# تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز

عەلی باپیر

## بەرگی پێنجەم

### تەفسیری سوورەتی ( الأنعام )

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نـووســـەر: عەلـی باپـیر.

نەخشەسازیی ناوەوە: عزالدين محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٦ ك– ٢٠١٥ز.

تـــیراژ : ٢٠٠٠ دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەكی ئەم تەفسیرە بەگشتی

الحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده الله فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لا إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾آل عمران، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾النساء، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصدَقَ الحَديث كَلامُ الله وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّار(١).

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - كە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین كتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی لە

---

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەكرد پێش هەر قسەیەكی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبَة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین‌و رامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بەباشترین جێگرتن جێگا دەگرێ‌و خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی‌و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم‌و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم‌و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم‌و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان‌و تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی‌و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکرای کتێب‌و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم‌و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان‌و چۆنیەتی جێبەجێکردن‌و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك‌و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم‌و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم‌و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرِّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون‌و دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾النحل،

واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەکانیو کتێبەکانی سوننەتدا خەریکمو دەیان کتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە کتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]، بەلام هەڵبەتە نالێمو هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووورداربوونی تواناو بڕستم لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بە

---

١) ئەو کتێبە کە ئێستا چاپ کراوەو کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانو، سەرجەم هەشت بەرگو دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر صالّحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕانو کچان لەنێو گەلەکەماندا زۆر بکات.

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئانو دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن‌و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین‌و بە گوێرەی سوورەتەکان بەرگەکانی دیاریی دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس‌و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢
٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتی (الأعراف)، سەرگەرمی سوورەتی (الأنفال)ەو عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ.

# پێشەکی ئەم بەرگە

خوێنەرە بەڕێزو سەنگینەکان !

ستاییش‌و شوکرانەی شایستە بۆ خوای بەخشەر ﷻ، کە یارمەتی داین سووڕەتی (الأنعام)یش ــ کە ئەم بەرگی پێنجەمە دەیگرێتە خۆی ــ تەفسیر بکەین‌و بیخەینەگەڵ چوار بەرگەکەی پێشووی: {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز}.

شایانی باسیشە کە سووڕەتی (الأنعام) لە ریزبەندیی موصحەف (ترتیب المصحف)دا یەکەمین سووڕەتی مەککەیی یە، بۆیە هەوڵمان داوە لە سەرەتای ئەم بەرگەوە، وێڕای سووڕەتی (الأنعام) پێناسەی کۆی قورئانی مەککەییش بکەین‌و، هێڵە گشتییەکانی بخەینەڕوو.

هەروەها لەم بەرگەدا بە پێویستمان زانیوە: هەڵوەستەی درێژ بکەین لەبەردەم هەندێك بابەتی بوونناسیی‌و ئیمانیی‌و عەقیدەیی دا، بە پێی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتە بەهێزو پێزانەی، کە لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون.

خوای میهرەبان‌و بە بەزەیی هەرچی زیاتر لە هیدایەت‌و تۆفیقی خۆیمان بۆ زیاد بکات، لە پێشکەشکردنی ئەم تەفسیرەو، سەرجەم کاروبارو چالاکییەکانمان داو هێزو پێزی باشتریان تێبخات.

سبحانك اللّهم وبحمدك، أشهد أن لا اله الاّ أنت، أستغفرك وأتوب إليك

١ ی ذی الحجة ١٤٣٦ ك

١٤ ی مایسی ٢٠١٥ ز

هەولێر

# پێناسەی سوورەتی (الأنعام) ونێوەڕۆکەکەی

بسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

الحَمد لله رَبّ العَالَمِين، وَصَلَّى اللهُ تَعَالَى وَسَلَّمَ وَبَارَكَ عَلَى سَيّدِ الْمرسَلين وَخَاتَم النّبيّين مُحَمَّدٍ وآلِهِ أَجْمَعِين، مِنَ الصَّحْبِ والأَزْوَاجِ وَالقَرَابَةِ وَالتابعِينَ لَهُمْ بإِحسَان إِلى يَومِ الدّين.

بەڕێزان !

خوا ﷻ پشتیوان بێ هەوڵدەدەین بەر لەوەی ڕاستەوخۆ بچینە سەر تەفسیرکردنی ئەم سوورەتە موبارەکە، پێناسەیەکی بکەین‌و، پێگەو گرنگیی‌و پلەو پایەی بخەینەڕوو، پاشان سەردێرو نێوەڕۆکی بابەتەکانی دەخەینەڕوو:

یەکەم: ئەم سوورەتە لە ریزبەندیی (مُصْحَف)دا، واتە: ئەو قورئانەی کە بە دەستیەوە دەگرین، شەشەمین سوورەتە، وە ژمارەی ئایەتەکانی بە ڕای زۆربەی زانایان (١٦٥)ە، هەندێکیشیان گوتوویانە: (١٦٧)ە، وە کەمترو زیاتریشیان گوتوە.

دووەم: ئەم سوورەتە یەکێکە لە سوورەتە مەککەییەکان، کە دەگوترێ: سوورەتی مەککەیی، واتە: ئەو سوورەتانەی کە پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵە بەڕێزەکانی لە مەککەوە بۆ مەدینە، هاتوونە خوار، بەتایبەتی خودی پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی کۆچ بکات لە مەککەوە بۆ مەدینە، وە هەر سوورەتێك دوای کۆچکردن هاتبێتە خوار، پێی دەگوترێ: سوورەتی مەدینەیی، واتە: ئەو سوورەتانەی کە مەککەیین، مەرج نیە لە نێو مەککە هاتبنە خوار، هەروەها سوورەتە مەدینەییەکان، با دواییش لە مەککە هاتبنە خوار، بەڵام مادام کەوتبنە پاش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، هەر پێیان دەگوترێ: سوورەتی مەدینەیی.

دیارە زۆربەی زانایان گوتوویانە: ئەم سوورەتە سوورەتێکی مەککەییە، وە هیچ ئایەتی مەدینەیی تێدا نیە، چونکە هەندێ سوورەتی دیکە هەن، سوورەتی

مەککەیین، بەڵام ڕەنگە چەند ئایەتێکی مەدینەیی یان ڕەگەڵ کەوتبن، یاخود سوورەتێك مەدینەییە، بەڵام چەند ئایەتێکی مەککەیی ڕەگەڵ کەوتبن، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: ئەم سوورەتە هەمووی مەککەییە، وە هیچ ئایەتی مەدینەیی ڕەگەڵ نەکەوتوون.

هەندێکیش گوتوویانە: دوو ئایەتی مەدینەیی ڕەگەڵ کەوتوون، ئەوانیش: ئایەتی ژمارە (٩١) کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ ﴾، وە ئایەتی ژمارە (١٤١) کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾.

وە هەندێکیش دەڵێن: شەش ئایەتی مەدینەیی تێدان، سێیان: ئایەتەکانی ژمارە (٢١و ٢٢) کە خوا (جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، وە ئایەتی ژمارە (٩١) کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴾، وە سێ ئایەتەکەی دیکەش: ئایەتەکانی ژمارە: (١٥١و ١٥٢ و ١٥٣)ن، کە دە (١٠) وەصیەتەکانیان تێدان.

بەڵام بە سەرنجدانی نێوەڕۆکی ئەو دوو ئایەتە، یاخود ئەو شەش ئایەتە، بۆمان دەردەکەوێ، کە هیچ شتێك ئێمە ناچار ناکات بڵێین: ئەو ئایەتانە مەدینەیین، چونکە ئەوانیش هەموویان لەگەڵ جەوو سروشتی ئایەتە مەککەییەکان و، سوورەتە مەککەییەکاندا دەگونجێن.

سێیەم: سوورەتی (الأنعام) بە ڕای سەرجەم زانایان تەنیا سوورەتێکە لە سوورەتە درێژەکان، (چونکە جوزئێك زیاترە) کە هەمووی بە یەك جارو بە یەك شەو دابەزیوە[١]، وە لەوبارەوە چەند فەرمایشتێك هەن:

فەرمایشتی یەکەم: ﴿عَنْ جَابِرِ بنِ عَبْدِالله رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ سُورَة الأَنْعَام، سَبَّحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: لَقَدْ شَيَّعَ هَذِهِ السُّوَرَةَ مِنَ الـمَلاَئِكَةِ مَا سَدَّ الأُفقَ﴾[٢]، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێك سوورەتی (الأنعام) دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ خوای بە پاك گرت {(سُبْحَانَ الله)ی کرد}، دوایی فەرمووی: ئەم سوورەتە ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر لە فریشتەکان هێناویانە، (یانی وەك ڕێزلێگرتن بەڕێیان کردوە لەو شوێنەوە کە خوای پەروەردگار دایبەزاندوە) کە ئاسۆیان پڕ کردبوو، یانی: ژمارەی فریشتەکان ئەوەندە زۆر بوون، ئاسۆ لەوان پڕ بوو بوو.

فەرمایشتی دووەم: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةَ الأَنْعَام بمَكّةَ لَيْلاً جُمْلَةً، حَوْلَـهَا سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَك يَجْأَرُونَ بالتَّسْبِيح}[٣]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: سوورەتی (الأنعام) بە یەك جار بە شەوێ لە مەککە دابەزی، وە حەفتا هەزار فریشتە لە دەوری بوون، (واتە حەفتا هەزار فریشتە لەگەڵ جبریل دا هاتبوون، کە دیارە ئەسڵی وەحی هەمووی جبریل هێناویەتی، بەڵام ئەوجارە، حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدا بوون) دەنگیان بەرز دەکردەوە بە (سُبْحَانَ الله) گوتن.

---

١) بەڵام من پێموایە زۆرێك لە سوورەتە مەککەییەکان ـ ئەگەر نەڵێم ـ هەموویان ـ بە یەکجارو لە یەك کاتدا دابەزیون .

٢) أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ في "شعب الإيمان" برقم: (٢٤٣١)، الحَاكِمُ برقم: (٣٢٢٦)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَقَالَ الشيخ الألباني: قُلْت: وَأَقَرّهُ ابْنُ كَثير، لَكِن رَدّه الذَّهَبِي، فالحديث إسناده حسن، لا سيّما وله شواهد كثيرة موصولة ومرسلة، أنظر: موسوعة: فضائل سور وآيات القرآن، قسم الصحيح، الجزء الأول، ص٢٥٥، ٢٦١، الشيخ محمد بن رزق بن طرهوني.

٣) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ في "الكبير"، ج١٢، ص٢١٥، وَرَوَاهُ أَبُو عبيد في فضائل القرآن: ص ١٢٩، وابن الضريس في فضائل القرآن: ص ١٥٧ ، من طريق حماد بن سلمة عن علي بن زيد به، وفي إسناده علي بن زيد وهو ضعيف.

دیارە ئەوە مەرج نیە خەڵك گوێی لێبووبێ، بەڵام دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەواڵەی داوەو عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسیش لەوەوە دەیگێڕێتەوە.

فەرمایشتی سێیەم: ﴿عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: أُنْزِلَتْ عَلَيَّ سُورَةُ الأَنْعَامِ جُمْلَةً وَاحِدَةً يُشَيِّعُهَا سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، لَهُمْ زَجَلٌ بِالتَّسْبِيحِ، وَالتَّحْمِيدِ﴾[1] واتە: ئوبەی كوڕی كەعب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوورەتی (الأنعام)م بە یەك جار دابەزیە سەر، حەفتا هەزار فریشتە هێنایان بەڕێیان كرد، دەنگیان بەرزكردبۆوە بە (سُبْحَانَ الله) كردنو (الحَمْدُ لِلَّهِ) گوتن.

چوارەم: ئەم سوورەتە (٧٨) جار وشەی موبارەكی (اللّٰه)ی تێدا دووبارە بۆتەوە، وە (٥٠) جار وشەی (رَبّ)ی تێدا هاتوە، وشەی: (اللّٰه) دیارە ناوی تایبەتی خوای پەروەردگارە، وە (رَبّ) یانی: پەروەردگار، ئەویش هەر یەكێكە لە سیفەتەكانی خوای بێوێنە، وە (٣٢) جار وشەی (هُوَ) بۆ خوای پەروەردگار بەكارهاتوە، هەموویان پێناسەی خوان ﴿ هُوَ ٱلَّذِى ﴾، وە وشەی (قُلْ) واتە: بڵێ، كە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بڵێ، (٤٢) جار بەكارهاتوە، كە ئەو (٤٢) جارە، بە زۆریی دەربارەی خوا بەیەك گرتنە واتە: تەنیا خوا بە پەروەردگارو، بە بەدیهێنەرو، بە پەرستراو دەزانین.

پێنجەم: ئەم سوورەتی (الأنعام)ە، یەكەمین سوورەتی مەككەییە، لە دوای سوورەتی (الفاتحة) كە لە بەرگی یەكەمی ئەم زنجیرە دەرسەدا تێپەڕیوە، كە تەفسیری دەكەین، بۆیە بە پێویستی دەزانم كە لەبارەی نێوەڕۆكی قورئانی مەككییەوە بەگشتی، وە سوورەتە مەككەییەكانەوە، وە ئەو پانتاییەی كە لە كۆی قورئاندا گرتوویانەتەوە، بدوێین، پێش ئەوەی بێینە سەر نێوەڕۆك و بابەتەكانی سوورەتی (الأنعام).

---

١) أَخْرَجَهُ أَبُو الشيخ، والدر المنثور، المصدر السابق، ص٢٠٦.

# سوورەتە مەككەییەكان: پانتایی و نێوەڕۆكیان

بەڕێزان !

قورئان هەمووی لە دوو قۆناغی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دابەزیوە: قۆناغێكیان كە (١٣) ساڵ دەخایەنێ، ئەو كاتە بووە كە پێغەمبەر ﷺ لە مەككە بووە، وە قۆناغی دووەم كە (١٠) ساڵو چەند مانگێك دەخایەنێ، ئەو كاتە بووە كە پێغەمبەر ﷺ كۆچی كردوە بۆ مەدینەو لە مەدینە بووە، ئنجا دوایی كە لە مەدینە چۆتە دەرێو قورئانی بۆ هاتوە، لە جەنگی (تبوك)دا، لە شام بۆی هاتوە، لە شوێنێكی دیكە بۆی هاتوە، گرنگ ئەوەیە وەك پێشتر گوتمان، قورئانی مەدینەیی، واتە: ئەو قورئانەی كە لە قۆناغێكدا بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ تێیدا لە مەدینە نیشتەجێ بووە.

ئنجا هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە قورئان (١١٤) سوورەتە، وە لەو (١١٤) سوورەتە، زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە (٨٦) سوورەتیان مەككەیین، (٢٨) سوورەتیشیان مەدینەیین، وە پانتایی ئەم دوو بەشەش بە شێوەی نزیكەیی (بصورةٍ تقريبيَّة) ، دوو لەسەر سێی قورئان سوورەتە مەككەییەكان پێكی دێنن، كە لە ماوەی (١٣) ساڵدا دابەزیون، وە یەك لەسەر سێی قورئانو تۆزێك زیاتریش مەدینەییەو لە ماوەی (١٠) ساڵدا دابەزیوە.

بەنسبەت نێوەڕۆكو هێڵە گشتیەكانی سوورەتە مەككەییەكانیش یان قورئانی مەككەیی، دەڵێین: لەبەرئەوەی كە بە زۆریی وایە ئینسان چۆن بیربكاتەوەو عەقیدەی چۆن بێو تێڕوانینیو جیهان بینینی چۆن بێ، هەڵسوكەوتیشی وادەبێ، وە ژیانو گوزەرانیشی وادەبێ، بۆیە خوا ﷻ لە وەحی كۆتایی خۆیدا كە قورئانە ـ وە من پێم وایە هەموو كتێبەكانی دیكەی خوای پەروەردگاریش هەر وابوون ـ خوا بۆ مرۆڤەكان، سەرەتا باسی بووناسییو جیهانبینییو ئیمانو عەقیدەی بۆ كردوونو، بۆی باسی

لایەنی عیبادەت و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا، کردوون، وە بۆی باسی خوو ڕەوشت کردوون، ئنجا دوایی هاتۆتە سەر باسی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەنێو خۆیانداو، بوارو بابەتەکانی: سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و جەنگ و ئاشتی و پەیوەندییەکان و هتد ... .

ئنجا خوای کاربەجێ کە دەزانێ ئینسان بیرکردنەوەو تەصەڕووفی چۆنە، ئاواش ڕەفتار دەکات، تەماشا دەکەی ئەو کەسەی ئیمانی بە خوا هەیە، ئیمانی بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئیمانی بە پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەیە، وە ئیمانی بە هەموو ئەو شتانە هەیە کە پێغەمبەران هەواڵیان پێداون، وە پێغەمبەری خاتەم هەواڵی پێداون، هەڵسوکەوتەکانیشی مسوڵمانانەن، وە کەسێك کە بڕوای بەو شتانە نیە، هەڵسوکەوتەکانیشی نامسوڵمانانەن، چونکە بە تەئکید هەڵسوکەوتی ئینسان، هەڵقوڵاوی بیرو بڕواو بووناسیی و جیهانبینیی ئینسانە، بۆیە خوای پەروەردگار لە قورئانی مەککەیی دا ــ کە وەك گوتمان (٨٦) سوورەتەو دوو لەسەر سێی قورئان پێکدێنێ ـ بە پلەی یەکەم باسی بووناسیی کردوە، کە بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن: (Ontology) (ئۆنتولوجی) وە بە عەرەبی دەڵێن: (مَعْرِفَة الوجُود)، یان (علم الوجُود) واتە: باسی ئەوە کە:

ئینسان چییە؟ لە کوێ هاتوە؟ کێ هێناویەتی؟ بۆچی هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ ئەم ژیانە دنیاییە چیە؟ ئایا ژیانی دیکەی بە دوادا دێ؟ پاشان ئەو بوونە کە ئینسان تێیدا دەژی، ئەو ئاسمانانە، ئەو ئەستێرانە، ئەو زەوییە، ئەو دەوروبەرە، چییە؟ بۆچی دروست بووە؟ کێ خاوەنیەتی؟ چۆن بەڕێوە دەچێ؟ سەرەنجامی چۆن دەبێ؟ هەر دەمێنێ؟ یان لەنێو دەچێ و نامێنێ؟ وە ئایا دوای ئەوەی کە لەنێو دەچێ، چی دیکەی دێتە جێ؟

پاشان لە قورئانی مەککەیی دا باسی ئەوە کراوە کە ئینسان دەبێ هەڵوێستی لە بەرانبەر خاوەنی ئەو بوونەوەرەدا چۆن بێ، ئیمانی پێبێنێ، ئیمانی پێنەهێنێ؟ بیپەرستێ، یان نا؟ ئەگەر بیپەرستێ، چۆنی بپەرستێ؟ چۆن یادی بکات؟ چۆن لێی بترسێ؟ چۆنی خۆشبوێ؟ چۆن پشتی پێ ببەستێ؟ چۆن بۆی ملکەچ بێ؟ وە ئایا ئەو بەرنامەو شەریعەتە کە ناردوویەتی، چۆنی مامەڵە لەگەڵدا بکات؟

وە ئنجا ئینسان دەبێ ڕەوشتو هەڵسوكەوتی چۆن بێ؟ ئایا ڕاست بێژبێ، یان درۆزن بێ؟ دەستپاك بێ، یاخود ناپاك بێ؟ بە ڕەحم بێ، یان بێ ڕەحم بێ؟، ئازابێ، یان ترسنۆك بێ؟، بەخشندە بێ، یان چرووكو ڕژد بێ؟ بە ئینصاف بێ یاخود بێ ئینصاف بێ؟ ... هتد، هەروەها مەسەلەی (باری كەسێتیی) كە ئینسان دەبێ چۆن ژیانی خێزانیی پێكەوە بنێ؟ ئەوانە لە قورئانی مەككەیی دا زۆر باسكراون، بەڵكو چەقی قورئانی مەككەیی ئەو بابەتانەن: بووناسیی، وە ئیمانو عەقیدە بە هەموو بەشەكانییەوە، وەك ئیمان بە خوا ﷻ بە سیفەتەكانی خوا، بە بەدیهێنەرایەتیی خوا، بە پەروەردگاریێتیی خوا، بە خاوەنداریێتیی خوا، بە سەرپەرشتیاریێتی خوا، بە پەرستراوێتیی خوا، بە ناوە هەرە چاكەكانیو سیفەتە بەرزەكانی.

وە پاشان ئیمان بە فریشتەكان، كە خوا زۆربەی كاروباری بوون (وجود)ی بە فریشتەكان سپاردوە، وە ئیمان بە كتێبەكانی خوا، كە فریشتەكان دەیانهێنن، وە ئیمان بە پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَة وَالسَّلاَم) كە نوێنەرو ڕەوانەكراوی خوان، وە ئیمان بە ڕۆژی دوایی كە ئەو ڕۆژەیە ئینسان تێیدا بە خزمەت خوا دەگاتەوە، وە بە دیداریی خوا دەگاتەوەو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەكات، وە سزای دەدا، ئەگەر خوار ڕۆیشتبێ، یان پاداشتی دەداتەوە، ئەگەر ڕاست ڕۆیشتبێ.

وە لە قورئانی مەككەیی دا ئەوەی تێبینی دەكرێ: هەمیشە خوای زاناو شارەزا بە چەند وشەیەك دواندنەكانی خۆی ئاڕاستە كردوون، ئەوانیش:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾، واتە: ئەی مرۆڤ ! واتە: مرۆڤ جارێ پێش ئەوەی بزانرێ ئیمان دێنێ، یان ناهێنێ؟ ڕەشە یان سپییە؟ عەرەبە یان غەیری عەرەبە؟ پیاوە یان ئافرەتە؟ گچكەیە یان گەورەیە؟ خوێندەوارە یان نەخوێندەوار؟ بەرپرسە یاخود سادەیە؟ دەوڵەمەندە یان نەدارە؟ هەرچی هەیە، بالاَی قەدو قیافەی دیمەنی چۆنەو چۆن نیە؟ دوێنراو (مخاطب)ی خوایە.

٢- ئنجا وشەی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، واتە: ئەی وەچەی ئادەم ! واتە: ئەی هەموو ئەوانەی كە لە ئادەم عليه السلام پاش كەوتوونو ڕەچەڵەكیان دەچێتەوە سەر ئادەم عليه السلام، كە بێگومان مرۆڤ هەمووی دەچێتەوە سەر ئادەم عليه السلام.

٣- وە وشـەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، واتە: ئەی خەڵکینـە !.

٤- هەروەها وشــەی: (بشـر)، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ ﴾الفرقـان، بەڵام وەك نازنـاوو ناونیشـانی دوانـدن، ئـەو سـێیانە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾، ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ ﴾، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾ن، وە تەنانـەت یەك جاریش لە قورئانی مەککەیی دا خوا بـە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئێمـەی مرۆڤـی نەدوانـدوە، کـە دوایـی حیکمەتەکـەی ڕوون دەکـەمەوە، ئـەوە بـە نسـبەت قورئـانی مەککەییەوە.

دیارە قورئانی مەدینەیـی کە وەك گوتم وەك ژمارە بیستو هەشـت (٢٨) سوورەتە، وە وەك قەبارەش یەك لەسەر سێی قورئانێ، مەدینەییە، سووڕگەی سەرەکیی و ئەو مەدارەی کە قورئانی مەدینەیی تێدا دەسووڕێ، بریتیە لە ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانی کۆمەڵگـای مسـوڵمان، وە ڕێنماییکردنی کۆمەڵگای مسـوڵمان، لە هەموو بوارەکانی حوکمو سیاسەتو ئابووریی و بازرگانیی و خێزانیی و کۆمەڵایـەتیی و جـەنگو ئاشـتیی و پەیوەندییـەکـانو، ئەدەبــە گشتییەکــانو هەڵسـوکەوتــە کۆمەڵایەتییـەکــان ... هتــد، وە لــە قورئــانی مەدینــەیی دا، تــەنیا دوو شــێوە بەکارهــاتوون بـۆ دوانـدنی ئینسـانەکان، ئەوانیــش: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، واتــە: ئــەی خەڵــکینە، وە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، واتــە: ئــەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ئنجا ئایا حیکمەتی ئەوە چییـە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیــە کە:

پـێش ئـەوەی مـرۆڤـ مسـوڵمان بـێ، خـوای بەدیهێنــەر وەك مرۆڤـ دەیـدوێنێ: ئـەی ئینسـان، ئەی وەچـەی ئـادەم ! ئەی خەڵکینە، ئنجا ئەمـە چی لـێ وەردەگیـرێ؟ ئەمـە ئەوەی لـێ وەردەگیـرێ کە: ئەو شەریعەتەی خوای پەروەردگار، ئەو دینە کۆتاییەی خـوا، بۆ ئینسان هاتوە، وەك ئینسان، نەك تەنیا بۆ فـلان گەل، یـان فـلان ڕەگـەز، یـان فـلان ڕەنـگ، یان فـلان چینو توێـژ، بەڵکو بۆ ئینسان هاتوە، وەك ئینسـان، ئنجا ئەو ئینسانە وەك گوتم: ئینتیمای نەتەوەیـی هـەر ئینتیمـایەکە، عەرەبە یان غـەیری عەرەبـە؟ وە لـە ڕووی ڕەنگـەوە: ڕەش پێسـتە، یان سپی پێستە؟ وە لـە ڕووی قـەدو قیـافەیەوە: جـوانە یان نا؟ لە ڕووی سـەروەتو سـامانەوە: دەوڵەمەنـدە، یـان هــەژارە؟ وە لـە ڕووی پێگـەی

كۆمەڵایەتیی و سیاسییەوە: پلەدارە یان سادە ؟ وە لە ڕووی ڕەگەزەوە: مێیە یان نێرە؟ وە لە ڕووی تەمەنەوە: گەنجە یان پیرە، یان منداڵە؟ هەموویان دەگرێتەوە، دیارە قورئانی مەدینەییش كە دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! چونكە دیسان ئەو خەڵكە كە ئیمانیان هێناوە، كۆمەڵە خەڵكێكن، وە بۆ ئەوەش خوای پەروەردگار وای دواندوون، چونكە قەوارەیەك كە ئیسلام دایدەنیٚ و بنیاتی دەنیٚ، هەر بۆ مسوڵمانان نیە، ئەو دەوڵەتەی كە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە پێكیهێناوە، جوولەكەشی تێدا بوون، هاوبەشدانەریشی تێدا بوون، مونافیقیشی تێدا بوون، نەصرانییشی تێدا بوون، بۆیە خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! تاكو مسوڵمان و غەیری مسوڵمانیش بگرێتەوە، وە كە دەشفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دیسان ئیمانداران هەموویان: نێرن، مێن، پیرن، گەنجن، وردن، درشتن، خوێندەوارن، نەخوێندەوارن، بەرپرسن، سادەن، هەموویان دەگرێتەوە.

ئنجا بۆچی خوای كاربەجیٚ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، تەنیا لە سوورەتە مەدینەییەكاندا بەكاریهێناوە، وە لە مەككە بەكاری نەهێناوە؟ وەڵام: چونكە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دواندنە لەگەڵ كۆمەڵگایەك دا لە مەدینە، كە كۆمەڵگای مسوڵمانانەو دوای ئەوە دروست بووە، كە لەویٚ پشتیوانان پەیدا بوونو، كۆچكەرەكانیش بۆ ئەویٚ چوون، وە پێغەمبەر ﷺ، پەیماننامەیەكی نووسی بۆ چۆنیەتی مامەڵە پێكەوەكردنی پێكهاتەكانی مەدینە، بە كۆچكەران و پشتیوانان، بە هەموو تیرەكانیانەوە، هەروەها جوولەكەكان و موشریكەكان، دوای ئەوە ئنجا كۆمەڵگایەك دروست بوو و ئەو كاتە خوا فەرمووی: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بەڵام پێشتر مسوڵمانان وەك تاكەكان (أفراد) هەبوون، كۆمەڵگایەكیان نەبوو، تاكو بتوانن شەریعەت پیادە بكەن و بە حەڵاڵ و حەرامەكانی خواوە پابەند بن و بتوانن ئەمرو نەهییەكانی خوا جێبەجیٚ بكەن، بۆیە لە قۆناغی مەككەدا خوای پەروەردگار زیاتر ئەو ئەركانەی ناردوون كە بە تاك دەكرێن، وەك: بوونناسیی و ئیمان و عەقیدەو، عیبادەتی شەخصیی و هەڵسوكەوت و ڕەوشتەكان، كە ئەوانە هەموویان بە تاكەكان دەكرێن، بەڵام ئەو ئەركانەی كە لە مەدینە ناردوونیە

خوار، بە تاك جێبەجێ ناكرێن، وەك دەرفەموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ ١٨٣ ﴾البقرة، ﴿ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ ٢١٦ ﴾البقرة، ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ ١٩٠ ﴾البقرة، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ ٢٨٢ ﴾البقرة، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٣٠ ﴾آل عمران، ئەوانە هەموویان دیارە بە دەستە جەمعیی جێبەجێ دەکرێن و، بە قەوارەیەك جێبەجێ دەکرێن، جا پیرەمێردی شاعیریش دەڵێ :

کاکە خوا کاری نابەجێ ناکا تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

خوای زاناو شارەزا زانیویەتی کە مسوڵمانان ناتوانن لە مەککە یاساکانی شەریعەت جێبەجێ بکەن، بۆیە لەوێ نەیناردوونە خوارێ، هەندێك لە زانایان دەڵێن: تەنانەت نوێژیش لە مەدینە فەرز بووە، بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە کە لە کاتی شەڕۆیی و بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج) لە ساڵی دەیەم، یان یازدەیەمی پێغەمبەرایەتیی دا فەرز بووە، بەڵام بە تەئکید ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان لە ساڵی دووەمی کۆچیی دا فەرز بووە، وە زەکات لە مەدینە فەرز بووە، وە حەج لە مەدینە فەرز بووە، وە جەنگ و جیهاد لە مەدینە فەرز بووە، هەروەها سزا شەرعییەکان، وەك سزای دزیی و، سزای زیناو، سزای کوشتن و، سزای بوختانی داوێن پیسیی و، سزای ڕێگریی و... هتد، ئەوانە هەموویان لە مەدینە فەرز بوون، چونکە هەتا قەوارەو دەسەڵاتێك نەبێ، ئەوانە جێبەجێ ناکرێن.

ئنجا بەڕاستی هەتا ئینسان ئیمانی نەبێ، کردەوەی باشی لێ چاوەڕوان ناکرێ، وە پاشان مسوڵمانان تاکو خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆیان نەبن، ناتوانن ژیان و گوزەرانی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی خۆیان بە گوێرەی شەریعەت ڕێکبخەن، کەواتە: هەبوونی قەوارەی سیاسیی پێویستەو پێش ئەوە، حوکمی جێبەجێ کردنی ئەو یاسایانە جیایە، بۆیەش ئەوە ڕوون دەکەمەوە، چونکە هەندێ کەس تەماشای واقیعەکە دەکات، دەڵێ: بۆچی لە بازاڕەکان شەڕاب دەفرۆشرێ و، قومار دەکرێ و،

دەبیستین زینا دەكرێ‌و، قەتڵ دەكرێ، بەڵام لە جیاتی ئەوەی سزای شەرعیی بدرێ، حەپس دەكرێ ؟ وەڵام: لە ڕاستیدا ئەو یاسایانە بە قەوارەی سیاسیی‌و بە دەسەڵاتی سیاسیی جێبەجێ دەكرێن‌و، مسوڵمانان دەبێ دەسەڵاتی سیاسیان هەبێ، ئەوجار جێبەجێكردنی ئەو سزا شەرعییانەیان لەسەر فەڕزە، وە لە پێش ئەو سزا شەرعییانەش دا، جێبەجێ كردنی باقی لایەنەكانی دیكەی شەریعەت، كە گرنگترینیان دابینكردنی پێداویستییە سەرەكییەكانی تاك تاكی كۆمەڵگایە، وە چەسپاندنی دادگەرییە، وە لابردنی ستەمەو نەهێشتنی گەندەڵییە، نەهێشتنی جیاوازییە لەنێوان چین‌و توێژەكانی كۆمەڵگادا، وە نەهێشتنی قۆرخكارییە، ئەوانە هەموویان كەی دەكرێن؟ وە بە كێ دەكرێن؟ بێگومان بە كۆمەڵگایەك كە خاوەنی دەسەڵاتی سیاسی بێ بەسەر خۆیەوەو، خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بێ.

پاشان پیادەكردنی یاساكانی شەریعەت ناگونجێ بێجگە لە قەناعەتی زاتیی تاكەكانی كۆمەڵگا، هیچ پاڵنەرێكی دیكەی هەبێ، واتە: دەبێ خەڵك بۆخۆی قەناعەتی وابێ‌و ئیمانی هەبێ بەو شەریعەتە، ئنجا دەگونجێ شەریعەت بەسەر ئەو كۆمەڵگایەدا جێبەجێ بكرێ، كەواتە: كۆمەڵگا ئەگەر ئەو قەناعەتەی نەبێ، با خۆشی بە مسوڵمان بزانێ، كە لە حەقیقەتدا ئەو كاتە ئەو خۆ بە مسوڵمان زانینە، نیشانەیەكی پرسیاری گەورەی لەسەرەو ئیشكالێكی زلی تێدایە، چونكە كەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، دەبێ قەناعەتیشی بەوە بێ، كە دەبێ شەریعەتی خوای بەسەردا جێبەجێ بكرێ، بەڵام گریمان ئەوە خەڵكێكی وا هەبوو، كە ئێستا زۆر لە مسوڵمانان وان، ئنجا ئایا بەهۆی نەزانینەوەیە؟ یان بەهۆی ناچارییەوەیە، یان بەهۆی لاسایی كردنەوەوەیە؟ یان بەهۆی حاڵەتی نیفاقەوەیە؟! گرنگ ئەوەیە كۆمەڵگایەك تاكەكانی قەناعەتێكی زاتییان نەبێ، كە دەبێ شەریعەتیان بەسەردا پیادە بكرێ، ناگونجێ بەسەریان پیادە بكرێ، چونكە دین ناگونجێ بەزۆر بەسەر خەڵكدا فەرز بكرێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة، واتە: تۆبزیی كردن‌و ناچاریی كردن لە دینداریی دا نییە.

كەواتە: خوا (عز وجل) پێش ئەوەی بە مسوڵمانانی بفەرموێ: دەبێ چی بكەن‌و چۆن بكەن؟ وە ئەمرو نەهی‌و حەڵاڵ‌و حەرامیان بۆ دیاریی بكات، بووناسیی و ئیمانی لێی حاڵی كردن، دیارە ئێمەش بە هەمان شێوە: دەبێ سەرەتا وەك ئینسان

وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە: ئەم بوونە چییە؟ كێ دروستی كردوە؟ وە بۆچی دروستی كردوە؟ ئنجا ئایا مرۆڤ بۆچی لەسەر ئەم زەوییە دانراوە؟ وە چی لێ داواكراوەو دەبێ چی بكات؟ وە چۆن بكات؟ ئنجا ئایا دوای ئەم ژیانە، ژیانی دیكە هەیە، یان نا؟ وە ئایا پێویستە چۆن لەگەڵ بەدیهێنەرو خاوەنی ئەم بوونەوەرەدا مامەڵە بكەین؟ وە ئایا چاكو خراپ، حەڵاڵو حەڕام، ڕاستو چەوت، كێ دیارییان دەكاتو چیو چین؟! دەبێ ئینسان پێشێ وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە عەقڵو دڵدا ڕۆشن بێ، ئنجا ئەركە شەرعییەكانی دەكەونە سەر شان، وە ئنجا دەتوانێ بە شەریعەتەوە پابەندبێ، چ وەك ژیانی تاكیی خۆی، چ وەك ژیانی خێزانییو كۆمەڵایەتییو سیاسیی.

لێرەشدا من دەمەوێ ئاماژە بكەم بە مەسەلەیەكی گرنگ، كە كاتی خۆی زانایانی ئیسلام لە كتێبەكانیاندا باسیان كردوە، لە باسی ئیمانو عەقیدەدا كە ئەو كاتە پێی گوتراوە: (علم الكلام) ئەویش ئەوەیە كە كاتێك هاتوون باسی خوای پەروەردگاریان كردوە، بە وشەی (صانع) دروستكەر، كارساز، وەسفیان كردوە، كە من بۆخۆم تێبینییم لەسەر ئەو وشەیە هەیە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠﴾الأعراف، واتە: خوا ناوی هەرە چاكی هەن، تەنیا بەو ناوە هەرە چاكانەی بانگی بكەن، وە واز لەوانە بێنن، كە لە ناوەكانی خوادا لادانیان كردوە، لەمەو دوا سزای ئەوەیان دەدرێتەوە.

بۆیە من پێمwایە وشەی (صَانع) نابێ بۆ خوا بەكاربهێنرێ، مەگەر بگوترێ: تەرجەمەی: بەدیهێنەر (خَالق)ە، وشەی (خَالق) یەكێكە لە ناوەكانی خوای پەروەردگار، بەڵام وشەی: (صَانع) لە قورئاندا نەهاتوە، وە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ نەهاتوە.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە: كە زانایانی ئیسلام لە باسی بەدیهێنەرایەتیی خوادا بەزۆریی باسی (صانع)یەتی خوایان كردوە، واتە: ئەوە كە خوا ئەم كەونو كائیناتەی دروست كردوە، كتێبەكانی عەقیدەی ئیسلامیی كە كاتی خۆی نووسراون، زیاتر باسی

چەسپاندنی بوونی بەدیهێنەر (إثبات الخالق)، یان (إثبات الصانع)یان كردوە، بۆ وێنە: (العقیدة النسفیة)و( تهذیب الكلام) كە دێنە سەر باسی خوای پەروەردگار، زیاتر جەخت لەسەر لایەنی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریەتیی خوا دەكەنەوە، ئنجا لێرەدا دەبێ ئەوە بزانین كە زانایان كاتی خۆی لە كتێبەكانی خۆیان دا زیاتر جەختیان لەسەر ئەو لایەنە كردۆتەوە، لەبەر ئەوە بووە كە ئەو كاتە جەوو بارودۆخە فیكرییەكە وای خواستوە، ئەگەرنا وە نەبێ عەقیدەی ئیسلامیی تەنیا بریتی بێ لەو لایەنە.

ئنجا ئێستاش زۆر كەس كە باسی خوا بەیەكگرتن دەكات، تەنیا باسی ئەوە دەكات كە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ‌و هاوبەشی بۆ دانەنرێ، واتە: تەنیا جەخت لەسەر لایەنی خوا بەیەكگرتن (توحید) دەكەنەوە، لەویش زیاتر لایەنە عیبادییەكەی، دیارە ئەوەش دیسان واقیعێك وای كردوە، كە مسوڵمانان ئاوا بیربكەنەوە، بۆ وێنە: ئەگەر تەماشای كتێبەكەی (محمد بن عبدالوهاب) بكەین، كە باسی تەوحید دەكات، هەروەها زۆر لە كتێبی دیكەی مەشرەب سەلەفیی، زیاتر هەر باسی ئەو بابەتە دەكەن، ئنجا كە تۆ تەماشا دەكەی، پێت وایە عەقیدەی ئیسلامیی تەنیا ئەوەیە! یان تەماشا دەكەی (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ‌و هەندێك لە زانایان كە باسی خوا بەیەكگرتن (توحید)یان كردوە، زیاتر باسی ناوو سیفەتەكان (الأسماء والصفات)یان كردوە، چونكە زیاتر باسی ئەو شتانەیان كردوە كە لە سەردەمی ئەواندا ئیشكال‌و مشتومڕیان لەسەر بووە، كە هەندێك كەس هەبوون، ویستوویانە سیفەتەكانی خوا هەموویان تەئویل بكەن، بە جۆرێك كە سیفەتەكان لە خوا دابڕنن، كە پێیان گوتراوە: (المُعَطِّلَة) و(الجَهْمِّیة). بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە كە ئێمە دەبێ باسی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی بكەین، وەك لە قورئان‌و سوننەتدا هاتوە، نەك وەك كاردانەوە بۆ واقیعێكی دیارییكراو، بێنی تەنیا لایەنێكی لێ باس بكەی !

هەڵبەتە وەك گوتم: ئەو زانایانە كە كاتی خۆی وایان كردوە، ڕەنگە پاساوی خۆیان بووبێ، بەڵام بەڕاستیی ناگونجێ ئەو كتێبانە وەك كتێبی عەقیدەی ئیسلامیی، یاخود وەك كتێبی ئیمان‌و پایەكانی ئیمان، تەماشا بكەین، چونكە باسی ئەوانی تێدا نیە، تەركیزو جەختیان لەسەر لایەنێك كردۆتەوە، كە لە سەردەمی خۆیاندا وای پێویست كردوە، چونكە ئەو لایەنە زیاتر هێرشی لەسەر بووە، یاخود ئەو

لایەنـە زیـاتر پێویسـت بـووە بـۆ مسـوڵمانان ڕوون بکرێتــەوە، بـەڵام دەبـێ ئیمـان‌و عەقیدەی ئیسـلامیی لە قورئــان‌و سـوننەتەوە بێـنین، نـەك لـە هەنـدێك کتێبـەوە، وەك مـن لـە کتێبەکــەی خۆمـدا (ئیمـان‌و عەقیـدەی ئیسـلامیی لەبـەر ڕۆشـنایی قورئــان‌و سوننــەت دا) کــە شــەش (٦) بەرگــە، لەوێـدا باســم کــردوە، وە پاشــان عەقیـدەی ئیسـلامیی نابـێ هـیچ نـاوێکی لــێ بنـرێ: وەك ســەلەفیی، خەلـەفیی، ئەشـعەریی، ماتـوریدیی، نـا، بەڵـێ ئێمـە هەنـدێك زانامـان هـەبوون: ئـەبو حەسـەنی ئەشـعەرییمان بووە، وە ئەبو مەنصـووڕی ماتوریدییمـان بـووە، فـلان زانـای دیکەمان بـووە، ڕێــزمان بۆیان هەیە، بەڵام عەقیدەی ئیسلامیی، پەیوەندیی بە هیچ کەسێکەوە نیـە، وە بـە هـیچ قۆناغێکیشـەوە نیە، نـە پەیوەنـدیی تـەنیا بـە سـەلەفەوەیە، نـە بـە خەلــەفەوە، نـە بـە ئەبــو حەســەنی ئەشــعەرییەوە، نــە بـە ئەبــو مەنصــووڕی ماتوریـدییــەوەو، نــە بـە ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەلــەوەو، نـە بـە باقلانیـیــەوەو، نــە بـە فـلان کەسـەوە ئەوانـە هـەموویان زانایـانی ئیســلام بـوون، بـەڵام کـە باسـی ئیمـان‌و عەقیـدەی ئیسلامیی یـان کـردوەو، باسی پایەکانی ئیمانیان کردوە، وەك گوتم جـاری وایە لەبەر ڕۆشـنایی، یـاخود لەژێر زەختـی واقیعەکـەی خۆیانـدا، جـەختیان لەسـەر لایـەنێك کردۆتـەوە، بـەڵام ئەمـە مانـای وانیـە کـە عەقیـدەی ئیسـلامیی هـەر ئەوەنـدەیـە، بـەڵکو دەبـێ تەماشـای هـەموو قورئان‌و سوننەت بکەی، ئنجا تێگەیشتنێکی هاوســەنگت دەربـارەی ئیمــان‌و عەقیـدەی ئیسـلامیی بۆ دروست دەبێ‌و، کتێبی زانایانیش هەر کەسەو لە بواری خۆیدا سوودی لـێ دەبینین، ڕەحمەتی خوایان لـێبێ‌و خوا پاداشـتیان بداتـەوە، بـەڵام نـاتوانی هـیچ کـام لـەو کتێبانــە بکەیــە بەرنامــە، نــە ئــەوەی تەحــاوییو، نــە ئــەوەی موحەممــەدی کــوڕی عەبدولوەهابو، نە ئەوەی ئیبنو تەیمییە، نە (العقیدة النسفیة)و نە (تهذیب الكلام)و نــە (الـمواقف)، هــەر کــام لەوانــە مرۆڤــ تــەنیا دەتوانــێ ســوودیان لــێ ببینــێ، وەك کەلـەپوورێك، وە لەڕاسـتییدا کتێبـەکانی دیکـەش هـەروان، وەك کتێبـە فیقهییـەکان‌و، کتێبەکانی دیکە کە دەربارەی تەزکیەی نەفس نوسراون، وەك بەرهەمی زانایان سوودیان لـێ دەبینین، بەڵام نابێ خۆمانیان پێ ببەستینەوەو، موو بـە مـوو بیانکـەین بـە بـەدیل بۆ قورئان‌و سوننەت، ئەوە هەڵەیـەکی زۆر گەورەیــەو، تەنیــا قورئــان‌و سـوننەت وەڵامـی هەموو پرسیارەکانی هـەموو سـەردەمەکانیان تێـدان، چ لـە ڕووی عەقیـدەوە، چ لـە ڕووی فیقهــەوە، چ لــە ڕووی تەزکییــەوە، بــەڵام هــیچ کتێبێــك وەڵامــی پرسـیارەکانی هــەموو ڕۆژگارەکانی تێـدا نیـن‌و وەڵامی پرسـیارەکانی ڕۆژگـاری خۆی داوەتـەوە.

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە قورئانی مەککەیی، سێ لەسەر چواری پانتایی یەکەی تەرخانکراوە بۆ بەسەرهاتی پێشووان، بەتایبەت بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ گەلەکانیاندا، چونکە ئەوەی نەزانێ دنیا چۆن هاتووەو چۆن ڕابردوە؟ نازانێ ئێستاش چی بکات، وە نازانێ بۆ داهاتووش چۆن بەرنامە دابنێ، لەبەر ئەوە خوێندنەوەی مێژوو زۆر گرنگە، زۆر گرنگە بزانی لە پێش تۆدا چی گوزەراوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ ...﴿١١١﴾ ﴾يوسف، واتە: لە بەسەرهاتی ئەواندا (واتە: پێغەمبەرانو گەلەکانیان) پەند هەیە بۆ خاوەن عاقڵان، قسەیەك نەبووە کە هەڵبەسترابێ... هەروەها خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَكُلّٗا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ ...﴿١٢٠﴾ ﴾ هود، واتە: وە بەسەرهاتی پێغەمبەرانت بۆ دەخوێنینەوە، کە دڵو عەقڵی تۆ زیاتر پێی دەچەسپێو بەرچاوت ڕۆشن دەکاتەوە.

ئنجا بە بۆچوونی من کە سێ لەسەر چواری قورئانی مەککەیی تەرخان کراوە بۆ بەسەرهاتو مێژووی بەشەر، ئاماژەیە بەوە کە ژیانی بەشەر سێ لەسەر چواری ڕابردوە، لەوکاتەوە کە قورئان دابەزیوە، سێ لەسەر چواری لەوەو پێش تێپەڕیوە، وە یەك لەسەر چواری ماوە، واتە: ژیانی بەشەر زۆری ڕۆیشتووە کەمی ماوە، وەك لە فەرمایشتێکی پێغەمبەریشدا ﷺ ئاماژەی پێدەدا کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا أَجَلُكُمْ فِي أَجَلِ مَنْ خَلا مِنْ الأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلاةِ الْعَصْرِ وَمَغْرِبِ الشَّمْسِ، وَمَثَلُكُمْ وَمَثَلُ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَعْمَلَ عُمَّالاً، فَقَالَ: مَنْ يَعْمَلُ لِي إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ عَلَى قِيرَاطٍ، فَعَمِلَتْ الْيَهُودُ، فَقَالَ: مَنْ يَعْمَلُ لِي مِنْ نِصْفِ النَّهَارِ إِلَى الْعَصْرِ عَلَى قِيرَاطٍ، فَعَمِلَتْ النَّصَارَى ثُمَّ أَنْتُمْ تَعْمَلُونَ مِنْ الْعَصْرِ إِلَى الْمَغْرِبِ بِقِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، قَالُوا: نَحْنُ أَكْثَرُ عَمَلاً وَأَقَلُّ عَطَاءً، قَالَ: هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ حَقِّكُمْ؟ قَالُوا: لا قَالَ: فَذَاكَ فَضْلِي أُوتِيهِ مَنْ شِئْتُ﴾[1]. واتە: کاتی مانەوەی ئێوە

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٧٣٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٦٣٩) ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا.

لەسەر زەوی لەچاو ئوممەتانی پێشوو، وەك ماوەی نێوان نوێژی ئێوارە (عصر) و خۆرئاوابوون (شێوان) وایە.

{یانی: لە بەیانییەوە هەتا نوێژی عەصر چەندە، لەچاو نێوان عەصرو شێوان، ماوەی مانەوەی ئوممەتانی پێش ئێوەش، لەچاو تەمەنی ئێوە، ئەوەندەیە} ...

ئنجا ئەوەش وەك گوتم: ئاماژەیە بەوە کە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ واپێدەچێ تەمەنەکەی یەك لەسەر چوار کۆی تەمەنی مرۆڤایەتیی بێ، ئەوەش هەر هەڵهێنجانێك و تێگەیشتنێکی خۆمەو، دەگونجێ لێکۆڵینەوە لە شوێنەوارەکان، ئەوە زیاتر دەربخات، وە بە تەئکید ژیانی بەشەر بەشی زیاتری ڕۆیشتوە، بەڵام نازانین ئایا کەمتری ماوە، یان نا؟ ئەوە دیارە هەر خوا دەیزانێ.

ئنجا با بێینە سەر نێوەڕۆکی مەبەستەکانی سوورەتی (الأنعام): ئەگەر بەگشتی سەرنجی سوورەتە مەککەییەکان، یان قورئانی مەککەیی بدەین، دەتوانین بڵێین: لە سێ سوورگەدا دەسوڕێنەوە:

یەکەم: خوا بەیەکگرتن.

دووەم: پێغەمبەرایەتیی و وەحی.

سێیەم: دوارۆژو باسی بەهەشت و دۆزەخ.

سوورەتی (الأنعام)یش لە ڕووی قەبارەوە پاش (الأعراف) گەورەترین سوورەتی مەککەییە، ئەم سوورەتەش وەك هەموو سوورەتە مەککەییەکان بەگشتی باسی ئەو سێ بابەتە دەکات:

١/ باسی خوا بەیەکگرتن: باسی ئەوە کە هەر خوا ﷻ بەدیهێنەرەو، هەر خوا ﷻ پەروەردگارەو، هەر خوا ﷻ خاوەنە، وە خوا بەتەنیا سەرپەرشتیاریی کەون و کائینات دەکات، وە دەبێ هەر خوا ﷻ بپەرسترێ و، بەندایەتیی بۆ بکرێ و، ملی بۆ کەچ بکرێ، وە لە هەموو کەس و لە هەموو شتێ زیاتر خۆش بویسترێ و بە گەورە بگیرێ و، شەرمی لێ بکرێ و، ترس و سامی بەرانبەر بنوێنرێ و، پشتی پێ ببەسترێ، وە نەزرو قوربانیی دەبێ هەر بۆ ئەو بکرێ و، دەبێ سەرجەم

دروشـــمەكانی خواپەرســـتیی هــەر پێشـكەشـــی ئــەو بكــرێن، وە دەبــێ یاســاو بەرنامەكانی ژیـان، هەر لەو وەربگـیـرێـن.

٢/ وە ســـورگەی دووەم بابــەتی پێغەمبەرایەتـیــیو وەحـی بـۆ هاتنــی پێغەمبەرانــە (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وە بەســەرهاتیان لەگـەڵ قەومــەكانیان: چـیان گوتـووە؟ چییان لــێ هـاتووە؟ سـەرەنجـامیان چـۆن بـووە؟ پەیامەكـەیان چـی بـووە؟ كـێ ئیمـانی بە پێغـەمبەران هێنـاوە؟ كـێ دژیــان بووە، بە زۆریی؟!

٣/ وە پاشـــانیش بابەتـــی دوارۆژ: ســـەرەنجام چــۆن دەبــێ؟ ئــەم كــەونو كائیناتــە ســەرەنجامی چــی لـــێ دێ؟ چــۆن قیامــەت دێ؟ وە دوای زیندووبوونــەوە، ژیانــی بەهەشـتو دۆزەخ چۆن دەبـێ؟ ئـەم ســـوورەتی (الأنعـام)ە، لــەم ســێ سـوورگەیەدا دەسـوورێتـەوە، وەك باقـی سـوورەتە مەككەییەكان.

ئنجـا وەك گوتمـان: وشـەی بڵــێ (قُـلْ) لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا، زۆرتـرین ڕێـژەی دووبارەبوونەوەی هەیە، وە لە هـیـچ سوورەتێكی دیكـەدا ئەوەنـدە دووبـارە نەبۆتـەوە، وە ئـەو (٤٢) جـارە، مەگـەر چـۆن دەنـا هـەمووی دەربـارەی خـوا بەیەكگرتنـە، كـە خـوا بـە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئاوا بە هاوبەش پەرسـتەكان بڵـێ، ئـەوەیان بـۆ ڕوون بكـەوە، ئـەوەیان بـۆ ڕوون بكـەوە، وەك دوایـی دەیبیـنـین كـە زانایـانی زمـان بـەو شـێوازە دەڵێن: شـێوازی دان پـێپێـدانان (أسلوب التقریر)، (تقریـر) واتـە: وابكـەی كـە بەرانبەرەكـەت دانـی پێـدا بنـێ، بۆ وێنــە: دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿١٤﴾ ﴾.

﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا ﴿١١٤﴾ ﴾.

﴿ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا ﴿١٤٠﴾ ﴾.

﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا ﴿١٦٤﴾ ﴾.

# ناوونیشانەکانی بابەتەکانی سوورەتی (الأنعام)

هەڵبەتە من بە سەرنجدانی خۆم، ئەگەرنا دەگونجێ ناوونیشانی زیاتریش لە سوورەتی (الأنعام) دەربێنین، بەڵام من سی (٣٠) ناوونیشانم دەرهێناون :

یەکەم: باسی یەکتایی خوا لە بەدیهێنەرایەتییدا، کێ هەموو شتێکی پەیدا کردوە؟ کێ هەموو شتێکی بەدیهێناوە ؟ تەنیا خوای باڵادەست، وە تەنیا خوا پەروەردگارەو تەنیا دەبێ خواش بپەرسترێ، وە باسی ناوو سیفەتەکانی خوا، وە بەڵگە هێنانەوەی جۆراو جۆر لەوبارەوە، زۆربەی ئایەتەکان دەکەونە ژێر ئەو ناوونیشانەوە.

دووەم: سەرنج ڕاکێشانی مرۆڤ ، بۆ دیاردەو دیمەنە سروشتییە دڵ بزوێنەکان، وە کردنیان بە بەڵگەی پەروەردگارێتییو بێهاوتایی خواو تەنیایی خوا، لە پەرستراو بەندایەتیی بۆ کرانی دا؛ ئەوەش ناوونیشانێکی دیکەیە، کە زۆر لە ئایەتەکان دەخاتەوە ژێر خۆی.

سێیەم: ناساندنی خوا بە کردەوەکانی، کە خوا زانیاریو دەستەڵاتو بەزەیی بێسنووری هەیە، بە هەموو وردەکارییەکانی دروستکراوەکانی ئاگادارە، وە مراندنو خەواندن، وە دەربازکردن لە گرفتارییەکان، وە ناردنی سزا لە سەرێو لە خوارێ بۆ ئەوانەی کە سەرپێچیی دەکەنو...هتد، بەشێکن لە کارەکانی خوا ﷻ.

چوارەم: ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە، کە خوا بەیەکگرتن شتێکی خواڕسك (فطري)ە لە دەروونی ئینساندا، وە عەقڵو زانستو واقیعی ژیانی مرۆڤ، ناچاری دەکەن، کە خواناس بێو خواپەرست بێ.

پێنجەم: سەلماندنی پێغەمبەرایەتییو وەحیو، بەرپەرچدانەوەی تۆمەتو گومانی بێبڕوایان، بە بەڵگەی عەقڵییو زانستییو واقیعیی.

شەشـەم: ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە وێڵکردنی بەشـەر، وە پەیامو بەرنامە بۆ ڕەوانە نـەکردنیان لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە، شـتێکی نـا شـایسـتـەیەو ناگونجـێ خـوای کاربـەجێ بەشـەر وێـڵ بکـات، وە پـەیامو بەرنامـەیان بـۆ نەنێـرێ، وە ئـەوە لەگـەڵ کاربەجێیی‌و بەزەیـی‌و زانایی خـوای پەروەردگـاردا ناگونجـێ.

حەوتـەم: ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە کە یـەکێك لـە یاساکانی خـوا، لـە ژیـانی بەشـەردا، ئەوەیـە کـە هـیچ کۆمەڵـگایەك مـادام بێئاگـا بـێ، پـێش وریاکردنـەوەو نـاردنی پێغـەمبەران (عَلَـيهِم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلام) خـوا خەڵکـەکەی نافەوتێنـێ، خـوای پەروەردگار ئەو ڕاسـتییەی لە چەنـد شـوێنێك لەم سـوورەتەدا دووبارە کردۆتەوە.

هەشـتـەم: خسـتنە ڕووی ئـەو راسـتییە کـە پێغەمبـەران (عَلَـيهِم الصَّلاَةُ وَالسـلام) هەڵبژاردەی نێو بەشـەرن، وە لە هەموو سیفەتێکی بـەرزو جوان لـە لووتکـەدا بـوون، بۆیە پێویسـتە بکرێنـە سـەرمەشـق.

نۆیـەم: باسـی دوا ڕۆژو ئیسـپاتی ڕۆژی دوایـی، کـە ئـەو ڕۆژە حەتمییـەو هـەر دێ، وە لێپرسـینەوەی تێـدا دەبـێ‌و سـزاو پاداشـت دەبـێ، وە هـەبوونی بەهەشـت‌و دۆزەخ، دادگـەریی خوای پەروەردگـار دەیخـوازێ.

دەیـەم: هۆشـداریی دان بە بێبـڕوایان‌و ئاگادارکردنەوەیان، لـەوە کە ئـەوانـەی بێبڕوان بە خـواو بە ڕۆژی دوایـی‌و، بـە پێغـەمبەران، لە ڕۆژی دوایـی دا پەشـێمان دەبنـەوە، بەڵام دیـارە پەشـێمانییەکەیان هیـچ سـوودیان پێ ناگـەیەنـێ.

یازدەیـەم: باسـی هەنـدێك ئیشـوکاری هەنـدێك لـە فریشـتەکان لـە ژیـانی بەشـەردا، وەك پاراستنی مرۆڤەکـان‌و، تۆمارکردنـی کردەوەکانیـان، وە گیـان کێشـانیان.

دوازدەیـەم: باسـی پووچـیی بیـرۆکەی هاوبەشـدانەران، ئەوانـەی کـە فریشتەکانیان بـە کچـی خـوا دادەنـان، وە شـەیتانەکانیشـیان بە کوڕی خـوا دادەنا.

سـێزدەیەم: ڕاگـەیاندنی ئـەو ڕاسـتییە کـە ئیسـلام تاکـە دینـی خـوا بـووە بـۆ هـەموو پێغەمبـەران لە ئـادەمەوە تا خاتەم، هـەر بۆیـەش کـە دەگـوترێ: (الأَديَـان السَّمَاوِيَة) ئـەوە هەڵەیـەو لەڕاسـتیدا یـەك دینـی ئاسمـانیی هەیـە: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِنـدَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴿١٩﴾ ﴾آل عمـران، بـەڵام چـەند بەرنامەیـەکی ئاسـمانییـان هـەن، وەك خـوا

دەفـەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴿٤٨﴾﴾المائـدة، واتـە: بـۆ هـەر كـام لـە ئێـوە {ئـەی مسـوڵمانو جوولەكـەو نەصـرانییو خـاوەن كتێبـەكان} بەرنامەیـەكمان دانـاوە، بـەڵام نەیفـەرمووە (لِكُلٍّ مِنْكُمْ جَعَلْنَا دِيناً)، ئـایین (دیـن) وەك بەرنامەیەكی گشتییە، كە ئیسـلامە، بـەڵام لـە وردەكـارییەكاندا، شـەریعەتەكان جـۆراو جـۆرن.

چـواردەیەم: خـوا تاكـە سەرچـاوەی یاسـادانانو دیاریـكردنی حـەڵاڵو حـەرامو ئـەمرو نەهییـە، وە هـیچ كـەس بـۆی نیـە بچێتـە ئـەو بازنەیـەوە، مەگـەر بـە مۆڵـەتی شـەریعەتو لە چوارچێوەی فراوانی شـەریعەتدا، واتە: لـە چـوار چێوەی شـەریعەتدا كە زانایان ئیجتیهاد دەكەنو، یاسا هەڵدەهێنجـنو دادەنـێن، ئـەوەی كـە خـوا ئیزنـی لەسەر بـێ لـە چـوار چێوەی شـەریعەتدا، یاسـا هـەڵبهێنجرێو ئیجتیهاد بكـرێ، ئـەوە قەیناكـا، بەڵام یاسایەك دابنرێ پێچـەوانە بـێ لەگـەڵ شـەریعەتداو تێكبگیـرێ، ئـەوە دیـارە كوفرەو شـیـركە.

پازدەیـەم: لـەم سوورەتەدا چـەند ئایـەتێك باسـی ئـەوە دەكـەن كـە بـەختیاریی ئینسـان، یاخود ڕوورەشـییو ماڵوێرانی ئینسـان، بەرهـەمی كردەوەكـانی خۆیـەتی، وە خـوا لـە بەرانبـەر چاكـەدا، بـە دە بەرانبـەر، وە لـە بەرانبـەر خراپـەدا، هـەر یـەك بـە یـەك، حسابی دەكات.

شـازدەیـەم: باسـی ئازادیـی مرۆڤەكـان لـە چـوار چێوەی ویسـتی ڕەهـای خـوادا، وە لـە چـوارچێوەی یاسـاكانی خـوادا، كـە بـۆ ژیـانی مرۆڤـ دانـراون، واتـە: ئینسـان ئـازادە، بـەڵام لـە ژێـر ڕكێفی ئیـرادەی ڕەهـا (مطـلق)ی خـوا دایـە، وە لـە چوارچێوەی ئـەو یاسـایانە دایـە كـە خـوا داینـاون، بـۆ نمـوونە: خـوای پـەروەردگار یاسـای دانـاوە، كـە ئینسـان ئەگـەر بچـێ بـۆ سـەرێ، دەبـێ ئامرازێكـی پـێ بـێ، ئەگـەر بتـەوێ بفـڕی، ناتوانـی، مەگـەر ئامرازێكـت پـێ بـێ، وە ئەگـەر چوویە نێـو ئـاوێ، دەبـێ مەلـە بزانی، كە مەلـەت زانی، ئازادیو لـەنێو ئاوەكـەدا دەتوانی خـۆت دەربـاز بكـەی.

حەڤدەیـەم: دادگـەریی ڕەهـای خـوا ﷻ، خوا باسـی دادگـەریی خـۆی كـردوە، كـە ئـەویش ئـەوە داخـوازی دەكـات، كـە تـاكو كۆمەڵـەكان، مامەڵـەی جیاوازیـان لەگـەڵدا بكـرێو چاكـەكـاران سـەرفـرازو، بەختـەوەرو، سـتـەمكارانو لاڕێبـووان، ماڵـوێرانو بـێ

مرادبن، نەك هەموویـان یەك حیسابیان بۆ بکرێ، لـەم سوورەتەدا ئـەو بابەتـە زۆر جەختـی لەسـەر کراوەتــەوە.

هـەژدەیـەم: بە هۆی ئیمانـەوە ئینسان سینگی گوشاد دەبـێ، وە دڵـی ئارام دەبـێ، وە بـە پێچـەوانەوە: کـوفرو شـیــرك دەبنـــە مایــەی دڵ تەنگــیی‌و سـەغڵــەتیی‌و تەنگـە نەفەسـیی‌و نارەحەتیـی‌و دەردەداریـی ئینسـان.

نۆزدەیـەم: دەستکاریی کردنی حـەڵاڵ‌و حـەرام، بـەبێ مۆڵـەتی شـەریعەت، سـەرچاوەکەی نەفـامییەو نەزانینــە، نابــێ هـیچ کـەس دەسـتکاریی حـەڵاڵ‌و حـەرام بکـات، بـەڵکو لەراسـتییدا دەسـتکاریی کردنـی حـەڵاڵ‌و حـەرام، لـە نەزانینـەوە دێ، وە ئەگـەر ئـەو کەسـەش کـە دەسـتکاریی حـەڵاڵـێك دەکـات، کـە خـوا حـەڵاڵی کـردوەو ئـەو حـەرامی دەکات، یان حــەرامێك کە خـوا داینــاوە، ئـەو حـەڵاڵـی دەکات، ئەگـەر بـە عەقیــدەوە بێ، مرۆڤـ پێشــی لە ئیسـلام‌و ئیمان دەردەچێ.

بیسـتـەم: خسـتنە رووی ئەو راستییە، کە گۆشــتە قەدەغـە کـراوە سـەرەکییەکان بـەس ئـەم چـوارەن: مـردار، خـوێن، گۆشـتی بـەراز، سـەربڕاو بـۆ غـەیری خـوا، واتــە: لـە گۆشـتەکان غـەیری ئـەو چـوارە هیچیان قەدەغـە نـین، وەك دوایـی باسـی دەکـەین، هەڵبەتە لەوبارەشــەوە زانـایان مشــتومڕێکیان هەیــە.

بیســـتو یەکـەم: لـەم سـوورەتەدا بەڵـگە هێنراوەتـەوە، لەســەر ئـەوە کـە کافرەکـان بیانوویان نەبـێ بۆ هاوبـەش بـۆ خـوا دانـــان، وە شــت قەدەغــەکردن، بـەوە کـە خـوا ئـــەوەی لــەوان ویســـتوە، وە راگەیاندنـــی ئـــەو راســـتییە کــە ئـــەوە بۆچـــوونی موشریکەکانە کە دەڵــێن: ئێمــە بۆیـە هاوبەشـمان بـۆ خـوا دانـاوەو، شـتمان حـەڵاڵ‌و حـەرام‌و کـردوە، چـونکە خـوا ویسـتوویەتی، خـوای پەروەردگـار بەڵـگە لەسـەر ئـەوە دێنێتــەوەو ئــەوە هەڵدەوەشێنێتــەوەو دەیانخــاتە روو کـە ئــەوە قسـەیەکی پووچــە، چونکـە بەڵــێ ئیرادەی خوا گشتگیـرەو رەهــایە، بـەڵام خـوای پـەروەردگار هـیچ کـات شــتی خراپی لە بەندەکان نەویستوەو، خۆیانن کە خراپە پەیـدا دەکـەن.

ئنجـا ئایــا کــافر دەبـن، موشـریك دەبـن، مونـافیق دەبــن، خراپەکــاریی دەکـــەن، حـەڵاڵ‌و حەرام دەستکاریی دەکەن؟ تا کۆتــایی.

بیستو دووەم: لەم سوورەتەدا مرۆڤ هان دەدرێ بۆ گەڕانو پشکنین بە زەویدا، وە سەرنجدانی شوێنەواری گەلانی پێشوو، وە پەند وەرگرتن لە سەرەنجامەکانیان.

بیستو سێیەم: ئەو ڕاستییە ڕوون کراوەتەوە، کە موحەممەد ﷺ لەسەر هەمان ڕێبازی ئیبراهیمی خەلیلە، وە ئەهلی تەوحیدەو دوورە لە شیرك، وە یەکەمینی مسوڵمانانە، چونکە ئەو کاتە کافرەکان دەیانگوت: ئێمە لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمین ﷺ، بەڵام خوای پەروەردگار لەم سوورەتەدا ڕوونی دەکاتەوە، کە نەخێر، تەنیا موحەممەد (پێغەمبەری خاتەم) لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمە ﷺ.

بیستو چوارەم: خوا فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم دەکات، کە خۆڕاگر بێو، پشوودرێژ بێ، وەك پێغەمبەرانی پێشوو، لە بەرانبەر بە درۆ دانانو، ئازاردانو، ناڕەحەت کرانیدا لەلایەن خەڵکەوە.

بیستو پێنجەم: خوا فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەکات، بەوە کە گرنگیی بدات بە مسوڵمانانی ڕەشو ڕووت، ئەو بڕوادارە شوێنکەوتووانەی کە هەژارو نەدارو سادەن، ئاگای لەوان بێ، وە لەبەر سەرقاڵ بوون بە زلەزلەکانو خۆ بەزلگرەکانەوە، ئاگای لە ڕەشو ڕووتەکان نەبڕێ.

بیستو شەشەم: ئەو ڕاستییە ڕوونکراوەتەوە کە هیدایەتی خوای کاربەجێ مایەی زیندووبوونەوەی ئینسانە، لە ڕووی مەعنەوییەوە، وە کافربوونیشی مایەی مردنیەتی، واتە: ئینسان وەك چۆن مردنی جەستەیی هەیە، مردنی مەعنەوییشی هەیە، وە وەك چۆن ژیانی جەستەیی هەیە، ژیانی مەعنەوییشی هەیە.

بیستو حەوتەم: خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە موژدە بدات بە ئیمانداران: کە گوناحو خراپەکانیان کە بە نەفامیی کردوویانن، پاش گەڕانەوەی ڕاست، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، لەو گوناحو خراپانەیان دەبەخشرێن.

بیستو هەشتەم: ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە پاش هاتنی نیشانە گەورەکانی قیامەت، ئیمانی مرۆڤ دەوری نابێ، یانی: دوای ئەوەی کە نیشانە گەورەکان دەردەکەون، ئینسان ئیمانیش بێنێ، بێسوودە، کە یەکێك لە نیشانە گەورەکان: هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، وە یەکی دیکە هاتنی یەئجووجو مەئجووجە... هتد.

بیستو نۆیەم: ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییە كە ئیسلام مایەی یەك ڕیزیی‌و تەبایی موسوڵمانانە، بۆیە پەرتەوازەیی موسوڵمانان، هۆكاری دەرچوونیانە لە بازنەی ئیسلام، هەڵبەتە پەرتەوازەییەك كە سەربكێشێ بۆ خەلەلی عەقیدەیی گەورە لە بازنەی ئیسلام بەرەدەر.

سی یەم: خستنەڕووی ئەو ڕاستییە كە مرۆڤەكان جێنشینی خوان لەسەر زەوی، وە خوا بەهۆی ئەوەوە كە پێیداون، وە بەرزیی‌و نزمیی تێدا كردوە، خستوونیەتە تاقیكردنەوە.

دیارە بۆیەش ئاماژەم بەم ئایەتانە نەكرد، كە دەلالەت لەسەر ئەو ناوونیشانانە دەكەن، چونكە دوایی بە درێژیی باسیان دەكەین، بەڵام بەڕاستیی من بۆ دابەشكردنی ئەم سوورەتە بەسەر چەند دەرسێكدا، چەند ڕۆژێك تێوەڕامانم كرد، زۆر وردبوومەوە: سبحان اللّه، ئەم سوورەتی (الأنعام)ە، وەك دەریایەك وایە، كە شەپۆل لە دوای شەپۆل دێ، وە زۆر لە سوورەتە مەدینەییەكان ئاسانە دابەشیان بكەی بۆ چەند بڕگەیەك‌و، هەر بڕگەی بۆ چەند دەرسێك، بەڵام سوورەتی (الأنعام) زۆر بەزەحمەتە، چونكە وەك چۆن دەریا شەپۆل لە دوای شەپۆل دێ، ئاوایە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بەیەك جار هاتۆتە خوار، وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە بابەتی عەقیدەو ئیمان پلە پلەیی تێدا نیە، بە پێچەوانەی بەرنامەكانی ژیانەوە، بۆیەش یاساكانی شەریعەت پلە پلەییان تێدایە، خوای پەروەردگار لە ساڵی دووەمی كۆچیدا ڕۆژووگرتنی فەرز كردوە، بەڵام دوای ساڵێكی دیكە یان زیاتر، زەكات، ئنجا دوایی حەج، بەڵام ئیمان‌و عەقیدە بەیەك جار هاتۆتە خوار، چونكە ئەوە حەقیقەتێكە ئینسان بە عەقڵ‌و دڵی وەریدەگرێ .

شایانی باسیشە:

من جوگرافیای ئەو (١٦٥) ئایەتەم دابەش كردوە بۆ نۆزدە (١٩) دەرس، جگە لەم دەرسی یەكەمە كە پێشەكیی بوو، بەم جۆرە :

دەرسی یەكەم: لە ئایەتی: (١ تا ١٠).

دەرسی دووەم: لە ئایەتی: (١١ تا ٢١).

دەرسی سێیەم: لە ئایەتی: (٢٢ تا ٣٢).

دەرسی چوارەم: لە ئایەتی: (٣٣ تا ٣٩).

دەرسی پێنجەم: لە ئایەتی: (٤٠ تا ٤٩).

دەرسی شەشەم: لە ئایەتی: (٥٠ تا ٥٨).

دەرسی حەوتەم: لە ئایەتی: (٥٩ تا ٦٧).

دەرسی هەشتەم: لە ئایەتی: (٦٨ تا ٧٣).

دەرسی نۆیەم: لە ئایەتی: (٧٤ تا ٩٠).

دەرسی دەیەم: لە ئایەتی: (٩١ تا ٩٤).

دەرسی یازدەیەم: لە ئایەتی: (٩٥ تا ١٠٥).

دەرسی دوازدەیەم: لە ئایەتی: (١٠٦ تا ١١٧).

دەرسی سێزدەیەم: لە ئایەتی: (١١٨ تا ١٢٧).

دەرسی چواردەیەم: لە ئایەتی: (١٢٨ تا ١٣٥).

دەرسی پازدەیەم: لە ئایەتی: (١٣٦ تا ١٤٤).

دەرسی شازدەیەم: لە ئایەتی: (١٤٥ تا ١٥٠).

دەرسی حەڤدەیەم: لە ئایەتی: (١٥١ تا ١٥٣).

دەرسی هەژدەیەم: لە ئایەتی: (١٥٤ تا ١٦٠).

دەرسی نۆزدەیەم: لە ئایەتی: (١٦١ تا ١٦٥).

لە كۆتایی پێناسەمان دا بۆ سووڕەتی (الأنعام)، ئەم چەند دەقە دێنین:

١/ {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِذَا سَرَّكَ أَنْ تَعْلَمَ جَهْلَ الْعَرَبِ فَاقْرَأْ مَا فَوْقَ الثَّلاثِينَ وَمِائَةٍ فِي سُورَةِ الأَنْعَامِ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهَۢا بِغَيْرِ

عِلۡمٍ ﴾ إلَى قَوْلِهِ ﴿ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴾}[(١)]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: ئەگەر پێت خۆشە نەزانیی عەرەبەکان بزانی، ئەوە ئایەتی (١٣٠) بە پشتەوە لە سوورەتی (الأنعام) بخوێنەوە: ﴿ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍ ﴾ هەتا ﴿ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴾.

٢/ (فخرالدین الرازي) گوتوویەتی: {قَالَ الأصوليّون: هَذِهِ السّورَة اخْتَصت بنَوعَين مِنَ الفَضِيلَة، أَحَدهُمَا: أَنَّهَا نَزَلَت دَفْعَةً وَاحِدَةً، وَالثانِي: أَنَّهَا شيَّعها سَبْعُونَ أَلْفاً مِنَ المَلائِكَةِ، والسَّبَبِ فِيهِ أَنَّهَا مشتَمَلَة عَلى دلائِل التوحِيد، وَالعَدْلِ، والنبوَّة، والمَعَاد، وَإِبْطَال مَذَاهِب المبطلِين والملحِدين، وَذَلِكَ يَدلّ عَلَى أَنّ عِلم الأُصُول فِي غَايَة الجَلالَة والرِّفعَة، وَأَيْضَاً فَإِنْزَال مَا يَدل على الأَحْكَام قَدْ تَكُون المَصْلَحَة أَن ينزله الله تَعَالى على قدر حاجَتهم، وَبِحسب الحَوَادِث والنَوَازِل، وَأَمَّا مَا يَدل عَلَى عِلم الأصُول، فقَد أَنْزَلَهُ الله تَعَالى جُمْلَةً وَاحِدَةً، وَذَلِكَ يَدل عَلَى أن تعلُّمَ علم الأصُول وَاجِبٌ عَلَى الفَور لا عَلَى التَّرَاخِي}[(٢)]، واتە: زانایانی بنچینەکانی دین، گوتوویانە: ئەم سوورەتە دوو جۆرە چاکیی هەن، کە تایبەتن بەخۆیەوە:

یەکەمیان: ئەوەیە کە هەمووی بە یەك جار دابەزیوە.

دووەمیشیان: ئەوەیە کە (٧٠) هەزار لە فریشتەکان بەرێیان کردووە لەگەڵی هاتوون.

هۆی ئەوەش کە ئەم سوورەتە ئەم دوو فەزڵەی هەیە، ئەوەیە: کە بەڵگەکانی خوا بەیەکگرتنی تێدان، وە باسی دادگەریی خواو، باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحی، وە باسی ڕۆژی دوایی و، باسی پووچەڵکردنەوەی بیروبۆچوونی ئەوانە کە بێبڕوان، وە

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٢٤).
٢) التفسير الكبير للفخرالدين الرازي، ج١٢، ص١٢٢، ١٢٣.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە زانیاریی بنچینەکانی دین (واتە: عەقیدە)، لەوپەڕی بەرزییو لەوپەڕی گرنگیی دایە، وە ئەوەش دەگەیەنێ کە یاسا شەرعییەکان جاری وایە بەرژەوەندیی لەوەدا دەبێ کە خوای بەرز بەپێی پێداویستی، وە بەپێی ڕووداوەکانو بەپێی پێشهاتەکان ئەو ئایەتانەی کە بنچینە شەرعییەکانیان تێدانو، یاسا شەرعیەکانیان تێدان، دایان بەزێنێ، بەلاّم ئەو ئایەتانەی کە ئیمانو عەقیدەیان لێ وەردەگیرێن، خوای بەرز بەیەکجار دایبەزاندوون، وە ئەوەش دەگەیەنێ کە فێربوونی زانیاری بنچینەکانی دین (مەبەست پێی ئیمانو عەقیدەیە) دەستبەجێ پێویستە، نەك بەکاوەخۆ، (مەبەست ئەوەیە حوکمە شەرعییەکان بۆ وێنە: نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەجو جەنگو جیهاد، هەر کات لەسەرت پێویست بوون، دەبێ حوکمە شەرعییەکانیان بزانی، بەلاّم ئیمانو عەقیدە پێویستە هەولّبدەی دەستبەجێ هەرچی لەبارەی ئیمانو عەقیدەوە هاتوە، بیزانێ، نەك بە پلەپلەیی).

٣/ (مُحَمَّد الطَاهِر بن عَاشور) دەربارەی سوورەتی (الأنعام) دەلّێ: (هِيَ أَجْمَع سُور القُرْآن لأَحْوَال العَرَبِ فِي الجَاهِلية، وَأَشَدُّها مقارعة في الجدَال والإحتِجَاج عَلَى سَفَاهَةِ أَحْوَالهِم)[1]، واتە: ئەم سوورەتە کۆکەرەوەترین سوورەتەکانی قورئانە، بۆ حالّو بالّی نەفامەکان لە سەردەمی نەفامییدا، (بە تایبەت لە ڕووی عەقیدەیانەوەو لەڕووی هەلّسوکەوتیانەوە) ، وە بە توندترین شێوەش وتووێژ دەکات، وە بەلگە لەسەر نەفامییو لەسەر بێ ئاگاییان دێنێتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) التحرير والتنوير، ج٧، ص١٢٥.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەماندا، دە (١٠) ئایەتی یەکەمی سوورەتی (الأنعام) دەتوێژینەوە، لە ئایەتی (١ تا ١٠)، کە خوای بەرزو مەزن بە ستایشکردنەوە خۆی دەناسێنێ، ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾. وە خۆی بە بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەویو پەیداکەری تاریکییەکانو ڕووناکیی دەناسێنێ، وە دوایی ئاماژە بە هەڵوێستی لادەرانەی بێبڕوایان دەکات.

پاشان باسی ئەو ڕاستییە دەکات، کە ئێمەی مرۆڤی لە قوڕ دروست کردوە، وە کاتی دیارییکراویشی بۆ کۆتایی پێهێنانی ژیانمان، چ وەك تاك تاکمان، چ وەك کۆمەڵ، واتە: کۆی مرۆڤایەتی، دیاریی کردوە، دوایی ئەوە دەخاتە ڕوو کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەر بۆخۆی پەرستراوە، (واتە: پەرستراوی ڕاستەقینە)، وە نهێنییو ئاشکراو هەڵسوکەوتەکانمان هەمووی دەزانێ.

ئنجا خوا باسی هەڵسوکەوتی کافرەکان دەکات لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا، وە هەڕەشەیان لێدەکات لەسەر بەدرۆ دانانی هەقو گاڵتە پێکردنی، وە دوایی سەرنجی بێبڕوایان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، وە سەرەنجامی شوومی پێشینە بەدرۆزانو لادەرەکانیان دەخاتە بەرچاو، وە پاشان لە وەڵامی بیانووگرتنو داواکاریی بێجێی کافرەکاندا، کە ئەوان بیانوویان دەگرتو دەیانگوت: دەبووایە کتێبێکمان بۆبێ، نەك پێغەمبەر ﷺ، ئایەتەکان بخوێنێتەوە، وە دەبووایە کتێبێکی نوسراومان بۆبێو دەستی لێ بدەین، خواش ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر کتێبێکیشمان بۆ ناردبان کە لەسەر شتێك نووسرابایە، وە دەستیشیان لێ دابایە، دیسان دەیانگوت: ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە.

وە دوایی بەرپەرچیان دەداتەوە، لە وەڵامی ئەوەدا کە داوا دەکەن، فریشتەیان بۆ دابەزێ، وە دەفەرموێ: ئەگەر فریشتەمان دابەزاندبایە، ئەوە نەدەبووە مایەی

هیدایـەتیان، وە ســەرەنجام شایســتەی ئـەوە دەبـوون کـە خـوای پەروەردگـار، وەك میللـەتانی پێشـوو کـە موعجیزەیـەکی ئاشـکرایان بـۆ هـاتووە، ئیمانیـان پـێ نـەهێناوە، کۆتاییـان پـێ هـاتوە.

وە لـە کۆتاییـدا خـوای بـە بـەزەیی ڕوو لـە پێغـەمبەری خاتـەم ﷺ دەکات، وە دڵـی دەداتـەوە پێـی دەفـەرموێ: لـە پـێش تۆشـدا گاڵـتە بـە پێغەمبـەرانی دیکـە کـراوەو سـەرەنجامیش گـاڵتـەکەران سـەریان بە فەتـارە چووە.

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ١ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٖ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلٗاۖ وَأَجَلٞ مُّسَمًّى
عِندَهُۥۖ ثُمَّ أَنتُمۡ تَمۡتَرُونَ ٢ وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ يَعۡلَمُ سِرَّكُمۡ وَجَهۡرَكُمۡ
وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُونَ ٣ وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ
٤ فَقَدۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ فَسَوۡفَ يَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٥ أَلَمۡ
يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَا لَمۡ نُمَكِّن لَّكُمۡ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ
عَلَيۡهِم مِّدۡرَارٗا وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَنۡهَٰرَ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَنشَأۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِمۡ قَرۡنًا
ءَاخَرِينَ ٦ وَلَوۡ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ كِتَٰبٗا فِي قِرۡطَاسٖ فَلَمَسُوهُ بِأَيۡدِيهِمۡ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ
إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا
يُنظَرُونَ ٨ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ
٩ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ
بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ١٠﴾.

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشـندە، ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاسمانەکانو زەوی هێنـاوەنە دیو تاریکـییەکانو ڕووناکـیی پەیدا کـردوون، کەچـی دوای ئـەوەش ئەوانەی کە بێبڕوان، پەرستـراوانی دیکە لەگەڵ پەروەردگاریانـدا یەکسـانو بەرانبـەر دەکـەن! ﴿١﴾ (خـوا) ئـەو کەسـەیە کـە لـە قـوڕێ دروسـتی کـردوونو، پاشـان کـاتێکی دیـاریکراویی "بـۆ کۆتـایی پێهێنـانی تـاك تاکتـان" دانـاوە، وە کـاتێکی نـاوبراو (دیـارییکراو)یش لـەلای خـوێ هەیـە، (بـۆ کۆتـایی پێهـاتنی هـەمووانتان لەسـەر زەوی) کەچـی دوای ئـەوەش (ئـەی کافرەکـان!) ئێـوە لـە گومـانو دوودڵـیی دانـە! ﴿٢﴾ وە ئـەو، خوایە لە ئاسمانەکانو لە زەویدا، نهێنییو ئاشکراتان دەزانێ، وە دەزانێ چی دەکەن ﴿٣﴾ وە هـیچ نیشـانەیەك لـە نیشـانەکانی پـەروەردگاری خۆیانیـان بـۆ نایـەت، مەگـەر پشـتی تێدەکەن ﴿٤﴾ ئنجا بێگومـان ئەوان کاتێك هەقیان بۆهـات، بەدرۆیان دانا، بە مسۆگەریی لەمـەودوا هـەواڵی ئـەوەیان بـۆ دێ کـە گاڵتـەیان پـێ دەکـرد.﴿٥﴾ ئایا سـەرنجیان نـەداوە لـەپێش وانـدا چـەند سـەدەمان لـەنێو بـردوون، کـە بـە جۆرێـك لـە زەویـدا بالادەسـتمان کردبـوون، ئێوەمـان ئـاوا بالادەسـت نـەکردوە، وە بـارانی بـەخورزەممان بـۆ نـاردن، وە ڕووبارگەلــمان بــەژێر (خانووبــەرەیان)دا ڕەوان کــردن، بــەڵام ســەرەنجام بەهــۆی گوناهەکانیانـەوە، فەوتانـدمانن، وە دوای وان (خـەڵکی) سـەدەی دیکـەمان پێگەیانـد ﴿٦﴾ (دەڵــێن: کتێبــی نووســراومان بــۆ بێنــە) وە ئەگــەر (گریمــان) بەرنامەیــەکمان بــە نووســـراوی دابەزاندبایــە ســەرتو دەستیشــیان لــێدابایە، دیســان ئەوانــەی بێبــڕوان دەیــانگوت: ئــەوە جادووییــەکی ئاشــکرایە ﴿٧﴾ وە گوتیــان: دەبووایــە فریشــتەی دابەزیبایەسـەر! ئنجـا ئەگـەر فریشـتەمان دابەزاندبایـە (وە ئیمانیـان پـێ نەهێنابایـە) کاریان تەواو دەبوو و چاوەڕوانییشیان نـەدەکرا ﴿٨﴾ وە ئەگـەر ڕەوانـەکراومان گێڕابایـە بە فریشـتە، دەمانکردە پیـاو، لەو حاڵەتەشدا ئەو تێکەڵکردنو سەر لێتێکـدانەی ئێسـتا دەیکەن، ئێمەش دەمانکرد (واتە: ئەگەر ئێسـتا هۆکاری بـڕوا نـەهێنانیان بـە پێغەمبـەر ئەوەیـە کـە مرۆڤێکـی پیـاوە، خـۆ ئەگـەر فریشـتەش بووایـە هـەر دەبـوو لەسـەر شـێوەی

پیاوێك بووایە، ئەگەرنا نەیانـدەبینیو، لەو حاڵەشدا هەمان ئیشکالیان بۆ دروست دەبوو) ﴿٩﴾ وە بێگومان لەپێش تۆدا "ئەی موحەممەد!" گاڵتە بە پێغەمبەران کرا، بەڵام سەرەنجام ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، دەوری ئەوانەیانی دا، کە گاڵتەیان پێدەکرد ﴿١٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ): (الحَمْدُ: الثَّنَاءُ بالفَضِيلَة، وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ المَدْحِ، وَأَعَمُّ مِنَ الشُّكْر)، (الحَمْدُ) بریتیە لە مەدحکردنی کەسێك بەو سیفەتە باشانەی کە تێیدان، بەڵام (حَمْد) تایبەتترە لە (مَدْح)، وە گشتی تریشە لە (شُكر)، چونکە مەدح پەیوەندیی تەنیا بە کەسێکەوە نیە کە بە ویستی خۆی چاکەیەك بکات، یان سیفەتێکی باشی هەبێ، بەڵکو دەگونجێ مەدحی شتێکی مادديی بێ ژیانیش بکەین، بەڵام (حَمْد) تەنیا بەرانبەر بە زاتێك دەگوترێ، کە بە ئیختیاری خۆی چاکە بکات، یاخود کە سیفەتی باشی تێدان، بۆیە دەڵێ: (وَأَعَمُّ مِنَ الشُّكْر)، چونکە شوکر تەنیا لە بەرانبەر نیعمەت دایە، لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتێکدا شوکر دەکرێ، بەڵام (حَمْد) مەرج نیە، ئەو کەسەی کە تۆ ستایشی دەکەی بەهۆی چاکەیەکەوە بێ، کە لەوەوە بە تۆ گەیشتبێ.

(خَلَقَ ): (الخَلْقُ: أَصْلُهُ التَّقْدِيرُ المُسْتَقِيمُ وَيُسْتَعْمَلُ فِي إِبْدَاعِ الشَّيءِ مِنْ غَيْرِ أَصْلٍ وَلا احْتِذَاءٍ)، (خَلْق) بریتیە لە ئەندازەگیرییەکی ڕاست، وە بەکاریش دەهێنرێ لە بەدیهێنانی شتێکدا، بێئەوەی ئەو شتە ئەسڵێکی بووبێ، یاخود چاولێکەریی تێدا کرابێ، یانی: خوا ﷻ ئەو زەویو ئاسمانانەی دروست کردوونو لە نەبوون هێناونیە دی.

( وَجَعَلَ): (جَعَل: لَفْظٌ عَامٌّ فِي الأَفْعَالِ كُلِّهَا) وشەیەکی گشتیە، هەم بۆ پەیداکردنی شتێك، وە هەم بۆ گۆڕینی لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك، وشەی (جَعل) بۆ هەموو ئەو

حاڵەتانە بەكاردێ: (صَارَ، أَوْجَد، أَوْجَد شَيئاً مِن شَيء، صيّر شَيئاً إِلى حَالَة دُونَ أُخْرَى، الحُكْمُ بشَيء عَلَى شَيءٍ)، واتە: بوو، پەیدای كرد، شتێكی لە شتێك پەیداكرد، شتێكی لە حاڵێكەوە بۆ یەكی دیكە گۆڕی، حوكمێكی بە شتێك بەسەر شتێك دا دا.

(يَعْدِلُونَ ): وشەی (يَعْدِلُون) دوو واتای هەن، (عَدَلَ) بە مانای (سَوَّى) دێ، واتە: یەكسانی كرد (أَي: يَجْعَلُون لَهُ عَدِيلاً) یانی: هاوتای بۆ دادەنێن، یاخود (عَدَل) بە مانای (جار و انحرف) ستەمی كردو لایدا، دێ، ئەو كاتە (يعدلون) بە مانای (يَنْحَرِفُون) واتە: لادەدەن، دێ.

(أَجَلًا): (الأَجَلْ: المُدّة المَضْرُوبَة للشَّيء، وَأَصْلُهُ استِيفاء الأَجل، أَي: مُدّة الحيَاة)، (أَجَل) بریتیە لە كاتێكی دیارییكراو بۆ شتێك، وە لە ئەسڵدا لەوەوە هاتوە، كە ئەو كەسە یاخود ئەو شتە، ماوەی ژیانەكەی خۆی تەواو دەكات، دەڵێ: فلان كەس ئەجەلی هاتوە، واتە: ماوەی ژیانەكەی تەواو بووەو كۆتایی هاتوە.

(تَمْتَرُونَ ): واتە: دەكەونە گومانەوە، دەڵێ (المِرْيَةُ: التَرَدُّد فِي الأَمْرِ وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الشَّكِ، والمُمَارَاة: المُحَاجَّةُ فِيمَا فِيهِ مِريَة)، (تَمْتَرون) لە (مِريَة)وە هاتوە، بریتیە لە دوو دڵیی لە شتێكدا كە تایبەتترە لە گومان، بەڵام (مُماراة) بریتیە لە موناقەشەكردن لە شتێكدا كە گومانی تێدایە.

(قَرْنٍ ): واتە: سەدە، ئێستا كە دەڵێین: (قَرْن) واتە: سەد ساڵ، بەڵام مەرج نیە هەر سەد ساڵ بێ، (القَرْنُ: القَوْم المُقْتَرِنون في زَمَن وَاحِد وَجَمْعُهُ قُرُون) (قَرْن) بریتیە لە خەڵكێك كە لە ماوەیەكی دیارییكراودا پێكەوە دەژین، جا هەندێكیان گوتوویانە: قەرن سەد ساڵە، هەندێك گوتوویانە: حەفتا ساڵە، هەندێكیشیان بە كەمتر یاخود زیاتریان داناوە.

(مَكَّنَّهُمْ ): واتە: باڵادەستمان كردبوون، دەست ڕۆیشتوومان كردبوون، توانامان پێدابوون، چونكە دەڵێ: (مَكَّنَ لَهُ فِي الشيء: جَعَلَ لَهُ عَلَيْهِ سُلْطَانًا) واتە:

دەستەڵاتی پێدا بەسەر ئەو شتەدا، (مَكَّنَ فُلاناً مِنَ الشيء: أمكنه منه، وتمكّن: علا شأنه)، واتە: فلان توانای بە فلانكەس دا بەسەر ئەو شتەدا، (وتمكّن) واتە: بالادەست بوو، وە دەست ڕۆیشتوو بوو.

(مِّدۡرَارٗا ): واتە: بە خوڕزەم، دەڵێ لە ئەسڵدا لە (دِرّ)ەوە هاتوە، (الدِرَّةُ: كَثْرَةَ اللَّبن وَسَيْلانُهُ وَالجَمْع دِرَرٌ، وَسَمَاء مِدْرارٌ: تَدُرُّ بالمَطَر) ئاژەڵێك شیری زۆر تێدابێ، مانگایە، مەڕە، بزنە، حوشترە، شیری زۆری تێدابێ، دەگوترێ: شیرەكەی زۆر دێ، (سَمَاء مِدْرارٌ) ئاسمانێك كە بارانەكەی بە خوڕزەم ببارێ‌و هەڵڕێژێ.

(قِرۡطَاسٖ ): دەڵێ: (القِرْطَاسُ: مَا يُكتَبُ فيهِ)، ئێستاش دەڵێین (قِرْطَاسِية) كە لێرەدا دیارە بە كاغەز دەگوترێ، بەڵام لە قورئاندا (قِرْطَاس) هەر شتێكە لەسەری بنووسرێ، پێست بێ، بەردی تەنك بێ، گەڵای درەخت بێ، كاغەز بێ، چەرم بێ، هەرچی بێ.

(وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم ): واتە: لێمان تێكەڵ دەكردن، دەگوترێ: (لَبِسَ الثَّوْب يَلْبَسُه لُبْساً، وَلَبَسَ عَلَيْهِ يَلْبِسُ لَبْساً: خَلَطَ، وَفِي الأَمْرِ لُبْسَةٌ: أي شبهة وَلَيْسَ بوَاضِح) واتە: بەرگەكەی پۆشی، دەیپۆشێ بەپۆشین، بەڵام (لَبَسَ عَلَيْهِ يَلْبِسُ لَبْساً) ئەو شتەی لێ تێكەڵ كرد، (وَفِي الأَمْرِ لُبْسَةٌ) واتە: ئەو شتە (لَبْس)ی تێدایە، واتە: شوبهەی تێدایە، یاخود ڕۆشن نیە.

(فَحَاقَ): واتە: دابەزی، دەوری دا، خوا ﷻ فەرموویەتی ﴿ولا يحيق المكْر السَّيء إلاَّ بأَهْلِهِ﴾، أَي لا ينزِلُ ولا يصيب﴾ هەندێك گوتوویانە: (حَاق) واتە: دابەزی، وە هەندێك گوتوویانە: واتە: دەوری دا.

(سَخِرُواْ ): واتە: گاڵتەیان پێكرد، لە عەرەبیدا دەگوترێ: (سَخِرَ مِنْهُ، سَخِرَ بِهِ) هەردووكیان بە مانای گاڵتەی پێكرد، دێ، ئنجا (سَخِرَ بِهِ سَخْراً، وسُخْراً وَسُخْرِيةً: هَزِيءَ بِهِ) هەموویان بە مانای گاڵتە پێكردن، دێن.

(يَسۡتَهۡزِءُونَ ): (الهُـزْءُ: مَـزْحٌ فِـي خِفْيَـةٍ) واتـه: (هُـزْءْ) يـان (هُـزواً) بـه مانـای گاڵـتەپێکردنێکی پەنهانـه، لـه زمـانی عەرەبیـدا دەگـوترێ: (هَزِئـتُ بـهِ وَاسْـتَهْزَأْتُ، والإسـتهزاء: ارتيـاد الهُـزء، وإن كـان قد يُعَبَّـر بـهِ عـن تعـاطي الـهُزءِ)، واتـه: گاڵـتەم پێکـرد، بە شـێوەیەکی پەنهـان.

## مانـای گـشـتی ئایەتەکـــان

خوای بە بەزەیی بە (بسم الله الـرحمن الـرحيم) واتـه: (بـه نـاوی خـوای بـه بـەزەیی بەخشـندە) دەست پێدەکات، وەك جـاری دیکـەش گوتوومانـه: کـه ئینسـان دەڵـێ: (بسم الله الـرحمن الـرحيم) دەبێ سێ شـتان له دڵو مێشـکی خۆی ئامادە بکات:

یەکەم: بە ناوی خوای بە بەزەییو بەخشـندە ئەو کارە دەکـەمو بۆ خـوای دەکـەم.

دووەم: ئەم کـارە بەپێـی شـەریعەتی خوا دەکـەم.

سـێیەم: ئەم کارە دەکەم بە شـانو شـەوکەتی خۆم نـا، بەڵـکو بـه یارمـەتی خـواو بـه ئاسانکاریی خـوا، هـەر سێ واتایەکـه دەبێ لە دڵـدا ئامادە بـن، چـونکه پێچـەوانەی هەر کـام لەو سـێیانە، لادانە:

١- کارەکـەت بۆ خوا نەبـێ، شـیـرکە.

٢- کارەکـەت بەپێی شـەرعی خـوا نەبـێ، ئینحـڕافو بیدعـەتە.

٣- کارەکـەت پاڵـبدەیە لای خـۆت، ئـەوە عوجبـەو بـە خـۆ سەرسـامـبوونە، وە نەگێڕانەوەی فـەزڵە بۆ خـاوەنی فەزڵ.

دیارە ئەم (١٠) دە ئایەتـه لـه سـووڕەتی (الأنعـام)دا، وەك پێشـەکی وان، وە لـه هـەموو سـووڕەتەکانی قورئـان دا خـوای پـەروەردگار چـەند ئایـەتێك وەك پێشـەکیی دێنـێ، هـەروەك چۆن چـەند ئایەتێکیش هـەن، وەك کۆتـایی، لێرەدا خـوا بەوە دەست پێدەکات، دەفـەرموێ:﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ

﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾، ستایش بۆ خوایەك كە ئاسمانەكانو زەوی هێناونە دی، وە تاریكییەكانو ڕووناكیی گێڕاون، ئنجا دوای ئەوەش، ئەوانەی بێبڕوان، شتانی دیكە لەگەڵ پەروەردگاریاندا یەكسان دەكەن، ﴿ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾، واتە: دوای ئەوەش كە خوا بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوییە، وە هەرچی حاڵەتەكانی كە لە ئاسمانەكانو زەوی دا هەن، كە تاریكیی‌و ڕووناكیی، لە هەموو حاڵەتەكانیان گشتی ترن، هەموویان خوای پەروەردگار پەیدایكردوون، كەچی دوای ئەوەش ئەوانەی بێبڕوان، هەندێك لە دروستكراوەكانی خوا لەگەڵ پەروەردگاریاندا یەكسان دەكەن، ئەوە واتایەكی، یاخود ﴿ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾، واتە: لادەدەن لە پەروەردگاریان، ئەوەی یەكەمیان واتە: جگە لە خوا لەگەڵ خوادا یەكسان دەكەن لە پەرستراندا، وە ئەوەی دووەمیان واتە: لادەدەن لە پەرستنی خوا، بۆ پەرستنی جگە لە خوای بێ هاوتا، كە دیارە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا، زیاتر تیشك دەخەینە سەر مەسەلەی ستایش كردن بۆ خوا، كە لێرەدا خوا بۆچی وا دەست پێدەكات؟ بۆچی یەكسەر دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، ستایش بۆ خوایە؟! وە دوایی ڕوونی دەكەینەوە، دەفەرموێ: خوا كە ئاسمانەكانو زەوی دروست كردوون، مەبەست پێی چییە؟

ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی بوونەوەری فراوانی كرد، باسی ئاسمانەكانو زەوی كرد، ئنجا دێتە سەر باسی بوونەوەری گچكە، كە ئینسانە، چونكە ئینسانیش بوونەوەرێكی بچووكە، دەفەرموێ ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴾، خوا ئەو كەسەیە كە ئێوەی لە قووڕ دروستكردوە، ئایا ئێمە لە قووڕ دروست بووین؟ دوایی ڕوونی دەكەمەوە، ئەوە چۆنە؟ بە تەئكید ئادەم عليه السلام باپیرە گەورەی بەشەر لە قووڕ دروست بووە، ئەوە دیارە، بەڵام ئەدی بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێوەمان لە قووڕ دروست كردوە؟ ئایا مەبەست پێی ئەوەیە كە مادام باپیرە گەورەتان كە ئادەمە عليه السلام لە قووڕ دروست بووەو، ئێوەش لە ئادەم وەپاش

كەوتوون، كەواتە: هەمووتانی لە قوور دروست كردوە؟ یاخود مەبەست پێی ئەوەیە: كە وەك چۆن جەستەی ئادەم ﷺ لە قوور دروست بووە، جەستەی ئێوەش پێكهاتەكانی هەر دەچنەوە بۆ قوری زەوی؟ چونكە قور (طین) چیە؟ (گڵ + ئاو = قور) هەموو پێكهاتەكانی جەستەی ئینسانیش دەگەڕێنەوە بۆ ئاوو، بۆ خاك ﴿ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا﴾، دوایی خوا كاتێكی دیاری كرد، واتە: بۆ ئەو بوونە، بۆ ئاسمانەكانو زەوی، كاتێكی دیاریكردوە ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ﴾، وە كاتێكی دیاریكراویش لەلای خۆیەتی، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ، كە: خوای كاربەجێ بۆ مردنی هەر كامێكتان كاتێكی دیاری كردوە، وە كاتێكی دیاریكراوو ناوبراو لەلای خوا هەیە بۆ كۆتایی پێهێنانی ژیانی هەمووتان لەم سەر زەوییە، وە لە ڕاستییدا دووەمیان: زیاتر دەچێتە عەقڵەوە، بە بۆچوونی من، ئەگەرنا ئەوی دیكەش هەندێك لە زانایان گوتوویانە: واتە: خوا كاتێكی دیاری كردوە بۆ هەمووتان، بۆ وێنە: ئەو ئینسانە ئەگەر هیچ نەساغ نەبێو كەس نەیكوژێو شتێكی بەسەرنەیەت، حەفتا ساڵ هەشتا ساڵ، نەوەد ساڵ دەژیی، بەڵام كاتێكی دیاریكراو لەلای خوا هەیە، خوا دەزانێ كە ئەو ئینسانە، تەمەنە سروشتییەكەی خۆی تەواو ناكاتو بە بیست ساڵیی، یان بە سی ساڵیی بە ڕووداوی سەیارە دەمرێ، تووشی نەخۆشییەكی تایبەت دەبێ، تەمەنی كۆتایی پێدێ، بەڵام ئەوی دیكەیان زیاتر دەچێتە عەقڵەوەو ئەوم پێ ڕاسترە، كە مەبەست لە ئەجەلی یەكەم، واتە: كاتی دیاریكراو بۆ مردنی هەر كامێكمان، وە مەبەست لە كاتی ناوبراو (أجل مُسَمًّى) كاتی كۆتایی پێهاتنی ئەم بوونەوەرەیە، كە لە نێویدا دەژین، ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ﴾، دوایی لەگەڵ ئەوەشدا كە خوای پەروەردگار سەرەتاو كۆتایی هەمووتانی دیاری كردووەو بەدەستە، ئنجا ئێوە دەكەونە گومانیشەوە، ئەی بێبڕوایەكان؟!

دیارە لێرەدا ڕووی دواندن لە بێبڕوایانە، نەك لە ئیمانداران، چونكە ئیمانداران ناكەونە گومانەوە، ئێمە دەزانینو دڵنیاین كە خوا بەدیهێنەری ئێمەیە، وە ژیانو نەمانو بوونمان بە دەست خوای پەروەردگارە، لەو كاتەوە كە دەیەوێ، دەبین، وە لەو كاتەدا كە خوا دەیەوێ، كۆتاییمان پێ دێ، كەواتە: لێرەدا ڕووی دواندن لە بێبڕوایەكانە.

ئنجا دیسان خوا بە شتێکی دیکە خۆی دەناسێنێو دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلْأَرْضِ ﴾، وە ئەو، خوایە لە ئاسمانەکانو لە زەویدا، لێرەدا مەبەست چییە؟ واتە: هەر ئەو خوایە بێ هاوتایەیە کە شایستەی پەرسترانە، یاخود: هەر ئەو خوایە کە کارهەڵسوڕێنەری ئەو بوونەوەرەیە لە ئاسمانەکانو لە زەویدا، تەنیا ئەو شایستەی پەرسترانە. چونکە کافرەکان دەیانگوت: بەڵێ، لە ئاسمانەکان دا هەر خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوە، بەڵام لەسەر زەوی غەیری خوایان دەهێنایە ریزی خوا ﷻ، دەیانگوت: ئەوانیش بۆیان هەیە، حەڵاڵو حەرام دابنێن، ئەمرو نەهییان بەسەردا بکەن، بەبێ گەڕانەوە بۆ لای خوا ! بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: هەر ئەو خوایە لە ئاسمانەکانو لە زەویدا ﴿ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴾، پەنهانتانو ئاشکراتان دەزانێ، وە دەزانێ چی دەکەن، هەر خوا دەزانێ پەنهانتان چییەو ئاشکراتان چییە؟ وە دەشزانێ چ کردەوەیەك بەدەست دێنن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی هەڵوێستی بێبڕوایەکانو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، وە هیچ نیشانەیەك لە نیشانەکانی خوای پەروەردگاریان بۆ نایەت، مەگەر پشتی تێدەکەن.

ئایا لێرەدا مەبەست لە نیشانە چییە؟ دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان بێ، ڕستەکانی قورئان خوا ناوی لێناون ئایەت، وە دەگونجێ مەبەست پێی موعجیزەی پێغەمبەران بێ (علیهم الصلاة والسلام)، وە دەگونجێ مەبەست پێی دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی ئەو شتانە بێ کە ڕوو دەدەن، وەك لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کە مانگ لەت بوو، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ ﴾القمر، دەگونجێ مەبەست پێ هەرکامێك لەوانە بێ، دەفەرموێ: هەر کام لە نیشانەکانی پەروەردگاریان بۆبێ، حەتمەن پشتی تێدەکەن، لەجیاتی ئەوەی سەرنجی بدەن، وە بە هۆی ئەو نیشانانەوە، خاوەنی نیشانەکە، کە پەروەردگارە بیناسن، پشتی تێدەکەن!

دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَقَدْ كَذَّبُواْ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾، هەقیان بە درۆزانی، دوای ئەوەی کە بۆیان هاتبوو، هەق لێرەدا بریتیە لەم قورئانە، یان بریتیە لە پێغەمبەر ﷺ، یان بریتیە لەو ئیسلامەی کە ئەم قورئانەو ئەم پێغەمبەرە هێناویانە، ئەو هەقەیان بە درۆزانی، دوای ئەوەی کە بۆ لایان هات، ﴿ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَـٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، لە مەودوا بە تەئكید ئەوەی کە گاڵتەیان پێدەکرد، هەواڵەکەیان بۆ دێ، واتە: دەزانن کە ئەو هەقە: خوایەك، پەروەردگارێك ناردبووی، ئەو هەقە، کە قورئانە، یان پێغەمبەرە ﷺ، یان ئیسلامە، وە لێپرسینەوەش دەکات لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەقی بۆ ناردوونو پشتیان تێکردوەو بە درۆیان داناوەو گاڵتەیان پێکردوە، چونکە خوای پەروەردگار سێ شتی باس کردوون:

(إِعْرَاض، تَكْذِيب، إِسْتَهْزَاء) پشت هەڵکردن، بە درۆ دانان، گاڵتەپێکردن، پلە پلە، چونکە پشت تێکردن سووکترە لە بە درۆدانان، وە بە درۆدانان (شتێك بە درۆ دابنێیو بڵێی: ڕاست نیەو بڕوام پێ نیە)، سووکترە لەوەی گاڵتەی پێبکەی، دیارە ئەوانە وردە وردە هەر پێیان لێ هەڵێناوە، ئنجا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کوفر هەندێکی هەندێکی ڕادەکێشێو، گوناهەکان هەندێکیان هەندێکیان ڕادەکێشن.

ئنجا خوای پەنهانزان سەرنجیان بۆ مێژوو ڕادەکێشێ، خوا ﷻ لە قورئاندا زۆر جار سەرنجی بەشەر بۆ مێژوو ڕادەکێشێ، پێشێ خوای پەروەردگار سەرنجیانی بۆ دەوروبەریان ڕاکێشا، بۆ ئاسمانەکانو زەوی، ئنجا سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ مێژووی میللەتانی پێشوو، دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْاْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ ﴾، ئایا نەیانبینیوە؟! نەیانبینیوە بە چاوی سەر نا، بەڵکو چاوی عەقڵو دڵ، چونکە دیارە گەلە پێشووەکان، گەلی نووحو، گەلی هوودو، گەلی صالح، وە گەلانی پێغەمبەرانی دیکە، ناتوانین بیانبینین تێپەڕیون، کەواتە: بە چاوی عەقڵو دڵ تەماشای مێژوو بکەن، ئایا نەیانبینیوە: لە پێش واندا چەند کۆمەڵگاو چەند سەدەمان فەوتاندوون، کە ئەوان چۆن بوون؟ ﴿ مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، دەست ڕۆیشتوومان کردبوون لە زەویدا، کردبوومانن بە خاوەنی پێگەو تواناو دەسەڵات، ﴿ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ ﴾، ئیمکانییەتو توانایەکمان بە وان دابوو، بە ئێوەمان نەداوە، ئەی کافرەکانی مەککە!

لێرەدا مەبەست پێی کافرەکانی مەککەیە، نەك کافرەکانی ئێستا، چونکە ڕەنگە ئەو توانایەی هێزێکی زەبەلاحی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئێستا هەیەتی، لە مێژووی بەشەردا شتی وا نەبووبێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی کافرەکانی ئەو کاتەیە، کە قورئان لە نێویاندا دابەزیوە، دەفەرموێ: توانایەکمان دابووە کافرەکانی پێش ئێوە، کە بە ئێوەمان نەداوە، ئەی خەڵکی مەککەو دەوروبەری! کە دیارە خەڵکی مەککە توانایەکی ماددیی وایان نەبووە، بگرە تەنانەت دەوڵەتیان نەبووە ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا ﴾، وە باران و هەوری بە خورزەممان بۆ ناردبوون، هەوری پڕ لە بارانمان بۆ ناردبوون، بۆ ئەوەی وڵاتیان بۆ ئاوەدێر بکات ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَـٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ ﴾، وە ڕووباری زۆرمان بۆ گێڕابوون کە بە ژێر کۆشك و باڵەخانەکانیاندا دەڕۆیشتن، بەڵام سەرەنجام چییان لێ هات؟ ﴿ فَأَهْلَكْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ﴾، بە هۆی گوناهەکانیانەوە فەوتاندمان، واتە: لە هیچیان کەم نەبوو، ئیمکانیەتێکی زۆریان هەبوو، بەڵام بە هۆی گوناحو تاوانەکانیانەوە، فەوتاندمانو لە بەینمان بردن، ﴿ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴾، وە دوای هەر کامێك لەو کۆمەڵگایانە، کۆمەڵگایەکی دیکەمان پەیدا کرد، دوای هەر کام لەو سەدانە، سەدەیەکی دیکەمان هێنانە جێ، کەواتە: ئەی کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، وە کافرەکانی هەر ڕۆژگارێکی دیکەش! ئێوەش بترسێن لەوەی کە ئەگەر هەڵوێستی ئەو کافرە پێشووانەتان هەبێ، لە پشتتێکردن لە بەرنامەی خواو، بە درۆ دانانیو، گاڵتە پێکردنی، هەمان سەرەنجام کە بەسەر ئەوان هاتوە، بەسەر ئێوەش بێ.

ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستێکی دیکەیان، کە دیارە ئەوان پێشنیاریان کردوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئەو قورئانەیان لە کتێبێکدا، لە نووسراوێکدا بۆن بێنێ، دەستی لێبدەن، وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَـٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ ﴾، واتە: دەبێ بچی بۆ ئاسمانێ لەوێدا کتێبمان بۆ بێنی، نووسراوێك، وە بڕواشت پێ ناکەین،

كە چووی بۆ ئاسمانێ، هەتا كتێبێك نەهێنی لە پێش چاوی ئێمە بچی بۆ ئاسمانێ دوایی بێیەخوار كتێبێكیشت پێبێ، دەیانگوت دەبێ كتێبەكەش ئاوابێ: (مِنَ اللهِ رَبِّ العَالَمِينَ إِلى فلان بْنِ فلان ! إِنَّ مُحَمَّداً رَسُولِي فَآمِنوا بِهِ) لە خوای پەروەردگارەوە بۆ فلانی كوڕی فلان! موحەممەد پێغەمبەری منەو دەبێ ئیمانی پێ بێنن، دەیانگوت: ئاوا دەبێ یەك بە یەك نامەمان بۆ بێ!!

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، وە ئەگەر وەك ئەوان داوا دەكەن، ــ وەك بیانوو گرتن ــ گریمان نامەیەكیشمان لە نووسراوێكدا بۆ سەر تۆ ناردبایەو دەستیشیان لێدابایە، ئەوكاتیش ئەوانەی بێبڕوان دەیانگوت: ئەوە جادوویەكی ئاشكرایە، كەواتە: هیچ لە قەزیەكە نەدەگۆڕا، ئەگەر بەدوای بەڵگەدا دەگەڕێن، ئەوە فەرموون: قورئان، وەك قورئان تەحەددای كردوە، فەرموون قورئانێكی وا بێنن، ئەگەر نەتانتوانی، فەرموون دە سوورەتان بێنن، ئنجا ئەگەر هەر نەتانتوانی، فەرموون: یەك سوورەت بێنن، وە ئەگەر هەر نەتانتوانی، بزانن كە ئەوە قسەی پێغەمبەر ﷺ نیەو فەرمایشتی خوایە، چونكە خوا هەر لەو پیتو دەنگانەی ئێوە قسەیان پێدەكەن و شتیان پێدەنووسن، قورئانی فەرمووە، دە فەرموون ! ئەو پیتو دەنگانە لەبەردەستی ئێوەشدا هەن، چونكە سەرەتای چەند سوورەتێك لە قورئاندا بە پیتی پچڕ پچڕ دەستپێدەكات: (آلم، ص، ن، ق، آلر) یانی چی؟ یانی ئەو پیتانە لەبەردەستی ئێوەشدا هەن، دە فەرموون ! ئەگەر ڕاست دەكەن كە دەڵێن: قورئان خوا بۆ پێغەمبەری ﷺ نەناردوەو بۆخۆی دایناوە، ئەوە ئێوەش ئەو پیتانەتان لەبەردەستدان، ئەو دەنگانە لەبەردەستی ئێوەش هەن، ئێوەش قورئانێكی وابێنن، یان دە سوورەت، یان لانی كەم سوورەتێك بێنن، كەواتە: ئەگەر لە بەڵگە بگەڕێن، ئەو بەڵگە هەیە، بەڵام ئەگەر هەر لە بیانووگرتن بن، ئەگەر خوا ﷻ بیانووشتان ببڕێ، دیسان ئەوە ناكەنە بەڵگە لەسەر ئەوە كە (موحەممەد) پێغەمبەری خوایەو دەڵێن: ئەوە جادوویەكی ڕوونە.

ئنجا باسی بیانوویەكی دیكەیان دەكات، دەفەرموێ: گوتیان: دەبووایە فریشتەیەك دابەزێتە سەری، لە چەند شوێنی دیكەش لە قورئاندا لە سوورەتە مەككەییەكاندا،

خوای پەروەردگار باسی ئەو بیانووەی کافرەکان دەکات، بۆ نموونە: ﴿ قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ ﴾الإسراء، گوتیان: ئایا خوا بەشەرێکی بە پێغەمبەرو ڕەوانەکراو ناردوە، دەبوایە فریشتەیەك بێ، چونکە بەشەر ئەوەی لێ ناوەشێتەوەو، شایستەی ئەوە نیە، خوا فەرمایشتی لەگەڵ بکاتو وەحی بۆ بنێرێ، دەبێ مەلائیکەت بێ، جا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ ﴾، دەڵێن: دەبوایە فریشتەیەك دابەزێتە سەری، گوتیان: باشە قەیناکا موحەممەد ئەوە بەشەرە، بەڵام با فریشتەیەکی لەگەڵدا بێ، فریشتەکە بڵێ: ئەوە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، خواش دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِيَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴾، وە ئەگەر فریشتەمان دابەزاندبووایە کار تەواو دەبوو، دوایی چاوەڕێشیان نەدەکرا، چی تەواو دەبوو؟ واتە: یاساو سوننەتی خوا وابووە، لە مێژووی بەشەردا کە بۆ هەر کام لە میللەتان موعجیزەیەکی بەرهەستی بۆ ناردبێو ئیمانیان پێ نەهێنابێ، کۆتایی پێهێناون، وەك گەلی فیرعەون کە مووسا عليه السلام گۆچانەکەی دەستی پێشاندانو ئیمانیان پێ نەهێنا، خوا فەوتاندنی لە ئاوێدا.

وە گەلی عاد کە خوای بەرز هود عليه السلامی نارد بۆ لایان ئیمانیان پێ نەهێنا، دیارە موعجیزەی هەبووە، بەڵام خوا باسی موعجیزەکەی نەکردوە.

وە گەلی ثەموود خوا جل جلاله پێغەمبەر صالح عليه السلامی نارد بۆ لایان موعجیزەیەکی دایە، کە بریتی بوو لە حوشترێك، کە لە شاخێك، لە بەردێکی گەورە هاتە دەرێ، حوشترێکی زیندوو کە بایی هەموو خەڵکی شارەکە شیری تێدابوو، بەڵام ئیمانیان پێ نەهێناو حوشترەکەیان سەربڕی، خوای باڵادەستیش فەوتاندنی... هتد.

کەواتە: ئێوەش ئەگەر موعجیزەیەکی واتان بۆ هاتبا، وە فریشتەیەك دابەزیبایە، کۆتاییتان پێ دەهات، ئەمە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئێوە ناتوانن فریشتە ببینن، وە ئەگەر فریشتە لەسەر شێوەی خۆی هاتبایە بەرچاوتان، لە بەین دەچوونو تەحەمولی دیتنیتان نەدەکرد.

دوایـــی دەفـــەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَاهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴾، وە ئەگەر پێغەمبەرمان گێڕابا بە فریشتە، واتە: لەجیاتی بەشەرێك فریشتەیەكمان كردبا بە پێغەمبەر، دەبوو بردبامانە سەر شێوەی پیاوێك، بۆچی؟ چونكە لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی ناتوانن فریشتە ببینن‌و، هەر دەبوو چووبایە سەر شێوەی پیاوێك ﴿وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴾، وە دیسان لێمان تێكەڵ دەكردن، ئەوەی لە خۆیان تێكەڵ كردوە، واتە: ئەو كاتە ئەگەر فریشتەیەك بووایە چووبایە سەر شێوەی پیاوێك‌و گووتبای: من فریشتەم، دەیانگوت: نەخێر، تۆ فریشتە نی، ئەوە نیە لەسەر شێوەی پیاوی، ئنجا ئەگەر هەر گوتبای: فریشتەم بەڵام چوومەتە سەر شێوەی پیاو، بۆئەوەی بمبینن، دەیانگوت: نەخێر، ڕاست ناكەی، وە دیسان لێیان تێكەڵ دەبوو، ئەوەی كە ئێستا لە خۆیانی تێكەڵ دەكەن.

لە كۆتایی دا وەك دڵدانەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ ﴿ وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾، وە بە دڵنیاییی لەپێش تۆدا گاڵتە كراوە بە پێغەمبەران‌و پێغەمبەرانی زۆر گاڵتەیان پێكراوە ﴿ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾، وە سەرەنجام ئەوەی كە گاڵتەیان پێ دەكرد، ئەوانە گاڵتەیان دەكرد ئەو سزایە دابەزیە سەریان، وە لە بەینی بردن.

كەواتە: تۆش ئەی موحەممەد ﷺ! كە سەروەری پێغەمبەرانی‌و كۆتایی هەموویانی، تۆش ڕیزپەڕنی لەو یاساو بنچینەیەی كە گاڵتەت پێدەكرێ، بەڵكو لەپێش تۆدا پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) گاڵتەیان پێكراوە، بەڵام خوای كاربەجێ سزای ئەو گاڵتە پێكەرانەی داوە، واتە: ئەو گەلەی تۆش خوای دادگەر نایەڵێ ئاوا وەك بەرزەكی بانان بۆی دەربچن، بەڵكو سەرەنجام تووشی سزا دەبن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾، ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاسمانەکانو زەوی دروستکردوون، وە تاریکاییەکانو ڕووناکیی گێڕاون، دوایی ئەوانەی کە بێبڕوان لە پەروەردگاریان لادەدەن، یاخود جگە لە پەروەردگاریان یەکسانو بەرانبەر دەکەن لەگەڵ پەرستراوان دا لە پەرستندا.

پێویستە بزانرێ کە پێنج سوورەت لە قورئاندا بە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾، دەستیان پێکردوە:

یەکەم: سوورەتی (الفاتحة)یە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾﴾.

دووەم: سوورەتی (الأنعام)ە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾﴾.

سێیەم: سوورەتی (الكهف)ە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾﴾.

چوارەم: سوورەتی (سبأ)ە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾﴾.

پێنجەم: سوورەتی (فاطر)ە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾.

ئنجا ئایا ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا ﷻ کە بۆخۆی ستایشی خۆی دەکات، دیارە خوا بۆخۆی لە هەموو کەس چاکتر دەزانێ دەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ خوادا بکرێ، خوا دەیەوێ ئێمە فێر بکاتو کە دەفەرموێ:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، واتە: خوا ستایش بۆ کراوە، وە مەدحو سەنا هەڵدەگرێو، دەبێ مەدح بکرێو پەسند بکرێو ستایش بکرێ لەلایەن ئینسانەوە، لەلایەن جینەوە، لەلایەن فریشتەوە، لەلایەن هەموو دروستکراوەکانەوە.

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ خۆی بە دوو سیفەت دەناسێنێ: بە (خَلْقُ)و بە (جَعْل) ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾، ﴿ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ﴾، ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناون، وە تاریکاییو ڕووناکیی تێدا گێڕاون، کەواتە: ئەم بوونە، خاوەنەکەیو بەدیهێنەرەکەی، خوایە، وە هەرچی تەصەڕڕوفاتی تێشیدا دەکرێ، کە وەك گوتم: دیارترین شت لە حاڵەتو گۆڕانکارییەکان لە بوونەوەردا، بریتییە لە تاریکیی و ڕووناکیی، کە دوو حاڵەتی زۆر گشتیین، ئەوەش دیسان، ئەو تەصەڕووفەش تەنیا خوای پەروەردگار دەیکات.

## سێ بابەتی گرنگ :

### ١) حیکمەتی ڕستەی (ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ):

بۆچی خوا نەیفەرمووە: (أَحْمَدُ الله)، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾؟!

وەڵام: چونکە (أَحْمَدُ الله)، واتە: من ستایشی خوا دەکەم، بەڵام ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، واتە: خوا شایستەی ستایشکردنە، ئنجا چ خوا ستایشی خۆی بکات، چ فریشتە بیکەن، چ جند بیکەن، وە چ ئینسان بیکەن، چ دروستکراوەکانی دیکە بیکەن، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: هیچ شتێك نیە کە خوا بە پاك نەگرێو ستایشی نەکات، بەڵام ئێوە تێیان ناگەن،

هیچ شـتێك نیـە لـە گەردیلـەوە بگـرە، لـە چلّـە گیایەكـەوە بگـرە، لـە خانـەو شانەیەكەوە بگرە، هەرچـی دروسـتكراوی خوایـە، هـەمووی خـوا بـە پـاك دەگـرێو ستایشـی دەكـات، ئنجـا ئەگـەر فەرمووبـای: (أَحْمَـدُ اللّٰه)، واتـە: ئـەو كەسـەی كـە قورئـان دەخوێنـێ، هـەر ئـەو ستایشـی خـوا دەكـات، بـەلاّم ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، واتـە: ستایش بۆ خوا لەلایەن هەموو دروستكراوەكانی خواوە، وە لەلایـەنی خۆشیەوە.

پاشـان ئەگـەر فـەرمووبای: (أَحْمَـدُ اللّٰه)، ڕەنگـە ئـەو كەسـە كـە وایدەگـوت، قسـەكەی درۆ دەرچـووبایە، چونكـە ئەگـەر ئـەو كـە دەڵـێ: مـن ستایشـی خـوا دەكـەم، بـەلاّم لـەوكاتەدا بێئاگـا بـێ، ئەوە قسـەكەی ناڕاسـت دەردەچـێ.

وە ئنجا گوتنی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، ستایش بۆ خـوا، هیچ ئیددیعای تێدایە، بەلاّم كە دەڵێیـی (أَحْمَـدُ اللّٰه)، مـن ستایشـی خـوا دەكـەم، جۆرێـك لـە ئیـددیعای تێـدا هەیـە، كە زۆریش زەحمەتـە ئینسـان بتوانـێ ستایشـی خـوا بكـات، بـەلاّم كە دەڵێی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، واتە: ستایش بۆ خوا، جا چ ئینسان توانی ئـەو ستایشـە بكـات، كە بە تەئكید بێجگـە لە زاتی خوا خۆی، هیچ كـەس ناتوانـێ وەك بـۆ خـوا شـایسـتەیە، ستایشـی بكـاتو مـەدحی بكـاتو پێیەهـەڵا بڵـێ، وە ئـەو سـیفەتە بـەرزو نـاوە هەرچـاكـانەی بـاس بكـات.

٢) جیاوازی نێوان (حَمْد) و (مَدْح) و (شُكْر):

سـێ وشـەمان هـەن، كـە بریتیـن لـە : (حَمْـد) و (مَـدْح) و (شُـكْر)، ئایـا جیـاوازییـان چییـە؟

(حَمْـد) تەنیا ئاڕاستەی كەسێك دەكرێ، كە بە ویسـتی خۆی چاكەیەك دەكـات، یاخود سـیفەتی چـاكی تێـدا هـەن، واتـە: دەبـێ خـاوەنی ئیـرادەو ئیختیـار بـێ، بەلاّم (مَدْح) ئاڕاسـتەی هەر شـتێك دەكـرێ، با ئیختیاریشـی نەبـێ، بۆ وێنـە: مـن مەدحی ڕۆژ دەكەم، مەدحی خواردنێك دەكەم، مـەدحی گوڵێـك دەكـەم كـە جوانـە، كـە هیچیـان ئیختیـاریان نیـە، بـەلاّم (حَمْـد) ستایشـكردن، تـەنیا بـۆ كەسێكە كە خاوەنی ئیختیارە، ئەوە جیاوازیی نێوان (حَمْـد) و (مَـدْح).

وە پاشان (شُكْر) تەنیا لە بەرانبەر نیعمەت دایە، هەرچەندە لە كوردەواریی خۆماندا (حَمْد ومَدْح و شكر) هەموویان تێكەڵن، هەر دەڵێن: سوپاس، بەڵام من جیام كردۆتەوە، (حَمْد)م كردوە بە ستایش، (شُكْر)م كردوە بە سوپاس، بۆ وێنە، دەڵێی: (أَشْكُرُكَ) یانی: سوپاست دەكەم، (شُكْر) لە بەرانبەر نیعمەت دایە، دەبێ چاكەیەك بووبێ لەو لایەنەوە بۆ تۆ، ئنجا تۆ (شُكْر)ی دەكەی، بەڵام (حَمْد) نەبەستراوەتەوە بە چاكەوە، ئێمە دەڵێین: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، خوای بەرز سەرچاوەی هەموو چاكەكانە، بۆیە لەو كاتەدا كە تۆ ستایشی خوا دەكەی، چاكەكان ناهێنیە پێش چاوی خۆت، كە لەبەرئەوەی كە خوا ﷻ چاكەی لەگەڵدا كردووی، تۆش ستایشی بكەی، بەڵكو هەر لەبەرئەوە كە شایستەی مەدحو سەنایەو، لەبەر سیفەتە پەسندەكانی دەڵێی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، ئنجا كە دەڵێی: (الشُّكْرُ لله) لەبەر چاكەو نیعمەتەكانی، ئەوە جیاوازیی سەرەكیی ئەو سێ وشەیەیە.

٣) كورتە باسێك دەربارەی ئاسمانەكانو زەوی :

خوا ﷻ باسی ئاسمانەكانو زەوی دەكات، بۆ زانیارییتان لە قورئاندا خوا ﷻ هەركام لە: وشەی (السماء)ی بەكارهێناوە، وە وشەی: (السَّمَاوَاتِ)ی بەكارهێناوە، وە وشەی (سَبْعَ السَّمَاوَات)یشی بەكارهێناوە.

ئنجا لە زمانی عەرەبیدا، هەر شتێك كە لە سەرووی تۆوە بێ، (كُل مَا فَوْقَك)، (كُل مَا عَلاَك) پێی دەگوترێ: (السَّمَاء)، ئنجا ئەو (السَّمَاء)ە، دەگونجێ مەبەست پێی سەقفی خانوو بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی هەور بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی جەو بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی ڕەها (مُطْلَق)ی سەرەوە بوون بێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو حەوت ئاسمانانە بن، كە ئێمە نازانین سنوورەكەیان كوێیەو نێوانەكەیان چییە، كە خوای پەروەردگار باسی كردوون، وە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ بەتایبەتی لە بەسەرهاتی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج)دا پێغەمبەر ﷺ باسی حەوت

ئاســمانەکان دەکات، لـە هـەر ئاســمانێك کێــی لێبــووەو؟ چـۆن بـووە؟ کـەواتە ئاسمان واتە: سـەرەوە.

ئەدی زەوی چییـە؟ زەوی ئەوەیە کە ئێمە لەسەری دەژین، ئنجا ئایا خڕۆکـەی زەوی لـەنێو ئاسـماندا چییـە؟ خڕۆکـەی زەوی یەکێکـە لـە نـۆ (٩) خڕۆکـەی کۆمەڵـەی خـۆر کـە بـە ڕیزبەندیـی بریتیـن لـە: {عَطّارد، زهرة، أَرْض، مَرِيخ، ، مشتَري، زُحَل، يُورانـوس، نبتـون، بلوتـو}، ئەوانـە نـۆ خڕۆکــەن، کـە بـە دەوری خـۆردا دەخولێنـەوەو پێیـان دەگوترێ کۆمەڵەی خـۆر.

خـۆر چـییە؟ خـۆر یەکێکـە لـە ئەسـتێرەکانی مەجـەڕەی کاکێشــان، کـە ئێمـە دەڵــێین: کاکێشــان عـەرەب دەڵــێن: (درب الـتَّـبّان) واتـە: ڕێـی کاکێشــان، فــارس دەڵێن: (ڕاهی شـیری) واتە: ئەو ڕێیەی کە شیری پێدا هاتووەو شیـری لـێ ڕژاوە، وە ئینگلیز دەڵێن (Milky way) واتە: ڕێی شیـریی، کە ئەو کاکێشـانە دەوری سـەد ملیـار ئەسـتێرەی تێدایـە، یـەکێك لـە ئەسـتێرەکانی ئـەو کاکێشـانە ئـەو خۆرەی ئێمەیە، کـە نـە ئەستێرەیەکـی زۆر گەورەیـە، نـە زۆر گچکەیە، سەد ملیـار ئەسـتێرەی وەك ئـەو خـۆرەی ئێمـە لـەو کاکێشـانەدا هەیـە، ئنجـا ئایـا چـەند کاکێشـان هـەن لە ئاسـماندا؟ تا ئێستا بەمەزەننە زانایان دەڵێن: دەوری سەد ملیـار کاکێشـان هەیـە، یانی بە ژمارەی ئەستێرەکانی نێـو مەجـەڕەی کاکێشـان کـە سـەد ملـیارە، ئنجا ئایا دەبێ موڵکی خـوا چەند فـراوان بـێ؟!!

وە هەنـدێك لـەو کاکێشـانانە هـەن کـە بـە سـەدان ملیـۆن سـاڵی تیشـکیی تیشـکەکەیان دەگـاتە ئێرە، واتە: ئەو تیشکەی کە دەگاتـە ئێمـە، هـی سـەدان ملیـۆن سـاڵ لەمەوبەرە، کە تیشـك لە چرکەیەکدا سـێ سـەد هـەزار کیلـۆمەتر دەبـڕێ، ئنجا سـێ سـەد هـەزار (٣٠٠٠٠٠) کیلۆمەتر لە چـرکەیەکدا جـاران (X)ی (٦٠) بکە بۆئـەوەی خولەکت بـۆ دەربچـێ، پاشـان ئەنجامەکـەی جـارانی (٦٠) بکە بۆئـەوەی سەعاتت بۆ دەربچێ، ئنجا ئەنجامەکـەی جـارانی (٢٤) بکـە بۆئـەوەی ڕۆژو شـەوت بـۆ دەربچـێ، پاشـان ئەنجامەکـەی جـارانی (٣٦٥) بکـە بۆئـەوەی ساڵێکـت بـۆ دەربچێ، ئنجا ئەو ماوەیەی کە تیشك لە ساڵێکـدا دەیبـڕێ، پێـی دەگـوترێ: سـاڵی تیشـکی، کەچـی هەنـدێك لـە کاکێشـانەکان بـە سـەد ملیـۆن سـاڵی تیشـکیی، ئنجـا

تیشکەکەیان دەگاتە ئێرە، کە بۆ زانیاریتان خۆر تیشکەکەی بە هەشت خولەك (دقیقة) دەگاتە ئێمەو، هی مانگ بە چرکەیەكو یەك لەسەر سێی چرکەیەك تیشکەکەی دەگاتە ئێمە، لە حاڵێکدا کە مانگ (قمر) سێ سەدو حەفتاو ئەوەندە هەزار کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە، کەچی بە چرکەیەكو، یەك لەسەر سێی چرکەیەك تیشکەکەی دەگاتە ئێمە!

کەواتە: ئەم بوونەوەرە زۆر فراوانە، ئنجا وەنەبێ بوونەوەر بریتی بێ لە کۆی حەوت ئاسمانەکان، بەڵکو لەڕاستیدا هەرچی دەردەکەوێ لە کاکێشانەکانو لە ئەستێرەکانیان، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دایە، چونکە خوای پەروەردگار دوای ئەوەی باسی حەوت ئاسمانەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴿٥﴾ ﴾ الملك، واتە: بە تەئکید نیزیکترین ئاسمانی لە ئێوەمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، کەواتە: هەرچی ئەستێرەیەو خڕۆکەیەو ئەوانەی کە بە دەوریاندا دەخولێنەوە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دایە، ئنجا ئەوەش سنوورەکەی لە کوێ کۆتایی دێ؟ نازانین، ئنجا لە سەرووی ئەوەشەوە، شەش ئاسمانی دیکەو چیو چی دیکە هەن؟

کەواتە: ئەم بوونەوەرە کە ئێمە تێیدا دەژین زۆر فراوانە، ئنجا وەك گوتم زەویش بە قەبارە زۆر بچووکە، بەڵام بە پێگە زۆر زۆر گرنگو گەورەیە، چونکە تاکە شوێنێك کە ژیانی لەسەر هەبێ، ژیانی زیندەوەر، ئەم زەوییەی ئێمەیە، ئەوەی تا ئێستا زانیاری سەلماندوویەتی، هەر ئەوەیەو ژیانی مرۆڤ و جند تەنیا لەسەر ئەم زەوییەی ئێمەیە.

ئنجا هەر بەم بۆنەیەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە، هەرچەندە سەنەدەکەی بەلای هەندێك لە زانایانەوە بهێزە، کە زۆر جێی سەرنجە، پێغەمبەری خوا بۆمان باسی بوون (وجود) دەکات، کە ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: «بَيْنَمَا نَبِيُّ اللهِ ﷺ جَالِسٌ وَأَصْحَابُه، إِذْ أَتَى عَلَيهِم سَحَابٌ، فَقَالَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ: أَتَدْرُونَ مَا هَذِهِ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولهُ أَعْلَم، قَالَ: هَذِهِ العَنَانُ، هَذِهِ رِوَايَا الأَرْض، يَسوقُها اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى قَومٍ لا يَشْكُرُونَه، ولا

يَدْعُونَهُ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوقَكُمْ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم، قَالَ: فَإِنَّهَا الرَّقِيعُ: سَقْفٌ مَحْفُوظٌ، ومَوجٌ مَكْفُوفٌ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم، قَالَ: بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا خَمْسُمِائَةِ عَامٍ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوقَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم، قَالَ: فَإِنَّ فَوْقَ ذَلِكَ سَمَاءَينِ، (بُعْدُ) مَا بَيْنَهُمَا خَمْسُمائَةِ سَنَةٍ، ثُمَّ قَالَ كَذَلِكَ، حَتَّى عَدَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ، مَا بَيْنَ كُلِّ سَمَاءَينِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوقَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم، قَالَ: إنَّ فَوْقَ ذَلِكَ العَرْشُ، وَبَيْنَهُ وَبَينَ السَّمَاءِ بُعْدُ مَا بَينَ السَّمَاءَينِ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الَّذِي تَحْتَكُمْ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم، قَالَ: إِنَّهَا الأَرْضُ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا تَحْتَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم، قَالَ: إنَّ تَحْتَهَا أَرْضا أخرى، بينهما مَسيرةُ خَمْسُمَائَةِ سَنَةٍ، حَتَّى عَدَّ سَبْعَ أَرضِينَ، بَينَ كُلِّ أرْضَيْن مَسيرَةُ خَمْسَمِائَةِ سَنَةً، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيدِهِ! لَوْ أَنَّكُم دَلَّيتُم بحَبْل إلى الأَرْضِ السُّفْلَى، لَهَبَطَ عَلَى اللهِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾﴾الحديد[1].

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە كاتێكدا كە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە (بەڕێزە)كانی دانیشتبوون، هەورێكیان بەسەردا هات، پێغەمبەری خوا فەرمووی: دەزانن ئەمە چییە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن (ئەوە ئەدەبێكی بەرزی هاوەڵان بووە، لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ كە شتێك زانیبیشیان نەیانگوتوە: فلان شتەیە، گوتوویانە: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، دەنا دەیانتوانی بڵێن: ئەوە هەورە، زانیویانە هەورە، بەلام گوتوویانە: نەوەك نهێنییەكی دیكەی لەژێردا هەبێ، با پێغەمبەری خوا، خۆی پێمان بڵێ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە هەورە، وە ئەوانە ئاودێركەری زەویین، (زەوی ئاودێر دەكەن)، خوای پایە بەرز بەردەوام ئەم هەورانە دەنێرێ بۆ كەسانێك كە نە سوپاسی دەكەن، نە لێشی دەپاڕێنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتیان بۆ ئاودێر

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٨١٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٢٩٨)، وَقَالَ: غَرِيبٌ، والطبراني في "مسند الشاميين" برقم: (٢٦٦٥)، وضَعَّفَهُ كُل مِنَ الألباني وشعيب الأرنؤوط وأيمن صالح شعبان.

دەکات، دوایی فەرمووی: دەزانن لە سەرووتانەوە چی هەیە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: ئەوە ئاسمانە لە سەرووتانەوە، سەربانێکی پارێزراوە، وە شەپۆلێکی کۆکراوەیە، (ئاوا پێناسەی ئاسمانی کرد)، دوایی فەرمووی: دەزانن لەنێوان ئێوەو ئاسماندا ماوەی چەندە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: لە نێوان ئێوەو ئاسماندا رێگای پێنج سەد ساڵە، دوایی فەرمووی: دەزانن لە سەرووی ئەو ئاسمانەوە (واتە: ئاسمانی یەکەم) چی هەیە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: لە دوای ئەویشەوە دوو ئاسمانی دیکە هەن، کە لە نێوانیاندا پێنج سەد ساڵ رێیە، هەتا حەوت ئاسمانی ژماردن، دوایی فەرمووی: لە نێوان هەر دوو ئاسمانانێکدا وەك ماوەی نێوان ئاسمانو زەوی وایە، (واتە: هەموو پێنج سەد ساڵ، پێنج سەد ساڵ لەیەك دوورن)، دوایی فەرمووی: دەزانن لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە چی هەیە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی لە سەرووی ئەوەوە، عەرش هەیە (بارەگای خوا هەیە)، وە لە نێوان عەرشو ئاسماندا، (واتە: ئاسمانی حەوتەم لەگەڵ عەرش) ماوەی نێوان دوو ئاسمانان هەیە، (واتە: پێنج سەد ساڵ) دوایی فەرمووی: دەزانن چی لە ژێرتانە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: خڕۆکەی زەوی، دوایی فەرمووی: دەزانن لەژێر خڕۆکەی زەوییەوە، زەوییەکی دیکە هەیە، پێنج سەد ساڵ رێ دوورە، لەم زەوییەی خۆمانەوە (واتە: بە باری خوارێ دا) هەتا حەوت زەوی ژماردن، لە نێوان هەردوو زەوییاندا پێنج سەد ساڵ رێیە، (واتە: بەرەو خوار) دوایی فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر پیاوێك بە پەتێك شۆڕ بکەنەوە بەرەو زەوی یەکەم، بەرەو زەوی خواری خوارێ، دەکەوێتە سەر خوای پەروەردگار! (واتە: ئەو پیاوە دەکەوێتە سەر خوای پەروەردگار) دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ۝٣﴾ الحديد، واتە: خوا یەکەمە، دواهەمینە، ئاشکرایە، پەنهانە، وە بە هەموو شتێك زانایە.

دیارە ئەم فەرموودەیە زۆر جێی سەرنجەو بە پێی ئەم فەرمایشتە ـ كە فەرمایشتی دیكەش هەن، بەڵام ئەم فەرمایشتە فەرمایشتێكی تاكە لەوبارەوە ـ وا دێتە بەرچاو، كە نوێترین زانست كە بەشەر پێی دەگات، سەبارەت بە تێڕوانین دەربارەی بوونەوەرو ئاسمانەكانو زەویو بوون: خوای پەروەدگار بە پێغەمبەری خوێ ﷺ گوتوە، بەڵام لە قەدەر عەقڵی خەڵكی ئەو ڕۆژگارە قسەی كردوە، یانی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرموێ: ئاسمانی یەكەم پێنج سەد ساڵ لێتانەوە دوورە، نەیفەرمووە پێنج سەد ساڵ بە چ پێوەرێك ؟ ئێمە باسمان كرد، كە هەندێك لە كەهكەشانەكان چەند ملیۆن ساڵ، ساڵی تیشكیی لە یەكدی دوورن، ئایا ئەو پێوەرەی كە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی بووە، ساڵی تیشكییە، ساڵێكی دیكەیە، یان شتێكی دیكەیە كە لە تیشك خێراترە، یان مەبەستی پێی چی بووە؟ وە ئایا (پێنجسەد)ەكە، مەرجە تەنیا پێنج سەد (٥٠٠) بێ، دەگونجێ مەبەستی پێ ژمارەیەكی زۆر بێ، واتە: مەسافەیەكی زۆر دوور؟ وا پێدەچێ مەبەستی ئەوەی دوورەمیان بێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەقەدەر عەقڵی خەڵك قسەی كردوە، كە فەرموویەتی: لە نێوان هەردوو ئاسماناندا، پێنج سەد ساڵ ڕێیە، واتە: ماوەیەكی زۆر زۆر هەیە، ئەو كاتە ژمارەی پێنج سەد (٥٠٠) ژمارەیەكی زۆر بووە، وەك لە قورئاندا خوای پەروەردگار ژمارەی حەفتای (٧٠)ی بەكارهێناوە، بۆ وێنە: دەفەرموێ: ﴿إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ ٨٠﴾التوبة، واتە: ئەگەر حەفتا جار داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بكەی، خوا لێیان خۆش نابێ، ئایا ئەگەر بیكاتە حەفتاو یەك جار، خوا لێیان خۆش دەبێ؟ نەخێر، ئەدی بۆچی دەفەرموێ: حەفتا؟ یانی هەرچەندە زۆر بۆیان لە خوا داوای لێبوردن بكەی، خوا لێیان خۆش نابێ، بۆ نموونە: جاری وایە تۆ چوار جار، چووی بۆ لای كەسێك دەڵێی: هەزار جار هاتم بۆ لات، تۆ هەر نەهاتی، دیارە هەزار جار نەچووی، چوار، پێنج جار چوویو قسەكەت بەس بۆ زێدەڕۆیی (مُبَالَغَة)یە.

بەهەر حاڵ، ئەوەی كە دەمەوێ سەرەنجتانی بۆ ڕابكێشم ئەوەیە، كە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ شتێك دەفەرموێ، ئەویش ئەوەیە كە لە سەرووی حەوت

ئاسمانەکانـەوە، عەرشـە، وە عەرشـیش ئەوەنـدە دوورە لـە ئاسمانەکانـەوە، کـە ئێمـە نازانیـن ئەوە ماوەیـە بـە چ پێوەرێکـە، وە وا پێدەچێ زیـاتر مەبەسـت ئـەوەبێ کـە زۆر دوورە، عەرشـیش زۆر لـە ئاسـمانی حەوتەمـەوە دوورە، بـە بـاری سـەرێ دا، هـەروەك چۆن ئاسمـانی یەکـەم زۆر لـە ئێمـە دوورە، ئـەو پێـنج سـەد ساڵەش بـۆ ئەوەیە کـە تـۆ بزانـی زۆر زۆر دوورە، چونکـە دیـاریی نەکـردوە، ئـەو پێـنج سـەد ساڵە بە ڕۆیشتنی کەروبارە، بە ڕاکردنە، بە ڕۆشتنی باڵندەیـە، بـە خێرایـی دەنگە، بـە خێرایـی تیشـکە، بـە خێرایـی شـتێکی دیکـەیە لـە تیشـك خێراتـر؟ دیـاریی نەکـردوە ئێمـەش لـەخـۆمانەوە ناتوانین دیـاری بکـەین.

کەواتە: ئەم بوونەوەرە، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی بەڕێزیو بـە ئۆممەتیشی فەرمووە، کە زۆر زۆر فراوانە، واتە: ئەوەی کە کاتی خۆی بیردۆزەی (بطلیموس) کـە گوتوویـەتی: زەوی وەك سینییەك وایـە لەسـەر ئـاوێ، ئاسـمانیش گومبەزێکـە بەسـەری دادراوە، ئەستێرەکانیش گڵۆپنو تێـی چەقێنراون، مـانگو ڕۆژیـش لـە شوێنی خۆیـان وەسـتاون، پێغەمبەری خـوا ﷺ بـە پێی ئـەو فەرمایشـتە، ئـەوەی بـەدرۆ خستۆتەوە، کـە وانیـەو، ئـەو ئاسـمانانە زۆر زۆر دوورن، وە ڕاسـت نیـە ئاسـمان گومبـەز بـێ بەسـەر زەوی دا داربێ، بەڵکو پێنج سـەد (٥٠٠) سـاڵ لـە زەوی دوورە، واتە: زۆر زۆر دوورە، ئنجا حەوت ئاسمان لەسەر یەکن، لە نێوان هـەر دوو ئاسمانان دا مەسافەیەکی زۆر زۆر هـەیە، ئاسـمانەکانیش لەگـەڵ عـەرش زۆر زۆر لێـك دوورن، پاشـان پێغـەمبەری خـوا ﷺ شـتێکی دیکـەی باسـکردوە، دەفەرموێ: لە خـوار ئەو زەوییـەی ئێمـەوە زەوییـەکی دیکـە هەیـەو، ئـەم زەوییـە لەگەڵ ئەو زەوییەی خوارێ، پێنج سەد ساڵ ڕێ لێك دوورن، دوایی زەوییەکی دیکە، دوایی زەوییەکی دیکـە، تا حەوت زەوی، وە ئنجا ئاماژەی بە شتێکی سـەرنجڕاکێش کـردوە، دەفـەرموێ: ئەگـەر پیاوێـك بـە حەبلـێك بەردەنـەوە بـۆ زەوی یەکـەم، دەکەوێتە سـەر خـوای بێ وێنـە! لێرەدا مەبەسـتی پێغەمبـەری خـوا ئەوەیـە کـە تێمان بگـەیەنێ ئـەم زەوییـەی ئێمـە هـەر چوار دەوری ئاسـمانە، ئێستا سـەرەوەی زەوی لە کوێ دەردەکەوێتـەوە؟ لە بن پێی ئەمریکییەکـان دەردەکـەوێ، یاخـود لـە بـن پێـی ئوسترالـییەکان، چونکە زەوی ئاوایـە، بـە بـەرگێکی دەریـایی دەور دراوە، دوایـی بـە دەورێکـی هـەواییش دەور دراوە، وە لـە فـەزادا دەخولێتـەوە بـە دەوری

خۆی‌و بە دەوری خۆردا، واتە: تۆ ئەگەر پەتێك بەردەیەوە لەولاش لە ئاسمانەوە دەردەچی‌و لە فەزاوە دەردەچی! پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی پێ ئەوە بووە، بەڵام بۆیە لەجیاتی ئاسمان وشەی (خوا)ی بەکارهێناوە، چونکە خوای بەرزو مەزن (تبارك وتعالى) لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ﴾، وشەی (جَعَل) چەند واتایەکی هەن، وەك: دروستی کرد، هێنایە دی، گۆڕی، کەواتە: ﴿ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ﴾، واتە: دروستی کردوون، یاخود تاریکییەکان‌و ڕووناکیی لە شتەکانی دیکە پەیدا کردوون، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجًا...﴿٧٢﴾ ﴾النحل، واتە: وە خوا لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون، بەڵام بە نسبەت کافرەکانەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًا...﴿١٩﴾ ﴾الزخرف، واتە: ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بە بەزەیین، کردیانن بە مێینە، واتە: لە عەقڵی خۆیان دا گۆڕیانن.

وە مەبەست لە (الظلمات) هەر ئەو تاریکاییانەن کە دەیانبینین، بەڵام ڕووناکیی ئەو شتەیە، کە شتەکانی پێ دەبینی، وە تاریکیی ئەوەیە کە شتەکان نابینی، خوای پەروەردگار تاریکییەکانی بە کۆ هێناوە، فەرموویەتی: (ظلمات)، لەبەرئەوەی تاریکییەکان جۆراو جۆرن، بەڵام (نور)ی بە تاك هێناوە، دەشگونجێ مەبەست لە (ظلمات) گومرایی‌و سەرگەردانییەکان بن، گوناهەکان بن، وە مەبەست لە (نور) هەق بێ، کە هەق یەکێکە، بەڵام ناهەق زۆرە (٢ + ٢= ٤)، ئەنجامی ڕاست هەر (٤)ە، بەڵام (٥)و (٣)و (٦) هەر هەموویان هەڵەن، هەر ژمارەیەکی دیکە بڵێی، جگە لە (٤) هەڵەیە، کەواتە: هەڵە زۆرن‌و جۆراو جۆرن، بەڵام هەق یەکێکە، هەڵبەتە، هیچ تێکگیرانیش نیە کە بڵێین: مەبەست لە (ظلمات) و (نور) تاریکییەکان‌و ڕووناکییەکان، هەم تاریکیی‌و ڕووناکیی ماددیی‌و بەرهەستن، هەم هی مەعنەویین، واتە: مەبەست پێیان هەق‌و ناهەقە.

وە كە دەفەرمویٚ: ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ﴾، ئەوە دوو واتای هەن:

١/ ئەگەر بڵێی ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ﴾ ڕاوەستی‌و دوایی بڵێی: ﴿يَعۡدِلُونَ﴾، واتە: ئەوانەی كوفریان بە پەروەردگاریان كردوە، لادەدەن، واتە: لادەدەن بەرەو ناهەق، ئەوە مانایەكی.

٢/ دەشكونجێ بڵێین: ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان، یەكسان دەكەن لەگەڵ پەروەردگاریان دا، واتە: دروستكراوەكان لەگەڵ خوادا یەكسان دەكەن لە پەرستراندا.

ئنجا ئەوانەی شارەزای زمانی عەرەبیین، دەڵێن: ئەو (ب)ی دەچێتە سەر ﴿بِرَبِّهِمۡ﴾، ئەگەر پەیوەست (متعلق) بێ بە ﴿يَعۡدِلُونَ﴾ەوە، ئەو كاتە ئاوای لێ دیٚ: ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ﴾، واتە: یەكسان دەكەن بە پەروەردگاریان، وە دەشكونجێ (ب) پەیوەست (متعلق) بێ بە (كفروا)ەوە، واتە: ئەوانەی كە كوفر بە پەروەردگاریان دەكەن، لادەدەن، كەواتە: وشەی (يَعْدِلُون) یان بە مانای (يُسَوُّون) یەكسان دەكەن، دیٚ، یان بە مانای (يَنْحَرِفُون) لادەدەن، دیٚ.

ئنجا كە دەفەرمویٚ:

خوا ئاسمانەكان‌و زەوی دروستكردوون‌و تاریكاییەكان‌و ڕووناكیی داناون، پاشان دەفەرمویٚ: ﴿ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، ئنجا دوای ئەوەش ئەوانەی كە بێبڕوان بە پەروەردگاریان، لادەدەن، یاخود هاوبەشی بۆ دادەنێن‌و دروستكراوەكان لەگەڵ خوادا یەكسان دەكەن، بۆیە وایفەرمووە، چونكە: وشەی (ثُمَّ لِلتَّرْتِيبِ مَعَ التَّرَاخِي)، واتە: (ثم) بۆ ڕیزبەندییە، بەڵام كە ماوەی پێ بچێ، وەك بڵێی دوور بكەوێتەوە، بۆ وێنە: دەڵێی: (جَاءَ مُحَمَّد ثُمَّ أَحْمَد) واتە: موحەممەد هات، دوایی ماوەیەكی پێچوو، ئنجا ئەحمەد هات، بەڵام ئەگەر گوتت: (جَاءَ مُحَمَّد

فَأَحْمَد)، واتە: موحەممەد هات و یەکسەر ئەحمەدیش بە دوای دا هات، ئنجا لێرەدا بۆیە (ثم) بەکارهێنراوە، چونکە لە عەقڵی ئینسانەوە دوورە دوای بەدیهێنەرایەتی خوا بۆ بوون، لە پەرستنی وی لابدرێ.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ثُمَّ أَنتُمۡ تَمۡتَرُونَ ﴾: سێ هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا دەکەین:

هەڵوەستەی یەکەم: کە دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ﴾، ئاماژەیە بەوە کە: ئەی بەشەر! خوا ئێوەی لە قوڕێ دروست کردوە، کە هەرکامێك لە ئێمە ئەگەر شوێنێکی بە قوڕ بێ، زوو دەچێ بیشواتەوە، کەچی خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ئێوەمان لە قوڕ دروستکردوە، خۆتان لێ نەگۆڕێ! ئەو کەرەستەیەی جەستەی ئێوەی لێ پێکهاتوە، شتێکی زۆر نا بەرچاوە، ئەگەر پریشکە قوڕێکتان پێوە بنووسێ، زوو لە خۆتانی دەکەنەوە، ئێوە لەو قوڕە دروست بوون، بۆیە خۆتان لێ نەگۆڕێ و لەخۆبایی مەبن، ئینسان بە جەستەکەی گەورە نەبووە، جەستەکەی لە قوڕ دروست بووە، وەك هەر دروستکراوێکی دیکەی ئەم زەوییە، بەڵکو ئینسان بە ڕووحەکەی گەورە دەبێ، ڕووحەکە لە خواوەیە، وە ڕووحیش بە چی پاك دەبێ؟ بە ئیمان و تەقواو بە پەیوەندیی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا.

کەواتە: ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە جەستەتانەوە هەیە، قەدو قیافەو، جوانیی و سەروەت و سامان و، خواردن و خواردنەوەو، جل و بەرگ و، کۆشك و تەلارو... هتد، هەمووی پەیوەندیی بە بەدەنەوە هەیە، خۆتانی پێ هەڵمەکێشن، بەڵکو ئەوەی پەیوەندیی بە ڕووحتانەوە هەیە: ئیمان و تەقواو، یادی خواو، چاکەو طاعەت و سیفەتی بەرز، بەوە دڵخۆش بن.

(طین): یانی قوڕ، قوڕ لە چی دروست دەبێ؟ (تراب + ماء) واتە: گڵ لەگەڵ ئاو کۆدەبێتەوە، قوڕی لێ پێکدێ، دیارە شتێکی ئاشکرایە کە ئینسان جەستەکەی لەم خاکە دروست بووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆ زیاتر هۆشیارکردنەوەی ئێمە

دەفەرموێ: ﴿النَّاسُ بَنُو آدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ﴾[(١)]، واتە: خەڵك ڕۆڵەی ئادەمن، ئادەمیش لە گڵە.

ئنجا ئایا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ﴾: مەبەستی لە: لە قوڕ دروستکرانی ئێمە چییە؟ ئەوە دوو مەبەست دەگەیەنێ:

یەکەم: باپیرە گەورەی ئێوە کە ئادەمە ؑ ڕاستەوخۆ لە قوڕ دروست بووە، ئەوە دیارە چونکە خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتدا، وە پێغەمبەریش ﷺ لە چەندان فەرمایشتدا، باسیان فەرمووە، کە باپیرە گەورەی ئێوە یەکسەر لە قوڕ دروست بووەو، ئێوەش ڕۆڵەی ئەون، کەواتە: ئێوەش لە قوڕ دروست بوون.

دووەم: یاخود ئێوە ڕاستەوخۆ لە قوڕێ نەهاتوونە دەر، بەڵکو ناڕاستەوخۆ لە قوڕ دروست بوون، چۆن؟ جارێ ئەو (نُطْفَة)یەی کە ئێمەی لێ دروست دەبین، (نُطْفَة)کە لە چی دروست دەبێ؟ لە خوێن دروست دەبێ، خوێن لە چی دروست دەبێ؟ لە خواردنی هەزمکراو، خواردنی هەزمکراو لە چی دروست دەبێ؟ لەو شتانەی کە دەیانخۆین، ئەو شتانەی کە دەیانخۆین چیین؟ یان ڕووەکە، یان ئاژەڵە، یان ئاوە، وەك: گەنم و جۆو نیسك و نۆك و ماش و سەوزەو میوەو گۆشت و ئاو، کە هەموویان لە زەوی پەیدا دەبن، یانی: (نُطْفَة)ە کەش هەر لەو شتانە کە لە زەوی پەیدا دەبن، دروست بووە، بۆیەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ﴾السجدة، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە هەموو شتەکانی بە چاکترین شێوە دروست کردوە، وە دروستکردنی ئینسانی لە قوڕێوە دەست پێکردوە، واتە: ئادەم ؑ ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴾، دوایی وەچەکەی لە خولاصەیەك لە ئاوێکی کەم بایەخ، یان ئاوێکی قێزەون، وەدیهێناوە، کە مەبەست پێی تۆوی پیاوو هێلکۆڵەی ئافرەتە.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٠٧٩١)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٥١١٦)، وَالبَيْهَقِيُّ بِرقم: (٢٠٨٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٩٥٦) وَاللَّفظُ لَهُ، وَحَسَّنَهُ كُلٌ من الألباني وشعيب الأرنؤوط.

هەروەهـــا لـــە ســـوورەتی (الـمؤمنون)دا خـــوا دەفــەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ﴾، واتـــە: وە بێگومان ئینسـانمان لە خوڵاصەیەك لە قوڕ دروست كـردوە، دوایـی كردوومانـە بـە نوتفـە لـە شـوێنێكی سەقامگـیردا، كـە مەبەست پێـی منداڵدانی دایكە، ئنجا دەگونجـێ مەبەسـت لـە (مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ) ئـادەم ﷺ بـێ، كـە ئـادەم ﷺ لـە قوڕی زەوی وەرگیـراوە، دەشگونجـێ مەبەسـت پێـی هەر ئەو قۆناغـەی پێش بوونە نوتفەی ئینسان بـێ، كـە ئـاوی پیـاوو هێلكۆڵـەی ئـافرەت (حیمن الرجل و بویضة الـمرأة) پێكـــەوە ئاوێتـــە دەبـــنو كۆدەبنـــەوە، ئنجـا بەرهەردووكیـــان نوتفـــە پێكدێنن، واتە: حەیوانی مەنەویی، یانی: زینـدەوەرێكی دیكە پێكدێنـن، كـە پێـی دەگـوترێ: (نطفـة)، ئنجا ئـەو نوتفەیـە دوایـی گەشـە دەكـاتو دەبێتـە (مضـغة)و قۆناغەكانی دیكە دەبڕێو، دەبێتـە كۆرپەلـەو لەدایك دەبـێ.

كەواتـە: ئـەی بەشـەر! ئێـوە لـەوە دروسـت بـوون، سُبْحَانَ اللّٰه ! بەشـەر زۆر بـێ ئاگـــایە! زۆرجـار ئینسـان لـە بـیری دەچێتـــەوە لـە كوێـوە هـاتوە؟ لـە چییـــەوە دروســت بـووە؟ لـە شـتێك دروست بـووی كـە بـە زەرەبـین نـەبێ نـابینرێ؟ چـونكە هەندێك خەڵكی عـەوام وادەزانـێ: ئـاوی پیـاوو ئافـــرەت هەمووی تێكـــەڵ دەبـێو ئنجا دەبێتــە كۆرپـــەڵـە ! نـا، زینـدەوەرێكی زۆر بچـــووك لـە ئـاوی پیـاودا لەگـەڵ زیندەوەرێكی زۆر بچووك لە ئـاوی ئافرەتدا، كـە هیچیـان بـە چـاو نابینرێـن، یـەك دەگـرن، كـە دوای یەكگرتنیشـیان هەر بە چـاو نـابینرێن، ئنجا ئەوەیـە دوایـی وردە وردە لەنێو منداڵدانی ئـافرەت دا گەشـە دەكـاتو گـەورە دەبـێو دەبێتـە كۆرپەڵەو، دەبێتـــە ئەو ئینســـانەی كـە دوایـــی دەبێتـــە پیـاوێكی پـڕ بـە كراسـیو زۆرجـاران خــوا بە هــەق ناناســی!!

هەڵوەســـتەی دووەم: كـە دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴾، واتـە: دوایـی خـــوا كـاتێكی دیاریكـــرد، وە كـاتێكی نـاوبراویش لـەلای خۆیــەتی.

كاتێكی دیاری كرد: یانی: بۆ هەر كامێكتان ماوەیەك ژیانی دیاریی كردوە.

﴿ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ﴾، وە كاتێكی ناوبراویش لەلای خۆیەتی، ئەو كاتە ناوبراوە، مەبەست پێی كۆتایی هاتنی ژیانی بەشەرە لەسەر زەوی، هەموو لایەك: كافرو مسوڵمان، ئێستا لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە ڕۆژێك دێ ئەم سەرزەوییەی ئێمە نامێنێ، ئەم كۆمەڵەی خۆرە، نامێنێ، ڕۆژێك دێ تیشكی خۆر كۆتایی دێ، كە ڕۆژانە بە ملیۆنان تەن تیشكی ڕۆژ سەرف دەبێو هەمووی تەقینەوەی نێوكییە، كاتێك دێ كۆتایی پێ بێ.

هەندێكیش دەڵێن: مەبەست لە ئەجەلی یەكەم ئەوەیە كە خوای كاربەجێ دایناوە هەر بەشەرێك بە شێوەی ئاساییو سروشتی ئەوەندە بژیەت، بۆ وێنە: حەفتا ساڵ، هەشتا ساڵ، نەوەد ساڵ، سەد ساڵ، ﴿ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ﴾، بەلاّم خوا لە زانیاریی بێسنووری خۆیدا، زانیویەتی فلاّن كەسە، ژیانە سروشتییەكەی خۆی بەڕێ ناكات، سەیارە لێی دەدات، تووشی نەخۆشییەكی كتوپڕ دێ، نەفەرێك دەیكوژێ، شتێكی بۆ ڕێكدەكەوێو ژیانەكەی كۆتایی دێ.

بەلاّم من مانای یەكەمم پێ ڕاسترە، كە مەبەست لە ئەجەلی یەكەم ﴿ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ﴾،واتە: بۆ هەر كامێكتانأن ئەجەلێكی داناوە: (قَضَى لِكلّ مِنْكُمْ أَجَلاً) ﴿ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ﴾، كاتی دیاریكراوی كۆتایی هاتنی ژیانی هەموو مرۆڤەكان لەسەر زەوی، لەلای خۆیەتی، یانی بەس خوا دەیزانێ.

<u>هەڵوەستەی سێیەم:</u> كە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴾، یانی: دوای ئەوەش كە خوا ﷻ ئاوای دروست كردوونو، بەو شێوە هێناونیو، كە نە ژیانتان بەدەست خۆتانەو، نە هاتنتانو نە كۆتایی ژیانتان، هیچی بەدەست خۆتان نیە، كەچی ئێوە دەكەونە گومانیشەوە؟! كە مەبەست پێی كافرەكانە، (ثُمَّ لِلتَّرْتِيبِ مَعَ التَّرَاخِيَ) ە، واتە: (ثم) بۆ ڕیزبەندییە، بەلاّم كە ماوەی پێ بچێ، یانی دوای ئەوەش ئەوجار دەكەونە گومانەوە! شتێكی زۆر بێجێیە، بكەویە گومان لەوەدا

کە خـوا نەتوانـێ زینـدووت بکـاتەوە! لـەوەدا کـە خوایـەکی بـەرزو گـەورە کـە ئـەو کـەون و کـائینـاتو ئـەو بـازاڕەی سـاز کـردوە، کەچـی تـۆ گومانـت هەبـێ بتوانـێ زیندووت بکاتەوە، تۆ نەبـووی و تـۆی هێنـاوەتە دی، ئایـا ئێسـتا کـە گەردیلـەکانی بـوونی تـۆ بەزەویـدا بلاّو دەبنـەوە، ناتوانـێ کۆیـان بکاتـەوە؟! هـەموو خـاوەن صـەنعاتێك دوای ئەوەی صـەنعاتەکەی تێکـدەچـێ، یـان دەشکێ، دەتوانـێ دروسـتی بکـاتەوە، وەك دەفـەرموێ: ﴿ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ ﴿١٠٤﴾ ﴾الأنبيـاء، واتـە: وەك چـۆن یەکەمجـار دروسـتمان کردوە، دەیگـێڕینەوە.

**مەسـەلەی سـێیەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ يَعۡلَمُ سِرَّكُمۡ وَجَهۡرَكُمۡ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُونَ ﴾، وە ئـەو خوایـە لـە ئاسـمانەکانو لـە زەویـدا، نهێنیـیو ئاشـکراتان دەزانـێو، دەزانـێ چـی دەکـەن، ئەمـە دوو واتـای هـەن، وەك توێژەرەوانی قورئـان گوتوویانە:

١) کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتـە: (وَهُوَ اللهُ العَظِيم مُدَبِّرٌ مَعْبُودٌ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الأَرْض) ئـەو خوایـە مەزنـەی کـە کارسـازو کارهەڵسـوڕێنەرە لـە ئاسمانـەکانو لـە زەویـدا، واتـە: هـەر ئـەو بەدیهێنـەرو پەروەردگـارو خاوەنو کارسـازە.

٢) یاخود کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ ﴾، (اللّه): هەنـدێك لـە زانایان دەڵێن: (إِلَـه)ەو، (ال)ی چـۆتە سـەرێ، یـانی: (إِلَـه الحَـقّ) واتـە: هـەر خـوا پەرسـتراوی هەقـە لـە ئاسمانـەکانو زەویـدا، کەواتـە: وەك چـۆن لـە ئاسـمانان دا، فریشـتە تـەنیا خـوا دەپەرسـتن، ئێـوەش ئـەی خەڵـکی سـەر زەوی! لەسـەر زەوی تـەنیا خـوا بپەرسـتن، مەچن هەندێك لە دروستکراوەکان بکەنە هاوبەشی خوا لە پەرستراندا، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (الزخـرف)ە کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي فِي ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٞ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَٰهٞۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ ﴾، واتە: هەر ئـەوە کـە لـە ئاسمان پەرستراوە، وە لەسەر زەویش هەر ئەو پەرستراوە، وە ئەو کاربەجێی زانایـە.

ئنجا من لێرەوە دەمەوێ شتێکتان بۆ ڕوون بکەمەوە، زۆر کەس بەتایبەتی ئەوانەی مەشرەب سەلەفیین لە شتێکدا بەهەڵەدا چوون، کە دەڵێن: خوا لە ئاسمانە، هێندێکیان زۆر بە سادەیی تەماشای ئەو تەعبیرە دەکەن، پێیانوایە خوا لە ئاسمانێیەو لەسەر کورسییەك دانیشتووە ... هتد!

ئێمە دەڵێین: خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، بەڵام بە تەئکید کاتێك بووە کە نە عەرش بووەو، نە ئاسمان بووەو نە زەوی بووە، خوا پێویستی بە غەیری خۆی نیە، نە پێویستی بە عەرشەو نە بە کورسییەو نە بە ئاسمانە، ئەو کاتە خوا چۆن بوو، ئێستاش هەر وایە، ئەدی لەسەر عەرش بوونی خوای پەروەردگار چۆنە؟ ئێمە دەڵێین: کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۝٤﴾ الحدید، دوایی خوا چووە سەر عەرش، یان بەرز بۆوە بۆ سەر عەرش، ئەوە بە پێی زمانی عەرەبی ماناکەی دیارە، بەڵام بۆ خوای بێوێنە دەبێ بڵێین: وەك بۆ خوا شایستەیەو ئێمە نازانین، ئێمە کە دەڵێین: دیتنی خوا، دیتنی ئێمە بە چاوە، بەڵام ئایا دیتنی خوا بە چاوە؟ نەخێر، بیستنی ئێمە بە گوێیە، ئایا خوای پەروەردگار بە گوێ دەبیستێ؟ نەخێر، هەروەها ئێمە بە پێ دەڕۆین و بە دەست شت دەکەینو، بە زمان قسان دەکەین، بەڵام سیفەتەکانی خوای پەروەردگار پەیوەندییان بە ئەندامانەوە نیە.

کەواتە: خوا کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۝١١﴾ الشوری، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، لەسەر عەرش بوونی خوای بەرز تایبەتە بە خواوە ﷻ، هەروەك چۆن سیفەتەکانی دیکەی وەك هی دروستکراوەکان نین، لەسەر عەرش بوونی خواو، لە ئاسمان بوونی خواش، ئەویش تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە، وەك بۆ خوا شایستەیە، نەك وەك و دێتە زەینی ئێمەوە، مەخلووقێك دێتە سەر کورسی، یان لەنێو مەخلووقێکدا دەبێ، ئەوە هەمووی نەگونجاوە بۆ خوای پەروەردگار، بۆیە کە دەڵێین: خوا لە ئاسمانە، یان کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ﴾، ئەوەی کە لە ئاسمانە، دیارە مەبەست پێی خوایە، بەڵام ئایا ئاسمان مەبەست پێی چییە؟ یانی ئەوەی کە لە سەرووتانەوەیەو لە سەرووی

دروستکراوەکانەوەیە، بۆیە زانایان گوتوویانە: (اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ)، خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی لە دەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەی کە بۆ خوا شایستەیە.

کەواتە: نەیەتە زیهنتانەوە بڵێن: خوای پەروەردگار لەنێو ئاسمانێ دایە ! چونکە خوا ﷻ وەك هیچ کام لەو شتانە نیە کە دێتە زیهنو خەیاڵی ئێمەوە، وەك زانایان گوتوویانە: (وَكُلُّ مَا جَرَى بِبَالِكَ، فَاللهُ بِخِلَافِ ذَلِكَ) هەرچی بە دڵتدا دێ، بە خەیاڵتدا دێ، خوای پەروەردگار ئەوە نیە، چونکە خوای بێ وێنە، بۆخۆی وا خۆی پێناسە کردووە دەفەرموێ: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ۝١١ ﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، وە خوا وەك هیچ شتێك نیە، نە لە زاتی دا، نە لە سیفەتەکانی دا، ئنجا کە دەفەرموێ: خوا لە زەوییە، واتە: دەبێ لە زەویدا هەر تەنیا خوا بپەرسترێ، یان حوکمی خوا لە زەوییە، سیفەتەکانی خوا بەسەر خەڵکی سەر زەویشدا زاڵن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ﴾، وە هیچ کام لە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بۆ نایەتو هیچ نیشانەیەك لە نیشانەکانی پەروەردگاریان بۆ نایەت، مەگەر هەر پشتی تێدەکەن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ ﴾، هیچ نیشانەیەکیان بۆ نایەت، ﴿ مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ﴾، لە نیشانەکانی پەروەردگاریان، مەگەر هەر پشتی تێدەکەن، واتە: کافرەکان هەر جۆرە بەڵگەو نیشانەیەکیان بۆ بێ هەر پشتی تێدەکەن، وەك بڵێی: بڕیاریان داوە، سەرنجی ئایەتەکانی خوا نەدەن، بڕیاریان داوە نەیانەوێ خوا بناسنو نەیانەوێ خوا بپەرستن، خوا دەناسن کە خاوەنی کەونو کائیناتە، بەڵام نایانەوێ خوا بناسن، وەك پەرستراو، وەك پەروەردگار، وەك تاکە خاوەن، کە دەبێ هەر بەندایەتیی بۆ ئەو بکەن.

هەڵبەتە وشەی (آیة) لە قورئاندا زۆر هاتووە چەند واتایەکی هەن:

١/ لە ئەسڵدا (آيـة) بە مانای نیشانە (العلامة) دێ، چونکە زەکەریيا دوای ئەوەی کـە خـوا ﷻ موژدەی پێدا، کە کوڕیـان دەبێ، گـوتی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴿١٠﴾ ﴾مريم، واتـە: خوایـە ! نیشانەیەکم پێبـدە، (خوا) فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە کە هەتا سـێ شـەوان نـەتوانی قسـان بکـەی (زارت بگیـرێ)، بۆیـە دوایـی کـە قەومەکـەی قسـەیان لەگەڵ کـرد، ئاماژەی بـۆ کـردن، چونکـە زمانی گیـرا بـوو، کـە ئـەوە نیشانەی ئەوە بوو، یەحیا بۆتە نوتفـەو لە زگـی دایکی دایـە.

٢/ وە بە مانـای (معجـزة)ش هـاتوە، مـوعجیزە واتـە: نیشانەیەك کـە پێغەمبـەرێك ﷺ بیکاتە بەڵگـە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبـەری خوایـە.

٣/ وە بـە مانـای دیـاردەو دیمەنـە سروشـتییەکانیش هـاتوە، وەك دەفـەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ یوسـف، واتـە: زۆر نیشـانە هـەن لـە ئاسـمانەکانو زەویـدا بـە لایانـدا تێدەپەڕن، بەڵام پشـتیان تێدەکـەن.

٤/ هـەروەهـا بـە مانـای ڕسـتەکانی قورئـانیش هـاتوە، ئایەتـەکانی قورئـان، واتـە: ڕستەکان کە قورئانیـان لـێ پێکـدێ.

٥/ وە بـە مانـای ڕووداوی سـەیریش هـاتوە، وەك شـەق بـوونی مـانگ لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ، کافرەکـان داوای موعجیزەیـەکیان لـە پێغەمبـەری خـوا کـرد، گوتیان: مانگمان بـۆ شـەق بکـە، ئامـاژەی بـۆ کـرد، مـانگ لـەت بـوو، لـە سـووڕەتی (القمـر)دا دەفـەرموێ: ﴿ ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: قیـامەت نـزیك بـۆوەو مانـگ لـەت بـوو، وە ئەگـەر ئایەتێـك، نیشـانەیەك بێـنین (کـە مەبەسـت پێـی ڕووداوی لـەت بـوونی مانگـە)، پشتی تێدەکەنو دەڵێن: ئـەوە جادوویـەکی بەردەوامـە. (یانـی: ئەمەش هەر جادوویە).

کەواتە: وشەی (آیـة) بەو پێنج واتایانە هاتوە، بۆیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی موعجیزەکان بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی ئەو ڕووداوانە بێ، کە نیشانەن لەسەر ئەوەی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، ئەوانە هەقیان بە درۆ دانا، دوای ئەوەی بۆیان هات، لەمەودوا هەواڵی ئەوەی کە گاڵتەیان پێدەکرد، بۆیان دێ.

(النَّبَـأُ: الخَبَـرُ المُهِـم) واتە: هەواڵێکی گرنگ، کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، لەمەودوا هەواڵەکانی ئەوەی کە گاڵتەیان پێدەکرد، بۆیان دێ، واتە: ئەو شتەی کە گاڵتەیان پێدەکرد، دێ، یاخود سزای ئەو گاڵتە پێکردنەیان بۆ دێ، هەر دوو واتاکەی هەیە، ئنجا خوا ﷻ سێ وشەی بەکارهێناون بۆ ئەو کافرانە، کە بریتین لە: (إِعْرَاض، تَكْذِيب، إِسْتِهْزَاء) پێشی فەرموویەتی: ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، وە هیچ نیشانەیەك لە نیشانەکانی پەروەردگاریان بۆ نایەت، مەگەر هەر پشتی تێدەکەن، پشت تێکردن، یەکەمین قۆناغی کافربوونە، یەکەمین قۆناغی بەرەو کوفر چوون، ئەوەیە کە ئینسان پشت لە ئایەتەکانی خوا بکات، پشت لە دینی خوا بکات، دوایی بە درۆ دانان، ئەوجار گاڵتە پێکردن.

کەواتە: کوفر پلەپلە ئینسان پێیدا ڕۆ دەچێ، پێشێ کوفرێکی سووکترە، دوای وردە وردە قورس دەبێ، دوایە وردە وردە قورسترو قووڵتر دەبێتەوە، خوا پەنامان بدات، هەروەها ئیمانیش هەروایە، ئیمانیش ئینسان یەکسەر نابێتە ئیمانداریکی زۆر ئیمان دامەزراوو ئیمان کامڵ، ئەو پلەپلەیی یە سوننەتی خوایە لە دروستکراوەکانی داو، لە فەرمانەکانی دا (التَدَرُّج: سُنَّةُ اللهِ فِي خَلْقِه، وفِي أَمْرِهِ)، خوا شتەکانیشی بە پلەپلەیی دروستی کردوون، وە فەرمانەکانیشی کە

ناردوون بە پلەپلەیی ناردوونی، هەموو شتێکی لێکرا حەڵاڵ نەکردوە، هەموو شتێکیشی لێکرا حەرام نەکردوە، بەڵکو پلەپلەیی تێدا ڕەچاو کردوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ ﴾، چەند هەڵوەستەیەك لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا دەکەین:

یەکەم: کە دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ ﴾، ئەگەر ماناکەی بە سادەیی لێکدەینەوە، واتە: ئایا نەیانبینی لە پێش واندا چەند سەدەمان فەوتاندن، یانی: چەند کۆمەڵگا کە لە سەدەیەکدا بەیەکەوە دەژیان، بەڵام ئایا مەبەست لەو بینینە چییە؟ مەبەست لێی بینینی عەقڵە، وەك ڕوونکەرەوانی مانای قورئان گوتوویانە: (الرُّؤيَةُ هُنَا قَلْبِيَّةٌ وَلَيْسَتْ بَصَرِيَّةً)، یانی: بینین لێرەدا بینینی دڵە نەك چاو، ئایا بە عەقڵ نازانن لە پێش واندا چەندان کۆمەڵگای دیکە فەوتاون، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بڕوایان بە ئایەتەکانی خواو بە پێغەمبەرانی خوا نەکردوە، ئایا مێژوویان نەخوێندۆتەوە، نەیانبیستوە؟!

دووەم: کە دەفەرمووێ: ﴿ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ ﴾، (قرن) واتە: جیل، یان کۆمەڵگا، یان کۆمەڵە خەڵکێك کە لە کاتێکدا کە پێکەوە دەژین، لێرەشەوەیە کە زانایان وشەی (قَرْن)یان بۆ سەد ساڵ، یان بۆ حەفتا ساڵ، بەکارهێناوە، بەڵام لێرەدا کە دەفەرمووێ: ﴿ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ ﴾، چونکە سەد ساڵ بۆخۆی لە بەین ناچێ، مەبەست ئەو خەڵکەیە کە لەو سەد ساڵەدا ژیاون، یان لەو حەفتا ساڵەدا بەیەکەوە ژیاون، ئەو خەڵکە فەوتاون، کەواتە: مەبەست لە (قرن) واتە: خەڵکێك کە لەو سەدەیەداو لەو کاتەدا بەیەکەوە ژیاون.

سێیەم: کە دەفەرمویٚ: ﴿ مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَا لَمۡ نُمَكِّن لَّكُمۡ ﴾، زۆر جیل‌و کۆمەڵگامان فەوتاندن لە پێش واندا، کە لە زەویدا بەهێزمان کردبوون، نیشتەجێمان کردبوون، دەسەڵات‌و توانای مادییمان پێدابوون، کە ئەوەمان بە ئێوە نەدابوو، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (أمْكنّاهُ فِي الأَرْضِ، أَوْ مَكَنَّاهُ فِي الأَرْض)، هەردووکی یەك مانای هەیە، واتە: لە زەوییدا پێگەی پێداو چەسپاندی، دەستەڵاتی پێدا، دەست ڕۆیشتووی کرد، باڵادەستی کرد، دەفەرمویٚ: لە پێش ئەواندا ئەو کافرانەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، وە کافرەکانی سەردەمی ئێمەش‌و زۆر گەل‌و کۆمەڵگامان فەوتاندوون، کە لەوان بەتواناتر بوون.

هەڵبەتە بە پلەی یەکەم مەبەستی پێی کافرەکانی قورەیشە، کە لە مەککە لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستابوون، واتە: ئەو تواناو ئیمکانیەتە مادییەی کە دابوومان بە کافرەکانی پێش ئێوە، کە لە ئەنجامی ئەوەدا بڕوایان بە پێغەمبەرانی خوا نەکرد، فەوتاندمانن، ئەو ئیمکانیەتەمان نەداوە بە ئێوە، ئەوان لە ئێوە توانادارتر بوون، دەست ڕۆیشتووتر بوون، دەوڵەمەندتر بوون، بە دەستەڵاتتر بوون، کەچی هەر فەوتاندیشمانن، کەواتە: ئێوە بە ئاسانتر دەفەوتێنین، هەرچەندە بۆ خوای توانا ئاسان‌و قورس نیە، هەمووی وەك یەکە، خوا ئەگەر ویستی شتێك ببێ، هەر پێویست ناکات پێشی بفەرمویٚ ببە، هەر کە ویستی یەکسەر دەبێ، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٤٠ ﴾النحل، ئەوجار باسیان دەکات کە ئەو گەلانە، ئەو کۆمەڵگایانە چۆن بوون.

چوارەم: دەفەرمویٚ: ﴿ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡهِم مِّدۡرَارٗا وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَنۡهَٰرَ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَنشَأۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِمۡ قَرۡنًا ءَاخَرِينَ ﴾، وە ئاسمانمان، واتە: بارانی هەورمان بە خوڕزەوە بەسەردا باراندن، (السَّمَاء) لێرەدا مەبەست پێی هەور (سَحَاب)ە، یاخود مەبەست پێی باران (مَطَر)ە، واتە: باران بارینی

بە خورزەم، بە ڕێژنە، چونکە وشەی (مِدْرَار) لە (دِرّة)ەوە هاتوە (درة)ش بریتیە لەوەی کە گوانی ئاژەڵێك بدۆشیو شیرێکی زۆر لێ بڕژێ، ئنجا ئەگەر باران زۆر بوو، ڕووباریش زۆر دەبن، بۆیە دەفەرموێ: ڕووباریشمان گێڕابوون بە ژێر کۆشكو باڵەخانەکانیاندا دەڕۆیشتن، واتە: نیعمەتی زۆرمان پێدا بوون، ئیمکانیەتو توانای زۆرمان پێدا بوون، وڵاتمان بۆ ئاوەدان کردبوونەوە، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (ئاوو ئاوەدانی).

پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴾، بەهۆی گوناهەکانیانەوە فەوتاندمانن، واتە: ئێوەش وریابن، ئەگەر لەسەر گوناهان بەردەوام بن، هەمان چارەنووسی ئەوانتان دەبێ.

شەشەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴾، لە دوای وان سەدەی دیکەمان پێگەیاندن، واتە: ئەگەر ئێوەش لابەرین، جیلی دیکەو خەڵکی دیکە، کە لە سەدەیەکی دیکەی جیا لە سەدەی ئێوەدا دەژین، دێنو دەبنە میراتگری ئێوە، ئەوە هەڕەشەیەکە خوای کاربەجێ دەیکات.

کەواتە: پەند لە پێشووانتان وەربگرنو، هەڵەی ئەوان دووبارە مەکەنەوە، بۆئەوەی هەمان چارەنووسی ڕەشی کە بەسەر وان هاتوە، بەسەر ئێوەش نەیەت.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، هەڵبەتە ئەمە لە وەڵامی داواکارییو پێشنیارو بیانوو گرتنی کافرەکاندایە، دیارە ئەوان بیانوویان بە پێغەمبەر ﷺ گرتوە، کە دەبێ خوا ﷻ نامەیەکیان بۆ بنێرێ، پێغەمبەریش ﷺ بیانداتێو نووسرابێ لە خوای پەروەردگارەوە بۆ ئەبو جەهل، بۆ ئەبو سوفیان، بۆ نەضری کوڕی حاریث، بۆ عوتبە، بۆ شەیبە، بۆ فلان، بۆ فیسار! موحەممەد پێغەمبەری منەو ئیمانی پێ بێنن! چونکە دەیانگوت: بە چی بزانین کە تۆ پێغەمبەری!!

وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥ ... ﴾، واتە: (کافرەکان دەڵێن: وە ئیمانت بۆ ناهێنین هەتا ......، وە دەبێ بچێ بۆ ئاسمانێ، وە بڕواش بە چوونە ئاسمانەکەتو بە بەرزبوونەوەت ناهێنین، هەتا کتێبێك، نامەیەکمان بۆ نەهێنی بیخوێنینەوە، نامە لە خوای پەروەردگارەوە بۆ فلانی کوڕی فلان! ئیمان بە موحەممەد بێنە، پێغەمبەری منە !!

تەماشا ئەو بیانووە بێعەقڵانەیە بکەن! وەك بڵێی خوا ﷻ (بەشەرێك بێ، کوێخای دێیەك بێ، حوکمڕانێك بێ، لە شوێنێك، زۆر یەکی لەسەر وان کەوتبێ، داخۆ ئیمانی پێدێنن، یان نا؟)، ئنجا لەوێ خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٣﴾ ﴾، واتە: بڵێ: پاکیی بۆ پەروەردگارم{کە من داوای شتی وای لێ بکەم} من تەنیا بەشەرێکی ڕەوانە کراوم، هەرگیز ئەو شتانە لە خوا داوا ناکەم، خوا نامە بۆ چەند کەس بنێرێ؟ ئەگەر نامەی بۆ سەردەمی وان ناردبایە، کافرەکانی ئێستا دەیانگوت: دەبێ نامە بۆ ئێمەش بنێرێ، ئەو هەموو نامانە چۆن دەنێردرێن؟!

ئنجا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ كِتَٰبٗا فِي قِرۡطَاسٖ فَلَمَسُوهُ بِأَيۡدِيهِمۡ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾، وە ئەگەر کتێبێك لە نووسراوێکدا بنێرین بۆ سەر تۆ، (کتاب) واتە: نووسراو، یاخود نامە، نامەیەك لە شتێك دا کە لەسەری بنووسرێ، {قرطاس: دەگونجێ چەرم بێ، پێست بێ، گەڵای درەخت بێ، بەردی تەنك بێ، وە دەشگونجێ کاغەز بێ، وەك ئێستا هەیە، هەمووی دەگرێتەوە} بە دەستی خۆیان دەستی لێ بدەن، ئەوجار ئەوانەی

بێبڕوان دەڵێن: ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە، واتە: ئەگەر ئەوەشمان کردبایە هەر ئیمانیان نەدەهێناو دەیانگوت: ئەوە جادوویە، ئەگەرنا نامە چۆن لە ئاسمانێ دێ؟ ئەمە سیحرە کردووتە، کەواتە: خوای پەروەردگار مەبەستی لەو ئایەتە موبارەکە ئەوەیە، کە ئەوانە کەللەڕەق و نەسەلمێن و عینادن، ئەی پێغەمبەر ﷺ! خەمیان لێ مەخۆ، تۆ موعجیزەو بەڵگەی خۆت پێیە، کە ئەو قورئانەیە، وە بەرنامەی خۆت پێیە، بەڵکو هەر بۆخۆت موعجیزەی، وەك مەولەوی شاعیر دەڵێ:

هەتیو وە ئەدەو ئومی عەللامە لەمە موعجیزتر موعجیزە کامە

واتە: منداڵێکی بێ باب و دایك، ئەو هەموو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزە، کە مامۆستای بەشەرە لە ئەدەبدا، بە بەڵگەی ئەوەی خوای پەروەردگاریش دەربارەی ڕەوشتی بەرزی فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾القلم، واتە: بێگومان تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) لەسەر ڕەوشتێکی زۆر گەورەو مەزنی. (ئوممی عەللامە) نەخوێندەوار بێ و عەللامەیەك بێ، هەموو خەڵك بە شانازییەوە ئامادەبێ قوتابی وی بێ، ئەدی ئەگەر ئەوە خوا فێری نەکردبێ، لە کوێ فێر بووە؟ کەواتە: پێغەمبەر ﷺ هەر خۆی موعجیزەیەو هەر خۆی بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی خۆیەتی، کەواتە: تۆ نوقسانییت نیە، لە بەڵگەدا، بەڵام ئەوانە نوقسانییان هەیە لەوە کە ناسەلمێنن و نایانەوێ دان بە هەق دابنێن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانەی سووڕەتی (الحجر)ە، لە ئایەتەکانی (١٤و١٥)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّوا۟ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓا۟ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر دەرگایەکیان بۆ بکەینەوە بچن بەرەو ئاسمانێ و بەرز ببنەوە (دەرگایان بۆ بکەینەوەو پەیژەیەکیشیان بۆ دابنێین بۆ ئاسمانێ بچن) ئەوجار دەڵێن: ئەوە ئێمە چاومان بەستراوە، بەڵکو ئێمە جادوومان لێکراوە، واتە: ئەگەر دەرگاشیان بۆ بکەینەوەو پەیژەشیان بۆ بەردەینەوە خوارێ و بچن بۆ ئاسمانیش، دەڵێن: ئەوە فێڵمان لێکراوەو جادوومان لێکراوەو هەڵخەڵەتێنراوین.

هەروەهـــا لــە ســوورەتی (الطـور) لــە ئایــەتی (٤٤)دا دەفــەرموێ: ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطٗا يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتـــە: ئەگــــەر پارچــــە ئاسمانێكیشــیان بەســـەردا بەردەینـــەوە (پارچــــەیەك ئاســـمانیان بەســـەردا بەربێـتەوە، بۆ وێنـە: یەكێك لـە خڕۆكەكان بەربێـتەوە) دەڵـێن: ئـەوە هـەورێكـە كەڵەكـە بووە لەسـەر یەك‌و، دیسـان دانـی پێدا ناهێنـن.

**مەســـەلەی هەشـــتەم**: كـە دەفــەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴾، وە (كافرەكــان) گوتیــان: دەبووایــە فریشــتەیەك دابەزێتـە ســەری (یانــی: فریشــتەیەكی لەگەڵـدابێ، بلێــ مـن شـایەدم كـە ئـەو موحەممـەدە پێغەمبـەری خوایـە)، وە ئەگــەر ئێمـە فریشـتەمان دابەزاندبووایـە كـار تەواو دەبـوو، دوایـی چاوەڕێشـیان نەدەكـرا، یانی: چی كــار تــەواو دەبوو؟ واتـە: ئەگەر فریشـتە بنێـرین سـوننەت‌و قـانوونی خـوا وایـە، فریشـتـە بـۆ سـزا دەنێرێ، بۆیە دەینێـرێ، كە ئەو قەومـە بفەوتێنــێ، ئنجـا ئەگەر فریشـتە بنێـرین بۆ فەوتانـدنیان دەینێـرین، هـەروەك چۆن فریشـتەی نـارد بـۆ قـەومی لـووط ؑ، دوایی ئەوە بوو قەومی لووطیـان ژێرەوژوور كـرد.

ئنجــا ئــەم ئایەتــە وەك ئــەو ئایەتانــەی ســوورەتی (الحجـر) وایــە، كــە خــوا دەفــــــەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ﴿٦﴾ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ ﴾، واتــە: وە گوتیـــان: ئـــەی ئـــەو كەســـەی كــە (ذكــر)ی دابەزێندراوەتـە سـەر! بێگومـان تـۆ شـێتی، ئـەدی بۆچـی فریشـتەمان بـۆ نـاهێنی، ئەگـــەر لـــە ڕاســـتانی، (خـــواش ﷻ وەڵام دەداتـــەوەو دەفـــەرموێ:) فریشـــتان دانابەزێنیـــن، مەگـــەر بـــە هـــەق نەبـــێ، وە ئەگـــەر فریشـــتەمان دابەزاندبایـــە، چاوەڕێمان نەدەكـردن، واتـە: فریشـتان دابەزێنیــن، بـۆ ئـەوەیان دادەبەزێنــین لـە بـەینیان بـەرن، خــواش ﷻ نەیویســتوە ئەوانــە لەبــەین بــەرێ، بۆیــە فریشــتەی دانەبەزانـدوون.

هەروەها لە سوورەتی (الفرقان) لە ئایەتەکانی (٢١و٢٢)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە ئومێدیان بە دیداریی ئێمە نیە، گوتیان: بۆچی فریشتە دانابەزێتە سەرمان، یان بۆچی پەروەردگارمان نابینین؟ (خوا دەفەرموێ) خۆیان زۆر پێ گەورە بووە، وە زۆر تووشی ملهوڕیی‌و سەرکێشیی بوون، ئەو ڕۆژەی کە فریشتەکان دەبینن موژدە بۆ ئەوان (بۆ تاوانباران) نیە، لەو ڕۆژەدا، وە دەڵێن: دەبێ هیچ کەسێك هەبێ بەلامان لێ لابداو بۆمان ببێتە پەرژین‌و بۆمان ببێتە دیوارێك؟! بەلام نەخێر، هیچ کەس بەلای خوا ناگێڕێتەوە، ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ئەگەر فریشتەمان ناردبایە کاریان تەواو دەبوو، زانایان چوار مانایان بۆ لێك داوەتەوە:

یەکەم: ئەگەر فریشتە هاتبایە، بەس بۆ سزادانیان دەهات‌و کۆتاییان پێ دەهات.

دووەم: ئەگەر فریشتەیان دیتبایە، تەحەممولیان نەدەکرد، فریشتە ببینن لەسەر شێوەی خۆی، بەشەر ناتوانێ‌و تەحەممول ناکات فریشتە ببینێ.

سێیەم: ئەگەر فریشتەیان دیتبایە، قۆناغی تاقیکردنەوە کۆتایی پێ دەهات، چونکە ئەگەر فریشتە بێ، مانای وایە مرۆڤ لەنێو تاقیکردنەوەدا وەڵامی پرسیارەکانی وەرگرتوە! بەلام ئیمتیحان ئاوا نیە، خوای کارەجێ ئێمە تاقی دەکاتەوە لەم ژیانە دنیاییەدا، خۆی لە ئێمە پەنهان کردوە، فریشتە نابینین، دۆزەخ نابینین، قیامەت جارێ نەهاتوەو غەیبە، خوای پەنهانزانیش کە باسی ئیمانداران دەکات، بەوە وەسفیان دەکات کە بڕوایان بە پەنهان هەیەو دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ ﴾ البقرة، ئنجا ئەگەر تۆ هەموو شتەکان ببینی، ئەوە کەی تاقیکردنەوەیە، ئەوە مانای وایە قۆناغی تاقیکردنەوە بەسەر دەچێ‌و کۆتایی دێ.

چوارەم: ئەگەر فریشتەیان دیبایە، وە ئیمانیان پێ نەهێنابایە، شایستەی سزای مەرگ دەبوون.

**مەسەلەی نۆیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ﴾، وە ئەگەر پێغەمبەرمان گێڕابایە بە فریشتە، دەبوو ئەو فریشتەیەمان گێڕابایە بە پیاو، ئەو کاتیش ئەوەی کە ئێستا لە خۆیانی تێکەڵ دەکەن، دیسان لێمان تێکەڵ دەکردن، یانی: چی؟ واتە: ئەگەر موحەممەد ﷺ کە بەشەرێکەو کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتتەلیبی کوڕی عەبدولمەنافە، تا دەچێتەوە سەر عەدنانو ئەویش دەچێتەوە سەر ئیسماعیلو، ئەویش دەچێتەوە سەر ئیبراهیم، ئەگەر ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەشەر نەبووایە، فریشتەیەك بووایە، دەبوو بچێتە سەر شێوەی بەشەرێك، پیاوێك، چونکە پێغەمبەران هەموویان لە پیاوان بوون، ئنجا با سەرنج بدەین: پیاوێك هاتوە دەڵێ: من پێغەمبەری خوام، کاکە تۆ کێی؟ من فریشتەم، ئەدی بۆچی لەسەر شێوەی پیاوی؟ ئاخر خوا منی بردۆتە سەر شێوەی پیاو، بۆئەوەی بتوانن بمبینن، لەسەر شێوەی خۆم ناتوانن بمبینن، ئنجا کێ دەڵێ: تۆ فریشتەی ...؟ سەرەنجام لێیان تێکەڵ دەبوو.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ﴾، وە لێمان تێکەڵ دەکردن، ئەوەی ئێستا لە خۆیانیان تێکەڵ کردوە، واتە: ئەگەر فریشتەشمان ناردبایە، ئەگەر لەسەر شێوەی خۆی بووایە بۆ سزا دەبوو و، لەبەین دەچوون، وە ئەگەر خۆشی بردبایە سەر شێوەی پیاوێك، دیسان ئەوانە لێیان تێکەڵ دەبوو، وە ئەو ئامانجەی ئەوانی هەر نەدەپێکا.

کەواتە: هاتنی فریشتە دوو حاڵەتی دەبوون:

یەکەم: یان لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی دەبوو، کە ئەو کاتە نەیاندەتوانی ببینن، یان ئەگەر بینیباشیان تەحەمولیان نەدەکرد، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ کە جبریلی لەسەر شێوەی خۆی بینی، زۆر ترسا! ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، قَالَ: وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ، فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: بَيْنَا أَنَا

أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ بَصَرِي فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ، فَرَجَعْتُ، فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي﴾[١]، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەو کاتەی دەکرد کە وەحی پچڕابوو، لە کاتی قسەکردنی دا دەیفەرموو: لە کاتێك دا کە دەڕۆیشتم گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمان، چاوم بەرز کردەوە، ئەو فریشتەیەی کە لە (ئەشکەوتی حیرا) هاتە لام (لەسەر شێوەی پیاوێكو سێ جار بەخۆیەوە گوشی، وە گوتی: بخوێنە)، تەماشام کرد لەسەر کورسییەك دانیشتوە، نێوان ئاسمانو زەوی پڕ کردبوو، لێی ترسام، وە گەڕامەوەو گوتم: داماپۆشن.

کەواتە پێغەمبەری خواش تەحەممولی نەکردوە لەسەر شێوەی خۆی فریشتە ببینێ، ئەدی خەڵکی دیکە چۆن تەحەمولی دەکات؟ ئەوە ئەگەر لەسەر شێوەی خۆی بێ.

دووەم: وە ئەگەر لە شێوەی پیاوێکیش دابووایە، ـ وەك گوتم ـ لێیان تێکەڵ دەبووو دەیانگوت: کێ دەڵێ تۆ مەلائیکەتی؟ ئاخر مەلائیکەتمو چوومەتە سەر شێوەی پیاوو؟، ئاخر چۆن بزانین ؟! ئەگەرنا بێگومان پێغەمبەر ﷺ چەند جارێك جبریلی لەسەر شێوەی (دِحْيَةُ الْكَلْبِيّ) بینیوە، (أم سلمة) خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: جبریل دەچووە سەر شێوەی (دِحْيَةُ الْكَلْبِيّ) کە یەکێك بووە لە هاوەڵانو پیاوێکی زۆر جوان بووە، لەسەر شێوەی وی دەیبینی، ئەگەر شێوەی چووبایە سەر پیاوێك.

**مەسەلەی دەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنْهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ ﴾، ئەوە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ، خوا دەفەرموێ: لەپێش تۆشدا گاڵتە بە زۆر لە

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٢٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَحْمَدُ برقم: (١٤٥٢٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٩٩٣) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين.

پێغەمبەران كراوە، بەڵام ئەوەی كە گاڵتەیان پێدەكرد، گاڵتە پێكراوەكە دوایی دەورەی دان.

پێغەمبەر ﷺ پێی دەگوتن: خوا دەتانفەوتێنێ، خوا بوومەلەرزەتان بۆ دێنێ، خوا لافاوتان بۆ دەنێرێو دەتانخنكێنێ، كەچی ئەوان گاڵتەیان پێكردوە، ئیدی سەرنجام ئەو شتەی كە گاڵتەیان پێكردوە، دەوری داون، یاخود ئەوەی كە گاڵتەیان پێدەكرد، كە هاتنی قیامەتە، قیامەتی ئەوان هات، هەڵبەتە قیامەتی گەورەش بەتەئكید بەرێوەیە، وشەی (حَاقَ) هەندێك بە (أحَاط) واتە: دەوری دان، وە هەندێكیش بە (جَاءَ وَنَزَلَ) هات، وە دابەزی، لێكیان داوەتەوە.

كەواتە: ئەی موحەممەد ﷺ تۆش وەك ئەو پێغەمبەرانە كە خەڵكەكەیان گاڵتەیان پێدەكردن، ئەو هەڕەشانەی كە تۆ لێیان دەكەی، كە لە قورئاندا هاتوون، بەتەئكید ئەگەر ئیمان نەهێنن، ئەو هەڕەشانە بۆ ئەوانیش دێنە دی، ئنجا چ لە كاتێك دا كە لە ژیاندان، بێتە دی، چ لە دوای مردن، بۆیان بێتە دی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەمان دا ئایەتەکانی (١١ تا ٢١) واتە: یازدە (١١) ئایەت تەفسیر دەکەین، لەم یازدە ئایەتەدا خوا ﷻ دە جاران وشەی (قل) ئاراستەی پێغەمبەری خۆی دەکات، کە دیارە لەم سوورەتەدا بەگشتی چلو دوو جار (٤٢) جار ئەو وشەیە دووبارە بۆتەوە، خوای تاكو تەنیا لەم ئایەتانەدا بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەفەرموێ: بە هاوبەشدانەرەکان بڵێ: بە زەویدا بڕۆنو سەرنج بدەن، ئایا سەرەنجامی بە درۆ دانەرانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چۆن بووە؟ پاشان دەفەرموێ: لێیان بپرسە: ئایا کێ خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییە؟وە پێیان بڵێ: ئایا بێجگە لە خوا دۆستو پشتیوانێکی دیکە بگرم؟ واتە: کەسی دیکە شایستەی ئەوەنیە کە بیکەمە دۆستو مشوورخۆری خۆم.

پاشان خوا بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەفەرموێ: کە بە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان ڕابگەیەنێ: کە فەرمانی پێکراوە، (واتە: پێغەمبەر لەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە) کە یەکەمین گەردنکەچ بێ بۆ خوا، وە لە هاوبەش بۆ خوادانەران نەبێ، وە هەروەها پێیان ڕابگەیەنێ: کە ترسی سزای پەروەردگاری هەیە، لە ڕۆژێکی مەزندا، ئەگەر بێتو گیرۆدەی شیركو هاوبەش بۆ خوادانان بێ.

دوایی خوای بێ وێنە باسی چەند سیفەتێکی مەزنی خۆی دەکات: کە هەر ئەو خێرو شەڕی بەدەستە، وە بەسەر بەندەکانیانەوە باڵادەستە، وە کاربەجێی شارەزایە، ئنجا جارێکی دی فەرمان بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەکات: کە پرسیار لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکە: ئایا شایەدیی دانی کێ گەورەترە لە شایەدیی دان دا؟ دوایی هەر بۆخۆی وەڵام دەداتەوە کە: خوای باڵادەستو زاناو شارەزا شایەدی نێوانمانە، وەك قورئانیشی بۆ ناردووم کە پێتان ڕابگەیەنم، وە بە هەر کەسێکی دیکەش کە پێی دەگات.

وە پاشــان فــەرمانی پێــدەکات کــە یــەکتایی خــواو تــەنیایی خــوا ڕابگەیەنـــێ، وە دەیخاتەڕوو کە خاوەن کتێبەکـان جوولـەکەو نەصــڕانییەکانو ئـەوانی دیکـە، قورئـان، یــان موحەممـــەد ﷺ وەك کوڕەکـانی خۆیـان دەناسـن، وەك چـۆن مرۆڤـ کـوڕی خـۆی دەناسـێ، لـەنێو منداڵانـدا ئەگـەر بیبینـێ، ئـەوانیش ئـاوا دەزانـن کـە موحەممـەد ﷺ پێغـــەمبەری خوایـــەو، قورئـــان دوایـــین کتێبـــی خوایـــە، بـــەڵام لـــە ســـۆنگەی خـــۆ دۆڕاندنیـانەوە، کە خۆیـان لەدەسـتداوە، ئیمـان ناهێنـن.

وە لە کۆتـاییـدا خـوا دەفەرموێ: هیچ کـەس سـتەمکارتر نیـە لـەو کەسـەی کـە درۆ بـە نـاوی خـــواوە دەکـــات، واتـە: هاوبـەش بـۆ دادەنـێ، یـان ئایەتەکـانی خـوا بـە درۆ دەزانـێ.

﴿قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ (١١) قُل
لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ
يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ (١٢) وَلَهُۥ
مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (١٣) قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ (١٤) قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ
(١٥) مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ (١٦) وَإِن يَمۡسَسۡكَ
ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ (١٧)
وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ (١٨) قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ
شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ
أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ
(١٩) ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُۘ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ
لَا يُؤۡمِنُونَ (٢٠) وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ
ٱلظَّٰلِمُونَ (٢١)﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

(("ئەی موحەممەد" پێیان بڵـێ: بـە زەویدا بـڕۆنو بگەڕێن، پاشان سـەرنج بـدەن! سـەرەنجامی بـە درۆ دانـەران (ی پێغەمبـەران) چـۆن بـووە! ﴿١١﴾ بڵـێ: ئایا ئـەوەی لـە ئاسـمانەکانو زەوی دایـە هـی کێیـە؟ بڵـێ: هـەر هـی خوایـە، بـەزەیی پێداهاتنـەوە (بەرانبــەر بـە دروسـتکراوەکان)ی لەسـەر خـۆی پێویسـت کـردوە، بێگومـان لـە ڕۆژی قیامەتـدا بەرەو گۆڕەپانی کۆکردنـەوە کۆتان دەکاتەوە، کە هیچ گومانی تێدانیـە، ئەوانە (ی بێبـڕوان) خۆیانیـان لەدەست داوە، بۆیـە ئیمان نـاهێنن ﴿١٢﴾ وە هەرچـی دەکەوێتـە ژێر ڕکێفـی شـەوو ڕۆژەوە، هی ویـە، وە ئـەو بیسـەری زانایـە ﴿١٣﴾ بڵـێ: ئایا جگـە لـە خوا، دۆسـتو سـەرپەرشـتیارێکی دیکـە بگرم، پەیداکەری ئاسـمانو زەوی، لـە حاڵێکـدا کـە ئـەو خـۆراك دەداتو خـۆراك نـادرێ؟ بڵـێ: بـە دڵنیاییـەوە مـن فـەرمانم پێکـراوە یەکـەمین کەس بم، کە ملکـەچ دەبـێ (بۆ خوا) وە پێم گوتراوە: کە لە هاوبەش دانـەران نەبـی! ﴿١٤﴾ بڵـێ: مـن ئەگـەر سـەرپێچیی لە پەروەردگـارم بکـەم، لـە سـزای ڕۆژێکـی مـەزن دەترسـم ﴿١٥﴾ هـەر کـەس لـەو ڕۆژەدا لـێی لابـدرێ، ئـەوە (خـوا) بـەزەیی پێداهاتوە، وە هەر ئەوەش بردنەوەیەکی ڕوونـە ﴿١٦﴾ وە ئەگـەر خـوا تووشـی زیانێکـت بکات، جگـە لـە خـۆی هـیچ کـەس لای نابـات، وە ئەگـەر چاکەیەکیشـت تـووش بکـات، ئـەوە بێگومـان لەسـەر هـەموو شـتێك بـە توانایـە ﴿١٧﴾ وە ئـەو (خـوا) بەسـەر بەندەکانیەوە ملپێکـەچکەرە، وە ئـەو کاربەجێـی شـارەزایە ﴿١٨﴾ بڵـێ: ئایـا چ شـتێك شـایەدییدانەکەی گەورەتـرە؟ بڵێ: خـوا، لە نێـوان منو ئێـوەدا شـایەدە (کە تەنیـا خـوا پەرستراوی ڕاستەقینەیە) وە ئـەم قورئـانەم بـۆ نێرراوە، کـە ئێـوەی پـێ وریـا بکـەمەوەو، هەر کەسێکی دیکـەش کە پێی دەگـات، ئنجـا ئایا ئێـوە شـایەدیـی دەدەن کـە لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوی دیکـە هـەن؟ بڵـێ: مـن شـایەدیی (وا) نـادەم، بڵـێ: بێگومان پەرستراوی هـەق تـەنیا یـەك پەرستراوە، وە مـن دوورو بەرییـم لـەو شـتانەی دەیانکـەنە هـاوبەش (بۆ خـوا) ﴿١٩﴾ ئەوانـەی کتێبمـان پێـداون دەیناسـن (قورئـان، یـان

موحەممەد) وەك چۆن كوڕەكانیان دەناسن، ئەوانە (ی بێبڕوان) خۆیانیان دۆڕاندوە، بۆیە ئیمان ناهێنن ﴿٢٠﴾ ئنجا ئایا كێ ستەمكارترە لە كەسێك درۆ بە ناوی خواوە بكات (كە گوایە هاوبەشی هەن) یان بڕوای بە ئایەتەكانی نەبێ، بێگومان ستەمكاران سەرفراز نابن﴿٢١﴾))

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( كَتَبَ ): واتە: نووسی، بەڵام لێرەدا بەو مانایە نایەت، وەك لە چەند شوێنی دیكەی قورئانیش دا ئەم وشەیە هاتوە، بەڵكو بە مانای (أَثبت، قدّر، أَوجب، فرض، أَلْزَم) واتە: چەسپاندی، بڕیاریدا، پێویستی كرد، بڕیارێكی یەكلاكەرەوەی دا.

(سَكَنَ ): (السكن، السُّكُونُ: ثبُوتُ الشَّيءِ بَعدَ تَحرُّكٍ)، (سكن) بریتیە لە سەقامگیربوونی شتێكو ئارامگرتنی دوای ئەوەی كە جووڵاوە. (وَيُستَعْمَلُ في الإستِيطانِ وَاسمُ المَكَانِ نحو: سكن فلان، مكان كذا، سكن: من السكنى، أو السكون، مَسكن وجَمعُهُ مَساكن) واتە: (سكن) لە نیشتەجێبوونیشدا بەكاردەهێنرێ، وە بریتیە لە ناوی شوێنیش، دەگوترێ: لە فلان شوێن نیشتەجێ بوو، كەواتە: وشەی (سكن) كە لێرەدا هاتوە، لە زمانی عەرەبیدا دەگونجێ بە مانای وەستان بێ دوای جووڵە، وە بە مانای نیشتەجێبوون بێ لە شوێنێك، وە (مسكن) بە (مساكن) كۆ دەكرێتەوە.

(وَلِيًّا ): واتە: دۆستتان، سەرخەرتان، پشتیوانتان، (الوَلاءُ وَالتَّوالِي: أَنْ يَحْصُلَ شَيْئَانِ فَصَاعِداً حُصُولاً لَيسَ بَيْنَهُمَا مَا لَيْسَ مِنْهُمَا، وَيُسْتَعَارُ ذَلِكَ لِلْقُرْبِ مِنْ حَيْثُ الْمَكَانُ، وَمِنْ حَيْثُ النِّسبةُ، والدِّينُ، والصداقة، والنصرة، والإعتقاد)، وشەی (وَلاءُ و تَوالِي) مانایان ئەوەیە كە دوو شت بە دوای یەكدی دابێن، وە هیچ شتێكی دیكەیان نەكەوێتە نێوانەوە، وە دەخوازرێتەوە بۆ نزیكیی لە ڕووی شوێنەوە، یاخود لە ڕووی خزمایەتییو نەسەبەوە، یاخود لە ڕووی ئایینو مەزهەبەوە، یان

له ڕووی برادەرایەتیی‌و سەرخستنەوە، یان لە ڕووی بیروبڕواوە، وشەی: (وِلايَـةُ) بە مانای سەرپەرشتییکردن، یاخود کار بە ئەستۆوەگرتن دێ، وە وشەی: (وَلايَـةً)ش بەمانای یارمەتییدان دێ، وە وشەی: (الوَلـيُّ والْمَـوْلَى: يُستعملان في كُلّ ذلك) هەرکام لە (وَلِـيُّ) و (مَـوْلَى) بەیەك واتا بەکاردێن، واتە: سەرپەرشتییکردن یاخود سەرپەرشتییکران.

(فَاطِرِ): (فَـاطِر) و (خَـالِق) مانایان وەك یەکە، واتە: بەدیهێنەر، پەیداکەر، بەڵام وشەی (فَطر) بە مانای (شق) دێ، (أَصْلُ الفَطْـر: الشق طولاً، وفَطَر: أبدع و أوجد) ئەسڵی (فطر) بریتیە لە جیابوونەوە بە باری درێژیی دا، وە زیاتر سەرنجی ئەوە دەدرێ، لە حاڵەتێکی نەبوونییەوە جیای کردۆتەوەو، هێناویەتە حاڵەتی بوون، کەواتە: (فَاطِر) بە مانای داهێنەر (مبدع) و پەیداکەر (مُوجدْ) دێ.

(يُصْرَفْ): (الصرف: ردُّ الشيء من حالةٍ إلى حالةٍ أو إبدالُهُ بغيرِهِ)، (صَرف) بریتیە لەوەی کە شتێك لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك بگۆڕێ، یان لە حاڵێکەوە لابدەی بۆ حاڵەتێکی دی، واتە: بیگۆڕی، یاخود لایبەری، شتێکی دیکە بهێنیە شوێنی.

(كَاشِفَ): واتە: لابەر، چونکە لە (كَشْف)ەوە هاتوە، دەڵێ: (كَشَفَ الشيءَ وَكَشَفَ عَنْهُ: رَفَعَ عَنْهُ، مَا يُوَارِيه وَيُغَطِّيهُ، وَأَظْهَرَهُ، وَكَشَفَ غمَّهُ أزالَهُ)، وشەی (كَشْف) بە مانای دەرخستنی شتێك دێ، کەسێك کە شتێکی شاردۆتەوەو داپۆشیوە، لەسەری لادەبردرێ، وە بە مانای ئاشکراکردن‌و پێشاندان دێ، وە (كَشَفَ غمَّهُ: أزالَهُ) واتە: غەمەکەی لابرد.

(ٱلْقَاهِرُ): لە (قَهْر)ەوە هاتوە، (القَهْرُ الغَلَبَةُ وَالتذليلُ مَعَاً، وَيُسْتَعْمَلُ فِي كُلّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا) (قَهْر) بریتیە لە زاڵبوون‌و ملپێکەچ کردن پێکەوە، وە بەکاریشدەهێنرێ بۆ هەر یەکێکیان بە جیا.

(شَيْءٍ): واتە: شت، ئایا دروستە ئەم وشەیە بۆ خوا بەکاربهێنرێ؟ دەڵێین: بەڵێ، بەڵام خوا پاکیی بۆ وی شتێکە، نەك وەك شتان (إنَّ اللّه سُبْحَانه شَيء لا

كَالأَشْيَاء)! چونکە (هُوَ الَّذِي يَصِحُّ أَنْ يُعْلَم وَيُخْبَرَ عَنْهُ، ويقع عَلَى المَوجُودِ والمَعْدُومِ..) (شَيء) بریتیە لە هەر شتێك كە بگونجێ هەواڵی لەبارەوە بدرێ، یان بگونجێو بزانرێ، وە بۆ شتێك بەكاردێ، كە هەبێ، یاخود هەتا شتێك كە نەشبێ لە زیهنی خەڵكدا هەبێ، بەڵام لە واقیعدا بوونی نەبێ.

(شَهَٰدَةً ) (من الشُّهُودُ والشّهادةُ: الحُضُورُ مَعَ المُشَاهَدَةِ، إمَّا بالبَصَرِ أو البَصِيرَةِ) واتە: (شّهادةُ) لە (شهُودُ) و (شَهَادة)ەوە هاتوە، كە بە مانای ئامادەبوون دێ لەگەڵ بینیندا، چ بینینی بەچاو، چ بینینی بە عەقڵ، وە (الشَّهَادَةُ: قَوْلٌ صَادِرٌ عَنْ عِلْمٍ حَصَلَ بِمُشَاهَدَةِ بَصِيرَةٍ أو بَصَرٍ) (شَهَادة) بریتیە لە قسەیەك كە دەردەچێ لە كەسێكەوە كە عیلمێكی هەیە، بەهۆی ئەوەوە كە بەچاو شتی بینیوە، یاخود بە عەقڵ دەركی پێكردوە، بۆی پەیدابووە.

(لِأُنذِرَكُم ): (مُنذِر) ترسێنەر، یان وریاكەرەوە (الإِنْذارُ: إخْبَارٌ فيهِ تَخْوِيفٌ، كَمَا أنَّ التَّبْشيرَ إخْبَارٌ فيهِ سُرُورٌ) (إنذَار) بریتیە لە هەواڵدانێك كە ترساندنی لەگەڵ دابێ، هەر وەك چۆن (تَبشير) بریتیە لە هەواڵ پێدانێك كە دڵ خۆشیی تێدابێ.

(بَرِيٓءٌ ): (أَصْلُ البُرءِ وَالبَرَاءَةِ وَالتَبرِّي: التنحِّي مِمّا يُكْرَهُ مجاورَتُهُ، وَلَذَا قِيْل بَرِئْتُ مِنَ المَرَضِ بَرأً يبرَءُ)، (تَبَرِّي) بریتیە لەوە كە مرۆڤ خۆی لە شتێك بە دوور بگرێ، كە پێی ناخۆش بێ لێی نزیك بێ، بۆیە گوتراوە: لە نەخۆشییەكەم چاك بوومەوە، لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (بَرِئْتُ مِنَ المَرَضِ) چونكە خۆی دوورگرتوە لە نەخۆشییەكەی، كە ئەو پێی ناخۆشە هەیبێ.

(خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ): واتە: خۆیان لەدەستداوە، یان خۆیان دۆڕاندوە (أَضَاعُو وَأهْلَكُوا أَنْفُسَهُم) مرۆڤ كە دەستمایەكەی كەم بكات، یان نەمێنێ، زەرەری كردوە.

## مانـای گـشـتی ئایەتەکـــان

پێشتـر باسـمان کرد کە دە (١٠) ئایەتی پێشیٚ وەك پێشەکی وابوون، بـۆ کـۆی بـاس‌و بابەتـەکانی سـوورەتی (الأنعـام)، کـە وەك گوتمـان: سـوورەتی (الأنعـام) زیـاتر باسـی یەکتـایی خـوا ﷻ دەکات، کـە تەنیـا خـوا بەدیهێنـەرە، وە تـەنیا خـواش دەبیٚ پەرسـتراو بیٚ‌و بەندایەتیی بۆ بکریٚ، ئنجا ئـەم دەرسـەمان، تـەوەرە سـەرەکییەکەی بریتیـە لـەوە کـە خـوا ﷻ دە (١٠) جـاران بـە پێغـەمبەری ﷺ دەفـەرمویٚ: بڵـیٚ، واتـە: پێیـان بڵـیٚ، چەند پرسیارێکـیان لـیٚ بکـە، یـان چەنـد فەرمانێکـیان پـیٚ بکـە: کە ئایـا ئەوانـەی تەنیـا خوایـان بـە پەرسـتـراو دانـەناوەو، جگـە لـە خـوا شـتی دیکـەیان پەرسـتوە سـەرەنجامیان چـۆن بـووە؟ وە کـۆمەڵێك لـە سیفەتەکانی خـوای بـیٚ هاوتـا کـە بەڵـگەو پاسـاوی ئـەوەن، کـە دەبـیٚ تـەنیا ئـەو بەندایـەتیی بـۆ بکـریٚ‌و بپەرسـتریٚ، تـەوەرە سـەرەکییەکەی ئەوەیـە.

سـەرەتا خـوای کـاربەجـیٚ دەفـەرمویٚ: ﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: تۆ پێیـان بڵـیٚ، بـە هـاوبەش بـۆ خـوا دانـەرەکان بڵـیٚ: بـە زەویـدا بـڕۆن، پاشـان سـەرنج بـدەن‌و وردبنـەوە ! ﴿ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، ئایـا ئەوانەی پێغـەمبەرانیان بە درۆ دانـاوەو بێبـڕوابوون بە پێغـەمبەران، بـە کـتێبەکـانی خـوا، سـەرەنجامیان چۆن بـووە؟ تەماشـا بکەن! واتە: ئەگـەر سـەرەنجامی ئـەوان تەماشـا بکـەن، پەنـدیان لـیٚ وەردەگـرن‌و، ئێـوە وەك ئەوان ناکـەن، چونکە ئەم دنیـایە شاری بیٚ خاوەن نیە، خـاوەنێکی هەیـە کە خـوای پەروەردگـارە، وە ئەو خاوەنـە شـایستەی ئەوەیـە کـە تـەنیا ئـەو بەندایـەتیی بـۆ بکـریٚ‌و ملکـەچیی بۆ بکریٚ، کە بەندایەتیی کردنەکـەمان بـۆ ئـەوو ملکـەچ کردنمـان تـەنیا بـۆ ئـەو، ئەوەیـە کـە ئـەو هیـدایەت بەرنـامەیەی ئـەو دەینێـریٚ بـە پێغەمبـەرانی خۆیـدا (علیهم الصلاة والسلام)، لێیـان وەربگـرین، وە ژیـانی خۆمـان: ژیـانی تاکـییمان، ژیـانی کۆمەڵایەتییمـان، سیاسییمان، بە هەموو ڕەهەندەکانیانەوە، بەو شێوەیە بگوزەرێنییـن‌و ڕێك بخـەین، کە هیدایەت‌و بەرنـامەی خوا دیـاریکـردوە.

ئنجا دیسان بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پرسیارێکی دیکەیان لێ بکات: وە سەرنجیان وەردەسووڕێنێ بۆ کتێبی بوونەوەرو، دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، پێیان بڵێ: ئایا هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هی کێیە؟! کێ دەتوانێ بڵێ: خاوەنی خۆرم، خاوەنی مانگم، خاوەنی ئەستێرەکانم، خاوەنی بارانم، خاوەنی چیاکانم، خاوەنی کانیو سەرچاوەکانم! کەس هەیە بتوانێ ئیددیعای ئەوە بکات؟ بێگومان نەخێر، هەر خوای بالادەست خاوەنیانە، جا ئەو پرسیارکردنە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ (الأسلوب التقريري) واتە شێوازی ئەوە کە تۆ بەرانبەرەکەت ناچار بکەی دان بەوەدا بێنێ، کە تۆ مەبەستتە، نەك وەڵامێکی دیکە بداتەوە: کێ خاوەنی هەرچییەکە کە لە ئاسمانەکانو لە زەوی دایە؟ ﴿ قُل لِّلَّهِ ﴾، بڵێ بێگومان هەر خوا، هەموو هی خوایەو، هەر خوا خاوەنە، ﴿ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ ﴾، بەزەیی نواندنی بەرانبەر بە دروستکراوەکانی لەسەر خۆی پێویست کردوە، واتە خوا ﷻ کە پێغەمبەری بۆ ناردوون، وە کتێبی پێدا ناردوە، لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە خوا بەزەیی بە ئێوەدا هاتۆتەوەو ڕەحمتان پێ دەکات، بۆیە پێغەمبەری بۆ ناردوون، کە موحەممەدە ﷺ، کە تەواوکەری کاری هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، وە کتێبی بۆ ناردوون، کە بریتیە لە فەرمایشتی خۆی، ئەوە لە ڕووی ڕەحمو بەزەییەوە، ئەوەی لەگەڵ ئێوەدا کردوە، کەواتە: ڕەحمەتی خوا وەربگرنو وابکەن کە ڕەحمەتی خوا بتانگرێتەوە، ﴿ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ ﴾، وە بە دڵنیایی یەوە هەر بەهۆی بەزەیی خۆشیەوە خوا بڕیاری داوە، چونکە ئەو (ل) لامە لامی قەسەمە، یانی: سوێند بە خوا، خوا کۆتان دەکاتەوە بەرەو گۆڕەپانی ڕۆژی قیامەت، کە هیچ گومانی تێدا نیە ئەو ڕۆژە دێ، ئەویش هەر بەهۆی بەزەیی خۆیەوە، تاکو چاکەی چاکەکاران زایە نەبێ، وە ئەوانەی ستەمیان کردوە، لێیان بپرسرێتەوە کە ئەوەش دیسان بەزەییو ڕەحمەتی خوایە، کە ئەوەی کردوە، ئەدی ئایا ئەوانەی بێبڕوان چییان لێ دێ؟ سەرەنجامیان چۆن دەبێ؟ دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾،

ئەوانەی خۆیانیان لە دەست داوە، بۆیە بڕوا ناهێنن، دیارە ئەو تەعبیرە زۆر وردەو دەبێ باش سەرنجی لێ بدەین: ئەگەر وەك ڕواڵەت تەماشای بكەین، ئاوایە: ئیمان نەهێنان هۆكارە، خۆ لە دەست دان دەرەنجامە، دەبوو فەرموو بای: (ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ) ئەوانەی ئیمان ناهێنن، خۆیان لەدەست داوە، بەهۆی نەبوونی ئیمانەوە، لەسەر بوونەكەی خۆیان قەرزار دەبنەوە، بەڵام خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، ئەوانەی خۆیانیان لەدەست داوە، بۆیە ئیمان ناهێنن، بۆچی ئەو شێوازە بەكارهاتوە؟ ئەمە وەك دواییش باسی دەكەین، خوای زانا ئەوەی گرنگە، كە ئەنجامەكەیەو دەرەنجامەكەیە، پێشی خستوەو، هۆكارەكەی دوا خستوە، یاخود بۆیە ئەو شێوازە بەكارهاتوە كە: ئەوانەی خوای بێ وێنە بە شایستەی ئەوەی نەزانیون دەربازو سەرفرازبن، وە دۆڕانی لە چارەنووسیون، ئەوانەن كە بڕوا ناهێنن، واتە: بە هۆی ئەوەوە كە خوا دۆڕانی لە چارە نووسیون، بۆیە ئیمان ناهێنن.

ئنجا جارێكی دیكە سەرنجیان ڕادەكێشێ، بۆ كات (زمان)، پێشێ سەرنجی ڕاكێشان ــ وەك توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە ــ بۆ شوێن (مكان) هەرچی لە شوێنەكان دا هەیە، وە فەرمووی: ﴿ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ ﴾، هەرچی شوێنێك لە ئاسمانو زەوی دایە، هەمووی هی خوایە، ئنجا سەرنجیان ڕادەكێشێ بۆ (زمان)، هەرچی لە كاتەكاندایە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ ﴾، چونكە دوو حاڵەت ئەگەریان هەیە لە كاتەكاندا: یا تاریكیی، یان ڕووناكیی، یان شەو، یان ڕۆژ، واتە: لە تاریكییدا، یان لە ڕووناكییدا، هەر ئەو دوو حاڵەتەش هەن، هەموو بوون بگەڕێ، یان تاریكە، یان ڕووناكە، یان شەوە، یان ڕۆژە، یانی: هەرچی لە شەودابێو هەرچی لە ڕۆژدابێ، هەمووی هی خوایە ﷻ ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، وە خوا بیسەری زانایە، وا مەزانە كە لە تاریكییدابن دەنگتان نابیستێ، هەمیشە خوا پێتان زانایەو ئاگادارە، كەواتە: خوا خاوەنداریێتیی

ڕەهای هەیــە بـۆ هــەموو شـــتێك، هەرچـی لـە هـەر شــوێنێکە، وە هــەرچی لـە هـەر کاتێکـــدایە، هــەر خـوا خـــاوەنیەتی، ئنجـا مـادام وابـــێ: دەبــێ تــەنیا هـەر ئـەویش پەرســـتـراوبـــێ، بۆیـــە دوایـــی دەفـــەرموێ: ﴿ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، بلـێ: ئایا بێجگـە لـە خوا ﷻ سـەرپەرشــتیارێکی دیکـە بگـرم، کەسـێکی دیکە بکـەمە مشـوورخۆری خـۆم، کە شـێوازی ژیـانم فێربکـاتو، حەڵاڵو حـەڕامم بـۆ دابنـێو، ئـەمرو نـەهیم ئاڕاســتە بکـات؟ وە بـزانم داخـۆ چـۆن بـژیم؟ چۆن نەژیــم؟ ژیانـی خۆم چۆن ڕێك بخـەم؟ ئایا جگە لە خوا کەسێکی دیکە شایســتەیی ئەوەی هەیـە بیکەمە سـەرپەرشــتیارو مشوورخۆری خـۆم؟ ﴿ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، لـە حاڵێکـدا کە ئـەو بەدیهێنــەرو پەیداکـەری ئاسـمانەکانو زەوییــە، ﴿ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُ ﴾، وە لە حاڵێکـدا کە خوا خــۆراك دەدا بـە غەیـری خـۆی، وە هـیچ کــەس خـــۆراك نـادا بـەو، واتە: هــەموو شتێك پێویســتە ئەو بیژیەنـێ، بەڵام ئەو پێویســتی بە غەیری خۆی نیە؟ ئـەو پرسـیارکردنە دیـارە پرسـیارکردنی نکوولــیی لێکــەرانەیە (الإستفهام الإنكاري) واتـە: تـۆ چـاوەڕێی وەڵام ناکـەی، وەڵامەکـەی لـەنێو خۆیدایــە، ئەگـەر تـۆ بـە کەســێك بڵـێی: ئەوە مێـز نیـە؟! ئـەدی ئـەوە دیـوار نیــە؟ ئـەوە گڵـۆپ نیـە؟ ئاماژەش بکـەی بـۆ گڵۆپ، واتە: گڵـۆپە، واتایەکـەی لەنێو خۆیدایـە، لێرەشــدا کـە دەفـەرموێ: ئایا جگـە لـە خوا بکەم بە سەرپەرشتیاری خۆمو، مشـوورخۆری خۆمو، دۆسـتی خـۆم، لـە حاڵێکـدا کـە بەدیهێنــەری ئاســمانەکانو زەوییـەو، ئەو بژیـوو خۆراك دەدات بە غەیری خۆی، وە ئەو خۆراکی پێ نادرێ؟ واتە: هەموو شــتێ پێویســتی بـەو هەیــە، بـەڵام ئـەو پێویستی بـە هـیچ شـتێكو هیــچ کەسـێك نیــە، ﴿ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَ ﴾، بلێ: فەرمانم پێکـراوە، کە یەکـەم کــەس بم کە ملکـەچ دەبم بۆ خــوا ﷻ، وە من یەکـەم کەسـم کە ملکەچ دەبم بۆ خـواو قەناعـەتم پێیــەتی، ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، وە نەهییـم لێکـراوەو پێم گـوتراوە: لە هاوبەش بـۆ خـوا دانــەران مەبــە، لــەوانە مەبـە کە هــاوبـەش بۆ خــوا دادەنێن.

ئنجا جارێکی دیکە دیسان خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، پێیان بڵێ: من ئەگەر سەرپێچیی لە پەروەردگارم بکەم، لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن دەترسم، واتە: من کە پێغەمبەری خواو هەڵبژێردراوی خوام، لە کاتێکدا سەرپێچیی لە پەروەردگارم بکەم، لە ئازارو سزای ڕۆژێکی مەزن دەترسێم، ئایا ئێوە لێی ناترسن، ئەی موشریکەکان؟ ئێوە زیاتر شایستەی ئەوەن کە بترسێن، من پێغەمبەری خواو، هەڵبژاردەی خواو، خۆشەویستی خوام، لێی دەترسێم، ئەدی ئێوە چۆن لێی ناترسێن ؟

﴿ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴾، هەر کەسێك ئەو سزایەی لێ لابدرێ لەو ڕۆژەدا، ئەوە بە تەئکید خوا بەزەیی لەگەڵ نواندوە، وە هەر ئەوەش بردنەوەو سەرکەوتنێکی ئاشکراو ڕوونە، کەواتە: بە هۆی چییەوە، سزای ڕۆژی مەزن لە ئینسان لادەدرێ؟ بە هۆی خوا بەیەکگرتنو ئیمانەوە، بە هۆی ئەوەوە کە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکەی کە شایستەیەتی، کەواتە: ئێوەش هەوڵبدەن ئیمان بێنن، وە خوا بەیەکگربن، بۆ ئەوەی خوا بەزەیی پێتاندا بێتەوە لەو ڕۆژەدا، وە تاکو ئەو سەرکەوتنو بردنەوە مەزنەتان بەقسمەت بێ.

ئنجا دوایی خوای پەروەردگار ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، بەڵام بە تەئکید مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانە، وەك دەڵێ: (دیوار لەگەڵ تۆمە، گوێسوانە گوێت لێ بێ) چونکە هەڕەشەیە لەوان، بەڵام ڕووی نواندن لە پێغەمبەری ﷺ خوایە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، وە ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ زیانێکت تووش بکا، هیچ کەس لێت لانابات، وە ئەگەر بیەوێ چاکەیەکیشت تووش بکات، لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، ئنجا مادام هەر خوا زیان گەیاندنو سوود گەیاندنی بەدەستە، کەواتە: دەبێ هەر ئەو بپەرسترێ، وەك گوتم ئەوانە هەموویان بەڵگە هێنانەوەن، کە دەبێ تەنیا خوا ﷻ بەندایەتیی بۆ بکرێ، تەنیا خوا ملکەچیی بۆ بکرێو بپەرسترێ، بەڵام ئاگاداربن! کە تەنیا خواپەرستن، واتە: ئەوپەڕی ملکەچیی و

ئەوپەڕی خۆشویستن‌و، ئەوپەڕی لێترسان‌و، ئەوپەڕی بە گەورەگرتن‌و، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن، تەنیا بۆ خوا بێ، وە ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە هەرچی پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ لە خواوە هەواڵی پێداوە دەیهێنێ، هەمووی قبوول بێ، بە عەقڵ تێی بگەی، بە دڵ قبووڵت بێ، بە زمان دانی پێدابێنی، وە بە ئەندامەکانی جەستەشت جێبەجێی بکەی، ئەوە مانای بەندایەتییە، نەك لێرەدا خەڵکی بە سادەیی‌و بە شێوەیەکی جوزئیی لێی تێبگات، کە: نوێژو ڕۆژووی تەنیا بۆ خوا بێ، بەڵام دوایی لە بواری سیاسیی‌و لە بواری کۆمەڵایەتیی‌و، لە بواری ئابووریی دا، گوێ نەداتە شەریعەت ! نەخێر، تەنیا خوا پەرستن، وە تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، واتە: لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ملکەچی خوا بی.

ئنجا خوای پەروەردگار لەسەر زیاتر خستنەڕووی سیفەتەکانی خۆی بەردەوام دەبێ‌و دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦ ﴾، وە خوا بەسەر بەندەکانییەوە بالادەستەو مل پێ کەچکەریانە، ﴿ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، وە خوا کاربەجێیەو شارەزایە.

ئنجا جارێکی دیکە ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗ ﴾، پێیان بڵێ: چ شتێك شایەدییەکەی گەورەترە، چ شتێك ئەگەر شایەدیی بدا شایەدییەکەی لە هی هەموو کەس گەورەترە؟ ﴿ قُلِ ٱللَّهُ ﴾، بڵێ خوا، شایەدییدانی خوا لە شایەدییدانی هەموو کەسێك‌و شتێك گەورەترە، کەواتە پێیان بڵێ: ﴿ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ ﴾، بڵێ: خوا لە نێوان ئێمەو ئێوەدا شایەدە، واتە: خوا شایەدی منە کە من پێغەمبەری خوام.

ئنجا ئایا شایەدییدانی خوا بۆ (محمد) پێغەمبەر ﷺ کە پێغەمبەری خوایە، لە چیدا بەرجەستە بووە؟ ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ ﴾، یانی: شایەدیی دانی خوا بۆ من، لەوەدا بەرجەستە دەبێ، کە ئەم قورئانەم بۆ نێرراوە لەلایەن خواوە، کەواتە: ئەم قورئانە بەڵگەو موعجیزەو ئیسپاتکەری پێغەمبەرایەتیی موحەممەدە ﷺ،

پێغەمبەری خوا ﷺ غەیری قورئان بەڵگەیەکی دیکەی نەهێناوەتەوە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، هەرچەندە زۆر موعجیزەی دیکەی هەبوون، بەلام بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، بەس ئەم قورئانەی بە بەڵگە هێناوەتەوە، بۆچی؟

چونکە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نموونە: ئاو هاتن لە نێوان پەنجەکانی، کە چەند جار ئەوە دووبارە بۆتەوە، وە زۆربوونی خواردنی کەم، خواردنێکی کەم بەشی دوو سێ نەفەری کردوە، بەلام دوایی چەند سەد نەفەر لێیان خواردوە، دوای ئەوەی دووعای لەسەر کردوە، وە ئەوە کە دەنکە چەوو بەرد، تەسبیحاتی لەدەست دا کردوە، وە ئەوە کە هەور سێبەری لێکردوە، وە ئەوە کە ئەو بنکە دارخورمایەی وتاری لەسەر دەدا، وەك بەچکە حوشتر نالاندیو گریا، کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەسەری لاچوو، چونکە مینبەرێکیان بۆ دروست کرد، چووە سەر مینبەرەکە، وە ئەوانەی لە مزگەوتەکە دا بوون، هەموویان گوێیان لێ بوو کە وەك بەچکە حوشتر باراندی، هەتا پێغەمبەر ﷺ لە مینبەرەکە دابەزیو چوو دەستێکی پێدا هێنا، ئەمجار بێدەنگ بوو، وە زۆر شتی دیکەی لەو جۆرانە[1].

ئەگەر پێغەمبەر ﷺ یەکێك لەو شتانەی کردبایە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتیی خۆی، ئێمە ئێستا پەکمان دەکەوت، چونکە ئەوانەی ئەوکاتە بینیویانە، هەر بۆ ئەوان دەبووە بەڵگە، ئەدی ئێمە چی بکەین؟! بەلام نەخێر، خوا موعجیزەو بەڵگەیەکی داوە بە پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد) ﷺ کە ئەو کاتەو ئێستاو دوای ئێستاو لە هەموو کاتو شوێنەکاندا، وەك یەك بەڵگەیە، کە قورئانە، ئەم قورئانە کە خوا بۆ پێغەمبەری ﷺ ناردوە، وە تەحەددای ئینسو جندی پێکردوەو پێشێ فەرموویەتی: قورئانێکی وا بێنن، دوایی بۆی سووك کردوونو فەرموویەتی دە (١٠) سوورەتی وا بێنن، دوای سووکتری کردوەو فەرموویەتی: یەك سوورەتی وا بێنن، ئەگەر بڕوا ناکەن، بەوە کە قورئان فەرمایشتی خوایە، بۆ پێغەمبەری خۆی ﷺ ناردوە، بەلام هەر نەیانتوانیوە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ

---

١) لە بەرگی چوارەمی کتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) کە باسی پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ و سیرەو ژیانو موعجیزەکانی تێدایە، زۆرێك لەو موعجیزانەی لەسەر دەستی ڕوویان داوە تۆمارکراونو ئاماژە بە سەرچاوەکانیان کراوەو دەقەکانیان (تخريج) کراون.

﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ ﴾، بڵێ خوا لە نێوان منو ئێوەدا شایەدەو ئەم قورئانەم بە سروش بۆ نێردراوە، واتە: شایەدیی دانی خوا بۆ ڕاستیەتی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری خۆی (موحەممەد) ﷺ لەم قورئانەدا بەرجەستەیە.

ئنجا ئایا خوا ئەم قورئانەی بۆچی بۆ ناردوە؟ ﴿ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، بۆئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم، وە هەر کەسێکی دیکەش کە پێی دەگات، ئنجا دوایی پێغەمبەر ﷺ دیسان دەپرسێ، کە خوا پێی دەفەرمووێ: ﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ ﴾، ئایا ئێوە شایەدیی دەدەن کە لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەن؟ ئایا شایەدیی وا دەتوانن بدەن؟ ﴿ قُل لَّآ أَشْهَدُ ﴾، بڵێ: من شایەدیی وا نادەم، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەدیی بە هەق نەبێ نادات، بەڵام هەر کەسێ بڵێ: بەڵێ، خوا پەرستراوی دیکەی لەگەڵدا هەن، شایەدییەکی بە درۆی داوە، وە بۆی ئیسپات نابێ، چونکە غەیری خوای بێهاوتا، هەمووی دروستکراوی خوایە، دروستکراوی خواش نابێ وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، چونکە دروستکراوی خوا، یان وەك خۆتە، کە بەشەرە، یان لە خوار خۆتە، کە شتەکانی دیکەن، ﴿ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾، بڵێ: بێگومان ئەو (واتە: خوا ﷻ) پەرستراوی بەهەقە، تەنیا یەك پەرستراوە، ﴿ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴾، وە بێگومان من دوورمو حاشا دەکەم لەوەی ئێوە دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا.

ئنجا خوا بەڵگەو شایەدییەکی دیکە لەسەر ڕاستێتیی موحەممەد ﷺو پێغەمبەرایەتییەکەی باس دەکات، کە بریتیە لە شایەدیی دانی خاوەنی کتێبەکان، دەفەرمووێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ ﴾، ئەوانەی کتێبمان پێداون، دەیناسن، وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، دەگونجێ مەبەست لە (دەیناسن) واتە: موحەممەد ﷺ دەناسن، یاخود قورئان دەناسن، کە کتێبی خوایە، وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن.

گێڕراوەتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامی گوتوە: (أتَعرِفُ مُحَمَّداً كَمَا تَعْرِف ابنَك؟)، واتە: ئایا موحەممەد ﷺ دەناسی وەك چۆن کوڕی خۆت دەناسی؟ ئەویش گوتوویەتی: بەڵێ زیاتریش لە کوڕەکەم موحەممەد دەناسم کە پێغەمبەری خوایە، چونکە خوا بە ئەمینی ئاسمانێ دا کە بریتیە لە جبریل، ناردوویەتی بۆ ئەمینی سەر زەوی، کە موحەممەدە ﷺ، وە نیشانەکانی هەموو لە کتێبەکانی ئێمەدا هاتوون لەبەرئەوە من زیاتر لەوەی کە دەزانم کوڕەکەم کوڕی منە زیاتر لەوە دەزانم کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، زۆربەی تەفسیرەکان ئەو پرسیارەو وەڵامەی نێوان عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیان هێناوە خوا، لە هەردووکیان ڕازی بێ[1].

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، جارێکی دیکە دووبارەی دەکاتەوە دەفەرموێ: ئەوانە خۆیان لەدەست داوە، بۆیە ئیمان ناهێنن، کە وەك گوتم لەڕاستیدا ئیمان نەهێنانیان، هۆکاری خۆ لەدەست دانیانە، بەڵام خوای پەروەردگار دەرەنجامەکەی پێش خستوە.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ ﴾، وە کێ ستەمکارترە لە کەسێك درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، یاخود ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانێ، واتە: یەکێك لەو دوو گوناهە، یان هەردووکیان دەکات، ﴿ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾، درۆ بە ناوی خواوە دەکات، واتە: دەڵێ: هاوبەشی هەن، ئەوەش درۆ هەڵبەستنە بۆ خوا، ﴿ أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ ﴾، یاخود ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانێ، واتە: بڕوا بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ ناکات، وە بڕوا بەوە ناکات کە قورئان بۆ موحەممەد ﷺ هاتوە، واتە: هەر کەسێك یەکێ لەو دوو گوناهەی هەبێ، لە هەموو کەس ستەمکارترە، چ جای هەردووکیانی هەبن، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، بێگومان ئەوانەی ستەمکارن، سەرفراز نابن.

---

١) الجامع لإحكام القُرآن: ج٢، ص١٤٤.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾﴾، ئەم تەعبیرە بەلای کەمەوە لە دوو شوێنی دیکە لە قورئاندا هاتوە:

١/ لە سوورەتی (النمل)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٦٩﴾﴾، واتە: بڵێ بە زەویدا بڕۆنو سەرنج بدەن، سەرەنجامی تاوانباران چۆن بووە؟

٢/ لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾﴾، واتە: بڵێ بە زەویدا بڕۆن سەرنجیش بدەن خوا چۆن دروستکراوەکانی دەست پێکردوە، دواییش بۆ جارێکی دیکە دوای ئەوەی کە فەوتان، دەیانهێنێتە کایەوەو دروستیان دەکاتەوە؟!

ئەوە نوکتەیەکی ڕەوانبێژییە، زیاتر ئەوانەی پسپۆڕی زمانی عەرەبیین، لێی تێدەگەن، دەڵێن: لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟﴾، واتە: بڵێ بە زەویدا بڕۆنو دوایی سەرنج بدەن، بەڵام لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟﴾، بە زەویدا بڕۆنو سەرنج بدەن، لە وێ بە (ثُمَّ)، لێرە بە (ف) ئایا جیاوازییان چییە؟! (ثُمَّ) لەگەڵ پیتی (ف) هەردووکیان بۆ (عَطْف)ن، ئەگەر بڵێی: (جاء زيد فعمر) یان (جاء زيد ثم عمر) یەکەمیان واتە: زەید هات یەکسەر بە دوایدا عومەر هات، بەڵام دووەمیان واتە: زەید هات دوای ماوەیەك عومەریش هات، کەواتە: هەردووکیان بۆ

(عَطْف)ن، بەڵام وشەی (ثُمَّ)، دەڵێ: بەکاوەخۆ (تراخي) و دووریی (بعد) دەگەیەنێ، واتە: ماوەیەکی پێ دەچێ، بەڵام (ف) یەکسەر بەدوایدا، جا ئەوە لێرەدا یانی چی؟ ئەوەی یەکەمیان کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ ﴾، واتە: کە بە زەویدا ڕۆیشتن، یەکسەر سەرنج بدەن، ئەوەی دیکە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ ﴾، بە زەویدا بڕۆن‌و، دوایی بە کاوەخۆ سەرنج بدەن، ئەویش چونکە مرۆڤ دوو حاڵەتی هەن:

١- جاری وایە ئینسان سەفەر دەکات، سەفەرێکی ئاسایی دەکات، بازرگانییە، گەشتێکە، خوا دەفەرموێ: لەو حاڵەتەدا کە تۆ سەفەر دەکەی، با بۆ مەبەستێکی دیکەش سەفەرت کرد بێ، مادام دیاردەو دیمەنەکان دەبینی، سەرنجان لێبدە، ﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ ﴾.

٢/ چونکە مەبەستتان لە سەفەرەکەتان سەرنجدانی ئایەتەکانی خوای پەروەردگارە، بڵێ بە زەوی دا بڕۆن‌و یەکسەر سەرنج بدەن، ﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ ﴾.

ئنجا ئەم ئایەتە سێ شتی لێ وەردەگیرێن:

أ/ کە خوا دەفەرموێ: پێیان بڵێ: بە زەویدا بڕۆن‌و سەرنج بدەن، سەرەنجامی ئەوانەی کە پێشتر پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانیوە، چۆن بووە؟ واتە: ئێوەش بترسێن، ئەگەر وەك وان بکەن، وەك وانتان بەسەر بێ، چونکە هەر کەسێك بە ڕێی کەسێکدا بڕوات، ئەو کەسە بە چ سەرەنجامێك گەیشتوە، ئەویش بە هەمان سەرەنجام دەگات.

ب- ژیانی بەشەر بە یاساکانی خوا بەڕێوە دەچێ، وە ئەوەش یاسای خوایە، کە ئەوانەی پێغەمبەران بەدرۆ دەزانن، ئەوانە گوناهبارو تاوانبارن‌و سزا دەدرێن، کەواتە: ئەوە یاسایەکی خوایەو ناگۆڕێ‌و گۆڕانی بەسەردا نایەت، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾ فاطر،

واتە: سوننەتی خواو یاسای خوا نە دەگۆڕدرێو نە لادەدرێ، کەواتە: تەماشا بکەن، لە پێش ئێوەدا هەر کەسێك پێغەمبەرانی خوای بەدرۆ زانیبێ سەرەنجامەکەی خراپ بووە، کەواتە: ئێوە وەك وان مەبن، چونکە ئەوە یاسای خوایەو بەسەر ئێوەشدا دەچەسپێ، وەك چۆن بەسەر ئەوانی پێش ئێوەدا چەسپیوە.

ج- خوا دەفەرموێ: لە مێژوو بکۆڵنەوە، وە خوا فەرمان بە بەشەر دەکات کە لە مێژوو بکۆڵێتەوە: ﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ ﴾، بە زەویدا بڕۆن، چونکە گەڕان بە زەویدا دوو گەڕانە: سەفەرکردنی کردەیی، وە سەفەرکردنی تیۆریی، گەڕانی کردەیی، ئەوەیە کە هەر بە کردەوە بڕۆی بۆ وێنە: بچی بۆ میسر، ئەهرامەکان ببینی، وە بچی شوێنی عادو سەموود ببینی، لەلای شام نێوان شامو دوورگەی عەرەبیی دا، وە بچی بۆ یەمەن سەددی مەئریبو شوێنەواریی سەبەئییەکان ببینی، وە بچی بۆ شوێنەکانی دیکە، لە هیند لە چین ... هتد، وە حاڵەتێکی دیکەی گەڕان بریتییە لە گەڕانی فیکریی، واتە: کتێب بخوێنیەوەو مێژوو بخوێنیەوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ ﴾، هەردووکی دەگرێتەوە، واتە: هەم بە جەستە بڕۆی بگەڕێی، بپشکنی، یاخود کتێب بخوێنیەوەو سەرچاوەکانی مێژوو بپشکنی، کە میللەتان سەرەنجامیان چۆن بووە؟ بەتایبەت ئەوانەی کە پێغەمبەرانی خۆیان بە ناڕاست داناوە، وە سەرپێچییان لێکردوون.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پرسیاریان لێ بکات، کە ئەم شێوازە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ: (الأسلوب التقريري) واتە: شێوازێك کە تۆ بەرانبەرەکەت ناچار بکەی دانی پێدابنێ، واتە: پرسیارێکی لێ بکەی کە وەڵامەکەی دیار بێ، بۆ نموونە: ئاوت لە پێش بێ،

پێی بڵێی: ئەوە ئاو نیە؟! ئاگرت لە پێش بێ، پێی بڵێی: ئەوە ئاگر نیە دەسووتێ؟ ... هتد، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر لێیان بپرسی بڵێی: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، هی کێیە؟ ئەگەر کەسێ ئیحتیرامی عەقڵی خۆی بگرێ، هەر دەڵێ: هی خوایە، خۆ ناڵێ هی منە، یا هی فلان کەسە، ئەدی لە پێش ئەودا، ئەدی لە دوای ئەو کە ئەو دەفەوتێ؟ لێرەدا مەبەست لەم پرسیارو وەڵامە ئەوەیە کە مادام خوا خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییەو ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەوی دایە، خاوەنەکەی خوایە، کەواتە: دەبێ هەر ئەو بپەرستڕێو، بەندایەتیی بۆ بکرێو، هەر ئەو بە پەروەردگار بزانرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّهِ ﴾، بۆخۆت وەڵام بدەوە، بڵێ: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هی خوایە.

ئنجا خوا ﷻ باسی سیفەتێکی دیکەی خۆی دەکات کە بریتیە لە بەزەیی نواندن، بەڵام بە شێوازێك نا کە بفەرموێ: (هو الرحمن) یان (هو الرحيم) (هو یرحمکم)، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ﴾، لەسەر خۆی ڕەحمەتی پێویست کردوە، واتە: لەسەر خۆی پێویستی کردوە کە بەزەیی بە دروستکراوەکانی دابێ، دیارە خوا ﷻ هیچ شتێکی لەسەر پێویست نیە، بەڵام ئەگەر بۆخۆی لەسەر خۆی پێویست بکات، دەبێ، ئنجا ئەوە لە نێوان ئەشاعیرەو موعتەزیلەدا، کێشەو مشتومڕێکی زۆری لەسەرە: موعتەزیلە گوتوویانە: دەگونجێ خوا شتی لەسەر پێویست بێ، ئەشاعیرە گوتوویانە: خوا ناگونجێ شتی لەسەر پێویست بێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأنبیاء، واتە: خوا پرسیاری لێ ناکرێ لەوە کە دەیکات، ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ.

بەڵام وەڵامی ڕاست ئەوەیە، کە هیچ کەس ناتوانێ هیچ شتێك لەسەر خوا پێویست بکات، بەڵام خوا ئەگەر بۆخۆی شتێکی لەسەر خۆی پێویست کرد، ئەوە لەسەر خۆی پێویستی دەکات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا

﴿نَصۡرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٧﴾الـروم، واتـە: هەقـە لەسـەر ئێمـە یارمـەتی ئیمـانداران بـدەین، یـان دەفـەرموێ: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ...٢١﴾المجادلـة، واتـە: خـوا نووسـیویەتی مـنو پێغەمبـەرانم، زاڵ دەبیـن، لێـرەش کـە دەفـەرموێ: ﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ﴾، لەسەر خـۆی بـەزەیی نوانـدنی پێویسـت کـردوە، بۆخـۆی لەسـەر خۆی پێویست کردوە، وە گەورەییـە بـۆ خـوا کـە بـەزەیی نوانـدن بەرانبـەر بـە دروسـتکراوەکانی لەسـەر خۆی پێویسـت کـردووە، هیـچ نوقصـانیی تێدا نیە، تاکو بڵـێی: چۆن دەبـێ خـوا شـتی لەسەر پێویست بـێ، مـادام بۆخـۆی لەسـەر خـۆی پێویسـت کردبـێ، کـە هـەموو دروسـتکراوەکان پێویسـتییان بـەو سیفەتە هەیـە، خـوا بە بەزەیـی بێ لەگەڵیـان.

ئنجـا دوایـی دەفـەرموێ: ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ﴾، بێگومـان کۆتـان دەکاتـەوە بـەرەو ڕۆژێـك، واتـە: بـەرەو گۆڕەپـانی ڕۆژێـك کـە هیـچ گومـانی تێـدا نیـە، کـە ئـەو ڕۆژەش ڕۆژی قیـامەتە، لێـرەدا چـۆنیەتی پێکـەوە پەیوەسـتبوونی ئایەتەکان ئاوایـە.

مادام خـوا خـاوەنی هەموو شـوێنەکانە، ناگونجـێ ئەوانـەی لـەو شـوێنانەدانەو دروسـتی کردوون، لێیان نەپرسـێتەوە، بۆیە دەبـێ قیـامەت بـێ، وە کە قیـامەتیش بـێ، ئەی خەڵکینـە! بەندایەتیـی بۆ خوا بکـەن، بۆئـەوەی لـە قیامەتـدا سـەربەرزو سـەرفراز بن، وە بتـوانن وەڵامی پرسـیارەکانی خـوا بدەنـەوە.

لـێرەدا کـە دەفـەرموێ: ﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ﴾، خـوا لـە ئایـەتی (١٥٦)ی سـوورەتی (الأعـراف) بـە شـێوەیەکی دیکـە دەفـەرموێ: ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ﴾، واتـە: ڕەحمـەتی مـن هـەموو شـتێکی گرتۆتـەوە، یانـی: زاڵمیشـی گرتۆتـەوەو، شـەیتانیشـی گرتۆتـەوە ! بەڵـێ لـە دنیـادا، ڕەحمـەتی خـوا هەموو شـتێکی گرتۆتـەوە، بـەڵام ئایا مانـای وایـە لـە قیـامەتیش خـوا ڕەحـم بـە هـەموو شـتێك و بـە هـەموو کـەس دەکـات؟ وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە لـە هەمـان

شـــوێن دا دەفـــەرموێ: ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَالَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾، واتە: وە بەزەیـی مـن هـەموو شـتێکی گرتۆتـەوە، بـەڵام لەمـەودوا (لـە ڕۆژی دوایـی دا) بێگـومان تەنیـا بـۆ ئەوانـەی دەنووسـم کـە پـارێز دەکـەنو زەکـات دەدەن، وە ئیمـان بـە ئایەتەکانمـان دێنـن، کەواتـە: ڕەحمـەتی خـوا لـە دوارۆژدا تایبەتـە بـە ئـەهلی ئیمانەوە، بەڵام لە دنیادا بۆ هەموو کەسە، بۆ وێنە: بـاران ڕەحمـەتی خوایـەو بـۆ هـەموو کەسـی دەنێـرێ، یـا ڕەحمـەتی خوایـە، ئـەو هـەموو نیعمەتانـە، ڕەحمـەتی خـوانو هـەموو دروسـتکراوەکانو هـەموو بەندەکـان، بـە چاكو خراپـەوە لێیـان بەهرەمەنـدن.

ئنجـا لەوبارەشـەوە فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ زۆرن، بـۆ وێنـە: یـەکێك لـە فەرموودەکان ئەمەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَمَّا قَضَى اللهُ الْخَلْقَ كَتَبَ كِتَابًا فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ، إِنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي﴾[1]، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوای ئـەوەی خـوا دروسـتکراوەکانی دروسـت کـردن، نووسـراوێکی نووسـی لـەلای خـۆی دانا لەسـەر عـەرش: بێگومان بەزەییـم پێش توورەییم کەوتۆتـەوە.

هـەروەها لەوبـارەوە ئەمـەش فەرمودەیەکـی دیکەیـە: ﴿عَنْ سَلْمَانَ رضي الله عنه، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ اللهَ خَلَقَ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ مِائَةَ رَحْمَةٍ، كُلُّ رَحْمَةٍ طِبَاقَ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَجَعَلَ مِنْهَا فِي الأَرْضِ رَحْمَةً، فَبِهَا تَعْطِفُ الْوَالِدَةُ عَلَى وَلَدِهَا، وَالْوَحْشُ وَالطَّيْرُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْضٍ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَكْمَلَهَا بِهَذِهِ الرَّحْمَةِ»﴾[2]، واتـە: سەلـمانی فارسیی خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: خـوای بـەرز ئـەو ڕۆژەی کـە ئاسـمانەکانو

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨١١٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣١٩٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٠٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٤٤).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٧٧١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩١١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦٢٨)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

زەوی دروست کردن، سەد (١٠٠) ڕەحمەتی دروست کرد، هەر ڕەحمەتێکیان پڕی نێوان ئاسمانەکانو زەوییە، لەو سەد (١٠٠) ڕەحمەتە، یەکێکی خستە سەر زەوی، بەو یەك ڕەحمەتە دایك بەزەیی بە منداڵی دادێ، (دیارە بابیش بەزەیی بە منداڵی دادێ، بەڵام ڕەحمەتی دایك زیاترە)، وە هەروەها ئاژەڵو دڕندەو باڵندەو پەرەور هەموویان بەزەییان بە یەکدی دادێ، هەر بەو ڕەحمەتە، ئنجا کە ڕۆژی قیامەت داهات، خوا نەوەدو نۆ (٩٩) ڕەحمەتەکەی دیکە لەگەڵ ئەو ڕەحمەتەی دەخاتە کار، بۆ لێخۆشبوونی ئەوانەی کە گوناهبارن، (دیارە ئەوانەی ئەهلی ئیمانن، چونکە ئەوەی ئیمانی نەبێ، دیارە ڕەحمەتی خوای پەروەردگار نایگرێتەوە).

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾، ئەمەش بەرجەستەکەری ڕەحمەتی خوایە، واتە: بەهۆی ڕەحمەتی خواوە، خوا کۆتان دەکاتەوە، ئەگەر خوا بەزەیی بە دروستکراوەکانیدا نەهاتبایەوە، لێیان دەگەڕا، دوایی چاكو خراپ هەموو لەبەین دەچوونو، کەس لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەدەکرا، بەڵام ئەوە پێچەوانەی ڕەحمەتو بەزەیی یە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾، وەك پێشتر گوتم: بە ڕواڵەت دەبوو ئاوابێ: (ٱلَّذِينَ لَمۡ يُؤۡمِنُواْ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ) ئەوانەی ئیمانیان نەهێناوە، سەرەنجام خۆیان دۆڕاندوە.

وشەی ﴿خَسِرُوٓاْ﴾، یانی: (ضَيَّعُوا وَأَهْلَكُوا) واتە: خۆیان فەوتاندوە، بەڵام خوای کاربەجێ ئەوەتا لێرەدا شێوازەکەی گۆڕیوە، فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾، بۆچی؟ چونکە خۆ لە دەست دانو خۆ دۆڕاندن، ئەوەیە کە ئینسان لەسەر بوونەکەی خۆی قەرزدار بێتەوە، ئنجا ئەوە دەرەنجامە، ئیمان نەهێنانیش هۆکارە، بەڵام خوای کاربەجێ دەرەنجامەکەی پێش خستوە، چونکە ئەوە گرنگترە بە نسبەت بێبڕوایانەوە لە دواڕۆژدا، وە هۆکارەکەی دوا خستوە، کە بریتیە لە ئیمان نەهێنان.

وە دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی ئـەوەبێ کـە ئەوانـەی کـە لـە عیلمـی بـێ سـەرەتای خـوادا، دۆڕابـوون، دۆڕانو خەسـارەتیان بـۆ نووسـراوەو بـە قیسـمەت کـراوە، لەبەرئەوەیە کە شایستەی ئەوەن، بۆیە ئیمان ناهێنـن.

ئنجـا ئەمە ئەوەشی لـێ وەردەگیـرێ کە کەسێك بێبـڕوایە، پێـی وانەبـێ شـتێکی گرنگی کردوە، ئەی بـابای کـافر! تۆ بۆیە ئیمـان ناهێنـی، چـونکە خـوا نەیویسـتوە تۆ سـەرفرازو بەختەوەر بی، کەواتە: شـانازیی بـە بـێ ئیمانییەکـەی خۆتـەوە مەکـە، پێـت وا نەبـێ شـتێکی گـەورەت کـردوە، ئەسـڵەن خـوای دادگـەر ویسـتی لەسـەر نەبـووە تۆ ئیمـان بێنی، لەبەرئـەوەی شایسـتە نـی، شـایستەی سـەرفرازییـەك نـی، کـە بەرهـەمی ئیمانـە، بەڵـکو شـایسـتەی خەسـارەتو دۆڕانێکـی، کـە بەرهـەمی کوفـرە، بۆیـە بـا کافرەکـان شـانازیی بـە بێئیمانیـیو بـە کوفـری خۆیـانەوە نەکـەنو، پێیـان وابـێ شـتێکی گـەورەیان کـردوەو تەحـەددای ئیـرادەی خوایـان کردوە ! ئنجا ئەوە لە قورئـاندا لە شوێنی دیکەش دا هـاتوە، بۆ وێنـە:

١) لـە سـوورەتی (الزمـر)دا دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ ﴾، واتـە: بەڵـێ بێگومـان زەرەرمەنـدانی ڕاسـتەقینە ئەوانـەن، کـە خۆیـانو مـاڵو منداڵیـان لـە ڕۆژی قیامەتـدا لەدەسـت دەدەن، ئـا ئـەوە زیانبـاریی ئاشـکرایە ! مـرۆڤـ خۆیشـی مـاڵو منداڵەکەیشی لەدەسـت داوە، لێك دابڕاون !

٢) هـەروەها لـە سـوورەتی (الشـوری)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتـە: وە ئەوانـەی بـڕوادارن گوتیـان: بێگومـان خەسـارەتمەندان خۆیـانو کەسـوکاریان لەدەست دا لـە ڕۆژی قیامەتـدا، بێگومـان سـتەمکاران لـە ئـازارو سـزایەکی بەردەوامـدان، کەواتـە: مـادام ئیمـان نـەهێنان مایەی زیانبارییـە، ئـەی ئینسـانەکان! ئیمـان بێنـن، بۆئـەوەی تووشـی زیانبـاریی نـەبن.

**مەســـەلەی چـــوارەم:** کــە خــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، واتــە: وە موڵــکی خوایـــە هـــەرچی کــە لــە شــەوو ڕۆژدا سـەقامگیـر دەبێ، وە ئەو بیسـەری زانـایە.

وشــەی: (سَكَنَ ) لە زمانی عەرەبیـدا بە دوو واتـا دێ:

١/ بە مانـای ئامـادەبوو (حَضَـرَ).

٢/ وە بە مانـای نیشـتەجێ بوو (أَقَـامَ)ش دێ.

واتــە: (سُكُونْ) دەگونجێ لە بەرانبەر (تَحَرُّك)دا بێ، واتــە: هەرچـی دەجووڵـێو هەرچـی کـە ناجووڵــێ، هـەمووی هـی خوایـە لـە شـەوو ڕۆژانـدا، یـاخود هەرچـی سـەقامگیــر دەبـێ لـە شـــەو ڕۆژانـدا، هـی خوایـە، وە مەبەسـت لـە شـەوو ڕۆژیـش ئەوەیـە کـە شـتەکانی نێـو بوونـەوەر بەگشـتی، دوو حاڵەتی گشـتییان هەیـە، کـە هـەموویان دەگرنـــەوە: کـــە بریتیـــن لـــە: تـاریکیی‌و ڕووناکــیی، یــانی: تاریکـــیی‌و ڕوونـــاکیی دوو حاڵـــەتی هـــەرە گشـــتیین، بـــۆ هـــەموو دروســـتکراوەکان، هـــەموو دروسـتکراوەکان، یان لە تاریکـیی دان، یان ڕووناکـیی دا، کەواتـە: ئایەتەکـەی پێشـێ باســی ئــەوەی کــرد کــە هەرچـی لــە ئاســمانەکان‌و زەویـدا هەیــە، هـی خوایـە، واتـە: هەرچـی پەیوەنـدیی بـە شـوێنەکانەوە هەیـە، لێرەشـدا ڕایگەیانـــدوە کـە هەرچـی پەیوەندیی بە کاتەکـانەوە هەیـە، هـی خـوایــە ﷻ لێـرەدا خـوای زانـاو تـوانا بۆیـە ئەوە دەخـاتە ڕوو، یانـی: مـادام خـوا ﷻ خـاوەنی هەموو شـوێنەکانەو، هەموو ئـەو شـتانەی کە لە شـــوێنەکاندا نیشــتەجێن، وە خـــاوەنی هــەموو کــاتەکانەو هەموو ئـەو شـــتانەی کــە کاتیــان بەســـەردا دێـن‌و تاریکــیی‌و ڕووناکییـان بەسـەردا دێـن، کەواتە: جێـی خۆیـــەتی، وە شـایســتەیە کە تـەنیا ئـەو بپەرسترێ، وە بەندایـەتیی تەنیـا بۆ ئەو بکـرێ.

**مەسـەلـــەی پێـنجـــەم:** کـــە دەفـــەرموێ: ﴿ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ ﴾، جـــارێکی دیکـــە خـــوا بـــە پێغەمبـــەر ﷺ

دەفـەرموێ: بفـەرموێو بپرسـێ کـە ئـەو پرسـیارەش، پرسـیارێکی نکوولـیی لێکەرانەیە (الإِسْتِفْهَام الإِنْكَارِي)و مەبەست ئەوە نیە وەڵامەکەی وەربگرێتەوە، بەڵکو وەڵامەکەی لەنێو خۆیدایە، بۆ وێنـە: کەسێك ئاوی لەبـەردەم بێ، بڵێ: ئـەوە ئاو نیـە؟ دەبێ تـۆ بڵێی: با، یان ئەگـەر کەسێك لەسـەر کورسییەك دانیشتبێ، بڵێ: ئەوە کورسی نیـە؟ دەبی بڵێی، با، لـێرەدا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئایا بێجگە لە خوا بکەمە دۆستو سەرپەرشتیاری خۆم ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، لە کاتێکدا کە ئەو پەیداکەری ئاسمانەکانو زەوییـە؟ ﴿وَهُوَ يُطۡعِمُ﴾، وە ئـەو خـۆراك دەدات بـە غـەیری خـۆیو بـژیویان پێدەداوت دەیانژیێنێ، ﴿وَلَا يُطۡعَمُ﴾، وە هیچ کەسێکیش بژیو بە وی نادات، واتە: خوایەك ﷻ بەو شێوەیە بێ، هەر ئەو شایستەیە بکرێتە سەرپەرشتیارو مشوورخۆرو دۆستو جێی پشت پێبەستن، وشەی (وَلِي) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای: نزیك دێ، وە بە مانای دۆست دێ، وە بە مانای پشتیوان دێ، وە بە مانای یارمەتیدەر دێ، وە بە مانای مشوورخۆر دێ، بە مانای سەرخەر دێ {واتە: کەسێك کە سەرت دەخات}، وە بە مانای کەسێك کە پشتی پێ دەبەستیو کاری خۆتی پێ دەسپێری، هەموو ئەو واتایانەی هەن.

ئنجا ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الأعراف)ە، کە خوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٣﴾، (خوا باسی قورئان دەکات دەفەرموێ:) ئەم کتێبە، کتێبێکە بۆ تۆ نێردراوەتە خوار، با لە سینەتدا هیچ سەغڵەتیی لەبارەوە نەبێ، (واتە: بەرانبەر بە هیچ شتێك لە کتێبی خوادا، هەست بە سەغڵەتیی مەکە، ئەی پێغەمبەر! ﷺ) بۆ ئەوەی خەڵکی پێ وریا بکەیەوەو بترسێنی، وە بۆ ئەوەی بیرخەرەوە بێ بۆ ئیمانداران، بە دوای ئەوە بکەون کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێندراوە (واتە: بە دوای ئەو قورئانە بکەون) وە جگە لە خوا، بە

دوای سەرپەرشیارانی دیکەو مشوورخۆرانی دیکە مەکەون، کەمێك نەبێ بیر ناکەنەوە، {یاخود پەند وەرناگرن}.

کەواتە: (وَلِي) کەسێکە کە بەرنامەت بۆ دادەنێ‌و کە لێرە دەفەرمویێ:

﴿ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا ﴾، بڵێ: ئایا جگە لە خوا بکەم بە بەرنامە دانەر، یان مشوورخۆر، یان کار هەڵسوڕێنەری خۆم؟! بە تەئکید نەخێر، دیارە وشەی (وَلِي) مانای پەرستراو (معبود)یش دەگرێتە نێو خۆی، چونکە پەرستراوێتیی (الألوهية) بەشێکی بریتیە لەوە، کە پەرستراو سەرپەرشتیی پەرستارەکانی خۆی دەکات، (مَعْبُود) سەرپەرشتی بەندە (عَبْد)ەکانی خۆی دەکات، وە مشووریان دەخواو کاریان بۆ هەڵدەسووڕێنی، وە بەرنامەیان بۆ دادەنێ‌و ڕێنماییان دەکات.

ئنجا ئەو ڕستەیە کە دەفەرمویێ: ﴿ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُ ﴾، پێشتر باسی وشەی (فاطر)مان کرد، کە لە (فَطْر)ەوە هاتوە، (فَطْر) واتە: (شَق) هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەمە ئاماژەیە بەوە، کە ئێستا وەك بیردۆزەیەك بۆ سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر، هەندێك لە زانایانی گەردووناس‌و فیزیا زان باسی دەکەن، کە بریتیە لە تەقینەوەی گەورە (الإنفجار الكبير) ئەویش ئەوەیە کە کاتێك بووە ئەو بوونە، کە ئێستا لە ئاسمانەکان‌و زەویدا بەرجەستەیە، هەمووی یەك شت بووە، بەڵام تەقینەوەیەکی گەورەی تێدا پەیدا بووە، وە ئەو بەشانەی لێ دروست بوون، هەڵبەتە هەندێکیان دەڵێن: زیاتر کۆمەڵەی خۆر، واتە: خۆرو نۆ خڕۆکەکانی دەوری، ئەو حاڵەتەی بەسەردا هاتوە، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: نەخێر لەڕاستیدا هەموو ئەو کەهکەشانانەی کە هەن، هەموویان ئەو حاڵەتەیان بەسەردا هاتوە، وەك لە سوورەتی (الأنبياء) لە ئایەتی ژمارە (٣٠)دا خوا ﷻ ئاماژەی بۆ دەکات، دەفەرمویێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَا ...﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان نازانن نەیانبینیوە، (واتە: بە

چاوی عەقڵ‌و دڵ نەیانبینیـوە، ئەگەرنا کەس بە چاوی سەر نەیبینیوە) کە ئاسمانەکان‌و زەوی پێکەوە لکاو بوون، لێکمان جیاکردنەوە!

ئنجا بۆ زانیارییتان ! ئەم ئایەتە موبارەکە ئیعجازێکی زانستی تێدایە، کە ئاماژە دەکات بە نوێترین بیردۆزەی زانیاریی کە ئێستا باس دەکرێ، بۆ چۆنیەتی دروستبوونی بوونەوەر، ئەویش ئەوەیە کە کاتی خۆی ئەم بوونەوەرە یەك شت بووەو دوایی لێك جیابۆتەوە، لێك جیابوونەوەکەشی، خوا وشەی: (فَفَتَقْنَاهُمَا )ی بۆ بەکارهێناوە، (فتق) ئەوەیە کە شتێك لە شتێك جیاببێتەوە، بەلام یەکجاریی لێی دوورنەکەوێتەوە[1]، ئەگەر ئینسان بلۆقێك لە جەستەی پەیدا بێ، بەلام لێی جیانەبێتەوە پێی دەگوترێ: (فتق)، دیارە زەوی یەکجاریی لە خۆر جیانەبۆتەوەو بە هێزی کێشکردن(جاذبیة) هەر بەیەکەوە پەیوەستن، هەڵبەتە ئێمە ئایەتەکانی قورئان ملکەچ ناکەین بۆ بیردۆزە زانستییەکان، هەتا نەبن بە حەقیقەتی زانستیی، چونکە ئەوەی خوا دەیفەرموێ: هەر ئەوە ڕاستە، بەلام زانیاری بەشەر بەزۆریی ڕێژەیی (نسبي)یەو بەشێك لە حەقیقەتی بۆ دەردەکەوێ، دوایی حەقیقەتی بە تەواویی بۆ دەردەکەوێ، یان جاری وایە شتێکی بۆ دەردەکەوێ، دوایی شتێکی ڕوونتری بۆ دەردەکەوێ‌و، لەوەی پێشێ پەشێمان دەبێتەوە، لەبەرئەوە نابێ قورئان بە دوای بیردۆزە زانستییەکان بخەین، تاکو دەبن بە حەقیقەتی زانستیی، کە ئەو کاتە دیارە حەقیقەتی زانستیی، لەگەڵ ئەوەی کە وەحی دەیفەرموێ، هەمیشە یەکن، چونکە زانست باسی دروستکراوی خوا دەکات، وەحییش فەرمایشتی خوایە، هەمیشەش کردەوەی خوا لەگەڵ فەرمایشتی خوا یەکن، بۆیە زانایانی ئیسلام دەڵێن: هیچ کاتێك ناگونجێ عەقڵی ساغ (سلیم) لەگەڵ وەحی ڕاست (صحیح) تێك بگیرێن، عەقڵی ساغ لەگەڵ وەحییەك کە لە ڕێیەکی ڕاستەوە بە ئێمە گەیبێ، هەرگیز تێکناگیرێن، وە (إبن الرشد) کتێبێکی هەیە بە ناوی (فصل المقال فيما بين الشريعة والحكمة من الإتصال) واتە: (قسەی

١) بڕوانە: المعجم الوسيط، ص: ٦٧٢ ، (النَتْقُ: الشقُّ... بروز جُزْءٍ من الأمعاء من فتحةٍ في جدار البَطْن.

ڕوون دەربارەی پەیوەندیی نێوان شەریعەتو عەقڵ)، کە ئەو وشەی عەقڵ بە حیکمەت وەسف دەکات.

دیارە لە سووڕەتی (فصلت)یشدا خوای پەروەردگار ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾، واتە خوا ویستی ئاسمان دروست بکات، کە ئەو کات لە شێوەی دووکەڵ دابوو، کە ئەوەش دیسان ئەو بیردۆزەیە کە دەڵێ: تەقینەوەی گەورە بووە، وە ئەو کاتە ماددەی بوونەوەر لە شێوەی گازێکی زۆر چڕو پڕدا بووە، پلەیەکی گەرمیی زۆر بە هێزی هەبووەو، لە ئەنجامدا لەنێو خۆیدا تەقیوەتەوە، هەڵبەتە وەك گوتم زانست ئێستا وا دەڵێ، بەڵام دیارە ئەگەر وەحی بە ڕاشکاویی گوتبای، شێوازەکەی چۆن بووە، ئێمە لەوێ دەوەستاین، ئەوەی خوا بیفەرموێ، هەر ئەوەیە، بەڵام ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە ئاسمانەکان پێش ئەوەی دروست ببن، یان بوونەوەر پێش ئەوەی دروست ببێ، دووکەڵ (گاز) بووە، وە لە سووڕەتی (الأنبياء)یشدا دەفەرموێ ﴿ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَا ﴾، واتە: پێکەوە لکاو بوون، لێکمان جیاکردنەوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُ ﴾، خوا خۆراك دەدات، بژیو دەدات بە غەیری خۆی، نەیفەرمووە: بە کێ؟ ﴿ وَهُوَ يُطۡعِمُ ﴾، بەرکار (مفعول)ەکەی فوتێنراو (محذوف)ە، یانی: (يطعم المخلوقات)، ﴿ وَلَا يُطۡعَمُ ﴾ بەڵام خۆراکی پێنادرێ، یانی: خوا هەموو دروستکراوەکان دەژیەنێو ژینیان پێ دەدات، چ خواردنی ماددییان بداتێ، وەك ژیاندارو ئینسانو زیندەوەرو پەڕەور، چ خواردنی مەعنەوییان بداتێ کە فریشتەکانن، یان هەر جۆرە خواردنێکی دیکەیان بداتێ، کە ئێمە نازانین چییە، گرنگ ئەوەیە هەرچی بژیو، خوا دەیدات بە دروستکراوەکانی، چ بژیوی ماددیی بێ، یان مەعنەویی، یان هەر شتێکی دیکە بێ، بەڵام خوای بێنیاز پێویستی بە دروستکراوەکانی نیە بژیوی بۆ دابین بکەن، لەبەرئەوەی خوا پێویستی بە غەیری خۆی نیە، وە

یەکێك لە سیفەتەکانی خوا ئەوەیە کە (الصَّمَدَ)ە، واتە: جێی نیازو بێنیازە، پێویستی بە غەیری خۆی نیەو، غەیری خۆیشی هەموو پێویستی بەو هەیە، ئنجا چ بۆ خواردن بێ، چ بۆ هیدایەت بێ، چ بۆ پەیدابوون بێ، چ بۆ بەردەوام بوون بێ، وەك مووسا (علیه السلام) فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه، واتە: (مووسا) گوتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو، دوایی ڕێنماییشی کردوە، چۆن بژی؟

کەواتە: بۆ پەیدابوونیانو بۆ بەردەوامبوونیان، وە بۆ بژیو پێدرانیان، هەموویان پێویستییان بە خوای زاناو توانایە، کەواتە: ئەی موشریکەکان! تەنیا ئەو خوایە شایستەی پەرستنە، کە هەموو دروستکراوەکانی دەژیەنێ، بەلاّم پێویستیی بە هیچیان نیە، بۆخۆی بێ نیازەو هەمووشیان پێویستییان بەوە، دیارە پێشتر باسمان کرد، کە ئەم سوورەتی (الأنعام)ە، بە زۆریی باسی خوا بەیەکگرتنە، کە دەبێ تەنیا خوا بەندایەتیی بۆ بکرێو، بپەرسترێ، بە مانای فراوانی بەندایەتییو پەرستن.

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنِّىٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلۡ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّى عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٍ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، چەند هەلْوەستەیەك لە بەرانبەر ئەم سێ ئایەتە موبارەکەدا دەکەین.

سەرەتاش دەلْێین: خوا ﷻ لێرەدا دووجار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، کە بەو شێوەیە قسە لەگەلْ هاوبەشدانەرەکاندا بکە: ﴿ قُلۡ إِنِّىٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَ ﴾، بلْێ: من فەرمانم پێکراوە، یەکەمین کەس بم کە ملکەچ دەبم بۆ خوا.

لێتان تێکنەچێ وشەی (مُسْلِم) (إِسْم فَاعِل)ە، لەسەر کێشی (مُفْعِل) واتە: ملکەچ، کە بە کوردی دەڵێین: مسولْمان، واتە: ملکەچ بۆ خوا، خوا دەفەرموێ: تۆ پێیان بڵێ: من فەرمانم پێکراوە: یەکەمین کەس بم، کە ملکەچ دەبم، بۆ خوا، ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، وە پێشمگوتراوە: لە هاوبەشدانەران نەبی، کەواتە: ئەوەی کە بە ئێوەی ڕادەگەیەنم، پێش ئێوە، خۆم پێوەی پابەندمو خۆم پێوەی پابەند کراوم، وە ئەوەی کە بە ئێوەی دەڵێم مەیکەن، پێشی بۆ خۆم نایکەم.

ئەم سێ ئایەتە چەند شتێکیان لێ وەردەگیرێ:

یەکەم: ئەوەی کە من بە ئێوەی دەڵێم: ملکەچبن بۆ خوا، بەندەبن بۆ خوا، تەنیا خوا بپەرستن، پێش هەمووتان بۆخۆم پابەند کراوم بەوەوە، وە من پێش هەمووتان ملکەچم بۆ خوا، وە لە هەمووتان بەندەترم بۆ خوا، ئنجا ئەمە زۆر گرنگە، زۆر خەڵکی بەرپرس شتی باش بە خەڵك دەڵێن، بەڵام بۆ خۆیان نایکەن، دەڵێن: جارێك مەلایەك ئامۆژگاریی خەڵکی کردوە، دوایی شتێك بووە بۆخۆی نەیکردوە، گوتوویانە: مامۆستا تۆ واتگوتوە، ئەویش گوتوویەتی: خەڵکینە! بە قسەم بکەن، بە کردەوەم مەکەن، بەڵام لەڕاستیدا خەڵك پێش ئەوەی گوێ بۆ قسەت بگرێ، تەماشای کردەوەت دەکات، وە ئەگەر قسەکانت مۆری کردەوەکانتان پێوە نەبێ، ئەوە پارەی قەڵبەو بەسەرتدا دەدەنەوەو نایانەوێ، خەڵك دەڵێن: دیارە مامۆستا بۆخۆی بڕوای بە قسەکانی خۆی نیە، ئەگەرنا ئیشی پێ دەکردن، ئەگەر بۆخۆت کار بە قسەکانت نەکەی، خەڵك دەڵێن: دیارە ئەو قسانەی خۆی بە ڕاست نازانێ، چونکە بۆخۆی لە هەموو کەس لە پێشترە، کە سوود بە خۆی بگەیەنێ، ئەگەر قسەکانی خۆی پێ چاکن، بۆخۆی دەبێ ئەو چاکەیە بکات، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) جیاوازییان چی بووە لەگەڵ خەڵکی دیکەدا، لەگەڵ فەیلەسووفەکانو بیرمەندەکان دا، لەگەڵ ئەوانەدا کە ویستوویانە چاکسازیی بکەن؟ جیاوازییان ئەوە بووە کە هیچ قسەیەکیان نەکردوە، کردەوەیان پێ نەکردبێ، بەڵکو کردەوەیان لە قسەیان بەجێ نەماوە،

بەڵکو کردەوەیان لە قسەیان زیاتر نەبووبێ، کەمتر نەبووە، تەماشای ژیانی پێغەمبەران بکەن، ڕواڵەتو دەروونیان یەك بووە، قسەو کردەوەیان یەك بووە، دڵو زمانیان یەك بووە، بۆیە ئەوەی کە ئەهلی ئینصاف بووبێ، کەوتۆتە ژێر کاریگەرییان، ئەوەی کە خوا هیدایەتی بۆ نووسیبێ، بەڵام خەڵکی دیکە دەبینی وانیە، بۆ وێنە: سوقراتو ئەفلاتوونو ئەرستۆ کتێبیان نووسیون، بەڵام ڕەنگە لە هەشتێ مشتیان لە قسەکانی خۆیان جێبەجێ نەکردبێ، فلان کەسێك شتی نووسیوەو گوتوە، بەڵام لەوانەیە ئەوەی کە گوتوویەتی زۆری ژیانیو کردەوەکانی پێچەوانەی قسەکانی خۆی بووبێ، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دوو فلیقانەیی لە بوونیاندا نەبووە، بۆچی؟ چونکە ئەوەی کە بە خەڵکیان ڕاگەیاندوە، وەك بەندایەتیی بۆ خوا، پێشێ بۆخۆیان کاریان پێکردوە.

دووەم: کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ ﴾، ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە بانگخوازو پێشەواو بەرپرس، دەبێ لە پێش خەڵکەوە پابەندی شەریعەت بێ، دەبێ لەپێش واندا ملکەچ بێ بۆ خوا، وە لەپێش وانیشدا پابەندبێ بەو بەرنامەو شەریعەتەوە کە خوا دەینێرێ.

سێیەم: ئنجا دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾، بڵێ: من ئەگەر سەرپێچیی لە پەروەردگارم بکەم، لە سزای ڕۆژێکی مەزن دەترسێم، واتە: من لە بەرانبەر خوادا، مافی لاملیی‌و سەرپێچییم نیە، بەڵکو ئەوەی کە بە ئێوەی ڕادەگەیەنم، ئەگەر سەرپێچیی لە پەروەردگارم بکەم، منیش شایستەم کە خوای دادگەر سزام بدات، لە ڕۆژێکی مەزندا.

چوارەم: پاشان کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، یانی: ئەم دووە بە یەکەوە، بڵێ: من فەرمانم پێکراوە یەکەمین کەس بم، کە ملکەچ دەبم، وە پێم گوتراوە کە لە

هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبم، کەواتە: ملکەچ بوون بۆ خوا، لەگەڵ هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا، پێچەوانەی یەکدین، هەر کەسێ ملکەچی خوا بێ، هاوبەشی بۆ پەیدا ناکات، وە هەر کەسێك هاوبەشی بۆ خوا پەیدا کرد، ملکەچی خوا نەبووەو خوای بە یەك نەگرتوە، جا چ شیرکی گچکەبێ، کە ئەوە مانای وایە بە شێوەیەکی جوزئیی ملکەچی خوا نەبووە، وە چ شیرکی گەورە بێ، کە مانای وایە بە شێوەیەکی گشتی ملکەچی خوا نەبووە، واتە: شیرك‌و مسوڵمانەتیی تێکدەگیرێن، ئەگەر ئینسان مسوڵمان بێ، موشریك نابێ، وە ئەگەر موشریك بێ، مانای وایە مسوڵمان نیە، دیارە مەبەستم شیرکی گەورەیە، ئەگەرنا شیرکی بچووك وەك: سوێند بە غەیری خوا خواردن، وە بەکارهێنانی هەندێك تەعبیر وەك (ماشاءَ اللّٰه وشئت)، وە ڕیا کە شیرکی بچووکە، ئەوانە ئینسانیان پێ لە بازنەی ئیمان‌و ئیسلام دەرناچێ، بەڵام شیرکی گچکە گوناهی گەورەیەو، ئینسانی پێ گوناهبار دەبێ.

پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴾، هەر کەسێك سزای ئەو ڕۆژە مەزنەی لێ لابدرێ، ئەوە بە تەئکید خوا بەزەیی پێدا هاتۆتەوە. وشەی (قَد) بۆ (تحقیق)ە، یانی: بە تەئکید هەرکەس ئەو سزایەی ئەو ڕۆژەی لێ لابدرێ، خوا بەزەیی پێدا هاتۆتەوە، ﴿ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴾، وە ئەوەش بردنەوەو بە ئامانج گەیشتنێکی ڕوون‌و ئاشکرایە، بەڵام کێ سزای سەختی ڕۆژی قیامەتی لێ لادەدرێ؟ لەڕاستیدا کەسێك کە لە دنیادا، وایکردبێ، بەزەیی خوای پێ ببڕێ، واتە: کەسێك لە ڕۆژی دواییدا ڕەحمەت‌و بەزەیی خوا دەیگرێتەوە، کە وایکردبێ لە دنیادا بیگرێتەوە، بە بەڵگەی هەر دوو ئایەتی ژمارە (١٥٦ و١٥٧) لە سوورەتی (الأعراف)دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ

(١٥٦) ﴾، واتـە: بەزەیی مـن هـەموو شـتێکی گرتۆتـەوە، ئـەوە لـە دنیـادا، بـەزەیی خـوا هـەموو شـتێکی گرتۆتـەوە (بـەڵام ئـەدی لـە قیـامەت دا، هـەموو کەسێك دەگرێتەوە؟ نەخێر، دەفەرموێ) لە قیامەت دا پێویسـتی دەکەم بۆ ئەوانەی کە لـە دنیـادا پـارێز لـە خـوا دەکـەن و تەزکیـە دەکـەن، (یـان زەکـات دەدەن)، وە ئەوانەی کە ئیمـان بـە ئایەتـەکانمان دێنـن، کەواتـە: ئـەوەی لـە دنیـادا ئەهلـی تـەقوا نـەبووبێ و ئەهلـی زەکـات دان نەبووبـێ و، ئـەهلی ئیمـان نەبووبـێ بـە ئایەتەکانی خوا، لە قیامەت دا لە ڕەحمـەتی خـوا بـێبەش دەبـێ، ئنجـا دوایـی ئەوانـە پێناسـە دەکـات: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ (١٥٧) ﴾، ئەوانـەی بـە دوای ڕەوانەکـراوی پێغـەمبەری نەخوێنـدەوار دەکـەون کـە موحەممـەدە ﷺ.

هەروەها لە سـوورەتی (الأعـراف) لە ئایـەتی (٥٦)دا خـوای پەروەردگـار بۆمـان بـاس دەکات کە ڕەحمـەتی خوا شـایستەی هـەموو کـەس نیـە، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ (٥٦) ﴾، واتـە: بێگومـان بـەزەیی خـوا لـە چاکەکاران نـزیکە، ئەدی لە خراپە کـاران؟ ئەوە بە تەئکیـد تووڕەیی خـوا لـەوان نـزیکە، چونکە خـوای بـەرزو مـەزن کاربەجێیـە، هـەر کەسـە وەك خـۆی مامەڵەی لەگـەڵدا دەکـات، وە خـوای زانـاو شـارەزا خـاوەن داد (عـدل)ەو خـاوەن چاکـە (فضـل)یە، دادەکەی بۆ سـزا دانـە، بەڵام چاکەکـەی بـۆ پاداشـتدانەوەیە، وەك خـوا بـۆ سـزای خراپـەو بـۆ پاداشـتدانەوەی چاکـە، فەرموویـەتی: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ (١٦٠) ﴾ الأنعام، واتە: خـوای پەروەردگـار خـاوەنی (فضـل)ە، لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە بـە قسـەی دەکەن، وە خـاوەنی (عـدل)ە، لەگـەڵ ئەوانەدا کە بە قسـەی ناکەن، بەڵام ستەمیان لـێ ناکـات، وەك دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا (٤٩) ﴾ الکهـف، واتـە: پەروەردگـارت ستەم لە هیچ کـەس ناکات، بـەڵام پـڕ بـە پێسـتی خۆیـان مامەڵـەیان

لەگەڵدا دەکات، بەڵام ئەوانەی کە ملکەچن بۆ خـوای بەخشـەر، بە یەك بـە دە، پاداشـتیـان دەداتـەوە، بەڵـکـو تاکـو یـەك بـە حەوسـەدیش زیـاتـر دەڕوا، وەك لـە سـوورەتی (البقـرة)دا ئامـاژەی پێکـراوە .

**مەسـەلەی حـەوتەم:** کە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، لێـــرەدا ڕووی دوانـــدن لـــە پێغـــەمبەرە ﷺ، بـەڵام مەبەســتی پــێ هــەموو کـەس و هـەموو مرۆڤـەکانن، بەتایبــەت ئـەو هاوبەشــدانەرانەی کـە پێغەمبـەر ﷺ بـانگی کـردوون، هـەروەها ئەوانـەی سـەردەمی ئێمـەش، چ هاوبەشـدانەر بـن، چ کـافر بـن، چ مونافیـق بـن، چ مولحیـد بـن، هەرچی بـن، خـوای پـەروەردگار وەك حەقیقـەتێك ڕوونـی دەکاتـەوە، بـەڵام ڕوو لـە پێغـەمبــەر ﷺ دەکـاتو دەفـەرموێ: وە ئەگــەر خـوا تـۆ تووشـــی زیـــانێك بکـــات، هـیچ کـەس جگــە لـە خـۆی ئـەو زیانـەت لــێ دوو ناخـاتەوە، وە ئەگـەر چاکـەیەکت بۆ بێنـێ لەسـەر هـەموو شـتێك بە توانـایە.

ئنجا ئایا وشـەی (ضـر) یـانی چـی؟ (الضـرُّ: سُـوءِ الحَـالِ إمَّا فِـي نَفْسِـهِ، وَإمَّا فِـي بَدَنـه لِعَـدَمِ جَارِحَـة وَنَقْـص، وَإمَّا فِـي حَالَـةٍ ظَـاهِرَةِ مِـنْ قِلَّـة مَـالٍ وَجَـاهٍ) زیـان بریـتـیە لە حاڵی خراپ، جا چ کە لە نەفسی دا تووشــی خــەمو خــەفەت دەبــێ، چ لـە بەدەنــی دا تووشـی نەخۆشــیی، یـان کـەم ئەنـدامیی دەبـێ، چ لـە حاڵــەتی ڕواڵــەتیی دا تووشــی نــەداریی و هــەژاریی و مــاڵ وێرانیــی و کــۆچ و کۆچــباریی و دەربـەدەریی و دەبـێ، (راغب الأصفهاني) دەڵـێ: (الضـرُّ: الإسـم الجَـامِعُ لِمـا يَنَـالُ الإنْسَـان مِـنَ الـمَكْرُوه) دەڵــێ (الضــُّرُّ) نـاوێکی کۆکەرەوەیـە، بـۆ هـەر شـتێك کـە ئینسـان پێی ناخۆشـەو تووشـی دێ، جـا لە نەفسـی دا بێ، لـە بـەدەنی دا بـێ، یـان لـە مـاڵی دابـێ، وە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، (خَیْر) دەڵێ: (الخَيْرُ: وَهُوَ ضِدُّ الشَّرِّ، وَهُوَ مَـا يرغَـبُ فِيـهِ الكُـلّ) (خَیـر) پێچەوانەو دژی (شرّ)ە، وە (خَیْر) ئەوەیە کە هەموو کـەس بۆی ئـارەزوومەنـدەو پێی خۆشـە.

ئەوەی کە خوا لەم ئایەتەدا دەیەوێ بیفەرموێ ـ بە تێگەیشتنی من ـ ئەوەیە: کە ئەگەر زیانێکمان تووش بێ، بێجگە لە خوا کەس بۆی لاناچێ، وە ئەگەر تووشی خێرێکیش بین، بە تەئکید خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایەو دەتوانێ هەموو خێرێکمان بە نسیب بکات، وە دەشتوانێ هەموو شەڕو زیانو خراپەیەکمان لێ لابدات.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ﴾، لە زمانی عەرەبیدا (لا كَاشِفَ)، دەڵێن: ئەم (لا)یە، بۆ (نفي الجنس)ە، واتە: (جنس)ی لادەر، بۆ ئەو زیانو زەرەرو ناڕەحەتییە نیەو هیچ کەس ناتوانێ، وە ئەوەی دیکەش کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، ئەوەش شێوازی کورت هەڵهێنان (حصر)ە.

## کورتە باسێک دەربارەی
## چەمک و واتای: هەموو شتێک بە دەستی خوا بوون

ئەم حەقیقەتە، حەقیقەتێکی گرنگەو خوا لە قورئاندا گرنگیی زۆری پێداوەو لە چەند ئایەتاندا باسکراوە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە چەندان فەرمایشتدا باسیکردوە، چونکە: بە زۆریی خەڵك کە تووشی شیرك دێ، یان لەبەرئەوەیە کە چاوەڕوانی خێرێك لە کەسێك، یان لە شتێك دەکات، یان چاوەڕوانی لابردنی زەرەرێکی لێدەکات، واتە: یان بۆ ئەوەیە کە زیانێکی لێ دووربخاتەوە، یان دەیەوێ خێرێکی بۆ بێنێ، خوا لە چەندان شوێن لە قورئاندا، ڕایگەیاندوە کە زیان دوورخستنەوە (دفع الضّر)، وە سوود هێنان (جلب النفع) تەنیا بە خوایە، جگە لە خوا هیچ کەس ئەو توانایەی نیە.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە من کەسێك خەریکە دەخنکێ، دەچم دەریدێنم‌و سوودی پێ دەگەیەنم، یان زەرەری لێ دوور دەخەمەوە، یاخود کەسێك هەژارە سوودی پێدەگەیەنم‌و هاوکاریی دەکەم، مەبەست ئەو حاڵەتانە نین، تاکو یەکێك بۆی هەبێ بڵێ: چۆن غەیری خوا هیچ سوودو زیانی بەدەست نیە؟! دەڵێین: ئەوە ڕاستە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئەوە سەربەخۆ (بالإستقلال) نیە، چونکە: تۆ هی خۆت نی، وە یارمەتییەکەشت کە پەیدات کردوە، هی خۆت نیە، وە ئەندامەکانت کە بەکاریان دێنی، وە ئیمکانەتییەکەت کە بەکاری دێنی، هەموویان هی خوان، ئەوەی کە بە سەربەخۆیی شتەکان هی خۆینی‌و زیانیان پێ دوور دەخاتەوە لە ئێمەو، قازانجیان پێ نزیك دەخاتەوە لە ئێمە، تەنیا خوایە.

ئنجا لەڕاستییدا ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، بۆئەوەی خەڵك تووشی شیرك نەبێ‌و، ئەهلی تەوحید بێ، بۆیە ـ وەك گوتم ـ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییەی بەیان کردوە، هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ لە چەندان فەرموودەی دا، بۆ وێنە:

١/ لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾، واتە: وە خوا ئەگەر زیانێکت تووش بکات، جگە لە خۆی کەس ناتوانێ لایبدات، وە ئەگەر بیەوێ چاکەیەکت بۆ بێنێتە پێش، هیچ کەس ناتوانێ بەخششی خوا دوور بخاتەوە، خوا هەر کەسێك بیەوێ لە بەندەکانی تووشی خێرو قازانجی دەکات، وە ئەو لێبوردەی بە بەزەیی یە.

٢/ وە لە سووڕەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: دەرگای هەر ڕەحمەتو بەزەییەك خوا بۆ خەڵکی بیکاتەوە، هیچ کەس

ناتوانێ بیگرێ (ئەگەر خوا ویستی ڕەحمت پێ بکات، ئەو ڕەحمەتە بە کەس ناگیرێ) وە ئەگەر خوا ویستی ڕەحمەتێکت لێ بگرێتەوەو شتێکت نەداتێ، کەس ناتوانێ بتداتێ، لەدوای وی، خوا زاڵی کاربەجێیە.

٣/ وە لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾﴾، پێیان بڵێ: پێم بڵێن: ئایا دەبینن، ئایا دەزانن ئەوانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە (بەشەرن، بەردن، مانگان، خڕۆکەن، ئەستێرەن، حیزبن، هەرچی هەن ئەوانەی کە چاوەڕوانییتان لێیان هەیە) ئەگەر خوا بیەوێ زیانێکم تووش بکات، ئەوان دەتوانن ئەو زیانەم لێ لابدەن، یان ئەگەر خوا بیەوێ بەزەییەکی بە مندا بێتەوە (چاکەیەکم بە نسیب بکات) دەتوانن نەهێڵن ئەو چاکەو بەزەییەی خوا بۆ من بێتو لێم بگرنەوە؟!

دیارە: نەخێر وەڵامەکەی هێندە ڕوونە، پێویست ناکات بڵێن: نەخێر، بۆیە دەفەرموێ: ﴿قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ﴾، بڵێ: خوام بەسە، ﴿عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴾، پشت بەستووان تەنیا پشت بەو دەبەستن.

٤/ وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن، بۆ وێنە: ﴿عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ: لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ﴾[1]، واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە نوێژێ دەبۆوە (سەلامی دەدایەوە) دەیفەرموو:

---

١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ أَخْرَجَهُ: الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٨٤٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٣٣٧)، وَأَحْمَد بـرقم: (١٨١٦٤)، وَأَبُو دَاوُد بـرقم: (١٥٠٥)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢٩٩)، وَإِبْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٢٠٠٥)، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (١٣٤١)، وَإِبْنُ خُزَيْمَة برقم: (٧٤٢)، وَأَبي عَوَانَة برقم: (٢٠٧٠).

بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، تاکەو هاوبەشی نین، موڵك هەر هی ئەوە، ستایش هەر بۆ ئەوە، وە ئەو لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، ئەی خوایە! هەر شتێك تۆ بیبەخشی، کەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ (ڕێگر نیە لەوەی کە تۆ بیبەخشی) وە هەر شتێك کە تۆ نەیبەخشی، بەخشەر بۆی نیە، (واتە: هەر شتێك کە تۆ بتەوێ نەبێ، کەس ناتوانێ بیبەخشێ)، وە خاوەن سامان، ماڵو سامانەکەی لە بەرانبەر تۆدا سوودی پێناگەیەنێ.

٥/ هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە: ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَاً، فَقَالَ: يَا غُلامُ! إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ، إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ، إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلامُ، وَجَفَّتِ الصُّحُفُ﴾[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ سوار بوو بووم (ئەو کاتە مێرمنداڵ بووە) فەرمووی: ئەی ڕۆڵە! چەند وشەیەکت فێر دەکەم: خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێ، (واتە: دینی خوا بپارێزە، فەرمانەکانی خوا بپارێزە، جا ئەگەر فەرمانن جێبەجێیان بکە، ئەگەر قەدەغەن خۆتیان لێ بە دوور بگرە)، خواش دەتپارێزێ، خوا بپارێزە لەوەی کە لێت تووڕە بێ، خوا بەرەو ڕووی خۆت دەبینی (واتە: هەمیشە خوای پەروەردگار یارو یاوەرت دەبێ) وە ئەگەر داوات کرد بەس لە خوا داوا بکە، وە ئەگەر یارمەتیت وەرگرت، بەس داوای یارمەتی لە خوا بکە {واتە: بۆ ئەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن، ئەگەرنا تۆ بە برادەرێکی خۆت بڵێی: ئەرێ ئەو قەڵەمەم نادەیە، شتێکی پێ بنووسم؟ ئەوە قەیناکا، کەسێك داوای هاوکارییەکی لێبکەی کە بەو دەکرێ، بەڵام ئەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن، بەس لە خوایان داوا بکەو، ئەوەی تەنیا بە خوا دەکرێ، وەك: شیفای نەخۆشیی، سەرخستن، ژێرخستن،

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٦٩)، وَالتِّرْمِذِيُّ برقم: (٢٥١٦)، قَالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَالَ الشيخ الألباني: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

دەوڵەمەندبوون، هەژارکەوتن، عەزیزبوون، زەلیلبوون تا کۆتایی، چاوەڕوانیی ئەوانە لە غەیری خوا مەکە}، وە بزانە ئەگەر ئۆممەت هەموو کۆببنەوە (واتە: بەشەرییەت هەمووی کۆببێتەوە) کە سوودێکت پێبگەیەنن بە شتێك، ناتوانن سوودت پێ بگەیەنن، مەگەر خوا بۆی نووسیبی (یانی: ئەگەر خەڵکێك هاوکارییەکیشی کردیو سوودیان پێ گەیاندی، (پێش ئەوەی دەستی وان ببینی، دەستی خوا ببینە، بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەیو پێشی ئەوان، چاکەکە لە خوا بزانە، ئەگەر خوا بۆی نەنووسیبایو خوا لە دڵی نەنابان، وە ئەگەر خوا هۆکارەکانی ساز نەکردبان، ئەو شتەت بۆ نەدەبوو) وە بزانە کە ئەگەر هەموو مرۆڤەکان کۆببنەوە، زیانێکت پێ بگەیەنن بە شتێك، ناتوانن ئەو زیانەت پێ بگەیەنن، مەگەر خوا بۆی نووسیبیو خوا بەسەرت بێنێ، قەڵەم هەڵگیراون، وە لاپەڕەکانیش وشکبوونەوە، (مەبەست ئەوەیە هەموو شتێك لە زانیاریی خوادا هەیە، کەواتە: پشت بە خوا ببەستە).

٦/ هەروەها ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا غُلامُ، أَوْ يَا غُلَيِّمُ! أَلا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللهُ بِهِنَّ، فَقَالَ: احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ أَمَامَكَ، تَعَرَّفْ إِلَى اللهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفكَ فِي الشِّدَّةِ، وَاعْلَمْ: أنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبكَ، وَمَا أصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَاعْلَمْ: أنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الفَرَجَ مَعَ الكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً﴾[1]، واتە: ڕۆژێك لە پشت پێغەمبەر ﷺ سوار بوو بووم، گوتی: ئەی کوڕیژگە! (کوڕە بچکۆڵە!) هەندێك وشەت فێر دەکەم، خوا بەهۆیانەوە سوودت پێدەگەیەنێ: خوا

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٠٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط : صحيح، وَأَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ في "شعب الإيمان" برقم: (١٠٧٤)، وَالطَّبَرَانِيُّ في "الكبير" برقم: (١١٥٦٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (٦٣٠٣).

بۆیە هەردووك ڕیوایەتم هێنان، چونکە نێوەڕۆکەکەیان لێك جیایە، ڕەنگە بگوترێ: ئایا پێغەمبەر ﷺ ئەوەیانی پێ فەرمووە، یان ئەوەیانی پێ فەرمووە؟ دەڵێین: هەردووکیانی پێ فەرمووە، بەڵام (ترمذي) ئەو ڕاویانەی کە ئەو لێیەوە وەرگرتوون، ئەو بەشەیان لەلا بووە، (طبراني) و (حاكم)یش بەشەکەی دیکە، ئنجا ئەگەر حەدیسێك بە دوو سێ ڕیوایەت هات، نابێ بگوترێ: دەبێ کامیان ڕاست بێ؟ مادام شتەکان تێکناگیرێن، هەردووکیانی فەرمووە، بەڵام ڕاویەکییان هەندێکی هێناوەو، بەشەکەی دیکەش، یەکی دیکە هێناویەتی.

بپارێزە لە پێش خۆت دەیبینی، لە فەرحانییداو لە کاتی ئاسانییدا خۆت بە خوا بناسێنە، لە سەغڵەتییدا دەتناسێ (واتە: کاتێك کە لە فەرحانییدای‌و هیچ گرفتت نیە، تۆ بەندەی چاکی خوابە، کە لێت قەوما، خوا مشوورخۆرێکی باشت دەبێ‌و، یارمەتیدەرو هاوکارێکی باشت دەبێ)، وە بزانە ئەوەی کە تووشت نەبووە، نەدەگونجا تووشت بێ، وە ئەوەی کە توشت بووە، نەدەگونجا تووشت نەیەت[1]، وە بزانە کە سەرکەوتن لەگەڵ خۆڕاگریی دایە، وە دەروو لێکرانەوە لەگەڵ خەم‌وخەفەت دایە، وە لەگەڵ زەحمەت‌و تەنگانەدا ئاسانیی هەیە.

واتە: ئەو شتانە هەموویان لێك نزیکن، کە تووشی خەفەتێك بووی، وامەزانە کە قەت لێی دەرباز نابی، خەریکە دەرووت لێ ببێتەوە، وە ئەگەر تووشی سەغڵەتییەك بووی، وامەزانە تازە هەورازەو هەرگیز سەرناکەوی، هەر هێندەت زانی سەردەکەوی‌و شۆڕدەبیەوە، وە ئەگەر خۆڕاگریش بی سەرکەوتوو دەبی.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ﴾، وە خوا باڵادەستە بەسەر بەندەکانیەوەو مل پێکەچکەریانە، وە ئەو کاربەجێی شارەزایە، وشەی (قهر) لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (القَهْرُ: الغَلَبَةُ وَالتَذلِيلُ مَعًا) بریتیە لە زاڵ بوون‌و مل پێکەچکردن، کەواتە: (قاهر) بوونی خوا ﷻ بەسەر بەندەکانیەوە، یانی: هەم باڵادەستە، وە هەم ملیشیان پێکەچ

---

١) ئینسان ئەگەر ئەو حەقیقەتە بزانێ: کە ئەوەی تووشی نەبووە، نەدەگونجا تووشی بێ، وە ئەوەی کە تووشی بووە، نەدەگونجا تووشی نەیەت، جا چ بۆ چاکە بێ، چ بۆ خراپە بێ! جاری وایە کەسێك قوتار دەبێ لە بەڵایەك، کە ڕوو لە خەڵکێك دەکاتو ئەو دەربازی دەبێ، لە خۆشییان خەنی دەبێ، ڕەنگە وابزانێ ئەوە بە ئازایەتیی خۆی بووە، نا، ئەوە خوا نەینووسیبوو، دەستی خوا ببینە، خوا نەیهێشت ئەوە تووشی تۆ بێ، جاری وایە خێرێك بە وی دەبڕێ، یان پێی نابڕێ، لە حاڵەتی پێبڕاندا زۆر دڵخۆش دەبێ، لە حاڵەتی پێنەبڕاندا، زۆر سەغڵەت دەبێ، ئەگەر پێت بڕا، خوا نووسیویەتی، ئەگەر پێت نەبڕا، دیارە خوا نەینووسیبوو، زۆر خەفەتی بۆ دامەگرە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموێ.

دەکات، ئنجا ئەوەی بە خۆشی خۆی ملی بۆ خوا ﷻ کەچ دەکات، کە مسولمانانن، وە ئەوەی بە خۆشی خۆی مل بۆ خوا کەچ نەکات، دوایی هەر ملکەچی خوا دەبێ، لە سەرەمەرگدا، وە دوایی دەکەوێتە بەردەستی فریشتان‌و هەر ملکەچی خوایە، ئێمە لە هەندێك شتدا ئیختیارمان هەیە، دەتوانین ملکەچی خوا بین، دەشتوانین ملکەچی خوا نەبین، لە بەشە ئیختیارییەکەمان دا، بەڵام بەشێکی دیکەی ئیجبارییمان هەیە لە ژیانماندا، بۆ وێنە: کێ دەتوانێ نەخواو، نەخەوێ‌و، بە چاو نەبینێ‌و، بە گوێ نەبیستێ‌و، بە پێیان نەڕواو، لەژێر چەتری ئاسمانی خوادا نەبێ‌و، لەسەر زەوی خوا نەبێ‌و، ئاو نەخواتەوەو، هەوا هەڵنەمژێ‌و... هتد؟ ئەوانە هەموویان ملکەچیی ئینسانن بۆ خوا، تۆ ناچاری دەبێ هەوا هەڵمژی، ئەگەر دەتەوێ بژی، ناچاری دەبێ ئاوێ بخۆیەوەو، خواردن بخۆی، دەبێ بخەوی، دەبێ بە پێیان بڕۆی، بەکورتیی: ملکەچی یاساکانی خوای پەروەردگاری، لە بەشە ئیجبارییەکەت دا، بەڵام ئازایەتیی ئەوەیە لەو بەشەدا کە دەتوانی ملکەچ نەبی، ملکەچ بی، واتە: لە بەشە ئیخیارییەکت دا، وە سزاو پاداشتیش لەوێ دایە.

## کورتە باسێک دەربارەی لەسەرەوەبوونی خوا (فوقیّة الله)

دەمەوێ هەندێك باسی لەسەرەوەبوون (فوق)یەتی خوای بێ وێنە بکەم، خوا ﷻ لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦ﴾، واتە: خوا باڵادەستەو مل پێ کەچکەرە بەسەر بەندەکانیەوە، لێرەدا مەبەست پێی بەرزیی (علو) نیە، بەو مانایەی کە لە ئایەتەکانی دیکەدا، ئاماژەی پێکراوە، کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾الأعراف، یان دەفەرموێ: ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ۝١٠﴾فاطر، یان دەفەرموێ: ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ۝٤﴾المعارج، بەڵکو لێرەدا مەبەست پێی

(فوق)یەتی مەعنەوییە، بەڵام دەربارەی ئەوە کە خوا ﷻ لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەڕاستی بەزایەدانو تێپەڕاندن (إفراط، وتفریط)ی تێکەوتووە، من دەمەوێ لەوبارەوە تیشکێك بخەمە سەر بەرزیی (علوّ)ی خوای بێ هاوتا، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، نەك بەو شێوەیەی کە دێتە زیهنی ئێمەوە، بۆ وێنە: کە بڵێم ئەم کتێبە لەسەر ئەم مێزە دادەنێم، بەو چەمکە نا، چونکە ئەوە هی دروستکراوە، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۝١١﴾الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، کەواتە: زاتی خوا وەك هیچ کام لە زاتەکان نیە، وە سیفەتەکانیشی، وەك هیچ کام لە سیفەتەکان نین، بەڵام چەندان ئایەتو چەندان فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویانە، وە بە عەقڵو فیترەتیش دیارە کە خوا لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بە شێوەیەك کە بۆ خوا شایستەیە، با سەرنج بدەین :

١ - لە سوورەتی (الزمر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ۝١﴾، واتە: دابەزاندنی کتێب لەلایەن خوای زاڵی کاربەجێوەیە، کەواتە: ئەم کتێبە لە سەرێوە دابەزێنراوەو، لە سەرەوە بۆ خوارێ هاتوە، ئێمەی خەڵکی سەر زەوی، لە خوارێین، خوای پەروەردگار کتێبی لە ئاسمانەوە دابەزاندوە لە سەرێوە، وە کە دەشفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ﴾، کەواتە: خوای پەروەردگاریش لە سەرەوەیە.

٢ - وە لە سوورەتی (فاطر)دا خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿... إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۝١٠﴾، واتە: وشەی چاكو پاك بەرەو خوا بەرز دەبێتەوە، وە کردەوەی باش بەرزی دەکاتەوە (واتە: ئەو وشە چاكو پاکە بەرز دەکاتەوە)، کەواتە.: خوا لە بەرزییەو ئێمەش لە خوارێین، وشەی چاكو پاکیش زۆر لە زانایان دەڵێن: ﴿ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ﴾ وشەی (توحید)ەو بۆ لای

خوا بەرز دەبێتـەوە، كەواتە: خوا لە بەرزییـە، هەڵبـەتە لە بـەرزیی بـوونی خـوا، بەو شـێوەیەیە كە بۆ خـوا شـایسـتەیە.

٣ – هەروەها لە سـوورەتی (النسـاء)دا خـوا دەربـارەی عیسا ﷺ كـە جوولەكـەكان دەڵێن: كوشتوومانەو نەصرانییەكان دەڵێن: بەڵێ جوولەكەكان لە خاچیـانداوەو بـەو بۆنـەوەش صـەڵـیب بـە ملـی خۆیـاندا دەكـەن، خـوا بـە درۆیـان دەخاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ﴿١٥٨﴾﴾، واتــە: بـە تەئكیـد ئـەوان (جوولەكـەكانو ڕۆمانەكـان) عیسـایان نەكوشت، بەڵـكو خـوا بـەرەو لای خـۆی بـەرزی كردەوە، كـەواتە: خـوای پەروەردگار لە بەرزییــە.

٤ - وە لـە سـوورەتی (الـمعارج)دا باسـی فریشـتەكان دەكـاتو دەفـەرموێ: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾، واتــە: فریشـتەكانو ڕووح بـەرەو خـوا بـەرز دەبنـەوە، لـە ڕۆژێكـدا كـە ئەندازەكـەی پەنجا هـەزار سـاڵە (٥٠٠٠٠)، (كە ڕۆژی قیامەتە)، كەواتە: لەو ڕۆژەدا فریشـتەكان بەگشـتی، وە ڕووح (كـە جبـریلە) بـەرەو خـوا بـەرز دەبنـەوە، كـە ئـەو ڕۆژەش ئەندازەكـەی پەنجا هـەزار سـاڵە (٥٠٠٠٠)، واتە: ڕۆژێكی زۆر درێـژە.

٥ - وە لـە حـەوت ئایەتانـدا خـوای كاربەجـێ باسـی ئـەوە دەكـات كـە چۆتە سـەر عـەرش، دەفـەرموێ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾﴾طـه، ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾الأعـراف، دوایـی خـوا چـووە سـەر عـەرش، بـەرز بـۆوە بـۆ سـەر عـەرش، چۆن؟ بەو شـێوە كە بۆ خـوا شـایسـتەیە.

٦ - پاشان پێغەمبەر ﷺ لە جەنگـی (بنـي قريظة)دا كـە بـە دیل گیـرابوون، وە سـەعدی كـوڕی موعـاز سـەرۆكی عەشـیـرەتی ئـەوس بـووو برینـدار بـوو، وە بـەنی قورەیـزەش هاوپەیمـانی سـەعدی كـوڕی موعـاز بـوون، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ئایا ڕازین سـەعد بكەمە حەكەم؟ گوتیان: بەڵـێ، گوتـی: سـەعد تـۆ حەكـەمی، چـی لـەو دیلانـە بكـەم كـە پـەیمانیان شـكاندوە؟ سـەعد گوتـی: ئایـا هــەر بڕیارێـك بــدەم جێبـەجـێ دەكـرێ؟ پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: بەڵـێ،

گوتی: بەسەر ئەو کەسەش دا کە لەو چادرە دایە (لەبەر ئەدەب نەیگوت: بەسەر تۆشدا) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، گوتی: من بڕیار دەدەم ئەوانەیان کە باڵغن‌و پیاون، بکوژرێن، چونکە ئەوانە غەدرو خیانەتیان کرد لە ئیسلام‌و لە مسوڵمانان، پێغەمبەر ﷺ یش فەرمووی: ﴿قَدْ حَكَمْتَ بِحُكْمِ اللّٰه مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَاوَاتٍ﴾[1]، واتە: حوکمێکت تێدا کردن، کە حوکمی خوایە کە لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوەیە.

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو خوایەی کە لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوەیە، حوکمەکەی تۆ موافیقی حوکی ئەوە، دیارە پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی کە خوای بەرز ئەوەی پێ خۆشە.

٧ - هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە دوعایەکدا کە ڕازو نیار لەگەڵ خوادا دەکات، دەفەرموێ: ﴿أَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ﴾[2]، واتە: خوایە! تۆ لە سەرەوەی، هیچ شتێك لە سەرووی تۆوە نیە.

٨ – ئنجا با بەڵگەیەکی عەقڵیی‌و فیطریی لەوبارەوە بێنینەوە، بۆیەش جەخت لەسەر ئەو مەسەلەیە دەکەمەوە، چونکە هەندێك مەلای خۆمان کە بەداخەوە کارتێکراون بەوەی پێی دەڵێن: فیکری ئەشعەریی، یان ماتوریدیی، دەڵێن: خوا لە هەموو شوێنێکە!، بەلام خوا بۆخۆی لە حەوت ئایەتاندا دەفەرموێ: من لەسەر عەرشم، بەلام چۆن لەسەر عەرشە؟ بەو شێوەو بەو مانایە کە بۆ خوا شایستەیە، نەك وەك وشکە سەلەفییەکی ناحاڵیی، یان ئەوانەی کە جەستێنەر (مجسِّمة)ن، دەڵێن، کە پێیان وایە خوا لەسەر کورسییەك دانیشتوە! نا، چونکە ڕستەی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ۝١١﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، پێچەوانەی ئەوەیە، بەلام ناشتوانین بڵێین: خوا لە هەموو شوێنێکە، بەڵکو دەڵێین: خوا لە دەرەوەی

---

١) أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ في "الكبرى" ج٩، ص٦٣، وَالبَزَّار برقم: (١٠٩١)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٤٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني في "السلسة الصحيحة" برقم: (٢٧٤٥).

٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٧١٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٨١)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٣١)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٩٦٦) وَالبُخَارِيُّ في (الأدب المفرد) برقم: (١٢١٢).

دروستکراوەکانی خۆیەتی، وە خوا لە سەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، وەك لە عەقیدەی (طحاوي)دا هاتوە: (اللّٰه سُبْحَانَهُ وَتَعَالى مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ)، خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، لە دەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە، وە هەندێك کە دەڵێن: خوا لە ئاسمانە، وا دەزانن خوا لەنێو ئاسمانیدایە، ئاخر خوا لەنێو دروستکراوی خۆیدا نابێ! خوا لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی، وە بەو شێوەیەش کە بۆ خوا شایستەیە، لەسەر عەرشەکەیەتی .

٩ - ئنجا لەوبارەشەوە ئەو بەسەرهاتە هەیە، کە خاوەنی تەفسیری: (روح المعاني) (محمود الآلوسي) هێناویەتی دەڵێ: (ذكر محمد بن طاهر المقدسي أن الشيخ أبا جعفر الهمداني حضر مجلس إمام الحرمين، وهو يتكلم في نفي صفة العلو ويقول: كان اللّٰه تعالى ولا عَرْشَ، وهو الآن على ما كان، فقال الشيخ أبو جعفر: أخبرنا يا أستاذ! عن هذه الضرورة التي نجدها في قلوبنا فإنه ما قال عارف قط: يا أَللّٰه! إلا وجد في قلبه ضرورةً بطلب العلو لا يلتفت يُمنةً، ولا يُسرةً، فكيف تُدفع هذه الضرورة عن أنفسنا؟ قال: فلطم الإمام على رأسه ونزل، وأظنه، قال: وبكى، وقال حَيّرني الهَمَدَانِي!)[1]، واتە: موحەممەدی کوڕی تاهیری مەقدیسیی دەگێڕێتەوە، کە شێخ ئەبو جەعفەری هەمەدانیی لە کۆڕی ئیمامی حەرەمەیندا (کە ناوی جووەینیە) دادەنیشێ (کە زانایەکی زۆر گەورەی ئەهلی سوننەتو جەماعەتە) لەوکاتەدا ئیمامی حەرەمەین باسی نەفی سیفەتی بەرزیی لە خوا دەکات، گوتی: خوای بەرز بوو، عەرش نەبوو، ئێستاکەش هەر وەك ئەو کاتە وایە، شێخ ئەبو جەعفەریش دەڵێ:

ئەی مامۆستا! هەواڵمان پێبدە بۆچی خۆمان ناچار دەبینین، هیچ خواناسێك نەیگوتوە: (یا أَللّٰه) مەگەر لە دڵیدا هەست دەکات کە پێویست بەوە دەکات ڕوو لە سەرێ بکات، ئەوە بۆچی وایە هیچ ئاوڕ بە لای ڕاستو بە لای چەپدا ناداتەوە؟ دەڵێ: ئیمامی حەرەمەین دەستی بەسەر سەری خۆیدا داو

---

١) ج٤، ص١٥١.

(لەسەر مینبەر بوو، یان کورسی بوو، لێی دابەزیو گوتی: وابزانم گریاو گوتی: هەمەدانیی سەرسامی کردم!

دیارە پرسیارەکەی زۆر بەجێبووە، چونکە ئیمامی حەڕەمەین بۆ خۆشی کە پاڕاوەتەوە هەر وای کردوە، ئنجا ئەگەر خوا لە سەرەوە نیە، بۆچی وادەکەی؟ کەواتە: لەڕاستیدا لە سەرەوەبوونی خوای پەروەردگار، شتێکە هەم دەقەکانی قوڕئانو سوننەت دەیگەیەنن، هەم عەقڵو فیترەتی ساغیش، کەواتە: بۆیە ئەوە بەزایەدان (تفریط)ە، کە نکووڵیی لەوە بکەی خوا لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆی بێ، وەك بۆ خوا شایستەیە، بەڵام ئەوەتان لەبیرنەچێ (وەك بۆ خوا شایستەیە)، وە من یەك بەرگ کتێبم لەوبارەوە نووسیوە، (ناوو سیفەتە بەرزەکانی خوا) کە بەرگی (٣)ی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ ئاگامان لە تێپەڕاندنیش بێ، بە ڕەهایی نەڵێین خوا: لە سەرەوەیە، واتە: کە سەرەنجام بگوترێ: خوای پەروەردگار وەك دروستکراوەکان لە سەرەوەیە، چونکە ئەوە هەڵەیە، یان بڵێی خوا لە ئاسمانە، وە پێت وابێ خوا لەنێو ئاسمانێیە، یان: خوا کورسی هەیەو عەڕشی هەیەو خوا لەسەر کورسیو عەرش دانیشتوە ! ئەوە دروستکراوەکان وان، بەڵام خوای بێوێنە وانیە، وە خوای بەرزو مەزن نە پێویستی بە کورسی هەیەو، نە بە عەڕشو، نە بە ئاسمان، بەڵام خوا بۆخۆی هەواڵی بە ئێمە داوەو دەفەرموێ بەرزبۆوە بۆ سەر عەڕش، یان چووە سەر عەڕش، ئێمەش خوای مەزن بەوە وەسف دەکەین، کە خۆی پێ وەسف کردوە، بەڵام چۆنیەتییەکەی خوا بۆخۆی دەزانێ، وە ماناکەشی بۆ ئێمە دیارە، بەڵام ئەو مانایەی کە بۆ ئێمە دیارە، کە بریتییە لە: (چوونەسەر)و (نیشتەجێ بوون)و (بەرزبوونەوە)، ئەو مانایە بۆ خوا بەکارنایەت، هەروەك چۆن زانینی ئێمە بەهۆی عەقڵو دەماغەوەیە، بەڵام زانینی خوای بەرز پێویستیی بەوە نیە، وە قسەکردنی ئێمە بە زمانو قوڕگو سندوقی دەنگە، بەڵام فەرمایشتکردنی خوای بێوێنە، وانیە، وە بینینی ئێمە بە بیلبیلەو گلێنەی چاوە، بەڵام بینینی خوای تاك وانیە، وە بیستنی ئێمە بە گوێو بەو ئەندامانەیە کە گوێیان لێ پێکهاتوە، پەردەی گوێو سندانو چەکوشو ئەوانە، بەڵام

بیستنی خوای بێوێنە وانیە، كەواتە: بە هەمان شێوەش (لە سەرووبوون)ی خوای پەروەردگارو (بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەر عەرش)یش بە هەمان شێوە بەو شێوەیە كە بۆ خوا شایستەیە.

١٠ - (الآلوسي) خاوەنی (روح المعاني) قسەیەكی جوان دەكات لەوبارەوە دەڵێ: (وبالجُمْلَة يَجِبُ تَنْزِيهُ اللهِ تَعَالَى عَنْ مُشَابَهَةِ الـمَخْلُوقِين وَتَفْوِيض عِلْم مَا جَاءَ مِنَ الـمُتَشَابِهَاتِ إِلَيْهِ عَزَّ شَأنه، والإِيْمَان بها عَلَى الوَجْهِ الَّذِي جَاءَتْ عَلَيْهِ وَالتَأْوِيلِ القَرِيب إِلى الذهنِ الشَّائِع نظيره فِي كَلَامِ العَرَبِ مِمَّا لا بَأْسَ بِهِ عِنْدِي، عَلَى أَنَّ بَعْضَ الآيَات مِمَّا أَجْمَعَ عَلَى تَأْوِيلِهَا السَّلَف وَالخَلَف)[١]، واتە: بەكورتیی: دەبێ خوا بە پاك بگیرێ لەوەی كە وەك دروستكراوەكانی بچێ، وە ئەو ئایەتە موتەشابیهانەی كە هاتوونو ئێمە تێیان ناگەین، دەبێ زانیارییەكەیان حەواڵەی خوا بكرێتەوە، وە ئیمان بێنین پێیان بەو شێوەیەی كە هاتوون، بەڵام ئەگەر بە تەئویل كردنێكیش كە لە عەقڵەوە نزیك بێ تەئویل بكرێن، وە بەوە كە لە قسەی عەرەبانیشدا باوبێ، بەلای منەوە ئاساییە، وە بە تەئكید هەندێك ئایەتیش هەموو زانایانی پێشینو دوایین لەسەر تەئویل كردنیان یەكدەنگن.

منیش دەڵێم: بۆ وێنە: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ٤﴾ الحدید، خوا لەگەڵتانە لە هەر شوێنێك بن، ئیمام ئەحمەدو هەموو زانایان دەڵێن: دەبێ تەئویل بكرێو نابێ بگوترێ: خوا ئێستا لێرەیە، واتە: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ﴾، خوا لەگەڵتانە، بە چیو چۆن؟ (أَي بعِلْمِه، وَقُدْرَتِهِ، وَسُلْطَانِهِ) بە زانیارییەكەیو بە تواناییەكەیو بە دەسەتەڵاكەی، بەڵام بۆخۆی لێرە نیە، ئەگەر لێرەبێ، ئەدی چۆن لە سەرەوەی دروستكراوەكانی خۆیەتی، هەندێك لە ئایەتەكان هەر دەبێ تەئویل بكرێن، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، بەڵام دەبێ تەئویلێك بێ، بگونجێ لەگەڵ زمانی عەرەبیدا، وە نەبێتە هۆی لابردنی سیفەتەكانی خوا.

---

١) ج٤، ص١٥٢.

**مەسـەلــەی نۆیــەم:** کــە دەفــەرموێ: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ۚ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّآ أَشْهَدُ ۚ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾

پێنج هەڵوەستە لەبـەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا :

**هەڵوەســـتەی یەکــەم:** لێرەدا خـوا بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً﴾، لـە هــاوبەش دانــەرەکان بپرســـە، بڵــێ: چ شـــتێك شــایەدیی دانەکـەی گـەورەترە، واتـە: کــێ شــایەدیی دانەکـەی گـەورەترە؟ دوایـی خـوای کاربەجـێ هـەر بۆخـۆی، وەڵام دەداتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾، بڵـێ: خـوا، ئەگـەر شــایەدیی بـدا، شــایەدیی دانەکـەی لە هــی هــەموو کــەس گەورەترە، لێــرەدا زانایــان دەڵــێن: دەگونجــێ مەبەســـت لــە شــایەدیی لەســـەردراو خــوا بەیەکگــرتن بــێ، واتـە: کـــێ ئەگـەر شـــایەدیی بـــدا بــۆ ڕاســـتێتیی خـــوا بــە یەکگــرتن، شــایەدیی دانەکـەی گـــەورەترە!! دیـارە دوایـــی وەڵام دەداتـــەوە کـە ئەگـەر خـــوا شـایەدیی بـدا، لەســـەر ئـەوە کـە تەنیـا خـوا بپەرسـتـرێو، تـەنیا بەندایـەتیی بـۆ خـوا بکـرێ، شـایەدیی دانەکـەی لە هـی هەموو شـتێكو لـە هـی هــەموو کــەس گــەورەترە.

هەندێکیشـــیان گوتوویانــە: دەگونجــێ لێــرەدا مەبەســـت لــەو بابەتـــەی کـە شـاهێدیی لەســـەر دەدرێ، پێغــەمبەرایەتیی موحەممـــەد ﷺ بــێ، واتـە: ئایا چ شـــتێك ئەگـــەر شـایەدیی بـدات لەســـەر ئـەوە کـە موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری خوایـە، شــایەدیی دانەکەی گـەورەترە؟

**هەڵوەسـتەی دووەم:** چۆنیـەتی شایەدیی دانی خوا لەسـەر تەوحید، لەســەر ئــەوە کە تەنیـا خۆی دەبـێ بپەرسـترێو بەندایەتیی بۆ بکرێ، بە چەند جۆرێکـە:

<u>جۆری یەکەم</u>: بەو نیشانەو بەڵگانەی کە لە دەروونی ئینسانو لە ئاسۆیەکاندا دایناون، وەك دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت، واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمان لە دەروونیاندا، وە لە ئاسۆییەکاندا، (واتە: لە دەوروبەریاندا) بۆیان دەردەخەین، تاکو بۆیان دەرکەوێ کە خوا هەقە، یان قورئان هەقە.

<u>جۆری دووەم</u>: لە شایەدییدانی خوای باڵادەستو بێ هاوتا، لەسەر ڕاستێتیی خوا بەیەکگرتن، بریتیە لە عەقڵو سروشتە ساغەکان، کە خوا دروستی کردوون، واتە: هەموو عەقڵێکی سەلیمو هەموو سروشتێکی ساغ، دەزانێ کە خوا تاکە پەرستراوە، وە تاکە زاتێکە دەبێ بەندایەتیی بۆ بکرێ.

<u>جۆری سێیەم</u>: لە شایەدییدانی خوا لەسەر خوا بەیەکگرتن، بریتیە لە ئایەتەکانی قورئان، واتە: ئەو ڕستانەی کە قورئانیان لێ پێکدێ، لە ئایەتەکاندا خوای پەروەردگار شایەدییدانی خۆی ڕاگەیاندووە، وە قورئانیش لە سۆنگەی ئەوەوە کە دەستەوسانکەرەو هیچ کەس ناتوانێ وەك قورئان بێنێ، کەواتە: قورئان بەڵگەو شایەدە لەسەر ئەوە کە تەنیا خوا شایستەی پەرستنە.

<u>جۆری چوارەم</u>: بریتیە لە موعجیزەکان، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، مەگەر موعجیزەیەکی دراوەتێ، پێی ئیسپات کردوە کە پێغەمبەری خوایە، موعجیزەش بریتیە لە شتێك کە بەرانبەرەکان دەستەوسان دەکات، کەواتە: موعجیزەکانی پێغەمبەرایەتییش، وە قورئان بۆ خۆشی کە موعجیزەی پێغەمبەری خاتەمە، بەڵگەن لەسەر ئەوە کە خوا تاکە پەرستراوی هەقە، بەڵام ئایا ئەگەر مەبەست لەو شتە کە شایەدیی لەسەر دەدرێ، پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ بێ، خوا چۆن شایەدیی لەسەر داوە؟

یەکـەم: ئەوە کە خـوا پێغـەمبەرایەتیی بـە پێغـەمبەری کۆتـایی موحەممـەد ﷺ سـپاردوە، بۆخۆی بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە پێغەمبـەرە، چونکـە: هـەر کەسێك تەماشـای حـاڵو ژیـانو بەسـەرهاتی موحەممـەد ﷺ بکـات، بـە ئاشـکرا دەسـتی خـوا دەبینـێ، چ پـێش پێغەمبەرایـەتیی، وە چ دوای پێغـەمبەرایەتی، وە دڵنیـا دەبـێ کـە موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری خوایـە، مەولـەوی شـاعیـر لەوبـارەوە شـیعرێکی هەیـە دەڵـێ:

**هەتیـو وە ئەدەو ئومـمی عەللامە    لەمە موعجیـزتر موعجیـزە کامە!**

پێغـەمبەر ﷺ بـێ بـاب بـووە، بەڵـکو بـێ دایکـیش بـووە، ئنجـا لەگـەڵ ئەوەشدا لە لووتکەی بەرزی ئەدەبو ئاکاردا بـووە، پاشـان نەخوێنـدەوار بـووە، وە لـە لووتکـەی زانسـتو مەعریفـەتو شـارەزاییدا بـووە، ئنجـا لەڕاسـتییدا کاتێك منداڵ بەبێ، دایـكو بـاب گـەورە بـێ، وە خاوەنـی ڕەوشـتو ئەدەبێکـی مـەزن بـێ، وە کاتێـك کەسـێك نەخوێنـدەوار بـێ، کەچـی لـە لووتکـەی مەعریفـەتو شـارەزاییو زانسـتدا بـێ، کەواتـە: دیـارە خـوا فێـری کـردوەو خـوای پەروەردگار لەسـەر ئەو ئەدەبو ڕەوشـتە جوانە پەروەردەی کـردوە.

دووەم: هـەروەهـا خـوای پـەروەردگار بـەهۆی قورئانـەوە شـایەدیی دەدا کـە موحەممـەد ﷺ پێغـەمبەری خوایـە، چونکە قورئانێکـی لـە خـواوە بـۆ هـاتوە، کـە هـیچ کـەس ناتوانـێ نـەك قورئانێکـی وا، بگـرە دە (١٠) سـووڕەت، بـەڵکو یـەك سـووڕەتی واش بێنـێ، کەواتـە: دیـارە موحەممـەد ﷺ ڕەوانـەکراوی خوایـەو قورئـانی بۆ هـاتوە.

سێیەم: جۆرێکی دیکە شایەدییدانی خـوای بێهاوتـا لەسـەر پێغـەمبەرایەتیی موحەممـەد ﷺ، بریتیـە لـە مـوژدەدانی کتێبـە پێشـووەکان، وە پێغەمبـەرانی پێشـوو (علیهم الصلاة والسلام) لەسـەر پێغەمبەرایـەتیی موحەممـەد ﷺ، دیارە ئێستاش کتێبە پێشـووەکان، واتـە: پـەیمانی کۆنو پـەیمانی نـوێ، دیـارە کـە دەگـوترێ: پـەیمانی کـۆن (العهد القديم) واتـە: تـەوڕاتو هـەموو ئـەو کتێبـانەی کـە لەگـەڵ تـەوڕات دان، وە کـە دەگوتـرێ پـەیمانی نـوێ (العهـد

الجدید)، واتە: چوار ئینجیلەكانو كتێبەكانی دیكەی كە لەگەڵیاندان، وە ئێستاش لە پەیمانی كۆنو نوێ، لە زۆر شوێنان دا، لەگەڵ ئەوەش دا كە دەستكاریی كراونو گۆڕدراون، دەردەكەوێ كە پێغەمبەرانی پێشوو (علیهم الصلاة والسلام)، مووساو عیسا بە پلەی یەكەم، پاشان هەموو ئەو پێغەمبەرانەی دیكە، كە لە پەیمانی كۆنو نوێدا ناویان هاتوە، موژدەیان داوە كە لە دوا قۆناغی ژیانی بەشەردا، پێغەمبەری كۆتایی دێ، وە ئەو نیشانانەی كە ئەوان گوتوویانن: تەنیا بەسەر پێغەمبەر (محمد) ﷺ دا دەچەسپێن.

**هەڵوەستەی سێیەم:** كە خوا دەفەرمویێ: ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ ﴾، زانایان ئەوەیان كردوە بە بەڵگە كە وشەی (شيء) كە بە كوردی یانی (شت) هەر شتێكە بوونی هەبێ، بۆ خوا بەكاردێ، چونكە (شيء) شت، بریتیە لە هەر شتێك كە بگونجێ هەواڵی لێبدەی، وە بگونجێ بزانرێ، دیارە خوای پەروەردگاریش زانراوەو هەواڵی لێ دەدرێ، بەڵام بەتەئكید وشەی (شيء) یەكێك نیە لە ناوە چاكەكانی خوا، لەبەرئەوە ناتوانی بڵێی: (یا شيء)، بۆچی؟! چونكە خوا سبحانه وتعالی دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴿١٨٠﴾ ﴾الأعراف، خوا ناوە هەرە چاكەكانی هەن، بەوان لێی بپاڕێنەوە، بەڵام وشەی (شيء) لەو ناوانە نیە كە بۆ خوا بەكارهاتوون، بەڵكو وشەو تەعبیرێكی گشتییە كە خوای بەرزو مەزنیش دەگرێتەوە، بەڵێ خوا شت (شيء)ە، بەڵام (لیس كالأشیاء) وەك شتەكانی دی نیە، ئەو بەدیهێنەرەو شتەكانی دیكە هەموویان بەدیهێنراون.

**هەڵوەستەی چوارەم:** لەبەردەم ئەو ڕستەیەدا دەكەین: ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ ﴾، وە ئەم قورئانەم بۆ ڕەوانە كراوە، كەواتە: كە دەفەرموێ: بڵێ خوا شایەدە لە نێوان منو ئێوەدا، وەك گوتم لەسەر ڕاستێتیی خوا بەیەكگرتن (توحید)، یاخود لەسەر ڕاستێتی موحەممەد ﷺ كە پێغەمبەری

خوایە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ ﴾، وە ئەم قورئانەم بۆ ڕەوانە کراوە، واتە: وەك بەڵگەی ئیسپاتی خوا بەیەکگرتن، یاخود بەڵگەی ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، ئەوە ئەم قورئانەم بۆ نێردراوە، کە بەڵگەو شایەدە، ئنجا ئامانجی ڕەوانەکرانی قورئان، بەیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، بۆئەوەی ئێوەی پێ وریا بکەمەوەو ئێوەی پێ بترسێنم، وە هەر کەسێکی دیکەش کە قورئانی پێ دەگات، دیارە وشەی (إِنْذَار) لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (الإِنْذَار: إعلامٌ مع تخويف) بریتیە لە ئاگادارکردنەوە لەگەڵ ترساندن دا، قورئان هاتوە بۆئەوەی خەڵك وریا بکاتەوەو بێداریان بکاتەوە، وە بشیان ترسێنێ کە ئینسان بە هەوەنتە دروست نەکراوە، بەڵکو ئایندەیەکی زۆر ترسناك چاوەڕێی دەکات، کە بریتیە لە لێپێچانەوە وە لێپرسینەوە لەلایەن خوای دادگەرەوە.

کەواتە دەبێ ئینسان بزانێ چۆن دەژی؟ چی دەکات؟ چۆن دەکات؟ ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، کە ئەوە هەموو سەدەو وەچەکانی دیکەی دوای سەدەی پێغەمبەر ﷺ تا دنیا بە کۆتا دێ، دەگرێتەوە، چونکە هەندێك گوتوویانە: قورئان تەنیا بۆ عەرەب هاتوە، وە تەنیا بۆ ڕۆژگاری خۆی هاتوە، بەلام ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، قورئانم بۆ نێردراوە، تاکو ئێوەی پێ وریا بکەمەوە، وە هەر کەسی دیکەش کە پێی دەگات دوای ئێوە، کەواتە: قورئان تەنیا بۆ گەلی عەرەب نەهاتوە. وە ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە لەسەر مسوڵمانان فەرزە ئەم قورئانە بگەیەنن بە هەموو میللەتان، وە بیگەیەنن بە هەموو مرۆڤەکان، چونکە خوا لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، ئەم قورئانەم بۆ ڕەوانەکراوە، تاکو ئێوەی پێ وریابکەمەوە، وە هەموو ئەوانی دیکەش کە پێیان دەگات، کەواتە: فەرزە لەسەر ئۆممەتی پێغەمبەر

ﷺ، ئەو لە سەردەمی خۆیدا بە خەڵکی ڕۆژگاری خۆی گەیاندوە، چ ئەوەی ڕاستەوخۆ پێی گەیاندوە، چ ئەوەی بە نامە بۆ پادشاکانی ڕۆم و فارس و میصرو حەبەشەو، وە لەسەر ئۆممەتەکەشی پێویستە، هەر جیلێك لە جیلەکانی ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەم قورئانە بە هەموو زمانەکان هەوڵ بدات تەرجەمەی بکات، وە بیگەیەنێ بە مرۆڤایەتیی، تاکو ئەوەی کە خوا ویستوویەتی، ئەوانی پێ وشیار بکاتەوەو ئەو پەیامەی خوا بزانن چییە؟

(القرطبي) دەڵێ: کە دەفەرمویێ: ﴿ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، واتە: وە هەر کەسێك کە باڵغ بووبێ، ئەم قورئانەی پێ بگەیەنم، بەڵام لەڕاستیدا ئەم واتایە بێهێزە، هەرچەندە ئەوەش دەگرێتەوە، چونکە ئەو کاتە هەر کەس باڵغ بووبێ لەسەری فەرز دەبێ، بە دوای قورئان بکەوێ، ئەوە ڕاستە، بەڵام لێرەدا ﴿ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، واتە: ئێوەشی پێ وریا بکەمەوە، وە هەر کەسێکی دیکەش کە پێی دەگات.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە کە فەرزە لە دوای خۆی ئۆممەتەکەی قورئان بگەیەنن بە خەڵك، فەرموویەتی: «بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً، وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[1]، واتە: ئایەتێکیش بێ لە منەوە بیگەیەنن، (بۆچی دەفەرموێ لە منەوە؟ چونکە ئەم قورئانە هەمووی لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ گەیشتوە، کەواتە: لەسەر ئۆممەتەکەی فەرزە کە ئەم قورئانە، وە ئەم ئیسلامە بگەیەنن بە خەڵکی دەوروبەریان) وە لە بەنی ئیسرائیلیشەوە بگێڕنەوەو هیچ سەغڵەتیی تێدا نیە، (واتە: ئەم هەواڵ و شتانەی کە لە کتێبەکانیاندا هاتوون، با زانیارییتان لەسەری هەبێ و بزانن چییان گوتوە، هەرچەندە ڕاست و درۆشی تێکەڵ کراوە، بەڵام دیارە وەك بەسەرهات و مەعلوماتی مێژوویی، دەتوانن سوودیان لێ ببینن، نەك وەك دین، چونکە وەك دین ئەوە تەنیا قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمە دینێکی پابەندکەرە،

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٦١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٦٩)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٦٢٥٦)، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٥٤٢).

بەڵام ئەگەر ئینسان شارەزاییشی هەبێ دەربارەی کتێبەکانی خاوەن کتێبان، چ هی جوولەکەو نەصرانیی، یان هی ئەوانی دیکە، شتێکی باشە).

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ﴾، وە هەر کەسێك بە ئانقەست درۆ بە زمانی منەوە بکات، با شوێنی خۆی لە ئاگری دۆزەخدا هەڵبگرێ، بۆچی دەفەرموێ: (مُتَعَمِّداً)؟ تۆ شتێکت پێ دەگات دەڵێن: ئەوە حەدیسی پێغەمبەرە ﷺ، تۆش دەیگێڕیەوەو دەڵێی: پێغەمبەر ﷺ وایفەرمووە، واش نیەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ نیە، ئایا تۆ وەبەر ئەو هەڕەشەیە دەکەوی؟ نەخێر، بۆچی؟ چونکە تۆ بە ئانقەست ئەوەت بە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ بڵاونەکردۆتەوە، تۆ واتزانیوە فەرموودەیە، وە ئەگەر وا نەبووایە، زۆر لە زانایان وەبەر ئەو هەڕەشەیە دەکەوتن، بەڵام ئەگەر تۆ بزانی شتێك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ نیە، وە بشڵێی: پێغەمبەر وایفەرمووە، ئەوە بەو هۆیەوە ئینسان وەبەر ئەو هەڕەشەیە دەکەوێ، بەڵام ئەگەر نەزانی لە رووی سەنەدەوە، دەقێك بە ئێمە گەیشتوە پێمانوایە کە فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ بە دەمی پێغەمبەرە بڵاوی دەکەینەوە، بەڵام هی ئەویش نیە، ئەوە لەو حاڵەتەدا ئینسان وەبەر ئەو هەڕەشەیە ناکەوێ، چونکە بە ئانقەست درۆی بە ناوی پێغەمبەر ﷺ نەکردوە.

**هەڵوەستەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّا أَشْهَدُ ۚ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾، دێتەوە سەر باسی خوا بەیەکگرتن (توحید)، دەفەرموێ: ئایا (ئەی کافرەکانو بتپەرستەکانو ئەی هاوبەشدانەرەکان، یاخود ئەی خەڵکینە بەگشتی!) ئێوە شایەدیی دەدەن کە لەگەڵ خوادا پەرستراوانی دیکە هەن؟ ﴿قُل لَّا أَشْهَدُ﴾، تۆ بڵێ: من شایەدیی نادەم، چونکە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، واتە: پەرستراوی بە هەق نیە، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق زۆرن، خەڵك مانگ دەپەرستێ، خۆر دەپەرستێ، بووذا دەپەرستێ، حیزبێکی کافر دەپەرستێ، ڕژێمێکی تاغووتیی دەپەرستێ، هەواو ئارەزووی خۆی دەپەرستێ،

پارەو سامان دەپەرستێ، چیو چی دەپەرستێ... هتد، ئەوانە هەموویان هەن، بەڵام ئەوانە هەموویان پەرستراوی بە ناهەقن، پەرستراوی بە هەق نیە جگە لە خواو، تەنیا خوا پەرستراوە، ﴿قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾، بڵێ: تەنیا یەك پەرستراو هەیە، کە خوایە، وە من لەوەی کە ئێوە دەیانکەن بە هاوبەش بۆ خوا، بەرییم و حاشایان لێ دەکەم، یەخەیان لێ دادەڕم و دوورییان لێ دەگرم.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾، لە سوورەتی (البقرة)شدا ئەم ڕستە موبارەکە هاتوە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ... ﴿١٤٦﴾﴾، ئەوانەی کتێبمان پێداون، دەیناسن، وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، واتە: موحەممەد ﷺ، دەناسن کە (موحەممەد) پێغەمبەری خاتەمە، چونکە ئەوکاتە هەموویان چاوەڕێیان دەکرد، جوولەکەو نەصرانییەکان چاوەڕێیان دەکرد، خاوەن بەرنامەکانی دیکە چاوەڕێیان دەکرد، بۆچی؟! چونکە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، مەگەر هەواڵی داوە بە ئۆممەتەکەی خۆی کە ئەگەر وەچەکانتان مان، لە کۆتایی زەماندا پێغەمبەرێك دێ بە ناوی موحەممەد ﷺ و بە ناوی (أحمد) کە لەسەر هەموو بەشەر پێویستە پابەندی ئەو بەرنامەیە بێ، کە دەیهێنێ، وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾﴾، خوا دەفەرموێ: وە یادبکەوە کاتێك خوا پەیمانی پتەوی لە

پێغەمبەران وەرگرت (فەرمووی:) چونکە کتێب و حیکمەتم پێداون، دوایی ئەگەر پێغەمبەرێکتان هاتەلا، کە بە ڕاستدانەری ئەوە بوو کە پێتانە (لە بەرنامەکان)، ئەوە دەبێ بێگومان بڕوای پێبێنن و پشتی بگرن، (خوا) فەرمووی: ئایا دانتان پێداهێناو پەیمانی منتان لەسەر ئەوە وەرگرت؟ گوتیان: دانمان پێداهێنا، فەرمووی: دەجا شایەدبن، وە منیش لەگەڵتان دا لە شایەدانم.

وە خوا پێغەمبەرانی پێشووی، هەر پێغەمبەرەی بۆ کۆمەڵگایەك ناردوە، بۆ کاتێكو شوێنێك، بۆ گەلو عەشیرەتێك، بەلام پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بۆ هەموو بەشەر نێردراوە، چونکە دەبوایە بەشەر کۆببنەوە لەسەر یەك بەرنامە، کە ئەویش موحەممەد ﷺ دەیهێنێ، بۆیە هەموو کۆمەڵگایەکان کە پێغەمبەرانیان لەنێودا ڕەوانەکراون، پێغەمبەرەکانیان پێیان ڕاگەیاندوونو زانیویانە کە لە سەردەمی واندا پێغەمبەری کۆتایی نایەت، بەلام فەرموویانە: بە جیلەکانی دوای خۆتان ڕابگەیەنن، کە ئەگەر پێغەمبەری کۆتایی هات، لەسەر هەموو مرۆڤایەتیی پێویستە واز لەو بەرنامانەی دیکە بێنێو واز لەو کتێبانەی دیکە بێنێ، کە بۆ قۆناغێکی دیارییکراوو بۆ کاتێکی دیارییکراوو بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو نێردراون، وە هەموویان بە دوای ئەو کۆتا کتێبو ئەو کۆتا پێغەمبەرە ﷺ بکەون، کە بۆ هەموو بەشەر دێ، کە پێغەمبەرەکە ناوی (مُحَمَّد) و (أحْمَد)ە، وە کتێبەکەشی قورئانە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: خاوەن کتێبەکان دەیناسن، وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، واتە: موحەممەد ﷺ یاخود قورئان، هەردووکی دەگرێتەوە، وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، وە لە پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێ (العَهْد القَدِيم وَالعَهْد الجَدِيد)دا کە دووسێ هەزار لاپەڕە دەبن، لە چەند شوێنان لەو کتێبانەدا، هاتوە کە پێغەمبەران موژدەیان داوە لە دوای ئەوان پێغەمبەرێك دێ، شوێنکەوتووەکانی ئاوانو، ئەو پێغەمبەرە دەستەلاتی ئاوا دەبێو، ئەو پێغەمبەرە ئایەتەکانی خوا ئاوا دەخوێنێتەوە ... هتد، کە سیفەتەکانی جگە لە موحەممەد ﷺ بەسەر هیچ کەسی دیکەدا ناچەسپن، وە من لە کتێبی:

(الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا بە درێژیی باسی ئەو مەسەلەیەم کردوە، وە چەند نموونەیەکی گرنگم لەوبارەوە لەو کتێبانەوە هێناون[١].

دوایی دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، واتە: ئەوانەی کە خۆیان لەدەستداوە بۆیە ئیمان ناهێنن، کە پێشتریش باسمان کرد، ڕستەکە بە ڕواڵەت دەبێ ئاوابێ: (الَّذِينَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَخَسِرُوا أَنْفُسَهُم) ئەوانەی ئیمانیان نەهێناوە، سەرەنجام خۆیان لەدەستداوە، بەڵام خوای پەروەردگار بەو شێوەیە ڕستەکەی داناوە: ئەوانەی خۆیان لەدەستداوە، بۆیە ئیمان ناهێنن، واتە: خوا خۆ لەدەستدانو خۆ دۆڕاندنەکەی، کردوە بە ئەنجامو پێشی خستوەو، هۆکارەکەی کە ئیمان نەهێنانە، دوای خستوە، بۆچی؟ چونکە لەڕاستیدا بەنسبەت ئەوانەوە کە لە دوارۆژدا خۆیان لەدەستدەدەنو خۆیان دەدۆڕێننو، لەسەر بوونەکەیان قەرزدار دەبنەوە، ئەوەی بۆوان زیاتر بایەخی هەیە، بریتیە لە خۆ لەدەستدان، دیارە ئیمانەکەیان لە دنیادا نەهێناوە، بەڵام خۆ لەدەستدانو قەرزداربوون لەسەر بوونی خۆیان، لە دوارۆژدا وەدەرکەوتوە، بۆیە خوای پەروەردگار ئەوەی پێش خستوە.

**<u>مەسەلەی یازدەیەمو کۆتایی</u>**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە درۆ بە ناوی خواوە دەکات، یان ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانێ.

دوو شت خوا خاوەنەکەیانی بە زاڵمترین کەس داناوە:

<u>یەکەم</u>: کەسێك کە درۆ بە ناوی خواوە دەکات.

<u>دووەم</u>: کەسێك ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانێ، واتە: ئەو کەسەی کە یەکێك لەو دوو سیفەتانەی تێدابێ، زاڵمترین کەسە.

---

١) بڕوانە: المجلد الرابع، ص ٢٨٦- ٣٠٣، وە لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف ) ئایەتی ژمارە (١٥٧)دا، چەند نموونەیەکم لەو موژدانە هێناون.

ئنجا درۆ بە ناوی خواوە یانی چی؟ واتە: بڵێی: خوا هاوبەشی هەیە، ئاخر کوا خوا هاوبەشی هەیە؟! خوا مەخلووقی هەن‌و غەیری خوا، هەموو بەدیهێنراوەکان‌و هەموو ژیاندارەکان، خوا ڕێو شوێنی بۆ داناون، چ مرۆڤ بن، چ جند بن، چ فریشتە بن، چ ماددەی بێ گیان بێ، چ هەر دروستکراوێکی دیکە کە لە بوونەوەردا هەیە، لە گەردیلەوە تا کەهکەشان، بێ ژیان بێ، یان ژیاندار، هەمووی دروستکراوی خوایە، بۆیە ئەگەر یەکێك لە دروستکراوەکانی خوا، بێنیە ڕیزی خواو هاوتای بکەی لەگەڵ خوادا، ئەوە تۆ درۆت بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: کەسێك وابکات ستەمکارترین کەسە، ﴿أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ﴾، یان ئایەتەکانی خوا بە درۆ بزانێ، واتە: هیچ کەس ستەمکارتر نیە لەو کەسەی کە خوا بەیەکگرتن بە ناڕاست دادەنێ‌و، شیرك هەڵدەبژێرێ، یاخود ئایەتەکانی خواو پێغەمبەرایەتیی‌و وەحی بە درۆ دادەنێ، هەر کەسێك یەکێك لەو دووانە بکات، ئەوە ستەمکارترین کەسە، ئەدی کەسێك هەردووکیانی تێدابن، هەم درۆ بە ناوی خواوە بکاو بڵێ: خوا هاوبەشی هەیە، هەم ئایەتی خواش بە درۆ دابنێ! ئەوە بە تەئکید هەر زۆر ستەمکارە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، بێگومان ستەمکاران سەرفراز نابن، بۆ زانیارییتان وشەی (ظالم) لە قورئاندا بە مانای کافر دێ، وە بە مانای کەسێك دێ کە ستەم لە کەسێکی دیکە دەکات، وە بە مانای هاوبەشدانەر (مُشْرِك)یش دێ، چونکە وشەی (ظُلْم) بە دوو شێوە پێناسە کراوە: (الظُّلْمُ: وَضْعُ الشَّيْءِ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ، أَو تَجَاوُزُ الْحَدِّ)، (ظُلْم) بریتیە لەوەی شتێك لە غەیری شوێنی خۆی دابنێی، یاخود بریتیە لە سنوور بەزاندن، ئنجا کەسێك بێنێ لە جێی تەوحید ئیمان بە شیرك بێنێ، وە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دابنێ، بە تەئکید ئەوە شتێکی زۆر بێجێی کردوە، وە لە هەمان کاتدا سنووریشی بەزاندوەو سنوور شکێنیی کردوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لەم دەرسـەدا ئایەتەکانی (٢٢ تا ٣٢) واتە: یـازدە ئایەت تەفسـیـر دەکەین، کە تـەوەری سـەرەکییان بریتیە لە بەرجەستەکردنی سـەرەنجامی شوومی هاوبەش بۆ خـوا دانـەران لە ڕۆژی دوایـی دا.

بەڵـێ ئـەم دەرسـە سـوڕگەی سـەرەکیی ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ باسـی سـەرەنجامی شـوومی ئەوانـە دەکـات، کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنـێن، کـە لـەڕۆژی دواییـدا پـاش خڕکرانـەوەی هـەموو لایـەك، پرسـیار لـە هاوبەشـدانەرەکان دەکـرێ، لـەبارەی هاوبەشـەکانیانەوە، ئـەوانەی کـە کردوویـانن بـە هاوبـەش لـە پەرسـتندا، پرسـیاریان لـێدەکـرێ: کـوا هاوبەشەکانتان لە کوێـن، ئەوانـەی کە گومانتان دەبرد هاوبەشـی خـوان؟ دیـارە بێجگە لە نکووڵیی لێکردن هیچی دیکەیان بۆ نامێنێتەوە.

پاشان خـوا باسی هەڵوێستی نەبیسـەرانەو کەللـەڕەقانەیان لـە بەرانبـەر ئایەتـەکانی خـوادا دەکات، هەروەهـا تۆمەتی ئەفسانەی پێشینان دانەپاڵ قوڕئـان! کـە دەڵێن: قوڕئـان ئەفسانەی پێشینـانە، ئەوەیـان دەخـاتەڕوو.

وە دوایـی ئامـاژە بـە هەڵوێسـتی خـەڵك دوورخەرەوانـەو خـۆ دوورگیـرانەیان لـە بەرانبەر پێغەمبـەردا دەکـات، کـە هـەم خەڵکـیان دووردەخستەوە، هـەم بۆخۆشـیان لێـی دوور دەکەوتنـەوە، دوایـی دیمـەنی ڕاگیـرانیان لـە سـوێی ئـاگری دۆزەخو، پەشـێمان بوونـەوەیان دەخاتـە بەرچـاو، هـی کافرەکـانو هـی هاوبەشـدانەرەکان، وە بـە درۆیـان دەخاتـەوە، لـە خۆزگـە بـە ئیمـان خـواستنەکەیاندا، چونکـە لـەوێ خۆزگـە بـە ئیمـان دەخـوازن، بەڵام خـوا دەفەرمـوێ: درۆ دەکـەن ئێسـتاش ئەگـەر بیانگێڕنـەوە بـۆ دنیـا، هەر بە هەمـان بەزمـی پێشـی دەسـت پـێ دەکەنـەوە.

ئنجا دوایی باسی هەڵوێستی تەنیا ژیانی دنیا بینینو، نکووڵیی کردنیان لە قیامەت دەکات، وە دوایی جارێکی دیکە هەڵوێستی ڕاگیرانیان لە قیامەتدا، لەبەردەم پەروەردگاردا دەکات، کە سەرزەنشت دەکرێن، وە دان بە هەڵەو کەموکورییەکانی خۆیاندا دێنن، کە بەهەڵەدا چوون، وە سەرەنجام ئاکامی شوومیان کە بریتییە لە زیانباریی‌و خەفەتباریی‌و وە گوناحو خراپە لە کۆڵنانیان، دەخاتەڕوو.

لە کۆتایی دا خوای بەرزو مەزن ژیانی بێبڕوایان بە گەمەو یاریی‌و پێناسە دەکات، وە ڕایدەگەیەنێ کە مەنزڵگای دوارۆژ بۆ پارێزکاران باشترە ئەگەر بفامن.

﴿ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ
(٢٢) ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ (٢٣) ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ
عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ (٢٤) وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَۖ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ
قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا
جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ (٢٥) وَهُمۡ يَنۡهَوۡنَ عَنۡهُ
وَيَنۡـَٔوۡنَ عَنۡهُۖ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ (٢٦) وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ
فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٢٧) بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ
يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ (٢٨) وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا
حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ (٢٩) وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ قَالَ أَلَيۡسَ هَٰذَا
بِٱلۡحَقِّۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ (٣٠) قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ
كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ قَالُواْ يَٰحَسۡرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا
وَهُمۡ يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ (٣١) وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا
لَعِبٞ وَلَهۡوٞۖ وَلَلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۗ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ (٣٢) ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{وە (یاد بکەوە) ئەو ڕۆژەی تێکڕایان کۆدەکەینەوە، دوایی بە وانەی هاوبەشیان (بۆ خوا) داناوە دەڵێین: کوان ئەو هاوبەشانەتان کە پێتان وابوو (هاوبەشی خوان لە پەرستندا)؟ ﴿٢٢﴾ ئنجا ئەنجامی تاقیکرانەوەکەیان (بەو پرسیار لێکردنە) هەر ئەوە بوو کە گوتیان: بە خوا پەروەردگارمان! ئێمە هاوبەشدانەر نەبووین ﴿٢٣﴾ سەرنج بدە! چۆن خۆیان بە درۆ دەخەنەوە، وە ئەوەی کە هەڵیان دەبەست (کە گوایە خوا هاوبەشی هەن) لێیان بزر بوو ﴿٢٤﴾ وە هەیانە لەوان کە گوێت بۆ هەڵدەخات، بەڵام پەردەمان خستوونە سەر دڵیان، تاکو تێینەگەن، وە قورساییمان خستۆتە گوێیانەوە، وە ئەگەر هەرچی بەڵگەو نیشانە هەیە ببینن، بڕوای پێ ناهێنن، دەڵێن: ئەم (قورئان)ە، جگە لە ئەفسانەکانی پێشووان، هیچی دیکە نیە ﴿٢٥﴾ وە ئەوان خەڵکیشی لێ دەسڵەمێننەوەو، خۆشیان لێی دوور دەکەونەوە، وە هەر هەست ناکەن، ئەگەرنا (بەو ڕەفتارەیان) بەس خۆیان دەفەوتێنن ﴿٢٦﴾ وە ئەگەر ببینی لە کاتێکدا کە لەسەر سوێی ئاگر (ی دۆزەخ) وەستاندیانن، ئنجا گوتیان: خۆزگە گێڕرابایینەوە (بۆ دنیا) وە ئایەتەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەزانیبایەو لە بڕواداران بووینایە، (ئەوە دیمەنێکی دڵتەزێنت دەبینی) ﴿٢٧﴾ (خوا دەفەرموێ:) بەڵکو ئەوەی پێشتر پەنهانیان دەکرد، بۆیان دەرکەوتوە، دەنا ئەگەر گێڕراباشنەوە، هەر دەگەڕانەوە سەر ئەوەی کە ڕێگرییان لێی کراوە، وە بێگومان درۆزنن ﴿٢٨﴾ وە (هاوبەشدانەرەکان) گوتیان: (ژیان) هەر ژیانی دنیایەو زیندووش ناکرێینەوە ﴿٢٩﴾ وە ئەگەر تۆ (بە چاوی عەقڵ و دڵ) ببینی کاتێك کە لەبەردەم (دادگای) پەروەردگاریاندا ڕادەگیرێن (دیمەنێکی سامناك دەبینی، خوا فەرمووی:) ئایا ئەم (زیندووکرانەوەو لێپرسینەوەیە)ە هەق نیە؟ گوتیان: با، سوێند بە پەروەردگارمان، فەرمووی: دە ئازار بچێژن بەهۆی ئەوەوە کە کافر بوون ﴿٣٠﴾ مسۆگەر ئەوانەی کە دیداری خوایان بە درۆ دادەنا، زیانبار بوون، (وە لەسەر

زیانەکەیان بەردەوام بوون) هەتا کاتێك کتوپڕ کاتی دیارییکراو (ی قیامەت) هات، گوتیان: هۆی داخو خەفەت! لەسەر ئەوە کە کەمتەرخەمییمان تێدا کرد (لە ژیانی دنیادا)، وە لەو حاڵەدا قورساییی یەکانیان (گوناحو خراپەکانیان) لەسەر پشتیان هەڵدەگرن، ئاگاداربن ئەوە خراپترین شتە کە هەڵیدەگرن ﴿٣١﴾ وە ژیانی دنیا (لە ڕوو ماددییەکەیەوە) جگە لە یارییو خافڵان هیچی دیکە نییە، وە بێگومان مەنزڵگای دیکە (دوارۆژ) بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن، باشترە، ئایا نافامن! ﴿٣٢﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(تَزْعُمُونَ ): وشەی (زعم) قسەیەكە كە درۆبێ، دەڵێ: (الزَّعْمُ: حِكَايَةُ قَوْلٍ يَكُونُ مَظِنَةً لِلْكَذِبِ، وَلِهَذَا جَاءَ فِي الْقُرْآنِ فِي كُلِّ مَوْضعٍ ذُمَّ الْقَائِلُونَ بِهِ)، (زعم) بریتیە لە گێڕانەوەی قسەیەك كە ئەگەری درۆی زیاتر لێ دەكرێ، بۆیە لە هەموو قورئاندا تەنیا لەو شوێنانەدا هاتوە كە هەر كەسێك ئەوەی گوتبێ زەم كراوە، (یزعمون) واتە: پێیان وایە، بەڵام لە پێوابوونەكەدا، بە هەڵەداچوونو درۆ دەكەن.

(فِتْنَتُهُمْ ): (فِتْنَةٌ ) یانی: تاقیكردنەوە، (أصْلُ الفَتْنِ: إدْخَالُ الذَّهَبِ النَّار لِتَظهَر جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَاءَتِهِ، وَاسْتُعْمِلَ فِي إِدْخَالِ الإِنْسَانِ النَّار) واتە: ئەسڵی وشەی (فِتنَة) لە (فَتْن)ەوە هاتوە (فَتْن)یش ئەوەیە زێڕ بخەیە نێو ئاگر، بۆئەوەی چاك و خراپی لەیەك جیابێتەوە، وە بەكارهێنراوە بۆ ئەوە كە ئینسان بە ئاگر سزا بدرێ، وە بە مانای تاقیكردنەوە، هاتوە، وەك خوای كاربەجێ بە مووسا ﷺ ی فەرمووە: ﴿ ...وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا ... ﴿٤٠﴾ ﴾ طه، واتە: تۆمان تاقیكردەوە بە چەند تاقیكردنەوەیەك، تاكو خڵتەی پێوە نەهێڵێ، وە بە مانای ئازارو گرفتارییش هاتوە.

(يَفْتَرُونَ ): واتە: درۆ هەڵدەبەستن، كە لە (فَرْي)یەوە هاتوە، (الفَرْيُ: قَطْعُ الجلد للخَرْزِ والإِصْلاَح، واستعمل الإِفْتِرَاءُ لِلْكَذبِ والشِّرْكِ وَالظُّلْم)، كەسێكی پینەچیی كە چەرم دەبڕێ بۆئەوەی كە پینەی پێ بكات، یاخود بیدوورێتەوە، پێی دەگوترێ: (فري)، جا وشەی (إِفْتِرَاء) بۆ درۆ هەڵبەستن، وە بۆ شیركو ستەمیش بەكارهێنراوە، چونكە شیركیش شتێكی بێ بنەمایە، وە ستەمیش شتێكی بێجێیە.

(أَكِنَّةً ): (جَمْعُ كِنَان، نَحو: غِطَاء وَأَغطية، لكن أكنان جمع كنّ)، (أَكِنَّةً) كۆی (كِنَان)ە، (كِنَان) واتە: توورەگە، یان كیف، وەك (غطاء) واتە: سەرپۆش، وە

کۆیەکەی (أَغطیة)یە، بەلام (أَکنان) کۆی (کِنّ)، واتە: پەناگەو شوێنێك کە ئینسان تێیدا خۆی پەنهان بکات.

(وَقۡرٗا): دەڵێ: (الوقر: الثِّقَلُ فِي الأُذُنِ، يُقَالُ وَقَرَتْ أُذنُهُ تَقِرُّ وَتَوْقِرُ)، واتە: گوێگرانیی، وەك: کەسێك شتێکی لە گوێ هاوێشترابێ‌و نەیبیستبێ.

(أَسَٰطِيرُ): (أَسَاطِير هِيَ جَمْع أُسْطُورَة، نَحْو: أُرْجُوحَة وَأَرَاجِيح، وَأُحْدُوثَة وَأَحَادِيث، أَي: شَيءٍ كتبوه كَذِبَاً وَمَيْناً)، (أَسَاطِير) کۆی (أُسطورة)یە، ئێمە بە کوردیی دەڵێین: ئەفسانە، واتە: حیکایەتێك یان بەسەرهاتێکی بێ بنەما، نەك ڕووداوێکی مێژوویی کە ئەسڵی هەبێ، وەك (أُرْجُوحَة وَأَرَاجِيح)، جولانەوەو جۆلانەکان (وَأُحْدُوثَة وأحاديث) واتە: ڕووداوێك، یان شتێك تازە پەیدا بووبێ، کۆیەکەی (أَحَادِيث)ە، لێرەدا مەبەستیان لە (أَسَاطِير) چییە؟ (أَي شَيءٍ كتبوه كَذِبَاً وَمَيْناً) شتێکە هەر بە درۆ نووسراوە، قورئانیان بەوە ناوزەند دەکرد.

(وَيَنۡـَٔوۡنَ): دەڵێن: (نَأى: نَأياً مثل، نَعَى: أَعْرَضَ، وَتَبَاعَدَ) خۆی لێ دوورگرت.

(يَٰلَيۡتَنَا): (لَيْتَ طَمْعٌ وَتَمنٍّ)، (لَيْتَ) واتە: خۆزگەو بریا، لە کوردەوارییدا کە شتێك نایەتە دی دەڵێن: ئەی خۆزگە، ئەی بریا هاتبایە دی.

(بِلِقَآءِ ٱللَّهِ): واتە: بە دیداری خوا، (اللِّقَاءُ: مُقَابَلَة الشَّئ وَمُصَادَفَته مَعَاً، وَقَدْ يُعَبّر بِهِ عَن كُل وَاحِدٍ مِنْهُمَا) دەڵێ: (لِقَاء) بریتییە لە بەرەوڕووچوونی شتێك، وە پێگەیشتنی، وە جاری وایە بۆ هەر کامێك لەوانە بەکاردێ، جا چ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی، چ بۆ گەیشتنی (لِقَاء الله) یانی: دیداری خوا، کە ئینسان بچێتە خزمەت خواو بە دیداری خوا بگات.

(بَغۡتَةٗ): یانی: (فَجْأَةً) واتە: کتوپڕو لەناکاو (البَغْتُ: مفاجأة الشيء مِنْ حَيْثُ لا يُحْتَسَبُ، بَغَتَ فَهُوَ بَاغِتٌ) (بَغَتَ): واتە: کتوپڕو لەناکاو شتێك هات، بێئەوەی کە پێشەکی هەبێ.

(يَحَسْرَتَنَا ): (الحَسْرَةُ: الغَمُّ عَلَى مَا فَاتَهُ وَالنَّدَمُ عَلَيْهِ، كَأَنَّهُ انْحَسَرَ عَنْهُ الجَهْلُ الَّذِي حَمَلَهُ عَلَى مَا ارتَكَبَه) وشەی (حَسْرَة) واتە: داخو خەفەتێك، وە پەشێمانبوونەوە، (حَسَرَ) واتە: قۆڵی هەڵكرد، ئەو داخو خەفەتە بەسەر ئەو ئینسانەدا دێ لە حاڵێكدایە كە نەزانینەكەی وایلێكردوە تووشی ئەو غەڵەتە بێ، دوایی كە نەزانینەكەی نەماوە، بەرچاوی ڕۆشن بۆتەوە، بۆیە پەشێمان بۆتەوەو ئێستا دەزانێ چی كردوە.

(أَوْزَارَهُمْ ): كۆی (وِزْر)ە، (وِزْر) یانی: (ثقل) قورسایی، ئنجا (أَوْزَارَهُم) یانی: (أَثْقَالَهُم)، قورساییەكانیان، گوناحو تاوانێك كە ئینسان دەیكات، وەك كۆڵێكی قورس وایە لەسەر شانیەتی، كە دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴾، قورساییەكانی خۆیان بەسەر كۆڵی خۆیان داداوە، چەند شتێكی ناخۆشە ئینسان كە دەچێتەوە خزمەت خوا، بە كۆڵێك گوناهەوە بچێتەوە، هەگبەی گوناهانی پڕ بێ، بڵێ: خوایە! ئەوەم بە دیاریی بۆ تۆ هێناوە!

(لَعِبٌ ): دەڵێ: (لَعِبَ: عَمِلَ عَمَلاً لا يُجْدي عَلَيْهِ نَفْعَاً، ضِد: جَدَّ)، (لَعِبَ) واتە: كارێكی كرد، كە سوودێكی پێ ناگەیەنێ، پێچەوانەی (جَدَّ) واتە شتێكی چاكی كرد، سوودی هەبوو.

(وَلَهْوٌ): (اللَّهْو: مَا يَشْغَلُ الإِنْسَانُ عَمّا يعنيه ويُهِمُّه، يُقَالُ لَهَوْتُ بِكَذَا، وَلَهَيْتُ عَنْ كَذَا، اشْتَغَلت عَنْهُ بِلَهْوٍ) (لَهو) بریتیە لە هەر شتێك كە ئینسان سەرقاڵ بكات لە شتێك، كە ئەو شتەی كە لێی غافڵەو بێ ئاگایە، بۆ ئەو چاكترەو گرنگترە، دەگوترێ: (لَهَوْتُ بِكَذَا، وَلَهَيْتُ عَنْ كَذَا) هەردووكیان یەك مانایان هەیە، واتە: پێوەی سەرقاڵ بووم، سەرگەرم بووم، دوایی باسی دەكەین كە خوای پەروەردگار بۆچی ژیانی دنیای بێبڕوایان، یاخود ژیانی دنیا لە ڕووە ماددییەكەیەوە، بە وشەی (لهو و لعب) باس دەكات.

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوای زاناو توانا لەو ئایەتانەدا کە ڕابردن باسی پێغەمبەرایەتیی‌و خوا بەیەکگرتن‌و دواڕۆژی کرد، بەڵام ئەم ئایەتانە زیاتر باسی سەرەنجامی بێبڕوایان دەکەن، لە دواڕۆژدا کە وەزعیان چۆن دەبێ؟ چی دەڵێن؟ چی دەکەن؟ چۆن پەشێمان دەبنەوە؟... هتد.

دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾، وە ئەو ڕۆژەی هەموویان خڕدەکەینەوە، دوایی بەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، دەڵێین‌و لێیان دەپرسین: کوان ئەو هاوبەشانەتان کە پێتانوابوو هاوبەشی خوان؟ واتە: کوان، بۆ یارمەتیتان نادەن، بۆ نایەن شەفاعەتتان بۆ بکەن، بۆ نایەن شتێکتان بۆ بە شتێك بکەن، ئەگەر ڕاستتان دەکرد؟ ئێمە دیارە ئێستا لە دنیاین، بەڵام خوای کاربەجێ قیامەت وەك ئێستا دێنێتە بەرچاومان، واتە: لە قیامەت دا ئەوە سەرەنجامتان دەبێ، ئەوانەی کە دەیانپەرستن لەگەڵ خواو لە جیاتی خوا، لێتان بزر دەبن‌و دیار نامێنن، خواش پێتان دەفەرموێ: کوا شەریکەکانتان؟ ئێوەش هیچ وەڵامێکتان نابێ، کەواتە: هەر ئێستا دەستیان لێ هەڵبگرن.

دیارە بۆیەش خوای زانا قیامەتمان وەك ئێستا دێنێتە بەرچاو، چونکە بەنسبەت خوای پەروەردگارەوە، ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو، هەر یەکن، (ئانیشتاین) لە بیردۆزی گوێرەیی (النظرية النِّسبيَّة) خۆیدا باس دەکات، کە ئێمەی بەشەر بەهۆی ئەوەوە کە مەحکوومی کات‌و شوێنین، کات (زمن) دەکەینە سێ بەش:

أ / بەشێکی کە تێپەڕیوە، پێی دەڵێین: ڕابردوو (ماضي).

ب / بەشێکی دیکە کە ئێستا تێیداین، دەڵێین: ئێستا (حاضر).

ج / بەشێکیش کە نەهاتوە، پێی دەڵێن، ئایندە، داهاتوو (مستقبل).

بەڵام خوای زاناو شارەزا لە دەرەوەی زەمانو مەکانە، دوێنێو ئەمڕۆو ئێستا بۆ خوا نیە، بەنسبەت خوای بێوێنەوە، کات هەمووی وەك یەکە، بۆیە خوای کاربەجێ کە باسی بەهەشت دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾ ﴾التكوير، واتە: وە کاتێك بەهەشت نزیك خرایەوەو ڕازێنرایەوە (بۆ پارێزکاران)، بە ڕێژگە (صیغة)ی ڕابردوو دەیفەرموێ، یان لێرە دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ﴾، ئەو ڕۆژەی هەموویان کۆدەکەینەوە، وەك ئێستا، چونکە بەنسبەت ئێمەوە داهاتوو نەهاتووە، ڕانەبردوو تێنەپەڕیوە، ئێستاش تێیدا دەژین، بەڵام بەنسبەت خوای تاکەوە زەمان هەمووی یەك شتە، ئەوە مەسەلەیەکی قووڵی فەلسەفییە، بەڵام ویستم ئاماژەیەکی پێ بکەم.

جا با بزانین ئەوانە وەڵامیان چی دەبێ؟ دوای ئەوەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾، ئەو هاوبەشانەتان کە پێتانوابوو هاوبەشی خوان، وە بەندایەتییتان بۆ دەکردن، کوان ؟ ﴿ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴾ دوایی فیتنەی ئەوان واتە: تاقیکردنەوەی ئەوان، یان سزای ئەوان، یان پاساو هێنانەوەیان، یان وەڵامی ئەوان، یان دەرەنجامی تاقیکرانەوەیان، بە هەموو ئەو مانایانە دێ، واتە: وەڵامیان بۆ ئەو پرسیارە کە بۆخۆی تاقیکردنەوەو فیتنەیە، هەر ئەوە بوو کە گوتیان: سوێند بە خوا پەروەردگارمان! ئێمە هاوبەشدانەر نەبووین، حاشا دەکەن! دەڵێن: هاوبەشمان دانەناوە بۆ تۆ، هەر گوتوومانە: (بەس خوایە، ئەوی دیکە هەمووی کاو بایە) واتە: خۆیان بە درۆ دەخەنەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، تەماشا بکە! چۆن خۆیان بە درۆ دەخەنەوە، درۆ بە خۆیانەوە دەکەن، واتە: خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾، وە ئەوەی کە هەڵیان دەبەست، نەما، بزر بوو، ئەو هاوبەشانەی کە بۆ خوایان هەڵدەبەستن، لەبەرچاویان نەمان، چونکە لە واقیع دا نەبوون، بەڵێ، وەك دارو بەردو مانگو خۆرو ئەستێرەو هەواو ئارەزوو و

حیزب ... هتد، وە وەك چەند دروستکراوێکی دیکە، هەبوون، بەڵام وەك هاوبەشی خوا، نەبوون، دەنا وەك دروستکراو هەبوون، بەڵکو عیساش کە نەصرانییەکان پەرستوویانەو، عوزێریش کە جوولەکەکان پەرستوویانەو، پیاوچاکانیش کە پەرستراون، دێن بەرائەت دەکەنو دەڵێن: خوایە! ئێمە جگە لە پەرستنی تۆ هیچی دیکەمان فێر نەکردوون، ئەوانە درۆیان بە ناوی ئێمەشەوە کردوە.

ئنجا باسی هەڵوێستی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات لەگەڵ پێغەمبەران دا، کە دوای باسی سەرەنجامە قیامەتییەکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ۖ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ ﴾، وە هەیانە چاك گوێت بۆ هەڵدەخات بە حیساب، بۆئەوەی بزانێ چی دەڵێی؟ بەڵام ئێمە کیفمان لەسەر دڵیان داناوە، یاخود پەردەمان لەسەر دڵ داناون، یاخود دڵیانمان خستۆتە نێو کیفو توورەگەوەو سەرەکەمان بەستوە، بۆئەوەی کە تێی نەگەن، ﴿ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗا ﴾، وە گوێشیانمان قورسو گران کردوەو، قورساییمان خستۆتە نێو گوێیەکانیانەوە، ئینسان قورسایی لە گوێدا بێ، گوێی لە هیچ نابێ، وە ئەگەر دڵیشی لە توورەگە دابێ پێی تێناگات، واتە: ئەگەر شتێك بخرێتە توورەگەو کیفێکەوە، دوایی سەرەکەشی گرێی لێ بدرێ، دیار نابێ، واتە: ئەوانیش دڵیان داخراوەو عەقڵیان داپۆشراوە، وە گوێشیان گیراوە ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا ﴾، وە ئەگەر هەر ئایەتێك، هەر نیشانەیەك ببینن، هەر ئیمانی پێ ناهێنن.

یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: ئنجا بۆچی خوا وای لێکردوون؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوای دادگەر لێرەدا باسی چەسپاندنی یاساکانی خۆی دەکات، بەسەر ئەوانەدا، ئەگەرنا خوا وای لێ نەکردوون، ئەوانە بۆخۆیان وایان لە خۆیان کردوە، بەڵام مادام بە پێی یاسای خوایە، وەك خوا وای لێکردبن، وایە، ئەگەرنا بۆخۆیان وایان لەخۆیان کردوە، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەوە کە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾إبراهيم، واتە: وە خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، خوای دادگەر کێ گومڕا دەکات؟ ئەوەی ستەمکاربێو زوڵم لەخۆی بکات، ئەوانەی کە ڕێی چەوت دەگرن، خوای دادگەریش دەفەرموێ: مادام ڕێی چەوت دەگری،

بڕۆ، بۆچی؟ چونکە خوا ویستوویەتی ئەو خەڵکە لەم ژیانەدا تاقی بکاتەوە، ئنجا کە تاقییان بکاتەوە، دەبێ بواریان پێ بدات، دەفەرموێ: ئەوە ڕێی چەوتە، ئەگەر بەویدا بڕۆن، تووشی زیان دەبن، بەڵام ئەگەر دەشڕۆن ڕێتان لێ ناگیرێ، بۆ ئەوەی تاقی بکرێنەوە، وە ئەوەش ڕێی ڕاستە، ئەگەر بەویدا بڕۆن، قازانج دەکەن، بەڵام زۆریشتان لێ ناکرێ، ڕێی ڕاست بگرن، ئەدی ئەگەر وا نەبێ ئینسان چۆن تاقی دەکرێتەوە؟ بۆیە دەبێ وریابن! لێرەدا خوای کاربەجێ مەبەستی ئەوە نیە کە پێی خۆش نەبێ، یاخود نەهێڵێ ئەوانە تێبگەن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەوانە کارێکیان بەسەر خۆیان هێناوە، بەهۆی گوناحو تاوانەکانیانەوە، کە وەك عەقڵیان داپۆشرابێو لە توورەگە دابێ، لە هەگبەو کیف دابێ، وە گوێشیان قورسایی تێدابێ، بۆخۆیان وایان لە خۆیان کردوە، بە هۆی گوناحو تاوانەکانیانەوە، خۆیان تووشی حاڵەتێکی ئاوا کردوە.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ { ئەو حاڵەتەیان هەیە} تاکو کە دێن بۆ لات موناقەشەت لەگەڵدا دەکەن، شەڕە قسەو دەمبەدەمەت لەگەڵدا دەکەن، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: ئەمە جگە لە ئەفسانەی پێشینان، هیچی دیکە نیە ! قورئان هەر ئەفسانەیەو درۆو دەلەسەیەو حیکایەتی بێ بنەمایە، بۆیەش وایانگوتوە، چونکە تەماشایان کردوە قورئان زۆری بەسەرهاتە، ئەو عەقڵو ئیدراکەشیان نەبووە کە خوای تواناو زانا ئەم کتێبەی داناوە بۆ ئێمەی بەشەر، کە ڕەنگە سێ لەسەر چواری مێژووی بەشەر تێپەڕیبێ، ئەو سێ لەسەر چوارە، دەبێ بیگێڕێتەوەو پەندو عیبرەتەکانی ژیانی ئەو میللەتانە، کە چۆن ژیاونو لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان دا چۆن ڕەفتاریان کردوە؟ سەرەنجامیان چۆن بووە؟ بۆمان بخاتەڕوو، بۆئەوەی ئەو یەك لەسەر چوارەی ژیانی بەشەر کە ماوەو پێغەمبەری خاتەمی ﷺ بۆ هاتوە، پەند وەربگرێ لە ژیانی ئەو سێ لەسەر چوارەی کە ڕابردوە، هەر بۆیەش ئەگەر تەماشای هەموو قورئان بکەین، دەتوانین بڵێین: سێ لەسەر چواری، یاخود دوو لەسەر سێی قورئان بەسەرهاتەکانن، بەسەرهاتی پێغەمبەرانن، بۆچی؟! تاکو ژیانی بەشەر ئەو سێ لەسەر چوارەی کە ڕابردوە، خوای میهرەبان بیکاتە جێی پەندو عیبرەتو، دەرسی ژیانی لێ وەربگیرێ، بۆ ئەو یەك لەسەر چوارەی کە ماوە.

دوایی باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَهُمۡ يَنۡهَوۡنَ عَنۡهُ وَيَنۡـَٔوۡنَ عَنۡهُۖ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾، وە ئەوانە خەڵکیشی لێ دەپرینگێنەوەو لێ دەسڵەمێننەوەو، خۆشیانی لێ بە دوور دەگرن، ئەمە واتایەکی، هەندێکیشیان گوتوویانە: ئەو بێبڕوایانە خەڵکیش لە پێغەمبەر ﷺ دوور دەخەنەوە، کە زیانی پێ نەگەیەنن، واتە: بەرگرییشی لێدەکەن، وە خۆیشیانی لێ دوور دەگرن، کە دەڵێن: مەبەست پێی (أبو طالب)ە، بەڵام بەڕاستی ئەو مانایە بێهێزە، ئنجا شیعە لێرەدا زۆر خۆیان مشەوەش کردوە، چونکە شیعە (أبو طالب) بە مسوڵمانێکی زۆر چاك دادەنێن، دەڵێن: مسوڵمانێکی زۆر گەورەیەو، ئەهلی سوننەت هەر لە ڕقان ڕەواجیان بەو حەدیسانە داوە، کە دەڵێن: (أبو طالب) کافرە، لە ڕقی ئیمام عەلی !! کە بێگومان بەهەڵەدا چوونو درۆ دەکەن، (أبو طالب) ئیمانی نەهێناوە، بەڵام لێرەدا ئەم ئایەتە هیچ پەیوەندیی بە (أبو طالب)ەوە نیە، وە:

﴿ وَهُمۡ يَنۡهَوۡنَ عَنۡهُ وَيَنۡـَٔوۡنَ عَنۡهُ ﴾، واتە: وە کافرەکان خەڵکی لێ دوور دەخەنەوە، کە ئیمان نەهێنن، وە بۆخۆشیان دووریی لێ دەگرن، یانی: نە بۆخۆیان ئیمانی پێ دێننو، نەدەهێڵن خەڵکیش ئیمانی پێ بێنێ، وەك گاشە بەردێك، کە بکەوێتە زاری کانیەکەوە، نە بۆخۆی دەخواتەوەو، نە دەهێڵێ خەڵکیش لێی بخواتەوە، ئاوایان لێهاتوە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾، وە ئەوانە هەر خۆیان دەفەوتێنن، بەڵام هەست ناکەن، واتە: بەو هەڵوێستەیان هەر زیان لە خۆیان دەدەنو، هەر خۆیان دەفەوتێنن، ئەگەرنا لەڕاستیدا ناتوانن زیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن، بەو واتایە کە پەکی کارەکەی بخەن، ئەزیەتی دەدەنو، نارەحەتی دەکەن، بەڵام کارەکەی پەکی ناکەوێ، شتێك خوا بیەوێ سەر بگرێ، هەر سەردەگرێ.

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەی قیامەتیان دەکات، دیمەنێکی دیکەی قیامەتیان دێنیتە بەرچاو، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، ئەگەر تۆ ببینی کاتێ کە دەوەستێنرێن لەسەر

ئاگـر، لێـرەدا هەندێـك لـە زانایـان بۆیـان بۆتـە ئیشـكال: چـۆن لەسـەر ئـاگر دەوەستێنرێن؟ ئەدی ناسووتێن‌و نارەحەت نابن؟! نەخێر، بەڵكو مەبەست ئەوەیـە كە لەسـەر سوێ‌و قـەراغـی ئاگری دۆزەخ دەوەستێنرێن، ئیدی مەرج نیـە چووبنـە نێوی، دیارە هەم لـە زمانی كوردییـداو، هەم لـە عەرەبییـداو، هـەم لـە هـەموو زمانەكـان دا ئـەو جـۆرە تەعبیـرانە هـەن، دەفـەرموێ: ئەگـەر ئەوانـە ببینـی كـە دەوەسـتێنرێن لـە سـوێی ئاگر، لە نـزیكی ئـاگری دۆزەخ، سـێ خۆزگان دەخـوازن! ﴿ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، گوتیـان: ئەی خۆزگە بگێڕرێینـەوە بـۆ دنیا، {ئنجـا كـە گێڕراینـەوە} ئایەتـەكـانی پەروەردگـارمـان بـەدرۆ دانـانێیـن، وە لـە ئیمـانداڕانیش دەبیـن، بـەڵام ئایا ئـەو خۆزگانـە دێنـە دی؟! بـە تەئكید نەخێـر، ئـەوە خـەیاڵ پـلاوەو، خۆزگـەو بریایـەكی بـێ‌بەرە، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿ بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُ ﴾، بەڵكـو ئەوەیـان بـۆ دەركـەوت‌و بـۆ ئاشـكرا بـوو، كـە پێشـتـر دەیانشـاردەوە، چییـان دەشـاردەوە؟ كـافر بۆچـی پێـی دەگـوترێ (كـافر)؟ (كـافر) یانی: پۆشـەر (سـاتر)، لەبەرئەوەی كە فیطـرەت‌و سـروشتی ئینسان خـوا دەناسـێ، بـەڵام بابـای كـافر ئـەو حەقیقـەتـە كـە لـە دەروونییـدا هەیـەو، خـوا لەگـەڵ بوونـی دا تێكیهـەڵشـێلاوە، دەیشـارێتەوە، ﴿ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾، وە ئەگەر گێڕراباشـنەوە، دەگەڕانەوە سـەر ئەوەی لێیـان قـەدەغـە كـراوە، واتـە: دەگەڕانـەوە سـەر بـەزمی پێشـێ، وە بـە تەئكیـد درۆ دەكـەن، كـە دەڵـێـن: ئیمانمـان دەهێنـاو ئایەتەكانی خـوامـان بە درۆ دانـەدەنـا، درۆ دەكـەن‌و ڕاسـت ناكـەن.

ئنجـا باسـی هەڵوێسـتێكی دیكـەیان دەكـاو دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ﴾، وە گوتیـان: ژیـان تـەنیا ئـەم ژیانـە دنیاییەمانـە، وە ئێمـە زینـدوو ناكرێینـەوە، دەمـرین‌و زیندووبوونـەوە نیـە، ئنجا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾، وە ئەگـەر تـۆ ببینـی كاتێك كـە لەسـەر پـەروەردگاریان ڕادەگیـرێن،

یانی: لەبەردەم دادگای پەروەردگاریاندا ڕادەگیرێن، ئنجا خوا دادگاییان دەکاو دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ﴾، فەرمووی: ئایا ئا ئەوە هەق نیە، ئەو زیندووبوونەوەو ئەو وەزعەی کە ئێستا هاتۆتە پێشێ و دەیبینن، هەق نیە؟ ڕاست نەبوو؟ ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾، گوتیان: با، سوێند بە پەروەردگارمان {ڕاستەو ئێمە بەهەڵەدا} چووین، (خوای دادگەریش): فەرمووی سزاو ئازار بچێژن، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون، دەبێ بیچێژن.

ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً ﴾، بێگومان ئەوانەی بڕوایان بە دیداری خوا نەبوو، زیانبار بوون، پێیانوابوو ناگەنەوە خزمەت خوا، هەتا ئەو کاتەی کە تێیدا کتوپڕو لەناکاو بەبێ پێشەکی دنیا کۆتایی هات، ئنجا ئەو (ساعة)یە، چ (ساعة)ی گەورە بێ، (قیامەتی گەورە)، چ (ساعة)ی گچکە (کاتی مەرگ)، هەرکامێکیان بێ دەگونجێ، وەك گوتراوە: (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ) واتە: هەر کەسێك مرد، قیامەتی خۆی هاتوە، دیارە مردنیش کتوپڕ دێ، لەو کاتەدا چی دەڵێن؟ دەڵێن: ﴿ قَالُواْ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا ﴾، هەی داخ و خەفەت!! {لە کوێی؟ ئێستا وەختی ئەوەیە کە خەفەتان بخۆین}، لەسەر ئەوە کە ئێمە کەمتەرخەمییمان تێدا کرد، {لە چییدا؟ لە ژیانی دنیادا، یاخود لە ئایەتەکانی خوادا}، ﴿ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴾، حاڵێشیان وایە: گوناهەکانی خۆیان لەسەر پشتی خۆیان هەڵگرتوە، تێلەکەو هەگبەی گوناهانیان لە کۆڵێناوە، وە لە خزمەت خواشدا ڕاوەستاون، ئاگاداربن! خراپترین شت ئەوەیە کە ئەوان هەڵیانگرتوەو لە کۆڵیان ناوە.

چەند ناخۆشە ئینسان بە کۆڵێك گوناهەوە بچێتەوە خزمەت خوا، لە کاتێکدا خوا دروستی کردوە، تاکو تاقی بکاتەوەو لەسەر زەوی دایناوە، ئاوەدانی بکاتەوەو بەندایەتیی بۆ خوا بکات، کەچی لە جیاتی ئەوەی بەدەستی پڕ لە تەقواوە

بچێتەوە لای خوا، بە کۆڵێك گوناحو شەرمەزارییو عەیبدارییەوە بچێتەوە خزمەت پەروەردگاری !! ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۖ وَلَلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾، وە ژیانی دنیاش تەنیا یارییو کات بەسەربردنە، وە مەنزڵگای دوارۆژ باشترە بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن، ئایا نافامن؟ لێرەدا وەك دوایش لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ﴾، دوو واتای هەن:

١) ژیانی دنیا (واتە ژیانی دنیای بێبڕوایان) گەمەو کات بەسەر بردنەو، هیچی دیکەی تێدا نیە.

٢) یاخود ژیانی دنیا لە ڕووە ماددییەکەیەوە، دەشوبهێتە گەمەی منداڵانو یارییو کات بەسەربردنیان، بەڵام مەنزڵگای دوارۆژ بۆ ئەوانەی کە پارێز دەکەن، بە تەئکید چاکترەو بەراورد ناکرێ لەگەڵ دنیادا، هەر کەسێك عەقڵی هەبێ، ئەو حەقیقەتە دەرك دەکاو دەیزانێ.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾، وە ئەو ڕۆژە کە تێکڕایان کۆدەکەینەوەو خڕیان دەکەینەوە، دوایی بەوانەی کە هاوبەشیان (بۆ خوا) داناوە دەڵێین: کوان ئەو هاوبەشانەتان کە پێتان وابوو، (واتە: پێتانوابوو کە هاوبەشن)؟، لێرەدا دیارە ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی ڕاستەقینە نیە، واتە: وەنەبێ خوای پەروەردگار لێیان بپرسێ: کوان لە کوێن؟ ئەوانیش بڵێن: لە فلان شوێنن، یان هاتوون، یان نەهاتوون، یان خۆیان پەنهان کردوە، بەڵکو لە زانیاریی ڕەوانبێژییدا دەربارەی ئەم پرسیارکردنە دەڵێن: (سُؤَالُ تَقْرِيعٍ وَ تَوْبِيخٍ وَ تَبْكِيتٍ) واتە: پرسیارکردنی سەرزەنشتکردنو سەرکۆنەکردنە، نەك پرسیارکردنێك بێ کە چاوەڕێی وەڵامەکەی بکەیەوە، بۆ وێنە: کەسێك خۆی بە شتێك هەڵدەکێشێ، تۆ دەڵێی: کوا فلان شتەت؟ یانی: مەبەستت نیە بڵێ: لە فلان شوێنە، یانی: سوودی پێ نەگەیاند، ئنجا کە دەفەرموێ: کوان ئەو هاوبەشانەتان کە گومانتان دەبرد؟ دوو واتایان هەڵدەگرێ:

یەکەم: واتە: خۆیان لە کوێن؟ بۆچی دیارنین؟ کە وەك گوتم، ئەوە سەرزەنشتکردنە.

دووەم: یاخود سوودیان لە کوێیە؟ کوا سوودیان بۆ ئێوە، ئەدی بۆچی بەندایەتییتان بۆ دەکردن؟ بەشێك لە بەندایەتییتان بۆ ئەوان تەرخان دەکرد؟

بەندایەتیی (عبادة)یش دووبەشی سەرەکییە:

١/ یان پێشکەشکردنی دروشمەکانە.

٢/ یان وەرگرتنی بەرنامەکانە، (تقديم الشعائر، وأخذ الشرائع).

دروشم وەك: نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، پاڕانەوە، نەزر، قوربانیی، سوێند پێ خواردن، پشت پێ بەستن، زۆر خۆشویستن... هتد، وە (شرائع)یش واتە: ئەو

یاساو بەرنامەیەی کە ژیانی تاکیو خێزانیو کۆمەڵایەتیو سیاسیی ڕێك دەخات.

ئنجا هەر کەسێك بەشێك لە دروشمو پەرستنەکانی بۆ کەسێك ئەنجام بدات، یان یاساکانی ژیانی لێوەربگرێ، ئەوە مانای وایە وەك پەرستراو مامەڵەی لەگەڵدا کردوە.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴾، یانی: (كُنْتُمْ تَزْعُمُونَهُم شُرَكَاء) واتە: پێتانوابوو هاوبەشن، وشەی (زَعْم) کە پێشتریش باسمان کرد: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: (كُلُّ زَعْمٍ فِي كِتَابِ الله، فَالْمُرادُ بِهِ الكَذِبُ)[1]، واتە: هەموو وشەیەکی (زَعْم) لە کتێبی خوادا مەبەست پێی درۆیە، لە ئەسڵدا (زَعْم) واتە: پێی وایە، وایزانی، بەڵام پێوابوونو پێزانینێکە، کە لە بنەڕەتدا درۆیە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ ٢٣ ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢٤ ﴾، لەم دوو ئایەتەدا خوا هەڵوێستی بتپەرستەکان، لە وەڵامی ئەم پرسیارەی خوای پەروەردگاردا، دەخاتەڕوو، دەفەرموێ: دوایی فیتنەی ئەوان تەنیا ئەوەندە بوو کە گوتیان: سوێند بە خوا پەروەردگارمان! هیچ هاوبەشێکمان دانەناوە، ئنجا دیارە درۆ دەکەن بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ ﴾، سەرنج بدە! چۆن درۆ لەگەڵ خۆیان دەکەن، یان خۆیان بە درۆ دەخەنەوە، واتە: شتێکیان کردوەو ئێستا دەڵێن: نەمانکردوە، شتێکیان گوتوەو ئێستا دەڵێن: نەمانگوتوە، یان درۆیەك دەکەن کە تەنیا زیانی بۆخۆیانە. ﴿ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴾، وە لێیان ونبوو، لێیان بزر بوو، ئەوەی کە هەڵیان دەبەست، ئەوەی کە دەیانکردە هاوبەش بۆ خوا.

---

١) مفاتيح الغيب للرازي: ج ٦، ص ١٥٦.

توێژەرەوانی قورئان چەند مانایەکیان بۆ وشەی (فتنە) لێکداوەتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴾، ماناکەی ئاوەیە، واتە: دوایی تاقیکرانەوەیان بەو پرسیارلێکردنەی خوا، ئەنجامەکەی هەر ئەوە بوو کە سوێندی بە درۆیان خوارد، چونکە خوا کە لێیان دەپرسێ‌و ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە، ئەوە تاقیکردنەوەیە:

١/ هەندێك گوتوویانە: (فِتْنَتُهُمْ) واتە: (إختبارهم) تاقیکرانەوەیان بەو پرسیارو وەڵامە.

٢/ هەندێکی دیکە گوتوویانە: (فِتْنَتُهُمْ) (أَي: قَوْلُهُمْ)، واتە: قسەکەیان.

٣/ هەندێك گوتوویانە: (فِتْنَتُهُمْ) (أَي: جَوَابُهُمْ)، واتە: وەڵامەکەیان.

٤/ هەندێکی دیکە گوتوویانە: (فِتْنَتُهُمْ) (أَي: مَعْذِرَتُهُمْ) واتە: پاساو هێنانەوەکەیان.

٥/ هەندێکیش گوتوویانە: (فِتْنَتُهُمْ) واتە: (إنخداعهم) هەڵخەڵەتاوییان بەو پەرستراوانە، کە لە دنیادا بە هاوبەشی خوایان داناون.

## پرسیارێك و وەڵامەکەی :

ئنجا لێرەدا بە ڕواڵەت پرسیارێك دروست دەبێ، ئەویش ئەوەیە: کە لە لایەکەوە ئەو هاوبەش پەرستانە، سوێند بە خوا دەخۆن، دەڵێن: بە خوا پەروەردگارمان! ئێمە هاوبەشدانەر نەبووین، کە دیارە درۆش دەکەن، کەچی لەولاشەوە لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی ژمارە (٤٢)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴾، واتە: هیچ قسەیەکیان لە خوا پەنهان ناکەن، واتە: کافرەکان لە قیامەتدا چی ڕاستە دانی پێدادێنن‌و دەیڵێن‌و، هیچی ناشارنەوە، کەچی لێرەشدا دیارە وا پێشان دەدەن، کە هاوبەش پەرست نەبوون، ئەمە چۆنە؟!

لەوبارەوە (طبري) لە تەفسیرەکەی دا ئەم پرسیارو وەڵامە دێنێ: {عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: أَتَى رَجُلٌ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: قَالَ اللهُ: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، وَقَالَ فِي آيَةٍ أُخْرَى: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا قَوْلُهُ: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، فَإِنَّهُمْ لَمَّا رَأَوْا أَنَّهُ لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلاَّ أَهْلُ الإِسْلاَمِ، قَالُوا: تَعَالوا لِنَجْحَدَ! فَقَالوا: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾! فَخَتَمَ اللهُ عَلَى أَفْوَاهِهِم، وَتَكَلَّمَتْ أَيدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾}[1]، واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ: پیاوێك هاتە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، گوتی: خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، هاوبەشدانەرەکان گوتیان: بە خوا پەروەردگارمان! ئێمە هاوبەشدانەر نەبووین، وە لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾، واتە: کافرەکان لە ڕۆژی دواییدا هیچ قسەیەك لە خوا ناشارنەوە ! (ئەمە چۆنە؟) عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش وەڵامی داوەتەوە، گوتی: ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، لە کاتێکدایە کە هاوبەشدانەرەکان دەبینن تەنیا ئەهلی ئیسلام دەچنە بەهەشت، ئەوانیش دەڵێن: ڕاستە ئێمە لە دنیادا کافرو هاوبەش پەرست بووین، بەڵام وەرن بانکووڵیی لێ بکەین، بۆیە وادەڵێنو، ئەو درۆیە دەکەن، بەڵام دوایی خوا مۆر بەسەر دڵو زمانیانەوە دەنێ، وە دەستیان قسە دەکەنو پێیەکانیان قسە دەکەنو شایەدیی دەدەن، لەوکاتە دایە کە: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾، بە زمان درۆ دەکەن، بەڵام دوایی ئەندامەکانی جەستەیان شایەدییان لەسەر دەدەن، بۆیە هیچ شتێکیان پێ لە خوا ناشاردرێتەوە.

---

١) جامع البيان لطَّبَري ، برقم: (٣٠٥٦).

ئنجـا لێـرەدا زانـایان پرسیارێکی دیکەیان بۆ دروست بووە :

## ئایا کافرەکـان لە ڕۆژی قیـامەتـدا درۆ دەکـەن یـان نـا ؟

موعتـەزیلـە دەڵێـن: نـەخێر کافرەکـان لـە ڕۆژی دوایـی دا درۆ ناکـەن، بـەڵام زۆربـەی زانـایان گوتوویانـە: بەڵـێ، درۆ دەکـەن، وە بێگـومان قسـەی زۆربـەی زانایـان ڕاسـتە، بۆچی؟ چونکە ئێمـە دەبیـنین خـوای پـەروەردگار لـە زۆر شـوێنی قورئـانـدا باسی کـردوە، کـە کافرەکان لە قیامـەتدا درۆ دەکەن، بۆ وێنـە:

١ / لـە سـوورەتی (الـمجادلة)دا خـوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ﴾، واتـــە: لە ڕۆژی قیامەتدا کـە خـوا هـەموویان زینـدوو دەکاتـەوە، سـوێندی بـۆ دەخـۆن، وەك چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن، وە پێیانـوایە لەسـەر شـتێك بـوون، ئاگـاداربن! ئەوانن درۆزنان، واتە: درۆ دەکەن، ئنجا دوای ئەوەش خـوا ئـاوا دەفەرموێ، کـە پێشتـر لـە ئایـەتی (١٤)ی سـوورەتی (الـمجادلة)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، واتـە: وە( لـە دنیـادا مونافیقـەکان دێـن بـۆ لاتـان) بـە درۆ سـوێندتـان بۆ دەخـۆن، کە دەشـزانن درۆ دەکـەن، کەواتە: لە دنیـادا بـە درۆ سوێند دەخۆن، دواییـش خـوا دەفـەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ﴿١٨﴾ ﴾، واتـە: ئەو ڕۆژەی کە خـوا زیندوویان دەکـاتەوە، سـوێندی بۆ دەخۆن، وەك چۆن سـوێند بۆ ئێـوە دەخـۆن، ئنجا لە دنیـادا بە درۆ سـوێندیان بـۆ مسـوڵمانان خـواردوەو گوتوویانـە مسـوڵمانین، هـەویش نـەبوون، کەواتـە: لـە قیامـەتیش دا بـە درۆ سـوێند دەخــۆن، دیـارە ئەمـە بەڵگـەیەکی زۆر بـەهێزە لەسەر ئەوە کە کـافرەکان لە قیامـەتـدا درۆ دەکـەن.

٢ / ئنجا لە سوورەتی (الـمؤمنون) لە ئایـەتی (١٠٧)دا خـوا هێناویـەتی دەفـەرموێ: کافرەکـــان دەڵـــێن: ﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَـٰلِمُونَ ﴾، واتـــە:

پەروەردگارمان! لە دۆزەخ دەرمانبێنە، ئەگەر گەڕاینەوە، ئێمە ستەمكارین، ئەگەر جارێكی دی گەڕاینەوە سەر شیركو كوفر، لەوێ ئاوا دەڵێن، كەچی خوا لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (٢٨)دا دەفەرموێ: ﴿...وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾، وە ئەگەر بشگێڕدرێنەوە بۆ دنیا، دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەوەی كە نەهییان لێكراوە، (كە شیركو كوفرە)، وە بێگومان ئەوان درۆزنن. كەواتە: كە لە ئایەتی (١٠٧)ی سوورەتی (المؤمنون)دا دەڵێن: پەروەردگارمان! لە دۆزەخ دەرمانبێنە، ئەگەر گەڕاینەوە سەر شیركو كوفر، ئێمە ستەمكارین، ڕاست ناكەن.

ئنجا ئێمە دەتوانین بڵێین: ئەم پرسیارە كە خوا دەفەرموێ: كافرەكان قسە ناشارنەوە لە خوا، وە لە هەندێك شوێن دەفەرموێ: بە درۆ سوێند دەخۆن و نكووڵیی دەكەن، كە موشریكو كافر بوون، بە دوو شێوە وەڵام دەدرێتەوە:

یەكەم: قیامەت قۆناغ قۆناغەو، یەك قۆناغ نیە، بۆ وێنە خوای مەزن لە سوورەتی (الرحمن)دا دەفەرموێ: ﴿ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُسۡـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٞ وَلَا جَآنّٞ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا نە ئینس نە جین لەبارەی گوناهەكانیانەوە پرسیاریان لێناكرێ، كەچی لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، ڕایانگرن، پرسیاریان لێ دەكرێ، ئەمە چۆنە؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە: لە قۆناغێكدا دەهێنرێن و پرسیاریان لێ ناكرێ، بەڵام لە قۆناغێكی دیكەدا پرسیاریان لێ دەكرێ.

واتە: مادام قیامەت قۆناغ قۆناغە، كەواتە: ئەوانیش لە قۆناغێكدا درۆ دەكەن و، لە قۆناغێكی دیكەدا كە بواری درۆكردنیان نیە، دانی پێدادێنن.

دووەم: كافرەكان نكووڵیی دەكەن، تاكو بەڵگەو ئیسپاتیان لەسەر پەیدا دەبێ، ئەو كاتە بەناچاریی دانیپێدادێنن، وەك چۆن لە دنیادا كەسێك كە تاوانێكی كردوە، هەتا دەزانێ بەڵگەو ئیسپاتی لەسەرە نكووڵیی لێدەكات، بەڵام كە زانی

بواری نكووڵیی كردنی نەماوەو، شایەدەكان هاتنە بەرچاوی، ئەوكاتە بەناچاریی دانی پێدادێنێ.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾، وشەی (ضَلَّ) یانی: ونبوو، بزر بوو، فەوتا، لەبەرچاو نەما، واتە: ئەوەی كە بە درۆ بۆ خوا هەڵیاندەبەست كە هاوبەشە، لە قیامەتدا هیچیان لەبەرچاو نامێنێ، چونكە بوونیان نەبووە، وەك هاوبەش بۆ خوا، ئەگەرنا بوونیان هەبووە، وەك: دارو بەردو، خۆرو مانگو ئینسانو ئەستێرەو مشكو مارو هەواو ئارەزوو ئەو شتانەی كە دەپەرسترێن، بەڵام ئەوانە هیچیان هاوبەشی خوا نین، بەڵكو تەنیا دروستكراوێكی خوان.

**مەسەلەی <u>سێیەم</u>:** كە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا﴾، وە هەیانە لەو (كافرانە) گوێت بۆ هەڵدەخات، بەڵام دڵیانمان خستۆتە چەند توورەگەو كیفێكەوە، یاخود پەردەپۆشمان كردون، بۆئەوەی كە تێینەگەن، وە گوێشیانمان گران كردون، بۆئەوەی كە نەبیستن.

وشەی (أَكِنَّةً) كۆی (كِنَان)ە، (كِنَان) واتە: كیف، بەرگ، توورەگە، هەر شتێك كە شتێكی تێبكەی، وەك (أَسِنَّة) كۆی (سِنَانَ)ە، كە بە مانای ڕم دێ، (أَعِنَّه) كۆی (عِنَان)ە، كە بە مانای جڵەو دێ، (أَغْطِيَة) كۆی (غِطَاء)ە، كە بە مانای سەرداپۆش دێ.

وە وشەی: (وَقْرًا) واتە: (ثِقَلاً، أَوْ صَمَمَاً) واتە: گوێ گران بوون، یان گوێ كەڕبوون، وەك چۆن كەسێك شتێكی قورسی وەك ئاسنو قوڕقوشم بچێتە گوێیەوە، ئەو كاتە هیچ نابیستێ، ئاوایان لێهاتوە، ئنجا وشەی (وَقْر) بەو مانایە دێ، وە وشەی (وِقْرْ) بە مانای (حِمْل) دێ، واتە: بار.

لێرەدا پرسیارێك دەكرێ، ئایا خوای پەروەردگار بۆچی ڕێگا نادات ئەوانە عەقڵیان ئیش بكاو، دڵیان ئیش بكاو تێبگەن، بۆچی دڵی وا لێكردوون لە تووڕەگەو كیف دابێ، وە بۆچی گوێی وا لێكردوون، وەك شتێكی قورسی تێدابێ‌و هیچ نەبیستن؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە خوای دادگەر دەیەوێ بۆمان ڕوون بكاتەوە، كە ئەوانە لە ئەنجامی گوناح‌و تاوانەكانیان دا، وایان لێهاتوە، وەك كەسێك كە عەقڵی داپۆشرابێ، وە دڵی خرابێتەو تووڕەگەو كیفەوە، هیچ زانیاریی بۆ نەچێ، وە شتێكی خرابێتە گوێ، كە هیچ نەبیستێ، واتە: لە ئەنجامی گوناح‌و تاوانەكانی خۆیان دا وایان لێهاتوە، ئەگەرنا خوای كارزان ئەم ئایەتانەی بۆیە بۆ ناردوون، تاكو گوێبیستیان بن، وە ئەو هەموو موعجیزەو دیاردەو دیمەنانەی دروست كردوون، بۆئەوەی مرۆڤەكان سەرنجیان بدەن‌و بیریان لێبكەنەوە، وە بەهۆیانەوە خوای پەروەردگار بناسن، كەواتە: لێرەدا خوای میهرەبان دەیەوێ پێمان بفەرموێ: كە ئەوانە بەهۆی گوناح‌و تاوانەكانیانەوە، یاسای خوایان بەسەردا چەسپیوە، هەر كەسێكیش كە بەردەوام بوو لەسەر گوناهان، دڵی مۆر دەكرێ، گوێی نابیستێ‌و چاویشی هەق نابینێ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەنیە گوێی نەبیستی، دەبیستێ، بەڵام تێناگات، وە چاوی دەبینێ، بەڵام هەق نابینێ.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا ﴾، وە ئەگەر هەر نیشانەیەك ببینن، ئیمانی پێ ناهێنن، واتە: هەر بڕیاریان داوە كە ئیمان نەهێنن، لەبەرئەوە یەكیان لەسەر بەڵگەو نیشانە نەكەوتوە، هەڵبەتە ئەم ڕستە قورئانییە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرە ﷺ، چونكە زۆرجار كافرەكان بڕوبیانوویان بە پێغەمبەر ﷺ دەگرت، دەیانگوت: تۆش وەك پێغەمبەرانی پێش خۆت موعجیزان بێنە، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا ﴾، وە ئەگەر هەر نیشانەیەك، هەر بەڵگەیەك، هەر موعجیزەیەك كە بە پێغەمبەرانی پێشووش دراوە، ببینن، هەر ئیمانی پێ ناهێنن، وە بە كردەوەش ئەو كافرانەی مەككە هەر وابوون، وەك لە سووڕەتی (القمر)دا هاتوە: ﴿ ٱقۡتَرَبَتِ

﴿ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝٢ ﴾

واتە: قیامەت نزیکەو مانگ لەت بوو. وە ئەگەر نیشانەیەك ببینن، پشتی تێدەکەنو دەڵێن: جادوویەکی بەردەوامە: ڕۆژێك کافرەکانی مەککە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوەو گوتیان: بەڵگەیەکمان پێشان بدە، فەرمووی: چیتان دەوێ؟ (دیارە شەو بووە) گوتیان: مانگمان بۆ شەق بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەنجەی موبارەکی ئاماژەی کرد، بە فەرمانی خوا مانگ لەت بوو، کافرەکان گوتیان: بەڕاستی موحەممەد جادوویەکی گەورەی کرد، ئەمە (بخاري) و (مسلم) لە (صحيح)ەکانیان دا هێناویانەو، پێشتریش هێنامان.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ ﴾، واتە: کە لەلای تۆ نین، هەر نیشانەیەك ببینن ئیمانی پێناهێنن، کە دێشن بۆ لای تۆ، شەڕە قسەو موناقەشەت لەگەڵدا دەکەن، کەواتە: هەر نایانەوێ ئیمان بێنن.

جا بەڕێزان بزانن! کە کەسێك کە نەیەوێ ئیمان بێنێ، هەموو بەڵگەی دنیای بۆ بێنی، ئیمان ناهێنێ، چونکە خوا توانایەکی داوە بە مرۆڤ، ئەگەر ڕەغبەتی لە شتێك نەبێ، دڵنیاش بێ کە ڕاستە، دانی پێداناهێنێ، وەك خوا دەربارەی داروودەستەی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ۝١٤ ﴾النمل، واتە: یەقینیان هەبوو لە دڵی خۆیاندا کە {موعیزەکانی مووسا} ڕاستن، {مووسا پێغەمبەری خوایە}، بەڵام نکووڵییان لێکردو دانیان پێدانەهێنا، بۆچی؟ ﴿ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾، بەهۆی ستەمو خۆ بە زلگرییەوە.

ئێستاش خەڵك هەیە دەزانێ ئیسلام ڕاستە، ئیسلامییەکان ئینسانی باشو چاکەخوازن، لای کەم دزیی ناکەنو، درۆ ناکەنو، حەرام ناخۆن، چاویان لە نامووسی خەڵك نیە، بەڵام ئەدی بۆچی پشتگیرییان ناکەن؟ چونکە بەرژەوەندییەکانیان تێکدەچن، موشریکەکان بۆچی بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم نەدەهێنا؟ چونکە بەزمو بازاڕیان لێ تێکدەچوو، جوولەکەو

نەصرانییەکـان بۆچـی ئیمانیـان نەدەهێنـا؟ ئـەو بـەزمو بـازارەی کـە دایاننـابوو، خەڵـکە سـادەکەیان پـێ فریـو دەداو، بـە نـاوی دینـەوە خۆیـان پـێ دەژیانـدن، ئـەوەیان لـێ تێکدەچـوو، ئەگەرنـا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡ ﴿١٤٦﴾ ﴾البقـرة، ئەوانـەی کتێبمـان پێـداون، پێغەمبـەر دەناسـن، وەك چـۆن کورەکـانی خۆیـان دەناسـن، بـەڵام بۆچـی دانـی پێداناهێنـن؟ لەبەرئـەوەی ئـەو بەرژەوەندییـە ناشـەرعییانەی کـە بـەهۆی یەهودییـەتو نەصرانییەتـەوە، ئەوانی دیکەش بـەهۆی شیركو بتپەرستییەوە، بۆیان دەستەبەر کـرابوون، ئـەو بەرژەوەندییانـەیان لـێ تێکدەچـوون، ئـەوکات ئـەبو جـەهلو ئـەبو سـوفیان، نـەزری کـوڕی حـارسو کـێو کـێ، دەهاتنـە ڕیـزی بـیلالو صـوهەیبو سەلمانو عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودو ئـەبو زەڕی غیفـاریی، وە هـەموویان یەکسان دەبوونـەوەو، ئـەوکات بـەزمو بـازاڕو خـۆ بـەزلگرییان لـێ تێکدەچـوو، بۆیـە هـەر ئیمانیـان نەدەهێنـا.

**مەسـەلەی پێنجەم**: کە دەفـەرموێ: ﴿ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ ئەوانەی کە بێبـڕوان دەڵێن: ئەمـە جگە لە ئەفسانەی پێشـینان، چی دیکە نیـە.

جـارێ وشەی (أَسَـاطِير) کـۆی (أُسْطُورَة)ەیـە، (أُسْطُورَة)ش واتـە: بەسـەرهاتێـك کـە بنـەمایەکی مێـژوویی نـەبێ، وەك حیکایـەتی ڕۆسـتەمو زۆرابو زۆر حیکایـەتی یۆنـانیی‌و ئیغریقیـی‌و بابلـیی، کـە ناچنــە عەقڵــەوە، چـونکە هیــچ بنمـایەکی مێژوویـی یان نیە، ئەوان دەیـانگوت: قورئـانیش تـەنیا ئەفسانەی پێشینانە، وشـەی (أُسْـطُورَة)ش لــە (سَـطَر)ەوە هـاتوە، (السـطر) کــە کۆیەکـەی (أسـطار)ە، کـۆی کۆیەکەشـی (أسـاطیر)ە، وە (سَـطْر) واتــە: دێــڕ، دێڕێـك کــە دەنووسـرێتەوە، وە (سطر، أسطر) بۆچی وایـانگوتـوە؟ چـونکە تەماشایان کـردوە، قورئـان بەسـەرهاتی زۆری تێـدان، بەسـەرهاتی پێغـەمبەران، بەسـەرهاتی گەلـە پێشـووەکان، ئیـدی لـەو ڕووەوە کـە بەسـەرهاتی تێـدان، بـە حیسـابی خۆیـان بـواری شـوبهەو گومانێکیـان دەستکـەوتوە، کە بڵێین: قورئـانیش وەك ئـەو بەسـەرهاتو ئەفسانانەی پێشـینانە، کــە لــە کتێبانــدا هــاتوون، بــەڵام لەڕاســتیدا ئــەو بەســەرهاتانەی قورئــان

دەیانگێڕێتەوە، لەگەڵ ئەفسانەکان زۆر جیان، هیچ بەسەرهاتێك لە قورئاندا نەهاتوە، کە لەگەڵ مێژوودا تێکبگیرێ، بەڵکو لە قورئاندا خوا زۆر ڕاستیی کە شێردراوە بوون، لە ژیانی پێغەمبەراندا، لە ژیانی بەشەردا، بەهۆی قورئانەوە ئاشکرای کردوونو، ڕوونی کردووتەوە، ئەوەی کە بە پێویستی زانیبێ، وەك دەفەرموێ: ﴿يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ۝١٥﴾ المائدة، واتە: زۆر لەوەی کە ئێوە لە کتێب دا پەنهانتان دەکرد، خوای زانا لە قورئاندا دەریخستوە.

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ ۖ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾، خوای زاناو شارەزا باسی هەڵوێستی کافرەکان دەکات، دەفەرموێ: ئەوان خەڵکی لێ دەپرینگێننەوەو خەڵکی لێ دوور دەکەنەوە، پێغەمبەر ﷺ، یان لە قورئان، یان لە هەردووکیان، وە بۆخۆشیان لێی دوور دەکەونەوە.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێ: ئەوانە یەکەمجار بۆخۆیان دووردەکەونەوە، ئنجا خەڵکیش دوور دەخەنەوە، ئەدی بۆچی خوای پەنهانزان خەڵك دوور خستنەوەکەیانی پێش دوورکەوتنەوەیان خستوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەوەی ئەوان زۆر مەبەستیان بووە، ئەوە بووە کە خەڵکی لە پێغەمبەر ﷺ، یان لە قورئان، یان لە هەردووکیان، دووربخەنەوە، ئەوەی بەلایانەوە گرنگ بووە ئەوە بووە، بۆیە ئەوەیان پێش خراوە، ئنجا چی بۆ ئەوەیان زۆر لە لا گرنگ بووە؟ چونکە گوتوویانە: ئەگەر ئەو خەڵکە لەم پەیامو بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ تێبگات، دەزانن کە لە بەرژەوەندییانەو ئیمانی پێدێنن، بۆیە خوا لە سووڕەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ۝٢٦﴾، ئەوانەی کە بێبڕوان گوتیان: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن، وە غەڵبەغەڵبو دەنگە دەنگو قسەی پڕوپووچی تێدابکەن، بۆئەوەی (خەڵکەکە نەیبیستێو)، بەسەریدا زاڵ بن، واتە: زانیویانە کە ئەگەر ئەو خەڵکە

ڕەش‌وڕووتە، لە قورئان تێبگات، بە دوای ئەوان ناكەوێ‌و لە خۆی ناوەشێنێتەوە ببێتە كۆیلەی ئەبو جەهلێك‌و فیرعەونێك‌و نەمردوودێك‌و، خۆ بە پەرستراوزانێك، كەواتە: گوتوویانە: باشترین چارەسەر ئەوەیە كە نەهێڵین لە قورئان تێبگەن، هەر تێیبگەن لێمان هەڵدەگەڕێنەوە.

یەكێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی زلەزلەكان تێشیدەگەیشتن‌و هەڵیش نەدەگەڕانەوە؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە ئەوان بەرژەوەندییان لە بتپەرستیی دابوو، بەڵام خەڵكێكی ڕەش‌و ڕووت كە كڵاوی لەسەرنراوە، ئەگەر تێبگات هیچ بەرژەوەندیی نیە لەو بەرنامە پڕ كوفرو شیركەدا، كە لەسەری فەرز كراوە، بۆیە زۆرجار ئەبو جەهل‌و زلەزلەكان دەیانگوت: ڕێگا مەدەن كۆیلەكان بچنە لای موحەممەدو بڵێن: جادووگەرە، شێتە، كاهینە، شاعیرە، تاكو لەبەرچاویان بكەوێ‌و گوێی بۆ نەگرن، هەر گوێی بۆ بگرن، لێتان هەڵدەگەڕێنەوە.

دەڵێن: ڕۆژێك شاعیرێك دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ كە ئەو كاتە ئەوانەی حەكیم‌و قسەزان‌و قسە ڕۆیشتوو بوون، دەبوونە شاعیر، بەڵام پێش ئەوەی بچێ پێی دەڵێن: كە چووی بۆ مەككە، ئاگات لە جادووگەرەكەی قوڕەیش بێ، هەڵتنەخەڵەتێنێ، وابزانم دەچێ لە عەشیرەتێكی دیكە بووبێ، ئەویش دەڵێ: چۆن هەڵدەخەڵەتێم، شاعیرم‌و حەكیمم‌و قسە زانم‌و ڕاست‌و چەوت لێك جیادەكەمەوە؟ دەڵێن: ئاخر قسەكانی زۆر كاریگەرن، كابرا دەڵێ: هێندەیان ترساندم، كە چوومە نێو كەعبە، لۆكەم لە هەردوو گوێم ئاخنی، بۆئەوەی هیچ قسەیەكیم نەكەوێتە بەر گوێ، دەڵێ: دوایی كە تەماشام كردو، شێوەو دیمەنی موحەممەدم بینی، بە عەقڵم دانەچوو ئەوە جادووگەر بێ‌و شێت بێ، پیاوێكی زۆر گران‌و سەنگین‌و نەجیب‌و هێدیی‌و مەندو لەسەرەخۆو بەڕێز بوو، دەڵێ: هەر خۆم بەخۆمم گوت: تۆ چۆن دەبێ هێندە لە عەقڵی خۆت بترسێی؟! گوێی خۆت شل بكە، با دوو سێ قسەت بكەونە بەر گوێ، داخۆ چی دەڵێ؟ دەڵێ: لۆكەكەم شل كرد، (یاخود دەریهێناوە، پێغەمبەریش ﷺ قورئانی خوێندوە) بیستم قسەی زۆر مەعقوولْ دەكات، دیارە ئەو نەیزانیوە ئەمە قورئانە، دەڵێ: زیاتر لێی چوومە پێش گوتم: تۆ كێی؟ گوتی: من موحەممەدم‌و پێغەمبەری خوام، گوتم: تۆ چی دەڵێی؟ ئەویش هەندێ ئایەتی بۆ خوێندمەوە،

دوای ئەوەی ئایەتەکانی تەواوکردن، هەر لەوێ نەجووڵاو مسوڵمان بوومو ئیمانم پێ هێنا.

ئنجا دوایی کە دەگەڕێتەوە دەڵێن: تۆشی هەڵخەڵەتاند ! ئەویش دەڵێ: بچن گوێی لێبگرن، ئەوەی عەقڵو فیطرەتێکی ساغی هەبێ، ئەوەی ئەو دەیڵێ، دەیسەلمێنێ.

دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾، واتە: تەنیا خۆیان دەفەوتێنن، بەڵام هەست ناکەن.

ئنجا ئەو کاتە کە خوا وایفەرمووە، ئەنجامەکەی زۆر دیار نەبووە، بەڵام ئێستا ئێمە دەزانین، ئەو کەسانەی کە دژایەتیی پێغەمبەر ﷺیان کرد، خەڵکیان لێ دوور دەخستەوەو پڕوپاگندەیان بۆ دەکردو ناووناتۆرەیان بە دوادەخست، کوان؟ لە کوێن؟ هەموویان فەوتانو چوونە زبڵدانی مێژووەوە، ئەبو جەهلو ئەو زلەزلانەی قورەیش کە بوختانیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەبەست، وە لە کاتی سەجدە بردن دا، ڕیخۆڵەو هەناوی ئاژەڵیان دەخستە سەر پشتو، منداڵیان تێبەردەدان، ئەوانە چییان لێهات؟ ئێستا مەگەر وەك شتێکی قێزەون باس بکرێن، ئەگەرنا کێ ناویان دێنێ! بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾، تەنیا خۆیان دەفەوتێنن، بەڵام هەست ناکەن، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە زیان ناکات، هەق هەر دەچەسپێ، ناهەق دەڕوات، دیارە لە ڕۆژگاری ئێمەشدا هەر وایە، ئەوەی هەقە هەر دەچەسپێ، ئەوەی ناهەقە دەڕوات، با ناهەقەکە سوپاو پارەو تەماعی لە پشت بێ، هیچ نیە، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿١٧﴾ ﴾ الرعد، واتە: ئەوەی پووشو پەڵاشە[1] دەڕوات، ئەوەی سوودی هەیە بۆ خەڵك (کە ئاوەکەیە) لە

---

١) الزبد: بریتە لەو پووشو پەڵاشەی لەگەڵ ئاوی باراندایەو دەکەوێتە سەر ئاو، دوایی وشك دەبێتەوەو با ڕایدەماڵێ، بڕوانە : مختار الصِّحاح، ص ٢٤٣.

زەویـدا دەمێنێـتەوەو پێیـدا دەچێتـە خـوار، یانـی: لـە زەوی دا خـەزن دەبـێ‌و دوایی لە شـێوەی كانی‌و سەرچاوەدا دێتـەوە دەر، پـووش‌و پەڵاشـەكە چی لـێـدێ؟ وشك دەبێتـەوەو بایـەك لـێی دەداو ڕایدەماڵـێ، لەڕاستیدا ناهەق‌و باطڵ ئـاوایە، لەو كاتەوەی ئیسلام هـاتوە، چـەندان بەرنـامەو ڕێچكـەو ڕێباز لەگەڵ ئیسلام دا ڕووبـەڕوو بوونـەوە؟ كـوا لەكـوێن؟ هـەر ناویشـیان نیـە، كەچـی ئیسلام وەك كێوێكـی سـەربەرز نەلەخشـاو هـەر وەك خـۆی ماوەتـەوە، لـە سـەردەمی ئێمـەدا، هـەروا دەبـێ‌و لـە دوای ئێمـەش هـەروا دەبـێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، وە ئەگـەر دەیـانبینی كـە لەسـەر ئـاگر دەوەستێنرێن، (واتـە: لـە سوێی ئـاگر، لـە نـزیك ئـاگر، نـەك لەسـەر خـودی ئـاگر)، گوتیـان: خۆزگـە بگێڕدرێینـەوە بـۆ دنیـا، وە ئایەتـەكانی پـەروەردگارمان بـە درۆ نەزانیـن، وە لـە ئیمـانداران بیـن، دیمەنێـكی دڵتەزێـن دەبیـنی ! بـەڵام ئـەم خۆزگـەو بریـایە وەك پێشـینان دەڵـێن: (داری خۆزگـەو بریـا بـەر ناگـرێ)، مـن جارجـار ئەگـەر پێویسـت بكـات، ئامـاژە دەكـەم بـە جیاوازیـی خوێندنـەوەكان (أختلاف القـراءات)، ﴿ نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ نُكَذبُ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا ونكـون مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، (حمزة) و (حفص) لە حەوت قورئـان خوێنـە ناودارەكـان (القـرّاء السَّبعة) وایـان خوێندۆتـەوە: ﴿ نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، بـەڵام (كسـائي) و (أبو عمر) و (أبو بكر) ئاوایان خوێندۆتـەوە: ﴿ نُرَدُّ وَلَا نُكَذبُ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا ونكـونُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، كە دیـارە بـە هـەردووك جـۆرە خوێندنەوەكـە دەگونجـێ ماناكـەی وابـێ، كە سـێ شـتیان بە ئاوات خواسـتوون: گێـڕرانەوە بۆ دنیـاو، بێبـڕوانەبوون بـە ئایەتـەكانی پەروەردگـاریان‌و، لـە بـڕواداران بـوون: (تَمَنّـوا الـرَدّ وَتَـرْك التَّكْـذِيب وَالكَـوْنَ مِنَ الـمُؤْمِنين).

وە دەشگونجێ بە پێـی خوێنـدنەوەی دووەم مەبەسـت ئـاوابـێ:

خۆزگە بگێڕڕێینەوە، ئنجا بەڵێین بێ: بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بێبڕوا نەبین، وە لەگەڵ بڕواداران دابین.

واتە: بە پێی خوێندنەوەی یەکەم هەر سێ شتیان بە خۆزگە خواستوون، بەڵام بە پێی هی دووەم، گێڕدرانەوەیان بە خۆزگە خواستوە، بەڵام بۆ بە درۆ دانەنانی ئایەتەکانو لەگەڵ ئیمانداراندا بوون، بڕیار دەدەنو بەڵێن دەدەن کە وابن، کە دیارە لە هیچیان دا ڕاست ناکەن.

ئنجا لە زمانی عەرەبییدا (لو) وەك (ئەگەر) وایە لە زمانی کوردییدا، ئەگەر بڵێم: ئەگەر فلان کەس هات، یەکسەر چاوەڕێی ئەوە دەکەی، کە بڵێم لەبەری هەڵدەستم، یان ڕێزی دەگرم، یان خەڵاتی دەکەم، یان سەرزەنشتی دەکەم، ئنجا لێرەدا لە ئایەتەکەدا: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ ... ﴾ وەڵامی (لو) دیار نیە، کە خوا دەفەرموێ: {ئەگەر بیانبینی کە دەوەستێنرێن لە نزیك ئاگری دۆزەخەوە، وە گوتیان: خۆزگە بگێڕدرێینەوە بۆ دنیا، وە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دانانێینو لەگەڵ ئیمانداران دەبین}، وەڵامی ئەگەر (لو) دیارنیە، وەڵامەکەشی ئەوەیە کە: ئەگەر بیانبینی، دیمەنێکی سەرنجڕاکێش دەبینی، یاخود لە حاڵێکی زۆر خراپدا دەیانبینی، ئنجا بۆچی وەڵامەکەی نەهاتوە؟ چونکە بە عەقڵ دیارە، وە بۆ ئەوەش کە زیهن بۆ ئەگەری هەر شتێك بچێ، بۆ وێنە: ئەگەر منداڵێکت سەرپێچیی کردبێ، یان کارێکی خراپی کردبێ، تۆش پێی بڵێی: ئەگەر بۆت هەڵسم! ئەگەر تووڕەم بکەی! یانی چی؟ ئەوکاتە ئەو منداڵە زیهنی بۆ سەد شت دەچێ، دەڵێ: خوایە! دەبێ لێم تووڕەبێ؟ قسەم پێ بڵێ؟ حەپسم بکات؟ ئازارم بدات؟ کە بێگومان ئەوەش دیسان یەکێك لە ڕووەکانی ڕەوانبێژیی قورئانە، کە جاری وایە شتێك قرتاو (حذف) دەبێ، بۆئەوەی ماناکەی زۆر فراوان بێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾، (ڕاست ناکەن لەوەدا کە دەڵێن: ئەگەر ئێمە بگێڕدرێینەوە بۆ ژیانی دنیا، ئایەتەکانی خوا بە درۆ دانانێین، وە لەگەڵ

ئیماندارانــدا دەبیــن) بـەڵکو ئـەوەی لـە ڕابـردووداو لـەوەو پـێش دەیانشاردەوەو پەنهانیـان دەکـرد، بۆیان ئاشکرا بووە.

لێرەدا توێژەرەوانی قورئـان چەنـد مانـایەکیـان هێنـاون:

١ / هەنـدێك گوتوویـانە: گوناهـەکانیان پـەنهان دەکـرد، بـەڵام لـەوێ بۆیـان ئاشـکرا بـوون، بۆیــە ئـاوا خەجاڵـەتو شـەرمەزار بـوون، دەسـتیان کـردوە بـە پاسـاو هێنـاوەو خۆزگـە خـواستن.

٢ / هەندێکیش گوتوویانە: واتە: ئەوەی پەنهـانیان دەکـرد، لـە دووڕوویـی (نفـاق)، یاخـود ئـەوەی پەنهانیان دەکـرد لە کوفـر.

٣ / هەندێکی دیکـەش گـوتوویانە: واتە: ئـەوەی پـەنهانیان دەکـرد، لـەو سـزایەی کـە بۆیـان دیـاریی کـراوە، دەیـانزانی بـەو شـێوەیە سـزا دەدرێـن، بـەڵام پـەنهانیان کـردوە لە خۆیـان، وەك بڵـێی فێڵـیان لە خۆیـان دەکـرد.

٤ / بـەڵام وا پێدەچێ ڕای ڕاسـتـتـر ئـەوەبێ وەك (محمـد الطـاهر بـن عاشـور) لـە تەفسیـرەکەی خــۆی: (التحریر والتنویر)دا دەڵـێ: لێـرەدا مەبەست لـەوەی کـە پەنهـانیان کــردوە، ئـەو ئیمـانو عەقیدەیـە بـووە کـە لـە دڵیانـدا هـەبووە، بـەڵام ڕێیــان پێنــەداوە دەربکــەوێ، لەبــەر لێتێکنــەچوونی ئــەو بەرژەوەندییــە ناشــەرعییانەی کـە هـەیانبوون، واتـە: ئـەو ئیمانـەی کـە لـە دنیـادا ڕێیـان نـەدەدا دەربکـەوێ، ئەو ئیمـانە لـە قیامـەت دا دەردەکـەوێ، چونکە لـەوێ هـیچ پاساوێك نەمـاوە بـۆ ئیمـان نەهێنــان، وە لەڕاسـتییدا مـن ئـەو مانایـەم پـێ زۆر بـەهێزە. ئنجـا بەسـەرهـاتێك هەیــە لـەوبــارەوە، وەك لــە دەرســی دواتــر دەیگەینــێ، ئەخنەسو ئەبــو جەهـل پێکگەیشـتن، (ئـەبو جەهــل کونیـەکـەی أبـو الحکـم بووە) ئەخنەس ئەبو جەهلی جیاکردەوەو گـوتی: ئەی ئـەبو لحەکـەم دەربـارەی موحەممەد هەواڵم پێبـدە! ئایا ڕاسـتگۆیە یـان درۆزنــە؟ چونکــە لـە قورەیش جگە لە خـۆمو خـۆت کەسـی دیکـەی لـێ نیـە قسـەمان ببیسـتێ، ئـەبو جـەهـل گــوتی: بــێ قــەزابی، ســوێند بــە خــوا موحەممــەد ڕاســتگۆیە، وە هــەرگیز موحەممـەد درۆی نەکــردوە، بــەڵام ئەگــەر (بنـو قُصَـي)[1] {کـە عەشـیـرەتی

---

١) قُصَي: باپیـرە گـەورەی (بنو هاشم)ی هۆزی پێغـەمبـەری خوایـە ﷺ.

پێغەمبەرە ﷺ}، هەڵگرتنی ئاڵای جەنگو، پەردەکردن بۆ کەعبەو ئاو پێدانی حاجیان، عایدی وان بێ، ئنجا پێغەمبەرایەتییش هەر لەوان بێ، ئەدی هۆزی قورەیش چی بۆ دەمێنێتەوە؟ لەبەرئەوە بەدوای ناکەوین ! ئەمە پشتگیریی ئەو تەفسیرەی دوایی دەکات کە ئێمە پەسندمان کرد.

پاشان کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾، وە ئەگەر بگێڕدرابانەوە (بۆ دنیا) دەگەڕانەوە سەر ئەوەی کە لێیان قەدەغە کرابوو، چییان لێ قەدەغە کرابوو؟! شیرك‌و کوفر.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە جاری وایە ئینسان حاڵەتێکی سۆزداریی بۆ دروست دەبێ، وەك کەسێکی گوناهبار دەکەوێتە ژێر کاریگەریی قسەیەك، دەڵێ: بڕیارم داوە دەگەڕێمەوە، دوو ڕۆژان چوار نوێژان دەکات، دوایی تێهەڵدەگەڕێتەوە، یان هەندێ کەس کە قومار دەکات، یان شەراب دەخواتەوە، یان جگەرە دەکێشێ، لەسەر گوناهێك بەردەوامە، تووشی حاڵەتێکی عاتیفیی دەبێ‌و دەڵێ: وازی لێ دێنم ! ئنجا دوو سێ ڕۆژ بەردەوام دەبێ‌و دوایی دەگەڕێتەوە سەر بەزمی پێشێ، وەك گوتراوە: (عَادَت حَلِيمَةَ إلى عَادَتِهَا القديمَة)، واتە: حەلیمە گەڕاوە سەر عادەتی پێشێی، ئەو حاڵەتانە هەن، بەشەر ئەگەر هەر بە سۆزداریی‌و دڵگەرمیی شت وەربگرێ، شتێکی خراپە، چونکە سۆز (عاطفة) وەك پووش وایە، پووش گڕو فڕە، زوو گڕ دەگرێ‌و زووش خامۆش دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر ئینسان بە عەقڵ‌و تێگەیشتنەوە شت وەربگرێ، وە بە قەناعەتێکی تەواو، هەتا ئەو قەناعەتەی لە دڵدا هەبێ، ئەوە لەسەر ئەو ڕێیەی کە گرتوویەتی، بەردەوام دەبێ.

**مەسەلەی نۆیەم**: خوا باسی بێبڕوایەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ قَالَ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾، وە (بێبڕوایەکان) گوتیان: ژیان تەنیا ئەم ژیانە دنیاییمانە، {هیچ ژیانی دیکەمان نیە}، دیارە

کافرو بتپەرستەکانی مەککە، هەموویان لەوانە نەبوون کە نکوولّیی بکەن لە هاتنی قیامەت، بەلاّم ئەوانەی خوا لێرەدا باسیان دەکات، کۆمەڵێك بوون بڕوایان هەر بە قیامەت نەبووە، گوتوویانە: ژیان هەر ئەو ژیانەی دنیایە، وە ئێمە زیندوو ناکرێینەوە، ئنجا خوای کاربەجێ ڕاستەوخۆ لە دنیاوە دەیانگوازێتەوە بۆ قیامەتێو، دەفەرمویّ: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ قَالَ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾، وە ئەگەر بیانبینی کە دەوەستێنرێن لەسەر پەروەردگاریان، (واتە: لە بارەگای پەروەردگاریاندا دەوەستێنرین) خوا پێیان دەفەرمویّ: ئا ئەمە هەق نیە {ئەو زیندووبوونەوەو، ئەو قیامەتو لێپرسینەوەو پاداشتو سزایە} ؟ ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾، دەڵێن: با، بە پەروەردگارمان، ڕاستە {ئێمە بە هەڵەداچووبووین} فەرمووی: سزاو ئازار بچێژن، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون، لێرەدا دیسان وەلاّمی ئەگەر (لو) دیار نیە، واتە: ئەگەر بیانبینی، لە وەزعێکی زۆر سەغڵەتدا دەیانبینی، وە زۆر بە بەدبەختیی دەیانبینی، وە زۆر بە پەشێمانیی دەیانبینی، هەر وەلاّمێك كە بگونجیّ لەگەڵ مەقامەکەدا، زیهن بۆی دەچیّ، بۆیە خوای کاربەجیّو شارەزا یەك شتی دیاریی نەکردوە، بۆ وێنە: بفەرمویّ: (وَلَوْ تَرَى إِذْ وُقِفُواْ عَلَى رَبِّهِمْ لَرَأَيْتَهُم نادِمِين)، بە پەشێمانیی دەیانبینی، کە ئەوکاتە هەر یەك مانای بوو، بەلاّم ئێستا هەر مانایەك کە لەگەڵ مەقامەکەدا بگونجیّ، زیهن بۆی دەچیّ، وە ماناکەی زۆر فراوان دەبیّ، ئنجا کە دەفەرمویّ: ﴿ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ ﴾، کە دەوەستێنرێن لەسەر پەروەردگاریان، ئەمە ئەوە ناگەیەنیّ کە پەروەردگاریان دەبینن، بەڵکو یانی: لەبەردەم دادگای پەروەردگاردا دەوەستێنرێن، وە مەرج نیە خوای پەروەردگار بۆخۆی ڕاستەوخۆ قسەیان لەگەڵدا بکات، بەڵکو لە ڕێی فریشتەکانەوە دەیاندوێنیّ، بۆچی دەڵێین: مەرج نیە پەروەردگاریان ببینن، چونکە بە دەقی ئایەت کافرەکان لە ڕۆژی دوایی دا لە دیدارو بینیی پەروەردگاریان بێبەشن،

خــوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿...إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۝١٥﴾ المطففــین، واتـە: ئەوان (کافرەکان) لـە ڕۆژی دوایـی دا پـەردەپۆش دەکـرێن لـە پەروەردگـاریان، خـوا نابیـنن، بینینـی خـوای بـێ وێنــە گـەورەترین نیعمـەتی بەهەشـتەو، کافرەکان لێـی بێبەشــن، بــەڵام کــە دەفــەرموێ: لەســەر پــەروەردگاریان دەوەســتێنرێن، واتــە: لەبــەردەم دادگــای پــەروەردگاردا، بــەڵام بــە پێــی ئایەتەکــەی دیکــە پەردەپــۆش دەکرێـن‌و نایبینـن‌و، لەو نیعمەتە بێبـەش دەکـرێن.

**مەسەلـــەی دەیـــەم**: کـــە دەفـەرمـــوێ: ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ﴾، بێگومـان ئەوانـەی کە دیداری خـوایان بـە درۆ زانـی، زیانبار بوون، هـەتا کاتێك کە قیـامەت لـە نەکاو هــات، گوتیـان: هـەی داخ‌و خەفەت! لەسەر ئـەوەی کە بە زایـەمانـدا تێیــدا {لە دنیـادا، یـان لـە قیامەتـدا، یـان لە خواپەرستیی دا، هەمووی دەگرێتەوە} ﴿وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ﴾، وە لــەو کاتــەدا قورســاییەکانی خۆیــان لەســەر پشـــتیان هەڵدەگـرن، ئاگـاداربن! خراپتـرین شــت ئەوەیــە، کـە ئـەوان لەســەر پشـتی خۆیـان هـەڵی دەگـرن.

لـەبەردەم ئـەم ئایـەتـەدا دوو هەڵوەســتە دەکـەیـن:

هەڵوەسـتەی یەکـەم: کـە دەفەرموێ: ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان بە دیداری خوا نەبووە، زیانبـار بوون، خەسارەتمەند بوون، وە زیانباریی‌و خەسارەتمەندییەکەیان بەردەوام بـووە، هەتـا کاتێك کـتوپـڕ کاتـی دنیا تێکچوون هات، ئەمـە چی لـێوەردەگیـرێ؟ واتە: ئینسـانی بێبــڕوا بەهــۆی بێبـڕواییــەوە، تووشـی زەرەرو زیـان‌و بەدبەختیــی‌و

چارەڕەشیی دێ، هەتا قیامەت، چونکە: ئینسانی بێبڕوا هەر لە دنیادا ژیانێکی پڕ دڵە ڕاوکەو نارەحەت دەباتە سەر، چاودێریی خوا بەسەر خۆیەوە نابینێ، چاوەڕێی و زیندووبوونەوەو دیداری خوا ناکات، چاوەڕێ ناکات خوا پاداشتی بداتەوە، پێی وایە هەر کە مرد هەموو شتێك کۆتایی پێدێ، هەمیشە چاوەڕێی چاڵێکی ڕەش دەکات، کە بکەوێتە بنیی و نەیەتەوە دەر! ژیانێکی ئاوا ژیانێکی ناخۆشە.

پاشان ئینسانی بێبڕوا بەهۆی بێ ئیمانییەکەیەوە، هەمیشە خەریکی گوناح و تاوانە، هەمیشە خەریکی تێرکردنی ئارەزووەکانیەتی، بێ گوێدانە عەقڵ و شەرع و، بەرژەوەندیی خەڵك و، ڕەزامەندیی خواو، هەتا جەستەی خۆشی، وەك دەبینن چۆن مادده بێهۆشکەرەکان بەکاردێنن، جگەرە دەکێشن، سەرخۆش دەبن، بێهۆش دەبن، زیناو داوێنپیسیی دەکەن، کە ئەوە هەمووی دەبێتە دەردو نەخۆشیی و ژەقنەبووت، یانی: هەر ژیانە دنیاییەکەشیان لێ تێکدەچێ، پێش قیامەت.

ئنجا ئەوە هەمووی لە ڕووی ژیانی تاکییەوە، وە لە ڕووی ژیانی کۆمەڵایەتییەوەش، ئەوانەی کە بێبڕوان و خۆیان لە خەڵکی دەکەنە پەروەردگارو پەرستراو، وە خۆیان بەسەر خەڵك دا فەرز دەکەن، ژیانی خۆیان و خەڵکیش دەکەنە دۆزەخ، کەواتە: لەڕاستییدا بێبڕوایی و دوور لە خوایی، مایەی زیانباریی ئینسانە لە دنیادا، هەتا دەگەنە قیامەت، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە دیداری خوا نەبووە، زیانبار بوون، خەسارەتمەند بوون، وە زیانباریی و خەسارەتمەندییەکەیان بەردەوام بووە، هەتا کاتێك کە کتوپڕ کاتی دیاریکراو هات، ئنجا چ قیامەتی گەورە بێ، چ قیامەتی گچکە، قیامەتی گەورە ئەوەیە کە دنیا تێکدەچێ و خەڵك زیندوو دەکرێنەوە، کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە: ﴿لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ﴾[1]، واتە: تێکچوونی ئەم دنیایە نایەت، مەگەر لەسەر خراپترینی خەڵك، وە لە

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٩٤٩) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ.

فەرمایشتێکی دیکەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ: اللهُ اللهُ﴾[1]، واتە: تێکچوونی دنیا نایەت، هەتا ئەو کاتەی لەسەر زەوی ناگوترێ: (اللهُ اللهُ)، کەواتە: دنیا بەسەر خراپترین دروستکراوانی خوادا کاول دەبێ، کە کەسیان تێدا نامێنێ بڵێ: خوا (الله) کەس خوای لەبیر نامێنێ، وە لە فەرموودەیەك دا هاتوە: وەك چۆن گوێدرێژ سواری یەکدی دەبن، مرۆڤەکان ئاوا سواری یەکدی دەبن! دنیا بەسەر ئەواندا کاول دەبێ، جا چ ئەوانەی دەگەنە ئەو کاتە، بە نسبەت قیامەتی گەورەوە، چ قیامەتی بچووك مەبەست بێ، وەك گوتراوە: (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ)، واتە: ئەوەی مرد، قیامەتی[2] هاتوە، ئایا ئەوانەی ڕۆیشتوونو مردوون لە کافرەکان قیامەتیان نەهاتوە؟ با، هاتوە، چونکە هەر کەسێ مرد، لەخۆی حاڵی دەبێ، سزا، ئەگەر کافر بێ، یان پاداشت، ئەگەر ئیماندار بێ، پاداشتو سزا دەست پێدەکات، لە ژیانی بەرزەخدا، ژیانێك کە دەکەوێتە نێوان ئەم ژیانەی ئێمەو ژیانی دوایی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ١٠٠﴾المؤمنون، وە لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیە، هەتا ڕۆژی قیامەتو زیندوو بوونەوە.

<u>هەڵوەستەی دووەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە دنیا تێکچوون لەنەکاو دێ، ئەوە لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَاۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَۚ ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٠٦٢)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٢٤٧). وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٠٧)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٨٤٩)، وَالبَزَّار برقم: (٦٩٨٠) وَالبَيْهَقِيُّ في "الشعب الإيمان" برقم: (٥٢٤).

٢) وشەی (ساعة) و (قيامة) لە یەك جیان. (ساعة) یانی: کاتی دیاریکراوی تێکچوونی دنیا، بەڵام (قيامة) یانی: کاتی هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەی مردووانو دەست پێکرانی حەشرو حیساب.

بَغۡتَةً ﴿١٨٧﴾، واتە: (ئەی موحەممەد) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی هاتنی کاتی دنیا تێکچوون، کەی دێو لەنگەر دەگرێ؟ بڵێ: زانیارییەکەی تەنیا لەلای پەروەردگارمە، تەنیا ئەو دەیزانێو دەریدەخات، هەواڵێکی زۆر قورسە لەسەر ئاسمانەکانو زەوی، لەنەکاونەبێ نایەت، کتوپڕ دێ.

هەروەها لەوبارەوە فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ هەیە، دەفەرموێ: ﴿لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمنوا أَجْمَعُونَ، فَذَلِكَ حِينَ لا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلانِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا، فَلا يَتَبَايَعَانِهِ، وَلا يَطْوِيَانِهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ، فَلا يَطْعَمُهُ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أَكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلا يَطْعَمُهَا﴾(1)، واتە: دنیا کۆتایی نایەت، تاکو خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت، ئەگەر خۆر لە خۆرئاواوە هەڵهاتو خەڵکی بینییان، هەموویان ئیمان دێنن، بەڵام ئەوە ئەوکاتەیە کە ئیمان هێنانی هیچ کەسێك سوودی پێناگەیەنێ، کە پێشتر ئیمانی نەهێناوەو کاری چاکی نەکردوە، وە دنیا تێکچوون دێ، لە کاتێکدا کە دوو پیاو پۆشاك ( یان قوماش)یَکیان بڵاوکردۆتەوە کڕینو فرۆشتنی پێدەکەن، نە کڕینو فرۆشتنەکە تەواو دەبێو نە دەشیپێچنەوە، وە دنیا تێکچوون دێ، لە کاتێکدا کەسێك شیری حوشترەکەی دۆشیوە، پێش ئەوەی فریای ئەوە بکەوێ بیخواتەوە، وە دنیا تێکچوون دێ، لەکاتێکدا کەسێك حەوزەکەی خۆی سواغ کردوە، پێش ئەوەی ئاژەڵەکەی تێدا ئاو بدات، وە دنیا تێکچوون دێ لەکاتێکدا کە پیاوێك پاروەکەی بەرز کردۆتەوە، پێش ئەوەی بیخاتە نێو زاری.

ئنجا کە دەڵێن: ﴿يَحَسۡرَتَنَا﴾، یانی: هەی داخو خەفەت! وەرە بۆ لای ئێمە، ئێستا وەختیەتی، ئێستا کاتی ئەوەیە خەمو خەفەت بخۆین، چونکە جگە لە خەمو خەفەت، هیچ شتێکی دیکەمان بۆ نەماوەتەوە.

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٦٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٧).

وە کە دەڵێن: ﴿ عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا ﴾، یانی: (علی ما ضَیّعْنَا) لەسەر ئەوەی بەزایەماندا، ئنجا ئایا (فیها) ڕاناوەکەی بۆچی دەچێتەوە؟ چوار ئەگەری هەن:

١ / یان بۆ قیامەت دەچێتەوە، واتە: ئێمە تەمەنی خۆمان بە زایەداو، بۆ ئەو ڕۆژە کە قیامەتە، کارمان نەکرد.

٢ / یاخود ئێمە تەمەنی خۆمان بە زایەدا کە کەمتەرخەمییمان کرد لە خواپەرستییدا.

٣ / یاخود کەمتەرخەمییمان کرد، لە پابەندبوون بەو بەڵێنەدا، کە خوا لێی وەرگرتبووین، کە بەندەی خوابین.

٤ / یاخود کەمتەرخەمییمان کرد، لە بەدەستهێنانی بەهەشتدا.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ گوناهەکانی چوواندوە بە کۆڵێك‌و بارێکی قورس، کە لەسەر پشتی خۆیان هەڵیانگرتوە، وە لەڕاستییدا گوناح، بار قورسیی‌و بارگرانییە، بۆ دنیاو بۆ قیامەت.

<u>**مەسەلەی یازدەیەم‌و کۆتایی**</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، وە ژیانی دنیا تەنیا یاریی‌و کات بەسەربردنە، وە بە دڵنیایی مەنزڵگای دواڕۆژ بۆ کەسانێك کە پارێز دەکەن باشترە، ئایا نافامن ؟

**لەبارەی چەمك‌و واتای (لعب) و (لهو)ەوە، زانایان چەند ڕایەکیان هەن:**

١) هەندێك گوتوویانە: (لَعِب) ئەوەیە کە بە ئامێر بێ‌و، (لَهُو) ئەوەیە کە بەبێ ئامێر بێ‌و، بە ئامێریشەوە دەکرێ.

٢) هەندێکیشیان گوتوویانە: (لَعِب) پەیوەندیی بە جەستەوە هەیەو، (لَهُو) پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە.

٣) هەندێکی دیکە گوتوویانە: (لَعِب) بۆ قۆناغی سەرەتای تەمەنە، تەمەنی منداڵیی‌و هەرزەکاریی، بەڵام (لَهُو) بۆ قۆناغی دواتری تەمەنە، کاتی گەنجیەتیی‌و دوایی کامڵ بوون‌و چوونە تەمەنەوە.

ئنجا خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ژیانی دنیا تەنیا یاریی‌و گەمەو کات بەسەر بردنە، ئەوەش سێ واتای هەن:

١- واتە: ژیانە ماددییەکەی دنیا، یانی لە ڕووی ماددییەوە ژیانی دنیا، وەك خافڵان‌و یاریی منداڵان وایە.

٢- یاخود ژیانی دنیا لەچاو بەهەشت، وەك یاریی‌و گەمەی منداڵان وایە.

٣- یاخود ژیانی دنیای کافران، وەك گەمەو یاریی منداڵان وایە، ئەگەرنا ژیان هەمووی گەمەو یاریی نیە، ژیانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ژیانی ئیمانداران، کە تێیدا خوا لە خۆیان ڕازی دەکەن‌و شەریعەتی خوا ﷻ پیادە دەکەن، ئەو ژیانە گەمەو یاریی نیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەوت (٧) ئایەت پێکدێ، ئایەتەکانی (٣٣ تا ٣٩) تەوەری سەرەکیی ئەم حەوت ئایەتە، دڵدانەوەی خوای بە بەزەییە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وە بەرچاوڕوونکردنەوەی، لەو ڕووەوە: کە بێبڕوایە ستەمکارەکان ئەو بە درۆزن نازانن، بەڵکو هەر نایانەوێ ئیمان بە ئایەتەکانی خوا بێنن، وە بۆی ڕوون دەکاتەوە، کە پێغەمبەرانی پێشووش (علیهم الصلاة والسلام) هەر ئاوا بە درۆ دانراون و ئازار دراون، بەڵام خۆڕاگربوون، هەتا خوا سەری خستوون، پاشان خوای کاربەجێ دەیخاتەڕوو، کە هێنانی بەڵگەو موعجیزەی ناچارکەر، ئەرکی پێغەمبەر ﷺ نیە، وە کافرەکانیش هەر بیانوو دەگرن، ئەگەرنا ئەوەی بیەوێ دەنگی زوڵاڵی هەق ببیستێ، ئەو موعجیزەیەی کە پێغەمبەری خاتەم هێناویەتی، کە قورئانە، بەسە بۆ هیدایەت، بەڵام ئەوەی کە مردووبێ، دوایی خوا زیندووی دەکاتەوەو لێی دەپرسێتەوە، واتە: ئەوەی کە بە مردنی مەعنەویی مردبێ و، عەقڵ و دڵ و هەستەوەرەکانی خۆی لە کارخستبن.

پاشان خوا باسی بیانوو گرتنی کافرەکان دەکات کە داوای بەڵگەو نیشانەیەکی تایبەتیان دەکرد، وە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێیان بڵێ: خوا لەسەر ئەوە بە توانایە، بەڵام ئەوان زۆربەیان نازانن کە هێنانی ئەو جۆرە بەڵگەو موعجیزەیە، لەگەڵ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دا ناگونجێ، چونکە ئۆممەتەکانی پێشوو، هەر کەس ئیمانی نەهێنابی بەو موعجیزەیەی کە پێغەمبەرەکەیان بۆی هێناون، لەبەین چوون.

دوایی سەرەنجیان ڕادەکێشێ بۆ دیاردەی ئۆممەت بوونی ئاژەڵ و زیندەوەرو پەلەوەران.

**وە لە کۆتاییدا خوا ڕایدەگەیەنێ: کە بێبڕوایان بە ئایەتەکانی خوا، کەڕو لاڵن‌و لە تاریکایی دان.**

**پاشان ویستی ڕەهای خوا دەخاتەڕوو، لە بواری گومڕاکردن‌و ڕاستەڕێ کردنی مرۆڤەکاندا.**

﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ
ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ
أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِى۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ
عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِىَ نَفَقًا فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِى ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم
بِـَٔايَةٍ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ
ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ
مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن
دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَـٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَـٰبِ مِن
شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ ۗ
مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ ﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((بـە دڵنیـاییەوە دەزانـین "ئـەی موحەممـەد" ئـەوەی کافرەکـان دەیڵێن، دڵتەنگـت دەکـات، ئنجـا بێگومـان ئـەوان تـۆ بـە درۆ نـازانن، بەڵـکو سـتەمکارەکان نکـوڵیی لـە ئایەتـەکانی خـوا دەکـەن، (هەرچـەندە بـە ڕاسـتیان دەزانـن، بـەڵام دانیـان پێدانـاهێنن) ﴿٣٣﴾ وە بێگومان لە پێش تۆشدا پێغـەمبەرانێك بـە درۆ زانـراون، بـەڵام لەسـەر بـە درۆ دانـران‌و ئازاردانیـان خـۆڕاگر بـوون، هـەتا یارمـەتیمانیان بـۆ هـات، وە یاسـاو بڕیارەکـانی خـوا گۆڕانیـان بەسەردا نایـەت، وە لە هەواڵی پێغـەمبەرانت بۆ هاتوە، (کـە چـۆن بـوون‌و چییـان بەسـەرهـاتوە؟) ﴿٣٤﴾ ئنجا ئەگەر پشـت هەڵکردنیـانت لەسـەر دڵ گـەورەو گـران بـوو، ئەگـەر توانیـت تونێڵـێك لـە زەویـدا، یـان پەیژەیـەك لـە ئاسـماندا پەیدابکـەی‌و، نیشـانەو بەڵگەیەکیان بۆ بێنـی (بیکـە)، وە ئەگـەر خـوا ویسـتبای تۆبزییـان لێبکـات، لەسـەر ڕێـی ڕاسـت کـۆی دەکردنـەوە، دەجـا لـە نـەفامان مەبـە ! ﴿٣٥﴾ بێگومـان تـەنیا ئەوانەی (بە گوێی عـەقڵ‌و دڵ) دەبیسـتن، بـە دەنگـەوە دێـن (و وەڵامـی بانگـەوازی خـوا دەدەنەوە)، بەڵام مردووەکان خـوا بـۆ لای خـۆی زینـدوویان دەکاتـەوە، پاشـان بـۆ لای وی دەگێڕدرێنـــەوە ﴿٣٦﴾ وە کافرەکـــان گوتیـــان: خۆزگـــە لـــە پەروەردگاریـــەوە نیشـــانەو بەڵـگەیەکی (ناچـارکەری) بـۆ دابەزێنرابایـە، بڵـێ: بێگومـان خـوا دەتوانـێ نیشـانەو بەڵگەیەك دابەزێنـێ، بەڵام زۆربەیان نازانن (کە ئەوە بـە زیانیـان تـەواو دەبـێ) ﴿٣٧﴾ وە هـیچ زینـدەوەرێك لـە زەویـدا نیـــەو، هـیچ باڵـندەیەك لـە ئاسـمان بـە دوو باڵەکـانی نافـڕێ، مەگـەر کۆمەڵێکـن وەك ئێـوەومانـان، لـە کـتێب دا هـیچ شـتێکمان نەبـواردوە (کـە باسـمان نەکردبـێ، یـان تۆمارمـان نەکردبـێ) پاشـان بـەرەو لای پـەروەردگاریان کۆدەکرێنـەوە ﴿٣٨﴾ ئەوانەی بە ئایەتەکـانمان بێبـڕوان، کەڕن‌و لاڵـن لە تاریکـاییەکاندان، خـوا هـەر کەسـێکی بـوێ، گـومڕای دەکـات، وە هـەر کەسـێکیشـی بـوێ، دەیخـاتە سـەر ڕاسـتە ڕێ ﴿٣٩﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(يَجۡحَدُونَ ): (الجَحْدُ: نَفيُ مَا فِي القَلْبِ إِثْبَاتُهُ، وَإِثْبَاتُ مَا فِي القَلْبِ نَفيُهُ)، (جَحْد) لە زمانی عەرەبیدا ئەوەیە كە شتێكت لە دڵدابێ‌و، بە زمان نكووڵیی لێبكەی، یان شتێكت لە دڵدا نەبێ‌و، بە زمان بیڵێی، واتە: پێچەوانەی دەروونی خۆت قسە بكەی، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی گەلی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ ...١٤﴾النمل، واتە: نكووڵییان (لە مووسا ﷺ و لە موعجیزەكانی) كردو دانیان پێدانەدەهێنان، بەڵام لە دڵیاندا دڵنیابوون (كە نیشانەو بەڵگەی خوای پەروەردگارن‌و مووساش پێغەمبەری خوایە) بەهۆی ستەم‌و خۆبەرزكردنەوەوە.

(وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ): (كَلِمَات) كۆی (كَلِمَة)، (كَلِمَة) واتە: وشە، بەڵام لێرەدا (كَلِمَةُ اللّه) واتە: (حُكْم اللّه، إِرَادَةُ اللّه، سُنَّةُ اللّه)، یانی: بڕیاری خوا، ویستی خوا، یاسای خوا، كەواتە: (وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ) واتە: بڕیارەكانی خوا، ویستەكانی خوا، یاساكانی خوا، گۆڕانیان بۆ نیە.

(نَفَقٗا ): (النَّفَقُ: الطَّرِيقُ النَّافِذُ وَالسَّرَبُ فِي الأَرْضِ النَّافِذُ فِيهِ، وَمِنْهُ نَافقَاء اليربوع)، (نَفَق) بریتیە لە ڕێیەك كە دوو سەری هەبن، بۆ لێ دەرچوون، وە لەوەوە بە كونی جرج گوتراوە: (نافقاء)، چونكە جرج كە لە زەوی دا كونێك لێبدات حەتمەن دوو سەری هەن، بۆیە بە مونافیق گوتراوە: مونافیق، چونكە وەك جرج دوو ڕووی هەن، دوو لای هەن.

(سُلَّمٗا ): (السُّلَّمُ: مَا يُتَوَصَّلُ بِهِ إِلى الأَمْكِنَةُ العَالِيَة فَيُرْجَى بِهِ السَّلاَمَة، الدَّرَج)، (سُلم) یانی: پەیژە، بۆچی بە پەیژە گوتراوە: (سُلَّم)؟ چونكە بەهۆی پەیژەوە دەگەیە شوێنە بەرزەكان، وە سەلامەتیش دەبی، بۆیە گوتراوە: (سُلَّم)، واتە:

ئـەو شــتەی كـە بـە ســەلامەتیی پێـی بـەرز دەبیــەوە، لـە شـوێنێكی نزمـەوە بـۆ شـوێنێكی بــەرز.

(دَآبَّةٍ): (الـدَّبُّ وَالـدَّبِيبُ: مَشِـي خَفِيـفٌ وَيُسْـتَعْمَلُ ذَلِـكَ فِـي الحَيْـوَانِ وَفِـي الحَشَـرَاتِ أَكْثَر) وشـەی (دب)و (دبیب)، بـە ڕۆیشـتنی هێـواش دەگـوترێ، وە بـۆ هـەر ئـاژەڵو پەلـەوەرو ژیـاندارێك بەكـاردێ، بـەڵام زیاتر بۆ زینـدەوەران.

(مَّافَرَّطْنَا): دوو وشـــەی دژ بـــە یەكدیـــمان هـــەن: (أَفْـرَطَ و فَـرَّط)، (أَفْـرَطَ) واتـــە: تێپپـــەڕاند، (فَـرَّط) واتـە: بەزایـــەی دا، كەواتـــە: (إِفْرَاط) تێپەڕاندنـــە، (تَفْرِيط) بەزایەدانو كورتـهێنانە، (ما فرَّطنـا) یـانـی بەزایەمان نـەداوە، نەمـانبـواردە.

(أُمَمٌ): (الأُمَّة: كُلّ جَمَاعَة يَجْمَعُهُم أَمْـرٌ مَا إمَّا دِيـنٌ وَاحِـد، أَو زَمَـان وَاحِـد، أَو مَكَـان وَاحِـد سَـوَاءً كَـانَ ذَلِـكَ الأَمْـرِ الجَـامِع تَسْـخِيراً أَو إختيـاراً وَجَمْعُهَـا: أُمَـمْ) واتـە: (أُمَّة) هـەر كۆمەڵـە خەڵـكێكە كـە كارێـك كۆیـان بكاتـەوە، یـان یـەك دیـن كۆیـان بكاتەوە، یاخـود لـە كاتێكـدا، یـان لـە شــوێنیكدا كۆببنـــەوە بـۆ مەبەســتێك، یـــان (أُمَّة) هەر كۆمەڵە شـتێكن (كۆمــەڵە كەسـێك، كۆمەڵە ســاڵێك، كۆمەڵە ئاژەڵـێك)

وەك خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ ﴾ یوسف، واتـە: دوای كـۆمەڵە ســاڵێك بـرادەرە سـجنەكەی یوســف، یوســفی كەوتـەوە بیـر، بۆیـە (أُمَّة) هـەر كۆمەڵـە شـتێكە كـە شـتێك كۆیـان بكـاتەوە، جـا ئـاییینێـك بـێ، یـــان ڕۆژگــارێك بــێ، یــان شـوێنێــك بــێ، ئنجــا ئــەو شــتە كۆكـــەرەوەیە، (تسـخیري) بێ، یان (إختیـاری) واتـــە: لـە ویسـتی مـرۆڤـ بـەدەر بـێ، یـان لەژێـر ڕكێفی ئیـرادەی دابـێ.

(ٱلۡكِتَٰبِ): واتە: پـەڕاو، نووسـراو، بـەڵام لێـرەدا بـە مانـای قورئـان دێ، یـان بـە مانـای (لـوح الـمحفوظ) دێ، ئـەو شـــتەی كـە خـــوای زانـــا زانیـاری خـۆی تێـدا تۆمـار كـردوە، وەك زانـایان دەڵـێن.

( صُمٌّ ): کۆی (أَصَمّ)ە. (أصَم)یش واتە: کەڕ، (صُمٌّ): کەڕەکان، (صَمَم) بریتیە لە لەدەستدانی هەستی بیستن، وە هەر کەسێك کە گوێ بۆ هەق نەگرێ، یاخود وەری نەگرێو قبووڵی نەکات، ئەوە بە (کەڕ) وەسف دەکرێ.

(بُكْمٌ ): کۆی (أبْكَمَ)، یان کۆی (بَكْم)، واتە: لاڵ، (بُكْمُ): لاڵەکان، (أبْكَم) کەسێکە کە لەدایك دەبێ، قسان ناکاتو (لاڵ)ە، یاخود کەسێکە کە هەق ناڵێ، وە ئەوەی هەقیش نەڵێ لەسەر زمانی قەرزار بۆتەوە، وەك چۆن ئەوەی هەق نەبیستێ، لەسەر گوێی قەرزار دەبێتەوە، وە ئەوەی لە هەق تێنەگات لەسەر عەقڵی قەرزار بۆتەوەو، بوونو نەبوونی ئەو ئەندامانەی وەك یەك وایە، مادام هەقیان پێ نەبیستێو نەبینێو قبووڵ نەکاتو فەهم نەکات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکەی کە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە: ﴿عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ أَبَا جَهْلٍ قَالَ لِلنَّبِيِّ: إِنَّا لا نُكَذِّبُكَ، وَلَكِنْ نُكَذِّبُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾﴾[1]، واتە: عەلی خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو جەهل بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئێمە تۆ بە درۆ دانانێین، بەڵکو ئەوەی هێناوتە بە درۆی دادەنێین!

ئەبو جەهل بۆخۆی زانیویەتی کوڕی دێشێ، زانیویەتی موحەممەد ﷺ ڕاست دەڵێو ئەوەی هێناویشیەتی ڕاستە، بەڵام بۆچی دەڵێ: بەڕاستی دانانێین؟ چونکە ئەگەر بەڕاستی دابنێ، ئەو بەزمو بازاڕەی کە بۆخۆیان دروستیان کردوە، لێیان تێکدەچێ.

---

١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٦٤)، والحاكم برقم: (٣٢٣٠) وصحَّحَهُ.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکــان

وەك پێشتـر ئاماژەمـان پێـدا : سـوورگەی سـەرەکی ئـەم حـەوت ئایەتـە موبارەکە بریتیـە لـە دڵـدانەوەی پێغـەمبەر ﷺ، هـەروەك زۆرجـار گوتوومانـە: ئـەم سـوورەتە هـەمووی باسی یەکتایی خوایە، باسی تەنیا خواپەرستییە، باسی خـوا بـە یەکگرتنە، باسـی ئەوەیـە کە دەبـێ تەنیا خـوا بەندایەتیـی بۆ بکرێو تـەنیا خـوا بپەرسـترێ، بـە مانـای فراوانـی پەرستن.

ئنجا زۆرجاری دیکەش گوتوومانـە: پەرستنی خـوای بێهـاوتا ئەوەیەکە: ئەوپـەڕی ملکـەچییی، لەگـەڵ ئەوپـەڕی خۆشـویستن، لەگـەڵ ئەوپـەڕی بـە گـەورە گرتـن، لەگـەڵ ئەوپەڕی لێتـرسان، لەگەڵ ئەوپـەڕی پشت پێبـەستن، لەگـەڵ ئەوپـەڕی شـەرمو سـامو ڕێـز نوانـدن، تەنیا بۆ خـوا بـێ، ڕاسـتە شـتی دیکـەت خۆشـدەوێ، بـەڵام هیـچ کـەسو هیچ شـتێکت بەقـەد خوا خۆشـنەوێو، ئەو ترسـەی بەرانبەر بـە خـوا هەتـە، بەرانبـەر هیچ کـەس نـەتـبێ، جـاری وایـە پشـت بـە هـەنـدێ شـت دەبەسـتی، بـەڵام ئەوپـەڕی پشـت پێ بەسـتنت، بە خوا بـێ.

کـەواتە: دەبـێ خـوا لـە ژیـانی تـۆدا، لـە عەقـڵو دڵـی تـۆدا: لـە هـەموو شـتێكو لـە هەموو کەسێك بەرزتـرو بـەڕێزترو، شـیرینتـرو، خۆشـەویستـتـرو، شـەرم لـێکـراوترو، سـام لـێکراوتـرو مل بۆکەچکـراوتـر بێ، ئەوجار مانای وایـە کە خـوات پەرستوە.

جا خـوای پەروەردگـار بـە پێغـەمبـەری خاتـەم دەفـەرموێ: ﴿ قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَ ﴾، ئـەی موحەممــەد! دەزانیــن ئــەوەی ئــەوان دەیڵــێن: تــۆ دڵــتەنگو نارەحـەت دەکـات، بەشـەر بەشـەرە دڵی خوێنو گۆشــتە، بـە قسـەیەکی خـۆش دڵـی خـۆش دەبـێ، بە قسـەیەکی ناخۆش دڵـی نـاخۆش دەبـێ، بـا ئـەو کەسـە پێغـەمبەریش بێ، ﴿ فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴾، بەڵام دڵنیـابە کە ئەوان تۆ بە درۆ دانـانێن، دەزانـن تـۆ ڕاسـتگـۆی، بـەڵام ستەمکاران ــ ئـەو هاوبـەش بـۆ

خوادانەرانەن کە نکوولّیی لە ئایەتەکانی خوا دەکەن ـ دەزانن ڕاستە لە دڵیاندا، بەڵام دانی پێداناهێنن، پێی لێ نانێن، ئەوە (جَحْد)ە.

خوای بە بەزەیی بەم شێوەیە دڵی پێغەمبەری خۆشەویستی داوەتەوە، کە ئەو کافرانەی پێت دەڵێن: موحەممەد جادووگەرەو، پێت دەڵێن: فاڵچیی‌و کاهینەو، پێت دەڵێن: شاعیرەو، قورئانی بۆخۆی هەڵبەستوە، ڕاست ناکەن لەگەڵ خۆیاندا، قەناعەتیان وانیە، دەزانن تۆ ڕاستگۆی.

ئنجا بۆ زانیارییتان ! ئەگەر مرۆڤ ڕاستگۆ بوو، لە هەموو شتێك لەلای قورستر ئەوەیە ڕاستگۆییەکەی بخرێتە ژێر پرسیارەوەو بە درۆ دابنرێ، ئەوەی زۆر لەسەر دڵ قورسە، وەك چۆن ئینسان ئەگەر پاك‌و عەفیف بوو، لە هەموو شتێك ناخۆشتر ئەوەیە کە پێچەوانەی عیففەت‌و پاکیی بدرێتە پاڵ، وە ئینسان ئەگەر ئازا بوو، زۆر ناخۆشە ترسنۆکیی بدرێتە پاڵ، وە ئینسان ئەگەر بەخشندە بوو، زۆر ناخۆشە چرووکیی بدرێتە پاڵ، بەڵام کەسێك کە بۆخۆی ترسنۆك بێ، یان چرووك بێ، یان دەستپاك نەبێ، یان درۆزن بێ زۆر لە دڵی قورس نایەت، ئەگەر بڵێن: ترسنۆکی، یان چرووکی، یان دزی، یان درۆزنی، چونکە سیفەتێکیان گوتوە، کە هەست دەکات تێیدا هەیە، بەڵام ئینسان سیفەتێکی بدرێتە پاڵ، کە پێچەوانەکەی هەبێ، زۆر پێی ناخۆشە، ئنجا دیارە پێغەمبەر ﷺ زۆر لەسەر دڵی ناخۆش بووەو زۆر نارەحەت بووە، بۆیە خوای پەروەردگار ئاوا دڵی دەداتەوە.

دوایی بە بارێکی دیکەدا دڵی دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ﴾، وە بێگومان لەپێش تۆشدا پێغەمبەرانێکی زۆر بە درۆدانران، هەندێك لە تەفسیرە کوردییەکان نووسیویانە: بە درۆخرانەوە! کە ئەمە هەڵەیە، چونکە بە درۆ خستنەوە، ئەوەیە کە درۆزن بێ‌و درۆیەکەی بشارێتەوە، دوایی درۆیەکەی لێ ئاشکرا بێ، لە زمانی کوردییدا (تکذیب) یانی: بە درۆدانان، ئەوەیە کە کەسێك ڕاستگۆبێ‌و بە درۆ دابنرێ، بەڵام بە درۆخستنەوە، ئەوەیە کە درۆی کردبێ‌و درۆیەکەی لێ ئاشکرابێ، ئەو هەڵەیە لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا هەیە، بۆیە باسم کرد، ﴿ فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ ﴾، بەڵام ئەوان خۆڕاگر بوون لەسەر ئەوەی کە بە درۆ دانران‌و، لەسەر ئەوەی کە ئازاردران، نەك هەر بە درۆدانران،

بەڵكو ئازاریش دران، جنێویان پێدرا، ناڕەحەت كران، دەركران، بەڵام خۆڕاگربوونو پاشەكشەیان نەكرد، ﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمۡ نَصۡرُنَا ﴾، هەتا سەرەنجام یارمەتی ئێمەیان بۆ هات، ئنجا ئایا یارمەتی خوا چۆن هاتوە؟ یانی: سەركەوتنو خەڵكەكە دوایی گەیشتنە قەناعەت، یاخود خوا بەڵایەكی ناردو، خەڵكەكە لە بەین چوونو، ئەو پێغەمبەرانە لەگەڵ ئەو خەڵكەی ئیمانیان پێ هێنابوون، دەرباز بوون، بۆ وێنە: گەلی پێغەمبەر نووح، تۆفان هات كافرەكان فەوتانو خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، بە سواری كەشتی دەرباز بوون، هەروەها هوود، خۆیو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێنابوو دەرباز بوونو، گەلی عاد لەنێو چوون، وە پێغەمبەر صالح، خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوونو ئیمانیان پێهێنا بوو، دەرباز بوونو گەلی سەموود لەنێو چوون، وە پێغەمبەر شوعەیب، خۆیو ئەوانەی ئیمانیان پێهێنابوو، دەرباز بوون، كە بۆ گەلی مەدیەنو ئەصحابولئەیكە نێردرا بوو، چونكە قورئان باسی هەردووكیان دەكات، وە هەردووكیان لەبەین چوون، وە پێغەمبەر لووط، خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوونو، ئیمانیان پێهێنا بوو، دەرباز بوون.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: ویستی خواو، بڕیاری خواو، یاسای خواو، ڕستەكانی خوا، كە دەیاننێرێ گۆڕانیان بەسەردا نایەتو، كەس ناتوانێ بیانگۆڕێ، لە زمانی عەرەبیی دا ئەم (لا)یە لێرەدا بۆ (نفـي الجنس)ە، یانی هیچ لادەرێك نیەو هیچ گۆڕەرێك نیە بۆ بڕیارەكانی خوا، بۆ وشەكانی خوا، بۆ ویستەكانی خوا، ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، وە بێگومان هەواڵی گرنگی ڕەوانەكراوان بۆ تۆ هاتوە، بەسەرهاتی پێغەمبەرانت بۆ گێڕدراوەتەوە، چونكە ئەم سوورەتی ئەنعامە، واپێدەچی لە ساڵی: دەیەم، یان یازدەیەمی پێغەمبەرایەتیی دا هاتبێتە خوار، یانی لەپێش ئەم سوورەتەدا، زۆر سوورەتی دیكە هاتوونە خوار، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، وە بێگومان لە هەواڵی پێغەمبەرانت بۆ هاتوە، (نبأ) واتە: هەواڵێكی گرنگ.

پاشان خوای پەروەردگار بە شێوەیەك پێغەمبەری خۆی دەدوێنێ، كە ڕەنگە ئێرە تاكە شوێنێك بێ لە هەموو قوڕئان دا، بەو شێوەیە پێغەمبەری خوا دوێنرابێ، دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ ﴾، وە ئەگەر پشت هەلكردنو لاملیو پشت تێكردنی ئەوانت لەسەر دڵ، گەورەو گران بوو، ئەگەر توانیت تونێلێك، كونێك لە بن زەوی بدۆزیەوە، یاخود پەیژەیەك بەرەو ئاسمان، (واتە: موعجیزەیەكیان لە زەوی بۆ دەربێنی، یان لە ئاسمان بۆیان دابەزێنی، ئەوەیان بۆ بكە؟!) دیارە وەڵامەكەی قرتێنراو (مَحْذُوف)ە، بەلام سیاق دەلالەتی لەسەر دەكات، واتە: ئەگەر توانیت، وابكە، بەلام ناتوانی وابكەی، ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای، لەسەر ڕێنماییو لەسەر ڕێی ڕاست كۆی دەكردنەوە، بەلام دیارە خوا نەیویستوە، ئنجا یەكێك لێرەدا بۆی هەیە بلێ: باشە خوا بۆچی نەیویستوە، كۆیان بكاتەوە لەسەر هیدایەت؟ ئەدی پێغەمبەری بۆ ئەوە نەناردوە هیدایەتیان بدات؟ ئەدی كتێبی بۆ ئەوە دانەبەزاندوە، ببێتە مایەی هیدایەت دانیان؟ دەبا كۆی كردبانەوە!!

لێرە نابێ لێتان تێكبچێ: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾، واتە: خوای بالادەست وەك ویستی تەشریعیی، ویستوویەتی لەسەر هیدایەت كۆببنەوە، وەك دیارە كە پێغەمبەری بۆ ناردوونو، كتێبو پەیامی بۆ ناردوون، بەلام وەك ویستی تەكوینیی نەیویستوە، بۆچی؟ چونكە ئەگەر وەك ویستی تەكوینیی وای لێكردبان، ئازادییەكەیانو ئیرادەكەیان زەوت دەبوو، بەلام خوا ویستوویەتی: ئازادانە ئیمان بێنن، نەك تۆبزییو زۆریان لێبكات، وەك لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾یونس، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، هەموو ئەوانەی كە لەسەر زەویین، ئیمانیان دەهێنا، {بەلام پەروەردگارت نەیویستوە زۆریان لێبكات}، ئنجا ئایا تۆ زۆریان لێدەكەیو ناچاریان دەكەی ئیمان بێنن؟

خوای باڵادەست نەیویستوە ناچاریان بكاتو ویستوویەتی ئازادیان بكات، كە ئازادیشی كردوون، هەندێكیان ئازادانە ئیمانیان هێناوە، وە هەندێك ئازادانە كافر بوون.

دوایی خوای پەروەردگار فەرمایشتێك بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، كە لە هیچ شوێنێكی دیكەی قورئاندا ئاوای پێ نەگوتراوە، دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾، لە نەفامان مەبە، واتە: ئەگەر بەدوای پێشنیارو داخوازییو بیانووگرتنەكانی كافران بكەوی، كە داوای موعجیزەت لێدەكەن، مانای وایە شتێكت كردوە لەگەڵ پێگەو پایەی تۆدا ناگونجێ، بەڵكو ئەوە هی نەفامانە، ئنجا لێرەدا ئەگەر وردبیەوە، دەبینی خوای پەروەردگار چەندە ڕێزی لە پێغەمبەرەكەی خۆی گرتوە، نەیفەمووە: (فَلا تَكُونَنَّ جَاهِلاً) واتە: نەفام مەبە، یان (فَلا تَجْهَل) واتە: نەفامیی مەكە، بەڵكو فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾، واتە: مەچووە ڕیزی نەفامانەوە، تۆ لە ڕیزی ئەواندا نی، پێگەو پایەی تۆ ڕێت لێدەگرێ كە بچیە ڕیزی نەفامانەوە.

پاشان هەر لەسەر ئەو مەسەلەیە بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَ ﴾، بێگومان تەنیا ئەوانە وەڵام دەدەنەوە، كە دەبیستن، ئنجا یەكێك بۆی هەیە بڵێ: خۆ ئەوانەش گوێیان هەبوو، ئەدی بۆچی نەیانبیستوە؟ دەڵێین: بەڵێ ڕاستە بگرە ئاژەڵیش گوێی هەیە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە بیستن، بیستنی پەسندكردنو وەرگرتنو قبوولْ كردنە، واتە: بێگومان تەنیا ئەوانەی كە هەق بە گوێیەكانیان دەبیستنو قبووڵی دەكەن، هەر ئەوانە وەڵام دەدەنەوە، بەڵام ئەوانە دیارە هەستی بیستنی خۆیان بۆ وەرگرتنی هەق، لە كار خستوە، بۆیە وەك ئەوە وایە كە نەبیستنو گوێیان نەبێ، چونكە ئینسان لە ئەنجامی گوناهو سەرپێچیی دا هەستەوەرەكانی لەدەست دەدات، عەقڵی ئیش ناكات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآ ١٧٩ ﴾ الأعراف، هەموو ئەو ئەندامو كۆئەندامانەی كە دەبێ هەقیان پێ تێبگاتو ببینێو ببیستێ،

لە کار دەکەون، دیارە دەنگەکان دەبیستن‌و، دیمەنەکان دەبینن‌و، عەقڵیشیان هەیە، بەڵام کە ئەو هەقەیان قبوولْ نەکردو، تێینەگەیشتن، وەك ئەوە وایە، ئەو هەستەوەرانەیان لەدەستدابێ، بۆیە دوایی دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمَوۡتَىٰ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ﴾، وە ئەوانەی مردوون، خوا زیندوویان دەکاتەوە، دواییش بۆ لای وی دەگێردرێنەوە، ئەوانەش مردووی مەعنەوییین، مردووی بەشی زیندوو خۆرن، زیندوو وەك جەستە، مردوو وەك ڕووح، کەسێك خواو خاوەنی خۆی نەناسێت‌و، نەیپەرستێ‌و بەندایەتیی بۆ نەکات، وە نەزانێ لە کوێوە هێناویەتی‌و؟ بۆچی هێناویەتی‌و؟ دەبێ چی بکات؟ دەیباتەوە کوێ؟ دەبێ چۆن بژیەت؟ ئایا ئەو جۆرە کەسە، چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ ماددەیەکی بێ ژیان، لەگەڵ ئاژەڵێك دا؟ بۆیە خوای زاناو شارەزا لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ١٧٩﴾ الأعراف، واتە: زۆرێك لە ئینس‌و جندمان بۆ دۆزەخ ئامادەکردوون، کە دڵیان هەیە پێی تێناگەن، چاویان هەیە پێی نابینن، گوێیان هەیە پێی نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن، بەڵکو گومڕاترن، ئەوانە بێئاگان.

سبحان الله ! ئایینی ئیسلام زۆر گرنگی بە عەقڵ‌و هۆشیاریی دەدات، ئینسان کە عەقڵی خۆی بەکارنەهێنا، دەکەوێتە بێئاگایی، کە کەوتە حاڵەتی بێئاگایی، جیاوازیی نیە لەگەڵ ئاژەڵ دا، بەڵکو لە ئاژەڵ خراپترە، بۆچی لە ئاژەڵ خراپترە؟ چونکە ئاژەڵ ناتوانێت ئاژەڵ نەبێ، گا هەر گایە، مەڕو بزن، هەر مەڕو بزنن، گورگ‌و چەقەڵ، هەر گورگ‌و چەقەڵن، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ مرۆڤ بێ‌و ئاژەڵ نەبێ، دەتوانێ دڕندە نەبێ، بۆیە مرۆڤ کاتێك خۆی دەباتە ڕیزی ئاژەڵ، لەوەدا کە هەر وەك ئەوان ژیانێکی ماددیی، جەستەیی دەگوزەرێنێ، دوور لە لایەنی مەعنەوییی‌و عەقڵیی‌و هۆشیاریی‌و، حیساب بۆ مافی خوا کردن‌و قیامەت‌و ... هتد، بۆیە کاتێك مرۆڤ ژیانێکی ئاژەڵانە بەڕێ دەکات، لەوان خراپترە، چونکە ئەو دەیتوانی ئاژەڵ نەبێ، بەڵام ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ، ئاژەڵ ناچاریی یەو خوا کردوویەتی بە

ئـاژەڵ، بـەڵام ئینسـانێك بـە ویسـتی خـۆی خـۆی بکـاتە ئـاژەڵ، بێگـومان لـە ئـاژەڵ خراپـترە، وەك خـوای کاربەجـێ لـە شـوێنێکی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿... وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾﴾ محمـد، واتـە: وە ئەوانـەی بێبـڕوان، ڕادەبوێـرنو دەخـۆن، وەك چـۆن ئـاژەڵ دەخـوات، وە ئاگـر سـەرەنجامیانە.

ئنجـا لێـرەدا دەفـەرموێ: ﴿وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾، وە مـردووەکان خـوا زینـدوویان دەکاتـەوە، ئەوانـەی کـە لـە ڕووی مەعنەوییـەوە مـردوون، دوایـی خـوا زینـدوویان دەکاتەوە، پاشـانیش بۆ لای وی دەگێڕدرێنـەوە.

ئنجا هەر لەسەر بیـانووگرتنی کافرەکـان بەردەوام دەبـێ، دەفـەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، وە گوتیـان: دەبووایـە، {ئـەم (لـولا)یـە، (لـولا)ی هانـدان (تحضـیص)ی پێدەڵـێن، بریـا وابووایـە، دەبووایـە وابووایـە}، نیشـانەیەکی لەلایـەن پەروەردگاریەوە دابەزێنرابەیە سەر، مەبەستیان لە نیشانە: بەڵگەو موعجیـزەیە، واتـە: موعجیـزەی وەك پێغـەمبەرانی پێشـوو، بـەڵام خـوا بـۆ وەڵامـدانەوەیـان؟ دەفـەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بلـێ: بێگومـان خـوا توانـادارە لەسـەر ئەوە کە نیشـانەیەك، بەڵگەیەك بنێرێتە خـوار، بـەڵام زۆربـەیان نازانــن، یـانی چـی؟ واتـە: ئەگـەر ئەهلـی زانیـاریی بـن، ئـەوە قوڕئـان بەڵگـەیە، بـەڵام ئەوانـە خـاوەنـی نەزانینــن، خـوای زانـاو توانـا بـۆ ئەهلـی عیلـمو ئەوانـەی عەقـڵی خۆیـان بـەکاردێننو زانسـت دەیانجووڵێنــێ، ئـەم قوڕئانـەی نـاردوە، ئـەم قوڕئانـە موعجیـزەیەکـی ئەدەبیـی، زانسـتیی، زمانـەوانیی و... هتـدی، گشـتگیـرە[1]، لـە هـەموو ڕوویێکـەوە، بۆیـە ئـەوەی ئەهلـی عیلـم بـێو بـەدوای بەڵگەدا بگـەڕێ، ئـەوە قوڕئـان، بـەڵام ئەوانـە نازانـن، ئەمـە مانـایەکی.

---

١) لەبارەی بەڵگەو موعجیـزەیەکـی گشـتگیـربوونی قوڕئـانەوە دەتـوانی سـەرنجـی بەرگـی سـێیەمی کـتێبـی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) بـدەی.

مانایەكی دیكەشی ئەوەیە كە: خوا دەتوانیَ موعجیزەی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بنێریَ، بەڵام زۆربەیان نازانن، كە ئەگەر موعجیزەی وەك پێغەمبەرانی دیكە بنێریَو ئەوانیش ئیمانی پیَ نەهێنن، لەبەینیان دەبات، وەك خوای توانادار حوشترەكەی بۆ پێغەمبەر صاڵح نارد، لە شاخێك هاتە دەر، بەڵام دوایی پێغەمبەر صاڵحیان بە درۆ داناو حوشترەكەشیان سەربڕی، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الشمس)دا باسی دەكات، دەفەرمویَ:

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: بەدرۆیان داناو سەریان بڕی، پەروەردگاریشیان بەهۆی تاوانیانەوە، بوومەلەرزەی ناردنەسەرو وڵاتەكەیانی تەخت كرد.

هەروەها پێغەمبەرەكانی دیكەش كە خوای دادگەر گەلەكانیانی لەنێو بردوون، دوای ئەوە بووە كە موعجیزەی بەرهەستو بەرجەستەیان بۆ هاتووە، بە درۆیان داناوەو ئیمانیان پیَ نەهێناوە، ئیدی شایستەی ئەوەبوون، كە خوا دادگەر لە بەینیان ببات.

ئنجا خوای زاناو شارەزا سەرنجیان ڕادەكێشیَ بۆ شتێكی دیكەو، دەفەرمویَ:

﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَـٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ﴾، وە هیچ زیندەوەرێك لەسەر زەوی نیە، وە هیچ باڵندەیەك بە دوو باڵەكانی نافڕیَ، مەگەر ئەوانیش كۆمەڵانێكن وەك ئێوە.

لێرەدا خوای زانا پێیان بفەرمویَ: فەرموون تەماشای كتێبی بوونەوەر بكەن، نیشانەكانی گەورەییو پەروەردگارێتیی خوا، زۆر جوان دیارن، بەتایبەت زیندەوەرانێك كە لەسەر زەویین، وە باڵندەو پەرندانێك كە دەفڕن، ئەوانە هەموویان وەك ئێوە كۆمەڵ كۆمەڵن، ﴿ مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَـٰبِ مِن شَىْءٍ ﴾، لە كتێبدا هیچ شتێكمان بە زایە نەداوە، واتە: لەم قورئانەدا هەرچی ژیانی ئینسان پێویستی پێیەتی، باسمان كردوە، یاخود (كتاب) مەبەست پێی (لوح المحفوظ)ە، كە زانایان دەڵێن: زانیاریی بیَسنووری خوا لەویَ دا تۆماركراوە، لەوێدا هیچ شتێكمان فەرامۆش نەكردوە، ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾، دوایی هەر بۆ لای پەروەردگاریان

کۆدەکرێنەوە، واتە: ئەو زیندەوەرو درندەو ئاژەڵو پەلەوەرانە، هەموویان بەرەو لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە، ئنجا ئایا دوایی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ، یان ناکرێ؟ زۆربەی زانایان دەڵێن: لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: بەرەو لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە، کاتی تێکچوونی دنیایە، وە هەندێکیش دەڵێن: لە قیامەتێ کۆدەکرێنەوە، بەلام لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ناکات، دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا تیشکی زیاتری دەخەینەسەر.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا صُمٌّ وَبُكۡمٌ فِي ٱلظُّلُمَـٰتِ ﴾، وە ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە ناهێنن، کەڕن، لاڵن، لە تاریکاییەکاندان، ﴿ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، هەر کەسێك خوا بیەوێ (گومڕای بکات) گومڕای دەکات، وە هەر کەسێکیشی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ. بەلام بە دڵنیایی خوا لەگۆترە، نە کەس گومڕا دەکاتو، نە کەسیش دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٢٧ ﴾ إبراهيم، خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، کەواتە: خوا لەخۆڕا خەڵك گومڕا ناکات، ئەوانە گومڕا دەکات کە ستەم دەکەن، وە هەمیشە ویستی خراپەو شەڕیان هەیە، نایانەوێ بەرەو خوا بڕۆن، ئنجا وەك خۆیان دەیانەوێ، خوای دادگەر ئاوا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، ئەگەرنا ئەگەر بیانەوێ بەرەو خوا بچن، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ۝٢٧ ﴾ الرعد، ئەوەی بەرەو خوا بگەڕێتەوە، خوا ڕێنمایی دەکات، ئەوەی بەرەو خوا بجووڵێ، خوا دەستی دەگرێ، ئەوەی پشتیش لە خوا بکات، خوای پەروەردگار ئیهمالی دەکات، ئەوەش نیشانەی دادگەرییو کاربەجێی خوایە، چونکە ئەگەر وا نەکاتو بەتۆبزیی بیانگێڕێتەوە، مانای وایە ئەو ویستە ئازادانەی کە پێی تاقی دەکرێنەوە، وە پێی بوون بە مرۆڤ ، لێیان زەوت دەکات، خوای دادگەریش ویستوویەتی مرۆڤ مرۆڤ بێ، ویستی ئازادانەی هەبێ، ڕێی ڕاستی خوا بگرێ، یان پشت لە پەروەردگاری بکات، سەرپشك بێ.

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَۖ فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٣٣ ﴾، وشەی (قد) لە زمانی عەرەبیدا بەزۆری بۆ جەختكردنەوەو دڵنیاكردنەوەیە، واتە: بێگومان، بە دڵنیایی، بۆ وێنە: (قَد جَاء) واتە: بە تەئكید هات، ﴿ قَدۡ نَعۡلَمُ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە دەزانین، ئەمە بۆ چییە؟ لێرەدا ئەمە بۆ وەڵامدانەوەی پێغەمبەری خوایە، ﴿ قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ﴾، تۆ بزانە! پەروەردگارێك هەیە ئاگای لە دڵو دەروونو هەستو نەستی تۆ هەیە، دەزانێ كە تۆ بەهۆی بە درۆدانانی وانەوە، دڵ ناڕەحەت بووی، خوای پەروەردگار ئاگای لە هەستو نەستە شێردراوەكانی مرۆڤ هەیە، جاری وایە ئینسان بە دڵ شتێك لە خوا دەخوازێ: تۆ بڵێی خوای پەروەردگار ئەوەم بۆ بكات، یان پێم ببەخشێ، بێئەوەی هیچ قسەیەكیش بكات، خوای پەنهانزان بۆی دەكات، بۆچی؟ چونكە نێو دڵت دەخوێنێتەوە.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ﴾، ئاواش خوێندراوەتەوە: (إِنَّهُ لَيُحْزِنُكَ)، (أَحْزَنَ يُحْزِنُ، حَزَنَ يَحْزِنُ) هەردووك خوێندنەوە (قراءة) كە هاتوون، (حَزَنَهُ وأَحْزَنَهُ) واتە: دڵی توند كرد، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەش دا كە باشترین كەس بووەو، گەورەی پێغەمبەران بووەو، چاكترین بەندەی خوا بووە، بەڵام بەشەر، بەشەرە، وە دڵ: گۆشتو خوێنە، دیارە مرۆڤ بە قسەی ناخۆش دڵی ناخۆش دەبێ، وە بە قسەی خۆشیش دڵی خۆش دەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا پێغەمبەری خوا خۆی زۆر بە سەرەوە نەبردوە، ئەگەرنا هیچ كەس نیە، قسەی ناخۆشی پێ ناخۆش نەبێ، وە بە قسەی خۆشیش دڵی خۆش نەبێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ ﴾، کە بەم شێوەش خوێنراوەتەوە: (**لا يُكْذِبُونَكَ**)، لە زمانی عەرەبی دەڵێ: (كَذَّبَهُ: أي: قَالَ لَهُ: أَنْتَ كَاذِبٌ، وَأَكْذَبَهُ أَي قَالَ لَهُ إِنَّ: مَا تَقُولُهُ كَذِبٌ)، (كَذَّبَهُ) یانی گوتی: تۆ درۆ دەکەی، بەڵام (أَكْذَبَهُ) واتە: گوتی: ئەوەی دەیڵێی درۆیە، تۆ درۆزن نی، بەڵام قسەکەت درۆیە، هەردوو خوێندنەوەکان هاتوون، هەندێکیش گوتوویانە: هەردوو وشەی (كَذَّبَهُ، أَكْذَبَهُ) یەك مانایان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کەسی بەرانبەرت بە درۆ دابنێی، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ ﴾، بە تەئکید ئەوان تۆ بە درۆزن دانانێن، وە ئەوەی دەشیڵێی، بە درۆی دانانێن، بە پێی خوێندنەوەی دووەم، ئەدی مەسەلەکە چییە؟ دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴾، بەڵام ستەمکارەکان، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، نکووڵیی لە ئایەتەکانی خوا دەکەن، چونکە دەڵێ: (الجَحْد: إِثْبَاتُ مَا نُفِيَ، وَ نَفْيُ ما ثَبَتَ) شتێك کە لە دڵتدا نیە، بیڵێی، وە شتێك کە لە دڵت دایە، نەیڵێی، وەك خوا لە سوورەتی (النمل)دا دەربارەی فیرعەونو داروەدەستەکەی کە دژایەتیی مووسایان کردوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەمووە موعجیزە گەورانەی هەبوون، خوا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ ﴾، واتە: نکووڵییان لێکرد، هەرچەندە لە دەروونیشیان دا دڵنیابوونو دەیانزانی {کە مووسا ﷵ پێغەمبەری خوایەو} موعجیزەکانی هەموو ڕاستن.

لەوبارەوە (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆی، لە درێژەی بەسەرهاتێکدا، دەڵێ: {فَالتَقَى الأَخْنَس وَأَبُو جَهْل، فَخَلاَ الأَخْنَس بأَبِي جَهْل، فَقَالَ: يَا أَبَا الحكَم، أَخْبرنِي عَن مُحَمَّدٍ، أَصَادِقٌ هُوَ أَمْ كَاذِبٌ؟ فَإِنَّهُ لَيْسَ هَهُنَا مِنْ قُرَيش أَحَد غَيْرِي وَغَيرك يَسْمَع كَلامَنَا! فقَالَ أَبُو جَهْل: وَيْحَكَ، وَاللهِ إِنَّ مُحَمَّداً لَصَادِقٌ، وَمَا كَذَبَ مُحَمَّد قَطّ، وَلَكِن إِذَا ذَهَبَ بَنُو قُصَيٍّ باللّواء والحجَابَة والسِّقَايَة والنُّبوة، فَمَاذَا يَكُونُ لِسَائِر قُرَيش؟ فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ

﴿بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴾}[1]، واتـه: ئەخنــەس لەگـەڵ ئـەبو جەهــل پێکگــەیشتن، (ئـەبو جەهـل کونیەکـەی أبـو الحکم بـووە) ئەخنـەس ئـەبو جەهلـی جیـاکردەوەو گـوتی: ئەی ئەبولحەکەم ! دەربارەی موحەممەد هـەواڵم پێبـدە، ئایا ڕاستگۆیــە یـان درۆزنــە؟ چونکە لە قوڕەیش جگــە لـە خــۆمو خــۆت کەســی دی لـێنیـە قسەمان ببیستـێ، ئەبو جەهـل گوتـی: بێقەزابی، سوێند بـە خـوا موحەممـەد ڕاسـتگۆیە، وە هەرگیــز موحەممــەد درۆی نەکـــردوە، بـەڵام ئەگـەر بـەنو قوصــەی (ئەسڵــی بنـو هاشـم کە عەشـیـرەتی پێغـەمبـەرە ﷺ) ئـاڵای جـەنگی عایـد بـێو، پەردەکـردن بۆ کەعبــەی عــاید بــێو، ئـاوپێدانــی حاجیــانــی عــاید بــێ، ئنجا پێغـەمبەرایەتییش هەر لــەوان بـێ ئــەدی هــۆزی قوڕەیش چــی بۆ دەمێـنێـتەوە؟

دەڵــێن: دوای ئــەوەی یــەکێك لــە شــوێنکەوتووانی موســەیلەمەی درۆزن هــەواڵی پێغــەمبەری پێـدەگاتو دەزانــێ ڕاستگۆیــە، دەڵــێ: (كَذَّاب رَبيعة أَحَبُّ إِلَيَّ مِن صَادِقِ مُضَر) واتە: درۆزنـی ڕەبیعـەم (کە لە عەشـیـرەتەکـەی خۆمـە) پـێ چاکتــرە لە ڕاسـتگۆی موضــەڕ، عــەڕەب دوو هۆزی سـەرەکیـی بـووە: (رَبيعة و مُضَر).

ئنجـا ئێســتاش هـەر وایـە، ئـەو حیزبـە عەلـمانییانە، تەماشـا بکــەن لـە هــەموو دنیـادا بابـای عەلـمانیی دەزانــێ حیـزبەکـەی گەندەڵە، دزیـی دەکـات، سـتەم دەکـات، هەرچی خراپەیە دەیکات، بـەڵام هـەر لەگـەڵیشـیەتی، بۆچـی؟ چونکـە بەرژەوەنـدیی دنیـایی هەیـەو بەستراوەتەوە بە کۆمەڵێك شتەوە، هەرچەندە دەزانێ هەق نیە، بەڵێ جـاری وایە ئەگەر مـرۆڤ مسوڵمانیش بـێ، بەڵام ئیمانــی تـەواو نەبــێ، تووشـی ئـەو حاڵەتانە دەبـێ، بۆ وێنــە:

ئەو سوپایەی کە لە کـەربـەلا دەوری حوسـێنی کوڕی عەلـییان دابوو، خــوا لێیـان ڕازی بـێ، حوسـێن پێـی گـوتن: مـن لەســەر نامـەی خۆتـان هـاتووم، کـە ئێـوە شەسـت هەزار ئیمزاتـان بـۆ کۆکــردوومەوەو داواتــان کـردوە بـێم، گوتتـان: ئێمـە بڕوامـان بـە یەزیـدی کـوڕی موعـاویــە نیــە، بەکەڵــکی خەلــیفایەتیی نایــەت، وەرە بەیعــەتت پێدەدەیـن، ئـەدی بۆچـی ئێسـتا دەورتان داوم؟ ئەوانیش هـیچ وەڵامیـان نـەبوو، بـۆی دەگریان دەشیان کوشت! ئنجا (عباس محمود العقاد) قسـەیەکی زۆر جـوان دەکـات،

---

١) جامع البيان برقم: (١٣١٩).

دەڵـێ: (كـانـت سـیُوفهُم مَـعَ یَزِیـد وَقُلُوبهُم مَـعَ حُسَیْن) شـمشـێرەكانیان لەگـەڵ یەزیـد بـوون، دڵیشـیان لەگـەڵ حوسـێن بـوو، منـیش دەڵـێم: (فَغَلَبَـتْ سـیوفهُم قُلُوبَهُم)، شـمشـێرەكانیان بەسەر دڵـیاندا زاڵ بـوون !

زۆر كـەس وایـە، زۆر كـەس لەسـەر مەزهـەبی سـوپای یەزیـدە، دەزانـێ ئیسـلام هەقـە، مسـوڵمانان لەسـەر هـەقن، كەچـی هـەر بـەدوای سـەركردە گەندەڵەكـەی دەكـەوێ، بۆچـی؟ چونكـە بەرژەوەندەییەكـەی لەگـەڵی دایـە، وەك ئـەبو جـەهلو كابرای شوێنكەوتووی موسـەیلەمـەی درۆزن.

**مەسـەلـەی دووەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِي الْمُرْسَلِينَ ﴾، چەند هەڵوەستەیەك لەبەردەم ئەم ئایـەتـە موبارەكەدا دەكـەین:

١) كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا ... ﴾، بێگومان لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێك بە درۆ دانران، بەڵام خۆیان ڕاگرتو لەسـەر بە درۆ زانـرانو بە درۆزن دانران، تاكـو یارمەتیمانیان بۆ هـات، یانـی: تـۆش ئـارام بگـرە، یارمەتییت بـۆ دێ، ئنجـا ئایـا چـۆن یارمـەتی خـوا بـۆ پێغـەمبەران هـات؟ دوای ئـەوەی خـوا مـوعجیزەی بەرهەسـتو زەقو ئاشـكرای بـۆ پێغـەمبەران نـاردن، قەومـەكانیان ئیمانیـان پێنەهێنـا، خـوای دادگـەر قەومـەكانیانی لـە بـەین بـردن، پێغەمبەرەكەو ئەوانەی ئیمانیان هـێنابوو، ڕزگـار بـوون، ئـەدی چۆن یارمـەتی بـۆ پێغـەمبـەری خاتـەم هـات؟ خـوای كاربەجـێ موعجیـزەیەكـی بەرهەسـتو مادديـی بـۆ پێغـەمبەری خاتـەم نـە نـارد، بەڵـكو موعجیـزەیەكـی فیكـریی، زانسـتیی، ئەدەبـیی بـۆ نـارد، كـە بـەردەوام بـێ، ئـەویش ئـەم قورئانەیـە كـە ئێسـتا لەبـەردەسـتی ئێمـەیـە، هـەتا دوایـی خـوا یارمـەتی بـۆ نـارد كـە خەڵـكـێكی زۆر ئیمانیـان پـێ هێنـا، وە سـەرەنجام ئیمانـداران سـەركەوتن بەسـەر بێئیمـانـان دا، كەواتـە: ئـەوان خۆڕاگـر بـوونو تـۆش خـۆڕاگربـە، یانی: یارمـەتی خـوا بـۆ وان هاتـوە، بـۆ ئێـوەش دێ، هـەر واش بـوو، ئەمـە وەك ئـەوە وایـە كـە لـە سـووڕەتی

(الأحقاف)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: خۆڕاگربە وەك چۆن خاوەن ئیرادە پتەوەكان لە پێغەمبەران خۆڕاگر بوون، وە پەلەیان لێ مەكە (واتە لە سزادانیان).

٢) كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، پێشتر ئاماژەمان پێدا، (كَلِمَاتُ الله) واتە: بڕیارەكانی خوا، یاساكانی خوا، ویستی خوا، هیچ كەس ناتوانێ لایانبداتو بیانگۆڕێ دڵنیابە خوای پەروەردگار چی بۆ پێغەمبەرانی پێشێ كردوە، ئەوەش بۆ تۆ دەكات، وە هەر واش بوو.

٣) كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِي ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، وە بێگومان لە هەواڵی گرنگی پێغەمبەران بۆ تۆ هاتوە، لە زۆر شوێنی قورئان دا خوای بەرز باسی بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ پێغەمبەری خاتەم دەكات، بۆ وێنە:

أ / لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ ﴿١٢٠﴾ ﴾، واتە: بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ تۆ دەخوێنینەوە تاكو دڵتی پێ بچەسپێنین.

ب / هەروەها لە سووڕەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئێمە بەهۆی ئەم قورئانەوە كە بۆتی دەنێرین، باشترین بەسەرهاتت بەسەردا دەخوێنینەوە، وە باشترین گێڕدراوەت بۆ دەگێڕینەوە، با پێشتریش لە بێئاگایان بوویی، وە نەتزانیبێ.

پێغەمبەری خوا نەخوێندەوار بووەو نەشارەزا بووە، لە كتێبە پێشووەكان، بەڵام خوای زاناو شارەزا شارەزای كردووەو هەموو شتی فێر كردوە، كەواتە: بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆ تۆ گێڕدراوەتەوەی پەندی لێ وەربگرە، وە ئەوان چییان كردوە، تۆش وا بكە، خوای بەخشەر چی بۆ وان كردوە، ئەوەش بۆ تۆ دەكات.

**مەسـەلەی سێیـەم:** کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، لـێرەدا خـوای سـبحانە وتعالـی ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات دەفەرموێ: ئەگەر پشـت هەڵکـردنو ڕوو وەرسووڕاندنی بێبڕوایەکانت، لەسەر دڵ قورسە، ئەگەر توانیـت تونێڵـێکیان لـە بـن زەوی بـۆ لـێبدەی، یـاخود پەیژەیـەکیان بـەرەو ئاسـمان بـۆ هەڵبەسـتی، کـە نیشـانەیەکیان، (واتـە: بەڵگەیـەك، موعجیزەیـەك ئـەوەی ئـەوان داوای دەکـەن) بـۆ بێنـی، (یـانی: ئەگـەر توانیـت وابکـەی، بیکـە) وە ئەگـەر خـوا ویستبای لەسـەر ڕێنمایـی کـۆی دەکردنـەوە، دەجـا تـۆ لـە نەفـامان مـەبـە، واتـە: وەختـێ خـوا نەیـەوێ بـە زۆر کۆیـان بکـاتەوە، زۆر سـووربوونی تـۆ لەسـەر هیدایەتـدرانیان، لەگەڵ ئەو یاسایەی خوادا تێکدەگیـرێ، چونکە خوای ﷻ نەیویستوە بە تۆبزیـیو بە زۆر ناچاریان بکات، ئیمان بێنـن، ویستوویەتی ئازادیـان بکـات.

کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ ﴾، (كَبُـرَ: شَـقّ، ثَقُـلَ) واتـە: بەزەحمەتـە قـورسو گرانـە، ئەگەر قـورسو گرانـە لەسـەر دڵت کـە ئـەوان پشـت هەڵبکـەنو پشـتت تـێ بکـەنو ڕوو وەچەرخێـنن، چـارت چـییە؟ یـان دەبـێ پشـوودرێـژ بیو خۆڕاگر بی، یان فەرموو: ئەگەر ئـەوەی داوای دەکەنو بیانووی پـێ دەگرن، کە بریتیە لـە هێنـانی موعجیـزەیـەكو بەڵگەیـەك، وەك هـی پێغـەمبەرانی پێشـوو، فەرموو: بزانە لە بن ئـەرزێ بۆیـان دەردێنـێ، یان لـە ئاسـمان بۆیـان دێنیـە خـوارێ، واتە: بۆت ناکرێ، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە.

هـەڵبەتە دەشـگونجێ ئەم ئایـەتە لێرەدا مەبەسـت پێـی مەدحـی پێغـەمبەر ﷺ بـێ، واتە: تۆ ئەوەنـدە سووری لەسەر ئەوەی ئەوانە ئیمـان بێـننو هیدایـەت بـدرێن، کە ئەگەر بۆت کرابایە، تونێڵێك بە بـن زەویـدا لێبـدەیو لـە بـن زەوی، بەڵـگەو نیشـانەیەکیان بۆ بێنـی، یاخود پەیژەیەکت دەستبکەوێو سەربکەوی لـە ئاسـمانێ

بەڵگەو نیشانەیەکیان بۆ بێنی، واتدەکرد، واتە: تۆ ئەوەندە سووری لەسەر هیدایەتدرانی ئەوانە، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (ئنجا کاکە! لە بن ئەرزێ بۆت دەربێنم، لە ئاسمانێ بۆت داباریێنم) یان دەڵێ: (ئاسمان دوورو زەوی سەخت)، کەواتە: وەك گوتم: لە لایەکەوە دەگونجێ ئەوە دڵدانەوە بێ بۆ پێغەمبەر ﷺ کە تۆ چی دەکەی، لە کاتێکدا کە خوا نەیویستوە ئەوانە بە زۆر هیدایەت وەربگرن، بەڵکو ویستوویەتی ئازادیان بکات، وە بە ئیرادەی ئازادانەی خۆشیان ئیمان ناهێنن، چارت چییە؟ ئایا لە بن ئەرزێ نیشانەیەکیان بۆ دێنی، یاخود لە ئاسمانێ بۆیان دادەبەزێنی؟ واتە: نابێ وابکەی، بەڵکو پشوودرێژو خۆڕاگر بە، چونکە ئەم قورئانە بەسە، ئەگەر بیانەوێ ئیمان بێننو هیدایەت بدرێن، ئەم قورئانە موعجیزەیەکی کافییە بۆیان، یاخود دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ ئەی پێغەمبەر! ﷺ تۆ ئەوەندە سووری لەسەر ئەوەی ئەوانە ئیمان بێننو هیدایەت بدرێن، کە ئەگەر بۆت کرابایە نیشانەیەك، یان بەڵگەیەك بێنی، دەتکرد، بەڵام بۆت ناکرێ .

## مانای : تەنیا بەدەست خوابوونی هیدایەتو جیاوازیی نێوان ئیرادەی تەشریعییو ئیرادەی تەکوینیی

خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمۡ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ﴾، ئەم مەسەلەیە لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١) لە سورەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦ ﴾، واتە: بێگومان تۆ ئەوەی کە خۆشتدەوێ، ڕێنمایی ناکەی، بەڵکو خوا هەر کەسێك کە بیەوێ ڕێنمایی دەکات، واتە: بە پێخۆشبوونی تۆ نیە، لە (صحيح مسلم)[1]دا هاتوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی ئیمان نەهێنانی (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خوار،

---

١) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَمِّهِ عِنْدَ الْمَوْتِ: ﴿قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾، فَأَبَى فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾ الآيَةَ}، صحيح مُسْلِمٌ: باب أَوَّلُ الإِيمَانِ قَوْلُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، رقم: (١٤٣).

کە زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی ئیمان بێنێ‌و، ئەویش ئیمانی نەهێنا، خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾، واتە: تۆ ناتوانی ڕێنمایی ئەو کەسە بکەی‌و بیخەیتە سەر ڕێگای ڕاست، کە خۆشت دەوێ، (کە مامتە)، بۆچی خۆشی دەویست؟ لەبەرئەوەی مامی پێغەمبەر ﷺ بوو، وەك نەسەبو خزمایەتیی، وە پاشان پارێزەرێکی باشی پێغەمبەر ﷺ بووو پشتیوانییەکی باشی لێکرد، ئەویش وەك چاکەدانەوەیەکی، پێی خۆشبوو لەسەر دەستی ئەو ئیمان بێنێ‌و هیدایەت بدرێ، سەرەنجام دەربازی بێ لە ئاگری دۆزەخ، ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴾، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ، هیدایەتی دەدات، واتە: هەر کەسێکی بوێ بە ویستی ئازادانەی خۆی هیدایەتی دەدات، وە ئەگەر ویستباشی بە ناچاریی هیدایەتی دەدان، بەڵام نەیویستوە، خوای دادگەر نەیویستوە خەڵك ناچار بکات لەسەر ئیمان هێنانیان‌و هیدایەت دانیان، ویستوویەتی خەڵك ئازاد بکات.

٢) هەروەها لە سوورەتی (یونس)یش دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، تێکڕای ئەو خەڵکەی کە لەسەر زەویین، هەموو ئیمانیان هێنابایە، ئیمانیان دەهێنا، ئایا تۆ خەڵك ناچار دەکەی لەسەر ئیمان هێنانیان، هەرچەندە پێشیان ناخۆشە؟ واتە: من ناچارم نەکردوون، هەرچەندە دەشتوانم، تۆ بە تەئکید ناشتوانی، واتە: دەرفەتی ناچارکردنت نیە، تۆ دەتوانی وا لە کەسێك بکەی لە ترسان بڵێ: مسوڵمانم، بەڵام ئەو کەسە نابێتە ئیماندار، بەڵکو دەبێتە مسوڵمانێکی ڕووکەشی مونافیق.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، تۆ لە نەفامان مەبە، واتە: ڕەفتاری وەك هی نەفامان لە خۆت مەوەشێنەوە، کەواتە: ئەمە نەفامیی‌و بێئاگاییە لە یاساکانی خوا، کە کەسێك خوا نەیویستوە بە زۆر ئیمانی پێ بێنێ، تۆش هەر سووربی لەسەر ئیمان هێنانی، لەگەڵ ئەوەش دا کە خوا نەیویستوە بە زۆر ئیمان بێنێ، بە ئیرادەی تەشریعیی خۆی ویستوویەتی،

بەڵام بە ئیرادەی تەکوینیی نەیویستوە، چونکە خوا سبحانە وتعالی دوو جۆرە ئیرادەی هەن:

١ - ئیرادەیەکی تەشریعیی.

٢ - ئیرادەیەکی تەکوینیی.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة، (ئەمە ئیرادەی تەشریعییە) واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و زەحمەتی بۆتان ناوێ، واتە: لە شەریعەتی خۆیدا یاساکانی ئاسان داناون، وە هەر کاتێك تێگیران، مۆڵەت هەیەو زەحمەتی بۆتان ناوێ.

ئەدی ئیرادەی تەکوینیی خوا، وەك چی ؟ وەك ئەوە کە خوا دەفەرموێ :

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾﴾ القصص، (ئەمە ئیرادەی تەکوینییە، ئیرادەی قەدەریی)، واتە: وە دەمانەوێ ئەوانەی لە زەوی دا چەوسێنراونەوە، دەسەڵاتیان بدەینێ، وە بیانکەینە حوکمڕان، کەواتە: خوای سبحانە وتعالی بە ئیرادەی تەکوینیی خۆی نەیویستوە ناچاریان بکات، لەبەرئەوەی ئەوە پێچەوانەی ئازادانە خوڵقێنرانی ئینسانە، مادام ئازادەو بۆ تاقی کردنەوە خوڵقاوە، دەبێ دەرفەتی پێ بدرێ، چۆن وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە، وە دەبێ دەرفەتی پێ بدرێ: ڕاست دەڕوات، چەوت دەڕوات، خراپ دەکات، چاك دەکات، وەك خوا لە سوورەتی (الإنسان)دا دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾، دوای ئەوەی باسی تاقیکردنەوەی ئینسان دەکات، دەفەرموێ: بەڕاستی ئێمە ئینسانمان لە نوتفەیەکی تێکەڵ دروستکرد، وە تاقیشی دەکەینەوە، وە وامانکردوە بیسەرو بینەر بێ، (واتە: هەستەوەرەکانمان پێداون، ڕێی خۆی پێ بزانێ و دەرك

بکـات)، وە بــەرەو ڕێـی ڕاسـت هیدایـەتمـان داوە، (یـانی: هیدایـەتی تەشـریعیی، ئەگەرنا خـوا هیـدایەتی تەکـوینیی کەسێك بدات گومـڕا نابـێ، بەڵـکو مەبەسـت پێی ئەوەیـە: شـەریعەتمان بـۆ نـاردووە ڕێمـان پێشـانداوە) یـان شـوکرانەبژێـرو سوپاسـگوزار دەبـێ، یـان سپڵـە دەبـێو گوێ نـاداتە هیـدایەتـی خـوا (دەرفـەتی هەردووکیـانی هەیـە).

٣) وە لــە سـوورەتـی (الكهـف)دا دەفــەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیـە کـێ حـەز دەکـات بـا ئیمـان بێنـێ، کـێش حـەز دەکـات بـا کـافر بـێ، (دەرفـەتی هەردووکیان هەیە).

هەڵبەتـە ئـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، هـەرچەنـدە بـە دڵنیـایـی خـوا ﷻ پێغـەمبەری خـوێ ﷺ لـە هـەموو کەسـێك زیـاتر خۆشـویسـتوە، بـەڵام ئەویشـی ئاگـادار کـردۆتـەوە، کـە نابـێ شـتێك بکـات لـە نەفـامان بـێ، هەڵبەتـە نەیفـەرمووە: (فَلا تَكُنْ جَاهِلاً) نەفـام مەبـە! یـان: (فَلا تَجْهَلْ) نەفامیـی مەکـە بەڵکـو فەرموویـەتی: ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، خـۆت ڕەگـەڵ نەفـامان مەخـە، واتـە: تـۆ نەفـام نـی، بـەڵام هەڵویسـتێكو ڕەفتـارێکت نەبـێ، بچیـە ڕیـزی نەفامـانەوە.

**مەسـەلەی چـوارەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾، (إِنَّمَا) لـە زمـانی عەرەبیـدا پێـی دەگـوترێ (أَدَاةُ الحَصْر والإِثبَات) ئـامرازی کـورت هـەڵهێنانو چەسپاندن، خـوا دەفـەرموێ: بێگومـان تـەنیا ئەوانـە وەڵام دەدەنـەوەو بـە دەنگـەوە دێـن، کـە دەبیسـتن، مردووەکـانیش خـوا زیندوویان دەکـاتەوە، پاشان دەگێڕدرێنەوە بۆ لای پەروەردگـاریان.

وشـەکـانی: (أَجَـابَ، اسْتَجَـابَ) هـەردووکیان یـەك مانایـان هەیـە، واتـە: وەڵامـی دایەوە، ئەدی جیاوازییان چییـە؟ لە زمانی عەرەبی دا هـەر کـات وشـەیەك پیتـەکانی

زیاتر بوون، ماناکەی بەهێزترە، بۆ وێنە: (سَمِعَ) واتە: بیستی، (اسْتَمَعَ) واتە: باش گوێی هەڵخست، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ﴾، (یجیب) واتە: وەڵام دەداتەوە، (یستجیب) مانای وەڵام دەداتەوەو قبووڵیشی دەکات، چونکە جاری وایە ئینسان وەڵامی شتێك دەداتەوە، بەڵام وەری ناگرێ، یەکێ بانگم دەکات دەڵێ: فلان کەس وەرە، دەڵێم: باشەو دەچم، بەڵام ئەو کارەی هەیەتی جێبەجێی ناکەم، ئەمە پێی دەگوترێ: (أجَاب) وەڵامی دایەوە، بەڵام ئەگەر بڵێی (استَجَاب، يَسْتَجِيب) یانی: وەڵام دەداتەوەو ئەو داوایەی پێی دەگوترێ، جێبەجێی دەکات.

ئنجا خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ﴾، بێگومان هەر ئەوانەی دەبیستن وەڵامی داواکارییەکەی تۆ دەدەنەوە، کە وەرگرتنی هیدایەتی خوایە، ئایا لێرەدا (يَسْمَعُونَ) مانای چییە ؟ دوو جۆرە بیستنمان هەن :

أ/ بیستنێك هەیە کە تۆ هەر دەنگەکە دەبیستی.

ب/ بیستنێکی دیکە هەیە کە تۆ قبووڵیشی دەکەی.

واتە: بیستنی بە عەقڵو گوێ هەیە، وە بیستنی بە دڵ هەیە، لەگەڵ ئەوەدا کە بە گوێ دەیبیستی، بە دڵیش پەسەندی دەکەی‌و قبووڵی دەکەی، لێرەدا مەبەست پێی (سِمَاع قَلْبٍ وَقبُول) بیستنی بە دڵو قبووڵ کردنە.

دەربارەی وشەی (موتی) کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾، بێگومان مەبەست پێی مردووانی مەعنەوییە بۆچی؟ چونکە ئەوانەی کە دەبیستن، دڵێکی زیندوویان هەیە، بەڵام ئەوانەی کە نابیستن، مردوون. کە بێگومان مەبەست مردنی جەستەیی نیە، بەڵکو مەبەست پێی کەسێکە دڵەکەی مردووبێ، ڕووحەکەی مردوو بێ، ئەوانە مەگەر خوای پەروەردگار لە قیامەتی زیندوویان بکاتەوە، ئەگەرنا ئەوانە بە مردنی مەعنەویی مردوون، ماوەتەوە بە جەستەش بمرن‌و بچنە ژێر زەوی،

بەڵام لە ڕووی ڕووحیی‌و مەعنەوییەوە مردوون، وەك بەشەرێك مردوون، تەنیا وەك كەلەش ماون‌و مردووی بەشی زیندووی خۆرن.

وە لە زمانی عەرەبیدا: وشەی (موتى) لەگەڵ (أموات) لەگەڵ (مَيّتون) لەگەڵ (مَيْتُون) هەموویان بە مانای مردووان دێن، تاكی ئەمانە چییە؟ تاكەكەیان (مَيْت، مَيِّت)ە، كە لە قورئاندا هاتوە: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾الزمر، وە خوێنراوەتەوەش ( إِنَّكَ مَيْتٌ وَإِنَّهُم مَيْتُون ) (مَيِّتون) كۆی (مَيّت)ە، وە (مَيْتون) كۆی (مَيْت)ە، هەمووشی بە مانای مردوویە.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، (كافرەكان، هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان) گوتیان: دەبووایە لە پەروەردگارییەوە نیشانەیەكی بۆ دابەزێنرابایە، مەبەستیان لە نیشانە یانی موعجیزەیەك، یان بەڵگەیەك، وەك ئەوەی بە پێغەمبەرانی پێشوو دراوە (صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ)، وەك لە سوورەتی (الأنبياء)دا خوای زانا دەفەرمویٚ: ﴿ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: با بەڵگەو نیشانەیەكمان بۆ بێنێ، وەك ئەوانەی پێشوو ڕەوانە كراون، بەڵگەی بەرهەست‌و زەقیان هەبووە.

بەڵام قورئان بەڵگەیەكی عەقڵیی‌و فیكریی‌و عیلمیی یە.

## حیكمەتی موعجیزەبوونی قورئان بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ

كە دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، ئایا وشەی (آیة) یانی چی؟

بە مانای بەڵگەو نیشانەو موعجیزە دێ، چونكە پێشتر باسمان كرد: ئایەت لە قورئاندا چەند واتایەكی هەن: بە مانای موعجیزە دێ، وە بە مانای ڕووداوێكی مێژوویی دێ، وە بە مانای دیاردەو دیمەنە سروشتییەكان دێ، كە خوا دروستی

کردوون، وە بە مانای ڕستەکانی قورئان دێ، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاقی ئایەتەکە، هەمووومان دەزانین مەبەستیان پێی موعجیزەیەکە، وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو، خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً ﴾، بڵێ: بێگومان خوا ﷻ تواناداره کە نیشانەیەك، موعجیزەیەکی ئاوا بنێرێتە خوار، ئەدی بۆچی وا ناکات؟ لەبەرئەوەی خوا کاربەجێیە، شتی بێجێ ناکات.

خوا ﷻ پڕ بە پێستی پێداویستی مرۆڤەکان مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکات، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، زۆربەیان نازانن مانای چی؟ تەماشای زۆر لە تەفسیرەکانم کرد، هی هەمووانم کۆکردۆتەوەو، دەگونجێ ئەم (بەڵام زۆربەیان نازانن) مەبەست پێی چەند شتێك بێ:

١/ زۆربەیان نازانن کە ئەگەر خوا موعجیزەو بەڵگەی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيهِمِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بۆ پێغەمبەری خاتەم بنێرێ، وە ئەوانیش ئیمانی پێ نەهێنن، وەك چۆن ئۆممەتانی پێشووی لەبەین بردوون، کە ئیمانیان بە موعجیزەکانی پێغەمبەرەکانیان نەهێناوە، ئەوانیش لەبەین دەبات، بەڵام کە ئەوان نازانن، خوا دەزانێ، بۆیە بە نەزانینی وان ناکات.

٢/ زۆربەیان نازانن کە قورئان بەسە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، بۆچی دەفەرموێ زۆربەیان نازانن؟ چونکە ئەوانەی کە زۆر شارەزاو زۆرزان بوونو سیاسیەتمەدار بوون، ئەوانەی کە تێگەیشتنی وردیان هەبوو، دەیانزانی کە قورئان موعجیزەیە، وەك پێشتر باسمان کردووەو دواتریش باسی دەکەین، دەیانزانی کە قورئان موحەممەد ﷺ داینەناوە، وە دەیانزانی کە فەرمایشتی خوایە، کەواتە: کەمێکیان دەیانزانی کە قورئان موعجیزەو بەڵگەیە.

٣/ زۆربەیان نازانن کە بەشەر قۆناغی ساوایی هەڵبواردووە، ئێستا گەیشتۆتە قۆناغی پێگەیشتن، بەشەر هەتا لە قۆناغێکی ساوادا بووە، موعجیزەی بەرهەستی بۆ هاتوە، بۆ وێنە: منداڵ بەچی زیاتر موعجەب دەبێ؟ بەو شتانەی کە شتی بەرهەستن، هەتا تەمەنی بچووکتر بێ، پێویستی بە شتی

بەرهەست زیاترە، بووکە شووشە، سەیارە، دوایی کە وردە وردە گەورە دەبێ، یاریی فیکریی دەکات، دوایی وردە وردە گەورەتر دەبێ ... هەروەها، بەشەریش کە لە قۆناغی ساوایی دا بووە، خوای پەروەردگار بۆ ئیسپاتی ڕاستیی پێغەمبەرەکان (عَلَیهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) موعجیزەو بەڵگەی بەرهەستی ناردوون، بۆئەوەی کە لەگەڵ قۆناغی ئەو کاتی مرۆڤایەتیی دا بگونجێن، بەڵام دوای ئەوەی مرۆڤ گەیشتۆتە قۆناغی کامڵ بوونو ڕوشد، موعجیزەیەکی عەقڵییو فیکریی‌و ئەدەبیی بۆ نێردراوە، کە قورئانە، کە بە عەقڵ دەرك دەکرێ، نەك بە هەستەکان.

٤/ زۆربەیان نازانن کە بیانووگرتن، ڕێی ئیمان هێنان نیە، وە بیانووگرتن کۆتایی پێ نایەت، ئەگەر بۆ کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ شتێکی ناردبایە، کافرەکانی ئێستاش دەیانگوت: شتێکیش بۆ ئێمە بنێرە، هەتا ئیمان بێنین !.

٥/ زۆربەیان نازانن کە دەبێ ئیمان بە پەنهان (غیب) بێ، بەڵام کاتێك شتەکان دەبنە بەرهەستو بەرجەستە، ئەو کاتە ئیمان هێنان ئازایەتیی نابێ.

شایانی باسیشە خوا ﷻ بۆ قۆناغەکانی پێشووی ژیانی بەشەر، لە سەردەمی هەر پێغەمبەرێکدا، چ شتێك باوو بووبێ، بەڵگەو موعجیزەی ئەو پێغەمبەرە لەو شێوەیە بووە کە باو بووە:

١) لە سەردەمی مووسادا (علیه السلام) جادوو باوبووە، خوای پەروەردگار موعجیزەیەکی بۆ ناردوە، کە هەرچی جادووگەرە بۆڕی بدات، موعجیزە بووە، بەڵام لە شێوەی جادوودا بووە.

٢) هەروەها لە سەردەمی عیسادا (علیه السلام) لەو شوێنەی کە ئەو لەوێ بووە، زانستی پزیشکگەریی باوبووە، بۆیە موعجیزەکانی عیسا (علیه السلام) لەو بوارەدا بوون، بۆ وێنە: مردووی زیندووکردۆتەوە، کوێری زگماك‌و لاڵی زگماك‌و، نەخۆشیی بەڵەك‌و ئەوانەی چاك کردۆتەوە، کە تا ئێستاش زانستی پزیشکیی ناتوانێ ئەوانە چاك بکاتەوە، باڵندەی لە قوڕێ دروستکردوە، فووی پێدا کردوە، بووەتە باڵندە، هیچ کەس ناتوانێ شتی وا بکات، ئەوە بەڵگە بووە لەسەر

ئـەوەی کـە عیسـا (علیـه السـلام) پێغــەمبەری خــوایە، چـونکە پـێش هـەموو پزیشکەکان کەوتۆتـەوە.

٣) هـەروەهـا لە سـەردەمی هـەر پێغـەمبەرێکـدا زانایان دەڵێن: چ شتێك زۆر بـاوبووە، خەڵــك بــە چ شــتێك زۆر سەرســامو موعجــەب بــووبن، خــوای کاربــەجێ موعجیزەیەکی داوە بە پێغـەمبـەری ئەو ڕۆژگـارە، کـە بـە مەسافەیەکی زۆر پـێش هـەموو خەڵك بکەوێتـەوەو، هیـچ کەس نەتوانـێ شتی وابکـات، تاکـو بـزانن ئـەوە لـە خـواوەیــە، وە لـە سـەردەمی پێغــەمبەری خاتــەم ﷺدا، جارێ لـەو ژینگەیـەی یەکـەم دا کە تێیـدا بووە، کە نیـوە دوورگەی عەرەبیـی بووە، زانستی ڕەوانبێــژییو قســەزانیی بـاوبــووە، عــەرەب گــەورەترین هونــەریان بریتــی بــوو، لــە شـیعرو پەخشــانو وتــاردان، خــوای زانــاو توانــاش قورئــانی نــارد، وەك موعجیزەیــەکی ئەدەبیـی کە هەرچی شـاعیـرو ئەدیـب هـەبوون، بـۆڕی دان.

پاشــان ئۆممــەتی پێغــەمبەر ﷺ خــوای پەروەردگــار زانیویــەتی لــە دوا قۆنـاغی ژیانی بەشـەردا، بەشەر زۆر بەرەو پێشـەوە دەچێ لـە ڕووی زانستییو فیکرییــەوە، لە هـەموو بوارەکانی ژیانـدا، بۆیە قورئانێکی ناردوە لـە هـەر ڕوویێکەوە تـۆ تەماشـای بکـــەی، موعجیــزەیە، لــە ڕووی: گــەردوون ناسـییو فیزیـاو کیمیـاو زەوی ناسـییو زینـدەوەرزانییو ڕووەکنـاسـییو مێژووناسـییو پزیشکگەرییو یاسـاناسـیو... هتـد، وێــڕای ڕووی ڕەوانبێــژییو، لــە هــەر ڕوویێکــەوە تــۆ تەماشــای قورئــان دەکــەی، موعجیـزەیـە[1]، بێگومان ئێمە ناڵێین قورئـان کتێبـی هەموو شتێکە، بەڵکـو تەنیـا ئاماژەی تێـدایە لـە هــەر کـام لـەم بوارانـەدا، کـە هـەر کەسێك پسـپۆریی تێیـدابوو تەماشـای قورئــان بکــات، لە قورئــاندا ئامــاژەی وا دەبینێتـەوە، کـە دڵنیــا بــێ، ئـەم قورئــانە کەسێك ناردوویـەتی، کـە ئێســتای دیـوەو بـۆ ئێستاش قسەی کـردوە، نـەك تەنیــا بـۆ هــەزارو چـوار ســەد (١٤٠٠)و ئەوەنـدە ســاڵە لەمەوبــەر! ئنجـا زاتێـك بـۆ ڕابردوو و ئێستـاو بۆ دوای ئێســتاش قســە بکات، دیارە خـوایــە ﷻ، چـونکە بەشـــەر بـۆ کـاتی خـۆی قسـە دەکـات، بـۆ ڕۆژگــاری خـۆی قســە دەکــات، بـەڵام خـوا ﷻ بـۆ

---

١) وەك پێشــتریش گـوتــم: لـە بەرگـی سـێیەمی کـتێبـی: (الإسـلام كـما يتجلّـى فـي كـتـاب الله) بـاسـی ڕووە جـۆراوجـۆرەکـانی ئیعجـازی قورئـانم کردوە بە تـایبـەت لە ڕووی ئیعجـازی زانستییــەوە سـی (٣٠) نـموونـەم هێنـاونەوە.

ئێستاش‌و بۆ دوای ئێستاش‌و، بۆ ئەوکاتەیش فەرمایشتی فەرمووە، بۆیە خوا ﷻ موعجیزەیەکی ئاوای داوەتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە ئۆممەتەکەیشی دوای خۆی پەکیان نەکەوێ لە بەڵگەدا، ئێستا ئێمە وەك پێغەمبەری خاتەم تەحەددای کافرەکانی ڕۆژگاری خۆمان دەکەین، بەم قورئانە، دەڵێین: فەرموون: ئەم قورئانە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ کێ دەڵێ: وانیە، مشکان مەیدان نەکێلاوە! ئێوەش وێنەی ئەم قورئانە بێنن، نەتانتوانی، فەرموون: وێنەی دە سوورەت بێنن، هەر نەتانتوانی، فەرموون: وێنەی سوورەتێك بێنن! بەلام هەر کەسێك دەیەوێ کاری وابکات با یەکەم: شارەزایی هەبێ لە زمانی عەرەبیی دا، پاشان بزانێ ئەم قورئانە چی تێدایە، نەك وەك موسەیلیمەی درۆزن (مُسَيْلَمة الكذاب) شتێك بلێ، دوایی ببێتە جێی گاڵتەجاڕیی‌و پێکەنین، کە بە حیساب لاسایی قورئانی کردۆتەوە ! لە قورئاندا سوورەتی (الفيل) هەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ۝٢ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ۝٥ ﴾.

ئەویش (مُسَيْلَمة) هەڵسا شتێکی دانا کە دەڵێ: (الفِيلُ مَا الفِيلُ؟ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الفِيل. لَهُ أذَنان عريضان وَخُرطُومُ طَوِيل) کە منداڵێکیش دەتوانێ وابڵێ، واتە: فیل، فیل چییە؟ تۆ چووزانی فیل چییە؟ دوو گوێی پان‌و لووتێکی درێژی هەیە.

هەڵبەتە ئەمە هیچ نیە، بەلام سوورەتەکانی قورئان بەرنامەن، وە سوورەتەکانی قورئان نهێنییەکانی ئاسمان‌و زەوییان تێدان، بە هەر حاڵ ئەم باسە زۆر دوورو درێژەو، ئێمە بەم ئەندازەیە وازی لێدێنین.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ﴾، واتە: هیچ زیندەوەرێك لە زەوی دا نیە، وە هیچ باڵندەیەك بە دوو باڵەکانی نافڕێ، مەگەر کۆمەڵانێکن وەك ئێوە.

یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: ئەم ئایەتە چۆن پەیوەست دەبێتەوە بە ئایەتەکانی پێشەوە، ئەوان باسی دابەزاندنی موعجیزەو بەڵگە دەکەن، بۆ ئیسپاتی پێغەمبەراتیی موحەممەد ﷺ، بەڵام لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ ئەوە کە هیچ زیندەوەرێك لە زەوی دا نیە، وە هیچ باڵندەیەك نافڕێ، مەگەر ئەوانیش کۆمەڵن، وەك ئێوە؟!

لێکۆڵەوەران لە ماناو مەبەستەکانی قورئان، (مُفَسِّرون) سێ وەڵامیان دانەوە، منیش یەکی دیکەم لێ زیادکردن، کە یەکەمیانە:

یەکەم: واتە: ڕێکوپێکیی لە ژیانی گیانداراندا بەڵگەی هەبوونی حیکمەتە لەپشت ئەم بوونەوەرەوە، کەواتە: ئەی کافرەکان! ئێوە بۆیە بڕوا بەوە ناکەن کە خوا پێغەمبەرێ بنێرێو، کتێبو بەرنامەی پێدا بنێرێ، چونکە پێتان وایە کە خوا مشووری لە ئێوە نەخواردوەو، هەقی بەسەر ئێوەوە نیە، وەك عەلمانییەکانی ئێستاش وادەڵێن، دەڵێن: خوا هەقی بەسەر ژیانی ئێمەوە نیە، بۆخۆمان ژیانی خۆمان ڕێك دەخەین ! ئنجا خوا سەرنجیان ڕادەکێشێو دەفەرموێ: ئێوە هەر خۆتان نین لەسەر ئەم زەوییە، تەماشای هەرچی زیندەوەرە بکەن، تەماشای مێرووڵەو مۆرانەو هەنگو پەپوولەو هەرچی زیندەوەرە دەکەی، پاشان بچۆ بۆ شتی گەورەتر باڵندەو پەڕندەکان، چ هی بچووکیان وەك پەڕەسێلکە، چ هی گەورەیان، وەك قازو مراویی، پاشان ئاژەڵەکان، ئنجا دڕندەکان، هەرچی تەماشای دەکەی. دەبینی ئەوانیش ئۆممەتنو، ڕێکوپێکیی لە ژیانیاندا هەیە، هێلانە چۆن دروست دەکەن؟ بەچکەکانیان چۆن بەخێو دەکەن؟ چۆن گەرمیانو کوێستان دەکەن؟ چۆن لەنێو دەریاکاندا هاموشۆ دەکەن؟

دەڵێن: هەندێك جۆرە نەهەنگ یان ماسی هەیە، بۆ دانانی گەرایەکەی خۆی، چەندان فەرسەخ دەڕوات، سەدان کیلۆمەتر دەبڕێ، ئەو شوێنەی کە لێیەتی، بۆ نموونە: ساردە، ئەگەر گەراکەی ئەگەر لەوێ دابنێ، دەفەوتێ، دەچێ سەدان کیلۆمەتر دەبڕێ، دەچێ بۆ شوێنێکی گەرم، لەوێ گەرا دادەنێ، ئەو گەرایانە لەوێ دەترووکێنو دەبنە ماسی، وە لەو سەدان کیلۆمەترەوە دێنەوەو شوێنی خۆیانو پێ دەزاننەوە، چونکە لەوێ ناژینو

گەرمێنە، دێنەوە ئەو شوێنەی کە دایکیان لەوێ بووە، بێئەوەی هیچ کەس دەستیان بگرێ! هەروەها زۆر جۆرە باڵندەش گەرمیانو کوێستان دەکەن.

وە هەنگ چەندان کیلۆمەتر دەڕوات، شیلەی گوڵان دەمژێو دوایی دێتەوە، ئنجا ئەو ڕێکوپێکیی یە لە ژیانی مێروودا هەیە، وە ئەوەی لە ژیانی هەنگدا هەیە، وە ئەوەی لە ژیانی پەلەوەرەکاندا هەیە، هەمووی سەرسوڕهێنەرە، مانای وایە ئەوانە هەموویان ئۆممەتن.

کەواتە: خوا تەنانەت باڵندەو مێروولەو هەنگو ئاژەڵو دڕندەشی پشت گوێ نەخستوە، بەڵکو بەرنامەی بۆ داناونو هیدایەتی داون، کەواتە: چۆن ئێوە پشتگوێ دەخات، ئەی بەشەر! بەڵکو پێغەمبەرتان بۆ دەنێرێ، وە کتێبیشیان پێدا دەنێرێ، بۆئەوەی ژیانی خۆتان بە شێوەیەکی وا کە خوا دەیەوێ، ڕێکبخەن، ئەوە چۆنیەتی پەیوەستبوونی ئەو ئایەتە بە ئایەتەکانی پێش خۆیەوە، کە زۆربەی توێژەرەوان لێیان گیربووەو تەماشای تەفسیرەکانم کردوە، هیچیانم نەبینی بەم شێوەیە پەیوەستی بکەنەوە.

دووەم: خوای دادگەرو کاربەجێ مادام لە مارو مێروو بێئاگا نەبووەو هیدایەتی داون، لە ئێوەش بێئاگا نیەو ئێوەش هیدایەت دەدات، وە ژیانی هەموو دروستکراوەکان، ڕێکوپێکیی تێدایە، ژیانی ئێوەش دەبێ ڕێکوپێکیی تێدابێ، ژیانی وان بە حوکمی غەریزەو یاسا کیمیاییو فیزیاییو جیۆلۆجیی یەکان، ڕێكو پێکیی تێدا دەبێ، بەڵام ژیانی ئێوە دەبێ بەهۆی هیدایەتی خواوە، ڕێکوپێکیی تێدابێ، ئەویش بەوجۆرە کە خوا پێغەمبەر بنێرێو کتێب دابەزێنێ.

سێیەم: بۆ ناسینی خوا، ئەو خوایەی کە ئەو پێغەمبەرەی ناردوە، کە موحەممەدە ﷺ، وە ئەو کتێبەی پێدا ناردوە، ئێوە سەرنجی کتێبی بوونەوەر بدەن، چونکە هەتا زیاتر تەماشای کتێبی بوونەوەر بکەن، خاوەنی ئەو کەونو کائیناتە زیاتر دەناسن، وە زیاتر چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکەن کە هیدایەتو بەرنامە بنێرێ، وە پێغەمبەر بنێرێ، تاکو ڕێنماییتان بکات، چونکە کافرەکانی ئەو کات، وە کافرەکانی ئێستاش دەڵێن: ئاخر چ پێویست

دەکات خوا کتێب بنێرێ! ئینسان عەقڵی هەیە؟ هەتا ئەوانەش کە خوا دەناسن دەڵێن: پێویست ناکات خوا دەست بخاتە کاروباری بەشەرەوە، بەشەر بۆخۆی کاری خۆی دەزانێ، خوا هێندە گەورەیە، هیچ پەیوەندیی بەو وردەکارییانەوە نیە!!، هەتا هەندێك لە فەیلەسووفەکانی یۆنان گوتوویانە: خوا زۆر لەوە گەورەترە، کە شتی گچکە گچکە بزانێ، بۆیە (أبو حامد الغزالي) لە کتێبی (تهافت الفلاسفة)دا یەکێك لەو هۆکارانەی فەیلەسووفەکانیان پێ کافر دەکات، ئەوەیە کە گوتوویانە: خوا زانیاریی بە وردەکارییەکان نیە، چونکە خوا زۆر لەوە گەورەترە، بزانێ مێروو چی دەخوات؟ ماسی بۆ کوێ دەڕوات؟ بەشەر چی دەکاتو، چی دەخوات؟ خوا ئەوەی لێ ناوەشێتەوە، ئەو شتە وردانە بزانێ، ئەوانەی وایانگوتوە (أبو حامد الغزالي) لەبەرئەوە بە کافری داناون، ڕاستیش دەکات، چونکە خوا هەموو شتێك دەزانێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ ﴾البقرة، واتە: وە بزانن کە خوا هەموو شتێك دەزانێ، پاشان بۆ ئێمەی بەشەر وایە کە دەڵێین: ئەوە گچکەیە، ئەوە گەورەیە، ئەگەرنا ئەو ئیعجازەی لە مێروولەدا هەیە، هەر ئەویش لە فیلدا هەیە، خۆ بەشەر کە ناتوانێ فیل دروست بکات، مێروولەشی هەر پێ دروست ناکرێ، مێشوولەشی پێ دروست ناکرێ، بەڵکو ڤایرۆسێکیشیان پێ دروست ناکرێ، بەکترایەکیان بۆ دروست ناکرێ، وەك چۆن شێرو پڵنگیان پێ دروست ناکرێ، وە وەك چۆن پارچە شاخێکیان بۆ دروست ناکرێ، گەردیلەیەکیشیان هەر پێ دروست ناکرێ.

کەواتە: لەڕاستییدا لە چاوی ئێمەی بەشەردا، ئەوە گچکەیەو ئەوە گەورەیە، ئەگەرنا ئەو نهێنییەی لە گچکەکاندا هەیە، هەر ئەوەش لە گەورەکاندا هەیە، وە ئەگەر دروستکرانی گەورەکان بە زەحمەتە، دروستکرانی گچکەکانیش بە زەحمەتە، بەڵکو بە زەحمەتتریشە.

<u>چوارەم</u>: چۆنیەتی پەیوەستبوونی ئەم ئایەتە بە ئایەتەکانی دیکەوە ئەوەیە کە: خوا ﷻ باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ﴾، ئنجا مادام خوا پەلەوەرو زیندەوەرو دڕندەو ئاژەڵانیش کۆبکاتەوە لە قیامەت دا، دیارە

ئێوەی مرۆڤ لە پێشترن، کە حیساب‌و کیتابتان لەگەڵ بکرێ‌و، کۆتان بکاتەوەو لێتان بپرسێتەوە، چونکە خوای دادگەر باسی کردوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٍۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ٣٨ ﴾، واتە: مادام ئەوان کۆبکاتەوە، ئێوەش کۆدەکاتەوە، کەواتە: ئاگاتان لێ بێ، ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بێنن‌و ئیمان بە کتێبەکەی بێنن، پێش ئەوەی لە قیامەتێ کۆتان بکاتەوەو، لێتان بپرسێتەوە، وە تووشی شەرمەزاریی‌و پەشێمانیی ببن.

**مەسەلەی حەوتەم**: کە دەفەرمووێ: ﴿ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٍۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ﴾، واتە: لە کتێبدا هیچ شتێکمان بەزایە نەداوە، وە دواییش بۆ لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە. لە تەفسیری ئەم ڕستەیەدا دوو خاڵن دەخەینەڕوو:

١/ ئایا مەبەست لە (الکتاب) چییە؟

أ- هەندێك دەڵێن: (الکتاب) مەبەست پێی قورئانە، واتە: لە قورئاندا هیچ شتێکمان بەزایە نەداوە، هەموو شتێکمان لە قورئاندا باسکردوە، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی لە قورئاندا باسی تەکنۆلۆژیاو دروستکردنی سەیارەو فڕۆکەو تەلەفۆن‌و تەلەفزیۆن، نەکراوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: کە خوا هیچ شتێکی فەرامۆش نەکردوە لە قورئاندا باسی بکات، کە ژیانی بەشەر پەکی لەسەری کەوتبێ، وە لە مەودای عەقڵی ئینساندا نەبێ، بەڵام ئەوەتا بەشەر کامێراو تەیارەو سەیارەو کۆمپیوتەر دروست دەکات، کەواتە: ئەمانە لە مەودای عەقڵی ئینساندان، ئەو شتەی کە ئینسان بۆخۆی پێی دەکرێ‌و عەقڵی پێ دەشکێ، خوا لە قورئاندا باسی نەکردوە، تەنیا ئەو شتانەی باسکردوون، کە لە مەودای عەقڵی بەشەردا نین، بەڵام ئەو شتانەی کە بەشەر بۆخۆی دەیانزانێ: چۆن نان دروست بکات؟ چۆن چێشت لێ بنێ؟ چۆن نەخۆش چارەسەر بکات؟ چۆن کەلوپەل دروست بکات؟ ئەمانە لە مەودای عەقڵی

بەشـەردان، کەواتـە: کـە دەفـەرموێ: ﴿ مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ﴾، هـیچ شتێکمان لە کتێبـدا بەزایـە نـەداوەو فەرامۆشـمان نـەکردووە، حەتمەن باسـمان کـردوە، یـانی: ئـەو شـتانەی کە ژیـانی بەشـەر پەکـی لەسـەریان کـەوتووە، لـە مەودای عەقڵی بەشـەردا نیـن.

ب - وە هەنـدێك لـە زانایـان گوتوویانـە: (الكِتَاب) یـانی: (اللـوح الـمحفوظ) واتـە: لەوحـی پارێـزراو، واتە: ئەو دروسـتکراوەی کە خـوای زانـا هـەموو زانیارییـەکانی تێـدا تۆمـارکـردوون، لەبـارەی دروستکراوەکانیـەوە.

٢/ دەربـارەی ئـەوە کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾، زانـایـان سـێ واتـایـان بۆ لـێکداونـەوە :

یەکـەم: تێکـڕای پەلـەوەرو زینـدەوەرو ئـاژەڵ‌و، هـەموو ئەوانـەی کە خـوا دروسـتی کردوون، بۆ لای پەروەردگاریان لە دنیـادا کۆدەکرێنـەوە، کـەی کۆدەکرێنـەوە؟ لە کاتێکدا کـە دنیـا تێکـدەچـێ، وەك خـوای پـەروەردگار لـە سـوورەتی (تکویر)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ۝٥ ﴾ التكـوير، واتـە: کاتێـك ئاژەڵـەکان کۆکرانـەوە سـەریەك، دیـارە کۆکـرانەوە سـەریەکیان لـە کاتێکدایـە کـە دنیـا تێکـدەچـێ.

دووەم: یاخـود مەبەسـت لـە: ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾، واتـە: بـەرەو گۆڕەپـانێك کە پەروەردگاریـان بـۆی دیـاریی کـردوون، بـۆ لێپرسـینەوەو سزاو پاداشت، ئەوانیـش بـۆ ئەوێ کـۆدەکرێنـەوە.

سێـیەم: کـە دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾، هـەم کۆکردنـەوەی دنیـایی دەگـەیەنـێ، هـەم هـی قیـامەتیش دەگـەیەنـێ، منیـش ئـەم ڕایـەم پـێ ڕاسـتە، پێشـەوای توێـژەرەوانی قورئـان (أبـو جعفـر الطبـري)یـش لـە تەفسیـرەکەی خۆیـدا لـەوبـارەوە دەڵـێ: (كَانَ أَصْوَبُ القَوْلِ فِي ذَلِكَ أَن يُعَمَّ بِمَعْنَى الآيَةِ مَا عَمَّهُ اللهُ بظَاهِرِهَا وأن يُقَالُ: كُل دَابَّة وَكُلّ طَائِر

مَحْشُورٌ إِلى اللهِ بَعْد الفَنَاء وَبَعْدَ بَعْث القِيَامَةِ، إِذْ كَانَ اللهُ تَعَالَى ذِكْرُهُ قَدْ عَمَّ بِقَوْلِهِ: ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾، وَلَم يُخَصِّصْ بِهِ حَشْرًا دُونَ حَشْر)[1]، قسەکەی زۆر بەجێیە، وە پێشەوا (طبري) ئەو عادەتەی هەیە، هەمیشە هەوڵدەدات چەمکی ئایەتەکان فراوانتر بکات، کە دیارە هەر واشەو چەمکی ئایەتەکان وایە، دەبێ مرۆڤ لێکدانەوەیەکی فراوانیان بۆ بکات، دەڵێ: قسەی ڕاستتر لەمەدا ئەوەیە کە دەبێ مانای ئایەتەکە بگشتێنرێ، چۆن خوا مانای ڕواڵەتەکەی گشتاندوە، وە بگوترێ: هەر زیندەوەرێك و هەر باڵندەیەك بەرەو خوا کۆدەکرێتەوە، چ کاتێك دنیا بەرەو کۆتایی دێ و تێکدەچێ، چ دواى زیندووبوونەوە لە قیامەتدا، چونکە خوای بەرز ﷻ بەگشتی فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾، بەرەو پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە، واتە: هەم لە دنیادا کۆدەکرێنەوە، هەم لە قیامەت دا.

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ»﴾[2]، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: مافەکان بۆ خاوەنی خۆیان دەگێڕدرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، تاکو تۆڵە دەستێنرێتەوە بۆ مەڕی بێ قۆچ، لە مەڕی قۆچدار. {لەوانەیە مەبەست پێی بزن بێ، چونکە وشەی (شاة) بۆ بزنیش بەکاردێ[3]، یاخود ئەو مەڕەی کە قۆچی هەیە لەو مەڕەی کە قۆچی نیە دەداتو، شەڕی پێ لەگەڵ دەکات}.

---

١) جامع البيان، ج٧، ص٢٠٠، ٢٠١.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٧٢٠٣)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٥٨٢)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٤٢٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣٦٣) قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسنادُهُ صَحِيح.

٣) بڕوانە: المعجم الوسيط، ص ٥٠١، {الشاة، الواحدة من الصّفان المَعْزِ والظِّباءِ والبقر والنَّعام وحُمُر الوحش، يقال للذكر والأنثى، ج : شاء وشياه}.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە کە (الطبري) بە سەنەدی خۆی دەیگێڕێتەوە، لە تەفسیرەکەی دا: (حَدَّثَنا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ، حَدَّثَنا مُحَمَّد بْن ثَوْر، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ بَرْقَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ الأَصَمِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، رَضِيَ الله عَنْهُ في قوله: ﴿إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ٣٨﴾، قَالَ: يَحْشُرُ الله الخَلْقَ كُلَّهُم يَوْمَ القِيَامَةِ، البَهَائِمَ وَالدَّوَابَّ وَالطَّيرَ وَكُلَّ شَيء، فَيبلغ مِن عَدل الله يَوْمَئِذٍ أن يأْخُذَ لِلجَمَّاء مِنَ القَرْنَاءِ، ثُمَّ يَقُولُ: "كُونِي تُرَابًا"، فَلِذَلِكَ: ﴿وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ٤٠﴾ النبأ)[1] واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا هەموو دروستکراوەکان کۆدەکاتەوە: ئاژەڵەکانو زیندەوەرەکانو باڵندەکانو هەرچی ژیاندارەو هەموو شتێك، هەتا دادگەریی خوا تەواو دەچەسپێ بەشێوەیەك کە هەقی بێ قۆچ لە قۆچدار دەکرێتەوە، دوایی خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ببنەوە بە گڵ، ئەوە ئەو کاتەیە کە خوای بەرز لەسەر زمانی بابای کافر دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ٤٠﴾، واتە: کافر لەو ڕۆژەدا دەڵێ: خۆزگە گڵ بوومایە، (کە دەبینێ ئاژەڵو باڵندەو پەلەوەرەکان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، لەسەر ئەوەی کە لەنێو خۆیان دا زوڵمیان لە یەکدی کردوە، بێگومان ئەوانە ناچنە بەهەشتو دۆزەخ خوا دەفەرموێ: ببنەوە گڵ، کافر لەوکاتەدا خۆزگە بەوان دەخوازێ، دەڵێ: ئەگەر منیش وەك وان ئاژەڵو ماڵات بام، ئێستا ڕزگارم دەبووو نەدەچوومە دۆزەخێ).

---

١) قال محقق (تفسير الطبري): جعفر بن برقان الكلابي: ثقة، و"يزيد بن الأصم بن عبيد البكائي": تابعي ثقة، وهذا الخبر رواه الحاكم في المستدرك ج٢، ص٣١٦، من طريق عبدالرزاق، عن معمر، عن جعفر الجذري، عن يزيد بن الأصم، وقال: "جعفر الجذري هذا، هو ابن برقان، قد احتج به مسلم، وهو صحيح على شرطه، ولم يخرجاه"، ووافقه الذهبي، وخرجه إبن كثير في تفسيره ج٣، ص٣٠٨، ٣٠٩، ثم قال: "وقد روي هذا مرفوعًا في حديث الصور". وخرجه السيوطي في الدر المنثور ٣: ١١، وزاد نسبته لأبي عبيد، وابن المنذر، وابن أبي حاتم.

هەڵبەتە هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: سزاو پاداشت تەنیا بۆ مرۆڤو جندەو بۆ باڵندەو ئاژەڵ ژیانداران نیە، بەلام ئەوەتا فەرمایشتەكەی پێغەمبەر ﷺ مانایەكەی زۆر ڕوونە، هەڵبەتە ئەوان دەڵێن فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی تەشبیهە، یانی: ئەگەر گریمان بزنێكی قۆچدار زوڵمی لە مەڕێكی بێ قۆچ كردبێ، خوای دادگەر تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە، ئەوان وای تەئویل دەكەن، ئنجا بە هەر حاڵ ئەوە یەكێك نیە لەو مەسەلانەی ئەگەر كەسێك بڵێ: وایە یان وا نیە، پێی لە بازنەی ئیسلام بچێتە دەرێو بواری تێدایە زانایان قسەی لەبارەوە بكەن.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكۡمٌ فِي ٱلظُّلُمَٰتِۗ ...﴾، وە ئەوانەی ئایەتەكانی ئێمە بە درۆ دادەنێن، كەڕو لاڵن لە تاریكاییاندان، واتە: عەقڵو گوێو زمانیان لەكارخستوە بەهۆی گوناهەكانیانەوە، ئەو هەستەوەرانەی خۆیان لەكارخستوە، بە جۆرێك كە هەر نەیانبن، كەسێك گوێی خۆی بەكار نەهێنێ بۆ بیستنی قسەی هەق، جیاوازیی چییە لەگەڵ بابای كەڕدا؟ وە كەسێك چاوی خۆی بەكارهێنێ بۆ بینینی هەق، جیاوازیی چییە لەگەڵ كوێردا؟ وە كەسێك زمانی خۆی بەكارنەهێنێ بۆ قسەی هەق، جیاوازیی چییە لەگەڵ كەسێكی لاڵ دا؟ وە كەسێك عەقڵی خۆی بەكارنەهێنێ بۆ تێگەیشتنی ئایەتەكان، جیاوازیی چییە لەگەڵ بابای بێ عەقڵ دا؟.

**مەسەلەی نۆیەمو كۆتایی:** كە دەفەرموێ: ﴿...مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٣٩﴾، واتە: هەر كەسێك خوا بیەوێ گومڕای دەكات، وە هەر كەسێكی بوێ دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست.

پێشتریش باسمان كرد، لەو شوێنانەدا كە خوای تاكو پاك بە ڕەهایی باس دەكات، كە هەر كەسێكی بوێ، گومڕای دەكات، وە هەر كەسێكی بوێ، هیدایەتی دەدات، مەبەست ئەوە نیە كە خوا لەگۆترە وادەكات، وە مەبەستیشی ئەوە نیە ئەگەر كەسێك هیدایەتی بوێ، هەر گومڕای بكات! یان هەر كەسێك بیەوێ

گومڕابێ، خوا بەتۆبزیی ملی پێ بسووڕێنێو هیدایەتی بدات، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ویستی خوا ڕەهایە، بەڵام ویستی ڕەهای خوا، بەپێی حیکمەتی خۆیو، بەپێی زانستی ڕەهای خۆی کار دەکات، سیفەتەکانی خوا هەموویان پێکەوە کاردەکەن، با تەماشا بکەین خوای پەروەردگار کێ گومڕا دەکات؟ خوا دەفەرموێ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾﴾إبراهيم، واتە: خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، وە هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ البقرة، واتە: وە سەرپێچییکاران نەبێ گومڕا نابن.

ئەدی خوا کێ هیدایەت دەدات؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾﴾ الشورى، وە دەفەرموێ: ﴿وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾﴾الرعد، کەسێك کە بەرەو لای خوا دەگەڕێتەوە، خوا هیدایەتی دەدات، مانای وایە تۆ ڕووی خۆت دەبێ لەدڵەوە وەچەرخێنی بۆ لای خوا، هەروەها لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾﴾، کەواتە: تۆ دەبێ وەرچەرخێیو جووڵە بکەی بەرەو لای خوا، ئنجا خوای پەروەردگاریش دەستت دەگرێ، بەڵام کەسێك لامل بێ بەرەو خوا، خوای کاربەجێ بەتۆبزیی نایهێنێتەوە، چونکە خوای دادگەر ویستوویەتی ئەو خەڵکە تاقی بکاتەوەو، ئەوەش بەبێ ئازادییو سەرپشككردن مەیسەر نابێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دە (١٠) ئایەت (٤٠ تا ٤٩) پێکدێ‌و، سێ جاران وشەی (قل)یان تێدا دووبارەبۆتەوە، سوورگەی ئەم ئایەتانەش بریتیە لە هۆشداریی دانە کافرەکان، لەسەر زمانی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ کە ترسی هاتنی سزای خوا، یان هاتنی دوارۆژیان هەبێ‌و، پشتێندی دڵنیایی لێنەکەنەوەو، پێیان وانەبێ دنیا شاری بێ خاوەنەو، هەرچی بکەن‌و هەر چۆن بکەن، هەر سەلامەت دەبن‌و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن!

هەروەها خوای کاربەجێ ئاماژەیەکی خێرا دەکات بە سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی سەرپێچییکار، کە چۆن پاش جەربێنرانی جۆراوجۆرو، کەوتنیان لە تاقیکردنەوەی خوا، دووچاری سزای کتوپڕو سەخت بوون‌و، دوابڕاو بوون!

هەروەها خوا بە پێغەمبەرەکەی (موحەممەد) ﷺ دەفەرموێ: کە بە کافرەکان بڵێ: ئایا ئەگەر خوا هەستەوەرەکانی: بیستن‌و دیتن‌و عەقڵی لەبەین بردن، کێ بۆیان دەگێڕێتەوە؟ یان ئەگەر سزای خوا بە پەنهانیی، یان ئاشکرا هات، ئایا جگە لە ستەمکاران کێ لەبەین دەچێ؟!

وە لە کۆتایی دا خوای زاناو توانا، باسی ئامانجی نێررانی پێغەمبەران دەکات، کە موژدەدان‌و ترساندنی مرۆڤەکانەو، ئاماژەش بە سەرەنجامی هەر کام لە ئیمانداراڵ چاکسازییکەرو، بێبڕوایانی لادەر دەکات.

﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن
كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا
تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ
يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ
ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ
أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾
فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ
سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ
نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً
أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا
مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾
وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەكـان

((بلّـێ: ئایــا دەزانـــن (یـان پـێم بلّـێن) ئەگـەر سـزای خـواتان بـۆ هـات، یـان كـاتی دیارییكراو (ساعة) هــات، ئایـا ئەگـەر ئێـوە لـە ڕاســتانن (كە جگە لـە خـوا، شتێكی دیكە شایستەی پەرسـتـرانە) جگە لە خـوا لـە كەس دەپاڕێنـەوە؟ ﴿٤٠﴾ بەڵـكو تەنیـا لەوی دەپاڕێنــەوە، ئنجـا ئەگەر ویستـی، ئـەوەی بـۆی لـە خـوا دەپاڕێنـەوە، لایدەبـاتو، ئـەوەی دەیكەنـە هاوبـەش (بـۆ خــوا) فەرامۆشـی دەكـەن ﴿٤١﴾ بێگومـان پـێش تـۆش (پێغـەمبەرانمان) بۆ لای چـەند كۆمەڵگایەك ناردن (ئنجا بـە مەبەسـتی تاقیكردنـەوە) گرفتــاریی‌و دەردەدارییمــان بەسـەر هێنـان، بـەڵكو بـلاڵـێنەوەو ملكەچیی (بـۆ خـوا) پێشــان بــدەن ﴿٤٢﴾ دیــارە دەبوو‌ایـە كـە ســزای ئێمـەیان بـۆ دەهـات زەبوونییـان (بـۆ خـوا) پێشـاندابایە، بەڵام (وایـان نـەكرد، چـونكە) دڵیـان سـەختو ڕەق بـوو، وە شـەیتان كردەوەكانیانی بـۆ ڕازاندبوونـەوە ﴿٤٣﴾ ئنجا كاتێـك ئـەوەی پێـی ئامۆژگـاریی كــرابوون، لەبیـریـان كـرد، دەروازەی هەموو شــتێك (ی خێر)مـان لێكردنــەوە، (وە ئەمجـاره بـە خۆشــییان تاقیمان كردنەوەو مۆڵەتمان دان) هەتا كاتێك كە ئـەوەی پێـیـان درابـوو (لـە نـازو نیعمـەت) پێی دڵخـۆش (و لەخۆبـایی) بـوون، لـە نـەكـاو گرتمـانن، ئیـدی یەكسـەر نائومێدو تەمابڕاو بوون ﴿٤٤﴾ ئنجا سەرەنجام ئەو كۆمەڵەی ستەمیان كرد، دوایان بـڕا (و فەوتان) وە ستایش بـۆ خـوای پەروەردگـاری جیهانییــان ﴿٤٥﴾ بلّـێ: ئایــا دەزانـن (یـان پێم بلّێن) ئەگەر خـوا بیستن‌و چاوەكانتانی لێوەرگرتن (و نەیهێشــتن)، وە مۆری بەسـەر دڵەكانتانەوە نا، جگە لە خـوا چ پەرسـتراوێك بۆتان دێنێتەوە؟ سەرنج بدە! چۆن چـۆنی ئایەتـەكانمانیان بـە شـێوەی جۆراوجــۆر بـۆ دەخەینــەڕوو، ئنجـا دوای ئـەوەش ئەوانـە لامل دەبـن! ﴿٤٦﴾ بلّـێ: پێم بلّـێـن: (یان ئایـا دەزانن) ئەگەر سزای خـواتان كتوپـڕ (و بـە پەنهـانیی) یـان بەئاشـكرا بـۆ هــات، ئایا جگــە لـە كۆمەڵـی ســتەمكاران، كـێ لەبەیـن دەچـێ؟ ﴿٤٧﴾ وە ئێمـە پێغـەمبەران تەنیـا بۆ ئەوە دەنێـرین، كە مـوژدەدەرو ترسـێنەر بن، جا هـەركـەس ئیمـان بێنـێ‌و چاكسـازیی بكـات، ئـەوە نـە (بـۆ داهـاتوو) ترسـیان لەسەره وە نــە (بۆ ڕابردوو) پـەژاره دادەگــرن ﴿٤٨﴾ وە ئەوانـەش كـە ئایەتــەكانمان بـە درۆ دەزانــن، بەهـۆی لاڕێ بوونیـانەوە، سـزاو ئـازاریان پێوە دەچەسـپێ ﴿٤٩﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَرَءَيۡتَكُمۡ ): واتە: (أخبروني، أو هل تعلمون) دوو واتای هەن: مانای هەواڵم پێبدەن، یاخود ئایا دەزانن؟

(بِٱلۡبَأۡسَآءِ ): (البُؤس والبَأْسُ والبأسَاء: الشدّة والمكْرُوه إلاَّ أَن البؤس فِي الفقْر والحَرْب أَكْثَر، وَالبَأس والبَأْسَاء فِي النكَاية) وشەی (بأْس، بُؤس، بأْسَاء) واتە: سەختیی و ناڕەحەتیی، بەڵام وشەی (بؤس) زیاتر بۆ هەژاریی و جەنگ بەكاردێ، وە وشەی (بأساء)یش بۆ تۆڵە لێكردنەوەو تەمبێكردن.

(وَٱلضَّرَّآءِ ): لە (ضر)ەوە هاتوە، (الضُّرُّ: سُوءُ الْحَالِ، والضَّرآء عَكْسُ السَّرَّآء)، (ضرّ) واتە: حاڵی ناخۆش، پێچەوانەی (السَّرآء)ە، واتە: خۆشیی، وە (بأْس) بە مانای تەنگاویی و ناخۆشیی دێ، وە بەمانای جەنگێك دێ كە ئینسان تێدا دەكەوێتە تەنگانە.

(يَتَضَرَّعُونَ): واتە: دەپاڕێنەوەو دەلاڵێنەوە، یاخود زەبوونیی و گەردنكەچیی دەردەبڕن (ضَرَعَ الرَّجُلُ: ضَعُفَ وَذَلَّ فَهُوَ ضَارِعٌ، وَضَرِعٌ، وَتَضَرَّعَ: أَظْهر الضراعة)، واتە: بێهێزبوون و زەبوونبوون، وە كەسێك زەبوون بووبێ، پێی دەگوترێ: (ضَارِعٌ و ضَرِعٌ) ملكەچ و بێهێز، یان (وَتَضَرَّعَ) واتە ملكەچیی و زەبوونیی خۆی و بێدەرەتانیی خۆی، خستە ڕوو.

(قَسَتۡ ): لە (قسوة)ەوە هاتوە، (القَسْوَةُ: غِلَظُ القَلْبِ، وَأَصلُهُ مِنْ حَجَرٍ قَاس)، (قَسْوَة) بریتیە لە دڵ ڕەقیی، (قَسَت قُلُوبُكُم) واتە: ئێوە مانان دڵتان ڕەق بوو، وە لە بنچینەدا لە بەردی ڕەقەوە هاتوە.

(فَرِحُواْ ): (الفَرح: انْشراح الصَّدْرِ بلذّة عَاجِلَة، وَأَكْثَر مَا يَكُونُ ذَلِكَ فِي اللَّذا البَدَنِيَّة وَالدنيَوِيَّة)، واتە: دڵتان خۆشبوو، (فرح): بریتیە لە سینە گوشادبوون،

بەهــۆی لــەززەتێکی زوو تێــپەڕەوە، وە بەزۆریــی بــۆ لــەززەتو خۆشــییە جەستەیی‌و دنیاییەکان بەکــاردێ.

(بَغْتَةً ): واتە: کـتوپـڕ، (البَغْت، مُفَاجَأَة الشيء مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِب)، واتـە: شــتێك کتـوپـڕ بـێ کە ئینسـان چـاوەڕوانی نەکـات.

(مُّبلِسُونَ ): (الإِبْلاَس: الحـزْن الـمعتَرِض مِـنْ شِـدَّةِ البَـأْس، وَأَبْلَـسَ: سَـكَتَ وَانْقَطَعَـت حُجَّتَـه)، (مُبلِسُـون): واتــە: نائومێــد بــوون، تەمــا بــڕا بــوون، یـاخود خەفـەتبار بوونێــك کـە ئینســان هـیچ تـەمای نەمــا بــێ، (أَبْلَـسَ) بـە مانـای (سَـكَـتَ)ش دێ، یـانـی: بـێدەنــگ بوو، یاخود قسـەی نەمـا.

(دَابِرُ ): (الدَّابِــر: المتَـأَخِّـر)، واتــە: ئــەوەی کـە لــە دواوە دێ، جـا قـەومێك ئـەوەی دواییـان بفـەوتــێ، مانـای وایـە ئـەوەی پێشــێ، لە مێـژە فەوتــاوە!

(نُصَرِّفُ ): (الصَّرْفُ: رَدُّ الشيء مِنْ حَالَةٍ إِلى حَالَة أَو إِبْدَاله بغَيْره) (صَرْف) بریتیـە لـەوە کـە شـتێك لە حاڵێك بۆ حاڵێکـەوە بگۆڕێ‌و شتێکی دیکە لە شـوێنی دابنـرێ، ﴿ نُصَرِّفُ ٱلْأَيَـٰتِ ﴾، واتە: ئایـەتەکانمانیـان بۆ جـۆراوجـۆر دەکـەین.

(يَصْدِفُونَ ): (صَدَفَ عَنْهُ: أَعْرَضَ إِعْرَاضَاً شَدِيداً، يَجْرِي مَجْرَى الصَّدَفِ أَي الـمَيْـلُ فِـي أَرجـل الـبَعِير، أَو فـي الصـلابة كَصَدَفِ الجبَـل أَي جَانِبـه، أَو الصـدَف الَّـذِي يُخْـرَجُ مِـنَ البَحْـرِ) (يَصـدِفُونَ): واتــە: ملــی تێدەکــەن‌و پشــتی تێدەکــەن، زۆر بەتوونــدیی بـە شــێوەیەك کـە وەك (صــدف)ە، (صـدف)یـش بریتیـە لـە جـۆرە دەردێـك کـە تووشـی لاقـی حوشتــر دێ، نانووشـتێتەوە، یـاخود لاقـی ڕەق دەبـێ بەلایەکـدا مەیل دەکات، یـاخود (صدف) یـانی: پارچە شــاخێکی ڕەق، لایـەك لـە چیـا، یــان ئـەو (صدف)ەی کــە لـە بەحــر دەردەهێنـرێ‌و گەوهـەری تێدایـە، زۆر ڕەقــە، دەبــێ بشــکـێنرێ.

(يَمَسُّهُمُ ): (الـمسّ: كَـاللَّمْس لَكِـن اللَّمْـس قَـدْ يُقَـالُ لِطَلَـب الشـيء، وَإِنْ لَـمْ يوجـد والـمَسُّ يُقَالُ فِي كُلّ مَا ينَال الإِنْسَان مِنْ أَذَىً) (يَمَسُّهُم): (مَسّ) و (لَمْس) وەك

یەکن، یانی پێوەنووسان، بەڵام (لَمْس) بۆ شتێك بەكاردێ با پەیداش نەبێ، (إلتَمَسَهُ) واتە: ویستی پەیدای بكات، با پەیداش نەبێ، بەڵام (مَسّ) بۆ شتێك بەكاردێ، كە تووشی ناڕەحەتییەك یان ئازارێك ببێ.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار لە درێژەی ئەو ڕێنماییانەدا كە بۆ پێغەمبەر ﷺیان دەكات، دەربارەی چۆنیەتی وتووێژكردنی لەگەڵ كافرەكاندا، یاخود لەگەڵ بتپەرستو هاوبەش بۆ خوا دانەرەكاندا، دوای ئەوەی لە ئایەتەكانی پێشوودا، خوا ﷻ چەند شتێكی بە پێغەمبەر ﷺ فەرموون، بۆ چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵیان دا، وە چەند ڕاستییەكی پێ فەرموون، كە بیانخاتە بەرچاوی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، ئنجا خوای دادگەر جەخت لەسەر هاتنی سزاو جەزرەبەی خۆی دەكاتەوە، چ لە دنیادا، چ لە دواڕۆژدا، جا ئەو سزاو جەزرەبەیە، چ لە بەڵاو نەخۆشییو ناخۆشییدا بەرجەستە بووبێ، چ لە هاتنی مەرگو مردندا، چ لە هاتنی قیامەتو ڕۆژی دوایی دا.

سەرەتا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾، پێیان بڵێ، بە كێ بڵێ؟ دیارە بە هەموو ئەوانەی كە بانگیان دەكات بۆ لای خواو بانگیان دەكات بۆ ئیمانو ئیسلام، بەڵام بە پێی سیاقی ئایەتەكان، وە بەپێی نێوەڕۆكی ئایەتەكان، كە لێیان ورد دەبینەوە، زیاتر مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانە، چونكە بۆ وێنە: دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ ﴾، واتە: ئایا لە غەیری خوا دەپاڕێنەوە، ئەگەر بەڵایەكتان بۆ هات؟ ئنجا دیارە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانن كە لە غەیری خوا دەپاڕێنەوەو، جگە لە خوا دێننە ڕیزی خوا ﷻ، بۆیە دەڵێین: مەبەست لە دواندنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئاڕاستەكردنو ڕێنمایی كردنی لەلایەن خواوە، لەم ئایەتانەدا، زیاتر بێ قسەكردنو دەمكوتكردنی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانە، دەفەرموێ: بڵێ: هەواڵم پێ بدەن (أرءیتَكُم) بە مانای هەواڵم پێ بدەن (أَخْبِروني) یان بە مانای: ئایا دەزانن، هەردوو واتاكەی هەن، واتە: ئایا دەزانن، یان هەواڵم پێ بدەن، ﴿ إِنَّ

أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ ﴾، ئەگەر سزای خواو ئازاری خوا هـات، یاخـود ئەو کـاتە هات کـە دنیـا تێکـڕا وێـران دەبـێ، (ٱلسَّاعَةُ ): واتـە ئـەو کاتـەی کـە دنیـای تێکرا تێدا کـاول دەبـێ، ئـەو بوونـەوەرە هـەموو کۆتـایی دێ، لاپـەڕەی ئـەم وجـوودە هەڵدەدرێتـەوەو، لاپەڕەیەکی تازە دەست پێدەکات، بڵـێ: هـەر کامێك لـەو دووانـە بێـن، ﴿ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، ئایـا لـە جگـە لـە خـوا دەپاڕێنـەوەو، داوای دەربـازبوونو قوتـاربوون لـە غـەیری خـوا دەکـەن، ئەگـەر ئێـوە ڕاسـتگۆن، ئایـا لـە غەیری خوا دەپاڕێنـەوە لـەو کاتـەدا؟ دیـارە وەڵامـی پرسـیارەکە لەنێـو خۆیـدایە، ئـەو جـۆرە پرسـیارکردنە لـە زمـانی عەرەبیـدا پێـی دەگوتـرێ: (الإسـتفهامُ الإنكـاريُّ) پرسـیارکردنی نکووڵـیی لێکـەرانە، واتـە: وەڵامەکـەی لەنێـو خۆیدایـەو، پرسـیارکەر چاوەڕێـی وەڵام لە پرسیارلێکراو ناکات، بڵێ: ئا، یان نا، ئەگـەر مـن گوتـم: ئایـا ئەمـە قورئـان نیـە؟ ئایـا ئەمـە مایکرۆفـۆن نیـە؟ ئایـا ئەمـە دەفتـەر نیـە؟ بەرانبـەرەکـەم ناتوانـێ بڵـێ: نا! دەبێ بڵـێ: بـا، چونکە دیارە لەبەرچاویەتی.

مەبەسـت لـە (عَذَابُ ٱللَّهِ) کـە دەفـەرموێ: (إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ) دەگونجـێ هـەژاریی و نـەداریی بـێ، دەگونجـێ نەخۆشـیی و ناخۆشـیی بـێ، وە دەگونجـێ خـەم و خـەفەت بێ، یـان هەر ڕووداوێکی ناخۆشبـێ، لـە دەوروبەرمانـدا، لـە ژیانمانـدا، هـەمووی دەگرێتـەوە، دیـارە (سَاعَة) یەکێکـە لە ناوەکانی هاتنـی ڕۆژی دوایـی، واتـە: تێکچوونی ئەم بوونەوەرە، چونکە ئەم بوونەوەرە، یاخـود ڕۆژی دوایـی، دوو قۆناغـی سـەرەکین:

١/ پێشـێ تێکچوونی ئەو بوونـەی ئێسـتا هەیـە.

٢/ ئنجـا دوایـی هـاتنی قۆنـاغی دووەم، کـە بریتیـە لـە قۆنـاغی زیندووبوونـەوەو لێپرسـرانەوەو کۆکردنـەوەی خـەڵكو، پاشـان دابەشـکردنیان بەسـەر بەهەشـتو دۆزەخدا بەپێـی ئیمـانو کوفـرو، چاکـەو خراپەکـانیان.

لێـرەدا خـوا ﷻ بـە پێغـەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کـە ئـەو پرسـیارە نکووڵییکـەرانە ئاڕاستەی کافرەکانو موشـریکەکان بکـات، بۆئـەوەی بـزانن کـە ئەوانـەی جگـە لـە خـوا لێیـان دەپاڕێنـەوەو دەیانپەرسـتن، هـیچ پاساوێکـیان نیـە، چونکـە ئەگـەر ئـازارو سـزایەك بـێ، یـاخود تێکچوونـی دنیـا بـێ، یان هـەر تەنگـانەو ناڕەحەتییـەك بـێ، لـە

غەیری خوا ناپاڕێنەوە، کەواتە: با وەك چۆن لە تەنگانانداا تەنیا خوا دەناسن، لە شێنەییش دا تەنیا ئەو بپەرستن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ ﴾، بەڵکو تەنیا لە خوا دەپاڕێنەوە، لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر بەرکار (مفعول بە) پێش کردار (فعل)و بکەر (فاعل) کەوت، کورت هەڵهێنان (حَصْر) دەگەیەنێ، فەرموویەتی: ( بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ ) نەیفەرمووە: (بَلْ تَدْعُونَ إِيَّاهُ)، یان (بَلْ تَدْعُونَهُ) بەڵکو دەفەرموێ: بەڵکو تەنیا لەو دەپاڕێنەوە، تەنیا داوا لەو دەکەن، ﴿ فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ ﴾، ئەو کاتە (خوا ﷻ ) بیەوێ ئەوەی کە بۆی لە خوا دەپاڕێنەوە، لایدەبات، وەك چۆن پەردەیەك لەسەر شتێك لادەبەی، ئەو بەڵایەتان لێ لادەبات، ﴿ وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ ﴾، وە ئەوانەی دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، لەو کاتەدا لەبیرتان دەچنەوەو، فەرامۆشیان دەکەنو، وێڵیان دەکەن، من ئینسانی بێدینم بینیوە، گوتوویەتی: من باپایەکی مارکسییو ماددییو، خوانەناس بووم، ڕۆژێك لە ڕۆژان ناوی خوام بەسەر زاردا نەدەهات، بەڵام جارێك گرتیانمو فڕێیانداماە ژوورێکی تاریکەوە (ژێر زەمینێك) یەکەمین وشە کە هاتە سەر زارم گوتم: (یا اَللە)، منیش زۆر خۆمم پێ سەیر بوو!! باشە من لە ژیانمدا خوام نەناسیوە، ئەوە چی بوو؟! (بەڵێ، لە تەنگانانەدا سروشتەکەت، ڕووحەکەت هاواری خاوەنەکەی خۆی دەکات، هاواری بەدیهێنەرەکەی خۆی دەکات)، گوتی: لەوکاتەوە زانیم ئەو مارکسیزمو ماددیگەراییە شتێکی پووچە، دیارە هەر لە حیزبەکەی خۆمدا مامەوە، بەڵام بۆم دەرکەوت کە نکووڵیی کردن لەوەی کە بوونەوەرو کائیناتو ئینسان خاوەنێکی هەبێ، شتێکی پێچەوانەی عەقڵو فیترەتو زانستو واقیعە، بۆیە خوا لێرەدا دەفەرموێ: بەڵکو تەنیا لە خوا دەپاڕێنەوە، کە تووشی تەنگانە بوون، وە ئەگەر خوا ویستی ئەوەی کە بۆی دەپاڕێنەوە واتە: ئەو بەڵایە کە دەتانەوێ خوا لایبدا، لایدەداتو دەربازتان دەکات، وە ئەوانەش کە دەیانکەنە هاوبەش، لەبیرتان دەچنەوەو فەرامۆشیان دەکەنو وێڵیان دەکەن.

ئنجا خوای کاربەجێ سەرنجی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بەتایبەت، وە مرۆڤەکان بەگشتی بۆ مێژوو ڕادەکێشێ ، پێشێ سەرنجی ڕاکێشان بۆ فیترەتی

خۆیان، لە دەروونو فیترەتی خۆتدا، کاتێك دەستت لە هەموو پچكان دەبڕێو، دەكەویە تەنگانەو ناڕەحەتییەوە، هاوار دەكەیە خوا، كەواتە: مادام لە تەنگانەدا هەر ئەو لە فریات دێو، هەر هاواو دەكەیە وی، لە شێنەییشدا هەر ئەو بپەرستە، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرماییشتێكدا بە عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەفەرموێ: ﴿تَعرَّفْ إِلَى اللهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفكَ فِي الشِّدَّةِ﴾[1] واتە: لە كاتی ئاسوودەییو فەرحانییدا خوا بناسە، خۆت بە خوا بناسێنە، وەك بەندەی باش، لە تەنگانانەو لە سەغڵەتییاندا دەتناسێ.

ئنجا سەرنجیان بۆ مێژوو ڕادەكێشێو دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾، وە بێگومان لەپێش تۆشدا ڕەوانەمان كرد بۆ لای چەند كۆمەڵێك، چی بۆ ڕەوانەكردن؟ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) وە پەیامو بەرنامەی خۆی بۆ ڕەوانەكردن ﴿ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴾، گرتمانن بە (بِٱلْبَأْسَآءِ) و (وَٱلضَّرَّآءِ) (البَأساء) - وەك پێشتر باسمان كرد لە شییكردنەوەی وشەكان دا -، واتە: ئەو حاڵە ناخۆشانەی پەیوەندییان بە دەرەوەی ئینسانەوە هەیە: بێ جێگەو ڕێگەیی، بێ نوێنیی، بێ خۆراكیی، هەژاریی قەرزاریی، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە، وە (الضراء)یش ئەو ناڕەحەتییانەن كە پەیوەندییان بە دەروونی ئینسانەوە هەیە، ئەو ناڕەحەتییانەی تووشی ئینسان دێنو دڵی پێیان تەنگ دەبێ، وەك: نەخۆشییو، ناخۆشییو گرفتو دڵەڕاوكە (ضراء) هەموویان دەگرێتەوە، دەفەرموێ: بە گرفتارییە دەرەكییو نێوخۆییەكان، گرتمانن. (لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ) بەڵكو بپاڕێنەوە، (تَضَرُّع): بریتییە لە دەرخستنی بێهێزیی لە بەرانبەر خوادا، یانی پاڕانەوەو لالانەوەو كڕووزانەوە لە خوا.

١) أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ فِي "شعب الإيمان" برقم: (١٠٧٤)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي "الكبير" برقم: (١١٥٦٠)، وقال الشيخ الألباني: إِسنَادُهُ صَحيح لِغَيرِهِ كَمَا بَيَّنتهُ فِي "ظلال الجنة تخريج السنة" لابن أبي عاصم.

ئنجا بۆچی خوای پەروەردگار ئاوا گرتنیو سزای دان؟ حیکمەتەکەی ئەوە بووە، کە لە خوا بپاڕێنەوەو بێهێزیی خۆیان لە بەرانبەر خوادا پێشان بدەنو بەندایەتیی خۆیان بۆ خوا بنوێنن، ﴿ فَلَوۡلَآ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَا تَضَرَّعُواْ ﴾، (لَولا) لێرەدا پێی دەگوترێ (لَولا)ی (تَحْضيض)ی کە لە زمانی عەرەبی دا، واتە: هاندان، بەمانای (هَلاّ) دێ، یانی: دەبوایە کاتێك کە شیددەتو نارەحەتیی ئێمەیان بۆ دەهات، چ بە قەرزارییو نەدارییو هەژاریی، چ بە نەخۆشییو ناخۆشیی، دەبوایە کڕووزانەوە (تَضَرُّع)یان کردبایەو، لالانەوە پاڕابانەوە، ئاتاجییو پێویستیی خۆیان بۆ خوا پێشان دابایەو، بەندایەتییو خۆیان بۆ خوا خستبایە ڕوو، ﴿ وَلَٰكِن قَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ ﴾، بەڵام دڵیان ڕەق بوو، لەجیاتی ئەوەی کە دڵیان نەرم بێ، وە هەست بە ئاتاجیی خۆیان بکەن بەرانبەر بە خوا، وە لە خوا بپاڕێنەوە بلالێنەوە، کەچی بەپێچەوانەوە: دڵیان ڕەق بوو، بۆچی دڵیان ڕەق بوو؟ ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، شەیتان ئەو کردەوانەی کە دەیانکردن، کردەوە خراپەکانیانی بۆ جوان کردن، دیارە لە ئەنجامی کردەوەی خراپیشدا ئینسان دڵی ڕەق دەبێ، دڵی ئینسان بە طاعەتو چاکە نەرم دەبێو، بە گوناهو تاوان سەختو ڕەق دەبێ، وەك خوای زاناو شارەزا دەربارەی جوولەکەکان دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗ...﴿١٣﴾ ﴾المائدة، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە پەیمانی خوایان هەڵوەشاندەوەو شکاند، لەعنەتمان لێکردنو دڵیشیانمان ڕەق کرد، کەواتە: خوا لەخۆڕا دڵی کەس ڕەق ناکات، چونکە لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: دڵیانمان ڕەق کرد، مۆرمان بەسەر دڵەوە نان، لە ئەنجامی چی دا؟ بەهۆی کردەوە خراپەکانەوە، ئینسان دڵی ڕەق دەبێو مۆری بەسەر دڵەوە دەنرێو، حاڵەتی دەروونیی تێکدەچێ: چاوی هەق نابینێ، گوێی هەق نابیستێ، دڵی هەق دەرك ناکات.

ئنجا خوای قسە لەجێ لەسەر ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دیکەدا بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ

﴿فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ﴾، ئنجا دوای ئەوەی، ئەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون، فەرامۆشیان کردو لەبیریان چوو، واتە: دوای ئەوەی کە ئەو ناخۆشیی‌و نارەحەتییانەی هاتبوونە ڕێیان، کاریان تێنەکردن‌و لەجیاتی ئەوەی دڵیان نەرم بێ‌و بگەڕێنەوە لای خواو، هەست بە ئاتاجیی خۆیان بکەن‌و، بەندایەتیی خۆیان بۆ خوا بنوێنن، لەبیریان چووو فەرامۆشیان کرد، ئەوجار بارەکەمان لێ گۆڕین لە تاقیکردنەوەکەیان دا ﴿فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ﴾، ئەوجار دەرگاکانی هەموو شتێکمان لێکردنەوە، واتە: دەرگای خۆشیی‌و نازو نیعمەت‌و هەبوون‌و... هتد، دوای ئەوەی کە بە نەهات پەندیان وەرنەگرت، ئەوجار دەرگای هاتمان بۆ کردنەوە، بەڵکو بگەڕێنەوە، دیارە خوای میهرەبان مەبەستی ئەوە بووە کە بگەڕێنەوە، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: ئەوە وەك سزایەك بووە، دوای ئەوەی بە تەنگانەو نارەحەتییەکان تەمبێ نەبوون‌و پەندیان وەرنەگرت، ئنجا خوا ﷻ وەك سزایەك بۆ ئەوەی زیاتر لەخۆبایی بن‌و، زیاتر لە خوا دوورکەونەوە، وە سەرەنجام زیاتر شایستەی سزا بن، خوا دەرگای نازو نیعمەتی بەسەردا کردنەوە.

لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، دەفەرموێ: ﴿إِذَا رَأَيْتَ اللهَ يُعْطِي الْعَبْدَ مِنْ الدُّنْيَا عَلَى مَعَاصِيهِ مَا يُحِبُّ فَإِنَّمَا هُوَ اسْتِدْرَاجٌ، ثُمَّ تَلا رَسُولُ اللهِ ﷺ: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةً فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ﴾﴾[1]، واتە: گەر بەندەیەکت بینی بەردەوام بوو لەسەر گوناهکردن، خواش نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتبوو، ئەوە بزانە پەلکێشکران (إستدارج)ە، {واتە: خوا پەلکێشی دەکات بۆ سزادان، وەك چۆن کەسێك ئاژەڵێك دادەبەستێ، ئەگەر مەبەستی بێ سەری ببڕێ، ئالفی دەداتێ‌و خزمەتی

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٣٤٩)، وَالطَّبَرَانِيُّ في الكبير برقم: (٩١٣)، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٤٥٤٠)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: الروياني برقم: (٢٦٠)، قَالَ المناوي: قَالَ العرَاقي: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ. وَصَحَّحَهُ الألباني في "السلسلة الصحيحة" رقم: (٤١٣).

دەکات، تاکو قەڵەو بێ، بۆئەوەی بەکەڵکی سەربڕینێ بێ}، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکەی خوێندەوە: ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ ... ﴾ .

بەڵێ: خوای دادگەر هەندێ لەوانەی کە بە هەموو شتێك تاقییان دەکاتەوە، هەر دەیدەنە لاملییو پشت لە خوا دەکەن، بۆئەوەی زیاتر شایستەی سزای پڕ بە پێست بن، دەرگای خێرو خۆشییان لێدەکاتەوە، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ ﴾، هەتا ئەو کاتەی زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کە پێیان دراوە، وشەی (فَرِحوا) بە زۆری لە قورئاندا بۆ حاڵەتی زەمکراو بەکارهاتوە، (فَرِحوا) لێرەدا واتە: تا کاتێ کە لەخۆبایی بوون، شانازییان بەخۆیانەوە کردو زۆر دڵخۆشبوون، خوایان لەبیر چوو، بەوەی کە پێیان درابوو، کە بە شێوەی نەناسراو (المجهول) هێناویەتی، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ ﴾، هەتا کاتێ کە دڵخۆش بوون، بەوەی کە پێیان دراوە، بۆیە بکەر (فاعل)ەکەی دیار نیە، وەك ئەوەی نەیانزانیبێ کێ پێی داونو ئەو خۆشییو نازو نیعمەتە، لە کێوەیە؟ دوای ئەوەی کە زۆر دڵخۆشو لەخۆبایی بوون، ﴿ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴾، کتوپڕ گرتمانو یەکسەر کەوتنە حاڵەتی بێئومێدیی، کەوتنە حاڵەتی تەمابڕاو بوون، یاخود کەوتنە حاڵەتی بێدەنگییو کشوماتیی، لە خەمو خەفەتو نارەحەتییو، لەژێر فشاری ئەو بەڵاو گرفتارییەدا کە بۆیان هات، هیچ نقەیان نەهاتو زاریان بوو بە تەڵەی تەقیو، ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئیدی سەرەنجام، ئەو کۆمەڵەی کە ستەمیان دەکرد، دوابڕاو بوون، دوایان بڕا، وە ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییانە، ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾، واتە: دوا کەسیان لەبەین چوو، ئنجا ئەگەر کۆمەڵێك دوانەفەریان لەبەین بچێ، ئەدی ئەوانی دیکە چییان لێهاتوە؟ دیارە ئەوان پێشتر لەبەین چوون، کامەیان دەکەوێتە دوایە بۆ لەبەین چوونێ، دیارە ئەوەیان ئاخیر نەفەریانە، لە کوردەواریی خۆمان دا دەڵێ: (قڕەبڕ بوون)، یانی: ئەوەی قڕەیان

(ئـــەوەی دوایـــان) بـــڕا، یـاخود (قیـڕەبـــڕ بـــوون) واتـــە: کەســـیان تێـدا نـەما کـە بقیـڕێنـــێو، هـەموویان لەبەیـــن چـوون، ئـنجـا خـــوا ﷻ ستایشـــی خـۆی دەکـاتو دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ستایش بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانەکانـە، واتـە: خـــوا ستایشـــی خـــۆی دەکـات کـە خەڵـکی زاڵمـی لەبـەین بـردوە، ئەمـە چـی لێوەردەگیـرێ؟ ئەمـە ئـەوەی لێوەردەگیـرێ کـە ئێـوەش ئـەی مسـوڵمانەکانو بەنـدە صاڵحەکـانی خـوا! دژی زوڵــمو زاڵـمان بـن، ئەوەتـا خـوا سـتایشـــی خـۆی دەکات کـە زاڵمی لەبـەین بـردوون، کەواتـە: ئێـوەش وەك خـوای کـارزانـی خۆتـان لـە بەرانبـەری زوڵـم دا بوەستن، وە لەگەڵ زاڵمەکـانـدا دەستەو یەخـەبن، وە مەهێڵـن دنیـا بخـەنە ژێـر ڕکێفـی خۆیـانەوە، جـا چ زاڵـمێکی گـچکە بـێ (خۆماڵـیی بـێ) چ زاڵمێکی گـەورە بـێ (دەرەکیی بـێ)، چ لەسەر ئاستی دنیا بێ، چ لەسـەر ئاستی شارو وڵاتێـك بـێ، چ لەسـەر ئاستی گوندو دێهاتێـك بێ، زوڵم هەرچـۆن بـێ، هـەر شتێکی خراپە، بۆیـەش خـــوای دادگـــەر لەعنـــەتی لـــە زاڵـــمان کـردوەو فەرموویـــەتی: ﴿ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ هـود، ئاگـاداربـن ! نەفرینـی خـوا لـە زاڵمانـە.

ئنجا خـوای تـاكو پـاك دووبـارە بـە پێغـەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ﴾، ئنجـــا سـەرنجیـان ڕادەکێشـێ بـۆ ئـەو هەسـتەوەرانەی کـە پێیـان دراون: هەسـتی بیسـتنو، هەستی بینـینو، هەسـتی دەرك کـردنو شـت زانیـن، دەفـەرموێ: (قُلْ )، پێیـان بڵـێ ﴿ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم ﴾، هەواڵـم پـێ بـدەن، یـان ئایـا دەزانـن! ئەگـەر خـوا بیسـتـنو چـاوەکانی ئێـوەی وەرگـرت، وە مـۆری بەسـەر دڵەکانتانەوە نـا، ﴿ مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ﴾، جگە لـە خـوا چ پەرسـتـراوێك ئـەو ئەنـدامانەتـان بـۆ دێنێتـەوە؟ ئەگـەر خـوا کـەڕی کـردنو، کـوێری کـردنو، بێعـەقـڵی کـردن، ئەو هەستەوەرانەی لێستاندنەوە، کـێ دەتوانـێ ئەوانەتـان بـۆ بگەڕێنێتـەوە؟ بـە کـەس دێنـەوە؟ نـەخێر، کەواتـە: ئـەو خـوایەی کـە بیسـەری کـردوونو، بینـەری

کردوون‌و، عاقڵی کردوون‌و، هۆشیاری کردوون، بەندایەتیی بۆ ئەو خوایە بکەن، ئنجا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، یان بە هەر کەسێ کە قورئان دەخوێنێتەوە، ﴿ أَنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْأَيَـٰتِ ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴾، سەرنج بدە، تەماشا بکە، تێوەڕامێنە، چۆن ئایەتەکانی خۆمان جۆراو جۆر دەکەین، واتە: جارێك دەڵێین: سەرنجی مێژوو بدەن، جارێك دەڵێین: تەماشای قیامەتێ بکەن، جارێك دەڵێین: تەماشای حاڵەتی تەنگەتاویی‌و نارەحەتیی بکەن، یان تەماشای حاڵەتی خۆشیی‌و ناخۆشیی بکەن، یان دەڵێین: تەماشای ئەندامەکانی خۆتان بکەن، ئەگەر خوا لێتان وەرگرێتەوە کێ بۆتان دەهێنێتەوە؟ تەماشا بکەن! چۆن ئایەتەکانیان بۆ جۆراو جۆر دەکەین، ﴿ ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴾ (ثُمَّ للعطف مع التراخي والبُعْد) (ثُمَّ)، ئامرازی گێڕانەوەو بادانەوەیە، لەگەڵ پێچوون‌و دووریی دا، واتە: دوای ئەو ئایەتانەش کە بۆیان جۆراو جۆر دەکەین، ئنجا ئەوان هەر لادەدەن، وشەی (يَصْدِفُونَ ) یانی: لادەدەن‌و لامل دەبن، بەڵام وێڕای ئەوەش ئاماژەیە بە دەردێك کە تووشی حوشتر دەبێ، بەناوی (صَدَف) کە لاقی ڕەق دەبێ‌و نانووشتێتەوە، واتە: ئەوان ملیان ڕەق بووەو، ناتوانن بەلای حەقیدا بسووڕێنەوە، یاخود ئاماژەیە بەو قۆزاخە (صَدَف)ە کە گەوهەری لەنێودایە، کە قۆزاخەیەکی زۆر ڕەقە، یاخود ئاماژەیە بە پارچە شاخ، کە پێی دەگوترێ: (صَدَف)، واتە: ئەوانە وا ڕەق بوون، وەك پارچە شاخێك، یان وەك (صَدَف) ێك، یان وەك حوشترێك کە تووشی ئەو دەردە بووە، ئاوایان لێهاتوە.

دوایی جارێکی دیکە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾، پێیان بڵێ: پێم بڵێن، یاخود ئایا دەزانن! ئەگەر سزای خوا کتوپڕ، یان بە ئاشکرا بێ، {کتوپڕ واتە: بە پەنهانیی، چونکە شتێك کە بە کتوپڕ بێتە بەرچاوت، دیارە بە پەنهانیی هاتوە، ئێستا مارێك بێتە ئەم ژوورە مانای وایە کتوپڕو بە پەنهانیی هاتوە، بەڵام ئەگەر بە ئاشکرا بێ‌و دیار بێ لەبەرچاوت، ئەوە دیارە بە پەنهانیی نەهاتوە}،

﴿ هَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، ئایا جگە لە کۆمەڵی ستەمکاران کێ لەبەین دەچێ؟ واتە: هەر ئێوە لەبەین دەچن، چونکە ئەگەر گریمان سزای خوا بریتی بێ لە کاتی تێکچوونی دنیاش، ئەهلی ئیمان دیارە تویشووی خۆیان پێیە بۆ ئەو سەفەرەو خۆیان ئامادە کردوە، بۆیە بە هیلاك ناچن، واتە: بە مردنێکی خراپ نامرن.

ئنجا لە کۆتایی دا باسی ئامانجو حیکمەتی نێردرانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾ وە ڕەوانەکراوانی خۆمان نانێرین، مەگەر موژدەدەر بنو ترسێنەر بن.

موژدەدەرو دڵخۆشکەر بن، بۆ ئیمانداران، بۆ کەسانێك کە بەدەم بانگەوازی خواوە دێن، وە ترسێنەرو وریاکەرەوە بن، بۆ کەسانێك کە پشت لە بانگەوازی خوا دەکەن، بۆ ئیمانداران کە موژدەی خێرو خۆشیی دنیاو، موژدەی دواڕۆژیان پێبدەن، هی بێبڕوایانیش بیانترسێنن لە ژیان تاڵیی‌و بەدحاڵیی دنیاو، دۆزەخی دواڕۆژ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۡ ءَامَنَ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، ئنجا هەر کەسێك ئیمان بێنێو چاکە بکات، ئەوە نە ترسیان لەسەرە، نە پەژارەش دایاندەگرێ، یانی: نە بۆ داهاتوو ترسیان لەسەرە، نە بۆ ڕابردووش خەمێ دەخۆنو دڵیان نارەحەت دەبێ، بۆچی؟ چونکە (ئەوەی پەرێزی پاکە بێباکە) کە تۆ پەرێزت پاك بووو ژیانەکەت بە پاکیی هێنا، کاتێ تەماشای ڕابردووی خۆت دەکەی، دڵت خۆشە، کەست بە ناهەق نەکوشتوە، زینات نەکردوە، دزییت نەکردوە، خراپەت نەکردوە، هەقی خەڵکت لەلا نییە، فەرمانەکانی خوات جێبەجێ کردوون، بەپێی توانا خزمەتت بە خەڵكو کۆمەڵگای خۆت کردوە، صیلەی ڕەحمت جێبەجێ کردوە، ڕەوشتت بەرزو جوان بووە، خۆت لە گوناهە گەورەکان پاراستوە، وە ئەرکە شەرعییەکانت جێبەجێ کردوون، هەقی خەڵكو دەوروبەرت جێبەجێ کردوە، بۆیە کاتێ تەماشای ڕابردووت دەکەی، خەفەت ناخۆی، وە کاتێ تەماشای داهاتووش دەکەی، کردەوەی چاکت کردوەو، تویشووت پێیەو پەرێزت پاکە، بۆ داهاتووش ترست نییە.

کەواتە: ئەمە ئینسان بیکاتە پێوەرو تەرازوو: تا چ رادەیەك بە رابردووی خۆت دڵخۆشی، وە تا چ رادەیەك بە داهاتووی خۆت ئومێدەواری؟ بەئەندازەی ئەوەی کە ئیمانت هەیەو، چاکسازیی دەکەی، ئومێدەوارییت هەیە بۆ داهاتوو، وە بێباکییشت هەیە بۆ رابردوو، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴾، بەڵام ئەوانەی ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناوە، سزاو ئازاریان تووش دێ، بەهۆی ئەوەوە کە لایان دەدا، ئەو سزاو ئازارە، وەك لە مەسەلە گرنگەکانیشدا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، هەم دنیا دەگرێتەوە، هەم دوارۆژ، بەڵێ، لەراستیدا ئینسانی بێبڕوا، کە بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناکات، هەم لە دنیادا تووشی گرفتاریی‌و ژین تاڵیی‌و بێحاڵیی دێ، وە هەم لە دوارۆژیشدا، وەك خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ﴾ الزمر، بە دڵنیاییەوە: سزاو ئازاری دوارۆژ گەورەترە، خوا پەنامان بدات.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ ﴾، (خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ) بڵێ: ئەی بێبڕوایەکان! ئایا دەزانن، {یاخود هەواڵم پێ بدەن} ئەگەر سزای خواتان بۆ بێ، یاخود کاتی تێکچوونی دنیا بێ، ئایا جگە لە خوا دەپاڕێنەوە، ئەگەر ڕاست دەکەن {کە لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەن}؟ بەڵکو تەنیا لەو دەپاڕێنەوە، وە ئەوەی کە داوای دەکەن، ئەگەر (خوا) بیەوێ لێتان لادەبات، واتە: ئەو ئازارو ناڕەحەتییە، ئەو سزایەی کە بە ملتاندا دێ، خوای میهرەبان لە کۆڵتان دەکاتەوەو لێتان دوور دەخاتەوە، وە ئەوانەی کە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، فەرامۆشیان دەکەن و لەبیرتان دەچن.

وشەی: (أَرَءَيْتَكُمْ) تویژەرەوانی قورئان دوو مانایان بۆ داناون:

یەکەم: هەواڵم پێ بدەن، یاخود پێم بڵێن.

دووەم: ئایا دەزانن! کە ئەگەر سزای خوا بێ، یان کاتی دیاریکراو بێ، ئەوانەی کە لەجیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، ئایا دەتوانن ئەوەی داوای دەکەن، لە کۆڵتان بکەنەوە؟ بە تەئکید نەخێر.

لێرەدا خوای پەروەردگار دەیەوێ هۆشداریی بداتە کافرەکان، کە ئەگەر بڕوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ نەهێنن، ئەگەر لە دنیادا سزای خواتان بۆ بێ، یاخود سزای کاتی تێکچوونی دنیاتان بۆ بێ، جا چ کاتی تێکچوونی گەورە، کە دنیا تێکچێ، یان تێکچوونی گچکە بۆ هەر کامێکیان، کە بریتیە لە مردنی، چونکە زۆرجار گوتوومانە: (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ) هەر کەسێك مرد، قیامەتی وی هاتوە، واتە: چ تووشی نەخۆشیی و گرفتاریی و بەڵاو ئازارێك بن، چ تووشی مەرگ بن، چ تووشی دنیا بەسەردا کاول بوون بن، بێجگە لە خوا کەس

توانای ئەوەی نیە، کە ئازارتان لێ لابداتو، مەرگتان لێ دووربخاتەوە، یاخود ئەوەی کە جێگای مەترسییتانە، لێتان دوور بخاتەوە.

کەواتە مادام هەر خوا پەنایەو، هەر خوا دەتوانێ ئازارو ناڕەحەتییتان لێ دوربخاتەوە، هەر خواش بپەرستنو هاوبەشی بۆ دامەنێن.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴾، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بێگومان لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانمان ڕەوانەکردن بۆ ئۆممەتانو کۆمەڵگەکانی پێشوو ﴿ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ) ئێمەش گرتمانن بە ناڕەحەتییو نەدارییو هەژاریی، وە بە ئازارو گرفتارییەکان ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴾، بەڵکو لە خوا بپاڕێنەوەو بکڕووزێنەوەو بلاڵێنەوە، دان بەوەدا بنێن کە ئەوانە بەندەن‌و، دەبێ بۆ خوا ملکەچ بن.

وشەی: (البأساء)، لە زمانی عەرەبییدا بە (الفَقْرُ وَالحَاجَة و سوء الحَالِ الخارجي) واتە: نەدارییو ئاتاجیی، وە ئەوە کە ئینسان حاڵی دەرەوەی خۆی خراپ بێ، واتە: موڵكو ماڵی نەبێ، سەروەتو سامانی نەبێ، بەرگو پۆشاکی نەبێ، خواردنو خواردنەوەی نەبێ، پێداویستییە سەرەتاییو سەرەکییەکانی نەبن، ئەوە پێی دەگوترێ: (البؤس، البأساء).

(الضَّرَّاء)، بریتیە لە نەخۆشییو تێکچوونیی حاڵەتی نێوەوەی ئینسان، واتە: ئینسان غەمو خەفەتی هەبێ، نەخۆشی هەبێ، ئازارێك لە جەستەی دا هەبێ، یان لە ڕووحی دا.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئۆممەتانی پێش ئۆممەتی تۆمان، بە نەدارییو هەژارییو نەخۆشییو ناخۆشییو ناڕەحەتیی تاقیکردنەوە، بۆئەوەی ملکەچییو زەبوونیی خۆیان لە بەرانبەر خوادا پێشان بدەن، واتە: ئامانجی تاقیکردنەوەکە بۆ ئەوەبووە کە لە خۆیان حاڵی بن، کە پێویستییان بە خوایە، وە لەخۆیان حاڵی بن، کە لە بەرانبەر خوا بێهێزن، وە لەخۆیان بایی نەبن، وە بەرانبەر بە بەندەکانی خوا کە بێهێزن، ملهوریی نەکەن.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ ﴾، ئەم (لولا)یە، (لولا)ی (تحضیض)ی یە واتە: بۆ هاندانە، بەمانای: (هلاّ) یانی: دەبووایە کە ئەو ئازارو نارەحەتییەیان بۆ دەهات، ملکەچییان بۆ خوا دەربڕیبایەو لە خوا پاڕابانەوە، ﴿ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، بەلاّم لەجیاتی ئەوە دڵیان ڕەق بوو، وە شەیتانیش ئەو کردەوانەی کە دەیانکردن، بۆی جوان کرد، واتە: لە ئەنجامی کردەوە شەیتانییەکان دا دڵیان ڕەق بوو.

ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئینسان لە تەنگانەو لێقەوماندا زیاتر هەست بە بێهێزیی خۆی دەکاتو، زیاتر هەست بە ئاتاجیی خۆی دەکات، بۆ خوای بالاّدەست، بۆیە جاری وایە کە خوا مرۆڤ تووشی گرفتارییو دەردەداریی دەکات، تووشی نەخۆشییو ناخۆشیی دەکات، لەبەر ئەوە نیە کە خوا ڕقی لێبێتەوە، بەڵکو خوا بۆیە ئەوەی بەسەر دێنێ، تاکو هەست بە بێهێزیی خۆی بکاتو خۆی بناسێ، وەك گوتراوە: (مَنْ عَرَفَ نَفْسَهُ فَقَدْ عَرَفَ رَبَّهُ) هەر کەسێك خۆی بناسێ، پەروەردگاریشی دەناسێ، کەواتە: خوا دەفەرموێ: میللەتانی پێش ئێوەمان تووشی گرفتارییو نارەحەتیی دەرەکییو دەروونیی کردن، تاکو لەبەر خوا بلاڵێنەوەو هەست بە بێهێزییو ئاتاجیی خۆیان بکەن، لە بەرانبەر خوادا، بەلاّم لە جیاتی ئەوەی کە وابکەن، بەهۆی کردەوە شەیتانییەکانیانەوە کە شەیتان بۆی ڕازاندبوونەوە، دڵیان ڕەق بوو، کەواتە: بەهۆی تاوانو گوناهەوە، ئینسان دڵی ڕەق دەبێ لە بەرانبەر خواو یادی خوادا.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>:** خوا پێشتر فەرمووی: بە نارەحەتییان تاقیمان کردنەوە، نارەحەتیی لە دەرەوەی خۆیاندا، وەك: نەبوونی سەروەتو سامانو جێگاو ڕێگاو دەربەدەریی ئاوارەییو...هتد، وە لە دەروونی خۆیاندا، وەك نەخۆشییو ناخۆشییو خەمو خەفەتو گرفتاریی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴾، بەلاّم کاتێك لەبیریان چوو، یاخود پشت گوێیان کردو فەرامۆشیان کرد، ئەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون، (کە بریتی بوو لە بەلاّو

گرفتارییەکان)، ئەوجار بارەکەمان لێ گۆڕینو بە جۆرێکی دیکە تاقیمان کرنەوە، ﴿ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ ﴾، دەرگای هەموو شتێکمان بۆ کردنەوە، واتە: دەرگای خێرو خۆشییان، پێشێ خوا بە ناخۆشییان تاقیکردنەوە، ئەمجارە بە خۆشییان، تاکو بەهۆی نیعمەتەکانی خواوە، هەست بە چاکەی بکەنو سوپاسی بکەن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ ﴾، هەتا کاتێك زۆر دڵخۆش بوونو لەخۆبایی بوون، بەوە کە پێیان دراوە، لەجیاتی ئەوەی کە بەهۆی نیعمەتەکانەوە چاکەی خوا ببینن بەسەر خۆیانەوەو سوپاسی خوا بکەن، ستایشی بکەنو سوپاسگوزار بن، بە پێچەوانەوە: زۆر دڵخۆش بوون، دڵخۆشبوونێکی لەخۆبایی بووانە! ﴿ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةً فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴾، ئێمەش کتوپڕ گرتمانو سزاماندان، ﴿ فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴾، ئیدی کەوتنە حاڵەتێکی نائومێدییو بێدەنگیی، (إبلاس) ئەوەیە کە ئینسان بێدەنگ بێ، هیچ قسەی بۆ نەمێنێتەوە، یان ئەوەندە خەمو خەفەتی هەبێ، قسەی پێ نەکرێ، یان نائومێد بێو دەستی لە هەموو پچکان ببڕێ.

ئەم ئایەتە موبارەکە وەك ئەم دوو ئایەتەی سوورەتی (الأعراف)ە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ۝٩٤ ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ۝٩٥ ﴾، ئەم دوو ئایەتە هەمان مەبەستی ئایەتەکەی سوورەتی ئەنعام دەگەیەنن، لێرەدا خوا دەفەرموێ: لە هیچ وڵاتێكو شارێکدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردوە، مەگەر دانیشتووانی ئەو وڵاتو شارەمان تاقیکردۆتەوە، بە نەدارییو هەژارییو ناخۆشییو نەخۆشیی، بەڵکو بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوەو هەست بە بێهێزییو ئاتاجیی خۆیان بکەن، بەڵام کە ئەوەیان سوودی نەبوو ﴿ ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ ﴾، دوایی ئەوجار لە شوێنی خراپە چاکەمان دانا، ﴿ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ ﴾، تاکو زیادیان کرد، یان لە سنووری خۆیان تێپەڕینو گوتیان: ﴿ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ ﴾، بابو

باپیرانیشمان تووشی نەخۆشییو گرفتارییو خۆشییو شادمانیی بوون، ئەمە هەر یاساو سوننەتێکەو وەزعی دنیا هەر وایە، کە هەژارییو خۆشییو ناخۆشییو گرفتاریی بەدوای یەکدا دێن، وە لە ژیانی دنیادا ئەو هەورازو نشێوە هەر هەن، ئنجا کە وایانگوتو نەیانزانی تاقیکردنەوەی خوایە، وە نە بەهۆی ناخۆشییو نارەحەتییەکانەوەو، نە بەهۆی خۆشییەکانەوە، نەگەڕانەوە بۆ لای خوا، واتە: نە ئەهلی صەبر بوون، نە ئەهلی شوکر بوون، ﴿ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، لەنەکاو گرتنمان، بێئەوەی کە بۆخۆیان هەست پێبکەن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، واتە: ئەو کۆمەڵەی کە ستەمیان دەکرد، دوابڕاو بوون، واتە: تاقیان لێ نەما، چونکە ئەگەر شتێك دواییەکەی ببڕێ، دیارە پێشەوەکەی زووتر نەماوە، لە کوردەواریی خۆشمان دا دەڵێن: دوابڕاو بوون، یانی: کەسیان نەما، یان دەڵێ: قڕەبڕ بوون، واتە: ئەوەی کە قڕە بووەو لە دواوەیە، ئەویشیان نەماوە، دەشگونجێ بگوترێ: قیڕەبڕ بوون، واتە: کەسیان نەماوە بقیڕێنێ ﴿ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، سوپاسو ستایش بۆ خوای جیهانییان، وشەی ﴿ دَابِرُ ﴾، یش (الدَّابِر، وَالدُّبُر: الظَّهْر) واتە: پشتی ئینسان، دواوەی ئینسان، هەروەها (الدَّابِر: الآخر) دواکەس، بۆیە کە دەفەرموێ: ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ﴾، أَي: آخِرُ مَنْ بَقِيَ مِنْهُمْ) واتە: دوا کەسی ئەو کۆمەڵەی فەوتاند.

ئنجا لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی کە ستەمکار بوون، کۆمەڵی ستەمکاران، دوابڕاو بوونو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە خوا ﷻ زۆری پێخۆشە، زاڵمەکان لەبەین بچن، وە بە پێی ویستو یاسای خۆشیەتی، کە ستەمکاران لەبەین بچن، بۆیە ستایشی خۆی کردووەو، مەدحو سەنای خۆی کردوە، کە ستەمکارو زاڵمەکانی لەبەین بردوون.

کەواتە: مسوڵمانانیش دەبێ شتێك کە خوا پێی خۆشە، وە ستایشی خۆی لەسەر دەکات، کە لەبەینبردنی زاڵمەکانە، دەبێ ئەوانیش تەماشای خوای

کارزان خۆیان بکەن‌و، دژی ستەمی ستەمکاران بن.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَـٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ﴾، واتە: پێیان بڵێ: ئایا دەبینین، دەزانن (یان هەواڵم پێ‌بدەن)، ئەگەر خوا بیستنتانی، یان چاوەکانتانی وەرگرت، یانی: هێزی بیستنی نەهێشت‌و، هێزی بینینتانی نەهێشت، ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم﴾، وە مۆری بەسەر دڵەکانتانەوە نا، واتە: وایلێکردن، نەفامن، ئایا بێجگە لە خوا، چ پەرستراوێك ئەو ئەندامانەتان بۆ دەگێڕێتەوە؟!

وشەی (قلوب) لە قورئاندا بە مانای (عقول)یش دێ، کە کۆی (عقل) و (قلب)ن، واتە: ئەوەی کە ئینسان دەرکی شتی پێ‌دەکات، شتی پێ دەزانێ، ﴿مَّنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ﴾ یانی: ئەگەر خوا کەڕو کوێری کردن، وە شێت‌و حۆلی کردن، کێ جارێکی دیکە چاوو گوێ‌و عەقڵتان پێ دەبەخشێتەوە؟ بەتەئکید هیچ کەس، ئنجا ئەمە سێ شتی لێ وەردەگیرێن:

**یەکەم**: ئەوە وەبیرخستنەوەی چاکەو نیعمەتەکانی خوایە، واتە: ئەو نیعمەتانەی خوا کە خوا پێی داون، بەبێ بەرانبەر، بێئەوەی خۆتان داوای لێ بکەن، ئایا کەس داوای لە خوا کردوە دووچاوی پێ بدات؟ یان دوو گوێی پێ بدات؟ یان زمانێکی پێ بدات؟ یان عەقڵێك‌و دڵێکی پێ بدات؟ نەخێر، بەبێ ئەوەی داوا لە خوای بەخشەرو پەروەردگار بکەین، ئەو نیعمەتانەی هەموو بە ئێمە داون، کەواتە: ئەو خاوەن چاکەیەی، کە ئەو هەموو نیعمەتانەی بە ئێوە داون، هەر ئەو بپەرستن.

**دووەم**: ئەوە هەڕەشەیەو خوا دەفەرموێ: ئەو نیعمەتانەم بە ئێوە داون، شوکری ئەو نیعمەتانە بکەن‌و بۆ ڕەزامەندیی من بەکاریان بێنن: بە چاو هەق ببینن، بە گوێ هەقی ببیستن، بە عەقڵیش هەق بناسن، بەڵام وەختێك ئینسان بە گوێ‌و چاوو عەقڵ، هەق دەرك نەکات، ئەوە لەڕاستیدا شایستەی سزای خوایە، کە خوای دادگەر ئەو هەستەوەرانەی لێ وەربگرێتەوە، یاخود

مانای وایە کە کەسێك کە ئەو گوێو چاوو دڵو عەقڵەی خۆی، کە دەتوانێ هەقیان پێ ببینێو ببیستێو تێبگاو بزانێ، بەکاریان نەهێنێ بۆ دۆزینەوەی هەق، کە لە پەیامی خوادا بەرجەستەیە، ئەوە لەسەر بوونی ئەو هەستەوەرانەی قەرزار بۆتەوە، واتە: جیاوازیی نیە لەگەڵ کەسێك دا، کە کوێرەو کەڕەو شێتو بێ عەقڵە.

سێیەم: پاشان ئەمە ئاماژەشی بۆ ئەوە تێدایە کە پەرستراو ئەو زاتەیە، بتوانێ ئەو شتانە بدات بە ئینسان، ئەوە شایستەی پەرستنە، نەك ئەو دارو بەردو صەنەمو بتو ئینسانو هەموو ئەو شتانەی دەیانپەرستن، هیچ شتێکیان بەدەست نیە، بگرە خۆشیان دەبێ خوا بوونو چاوو گوێیان پێ بدات، کەواتە: ئەو شتانە مەپەرستن، کە ئەو شتانەیان بەدەست نیە.

دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ﴾، واتە: سەرنج بدە! چۆن ئایەتەکانی خۆمانیان بۆ جۆراو جۆر دەکەین، پاشان ئەوان لادەدەنو لاملیی دەکەن، ئەمە دوو واتای هەن:

١/ خوا ﷻ بە زۆر شێوە نیشانەکانی پەرستراوێتیو گەورەیی خۆی دەخاتە ڕوو، جارێك سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، وە جارێك سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ بوونەوەر، بۆ ئاسمانو زەوی، وە جارێك سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ئەو دیاردەو دیمەنانەی کە لە دەوربەرمانن، باران بارینو هەورو ڕووەكو دارو درەختو میوەجات، وە جارێك سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ئەو نیعمەتانەی، کە لەخۆماندا هەن، وەك هەستەوەرەکانمان، وەك چاوو گوێو عەقڵو زمانو، هەموو ئەو ئەندامانەی کە خوا پێی داوین.

٢/ تەماشا بکەن ! چۆن ئایەتەکانی قورئانیان بە جۆراو جۆریی بۆ دەخەینە ڕوو، هەر کۆمەڵە ئایەتێك باسی شتێك دەکاتو، جۆراو جۆرن، ﴿ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ﴾، کەچی دوایی ئەوانە سەرباری ئەو هەموو ئایەتە جۆراو جۆرانەش، لادەدەن.

وشەی (صَدَفَ يَصْدِفُ) یانی: لایدا، لادەدات،(صَدَفْ)یش ئەو قۆزاخەیە کە گەوهەری تێدایەو زۆر ڕەقە، دەبێ بشکێنرێ، هەروەها (صَدَف) بە نەخۆشییەك

دەگوترێ کە تووشی حوشتــر دێ، لاقی ڕەق دەبیّو نانوشـتێتەوە، وە (صَدَف) بـە شــاخو چیــاش دەگوتـــرێ، وە بــە بـــەردی ڕەقــیش دەگوتـــرێ، واتــە: ئەوانــە دڵو عەقڵیان ڕەق دەبـێ وەك (صَدَف)، یاخـود ملـیان ڕەق دەبـێو ناگـەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، لەگـەڵ ئەو هـەموو نیشـانەو ئایەتـانـەی خـوادا.

**مەسـەلـەی شـەشـەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً ...﴿٤٧﴾﴾، واتــە: بڵــێ: ئـایـا دەبیـنـن ! ئایا دەزانـن ! {یـان هـەواڵـم پـێ بـدەن} ، ئەگــەر کتـوپـڕ سـزای خــواتان بـۆ بـێ، یـان بـە ئاشـکرا، دیـاره شــتێك کـتـوپـڕ بێ، بـە پەنهانیی دێو پێشـەکییەکانـی دیـار نیـنو، هەسـتی پـێ ناکـرێ، واتــە: بـە پەنهانیــی بـێ، یـان بـە ئاشـکرا، بـەڵام لـێرەدا فەرموویـەتی: ﴿بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً﴾، (بَغْتَةً) واتـە: کـتـوپـڕ، چونکـە شـتی کـتـوپـڕ هەمیشــە بـە پەنهانیــی هاتوە، (جَهْرَةً ) واتە: بە ئاشکرا، چونکە دەگونجـێ سزای خـوا کـتـوپـڕ بـێ، جاری وایـە کەسـێك تووشـی سـەرەتان دەبـێ، هـەر بەخۆشـی نـازانی، یـان کتـوپـڕ کەسـێك گوللـەیەکـی وێڵـی پـێدەکـەوێ، یـان کـتـوپـڕ دز هـەڵدەکوتنــە سـەری، بـەبێ ئـەوەی چاوەڕوانیـی کردبێ، یـان کـتـوپـڕ بە ڕووداوێکـی هـاتووچـۆ لەبەیـن دەچـێ.

جــاری واشـــە بـەڵا بـە ئاشــکرا دێ: نەخۆشــییەکی لــێ پەیـدا دەبـێ، وردە وردە درێــژە دەخـایەنــێ، یـاخود دەکەوێتــە ژێــر بــاری قــەرزان، هەتــا دەکەوێتـە سـەر ساجی عەلـیو سـەرووەتو سـامانەکەی نامێنــێ، یـاخود حیـزبێکـە، یـان دەوڵـەتێکـە وردە وردە خەڵــك لێـــی هـەڵدەگـەڕێتـــەوەو خۆپیشـــاندان دەکـــەن، وەك ئـــەو دیکتاتۆرانـەی کە بینیمانـن لە: میسـرو تونـسو لیـبیـاو یەمـەنو سـوریاو... هتـد، ئنجـا دەفـەرموێ: بڵــێ: ئەگــەر ســزای خـــواتان بـۆ هــات کـتوپــڕو پەنهــان، یـان ئاشکراو لەبـەرچاوان، ﴿هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ ئایا جگـە لـە کۆمەڵـی سـتەمکـاران کــێ لەبەیــن دەچــێ؟ واتــە: هـەر ئێـوەی سـتـەمکار لەبەیــن دەچــن، ئـەوەش دیسـان هەڕەشـەیە لەو بێبـڕوایانە، کـە دەگونجـێ سـزای خــواتان بـۆ بـێ، بـە پەنهانیـی، یا بە ئاشـکرا، کـتـوپـڕو لەناکـاو یاخود، بە کـاوە خـۆو پلـە بە پلـە.

ئنجا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، ئایا بێجگە لە کۆمەڵی ستەمکاران، کێ لەبەین دەچێ؟ لێرەدا وایفەرمووە، کەچی لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً ...﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: پارێز لە بەلایەك بكەن كە تەنیا تووشی ئەوانەتان نابێ كە ستەمیان كردوە، (واتە: تووشی هەمووتان دەبێ) ئەو دوو ئایەتە بەڕواڵەت تێكدەگیرێن، ئنجا ئایا ئەو ئیشكالە چۆن حەل دەبێ؟ وەلامەكەی ئەوەیە كە:

ئایەتەكەی سوورەتی (الأنفال)باسی سزایەكی تایبەتە، كە لە ئەنجامی كەمتەرخەمیی كۆمەڵگادا، لە بەرانبەر زوڵم و خراپەو ناشەرعیی دا، خوا سزایەك دەنێرێ بۆ كۆمەڵگایەكو هەموویانی پێ سزا دەدات، بە چاكو خراپەوە، بۆیە دەفەرموێ: لە بەلایەك بترسێن، كە بەس تووشی ستەمكارانتان نابێ، بەلام ئەوەی دیكە كە دەفەرموێ: ئەگەر ئازارو سزای خوا هات، ئایا جگە لە ستەمكاران كەسی دیكە لەبەین دەچێ؟ واتە: ئەمە سزایەكە بۆ كافران دێ، لەسەر كوفرەكەیان كە مەبەستی سزای دوارۆژە، یاخود مەبەستی ئەو سزایانەیە، كە خوای بەرز دەیاننێرێ لە ئەنجامی سزادانی كافراندا، نەك لە ئەنجامی كەمتەرخەمیی كۆمەڵگایەك دا، تاكو چاكو خراپیان بگرێتەوە.

واتە: چ ئەوانەی خراپەكار بوون، چ ئەو چاكەكارانەی كە دەستی خراپەكارانیان نەگرتوە، سزایەكە هەمووان دەگرێتەوە، بەلام لە حاڵەتی دووەم دا كە سزای كۆتایی هاتنی ژیانی دنیا دێ، یان بەلایەك دێ، بۆ سزادانی ستەمكارو خراپەكاران، هەرچەندە هەموویان دەگرێتەوە، بەلام تەنیا ستەمكاران بە فیڕۆ دەچن و بە هیلاك دەچن، ئەگەرنا چاكەكاران پاداشتیان دەبێ، بۆ وێنە: ئەگەر ئێستا لافاوێك بێ بەسەر ولاتێك دا، ئەوانەی ستەمكارو خراپەركارن، ئەوە بە هیلاك دەچن، بەلام ئەوانەی ئیماندارو چاكەكار بن، بەڵێ ئەوە بەلایەكەو هاتوە، بەلام ئەوان بە هیلاك ناچن، بەو واتایە كە لێی ناچنە زەرەرێ و ئەوان لەسەر ئەو ئازارو نارەحەتییە پاداشتیان هەیە، یان (طاعون) نەخۆشییەكە كاتی خۆی هەبووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لە ئێوە بیستی

(طاعون) لە وڵاتێکدا هەیە با نەچێتە ئەوێ، وە ئەگەر لەوێ دابوو، با نەچێتە دەرێ، چونکە ئەو کەسەی بە (طاعون)[1] بمرێ شەهیدە، بەڵام ئایا کافر، کە بە (طاعون) دەمرێ شەهیدە؟ بێگومان نەخێر، بە هیلاك دەچێ، بەڵام مسوڵمانەکە بە شەهید لە قەڵەم دەدرێ.

ئنجا فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە پەیوەندیی بەم مەسەلەیەوە هەیە، کاتێك خوای بەخشەر نیعمەتو چاکەکانی بە کۆمەڵێك دەدات، بەڵام ئەوان لەسەر گوناهـ بەردەوام دەبن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە، کە بەرەو سزادان دەچن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذَا رَأَيْتَ اللّٰهَ يُعْطِي الْعَبْدَ مِنْ الدُّنْيَا عَلَى مَعَاصِيهِ مَا يُحِبُّ، فَإِنَّمَا هُوَ اسْتِدْرَاجٌ، ثُمَّ تَلا رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: ﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴾﴾[2]، واتە: ئەگەر بەندەیەکت بینی بەردەوام بوو لەسەر گوناهکردن، خواش نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتبوو، ئەوە بزانە کە ئیستیدراجە (واتە: خوا پەلکێشی دەکات بۆ سزادان، وەك چۆن کەسێك ئاژەڵێك دادەبەستێ، ئەگەر مەبەستی بێ سەری ببڕێ، ئالفی دەداتێو خزمەتی دەکات، تاکو قەڵەو بێ، بۆئەوەی بەکەڵکی سەربڕینێ بێ)، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ئنجا کاتێ ئەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون، فەرامۆشیان کرد، دەرگای هەموو شتێکمان لێ کردنەوە، (بۆئەوەی پەلکێش بکرێن بەرەو سزا)، ئنجا کاتێك دڵخۆش بوون بەوەی پێیان درابوو، کتوپڕ گرتمانو سزاماندانو، سەرەنجام تەمابڕاوو نائومێد بوون.

---

١) ﴿إذا سمعتم به بأرضٍ فلا تَقْدَمُوا عليه، وإذا وقع بأرضٍ وأنتم فيها، فلا تخرجوا فراراً منه﴾ صحيح مسلم: ٥٧٤٥، کە باسی (وباعر) کراوەو ئەمیش یانی (طاعون) بڕوانە: المعجم الوسيط، ص ١٠٠٧، (الوَبأُ: الطاعون وكل مرضٍ فاشٍ عام)، دیارە (وباعر) و (وَبأُ) هەردووکیان هاتوون.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٣٤٩)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي "الكبير" برقم: (٩١٣)، وَالبَيْهَقِي فِي "شعب الإيمان" برقم: (٤٥٤٠)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: الروياني برقم: (٢٦٠)، قال المناوي: قال العراقي: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ. وَصَحَّحَهُ الألباني في "السلسلة الصحيحة" رقم: (٤١٣).

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

## چەند ڕاستییەك لەبارەی پێغەمبەرانەوە ( علیهم السلام )

لێرەدا خوا چەند شتێك دەربارەی پێغەمبەران (علیهم السلام) دەخاتە ڕوو:

١/ سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾، ئێمە پێغەمبەران (علیهم السلام) نانێرین مەگەر ترسێنەرو موژدەدەر بن، واتە: پێغەمبەران بۆ ئەوە نانێرین حەتمەن خەڵك بکەن بە ئیماندار، وە پێغەمبەران بۆ ئەوە نانێرین کە خەڵك سزا بدەن، وە پێغەمبەران بۆ ئەوە نانێرین داوا بکەن خوای بەرز دنیا بەسەر کافراندا وێران بکات، بەڵکو بۆ ئەوەیان دەنێرین کە موژدەی بەهەشت بدەن بە ئیمانداران، وە هەڕەشەی دۆزەخ بکەن لە کافرانو ملهوڕان، واتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر ئەوەندەیان بەدەستە، پەیامی خوا بە خەڵك بگەیەنن، موژدەیان پێبدەن: ئەگەر بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، سەرەنجامیان باش دەبێ، وە خوای پەروەردگار لێیان ڕازی دەبێ، وە سەرەنجامی دنیاشیان باش دەبێ، ژیانێکی بەختەوەرانەو پاكو باشیان دەبێ.

وە ئەگەر بەدەم بانگەوازی خواوە نەیەن، هەم ژیانی دنیایان تاڵو تەنگو نارەحەت دەبێ، هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾طه، هەم ژیانی دواڕۆژیشیان بەدبەختییو پەشێمانیی دەبێ، وە دووچاری سزاو جەزرەبەی خوا دێن.

کەواتە: تۆش ئەی موحەممەد! ﷺ کە یەکێکی لە پێغەمبەران، بەڵکو سەروەری پێغەمبەرانی، ئەرکی تۆش هەر ئەوەیە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، تۆمان نەناردوە، مەگەر موژدەدەرو ترسێنەر بی، بەڵام ئەو بیانوویانەی ئەوان دەیانگرن، ئەو داوایانەی لێت دەکەن، وامان بۆ بکە! بچۆ بۆ ئاسمان...هتد، هیچی ئیشی تۆ نیەو ئەرکی تۆ نیە.

٢/ ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۡ ءَامَنَ وَأَصۡلَحَ ﴾، یانی: هەمیشە ئیمان دەبێتە هۆی چاکسازیی، ئینسان بەهۆی ئیمانەوە صالح دەبێ، پاكو چاك دەبێ، وە چاکسازییکاریش دەبێ، کەواتە: کەسێك ئیمانمان تێدا بینی، بەڵام چاکێتییمان تێدا نەبینی، ئیمان نابینرێ، بەڵام خۆ چاکێتیی دەبینرێ، ئەگەر چاکێتییمان تێدا نەبینی، دەبێ لە ئیمانەکەشی بکەوینە گومانەوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۡ ءَامَنَ وَأَصۡلَحَ ﴾، یان لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ﴾، کەسێك دەڵێ: من ئیمانم هەیە، ئێمە نازانین ئیمان پەنهانە، (الإِيْمَان سِرّ وَالإِسْلاَم عَلاَنِيَة) ئێمە نازانین، بەڵام تەماشای دەکەین، ئەگەر کردەوەی باشی هەبوو، ئەگەر صالح بوو، ئەگەر چاکسازو چاکەکار بوو، دەڵێین: ئیمانی هەیە، بەڵام ئەگەر چاکەمان تێدا نەبینی، لاف لێدانی ئیمان بەبێ چاکیی، بەبێ چاکسازیی، بەبێ کردەوەی باش، لەڕاستیدا دەعوایەکە کەس وەریناگرێ، وە قسەیەکە وەك ماڵی قەڵپەو سەر بە خاوەنیەتی، خوا پەنامان بدات لەوەی کە ئیددیعای ئیمانو ئیسلام بکەین، بەڵام چاك نەبینو چاکساز نەبین.

٣/ کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، لە قورئاندا زۆرجار ئەم ڕستەیە هاتوە: ﴿ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، چونکە: ئینسان دوو حاڵەتی هەن لە ژیانیدا: ترسی داهاتووی هەیەو، خەمی ڕابردووی هەیە، ترسی داهاتووی هەیە: دەبێ چیم لێبێ؟ خەمی ڕابردووشی هەیە: خوایە! دەبێ ئەو گوناهانەی ڕابردوومو ئەو ژیانەی ڕابردووم، چۆنم بۆ حیساب کرابێ؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێ: کەسێك خاوەنی ئیمان بێو کردەوەی باشی هەبێ، یان خاوەنی ئیمانو چاکە بێ، نە ترسی داهاتووی هەیە،

حەتمەن خوا لەگەڵی بە کەرەم دەبێ، نە ترسی ڕابردووشی هەیە، بەهۆی ئیمانەکەیەوە، (الإِسْلاَمُ يَهدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ)[1] ئیمانو ئیسلام پێش خۆی دەسڕێتەوە، ئەگەر ئیمانی چاکت هێنابێ، ئەگەر تۆبەی باش بکەی بۆ لای خوا، ڕابردووت دەسڕێتەوە، خاوێن دەبیتەوەو نەجاتت دەبێ، کەواتە: پەژارەت بۆ داهاتوو نابێو ڕابردووشت چاك دەبێ.

کەواتە با ئەوەی ئینسان بیکاتە تەرازوو: بایی ئەوەندە کە دڵ ئارامییت هەیە، سەبارەت بە داهاتووو ئایندەت، وە ئیرتیاحو ئاسودەییت هەیە، سەبارەت بە ڕابردووت، ئەوە بزانە خاوەن ئیمانیت، بەڵام بە مەرجێك ئەوە لە بۆش نەبێ، حەسەنی بەسرایی دەڵێ: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ أَحْسَنَ الظَّنَّ بِرَبِّهِ، فَأَحْسَنَ الْعَمَلَ، وَإِنَّ الْمُنَافِقَ أَسَاءَ الظَّنَّ بِرَبِّهِ، فَأَسَاءَ الْعَمَلَ)[2]، واتە: ئیماندار باشترین گومانی بە پەروەردگاری دەبات، وە باشترین کردەوەش ئەنجام دەدات، بەڵام مونافیق خراپترین گومان بە خوا دەباتو، خراپترین کردەوەش ئەنجام دەدات، لەڕاستییدا جۆری کردەوەیە کە پێت دەڵێ: گومانی باشت بە خوا هەیە، یان گومانی خراپ؟ کەسی وا هەیە دەڵێ: گومانم بە خوای بە بەزەیی زۆر چاکە، خوا منی زۆر زۆر خۆشدەوێ، کەچی نوێژان ناکاتو ڕۆژووان ناگرێ، هیچ چاکەیەکیشی نیە، ئنجا دەشڵێ: وەڵڵاهی مامۆستا ! من بەینم لەگەڵ خوادا زۆر باشە، پێموایە پەیوەندییم لەگەڵ خوادا زۆر زۆر پتەوە ! من دڵم زۆر زۆر باشە، ئیمانێکی زۆر چاکم هەیە، خۆ بەوە نیە کە نوێژ ناکەم !! ئەوەیە دەڵێ: (شەل نیە، بەڵام پای شکاوە)! ئەدی ئەگەر ئیمانی زۆر باشت هەیە، بۆچی نوێژی تێدانیە، ئەدی ئەو ئیمانە باشە بۆچی ناتجووڵێنێ، خۆ ئەگەر سەیارەیەك، مەکینەیەکی باشی لەسەر بێ، باش دەڕوات، ئەدی تۆ بۆچی ناجووڵێیو بەرەو خوا حەرەکەت ناکەی، دیارە مەکینەیەکی باشت لەسەر نیە، مادام ئیمانی باشت هەبێ، دەبێ کردەوەی باشت هەبێ، کانیاوێك ئەگەر کانیاوێکی زۆر سازگار بێ، نابێ ئاوی تێدابێ؟ بەڵام تۆ هیچ ئاوت تێدا نیە، وشكو برینگی ! درەختی باش، میوەشی دەبێ، بەروبوومی باشی پێوە دەبێ، بەڵام تۆ هیچ میوەت

---

١) ﴿ ... أما علمت أنَّ الإسلام يَهدمُ ما كان قَبْلَهُ !﴾ رواه مسلم: (٣١٧).

٢) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبي شيبة برقم: (٣٦٣٣٩).

پێوە نیە، كەواتە زرِی ! بەڵێ ئەگەر ئینسان ئیمانو كردەوەی باشی هەبێ، حاڵەتی دڵ ئارامییو ئۆخژنی بۆ دروست دەبێ سەبارەت بە ئایندەو داهاتووی، وە سەبارەت بە رِابردووشی، بەڵام ئەوە دەبێ لەسەر بناغەیەك بێ.

٤/ ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴾، ئەوانەی كە بڕوایان بە ئایەتەكانی ئێمە نیە، ئەوە سزایان تووش دەبێ.

توێژەرەوانی قورئان هەموو گوتوویانە، ئەوە لە قیامەتێیە، بەڵام من دەڵێم: لە دنیایەش ئەو سزایەیان تووش دەبێو: (يَمَسُّهُمُ العَذَابُ فِي الدُّنيَا وَالآَخِرَة) بەڵێ من پێموایە چەمكی ئایەتەكە دنیاش دەگرێتەوە پێش قیامەت، بۆچی؟ تەماشا بكەن ! دەفەرموێ: ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەكانی ئێمە نیە، ئنجا ئاشكرایە ئەوانەی پابەند نین بە بەرنامەی خواوە:

أ) لە ڕووی جنیسییەوە، ئینحیراف دەكەن، ئەوە نەخۆشییەكانی: ئایدزو سیلانو زوهرییو... هتد، دنیا پڕە لەو نەخۆشییانە.

ب) لە ڕووی خواردنو خۆراكەوە، ئینحیراف دەكەن، مادده سڕكەرو سەرخۆشكەرەكان بەكاردێنن، وەك: تلیاكو حەشیشەو شەڕابو حەبو جگەرەو نێرگەلەو... هتد.

ج) لە ڕووی زۆر خۆرییەوە، ئینحیراف دەكەن، تووشی قەڵەوییو ئەو دەرهاویشتە خراپانەی كە لە قەڵەویی پەیدا دەبن، دەبن.

د) لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە، ئینحیراف دەكەنو تووشی لادان دەبن، ئەو عادەتە خراپانەیان لەنێو پەیدا دەبن، كە دەیانبینین، وەك خووخدەی خراپو، لاساییكردنەوەی خەڵكو، بەدوای مۆدیلو عادەتی خراپی خەڵك كەوتنو، چاولێكەریی.

هـ) لە ڕووی سیاسییەوە، ئینحیراف دەكەنو تووشی زوڵمو خۆسەپێنییو دیكتاتۆریی دەبن، ئەوە دەیانبینین كە چۆن خەڵكو میللەت كە جام پڕ بوو لەسەری دەرژێ، لێیان ڕادەپەڕێو دوایی گۆڕبەگۆڕ دەبنو فڕێ دەدرێنە زبڵدانی مێژوو، وەك (مُعَمَّر قَذَّافِي) كە بە خەڵكی لیبیای دەگوت: (مَنْ

أَنْتُمْ؟ مَنْ أَنْتُمْ؟ أَنْتُمْ جَرَاثِيم) ! ئێوە کێن؟ ئێوە کێن؟ ئێوە میکرۆبن، یان دەیگوت: (أَنْتُمْ جُرْذان)، واتە: ئێوە جرج و مشکن !! وەك جرج و مشك تەماشای میللەتەکەی خۆی دەکرد، بۆیە خەڵکەکەی خۆی لێی ڕاپەڕین و بەوشێوەیە کوشتیان کە دیتمان و، بەو دەردە چوو، کە پێی چوو.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نیە، تووشی سزا دێن، یانی: لە دنیادا پێش قیامەت، ئەوەی لە بەرنامەی خوا لابدات، لەسەر ئاستی تاکیی، لەسەر ئاستی خێزانیی، لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیی، لەسەر ئاستی سیاسیی، لە ڕووی ئابووریی و لە هەر ڕوویەکەوە لە شەریعەتی خوا، لابدات، تووشی بەڵاو گرفتاریی خراپ دەبێ، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الـروم ، واتە: خراپەو ئاشووب تەڕو وشکی گرتۆتەوە، بەهۆی کردەوەی دەستی خەڵکییەوە، تاکو بەشێك لە سزای کردەوەکانیان پێ بچێژێ بۆئەوەی بگەڕێنەوە. یانی لە دنیادا سزایەکەیان تەنیا بەشێکی کەمەو زۆرینەکەی هەڵگرتوە بۆ قیامەت.

٥/ ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴾، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە لایانداوەو لاڕێ بوون، لە چی لایانداوە؟ لە حوکمی عەقڵ و فیطرەت و شەریعەت دەرچوون، لە یاساکانی خوا دەرچوون، بۆ وێنە: کەسێك سەیارە لێدەخوڕێ، کە لە جادە دەردەچێ و بەپێچەوانەی ئاڕاستەی یاساکانی هاتوچۆوە، دەڕوات، یان شەمەندەفەر کە لە سکە دەردەچێ، یا تەیارە کە لە مەجالی خۆی دەردەچێ، یان لەو شوێنەی کە لێی دەنیشێتەوە لە فڕۆکەخانە (مطار) کاتێك لە شوێنەکەی لە (مدرج) دەردەچێ، چی لێدێ؟ بێگومان: سەرەنجامی سووتان و لەبەین چوونە، ئینسانیش وەختێ لاڕێ دەبێ و لە بەرنامەی خوا لادەدات، تووشی سزاو جەزرەبەی خوا دەبێ لە دنیاو دوارۆژدا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتەکانی: (٥٠ تا ٥٨) پێکدێ، واتە: نۆ (٩) ئایەت دەگرێتە خۆی، تەوەری سەرەکیی ئەم نۆ ئایەتە، کە حەوت (٧) جار وشەی (قُل)یان تێدا دووبارە بۆتەوە، واتە: خوا ﷻ حەوت جار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەوە بڵێ...، ئەوە بڵێ...، بە کێ؟ بەو خەڵکەی کە بانگیان دەکات بۆ لای خوا بەگشتی، وە کافرەکانو هاوبەشپەیداکەرەکان بەتایبەت، کە دیارە ئەو کۆمەڵگایە کە ئەوکات پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بۆتەوە، بەزۆریی هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوابوون، جا تەوەری سەرەکیی ئەم نۆ ئایەتە بریتیە لە ڕێنماییو ئامۆژگاریی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە بواری مامەڵەکردنییدا لەگەڵ هەرکام لە بێبڕوایانو هاوبەش بۆ خوا دانەران لە لایەکەوە، وە بڕواداران لە لایەکی دیکەوە.

خوا فەرمانی پێ دەکات، کە چەند ڕاستییەکی گەورەو گرنگ لەبارەی خۆیو بەرنامەو پەیامەکەیەوە بە بێبڕوایەکان ڕابگەیەنێ، وەك:

١/ ئیددیعا نەکردنی خاوەندارێتیی خەزێنەکانی خوا.

٢/ ئیددیعا نەکردنی زانینی نادیار (غیب).

٣/ ئیددیعا نەکردنی ئەوەی کە فریشتەیە، چونکە بێبڕوایەکان هەندێ شتیان لێ داوا دەکرد، وەك خەزێنەکانی خوا لەبەردەستی پێغەمبەر ﷺ دابن، یاخود توانایەکی یاسادڕ (خارِقُ العادَة)ی هەبێ، پاشان خوا فەرمانی پێ دەکات، کە کەسانێك بە قورئان هۆشیار بکاتەوە، کە ترسی دیداری پەروەردگارییان هەیە لە دواڕۆژدا.

ئنجا دوایی خوا ﷻ دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئیماندارانـدا ڕێنمایی دەکـاتو پێـی دەفـەرموێ: بـڕواداره دڵسـۆزو ڕەشو ڕووتـەکان، بـە مەبەسـتی سـەرنج ڕاکێشـانی بێبـڕوا زلـە زلـەکان، لـە کـۆڕو مەجلیسـی خـۆت دەرمەکـە، چـونکە ئـەوان تەکلیفیـان لێدەکرد: ئەو ڕەشو ڕووتانە دەربکە، ئنجا دێینـە کـۆڕو مەجلیسی تۆوە، خوای پەروەردگاریش بە پێغـەمبەر دەفەرموێ ﷺ هەرگیز شتی وا نەکەی.

پاشـان فـەرمانی پێـدەکات کـە هـەر کـات بڕوادارەکـان هاتنــە کـۆڕو مەجلیسـیەوە، سـەلامیان لـێبکات، وە سەلامی خـوایان پێ بگەیەنـێ، وە موژدەی بـەزەییو لێخۆشـبوونی خـوای بە بەزەیـی بۆ کردەوە خراپەکانیـان، پێ بـدات.

لە کۆتـایی دا خـوا فەرمـان بە پێغـەمبەر ﷺ دەکات کـە چەند شـتێك بـە کافرەکـان بڵـێ، بەتایبـەت، وە بە خـەڵك بەگشـتی:

١) مـن ڕێـم لێگیــراوە کـە پەرسـتــراوەکانتان کـە جگـە لـە خــوا لێیـان دەپــاڕێنەوە، بپەرسـتم.

٢) وە من شـوێنی ئارەزووەکانتـان ناکـەوم، ئەگـەرنا گـومڕا دەبـم.

٣) وە من لەلایـەن پەروەردگارمـەوە لەسـەر بەڵـگەیەکی ڕوونم، واتـە: لەسـەر ڕێبـازێکـی ڕوونـم، وە سـزادانیشـتان عاییدی خـوایەو بەدەست من نیـە.

٤) وە سـزادانــی ئێـوە کـە پەلــەی لێدەکــەن، ــ چونکــە کـافرەکــان پەلەیــان دەکـردو دەیانگـوت: بۆمـان بنێـرەوە دەیانگـوت: کـوا؟ بـا دۆزەخ بـێ، وە ئاسـمانمان بەسـەردا بڕووخێنـە ـ ، ئەگـەر سزادانتان بەدەست من بووایـە، ئەوە کێشـەی نێوانمـان کۆتـایی دەهاتو زوو یەکلایـی دەبویــەوە، واتە: ئەو سزایەم زوو بەسەردا دادەبەزانـدن، بەڵام ئەو سزایە بەدەسـت من نیــە، بەڵکو لەدەسـت خـوای باڵادەسـت دایـە.

﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ
إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرۡ
بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ
يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ مِنۡ
حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم
مِّنۢ بَيۡنِنَآۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا
فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۖ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ
سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ
ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٥٥﴾ قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهۡوَآءَكُمۡ قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذٗا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلۡ إِنِّي
عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبۡتُم بِهِۦۚ مَا عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦٓۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ
إِلَّا لِلَّهِۖ يَقُصُّ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوۡ أَنَّ عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦ
لَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۗ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بڵێ: پێتان ناڵێم عەمبارەکانی خوام لەلان، وە پەنهان نازانم، وە پێتان ناڵێم من فریشتەم، من تەنیا شوێن ئەو سرووشە دەکەوم کە بۆم دێ، بڵێ: ئایە کوێرو بینەر یەکسانن، ئایا بیر ناکەنەوە؟ ﴿٥٠﴾ وە ئەو کەسانەی پێ بترسێنەو وریا بکەوە (واتە: بە قورئان)، کە دەترسن بۆ لای پەروەردگاریان کۆبکرێنەوە (لە حاڵێکدا) کە جگە لەو هیچ پشتیوانو تکاکاریان نین، بەڵکو پارێز بکەن ﴿٥١﴾ وە ئەوانە (لە کۆڕی خۆت) دەرمەکە، کە بەیانیانو ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو، مەبەستیان ڕوو (ڕەزامەندیی)یەتی، نە هیچ لێپرسینەوەیەکی وان لەسەر تۆیەو، نە هیچ لێپرسینەوەیەکی تۆش لەسەر وانە، جا ئەگەر (گریمان) دەریان بکەی، لە ستەمکاران دەبی ﴿٥٢﴾ وە ئاوا هەندێکیان بە هەندێکیان تاقیدەکەینەوە (لە ڕووی سامانو پێگەی کۆمەڵایەتییەوە جیاوازییان دەکەین) تاکو (خۆ بەزلگرە بێبڕوایەکان) بڵێن: ئایا ئەوانەن کە خوا لە نێوان ئێمەدا (هەڵبژاردوونو) چاکەی لەگەڵ کردوون؟! (بەڵام) ئایا خوا زاناتر نیە، بە سوپاسگوزاران (تاکو هەڵیانبژێرێ بۆ هیدایەت دان)؟! ﴿٥٣﴾ وە هەر کات ئەوانەت هاتنەلا، کە بڕوا بە ئایەتەکانمان دێنن، ئەوە پێیان بڵێ: سەلامتان لێ بێ، پەروەردگارتان بەزەیی نواندنی لەگەڵتان دا لەسەر خۆی پێویست کردوە، وە بە دڵنیاییەوە، هەرکامێکتان نەفامانە خراپەیەك بکات، ئنجا دوای ئەوە بگەڕێتەوەو چاکسازیی بکات، ئەوە (خوا) لێبوردەی بە بەزەییە (بەرانبەری) ﴿٥٤﴾ وە بەو شێوەیە ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە (تاکو لێیان تێبگەن)، وە بۆئەوەی ڕێبازی تاوانباران ڕوون بێتەوەو بزانرێ ﴿٥٥﴾ بڵێ: من ڕێگریم لێکراوە کە ئەو (پەرستراو)انەی لە جیاتی خوا داوایان لێدەکەن، بیانپەرستم، بڵێ: دوای ئارەزووەکانتان ناکەوم، ئەگەر وابکەم، گومڕا دەبم، وە من لە ڕێنماییکراوان نابم ﴿٥٦﴾ بڵێ: بێگومان من لەلایەن پەروەردگارمەوە لەسەر ڕێ (بەڵگە)یەکی ڕوونم، کەچی ئێوەش بەدرۆی دادەنێن، ئەو (سزایەی) پەلەی لێدەکەن (بۆتان بێ) لەلای من نیە، حوکمو بڕیار هەر هی خوایە، هەق باس دەکات، وە باشترینی دادوەرییکەرانە

﴿٥٧﴾ بلێ: ئەگەر ئەو (سزای)ەم بەدەست بووایە کە پەلەی لێدەکەن، کاری نێوان منو ئێوە کۆتایی دەهات، (و بە سزای خۆتان دەگەیشتن) وە خوا بە ستەمکاران زاناترە ﴿٥٨﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(خَزَآئِنُ ٱللَّهِ): واتە: عەمبارەکانی خوا، بە کوردیی دەڵێین: عەمبار یان ئەمبار، دەشڵێین: خەزێنە، دەڵێ: (الخَزْنُ: حِفظُ الشَّيءِ فِي الخِزانَة، وَالخَزَائِنُ جَمْعُ خِزَانَة)، (خَزْن) بریتیە لە پاراستنی شتێك لە عەمباردا، یاخود لە شوێنی تێدا هەڵگیرانیدا، وە (خَزائِن) کۆیەکەی (خِزَانَة)یە، ئێمە لە کوردیدا دەڵێین: خەزنە، یان خەزێنە، بەڵام ئەسڵی خۆی بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (خِزَانَة) کە کۆیەکەی (خَزائِن)ە.

(وَلَا تَطۡرُدِ): واتە: دەرمەکە، (الطَّرْدُ: هُوَ الإِزْعَاجُ وَالإِبْعَادُ عَلَى سَبيل الإِسْتِخْفَاف)، (طرد): بریتیە لە ناڕەحەتکردنو دوورخستنەوە، بە شێوەیەکی کەم تەماشاکەرانە.

(بِٱلۡغَدَوٰةِ): (الغَدْوة وَالغدَاة: أَوّل النهار، وقُوبِلَ الغُدوُّ بالآصال، وَالغَدَاةِ بالعَشيِّ) وشەی (غَدْوة وَغداة) هەردووکیان بە مانای سەرەتای ڕۆژن، پێش نیوەڕۆ یان بەرەبەیان، وە وشەی (غُدوّ) واتە: بەیانیان لەگەڵ (الآصال)دا دێ، واتە: ئێواران، وە وشەی (غداة)یش لەگەڵ (عَشِيّ)دا، دێ، هەردووکیان بە مانای بەیانیو ئێوارە، یاخود پێش نیوەڕۆو دوای نیوەڕۆ، دێن.

(وَٱلۡعَشِيِّ): دەڵێ: (العَشِي: مِنْ زَوَال الشَّمْس إِلى الصَّبَاح) (عَشِي): بریتیە لەو کاتەوە کە ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسمانەوە لادەدات، واتە: ئێوارە دێ، تاکو بەیان، هەر پێی دەگوترێ (عَشيِّ).

(وَجْهَهُۥ): (أَصْلُ الوَجْه الجَارِحَة وَاسْتُعْمِلَ فِي مُسْتَقبل كُلّ شَيء، وعُبّر عَنِ الذَّاتِ بالوَجْه)، (وجه) له زمانی عەرەبیدا بریتیه لەو ئەندامەی ئینسان كه دەكەوێته نێوان هەردوو گوێیەكانی لەگەڵ چەناگەو پێشه سەری، بەڵام بەكاریش هێنراوه بۆ پێشەكیی هەر شتێك، دەڵێ: ئەو خانووه ڕووی له منه، یان بەڵایەك هات، پێموایه ئەو بەڵایه ڕووی له منه، پێشەكیی هەر شتێك پێی دەگوترێ: (وجه) وه هەروەها لەجیاتی (ذات)یش (وَجه) بەكاردێ، ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾الرحمن، دەگونجێ مەبەست له (وَجْهُ) لێرەدا (ذات) بێ، واته: زاتی هەموو شتەكان لەبەین دەچێ، تەنیا زاتی خوا دەمێنێتەوه، دەشگونجێ مەبەست به (وجه) سیفەتێكی خوای پەروەردگار بێ، دیاره سیفەتەكانیش وەك زاتن، وەك چۆن نازانین زاتی خوا چۆنه، سیفەتەكانیشی ناتوانین چۆنیەتییەكەیان دیاریی بكەین.

هەروەها (وجه) به مانای ڕەزامەندییش دێ، ئەگەر كەسێك ڕوو بداته كەسێك، مانای وایه لێی ڕازییه، دەڵێ: ڕووی لەگەڵم خۆشه، مانای وایه لێی ڕازییه، ئەگەر ڕووی لێ وەرچەرخاند، مانای وایه لێی تووڕەیه، كەواته: (وجه) بەمانای ڕەزامەندییش دێ.

(حِسَابِهِم): (حِسَاب) واته: لێپرسینەوه، حیسابو كیتاب، لێپرسینەوەیه، یانی حاڵو وەزعیان لەسەر تۆ نیەو، حاڵو وەزعی تۆش لەسەر وان نیه، دەڵێ: (حَسَبَ المَالَ: عَدَّهُ وَأَحْصَاهُ، وَحاسَبَهُ، ناقَشَهُ الحِسَاب)، (حَسَبَ المال): واته:ماڵو سامانەكەی ژمارد، سەرژمێری كرد، (حاسَبَهُ): واته لێپرسینەوەی لەگەڵدا كردو لێی پێچایەوه.

(فَتَنَّا): یانی: (إختَبَرْنا وابْتَلَيْنا) تاقییمان كردووه، جەرباندمان.

(مَنَّ): واته: چاكەی لەگەڵ كردوون، دەڵێ: (المِنَّة: النِّعْمَةُ الثَّقِيلَة، مَنَّ فُلانٌ عَلَى فُلانٍ، إِذَا أَثْقَلَهُ بالنِّعْمَةِ)، (مِنَّة) واته: چاكەی قورسو گران، دەگوترێ: فلان

کەس مینندەتی لەسەر فلان کەس کرد، واتە: چاکەیەکی لەگەڵدا کردوە، باری قورس کردوە، بەڵام بە زۆریی بۆ حاڵەتی زەم بەکاردێ، وەك یەکێك بە یەکێکی دی دەڵێ: منەتم لەسەر مەکە، بەڵام جاری واش هەیە کابرا دەڵێ: تۆ منەتێکی زۆرت لەسەر منە، منەتم بە تۆ هەیە، یانی: چاکەت لە چاوی مندا هەیە.

(نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ): واتە: ئایەتەکانی خۆمان ڕۆشن دەکەینەوە، دەڵێ: (التَّفْصيل: التَبيينُ، لأَنَّهُ يفصل الأُمُور بَعْضَهَا عَنْ بَعْض فَتَتَبَيّنَ) ئەگەر چەند شتێك کۆمەڵ بوون بەیەکەوە بوون، یەکێکیانت جیاکردەوە، مانای وایە ڕوون بۆوە، بەڵام ئەگەر هەموویان بەیەکەوە کۆمەڵ بن، لێت تێکەڵ دەبن، خوا دەفەرموێ: ئاوا ئایەتەکانی خۆمان لە یەکدی جیادەکەینەوە، ڕوونیان دەکەینەوە، وە (فاصِل) لە (فَصْل)ەوە هاتوە، (الفَصْلُ: إبَانَة أَحَد الشَّيْئَيْنِ مِنَ الآخَر حَتَّى يَكُون بينهما فُرْجَةٌ، وَالحُكْم بَيْنَ النَّاس، وَالفَيْصَل الحَاكِمُ، وقِيل: القَضَاء بَيْنَ الحَقّ وَالبَاطِل)، وشەی (فَصْل): بریتیە لەوە کە دوو شتان لە یەك جیابکەیەوە، بەینیان هەبێ، هەروەها دادوەریی کردن لە نێوان خەڵکیدا، وشەی (فَصل)ی بۆ بەکاردێ، وە (فَيصَل) بریتیە لە: دادوەر، هەروەها بریتیە لە: دادوەریی کردن لە نێوان هەقو ناهەقدا.

(بَيِّنَةٍ): (البَيِّنَات جَمْعُ بَيِّنَة: الدَّلاَلَةُ الوَاضحَة) واتە: (بینات) کۆی (بَيِّنَة)یەو ئەمیش ئاوا پێناسە کراوە: (الدَّلاَلَة الوَاضحَة عَقْلِيَةً كَانَتْ أو مَحْسُوسَة، و سُمِّيَ شَهَادَةُ الشَّاهِدَين بينةً، كَمَا جَاءَ في صحيح مُسلِم: البَيِّنَةُ عَلَى المُدَّعِي) واتە: ڕێنیشاندانێکی ئاشکرا، بەڵگەیەکی ئاشکرا، چ عەقڵیی بێ، چ بەرهەست بێ، بۆیە شایەدیی دانی دوو شاهێدان پێی گوتراوە: (بَيِّنَة) چونکە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرایە، یاخود ڕێنیشاندەرێکی ئاشکرایە، کە ئەو شتە بەوجۆرە بووە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ، هاتوە فەرموویەتی: (البَيِّنَةُ عَلَى المُدَّعِي)، واتە: کەسێك ئیددیعایەك بکات دەبێ بەڵگەیەکی ڕوون بێنێ.

(ٱلْحُكْمُ): دەڵێ: (الحكم بالشيء أن تقضيَ بِأَنَّهُ كَذَا وَلَيْسَ بِكَذَا، سَوَاء ألزمت ذلك غيرك، أو لم تُلْزِمْهُ) دەڵێ: حوکم دان بە شتێك ئەوەیە تۆ بڕیار بدەی

ئەو شتە ئاوایەو ئاوا نیە، ئنجا یەکسانە تۆ ئەو کەسە پابەند بکەی، یان پایەند نەکەی، واتە: حوکم دان بە شتێك، بۆ وێنە: من دەڵێم: حوکم دەدەم بەوەی کە فلان کەس ئینسانێکی باشە، یان فلان کەس ئینسانێکی خراپە، مەرج نیە سزاشی بدەی لەسەر خراپەکەی.

(يَقُصُّ ٱلۡحَقَّ): واتە: هەق دەفەرموێ: یان هەق ڕوون دەکاتەوە، دەڵێ: (القَصُّ: تتبع الأَثَر، وَالقَطْع، وَالـمِقَصُّ: الـمِقراض): (قَص) ئەوەیە کە بەدوای شوێن پێ بکەوی، یان بریتیە لە بڕینی شتێك، وە (مِقَص) بۆیە وای پێدەگوترێ، چونکە شتی پێ دەبڕدرێ.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾، لەوبارەوە ئەم دەقە گێڕدراوەتەوە:

﴿عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه قَالَ فِيّ نَزَلَتْ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ ... ﴾، قَالَ: نَزَلَتْ فِي سِتَّةٍ: أَنَا وَابْنُ مَسْعُودٍ مِنْهُمْ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ قَالُوا لَهُ تُدْنِي هَؤُلاَءِ، وَفِي رِوَايَةٍ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ فِي سِتَّةَ نَفَرٍ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ لِلنَّبِيِّ ﷺ اطْرُدْ هَؤُلاَءِ لاَ يَجْتَرِئُونَ عَلَيْنَا، قَالَ: وَكُنْتُ أَنَا وَابْنُ مَسْعُودٍ وَرَجُلٌ مِنْ هُذَيْلٍ وَبِلاَلٌ وَرَجُلاَنِ لَسْتُ أُسَمِّيهِمَا فَوَقَعَ فِي نَفْسِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقَعَ، فَحَدَّثَ نَفْسَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ ... ﴾﴾[1] وە (الوَاحِدي) لە (أسباب النزول)دا هێناویەتی ناوی شەش کەسەکەشی هێناوە، کە ئەمانەن: (سعد وإِبْنُ مَسْعُود وَصُهَيب وَعَمَّار وَالمِقْدَاد وَبِلال)[2].

واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص، دەڵێ: ئەم ئایەتە موبارەکانە لەبارەی منەوە هاتنە خوار، دوایی دەڵێ: لەبارەی شەش کەسانەوە هاتنە خوار، من یەکێکیان بووم و عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیش یەکێکیان، {دوایی ناوی شەشە کەسەکانیش هاتوە لەلای (الواحدي)، کە: (عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودە، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصە، صوهەیبە، عەممارە، میقدادی کوڕی ئەسوودە، لەگەڵ بیلالی حەبەشیی)، ئەوانە

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٤١٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٨٢٦٤)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٢٨)، وَالوَاحِدي في "أَسباب النزول" ص١٤٥.

٢) بڕوانە: (الإِستيعاب في بيان الأسباب ج٢، ص١٣٧، سليم الهلالي، ومحمد بن موسى آل نصر).

ڕەش‌و ڕووت‌و سادەو، هەندێکیان کۆیلە بوون‌و، هەندێکیان هەر هەژارو نەدارو لێقەوماو بوون، شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ زۆربەیان هەر ئەوانە بوون، بەڵام دیارە دەوڵەمەندیشیان تێدا بوون وەك: ئەبوبەکری صیددیق‌و، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف‌و، عوسمانی کوڕی عەففان، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، بەڵام زۆربەیان ڕەش‌و ڕووت بوون} کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پێیان گوت: (واتە بە پێغەمبەر ﷺیان گوت): تۆ ئەمانە لەخۆت نزیك دەخەیەوە، بۆیە ئێمە نایەینە کۆڕو مەجلیسی تۆ.

وە لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتوە ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین شەش کەس بووین، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە پێغەمبەرﷺیان گوت: ئەوانە دەربکە نەیەنە کۆڕو مەجلیسی ئێمەوە، جورئەت نەکەن بێنە نێومان، {کە تەنها لە مەجلیسی پێغەمبەردا ﷺ ئەو ڕەش‌و ڕووتانە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دادەنیشتن، ئەگەرنا ئەوانە قبووڵیان نەدەکرد بێنە مەجلیسیانەوە، بێنە (دار النّدوة)، یاخود بێنە ئەو شوێنانەی کە تایبەتن بەوانەوە}[1].

ئنجا سەعد دەڵێ: من‌و ئیبنو مەسعوود وە پیاوێك لە هوذەیل، وە بیلال، وە دوو پیاویش کە ناوەکانیان نازانم، ئێمە ئەو شەشە بووین (کە دوایی ناوەکانی دیکەش هاتوون کە لەسەرەوە باسمان کردن)، دەڵێ: ئەوان کە ئەو پێشنیارەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ کردو ئەو داواکاریەییان لێکرد، ئەوە کەوتە دڵی پێغەمبەرەوە ﷺ، کە خوا ویستی بکەوێتە دڵی، (واتە: شتێك بە دڵی داهات، تەماشا دەکەین ئەو هاوەڵانە چەند بەئەدەب بوون، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، نەیانگوتوە: ئەوەی هاتۆتە دڵەوە کە: ئێمە دەربکات! بەڵکو دەڵێن: ئەوەی هاتە دڵەوە کە هاتە دڵی، دیارە پێغەمبەر ﷺ تەماشای کردوە، گوتوویەتی: من ئەگەر هەر لەگەڵ ئەو ڕەش‌و ڕووتانە بم، دینەکە ناچەسپێ، ئەگەر ئەو زلە زلانە گوێم بۆ بگرن، دوایی ئەو ڕەش‌و ڕووتانەش ڕزگاریان دەبێ‌و تووشی ئازارو ئەشکەنجە نابن، یانی، بەرژەوەندیی کارو بانگەوازەکەی

---

١) وەك چۆن لە ئەمریکا تا ئەو ساڵانەی دواییش دەیاننووسی: (سەگ‌و ڕەش پێست نابێ بێنە ژوورەوە) ئێستاش ڕەنگە لە هەندێ شوێنان مابێ، بەڵام ئیسلام (١٤٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا، ئەوەی هەڵوەشاندەوە، بۆیە کە ئۆباما لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا، بۆ سەرۆکایەتی ئەم وڵاتە خۆی هەڵبژاردو دەرچوو، زۆریان پێ سەیر بوو، کە ئۆباما ئەوەندە ڕەش پێستیش نیە، هەروەها تاکو ئەو ساڵانەی ڕابردوو، قبووڵیان نەدەکرد لە شەمەندەفەرو پاس دا، ڕەش پێستەکان دابنیشن.

ڕەچاو کردوە، لەو بیرکردنەوەیەی دا کە بە دڵیدا هاتوە، نەك دان بەو عادەتە نەفامانەیەی ئەواندا بێنێ‌و، ئەو ڕەش‌و ڕووتانە لە مەجلیسی خۆی دەربکات، بەڵکو وەك بەرژەوەندیی بانگەوازەکەی لەوانەیە چووبێتە دڵی، کە باشە، با جارێ ئەوانە لابچن‌و ئەو کافرانە بێن گوێم بۆ بگرن) شتێکی هاتە دڵەوە، ئیدی خوا ئەو ئایەتانەی ناردنە خوار: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴾، ئەوانەی کە بەیانیان‌و ئێواران، یاخود پێش نیوەڕۆو دوای نیوەڕۆیان، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو مەبەستیان ڕووی خواو دیداری (یاخود ڕەزامەندیی خواو پاداشتی) خوایە، دەریانمەکەو دووریان مەخەوە.

بەڵام ئایا کە دەفەرموێ: (وَلَا تَطْرُدِ) دەریانمەکە؟ ئایا پێغەمبەر ﷺ هەرگیز وابووە هیچ کەس لە کۆڕو مەجلیسی خۆی دەربکات؟ نەخێر، ئەدی ئەو تەعبیرە بۆچی بەکاردێنێ؟ لێتان تێکنەچێ، ئەو تەعبیرە هی کافرەکان بووە، ئەوان گوتوویانە: (أطرد هؤلاء)، خوای پەروەردگار وشەکانی ئەوانی دووبارە کردۆتەوە، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ تەنانەت مونافیق‌و کافریشی لە کۆڕی خۆی دەرنەکردوون، ئەگەر تەعبیری پێغەمبەر ﷺ با، دەیفەرموو: دووریان مەخەوە، یاخود ڕوویان لێ گرژ مەکە، وەك لە سووڕەتی (عَبَس)دا هاتوە، ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ۝٢ ﴾، کەواتە: ئەم (وَلَا تَطْرُدِ)ە، وشەی کافرەکانە، تەعبیری ئەوانە، خوا بەکاری دێنێتەوە، واتە: تۆ ئەوەی ئەوان دەیڵێن: وامەکە، لە حاڵێکدا نە لێپرسینەوەی تۆ لەسەر وانە، نە لێپرسینەوەی وان لەسەر تۆیە، ئەگەر دەریانبکەی، تۆ لە ستەمکاران دەبی.

کە ئەوەش زۆر قورسە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ۝٥٣ ﴾، ئاوا هەندێکیان بە هەندێکیان تاقیدەکەینەوە، بۆئەوەی کافرە زلە زلەکان، بڵێن: ئا ئەوانەن کە خوا لەنێو ئێمەدا چاکەی لەگەڵدا کردوون‌و، بەسەر ئێمەدا هەڵیبژاردوون؟ یانی: ئەوان

پێیان وابووە، کێ دەوڵەمەندتر بێ، ئەو لە خوا نزیکترە، دەیانگوت: یانی چی خوا لەنێو ئێمەدا ئەو ڕەش و ڕووتانەی هەڵبژاردوون، کە ئێمە هیچ حیسابیان بۆ ناکەین، بە هەرچی و پەرچییان دادەنێین و، بە خەڵکی سادەو بێ پێگەیان دادەنێین، خوا چی دەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ﴾، ئەدی خوا زاناتر نیە بە سوپاسگوزاران! خوا سوپاسگوزاران هەڵدەبژێرێ بۆ نزیکیی لە خۆی، بۆ هیدایەت دران و بۆ ئیمان، ئەوانەش سوپاسگوزار بوون و نیعمەتەکانی خوایان گێڕاوەتەوە بۆ خوا، نیعمەتەکانی خوایان لە ڕەزامەندیی خوادا بەکارهێناوە، ئەوانە نیعمەتی خوا، کە ئیمان و ئیسلامە، پێشوازییان لێکردوەو سوپاسی نیعمەتی خوایان کردوە، وەك ئێوە نین کە سپڵەو ناسوپاسن: خوا کردوونی بەخاوەن پێگەی کۆمەڵایەتیی و، خاوەن پێگەی سیاسیی و ئیمکانیەتی ئابوورییتان هەیە، هەروەها خوا پێغەمبەرێکی لەنێو خۆتاندا بۆ ناردوون، کە بە زمانی خۆتان قسەتان بۆ دەکات، شانازیی و شەرەفە بۆخۆتان، کەچی ئەو نیعمەتانەی خوا کە پێیداون، نادیدە دەگرن و، ئەو نیعمەتە گەورەیەش کە نیعمەتی هاتنی پێغەمبەرە ﷺ نادیدەی دەگرن، مانای وایە ئێوە سپڵەو ناسوپاسن، بۆیە شایستەی ئەوە نین کە خوا هیدایەتتان بدات، ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾ ئایا خوا زاناتر نیە بە سوپاسگوزاران، بە شوکرانە بژێران ئەوانەی کە قەدری نیعمەتی خوا دەزانن؟ با، کەواتە: ئەوانە شایستەی ئەوەن، کە خوا هیدایەتیان بداو هەڵیانبژێرێ.

## مانـای گـشــتـی ئـایـەتـەکـــان

وەك پێشتــر ئاماژەمـان پێـدا، تـەوەری سـەرەکیــی چـواچێوەی گشـتی کـە ئـەم دە ئایەتـە قسـەی لـێدەکەن، بریتیـە لە چەند ڕێماییەکی خوای پەروەردگار بـۆ پێغەمبـەر ﷺ لەبارەی چۆنیـەتی مامەڵەکـردنی لەگەڵ بێبـڕوایان دا، وە ڕەتکردنــەوەی کۆمەڵێـك گومـانو تۆمــەت ســەبارەی بـە خــۆی، وە پاشــان چۆنیــەتی مامەڵەکردنــی لەگـەڵ ئیماندارانێـك دا، کـە شـوێنی کـەوتوون، کـە بـە زۆریــی خـەڵکی ڕەشو ڕووتو هـەژارو نەدار بـوون، وە دواییــش دووبـارە قسـەکردنەوە لەگـەڵ بیـبڕوایان، دەربـارەی ئـەوە کـە پێغـەمبەر ﷺ بەرنـامەو ڕێبـازی خۆی چۆن دەبینـێ، وە چۆن تەماشـای ئـەوان دەکات.

ســەرەتا خــوای پــەروەردگار بــە پێغەمبـــەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ ﴾ دیــارە لێــرەدا خـــوا ﷻ بـــە پلـــەی یـــەك، مەبەســـت پێــی بێبـڕوایانێکە کە بیانوویـان بە پێغـەمبەر ﷺ دەگـرت، تاکو بەڵگـەو موعجیـزەی وەك هـی پێغـەمبــەرانی دیکـەیان بـۆ بێنـێ، بـەڵام دواییــش ڕووی لـە هــەموو بەشــەرە، دەفـەرموێ: تـۆ بڵـێ: مـن پێتــان ناڵێـم عەمبـارەکانی خــوا لـە لای منــن، تـاکو چیـم مەبەسـت بـوو، لـەو خـەزێنـەو عەمبـارانەی خــوا لـەو موعجیـزەو بەڵگـانە دەربێنـمو پێشـانتان بدەم، کە ئێـوە دەیانکـەنە بیـانوو، بـۆ ئیـمان هێنـان (وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ )، وە هـەروەها ناشـڵێم: پەنهانو نادیـار دەزانـم، تـاکو ئـەو شـتانەی کـە دەتانــەوێ لـە شـتی پەنهـــان، پێتـــان بڵێـــم، ﴿ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌ ﴾، وە پێشـــتان ناڵێـــم: مـــن فریشـتەم، واتـە: ناتـوانم شـتێك بکـەم کە لە توانـای بەشــەر بـەدەرە، وە ئــەو قسـانەشـم نەکردوون، بۆیـە ئێـوەش ئـەو چاوەڕوانییـەتان لـەمن نـەبێ.

ئنجـا ئــەدی ئایــا پێغــەمبەر ﷺ چـــی دەکــات؟ ﴿ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ ﴾، مـن تەنیـا شـوێنـی ئەوە دەکـەوم، کە وەك وەحیـی بۆم دەنێـردرێ، واتـە: مـن شـوێنکەوتووی وەحیـیو پەیـامی خـوام، بەڵام ئەو بیـانووانـەی ئێـوە دەیاندۆزنـەوە، ئـەو داواکارییـانەی کە ئێوە دەیانکـەن، من نـاتوانـم ئەوانەتـان بۆ جێبـەجـێ بکـەم، چونکـە بـە پێـی ئــەو

وەحییەی بۆ من دێ، ئەو دەستەڵاتە بەمن نەدراوە، وە ڕاستییەتی پەیامو پێغەمبەرایەتیی منیش، یەکێ لەسەر ئەو جۆرە شتانە نەکەوتوە، ﴿ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴾ ، پێیان بڵێ: ئایا کوێرو بینەر یەکسانن؟ ئایا بیرناکەنەوە؟! واتە: منێك کە بە پێی وەحیی بەڕێوە دەچم، وەك چاوساغو بینەرێك وام، وە ئێوە کە پشت لە بەرنامەی خوا دەکەن، وەك کوێرو کوتر وان، ئایا یەکسانین، ئایا بیرناکەنەوە؟! یاخود مەبەست ئەوەیە کە پابەندی وەحییم، وە هەر کەسێك کە پابەندی وەحییو پەیامی خوا بێ، مانای وایە لەبەر ڕۆشنایی دا بەڕێوە دەچێو وەك کەسێك وایە کە بەرپێی خۆی دەبینێو، لەبەر ڕۆشنایی دا هەنگاو هەڵدەگرێ، بەڵام کەسێك کە پشت لە بەرنامەی خوا دەکات، بە لاسایی کردنەوەی کوێرانە، شوێن پێشینانی خۆی دەکەوێ، پشت لە وەحی دەکات، ئەوە لەڕاستییدا وەك کوێر وایەو یەکسان نین، واتە: ئەگەر هەر بیر بکەنەوەو عەقڵێکی سەلیمتان هەبێ، دەتوانن جیاوازیی بخەنە نێوان کەسێکەوە کە شوێنکەوتووی وەحییە، وە کەسێك کە شوێنکەوتووی هەواو ئارەزووی خۆیەتی.

پاشان خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾، وە تۆ بەم قورئانە وریابکەوەو هۆشیار بکەوەو بترسێنە، کێ بترسێنێ؟ ئەوانەی دەترسێن، بۆ لای پەروەردگاریان کۆبکرێنەوە ﴿ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴾ ، لە حاڵێکدا کە هیچ کەس جگە لە خوا، سەرپەرشتیارو دۆستو پشتیوانیان نیە، وە هیچ تکاکەرێکیشیان نیە، واتە: هیچ کەسێك نیە کە مشووریان بخوات، سەرپەرشتییان بکات، پشتیان بگرێ، ئاگای لێیان بێ، وە هیچ کەسیش نیە بتوانێ تکایان بۆ بکات، لەلای خوای دادگەر، ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴾ ، بەڵکو پارێز بکەن، بەڵکو خۆ بپارێزن لە سزاو لێپرسینەوەی خوا، واتە: تەنیا ئەو کەسانە سوود دەبینن لەو پەیامە، بۆیە تۆ ئەوانەی پێ وریا بکەوە، کەسانێك کە ئەو ئامادەییەیان هەیە، مەترسیی لێپرسینەوەی ڕۆژی دواییان هەیە لەبەردەم دادگای خوای پەروەردگاریان دا، لە حاڵێکدا کە نە هیچ کەس تکاکەریانەو ، نە هیچ کەس سەرپەرشتیاریانە.

ئنجا خوای بە بەزەیی چەند ڕێنماییەك ئاڕاستەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ وە لەدوای ئەویشەوە ئاڕاستەی هەر كەسێك دەكات، كە بە ڕێی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەنگاو دەنێن، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴾، وە كەسانێك دەرمەكە كە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، بەیانیانو ئێواران، واتە: پێش نیوەڕۆیانو دوای نیوەڕۆیان، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، تەنیا مەبەستیان ڕووی خوای پەروەردگارە، مەبەستیان ڕازیكردنی خوای پاكو تاكە، یان مەبەستیان ئەوەیە كە بەرەو خوا بڕۆنو لە خوا نزیك ببنەوە، ئەوانە دەرمەكە، هەڵبەتە ئەدەبی بەرزی پێغەمبەری ﷺ ئەوە نەبووە، خەڵك لە كۆڕو مەجلیسی خۆی دەربكات، تەنانەت كافرو مونافیقیش هاتبنە مەجلیسی، دەرینەكردوون، ئەدی خوای بەخشندە بۆچی ئەم وشەیەی بەكارهێناوە؟ لەبەرئەوە بەكاریهێناوە، چونكە كافرەكان وەك لە هۆی هاتنەخوارەوەكەیدا باسمان كرد: لەسەر پێغەمبەر ﷺ یان كردبوو بە مەرج دەیانگوت: تۆ ئەو ڕەشو ڕووتانە دەربكە، وەك بیلالی حەبەشییو سەلمانی فارسییو سەعدی كوڕی ئەبی وەققاصو عەبدوڵلای كوڕی مەسعوودو صوهەیبی ڕۆمیی...هتد، ئەوانە دەربكە لە كۆڕو مەجلیسەكەت، ئنجا ئێمە دێینە كۆڕەكەتەوە، چونكە ئەوانە بە شایستەی ئەوە نازانین لەگەڵ ئێمەدا دابنیشن، بۆیە خوا دەفەرموێ: دەریان مەكە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ ﴾، نە لێپرسینەوەی ئەوان لەسەر تۆیە، نە لێپرسینەوەی تۆش لەسەر ئەوانە، واتە: ئەگەر هەڵەو كەموكوڕییەكیان هەبێ، لێپرسینەوەیان لەسەر خوایە، ئەگەر شتێكیش هەبێ بۆ تۆ، لە پاداشت یان تێبینی، ئەوەش دیسان لەسەر خوای پەروەردگارە، واتە: ئێوە لە بەرانبەر یەكدیدا بەرپرسیار نین، بەو واتایە كە كافرەكان ئەوەیان دەكردە بیانوو، كە گوایە ئەوانە ڕەشو ڕووتن، هەژارن، كۆیلەن، خەڵكی سادەن، بە حیسابی ئەوان شایستەی ئەوە نین لە كۆڕو مەجلیسی ئەواندا دابنیشن، بۆیە دەیانگوت، ئەوانە دووربخەنەوە، ئنجا ئێمە دێین، خوا دەفەرموێ:

﴿ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، ئەگەر دەریان بکەی، وەك ئەوان داوات لێدەکەن، ئەوە تۆ لە ستەمکاران دەبی، وەك گوتم: دیارە ئەدەبی بەرزی پێغەمبەر ﷺ لێی نەوەشاوەتەوە، کە هیچ کەس لە کۆڕو مەجلیسی خۆی دەربکات، نەك مسوڵمانانێك کە ویستوویانە خوا لە خۆیان ڕازی بکەن، بەڵکو کافرو موونافیقەکانیش هاتوون لە مەجلیسی دانیشتوون، بەڵام ئەم وشەیە لەبەر پێشنیاری کافرەکان بەکارهاتوە، چونکە دەیانگوت: (أُطرد هَؤلاءِ، يَعْني ضُعَفَاء الْمُسلِمِين) ئەوانە دووربخەوە، یانی: مسوڵمانە هەژارو بێهێزو کۆیلەکان، ئەوە تەعبیری کافرەکانە، خوای زاناو دانا بەکاری هێناوە.

دوایی خوا باسی هەڵوێستی کافرەکان دەکات، بەرانبەر ئەو ئیماندارانە، دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ ﴾، ئاوا هەندێکیان بە هەندێکیان تاقی دەکەینەوە، واتە: هەندێکیان پارەدار دەکەین، هەندێکیان هەژار، هەندێکیان لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە، لە سەرێن، هەندێکیان لە خوارێن، هەندێکیان خاوەنن، هەندێکتان کۆیلەن، پێکیان تاقی دەکەینەوە، بۆچی؟ دەفەرموێ: ﴿ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَـٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ﴾، ئەو لامە (ل) (لام العاقبة)یە، هەتا ئەنجامی تاقی کردنەوەکە، ئەوە بێ کە کافرەکان بڵێن، ئا ئەوانەن خوا لەنێو ئێمەدا چاکەی لەگەڵ کردوونو هەڵیبژاردوون؟ ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾، ئایا خوا زاناتر نیە بە سوپاسگوزارانو شوکرانە بژێران؟ ئەوانەی کە خوا هیدایەتی داون بۆ ئیمانو بۆ ئیسلامو، بەرانبەر خوا وەفادار بوون، سوپاسگوزار بوون، شوکرانە بژێر بوون، بۆیە خوا هەڵیبژاردوون، بەڵام ئەی کافرینە ! ئێوە بێوەفاو ناسوپاسگوزار بوون، شایستەی ئەوە نەبوون خوا هیدایەتتان بدات، بەڵێ: خوا ئەوانەی لە نێو ئێوەدا گوڵبژێر کردوە، کە ئێوە بە کەمیان تەماشا دەکەن، چونکە موڵكو سامانیان نیە، یان چەوساوەن لەبەردەستی ئێوە، بەڵام لەلای خوا بەڕێزن، لەبەرئەوەی وەفادارو سوپاسگوزارن، وە ڕاستە ئێوە پارەدارو خاوەن سامانو دەستەڵاتن، وە پێگەی کۆمەڵایەتییتان بەرزە، بەڵام لەلای

خوا بچووکن، چونکە سپڵەو ناسوپاسن، وە مرۆڤ بە سیفەتی بەرز، بەرزدەبێتەوە، وە بە سیفەتی نزم نزمدەبێتەوە، نەك بە پارەو سامان بەرزبێتەوە، نەك بە دەستەڵات بەرزبێتەوە، تەرازووی خوا، جیایە لە تەرازووە لاسەنگو لارەکەی ئێوە.

ئنجا خوای بە بەزەیی جارێکی دی ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە چۆن مامەڵە بکات لەگەڵ ئەو ئیماندارانەدا کە شوێنی کەوتوون، نەك بەو شێوەیەی کە کافرو موشریکەکان بۆی پێشنیار دەکەن، کە دەریانبکاتو دووریان بخاتەوە، کە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەتەوە، بەڵکو ئەوە پێشنیارێکە زادەو هەڵقوڵاوی بیری نەزۆکی کافرەکانە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ ﴾، ئەگەر ئەوانە هاتنە لات، کە بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە هەیە، بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە، پێیان بڵێ: سەلامتان لێ بێ، واتە: لەلایەن خواوە سەلامەت دەبن، ئاشتیی‌و خێرو خۆشیی لە ئێوە بێ، دیارە پێغەمبەر ﷺ سەلامی خوایان پێدەگەیەنێ، ﴿ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۖ ﴾، پەروەردگارتان بەزەیی لەسەر خۆی پێویست کردوە، بەرانبەر ئێوە،﴿ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، کە هەر کامێك لە ئێوە بە نەفامیی خراپەیەك بکات، دوایی بگەڕێتەوەو چاکە بکات، ئەوە بێگومان خوا بۆ ئەو لێبوردەو بە بەزەییە، کەواتە: ئاوا لەگەڵ ئەو ئیماندارە هەژارانەدا، کە کافرەکان بە کەم تەماشایان دەکەن، مامەڵە بکە، ڕێزیان بگرە، سڵاویان لێ بکە، یان سەلامی خوایان پێبگەیەنە، کە پەروەردگارتان لەسەر خۆی پێویستی کردوە بەزەیی بە ئێوەدا بێتەوە، کە هەر کامێکتان خراپەیەك بکات، بە نەزانیی‌و بە نەفامیی، وە بگەڕێتەوەو پەشێمان بێتەوەو چاکە بکات، ئەوە حەتمەن خوا لەگەڵی لێبوردەو بە بەزەییە.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾، وە ئاوا بەو شێوەیە ئایەتەکانی ڕوون دەکەینەوە، ئەسڵی وشەی تەفصیل، واتە: درێژکردنەوە، چونکە

قسە ئەگەر بە كورتیی بكرێ، ڕەنگە خەڵك باش تێینەگات، بەڵام ئەگەر درێژ بكرێتەوە، ماناكەی ڕوون دەبێتەوە، ﴿وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، وە بۆئەوەی ڕێگای تاوانباران ڕوون بێتەوە، بزانن چۆن بیردەكەنەوە ؟ چۆن ڕەفتارو مامەڵە دەكەن ؟ كە ئەم ئایەتە سێ جۆرە خوێندنەوەی هەن، وەك لە مەسەلە گرنگەكان دا ئاماژەی پێدەدەین.

لە كۆتایی دا خوا چوار جار فەرمان بە پێغەمبەر دەكات، پێی دەفەرموێ: بڵێ (قل) واتە: ئاوا بە كافرەكان بڵێ، دەفەرموێ:﴿ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ ﴾، بڵێ: من ڕێم لێگیراوە، كە ئەوانەی ئێوە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، بیانپەرستم، واتە: پەرستنی بتو صەنەمەكانو، ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن، لە من قەدەغە كراوە.

ئنجا بۆ جاری دووەم، دەفەرموێ:﴿ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ ﴾، بڵێ من بەدوای ئارەزووی ئێوە ناكەوم، واتە: ئێوە لە جگە لە خوا دەپاڕێنەوەو جگە لە خوا دەپەرستنو، بەدوای ئارەزووی خۆتانو، جگە لە خۆتان كەوتوون، من بەدوای (هوی) ناكەوم، بە دوای (هُدی) دەكەوم،﴿ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾، ئەگەر بەدوای ئارەزووی ئێوە بكەوم، ئەوە بە تەئكید گومڕا بووم، لە ڕێ پێشاندراوان نیم، هەمیشە (هوی) و (هدی) تێك دەگیرێن، بۆیە هەر كەس بەدوای (هوی) بكەوێ، لە (هدی) دوور دەبێ.

پاشان بۆ جاری سێیەم دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۚ ﴾، بڵێ: بێگومان من لەسەر ڕێیەكی ڕوونو ئاشكرام لە لایەن پەروەردگارمەوە، واتە: ئەو ڕێبازەی كە من لەسەرمی، كە لەم قورئانەدا بەرجەستەیە، بەڵگەیەكی ڕوونو ئاشكرایە، بەڵام ئێوە بڕواتان پێی نیەو بە درۆی دەزانن، ﴿ مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ ۚ ﴾، ئەوەی ئێوە پەلەی لێدەكەن، كە بە زوویی بێ، لە سزاو

جەزرەبەی خوا، بەدەست من نیە، ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ يَقُصُّ ٱلۡحَقَّۖ﴾، بڕیارو دادوەریی کردنو، ناردنی سزا، هەر بۆ خوایە، ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰصِلِينَ﴾، وە خوا باشترین لێك جیاکەرەوەی: ڕاستو چەوتو، حەڵاڵو حەرامو، پاكو پیسو، کافرو مسوڵمانە (فاصل) واتە: لێك جیاکەرەوە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە خوا باشترین دادوەرە.

لە کۆتایی داو بۆ جاری چوارەم دەفەرمویٚ: ﴿قُل لَّوۡ أَنَّ عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦ﴾ بڵێ: ئەگەر ئەوەی ئێوە پەلەی لێدەکەن، بەدەست من بووایە، چونکە کافرەکان هەموو جاری دەیانگوت: ئەگەر ڕاستە، دەبا خوا سزامان بدات، وەك خوا لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٢﴾ واتە: وە گوتیان ئەی خوایە! ئەگەر ئەوە ڕاستە {کە (قورئان) لەلای تۆوە هاتوە}، لە ئاسمانەوە بەردمان بەسەردا ببارێنە، یان سزایەکی بەئێشو ئازارمان بۆ بنێرە، ئنجا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: بڵێ: ئەگەر ئەوەی ئێوە پەلەی لێدەکەن، بەدەست من بووایە: ﴿لَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۗ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾، کاری منو ئێوە تەواو دەبوو، بەڵام ئەوە بەدەست من نیە، بەدەست خوایە، وە خوا بە ستەمکاران زاناترە، ئەو باشتران دەناسێ، بەڵام دیارە سزادانتان عایدی من نیە، بەڵکو عایدی خوای پەروەردگارتانە.

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:**

## وەڵامدانەوەی بیانووگرتنەكانی كافران بۆ بڕواهێنانیان بە پێغەمبەرایەتیی (محمد) ﷺ

كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌ ﴾، تۆ پێیان بڵێ: واتە: بە خەڵكی بەگشتی، بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە، یاخود تەنیا بە بێبڕوایەكانو هاوبەش بۆ خوا پەیداكەرەكان، كە بیانوویان بە پێغەمبەر ﷺ دەگرتو دەیانگوت: موعجیزەیەكی بەرهەستو زەقو ئاشكرامان بۆ بێنە، وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو (علیهم الصّلاة والسّلام) واتە: ئیكتیفایان بە قورئان نەدەكرد، خوا دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ﴿ لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ ﴾، پێتان ناڵێم عەمبارەكانو خەزێنەكانی خوا لەلای منن، هەتاكو چیم بوێ، لێیان دەربێنم، ﴿ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ ﴾، وە ناشڵێم پەنهانو نادیار دەزانم، ﴿ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌ ﴾، وە پێشتان ناڵێم: من فریشتەم، كەواتە: خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: سێ هەڵەیان بۆ ڕاست بكەوە:

یەكەم: عەمبارەكانی خوا لەبەردەستی ئەو نین.

دووەم: ئەو پەنهان (غیب) نازانێ.

سێیەم: ئەو فریشتە نیە.

ئنجا توێژەرەوانی قورئان دوو ڕایان هەن، لەوبارەوە كە بۆچی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەو سێ شتانەیان بۆ ڕوونبكاتەوە:

١/ هەندێکیان دەڵێن: مەبەست پێی وەڵامی بیانوو گرتنەکانیانە، ئەوان بیانوویان دەگرت، دەیانگوت: ئەگەر دەتەوێ ئیمانت پێ بێنین، دەبێ شتێکمان بۆ بکەی، وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو، موعجیزەو بەڵگەی جۆری ئەوانمان بۆ بێنی، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الإسراء) لە ئایەتی (٩٠ تا ٩٣) لەو سێ ئایەتەدا باسی حەوت داواکاریی کافرەکان دەکات، هەڵبەتە لە شوێنی دیکەشدا لە قورئان دا هەر هاتوەو، ئەو داواکارییانەیان زۆر دووبارە کردوونەوە، لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ ﴾ واتە: کافرەکان گوتیان: ئیمانت بۆ ناهێنین هەتا ئەو حەوت شتەمان بۆ نەکەی:

یەکەم: (تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ) دەیانگوت: ئەو شوێنەی ئێمە، خاکی مەککە زۆر شوێنێکی قاقڕو بێ ئاوە، قەیرانی ئاومان هەیە، تۆ سەرچاوەیەکی ئاومان بۆ هەڵقوڵێنە، ئەگەر پێغەمبەری خوای؟

دووەم: ( أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ) دەیانگوت: بۆخۆت دەزانی لە مەککە هیچ میوەجاتێك نیە، با باغێکت هەبێ لە دارخورماو لە ترێ، واتە: لە بەرزترین درەخت، کە خورمایە، تا نزمترین درەخت، کە دار مێوە، تێیدا بێ، ئنجا ڕووباریشیان بەنێودا بڕۆن، لەنێو ئەو باغو بێستانە، جۆگەلەو ڕووباری گەورە گەورە بڕۆن.

سێیەم: ( أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا ) دەیانگوت: یاخود پارچە ئاسمانێکمان - وەك تۆ گومان دەبەی – بەسەردا بارێنە، بۆیە گوتوویانە: (گومان دەبەی) چونکە خوای بەرز لە شوێنێکدا هەڕەشەیان لێدەکات دەفەرموێ: ئایا دڵنیان لەوەی خوای باڵادەست ئاسمانیان بەسەردا بڕووخێنێ؟

چوارەم: (أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ) دەیانگوت: یاخود خوا ﷻ لەگەڵ فریشتەکان بە پێشوازییمانەوە بێن، چەند داواکارییەکی بێجێیە، چەند بێئەدەبیەکی گەورەیە لەگەڵ خوادا ﷻ !!

پێنجەم: (أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٌ مِّن زُخۡرُفٍ ) دەیانگوت: یان خانوویەکی زێڕت هەبێ، کۆشکێکت هەبێ هەمووی زێڕ بێ، مادام تۆ پێغەمبەری خوای‌و، خواش هەموو شتێکی پێ دەکرێ، با کۆشکێکی زێڕت هەبێ.

شەشەم: (أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ ) دەیانگوت: یاخود لەپێش چاوی ئێمە بەرزبیەوە بۆ ئاسمان‌و خوا هەڵت کێشێ.

حەوتەم: (وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبًا نَّقۡرَؤُهُۥ) دەیانگوت: وە ئیمانت پێ ناهێنین، ئەگەر لە پێش چاوی ئێمەش بەرزبیەوە، هەتا کتێبێکمان بۆ نەهێنی (نامەیەکمان) بۆ نەهێنی بیخوێنینەوە، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، کە تێیدا هاتبێ: لە خوای پەروەردگارەوە بۆ فلان کەسی کوڕی فلان کەس !.

خواش ﷻ پێی فەرموون: (قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ) پێیان بڵێ: پاکیی بۆ پەروەردگارم (کە من ئەو داواکارییانە لە خوا بکەم)، ئایا من جگە لەوەی بەشەرێکم ڕەوانەکراوم چیدیکە هەم؟! یانی: من چۆن دەتوانم ئەو شتانە لە خوای پەروەردگار داوابکەم، خوا ﷻ بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی من قورئانی ناردوە، ئنجا گریمان ئەو شتانەشی بۆ کردن، خۆ ئەوانەی لەوێ

نەبوون دەڵێن: ئێمە چاومان لێنەبووە، دەبێ بۆ ئێمەشی دووبارە بکەیتەوە، ئنجا جیلەکەی دوایی دێ، دەڵێن: دەبێ بۆ ئێمەشی بکەی ! ئیدی ئەوە هەر نابڕێتەوە، یان یەکێکی دیکە دەڵێ: باشە تۆ ئەوەت بۆ ئەوان کردوە، بەڵام من شتێکی دیکە داوا دەکەم، بۆ وێنە دەڵێ: بێنە شاخێکم بۆ بکە بە زێڕ، یەکێکی دی دەڵێ: چیو چی...!! بۆیە ئەوە نابێ، ئنجا خوای زاناو توانا لەوبارەوە لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْأَيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: ئەوان گوتیان: دەبوایە چەند نیشانەیەکی لە پەروەردگاریەوە بۆ بێن، بڵێ: نیشانەو موعجیزەکان تەنیا بەدەست خوان، منیش تەنیا وریاکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆتان، (دوایی دەفەرموێ:) ئایا بۆ وان بەس نیە (ئەگەر ڕاست دەکەن دەیانەوێ حاڵی بنو دڵنیا بن، کە تۆ پێغەمبەری خوای) کە ئێمە کتێبێکمان دابەزاندۆتە سەرت (کە قورئانەو) بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە ؟ بێگومان بەزەیی (خوا)و بیرخستنەوە هەیە بۆ کۆمەڵێك (بیانەوێ) بڕوا بێنن. ئنجا نەك هەر ئەوەندە، بگرە: خوا تەحەدداشی کردوون، کە نەك قورئانێکی وا، بگرە دە سوورەتی وا، یان تەنانەت سوورەتێك بێننو، نەشیانتوانیوە.

بەڵێ، هەر کەسێك تەماشای ئەو کەلامەی خوا بکات، دەزانێ کە ئەوە قسەی بەشەر نیە، ئایا قورئان بەس نیە؟! بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ هەر خۆی بەس بووە، کە ئەگەر بە عەقڵو ئینسافەوە تەماشایان بکردایە، دەیانزانی پێغەمبەری خوایە، وەك گێڕراوەتەوە: ڕۆژێك دوو لە کافرە زلە زلەکان، یەکیان بەوی دیکەی گوت: پێتوایە موحەممەد ڕاست بکات؟ گوتی: بە خوا ئێمە جگە لە ڕاستیی چی دیکەمان لێ نەبینیوە، تەمەنی گەیشتۆتە چل ساڵی لەگەڵ بەشەراندا درۆی نەکردوە، ئێستا لە دوای چل ساڵی تۆ بڵێی بە ناوی خواوە درۆ بکات؟! گوتی: ئەدی بۆ ئیمانی پێ ناهێنی؟ گوتی: بۆیە ئیمانی پێناهێنم دەبێ عەشیرەتی ئێمە بەدوای عەشیرەتی وان بکەوێ، دەڵێن: ئێمە پێغەمبەرمان

لەنێو دایە، ئێمە پێغەمبەرێك لە كوێ بێنین ؟ كەواتە: ئێمە دەدۆڕێین لە مەیدانی عەشیرەتداریی دا[1] ! وەك زۆرێك لەو حیزبە عەلمانییانەی ئێستا، دەزانن ئیسلام ڕاستە، بەلاّم ئەگەر بێو پابەندبن بە ئیسلامو شەریعەتەوە، ئەو كاتە ڕێی گەندەڵیی و ستەمو حوكمی میراتیی و تاكیی و بنەماڵەیی یان لێدەگیرێو، یەكسان دەبن لەگەڵ خەڵك داو یەكیان بواری نابێ بڵێ: من جیام لە خەڵكی دیكە، وە ئیمتیازی ناشەرعیی لەدەست دەچێ، بۆیە هەر ئەو عەلمانییەتو ڕێچكە پڕ درۆو دەلەسانەی خۆیان پێ باشترە، لەو شەریعەتەی كە ڕێی فرتو فێڵو درۆو دەلەسە نادات.

٢/ هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست لەو سێ شتانە كە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ بڵێ: ئەو سێ شتانەم بەدەست نین: نە عەمبارەكانی خوام بەدەستن، نە غەیب دەزانمو نە فریشتەشم، مەبەست ئەوەیە كە خوا ﷻ دەیەوێ ڕایبگەیەنێ كە: موحەممەد ﷺ لایەنی سەرووی بەشەری نیەو موحەممەد ﷺ مرۆڤە، بەلاّم بەشەرێكی ناوازەیە، بەلاّم لە سەرووی بەشەرەوە نیە، وەك شاعیرێك دەڵێ:

مُحَمَّد بَشَـرٌ وَلَيْسَ كَالْبَشَـرِ      بَلْ هُوَ يَاقُوتَـةٌ وَالنَّاسُ كَالْحَجَـرِ

موحەممەد هەر بەشەرە، بەلاّم وەك خەڵكی دی نیە

بەڵكو ئەو مروارییەو، خەڵكیش وەكو (بەرد)یە

مرواریش جۆرێكە لە بەرد، بەلاّم زۆر جیایە لە بەرد.

١/ خوا ﷻ لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ٦ ﴾
واتە: تۆ پێیان بڵێ: بێگومان من بەشەرێكم وەك ئێوە، بەلاّم وەحییم بۆ دێ، (خوا

---

[1] پێشتر دەقی ئەو گێڕراوەیەمان هێنا بە تۆزێك جیاوازییەوە.

پەیامم بۆ دەنێری)، وەحییەکەش ئەوەیە کە پەرستراوی ئێوە، یەك پەرستراوە، کە وابێ بەرەو ئەو ڕاستە ڕێ بگرن، یان خۆتان لەگەڵ ئەودا ڕاست بکەن، وە داوای لێبوردنی لێبکەن، وە سزای سەخت بۆ ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن.

٢ / هەروەها لە سووڕەتی (الفرقان)دا خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەکات کە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصّلاة والسّلام) بەشەر بوون، وەك دەفەرموێ:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا ﴿٢٠﴾﴾، واتە: لە پێش تۆدا هیچ کام لە پێغەمبەرانمان نەناردوە، مەگەر ئەوانیش خواردنیان خواردوەو بە بازاڕدا ڕۆیشتوون (وەك بەشەر)، وە هەندێکتان بە هەندێکتان تاقی دەکەینەوە ئایا ئارام لەسەر یەکدی دەگرن؟ وە پەروەردگارت بینەرە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٞ﴾، وە من پێتان ناڵێم فریشتەم، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە فریشتە لە ئینسان گەورەترە، چونکە خوا ﷻ پێی فەرمووە: بڵێ من فریشتە نیم، وا دیارە فریشتە لە مرۆڤ چاکترە، بۆیە خوا بە پێغەمبەری فەرمووە: بڵێ من فریشتە نیم، یانی: من خۆم هێندە پێ پاك و چاك نیە !

بەڵام من ئەو بۆچوونەم پێ بێهێزەو، ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوە کە فریشتە لە ئینسان گەورەترە، بەتەئکید فریشتە بەگشتی لە خەڵکی گەورەترن، بەگشتی یانی: بە کافرو مسوڵمانەوە، بەڵام پێموایە ئینسانی ئیماندار لە فریشتە گەورەترە، وە پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) لە گەورە گەورەکانی فریشتەکان گەورەترن، بۆچی؟ چونکە خواپەرستیی و طاعەتی فریشتەکان، هیچ ماندووبوونی تێدا نیە، چونکە بۆخۆیان خوای بێهاوەڵ وای دروست کردوون، کە خوا بپەرستن، وەك چۆن گەردیلە خوا وای دروست کردوە: ئەلیکترۆن بە دەوری پرۆتۆندا دەخولێتەوە، وە هەنگی وا دروست کردوە، شیلەی گوڵان بمژێ و هەنگوین دروست بکات، فریشتەکانیشی وا دروست کردوون، کە ئەهلی طاعەتن پاکن و چاکن،

بەرێزن، بەڵام ئینسانێك كە طاعەت دەكاتو بە سەرماو گەرماو نارەحەتییو، ماڵی خۆی دەبەخشێو، گیانی خۆی دەبەخشێو، تووشی ئاوارەییو نارەحەتییو گرفتاریی دێ، لەسەر خوا، واپێدەچێ ئیماندارانی فەرمانبەر بۆ خوا، لە فریشتان گەورەتر بن، چونكە زەحمەت دەكێشن، بە طاعەتەكەیانەوە، بەڵام فریشتە زەحمەت ناكێشێ، ئێمە چۆن هەناسە دەدەینو ماندوو نابین، فریشتەكان ئاوا طاعەت بۆ خوا دەكەنو ماندوو نابن، بە هەر حاڵ فریشتە فریشتەیەو، ئینسانیش ئینسانەو، دوو دروستكراوی لێك جیاشن، بۆیە هەندێ لە زانایان دەڵێن: هەر دروست نیە بەراوردیشیان لەنێواندا بكرێ[1]، بەڵام ئەدی لێرەدا بۆچی وادەفەرموێ؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: چونكە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ بەرپەرچی قسەی كافرەكان دەداتەوە، ئەوان پێیانوابوو كە دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرووی بەشەرەوە بێ، وە دەبێ شتی وایان بۆ بێنێ، كە بە خەڵكی ئاسایی ناكرێ، بۆیە ئەوە بەرپەرچدانەوەی قسەی ئەوانە كە: من فریشتە نیم، وە لە سەرووی بەشەرەوە نیم، بۆیە ئەو شتانەی لە سەرووی بەشەرەوە دەكرێن، ئەو چاوەڕوانییە لە من مەكەن: كانیتان بۆ هەڵقوڵێنمو، شاختان بۆ بكەم بە زێڕو، خانووی زێڕم هەبێو، بچمە ئاسمانێو، نامە لەلای خواوە بێنم، ئەو شتانە هی من نین، من بەشەرێكم بەندەی خوام، پابەندی شەریعەتی خوام، وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: هیچ شتێك رێی لە خەڵك نەگرت كە ئیمان بێنن، كاتێ نامەی خوایان بۆ هات، مەگەر ئەوە نەبێ كە گوتیان: ئایا خوا پێغەمبەرێكی بەشەری ناردوە، واتە: ئەوان ئینسانیان هێندە پێ نزمو بچووك بوو، پێیانوابوو شایستەی ئەوە نیە ببێتە نوێنەری خواو پەیامبەری خوا، بەڵام لەڕاستییدا ئینسان بەهۆی ئیمانەوە حورمەتو رێزی خۆی دەزانێ، وە ئینسان بەهۆی كوفرەوە، خۆی لەلا نزمو بچووكو پەست دەبێتەوە، خۆی دەكاتە مەیموون زادەو، خۆی یەكسان دەكاتەوە لەگەڵ قرژاڵو بۆقو مەیموونو بەرازدا، بەڵام

---

١) لە كتێبی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) لە بەرگی سێیەم دا، باسی ئیمان بە فریشتانو باسی ئەم مەسەلەیەشمان كردوە.

ئینسان بەهۆی ئیمانەوە دەڵێ: من جێنشینی خوام، بۆیە کافرەکان لەبەرئەوەی لە هەمبانەی خۆیان گوێزیان ژماردوە، وە لە ڕوانگەی بە ئاژەڵ دانانی ئینسانەوە، تەماشای ئینسانیان کردوە، گوتوویانە: ئینسان لێی ناوەشێتەوە، نوێنەری خوابێ، بەڵام نەخێر، ئینسان بەهۆی بەندایەتیی‌و پەیوەندیی بە خواوە، بەرزەو شایستەی ئەوەیە کە نوێنەری خوابێ، وە فریشتەکانیش لە خزمەتی دابن، وەك چۆن هەموو فریشتەکان کڕنووشیان بۆ ئادەم ؑ برد، کڕنووشی ڕێزگرتن‌و حورمەت لێگرتن.

**مەسەلەی دووەم:** خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، ئاوا بفەرموێ: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە بۆم دەنێررێ، تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە بە سرووش بۆم دێ‌و، لەلایەن خواوە وەك پەیام بۆم دێ، واتە: ئەو شتانەی ئێوە دەیانڵێن، بیانووگرتنن، وە منیش بەڕاستیی بەدەم بیانوو گرتنەکەی ئێوەوە ناچم، من شوێن پەیامی خوا دەکەوم‌و شوێن ڕێنمایی خوا دەکەوم، خوای پەروەردگار چیم پێ بفەرموێ، وادەکەم، گوێ نادەمە قسەو قسەلۆك‌و بیانووگرتنتان.

## قسەیەك لەبارەی ئیجتیهادکردنی پێغەمبەرانەوە (علیهم السلام)

هەندێ لە زانایان‌و توێژەرەوان گوتوویانە، ئەم ڕستەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە بۆم دێ، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەران (علیهم الصّلاة والسَلام) ئیجتیهادیان نەکردوە، یانی: کۆششیان نەکردوە بۆ هەڵێنجانی یاسا شەرعییەکان، یاخود بۆ بڕیاردان! بەڵام من ئەوەم پێ هەڵەیە، چونکە نە ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ، وە نە پێغەمبەران (علیهم الصّلاة والسلام) وابوون کە ئیجتیهادیان نەکردبێ، جارێ مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە کە: من شوێن ڕێنمایی خوا دەکەوم‌و گوێ بە پێشنیارو بیانووەکانی ئێوە نادەم‌و، ناکەومە ژێر کاریگەریی قسەکانتان، کە ئەمە لە چەند شوێنێکی دیکەش لە قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١/ لە سوورەتی (یونس)دا، خوا لەسەر زمانی پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿...إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾﴾.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (الأحقاف)دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾﴾، ئەوە لە چەند شوێنان دا هاتوە: من بەدوای پەیامو ڕێنمایی خوا دەکەوم، واتە: لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە من گوێ بە بڕوبیانووو داواکاریی بێجێی ئێوە نادەم، مەبەست ئەوە نیە کە من ئیجتیهاد ناکەم، لە کاتێکدا کە وەحی نەبێ، ئەو دوو بابەتە لە یەکدی جیان.

ئنجا ئەگەر تەماشای ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکەین: ئایا ئیجتیهادی نەکردوە؟ بەتەئکید با، وە لەوبارەوە چوار نموونە دەهێنینەوە، بەلاّم با سەرەتا پێناسەی ئیجتیهاد بکەین: (ئیجتیهاد واتە: عەقلّی خۆ بەکارهێنان، بۆ بڕیاردان، یان بۆ دەرهێنانی حوکمی شەرعیی، لە دەقێکی شەرعیی، یان بۆ بڕیار وەرگرتن، بۆ هەنگاو نانێك[1].

**نموونەی یەکەم/** هەندێ لە دلّ نەخۆشو ئیمان لەرزۆکەکان، یان مونافیقو دەغەلّەکان، بەرلەوەی پێغەمبەر ﷺ بچێ بۆ جەنگی تەبووك لە سالّی دەیەمی کۆچیی دا، هاتنە خزمەتی، گوتیان: مۆلّەتمان بدە، با نەیەین بۆ ئەو جەنگە، یەکێ دەیگوت: نەخۆشم، یەکێ دەیگوت: مالّێمان کەسی تێدا نیە، هەر یەکێ بیانوویێکی دەهێنایەوە، پێغەمبەریش ﷺ مۆلّەتی دان، خوا ﷻ لەوبارەوە ڕەخنەی لێگرتو فەرمووی: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ

---

١) هەندێك لە زانایانیش ئاوا پێنسەی (إجتهاد)یان کردوە: الإجتهاد: بَذْلُ الفقيه ما في وُسْعِهِ من الطاقة الفكرية والبدنية للحصول على الحكم الشرعي الصحيح في اعتقاده للقضيَّة المعنيَّة بالحكم، بڕوانە: أصول الفقه في نسيجه الجديد، د. مصطفى ابراهيم الزلمي، ص ٥٨٨، ط ٢٢.

لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾التوبـــة، واتـــە: خـــوا لێـــت ببووری، بۆچی مۆڵەتت دان، تاکو ئەوانەی کە ڕاست دەکەنو پاساویان هەیە، لەگەڵ ئەوانەی کە درۆزنن، بۆت لە یەك جیادەبوونەوە، نەدەبوو زوو مۆڵەتیان بدەی.

مانای وایە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر تەنیا بە وەحی ئیشی کردبایە، پێویستی بەوە نەدەکرد خوا پێی بفەرموێ: خوا لێت ببووری، دیارە عەقڵی خۆی بەکارهێناوەو ئەوانە داوای مۆڵەتیان لێکردوە، بە عەقڵی خۆی فەرموویەتی باشە، ئەوە ئیزنم دان، بەڵام دیارە لە هەڵوێستەکەی دا نەیپێکاوە، ئنجا کە نەیپێکاوە مانای وانیە گوناهبارە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ﴾[(١)]، واتە: ئەگەر حوکمڕان کۆششی کردو پێکای، دوو پاداشتی هەن، (پاداشتی کۆششکردنەکەو پاداشتی پێکانەکەی)، وە ئەگەر کۆششی کردو، نەیپێکاو هەڵەی کرد، پاداشتێکی هەر هەیە (پاداشتی ئەوە کە خۆی ماندوو کردوە).

**نموونەی دووەم/** لە جەنگی (بەدر)دا پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد چ لە دیلەکان بکەن، حەفتا (٧٠) کەسیان لێ بە دیل گرتبوون، ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: بەریان بدەین باشە، پارەیان لێ وەربگرین، چونکە پێویستییمان بە پارەکەیە، با بەریان بدەین بەڵکو خوا هیدایەتیان بدا، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: فلان کەس خزمی منە، بیدە من، با بیکوژم، فلان کەس خزمی ئەبوبەکرە، بیدە بەو با بیکوژێ، فلان کەس خزمی (عەلی)یە، بیدە دەست وی، با ئەویش خزمی خۆی بکوژێ، بۆئەوەی کافرەکان بزانن خاتری کەسیان ناگرین، پێغەمبەر ﷺ ڕای ئەبوبەکری پێ چاك بوو، خوای پەروەردگار ڕەخنەی لێگرت، فەرمووی: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٨٠٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٧٣٥٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧١٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٧٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٢٦)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٣٨١)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣١٤)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٠٦٠).

لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ... ﴿٦٧﴾ ﴾الأنفال[1]، واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە دیلان بگرێ، تاکو کافران لە پەل‌وپۆ نەخات، واتە: تا وایان لێ نەکات کە ملکەچ بن، ئەوانە جارێ هەر لەسەر ملهوڕیی خۆیان بەردەوامن، نەدەبوو بە ئومێدی قەرەبوو (فدیة) وەرگرتن، دەستگیرتان کردبانایە.

شایانی باسیشە: من پێموایە دەقی ئایەتەکە هەرئەوەی لێوەردەگیرێ کە نەدەبوو بە هاندەری پارەو دەستکەوت بە دیلیان بگرن، کە جارێ کافرەکان درك‌و هێزو پێزیان زۆرە، بەڵام ئەوەی لێوەرناگیرێ کە بۆچی لە بەرانبەر قەرەبوو(فدیة) دا - پاش دەستگیرکرانیان- بەرتاندان؟ وەك زۆربەی هەرەزۆری تەفسیرەکان گوتوویانە: کە من پێموایە ئەو جۆرە تێگەیشتنە لە ئایەتەکە: هۆی هاتنەخوارەوە: (سبب النزول)ەکە دەیگەیەنێ، نەك دەقی ئایەتەکە!

کەواتە: لێرەشدا خوای کاربەجێ شتێك بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕاست دەکاتەوە، مانای وایە دیارە پێغەمبەری خوا ئیجتیهادی کردوە.

**نموونەی سێیەم/** لە سوورەتی (التوبة)دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ چوو نوێژی لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلوول کرد، کە سەرۆکی مونافیقەکانی مەدینە بوو، ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری وەستا نوێژی لەسەر بکات، عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ نوێژ لەسەر ئەو کەسە دەکەی ئاوای کردو ئاوای کردو... هتد، هەڵوێستە خراپەکانی باسکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆت لادە، خوا منی سەرپشك کردوەو مەجالی داوم نوێژی لەسەر دەکەم، خواش ﷻ ئایەتی بۆ ناردە خوار، فەرمووی: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ

---

١) بڕوانە: (الإستیعاب في بیان الأَسباب، ج٢، ص ٢٥٠، بڕوانە (صحیح مسلم): ١٧٦٣ لام ، بەڵام پێویستە بزانرێ کە هۆی هاتنەخوارەوە کە لەگەڵ نێوەڕۆکی ئایەتەکەدا گونجاو نیە، شایانی باسیشە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأَنفال) دا بە تێروتەسەلی قسەمان لەبارەی ئەو ئایەتەو هۆی هاتنەخوارەکەی کردوەو، دەرمان خستوە کە هۆی هاتنەخوارەوە(سبب نزول)ەکە لەگەڵ ئایەتەکەدا ناکۆکە، بۆیە ناچارین ڕەتی بکەینەوە با لە ڕووی (سند)یشەوە ڕاست بێ، چونکە (متن) ەکەی نەگونجاوە !.

أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ...﴿٨٤﴾﴾[١]، لەمەودوا هەر کام لە مونافیقەکان مرد، نوێژی لەسەر مەکە، وە لەسەر قەبرەکەشی ڕامەوەستە، پێشتر دیارە ئەوەی بۆ نەهاتوە، دەنا نەدەچوو بۆ سەر قەبرەکەی و نوێژی لەسەر نەدەکرد، واتە: نوێژەکردنەکەی بە وەحی نەبووەو بە ئیجتیهادی خۆی کردوویەتی[٢].

**نموونەی چوارەم/** هەروەها لە هۆی هاتنە خوارەوەی سەرەتای سوورەتی (عبَس)دا چیرۆکی عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم، هەیە کە پیاوێکی نابینا بوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیزانی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرگەرمی قسەکردنە لەگەڵ هەندێ لە زلەزلەکانی قورەیش دا، ئەویش هەر دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ خوای پەروەردگار هیچ ئایەتی دیکەی بۆ نەناردووی، پێمیان بدەی، بۆئەوەی زیاتر پێی لە خوا نزیك ببمەوە؟! پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرچەرخاندو پشتی تێکرد، وەك بڵێی: پێی ناخۆش بوو، چونکە لەوکاتەدا سەرقاڵی قسەکردن بوو لەگەڵ زلە زلەکانی قورەیش دا، ڕەنگە ئەوان بڵێن: مادام ئەو کوێرە هاتوە بۆ ئەو مەجلیسەی ئێمە، قسەت لەگەڵ ناکەین و گوێت بۆ ناگرین، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی بۆیە کرد لەبەر بەرژەوەندیی بانگەواز، بەڵام خوای دادگەر ڕەخنەی لێگرت و فەرمووی: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾﴾[٣] التوبة، واتە: ڕووی خۆی گرژکردو پشتی تێکرد، کە کوێرەکە هات بۆ

---

١) بڕوانە: (صحیح البخاري): ٤٦٧١ ، وە (الإستيعاب...) ج ٢، ص ٣١٣.

٢) بەڵام لە تەفسیری سوورەتی (التوبة) کە بەرگی حەوتەمی ئەم تەفسیرەیە لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا باسم کردوە کە لە نێوان ئایەتەکەو هۆی هاتنەخوارەوە (سبب النزول)ەکەی دا تێکگیران هەیەو، لەوێ هەسەی کۆتایی خۆم لەوبارەوە کردوە.

٣) بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج ٢، ص ٤٩٥ – ٤٩٧، وە بڕوانە: سنن الترمذي: ٣٣٣١، وابن حبان في (الصحيح): ١٧٦٩، وأبو يعلى في المسند: ٤٨٤٨.

لای، تۆ چووزانی لەوانەیە تەزکیە دەبوو، یاخود پەندی وەردەگرت، بەلام کەسانێك کە خۆیان بێنیاز پێشان دەدەن (کە زلە زلەکانن)، تۆ دەچی لەوان نزیك دەبیەوە، چی دەبوو ئەگەر (بابای خۆبەزلگر) تەزکییەش نەبێو پاکیش نەبێتەوە (لە شیرك و کوفر مادام خۆی بە زل دەگرێو پێی خۆش نیە کوێرێك بێتە مەجلیسەکەتەوە).

دوایی خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێ: (کَلاّ) واتە: جارێکی دی شتێکی وا نەکەی، لە هەموو قورئاندا تەنیا لەو شوێنەدا خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری فەرمووە: (کَلاّ) چونکە: (کَلاّ: کَلِمَة رَدعٍ وَ زَجْر)[1]، (کَلا): وشەیەکە بۆ پرینگاندنەوەو تێوەخوڕینو جۆرێکە لە سەرزەنشت، یانی: جارێکی دیکە ئەو هەڵوێستە دووبارە مەکەوە، بۆیە پاشان پێغەمبەر ﷺ هەر جارێك دەگەیشتە عەبدوڵلای کوڕی ئوممی مەکتووم، دەیفەرموو: ﴿مَرْحَبَاً بِمَنْ عَاتَبَنِي فِيهِ رَبِّي، وَيَقُولُ لَهُ: هَلْ لَكَ مِنْ حَاجَةٍ؟﴾[2]، واتە: سڵاو لەو کەسەی کە پەروەردگارم لەسەر وی گلەیی لێکردم، وە پێی دەفەرموو: هیچ پێویستییەکت نیە؟ کەواتە: ڕاستە پێغەمبەر ﷺ ئیجتیهادی کردوە.

**مەسەلەی سێیەم**: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴾، بڵێ ئایا کوێرو بینەر وەك یەکن؟ ئایا بیر ناکەنەوە؟ ئەمەش دوو شتی لێ وەردەگیرێن:

١) بەڵێ ئەو شتانەی ئێوە داوایان دەکەن، بەدەست من نین، بەلام لەگەڵ ئێوەشدا یەکسان نیم، چونکە من لەبەر ڕۆشنایی وەحییدا بەڕێوە دەچمو، بەرپێی خۆم دەبینم، بەلام ئێوە کوێرو کوترانە ڕێ دەکەن.

٢) ئێوە ئەگەر دانیش بەو بەڵگەو نیشانەیەی خوای پەروەردگاردا نەهێنن، کە قورئانە، دان پێدانەهێنانی ئێوە، بەو نیشانەو موعجیزەیەدا، بەهۆی کوێریی خۆتانەوەیە، نەك بەهۆی کەموکووڕیی ئەو موعجیزەیەوە، کوێرێکی وەك

---

١) مختار الصحاح، ص ٤٩٩، (كلاّ: كلمةُ رَدْعٍ و زَجْرٍ، معناه: لا تَفْعَلْ، إنْتَهِ !).

٢) أسباب النزول للواحدي، ص٣٣٧، مرسلا.

ئێوە کە نازانێ ئەو قورئانە گەورەیە فەرمایشتی خوایە، لەگەڵ بینەرێکی وەك ئێمەدا، یەکسان نیە، ئەوە حەقیقەتە، بۆچی بیر ناکەنەوە؟

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾، وە بەو قورئانە ئەوانە وریا بکەوەو بترسێنە، کە دەترسێن بەرەو پەروەردگاریان کۆبکرێنەوە، لە حاڵێکدا کە هیچ سەرپەرشتیارێك‌و تکاکارێکیان نیە لەلای خوا، یاخود جگە لە خوا، بۆ ئەوەی بپارێزرێن (لە سزای خوا).

زانایان دەڵێن: (الإِنْذَارُ: إِعْلامٌ مَعَ تَخْوِيفٍ)[1]، واتە: (إِنْذَار) ئاگادارکردنەوەو هەواڵ پێدانە لەگەڵ ترساندن دا، وەك چۆن (تَبْشِير) بریتیە لە هەواڵ پێدان لەگەڵ دڵخۆشکردن دا، ئنجا کە دەفەرمویٚ: ( وَأَنذِرْ بِهِ ) پێی بترسێنە، مەبەست پێی چییە؟ ئەو ڕاناوەی (بِهِ) بۆچی دەچێتەوە؟ زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی قورئان بێ، کەواتە: بەم قورئانە ئەوانە ئاگادار بکەوەو بترسێنە، کە دەترسێن بەرەو پەروەردگاریان بێنەوە، لە حاڵێکدا کە بێجگە لە خوا هیچ دۆست‌و پشتیوان‌و تکاکارێکیان نیە.

ئەدی ئایا ئەوانە مەبەست پێی کێن، کە دەفەرمویٚ: بیانترسێنە؟ دەگونجێ مەبەست پێی ئیمانداران بن، چونکە هەر ئەوان سوود لەو ئاگادارکردنەوەیە وەردەگرن، وە دەگونجێ مەبەست پێی کافران بن، با ئەوانیش ترسی خوایان بچێتە دڵ‌و بزانن کە دنیا شاری بێ خاوەن نیە، وە بەهەوەنتە دروست نەکراون، یاخود مەبەست هەم مسوڵمانن، هەم کافران، مسوڵمانان بۆئەوەی لە تەقوا زیاد بکەن، کافرانیش بۆئەوەی ئەگەر تا ئێستا تەقوایان نەبووە، تەقوایان ببێ، چونکە دەفەرمویٚ: (لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ) ئنجا لەوانەیە یەکێك بڵێ: ئەگەر مەبەستی ئیمانداران بێ، ئەدی ئەوە نیە ئەهلی تەقوان؟ دەڵێین: تەقوا یەك پلە نیە:

---

١) (مختارالصحاح)، ص: ٥٦٣.

١/ لای کەمی تەقوا، بەبێ وی ئینسان نابێتە مسوڵمان، کە دەبێ خۆ بپارێزێ لە کوفری گەورەو شیرکی گەورەو نیفاق، بەبێ ئەوە ئینسان نابێتە مسوڵمان.

٢/ پلەیەکی دیکەی تەقوا ئەوەیە، کە بەبێ وی مرۆڤ نابێتە ئینسانێکی صالح، کە شایەدیی لێ وەربگیرێ، کە بریتیە لەو تەقوایەی بتپارێزێ لە گوناهە گەورەکان، گوناهە گەورەکانیش دوو جۆرن: (چواندنی واجبێك، یاخود شکاندنی قەدەغەیەك).

٣/ وە تەقوا هەیە کە پلەی سەرەوەیە، کە ئینسان بەبێ وی نابێتە دۆستی خوا، کە ئەوەیە ئینسان خۆی لە گوناهە گچکەکانیش بپارێزێ، وە خۆ لەو شتانەش بپارێزێ کە جێگای مەترسیی نین، لە ترسی ئەوەی کە جێگەی مەترسییە، وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتوە: ﴿لا يَبْلُغُ الْعَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُتَّقِينَ حَتَّى يَدَعَ مَا لا بَأْسَ بِهِ حَذَرَاً لِمَا بِهِ الْبَأْسُ﴾[1]، واتە: بەندە نابێتە پارێزکار (لە پلەی سێ)، تاکو هەندێ شت واز لێ نەهێنێ، کە هیچ ئیشکالێکی تێدا نیە، بەڵام لە ترسی ئەو شتانەی کە ئیشکالیان تێدایە.

وە لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {الْحَلاَلُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِعِرْضِهِ وَدِينِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ}[2]، واتە: حەڵاڵ ئاشکرایەو قەدەغەش ئاشکرایە، وە لەنێوانیاندا هەندێ شت هەن، وێك دەچن (واتە: بە حەڵاڵیش دەچن‌و بە حەرامیش دەچن) جا هەر کەسێ خۆی لە شوبهەکان بپارێزێ، ئەوە هەم دینی سەلامەت بووە، هەم سومعەو ناویشی سەلامەت بووە، وە هەرکەسێکیش ئاژەڵ لە دەوری قەدەغەوە بلەوەڕێنێ، نزیکە زەڕێ بکات.

---

١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٥١)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢١٥)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٤٤٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٨٩٩) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (٤٨٤)، ولكن ضَعَّفَهُ الألباني في (سنن إبن ماجه).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٣٩٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٣٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٠٥)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٤٥٣)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٨٤)، وَالدَّارمِيُّ برقم: (٢٥٣١).

(ئاژەڵەکانی بچنە نێو ئەو قەدەغەیەوە، کە نابێ بچنە نێوی)، واتە: هەرکەسێ خۆی نەپاراست لە شوبهەدارەکان، تووشی حەرامیش دەبێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾، ئەم ئایەتە موبارەکە دیارە پێشتر هۆی هاتنە خوارەوەکەیمان باسکرد، کە ئەوە بوو: هەندێ لە زلە زلەکانی قورەیش گوتیانە پێغەمبەری خوا ﷺ: ئەگەر دەتەوێ بێینە مەجلیسی تۆو گوێت بۆ بگرین، ئەو کۆیلەو ڕەش و ڕووتانە دەربکە (بیلال و صوهەیب و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص)، چونکە ئەوانە شایستەی ئەوە نین لە کۆڕو مەجلیسی ئێمەدا دابنیشن، پێغەمبەری خواش ﷺ شتێکی هاتە دڵ بۆ بەرژەوەندیی گشتی، (وەك: ئەگەر بەوان بڵێم: جارێ مەیەن، چونکە ئەو زلە زلانە ئەگەر ئیمانێ بێنن، خەڵکەکەی دیکەش ئیمان دەهێنن)، بەڵام خوا ﷻ لەسەر ئەوەی کە چۆتە دڵی، ڕەخنەی لێگرت، فەرمووی: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ ﴾، واتە: ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە بە بەیانیان و ئێواران، مەبەستیان ڕووی پەروەردگاریانە (واتە: مەبەستیانە بە دیداری پەروەردگاریان بگەن، یان مەبەستیان ڕەزامەندیی خوایە، یان مەبەستیان پاداشتی خوایە) ئەوانە دەرمەکە لە کۆڕو مەجلیسی خۆت، ﴿ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾، لێپرسینەوەی وان، لەسەر تۆ نیە، وە لێپرسینەوەی تۆش لەسەر وان نیە، واتە: ئەوان هەژارن، یان دەوڵەمەندن، هەرچۆنێکی هەن ئەوانە مادام بەدەم پەیامی خواوە هاتوون، ڕێزیان بگرەو لە کۆڕو مەجلیسی خۆت دەریان مەکە، بۆ ئەو کافرانەی کە ئەوە دەکەنە بیانوو، ﴿ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾، ئەگەر دەریانبکەی لە ستەمکاران دەبی، فەرهەنگەکانی

زمان دەڵێن: {الطَّرد: الإزعاج والإبعَادُ عَلَى سَبيل الإستخفَاف}[(١)] (طَرَّد) بریتیە لە نارەحەتكردنو دوورخستنەوە بە شێوەیەكی بەكەم تەماشاكەرانە، ئنجا لێرەدا ئیشكالێك دروست دەبێ بە ڕواڵەت: ئایا پێغەمبەر ﷺ بە تەمابووە دەریان بكات، كە خوا دەفەرموێ دەریانمەكە؟ ئایا بەتەمابووە بەكەم تەماشاكەرانە دووریان بخاتەوە؟ حاشا لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەدی ئەوە یانی چی؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە: خوا ﷻ هەر هەمان عیبارەتی كافرەكانی بەكارهێناوەتەوە، ئەوان گوتوویانە: (أُطرُدْهُم) دەریان بكە ! خوای كاربەجێ وشەكەی ئەوانی بەكارهێناوەتەوە، ئەگەرنا شایستەی پێغەمبەر ﷺ نیە، تەنانەت كافرو مونافیقیشی لە كۆڕو مەجلیسی خۆی دەرنەكردوون، چ جای ئیماندار؟! جاری وا هەیە خوای بەرز وشەیەك بەكاردێنێ، وشەی كافرێكە، دەنا ئەوە ئەدەبی پێغەمبەر ﷺ نیە، كەس لە كۆڕو مەجلیسی خۆی دەر بكات، بۆئەوەی گومانمان لە دڵ دا پەیدا نەبێ، بڵێین: ئەگەر خوا نەبووایە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی دەردەكرد.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ ﴾، پێشتر باسمان كرد: لە شەبەقی بەیانییەوە، واتە: لە فەجرەوە تاكو نیوەڕۆ پێی دەگوترێ: (الغداة)، وە كاتێ ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسمانێ لادەدا، تاكو دەبێتەوە بەیانی، پێی دەگوترێ: (العَشيِّ)، ئێمە بە كوردیی دەڵێین: پێش نیوەڕۆ، لەگەڵ دوای نیوەڕۆ، ئەمە یانی چی؟ یانی ئەوانە بەردەوام لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، هەمیشە بە شەوو ڕۆژ، جا خۆ مەرج نیە هەر دەستیان بەرز بێ، بەڵام هەر كاتێك هەلوێستێك هاتە پێش، پێویستی بە پاڕانەوە بوو، لە خوا دەپاڕێنەوەو لە كەسی دیكە ناپاڕێنەوە، مەبەست ئەوەیە، ئەگەرنا بەردەوام ئینسان دەستی بەرەو سەری بۆ پاڕانەوە بەرز بكاتەوە، كارو كەسابەتی بۆ ناكرێ، كەسیش واینەكردوە، ئەوە واتایەكی.

واتایەكی دیكەی ئەوەیە: عەینی لای بەیانیو عەینی لای ئێواری، دوو كاتی زۆر سەرنج ڕاكێشن، لای بەیانی وەك سەرەتای پەیدابوونی (بوون)ە، وە لای ڕۆژئاوابوون كۆتابوونی (بوون)ە، بۆیە خوای باڵادەست باسی بەندە چاكەكانی خۆی دەكات، كە لەو دوو كاتانەدا یادی پەروەردگاریان دەكەن، زیكرو بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجام دەدەن.

---

١) المعجم الوسيط، ص ٥٥٣.

## مانای وشەی (وجه) کاتێك بۆ خوا بەکاردێ

کە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾، رووی خوایان دەوێ، پێشتر باسمان کرد روو (وَجْه) لە زمانی عەرەبیدا، ئەو ئەندامەیە کە لە گوێوە تا گوێ، وە لە چەناگەوە تا پێشە سەر دەگرێتەوە، بەلاَم کاتێ ئەم وشەیە بۆ خوای پەروەردگار بەکاردێ، ماناکەی جیایە، چونکە خوا بێ وێنەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾الشورى، ئەدی مەبەست پێی چیە؟ چەند مانایەکی بۆ لێکدراوەتەوە:

١) هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی (ذات)ە، واتە: زاتی خوایان مەبەستە، دەیانەوێ لە خوا نزیك ببنەوە.

٢) هەندێکی دیکە گوتوویانە: (يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ) یانی: (يُرِيدُونَ طَرِيقَه الَّذِي أَمَرَه الله تعالى بِإِرَادَتِهِ)، ئەو لایەنەو ئەو رێگاو رێبازە، کە خوای بەرز فەرمانی پێکردوون، رووی تێبکەن، ئەوەیان دەوێ.

٣) هەندێکی دیکە گوتوویانە: (يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ) یانی: {أي يطلبون محبته ورضاه لأن من أحب ذاتاً يريد رؤية وجهه}، واتە: خۆشەویستی خواو رەزامەندیی خوایان دەوێ، چونکە کەسێك کەسێکی خۆشویست، پێشی خۆشە روویشی ببینێ، لە کوردەواریی خۆشماندا ئەمە هەیە، دەڵێ: فلاَن کەس رووی خۆشە لەگەڵمدا، واتە: لێم رازییە، یان فلاَن کەس رووی گرژە، واتە: توورەیە، کەواتە: ماناکەی ئەوەیە کە دەیانەوێ خوا لێیان رازی بێ.

٤) هەندێکی دیکە گوتوویانە: (وَجه) یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا ﷻ، بەلاَم هەموو سیفەتەکانی خوا، وەك زاتی خوان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴿١١﴾﴾الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، واتە: هیچ

شتێك زاتی وەك زاتی خوا نیە، وە سیفەتەکانیشی وەك سیفەتی خوا نین، وە خوای پەروەردگار وەك هیچ کام لە دروستکراوەکانی ناچێ، کەواتە: خوا ڕووی هەیە، بەڵام ڕوویەك کە شایستەی خۆیەتی، ئێمە نازانین چۆنییەتییەکەی چۆنە؟ لەوبارەشەوە ئەم فەرموودەیە هەیە کە دەریدەخات (وَجه) یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا ﷻ: ﴿عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشعَرِيّ ﷺ، قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللّهِ ﷺ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ: فَقَالَ: إنَّ اللّهَ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَنَامُ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ "وَفِي رِوَايَةِ النَّارُ" لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ﴾[1]، واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا پێنج وشەی پێ فەرمووین، فەرمووی: بێگومان خوای زاڵی خاوەن شکۆ، نانوێ، وە شایستەشی نیە بنوێ، (ناگونجێ بخەوێ)، تەرازوو نزم دەکاتو بەرز دەکات، کردەوەی شەوێی پێشی ڕۆژێ بۆ لا بەرز دەکرێتەوە، وە کردەوەی ڕۆژێی پێشی شەوێ بۆ لا بەرز دەکرێتەوە، (فریشتەکان کردەوەی بەندەکانی پێشان دەدەن) پەردەکەی (ئەو پەردەیەی کە خوای پەروەردگاری پەنهان کردوە لە دروستکراوەکانی) ڕووناکیی (نور)ە، {وە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا فەرموویەتی: ئاگرە}، ئەگەر (خوا) ئەو پەردەیە لابدات، پرشنگی ڕووی (خوا) هەرچی بینینی خوا دەیبینێ، هەمووی دەسووتێنێ، (واتە: هەموو دروستکراوەکان)، کەواتە: خوا ڕووی هەیە، بەڵام وەك باقی سیفەتەکانی ئێمە نازانین چۆنە[2].

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ﴾، زانایان چەند مانایەکیان بۆ لێکداونەوە:

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٦٤٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٩)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٣٧٩)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ في "الأوسط" برقم: (٦٠٢٥).

٢) باسی تێرو تەسەلمان لەبارەی ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوای تاكو پاك، لە بەرگی سێیەمی کتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)داو، لە بەرگی دووەمی: ( الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا، کردوە..

١/ هەندێکیان دەڵێن: (مِنْ حِسَابِهِم ): (أي مِنْ طَاعَتِهِم وَأَعْمَالهم)، ئەوان طاعەتو کردەوەکانیان عایدی تۆ نیە، خوا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات.

٢/ یاخود مەبەست پێی حاڵو باڵو ژیانو گوزەرانیانە، واتە: ئەگەر هەژارن، دەوڵەمەندن، عایدی تۆ نیە، تۆ نابێ ئەوە بکەیتە پێوەرو، دەوڵەمەند زیاتر لە خۆت نزیك بکەیەوە، یان بە پێچەوانەوە هەژارەکان زیاتر لە خۆت نزیك بکەیەوە، کێ زیاتر بۆ خوا صوڵحاوبێ، ئەو لە هەمووان نزیکترە.

٣/ زەمەخشەریی دەڵێ: واتە: {لا تُواخَذُ أَنْتَ وَلا هُم بِحِسابِ صاحِبِه}، واتە: نە تۆ نە ئەوان لەسەر کردەوەی ئەوی دیکە لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێ، هەر کەسە کردەوەی خۆی لە ئەستۆی خۆیەتی، وەك ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ..﴿١٦٤﴾﴾الأنعام، واتە: هیچ گوناهبارێ گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ.

٤/ دەشگونجێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێ، واتە: تۆ بەهۆی گوناهی ئەوانەوە، لێپرسینەوەت لەگەڵدا ناکرێ، ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ تاکو زۆر سوور بی لەسەر ئەوەی کە ئەوان گوێ بۆ تۆ بگرنو ئیمان بێننو، لەبەر زۆر سووربوونت ئیماندارە ڕەشو ڕووتەکان دوور بخەیەوە لە کۆڕی خۆت، تاکو ئەوان زەمینەیان بۆ خۆش بێ، گوێت بۆ بگرن، لێیانگەڕێ، ئەگەر ئامادەن لەگەڵ ئەو ڕەشو ڕووتانە گوێت بۆ بگرن، با گوێت بۆ بگرن، ئەگەرنا، لێیانگەڕێ، چونکە کردەوەی وان لەسەر خۆیان حیسابە، تۆ لەسەر کوفرو خراپەی ئەوان لێت ناپرسرێتەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴾، یانی: ئاوا هەندێکیان بە هەندێکیان تاقی دەکەینەوە، تاکو (کافرەکان) بڵێن: ئا ئەوانەن (ئەو ڕەشو ڕووتانە) کە خوا لەنێو ئێمەدا چاکەی لەگەڵدا کردوونو (هەڵیبژاردوون بۆ ئیمان)، واتە: چۆن ڕاستە ئەوانە لەلای خوا خۆشەویستترن، لە

حاڵێك دا كە پارەشیان نیەو كەس نایانناسێ، بەس ئێمە خوا خۆشی ناوێین لە حاڵێك دا پارەشمان هەیە ناو بەدەرەوەین‌و خەڵك دەمانناسێ، چۆن خوا خۆشمانی ناوێ؟! وایاندەزانی كێ پارەی زۆرتر بێ، خوا زیاتر ئەوی خۆشدەوێ، یان كێ بەرپرسیارێتیی زیاتر بێ، دەبێ لە لای خوا بەڕێزتر بێ، نەیاندەزانی تەرازووی لای خوا جیایە، تەرازووی لای خوا تەماشای پارەو پووڵ‌و كۆشك‌و دیمەن ناكات، تەماشای دڵ‌و كردەوە دەكات، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِنَّ اللهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ، وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ﴾[1]، واتە: خوا تەماشای شێوەو سەروەت‌و سامانتان ناكات، بەڵكو تەماشای دڵ‌و كردەوەكانتان دەكات. (كێ دڵەكەی ساغ‌و سافتر بێ‌و كردەوەی باشتر بێ، ئەوە لە لای خوا چاكترە).

بۆیە خوا لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴾، ئایا خوا زاناتر نیە بە شوكرانە بژێران؟ واتە: ئەوان كەسانێكی سوپاسگوزارن‌و نیعمەتەكانی خوایان وەرگرتوە؛ نیعمەتی ئیمان‌و ئیسلام‌و، شوكری ئەو نیعمەتەیان كردوەو وەریانگرتوە، بەڵام ئێوە ناسوپاس‌و سپڵەو بێئەمەگن، نە قەدری نیعمەتەكانی پێشێ دەزانن، كە خوا دەوڵەمەندی كردوون سەروەت‌و سامانی داونێ، نە قەدری ئەو نیعمەتەش دەزانن، كە پێغەمبەرتان بۆ هاتوە، بۆیە ئەوان هەڵدەبژێرێ كە ئیمان بێنن.

ئنجا لەوبارەوە ئەو فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: مَرَّ الْمَلأُ مِنْ قُرَيْشٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَعِنْدَهُ صُهَيْبٌ، وَبِلالٌ، وَعَمَّارٌ، وَخَبَّابٌ وَنَحْوُهُمْ مِنْ ضُعَفَاءِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، أَطْرُدْهُمْ، أَرَضِيتَ هَؤُلاءِ مِنْ قَوْمِكَ، أَفَنَحْنُ نَكُونُ تَبَعًا لِهَؤُلاءِ الَّذِينَ مَنَّ اللهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا، فَلَعَلَّ إِنْ طَرَدْتَهُمْ أَنْ نَأْتِيَكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ فِيهِم القُرْآن، قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٨١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٨٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٤٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٩٤)، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (١٠٤٧٧)، وَالدَيلَمِي برقم: (٦١٤).

يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾الأنعام﴿[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کۆمەڵێك لە زلە زلانی قوڕەیش بە لای پێغەمبەردا تێپەڕین، کە بیلال‌و صوهەیب‌و خەبباب‌و عەممارو وێنەی ئەوانەی لە خزمەت دابوون، هەروەها چەند کەسێکی دیکە لە چەوساوەو بێدەسەڵاتەکانی مسوڵمانان، گوتیان: ئەی موحەممەد! لەنێو هەموو گەلەکەتدا ئەوانەت هەڵبژاردوون، ئایا ئەوانەن لەنێو ئێمەدا خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون‌و هەڵیبژاردوون بۆ ئیمان؟ ئایا ئێمە بەدوای ئەوانە بکەوین؟ دەریانبکە، نزیکە ئەگەر دەریانبکەی، شوێنت دەکەوین، خوای بەرزیش ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار: ﴿ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ ﴾، واتە: ئاوا هەندێکیانمان بە هەندێکیان تاقی کردۆتەوە، وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی کردوە بە جێنشین لەسەر زەوی، وە هەندێکتانی بەسەر هەندێکتان دا بەرز کردۆتەوە بە چەند پلە، (بۆ وێنە: یەکێکی دەوڵەمەند کردوە، یەکێك توانای عەقلی زیاترە، هەندێکی حەوسەڵەیان زیاترەو دڵیان

١) أَخْرَجَهُ البَزَّار برقم: (٢٠٤١) وَصَحَّحَهُ الألباني في "السلسلة الصحيحة" برقم: (٣٢٩٧).

گەورەترە، جیا جیای کردوون) ﴿ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡ ﴾، بۆئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەوەدا کە پێی داون، (توانای جۆراو جۆری پێداون، هەندێکی بەرزکردوونەوە بەسەر هەندێکاندا، نەك لەبەرئەوەی خۆشتری دەوێن، بەڵکو بۆئەوەی تاقیتان بکاتەوە)، بێگومان پەروەردگارت سزای خێرایە، وە زۆریش لێبوردەی بە بەزەییە.

کەواتە: ﴿ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٍ ﴾، واتە: ئاوا پێکیان تاقی دەکەینەوە، ئنجا کە دەڵێن: ﴿ أَهَـٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآ ﴾، دیارە مەبەستیان پێ بە کەم تەماشاکردنی مسوڵمانە ڕەش و ڕووتەکانە، واتە: ئایا ئەو ڕەش و ڕووتانە، خوا لەنێو ئێمەدا هەڵیبژاردوون، ئنجا خواش دەفەرموێ: ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾، واتە: چونکە کافرەکان سپڵەن بێئەمەگ و ناسپاسن، شایستەی ئەوە نەبوون کە خوا هیدایەتیان بدات، هەڵبەتە بۆخۆیان هیدایەتیان وەرنەگرتوە، بەڵام دیارە تەرازووی خوای کاربەجێ تەرازووی دادگەرییە، تەرازووی جەوهەرو حەقیقەتە، بەڵام پارەو سامان، زۆر کەس بە دزیی و گەندەڵیی و زوڵم دەوڵەمەند دەبێ، هەروەها دەسەڵات، زۆر کەس بە فیرعەونایەتیی خۆی بەسەر خەڵکدا فەرز دەکات، دەبێ ئەوە سەنگی مەحەك بێ، کە ئینسان بۆخۆی پەیدای دەکات، کار لەسەر خۆی دەکات، کە برتییە لە ئیمان و تەقواو کردەوەی باش، بەڵام سەروەت و سامان، یەکێك هەیەتی، بەڵام بۆ خراپەکاریی بەکاری دەهێنێ، دەسەڵاتی هەیە، بەڵام بۆ زوڵم بەکاری دێنێ، لەبەرئەوە نابێ ئەوانە بکرێنە پێوەر.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلۡ سَلَـٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۖ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَـٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، وە هەر کات ئەوانەت هاتنە لا، کە ئیمان بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن، بڵێ: سەلامتان لێ بێ،

پەروەردگارتان لەسەرخۆی پێویست کردوە، بەزەیی هەبێ، (واتە: بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنێ)، کە بەزەییەکە بۆ هەر کام لە ئێوەیە خراپەیەکی بە نەفامیی کردبێ، دوایی بگەڕێتەوەو چاکسازیی بکات، ئەوە بێگومان خوا لەگەڵیدا لێبوردەی بە بەزەییە.

ئەم ئایەتە چۆنیەتی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بڕواداراندا دەخاتەڕوو، پێی ڕادەگەیەنێ:

١) ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾، ئەگەر ئەوانەت هاتنە لا، کە ئیمانیان بە ئایەتەکانی ئێمە هێناوە، سەلامیان لێبکە، سەلامی خۆی، یان سەلامی خوای پەروەردگار، سەلامیش، واتە: ئاشتیی‌و سەلامەتیی.

٢) ﴿ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ﴾، واتە پەروەردگارتان لەسەر خۆی پێویست کردوە، لەگەڵتان بە بەزەیی بێ.

٣) ﴿ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ﴾، هەر کامێك لە ئێوە بە نەفامیی‌و بە نەزانیی خراپەیەك بکات، ئنجا بە نەزانیی ئایا یانی: نەزانێ کە خراپەو بیکات؟ یاخود بە نەزانیی یانی: ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بێ‌و کردەوەیەکی نەفامانە بکات؟ ئەوەی دووەمیان ڕاستە، چونکە کەسێك نەزانێ شتێك گوناهە، بیشیکات، پێویست بە لێبوردن ناکات‌و سزای لەسەر نیە، کەواتە: (بِجَهَٰلَةٍ ) هەروەك لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا بە تەفصیل باسم کردوە، گوتراوە: (كُلُّ مَنْ عصَى الله فَهُوَ جَاهِلٌ)، هەرکەسێ بێفەرمانیی خوا بکات، ئەوە نەفامە.

کەواتە: (بِجَهَٰلَةٍ ) واتە: کردەوەیەکی نەفامانە بکات، با بشزانێ گوناهە، بەڵام کە بیکات ئەوە: کردەوەیەکی نەفامانەی کردوە، خوا لەگەڵ واندا بە بەزەیی یە، بەڵام ئەوەی نەزانێ گوناهە، ئەوە هەر گوناهی نەکردوە.

جا دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، دوایی بگەڕێتەوەو چاکسازیی بکات، یانی: ئینسان دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، وە چاکەو چاکسازیی بکات، بێگومان خوا لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا لێبوردەیە.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، وە بەو شێوەیە، (واتە: بەو شێوەیەی کە دەیبینی) ئایەتەکان ڕۆشن دەکەینەوە، بۆئەوەی ڕێبازی تاوانباران ڕوون بێتەوە.

وشەی: (وَلِتَسۡتَبِينَ ) سێ خوێندنەوە (قِرَاءَة)ی هەن:

١/ (وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ) ئەوەی خوێندنەوەی (حفص)ە، واتە: بۆیە ئایەتەکانت بۆ ڕوون دەکەینەوە، تاکو لەمیانی ئەو ئایەتانەی قورئاندا، خوای دادگەر ڕێچکەو بەرنامەی تاوانبارانو کافرانو هاوبەش بۆ خوادانەران، بۆ پێغەمبەری خواو بڕواداران ڕوون بکاتەوەو، لەوبارەیەوە بەرچاوڕوونو شارەزابن.

٢/ هەروەها خوێندراوەتەوە: (وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ) واتە: بۆئەوەی ڕێبازی تاوانباران ڕوون بێ.

٣/ هەروەها خوێندراوەتەوە: (وَلِيَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ )، کە ئەویش هەمان مانای دووەمی هەیە، بەڵام وشەی (سَبيل) لە زمانی عەرەبیدا، هەم بە (مُؤَنَّث)، هەم بە (مُذَكَّر)ی مەجازیی هاتو:

أ – هاتنی بە (مُؤَنَّث) وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (يوسف)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ (هَذِهِ) ئاماژەیە بۆ (مُؤَنَّث).

ب – هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)دا بە (مُذَكَّر) هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا ﴿١٤٦﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر ڕێبازی سەر ڕاستیيو ڕێ ڕوونیی ببینن، نایکەنە ڕێبازی خۆیانو نایگرنەبەر.

وشەی: (نُفَصِّلُ ) واتە: (نُوَضّح) و (نُبَيّن)، ئەمە مانایەکیەتی، واتە: ڕوون دەکەینەوە، ڕۆشن دەکەینەوە، وە بە مانای (نُنَوِّع)یش دێ، واتە: جۆراو جۆر دەکەین، یانی: بە چەند جۆرێك ئەوە ڕوون دەکەینەوە.

## پـێویسـتـیی شـارەزابوونـی مسـوڵمانان لە بیـرو بـەرنامـەکانی دیکـە

لـەم ئایـەتەش وەردەگیـرێ، کە شارەزابوون لە ڕێبازی تاوانبـاران‌و خراپـەکاران، لـە کافرو مونافیق‌و بتپەرستان، هەموویان، خـوا وەك (ل) لامـی (تعلـیل) هێنـاویەتـی، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ (وَلِتَسْتَبِينَ سَـبِيلَ) (سَبِيلُ ) (وَلِيَسْـتَبِينَ سَبِيلُ )ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، واتـە: ئـاوا ئایەتەکـان جۆراو جۆر دەکـەین‌و ڕوونیـان دەکەینـەوە، بۆئـەوەی ڕێبـازی خراپەکـاران لەبـەرچـاوی تـۆ ڕوون بـێ، یـان لـە خـودی خۆیـدا ڕۆشـن بێتـەوەو پەردەی بەسـەرەوە نەمێنـێ، شـاعیـرێکیش دەڵـێ:

عَـرَفْـتُ الشّــرّ لاَ لِـلشّـرّ لَـكِــن لِأَتَّـقِـيـهِ

وَمَنْ لَمْ يَعْرِفِ الشَّرّ مِنَ النَّاس يَقَعُ فيـهِ

واتە: خراپەو شـەڕم بۆیـە زانـی، هـەتا خۆمـی لـێبپارێـزم

هەرکەسـێ خراپەی خەڵکی نەزانـێ تێیدەکـەوێ، بەڕێـزم!

کەواتـە: هەندێك لە مسوڵمانان کە پێیـانـوایە مسوڵمان نابـێ هەوڵبدات جگـە لـە ئیسـلام، شـارەزای هیـچ فیـکرەیـەکی دیکـە بـێ، ئـنجا هەنـدێك دەڵێن: لەبەرئـەوەی دوایـی ئینسـان دڵـی ڕەق دەبـێ، وەك هەنـدێك لـە ئـەهلی تەصـەووف وادەڵـێن، وە هەنـدێك مەشـڕەب سـەلەفیی دەڵێن: لەبەرئـەوەی هـەقی موتڵەق تەنیـا لـە ئیسلام دایـە، نابـێ بە شـتی دیکەوە خـەریك بی، نەوەك گومانێکت بچێتـە مێشـکەوە !

بەڵام ئەم دوو پاسـاوە هەڵـەن:

١ – جارێ ئەگــەر مسوڵمان چاك لـە دینـی خـوای پەروەردگـار شارەزابـی، تـاکو شـتی زیـاتر بخـوێنێتـەوە، هەقانیەتـی ئیسـلامی زیاتر بۆ دەردەکـەوێ، چونکە ئەگـەر حەقیقـەتی ئیسـلام بـەراورد بکـرێ لەگـەڵ ئـەو بەرنامانـەدا، کـە زادەی فیکـری بەشـەرن، یان لەگـەڵ لە کتێبـە ئاسمانییەکـانی دیکـەدا کە گۆڕدراون، کاتێـك کـە ئیسـلام لەگــەڵ غەیـری خۆیـدا بـەراورد دەکـرێ، هەقـانیەتی

ئیسلام زیاتر دەردەکەوێ، وەك من لە کتێبی (الإِسْلاَمُ كَمَا يَتَجَلّى فِي كِتَاب الله عَزَّو جَلّ)[١]دا بەراوردێکم کردوە، لەنێوان قورئانو کتێبە ئاسمانییەکاندا، کە نێوانیان ئاسمانو ڕێسمانە، هەڵبەتە ئەسڵی کتێبە ئاسمانییەکان کە خوا ناردوونی، هەموویان لە یەك ئاست دان، بەلاّم کە یەکێکیان دەستکاریی دەکرێ لەلایەن بەشەرەوە، زۆر جیاواز دەبێ لەوەی خوا لە ئەسڵدا ناردوویەتی.

٢ – پاشان ئەگەر ئینسان باش دڵی جێگیربێ بە ئیمانو ئیسلام، ئیدی دڵی تووشی ڕەقیی نابێ، وە دوایش تەماشای ژیانی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەکەین، خوای پەروەردگار زۆر چاك بەرچاوی ڕۆشن کردۆتەوە دەربارەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، وە دەربارەی کەموکورپییەکانی خاوەن کتێبەکان، وە دەربارەی فرتو فێڵو تاکتیکی دەغەڵەکان، وە دەربارەی سیاسیەتی ڕۆمو فارس، بۆیە مسوڵمان پێویستە سەرەڕای ناسینی هەقەکەی خۆی، کە ئیسلامە، شارەزایی لە بەرنامەو ڕێچکەکانی دیکەشدا هەبێ، کە ئەوانیش جاری وایە هەقێکی جوزئییان تێدا هەیە، کە لەگەڵ ئیسلام دا تێکدەکاتەوە، بەلاّم بەتەئکید ناهەقیی زۆریشیان تێکەڵ دەبێ، وەك خوای پەروەردگار بە خاوەن کتێبەکان دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٧١﴾آل عمران، واتە: ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی هەق لەگەڵ بەتاڵ تێکەڵ دەکەن، واتە: هەقێکی کەمتان پێیە، لەگەڵ بەتاڵێکی زۆردا تێکەڵی دەکەن، چونکە هەمیشە شتی کەم لەگەڵ هی زۆر تێکەڵ دەکرێ، ﴿وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، وە هەقی دەشارنەوەو دەشزانن، کەواتە: خوای دادگەر ئەوە دەسەلمێنێ کە خاوەن کتێبەکان هەندێك هەقیان لەلایە، وە هیچ بەرنامەو فیکرەیەکی بەشەر نیە تۆزێك هەقی تێدا نەبێ، فیکرەی سەرمایەداریی دێنی، فیکرەی مارکسیی دێنی، فیکرەی لیبرالیزم دێنی، فیکرەی عەلمانیی دێنی، هەر فیکرەیەك

---

١) لە بەرگی سێیەمو لە باسی {ئیمان بە کتێبەکانی خوادا}.

لەوانە بێنی، هەندێك هەقی تێدایە، بەڵام كێشەیان ئەوەیە كە لەگەڵ ناهەقێكی زۆردا تێكەڵ كراوە، دیارە هەقی بێ خلّتەو تەواو، تەنیا لە وەحی خوای زاناو شارەزادا بەرجەستەیە، وەحی خواش تەنیا لە كتێبی خواو سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرجەستەیە.

**مەسەلەی نۆیەمو كۆتایی:** كە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ۚ قُل لَّا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبْتُم بِهِ ۚ مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ ۚ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ الْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۗ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾

## دە (١٠) ئامۆژگاریی و ڕێنمایی خوا بۆ پێغەمبەرەكەی لەبواری هەڵس وكەوت كردن لەگەڵ بێبڕوایان دا

لەم سێ ئایەتە موبارەكەدا خوای بەرز، دە (١٠) ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ دەكات بۆ چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ كافرو موشریكەكان دا بەگشتیو چوار جاریش وشەی بڵێ (قُلْ) بەكاردێنێ :

**یەكەم:** دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ﴾، بڵێ: من لێم قەدەغەكراوە: كە ئەوانە بپەرستم، كە ئێوە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن، كەواتە: خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بە كافرەكان بڵێ: كە تۆ لێت قەدەغەكراوەو ڕێگرییت لێكراوە، كە ئەو شتانەی ئەوان بپەرستی، كە

لەجیاتی خوا دەیانپەرستن‌و لێیان دەپاڕێنەوە، کە پاڕانەوەش کاکڵەی خوا پەرستییە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ﴾[1]، واتە: پاڕانەوە بریتیە لە خواپەرستیی، وەك چۆن فەرموویەتی: ﴿الْحَجُّ عَرَفَةُ﴾[2]، واتە: حەج کردن بریتیە لە لە عەرەفات ڕاوەستان، یانی: پایەی گەورەی حەج بریتیە لە ڕاوەستان لە عەرەفە، هەروەك پایەی گەورەی خواپەرستیی‌و بەندایەتیی بۆ خوای بەرزو مەزن، بریتیە لە پاڕانەوە، جا دەفەرموێ: بڵێ: من لێم قەدەغەکراوە کە ئەو شتانەی ئێوە لێیان دەپاڕێینەوە، بیانپەرستم.

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ، وە هەر کەسێك کە بە ڕێی پێغەمبەر ﷺدا دەڕوات، پابەند کراوە بە شوێنکەوتنی بەرنامەیەکەوە، کە لەلایەن خواوە بۆی هاتوە، وە هیچ بواری سەوداو سەنگ‌و سووکیی (مساومة)ی تێدانیە، جیاوازیی نێوان مسوڵمان‌و غەیری مسوڵمان چییە؟ مسوڵمان بەرنامەیەکی بۆ هاتوە کە وەحی خوایەو دەبێ بۆی ملکەچ بێ، وە پابەندی بێ‌و لێی لانەدات، بەڵام نامسوڵمان بەرنامەکەی وەك قوڕی دروستکراو وایە لەبەردەستی، بە کەیفی خۆی لێی لادەدات، دەیگۆڕێ، چونکە زادەی بیرو هۆشی خۆی، یان بیرو هۆشی کەسێکی دیکەیە، بەڵام مسوڵمان بەرنامەکەی لە خواوە بۆ هاتوە، وە هیچ مافی سەرپشکبوونی نیە لە بەرانبەریدا، وەك خوا لە سووڕەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾، واتە: هیچ پیاوێکی ئیماندارو هیچ ئافرەتێکی ئیماندار، کاتێك خواو پێغەمبەری خوا بڕیارێك دەدەن، مافی سەرپشکبوونیان نیە، وە هەر کەسێك سەرپێچیی لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بکات، بە گومڕاییەکی زۆر ڕوون گومڕا بووە.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٨٤١٥)، وَالبُخَارِيُّ فـي "الأدب المفرد" بـرقم: (٧١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (١٤٧٩)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢٩٦٩)، وَالنَّسَائِيُّ فـي "الكبرى" بـرقم: (١١٤٦٤)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٣٨٢٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٩٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨٠٢) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٧٩٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٩٤٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٨٨٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٠٤٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠١٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣١٠٠) وَصَحَّحَهُ، وَالدَّيْلَمِيُّ برقم: (٢٧٥٩).

دووەم: دەفەرموێ: ﴿قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهۡوَآءَكُمۡ﴾، پێیان بڵێ: من بە دوای ئارەزووەکانی ئێوە ناکەوم، واتە: ئەو شێوە پەرستنەی ئێوەو ئەو بەرنامەو ڕێچکەو ڕێبازانەی ئێوە، کە لە غەیری خوا دەپارێنەوەو، غەیری خوا دەپەرستن، ئەوە زادەو هەڵقوڵاوی ئارەزووی خۆتانە، جا (هَوَى) لە کوێ و (هُدَى) لە کوێ؟! (وَمَنِ اتَّبَعَ الهَوَى فَقَدْ هَوَى) هەر کەس بە دوای هەوا بکەوێ، بەردەبێتەوە.

سێیەم: دەفەرموێ: ﴿قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذٗا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾، ئەگەر بە دوای ئارەزووی ئێوە بکەوم، ئەوە گومڕابووم، وە ئەوکاتە من لە ڕێنمایی کراوان نابم، وشەی (ضَلَلْتُ) بە (ضَلِلْتُ)ش خوێندراوەتەوە، هەردووکیان بە مانای گومڕابوون دێن، ئینسان ئەگەر بەدوای ئارەزووی خۆشی بکەوێ، گومڕا دەبێ، چ جای بەدوای ئارەزووی خەڵك بکەوێ، ئارەزوو (الهَوَى) بریتیە لە (المَيْلُ إِلى الشَّهْوَة)[1] واتە: مەیل کردن بۆ لای ئارەزوو، بەڵام زیاتر مەبەست ئەو شتانە کە لەگەڵ شەرع دا تێکدەگیرێن، وە بە دڵنیاییی ئەوەی کە لەگەڵ شەرع تێکدەگیرێ، لەگەڵ عەقڵ و فیطرەت و تەندروستیی و بەرژەوەندیی دنیاو دوارۆژی مرۆڤدا تێکدەگیرێ.

چوارەم: دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي﴾، جارێکی دیکە خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێ: بڵێ: من لەلایەنی پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرام، واتە: هیچ گومان و دوو دڵییم نیە لە ڕاستیی ئەو ڕێبازەی کە گرتوومە، چونکە زادەی بیروبۆچوونی خۆم نیە، وەك بەشەرێك، چونکە بەشەر کەم شت دەزانێ و زۆر شتان نازانێ، ئەو بەرنامەیەی من بەڵگەیەکی ڕوون و ڕاشکاوە لە پەروەردگارمەوە، خوای زاناش هەموو شتێك دەزانێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٦﴾الفرقان، واتە: بڵێ: کەسێك قورئانی

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني ، ص: ٨٤٩ .

دابەزانـدوە، کـە نهێنیـی ئاسمانـەکانو زەوی دەزانـێ، کەسـێك هـەموو نهێنیـی ئاسـمانەکانو زەوی بزانـێ، دیـارە کـە بەرنامەیـەك دەنێـرێ، هەرگیـز شـتێکی تێدانیـە کە هەڵـە بێ، بۆچی؟ چونکە لـە زانیارییـەکی بێسـنوورو گشتگیـرەوە هـاتوە، بـەڵام کـە بەشـەرێك بەرنامەیـەك دادەنـێ، ئێسـتای لەبەرچـاوە، دوای ئێسـتای لەبەرچـاو نیـە، لایـەنێك لـە ژیـان تەماشـا دەکـات، لایەنەکـەی دی فەرامۆش دەکات، مرۆڤ سنووردارە: گوێی مرۆڤ لە بیست (٢٠) لەرینـەوە (ذَبْذَبـة) هەتا بیسـت هـەزار (٢٠٠٠٠) لەرینـەوە دەبیسـتێ، لـەوە زیاتربـێ، یـان کەمتـر بـێ نایبیستێ، چـاوی مرۆڤ مەودایـەك دەبینـێ، نیزیکتـر بـێ نایبینـێ، دوورتـر بـێ نایبینـێ، دیسـان شـتێك زۆرزۆر ورد بـێ نایبینـێ، وەك میکرۆبو ڤایرۆس...، وە شـتێکیش زۆر گـەورە بـێ بـاش بـۆی نابینـرێ، وە هەروەهـا هـەموو شـتەکانی دیکـەی مرۆڤ، بـۆ وێنـە: زانستو زانیـاریی مرۆڤ ، خـوا لەبارەیـەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ ﴾الإسـراء، وە عەقڵـی مـرۆڤیش هـەموو شـتێکی تێـدا جـێ نابێتـەوە، کەواتـە: ئـەو بەرنامەیـەی لـە ڕۆشـنایی وەحـی پەروەردگارمەوە بۆم هاتوە، بۆیە مـن لەسـەریمو بـڕوام پێـی هەیـە، چونکـە لـە سەداسـەد (١٠٠/١٠٠) لـە ڕاسـتییو تەواویـیو بێخەوشـیی یەکەی دڵنیـام، ئاخـر شـتی هەر کەسـە لەقـەدەر خۆیەتـیو، خواش ﷻ شـتەکانی لەقـەدەر خۆینـی.

پێنجـەم: دەفـەرموێ: ﴿ وَكَذَّبۡتُم بِهِۦۚ ﴾، واتـە: لـە حاڵـێکدا کـە ئێـوە بـڕوای پێنـاکەن، بـڕوا بە چی ناکەن؟ بە قورئـان، یان بەو بەڵگە ڕوونـە (بینـة)یـە، بـەڵام بۆچی دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَّبۡتُم بِهِۦۚ ﴾، مانـای (بیـان)ی لێگرتـوە، ئەگـەر مانای (بیـان)ی لـێگـرت، ئەو کاتە بـە (مُـذَکَّر) دێتـەوە، یـاخود ﴿ وَكَذَّبۡتُم بِهِۦۚ ﴾، واتـە: بڕواتان بە خـوا نیـە، ئەو خـوایەی کە ئەو بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەی بـۆ مـن نـاردوە، یـاخود ئێـوە بڕواتـان بـەو یەقینـە نیـە، کـە مـن هەمـەو لـە ئەنجـامی شـوێنکەوتنی هیـدایەتـی خـوادا بـۆم پـەیدا بـووە.

لـێرەدا خـوا بـە پێغـەمبەر ﷺ دەفـەرموێ، بـەو کافرانـە بڵـێ: ئـەو ئیمـان نەهێنـانەی ئێـوە، بـەم هەقـە، لـە نرخـی ئـەم هەقـە کـەم ناکـاتەوە، چونکـە

بابایەکی کوێریش بە نوێژی نیوەڕۆ تەماشای ئاسمان بکات، خۆر نابینێ، وە ئەگەر مانگیش لە چواردە دابێ، کەسێکی کوێر تەماشای ئاسمان بکات نایبینێ، وە هەروەها نەخۆشیش بەتایبەتی کەسێك مەلاریاو گرانەتای لێبێ، ئاوی شیرین بخواتەوە، بە زاری تاڵەو وەك ژەقنەبووت وایە، کەواتە: نوقصانیی لە خۆرو مانگو ئاودا نەبوو، بەڵکو نوقصانیی لە کەسەکە دابوو، دەڵێن: قالۆنچە ڕەشە بە بۆنی گوڵاوێ گێژ دەبێ، بەڵام ڕیخو شیاکە خردەکاتەوەو دەیکاتە تۆپ، تاقییان کردۆتەوە، بۆن گوڵاویان بۆ بردوە گێژ بووە، دیارە کەیفی بەو بۆن ڕیخە دێ، لەبەرئەوەی میزاجی تێکچووە !!

شەشەم: دەفەرموێ: ﴿ مَا عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴾، ئەوەی ئێوە پەلەی لێدەکەن لەلای من نیە، ئەوان پەلەیان لە چی دەکرد؟ پەلەیان لە سزا دەکرد، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ الأنفال، واتە: وە کاتێك (کافرەکان) گوتیان: ئەی خوایە ! ئەگەر ئەم قورئانە هەقە، با بەردمان بەسەردا ببارێ لە ئاسمانێ، یاخود سزایەکی بەئێشمان بۆ بێنە، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: ئەوەی ئێوە پەلەی لێدەکەن لەلای من نیە.

حەوتەم: دەفەرموێ: ﴿ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾، حوکمو بڕیار تەنیا بۆ خوایە، خوای باڵادەستە کە بڕیار دەدات، کەی سزاتان دەداتو چۆنتان سزا دەدات، یان سزاتان ناداتو هیدایەتتان دەدات، دوای ئەوەی عاقڵ دەبنو دەگەڕێنەوە.

هەشتەم: دەفەرموێ: ﴿ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ ﴾، خوا هەق دەخاتە ڕوو، هەق باس دەکات، (قصة) واتە: بەسەرهات، (قَصَّ، یقصُّ)، واتە: بەسەرهاتی گێڕایەوە، وە خوێندراویشەتەوە (یَقْضِ الحَقَّ) واتە: بە هەق بڕیار دەدات، ئەگەر بشڵێی: (یَقُصُّ) واتە: (یُبَیِّنُ وَیَحْکِي) ڕوونی دەکاتەوەو دەیگێڕێتەوە.

نۆیەم: دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴾، وە خوا باشترین یەکلاکەرەوەو دادوەرە، (فَاصِل) واتە: شتێك كە دوو شتان لێك جیابكاتەوە، كە لێرەدا مەبەست دادوەرو حاكمە، خوای دادگەر باشترین دادوەرە، ئەو حوكممان لەنێواندا دەكات.

دەیەم: دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، پێیان بڵێ: ئەگەر ئەوەی ئێوە پەلەی لێدەكەن، لەلای من بووایە، ئیش لەنێوان منو ئێوەدا تەواو دەبوو، (واتە: ئەو بڕیارو سزایە، ئەگەر لەلای من بووایە، بەسەرمدا دەچەسپاندن و یەكلادەبووینەوە)، وە خوا بە ستەمكاران زانایە.

## وەڵامی ئیشكالێك

توێژەرەوانی قورئان لێرەدا پرسیارێكیان كردووەو گوتوویانە: بەڕواڵەت لە نێوان ئەم ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ئەگەر ئەوەی ئێوە پەلەی لێدەكەن، لەلای من بووایە، كاری نێوان منو ئێوە تەواو دەبوو، واتە: سزایەكەم بەسەردا دەچەسپاندنو ئێوەم لە كۆڵ دەكردەوە، لەگەڵ فەرمایشتێكی پێغەمبەردا ﷺ تێكگیران هەیە، كە ئەمە دەقی فەرمایشتەكەیە:

﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لِرَسُولِ اللهِ ﷺ يَا رَسُولَ اللهِ! هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ فَقَالَ: «لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ، وَكَانَ أَشَدَّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلاَّ بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ، فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ فَنَادَانِي، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، قَالَ: فَنَادَانِى مَلَكُ الْجِبَالِ وَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّ اللهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَأَنَا مَلَكُ الْجِبَالِ وَقَدْ بَعَثَنِي رَبُّكَ إِلَيْكَ لِتَأْمُرَنِي بِأَمْرِكَ، فَمَا شِئْتَ، إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ

عَلَيْهِمُ الأَخْشَبَيْنِ». فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً» ﴾[1]، واتە: دایکمان عائیشـە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: بە پێغەمبەری خوام ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا چ ڕۆژت بەسەر هاتوون سەختتر لە جەنگی ئوحود؟ ئەویش فەرمووی: لە گەلەکەی تۆوە (واتە: لە قورەیشەوە) ئەوەی تووشم بوو تووشم بوو، سەختترین شت کە تووشم بوو، ڕۆژی عەقەبە بوو، (واتە: ئەو ڕۆژە کە بە لای عەقەبەدا هاتوە، جا باس دەکاتو دەفەرموێ): نەفسی خۆم پێشنیارم کرد بۆ (ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ) (کە سەرۆك هۆزێکی گەورە بووە لە طائیف)، بەڵام ئەوەی کە من لێم داوا کرد، وەڵامی نەدامەوە، منیش بە خەمو خەفەتەوە ڕۆیشتمو گەڕامەوە (جا ئەوە لێرە بەو کورتی باسی کردوە، ئەگەرنا بەردبارانیشیان کردوە لە طائیف بە منداڵانو هۆسەو هەراشیان لەدوا کردوە، بۆیە فەرموویەتی: ئەوەم زۆر لەسەر سەخت بووە، پاشان دەفەرموێ:) هەتا نەگەیشتمەوە (قَرْن الثَّعَالِب)[2] نەهاتمەوە سەر حاڵو بەهۆش خۆم نەهاتمەوە، سەرم بەرزکردەوە، تەماشام کرد هەورێکە، سەرنجمدا جبریل لەنێو ئەو هەورەدا بوو، بانگی کردم، گوتی: ئەی موحەممەد! خوای زاڵی پایەدار وەڵامی گەلەکەی تۆی بۆ تۆ بیست، وە چۆن بەرپەرچیان دایەوە، ئێستاش فریشتەی چیاکانی ناردوە، تاکو چیت پێ چاکە فەرمانی پێبکەی، فەرمووی : ئنجا فریشتەی چیاکان بانگی کردمو سەلامی لێکردم، گوتی: ئەی موحەممەد ! خوا قسەی گەلەکەتی بیست (کە چەندە خراپ وەڵامیان دایەوە) وە منیش فریشتەی چیاکانم، وە پەروەردگارت منی ناردوە بۆ لای تۆ، تاکو ئەوەی پێت چاکە، فەرمانم پێبکەی، چیت دەوێ؟ ئەگەر دەتەوێ تاکو ئەم دوو چیایەی طائیف بێنمەوە یەك، (تاکو قڕەبڕ بن)، دەڵێ: پێغەمبەری خواش پێی فەرموو: ﴿بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً﴾، واتە: بەڵکو ئومێدم وایە، خوا لە پشتی ئەوانە کەسانێك بێنێتە دەرێ، کە تەنیا خوا بپەرستن، وە هیچ شتێکی نەکەنە هاوبەش.

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٩٥)، وَإِبْنُ حِبَّان برقم: (٦٥٦١).

٢) ناوی شوێنێکە لە میقاتەکانی حەجەو، دەبێ لەوێ ئیحرام ببەستری.

ئنجا دەڵێن: لێرەدا ئەوە فریشتەی چیاکان خوای بەرز ناردوویەتیو لەژێر فەرمانی پێغەمبەردا ﷺ بووە، لە ئایەتەکەشدا دەفەرموێ: ئەگەر بەدەست من بووایە ! ئەدی ئەوەنیە لێرەدا بەدەستیەتی ؟ بە ڕواڵەت تێکگیر دەبن ! وەڵامەکەی ئاوایە:

١/ وا دیارە ئەو کاتە کە چووە بۆ طائیف، کافرەکان داوایان نەکردوە، سزایان بۆ بێنێ، بەڵام ئەوەی ئایەتەکە دەیفەرموێ: لە حاڵێکدایە کە ئەوان پەلەیان لێکردوە، بەڵام خەڵکی طائیف نەیانگوتوە: با سزامان بۆ بێ.

٢/ وەڵامێکی دیکەشی ئەوەیە کە لە کاتی دابەزینی ئایەتەکاندا، ئەو دەستەڵاتەی نەبووەو دواتر پێیدراوەو پێشتر پێی نەدراوە، چونکە چوون بۆ طائیف پێش مەسەلەی شەوڕۆییو پەیمان بەستنی عەقەبەی یەکەمو دووەم بووە، ئنجا دیارە ئەو ئایەتانەش پێشتر دابەزیون، پێش سەفەری طائیف.

٣/ ئەو دەستکراوەیی یەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر تایبەت بە خەڵکی (طائیف)ەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەت (٥٩ تا ٦٧)، پێکدێ‌و، سورگەی سەرەکییان، بریتیە لە خستنەڕووی ژمارەیەك لە سیفەتو کردەوەکانی خوای بەرزو مەزن: لە زانیاریی وردو بێسنووری بە وردو درشتی دروستکراوەکانو، خەواندنی مرۆڤەکان لە شەوداو، چاودێرییکردنی کردەوەکانیان بە ڕۆژو، پاشان گێڕانەوەیان بۆ لای خۆیو، لێپرسینەوەیان.

هەروەها ناردنی فریشتەکان بۆ پاراستنی کردەوەکانیانو، پاشان مراندنیانو گێڕانەوەیان بۆ لای خوای بالادەست، ئنجا دەربازکردنیان لە تەنگو چەڵەمەو گرفتارییەکانی ڕۆژگار، پاش پاڕانەوەو کڕووزانەوەیان.

وە لە کۆتاییدا هەڕەشەکردن لە کافرو هاوبەشدانەرەکان کە خوا دەتوانێ لە سەرووو خوارووویانەوە سزایان بۆ بنێرێ‌و، پێکیان وەربکاتو بە گژ یەکیاندا بکات، پاش پەرتەوازەو دەستە دەستە بوونیان، وە ڕایدەگەیەنێ کە هەرچەندە گەلو کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ بەرانبەر بە قورئان بێبڕوان، بەلام قورئان هەواڵی ڕاستەو، هەواڵی ڕاستیش کاتێك دەبێ هەر بچەسپێ.

﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا
تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ
إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ (٥٩) وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ
يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ
تَعۡمَلُونَ (٦٠) وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ
ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ (٦١) ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ
ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ (٦٢) قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ
تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ (٦٣) قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا
وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ (٦٤) قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن
فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ
نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ (٦٥) وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ وَهُوَ ٱلۡحَقُّۚ قُل لَّسۡتُ عَلَيۡكُم
بِوَكِيلٖ (٦٦) لِّكُلِّ نَبَإٖ مُّسۡتَقَرّٞۚ وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ (٦٧)﴾

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە خـوا کلیلـەکانی (زانینـی) نادیـاریی لـەلان، کـە جگـە لـەو کـەس نایانزانــێ، وە هەرچــی لـە وشــکانییو دەریـا دایـە، دەیزانــێ، وە هـیچ گـەڵا "ی درەخت"ێك ناکەوێتـە خـوار مەگەر دەیزانێ، وە هیچ دەنکـێك نیــە لـە تاریکاییـەکانی زەویـداو، هـیچ تەڕێـكو هـیچ وشـكێك نیـە، مەگـەر لـە کتێبێکـی ڕوون دایـە ﴿٥٩﴾ وە هـەر ئـەوە کـە بـە شـەوێ ڕووحەکانتان وەردەگرێ (و دەتانخەوێنـێ)، وە دەزانێ لە ڕۆژێ دا چی دەکـەن، دوایـی لـە ڕۆژێـدا بێدارتــان دەکاتــەوە، تـاکو مـاوەی نـاوبراو (دیـارییکراو بـۆ ژیانتـان) بەسەربچـێ، پاشـان گێڕانەوەتان بـۆ لای ویــە، دوایـی هەواڵـتان پێـدەدا بـەوەی کـە دەتـانکرد ﴿٦٠﴾ وە هەر ئەوە زاڵی ملـپێکـەچکەر بەسـەر بەندەکانییـەوە، وە پارێزەرانێکتـان (لـە فریشـتان) دەنێرتــە ســەر، هــەتا کاتێــك یەکێکــتان مردنــی گەیشــتە ســەر، نێرراوەکانمـان گیـانی دەکێشــنو، کەمتەرخــەمییش ناکــەن (لــە ئەنجامــدانی کارەکانیانــدا) ﴿٦١﴾ پاشـان (دوای مراندن) بـەرەو لای تاکە سەرپەرشـتیاری ڕاسـتەقینەیان گێڕرانـەوە، ئاگـاداربــن! بڕیـارو فەرمان هەر هی ئەوە، وە خـوا خێراتریـن لێپرسەرەوەیە ﴿٦٢﴾ بڵـێ: کـێ لە تاریکـاییەکان (و گرفتارییـەکان)ی وشکانیــیو دەریــادا دەربازتــان دەکـات، بـە ملکـەچییو پەنهانیــی لێــی دەپاڕێنـــەوە: ئەگـــەر بێــتو (خـــوا) لــەم (گرفتـــاریی)ە قوتـــارمان بکـــات، بـــە دڵنیاییـەوە لە سوپاسگوزاران دەبیـن؟ ﴿٦٣﴾ بڵـێ: هەر خوا لەو (گرفتـاریی)ە قوتـارتان دەکـات، وە لـە هــەر خــەمو تەنگـانەیەکی دیکـەش، کەچـی ئێـوەش هاوبـەش (بـۆ خــوا) دادەنـێن ﴿٦٤﴾ بڵـێ: ئـەو (خــوا) توانــادارە کـە لـە ســەرووتانەوە، یـان لەژێــر پێتــانەوە، ئــازارو ســزاتان بــۆ بـنێــرێ، یــان وەك چــەند پێــرو دەســتەیەکی پەرتــەوازە، پێکتــان وەربکــاتو ئــازارو ســزای هەندێکــتان بــە هەندێکــتان بچێــژێ، ســەرنج بــدە ! چــۆن (ڕوونکردنەوەی) ئایەتەکـانمانیان بۆ جۆراو جۆر دەکـەین، بەڵـکو بـە قووڵـیی تێبگـەن ﴿٦٥﴾ وە کۆمـەڵو گەلـەکەت ئـەم (قورئـان)ە یـان بـە درۆ دانـا، لـە حاڵێکــدا کـە هەقـە، بڵـێ: من بەسـەرتانەوە چاودێرو پارێزەر نیم ﴿٦٦﴾ بۆ هەر هەواڵێکـی گرنگ سەقامگیــر بوون هەیـەو، لەمـەودوا دەزانـن ﴿٦٧﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ ): واتە: كلیلەكانی پەنهان، (مَفَاتِيح: جَمْعُ مِفْتَحْ وَمِفْتَاح، مَا يُفْتَحُ بِهِ وَجَمْعُهَا: مَفاتح وَمَفَاتِيح، وَقَالَ الرَّازِي: المفاتحُ جَمْعُ مِفْتَحْ وَهُوَ المِفْتَاحُ، وَمَفْتح وَهُوَ الخَزَانَة)، واتە: وشەی (مَفَاتِح) كۆی (مِفْتَحْ) و (مِفْتَاح)ە، هەر شتێكە كە دەرگا، یان شتێكی دیكەی پێ دەكرێتەوە، ئنجا ئەگەر كۆی (مِفْتَحْ) بێ (مَفَاتِح)ە، وە ئەگەر كۆی (مِفْتَاح) بێ (مَفَاتِيح)ە، فەخرەددین ڕازیش دەڵێ: (مَفَاتِح) یان كۆی (مِفْتَحْ)ە، كە بریتیە لە (مِفْتَاح) كلیل، یان كۆی (مَفْتِح)ە، (مَفْتِح)یش بریتیە لە خەزێنەو عەمبار.

(حَبَّةٍ ): (الحَبُّ وَالحَبَّةُ: يُقَالُ فِي الحِنْطَةِ وَالشَّعِير وَنَحْوهِمَا مِنَ المَطْعُومَاتِ)، وشەی (حَبُّ) و (حَبَّة) بە دەنكی گەنمو جۆ دەگوترێ، وە وێنەی ئەوان، وەك دەنكە هەرزن، برنج، گەنمەشامی، نۆك، نیسك.

(كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ): واتە: كتێبێكی ئاشكرا، كتێبێكی ڕوون، (الكِتَابُ فِي الأَصْلِ اسْم للصَّحِيفَة مَعَ المَكْتُوب فِيهِ، اللَّوحُ المَحْفُوظ: عِلْمُ الله) وشەی (كتاب) لە ئەسڵدا لاپەڕەیەكە، یان هەر شتێكە كە شتی لەسەر دەنووسرێ، لەگەڵ نووسینەكەی نێویشی، پێی دەگوترێ (كتاب)، واتە: تیانووسێك، جا كاغەز بێ، چەرم بێ، پێست بێ، بەردی تەنك بێ، گەڵای درەخت بێ، لەگەڵ ئەو نووسینەی كە تێیدا دەنووسرێ، ئەگەر نووسینی لەسەر نەبێ، پێی ناگوترێ: (كتاب)، هەروەها دەگونجێ مەبەست لە (كتابِ مبين) لەوحی پارێزراو (لوحُ المَحْفُوظ) بێ، ئەو جیسمەی كە خوای پەروەردگار هەموو زانیارییەكانی خۆی لەبارەی دروستكراوەكانییەوە تێدا تۆمار كردوون، بە پێی ڕای زۆرێك لە زانایان، كە خوای زانا باسی (لوحُ المَحْفُوظ)یش دەكات، دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ۝٢١ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ۝٢٢ ﴾، مەبەست پێی (كتابِ مبين)ە، یاخود مەبەست پێی زانیاری خوای پەروەردگارە.

(يَتَوَفَّـٰكُم ): واتــە: بــە تــەواویی وەرتانـدەگــرێ، جـا خــوای کاربەجــێ (تَـوَفَّى)ی بەکارهێنـاوە بـۆ مرانـدنو بـۆ خــەواندنیش، (التـوفّي: عُبِّـرَ عَـنِ النَّـوْمِ وَالـمَوْتِ بالتــوفِيِّ: أَخْـذُ الشــيءِ وَافِيَـاً كَـامِـلاً)، وشــەی (توفــي) بــۆ خــەوتنو مــردن بەکارهاتوە، (تـوفِي)یش ئەوەیە شتێك بەتـەواویی وەربگیـرێ، کـە مرۆڤـ دەخـەوێ خـوای پەروەردگار ڕووحەکەی وەردەگرێ، وە کە دەشـمرێ ڕووحەکـەی وەردەگـرێ، بەڵام لە حاڵەتی مردنـدا، ڕووحەکـەی یـەکجاریی وەردەگـرێو، هـیچ پەیوەنـدیی بـە بەدەنـەوە نامێنــێ، لـە حاڵـەتی خەوتنـدا پەیوەندییـەکی دەمێنــێ، بـایی ئەوەنـدەی جەسـتەی کـار بکـاتو پێویسـتی پێـی هـەبێ.

(جَرَحْتُم ): (كَسَبْتُم، الجَـوَارِح: الأَعْضَـاء الكَاسِـبَة، الإِجـترَاحُ: إِكْتِسَـابُ الإِثْـم)، (جَـرَحْتُم) واتـە: وەدەسـتتان هێنـاوەو کردووتانـە، ئەندامـەکانی جەسـتە وەك چـاو، گــوێ، دەســت، پێــی پێیــان دەگوتــرێ: (جَارِحَـة)، بۆچـی؟ چـونکە کردەوەیـان پـێ ئەنجام دەدرێ، جا ئەوە لە ئەسڵدا لە (جرح)ەوە هاتوە، واتە: برینـدارکـردن، بۆیـە (جـوارح) بـۆ ئـەو شــتانەش بەکــاردێ کـە بـۆ ڕاووشـکار بەکــاردێن، وەك سـەگو تـاژیـیو ...هـتد. وە (الإِجترَاح) واتە: گونـاح کـردن.

(يَبْعَثُكُمْ ): (أَصْـلُ البَعْـث إِثَـارَة الشَّـيء وَتَوجِيهُـهُ، أَي يُخْـرِجُكُم وَيُسـيِّرِكُم إِلــى يَـوْمِ القِيَـامَةِ) (بَعْـث) ئەوەیـە کـە شـتێك هەڵگیـرسـێنیو ئاڕاسـتەی بکـەی، کـە دەفەرموێ: (يَبْعَثُكُم)، واتە: دەرتانـدێنــێ، وە بەڕێتــان دەکات بـەرەو ڕۆژی دوایـی، ئــەوە ئەگــەر مەبەســت پێــی زیندووکردنــەوە بــێ، وە ئەگــەر مەبەســت پێــی بێدارکردنـەوە بێ، بەڕێتــان دەکـات بـۆ ڕۆژگــار، واتـە: لـە شــەوێ دا بەئـاگـاتـان دێنێ، بۆئەوەی لە ڕۆژێ دا کـار بکـەن.

(حَفَظَةً ): (جَمْع حَافِظ : الـمَلاَئِكَة الَّذِينَ يَكتبونَ أَعْمَـال بَنِـي آدَم)، کۆی (حَـافِظ)ە، واتـە: پارێـزەر، مەبەســت پێـی ئـەو فریشــتانەیە کە کردەوەکــانی نــەوەی ئـادەم تۆمـار دەکـەن.

(لَا يُفَرِّطُونَ ): واتـە: کەمتەرخەمـیی ناکـەن، (فَـرَطَ وَفَـرَّطَ، يَعْـني: قَصَّـرَ فِـي الأَمْـرِ وَضَيَّعَهُ حَتَّى فَـاتَ، وَأَفْرَطَ: جَـاوَزَ)، (فَـرَطَ) و (فَـرَّطَ) واتـە: کەمتەرخـەمیی کـرد لـە کارەکـەدا، تـا کارەکـەی زایـە کـردو لەدەسـتی چـوو، بـەڵام (أَفْـرَطَ) واتـە: تێپەڕاند، (تَفْـرِيط) واتـە: کورتهێنـانو بەزایـەدان، (إِفْـرَاط) واتـە: تێپەڕانـدنو زێدەڕۆیی کـردن.

(كَرْبِ): (الكَـرْبُ: الغَـمُّ الشَّدِيد)، واتە: خـەفەتێکی زۆر گـەورە،

(يَلْبِسَكُمْ ): (لَبَسَ عَلَـيْهِ الأَمْرَ: خَلَـطَ) واتە: ئیشـەکەی لـێ تێکـەڵ کـرد.

(شِيَعًا ): (شِيعَة) واتە: کۆمەڵە خەڵکێك کە لەسەر شـتێك کۆدەبنـەوە، وە پشـتگیـریی کەسـێك دەکـەن لەسـەر بەرنامەیـەك، کـە کۆیـەکـەی (شِـيَع) و (أَشْـيَاع)ە، دەڵـێ: (مَنْ يَتَقَوّى بِهِم الإِنْسَان وَيَنْتَشِـرُونَ عَنْهُ)، واتە: (شِيعَة) هەر کۆمەڵە خەڵکێکـن کە کەسێك خۆیـان پـێ بەهێـز دەکـات، وە لـەوەوە بـڵاودەبنـەوە.

(بَأْسَ ): (الـعَذَابُ وَالشِّـدَّةُ فِي الحَـرْب) (بـأس) بـە مانـای سزاو ئـازارو سـەختیی دێ لـە جەنگـدا.

(يَفْقَهُونَ ): (الفِـقْه: هُـوَ التَّوصّـل إِلـى عِلْـم غَائِـب بعِلْـم شَـاهِد، فَهُـوَ أَخَـصّ مِـنَ العِلْـم)، (فِـقْه) بریتیـە لـە گەیشـتن بـە شـتێکی نادیـار، بەهـۆی زانینـی شـتێکی دیـارەوە، بۆیـە (فِـقْه) تایبەتـترە لـە (عِلْـم)، چـونکە (عِلْـم) هـەموو شـتێك دەگرێتـەوە، وەك پـەی بردن بە شتێك کە دەگونجـێ بزانـرێ، (فِقْه) بریتیـە لـەوە کە بەهۆی شـتێکی زانـراوەوە، شـتێك دەرك بکـەیو بزانـی، کە نەزانـراوە.

(بِوَكِيلٍ ): (الوَكِـيلُ: فَعِيـل بمَعْنَـى الـمَفْعُول، والتَّوْكِيـلُ أَنْ تَعْتَمِـدَ عَلَـى غَيْـرِكَ وَتَجْعَلَـهُ نَائِبـاً عَنْـك)، واتـە: (وَكِيـل) (فَعِيـل)ە، بـە مانـای (مَفْعُـول)، واتـە: (مَوكُول) کەسێك کە کـارت پـێ سـپاردوە. (تَوْكِيـل)یـش ئەوەیـە کـە پشت بـە

غەیری خۆت ببەستیو بیکەی بە جێداری خۆت، بڵێی: فلان کەس وەکیلی منە، (وَكَّلْتُه) واتە: کردمە وەکیلی خۆم، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ آل عمران، واتە: با بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، یانی: تەنیا خوا بکەنە وەکیلی خۆیانو پشت بەو ببەستن.

(مُّسْتَقَرٌّ): یان بە مانای سەقامگیربوون دێ، یان بە مانای کاتی سەقامگیربوون دێ، یان بە مانای شوێنی سەقامگیربوون دێ، لە (قَرَّ يَقَرُّ قَرَارًا)ەوە هاتوە، بە مانای (ثَبَتَ) واتە: جێگیربوو (وَاسْتَقَرُّ فُلاَن: تَحَرَّى القَرَار، وَقَد يُسْتَعْمَل بمَعْنَى قَرَّ، كَاسْتَجَابَ وَأَجَابَ) واتە: ویستی ڕابوەستێ، جاری وایە بە مانای (قَرَّ)ش دێ، وەك (إِسْتَجَابَ) و (أَجَابَ)ە، هەردووکیان بە مانای وەڵامی دایەوە، دێن، بەڵام (إِسْتَجَابَ) واتە: وەڵامدانەوەکەی بەهێز بوو.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای بێ وێنە لەم نۆ (٩) ئایەتە موبارەکەدا کۆمەڵێك سیفەتی گەورە گەورەی خوای، کە هەموو سیفەتەکانی خواش گەورەن، وە کۆمەڵێك لە کردەوە سەرسوورِهێنەرەکانی خوای، بۆ ئێمە دەخاتەڕوو، دیارە جاری دیکەش گوتوومانە: ئەم سوورِەتە هەمووی باسی خوا بەیەکگرتنە: هەر خوا بە دیهێنەرە، هەر خوا پەروەردگارو مشوورخۆرو کارسازە، باسی خاوەنداریێتی خوا، باسی سەرپەرشتیاریێتی خوا، باسی دادگەریێتی خوا، باسی حوکمڕانیێتی ڕەهای خوا، باسی ناوە چاکەکان‌و سیفەتە بەرزەکانی خوا، وە سەرەنجام باسی ئەوە کە تەنیا خوایەك کە دەبێ هەر ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارو سەرپەرشتیارو خاوەنی هەموو ناوێکی بەرزو سیفەتێکی پەسند بێ، هەر ئەو شایستەیە بەندایەتیی بۆ بکرێ‌و، بپەرسترێ‌و ملکەچیی بۆ بکرێ، واتە: لە هەموو کەسێك‌و لە هەموو شتێك زیاتر خۆشبویسترێ‌و، ملی بۆ کەچ بکرێ‌و، ڕێزی بگیرێ‌و، شەرمی لێ بکرێ‌و، پشتی پێ ببەسترێ، دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾، وە کلیلەکانی زانینی پەنهان‌و نادیار، تەنیا لەلای ئەون، جگە لە خوای پەنهانزان هیچ کەس ئەو کلیلانە نازانێ، یاخود ئەگەر (مَفَاتِح) کۆی (مَفْتِح) بێ، واتە: خەزێنەکانی نادیار غەیب تەنیا لەلای خوان، بێجگە لە خوا کەس ئەو عەمبارو خەزێنانە نازانێ چییان تێدایە.

دوای ئەوەی بەگشتی ئەوەی فەرموو، ئنجا دێتە سەر وردەکارییەکان، دەفەرموێ:

﴿وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ﴾، خوا دەزانێ چ لە وشکانییدا هەیەو، چ لە دەریادا هەیە، ئنجا ئەو هەموو بیابانە بێنە پێش چاوی خۆت، ئەو هەموو شاخ‌و چیایانە بێنە پێش چاوی خۆت، ئەو هەموو دەشت‌و دەرو کەژو کێوو قەدو قەدپاڵانە بێنە پێش چاوی خۆت! ئنجا ئەو هەموو دەریاو زەریاو ئۆقیانووسانە بێنە پێش چاوی خۆت، چییان تێدایە، چییان تێدا دەجووڵێ؟ خوا هەر هەمووی دەزانێ، وەك لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: (خوا مێرووی ڕەش لە شەوی تاریکدا، بەسەر بەردی ڕەشەوە دەبینێ)، ئەوە بۆ ئێمە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار نێو بەردەکەو نێو

هەناوی ئێمەش دەبینێو دەزانێ، پێشێ باسی خەزێنەکانی کرد، دوایی باسی تەڕو وشکی کرد، پاشان سەرەنجمان بۆ شتێکی دیکەی زۆر ورد ڕادەکێشێ، دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا﴾، هیچ گەڵایەك لە هیچ درەختێك ناکەوێتە خوار، مەگەر خوا دەیزانێ، ئنجا پایزان بێننە پێش چاوی خۆتان کە دەبێتە گەڵاڕێزان، لە کۆی سەر زەویدا چەند گەڵا دەکەونە خوار؟ خوا هەموویان دەزانێ، یەك بە یەك !! ﴿وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ﴾، وە هیچ دەنکە تۆوێك نیە لە تاریکاییەکانی زەویدا، دەنکی: گەنم، جۆ، نیسك، برنج، هەرزن، چی دیکە هەیە لەسەر زەوی کە دەچێنرێ، خوای پەنهانزان هەر هەمووی دەزانێ، ﴿وَلَا رَطۡبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾، هیچ تەڕێك نیەو هیچ وشکێك نیە، مەگەر لە کتێبێکی ڕوون دایە، کە مەبەست پێی زانیاریی بێسنووری خوایە، یان مەبەست پێی (لوح المحفوظ)ە، خوا زانیارییەکانی خۆی لەوێدا نووسیوە، ئەوە بەنسبەت زانیاریی.

ئنجا (خوا) دێتە سەر خستنەڕووی دەستەڵاتی خۆی، سەرەتا باسی خەوتن (نوم) دەکات، کە شتێکی زۆر جێی سەرنجە، دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ﴾، وە هەر ئەوە کە بە شەوێ دەتانخەوێنێ، وە دەزانێ بە ڕۆژێش چی دەکەن، خەولێکەوتن شتێکی زۆر سەیرە ! مرۆڤ جاری وایە خەوی لێدەزڕێ، هیچ خەوی لێ ناکەوێ، جاری وایە ناتەوێ بخەوی، خەوت بە ملدا دێ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (خەو زاڵمە !)، یەکێك بۆی گێڕاومەوە گوتی: دوو سێ شەوو ڕۆژ بوو نەخەوتبووم، بە شەوێ بەنێو دوو پەڵە گەنماندا دەڕۆیشتم، کە لامدەدا بە گوڵە گەنمان دەکەوتم، بەئاگا دەهاتم، یانی: هەر بەڕۆیشتنەوە خەوتوە، جا مرۆڤ ئاوایە، خوا دەفەرموێ: خوا ئەو کەسەیە کە بە شەوێ دەتانخەوێنێ، ڕووحەکانتان وەردەگرێتەوە، وە دەشزانێ بەڕۆژێ چی دەکەن، ﴿ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗى﴾، دوایی لە ڕۆژێدا بێدارتان دەکاتەوە، بۆئەوەی کاتێکی

ناوبراو، تەواو ببێ، کە مەبەست تەمەنێ دنیایانە، ﴿ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، دوایش بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، ئنجا هەواڵتان پێدەدات، بەو کردەوانەی کە دەتانکردن، کەواتە: خوا ئاگادارە کە ڕۆژو شەوتان چۆن دەگوزەرێنن.

﴿ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ ﴾، وە خوا زاڵەو مل پێ کەچکەرە، بەسەر بەندەکانییەوە، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾، وە چەند پارێزەرێکیشتان دەنێرێتە سەرێ، کێن پارێزەرەکان؟ فریشتەکان، چیمان دەپارێزن؟ کردەوەکانمان دەپارێزن، وەك دوایی باسی دەکەین، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا ﴾، هەتا کاتێك یەکێکتان کاتی مەرگی دێ، نوێنەرو ڕەوانەکراوەکانی ئێمە گیانی دەکێشن، کێن ڕەوانەکراوو نوێنەرەکان؟ فریشتەکانن، ﴿ وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾، وە کەمتەرخەمییش ناکەن، لە کاتی خۆیدا، لە شوێنی خۆیدا، بێئەوەی چرکەیەك تێپەڕێ، یان پێش بکەوێ، گیانی دەکێشن، ﴿ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ ﴾، دوایی گێڕدرانەوەیان، بۆ لای خوا سەرپەرشتیاری هەقیانە، کە هەر ئەو سەرپەرشتیارو مشوورخۆری ڕاستەقینەیانەو، هەر ئەو کارسازیانە، ﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴾، ئاگاداربن ! حوکمو بڕیار هەر بۆ ئەوە، وە ئەو خێراترین لێپرسەرەوەیە، جا مرۆڤ کە ئێستا کۆمپیوتەرو ئەو ئامێرانەی دیکەی دروست کردوون، کە بە چاوتروکانێك هەرچی زانیارییت بوێ، دەتداتێ، تێدەگات کە زانیاریی خوا چەند زۆرو بێسنوورە، هەر خوا دەزانێ چەندە؟

ئنجا شتێکی دیکەیان دەخاتە پێش چاو، دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ ﴾، بڵێ: کێ لە تاریکاییەکان (واتە: سەختییەکان)ی وشکانیی و دەریا دەربازتان دەکات؟ کە لێی دەپاڕێنەوە بە

کڕووزانـەوەو بـە پەنهـانیی، دەڵێـن: ﴿لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾، ئەگەر خـوا دەربازمان بکات لـەم تەنگانـەو سەغڵـەتییە، ئێمـە لـە سوپاسگوزاران دەبـین، بێگومـان سـوێند دەخۆیـن، جارێکی سـپڵەو ناسـوپاسگوزار نابیـن، ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴾، بڵـێ: هـەر خـوا لـەو گرفتارییـەی کـە بـۆی دەپاڕێنـەوە، دەربازتـان دەکـات، وە لـە هـەر خـەمو خەفـەتو مەینەتییـەکی دیکـەش، دوایـیش ئێـوە هـاوبەش بـۆ خـوا دادەنـێن، واتـە: غـەیری خـوا دێننـە ڕیـزی خـواو دەیپەرسـتن.

**ئنجا (خـوا) باسـی تواناداریـی خـۆی دەکـات لەسـەر سـزادانی جۆراجـۆری مرۆڤـەکان:**

﴿ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ﴾، خـوا بـە توانـایە کـە لـە سـەرووتانەوە سزاتان بۆ بنێـرێ، یان لە بـن پێتـانەوە سزاتان بۆ بێنـێ، یـاخود پەرتـەوازەتـان بکـاو بتانکاتـە چەنـد کۆمـەڵو دەسـتەیەكو پێکـتان وەربکـات، وە ئـازارو نارەحـەتیی‌و سزای هەندێکتان بە هەندێکتان بچێژێ، ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴾، سەرنج بدە! چۆن ئایەتەکانیـان بۆ جـۆراو جـۆر دەکـەین، بۆئەوەی تێبگـەیـن.

لـە کۆتاییـدا دەفـەرموێ: ﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۚ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴾، وە گەلەکـەت ئـەم قورئانـەیان بـە درۆ دانـا، لـە حاڵێکـدا کـە هەقـە، بڵـێ: مـن وەکیـل نـیم بەسـەرەتـانەوە، ﴿ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ۚ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، هـەموو هەواڵـێکی گـرنگ، کاتێـك دێ، سـەقامگیـر بـێ، بێتـە دی، یـان شـوێنێکی هـەیە، وە لەمـەودوا بۆتـان دەردەکـەوێ، ئـەو هەواڵـەی کـە خـوا دەفـەرموێ: لێپرسـینەوەتان لەگەڵـدا دەکـرێ‌و پاداشـت‌و سـزا هەیـە، هـەر هـەمووی ڕاسـتە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾، بە پێی تێگەیشتنی من خوای زاناو شارەزا لەم ئایەتە موبارەکەدا، باسی زانیاریی خۆی دەکات، هەم بە شێوەی فراوان، هەم بە شێوەی وردەکاریی، سەرەتا ئاوا دەست پێدەکات، دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ﴾، وە کلیلەکانی پەنهان تەنیا لەلای وین، واتە: لەلای خوای تاكو تەنیان، ئەو کلیلانەی کە شتە پەنهانەکانیان پێ دەزانرێن، (مَفَاتِح) کۆی (مِفْتَح) و (مَفْتِح)ە، کە (مِفْتَح) واتە: کلیل، وە (مَفْتِح) واتە: خەزێنە، عەمبار، یانی: بێجگە لە خوا هیچ کەس پەنهان نازانێ.

## باسێك لەوبارەوە كە پەنهان (غیب) تەنیا خوا دەیزانێ

مەسەلەی پەنهان (غیب) زانین لە ئیسلامدا، بە تەواویی یەکلا (حسم) کراوە، کە تەنیا خوا دەیزانێ، وەك دەفەرموێ: ﴿لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾، بەڵام بەداخەوە زۆرجار هەندێ لە مسوڵمانان تووشی لادان بوو ون لە ئایینەکەیان، کە ئێستا باسی دەکەین:

**چەند ئایەتێك لەوبارەوە: کە پەنهان تەنیا خوا دەیزانێ**

١) خوا ﷻ لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ۝٦٥﴾، واتە: بڵێ: نهێنییەك

کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، جگە لە خوا کەس نایزانێ، وە ناشزانن کەی زیندوو دەکرێنەوە.

٢) هەروەها لە سوورەتی (الجن)دا دەفەرموێ: ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾ لِّيَعۡلَمَ أَن قَدۡ أَبۡلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمۡ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيۡهِمۡ وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ عَدَدَۢا ﴿٢٨﴾ ﴾، (خوای بێهاوتا باسی خۆی دەکات، دەفەرموێ:) زانای نادیارو پەنهانە، هیچ کەس ئاگادار ناکاتەوە لەو پەنهانو نادیارەی کە بەس خۆی دەیزانێ، مەگەر ڕەوانەکراوێك کە بۆخۆی لێی ڕازی بێو پەسندی بکات، (کە ڕەنگە لێرەدا مەبەست پێی فریشتەکان بێ، ئەو فریشتانەی کە وەحی بۆ پێغەمبەران دێنن) ئەو ڕەوانەکراوەش بەو پەنهانو نادیارە، لە پێشو لە دواوە چەند چاودێرێك دادەنرێنو، چاودێریی دەکەنو ئاگایان لێدەبێ، بۆئەوەی خوا بزانێ (خوا دەزانێ) ئەو فریشتانە پەیامی پەروەردگاریان گەیاندوە، وە خوا بۆخۆشی ئاگادارە پێیان، وە هەموو شتێکی سەرژمێر کردوە.

٣) وە لە سوورەتی (آل عمران)یشدا دەفەرموێ: ﴿ ..وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ ﴿١٧٩﴾ ﴾، واتە: خوا عادەتی نیە ئێوە لە پەنهان ئاگادار بکاتەوە، بەڵام لە نێو پێغەمبەرانی خۆیدا پێغەمبەرانێك هەڵدەبژێرێ. ئەو پێغەمبەرانە هەرکامێکیان چەند پێویست بکات خوا لە پەنهان ئاگاداریان دەکاتەوە.

کەواتە: وەك گوتم مەسەلەیەکی زۆر حەسەمەو بەتەواویی یەکلاکراوەتەوە، کە غەیبو پەنهان تەنیا خوا دەیزانێ.

## چەند فەرمایشتێك لەوبارەوە :

١/ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ أَتَى عَرَّافاً فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾[1]، واتە: هەر کەسێك بچێ بۆ لای عەڕڕافێك، دەربارەی

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٨٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٩٥٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٥).

شتێك پرسیاری لێ بكات (بڕواشی پێی هەبێ)، نوێژی چل شەوی لێ قبوول ناكرێ.

(عرّاف)[١] ئەو كەسەیە كە ئیددیعای زانینی پەنهان (غیب) دەكات، دەست دەگرنەوە، قاوە دەگرنەوە، هێڵو خەت دەكێشن لەسەر لم، بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی دیكە، كەسێك ئیددیعای ئەوە بكات، كە غەیبو پەنهان دەزانێ، ئەوە پێیدەگوترێ (عرّاف).

٢/ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أنَاسٌ عَنِ الكُهَّانِ، فَقَالَ: «لَيْسُوا بِشَيءٍ»، فَقَالُوا: يا رَسُولَ اللهِ! إنَّهُمْ يُحَدِّثُونَا أحْيَاناً بِشَيءٍ، فَيَكُونُ حَقّاً؟ فَقَالَ رسُولُ اللهِ ﷺ: تِلْكَ الكَلِمَةُ مِنَ الحَقِّ يَخْطَفُهَا الجِنِّيُّ فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ، فَيَخْلِطُونَ مَعَهَا مئَةَ كَذْبَةٍ﴾[٢]، واتە: دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: كۆمەڵە خەڵكێك دەربارەی فاڵچیی (كاهن)ەكان پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد؟ فەرمووی: هیچ نین، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! جاری وایە قسەیەكمان بۆ دەكەن ڕاستیش دەردەچێ ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە وشەیەكی ڕاستە، جیننی دەیڕفێنێ (لە فریشتەكان لە ئاسمان) دەیخاتە گوێی دۆستەكەی (كاهینەكە)، ئەوانیش سەد درۆی لەگەڵ تێكەڵ دەكەن.

یانی: تاكو جارێك قسەكەی ڕاست دەردەچێ، نەوەدو نۆ جار درۆ دەردەچێ، خەڵكیش نەوەدو نۆیەكەش بە ڕاست دەزانێ.

٣/ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّها سَمِعَتْ رسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «إنَّ المَلائِكَةَ تَنْزِلُ فِي العَنَانِ "وَهُوَ السَّحَابُ" فَتَذْكُرُ الأَمْرَ قُضِيَ فِي السَّماءِ، فَيَسْتَرِقُ الشَّيْطَانُ السَّمْعَ، فَيَسْمَعُهُ، فَيُوحِيَهُ إلَى الكُهَّانِ، فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِئَةَ كَذْبَةٍ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ»﴾[٣]، واتە: دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گوێی لە

---

١) المعجم الوسيط، ص: ٥٩٥، ( العرّاف: المُنَجِّم، طبيب العرب، الكاهن ).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٦١٤)، البُخَارِيُّ برقم: (٥٨٥٩) وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٩٥٣) وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٣٦).

٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٠٣٨).

پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: فریشتەکان لە هەوردا دادەبەزن، باسی شتێك دەکەن کە لە ئاسمانێ بڕیاری لەسەر دراوە(١)، شەیتانەکانیش بە دزیی گوێ لە فریشتەکان دەگرن، ئەو وشەیە دەبیستن، ئنجا بۆ کاهینەکانی باس دەکەن، ئەوانیش سەد درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکەن لەلایەن خۆیانەوە.

کەواتە: دەگونجێ هەندێ جار قسەی کاهینو فاڵچییەکان ڕاست دەربچێ، لەبەرئەوەی لەلایەن فریشتەکان باسکراوەو، شەیتانەکان دزیویانە، بەڵام زۆری درۆ لەگەڵ تێکەڵ دەکەن، بۆچی؟ لەبەرئەوەی زانیارییەکە زۆر کەمەو بەش ناکات، بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ نینو پشتیان پێ نابەسترێ.

پێشێ خوای زانا باسی کلیلەکانی زانینی نهێنی کرد، ئنجا وردتری دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾، خوا هەرچی لە وشکانیی دا هەیەو هەرچی لە دەریادا هەیە، دەیزانێ، هەرچی لە وشکانیی دا هەیە، ئەو هەموو بیابانانە، ئەو هەموو شاخو داخە، ئەو هەموو دەشتو دەرە، ئەو هەموو قەد پاڵو کەژو کێوە، وە هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە، ئەو زەریاو ئۆقیانووسە زلانە، ئەو هەمووە ڕووبارو دەریایانە، وە هەرچی تێیاندایە لە پەلەوەرو زیندەرەوەر ماسیو ژیانداریی دەریاییو... هەر خوا بۆخۆی دەزانێ چییان تێدایە.

ئنجا زیاتر وردی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا ﴾، هیچ گەڵایەك ناکەوێتە خوار مەگەر خوا دەیزانێ، ئنجا ئەوە ئەگەر مرۆڤ بیهێنێتە پێش چاوی خۆی، بەتایبەتی لە وەرزی پایزدا کە دەبێتە گەڵاڕێزان، کە لە یەك چرکەدا ملیۆنانو بگرە ملیاران گەڵای درەخت دەکەونە خوارو، جۆرەها درەخت گەڵاڕێزانانە، خوای زاناو پەنهانبین دەزانێ گەڵا بە گەڵای ئەو گەڵایانە، کەی دەکەوێتە خوار، چۆن دەکەوێتە خوار، وە دەکەوێتە کوێو، دواییش چی لێ بەسەر دێ ؟! ئەوە خوا وایفەرمووە، ئەگەرنا زەڕە زەڕەی

---

١) مەبەست ئەوەیە کە خوای پەروەردگار هەموو فەرمانەکانی ئاڕاستەی فریشتان دەکات، ئەوانیش لەنێوان خۆیاندا باسی دەکەن.

کە گەڵایەکانیان لێ پێکدێن، وە ئەو گەردیلەکانو ئەوەی گەردیلەکانیشی لێ پێکدێ، ئەو ئەلکترۆنو پرۆتۆنو نیوترۆنە، بەڵکو لەوانیش گچکەتر، خوای پەنهانبین هەمووی دەزانێ، چونکە زانیارییەکەی بێسنوورە.

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾، (حَبَّة) بریتیە لە دەنك، وەك: گەنمو جۆو نیسكو نۆكو ماشو برنجو هەرزنو، هەموو ئەو شتانەی کە پێیان دەگوترێ: دانەوێڵە، کە لە وڵاتانی دنیادا جۆرەها دانەوێڵەی دیکە هەن، دەفەرموێ: هیچ دەنکە تۆێك نیە لە تاریکاییەکانی زەویدا، مەگەر خوای زاناو توانا دەیزانێ، وە هیچ شتێك نیە کە تەڕبێو تەڕایی تێدابێ، یان وشك بێ، مەگەر هەمووی لە کتێبێکی ڕوون دایە.

## مەبەست لە: ﴿كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ چییە ؟

هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەست پێی (لَوْح مَّحْفُوظ)ە، وەك خوا لە سوورەتی (البروج)دا باسی دەکات، دەفەرموێ: ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ﴿٢١﴾ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴿٢٢﴾﴾ واتە: بەڵکو ئەوە قورئانێکی پلەو پایە بەرزە. لە لەوحێکی پارێزراودایە، جا (لَوْح) یانی: تەختە، (مَحْفُوظ) یانی: پارێزراو، کە بە پێی ڕای هەندێك لە زانایان: دەگونجێ جیسمێکی گەورە بێ، خوای زاناو توانا زانیاریی خۆی تێدا نووسیوە، دەربارەی ئەو شتانەی دروستی کردوون، ئەگەرنا زانیاریی خوا بێسنوورە.

هەندێکیش لە زانایان دەڵێن: ئەوە تەعبیرێکە خوا بەکاریهێناوە بۆ تێگەیشتنی ئێمە، وەك چۆن ئەگەر کەسێك هەموو زانیارییەکانی خۆی لە دەفتەرێك دا بنووسێتەوە، هەمیشە کتێبەکەی لەبەرچاوەو، دەتوانێ یەکسەر بگەڕێتەوە بۆ زانیارییەکانی، ئێمە وەك مرۆڤ ئاواین، بەڵام لەبەرئەوەی خوا عەقڵی ئێمە دەدوێنێ، بۆیە وایفەرمووە، ئەگەرنا مەسەلەکە ئەوەنیە: تەختەیەك هەبێو زانیاریی خوای تێدا نووسرابێتەوە ! بەهەرحاڵ هەر کامێکیان بێ، ئاسایی یە، بەڵام من ڕای دووەمیانم پێی لە ڕاستیی نیزیکترە، کە ئەوە تەعبیرێکە خوا بەکاریهێناوە، بۆ تێگەیشتنی ئێمە لە زانیاریی بێسنووری

خوا، جا ئەوە لە چەند شوێنی دیکەی قورئان دا هاتوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٢٢﴾الحديد، واتە: هیچ بەڵایەکتان تووش نایەت لە زەویدا یان لە نەفسیی خۆتاندا، مەگەر لە نووسراوێك دایە، بە تۆمارکراویی بەرلەوەی دروستی بکەین.

بۆیە من دەڵێم: ئەوە مەبەست زانیاریی بێسنووری خوایە، واتە: خوای خاوەن زانیاریی بێسنوور، بەرلەوەی شتەکان بێنێتەدی، دەیانزانێ، وەك چۆن کەسێك شتێکی نووسیبێتەوە، دەیزانێ.

وە لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ اللّٰهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾(١)، واتە: خوا ئەندازەکانی دروستکراوەکانی خۆی، بەرلەوەی ئاسمانەکانو زەوی دروست بکات، بە پەنجا هەزار ساڵ، هەمووی نووسیونەوە.

کە من پێموایە ئەمەش هەر تەعبیرێکە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە کە هەموو شتێك لە زانیاریی خوای پەروەردگاردا هەیە، هەرچەندە هیچ تێکگیرانێکیش نیە، ئەگەر خوای پەروەردگار زانیاریی خۆی دەربارەی دروستکراوەکانی نووسیبێتەوە، ئەوەش هەر شتێکی ئاساییە، بەڵام بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، ئێمە نازانین چۆنە.

لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ﴾(٢)، واتە: قەڵەم وشك بووە، (واتە: ئەو مەرەکەبەی کە قەڵەم نووسیویەتی، تازە وشك بووە) بەوەی هەیەو دەبێ، هەتا ڕۆژی دوایی.

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٦٥٣) وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٥٦).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٠٤)، وَالطَّبَرَانِيُّ في "المعجم الكبير" برقم: (١١٢٤٣)، قَالَ الشيخ شعيب الأرناؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

ئنجا کەسێك بە سەرکێڵیی تەماشای قورئان بکات، دڵو دەروونیشی تەواو نەبێ، ڕەنگە بڵێ: مادام خوا هەموو شتێکی نووسیبێ، کەواتە: خوا چۆنی نووسیبێ دەبێ هەر وابێ !

بەڵام وەك گوتم: خوا بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەیە، دەزانێ چی دەبێو چۆن دەبێ؟ وە دوایی ئێمەش ناچار ناکات کە چاکە بکەین، یان خراپە بکەین، بەڵکو بە خواستو ویستی خۆمان کارەکان دەکەین، من لە بەرگی چوارەمی کتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)[1] لە باسی قەدەردا، بە تەفصیلْ باسمکردوە، کە زانیاریی خوا ئێمە ناچار ناکات چاکە بکەین، یان خراپە بکەین، بە بەڵگەی چی؟ لەوێش ئەم وێنەم هێناوەتەوە:

مامۆستایەك لە سەرەتای ساڵەوە تەماشای قوتابییەکانی دەکاتو دەفتەری یاداشتنامەی هەیە، ئایا ئەگەر بەپێی بۆچوونی خۆی بڵێ: فلان کەس یەکەم دەبێ، فلان کەس دووەم دەبێو، فلان کەس دەرناچێو دەمێنێتەوەو، فلان کەس لە دەرسێك دەکەوێو، دواییش هەمووی لە دەفتەرەکەدا تۆمار بکات، ئنجا ئەگەر سەرەنجام ئاوا دەرچوو، کەس بۆی هەیە بڵێ: لەبەرئەوەی مامۆستا نووسیبووی، فلان کەس یەکەم دەبێ، بۆیە یەکەم بوو، وە نووسیبووی فلان کەسیش لە دەرسێك دەکەوێ، بۆیە کەوت؟ نەخێر، چونکە مامۆستایەکە دەڵێ: من بەپێی ئەوەی تەماشای حاڵو وەزعی خۆتانم کرد، وامگوت، فلانکەس هیچ کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدەداو خۆی ماندوو دەکرد، گوتم: ڕەنگە ئەوە یەکەم بێ، ئەوەی دیکەش کە دەمبینی نەیدەخوێندو دەرسەکەی فەرامۆش دەکرد، گوتم: لەو دەرسە دەکەوێ..

ئنجا ئەوە ئینسان زانیارییەکی سنووورداری هەیە، دەتوانێ ئەو پێشبینییانە بکات، ئەدی خوای پەروەردگار؟ ئنجا ئایا نووسینی مامۆستایەکە بووە هۆی ئەوەی فلان قوتابی یەکەم بێو، فلانیش لە دەرسێك بکەوێ؟ بێگومان نەخێر، ئەوەی یەکەم بوو، بەهۆی خوێندنو خۆماندووکردنی خۆیەوە بوو، وە ئەوەش کە کەوت، بەهۆی نەخوێندنو فەرامۆشکردنی دەرسەکانیەوە بوو، مامۆستاش کە تەماشای حاڵیانی کرد، ئەوە دەرەنجامەی لێ هەڵهێنجا.

---

١) هەروەها لە بەرگی پێنجەمی کتێبی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله عزّ وجلّ)یش دا باسێکی کورتو پوختم لەوبارەوە کردوە.

بێگومان کە خوای بەدیهێنەر ئێمەی دروست کردوە، پێش ئەوەی ئێمە دروست بکات، زانیویەتی، فلان کەس چی دەکات‌و چۆن دەکات؟ بەلاَم زانیویەتی فلان کەس چی دەکات‌و چۆن دەکات، بە ویست‌و خواستی ئازادانەی خۆی، نەك خوا ناچاریی بکات کە وا بکات، بۆیەش پاداشت‌و سزا ڕوو لە ئینسان دەکەن، بەلاَم مەسەلەی نووسین، کە هەیە دەڵێ: خوا لەنێوچەوانی نووسیوە، وەك گوتم: پێمwایە ئەم نووسینە تەعبیرێکە، یانی: خوا زانیویەتی، ئنجا ئەگەر دەقێکی قورئان‌و سوننەتیش هەبێ، کە دەق‌و ڕاشکاو بێ لەسەر نووسین، ئەوە هیچ گرفتێك نیە.

**مەسەلەی دووەم**: کە خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە بە شەوگار دەتانخەوێنێ، وە دەزانێ بە ڕۆژگاریش چی دەکەن، دوایی (لە شەوێ یان لە ڕۆژێ دا) بەئاگاتان دێنێتەوەو بێدارتان دەکاتەوە، بۆئەوەی کاتێکی ناوبراو تەواوبێ، دوایی بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە، پاشان هەواڵتان پێدەدات بەوەی کە دەتانکرد.

## دوو هەڵوەستە لە بەرانبەر ئەم ئایەتی (٦٠) دا:

**هەڵوەستەی یەکەم**: ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ﴾، خوا ئێوە وەردەگرێ بە شەوێ، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (تَوَفَّاهُ: أَي أَخَذَهُ بتَمَامِهِ)[1] بەتەواویی وەریگرت، دوایی بەکارهێنراوە بۆ مراندن‌و خەواندن، بە بەڵگەی ئەوەی لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِى لَمۡ تَمُتۡ فِى مَنَامِهَا...﴿٤٢﴾﴾الزمر، واتە: خوا ڕووحەکان

١) مختار الصحاح، ص: ٦٢٦.

بەتەواویی وەردەگرێ لە کاتی مردندا، ئەوانەش کە نەمردبن، لە کاتی نووستندا.

هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ ﴿٥٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا ! من تۆ وەردەگرم، وە بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ ﴾، ئەی عیسا ! من تۆ دەمرێنم، کەواتە: عیسا مردووە، بە مردوویی جەستەکەی بەرزبۆتەوە ! کە بێگومان ئەمە ڕایەکی بێهێزەو مەرج نیە (وفاة) بەمانای مردن بێ، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ ﴾، واتە: دەتانخەوێنم، هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ...﴿٤٢﴾ ﴾الزمر، ئنجا دەبێ تەماشا بکەین ئایا وشەی (متَوَفّی)مردنی لەگەڵ دەگونجێ، یاخود خەواندن؟ کە لە ئەسڵدا وشەی (مُتَوَفِّيكَ ): بە سێ واتایان هاتوە: (مُمِيتُكَ، أَوْ مُنِيمُكَ، أَوْ قَابِضُكَ) واتە: دەتمرێم، یان دەتخەوێنم، یان وەرتدەگرم، وە دەگوترێ: (تَوَفَّى الْمُدَّةَ: بَلَغَهَا وَاسْتَكْمَلَهَا) واتە: ماوەکەی تەواوکردو گەیاندیە سەر، یاخود تەواوی کرد، ئنجا ئایا خوای بەرز کە دەفەرمویٚ: ﴿يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ ﴾، کام مانایان لەگەڵ سیاقەکەدا دەگونجێ؟ بێگومان ئەوەی سێیەم، چونکە: ئەگەر خوا مراندبای دەیفەرموو: جەستەکەت بۆ لای خۆم بەرز دەکەمەوە، بەڵام دەفەرمویٚ: ﴿وَرَافِعُكَ إِلَىَّ ﴾، واتە: ڕووحو جەستەت، وەك خۆت.

ئاشکراشە وە لەنێوان نووستنو مردندا پەیوەندییەکی زۆر هەیە: لە کاتی مردندا ڕووح لە جەستەدا نامێنێ، یاخود پەیوەندیی بە جەستەوە نامێنێ، وە لە کاتی خەوتندا ڕووح بە یەکجاریی پەیوەندیی لەگەڵ جەستەدا ناپچڕێ، بەڵام گۆڕانێکی بەسەردا دێ، کە بەشێك لە ئەندامەکان کارناکەن، ئەو ئەندامانەی کە بە خواستو ویستی مرۆڤ کار دەکەن وەك: عەقڵو دەماغو

گوێو چاوو زمانو دەستو پێ، مەگەر بە شێوەیەکی نەویستەنیی (لا إرادي) دەست یان پێ بجوولێ، بەڵام ئەو ئەندامانەی کە پەیوەندییان بە ویستی مرۆڤەوە نیە، هەر کار دەکەن، وەك: لێدانی دڵو گورچیلەو گەدەو سییەکان، کە ئەگەر ئەوانە کار نەکەن، مرۆڤ دەمرێ،

بەڕاستیی مرۆڤ دروستکراوێکی زۆر سەیرو سەرسووڕهێنەرە، خەو بەدەست خۆت نیە، جاری وایە دەتەوێ نەخەوی، کەچی لەنەکاو خەوت لێکەوتوە، جاری واش هەیە دەتەوێ بخەوی، خەوت لێناکەوێ ! ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە خەو (نوم) ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە ڕووحەوە هەیە، وە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ڕووح لە جەستەدا نیە، بەڵکو تەنیا پەیوەندیی پێوە هەیە، ئنجا کە مرۆڤ دەمرێ، پەیوەندیی یەکجاریی لەگەڵی دەپچڕێ، بەڵام کە دەخەوێ، پەیوەندییەکە لاواز دەبێ، کە ئەوەش هەر خوا دەیزانێ، چونکە تا ئێستا کەس نازانێ ڕووح چییە؟ وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: دەربارەی ڕووح پرسیارت لێدەکەن، بڵێ: ڕووح کاری پەروەردگارمەو ئەندازەیەکی کەمیش نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە، (ئەو ئەندازە کەمەش دیارە حەقیقەتی ڕووحی پێ نازانن).

**هەڵوەستەی دووەم :** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، واتە: خوا دەزانێ بە ڕۆژێ چی دەکەن، (جَرَحْتُم) یانی: (كَسَبْتُم) بۆچی وا گوتراوە؟ چونکە چاوو گوێو زارو دەستو پێ، هەموویان پێیاندەگوترێ: (جَارِحَة) کۆیەکەی (جَوارِح)ە، چونکە مرۆڤ بەو ئەندامانە کار دەکاتو کاریگەریی لەسەر شتەکان دادەنێ، وەك چۆن شتێك کە برینی تێدەبێ، پێی دەگوترێ: (جُرْح)، خوای پەروەردگار ئەو وشەیەی بەکارهێناوە بۆ (كَسْب) واتە: بۆ ئەو کارو چالاکییانەی کە ئینسان ئەنجامیان دەدات.

﴿ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى﴾، ﴿يَبْعَثُكُمْ﴾، یانی: (يُوقِظُكُم) دوایی خوا خەبەرتان دەكاتەوەو بێدارتان دەكاتەوە، كەواتە: خەواندن بەدەست خوایە، بێداركردنەوەش هەر بەدەست خوایە، نەتانبینیوە؟ یان نەتانبیستوە؟ كەسی وا هەبووە خەوتوە، بەخەبەر نەهاتوە؟ كەی بەخەبەر دێ؟ لە قیامەتێ بەخەبەر دێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا...﴿٤٢﴾﴾الزمر، بەڵێ هەیە وەك گوتم: بۆ خەوتنێ خەوتوەو لێی بۆتە مەرگو بەخەبەر نەهاتوە، كاتێك بەخەبەر دێ، ئەوە فریشتەیەو عالەمی بەرزەخەو ...هتد، بۆیە دەفەرموێ: خوا خەبەرتان دەكاتەوە، ئەگەر خوا نەیەوێ خەبەر ببیەوە، خەبەر نابیەوە، بۆیە لە سوننەتدا هاتوە كە مسوڵمان دەخەوێ بڵێ: ﴿«باسْمِكَ اللَّهُمَّ أَحْيَا وَأَمُوتُ»﴾[(١)]، واتە: خوایە ! بە ناوی تۆوە دەژیمو دەمرم، یانی: خەویش جۆرێكە لە مردن، وە دوایی كە لە خەو هەڵدەستێ، سوننەتە بڵێ: ﴿الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَحْيَانَا بعْدَ مَا أماتَنَا وإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾[(٢)]، واتە: سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی كە زیندووی كردینەوەی دوای مردنمان، وە هەر بۆ لای ئەویش كۆدەكرێینەوە، كەواتە: بەخەبەر هاتنەوە، جۆرێكە لە زیندووبوونەوە.

ئنجا دەفەرموێ: لە ڕۆژگاردا یان لە شەوگاردا خەبەرتان دەكاتەوە ﴿لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى﴾، بۆئەوەی كاتی ناوبراو، واتە: تەمەنێك كە بۆتان دیاریكراوە، (ئەو بە دوای یەك داهاتنی شەوو ڕۆژانە) كۆتایی دێ، وە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، دوای گێڕانەوەتان بۆ لای خوایەو هەواڵتان پێدەدا بەوەی كە دەتانكرد.

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٣١٢) عَن حذيفة، و برقم: (٦٣٢٥) عن أبي ذر.
٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٣١٢) عَن حذيفة، و برقم: (٦٣٢٥) عن أبي ذر.

مەبەستی سەرەکیی لێرەدا ئەوەیە، ئەی مرۆڤەکان ! ئەو خوایەی کە دەتانژیەنێو دەتانمرێنێو دەتانخەوێنێو بەخەبەرتان دێنێو، دەزانێ چی دەکەنو، بۆ لای وی دەگەڕێنەوە، بزانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەنو چۆن چۆنی بۆ لای دەگەڕێنەوە ؟ بەندایەتیی تەنیا بۆ وی بکەنو، غەیری وی بە پەرستراوی خۆتان مەزانن.

پێمخۆشبوو لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەدا ئاماژە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا بکەم، کە پەیوەندیی پێوەی هەیە: ﴿سُئِلَ نَبِي الله، فَقِيلَ يَا رَسُولَ الله! أَيَنَامُ أَهْلُ الجنَّةِ؟ فَقَالَ رَسُول الله ﷺ: «النَّوْمُ أَخُو الـمَوْتِ وَلاَ يَمُوتُ أَهْلُ الجنَّةِ»﴾[1]، واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئایا خەڵکی بەهەشتێ دەخەون؟ فەرمووی: نووستن برای مردنە، وە خەڵکی بەهەشتیش نامرن.

<u>**مەسەلەی سێیەم**</u>: ئنجا خوا باسی سیفەتێکی دیکەی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۖ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾، واتە: خوا بالادەستو ملپێکەچکەرە، لە سەرووی بەندەکانیەوە، ئێمە لە دەرسەکانی ڕابردوودا باسی لە سەرەوە بوونی خوای پەروەردگارمان کرد، لە سەرەوەی دروستکراوەکانی بوونی خوای پەروەردگار یانی چی؟ پێشتر باسمان کردو دووبارەی ناکەینەوە ﴿ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً ﴾، وە چەند پارێزەرێکتان دەنێردرێتە سەرێ، (حَفَظَة) کۆی (حَافِظ)ە، واتە: پارێزەر، کێن ئەو پارێزەرانە؟ بەتەئکید فریشتەکانن، چی دەپارێزن؟ کردەوەکانمان دەپارێزنو تۆمار دەکەن، وەك دوایی ئایەتی دیکەش لەوبارەوە دێنین. ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا ﴾، هەتا کاتێك کە یەکێکتان مردنی بۆ

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ في "الأوسط" برقم: (٩١٩)، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٤٧٤٥)، وَالدَيْلَمِي برقم: (٦٩٠٧) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي في "السلسلة الصحيحة" برقم: (٨٧).

لاهـــاتو مردنـــی گەیشـــتە ســەر، ڕەوانــەکراوەکانی ئێمــە دەیمــرێنن، ڕووحەکــەی وەردەگرن بە تەواویی، ﴿ وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾، وە هـیچ کەمتەرخـەمییش ناکـەن، لـە کاتی خۆیـداو لە شـوێنی خۆیدا، یـانی: پـاش‌و پێش نابـێ.

لێـرەدا خـوای پـەروەردگار باسـی ئـەو پارێزەرانـە دەکـات، کـە لـە شـوێنی دیکەشـدا هـاتوە، بۆ نموونـە:

١/ لـە سـوورەتی (الإنفطـار)دا خـوای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ۝١٠ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ۝١١ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ۝١٢ ﴾، واتـــە: بێگومـــان ئێـــوە چـــەند پارێزەرێکتان بە سەرەوەن، زۆر بەڕێزن‌و نووسـەرن ! کردەوەکانتـان تۆمـار دەکـەن، چۆنیـان تۆمار دەکەن؟ بە دەنگـو وێنـە، بـە قەڵەم، بـە کۆمپیوتـەر؟ جـاران پـێش ئــەوەی تۆمارکــەر (مسـجِّلة)و ڤیـدیۆو کـۆمپیوتــەر پەیـدابن، خەڵـك وایـدەزانی تـەنیا دەبــێ بــە قەڵــەم نووســین بکــرێ، ئێســتا دەبینیــن تۆمارکــەرو ڤیـدیـۆو نووسـینی کۆمپیتـەریش هەیـە، ڕەنگـە لـە داهـاتوودا جـۆرە تۆمارکردنــی دیکـەش پەیدابن، ئێمە هەمیشـە شتەکان قیاس دەکــەینەوە سـەر عەقـڵی خۆمـان‌و شـێوەی خۆمان، ئەگەرنا خـوا ئەو وشـانە کـە بەکـاردێنــێ، چەمـك‌و واتــای زۆر فراوانیـان هــەن، بـەڵام ئێمـە هـەر ئەوەنـدەیـان لــێ حــاڵی دەبـین، مەبەسـتم ئەوەیـە هـی وا هەیــە ڕەنگــە وا تەصـــەووڕ بکـــات کــە هــەر فریشـــتەیەك بۆخــۆی قەڵـــەم‌و دەفتـەرێکــی پێیـــەو، بـۆ خـۆی وردە وردە شـتەکان دەنووســێ؟ یـان تۆمارکــەری پێیـە، کە وەختی خۆی تەسجیلیش نـەبوو، یان کامێرایەکـی پێیـەو..هتـد! بـەڵام خــوا بۆخــۆی دەزانــێ کردەوەکــان چــۆن تۆمــار دەکرێــن؟ ئەگـەر بەشـەر بتوانــێ کامێـرای ڤیدیۆیـی‌و تەسجیلی دەنگـو کۆمپیوتـەرو ئەو ئامێـرانە بۆ تۆمـارکردن دروســت بکــات، دەبــێ خـــوای باڵادەســت بــۆ ئــەو فریشــتانە چ ئـامێرێکی زۆر پێشـکەوتـووی پێـــدابن، کـە نیـازو قسـەو کردەوەکـانمـان، زۆر بـە ڕێـك‌و پێکیـی تۆمار بکــەن؟ چونکـە دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ۝١٢ ﴾، واتە: (فریشـتەکان) ئـەوەی ئێوە دەیکــەن، دەیـزانن.

٢/ هەروەها لە سووڕەتی (ق)یشدا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾﴾، واتە: بێگومان ئینسانمان دروست کردووەو دەشزانین لە نەفسی دا چی دێتو دەچێ، (چ خوتخوتەو خەیاڵێکی لە دڵ دەگەڕێ)، وە ئێمە لێی نزیکترین لە ڕەگی ملی (کە خوێن دێنێو دەبات)، لە کاتێکدا کە دوو وەرگرەکان لەلای ڕاستو چەپ دانیشتوون (دوو وەرگرەکان دوو فریشتەکانن، کە زانیارییەکان وەردەگرنو، کردەوەکان تۆمار دەکەن) لە لای ڕاستو چەپ دانیشتوون، هیچ قسەیەکی لە دەم دەرناچێ، مەگەر چاودێرێکی ئامادەی لە لایە.

جا ئایا مەرجە ئەو فریشتانە یەکیان لەسەر شانی چەپو ئەوی دیکەیان لەسەر شانی لای ڕاست دانیشتبێ؟ نەخێر مەرج نیە، بەڵکو ئەوە بۆ نزیك خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە، واتە: وەك چۆن ئەگەر تۆ دوو کەست بەسەرەوە بن، لە لات دانیشتبن، هیچ شتێکیان لێ زایە نابێ، یەکیان هی لای ڕاست دەنووسێ، یەکیان هی لای چەپ دەنووسێ، بەڵکو ئەوە بۆ نزیك خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە، ئەگەرنا مەرج نیە فریشتە لەسەر شانی تۆ بن، خوا بۆخۆی دەزانێ چۆنە؟ وە دیسان چۆنیەتی تۆمارکردنەکەش، هەر خوا خۆی دەزانێ چۆنە؟ وە ﴿رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾یش دوو فریشتەکان نین، (رقیب) واتە: چاودێر، (عتید) واتە: ئامادە، هەمیشە چاودێرو ئامادەن، ئەو ئەو دوو سیفەتە سیفەتی هەردووك فریشتەکانن.

دەربارەی ئەو دوو فریشتانەش ئەم دەقە دێنین: ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ صَاحِبَ الشِّمَالِ لَيَرفَعُ الْقَلَمَ سِتَّ سَاعَاتٍ عَنِ الْعَبْدِ الْمُسْلِمِ الْمُخْطِئِ أَوْ الْمُسِيءِ، فَإِنْ نَدِمَ وَاسْتَغْفَرَ اللهَ مِنْهَا أَلْقَاهَا، وَإِلاَّ كُتِبَتْ وَاحِدَةً»﴾[1]، واتە: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ في "الكبير": (٧٧٦٥)، وَحَسَّنَهُ الألباني في "السلسلة الصحيحة": (١٢٠٩).

فەرموویەتی: بێگومان خاوەنی لای چەپ (واتە: فریشتەی لای چەپ) تاکو شەش کاتان، قەڵەم هەڵدەگرێ لەسەر بەندەی گوناهکار یان خراپەکار، ئەگەر پەشێمان بۆوەو داوای لێخۆشبوونی کرد، ئەوە لەسەری نانووسرێ، ئەگەرنا (ئەوەی نەکرد، واتە: پەشێمان نەبۆوە) ئەوە تەنیا یەك گوناهی بۆ دەنووسرێ.

سبحان الله ! خوا ﷻ چەند بە کەرەمە لەگەڵمان ! ئنجا لێرەدا زانایان پرسیارێکیان کردوە: ئایا فریشتەکان ئەوە دیارە ئەوەی کە بە ئەندامەکانمان بیکەین، دەینووسن، بەڵام ئەدی ئەوەی بە دڵماندا دێت، ئایا فریشتەکان ئەوەش دەنووسن یان نا ؟!

زانایان ڕاجیاییان هەیە، بەڵام من پێموایە ڕاجیایی ناوێ، چونکە فەرموودە قودسییەکە زۆر ڕوونە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿قَالَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: إذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيِّئَةٍ فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا سَيِّئَةً، وإذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرًا﴾[1]، واتە: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: هەر کات بەندەی من بە دڵی داهات خراپەیەك بکات، لەسەری مەنووسن، (هەر لەبەرئەوە کە بەدڵی داهاتوە) ئنجا ئەگەر کردی، خراپەیەکی بۆ بنووسن، وە هەرکاتێك چاکەیەکی بەدڵدا هاتو ئەنجامی نەدا، چاکەیەکی بۆ بنووسن، وە ئەگەر ئەنجامیدا، دە چاکەی بۆ بنووسن.

لێرەدا مەبەست لە خراپە بەدڵ داهاتن، ئەوەیە کە ئینسان بڕیاری لەسەر نەدابێ‌و دڵی لەسەر نەچەسپاندبێ، شتێك کە هەروا بە دڵی دادێت‌و دوایی لێی پەشێمان دەبێتەوە، ئەگەر دڵی لەسەر چەسپاند، با بە کردەوەش ئەنجامی نەدا، یاخود بە قسەش دەری نەبڕێ، هەر لەسەری دەنووسرێ، چونکە دڵی خۆی لەسەر ساغ کردۆتەوە، وە لەڕاستییدا بناغەی چاکەو خراپە لە دڵدایەو، بڕیاری نێو دڵەو، هەرکەسێ کە دەیەوێ چاکەیەك بکات، پێشێ بە دڵ بڕیاری لەسەر دەدات، وە ئەگەر بیەوێ خراپەیەك بکات، پێشێ بەدڵ بڕیاری لەسەر دەدات، بەڵام خوای پەروەردگار ڕەحمەتی پێش غەزەبی کەوتوەو، بەخششی فراوانە، بۆیە کەسێك چاکەیەکی هەر بە دڵیش دابێ، خوا دەفەرموێ: چاکەی بۆ بنووسن، وە ئەگەر

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٣٠) عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ ؓ.

ئەنجامیشی دا، دە چاکەی بۆ بنووسن و، هەتا یەك بە حەوت سەدیش دەڕوات، بە پێی ئایەتی ژمارە (٢٦١)ی (البقرة).

وە خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: (فریشتەکان) دەزانن ئەوەی ئێوە دەیکەن، واتە: بە دڵ بیکەن، یان بە زمان یان بە ئەندامەکان، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾، واتە: هەتا کاتێ یەکێ لە ئێوە مەرگی گەیشتە سەر، فریشتەکانمان گیانی دەکێشن، یان ڕووحەکەی وەردەگرن، وە هیچ کەمتەرخەمیی ناکەن ( لە ئەنجامدانی ئەرکەکەیان دا).

## وەڵامی ئیشکالێکی ڕواڵەتیی

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا ئیشكالێك هەیە ـ بە ڕواڵەت ـ:

أ ) لێرەدا خوا باسی ڕەوانەکراوەکانی گیانکێشەکانی دەکات، کە چەند فریشتەیەکن (تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا ).

ب ) بەڵام لە سووڕەتی (السجدة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: بڵێ: فریشتەی مەرگ، گیانتان دەکێشێ، کە عایدی ئێوە کراوە لەوێ دەفەرموێ: فریشتەی مەرگ، گیانەکە دەیکێشێ.

ج ) وە لە سووڕەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَا ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: خوا ڕووحەکان وەردەگرێ، لە کاتی مردن داو ئەوەی نەمردبێ لە کاتی خەوتن دا.

جا ئەوانەی کە بە سەرکێڵیی تەماشای قورئان دەکەن، پێیانوایە ئەوە جۆرێکە لە ناکۆکیی (تناقض)، بەڵام نا، لەڕاستیدا مەسەلەکە بەم شێوەیە:

١/ هیچ شتێك بەبێ ئیرادەی خوای زاناو توانا نیە، بە فەرمانی خوا خەڵك دەمرن و دەژین.

٢/ وە بە مشوورخواردن و بەسەر ڕاگەیشتنی فریشتەی مەرگ (مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ) پرۆسەی گیانکێشان ئەنجام دەدرێ.

٣/ بەڵام فریشتەی مەرگ (مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ)یش بە ملیۆنان فریشتەی لەبەردەست دان، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا ﴾، ئەوە ماناکەیەتی: ڕەوانەکراوەکانمان گیانەکە دەکێشن کە (مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ) دەیاننێرێ، بە فەرمانی خوا.

ڕەنگە کەسێك بڵێ: جاری وایە هەزاران کەس بە یەکەوە دەمرن، ئەمە چۆنە؟ بۆ وێنە: ئەو ساڵەی کە دوو بۆمبای نێوەکیی (قنبلتان نوويتان) لە (هیرۆشیماو ناکازاکی) دران، یان: کیمیایی بارانی شاری هەڵەبجە، یان ئەو مەرگەساتانەی کە دێن، جاری وایە هەزاران کەس پێکەوە دەمرن، ئایا فریشتەی مەرگ (مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ)و ئەو فریشتانە چۆن فریایان دەکەون؟!

لە وەڵام دا دەڵێین: ئێستا لە ئەنجامی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیادا، ئەو شتانە زۆر لە عەقڵ نزیك کەوتوونەتەوە: کاربەدەستانی یەك وڵات دەتوانن بەیەك پلاك هەمووی بکوژێنەوە، هەمووشی پێبکرێ، لە لای خوای باڵادەست ئەمە زۆر زۆر ئاسانە، بەڵام بۆ ئێمە زەحمەتە، وە بۆ فریشتەی مەرگ (مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ) دیارە خوای باڵادەست توانایەکی زۆر زۆری پێداوە، کە فریای هەموو خەڵکە بکەوێ.

**__مەسەلەی چوارەم:__** کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴾، دوایی گێڕدرانەوە بۆ لای خوای سەرپەرشتیاری ڕاستەقینە، ئاگاداربن ! بڕیارو حوکم هەر بەدەست ئەوە، وە هەر ئەو خێراترین لێپرسەرەوەیە.

لێرەدا خوا بە چوار وەسف خۆی پێناسە کردوە:

١) ﴿ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە.

٢) ﴿ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّ ﴾، واتە: خوا سەرپەرشتیارو دۆستو نزیكو مشوورخۆریانە.

٣) ﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ ﴾، حوكمو بڕیار فەرمانڕەوایی هەر هی ئەوە.

٤) ﴿ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴾، وە خوا خێراترین حیسابکەرو خێراترین لێپرسەرەوەیە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لێیان بپرسە، (لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە بە پێی سیاقەکە دەزانین، ئەگەرنا دەگونجێ، بڵێی: لە بەشەر بپرسە، لە هەموو ئەوانەی کە قورئانیان ئاراستە دەکەی بپرسە) بڵێ: کێ دەربازتان دەکاو قوتارتان دەکا لە تاریکاییەکانی وشکانیی‌و دەریا، (تاریکاییەکان بە مانای تاریکایی ڕواڵەتیی نیە، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: (ظُلُمَات) یانی: سەختییەکان‌و بەڵاو گرفتارییەکانی کە لە وشکانیی‌و لە دەریادا تووشیان دێن) ﴿ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ ﴾، کە لێی دەپاڕێنەوە بە لالانەوەو کڕووزانەوەو بە پەنهانیی لە دڵی خۆتاندا، جاری وایە ئینسان لە دڵی خۆیدا دەپاڕێتەوە، بواری نیە دەریشیبڕێ، هێندە وەزعەکەی سەختو قورسە، ﴿ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾، دەپاڕێنەوە دەڵێن: ئەگەر لەم گرفتە کە هاتۆتە پێش، لەو قەیران‌و ناڕەحەتییە خوا دەربازمان بکات، ئەوە بەتەئکید سوێند دەخۆین، کە ئێمە لە سوپاسگوزاران

دەبین (بۆ خوا)، ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴾، بڵێ: خوا لەو بەڵایە کە بۆی لە خوا دەپاڕێنەوە، دەربازتان دەکات، وە لە هەر خەمو بەڵاو گرفتێکی دیکەش دەربازتان دەکات، کەچی دوای ئەوەش ئێوە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن.

ئەمە لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، کە خوا بە دەم هاواری کافرانیشەوە دێ، ئێمەی مسوڵمان زۆرجار لە ئەنجامی دەمارگیرییمان بۆ ئیسلام، پێمانوایە خوا بەس خوای ئێمەیە، تەنیا مشوور لە ئێمەی مسوڵمان دەخواتو بەس پاڕانەوەی ئێمە وەردەگرێ، لە کاتی تەنگانەو سەختییەکانی ژیانی دنیادا !! بەڵام وانیەو ئەمەش چەند بەڵگەیەك لەوبارەوە :

١/ لە سوورەتی (الفاتحة)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ﴾، واتە: ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، وە لە زۆر ئایەتی قورئان دا دەردەکەوێ، کە خوای بە بەزەیی و دادگەر دوعای کافرانیش قبووڵ دەکات، ئەگەر لێیان بقەومێ و لێی بپاڕێنەوە، خوا ئەوانیش دەرباز دەکات، ئەوەتا لێرەدا لەگەڵ کافرانیەتی، کە دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴾، مانای وایە دوعایەکەیان قبووڵ دەکات، لەگەڵ ئەوەش دا کە شەریکیش بۆ خوا دادەنێن، کەچی خوا هەر بە نەفامیی ئەوان ناکات، چونکە بەندەی خۆیینی و دروستکراوی خۆیینی، خواش لە دنیادا ڕەحمەتەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، وەك لە ئایەتی (١٥٦)ی (الأعراف)دا هاتوە.

جا لێمان تێکنەچێ: لە دنیادا ڕەحمەتی خوا کافرو مسوڵمان دەگرێتەوەو لوتفو کەرەمو بەخششی خواو نازو نیعمەتەکانی خوا، لە دنیادا بۆ هەمووانن.

٢/ لە سوورەتی (النمل)یشدا دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٦٢ ﴾، واتە: یان ئایا کێیە کە وەڵامی بابای ناچار دەداتەوە،

(مُضْطَر) کەسێکە دەستی لە هەموو پچکان بڕابیو هیچ ئومێدی نەمابێ، کاتێك کە لە خوا دەپاڕێتەوە، خراپەی لێ لادەدات، وە دەشتانکا بە جێنشین لە زەوی، واتە: دەتانهێڵێتەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوی دیکە هەن؟ کەم وایە بیربکەنەوە، ئەگەرنا نەدەبوو غەیری خواتان پەرستبایە، چونکە هەر ئەو لە فریاتان دێ.

٣/ وە لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٥٦)دا خوا دەفەرموێ: ، ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ وە بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ( بەڵام لە دنیادا)، خوا ناوی لە باران ناوە ڕەحمەت : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِۦ ۝٥٧ ﴾، واتە: خوا بایەکان دەنێرێ، وەك موژدە لە پێش ڕەحمەتەکەیەوە (واتە: باران)، وەك هەر جارێك باران ببارێ، لە پێش دا با هەڵدەکاتو هەورەکان کە دێن زەخت لە بایەکە دەکەن، هەوا دێ، خوای بەخشەر دەفەرموێ: ئەو هەوایە، ئەو بایە کە دێ، موژدەیە، موژدەی باران، کە هەوری باراناوی بەڕێوەن، ئنجا بارانەکە بۆ کێیە؟ بۆ هەموو کەسە، وە ئەو نیعمەتانەی کە لە دنیادا هەن، خوای بە بەزەیی بۆ هەموو کەسی ڕەخساندوون، بۆ کافرو بۆ مسوڵمان، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ۝١٥٦ ﴾ الأعراف، بەڵام لە قیامەت دا ڕەحمەتی خوا چی لێدێ؟ ﴿ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ۝١٥٦ ﴾ الأعراف، بەڵام لەمەودوا {واتە: لە قیامەت}، تایبەتی دەکەم بەوانەوە کە پارێز دەکەن، وە ئیمانیان بە ئایەتەکانی خوا هەیەو، زەکات دەدەن.

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ﴾،

پێشتر باسمان کرد: لەم سوورەتەدا چل‌و دوو جار، خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ، بڵێ، هەمووشی دەربارەی سیفەتەکانی خواو، بەزۆرییش دەربارەی خوا بە یەکگرتن (توحید)و یەکتایی خوایە، لێرەش دەفەرموێ: بڵێ: خوا بە توانایە کە سزاتان بۆ بنێرێ، لە سەرووتانەوە، یان لەژێر پێتانەوە، (لە سەرێ بۆتان ببارێ، یان لەژێر پێتاندا دەرقوڵێ)، ﴿أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ﴾، یاخود بتانکاتە چەند دەستەو تاقمێك‌و پێكتان وەربكات، واتە: ئازاری هەندێکتان بە هەندێکتان بچێژێ، واتە: هەندێکتان بەسەر هەندێکتان دا زاڵ بکات.

## ترساندنی خوا بۆ کافرەکان بە سێ جۆرە سزایان :

لێرەدا خوای زاناو توانا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کە ئەو موشریك‌و بێ بڕوایانە بترسێنێ، بە سێ شتان :

١ - بە سزاو ئازارێك کە لە سەروویانەوە دەبارێ.

٢ - بە ئازارو سزایەك کە لەژێر پێیانەوە دێ.

٣ - بە سزاو ئازارێك کە لەنێو خۆیاندا دەبێ.

جا توێژەرەوانی پێشێ ڕەحمەتی خوایان لێبێ گوتوویانە: (الرَّجْمُ بالحِجَارَةِ وَالطُّوْفَان وَالصيحَةَ وَالرّيح؛ كَمَا فَعَل بعَادٍ وَثَمُودٍ وَقَوْمِ شُعَيب وَقَوْمِ لُوطٍ وَقَوْمِ نُوحٍ) بریتیە لە بەردباران کردن، تۆفان‌و لافاوو چریکەو با، وەك خوا بە گەلانی: عادو سەموودو گەلی شوعەیب‌و گەلی لووط‌و گەلی نووحی کرد، بەڵام ئێستا دیارە بە قەسف‌و ساروخ‌و ڕووکێت‌و بۆمبای تەیارەو تۆپ‌و مەدفەع‌و...هتد، ﴿مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ﴾، گوتوویانە: بەرۆچوونی دنیاو بە بوومەلەرزە، بەڵام ئێستا لوغم‌و چەندان شتی دیکەش پەیدا بوون، ﴿أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ﴾، یانی پێکتان وەربکاو تێکەڵتان بکات.

ئنجا لەو بارەوە ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ خَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ عَنْ أَبِيهِ وَكَانَ قَدْ شَهِدَ بَدْراً مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ رَاقَبَ رَسُولَ اللهِ ﷺ اللَّيْلَةَ كُلَّهَا، حَتَّى كَانَ مَعَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ صَلاتِهِ جَاءَهُ خَبَّابٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، لَقَدْ صَلَّيْتَ اللَّيْلَةَ صَلاةً، مَا رَأَيْتُكَ صَلَّيْتَ نَحْوَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَجَلْ، إِنَّهَا صَلاةُ رَغَبٍ وَرَهَبٍ! سَأَلْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فِيهَا ثَلاثَ خِصَالٍ فَأَعْطَانِي اثْنَتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً: سَأَلْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ: أَنْ لا يُهْلِكَنَا بِمَا أَهْلَكَ بِهِ الأُمَمَ قَبْلَنَا، فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ أَنْ لا يُظْهِرَ عَلَيْنَا عَدُوّاً مِنْ غَيْرِنَا، فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُ رَبِّي أَنْ لا يَلْبِسَنَا شِيَعاً، فَمَنَعَنِيهَا﴾[1]، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی خەبابی كوڕی ئەڕەت لە بابی دەگێڕێتەوە، كە یەكێك بووە لەوانەی لە جەنگی بەدردا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووە، دەڵێ: شەوێك چاودێریی پێغەمبەری ﷺ كرد، هەتا بەرەبەیان، كاتێك سەلامی نوێژی بەیانی دایەوە، (دیارە دوای تەسبیحاتو زیكرو ئەوانە) خەبباب چوو بۆ لایو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دایكو بابم بەقوربانت بن، ( مەرج نیە ئەو كاتە دایكو بابی مابن، بەڵام عەرەب ئەو تەعبیرەیان بەكارهێناوە بۆ زیادە خۆشەویستیی، واتە: ئینسان دەبێ دایكو بابی لە خۆی خۆشتر بوێن، ئنجا كە دایكو بابی بە قوربان بكات، مانای وایە لە خۆی لە پێشترە) ئەم شەو نوێژێكت كرد، هەرگیز نەمبینیوە نوێژی وات كردبێ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەمە نوێژێك بوو هەم ئارەزووی لە خوا نزیكبوونەوە بوو، هەم لێترسانیش (واتە: نوێژێك بوو دوو پاڵنەری هەبوون، هەم خۆشەویستیی خوای پەروەردگارو هەم لێترسانی) لە خوای زاڵی پایە بەرز سێ شتم داواكردن: دووانی پێدام یەكێكیانی پێنەدام: لە پەروەردگاری زاڵو پایە بەرزم داوا كرد كە نەمانفەوتێنێ بەوەی كۆمەڵگاكانی پێشێی پێ فەوتاندوون، (بەلایەكی گشتی بنێرێ وەك: گەلی عادو گەلی ثەموودو گەلی نووحو گەلی لووط) ئەوەی پێدام، وە داوام لە پەروەردگاری زاڵو پایە بەرزم كرد كە دوژمنێكمان لە غەیری خۆمان بەسەردا زاڵ

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٠٩١) تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسنَادُهُ صَحِيح، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٧٥)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٦٣٨)، قال الشيخ الألباني: صحيح.

نەکات کە نەماهێڵێ (واتە: هیچمان نەهێڵێ، نەك لە شوێنێك لە شوێنەکان، مسوڵمانان لە ئەندەلووس دوای ئەوەی هەشت سەدە لەوێ بوون، لە بەینیان بردن، ڕاستە لەوێ لەبەین چوون، بەڵام مسوڵمانی دیکە لە شوێنی دیکە مابوون و ماون، هۆلاکۆو جەنگیزخان و مەغۆل کاتی خۆی هاتوون، وەك لافاوێك بە عالەمی ئیسلامیی دا مسوڵمانانیان زۆر قەلاچۆ کردوە، بەڵام بنبڕ نەبوون، بۆئەوەی لێتان تێکنەچێ، مسوڵمانانی شوێنێك لەبەین دەچن، بەڵام لە شوێنی دیکە دەمێنن)، ئەوەشی پێدام، وە داوام لە پەروەردگاری زاڵ و پایە بەرزم کرد، کە لەنێو خۆماندا نەمانکاتە دەستە دەستەو پێکمان وەرنەکات، بەڵام ئەوەی پێنەدام.

یانی چی؟ یانی: ئەگەر لە ڕاستە شەقامی خوا بترازێن، وەك ئێستا دەیبینی: مسوڵمانان چۆن بوونەتە تاقم تاقم و بە دوای ڕێچکە شەیتانییەکان و بە دوای بیردۆزە ئینسانییەکان کەوتوون، یەك ڕووی لە ڕۆژهەڵاتە، یەك ڕووی لە ڕۆژئاوایە، یەك ڕووی لەولایەو یەك ڕووی لەملایە، کەس بە ڕبەی کەس ناپێوێ و، کەس لە مەڕی کەس ناخێوێ.

ئنجا ئەمە لە ئەنجامی ئەوە دایە، کە لە ڕاستە شەقامی خوا لایانداوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ... ﴿١٥٣﴾ ﴾ الأنعام، ئەمە ڕاستە شەقامی منە، شوێنی بکەون و لامەدەن، بەدوای ڕێچکەکان مەکەون، ئەگەرنا دەترازێن (ئاواتان لێدێ و بەو دەردە دەچن کە پێی چوون)، دیارە لێرەدا خوا هەڕەشە دەکات لە کافرەکان و لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە ئەگەر بێت و بەندەی خوا نەبن، ئەگەر بێت و یەکتاپەرست نەبن، ئەگەر بێت و ملکەچی شەریعەتی خوا نەبن، ئەو بەڵایانە، نزیکە بەسەرتان بێن، ئەمە جیایە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا بەڵێنی پێنەداوم کە دەستە دەستە نەبین.

ئنجا بەپێی ئەم فەرموودەیەش دیارە کە ئۆممەت جاری وایە دوژمنان زەفەری پێدەبەن و بەسەریدا زاڵ دەبن، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئۆممەت هەمووی لەبەین ناچێ، ئەگەرنا ئۆممەتیش مافی (ڤیتۆ)ی نیە، وەك میللەتانی پێشێ غەڵەت و پەڵەتانیش بکات، بەڵام وەك وان سزا نەدرێ ! وەك وان سزا دەدرێن،

بەڵام بەگشتی ئۆممەت لەبەین ناچێ، لەبەرئەوە کە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دوا ئۆممەتە، ئۆممەتەکانی پێشێ، ئەگەر لەبەینیش چوون، ئۆممەتی دیکە هاتوونە شوێنیان، وە پاشان ئەوان ئۆممەتی گچکە گچکە بوون، کۆمەڵی گچکە بوون لە شوێنێکی جوگرافیی‌و دیارییکراوو کاتێکی دیارییکراوو قۆناغێکی دیارییکراودا، بەڵام ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ لە دوا قۆناغی ژیانی بەشەر دایەو، لە هەموو سەر زەوییە، وە ئەگەر لەبەین بچێ، ئۆممەتێکی دیکەی نایەتە جێی‌و قیامەت دادێ، وەك لەو فەرموودە هاتوە: ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ: اللهُ اللهُ﴾[1]، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قیامەت نایەت، هەتا ئەو کاتەی لەسەر زەوی ناگوترێ: خوا، خوا (اللهُ اللهُ)، کەواتە: دنیا بەسەر خراپترین دروستکراوانی خوادا کاول دەبێ، کە کەسیان تێدا نامێنێ بڵێ: خوا (الله)، یانی: کەس خوای لەبیر نامێنێ، ئنجا ئەو کاتە دنیا بە کەڵکی ئەوە نامێنێ، کە ئۆممەتی دیکە بێن، مسوڵمانان نامێنن، بەشەر هەمووی بەسەر خراپە دەگەڕێ‌و، خوای کاربەجێ‌و دادگەریش ژیانی دنیا کۆتایی پێ دێنێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ﴾ سەرنج بدە ! چۆن ئایەتەکانی خۆمانیان بۆ جۆراو جۆر دەکەین، واتە: ڕستەکانی قورئان، جارێك دەڵێین: سەرنجی مێژوو بدەن، جارێك دەڵێین: سەرنجی دیاردەو دیمەنە سروشتیەکان بدەن، جارێك دەڵێین: سەرنجی فیطرەت‌و سروشتی خۆتان بدەن، جارێك دەیانبەین بۆ قیامەت، جارێك باسی بەهەشتە، جارێك باسی دۆزەخە، ئایەتەکانیان بۆ جۆراو جۆر دەکەین، بۆچی؟ ﴿لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ﴾ بەڵکو تێبگەن، دیارە وشەی (الفِقْه) دەڵێ: (العِلْم الدَّقِيق) بریتیە لە تێگەیشتنێکی ورد، وە هەندێك گوتوویانە: (فقه) بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە شتێك بەهۆی شتێکی دیکەوە، هەندێکیش گوتوویانە: (الفقه: هو فهم مراد

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٠٦٢)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٢٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٠٧)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٨٤٩)، وَالبَزَّار برقم: (٦٩٨٠) وَالبَيْهَقِيُّ في "الشعب الإيمان" برقم: (٥٢٤).

المتكلّم) (فقه) تێگەیشتنی مەبەستی قسەبێژە، بەڵام (علم) ئەوەیە کە تۆ ئەو شتە وەك خۆی بزانی، بۆیە وشەی (فقه) بۆ خوا بەکارنایەت، بەڵام وشەی (علم) بۆ خوا بەکاردێ، چونکە خوا ڕاست شتەکە دەزانێ، بەڵام ئێمە شتێك دەزانینو بەهۆی ئەو شتەوە، شتێکی دیکە دەزانین، زانیاریی ئێمە (تكاملي)یە وردە وردە دەبێ، بەڵام زانیاریی خوای پەروەردگار بێسنوورەو تێرو تەواوە (کامل)ە، لە یەکەم قۆناغەوە تەواو (کامل)ە، هی ئێمە وردە وردەیە، ئەمڕۆ شتێك دەزانی، سبەی شتێکی دیکە دەزانی.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ وَهُوَ ٱلۡحَقُّۚ قُل لَّسۡتُ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ﴾، وە گەلەکەت بە درۆیان دانا، واتە: ئەم قورئانو ئەم وەحییە بە درۆ دادەنێن، لە حاڵێکدا کە ڕاستیشە، بڵێ: من وەکیل نیم بەسەرتانەوە، وشەی (حَق) بە شتێکی چەسپاو دەگوترێ، یان بە شتێك کە پێکەڵپێك (مُطَابق)ی واقیع بێ، جاری واش هەیە بە مانای دادگەریی دێ، بەڵام زیاتر بە مانای شتی چەسپاو دێ، جا (سید قطب) ڕەحمەتی خوای لێبێ تێبینییەکی جوانی هەیە دەڵێ: جەرەسی وشەی حەق لەگەڵ جەرەسو ئاوازی وشەی (باطل)دا، ئەگەر سەرنجیان بدەی، هەر نەغمەو دەنگەکانیان، دەلالەت لەسەر ماناکەیان دەکەن، وشەی (حق) دوو پیتە، هەردووکیان پیتی گەروون، پیتی: (ح) و (ق)، (حق) جەرەسی لەفزەکە دەلالەت لەسەر شتێکی چەسپاو دەکات، (حق)، بەڵام (باطل) سێ پیتە: (ب، ط، ل)، (باطل) وەك (طبل)ە، دەنگی هەیە بەڵام بۆشەو شتێکی پووچو بۆشو بێ نێوەڕۆکە، (حق) شتێکی چەسپاو پڕو نەگۆڕە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ﴾، گەلەکەی تۆ (کە دیارە قورەیشن خەڵکی مەککەن) بەدرۆیان دانا ﴿وَهُوَ ٱلۡحَقُّ﴾، لە حاڵێکدا کە حەقە، واتە: بۆیە بە درۆی دانانێن، کە درۆبێ، نەخێر حەقە، بەڵام ئەوان بە درۆی دادەنێن، وەك کەسێك کە گرانەتا دەگرێ، مەلاریا دەگرێ، ئاوی شیرینو زوڵاڵی بدرێتێ، کە دەیخواتەوە دەڵێ: وەك ژەقنەبوتە، چونکە میزاجی تێکچووە ! کەواتە: ئەمە

ئاوڕدانەوەیەکە بە لای ئەوەدا کە ئەوەی ئەوان بە درۆی دەزانن، وەنەبێ ناڕاستو درۆبێ، حەقە، بەڵام ئەوان میزاجیان تێکچووە.

ئنجا ئەگەر تەماشایان بکەین: ئێستاشی لەگەڵ دابێ، بە درۆ دانانی خەڵکی مەککە بۆ ئیسلام: ﴿ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ ﴾، کە دیارە گەلی پێغەمبەر ﷺ هۆزی قورەیش بوون، وا هەست دەکەم ئێستاش شوێنەواری ئەوەیان پێوە دیارە، وە دوعای پێغەمبەر ﷺ کە بۆ خەڵکی مەدینەی کردوە، ئێستاش بە خەڵکی مەدینەوە دیارە، خەڵکی مەدینە خۆش مامەڵەترو نەرمو نیانترن، لە خەڵکی مەککە، بەڵێ بە درۆدانانی پێغەمبەر ﷺو ئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ ئێستاش کەمو زۆر هەست دەکەی شوێنەواری، بە خەڵکی مەککەوە، دیارە، وەك چۆن پشتیوانیکردنی مەدینەییەکان لە پێغەمبەر ﷺ کە دەرگای ماڵو دڵی خۆیان بۆ خستە سەر پشت، شوێنەواری ئەو چاکەیەو دووعایەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ وان، پێیانەوە دیارە.

وە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّسۡتُ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ﴾، بڵێ: من بەسەر ئێوەوە وەکیل نیم، پارێزەری ئێوە نیم، واتە: ئێوە عایدی من نەکراون، تاکو من نەهێڵم کافر بنو، نەهێڵم تووشی دۆزەخو تووشی ناڕەحەتیی بن، ئەوە دەکەوێتە سەر خۆتان.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لِّكُلِّ نَبَإٖ مُّسۡتَقَرّٞۚ وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾، هەموو هەواڵێك سەقامگیرییەکی هەیە، (مستقر) بە مانای چەسپان (إستقرار)ە، یان کاتی چەسپان، یان شوێنی چەسپان، یانی: هەموو هەواڵێك سەرەنجام دەچەسپێ، یان شوێنێك دێ، لێی بچەسپێ، یان کاتێك دێ، تێیدا بچەسپێ، ﴿ وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾، وە لەمەودوا دەزانن.

جا تەماشا بکەن ! ئەوە ئیعجازێکی مێژوویییە (لِكُل نَبَأ مستقر) واتە: ئەم قورئانەو ئەم وەحییە کە بۆ پێغەمبەری خاتەم دێ، کاتێك دێ سەقامگیرببێو بچەسپێ. وشەی (نبأ) واتە: (الخَبَرُ المُهِم) هەواڵێکی گرنگ، ئەم هەواڵە گرنگە

کە لە خواوە هاتووە پێغەمبەر ﷺ بۆچی پێی دەگوترێ (نبِيّ)؟ چونکە هەواڵ دێنێ لە خواوە (نبي) (فعيل)ە، بە مانای (فاعل)، واتە: (مُنْبِيء) هەواڵدەر، یاخود (فعيل)ە بە مانای (مفعول)، واتە: (مُنَبَّأ) هەواڵپێدراو لە خواوە، گرنگ ئەوەیە ئەو پێغەمبەرە ﷺ کە ئەو هەواڵە گەورەیەو، ئەو وەحیو قورئانەی هێناوە، کاتێك دێ ئەو قورئانە بچەسپێ، ئەو هەواڵە کاتێك دێ، دەچەسپێو سەقامگیر دەبێ، یان لە شوێنێك لە شوێنەکاندا، یان لە کاتێك لە کاتەکاندا، ئنجا ئێمە دەزانین ئەو کاتە کە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ، مسوڵمانان چەوساوەو، پێغەمبەر ﷺ بێ دەرتان بوونو، ئەو کافرە کەللەڕەقانە گاڵتەیان پێکردوەو گوتوویانە: شێتەو جادووگەرەو...هتد، بەڵام خوا ئەو کاتە فەرموویەتی: ﴿ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، لەمەودوا بۆتان دەردەکەوێ، دەزانن داخۆ چۆن ئەو قورئانە دەچەسپێ !

ئەمە وەك ئایەتەکەی کۆتایی سووڕەتی (ص)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: ئەم قورئانە یادخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، وە لە دوای ماوەیەکی دیکە هەواڵەکەی دەزانن، کە ئەم قورئانە چییە؟ بەرنامەو ڕێماییە بۆ هەموو بەشەر هاتوە، تاکو ژیانی بەشەر بگۆڕێو، وای لێبکات جێی ڕەزامەندی خوا بێ.

بەڵێ، ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە چی لێدێ؟ سەرەنجامی چۆن دەبێ؟ بەڵام خوای پەروەردگار کە خاوەنی ئەو دینەیەو، خاوەنی پێغەمبەر ﷺو دنیاو دوارۆژە، دیارە هەمووی لێ عەیانو ڕوون بووە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەمان ئایەتەكانی (٦٨ تا ٧٣)، واتە: شەش ئایەت تەفسیر دەكەین، تەوەری سەرەكیی ئەم شەش ئایەتە موبارەكە، بریتیە لە چەند ڕێنماییەكی خوای كاربەجێ بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، هەروەها هەر كەسێكی دیكە كە شوێنی وی دەكەوێ لەو بوارەدا، لە بواری چۆنیەتی هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ بێبڕوایان و نەیاراندا، كە بەشداریی كۆڕو مەجلیسێكیان نەكات، كە كوفری تێدا دەكەن، بە ئایەتەكانی خوا.

پاشان فەرمانی پێدەكات كە ئەو بێبڕوایانەی ئایینەكەیانیان بە یاریی‌و گەمە گرتوە، وێڵ بكات، بەڵام لەسەر وریاكردنەوەی خەڵكەكە بەگشتی بەردەوام بێ، دوایی پێی دەفەرموێ: كە بە نكووڵیی لێكردنەوە لە كافرو موشریكەكان بپرسێ: ئایا لە جیاتی خوا لە شتانێك بپاڕێینەوە كە نە سوودمان پێدەگەیەنن، نە زیان، وە پاش‌و پاش بەرەودوا بگەڕێینەوە، وەك چۆن كەسێك شەیتانەكان لە زەویدا گومڕای دەكەن‌و سەراسیمەو سەرگەردانی دەكەن؟

پاشان پێی دەفەرموێ: كە پێیان بڵێ: (بە خەڵكەكە بەگشتی یان بە كافرەكان) كە نوێژ بەرپا بكەن‌و، پارێز لەو بكەن‌و، هەر بۆ لای ویش دەگەڕێنەوە، وە لە كۆتایی دا بە چەند وەسفێكی گەورە خوای بەرزو مەزن خۆی دەناسێنێ:

١/ دروستكردنی ئاسمانەكان‌و زەوی بە هەق.

٢/ ئەو ڕۆژەی كە دەفەرموێ: ببە ! ، هەرچی بیەوێ دەبێ، قسەكەی هەقە.

٣/ لە ڕۆژی فووكردن بە كەڕەنادا، موڵك هەر هی ئەوە، دیارە پێش ئەو ڕۆژەو دوای ئەو ڕۆژەش موڵك هەر هی ئەوە، بەڵام لەو ڕۆژەدا خاوەنداریێتیی‌و

دەستەڵاتدارێتیی خوا، زیاتر بەرجەستە دەبێ، بۆ هەموو کەسو کافرو مسوڵمان دەیبینن.

٤/ خوا ﷻ زانای پەنهانو ئاشکرایە.

٥) خوا ﷻ کاربەجێی شارەزایە.

﴿ وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦۚ
وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَى
ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَلَٰكِن ذِكۡرَىٰ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾
وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَعِبٗا وَلَهۡوٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ وَذَكِّرۡ بِهِۦٓ أَن
تُبۡسَلَ نَفۡسُۢ بِمَا كَسَبَتۡ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ وَإِن تَعۡدِلۡ كُلَّ
عَدۡلٖ لَّا يُؤۡخَذۡ مِنۡهَآۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبۡسِلُواْ بِمَا كَسَبُواْۖ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ
أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٠﴾ قُلۡ أَنَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا
وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِي ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِي ٱلۡأَرۡضِ حَيۡرَانَ
لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٞ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَاۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۖ وَأُمِرۡنَا
لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُۚ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ
تُحۡشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ وَيَوۡمَ يَقُولُ
كُن فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ
وَٱلشَّهَٰدَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٧٣﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

((وە هـەر کـات ئەوانـەت دی کـە ناهەقییـان بەرانبـەر بـە ئایەتـەکانی خـوا دەکـرد، ئـەوە یەکسـەر بەجێیـان بهێڵـە، هـەتا دەچـنە نێـو قسـەو باسـێکی دیکـەوە، وە ئەگـەر شـەیتانیش لـە بیـری بردیـەوە، ئـەوە پـاش وەبیـرهاتنـەوە، لەگـەڵ کۆمـەڵی ستەمکاران دامەنیشـــە (٦٨) وە ئەوانـــەی پـارێز (لـــە خـــوا) دەکـــەن، هـــیچ شـــتێك لـــە گونـــاهو بەرپرسیارێتی وانیـان ناکەوێتـە سەر، بـەڵام ئـەوە هـەر بیـرخسـتنەوەیە، بەڵـکو پارێـز بکـەن (٦٩) وە واز لەوانـە بێنـە کـە ئایینـەکەیانیـان کردۆتـە مایـەی یـاریی‌و کـات پـێ بەسـەربردن، وە ژیـانی دنیـا فریـوی داون، وە (بـەم قورئانـە خەڵـکی) وریـا بکـەوەو بتـرسـێنە، نـەوەك کەسـێك بەهـۆی ئـەو (کوفـرو خـراپ)ەوە کـە وەدەسـتی هێنـاوە بفەوتـێ (لـە حاڵێـکـدا) کە جگـە لـە خـوا هـیچ سـەرپەرشـتیارو تکاکـارێکی نیـــە، وە ئەگـەر هەرچی قـەرەبوو (فیدیـە)یە بیـدات لێـی وەرناگیـرێ، ئەوانـە بەهـۆی ئـەوەوە کـە وەدەسـتیان هێنـاوە، فەوتـاون، خـواردنەوەیەکیـان لـە ئـاوی داغ هەیـە، وێـڕای سزایەکی بەئێـش، بەهـۆی ئـەوەوە کـە بێبـڕوا بـوون (٧٠) بڵـێ: ئایا جگـە لـە خـوا لـە شـتێك بپـارێینـەوە، کـە نـە سـوودمان پێـدەگەیەنـێ‌و نـە زیانمـان لێـدەدات! وە دوای ئەوەی خـوا ڕێڕوونیی کردووین، لەسـەر پـاژنە پێیـەکانمان بـەرەودوا بگەڕێینـەوە، وەك کەسـێك کـە شـەیتانەکان لـە (چـۆڵایـی) زەویـدا وێڵـی دەکـەن‌و فریـوی دەدەن‌و سـەرگەردان دەبـێ، (لـە حاڵـێکدا) کە چەند هاوەڵـێکی هەن بـەرەو ڕێـی ڕاست بـانگی دەکـەن: وەرە بۆ لامـان؟ بڵـێ: بێگومان تەنیـا ڕێـی خـوا ڕێیـە، وە فەرمانمـان پێکـراوە، کە بۆ پەروەردگاری جیهانـەکان ملکەچ بکەین (٧١) وە (فـەرمانمان پێکـراوە) کـە: نوێـژ بەرپـا بکـەین‌و پارێـزی لێبکـەن، وە هـەر ئـەو (خـوا) ئـەو کەسـەیە کـە بـۆ لای کۆدەکـرێنـەوە (٧٢) وە ئـەو کەسـێکە ئاسـمانەکان‌و زەوی بـە هـەق هێنـاونە دی، وە ڕۆژێـك کە (بە هـەر شـتێك) دەفەرموێ: ببـە، یەکسـەریش دەبـێ، قسـەکەی هـەقە، وە ئـەو ڕۆژەی کـە فـوو بـە کـەڕەنادا دەکـرێ، موڵـك هـەر هـی ویـە، زانـای پەنهـان‌و ئاشکرایەو، هەر ئەوە کاربەجێی شـارەزا (٧٣)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(يَخُوضُونَ ): واتە: قسەی خراپ دەکەن، لە زمانی عەرەبیی دا (خَاضَ) بۆ بەنێوکەوتنی شتێکی شل بەکاردەهێنرێ، دەگوترێ: (خَاضَ الـمَاءُ) واتە: چووە نێو ئاوەکە، (الخَوْضُ: هُوَ الشُّرُوعُ فِي الـمَاءِ وَالـمرُورُ فِيهِ، وَيُسْتَعَارُ فِي الأمُورِ وَأَكْثَرُ مَا وَرَدَ فِي القُرْآنِ وَرَدَ فِيمَا يَذم الشُّرُوعِ فِيهِ)، (خَوْض) بریتیە لە چوونە نێو ئاوو بەنێودا ڕۆیشتنی، وە خوازراوەتەوە، بۆ چوونە نێو کاروباریشەوە، وە لە قورئاندا بە زۆریی بۆ ئەو شتانە بەکارهاتوە، کە خراپە بچیە نێویان، وەك قسەو هەڵوێستی خراپ.

(ٱلذِّكْرَىٰ ): (الذِّكْرَى: كَثْرَةُ الذِّكْرِ وَهُوَ أَبْلَغُ مِنَ الذِّكْرِ، وَالذِّكْرُ استِحْضَارُ المَعْرِفَةِ فِي الذِّهْنِ)، (ذِكْرَى) لەگەڵ (ذِكْر) وەك یەکن، هەڵبەتە (ذِكْر) بەپێی سیاق دەگۆڕێ، جاری وایە بە مانای بیرخستنەوە دێ، جاری وایە بە مانای ناوبانگ دێ، بەڵام (ذِكْرَى) بریتیە لەوەی زۆر شت بیر خەڵك بخەیەوە، بۆیە دەڵێ: (وَهُوَ أَبْلَغُ مِنَ الذِّكْرِ) واتە: زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە، وە هەروەها (ذِكْرَى) بریتیە لە ئامادەکرنی زانیارییەك لە مێشکی خۆتداو، پاراستنی ئەو زانیارییە.

(تُبْسَلَ ): (البَسْلُ: ضَمُّ الشيءِ وَمَنْعُهُ، وَمِنْهُ قِيلَ لِلْمُحَرَّمِ والمُرْتَهَنِ: بَسْلٌ وَهُوَ مَمْنُوعٌ بالقَهْرِ)، وشەی (بَسْل) بریتیە لە بەیەکەوە نووساندنی شتێكو ڕێگا لێگرتنی، بۆیە بە شتی قەدەغەکراوو ڕەهن کراو (کەسێك کە بەند کرابێ) دەگوترێ: (بَسل) بریتیە لە شتێك نەهێڵی، بەلام بەزۆر نەیهێڵی، (أَنْ تُبْسَلَ: أن تُحْرَم) نەفسێك کە بێبەش بکرێ، یاخود مەنع بکرێ، یاخود سجن بکرێ، یاخود نائومێد بکرێ، هەموو ئەو مانایانەی هەن.

(عَدۡلٍ ): (العَدَالَـةُ وَالـمُعَادَلَةُ: لَفْظ يَقْتَضِي مَعْنَى الـمُسَاوَاةِ، وَالعَـدْلُ وَالعِـدْلُ مُتَقَارِبَانِ)، هەردوو وشەی (العَدَالَةُ) و (الـمُعَادَلَةُ) یەك مانا دەگەیەنن واتە: یەكسان، دەگوترێ: (هَذَا عَدْل هَذَا) واتە: ئەو شتە یەكسانە لەگەڵ ئەوە، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی كەسێك كە لە ئیحراما دایەو نێچیرێك ڕاو دەكات، دەبێ قەرەبووەكەی بدات، كە ئاژەڵێكی وەك ئەوە فەرموویەتی: ﴿... أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا ...﴿٩٥﴾﴾ المائدة، واتە: یاخود بەرانبەر ئەوە بەڕۆژوو بێ، وە هەردوو وشەی (عَدْل) و (عِدْل) مانایان لێك نزیكە، (عِدْل) لا بارێكە دەیخەیە سەر پشتی ولاخێك، كە دوو لای هەن، (عِدْلان) دوو لای بارێك كە وەك یەكن، ( ـدْل) زیاتر بۆ شتی بەرهەست بەكاردێ، (عَدْل)یش گوتمان، واتە: ئەم شتە وەك ئەو شتەیە، كە زیاتر بۆ شتی مەعنەویی بەكاردێ.

(حَمِيمٖ ): (الـمَاءُ الحَار)، واتە: ئاوی كوڵاو، یان ئاوی زۆر گەرم.

(عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا ): (العَقْبْ، العَقِب، العَقْب، مُؤَخَّرُ الرِّجْلِ، وَجَمْعُهُ أَعْقَاب، وَرُوِي: وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ)، (عَقَبْ، عَقِب، عَقْب) واتە: پاژنە پێ، كۆیەكەی (أَعْقَاب)ە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ﴾[1]، واتە: سزای سەخت لە ئاگر، بۆ ئەوانەی پاژنە پێیان ناشۆن (لە كاتی دەستنوێژ گرتندا).

(ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ): (أَي: حَمَلَتْهُ عَلَى اتِّبَاعِ الهَوَى، وَالهَوَى: مَيْلُ النَّفْسِ إِلَى الشَّهْوَةِ)، (استَهوَتهُ) واتە: وای لێكردوە بەدوای ئارەزوو بكەوێ، (هَوَى) بریتیە لەوەی ئارەزووی ئینسان بەلایدا بچێ، یان ڕوو لە ئارەزوو بكات، هەڵبەتە مەبەست پێی ئارەزووی ناشەرعییە.

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٦٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٧٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٩٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١١١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٥٥)

(حَيۡرَانَ ): (حَارَ يَحَارُ حَيْرَةً فَهُوَ حَائِرٌ وَحَيْرَان وَتَحَيَّر واسْتَحَار: إِذَا تَبَلَّد فِي الأَمْر وَتَرَدَّد فِيهِ)، (حَيْرَان) واتە: سەرگەردان، سەراسیمە، نەزانێ چی بکاتو ڕوو لە کوێ بکات؟ دەگوترێ: (حَارَ يَحَارُ حَيْرَةً فَهُوَ حَائِرٌ وَحَيْرَان) سەرگەردان بوو، سەرگەردان دەبێ، سەرگەردانە، (تَحَيَّر وَاسْتَحَار) واتە: کاتێك لە شتێکدا عەقڵی کول بێ، نەزانێ چی بکات، وە بکەوێتە دوو دڵییەوەو، نەزانێ کارەکە بە کامە لادا بخات؟

(ٱلصُّورِ): (القَرْنُ الَّذِي يَنْفُخُ فِيهِ إِسْرَافِيل)، (صور) لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، ئەو بووقەیە کە ئیسڕافیل فووی پێدا دەکات، دووجار فووی پێدا دەکات، وەك لە سووڕەتی (الزمر)دا هاتوە، فووی یەکەم بوونەوەر هەمووی تێکدەچێ، فووی دووەم ئەوەی خوا بیەوێ لە بوونەوەر هەڵدەستێتەوەو زیندوو دەکرێتەوە، کەواتە: فووی یەکەم بریتیە لە (ساعة)، وە فووی دووەم بریتیە لە (قیامة)، کە زۆر کەس تێکەڵیان دەکات، (ساعة) ئەو کاتەیە کە دنیا تێیدا کۆتایی دێ، وە (قیامة) ئەو کاتەیە کە مردووان هەڵدەستنەوە.

# مانــای گشــتــی ئـایەتەكــــان

خوا ﷻ هەر بەردەوامە لەسەر ئاراستەكردنی پێغەمبەر ﷺ، وە هەر كەسێك بە شوێن پێغەمبەردا هەنگاو دەنێ، بۆ چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ دەوروبەریدا، جا مسوڵمان بن، یان نامسوڵمان، چونكە پێشتر خوای پەروەردگار ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺی كرد، كە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئیمانداراندی شوێنكەوتووی دا بكات، ئنجا جارێكی دی دێتە سەر باسی ئەوە كە چۆن مامەڵە بكات لەگەڵ كەسانێكدا كە نەیارو ناحەزی ئیسلامن، وە قسەی پووچو بەلاش دەكەنو قسەی خراپ دەربارەی ئایەتەكانی خواو ئایینو بەرنامەی خواو پێغەمبەر ﷺ دەكەن، چۆنیان مامەڵە لەگەڵدا بكات؟ بەتایبەت لە كۆڕو مەجلیسێكیاندا كە كوفری تێدا دەكرێ، وە پاشان چییان پێ بڵێ؟ ئەم ئایەتانە باسی ئەو بابەتە دەكەن.

سەرەتا خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا ﴾، وە هەر كاتێك ئەوانەت بینی كە دەڕژێنە نێو ئایەتەكانی ئێمەوە، لە كوردەواریی خۆماندا دەڵێن: (بە پێی خواسی بەنێو دەكەوێ) واتە: بێئەوەی بەر پێی خۆی ببینێ، بێئەوەی هەقو ناهەق لێك جیابكاتەوە، هەر لەخۆڕا بەنێو دەكەوێو، قسەی بێ بەڵگە دەكات، ئەگەر ئەو جۆرە كەسانەت بینی، كە قسە بەرانبەر ئایەتەكانی ئێمە دەكەن، وە هەڵوێستی خراپ بەرانبەر ئایەتەكانی ئێمە دەنوێنن، ﴿ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ﴾، پشتیان تێبكە، واتە: لە كۆڕو مەجلیسیاندا بەشدار مەبە، لێیان نزیك مەبە، وە با ئەو پشت تێكردنو ئیهمالكردنەت بۆیان بەردەوام بێ، هەتا دەچنە نێو باسو بابەتێكی دیكەوە.

هەڵبەتە ئەوە دەرسێكی گەورەی تێدایە، وەك دوایی باسی دەكەین، كەواتە: مسوڵمان فەرمانی پێنەكراوە، كە لە كۆمەڵگا دابڕێ، بەڵكو دەبێ كارلێكی ئیجابیی لەگەڵ بكات، ئەوەش بەوە دەكرێ كە لێیان نزیك بێو بەشداریی كۆڕو مەجلیسیان بكەی، بەشداری شینو شاییان بكەی، بەڵام بەشداربوونی مسوڵمان لە بۆنەو بیرەوەرییو شینو شاییان دا، مانای ئەوەنیە كە لەبەرچاوی ئەودا كوفر بكرێو،

گاڵتە بە ئایینی خوا بکرێ، ئەویش گوێی تەپ بکات! بەڵکو نابێ بەشداری کاری ناهەقو خراپیان بێ، وە ئەگەر لەو جۆرە کۆڕو بۆنانەدا بەشداربێ، دەبێ هەڵوێستی هەبێ بەرانبەر خراپەکانیان، ئێستا بە زۆریی وایە مسوڵمانان تێدەپەڕێنن لە بەشداریی کردنیان لە کۆڕو مەجلیسی ئەهلی کوفردا، دوایی چی بکرێو چی بگوترێ، هەر خۆی بێدەنگ دەکات، خۆی مات دەکات، زۆر کەس خۆی بە مسوڵمانی باش دەزانێ، شێخە، مەلایە، بە خۆیو بە کۆڵێك ڕیشەوە دانیشتوە لە کۆڕێك دا، لە پێش چاوی ڕەشبەڵەك دەکرێ، شیعر دەخوێنرێتەوە، کوفری تێدایە، ئەویش دانیشتوەو گوێی تەپ کردوە، ئنجا کە لەوبارەوە پێی دەگوترێ، دەڵێ: ئەدی چۆن مسوڵمان دەبێ لەگەڵ کۆمەڵگاو خەڵکدا گونجاو بێ ! دەبێ مودارا بکەین، باشە، گوتمان مودارا بکە، بەڵام ئەگەر ناهەقیی بکرێو کوفر بکرێو، تۆش بێدەنگ بی ئەوە موداهەنەیە، مودارا ئەوەیە تۆ فشار لە خۆت بکەی بۆ سەلامەتیی ئایینت، بەڵام تۆ فشار لە ئایینەکەت کردوە، بۆ بەرژەوەندییو سەلامەتیی خۆت!!

ئنجا کەسی واش هەیە بە بارەکەی دیکەدا کورتی دێنێ، چی دەکات؟ لە کۆمەڵگا دادەبڕێ، ئاخر تۆ کە لە خەڵك دابڕای، هیچت بۆ ناکرێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانەت بینی کە دەڕژێنە نێو ئایەتەکانی ئێمەوە، بە کوفرو گاڵتە پێکردنو هەڵوێستی نەرێنیی، پشتیان تێبکە، هەتا دەچنە نێو باسو بابەتێکی دیکەوە، واتە: دوای ئەوەی چوونە نێو باسو بابەتێکی دیکەوە، بچۆوە نێویانو بەشدارییان لەگەڵدا بکە، ﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، وە ئەگەر شەیتان لە بیری بردیەوە، ئەوە لە دوای وەبیرهاتنەوە، لەگەڵ کۆمەڵی ستەمکاراندا دامەنیشە.

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە شەیتان جاری وایە مرۆڤ بێئاگا دەکات، وە شت لەبیر مرۆڤ دەباتەوە، بەڵام ئایا شەیتان توانیویەتی شت لەبیر پێغەمبەر ﷺ بەرێتەوە؟ دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین.

پاشان خوا باسی پارێزکارانو ئیماندارنێك دەکات، کە جاری وایە خزمایەتییو نزیکییان هەیە لەگەڵ ئەوانەدا، دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن

شَيۡءٖ ﴾، وە ئەوانەی پارێز دەکەن، هیچ لە لێپرسینەوەی ئەو کافرانە، لەسەر ئەوان نیە، هەر لەبەرئەوەی خزمیەتی، یان لەبەرئەوە کە دوێنی بەیەکەوە دانیشتوون، بەڵام ئەمڕۆ کوفری کردوە، ئێستا کوفرەکەی ناکەوێتە سەر وی، هەر لەبەرئەوەی لێی نزیکە، یان خزمیەتی، یان بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان بەشداریی ژیانو گوزەرانیان دەکەن، ﴿ وَلَٰكِن ذِكۡرَىٰ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴾، بەڵام پێویستە هەمیشە بیریان بخەنەوەو لەسەر هەڵوێستی دڵسۆزانەی خۆیان، بەرانبەریان بەردەوام بن، بەڵکو پارێز لە خوا بکەنو، واز لەو کوفرو شیرکە بێنن.

واتە: ئەگەر ئەهلی تەقوا بە هاندەری ئەوە لەگەڵ ئەهلی کوفر تێکەڵ دەبن، کە ئامۆژگارییان بکەن، بەڵکو بیانگێڕنەوە، ئەوە قەیناکات، بەڵام نابێ لە کاتێکدا کە ناهەقیی دەڵێن: بێدەنگ بن، دەبێ هەڵوێستیان هەبێ، ئەگەرنا کە پێویستیی کرد، بمێننەوە لە کۆڕو مەجلیسەکەیاندا، مادام ئامانجیان گۆڕانکاریی تێدا کردنیانو چاکردنیانو ئامۆژگاریی کردنیان بێ، گوناهبار نابن، ئەگەر بە هەڵوێستەوە بمێننەوە.

جا بۆیە قورئان دەبێ چاکی لێ وردبیەوە، ئەگەرنا دوایی هەر بۆخۆمان، خۆمان عاسێ دەکەینو، سەر لە خۆمان دەشێوێنین.

بۆ وێنە: نەصرانییەکانی نەجران هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت، یانی: لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دەیانگوت: عیسا عليه السلام کوڕی خوایە! وەك (القرطبي) لە تەفسیرەکەی دا، ئەم دەقەی هێناوە، دەڵێ: «﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٥٩ ﴾، نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة بِسَبَبِ وَفْدِ نَجْرَان حِينَ أَنْكَروا عَلَى النَّبِيّ ﷺ قَولَه: إنَّ عِيسَى عَبدُ اللهِ وَكَلِمَتُهُ، فَقَالُوا: أَرِنَا عَبْدَاً خُلِقَ مِنْ غَيْرِ أَبٍ، فَقَالَ لَهُم النَّبِيّ ﷺ: «آدَمَ مَنْ كَانَ أَبُوهُ؟ أَعَجِبْتُم مِن عِيسَى لَيْسَ لَهُ أَبٌ؟ فَآدَمُ عليه السلام لَيْسَ لَهُ أَبٌ وَلَا أُمٌّ!» » واتە: ئەم ئایەتە بەهۆی شاندیی نەجرانەوە هاتە خوار، کە نکووڵییان کردو، ڕەخنەیان گرت لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: عیسا بەندەی خوایەو وشەی خوایە، (واتە: بە وشەی

خوا دروست بووە)، گوتیان: بەندەیەكمان پێ پێشان بدە، كە بەبێ باب دروست بووبێ‌و لەدایك بووبێ ! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی بابی ئادەم كێیە؟ ئایا سەرسام دەبن بەوە كە عیسا بابی نیە، بەڵام سەرسام نابن، كە ئادەم نە بابی هەیە، نە دایك؟

كەواتە: ئەو قسە پووچو بەلاشانە، هەموویان لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ كراون، پێغەمبەر ﷺ خواش لەوێ بووەو، هاوەڵانی بەڕێزیش لەوێ بوون، كە دیارە ئەوە كوفرە بە ئایەتەكانی خوا، وە شیركە، ئەدی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی لەوێ بووە؟ چونكە هەڵوێستی هەبووە، هەروەها بۆئەوەی ئامۆژگارییان بكات، تاكو دەست هەڵبگرن لەو بیرۆكە پووچەی خۆیان، كەواتە: ئەم ئایەتەی دووەم، باسی ئەوە دەكات كە ئەگەر تۆ بە هەڵوێستەوە لە شوێنێك بووی، لە كۆڕێك دا بووی، مادام هەڵوێستت هەبووەو، بە ئامانجەوە لەوێ بووی، كوفرەكەی ئەوان زیانی بۆ تۆ نیە، بەڵام ئەگەر بەبێ هەڵوێستیی بەشداربی، مانای وایە پێی ڕازی، بەتایبەتی زۆرجار بێدەنگیی بەڵگەیە لەسەر ڕازی بوون.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾، وە واز لەوانە بێنە كە ئایینەكانیان كردوە، بە مایەی یاریی‌و گەمەو كات پێ بەسەربردن، وە ژیانی دنیا فریوی داون، واتە: ئەوانە كە تێیاندا گەیشتیە قەناعەت، كە هەر لەسەر وەزعی خۆیان بەردەوامن، لێیانگەڕێ، واتە: كاتیان پێوە بەفیڕۆ مەدە، ئەوەش ڕێنماییەكی زۆر گرنگە، كە تۆ دەزانی ئەو كەسە هیچی لێ سەوز نابێ، دارێك ناخاتە سەر بەردێك: جارێك، دوو، سێ، دە، ئیدی كاتی خۆتی پێ بەفیڕۆ مەدە، وەك لە سووڕەتی (النجم)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: پشت لەو كەسە بكە، كە پشتی لە ئایەتەكانمان‌و لە بەرنامەی ئێمە كردوەو، تەنیا ژیانی دنیای دەوێ، وێڵی بكە، كە دەزانی‌و تێیدا گەیشتوویە قەناعەت، سوودی نیە، زەوییەك مەكێڵە، كە هیچ سەوز نەكات، ئەدی چی بكات؟ ﴿ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا

مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ ﴾، بەڵام بەم قوڕئانە بیر کەسێك بخەوەو، ئامۆژگاریی کەسێك بکەو وریای بکەوە، کە مەترسیی ئەوەی هەیە، بەهۆی کردەوە خراپەکانییەوە، تووشی نا ئومێدیی ببێ، یاخود تووشی سزاو جەزرەبەی خوای دادگەر بێ، کە جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیارێكو هیچ تکاکارێکی نیە، ﴿ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ﴾، وە ئەگەر هەر قەرەبوویەك بدات، لێی وەرناگیرێ.

مانای ئەم ئایەتە موبارەکە ئەوەیە: ئەوانە کە تێیاندا گەیشتوویە دڵنیایی کە سوودی نیەو، گوێت بۆ ناگرنو لێت وەرناگرن، واز لەوان بێنە، بەڵام بەگشتی لەسەر ئامۆژگاریی کردنی خۆتو وریاکردنەوەی خۆت، هەر بەردەوام بەو لەگەڵ خەڵکی دیکەدا بەردەوام بە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُواْ بِمَا كَسَبُواْ ﴾، ئەوانە کەسانێکن بەهۆی کردەوەکانیانەوە تووشی، ئەوە بوون کە تەسلیمی سزا بکرێنو نائومێد بوونو گەیشتوونە بنبەستو تەمابڕاو بوون.

ئنجا ئایا ئەوانە لە دۆزەخ دا خواردنو خۆراکیان چۆنە؟ دەفەرموێ: ﴿ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ ﴾، خواردنەوەیان هەیە لە ئاوی داغو کوڵاو، وێڕای ئەوەش ئازارێکی بەئێشیان هەیە، سزایەکی بەئێشیان هەیە، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوابوون.

ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پرسیارێك ئاڕاستەی ئەو هاوبەشپەرستانە بکە، کە ئەگەر لێی وردبنەوە، دەبێ زۆر ڕایان بچڵەکێنێ، ﴿ قُلْ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا ﴾، بڵێ: ئایا لە جیاتی خوا لە شتانێك بپاڕێینەوە، چونکە: (ما) هەم بۆ خاوەن عەقڵانو، هەم بۆ ئەوانەش کە عەقڵو شعووریان نیە، بەکاردێ، بەڵام زیاتر بۆ ئەوانەیە کە عەقڵو شعووریان نیە، بۆیە من گوتوومە: شتانێك نەك کەسانێك، ئنجا ئەو شتە: بتە، صەنەمە، مرۆڤە ... هتد، بڵێ: ئایا لە جیاتی خوا لە شتانێك بپاڕێینەوە، کە نە سوودمان پێدەگەیەنن، نە زیانمان لێدەدەن،

﴿ وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾، وە ئایا لەسەر پاژنە پێیەکانمان هەڵگەڕێینەوەو بەرەو دواوە بچینەوە، دوای ئەوەی خوا ڕێنمایی کردووین؟ واتە: دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار قورئانی بۆ ناردووین، وە پێغەمبەری بۆ ناردووین؟ چونکە کەسێك پاش وەرگرتنی هیدایەتی خوا، وازی لێ بهێنێ و دەستبەرداری ببێ، وەك ئەوە وایە: پاشەوپاش بەرەو دواوە گەڕابێتەوە.

دوایی وێنەیەك دێنێتەوە بۆ ئەوانەی هیدایەتی خوا ڕەفز دەکەن، دەفەرموێ: ﴿ كَٱلَّذِي ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِي ٱلۡأَرۡضِ حَيۡرَانَ ﴾، وەك کەسێك کە شەیتانەکان لە زەویدا سەرگەردانیان کردوە، دیارە زانایان دەربارەی ئەم ئایەتە مشتومڕیان هەیە، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا بە تەفصیلێ باسی دەکەین، دەفەرموێ: ﴿ لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٞ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَا ﴾، هەندێ هاوەڵ و برادەری هەن، بانگی دەکەن بەرەو ڕێنمایی و بۆ لای ڕێی ڕاست، دەڵێن: وەرە بۆ لای ئێمە ! تۆ لاڕێ ڕۆیشتووی و، هەڵە بووی، وەرەوە سەر ڕێ! کەچی بەدەنگیانەوە نایەت، ﴿ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰ ﴾، بڵێ: ڕێنمایی خوا هەر ئەوە ڕێنماییە، هەر ڕێی ڕاستی خوا، ڕێیە، ﴿ وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، وە فەرمانمان پێکراوە کە ملکەچ بین بۆ پەروەردگاری جیهانییەکان، ﴿ وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ﴾، وە فەرمانمان پێکراوە کە نوێژ بەرپا بکەین و پارێز لە خوا بکەین، ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾، وە فەرمانیشمان پێکراوە کە بزانین: هەر بۆ لای خوا کۆدەکرێینەوەو خڕدەکرێینەوە، لە ڕۆژی دوایی دا بۆ لێپرسینەوەو پاداشت و سزا.

ئنجا لە کۆتایی دا خوا ﷻ بە چەند وەسفێکی گەورە، پێناسەی خۆی دەکات، بۆئەوەی بێبڕوایان لە بەرانبەر ئەو خوایە بەرزو مەزنەدا، کە خاوەنی ئەو وەسفانەیەو، خاوەنی ئەو کردەوانەیە، شەرم بکەن، تاکو ئەگەر ڕێزو شەرم و

خۆشەویستیشی ناچێتە دڵیان، با سامو ترسو هەیبەتی بچێتە دڵیان، وە ترسیان هەبێ كە ئەو خوا بەرزو مەزنو باڵادەستە، دەتوانێ دوایی سزایان بدات، دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾، وە خوا ئەو كەسەیە كە ئاسمانەكانو زەوی بە هەق دروست كردوون، واتە: ئێوە وامەزانن هەروا هاتوونە ژیانی دنیاو، كەس لێتان ناپێچێتەوە، ئەم بوونەوەرە بە هەق دروست بووە، ئێوەش لەسەر ئەم خڕۆكەی زەوییە، بە هەق دانراون، بۆ جێنشینایەتیی خوا، وە لەژێر تاقیكردنەوە دان، واتە: دەبێ لێپرسینەوەو پاداشتو سزا هەبێ، ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ﴾، وە قسەو فەرمایشتی خوا هەقە، كاتێك لەو ڕۆژەدا دەفەرموێ: ﴿ كُن فَيَكُونُ ﴾، ببە، یەكسەر هەر شتێك كە بیەوێ ببێ، دەبێ، كە شتەكان ئەوەندە خێرا دەبن، لە عەقڵو تەصەووری ئێمەدا جێی نابێتەوە، ﴿ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ﴾، وە ئەو ڕۆژەش كە فوو بە كەڕەنادا دەكرێ، موڵك هەر هی ئەوە، ﴿ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، زانای پەنهانو ئاشكرایە، دەزانێ بە پەنهانیی چیتان كردووە، بە ئاشكراش چی دەكەن، ﴿ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴾، وە خوا كاربەجێی شارەزایە، كەواتە: خوایەك خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ، شایستەیە كە هەر ئەو بپەرسترێ، وە هەندێك لە دروستكراوەكان نەهێنرێنە ڕیزی ئەو، لە پەرستران دا.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، دیارە ئەم ئایەتە دەبێ توێژینەوەیەكی باشی لەسەر بكەین، كە بە هەمان چەمك، بە تۆزێك جیاوازیی، لە ئایەتی ژمارە (١٤٠)ی سوورەتی (النساء)یشدا هاتوە، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ ﴾، واتە: وە پێشتر لە كتێبدا بۆتان دابەزێنراوە، كە هەر كات بیستتان ئایەتەكانی خوا كوفریان پێدەكراو گاڵتەیان پێدەكرا، ئەوە (لەو كۆڕو شوێنە) لەگەڵیاندا (واتە: لەگەڵ بێبڕواو دەغەڵاندا) دامەنیشن، هەتا دەچنە نێو باسێكی دیكەوە، ئەگەرنا ئێوەش وەك وان دەبن (لە گوناهو حوكم دا)، بێگومان خوا كۆكەرەوەی تێكڕای مونافیقو كافرەكانە لە دۆزەخدا.

بۆیە لە (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ ﴾، چونكە سوورەتی (الأنعام) سوورەتێكی مەككەییە، سوورەتی (النساء) مەدینەییە، واتە: ئەمە ئاماژەیە بەو ئایەتەی سوورەتی (الأنعام)، ئنجا كاتێك ئێمە ئەم دوو ئایەتە پێكەوە بەراورد دەكەین، چەند ڕاستییەكمان بۆ دەردەكەون:

# نۆ (٩) ڕاستیی کە لەو دوو ئایەتە وەردەگیرێن

**ڕاستیی یەکەم:** قورئانی مەککەییو مەدینەیی، تێکهەڵکێشو ئاوێتەی یەکدین، ئەم ئایەتەی سووڕەتی (الأنعام) لە مەککە هاتۆتە خوار، ئەم ئایەتەی سووڕەتی (النساء)یش لە مەدینە، کە کاتی هاتنەخوارەوەی: (الأنعام) ساڵی نۆیەم یان دەیەمی پێغەمبەرایەتیی، کەچی لە سووڕەتی (النساء)دا لە مەدینە ئاماژەی پێدەکاتەوە، کەواتە: ئایەتو سووڕەتە مەککەییو، مەدینەییەکان هەموویان تێکهەڵکێشو ئاوێتەی یەکدین.

**ڕاستیی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا ﴾، یانی چی؟ لە سووڕەتی (النساء)دا ئەو ئایەتەمان بۆ تەفسیر دەکات، دەفەرموێ: ﴿ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا ﴾، واتە: هەر کات بیستتان ئایەتەکانی خوا، کوفریان پێدەکراو گاڵتەیان پێدەکرا، کەواتە: دەڕژانە نێو ئایەتەکانمان ﴿ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا ﴾، یانی: ﴿ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا ﴾، واتە: کوفریان پێدەکراو گاڵتەیان پێدەکرا.

**ڕاستیی سێیەم:** دروست نیە مسوڵمان لە کۆڕی کوفرو گاڵتەکردن بە ئیسلام دا دابنیشێ، واتە: بەبێ هەڵوێست دابنیشێ، من لە کتێبی (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچکان) و (سۆزی نەتەوایەتیی)دا باسی چەند موناقەشەیەکی خۆمم کردوە، لەگەڵ کەسانی مولحیدو کافردا، کابرا دانیشتوەو گاڵتەی بە ئیسلام کردوەو کوفری بە ئایەت کردوە، منیش لەگەڵی دانیشتووەو موناقەشەم لەگەڵ کردوە، بەڵام بۆیە دانەنیشتووم، تاکو گوێی بۆ تەپ بکەمو بێدەنگ بم، بەڵکو دەنیشتووم، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾، بیری بخەمەوەو ئامۆژگاریی بکەم، بەڵکو پارێزی پەیدابێو خۆ بپارێزێ، لە

سزای خوا، کەواتە: دروست نیە مرۆڤ لە کۆڕو مەجلیسی کوفرو گاڵتەکردن بە ئیسلام دا دابنیشێ، مەگەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەو چارەسەرکردن‌و بانگکردنیان.

**ڕاستیی چوارەم:** بەڵام دروستە لە کۆڕو مەجلیسی کافرانی دیکەدا دابنیشی، با مەبەستیشت بانگەواز نەبێ، بۆ وێنە: هەڵسوکەوتێکی سیاسییە، کاروبارێکی بازرگانیی‌و مامەڵەیەکە، خزمایەتییەکە، شین‌و شاییەکە، دراوسێیەتییە، لەو حاڵەتانەدا دروستە دابنیشی، مەرجیش نیە کە هەر بانگیان بکەی بۆ ئیسلام، جاری وایە دەرفەتەکە وانیە، بۆیەش وا دەڵێم، چونکە کەسێك ئەگەر لە ئایەتەکان وردنەبێتەوە، وادەزانێ کە گەیشتە هەر کافرێك، یان دەبێ بانگی بکات، یان نابێ سەلامی لێبکات ! نەخێر وانیە، خوا دەفەرموێ: ئەگەر گاڵتەیان بە ئایەتەکانی خوا کردو کوفریان کرد، لەگەڵیان دامەنیشن، بەڵام ئەگەر گاڵتەو کوفریان بە ئیسلام نەکرد ، دروستە لەگەڵیان دابنیشی، هەورەها ئەگەر کوفرو گاڵتەشیان کرد هەر دروستە لەگەڵیان دابنیشی، بۆئەوەی بانگیان بکەی‌و ئامۆژگارییان بکەی.

**ڕاستیی پێنجەم:** ئەگەر کەسێك بە هەڵە ڕێی کەوتە نێو کافران‌و، گاڵتەیان بە دینی خوا دەکرد، ئەویش بێئاگا بوو، ئەوە گوناهی ناگاتێ.

**ڕاستیی شەشەم:** خوا دەربارەی لەبیرچوونەوەو چوونە کۆڕی کافران، فەرموویەتی: ﴿ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، واتە: ئەگەر شەیتانیش لەبیری بردیەوە، ئەوە پاش وەبیرهاتنەوە، لەگەڵ کۆمەڵی ستەمکاران دا دامەنیشە، کەواتە: دوای وەبیرهاتنەوە دامەنیشە، ئەدی پێش وەبیرهاتنەوە، کە دانیشتووی؟ گوناهبار نابی، چونکە لەبیرت نەبووە.

**ڕاستیی حەوتەم:** دەگونجێ شەیتان شتمان لەبیر بەرێتەوە، خوا لە سوورەتی (الکهف)دا لەسەر زمانی هاوەڵەکەی مووسا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ ﴾، واتە: وە تەنیا شەیتان لەبیری بردمەوە، کە یادی بکەم، کەواتە: دەگونجێ شەیتان شت لەبیری ئینسان بەرێتەوە.

**ڕاستیی هەشتەم:** لە ئایەتە مەککەییەکاندا بەس نەهی کراوەو دەفەرموێ: دامەنیشە لە کاتێکدا کوفر دەکرێ‌و گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا دەکرێ، بەڵام لە ئایەتە مەدینەییەکەدا، سزاش دیاریی کراوە، لە ئایەتە مەککەییەکەدا بەس دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ﴾، ئیدی باس نەکراوە، ئەگەر دابنیشن چی دەبێ، بەڵام ئایەتەکەی سووڕەتی (النساء) لە مەدینە هاتۆتە خوار، کە یاسا شەرعییەکان هەموویان لە مەدینە هاتوونە خوار، ئنجا لەوێ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ ﴾، واتە: ئەگەر دابنیشن، ئێوەش وەك وان دەبن (لە گوناهو حوکم دا)، (ئەم سزایە سزای دنیاو دواڕۆژە)، بێگومان خوا کۆکەرەوەی تێکڕای مونافیق‌و کافرەکانە لە دۆزەخدا، کەواتە: کەسێك لە کۆڕو مەجلیسی کافراندا دابنیشێ‌و گوێ تەپ بکات، زۆر نزیکە لە ڕیزی مونافیقاندا بێ، ئەگەر کافرێکی بە ئاشکراش نەبێ، کافرێکی پەنهانە، مسوڵمانێکی بە ڕواڵەت مسوڵمانە، ئەگەرنا چۆن لە شوێنێك دادەنیشێ، کوفر بە ئایەتەکانی خوا بکرێ، بەبێ هەڵوێستیی؟ بەڵکو جاری وایە ڕەنگە بە دەمیشیانەوە پێبکەنێ‌و، سەریشیان بۆ بلەقێنێ!! دیارە ئەو جۆرە کەسە پێی ناگوترێ مسوڵمان‌و، نیشانەی پرسیار دەکەوێتە سەر مسوڵمانەتییەکەی.

## دەگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ شتی لەبیر بچێ ؟

**ڕاستیی نۆیەم:** دەگونجێ پێغەمبەریش ﷺ شتی لەبیر بچێتەوە، جا بۆ زانیارییتان شیعە دەڵێن: نابێ‌و ناگونجێ هەرگیز پێغەمبەر ﷺ هیچی لەبیر بچێ، نەك هەر ئەو، بەڵکو نابێ ئیمامەکانیش هیچیان لەبیر بچێ، واتە: لەوبارەوە وەك خوا تەماشایان دەکەن‌و، سیفەتی خوایان دەدەنە پاڵ !! وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾مریم، واتە: پەروەردگارت شتی لەبیر ناچێ، شیعە ئەم سیفەتەیان بۆ پێغەمبەرو بۆ ئیمامەکانیش داناوە !

بە خوا ڕەنگە دووبەشیش کە بۆ پێغەمبەریان داناوە، مەبەستیان ئەوە بووبێ کە بڵێن: ئیمامەکانیش پارێزراون، چونکە ناگونجێ بڵێن: پێغەمبەر ﷺ شتی لەبیر دەچێتەوە، بەڵام ئیمامەکان شتیان لەبیر ناچێتەوە ! کە بە دڵنیایی ئەو قسەیەی وان، شتێکی پووچو بێ بنەمایە، چونکە مرۆڤ مرۆڤە، ئنجا با چەند بەڵگەیەك بێنینەوە لەسەر ئەوە کە دەگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ شتی لەبیر چووبێتەوە:

١) ئەم ئایەتە ڕاستەوخۆو بە ڕوونو ڕاشکاویی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدوێنێ، دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ﴾، واتە: ئەگەر شەیتانیش لەبیری بردیەوە، کەواتە: دەگونجێ شتی لەبیر بچێتەوە.

٢) هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (الكهف)دا زۆر بە ڕوونتر باسی ئەوە دەکات، کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتی لەبیر چۆتەوە، کاتێك کە هاوبەشدانەرەکانی مەککە دەچن بۆ لای جوولەکەکانی مەدینە، پێیان دەڵێن: کەسێك لەنێو ئێمەدا پەیدابووە بە ناوی موحەممەد، دەڵێ: من پێغەمبەری خوام، پێمان بڵێن: چۆنی مامەڵە لەگەڵ بکەین؟ جوولەکەکانیش دەڵێن: سێ پرسیاری لێبکەن، ئەگەر پێغەمبەر بێ دەیانزانێ، ئەگەر پێغەمبەریش نەبێ نایانزانێو، بۆتان دەردەکەوێ داخۆ ڕاست دەکات، یان درۆ دەکات، (حاشای پێغەمبەری خوا ﷺ)، دەڵێن: باشە، وە پرسیارەکانی لێدەکەن :

یەکەم: دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف).

دووەم: دەربارەی زولقەرنەین.

سێیەم: دەربارەی ڕووح.

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ﴿أُخْبِرُكُمْ بِمَا سَأَلْتُمْ عَنْهُ غَدَاً﴾، واتە: بەیانی هەواڵتان پێدەدەم دەربارەی ئەوەی پرسیارتان کرد، ﴿وَلَمْ يَسْتَثْنِ﴾[1]، واتە: ئەگەری تێنەخست، یانی: نەیگوت: (إِنْ شَاءَ اللّٰه).

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (٢٢٨٦١)، والسيوطي في لباب النقول برقم: (٦٧٧)، وابن هشام في السيرة ج١، ص٢٣٥، ٢٤٤، والبيهقي في "الدلائل" ج٢، ص٢٦٩، ٢٧١، الإستيعاب في بيان الأسباب ج٢، ص٤٧، قلنا: وسنده ضعيف.

ئنجا خوای کاربەجێ، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پلەو پایەی هێندە بەرز بووە، شتی زۆر بچووکیشی لەسەر حیساب کردوە، وەك ئێمە نەبووە، ئێمە گوناهی گەورەش دەکەین، خوا لەگەڵمان بە کەرەمەو جاری وایە، زۆر لەسەرمان حیساب ناکات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پایەکەی هێندە بەرز بووە، شتی زۆر بچووکیشی بە گەورە بۆ حیساب بووە، بۆیە چونکە نەیفەرموو: (إِنْ شَاءَ الله) خوا ماوەیەك وەحی ڕاگرتو قورئان نەهاتە خوار، هەندێك دەڵێن: مانگێك بووە، هەندێك دەڵێن: چل شەو بووە، هەندێك دەڵێن: دوو مانگ، هەندێك دەڵێن: بیست شەو، هەندێك دەڵێن: دە شەو، بە هەر حاڵ ماوەیەك وەحی نەهات، گرنگ ئەوەیە بۆ بەیانی کە بەڵێنی پێدابوون، وەحی نەهات، جا ئەگەر وەحی نەیەت چۆن وەڵامیان بداتەوە، تاکو خوا پێی نەفەرموێ، بۆخۆی نازانێ‌و شتێکی پەنهان (غیب)ە، جا کافرەکان لەوبارەوە شەڕێکی دەروونییان بەرپاکرد دژی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتیان: ئەوە دەرکەوت کە پێغەمبەری خوا نیە، چونکە وەڵامی پرسیارەکانی نەزانی !

ئنجا بەو هۆیەوە ئەم دوو ئایەتە هاتنە خوار، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾الكهف، وە لە درێژەی ئەوەدا، خوای زانا بۆی باسی هاوەڵانی ئەشکەوت کرد، وە باسی (ذو القرنین)یشی کرد، وە لە سوورەتی (الإسراء)دا وەڵامی پرسیاری ڕووحیشی دایەوە، فەرمووی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾، وەڵامی هەرسێکیانی دایەوە، دوایی خوای کاربەجێ ئامۆژگاریی کردو فەرمووی: بە هیچ شتێك مەڵێ: بەیانی دەیکەم، مەگەر بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ، وە یادی پەروەردگارت بکەوە، هەرکات لەبیرت چۆوە، ئەگەر شتێکت لەبیرچوو، یان پەروەردگارت لەبیرت چوو، (شەیتان بێئاگای کردی، لەو کاتەدا یەکسەر یادی بکەوە) بڵێ: بەڵکو

پەروەردگارم بۆ نزیکتر لە ڕێی ڕاست، لەمەودوا هیدایەتم بداو ڕێنماییم بکات، ( کە جارێکی دی ئاوا نەکەم، شتێك کە زانیارییم پێی نەبێ، قسەی لێنەکەمو بەڵێن نەدەم).

٣) وە ڕۆشنتر لەوانەش ئەم فەرمایشتەیە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي﴾[1]، واتە: بێگومان منیش بەشەرێکم وەك ئێوە، شتم لەبیر دەچێ، وەك چۆن ئێوە لەبیرتان دەچێ، ئەگەر لەبیرم چوو، بیرم بخەنەوە.

ڕۆژێك پێش نوێژی کردوە، لێی ئاڵقاوەو هەڵەی کردوە، یەکێك لە هاوەڵان بیری خستۆتەوەو پێی گوتوە، ئەویش فەرموویەتی: لەبیرم چوو، وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە.

٤) هەروەها هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً، يَقْرَأُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: يَرْحَمُهُ اللهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً، مِنْ سُورَةِ كَذَا﴾[2]، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو قورئانی دەخوێند لە مزگەوت، فەرمووی: خوا بەزەیی پێیدا بێتەوە، فلان ئایەتو فلان ئایەتی لە فلان سوورەت بیرهێنامەوە.

دیارە ئەو کاتە ئایەتەکانی لەبیر نەبوونو لەبیری چوونەوە.

٥) لە چەند شوێنێکی قورئان دا، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، واتە: بڵێ: بێگومان منیش بەشەرێکم وەك ئێوە، کەواتە: ئەویش شتی لەبیر دەچێ، تووڕە دەبێ، پێدەکەنێ، دڵخۆش دەبێ، خەمی دەبێ، ماندوو دەبێ، نەخۆش دەبێ ... هتد، بەڵام ئەوەندەیە وەحی بۆ دێو پێغەمبەری خوایە، ئەگەرنا بەشەرە وەك ئێمە، واتە: ئەو شتانەی بەشەر

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٠١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٧٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٠٢٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٢٤٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٢١١).

٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٧٥٠).

بەسەری دێن، بەسەر ئەویشدا دێن، وەك خواردنو خواردنەوەو، سەرماو گەرما، کەواتە: ئەو قسەیەی شیعە دەیکەن قسەیەکی پووچو بێ بنەمایە.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ وە ئەوانەی پارێز دەکەن، بەهۆی کردەوەی خراپی بێبڕوایەکانەوە، بەرپرسیار نابنو لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێ، بەڵام پێویستە بیریان بخەنەوەو ئامۆژگاریی یان بکەن، بەڵکو خۆیان (لە سزای خوا) بپارێزن.

کەواتە: ئەگەر مسوڵمانانی بەشدار لە کۆڕو کۆبوونەوەی بێبڕوایەکان دا، بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵسن بەرانبەریان، کە بریتیە لە بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی یان، ئەوە هیچ گوناهبار نابن، بەهۆی تێکەڵیی کردنیانو، بەشداریی کردنیان لە کۆڕو کۆبنەوەکانیان دا.

ئنجا ئەم ئایەتە لێی وەردەگیرێ کە:

١/ ئەگەر بێتو بڕوادارانی بەشدار لە بۆنەو کۆڕی کافرەکان دا، بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵنەستن، دروست نیە بەشداریی یان بکەن.

٢/ هەروەها لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، کە خوای بە بەزەیی و بەخشندە چەندە لێبوردەیە بەرانبەر بە کافرو هاوبەشدانەرەکان، کە لەسەر بڕوادارنی بە مەرج گرتوە دەبێ: ئامۆژگاریی یان بکەنو بیریان بخەنەوەو کوفرو شیرکەکەیان نەکەنە بیانووی پشتگوێ خستنیانو کەمتەرخەمیی بەرانبەریان!

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾، وە واز لەوانە بێنە کە ئایینەکەی خۆیانیان کردوە بە گەمەو یاریی و کات پێ بەسەربردن، وە ژیانی دنیا فریوی داون.

توێژەرەوانی قورئان، سێ واتایان بۆ ئەم ئایەتە لێکداوەتەوە، هەر سێکیان تەواون:

١) مەبەست لە: ﴿ دِينَهُمْ ﴾، واتە: ئیسلام، ئەو ئیسلامەی کە خوا بۆی ناردوون، ئەم قورئانە، بێبڕوایەکان گاڵتەی پێدەکەنو کۆڕو مەجلیسی خۆیان پێ گەرم دەکەنو ڕەخنەی ناهەقی لێدەگرن، وە کردوویانە بە مایەی گاڵتە پێکردنو کات پێ بەسەربردن، دەفەرموێ: ﴿ دِينَهُمْ ﴾، بۆیەش ئەم دینەی ــ کە ئیسلامە ـ پاڵداوەتە لای ئەوان، چونکە ئەم دینەی بۆ ئەوان ناردوە، بۆئەوەی پێی ڕاستو چاكو پاك بن، کەچی ئەوان لەجیاتی ئەوەی کە سوودی لێ ببینن‌و لێی بەهرەمەند بن، کردوویانە بە مایەی گاڵتەو کات پێ بەسەربردن.

٢) یان مەبەست لە: ﴿ دِينَهُمْ ﴾، واتە: ئایینە شیرکییەکەی خۆیان، وەك خوا لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: نوێژی هاوبەشدانەرەکان لەلای کەعبە، هەر بریتی بوو لە فیکە کێشان‌و چەپڵە لێدان، کەواتە: دینداریی هاوبەشدانەرەکان بریتیە لە شتێکی گاڵتەجاریی‌و کات پێ بەسەربردن.

٣) یان مەبەست لە: ﴿ دِينَهُمْ ﴾، ئایینەکەیان بریتیە لە یاریی‌و گاڵتەو کات پێ بەسەربردن، ئەمەش هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، کە بە جۆرێك دینداریی دەکەن، سوودێك بە ئینسان ناگەیەنێ، ئنجا نەصرانیین، ئێزیدیین، مەجووسیین، صابیئەن، جوولەکەن، خەڵکی دیکەی عەلمانیین، چونکە سیکۆلاریزمیش جۆرێکە لە دین، هەروەها ئەوانەی مارکس‌و لینین وەك بت‌و صەنەم دەپەرستن، ئەوەش هەر دینە، هەر شتێك کە تەقدیست کردو بە گەورەت گرتو، وەك پەرستراو مامەڵەت لەگەڵ کرد، جۆرێکە لە دینداریی، کەواتە: ئەوانە واز لێ بێنە کە دینەکەیان بریتیە لە گاڵتەو یاریی‌و کات پێ بەسەربردن‌و، ژیانی دنیا فریوی داون.

**<u>مەسەلەی چوارەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبۡسِلُواْ بِمَا كَسَبُواْۖ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ﴾، واتە: {وە بەهۆی ئەم (قورئان)ەوە} بیری کەسانێك بخەوە تاکو (بەهۆی کوفرەوە) کەسێك نائومێد نەبێ، یاخود تووشی بن بەست نەبێ، تووشی تەسلیم کران بە سزای خوا نەبێ، بەهۆی کردەوەکانی خۆیەوە، کە جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیارو هیچ تکاکارێکی نیە، (هیچ کەسێك نیە سەرپەرشتیی بکات، وە هیچ کەسێکیش نیە تکای بۆ بکات) وە بۆخۆشی قەرەبووی لێوەرناگیرێ، ئەوانە نائومێدبوونو تەسلیمی سزابوون، تووشی بنبەست بوون بەهۆی چییەوە ؟ ﴿بِمَا كَسَبُواْ﴾، بەهۆی ئەوەو کە وەدەستیان هێنا، کەواتە: لەڕاستیدا ئەوەی کە ئینسان بەختەوەر دەکات، یان بێمراد دەکات، ئەوەی ئینسان خۆشحاڵ دەکات، یاخود چارە ڕەش دەکات، کردەوەی ئینسانە، هەربۆیەش دووجاران: ﴿بِمَا كَسَبَتۡ﴾، ﴿بِمَا كَسَبُواْ﴾، خوای بەخشندە لە یەك ئایەتدا دووبارەی کردۆتەوە.

ئنجا باسی خواردنو خۆراکیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ﴾، خواردنەوەیان لە ئاوی داغە، وە ئازارێکی بەئێشیشیان هەیە، بەهۆی ئەو کوفرەوە کە دەیانکرد.

**<u>مەسەلەی پێنجەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَنَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعۡقَابِنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِي ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِي ٱلۡأَرۡضِ حَيۡرَانَ لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٞ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَاۗ﴾، پێنج ڕاستیی گرنگ لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێن:

# پێنج ڕاستیی گرنگ کە لە ئایەتی (٧١) وەردەگیرێن

یەکەم/ خوا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەسپێرێ، کە پێیان بڵێ: ـ بە هاوبەشدانەران ـ ئایا لەجیاتی خوا، یاخود لەگەڵ خوادا لە شتانێك بپاڕێینەوە، کە نە سوودمان پێدەگەیەنن، نە زیانمان لێدەدەن، وە لەسەر پاژنە پێیەکانمان بەرەو دواوە بگەڕێینەوە؟ ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە پەرستراو (معبود) دەبێ بتوانێ سوودو زیان بگەیەنێ، بەوانەی کە دەیپەرستن‌و لێی دەپاڕێنەوە.

ئنجا ڕەنگە یەکێك بڵێ: باشە سوود گەیاندن ئەوە دیارە، کە پەرستراو دەبێ سوود بگەیەنێ بەوانەی کە دەیپەرستن، بەڵام مەبەست لە زیانەکە چییە؟ مەبەست ئەوەیە: سوودیان پێدەگەیەنێ کاتێك لێی دەپاڕێنەوەو بۆی ملکەچن‌و فەرمانبەرن، وە بتوانێ زیانیشیان پێبگەیەنێ‌و سزایان بدات، لەکاتێکدا کە نافەرمانبەریی دەکەن‌و لەقسەی دەردەچن.

دووەم/ پەرستنی جگە لە خواو شیرك، هەڵگەڕانەوەیە لە سروشت‌و فیطرەت، چونکە شەریعەتی پەروەردگار پڕ بەپێستی مرۆڤەو، ئەو فیطرەتەی کە خوا مرۆڤی لەسەر دروستکردوە، لەگەڵ ئەو هیدایەت‌و ئایینەی بۆی ناردوە، دوو ڕووی یەك سکەن، وەك خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (الروم)دا دەفەرموێ:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾،

واتە: ڕووی خۆت ڕاست بکە لەگەڵ ئایینێك دا، کە خوا ناردوویەتی بە پاکیی، ئەو ئایین‌و مسوڵمانەتییە کە لەگەڵ ئەو سروشتەی کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوەو دروستکردوە، یەك شتن، (بۆیە دوایی دەفەرموێ:) گۆڕانکاریی‌و

دەستکارییکردن نیە بۆ دروستکراوی خوا، (واتە: مرۆڤەکانی وا دروستکردوە بیناسن‌و بیپەرستن، ئەو سروشتە ناگۆڕێ)، ئا ئەوەش ئایینی ڕاستە، بەلام زۆربەی خەڵکی نایزانن.

بێگومان ئایینی ڕاست ئەوەیە کە لەگەڵ سروشت‌و فیطرەتی مرۆڤدا بگونجێ، ئنجا لێرەدا خوای پایەدار هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، یان ڕەفزکردنی هیدایەتی خوا، بەوە دەچوێنی کە کەسێك لەسەر پاژنە پێیەکانی بەرەو دواوە بگەڕێتەوەو بکشێتەوە، دوای ئەوەی کە خوا ڕێنمایی کردوە.

سێیەم / لێرەدا کە دەڵێن: ﴿بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾، دوای ئەوەی کە خوا ڕێنمایی کردووین، هیدایەتی خوا بەگشتی دوو قۆناغی هەیە:

١- قۆناغی یەکەم: ئەوەیە کە ڕێنمایی خەڵك دەکات بەرەو بەرنامەی خۆی، کە خەڵك دەتوانن قبووڵی بکەن‌و وەریبگرن‌و پێوەی پابەندبن، وە دەشتوانن قبووڵی نەکەن‌و وەرینەگرن‌و پێوەی پابەند نەبن، ئنجا خوای کاربەجێ ئەو قۆناغەی ناوناوە: ﴿وَهُدًى لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾، قورئان هیدایەتە بۆ جیهانییان، کە دیارە جیهانییان هەموویان ڕێی ڕاست ناگرن، بەلام ئەوە بەرچاو ڕوونییەو، ئەو هیدایەتە لەبەردەستی هەمووان دایە، بۆ وێنە خوا دەربارەی گەلی (ثمود) دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٧﴾فصلت، بەلام گەلی ثەموودمان ڕێنمایی کرد، (واتە: بەرنامەی خۆمانمان خستە بەردەستیان، بەلام بەمانای هیدایەتدرانیان نایەت، ئەگەرنا نەیدەفەرموو:)، بەلام کوێرییان هەڵبژارد بەسەر ڕێنمایی دا، لە ئەنجامی ئەوەشدا برووسکەی سزای ڕیسوایی گرتنی، بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد.

٢- قۆناغی دووەم: ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دڵی ئەو خەڵکە وەرچەرخێنی، کە پابەندبن بەو بەرنامەو ڕێنماییەوە، لە چەند شوێنێکیش خوای بەخشەر

لە قورئاندا، باسی ئەو جۆرە هیدایەتە دەکات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ ﴾البقرة، واتە: ئەم کتێبە هیچ گومانی تێدانیە، کە ڕێنماییە بۆ پارێزکاران، واتە: ڕێی خۆیانی پێ دەردەکەن، وە پێوەی پابەند دەبن، لێرەدا هیدایەت بەمانای دووەمیەتی، کە وەرگرتنیو کارپێکردنو پێوە پابەندبوونیەتی، ئاوا هیدایەت دراون، بەڵام خەڵك بەگشتی، وە بەمانا گشتییەکەی هیدایەتیان خراوەتە بەردەست، کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان کە دەڵێن: ﴿ بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾، مەبەستیان پێی چەمكو واتای دووەمی هیدایەتە، واتە: خستووینیە سەر ڕاست، وە ئەگەر مەبەست پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانو ئەو کافرانەش بێ کە قورئانیان بۆ هاتوە، ﴿ بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾ ئەوە بە چەمكو واتای یەکەمی هیدایەتە، واتە: ئێمەو ئێوە خوا هیدایەتی خستووەتە بەردەستمان، ئێمە ئەوە قبووڵمان کردوە، بەڵام ئەوەی کە قبووڵی نەکات، وەك ئەوە وایە کە لەسەر پاژنە پێیەکانی هەڵبگەڕێتەوە، چونکە هیدایەتەکەی هاتۆتە بەردەستی، کەچی ئەو لەجیاتی پێشوازیی لێبکاتو لە باوەشی بگرێ، لێی هەڵدەگەڕێتەوەو پاشەو پاش دەکشێتەوەو ڕەفزی دەکات.

چوارەم / خوای کاربەجێ وێکچوواندنێکی کردوە بۆ کەسێك کە قبووڵی هیدایەتی خوا ناکات، کە چوواندوویەتی بە کەسێك کە شەیتان فریوی داوە، وە تووشی گوناحو تاوانی دەکات، یاخود شەیتان دەستی لێوەشاندوەو شێتی دەکات، وە سەری خۆی هەڵدەگرێو، بە دەشتو چیاو چۆڵ دەکەوێ ! ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتە زەینەوە: ئایا شەیتان مرۆڤ دەفرێنێو دەستی لێ دەوەشێنێو شێتی دەکاتو بە کێوانی دەخات، یان نا؟ چونکە ئایەتەکە زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ

﴿يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَا﴾، واتـە: وەك كەسـێك كـە شـەیتانەكان گـومڕاو سـەرگەردانیان كـردوە، لە زەویـدا، وە چـەند هاوەڵێكی هـەن كە بـانگی دەكـەن بـۆ ڕێنمـاییو ڕێـی ڕاسـت، دەڵێن: وەرە بـۆ لای ئێمـە، كەواتـە: ئایەتـەكە ڕوونـە لـەوەدا كە خـوای كـارزان كەسێك كـە هیدایـەتی خـوا وەرنـاگرێ، تەشـبیهی كـردوە بە كەسێكەوە، كە شـەیتان هەڵیدەفریوێنـێو سـەرگەردانو سـەراسـیمەی دەكـات !

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، لە نێوان زانایـاندا مشـتومڕێكـی زۆر دروسـت بـووەو چـەندان لاپەڕەی لەسـەر نووسـراون لە تەفسـیـرەكاندا، ئنجا لەوبـارەوە بەگشـتـی دوو بۆچـوون هـەن:

ڕای یەكـەم: دەڵێن: شـەیتانەكان مرۆڤـەكان تووشـی سـەرگەردانییو سەراسـیمەیی دەكـەنو، سـەری لـێ دەشـێوێنن واتە: تووشـی گونـاحو تـاوانـی دەكـەن.

ڕای دووەم: دەڵێن: نەخێـر بەڵكـو مەبەست ئەوەیـە كـە شـەیتانەكان ئـەو كەسـە شێت دەكـەنو بە كێوانی دەخەن.

دیـارە (الطبرانـي) لـە تەفسـیـرەكەی خۆیـدا هـەر دوو ڕایـەكان دێنـێ، دەڵـێ: (كَالَّـذِي زَيَّـنَت لَـهُ الشَّـيَاطِين هَـوَاهُ فَـهُوَ يَعْمَـلُ فِـي الأَرْضِ بِالْمَعَاصِـي، وَقِيـلَ مَعْنَـاهُ كَالَّـذِي اسْتَفرَسَـتْهُ الغـيلاَن فِـي الـمَهَامَةِ فَأَضَلّوه فَهُـوَ حَـائِرٌ)[1] واتـە: گوتوویـانە: وەك كەسێك كە شـەیتانەكان ئارەزووی خـۆی بـۆ جوان دەكـەن، وە لـە زەویـدا گونـاحو سـەرپێچـیی پێدەكـەن، وە گـوتراوە، مانـای ئـەم ڕسـتە قورئانییـە ئەوەیـە وەك كەسـێك كـە دێـوەزمەو خێـو (كـە شـەیتانێكە لەسـەر ڕێو باناندا دادەنیشـێو خەڵـكی دەترسـێنـێ) زیـانی پێدەگەیـەنێو گـومڕاو سەرگـەردانی دەكـات.

پێـنـجـەم / ئـایا ﴿ٱسۡتَهۡوَتۡهُ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾، لە چییەوە هاتوە؟ (هَوَى) بـە مانـای ئـارەزوو دێو بـە (أَهْـوَاء) كـۆدەكرێتەوە، (اتَّبَـعَ هَـوَاهُ) واتـە: بـەدوای ئـارەزووی خـۆی كـەوت، جا ئەگـەر فیعـلی لـێ دروست بكەی دەڵـێی: (هَوِيَ، يَهْـوَى) واتـە:

---

١) التفسیر الكبیـر: ج٣، ص٤٧.

ئارەزووی بۆ چوو، ئارەزووی بۆ دەچێ، بەڵام (هَوَى، يَهْوِي) واتە: (سَقَطَ، يَسْقُط)، کەوتەخوار، دەکەوێتەخوار، سبحان الله زمانی عەرەبی ئەو وردەکارییانەی زۆرن، بە یەك پیت، یان یەك حەرەکە، ماناکەی دەگۆڕێ.

چونکە دەگونجێ ﴿ ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴾، لە (هَوِيَ)ەوە هاتبێ، واتە: (هَوِيَ، يَهْوَى) ئارەزووی بۆ چوو، ئارەزووی بۆ دەچێ، واتە: شەیتانەکان وایانلێکرد ئارەزووی بۆ بچێ، وە دەشگونجێ لە (هَوَى، يَهْوِي)ەوە هاتبێ، واتە: کەوتە خوار، دەکەوێتە خوار، واتە: شەیتانەکان وایانلێکردوە، لە سەرێرا بیهێننە خوارێو بەریبدەنەوە.

وە ئیمام (فخر الدين الرازي) دەڵێ: خوای بێوێنە لە قورئان دا بۆی باسکردووین و فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ﴾ الحج، واتە: وە هەر کەسێك کە هاوبەش بۆ خوا دابنێ، وەك ئەوە وایە لە ئاسمان بکەوێتەوە خوارێ، باڵندە بیرفێنن، یاخود با بەریداتەوە، بەرەو شوێنێکی زۆر قووڵ، کەواتە: دەگونجێ ﴿ ٱسْتَهْوَتْهُ ﴾ لە: (هَوَى، يَهْوِي) یانی (سَقَطَ، يَسْقُط)ەوە هاتبێ.

# مەسەلەی ڕفێنرانی مرۆڤ لە لایەن جندەوە

یەکێك لەوانەی کە دەڵێن: مەبەست لە ﴿ ٱسْتَهْوَتْهُ ﴾ لێرەدا ڕفێنرانە لەلایەن شەیتانەوە (الشوكاني)یە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (أَي ذَهَبَت بِهِ مردة الجِن بَعْدَ أَنْ كَانَ بَيْنَ الإِنْس)[1]، واتە: شەیتانە هەلگەڕاوەکانی جند لەگەڵ خۆیان بردیانو سەریان لێ شێواند، دوای ئەوەی کە لەنێو خەڵکی بوو، چونکە ئەوانەی کە شێت دەبن، دوایی دەڵێن: لەگەڵ جندان بووین، لەگەڵ کاروان بووین، لەگەڵ خێڵ بووین، چووین گەرمێنو کوێستانمان کرد، شاییمان کرد، ئاوامان کرد.

هەروەها (الآلوسي)یش بە هەمان شێوە لە تەفسیرەکەی خۆیدا پشتگیری ئەم ڕایە دەکاتو دەڵێ: (وَلَيْسَ هَذَا مَبْنِياً عَلَى زَعَمَاتِ العَرَب، كَمَا زَعَمَ مَن اسْتَهْوَتهُ الشَّيَاطِين)[2]، واتە: وە ئەم ڕایە ( کە دەڵێ : شەیتان مرۆڤ دەڕفێنێ) لەسەر گومانەکانی عەرەب لە سەردەمی نەفامیی دا، بنیات نەنراوەو هەڵنەچنراوە، (کە پێیانوابووە شەیتانو جند دەست لە خەڵك دەوەشێنن)، وەك کەسانێك وا گومانیان بردوە، کە شەیتان هەڵیخەڵەتاندوون !

ئنجا با دوو زانای دیکەش بە نموونە بێنینەوە، کە بە پێچەوانەوەی (شوکانی)و (آلوسي)یەوە پێیان وایە شەیتانو خێوو دێوەزمە دەست لە خەڵك ناوەشێننو خەڵك شێت ناکەن، وە بە دەشتو کێوانی ناخەنو، ئەم ئایەتەش ئەو مانایە نادات، بەڵکو تەنیا ئەو مانای یەکەمەی هەیە کە (طبراني) هێنای کە دەڵێ: واتە: شەیتانەکان هەڵیدەخەڵەتێننو گوناحو تاوانی پێدەکەن، وای

١) فتح القدير ج٢، ص١٦٢.

٢) روح المعاني ج٤، ص٢٤٣.

لێدەکەن بەدوای ئارەزووی خۆی بکەوێ، نەك شێتی بکەنو بە دەشتو کێوانی بخەن:

١/ (الزمخشري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (وَهَذَا مَبنِيٌّ عَلَى مَا تَزْعُمهُ العَرَب وَتَعْتَقِدهُ: أَنَّ الجِنَّ تَسْتَهوي الإِنْسَان، وَالغِيلان تَسْتَولِي عَلَيْهِ، كَقَوْلِهِ: ﴿ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۝٢٧٥﴾البقرة)[1]، واتە: لێرەدا خوا بەپێی ئەوەی عەرەکان گومانیان بردوە، فەرمایشتی فەرمووە، عەرەبەکان لە سەردەمی نەفامیی دا عەقیدەیان وا بووە کە جندەکان خەڵك بە لای خۆیاندا هەڵدەخەڵەتێنن، وە دێوەزمەو خێو دوایی بەسەریاندا زاڵ دەبن، وە ئەمە وەك ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰا۟ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ...۝٢٧٥﴾، واتە: (سوود خۆر لە قیامەت دا) وەك کەسێکە کە شەیتان دەستی لێ دەوەشێنێ.

٢/ وە (محمد رشید رضا) لە تەفسیرەکەیدا هەمان رای (الزمخشري) دێنێو بەراستی دەزانێ، دوایی دەڵێ: (وَإِنَّمَا الجِنُّ مِنْ عَالَمِ الغَيْبِ لا نُصَدِّق مِنْ خَبَرِهِم إِلاَّ مَا أَثْبَتَهُ الشَّرْع، أَو مَا هُوَ فِي قُوَّتِهِ مِنْ دَلِيل الحِس أَو العَقْل، وَلَمْ يَثْبُت شَرْعَاً، وَلا عَقْلاً، ولا اخْتِبَاراً أَنَّ شَيَاطِين الجِنّ تَأْكُل النَّاسَ ولا أَنَّهَا تَظْهَر لَهُم فِي الفيافِي وَالقِفَار كَمَا كَانَت تَزْعُمُ العَرَب وَغَيْر العَرَب فِي طور الجَهْل وَالخُرَافَات)[2]، واتە: بێگومان جند لە جیهانی نادیارەو، ئێمە هیچ هەواڵێك بە راست نازانین دەربارەی جند، مەگەر ئەوەی شەرع چەسپاندبێتی، یان بە بەڵگەی بەرهەستو بە بەڵگەی عەقڵیی روونو راشکاو بۆمان دەربکەوێ، بە شێوەیەك کە وەك دەقی شەرعیی لەسەربێ، بەڵام نە بەپێی شەرعو، نە بەپێی عەقڵو نە بەپێی ئەزموونو تاقیکردنەوە، ئەمە نەچەسپاوە، کە شەیتانەکان { ئەو دەڵێ (تأكل الناس) خەڵك بخۆن، بەڵام دەبێ هەڵەی

---

١) الکشاف للزمخشري ج٢، ص٢٨. دار النشر: دار إحیاء التراث العربي، بیروت، عدد الأجزاء: ٤، تحقیق: عبدالرزاق المهدي.

٢) تفسیر القرآن الحکیم ج٧، ص٥٢٨.

چاپی بۆو (تَقْتُل الناس) بێ:} خەڵك بكوژن، هەروەها نەچەسپاوە لە دەشتو بیابان دا، خێوو دێوەزمە خۆیان پێشانی خەڵكی بدەن، وەك عەرەبو غەیری عەرەبیش لە سەردەمی نەفامییو ئەفسانەدا، گومانیان وابووە.

ئەوەی منیش بۆم دەركەوتوە، ئەوەیە كە بۆ تەفسیری ئایەتەكە ڕای یەكەمی (طبراني) بەهێزترە كە مەبەست گومڕاكردنو گوناه پێكردنی شەیتانەكانە بۆ مرۆڤ، نەك ڕفاندنیان، بەڵێ جاری وایە خەڵك شتی سەیر دەبینێ، وە دەگونجێ جندو شەیتەكان بە شێوەیەك لە شێوەكان خۆیان بخەنە پێش چاوی مرۆڤانو بیانبینن، بەڵام ئەوەش لە كاتێكدا دەبێ كە مرۆڤ بۆخۆی دەرفەت دەدات، بۆ وێنە: ئەگەر ترسێكی زۆری هەبێ، كە ڕەنگە لەو كاتە جند بواریان هەبێ خۆیانی پێ پێشان بدەن، چونكە ئەوە زۆر بیستراوەو دەبیسترێ، یان گوێی لە دەنگێك دەبێ كە ئەمەش زۆر بووەو هەردووكیشان دەگونجێن، بەڵام ئەوە نیە كە جند بیگرنو شێتی بكەنو، بە دەشتاییو چۆڵایی بخەن، چونكە خوا ئەو دەستەڵاتەی بە جندو شەیتانەكان نەداوە.

بەڵگەشم لەوبارەوە ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {لا عَدْوَى، وَ طِيَرَةَ، وَلا غُولَ}[1]، واتە: نە لە (نەخۆشیی) یەكدی گرتنەوە هەیە، نە ڕەشبینییو گەشبینیی هەیە[2]، وە خێوو دێوەزمە نیە (كە خۆ پێشانی خەڵك بدەنو شێتی بكەن).

(النووي) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا، دەڵێ: مەبەست پێی ئەوەیە كە نەخۆشیی بەبێ ویستی خوا ناگوازرێتەوە، واتە: ئەگەر خوا نەیەوێ، كەسێك نەخۆشیی لە كەسێكی دی ناگرێتەوە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆی فەرموویەتی: {لاَ يُورَدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ}[3]، واتە: با حوشتری نەخۆش نەبرێتە هی ساغ.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤١٤٩)، ومُسْلِمٌ برقم: (٥٧٥٧).

٢) واتە: ئەو ڕاست نیە كە ئەگەر باڵندە بە لای ڕاستدا بفڕێ، باشبێ، بەڵام ئەگەر بە لای چەپدا بفڕێ، خراپ بێ، یان ئەگەر كەسێك دووجار پژمی باشبێو، ئەگەر یەكجار پژمی خراپ بێ.

٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٢٥٢)، ومُسْلِمٌ برقم: (٥٧٥٢)، وَاِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١١٥).

هەروەها فەرموویەتی: {فِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ فِرَارَكَ مِنَ الأَسَدِ}[١]، واتە: لە بابای گول (گەڕ) ڕابکە، وەك چۆن لە شێر ڕادەكەی.

مانای وایە گولیی نەخۆشییەکە دەگوازرێتەوە، ئەگەرنا وای نەدەفەرموو، بەڵام لە فەرموودەی (لا عَدْوَى) مەبەستی ئەوەیە کە بەبێ مۆڵەتو ویستی خوا، لە یەکدی ناگرنەوە.

ئنجا (النووي) دەڵێ: (قَالَ جمهُور العُلَمَاء: كَانَتِ العَرَب تَزْعُمُ أَنَّ الغِيلان في الفَلوات وَهِيَ جِنْس مِنَ الشَّيَاطِين تَتراءى للنَّاس وَتَتَغَوَّل لَهُمْ تغوّلاً فتُضِلّهم عَن الطريق فتهلكهم، فَأَبْطَلَ النَّبِيّ ﷺ ذلك)[٢]، واتە: زۆربەی زانایان دەڵێن: عەرەب لە سەردەمی نەفامیی دا پێیانوابووە، کە دێوەزمەو خێوەکان کە لە ـنسی شەیتانەکانن (هەندێك گوتوویانە: ئەو شەیتانانەن کە دەچن بۆ ئاسمان تا گوێ لە فریشتەکان بگرنو زانیارییان لێ بدزن، فریشتەکانیش تیربارانیان دەکەن بە ئاگر) لە دەشتو چۆڵایی یان دا دەبنە خێوو دێوەزمەو، لەسەر ڕێو بانان دادەنیشنو، خۆیان پێشانی خەڵکی دەدەن، بە شێوەیەکی وا کە لێیان بترسێنو ڕێیان لێ تێکبچێو، لە بەینیان دەبەن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی هەڵوەشاندەوە.

بەڵام بێگومان جند دەتوانێ بچێتە سەر شێوەی شتێكو خۆی پێشانی خەڵك بداتن لەوبارەوەش ئەم فەرموودە هەیە کە لە (صحيح مسلم)دا هاتوە[٣]: گەنجێکی ئەنصارپی کە تازە ژنی هێناوە، لە جەنگی خەندەك دا، داوا لە پێغەمبەری خوا دەکات، مۆڵەتی بدات، بچێتەوە ماڵ، ئەویش مۆڵەتی پێدەداتو پێی دەفەرموێ: ئاگات لە خۆت بێ ! جوولەکەکان زیانت لێ نەدەن، کە دەچێتەوە دەبینێ وا خێزانەکەی لە پێش دەرگایەو ڕاوەستاوە، گەنجەکەش گومانی خراپی پێدەباو، ڕمەکەی لێ بەرز دەکاتەوە، بۆئەوەی ئەزیەتی بدات، خێزانەکەشی

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٧٢٠) قَالَ الشيخ الأرناؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَإِبْنُ أَبي شَيْبَة برقم: (٢٥٠٣١) والبيهقي في (الصغرى) برقم: (١٩٧٠).

٢) شرح صحيح مسلم للنووي: ج٧، ص٥٢٤.

٣) بڕوانە: (صحيح مسلم): ٥٨٠٠، كتاب الحيوان، باب قتل الحيَات وغيرها.

دەڵێ: ئارامبگرە، وەرە تەماشای ژووری بكە، كە دەچێ دەبینێ: مارێك پاپۆلكەی بەستووەو خۆی خڕ كردۆتەوە، خێزانەكەی گوتی: لە ترسی ئەوە هاتبوومە پێش دەرگا، گەنجەكەش ڕمەكە لە مارەكە دەداو مارەكەش خۆی بە گەنجەكە دادا، (دەڵێ:) نەمانزانی گەنجەكە پێشتر مرد، یان مارەكە پێشێ تۆپی، دەڵێ: دوایی پێغەمبەری خوا كە هەواڵەكەی پێگەیشتەوە فەرمووی: ﴿إن بالمدينة جناً قد أسلموا، فإذا رأيتم منهم شيئاً، فآذنوه ثلاثة أيامٍ، فإن لكم بعد ذلك، فاقتلوه، فإنّما هو شيطان﴾ صحيح مسلم: ٥٨٠٠ و سنن أبي داود: ٥٢٥٦، و سنن الترمذي: ١٤٨٤.

واتە: لە مەدینەدا هەندێك جند هەن مسوڵمان بوون، ئنجا ئەگەر شتێكتان لێ دیتن، سێ ڕۆژان مۆڵەتیان بدەنو ئاگاداریان بكەنەوە، بڕۆن، بەڵام ئەگەر دوای ئەوە خۆی پێشانتان دا، بیكوژن، چونكە ئەوە شەیتانە، واتە: جندێكی كافرە).

كەواتە: بۆ پێكەوە گونجاندنی فەرمایشتەكەو، ئەوەش كە خەڵك بە ئەزموون بینیویەتی، دەبێ بڵێین: خێوو دێوەزمە دەتوانن خۆ پێشانی خەڵك بدەنو ترسیان بخەنە دڵ، بەڵام ناتوانن دەستیان لێ بوەشێننو ئەزیەتیان بدەنو شێتو حۆلیان بكەن.

<u>**مەسەلەی شەشەم:**</u> كە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾﴾ لێرەدا خوای بێ هاوتا چەند شتێك بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، كە بە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانیان بفەرموێ:

١) ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ﴾، بڵێ: بێگومان هەر ڕێنمایی خوا، ڕێنماییە، وشەی (هدى) لێرەدا بەمانای ڕێنماییو بەرنامەیەكە، كە مرۆڤ پێی بگاتە ئامانج، یانی: ڕێبازو بەرنامەیەك كە بە ئامانج گەیەنەر بێ، تەنیا ئەوەیە كە خوای كاربەجێ ناردوویەتی.

٢) ﴿ وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، وە فەرمانمان پێکراوە کە: ملکەچ بین بۆ پەروەردگاری جیهانییان، مادام ڕێنماییو بەرنامەی بە ئامانج گەیەنەر، تەنیا لە خواوە بێ، کەواتە: دەبێ هەر ملکەچی وی بینو، خۆمان تەسلیمی بەرنامەی وی بکەین، وە مادام سوور دەزانی: ئەو ڕێیە بە ئامانجت دەگەیەنێ، عەقڵو مەنتیق وا دەخوازێ، بەو ڕێیەدا بڕۆی.

٣) ﴿ وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، وە فەرمانمان پێکراوە کە نوێژ بەرپا بکەین، سەرەتا هیدایەتی خوا وەردەگری، ئنجا بۆ خوا ملکەچ دەبی، کە ملکەچ بووی پاشان نوێژ دەکەی، واتە: نوێژ بەرجەستەکەرترین شێوەی ملکەچییە بۆ خوا، وە وەك هیدایەتی خوا لە ئەنجامدانی نوێژدا بەرجەستە دەبێ، لە هیچ شتێکی دیکەدا ئاوا بەرجەستە نابێ، لەبارەی گرنگییو گەورەیی نوێژەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاتُهُ}[(١)]، واتە: بێگومان یەکەمین شتێك کە بەندە لە کردەوەکانی لە ڕۆژی دوایی دا لێپرسینەوەی لەسەری لەگەڵدا دەکرێ، نوێژەکەیەتی.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ﴾[(٢)] واتە: ئەو پەیمانەی کە لە نێوان ئێمەو کافراندا هەیە، نوێژە، هەرکەسێك نوێژی نەکرد، ئەوە کوفری کردوە.

٤) ﴿ وَٱتَّقُوهُ ﴾، وە فەرمانمان پێکراوە: پارێز بکەین، لەڕاستییدا پارێزکاریی بەرهەمی نوێژە، هەر کەسێك بە تەواویی ئەهلی نوێژ بێ، تەقوای تێدا پەیدا دەبێ.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٩٤٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٨٦٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٤١٣)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٦) وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (١٤٢٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٩٦٥) وَقَالَ: صَحِيح الإسناد، وَالدَّارَمِي برقم: (١٣٥٥).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٩٨٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٢١)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح غريب، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٣)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (١٠٧٩)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (١٤٥٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (١١) وَقَالَ: صَحِيح الإسناد، وَإِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٠٣٩٦)، وَالدَّيْلَمِيُّ برقم: (٤٢٥٧) وَصَحَّحَهُ كُل من المناوي والعراقي والألباني.

٥) ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾، وە فەرمانمان پێکراوە ئەو ڕاستییە بزانین کە: کۆکرانەوەو خڕکرانەوەمان لە ڕۆژی دوایی دا، هەر بۆ لای خوایە، کە لەو ڕۆژەدا لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکات.

سُبْحَانَ اللّٰه! ئەم ئایەتانە - هەروەها سەرجەم ئایەتەکانی قورئان - وەك ئاڵقەی زنجیر وان: سەرەتا هیدایەت هەر هی خوایە، بۆیە دەبێ ملکەچ بین بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان، کە هیدایەتو بەرنامەی ناردوە، وە ملکەچییمان بۆ خوا وا دەخوازێ کە نوێژ بکەین، وە لە پێش هەموو شتێکدا نوێژ وامان لێدەکات ئەهلی تەقوا بین، وە سەرەنجامیش، بڕوامان وابێ کە بۆ لای خوا کۆدەکرێینەوە، بۆ لێپرسینەوەو پاداشتو سزا.

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِۚ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا بە پێنج لە سیفەتە هەرە گەورەکانی، پێناسەی خۆی دەکات، لەبەرئەوەی ئەم سوورەتە هەمووی باسی خوا بەیەکگرتنە، بۆیە هەر جارە خوا بە جۆرێك دەستی مرۆڤ دەگرێو دەیگێڕێ، تاکو خۆی پێ بناسێنێ، جارێك بە مێژوودا دەیگێڕێ، جارێك بە دەروونیی خۆیدا، جارێکی دی بە ئاسۆییەکاندا، جارێك بەنێو نازونیعمەتەکاندا، جارێك بە وردبوونەوە لە ئایەتەکانی قورئاندا، تاکو وای لێ بکات باش خوا بناسێ، ئێستاش با سەرنج بدەین:

# ناساندنی خوا لە سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی

١/ ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾، خـوا ئـەو کەسەیە کە ئاسمانەکانو زەوی بە هەق دروستکردوون، واتە: ئەم بوونەوەرە کە هاتۆتە دی بە گاڵتەو بێ حیکمەت نەهێنراوەتە دی، لە جێیەکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾ المؤمنون، واتە: ئایا پێتانوایە بێ حیکمەت ئێوەمان دروست کردوەو، بۆ لای ئێمە ناگێڕڕێنەوە؟ بەرزیی بۆ خوای پادشای هەق، یانی خوایەك پادشاو خاوەنی بوونەوەر بێ، پاکیی و بەرزی بۆ وی، کە بە بێ حیکمەت کارێك بکات.

٢/ ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ﴾، واتە: فەرمایشتی خوا هەقە، ئەو کاتەی دەفەرموێ: ببە، دەبێ، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: بە (كُن فَيَكُونُ)ێك شتەکەی کرد، (كُن) واتە: ببە، (فَيَكُونُ) یەکسەر دەبێ، جا ئەوە دیارە تەعبیرێکە، خوای بەدیهێنەر دەیەوێ لە عەقڵی ئێمەی نزیك بکاتەوە، ئەگەرنا بۆ خوا هەر پێویست ناکات فەرمایشت بشفەرموێ، بەڵکو هەر کە ویستی شتێك ببێ، یەکسەر دەبێ، بەڵام مەبەستی ئەوەیە کە ئێمە تێبگەیەنێ، خوا چەندە بە خێرایی شتەکان دەکات.

ئنجا ئایا ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکە؟ لە وەڵام دا دەڵێین: خوا ﷻ چ ئەو ڕۆژەی بوونەوەری دروستکرد، چ ئەو ڕۆژەی بوونەوەر تێکدەدات، چ ئەو ڕۆژەی ئێمە دەمرێنێ، وە چ ئەو ڕۆژەی زیندوومان دەکاتەوە، وە چ ئەو ڕۆژەی بەهەشتو دۆزەخ دێنە گۆڕێ، بۆ دابەشکردنی مرۆڤایەتیی بەسەریاندا، بەپێی ئیمانهێنانیانو کافربوونیان، لە هەموو قۆناغەکان دا، هەر کاتێك خوا ﷻ

بیەوێ شتێك ببێ، یەكسەر دەبێ، وە فەرمایشتەكەی هەقەو لە گوماندا مەبن.

٣/ ﴿ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ﴾، وە لەو ڕۆژەدا كە فوو بە كەرەنادا دەكرێ، موڵك هەر هی خوایە، هەڵبەتە هەموو دەمێ هەر وایە، بەڵام ئەو كاتە زیاتر بەرجەستە دەبێ، ئێستا پەردەیەكی بەسەرەوەیە، ئەوەی كە بیەوێ ئیمان نەهێنێ، دەتوانێ ئیمان نەهێنێ، بەڵام لەوێ ئەگەر بشیەوێ ئیمان نەهێنێ، ناتوانێ ئیمان نەهێنێ: ئەوە خوایە! ئەوە فریشتەیە! ئەوە دۆزەخو، ئەوە بەهەشتە! هەموو شتەكان بە چاوی خۆی دەبینێ، بەڵام لێرە ڕەنگە بواری هەبێ بڵێ: كوا من خوا نابینم! فریشتان نابینم؟ كوا كێ لە دۆزەخ هاتۆتەوە؟ كێ لە بەهەشت هاتۆتەوە؟ وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: مرۆڤ (ئەگەر خۆی لە گێلی بدات)، بیانووی هەیە، بەڵام لە قیامەت دا، هیچ بواری نیە، تاقیكردنەوە بەسەر دەچێ، بۆیە خوای باڵادەست لە سوورەتی (ق)دا بە ئینسانی كافر دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: تۆ بێئاگابووی لەمە (لە سەرەمەرگدا هەموو كەس فریشتان دەبینێ، ئیمانداران فریشتەكان بە شێوەیەكی ڕووخۆش و جوان دەبینن، كافرەكانیش بە شێوەیەكی ناشیرین و گرژو تووڕە) پەردەكەمان لەسەرت لادا، ئێستا چاوت زۆر چاك و زۆر تیژ دەبینێ.

لە چەند شوێنێكی قورئاندا، خوای پەنهانزان باسی كەرەنای فەرمووە، بۆ وێنە:

١) ﴿ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِى بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ ﴾الكهف.

٢) ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ ﴾طه.

٣) ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ المؤمنون.

٤) ﴿ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾النمـــل.

٥) ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ ﴾يـس.

٦) ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ ﴾النبـــأ.

**هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ لە چەند فەرمایشتێکی دا ئاماژەی پێکردوە، بۆ وێنــە:**

**فەرمایشــتی یەکــەم : ﴿عَنْ عَبْـدِ اللَّهِ بْنِ عَمْـرٍو رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَ: قَالَ أَعْـرَابِـيٌّ: يَا رَسُـولَ اللَّهِ! مَا الصُّـورُ؟ قَالَ: قَـرْنٌ يُنْفَخُ فِيــهِ﴾[1]، واتــە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەمرِ خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵێ: (پیـاوێکـی) دەشتەکیی، خێڵەکیی گوتـی: ئـەی پێغـەمبەری خـوا ! صــوور چییــە؟ فـەرمووی: قۆچێکـە فــووی پێـدا دەکــرێ.**

**بـە کـوردی (بـووق)و (کەرەنــا)ی پــێ دەگـوترێ، لـە شـێوەی قـۆچ دایــە، کـە فــووی پێــدا دەکــرێ، دەنگێکـی زۆر گـەورەی لێـوە دێ، دووجـاریش فـووی پێـدا دەکرێ، جـاری یەکـەم بۆئـەوەی ئەم بوونەوەرە تێکبـچێ، جـاری دووەم بۆئەوەی زیندووبنــەوە، وەك خـوا ﷻ فەرموویــەتی:** ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الزمـر.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٥٠٧) واللَّفْظُ لَهُ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٤٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٣٠) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٨٧٠) وَقَالَ: صَحِيح الإِسنَاد، وَالبَيْهَقِيُّ فِي الشعب برقم: (٣٥٠)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٩٨)، وَالبَزَّار برقم: (٢٤٨١)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣١٢)، قَالَ شعيب الأرنؤوط: إِسنادُهُ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

دیارە كەڕەنا (صور)یش لەلایەن یەكێك لە فریشتە بەڕێزەكانی خواوە فووی پێدا دەكرێ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە.

فەرمایشتی دووەم: ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: كَيْفَ أَنْعَمُ وَصَاحِبُ الصُّورِ قَدْ الْتَقَمَ الصُّورَ وَحَنَى جَبْهَتَهُ وَأَصْغَى سَمْعَهُ يَنْتَظِرُ مَتَى يُؤْمَرُ﴾[1]، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: چۆن دڵخۆش بم، لە كاتێكدا خاوەنی كەڕەنا (بووق)، كەڕەنا بە دەمیەوەیەو نێوچەوانیشی نووشتاندۆتەوە، چاوەڕێ دەكات هەر فەرمانی پێ بكرێو، فووی پێدا بكات[2].

٤/ ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، زانای پەنهانو ئاشكرایە، ئەوەی بە ئاشكرا دەیكەنو دەیڵێن، وە ئەوەش كە بە نهێنییو پەنهانیی دەیكەنو دەیڵێن، خوای زانا هەمووی دەزانێ.

٥/ ﴿ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، وە خوا كاربەجێی شارەزایە[3].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٧١٤)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (٨٨٦)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (١٠٨٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٣١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٨٦٧٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٢٣) تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْن.

٢) شایانی باسە ناوی ئەو فریشتەیە لە قورئانو سوننەت دا نەهاتووە، بەڵام لە هەندێك شوێنەوار (أَثَر)دا بە (إسرافيل) ناوزەد كراوەو، ئەوەش جێی متمانە نیە.

٣) دەربارەی كۆی باسو بابەتەكانی ڕۆژی دوایی دەتوانی سەرنجی بەرگی پێنجەمی كتێبی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله عز وجل)و بەرگی پێنجەمی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی...) بدەی.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەڤدە ئایەت پێکدێ، لە ئایەتی (٧٤ تا ٩٠)، تەوەری سەرەکییش بریتیە لە گێڕانەوەی وتووێژی ئیبراهیم لەگەڵ بابیو گەلەکەی دا، لەبارەی پەرستنی بتو صەنەمەکانو، ئەستێرەو مانگو خۆر، کە ئیبراهیم ئاوابوونیان دەکاتە بەڵگەی پەروەردگار نەبوونیانو، پاشان ئیمانو هەڵوێستی خۆی بە ڕوونیی بۆ گەلەکەیو بابی ڕادەگەیەنێ، کە تەنیا خوای بەدیهێنەر بە پەرستراوو پەروەردگاری خۆی دەزانێ.

پاشان باسی پووچیی بیرۆکەی شیرك دەکات، ئنجا دوایی خوای کاربەجێ وێڕای نووح ناوی ژمارەیەك لە پێغەمبەران دێنێ، کە سەرجەم شازدە کەسن، وەك وەچەی ئیبراهیمو پەیڕەوانی ڕێبازەکەی.

وە سەرەنجام خوا باسی ڕێبازی ڕاستی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەکاتو ڕایدەگەیەنێ: کە کاکڵەکەی بریتیە لە خوا بە یەکگرتنو هاوبەش بۆ دانەنانی، وە ڕاشیدەگەیەنێ: کە ئەگەر کافرانی هەر ڕۆژگارێك، بێبڕوابن بە پێغەمبەرانی خوا، ئەوە خوا پەکی ناکەوێو، کەسانی دیکە ئیمانی پێ دێنن.

وە لە کۆتاییدا خوا فەرمان بە پێغەمبەری (علیه الصلاة والسلام) دەکات: کە دوای ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بکەوێو، بە خەڵکیش بفەرموێ: کە هیچ کرێو پاداشتێکیان لێ چاوەڕوان ناکات.

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۖ إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَـٰلٍ
مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَـٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ
ٱلْـَٔافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَـٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى
لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَـٰذَا رَبِّى هَـٰذَآ
أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَـٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى
فَطَرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ۚ
قَالَ أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى
شَيْـًٔا ۗ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ
أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا ۚ
فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم
بِظُلْمٍ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَـٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ
قَوْمِهِۦ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَـٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ
وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ
وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ
وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ
وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّـٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَـٰهُمْ
وَهَدَيْنَـٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ

وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ
وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ
لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾﴾.

## مانای وشــه بە وشــەی ئایەتەکـان

(( وە (یادبکـەوە) کاتێـك ئیبـڕاهیم بـە ئـازەری بـابی گـوت: ئایـا چـەند بتێـك بـە پەرسـتـراوان دەگـری، بێگـومان مـن خـۆتو کۆمـەڵەکـەت لـە گومڕاییەکـی ڕوونـدا دەبیـنـم ﴿٧٤﴾ وە هـەر بـەو شـێوەیەش مولـکی فـراوانو سـەرسـوڕهێنەری ئاسـمانەکانو زەوییمـان پێشـانی ئیبـڕاهیم دا (تاکـو بەرچـاوی ڕۆشـن بـێ) وە بۆئـەوەی لـە بـڕوا پتـەوان بـێ ﴿٧٥﴾ ئـنـجا کاتێـك شـەوگار دایپۆشـیی ئەسـتێرەیەکی دی، گـوتی: ئـەوە پەروەردگـارمە، بـەڵام کـاتێك ئـاوا بـوو گـوتی: مـن ئـاوابووانم خۆشـناوێن ﴿٧٦﴾ ئـنـجا کاتێـك مـانگی بـە شـۆقی (دڕ بـە تـاریکی شـەوی دەری) بیـنـی، گوتـی: ئەمـە پەروەردگـارمە، بـەڵام کـاتێك ئـاوا بـوو، گـوتی: ئەگـەر بێـتو پـەروەردگارم (کـە بـە فیطرەتـم دەیناسم) ڕێنماییم نەکات، بە دڵنیایی یـەوە لـە کۆمەڵـی سـەرگەردانان دەبـم ﴿٧٧﴾ ئـنـجا کاتێـك خـۆری پرشـنگداری بینـی، گـوتی: ئەمـە پەروەردگارمـە، ئەمـە (لـە هەموویان) گـەورەترە، بـەڵام کـاتێك (ئـەویش) ئـاوا بـوو، گـوتی: ئـەی گەلەکـەم ! مـن دوورو بەریيم لەو شـتانەی ئێوە دەیانکەنە هاوبەش (بۆ خـوا) ﴿٧٨﴾ بێگومان من پـاکیی‌و چاکیی ڕووی (دڵی) خۆمم کـردە ئـەو کەسـەی کـە ئاسـمانەکانو زەوی وەدیـهێنـاون، وە من لە هـاوبەش (بـۆ خـوا) دانـەران نـیم ﴿٧٩﴾ وە گەلەکـەی شـەڕەقسـەیان لەگەڵ کـرد، گوتی: ئایا لە حاڵێکدا کە خـوا ڕێنمایی کردووم، لە بـارەی ویـەوە، شـەڕە قسـەم لەگـەڵ دەکـەن؟ وە من لەو شـتانە ناترسـم کە دەیانکـەنە هاوبەشی (خـوا) مەگەر پەروەردگارم شـتێکی بـوێ (تووشـم بـێ)، زانیـاریی پەروەردگـارم هـەموو شـتێکی گرتۆتـەوە، ئایـا

بیرناکەنەوە (و ڕاستییە خوارسکەکان ناهێننەوە یادتان؟) ﴿٨٠﴾ ئنجا ئایا چۆن من لەوە بترسم کە کردووتانەتە هاوبەش (ی خوا) لە حاڵێکدا کە ئێوە لە (سەرەنجامی) ئەوە ناترسن، کە شتێکتان کردۆتە هاوبەشی خوا، بەڵگەی لەسەر دانەبەزاندۆتە سەرتان، جا ئایا کام لەو دوو کۆمەڵە (خواپەرستانو هاوبەش پەرستان) شایستەترن بە دڵنیاییو هێمنیی، ئەگەر ئێوە (ڕاستیی) بزانن ﴿٨١﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو بڕوایەکەیان ئاوێتەی ستەم نەکردوە، ئا ئەوانە هێمنییان بۆ هەیەو، هەر ئەوانەش ڕێنماییکراوو ڕێی ڕاست گرتوون ﴿٨٢﴾ وە ئا ئەوە بەڵگەی ئێمە بوو کە لە بەرانبەر گەلەکەیدا بە ئیبراهیمان دابوو، هەر کەسێك بمانەوێ بە چەندان پلە بەرزی دەکەینەوەو، بێگومان پەروەردگارت کاربەجێی زانایە ﴿٨٣﴾ وە ئیسحاقو یەعقووبمان (بە ئیبراهیم) بەخشینو، هەر کامێکیشیانمان ڕێنمایی کرد، وە نووحیشمان پێشتر ڕێنمایی کردبووو خستبووە سەر ڕێی ڕاست، وە داوودو سولەیمانو ئەییوبو یوسفو مووساو هاروونیش لە وەچەی وی بوون، وە بەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ﴿٨٤﴾ وە زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاسیش (لە وەچەی وی بوون) هەر کامێکیان لە ساڵحان بوون ﴿٨٥﴾ هەروەها ئیسماعیلو ئەلیەسەعو یونوسو لووطیش (هەر لە وەچەی وی بوون) وە هەر کامێکیانمان (لە ڕۆژگاری خۆیدا) بەسەر جیهانییاندا هەڵبژاردبوو ﴿٨٦﴾ وە (هەر لە وەچەی وی بوون، زۆرێك) لە باوو باپیرانیانو وەچەیانو برایەکانیان، وە هەڵمانبژاردنو، بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنماییمان کردن ﴿٨٧﴾ ئا ئەوە ڕێنمایی خوایە، هەر کەسێکی بوێ لە بەندەکانی، پێی دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ، وە ئەگەر هاوبەشیان دانابایە (بۆ خوا) ئەوەی کە دەیانکرد (لە کردەوە باشەکانیان) لێیان هەڵدەوەشایەوە ﴿٨٨﴾ ئا ئەوانە (کە ناویان هێنرا) کەسانێك بوون کە کتێبو حیکمەتو پێغەمبەرایەتییمان پێیاندا، ئنجا ئەگەر ئەوانە (کافرەکانی ڕۆژگاری ئێوە) بڕوایان پێنەکەن، ئەوە کۆمەڵێکمان لێ ڕاسپاردوون، کە پێیان بێبڕوانین ﴿٨٩﴾ ئا ئەو (پێغەمبەر)انە، کەسانێکن کە خوا ڕاستە ڕێی کردوون، دەجا تۆش ڕێی ڕاستی وان بکە سەرمەشق، بڵێ: هیچ پاداشتێکتان لێ داوا ناکەم، ئەم (قورئان)ە، بێجگە لە بیرخەرەوە بۆ جیهانییان، هیچی دیکە نییە ﴿٩٠﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ): (المُلْك: هُوَ التَصَرّفُ بالأَمْرِ وَالنَّهي في الجُمهُور، وَالمَلَكُوتُ مُخْتَص بمُلْكِ الله تَعَالَى، وَهُوَ مَصْدَرُ (مَلَك) أُدْخِلَت فِيهِ التَّاء، نحو: رَحَمُوت، وَرَهَبُوت)، وشەی (مُلْك) بریتیە لە خەڵك خستنە ژێر ركێفی خۆت، بە جۆرێك كە بتوانی فەرمانیان بەسەردا بكەی‌و نەهییان لێبكەی، بەڵام (مَلَكُوت) تایبەتە بە موڵكی خوای بەرزەوە، كە ئەویش لە ئەسڵدا لە (مَلَك)ەوە هاتوە، (مَلَكَ يَمْلِكُ مُلْكاً)، بەڵام (ت)و (و)ی لێ زیادكراون، وەك: (رَحَمُوت) و (رَهَبُوت) بۆئەوەی ماناكەی بەهێزتر بێ، (مَلَكُوت) واتە: موڵكی فراوان، یان موڵكی سەرسوڕهێنەر تەنیا هی خوایە، بۆیەش كە تەنیا بۆ خوا بەكاردێ.

(ٱلْمُوقِنِينَ ): (اليَقِينُ: مِنْ صِفَةِ العِلْمِ فَوْقَ المَعْرِفَةِ وَالدِّرَايَةِ وَأَخواتها، وَيُقَالُ: عِلْمٌ يَقِين، وَهُوَ سُكُونُ الفَهْمِ مَعَ ثَبَاتِ الحُكْمِ)، (يَقِين) لە سیفەتی زانیارییە، لە سەرووی زانست‌و زانین‌و شێوەكانیانەوەیە، دەگوترێ: (عِلْمٌ يَقِين) واتە: زانیارییەكی جێی دڵنیایی، (يَقِين) بریتیە لەوە كە بڕیارێكت داوەو، عەقڵیشت لەسەری دامەزراوە، واتە: دوودڵیی‌و لەرەلەری تێدانیە، لە ئەسڵدا لەوەوە هاتوە: (يَقَنَ المَاءُ: أَي ثَبَتَ وَرَكَدَ)، واتە: ئاوەكە تەواو ڕاوەستاوە، بۆ وێنە: من دەزانم ئەوەی لە پێش دەستمن: دەفتەرو قەڵەمن، كە دوو شتی لێك جیان، واتە: زانیاریم تەواو چەسپاوە، لەسەر ئەو دوو شتە، زیادو كەم ناكات، ئەوە پێی دەگوترێ: (يَقِين).

(جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ ): (أَصْلُ الجَنّ: سَتْرُ الشَّيءِ عَنِ الحَاسَةِ، يُقَالُ جَنَّهُ اللَّيل وَأَجَنَّه وَجَنَّ عَلَيْهِ، جَنَّهُ سَتَره، وَأَجَنَّهُ جَعَلَ لَهُ مَا يُجنُّهُ، وَجَنَّ عَلَيْهِ كَذَا: سَتَرَ عَلَيْهِ)، وشەی (جَنّ) لە ئەسڵدا بە مانای داپۆشین دێ، ئەو شتانەی كە لە هەستەوەرەكان دادەپۆشرێ، كۆرپەلە لەبەرئەوەی نابینرێ، پێی دەگوترێ:

(جَـنين)، وە جنـد لەبەرئـەوەی نـابینرێ، پێـی دەگـوترێ (جِـن)، وە بەهەشـت لەبەرئـەوەی درختـەکـانی زۆر چـڕو پـڕنو زەوییەکـەی نـابینرێ، پێـی دەگـوترێ: (جَنَّـة)، وە شێت لەبەرئەوەی عەقڵەکەی داپۆشراوە، پێـی دەگـوترێ: (مَجنُون)، جا (جَنَّـهُ اللَّيل وَأَجَنَّه وَجَنَّ عَلَيْهِ) هەرسێکی بە مانای: شـەوگار داپیۆشـی، دێ.

(كَوْكَبًا): (الكَوْكَـبُ: الـنَّجْمُ، وَكَوْكَبَـة مِثْـلُ: بَيَـاضُ وَبَيَاضَـة، وَعَجُـوز وَعَجُـوزَة)، ئێسـتا لە زاراوی گەردووونناسییو فیزیادا دەڵـێن: (كـوكـب) بریتیـــە لـە خڕۆکە کـە تیشـکی نیـە، وە (الـنجم) بریتیـــە لـەوەی کـە تیشـکی هـەبێ، بـەڵام لـە بـەکارهێنانی قورئانـدا، وە لـە زمـانی عەرەبیـدا (كَوْكَـبُ ونجْـم) بـە یـەك واتـا بەکارهـاتوون، وەك: (بَيـاضُ وَبَيَاضَـة) هـەردووکی بـە مانـای سـپی دێ، یـان وەك: (عَجُـوز وَعَجُـوزَة) هـەردووکـی واتـە: پیـــرەژن، بــە هــەمان شـێوە (كَوْكَـب وَكَوْكَبَة) هەردووکیـان بە مانـای ئەسـتێرە دێـن.

(أَفَلَ): (الأُفـوُلُ: غَيْبُوبَـةُ النَيِّـراتِ كَالقَمَـرَيْنِ وَالنُّجُـوم)، أُفُـول: بریتیـە لـە ئـاوابوونی ئەوانەی کە تیشـکیان هـەیە، وەك: مـانگـو خـۆرو ئەسـتێرەکان.

(بَازِغًـا): (طَالِـعاً مُنْتَشِـر الضَّـوء)، (بازغـاً) واتـە: هـەڵاتووەو تیشـکەکەی بڵاوبۆتـەوە، دڕی داوە بـە تاریکـیی، دەڵـێ: (مِـن بَـزَغَ البيطَـار الدَّابَّـة: أَسـالَ دَمَهـا، فَبَـزَغ هُـوَ أي: سـال)، (بیطَـار) کاتێك وڵاخێك پشتی، یان قاچـی دەقەڵێشـێ، یـان خـوێنی لـێ دێ، پێـی دەگوتـرێ: (بَـزَغ).

(حَنِيفًا): (الحنَفُ: هُوَ مَيْـلٌ عَنِ الضَّـلالِ إلـى الإِسْـتِقَامَةِ، عَكْسُ الجَنَـف: وهُـوَ مَيْلٌ عَنِ الإِسْـتِقَامَةِ إلـى الضَّـلال، والحنَـفُ: هُـوَ الـمَائِلُ إلى ذَلِـك). واتـە: (حَنَـفُ) بریتیـــە لــە مــەیلکردنو بەلاداچــوون لــە گومڕاییــەوە بــەرەو ڕاســتە ڕێگـا، بـە پێچـەوانەوەی (جَنَـف)ەوە، وشـەی (جَنَـف) بریتیـە لـە مەیلکـردنی کەسـێك بـۆ وازهـێنـان لە ڕاسـتە شـەقامی خـوا بـەرەو گـومڕایـیو ڕێـی لارو خـوار، وە (حنیـف) کەسێکە بەرەو ئـەو (یانـی: ڕێـی ڕاسـت) مەیلی کردبـێ.

(سُلْطَٰنًا ): (السَّلاطَة: التَمَكُّن مِنَ القَهْرِ، وَسُمِّي الحُجَّة سُلْطَاناً لِمَا لَهُ السُّلْطَةُ عَلَى القُلُوب)، (سَلاطَة) بریتییە لە دەستەڵات ڕاناو مل پێ کەچکردن، وە بەڵگە (حجة) بۆیە پێی دەگوترێ: (سلطان) چونکە دەستەڵاتی هەیە بەسەر دڵی ئینساندا.

(أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ ): (أَصْلُ الأَمْنُ: طُمَئْنِينَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوْف)، وشەی (أمن) واتە: ئارامگرتنی نەفس‌و نەمانی ترس.

(يَلْبِسُوٓاْ ): (أَصْلُ اللَّبْس: سَتْر الشَّيء، يُقَالُ لَبَسْتُ عَلَيْهِ أَمره: سَتَرْتُ وَخَلَّطَتُهُ)، وشەی (لبس) واتە: داپۆشین، دەگوترێ: (لَبَسْتُ عَلَيْهِ أَمره) واتە: ئیشکەم لێ داپۆشیی‌و لێ تێکەڵ کرد.

(وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ): (الإجتِبَاءُ: الجَمْعُ عَلَى طَرِيق الإِصْطَفَاء)، واتە: کۆکردنەوە بە شێوەی هەڵبژاردن.

(لَحَبِطَ ): (أَصْلُ الحَبْطِ مِنَ الحَبَطِ: وَهُوَ أَنْ تُكْثِرَ الدَّابَّة أَكْلاً حَتَّى ينتَفخ بَطْنُهَا)، لە ئەسڵدا (حَبط)ەوە هاتوە، کاتێك کە ئاژەڵێك لەوەڕ دەخوات تا ورگی دەئاوسێ، دوایی تەندروستی تێکدەچێ، پێی دەگوترێ: (حَبَط)، وە (حَبِط) واتە: کردەوەکانی بە تاڵ دەبنەوە.

(وَٱلْحُكْمَ ): واتە: (الحِكْمَة)، لێرەدا حوکم بە مانای حیکمەت دێ، واتە: زانیاریی‌و کردەوەی بە سوود.

(وَكَّلْنَا ): (التَوْكِيلُ أَنْ تَعْتَمِدَ عَلَى غَيْرِكَ وَتَجْعَلَهُ نَائِباً عَنْكَ، وَالوَكِيلُ فَعِيل بِمَعْنَى المَفْعُول)، (توکیل) بریتییە لە وەکیل گرتن بۆ کارێك، پشت بە کەسێکی دی ببەستی‌و بیکەیە جێگری خۆت، (وَکیل)یش (فَعِیل)ی بە مانای (مَفْعُول)ە، واتە: کارپێسپێردراو.

(أَجْـرًا ): (الأَجْرُ وَالأُجْرَةُ: مَا يَعُودُ مِنْ ثَوَابِ العَمَلِ دنيَوِياً كَانَ أَو أُخْرَوِياً)، (أَجْرُ، أُجْرَة) بریتیە لەوەی کە مرۆڤ کردەوەیەك بکات، دوایی پاداشتەکەی بۆ بێتەوە، چ لە ڕووی دنیاییەوە، چ لە ڕووی دوارۆژەوە.

(ذِكْرَىٰ ): (الذِكْرُ وَالذِكْرَى وَالذُّكرة: ضِدُّ النِّسيَانِ)، وشەی (ذِكْر، ذِكْرَى، ذكرة) پێچەوانەی لەبیرچوونەوەن، واتە: لەبیربوونو لەیادبوون.

(ذَكَرَ الشَّيءَ ذِكْراً وذُكراً وذِكْرى وَتذكاراً: حِفْظُهُ وَاسْتحضرُهُ وَجَرَى عَلَى لِسَانهِ بَعْدَ نسيَانهِ)، واتە: ئەو شتەی لە مێشکی خۆیدا پاراست، وە بەسەر زمانی خۆی داهێنا، هەردووکیان پێیان دەگوترێ: (ذكر) چ لە مێشکی خۆی دا بیپارێزێ، چ بە زمان باسی بکات، دوای ئەوەی لەبیری چۆتەوە، (وذكر فلانة: خطبها، وذكر النعمة: شكرها، وذكر الناس: اغتابهم، وذكر الشيءَ: عابه، وذكَرَ الشيءَ له: أَعْلَمَه به، وذكر حقَّه: حَفِظَهُ ولم يُضَيِّعْهُ )[1]، دەگوترێ: (ذكر فلانة) واتە: ئافرەتەکەی خواست، (ذكر النعمة) واتە: سوپاسگوزاریی کرد، (ذكر الناس) بە خراپ باسی خەڵکی کرد، (ذكر الشيءَ) عەیبی لە شتەکە گرت، وە (ذكر الشيء له) لەو شتە ئاگاداری کردەوە، وە (ذكر حقَّه) مافەکەی خۆی پاراستو زایەی نەکرد.



١) المعجم الوسيط، ص٣١٣.

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هەر لەوبارەوە کە دەبێ: تەنیا خوا بپەرسترێ‌و بەندایەتیی بۆ بکرێ، وە دەبێ خۆمان بپارێزین لە هاوبەش بۆ خوا دانان، کە دیارە ئەم سوورەتە تەوەرە سەرەکییەکەی بریتییە لە خوا بە یەکگرتن‌و تەنیا خواپەرستن، ئنجا هەر لە درێژەی ئەو باسەدا، خوا بەسەرهاتێکی ئیبراهیم ﷺمان بۆ دەگێڕێتەوە، بەڵکو دەتوانین بڵێین: سێ لە بەسەرهات‌و وتووێژەکانی ئیبراهیمن ﷺ، بەڵام خوا ﷻ تێکهەڵکێشی کردوون‌و، لە یەك سیاقدا هێناونی، ئەگەرنا وەك دوایی ڕوون دەبێتەوە: سێ ڕووبەڕووبوونەوەو سێ وتووێژی ئیبراهیمن ﷺ، لەگەڵ سێ جۆر لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکاندا، ئەوانەی کە غەیری خوایان پەرستوەو بەندایەتییان بۆ غەیری خوا کردوە.

سەرەتا خوا ﷻ ئاوا دەست پێدەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ﴾، کە ئەمە وتووێژی یەکەمیانە، واتە: وە یاد بکەوە کاتێك کە ئیبراهیم بە بابی خۆی (ئازەر)ی گوت: ئایا بت‌و صەنەمان دەکەیە پەرستراوان (بە پەرستراوی دەگری)؟! ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، بێگومان من خۆت‌و گەلەکەت لە گومڕاییەکی ڕوون‌و ئاشکرادا دەبینم.

لێرەدا خوا ﷻ باسی هەڵوێستی ئیبراهیمی خەلیلمان بۆ دەکات لە بەرانبەر بابی دا، کە ناوی ئازەر بووە، وە گەلی ئازەر، واتە: ئەو خەڵکەی کە لەنێویاندا بووە، کە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان‌و مێژوونووسان دەڵێن: لە خوارووی عیراق لە ئووری کلدانییەکان بووە، وە هەندێکیش گوتوویانە: لە کوردستان بووە، وە هەندێك گوتوویانە: لە شام بووە، بەڵام وا پێدەچێ ئەوەی یەکەمیان لە هەموویان ڕاستتر بێ، بەڵام دوایی چووە بۆ شام‌و، ئیدی ئەگەر هاتبێ بۆ کوردستانیش دەگونجێ، ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە، ئەوەیە ئیبراهیم بە بابی خۆی گوتوە: ئایا بت‌و صەنەمان دەکەیە پەرستراو؟ ئێمە سێ وشەمان هەن:

یەك: (أصنام) كۆی (صنم)ە، بریتیە لە پەیكەرێك لە شێوەی مرۆڤدا.

دوو: (أوثان) كۆی (وثن)ە، وەك (صنم) وایە، بەڵام (صنم) ڕەنگ دەكرێ‌و (وثن) ڕەنگ ناكرێ.

سێ: (أنصاب) كۆی (نصب)ە، بریتیە لە بەردێك كە چەقێنرابێ‌و دانرابێ‌و بە پیرۆز گیرابێ‌و، جۆرێك لە پەرستشی بۆ ئەنجام درابێ، هەندێكیش گوتوویانە: هەرسێكیان بە یەك مانا دێن(١).

گرنگ ئەوەیە ئیبراهیم دەڵێ: ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾، بێگومان من خۆت‌و گەلەكەت لە گومراییەكی ڕوون‌و ئاشكرادا دەبینم، جا لێرەدا خوا ﷻ بەكورتیی باسی كردوە، بەڵام لە سوورەتەكانی (الصافات والشعراء والأنبیاء)دا بەتەفصیلێ باسی كردوە، كە چۆن بتەكانی شكاندوون، جگە لە بتە زلەكەیان كە هێشتوویەتەوە، بەڵام لێرەدا خوای كاربەجێ، بە یەك ئایەت‌و بە ئاماژەیەكی كورت باسی كردوە.

ئنجا دێتە سەر بەسەرهاتی دووەم، یاخود وتووێژی دووەم: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ﴾، وە ئاوا بەو شێوەیە، {واتە: وەك چۆن پووچیی بت‌و صەنەمەكانمان پێشانی ئیبراهیم دا، وە موناقەشەی لەگەڵ بابی‌و لەگەڵ گەلەكەیدا كرد، دەربارەی ئەوە كە نابێ بپەرسترێن‌و بكرێنە هاوبەشی خوا، بەهەمان شێوە} موڵكی فراوانی ئاسمانەكان‌و زەوییمان پێشانی ئیبراهیم دا ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ﴾، (نُرِيٓ) واتە: پێشانی دەدەین، خوای پەروەردگار بە (فعل المضارع) هێناویەتی، بۆئەوەی كە دیمەنەكە بێتە بەرچاومان ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ

١) بڕوانە: مختار الصحاح، ص٣٣٠و ٥٦٩و ٦٠٨، كە دەڵێ: هەموویان بە (پەرستراوی جگە لە خوا) دەگوترێن.

ٱلۡمُوقِنِينَ ﴾، وە بەو جۆرە موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەوی، پێشانی ئیبراهیم دەدەین، وشەی: (مَلَكُوتَ) هەر بە مانای موڵکە، بەلام لەگەڵ زێدە مانایی دا، چونکە صیغەی موبالەغەی (فعلوت)ە، وەك (جبروت، رهبوت، رحموت) ئەوانە مانای زیاتر دەدەن، بە وشەیەك، کەواتە: مەلەکووت واتە: ئەوە کە خوا دروستی کردوە.

ئنجا ئایا خوا ﷻ بۆچی موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەوی، پێشانی ئیبراهیم دەدات؟ دەفەرموێ: ﴿ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴾، واتە: وە بۆئەوەی بەرچاوی ڕۆشنبێ، وە بۆئەوەی لە بڕوا پتەوان بێ، بۆئەوەی ئیمانێکی پتەوی هەبێ، لەوەدا کە تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنو هەمەکارەیە، پاشان دەبێ هەر ئەویش پەرستراوی ڕاستەقینەی خەڵك بێ.

دیارە ئەو گەلەی ئیبراهیم کە لەنێویاندا بووە، هەندێکیان بتو صەنەمیان پەرستوە، وەك لە ئایەتەکەی پێشێ دا دەردەکەوێ، وە هەندێکیشیان ئەستێرە مانگو خۆریان پەرستوە، ئیدی ئیبراهیم لەگەڵ هەموویاندا ڕووبەڕوو بۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗا ﴾، کاتێك شەوی بەسەر داهات، یان: شەو بە تاریکیی خۆی ئیبراهیمی داپۆشی، خڕۆکەیەکی بینی، لە بەکارهێنانی قورئاندا (کوکب ونجم) بە یەك مانای بەکاردێن، لە زاراوەی گەردوونناسیی ئێستادا خڕۆکە (کوکب) بۆ ئەوانە بەکاردێ، کە تیشکیان نیەو، تیشك لە خۆر وەردەگرن، بەلام ئەوانەی کە تیشکێکی زاتییان هەیە، پێیان دەگوترێ (نجم)، ئەستێرە، کەواتە: ئیبراهیم شەوی بەسەردا هاتو ئەستێرەیەکی بینی، ئنجا ئایا ئەو ئەستێرەیە، کام ئەستێرە بووە؟ هەندێك دەڵێن: (مشتري) بووە، هەندێك دەڵێن: (زُحل) بووە، گرنگ ئەوەیە ئەستێرەیەکی بە تیشك بووە، ﴿ قَالَ هَٰذَا رَبِّي ﴾، گوتی: ئەمە پەروەردگارمە! کە {دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر}، ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴾، کاتێك ئاوابوو، گوتی: من ئاوابووانم خۆشناوێن، واتە: خۆشمناوێن وەك پەرستراو، چونکە پەرستراوو، پەروەردگار دەبێ

ئاگای لە پەروەردەکراوەکانیو لە دروستکراوەکانی خۆی بێ، ئەوانیش کە ئاوابوونو نەمان، مانای وایە ئاگایان لێیان نامێنێ، کەواتە: ناگونجێ ئەوانە پەروەردگاربن.

دیارە هەندێکیان ئەستێرەیان پەرستوە، هەندێکیان مانگیان پەرستوە، ﴿ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ ﴾، کاتێك مانگی بینی، کە تیشکەکەی دڕی بە تاریکیی دا، گوتی: ئا ئەوە پەروەردگارمە! ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، بەڵام کاتێك مانگیش ئاوابووو دیارنەما، گوتی: ئەگەر پەروەردگارم ڕێنماییم نەکات، بە تەئکید لە کۆمەڵی گومڕابووان دەبم، ئیبراهیم ﵇ بە سروشتو لە دەروونی خۆیدا، زانیویەتی پەروەردگارێکی هەیە، بەڵام بۆئەوەی بزانێ ئەو پەروەردگارە چۆنەو کێیە؟ لەوبارەوە گەڕاوە.

بەڵام بەپێی مانایەکی دیکەیان: ئیبراهیم ﵇ یەقینی هەبووە کە پەروەردگارێکی هەیە، بەڵام گوتوویەتی: گەلەکەم دەڵێن: ئەو پەروەردگارە، ئەستێرەیە، هەندێك دەڵێن: مانگە.

﴿ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ ﴾، ئنجا کاتێك خۆری بینی کە بە تیشکی ڕووناکییەکەی دڕی بە تاریکیی دابوو، پەردەی تاریکیی شەوگاری دڕاندبوو، گوتی: ئەمە پەروەردگارمە! ئەمە گەورەترە، بێگومان بەپێی زانیاری گەردووناسی تازەش خۆر (شمس) لە مانگو لە زەویش گەورەترە، خۆر (١،٣٠٠،٠٠٠) ملیۆنێكو سێ سەد هەزار جار لە زەوی گەورەترە، وە زەویش چەند بەرانبەری مانگە، بەڵام دیارە ئەستێرەکان، هەیانە بە ئەندازەی خۆرەو، هەیانە لە خۆر بچووکترە، وە هەیانە لە خۆر گەورەترە، ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴾، دوای ئەوەی ئەویش ئاوابوو (خۆریش ئاوابوو)، گوتی: ئەی گەلەکەم ! من بەریيم، واتە: دووڕم لەوانەی ئێوە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، چونکە دواهەمین شت کە پەرستراوە لە ڕووی گەورەیيو تیشکەوە، خۆر بوو، ئنجا مادام خۆریش ئاوابێ، کەواتە: ئەویش ئەو پەروەردگار نیەو، ئەو مشوورخۆرە نیە، کە شایستەی

پەرستـــران بـێ، بۆیـە مـن بـەرییم لـەوەی کـە ئێـوە دەیانکـەن بـە هاوبەشـی خـوا، چ ئەسـتێرەبن، چ مانـگ بـێ، چ خـۆر بـێ.

ئـنجـا خواپەرسـتیی خـۆیو خـوا بەیەکگـرتنی خـۆی ڕادەگەیەنـێ:﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا﴾، مـن ڕووی خـۆم کـردە ئـەو کەسەی کە ئاسمانەکانو زەوی وەدیهێنـاون، بـە پاکیـی ڕووم تێکـرد، وە ڕووم وەرگێـڕا لە هەرچی بەرنامەی دیکەو فیکرەی دیکە هەیەو، هاتمە سەر خـوا بەیـەکگرتن، وە ﴿وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾، وە من لە هاوبەش دانـەران نیـم.

ئـنجا دێتـە سـەر وتووێژێکی دیکەی ئیبـراهیم ﵇ دەفەرموێ: ﴿وَحَاجَّهُ قَوْمُهُ﴾ وە گەلەکەی موناقەشەیان لەگەڵدا کرد، دەربـارەی ئـەوە کە تـۆ چـۆن خـوا دەپەرستـی؟ ئەدی خۆر، مانگ، ئەستێرە، صەنەم، فڵانو فیسار؟ موناقەشـەو شـەڕە قسـەیان لەگەڵـدا کـرد، چونکە ئینسان کە تووشی سـەرگەردانیی دەبـێ، ئەو ناهەقییەی کـە لەسـەریەتی، لـێی دەبـێ بە هـەق، وە هەقەکـە لە بەرانبـەری دا وەستاوە، لـێی دەبـێ بـە ناهـەق، وەك خـــوای پـــەروەردگار دەربـــارەی مونافیقـــەکان دەفـــەرموێ: ﴿ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ ...﴿٦٧﴾﴾ التوبـة، واتە: دووڕووەکان هەندێکیان لە هەندێکیان نـزیکـنو بەینـیان لەگەڵ یـەك هەیـە، فەرمـان بە خراپـە دەکەنو، ڕێ لە چاکە دەگـرن، لەجیـاتـی ئـەوەی فەرمـان بـە چاکـە بکـــەنو، ڕێ لـــە خراپـــە بگـــرن، بـــە پێچـــەوانەوە دەکـــەن، ﴿قَالَ أَتُحَاجُّونِّي فِي اللَّهِ وَقَدْ هَدَانِ﴾، ئیبـــراهیم فـــەرمووی: ئایـــا دەربـــارەی خـــوا شـەڕەقســـەو وتـووێـــژم لەگـەڵـدا دەکـەن، لـە حاڵێکـدا کـە خـوا منـی هیدایـەت داوەو ڕێنمـایی کـردووم؟ واتـە: شـتێکی زۆر نەگونجـاوە، لەجیـاتی ئەوەی من شـەڕە قسە لەگـەڵ ئێـوەدا بکـەم، کە واز لە بتپەرستیی بێنن، کەچی ئێوە دەتانەوێ مـن لـە خـوا بەیـەکگـرتن هەڵگەڕێننـەوە! لـە حاڵێکـدا کـە خـوا ڕێنمـایی منـی کـردوە، ﴿وَلَا أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِ إِلَّا

أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـًٔا ﴾، وە من ئەوانەی کە ئێوە دەیانکەن بە هاوبەش بۆ خوا، لێیان ناترسێم، مەگەر پەروەردگارم شتێکی بوێ، واتە: مەگەر پەروەردگارم بیەوێ زیانێکم لێ بدات، ئەگەرنا ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانپەرستن، زیان لە من نادەنو لێیان ناترسێم، واپێدەچێ ئەوانە هەڕەشەیان لە ئیبراهیم کرد بێ، بۆ وێنە: گوتوویانە: خۆر، یان مانگ، یان ئەستێرە، دوایی زیانت پێدەگەیەنن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـًٔا ﴾، وە من ئەوانەی کە ئێوە دەیانکەن بە هاوبەش بۆ خوا، لێیان ناترسێم، مەگەر پەروەردگاری خۆم بیەوێ زیانێکم لێ بدات، ئەگەرنا ئەوانە هیچ نین، ﴿وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًا ﴾، پەروەردگاری من زانیارییەکەی گشتگیرەو، هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا پەند وەرناگرن، ئایا بیر ناکەنەوە؟

ئنجا بەردەوام دەبێ لەسەر بەڵگە هێنانەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَكَيۡفَ أَخَافُ مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا ﴾، وە من چۆن بترسێم لەوەی کە ئێوە کردووتانە بە هاوبەش بۆ خوا، لە حاڵێکدا کە ئێوە ناترسێن، لە سەرەنجامی ئەوەی شتێکتان کردۆتە هاوبەشی خوا، کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردۆتە خوار؟ دیارە جیاوازیی نێوان دینی هەقو دینی ناهەق، ئەوەیە کە دینی هەق بەڵگەو پشتیوانی هەیە، لە عەقڵو سروشتی ئینساندا، لە واقیعی ژیاندا، بەڵام دینی ناهەق، هیچ پشتیوانییەکی نیە، هیچ ڕەگو ڕیشەیەکی نیە، جا ئیبراهیم عليه السلام ئەم تەعبیرە بەکاردێنێ: ﴿مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا ﴾، ئەو شتەی کە ئێوە دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا، خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردۆتە خوار، (سُلْطَان) یانی: (حجة) بەڵگە، وە بەڵگەش بۆیەش ناوی لێنراوە (سُلْطَان) چونکە دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵو دەروونی

ئینساندا، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (لە ئاقار هەقدا، ئاو ڕادەوەستێ) واتە: ئێوە کە پەرستراوانێك دەپەرستن، هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نیە، من چۆن لێیان بترسم لە حاڵێك دا کە ئێوە خوایەك ناپەرستن، کە بەڵگەی لەسەرە؟ بوونەوەر پڕە لە بەڵگەکانی گەورەیی خواو یەکتایی خواو پەروەردگاریێتیی خوا، وەك یەکێك لە شاعیرەکان دەڵێ:

وَفِي كُلِّ شَيءٍ لَهُ آيَةٌ　　　تَدلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدٌ

لە هەموو شتێك دا نیشانەی هەیە　　　بەڵگەیە کەوا هەر یەك خوا هەیە

﴿فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، کام لەم دوو کۆمەڵە شایستەترە، بەدڵنیاییەوە، بە هێمنیی‌و بە ئارامیی یەوە، ئەگەر ئێوە بزانن؟ واتە: من کە خوا دەپەرستم، تاکە پەرستراوی بە هەق، یان ئێوە کە شتانێك دەپەرستن، یان وەك خۆتانن، یان لە خوار خۆتانن‌و شایستەی پەرستران نین، ئایا من بترسێم لەوانە کە زیانم لێبدەن، کە ئەوانە هیچیان بەدەست نیە، یان دەبێ ئێوە بترسێن لەو کەسە کە دەتانمرێنێ‌و زیندووتان دەکاتەوە، کەچی نایپەرستن؟ کەواتە: من زیاتر شایستەی ئەوەم کە دڵنیابم، وە ئێوە زیاتر شایستەی ئەوەن کە بترسێن.

ئنجا یان هەر قسەی ئیبراهیمە، یان فەرمایشتی خوایەو تێکەڵی کردوە، لەگەڵ قسەکەی ئیبراهیمدا، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ئیمانەکەشیان لەگەڵ ستەمدا تێکەڵ نەکردوە، ئا ئەوانە هێمنیی‌و ئارامییان بۆ هەیە، وە هەر ئەوانەش ڕێ پێشاندراون.

کە ئەم ئایەتە هاتە خوار، هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ، تووشی ناڕەحەتیی‌و دڵەڕاوکێ‌و ترس بوون، گوتیان: کێ لە ئێمە ستەمی لە خۆی نەکردوە؟! خواش ﷻ دەفەرموێ: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ئیمانەکەشیان لەگەڵ ستەمدا تێکەڵ نەکردوە، ئێمە هەموومان تووشی هەڵەو ستەم‌و کەموکوڕیی بووین، خواش ﷻ فەرموویەتی: مەگەر کەسانێك ئیمانەکەیان لەگەڵ ستەمدا تێکەڵ نەکردبێ، ئەهلی

دڵنیایی بن، مانای وایە هیچ کامێکمان ڕزگارمان نابێ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ بۆی ڕوون کردنەوە، فەرمووی: لێرەدا مەبەست لە ستەم، هاوبەش پەیداکردنە، ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ۝١٣﴾لقمان، واتە: بێگومان هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا زیاتر قسەی لەبارەوە دەکەین.

لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ﴾، ئا ئەمە بەڵگەی ئێمە بوو بە ئیبراهیمان دابوو، لە بەرانبەر گەلەکەی دا، واتە: ئەم قسانەی کە کران، ئەم وتووێژە هەمووی، بەڵگەکانی ئێمە بوون، ﴿نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ﴾، هەر کەسێك کە بمانەوێ چەندان پلەی بۆ بەرز دەکەینەوە، بێگومان پەروەردگاری تۆ کاربەجێی زانایە.

ئنجا خوا دێتە سەر باسی ناوهێنانی ژمارەیەك لە پێغەمبەران، کە بە ئیبراهیمەوە ژمارەیان هەژدەیە، تاکە ئایەتێك لە قورئاندا، ئەوەندە بەدوای یەکدا ژمارەیەکی زۆری پێغەمبەرانی تێدا ناوهێنرابن، ئەم ئایەتانەن، ئەوانەش هەموویان وەچەی ئیبراهیمن، ـ جگە لە نووح ـ ، بۆیە ئیبراهیم پێی گوتراوە، (أبو الأنبياء) بابی پێغەمبەران، زۆربەی زانایان دەڵێن: لەدوای ئیبراهیمەوە هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە، مەگەر لە وەچەی ئەو بووبێ، دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ كُلًّا هَدَيۡنَاۚ وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُۖ﴾، وە بە ئیبراهیممان بەخشی لەسەر ئەو هەڵوێستانەی هەر کام لە: ئیسحاق و یەعقووب، وە هەر کامیانمان ڕێنمایی کردبوو، خستبوومانە سەر ڕێی ڕاست، وە لە پێشوانیش دا، نووحمان ڕێنمایی کرد، چونکە نووح پێش ئیبراهیم بووەو، بە نووح گوتراوە: (أبو البشر الثاني) دووەمین بابی مرۆڤایەتی، چونکە لەدوای ویەوە، وەچەی بەشەر تەنیا ئەوانە بوون، کە لە خزمەت نووحدا بوون، جا چ نزیکانی خۆی بووبن، چ ئەوانەی لەگەڵی دابووبن، ئەگەرنا هیچ بەشەری دیکە نەماوە لەسەر زەوی و خوای پەروەردگار بژاری کردوە لە کافران و، کەسی لێیان نەهێشتوە.

جا دەفەرموێ: وە نووحیشمان پێشتر خستبووە سەر ڕێی ڕاست ﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ ، هەندێك دەڵێن: ڕاناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نووح، واتە: لە وەچەی نووح بوون هەر کام لە: داوودو سولەیمانو ئەییوبو یوسفو مووساو هاروونو ئەوانەی دیکە کە دێن، وە هەندێکیان گوتوویانە: ڕاناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئیبراهیم، بەڵام بە بۆچوونی من ئەو ڕایە ڕاستە کە دەڵێ: دەگەڕێتەوە بۆ ئیبراهیم، چونکە لێرەدا باس باسی ئیبراهیمە، وە خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە ئیبراهیم ئاوا بۆ خوای پەروەردگار ساغو یەکلابووبۆوە، خوای پەروەردگاریش لە بەرانبەری ئەوەدا، ئاوا پاداشتی ئیبراهیمی داوەتەوە، کە ئەو هەموو پێغەمبەرانەی لە وەچەی وی خوڵقاندوون، بۆیە ڕاناوەکە وا ڕاستترە بڵێن: دەگەڕێتەوە بۆ ئیبراهیم، وە ئەوانەی کە باسیان کراوە، هیچیان شتێکی وایان تێدانیە کە نەتوانین بڵێین: لە وەچەی ئیبراهیمە.

ئنجا ناوی شەش لەو پێغەمبەرانە دێنێو دەفەرموێ: وە لە وەچەی ئەو بوو: داوودو سولەیمانو (بابو کوڕ بوون، داوود بابی سولەیمانە) وەك خوا لە سووڕەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾، (سولەیمان)مان بە داوود بەخشی.

وە (ئەییوب) ئەویش خوای پەروەردگار لە چەند شوێنان دا باسی کردوە، کە زۆر تووشی نەخۆشییو تاقیکردنەوەی سەخت بووە، بەڵام خۆڕاگر بووە.

وە (یوسف) دیارە کە کوڕی یەعقووبە یەعقووبیش کوڕی ئیسحاقە ئیسحاقیش کوڕی ئیبراهیمە، کە سووڕەتێك لە قورئاندا بە ناوی ئەووەوەیە، وە (مووسا) ئەویش هەر لە بەنی ئیسرائیلەو ئیسرائیل نازناوی یەعقووبە، مووساش ﷺ دەچێتەوە سەر ئەوان.

ئنجا (هاروون) ئەمیش دیارە برای مووسایە، ئەوە شەش، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئا بەو شێوەیە ئێمە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

ئنجا خوا ﷻ باسی چوار پێغەمبەری دیکە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ﴾، وە زەکەرییاو یەحیا، ئەوانیش باب و کوڕ بوون، زەکەرییا بابی یەحیا بوو، عیساو یەحیاش دایکیان خوشك بوون.

وە ئیلیاسیش هەر لە بەنی ئیسرائیلە، کە بە (إلیاسین)یش هاتوە لە قورئاندا، ﴿ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، ئەو چوارەش هەر چواریان لە صالْحان و لە چاکەکاران بوون.

ئنجا شەشەکەی پێشێ زیاتر حالْەتی حوکمڕانیی و تەمکینیان هەبووە، ئەم چوارەش زیاتر دنیا بە کەمگرتن و سادە ژیانیان هەبووە.

ئنجا باسی چواری دیکە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ﴾، وە ئیسماعیل کە کوڕی ئیبراهیمەو، دایکی (هاجەر)ەو دەبێتەوە باپیرەی دووری پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ.

ئەلیەسەعیش خوای کاربەجێ لە قورئان دا ڕوونکردنەوەی لەبارەوە نەفەرمووە.

یونوسیش ئەوە دیارە، کە (ذو النون)یشی پێگوتراوە، وە (صاحب الحوت)یشی پێگوتراوەو لە نەینەوای زوو و (موصل)ی ئێستا، ژیاوە، وە لووط، ئەویش برازای ئیبراهیم بووە، واتە: کوڕی برای.

ئنجا لەبەرئەوەی ئەم چوارە شوێنکەوتوویان نیە، وە کتێبی دیارییکراویان ناونەهێنراوە، بۆیە خوای کاربەجێ بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانە، کە ئەوانە پلەیان لەوانی دیکە نزمتر بێ، دەفەرموێ: ﴿ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، هەر کامێك لەو چوارەشمان لە ڕۆژگاری خۆیاندا، بەسەر جیهانییانی سەردەمانی خۆیاندا هەڵبژاردبوو، دیارە هەر پێغەمبەرێك کە هاتوە باشترینی خەڵکی ڕۆژگاری خۆی بووە، هەتا لەنێو ئەوانەشیاندا کە ئیماندار بوون.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، (هەروەها ڕێنماییمان کردن و خستمانە سەر ڕێی ڕاست) لە

باب‌و باپیرانیان، وە لە وەچەو لە برایانیاندا، واتە: هی ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، بەڵام كەسانێكیش هەبوون، لەوانە نەبوون كە هەڵمانبژاردوون‌و، خستمانە سەر ڕێی ڕاست، ﴿ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾، ئا ئەوە ڕێنمایی خوایە، هەر كەسێك لە بەندەكانی بیەوێ ڕێنمایی دەكات، ﴿ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئەگەر ئەوانە واتە: نزیكان‌و خزم‌و كەسانی پێغەمبەران، باب‌و براو وەچەیان، یاخود ئەوانیش (پێغەمبەرانیش) هەر كامێك لەوانە ئەگەر هاوبەشی بۆ خوا دانابایە ﴿ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئەوەی كە دەیانكرد لە كردەوەی باش، خوا لێی هەڵدەوەشاندنەوە، واتە: ئەو كردەوە چاكانەی كە دەیانكرد، لێیان بە زایە دەچوون، یانی: هاوبەش بۆ خوا دانان، دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی كردەوە چاكەكان.

ئنجا جارێكی دیكە دەفەرموێ: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾، ئا ئەوانە كەسانێكن كە كتێب‌و حیكمەت‌و پێغەمبەرایەتییمان پێدابوون، یاخود بەرنامەو زانست‌و پێغەمبەرایەتیی، چونكە كتێب بەمانای بەرنامەو بە مانای كتێبیش دێ، كە دیارە كتێبی خوای پەروەردگار بەرنامەیە، وە حوكم بە مانای حیكمەت‌و بە مانای زانیاریی دێ، (نُبّوة)یش واتە: پێغەمبەرایەتیی، ﴿ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، ئا ئەوانە واتە: ئەو كافرانەی ڕۆژگاری تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ! یان ئەو كافرانەی ڕۆژگاری تۆ، ئەی ئەو كەسەی كە قورئان دەخوێنی! ئێمەش‌و پێش ئێمەش‌و، دوای ئێمەش هەر دەگرێتەوە، ئەگەر ئەوانە پێیانی بێبڕوابن، واتە: بەو سێ شتانە، بە كتێب‌و حیكمەت‌و پێغەمبەرایەتیی، ﴿ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴾، كۆمەڵێكی دیكەمان ڕاسپاردوە، ئیمانیان پێ دێنن‌و، پێیان بێبڕوا نابن، یاخود ئەگەر ئەوانە سپڵە بن، ئەوان بەرانبەریان سپڵە نابن.

خوا دەفەرموێ: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ﴾، ئا ئەوانە كەسانێكن خوا ڕێنمایی كردوون‌و، خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، ﴿ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ﴾، تۆش ڕێنمایی

ئەوانو ڕێی ڕاستی ئەوان بکە سەرمەشق، بە کێ دەفەرموێ؟ بە پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ.

ئنجا وەکو دوای باسی دەکەین: ئەمە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، سەروەری هەموو پێغەمبەرانە، چونکە خوا ﷻ ناوی هەژدە (١٨) لە پێغەمبەران دێنێ بە نووحەوە، دوایی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ئەوانە خوا خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، تۆش ئەو ڕێ ڕاستەی ئەوان بکە سەرمەشقی خۆت، واتە: ئەگەر عیسا زاهید بووەو خۆبەکەمگر(متواضع) بووە، واتە: ئەو سیفەتەی زۆر تێدا زەق بووە، ئەگەرنا هەموو پێغەمبەران هەموو سیفەتێکی باشیان تێدابووە.

وە ئەگەر نووح زۆر ئارامگرو پشوو درێژ بووەو (٩٥٠) ساڵ بانگەوازی کردوە.

وە ئەگەر داوودو سولەیمان دوو حوکمڕانی دادگەر بوونو حوکمیان بە شەریعەتی خوا کردوە.

وە ئەگەر ئەییوب زۆر خۆڕاگر بووە، لەسەر نەخۆشیی.

وە ئەگەر یوسف تووشی تاقیکردنەوەی زیندانی کران بووەو، ئارامی گرتوە.

وە ئەگەر زەکەریياو یەحیا زۆر ئارامگر بوون، کە بە ستەم شەهیدکراون لەلایەن جوولەکەکانەوە: تۆش ئەی موحەممەد ﷺ! چاو لە هەموویان بکەو، لە یەك کاتدا سیفەتی چاکی هەموویان لە خۆتدا بێنە دی، ئنجا کەسێك کە سیفەتی باشی هەموو پێغەمبەران لەخۆیدا کۆبکاتەوە، دیارە دەبێ لە هەمووان گەورەتر بێ.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴾، وە پێیان بڵێ: هیچ پاداشتو کرێتان لێ داوا ناکەم، لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانەتان پێ ڕادەگەیەنمو، ئەو دینەتان تێدەگەیەنم، وە ئەم قورئانە جگە لەبیرخەرەوە بۆ هەموو جیهانییان، شتێکی دیکە نیەو، تەنیا بیرخەرەوەیەو ئاگادارکەرەوەیە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، زانایان لێرەدا مشتومڕیان لەنێوان پەیدابووە، ئایا ئازەر بابی ئیبراهیم بووە، یان مامی بووە؟

١/ هەندێکیان کە شیعەیان لەنێودان دەڵێن: ئازەر مامی ئیبراهیم بووەو، جاری وایە، (أب) باب بە مانای (عم) مامیش دێ ، کۆمەڵێك تەئویلو پینەو پەڕۆی دوورو درێژ دەکەن ، بۆچی وادەکەن ؟ دەڵێن: ئاخر ناگونجێ بابی پێغەمبەران کافر بن !

٢/ بەڵام زۆربەی زۆری زانایان دەڵێن: ئازەر بابی ئیبراهیم بووە، هەروەك چۆن ڕواڵەتی ئایەتەکە زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی دەیگەیەنێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ ﴾، کەواتە: ئازەر بابی ئیبراهیم بووەو، کافریش بووە، وە کافربوونی بابی یەکێك لە پێغەمبەرانیش، یان خێزانی، یان کوڕی، یان مامی، هیچ زیانێك لە پێگەو پایەی بەرزی ئەو پێغەمبەرە نادات، وە لەوبارەوە چەند بەڵگەیەکیشیان هەن، بۆ نموونە:

١) خوای بێهاوەڵ لە سوورەتی (التوبة)دا زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ١١٤ ﴾، واتە: داوای لێبوردنکردنی ئیبراهیم بۆ بابی، تەنیا بەهۆی بەڵێنێکەوە بوو، کە پێی دابوو، ئنجا دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کە بابی دوژمنی خوایە، حاشای لێکرد، وە بێگومان ئیبراهیم زۆر بە پەرۆش بوو، زۆر هێدیی‌و مەند بوو.

کەواتە: ئەوە زۆر بە ڕوونیی دیارە، کە بابی ئیبراهیم کافر بووە.

٢) هەروەها لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾﴾، واتە: وە لە کتێبدا بۆیان باس بکە، کە ئیبراهیم پێغەمبەرێکی زۆر ڕاستگۆ بووە، کاتێك کە بە بابی گوت: ئەی بابە گیان! بۆچی شتێك دەپەرستی، کە نە هیچ دەبیستێ، وە نە هیچ دەبینێ‌و نە هیچ سوودێکت پێ دەگەیەنێ ؟!.

ئنجا ئەوانەی کە دەڵێن: ئازەر مامی ئیبراهیم بووە، چەند شتێك بە بەڵگە دەهێننەوە:

١ - دەقێك دەهێننەوە کە گوایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لَمْ أَزَلْ أُنْقَلُ مِنْ أَصْلاَبِ الطَّاهِرِينَ إِلَى أَرْحَامِ الطَّاهِرَاتِ﴾[1]، واتە: من بەردەوام دەگوازرامەوە، لە پشتی پیاوانی پاکەوە، بۆ منداڵدانی ئافرەتانی پاك.

ئێمەش دەڵێین: ئەم فەرموودەیە بێهێزە، بەلام ئەگەر گریمان ئەم دەقە ڕاستیش بێ، مەبەست ئەوەیە کە وەچەی پێغەمبەران‌و باب‌و باپیرانی پێغەمبەران، پاك بوون لە رووی ڕەوشتەوە، واتە: نە زنجیرەی بابیان، نە زنجیرەی دایکیان داوێن پیس نەبوون، ئەوە لە حاڵەتێکدا، ئەگەر دەقەکە ڕاستیش بێ، ئەگەر گریمان سەنەدەکەی ڕاستیش بوو، هیچ ناچارمان ناکات بڵێین: مەبەست پێی ئەوەیە کە هیچ کام لە باب‌و باپیرانی پێغەمبەران‌و، هیچ کام لە بەرەی دایکیان‌و بەرەی بابیان، کافر نەبوون، لە کاتێك دا کە بە دەقی ئایەت خوای پەروەردگار دەفەرموێ، کافر بوون !

٢ - وە هەروەها ئەم ئایەتەش دەکەنە بەڵگە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ ﴿٢٨﴾﴾التوبة، واتە: بێگومان هاوبەشدانەرەکان پیسن،

---

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ عَنْ عِكْرَمَةَ مُرْسَلاً، وَكَنْزُ العمَال برقم: (٣٠١٩٥)، (٣٩٦٥٥)، حَدِيثٌ ضَعِيفٌ.

ئنجا دەڵێین: مادام هاوبەشدانەرەكان پیس بن و، پێغەمبەریش دەفەرموێ: من لە پشتی پیاوانی پاك، بۆ داوێنی ئافرەتانی پاك گوازراومەتەوە، كەواتە: ناگونجێ هیچ كام لە باب و باپیران و دایك و داپیرانی پێغەمبەران كافر بوو بن.

ئێمەش دەڵێین: لە ئایەتەكەدا پیسی مەعنەویی مەبەستە، ئەگەرنا تۆ كافرێك دەستیشی لێبدەی، پێویست ناكات دەستت بشۆیەوە[1].

## سێ ڕاستیی گەورەو گرنگ

### ڕاستیی یەكەم: مێژووی بتپەرستی:

وەك ئیمام ( فخر الدين الرازي) لە تەفسیرەكەی خۆی دا دەڵێ: (لا دِينَ أَقْدَمَ مِنْ دِينِ عَبَدَةِ الأَصْنَامِ، وَالدَّلِيلُ عَلَيْهِ أَنَّ أَقْدَمَ الأَنْبِيَاءِ الَّذِينَ وَصَلَ إِلَيْنَا تَوَارِيخُهُم عَلَى سَبِيلِ التَّفْصِيلِ هُوَ نُوح ﷺ، وَهُوَ إِنَّمَا جَاءَ بِالرَّدِّ عَلَى عَبَدَةِ الأَصْنَامِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى حِكَايَةً عَنْ قَوْمِهِ أَنَّهُم: ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾﴾ وَذَلِكَ يَدلّ عَلَى أَنَّ دِينَ عَبَدَةِ الأَصْنَام قَدْ كَانَ مَوجُوداً قَبْلَ نُوح ﷺ)[2] واتە: هیچ ئایینێك لە مێژینەتر نیە، لە ئایینی بتپەرستەكان، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە، كە بەپێی ئەوەی بە ئێمە گەیشتوە، لە مێژینەترین پێغەمبەر، پێغەمبەر نووحە ﷺ، وە ئەویش هاتوە بۆئەوەی بەرپەرچی بیرۆكەی بتپەرستیی بداتەوە، وەك خوای بەرز لەوبارەوە لە گەلەكەی دەگێڕێتەوە، كە گوتوویانە: دەست هەڵمەگرن

---

١) لە تەفسیری سوورەتی (التوبة) بە وردیی قسەمان لەسەر ئەو ئایەتە كردوە، واتە لە بەرگی حەوتەمی تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێزدا.

٢) التفسير الكبير: ج٧، ص٣٠.

لە وەددو سوواعو یەغووسو یەعووقو نەسر (کە ناوی پێنج لە سەنەمەکانی گەلی نووح بوون) وە ئەمە دەگەیەنێ کە دینی بت پەرستەکان لەپێش نووحیش دا بووە.

بەلاّم لێرەدا دەبێ ئەم قسە ڕاست بکەینەوە، چونکە ئەو قسەیەی ئیمام (فخرالدین الرازي) هەندێ جار مولحیدو بێدینەکان، دەیکەنە بەڵگە لە دژی ئەوە کە ئەهلی دینو ئەهلی ئیمان دەیڵێن: کە خوا سەرجەم پێغەمبەرانی ناردوە بە (خوا بەیەکگرتن)ەوە وە دەڵێن: لە بنەڕەتدا مرۆڤ بت پەرست بووە، ئنجا ئیمام (فخرالدین الرازي)یش تەفصیلی پێ نەداوە، خوا عەفوی بکات، دەبوو ئەوە ڕوون بکاتەوە، ڕوون کردنەوەکەش ئەوەیە کە: لە بنەڕەتدا خوا دینی خوا بەیەکگرتنی ناردوە، بۆ هەموو پێغەمبەران، بەلاّم دوایی خەڵك لایانداوە، وە وەك چۆن لە سەردەمی نووحدا لادان بووە، ئەوەتا دوای نووح دیسان خەڵك جارێکی دیکە تووشی بت پەرستیی بوونەتەوە، ئەگەرنا سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) هەر بە خوا بە یەکگرتن (توحید)ەوە، هاتوون، چ پێش نووح ﵇وە چ دوای ویش، بەلاّم دوایی خەڵکەکە لایانداوە، هەر دوور نەڕۆین: ئەوە نەصرانییەکان، عیسا ﵇ لە چوار، پێنج، شوێن لە قورئاندا خوا لەسەر زمانی دەفەرموێ: پەروەردگاری ئێوە تەنیا یەکێکە، وە من بەندەی خوام هەر ئەو بپەرستن، هەر ئەوە ڕێی ڕاستە:

١/ ﴿... فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ آل عمران.

٢/ ﴿...وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۖ... ﴿٧٢﴾﴾ المائدة.

٣/ ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾﴾ الزخرف.

٤/ ﴿وَإِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾﴾ مريم.

کەچی نەصرانییەکان، ئێستا عیسا ﵇ دەپەرستن دەڵێن: خوا یەکێکە لە سێیان: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ ﴿٧٣﴾﴾ المائدة، واتە: بێگومان ئەوانەی کە گوتیان: خوا یەکێکە لە سێیەکان، کافرن، کە ئەوە هەمووی دوو هەزار ساڵێك لەمەو پێش عیسا ﵇، لە دایك بووە، کەواتە: پێغەمبەران هەموویان خوا بەیەك گرتنیان هێناوەو، تەنیا خوا پەرستییان هێناوە، بەڵام مرۆڤ زیاتر حەزی بە شتی بەرهەست دێ، زۆرجار مرۆڤ مەگەر بەهۆی ئیمانەوە کامڵ بێ و، ئاستی فیکریی بەرز بێتەوەو، پێگەیشتنی پەیدا بێ، ئەگەرنا مرۆڤ دەچێتەوە سەر عەقڵی منداڵیی، منداڵێك بڵێ: لە بازاڕی هاتوومەوە، شتێکی جوانم بۆ هێناوی، دەڵێ: کوا؟ هەتا پێشانی نەدەی، بڕوات پێ ناکات، دەبێ بە چاو ببینێ، بەڵام مرۆڤ بەهۆی ئیمانەوە، دەچێتە ئاستێکی بەرزی عەقڵییو فیکرییو، شت ئەگەر بە چاویش نەیبینێ، بڕوای پێ دەکات، بەڵام کاتێك مرۆڤ نزم دەبێتەوەو لە ئیمان دوور دەکەوێتەوە، دەچێتەوە ئاستی منداڵییو، دەبێ بە چاوی خۆی ببینێ! بۆیە هەموو کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەر گوتوویانە: ﴿فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾﴾ الأنبیاء، واتە: دەبێ نیشانەیەکمان بۆ بێنێ، وەك هی پێغەمبەرانی پێشێ، نەیانزانیوە کە خوا بەشەری خستۆتە قۆناغی ڕوشدو پێگەیشتنو، دەبێ موعجیزەو بەڵگەیەکی بۆ بنێرێ، لەگەڵ قۆناغی پێگەیشتنیدا بگونجێ، موعجیزەیەکی فیکریی، عیلمییو ئەدەبیی، کە قورئانە، نەك موعجیزەیەکی بەرهەست، وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو، کە بۆ قۆناغی ساوایی بەشەر نێردراوە !

## ڕاستیی دووەم: ئەوەیە کە لە گوتنی حەقیدا ـ بە تایبەت لە مەسەلەی ئیمانو خوا بەیەکگرتندا ـ نابێ خاتری کەس بگیرێ

تەماشای ئیبراهیم بکەن! چەند بەئەدەب بووە، لەگەڵ بابی دا، کەچی بەڕوونیی دەڵێ: ﴿إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾، من خۆتو گەلەکەت

لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینم، لە مەسەلەی عەقیدەو خوا بەیەکگرتنو ئیماندا، دەبێ لە بنی کوولەکەی بدرێو نابێ خاتری کەسی تێدا بگیرێ، لە شتی دیکەدا پلە پلەیی هەیە، لە یاساکانی شەریعەتدا، ڕەچاوی هەلومەرجی کۆمەڵایەتییو بارودۆخی سیاسیی دەکرێ، جێبەجێکردنی یاساکانی شەریعەت دەبێ، زەمینەیان بۆ بڕەخسێ، بۆیە شەریعەت بە پلە پلە هاتۆتە خوار، بەڵام عەقیدە، یەك تەکان هاتۆتە خوارو بە یەکجار، وەك لە سەرەتای تەفسیری سوڕەتی (الأنعام)دا باسمان کرد.

## ڕاستیی سێیەم: ئەوەیە کە هەق بێژیی و ڕاگەیاندنی ئیمانو عەقیدە، جیایە لەگەڵ ئەدەبو حورمەتو ڕێز نواندن

واتە: تۆ لەبەرئەوەی کە دەتەوێ ڕێز لە کەسێك بگری، مانای ئەوە نیە هەقی پێ نەڵێی، هەر وەك لەبەرئەوەی هەقی پێ دەڵێی، مانای وانیە، ڕێزی لێ نەگری، ئەم دووە لێك جیان، تەماشای ئیبراهیم بکەن! لێرەدا زۆر بە ڕوونو ئاشکرایی، دەڵێ: بابە من خۆتو گەلەکەت لە گومڕاییەکی ڕوونو ئاشکرادا دەبینم، دیارە بابی قسەکەی زۆر لەسەر دڵ قورس بووە، بەڵام هەر دەبوو پێی بڵێ، بەڵام ئایا ئیبراهیم لەوپەڕی ئەدەبدا نەبووە، لەگەڵ بابی دا؟ با تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین:

خوا لە سووڕەتی (مریم)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ٤١ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ٤٢ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ٤٣ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ٤٤ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ٤٥ ﴾، واتە: وە لە کتێبدا بۆیان باس بکە، کە ئیبراهیم پێغەمبەرێکی زۆر ڕاستگۆ بووە، کاتێك کە بە بابی گوت: (چەند بە نەرمییو بە سۆزو چەند بە حورمەتەوە!)

ئـەی بابـە گیـان! بۆچی شتێك دەپەرستی كە نە هیچ دەبیستیو نە هیچ دەبینیو نە هیچ سوودێكت پێ دەگەیەنێ ؟ بابە گیان! من لە خواوە زانیارییەكی بەسوودم بۆ هاتوە. ئەی بابە گیان ! شەیتان مەپەرستە، (ئەگەر وابكەی) سەرپێچیی فەرمانی خوا دەكەی. بابە گیان! دەترسم بەهۆی ئەوەوە كە تۆ شەیتان بە دۆست دەگری، سزاو ئازارت پێبگات، لە خوای خاوەن بەزەییەوە.

مانای وایە ڕێزیشی گرتوە، بەڵام هەقەكەشی پێ گوتوە.

ئنجا بابزانین بابی چۆنی وەڵام داوەتەوە؟ ﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا [1] ﴿٤٧﴾ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: (بابی) گوتی: ئەی ئیبراهیم ! ئەگەر واز نەهێنیو دەست هەڵنەگری بەردبارانت دەكەم، بڕۆ نەشتبینمەوە. (شاربەدەری كردوە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئیبراهیم دەڵێ چی؟) گوتی: سەلامەت لەسەر بێ، داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم هەر دەكەم، ئەو هەمیشە ڕێزی گرتووەو ئاگای لێم بووە، وە ئەوەی كە ئێوە لەجیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوەو دەیانپەرستن، من وازتان لێ دێنم، بەڵام لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە، نزیكە كە من بەدبەخت نەبم، بە دوعای پەروەردگارم(و ئەوەی لێی داوا دەكەم پێم بدات).

ئەوەی كە لێی داوا دەكرد ئەوەبوو كە خوا دەربازی بكاتو پەیامەكەی بڵاوبكاتەوە، یاخود ئەوەبوو كە بابی هیدایەت بدات، كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: دوای ئەوەی كە بۆی دەركەوت دوژمنی خوایە، لێی تەماوبڕاو بوو، بەرائەتی لێكرد.

---

١) حَفيَ بـه حَفاوةً فهو حفيٌّ: بالغ في إكرامِهِ وألْطافِهِ والعناية بأمره. مختار الصحاح، ص: ١٤٠.

# بەسەرهاتی ئیبراهیم و موناقەشەی لەگەڵ ئەستێرەو مانگ و خۆرپەرستاندا لە چوار دەخاڵدا

**مەسەلـەی دووەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾، ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە، یـەك بەسـەرهاتمان بـۆ بـاس دەکـەن، ئـەویش ئەوەیـە کـە پێشتـر ئامـاژەم پێـدا: ئیبـڕاهـیم ﷺ لەگـەڵ هـەموو ئەوانـەدا کـە غـەیری خـوایان پەرسـتوە، چ بـتو صـەنەم پەرسـت بـووبن، چ مرۆڤـ پەرسـت بووبـن، وەك نـەمرود، چ ئەسـتێرە پەرست بووبـن، چ مانـگ پەرست بووبـن، چ خـۆر پەرست بـووبن، لەگـەڵ هەمووانـدا ڕووبـەڕوو بۆتـەوەو، لەگـەڵ هەمووشـیاندا موناقەشـەی بـووە، وە هـەمووشـی بۆڕداونو بەزاندوونی.

لێرەدا خـوای پەروەردگـار بۆمـان باسـی مشـتومڕێکـی ئیبـڕاهیم دەکـات، لەگەڵ ئەسـتێرەو مـانگو خـۆر پەرسـتان دا، دەفـەرموێ: ئـاوا ئێمـە نیشانەکانی خۆمانمان پێشانی ئیبـڕاهیم دەدەیـن، موڵـکی فراوانـی خۆمـان پێشـانی ئیبـڕاهیم دەدەیـن، موڵـکە فراوانـەکـانی ئاسـمانو زەوی، تاکـو لـەوانە بـێ کـە ئیمانێکـی دامـەزراو

پتەویان هەیە، ئنجا ئێمە لە تەفسیری ئەم پێنج ئایەتەدا، چوارده (١٤)خاڵان تۆمار دەكەین:

یەكەم: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ ئەمە عەتف دەبێتەوە سەر ئەوەی پێشێ، واتە: وەك چۆن پووچیی بیرۆكەی بت پەرستییمان فێری ئیبراهیم كردو، تێمانگەیاندو بەرچاومان ڕۆشنكردەوە لەوبارەوە، بەهەمان شێوەش مولكی فراوانی ئاسمانەكانو زەوی پێشانی ئیبراهیم دەدەین، تاكو لە دڵنیایان بێتو لە مسۆگەران بێ، كە تەنیا خوا پەرستیی ڕاستە، وە بت پەرستییو ئەستێرە پەرستییو مانگو خۆر پەرستیی، شتێكی پووچە.

دووەم: كە دەفەرموێ: ﴿ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، (نُـرِي)، واتە: پێشانی دەدەین، ئەو پێشاندانە توێژەرەوانی قورئان، گوتوویانە: ئایا پێشاندانی چاوە، یان پێشاندانی عەقڵە؟ دەگونجێ پێشاندانی چاو بێ، واتە: بە چاو ببینێ، بە چاوی سەر، وە دەگونجێ پێشاندانی عەقڵ بێ، كە دیارە من زیاتر دڵم بەلای ئەوە دایە كە دووەمەو، پێشاندانی عەقڵیی مەبەستە، چونكە بینینی مولكی فراوانی ئاسمانەكانو زەوی، لە توانای چاوی مرۆڤدا نیە، هەرچەند هێندێك لە توێژەرەوانی قورئان تەكەللوفێكیان كردوەو حیكایەتێك دێنن، كە خوا چاوی ئیبراهیم ﷺ ی چاوی هێندە بەقووەت كرد، لێرەوە ڕووانی تاكو دەگاتە عەرش، بەڵام ئەوە قسەیەكە هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیە، وە بە پێی ئایەتەكانیش، كە دوایی خوای پەروەردگار باسیان دەكات، هەر ئەوەیە كە خوا لە ڕووی عەقلییەوە، ئیبراهیمی هێندە هۆشیارو زاناو شارەزاو بێداركردۆتەوە، كە لە نهێنیی ئاسمانەكانو زەوی تێبگات، وە بیانكاتە بەڵگە، ئەو ئاسمانو زەویو ئەو دیاردەو دیمەنانە بكاتە بەڵگە، لەسەر خوا بەیەك گرتن، كە تەنیا خوا خاوەنو هەمەكارەی كەونو كائیناتەو، دەبێ هەر ئەویش بپەرسترێو بەندایەتیی بۆ بكرێ.

سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، (مُلْك) واتە: هەر شتێك کە هەیە، دەگوترێ: ئەوە موڵکی فڵان کەسە، واتە: کە لەژێر دەستی ئەو دایەو لەژێر رکێفی ئەو دایە، بەڵام وشەی: (مَلَكُوتَ) تەنیا بۆ خوا بەکاردێ، دەگونجێ بڵێی: موڵکی سولەیمان ﴿عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَ﴾، موڵکی داوود، موڵکی فڵان پادشا، بەس ناگونجێ بۆ بەشەران بڵێی: (مَلَكُوتَ)، (مَلَكُوتَ) تەنیا هی خوایە، چونکە (مَلَكُوتَ)، واتە: موڵکی فراوان گشتگیر، هەر خواش خاوەنی رەهای هەموو موڵکی بوون و ئاسمانەکان و زەوییە.

چوارەم: کە دەفەرموێ: ﴿وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ﴾، وە بۆ ئەوەی ئیبراهیم لە دڵنیایان بێ، (یقین)ی هەبێ، (یقین) بریتییە: لە زانیارییەك کە ئینسان لەرەلەری تێدا نەمێنێ، وەك جارێکی دیکە، وێنەم هێنایەوە: ئەگەر من بڵێم ئەمە دەفتەرە، یەقینم هەیە، ئەمە دەفتەرە، تێیدا دەنووسرێ، ئەوە میکرۆفۆنە ! ئنجا هەر شتێك کە تۆ لەبارەیەوە یەقینت هەیەو دڵنیایی تەواوت هەیەو هیچ گومان و دڵ لە دڵدانت نیە، ئەوە پێی دەگوترێ: یەقین، بۆیە هەندێك لە زانایان ئاوا یەقینیان پێناسە کردوە: (اليَقِينُ: عِبَارَةَ عَن عِلْم يَحْصل بَعْدَ زَوَالِ الشُّبْهَةِ بسَبَبِ التَّأَمّل، وَلِهَذَا المَعْنَى لا يُوصَف علم الله تَعَالى بكُونه يَقِيناً، لأَنَّ عِلْمه غَيْر مَسْبُوق بالشُّبْهَة وَغَيْر مستفاد من الفكر والتأمل)[1] واتە: یەقین بریتییە لە زانیارییەك کە لە دوای لاچوونی شوبهەیەکەوە پەیدادەبێ، بەهۆی وردبوونەوەو تێوە رامانی تەواوەوە، بۆیە زانیاریی خوای بەرز بە (يَقِين) وەسف ناکرێ، چونکە زانیاریی خوا، گومانی پێش نەکەوتوەو، لە ئەنجامی بیرکردنەوەو رامانەوە، پەیدا نەبووە.

---

١) (التفسير الكبير) للرازي ج٧، ص٣٨.

پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ ﴾، (جَنَّهُ اللَّيْل، وَأَجَنَّه اللَّيْل، وَ جَنَّ عليهم اللَّيل) هەرسێکیان یەك مانایان هەیە، واتە: شەوگار دایپۆشی، سێبەری لێکرد، (مَجنون)یش عەقڵەکەی داپۆشراوە، (جَنّة)ش لەبەرئەوەی باغەکە چڕو پڕەو زەوییەکەی دیار نیە، لەبەر درەختەکان.

شەشەم: کە دەفەرموێ: ﴿ رَءَا كَوۡكَبًا ﴾، ئەستێرەیەکی بینی.

توێژەرەوان زۆر باسیان کردوە، ئەوە کام ئەستێرەیە؟ هەندێك گوتوویانە: زوهرەیە، هەندێك گوتوویانە: موشتەرییە، هەندێك گوتوویانە: زوحەلەو...هتد، گرنگ ئەوەیە خوا دیاریی نەکردوە، چ ئەستێرەیەکی بینیوە.

حەوتەم: کە ئیبراهیم ﷺ ئەستێرەو مانگو خۆری بینیونو، بە هەر سێکیشیانی گوتوە: (هَذَا رَبّي) ئا ئەمە پەروەردگارمە ! پێشتر باسمان کرد : توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئایا ئەو هەڵوێستەی ئیبراهیم مەبەست پێی تەعبیرکردن بووە لە بیروبڕوای نەیارەکانی، کە غەیری خوایان پەرستوە؟ یان تەعبیری لە ناخی خۆیو قەناعەتی خۆی کردووەو، وایزانیوە ئەوانە خوان؟ بە هەردووك ئەگەرەکەش: حاڵو ماقەمەکە، بریتیە لە حاڵو مەقامی وتووێژو گفتوگۆو دەمکوتکردنی بەرانبەرەکان.

وە زانایان ئاوا تەعبیریان لەو دوو ئەگەر (إحتمال)ە کردوە، دەڵێن: (هَلْ هُوَ مَقَامُ نَظَرٍ، أَوْ مُنَاظَرَةٍ)؟ ئایا حاڵەکە: تێفکرین بووە، یان وتووێژ ؟ دیارە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان (الطبري) قەناعەتی وایە ئەو هەڵوێستەی ئیبراهیم، بریتیە لە تەعبیرکردن لە ناخی خۆی، واتە: ئیبراهیم وتووێژێکی زاتیی و نێوخۆیی کردوە لەگەڵ خۆیدا، وەك دەڵێ: (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلُهُ:" ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥ ﴾، يَعْنِي بِهِ الشَّمْس وَالقَمَرُ وَالنّجُوم، ﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي ﴾، فَعَبَدَهُ حَتَّى غَابَ، فَلَمَّا غَابَ ﴿ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴾،

فَلَمّا رَأَى القَمَر بَازِغاً، ﴿ قَالَ هَٰذَا رَبِّي ﴾، فَعَبَدَهُ حَتَّى غَابَ، فَلَمَّا غَابَ، ﴿ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ ﴾، ﴿ فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَا أَكْبَرُ ﴾، فَعَبَدَهَا حَتَّى غَابَتْ، فَلَمَّا غَابَت قَالَ: يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُون)[1]، واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ گـێڕدراوەتەوە لەبـارەی فەرمایشـتی خـواوە کـە دەفەرموێ: ئاوا موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەویی پێشانی ئیبراهیم دەدەین، بۆئـەوەی لە دڵنیایـان بـێ، مەبەستی پـێ: ئەستێرەو مانگو خـۆرن: کـاتێك شـەوی لـێ بەسەرداهـات، ئەستێرەیەکی بینی، گـوتی: ئـەوە پـەروەردگارمە، وە پەرستشی بۆ کـرد، تاکو ئەستێرەکە ئاوابوو، کە ئاوا بـوو گـوتی: مـن ئـاوابووانم خۆشناوێن، دوایی کە مانگی بینی بە شـۆقتـر بوو لە ئەستێرەکە، گـوتی: ئەمە پەروەردگـارمە، وە ئەویشی پەرست تـاکو ئـاوابوو، کاتێـك کـە ئـاوابوو، گـوتی: ئەگـەر پەروەردگـارم (کـە لـە دەروونـی خـۆم دا دەیناسـمو هەستی پێدەکـەم) ڕێنمـاییم نەکـات لـە کۆمـەڵی گومڕایـان دەبـم، وە کـاتێـك خـۆری بینـی، گـوتی: ئەمـە پەروەردگارمە! ئەمـە لە هـەموویان گـەورەترە، ئنجـا ئەویشی پەرست تـا ئاوابوو، کاتێك کە ئاوابوو، گوتی: ئەی خەڵکەکەم! من لـەوەی کـە ئێـوە دەیانکەنـە هاوبەش بۆ خـوا دوورو بەرییمو حاشـایان لێدەکـەم.

ئنـجا دوایی (الطبـري) دەڵـێ: (وَأَنْكَـرَ قَـوْمٌ مِـنْ غَيْـرِ أَهْـلِ الرِّوَايَـةِ هَـذَا القَـوْلَ الَّـذِي رُوِيَ عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاس... وَزَعَمُـوا إِنَّمَـا قَـالَ ذَلِـكَ عَلَـى وَجْـهِ الإِنْكَـارِ مِنْـهُ، أَنْ يَكُون ذَلِـكَ رَبَّه، وَقَـالَ آخَـرُون مِـنْهُمْ: إِنَّمَـا مَعْنَـى الكَلاَمِ: أَهَـذَا رَبِّـي؟ عَلَـى وَجْـهِ الإِنْكَـارِ وَالتَّـوْبِيخ)، واتـە: کەسـانێك لـە غەیـری ئـەوەی دەقـەکانیان گێڕاوەتـەوە، ئەم قسەیەی کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عـەبباس گێردراوەتـەوە، نکووڵییـان کـردووەو گوتوویـانە: وانیـە، ئیبـراهیم تەعبیـری لـە نـاخی خـۆیو قەنـاعەتی خـۆی نەکـردوە، وە گوتوویـانە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس واینەگوتـوە، (ڕەنگـە

---

١) جامع البيان للطبري رقم: (١٣٣٧٨).

گوتبیان: نەیپێکاوە)، وە گوتوویانە: ئیبراهیم کە وایگوتوە، نکووڵیی لەوە کردوە کە ئەو ئەستێرەیە، ئەو مانگە، ئەو خۆرە، پەروەردگار بێ، واتە: بەشێوەی نکووڵیی لێکردنو توانجو تەوسەوە وایگوتوە، یانی: ئەمە پەروەردگارمە!! هەندێکیش گوتوویانە: مانای قسەکەی ئیبراهیم ئەمەیە: (أَهَذَا رَبِّي ؟) ئایا ئەمە پەروەردگارمە؟ پرسیاری کردوە، پرسیار کردن بە نکووڵیی لێکردنو سەرزەنشت کردنەوە.

ئنجا ئیمام (الطبري) دەڵێ: مادام خوا بۆخۆی هەواڵی پێداوین، قسەی ڕاست ئەوەیە دانی پێدابێنین: کە ئیبراهیم جارێك ئەستێرەی بە پەروەردگار زانیوەو، جارێك مانگو، جارێکی دیکە خۆر، دوایی گەیشتۆتە قەناعەت، کە ئەوانە هیچ کامیان ناگونجێن پەروەردگاربن.

بەڵام هەر کام لە ئیمام (فخرالدین الرازي) و (الآلوسي) و (جمال الدین القاسمي) و (الشوكاني)و هی دیکەش دەڵێن: ئیبراهیم لێرەدا کە بە هەرکام لە ئەستێرەو مانگو خۆری گوتوە: پەروەردگارمە، مەبەستی نەبووە بڵێ: ئەوانە پەروەردگارن، بەڵکو لە حاڵەتی وتوویژو شەڕەقسەو پێ سەلماندنی کافران دا بووە، کە وایگوتووە، جا ئەو زانایانە چوار واتایان بۆ هێناون:

١) مەبەستی ئەوەبووە بڵێ: گریمان ئەگەر وابوو، واتە: ئەوانە پەروەردگار بوون، وەك چۆن یەکێك بە یەکێك دی دەڵێت: باشە گریمان ئەوە وایە.

٢) مەبەستی ئەوەبووە، کە ئەوە بەپێی گومانی ئێوە وایە.

٣) بەشێوەی پرسیارکردن گووتویەتی: ئایا ئەوە پەروەردگارمە؟

٤) بەشێوەی گاڵتەپێکردنو توانج تێگرتنەوە گوتوویەتی: ئەوە پەروەردگارمە!

## ڕای خۆم لەوبارەوە:

منیش دوای ئەوەی نزیکەی سی (٣٠) تەفسیرم تەماشا کردوە، گەیشتمە ئەو ڕایەی کە ئیبراهیم ﷺ ئەوانەی بە پەروەردگار نەزانیوەو، لە ناخی خۆیەوەو بە سروشت خوای بە پەروەردگار ناسیوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الـــروم، واتـــە: ڕووی خـــۆت ڕاســـت بکـــە لەگـــەڵ ئاییـــنێك دا کـــە خـــوا ناردوویەتی بە پاکیی، ئەو ئایینو مسـوڵمانەتییە کـە ڕێـكو گونجـاوە لەگـەڵ ئـەو سروشتەدا کە خوا خەڵکی لەسـەر سـروشـتاندوەو دروسـت کردوە،

هـەروەها پێغـەمبەر ﷺ لە فەرمایشـتێکدا دەفەرموێ: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَـدُ عَلَى الْفِـطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَـوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ وَيُمَجِّسَانِهِ}[1]، واتـە: هـەموو ئینسانێك لەسـەر سروشـتی خـواناسیی لەدایـك دەبێـت، بـەڵام دوایـی بـابو دایکـی، دەیکـەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەصرانیی، یان دەیکەنە مەجووسـیی.

جـا ئەگـەر خەڵـکی خـوای خۆیـان بناسـن، بێگومـان پێغـەمبەران لـە خەڵـکی دیکە سـافو سـاغتـرن، وەك یەکێـك لـە شاعیـران لـە مـەدحی پێغـەمبەری خـوا ﷺ دەفـەرمـوێ :

مُـحَـمَّد بَشَـرٌ وَلَيْسَ كَالْبَشَـرِ     بل هُـوَ يَاقُوتَـةٌ وَالـنَّـاسُ كَالْحَجَـرِ

بێگومان ئیبـراهیم ئەو خـوا ناسـینە (معرفـة الله) لـە دڵو دەروونو عەقـڵی دا هـەبووە پێـش ئـەوەی وەحیـی بـۆ بـێ، بـەڵام ئایـا ئـەو پەروەردگـارە چۆنـە؟ سـیفەتەکـانی چیـین؟ نـاوە بەرزەکـانی چیـین؟ چـۆنی مامەڵـە لەگەڵدا بکـاتو چۆنـی بپەرسـتێ؟ ئەو شـتانەی نەزانیون، کە بە وەحیـی نەبێ نازانرێـن.

ئایا من بەڵگـەم چییـە لەسـەر ئەوە؟ بەڵگەم ئەوەیە: خـوا بـە کەسێك کـە لـە ئیبـراهیم گەورەترە، کـە (محمـد المـصطفى)یـە، دەفـەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا

١) أَخْرَجَـهُ الـبُـخَـارِيُّ بـرقم: (٦٥٩٩)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (٦٧٠٠)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٧١٤)، عَـنْ أَبِـي هُـرَيْـرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

﴿ نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى

واتــە: وە ئــاوا بـەو شــێوەیە (وەك چـۆن بـۆ پێغــەمبەرانی پێشــێ وەحییمـان ناردوە) بۆ تـۆش ئـاوا سـروشـمان كـردوە (كـە نـاوی لـێدەنـێ ڕووح)، ڕووحێكمـان لەلایەن خۆمـانەوە بۆ تـۆ نـاردوە، پێشتـر تۆ نەدەتـزانی كـتێب (بەرنامە) چییـە؟ وە نەدەتزانی ئیمان چییە ؟ بەڵام ئێمە ئـەم قـورئـانەمـان نـاردوەو كردوومانـە بـە ڕۆشــناییەك، هـەر كەسـێك لـە بەندەكـانمان كـە بمـانەوێ پێـی ڕێنمـایی دەكــەین، وە تـۆش خـەڵك ڕێنمـایی دەكـەی بـەرەو ڕێـی ڕاسـت، (واتـە: بەهـۆی قورئـانو وەحییـەوە).

كەواتـە: سـەروەری پێغـەمبەرانیش (محمـد الـمصطفى) ﷺ پـێش ئـەوەی وەحـی بـۆ بـێ، نەیزانیـوە: ئیمـان چییـەو، بەرنامـەی ژیـان چییـە؟ ئنجـا ئەگـەر ئیبـراهیمیش ئـەوە نەزانــێ، ئـەوە لـە پێشتــرە، چـونكە بـە تەئكیـد سروشـتو مەعـدەنی سـەروەری پێغـەمبەران (علیـهم الصلاة والسلام) لـە هـی ئیبـراهیـمو هـی هەموو پێغـەمبەرانیش ساغتـرو سافتـرو بەرزتـر بووە.

بەڵــێ ئیبــراهیم ﷺ لــە دەروونــی خۆیــدا، بــە عەقــڵ زانیویــەتی كــە پەروەردگـارێكـی هەیــە، وە ئـەم بوونـەوەرە شـاری بـێ خـاوەن نیـە، بـەڵام ئـەو خـاوەنە دەبـێ كـێ بـێ؟ سیفەتەكانی چۆنـن؟ دەبـێ لـە كـوێ بـێ؟ هـەتـا وەحـی بۆ نەیـەت نـازانـێ، تەنیـا دەزانـێ كە خـوا هەیەو بەدیهێنـەرێك هـەیـە.

هەر بۆیەشـە هـەموو فەیلەسـووفەكان، وە كامـەیان لـە هـەمووان ـ وەك دەڵێـن ـ عاقڵتــربووەو عەقــڵی گــەورەتر بــووە، وەك: (ســوقرات، ئەفــلاتوون، ئەرســتۆ) دەبیــنین لـە ناسـینی خــوادا بەهەڵــەداچوون، هـەبووە گوتوویـەتی: خــوا ژمـارە (عـدد)یە، وە هەبووە گوتوویـەتی: خـوا ڕووناكییــە، وە هـەبووە گوتوویـەتی: خــوا چوار توخمەكـانن: ئـاوو هـەواوو ئاگـرو گڵ! پاكیـی بۆ خـوا، وە ئـەوەی بەحیسـاب لە هـەمووان عاقڵتـر بووە، گوتوویـەتی: خــوا وەك هـیچ كـام لـە دروستكراوەكـانی نیـە، بـەڵام بوونـەوەری وەك كـاتژمێـرێك قـوڕمیش كـردوەو لـێی گـەڕاوە!

وە زۆرێــك لـە فەیلەسـووفەكان لـە یەكـێك لـە قسـەكانیاندا دەڵێن: خــوا شـتی گـەورە گـەورە دەزانــێ، بـەڵام شــتی وردەكــاریی نـازانــێ، چونكـە شـایسـتەی خــوا

نیـە، کـە ئـەو شـتە گچکـانە بزانـێ، بۆیـەش (أبـو حامـد الغزالـي) لـە کتێبـی (تهـافة الفلاسفة)دا دەڵێ: من لەبەر سـێ شـتان فەیلەسووفەکانم پـێ کافـرن:

أ/ کە دەڵێن: خـوای پەروەردگار زانیاریی بە شتە وردەکان (جزئیـات) نیـە، کەچی خـوا ﷻ بۆخـۆی دەفـەرموێ: ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٣١﴾ ﴾البقـرة، واتە: وە بزانـن کـە خـوا ﷻ بە هـەموو شـتێك زانـایە.

ب/ دەڵـێن: زیندووبوونـەوەی جەسـتەیی (المعـاد الجسـماني) نیـە، تەنیـا ڕووحەکـان، سـزا دەدرێـن، یـان نیعمـەت دەبینـن، بـەڵام جەستەکان زینـدوو نابنـەوە، کەچی خـواش ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ النحـل.

ج/ دەڵێن: ئەم بوونـەوەرە هەر لە سـەرەتاوە لەگەڵ خـوادا هەبووە، یـانی: کاتێك نەبـووە پەیدابووبـێ، دوای خـوا، بەڵـکو خـوا هـەر لەگـەڵ خۆیـدا دروسـتی کـردووە هـەربوو (أزلـي) یـە ! خـواش فەرموویـەتی: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ ... ﴿٦٢﴾ ﴾ الزمـر، واتە: خـوا بەدیهێنـەری هـەموو شـتێکە.

بەڵـێ ئیبـراهیم بـۆ دۆزینـەوەی ئـەوە گەڕاوە، کە لـە دڵو دەروونو عەقڵـی دا هەبـووە، بۆیـە کـە: ئەستێرەیەکی زۆر بەشـۆقی بینیـوە، گوتوویـەتی: ڕەنگـە ئـەوە پەروەردگـارم بـێ، دوایـی کـە مانگـی بینیـوە گوتوویـەتی: ڕەنگـە ئەمـە هـەوبێ، دوایـی کـە شـەوگار تێپـەڕیوەو، خـۆری بینیـوە گوتوویـەتی: ڕەنگـە ئەمـە هـەوبێ، چونکـە لە هـەمووان بە شـتۆقـتـرو گـەورەترە.

بۆیـە من قەناعەتم وایە کـە قسەکەی (طبري) ڕاسـتە، چونکە لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکـەدا گونجـاوە، ئنجـا لێشـمان تێکـنەچێ، کـە ئـەو کـاتە ئیبـراهیم گـەنج بووەو تـازە پێگەیشـتووە، جارێ وەحی بۆ نەهاتوە، بەڵام دیسان دەشگونجێ قسەی ئەوانەی دیکـە ڕاسـتبێ.

هەشتەم: ئیبراهیم ﵇ کە ئەستێرەو مانگو خۆری بینیون، خوا بۆ هەر سێکیان فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَ ﴾، بۆ ئەستێرە دەڵێ: ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَ ﴾، بۆ مانگیش دەڵێ: ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَ ﴾، بەڵام بۆ خۆر دەڵێ: ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَتْ ﴾، چونکە خۆر مێینەی مەجازییە، ئنجا ئایا بۆچی ئیبراهیم ﵇ ئاوابوونی هەر کامێك لەو سێیانە، دەکاتە بەڵگەی ئەوە کە ئەوانە ناگونجێ پەروەردگاربن؟ وەڵام: چونکە پەروەردگار کە مشوورگێڕی بوونەوەرە، دەبێ هەمیشە بەئاگاو بێداربێ، ئەگەر ئاوابێو پەنهان بێ، کێ ئاگای لە بوونەوەرو دروستکراوەکان دەبێ.

جا بۆیەش خوا لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیایی لە سەرووتانەوە حەوت چین (ئاسمانمان) دروستکردوون، وە ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێئاگا نین.

نۆیەم: کە ئیبراهیم ﵇ ئەستێرەو مانگو خۆری بینیونو دوایی ئاوابوون، بە هەر سێکیانی فەرمووە: ﴿ لَآ أُحِبُّ ٱلْأَفِلِينَ ﴾، من ئاوابووانم خۆشناوێن، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە یەکەمین سیفەت کە دەبێ مرۆڤەکان پەلکێش بکات بۆ لای خوای پەروەردگار، بریتییە لە خۆشویستن، واتە: پەرستراو (معبود) بەر لە هەموو شتێك، دەبێ خۆشتبوێ، دڵت بۆی بچێ، نەك لێی بترسێو سامی لێبکەی، بۆیە ئیبراهیم ﵇ گوتوویەتی: ﴿ لَآ أُحِبُّ ٱلْأَفِلِينَ ﴾، ئەگەر لە خوا ترسان لە پێشەوە بووایە، دەیگوت: (لا أخافُ الأَفِلين)، مەبەستم ئەوەیە زۆرجار مامۆستاو بانگخوازەکان کە باسی پەروەردگار دەکەن، زیاتر لایەنی ترسان لە خواو، تووڕەبوونی خواو، لێپرسینەوەی خواو، سزادانی خوا، دەخەنە ڕوو، بەڵام کاتێك کە تەماشای قورئان دەکەین، جۆرێکی دیکەیە، هەر کە قورئان دەکەیەوە، خوای لێبوردەو

بە بەزەیی، ئاوا دەست پێدەكات، دەفەرمویْ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾، سیفەتەكانی بەزەیی‌و بەخشندەیی‌و چاكەكاریی، كە دەبێ خوا لەسەر ئەو سیفەتانە خۆشبویستری، ئەوانە دەخرێنە ڕوو، بۆیە ئێمە نابێ خوا بەو شێوە بە خەڵك بناسێنین كە هەر لێی بترسێن، ئنجا كەسی وا هەیە كە قسە بۆ خەڵك دەكات، وادەزانێ خوا لە بەهانەیە بۆئەوەی سزایان بدات! نەخێر، بەڵكو خوای بەخشندە دەیەوێ بەندەكانی بەهرەمەند بكات، بۆیە ئێمەی دروستكردوە، دیارە ئێمەی خۆشویستوەو دەیەوێ بەهرەمەندمان بكات‌و سوودمان پێبگەیەنێ، هەر بۆیە خوا دەفەرمویْ: من خۆڕاگرانم خۆشدەوێن‌و، چاكەكارانم خۆشدەوێن‌و، ئەوانەم خۆشدەوێن، كە پشتم پێ دەبەستن، وە تۆبەكارانم خۆشدەوێن‌و، پاك‌و خاوێنانم خۆشدەوێن‌و، تێكۆشەرانی ڕێی خۆمم خۆشدەوێن، خوای پەروەردگار خاوەنی ئەو سیفەتانەی خۆشدەوێ.

دەیەم: كە دەفەرمویْ: ﴿فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا﴾، هەروەها دوایی بۆ خۆریش دەفەرمویْ: ﴿فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ﴾، وشەی (بزغ) واتە: (قطع) ئەو كەسەی كە چارەسەری ئاژەڵان دەكات، ئەگەر نەخۆشییەكیان هەبێ، وەك چۆن پزیشكی مرۆڤ هەیە، پزیشكی ئاژەڵانیش هەیە كە بە كوردی پێی دەڵێن: بەیتار[1]، جا وەك چۆن شتێك بە تێغێك دەبڕدرێ، وەك ئەوە وایە كە ڕووناكیی ئەستێرەو مانگ‌و خۆریش تاریكیی ببڕێ، ئاوا دڕ بە تاریكیی دەدات‌و پەردەی شەو دەدڕێ، جا ئەمە ئاماژەشە بەوە، كە ڕووناكیی ئیمان‌و خوا بەیەكگرتن‌و، ڕووناكیی عەقڵ‌و سروشتیش، پەردەی تاریكیی‌و كوفرو شیرك دەدڕن.

وە هەر كەسێك عەقڵێكی سەلیمی هەبێ، پەروەردگاری خۆی دەناسێ، وەك ئیبراهیم، دەیناسێ بەو واتایە كە دەزانێ هیچ كام لە دروستكراوەكان،

---

١) مختار الصِّحاح، ص: ٥٨ ، (بزغ الحاجِمُ والبيطارُ، أي شرطاً، وبابه، قطع).

پـەروەردگـار نـین، بەڵکـو پـەروەردگار لـە پشت ئـەو دروستکراوانەیـە، وە دەبـێ سیفەتەکانـی جیـابن لـە هـی ئـەو دروسـتکراوانە، بـەڵام وردەکارییـەکانو ڕوونکـردنەوەی سـیفەتەکانی خـواو ناوەکـانی خـوا، دەبـێ لـە ڕێـی وەحییـەوە بزانـرێـن.

یازدەیـەم: کە دەفەرموێ: ﴿لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ﴾، ئەگـەر پـەروەردگارم ڕێنمـاییم نەکـات، بـە دڵنیـایی مـن لـە کۆمـەڵی گومڕابـووان دەبم، کەواتە: ناسینی خوا، لـە دەروونـی ئیبـڕاهیم دا هـەبووە، بـەڵام لـە واقیـع دا نەیتـوانیوە دیاریی بکات، دوایی کـە هـەموو شـتەکانی تاقیکردوونـەوە، زانیویـەتی کە ئەوانە هیچیان پەروەردگار نین، بەڵام کە تەماشـای ئەسـتێرەو مـانگو خـۆری کـردوە، کـە زۆر بـەرز بـوون، ڕەنگـە وایزانیبـێ ئەوانـە هـەوبن، دوایـی بـۆی دەرکـەوتوە کە هیچ کام لە دروسـتکراوەکان، ناگونجێ ئـەو پەروەردگـارە بـن، کە لە دەروونـی خـۆی دا دەیناسـێ.

دوازدەیـەم: کـە دەفـەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَءَا الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُ﴾، کاتێك کـە خۆری بینی، تیشـکەکەی دڕی بـە تاریکـی دابوو، گوتی: ئا ئەمـە پەروەردگـارمـە، ئەمـە گـەورەترە !

لێـرەدا پرسیارێك دەکـرێ: لـە ڕووی زمـانەوانییەوە کە خـۆر (شـمس) مێینـەی مەجـازیی (مؤنـث مجـازي)یـە بۆچـی نەیگـوتوە: (هذه ربّـي) چونکـە مەبەسـت ئەوەیـە (هـذا الطّـالِعُ) یـان (هـذا الـموجود)، بـە هـەر حـاڵ دەگونجـێ (مؤنـث)ی مەجـازیی بـە ڕانـاوی نێرینـەش ئامـاژەی بـۆ بکـرێ، کەواتـە: پـەروەردگار دەبـێ گەورەترین بـێ، چونکـە هـەر کامێك لـە ئەسـتێرەو مـانگو خـۆر، لـەوەی دیکە گەورەتر بووە، کەواتە: لە سروشـتو عەقڵی مرۆڤ دا، ئـەوە هەیە کە پەروەردگار دەبـێ گـەورەترین شـت بـێ، هـەر بۆیـە ئێمـەش لـە کـاتی بانگدا دەڵێیـن: (اللّهُ أَكْبَر) خـوا گـەورەترە، وە هەڵبەتە کە دەڵێین: خـوا گـەورەترە، نـەك بـە قـەبارە، بەڵکو بە هەرچی چەمكو واتای گەورەیی هەیە، کە بۆ خـوا شـایسـتەیە، هـەروەها کـە دەڵێیـن: (سُبْحَانَ رَبِّي الأَعْلَى) پـاکیی بـۆ پـەروەردگاری هـەرە بـەرزم، واتـە: بـەرزیی بە هـەموو ئەو چـەمكو واتـایانەی کە بۆ خـوا شـایسـتەن.

سێزدەیەم: کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴾، کاتێك خۆریش ئاوابوو گوتی: ئەی گەلەکەم! من بەرییم لە هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانکەنە هاوبەشی خوا، ئەوانە بەکەڵکی ئەوە نایەن بێنە ڕیزی خوا، واتە: دوای ئەوەی کە لەنێو جیهانی بەرهەستدا، پەروەردگاری بەردەست نەکەوت، زانی کە پەروەردگار دەبێ بەرهەست (محسوس) نەبێ، وە دەبێ لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە هەستی پێنەکرێ، ئنجا ئیبراهیمیش کە تەماشای ئەستێرەو مانگو خۆری کردوە، هەر ئەوانە گەورەبوون‌و، وێڕای ئەوەی بەکەڵکی پەروەردگارێتی نەهاتوون، مانای وایە شتە بچووکەکان هەر ناگونجێ پەروەردگاربن، بۆیە سەرەنجام بە گەلەکەی دەڵێ: من بەرییم لە هەموو ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن، لە دارو بەردو ئەستێرەو مانگو خۆرو هەرچی هەیە، من خۆمیان لێ بە دوور دەگرم.

چواردەیەم‌و کۆتایی: ئەوە کە ئیبراهیم ﷺ دەڵێ: ﴿ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، من ڕووی خۆم وەرسووڕاند بەرەو کەسێك کە ئاسمانەکان‌و زەوی دروست کردوون، بە پاکیی ڕووی خۆم کردە وی، وە من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم.

مەبەست لە ڕوو (وجه) لێرەدا ڕووی دڵە، ڕووی نیازو مەبەستە، نەك ڕووی دەم‌و چاو، چونکە خوای پەروەردگار شوێنێکی دیارییکراوی نیە، تاکو ڕووی دەم‌و چاوی خۆمانی تێبکەین، بەڵێ خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی‌و لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەڵام بەو چەمك‌و مانایە کە شایستەی خوایە، بەڵکو واتە: ڕووی زاتی خۆم‌و، نیازو ئامانجی خۆم، ئاڕاستەی خوا کرد، کە هەر ئەو پەرستراوە.

**مەسەلەی سێیەم:** خوای پەروەردگار باسی بەسەرهاتی سێیەمی ئیبراهیم ﷺ دەکات کە تووشی موناقەشەو شەڕە قسە بووە، دەفەرموێ: ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي

شَيْـًٔاۗ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًاۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًاۚ فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾، لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا، باسی سێیەم وتووێژی ئیبراهیم ﷺ دەکات، هی یەکەم لەگەڵ بابی بوو، هی دووەمیان وتوێژی زاتیی بوو، لەگەڵ خوّی دا، لەسەر ڕای ئەوانە کە دەڵێن: ئیبراهیم لەگەڵ خۆیدا قسەی کردوە، یاخود وتووێژێك بووە لەگەڵ ئەستێرەو مانگو خۆرپەرسان دا، لەسەر ڕایەکەی دیکە.

هی سێیەمیش، وتووێژ لەگەڵ هاوبەشدانەرەکان دا، دەفەرموێ: ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ﴾، گەلەکەی شەڕە قسەیان لەگەڵدا کرد، بە حیسابی خۆیان بەڵگەیان بۆ هێنایەوەو وتووێژو دمبەدمبەیان لەگەڵدا کردوە.

### فامرانەوەی هەشت خاڵی گرنگ لە ئایەتی (٨٠) :

یەکەم: کە ئیبراهیم ﷺ فەرموویەتی: ﴿ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ﴾، ئایا شەڕە قسەم لەگەڵدا دەکەن، دەربارەی خوا، لە حاڵێکدا کە خوا ڕێنمایی منی کردوە؟ یانی: ئەوە شتێکی زۆر بێجێیو بێ مانایە، من پەروەردگارو پەرستراوو خاوەنی خۆم چاك دەناسم، ئێستا ئێوە قسەی چی دەکەن؟ دیارە ئەم قسەیەی ئیبراهیم هی دوای وەحییە، چونکە لێرەدا زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی قسەی خوّی دەکات، واتە: من ئێستا بەرچاوم ڕوونە، پێغەمبەران هەمیشە گوتوویانە: ئایا دەبینن، یان پێم بڵێن: ئەگەر لەلایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرابم ؟

دیارە پێغەمبەرانو شوێنکەوتووانیان، بەهۆی ئەو وەحییەوە کە خوا دەینێرێ، بەهۆی ئەو ئیمانەوە کە لە دڵیان دا جێگیر دەبێ، بەرچاویان زۆر ڕۆشنەو دەگەنە دڵنیایی تەواو، بەڵام خەڵکی دیکە لە گوماندایە، واتە: خەڵکی بێ بڕوا.

من زۆرجار موناقەشەم بووە لەگەڵ خەڵکیی مولحیدو بێ دینو ماددیی دا، کە بڕوایان بە ئایین نیە، ئەوانە لە کاتێکدا کە دەگەنە لووتکەی ئیلحادیش لە گوماندان، هەرگیز مرۆڤ لە کوفرو شیرکو ئیلحاددا، ناگاتە دڵنیایی.

یەکێك[1] بۆی گێڕامەوە گوتی: مارکسییەکی زۆر تۆخ بووم، بڕوام بە هیچ شتێکی نادیار نەبوو، بە حیسابی خۆم گاڵتەم پێدەهات، لە سەردەمی ڕژێمی بەعس دا لەسەر کوردایەتیی گیرام، فڕێیاندامە ژێرخانێکەوە، زۆر تاریكو ناخۆش بوو، زۆرم پێ سەیر بوو، یەکەمین کەس کە هاوارم لێ کرد خوا بوو، گوتم: (یا أللّه)؟! دەیگوت بۆخۆم سەرسام بوو بووم لە خۆم، دەمگوت: بەحیساب من خوا ناناسمو بڕوام پێی نیە!! گوتی: لەو کاتەوە بۆم دەرکەوت ناسینی خوا شتێکە مرۆڤ دەستەڵاتی بەسەریدا نیە، سروشتو بوونەوەر هەمووی هاواری خوا دەکات.

برایەکی دیکەش دوای ئەوەی خوا هیدایەتی دابوو، گوتم: چۆن گەڕایەوە؟ گوتی: ئەگەر مرۆڤ ئایینی نەبوو، ئیمانی نەبوو، هەمیشە بیر لە مردن دەکاتەوەو بیر لە ئایندەی خۆی دەکاتەوە، شەوێکیان لەسەر پشت ڕاکشابووم، هەر تەماشای مانگم کردو لێی وردبوومەوە، باشە ئەوە مانگی یەك شەوە، دوو شەوە، دوایی دەبێتە پازدەو شازدەو حەڤدە، دوایی کەم دەکاتەوە، وەك دەمی داسی لێدێتەوە، دوایی بیرم لەو ئەستێرانە کردوە، دوایی خۆر کە بەو ئەندازەگیرییە ڕێكوپێکەیە، گوتم: ئاخر ئەوە چ عەقڵێك قبووڵ دەکات ئەو بازاڕە، ئەو بوونەوەرە، ئەو دنیایە خاوەنێکی نەبێ؟ گوتی: ئیدی هەر لەخۆوە چاوم پڕ بوو لە ئاو گریانێکم لێ غالب بوو، هەر بەو نیوە شەوە هاوسەرەکەم هەڵساند گوتم: هەڵسە ئاوم بۆ گەرم بکە، گوتی: بۆچی چی بوون ؟ گوتم: هەڵسە! بەرگی تازەشم بۆ بێنە ئەو پۆشاکانە بشۆ، دەڵێ: خۆم شۆردو پۆشاکەکانم

---

١) پێشتریش ئاماژەم بەو بەسەرهاتەوە کردوە.

پۆشیو خێزانم گوتی: چی ڕوویداوە، چیت بەسەر هاتوە؟ هەرچەندە چاکیش نوێژم نەدەزانی، دەستم بە نوێژکردن کردو زۆر گریاموو لە خوا پاڕامەوە، هاوسەرکەم گوتی: پێم بڵێ چی بووە؟ گوتم: هیچ نەبوە، بەس خوام ناسیی!

ئنجا ئەوەی کە ئیبراهیم لێرەدا دەیفەرموێ: ﴿قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ﴾، ئایا شەڕە قسەم لەگەڵدا دەکەن دەربارەی خوا، کە هیدایەتی داوم ؟ ئنجا ئەو هیدایەتو بەرچاو ڕۆشنییە، مرۆڤ تاکو بە کردەوە خۆی نەیبێ، چێژی لێناکاتو نایزانێ چۆنە؟ بۆیەش ئەهلی تەصەووفو عیرفان دەڵێن: (مَنْ ذَاقَ عَرَفَ)، واتە: هەر کەسێك چێژتی، دەزانێ، بۆ وێنە: خواردنێك، میوەیەك کە بڵێن: زۆر خۆشەو زۆر بەتامە، ئەگەر بۆخۆت تامت نەکردبێ، هەر چەند باسی بکەن، نازانی، (أبو حامد الغزالي) وێنەیەك دێنێتەوە، دەڵێ: ئەگەر بە منداڵێکی نابالغ بگوترێ: لەززەتی جینسیی ئاوایەو ئاوایە، تێناگاتو نازانێ چییەو چۆنە؟ ئەگەر بڵێی: وەك ئاو وایە لە کاتی تینوویەتی دا بیخۆیەوە، یان وەك پرتەقاڵە، هەر تێی ناگات، چونکە لەڕاستیدا وەك هیچ کامیان نیەو، ناشزانێ چۆنەو چییە، چونکە بۆخۆی نەیچێژتوە، ئنجا بابای بێدینیش ئاوایە، کە خوای نەناسیوە، چووزانێ ئیمانو پشت بە خوابەستنو، خوا خۆشویستن، چ تامێکی هەیە؟ بۆیە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم کە یەکێکە لە پیاوچاکان گوتوویەتی: (لَوْ عَلِمَ المُلُوك وَأَبْنَاءُ المُلُوكِ مَا نَحْنُ فِيهِ، مِنَ النَّعِيم والسُّرُورِ، لَجَالدونا بالسّيوف) واتە: پادشاو نەوەکانیان ئەگەر زانیبایان، ئێمە لە چ خۆشییو لەززەتێکی مەعنەویی داین، بە شمشێر شەڕیان لەگەڵدا دەکردین، تا لێمان بستێنن.

<u>دووەم</u>: کە ئیبراهیم عليه السلام دەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ﴾، ئەوەی ئێوە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، من لێیان ناترسێم، وا پێدەچێ ئیبراهیم عليه السلام یان ترساندبێ، دیارە گوتوویانە: پەرستراوەکانمان دەستت لێدەوەشێنن، تووشی شتێکت دەکەن، چۆن نایانپەرستی؟ ئەویش لە وەڵام دا فەرموویەتی: ئەو شتانەی ئێوە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، من لێیان ناترسێم.

سێیەم: بەڵام لێرەدا هەڵاواردنێكی تێدەخات، دەڵێ: ﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيۡـًٔا ﴾ مەگەر پەروەردگارم شتێكی بوێ، واتە: مەگەر پەروەردگارم بیەوێ، زیانێكم لێبدات، نەخۆشم بخات، شتێكم بەسەربێنێ، ئەگەرنا ئەو شتانە بیانەوێو نەیانەوێ هیچ نین، بۆیە لێرەدا پەروەردگاری جیادەكاتەوە، تاكو گومان نەبەن كە لە پەروەردگاریش ناترسێ، واتە: تەنیا پەروەردگارم دەتوانێ شتێكم بەسەر بێنێ، ئەگەر خۆشییە، ئەگەر ناخۆشییە، ئەگەر هەورازە، ئەگەر نشێوە، تاڵیی‌و شیرینی‌و خێرو شەڕ، هەر بەدەست خوایە.

چوارەم: دەفەرموێ: ﴿ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىۡءٍ عِلۡمًا ﴾، پەروەردگاری من زانیارییەكەی هەموو شتێكی گرتۆتەوە، هەموو شتێك دەزانێ.

پێنجەم: كە ئیبراهیم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا پەند وەرناگرن، بیرناكەنەوە، ئەو ڕاستییانەی كە لەگەڵ فیطرەت‌و سروشتاندا تێكهەڵكێشراون، نایانهێننەوە بیر خۆتان !

شەشەم: ئنجا ئیبراهیم ﷺ بەڵگە دێنێتەوە كە بۆچی لە پەرستراوەكانی وان ناترسێ؟ دەفەرموێ: ﴿ وَكَيۡفَ أَخَافُ مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنًا ﴾، جا من چۆن بترسێم لەو شتانەی كە ئێوە دەیانكەنە هاوبەش بۆ خوا، لە حاڵێكدا كە ئێوە لە سەرەنجامی ئەوە ناترسن، كە هاوبەشێكتان بۆ خوا داناوە، كە خوا هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نەناردوە؟ بەڵام خوا بەڵگەی لەسەر هەن: عەقڵ، زانست، سروشت، واقع، هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە خوا خاوەنیانە، بەڵام ئەو شتانەی كە دەیانپەرستن لەجیاتی خوا، هیچ بەڵگەیەكیان لەسەر نیە.

بەڵگەش بۆیە ناوی لێنراوە (سلطان) لە زمانی عەرەبییدا، چونكە دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵ‌و دڵی مرۆڤدا[1]، بەڵام بێگومان توانای هەیە

---

١) مختار الصِّحاح، ص : ٢٧٧.

بەسەر عەقڵی کەسێك دا، کە بەدوای بەڵگەو بەدوای هەق دا دەگەڕێ، ئەگەرنا کەسێك کە لە هەقی نەگەڕێ، بەڵگەش دەستەڵاتی بەسەر عەقڵی دا نابێ، چونکە نایەوێ، دەزانێ هەقە، بەڵام نکووڵیی دەکات، وەك خوا دەربارەی ئالی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ...﴾ ﴿١٤﴾ النمل، واتە: یەقینیان هەبوو کە موعجیزەکانی مووسا ﷺ ڕاستن و لە خواوەن، بەڵام نکووڵییان لێکرد، وەك کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (کەسێك بە تۆبزی بنێری بۆ مازووان[1]، لە داری هەڵناڕوانێ)[2]، دەڵێ: هیچی پێوە نەبوون.

هەروەها گوتراوە: (ئەگەر دز دز بێ، تاریکە شەو زۆرە)، خوای کاربەجێ دنیای وا دروست کردوە، کە ئینسان بتوانێ لە هەق ڕابکات، بەڵام لە قیامەتێ ناتوانێ لە هەق ڕابکات، چونکە هەموو شتەکان ڕوون و ئاشکرا دەبن.

حەوتەم: ئیبراهیم ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾، کام لە دوو کۆمەڵەکان شایستەترن کە دڵنیاو هێمن بن، ئەگەر بزانن، (من کە بە بەرچاوڕوونیی و بەڵگەوە پەروەردگاری خۆم دەپەرستم، یان ئێوە، کە بە دوای چەند شتێك کەوتوون و چەند شتێك دەپەرستن، هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نیە، نە عەقڵ، نە واقیع، نە فیطرەت، نابنە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەوانە پەرستراوبن؟).

هەشتەم: کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو، ئیمانەکەی خۆیان لەگەڵ ستەمدا تێکەڵ نەکردوە، ئا ئەوانە هێمنیی و ئاسایشیان بۆ هەیە، وە ئا ئەوانە ڕێگە ڕاست گرتووانن.

---

١) مازوو: شتێکە، کە پێستی پێ خۆش دەکرێ.

٢) هەڵناڕوانێ: تەماشا ناکات، بەرەو سەرێ ناڕوانێ.

ئەمە دەگونجێ هەر قسەی ئیبراهیم عليه السلام بێ، وە دەشگونجێ فەرمایشتی خوای پەروەردگار بێ، دیارە هەمووی هەر فەرمایشتی خوایە، بەڵام دەگونجێ خوای بێ وێنە، لەسەر زاری ئیبراهیم بیگێڕێتەوە، وە دەشگونجێ ئیبراهیم کاتی خۆی ئەو قسەیەی نەکردبێ و، خوای زاناو شارەزا کاتێك ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە، ئەم فەرمایشتەی خۆی نێواخن کردبێ.

کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار، هاوەڵانی بەرێز نارەحەت بوون، وەك لەم دەقەدا دیارە: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتِ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾، شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم، وَقَالُوا: أَيُّنَا لاَ يَظْلِمُ نَفْسَهُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم: «لَيْسَ هُوَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لاِبْنِهِ: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾ لقمان»﴾[1]، واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: کە ئەم ئایەتە هاتە خوار: (ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو ئیمانەکەیان لەگەڵ ستەم تێکەڵ نەکردوە، ئەوانە دڵنیان) هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خوا لێیان ڕازی بێ، نارەحەت بوون، گوتیان: جا کام لە ئێمە ستەمی نەکردوە (واتە: گوناهی نەکردوە)؟! پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم فەرمووی: مەبەست پێی ئەوە نیە کە ئێوە گومان دەبەن، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە لوقمان بە کوڕەکەی خۆی گوت: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾ لقمان، واتە: ئەی ڕۆڵە! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، هاوبەش بۆ خوادانان ستەمێکی زۆر گەورەیە.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٤٩٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٤٢)، وَأَحْمَد برقم: (٤٢٤٠)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحيح على شَرط الشَّيْخَين.

ئیمانەکەی خۆیان لەگەڵ ستەمدا تێکەڵ نەکردوە، یانی: دوای ئەوەی کە ئیمانیان هێناوە، هاوبەشیان بۆ خوا دانەناوە، ئا ئەوانە دڵنیان.

لێرەدا مەبەست لە (ظلم) گوناح نیە، بەڵکو مەبەست پێی شیرکە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾، ئا ئەم وتووێژو بەڵگە هێنانەوەیە، بەڵگەی ئێمە بوو، کە بە ئیبراهیممان دابوو، لەسەر گەلەکەی، لە بەرانبەر گەلەکەیدا، بەو شێوەیە هەر کەسێك بمانەوێ، چەند پلەیەك بەرزی دەکەینەوە، بێگومان پەروەردگارت کاربەجێی زانایە، ﴿ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ﴾، یانی: (جَميع ما تكلَّمَ بهِ مَعَ قَوْمِهِ) هەرچی کە ئیبراهیم گوتوویەتی لەگەڵ گەلەکەیدا، مەبەست پێی هەموو بەڵگەکانە، نەك یەك بەڵگە، وە کە دەفەرموێ: ﴿ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴾، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە نیعمەتەکانی: عەقڵو، قسەکردنو، بەڵگە هێنانەوە، بەخشراوی خوان، بۆیە، نابێ کەس ئەگەر عەقڵێکی زیادەی بوو، شارەزاییەکی زیادەی بوو، زمانپاراویی و قسەزانییەکی زیادەی بوو، پێی لەخۆبایی بێ، چونکە ئەوەتا خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ ﴾، ئێمە بە ئیبراهیم ماندا بوو، بەخششی ئێمە بووە.

کە دەفەرموێ: ﴿ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ﴾، بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە:

یەکەم / ﴿ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ﴾.

دووەمیش / (نَرْفَعُ دَرَجَاتِ مَنْ نَّشَآء)، هەر کەسێك بمانەوێ بە چەند پلە بەرزی دەکەینەوە، پلەکانی هەر کەسێك بەرز دەکەینەوە کە بمانەوێ.

ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە: بەهۆی بەکارهێنانی عەقڵی سەلیمەوە، بۆ ئیسپاتی خوا بە یەکگرتن، مرۆڤ پلەی لەلای خوا بەرزدەبێتەوەو بەرگرییکردن لە ئایینی خوا، پلەو پایەی ئینسان لەلای خوا بەرز دەکاتەوە، چونکە: خوا لەبارەی

ئیبراهیمەوە دەفەرموێ: پلەمان بەرز كردەوە، هەر كەسێك بمانەوێ چەند پلە بەرزی دەكەینەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا كە بەرگریی لە ئایینی خوا كردوە، لە خوا بە یەكگرتن (توحید)و لە مەقامی خوا، خوای پەروەردگاریش پلەی لەلای خۆی بۆ بەرز كردۆتەوە، ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾، كەواتە: خوا بەگۆترە پلەی كەس بەرز ناكاتەوە، كاری خوا گۆترە نیە، بێ حیسابو كیتاب نیە، خوا كاربەجێیەو زانایە، دەزانێ كێ چی پێدەداو، چۆنیش پلەی بەرز دەكاتەوە.

**<u>مەسەلەی پێنجەم</u>:** ئنجا خوای زاناو شارەزا دێتە سەر باسی مەسەلەیەكی دیكە كە بریتیە لە درێژەپێدانی پەیامو بانگەوازی ئیبراهیم، كە پەیامی (خوا بە یەكگرتن) (توحید)ە، لە ڕێی وەچەكەیەوە كە لێی وەپاش دەكەوێ، وە خوا لێرەدا بە ئیبراهیمەوە، ناوی هەژدە لە پێغەمبەران دێنێ، دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، لێرەدا ئەگەر ناوی نووحو ئیبراهیم لابەرین، چونكە نووح نەوەی ئیبراهیم نەبووەو، ئیبراهیمیش بۆخۆی سەرڕشتەی وەچەكەیەتی، شازدە دەمێننەوە، كەواتە: خوای پەروەردگار باسی شازدە لە پێغەمبەران دەكات، وەك وەچەی ئیبراهیم.

## وەرگرتنی سێ بابەتی گرنگ لە ئایەتەكانی : ( ٨٤ و ٨٥ و ٨٦ ):

<u>یەكەم</u>: هیچ ڕیزبەندییەكی مێژوویی، یان پێگەو پایە، لەم ئایەتانەدا بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ڕەچاونەكراون، واتە: مەرج نیە ئەوەی لە پێشەوە ناوی هێنرا بێ، لە ڕووی مێژووییەوە لە پێشەوە بووبێ، یاخود پلەی بەرزتر بووبێ.

دووەم: خـوای کاربەجـێ پێغـەمبەرانــی (علیهم الصلاة والسلام) بـۆ چـوار جـۆر، پـۆلـێـن کردوون:

١) نـووحو ئیبـراهیمو ئیسحاقو یەعقووب، ئەوانـە باپیـرەی پێغـەمبەرانــن.

٢) شـەش پێغـەمبـەر باسـکراون، کە لە زەوییدا حوکمڕانو دەسـتـڕۆیشتوو بوون، وەك خــــوا ﷻ فەرموویــــەتی: ﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾، واتـە: وە لە وەچـەی وی (ئیـبـڕاهیـم) داوودو سولەیمانو ئەییوبو یوسفو مووساو هارون، هەبوون.

داوودو سـولەیمــــان دیـــارە کــە پادشــــا بـــوون، ئــەییوبیش خــــوا دوای چاکـبوونەوەی دەفـەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ ﴿٨٤﴾ ﴾الأنبیــاء، وە کەسوکارەکەیـمان پێبەخشیو وێنـەی ئەوانیشیان لەگەڵیـان بوو.

وە دەربارەی یوسفیش کە خـوا لەسـەر زاری وی دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ ٱجْعَلْنِى عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ ﴿٥٥﴾ ﴾یوسف، واتە: گوتـی: لـەسەر عەمبـارەکانی زەوییـم دابنـێ.

ئنجا کـە دیـارە مووسـاو هـارونیش حوکمـڕانو دەسـت ڕۆیشـتوو بـوون، بۆیـە خـــوا دەربـارەی ئـەم شـەش پێغـــەمبەرە دەفـەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، وە ئـا بـەو شـێوەیە پاداشــتی چاکەکاران دەدەینـەوە، چـونکە مرۆڤـ بەهـۆی دەسـتەڵاتو حـوکمڕانییو دەسـت ڕۆیشـتوویی یـەوە دەتوانــێ چاکە لەگەڵ خەڵـکدا بکات، ئەوانـەش چاکەکار بـوونو سـوودیان بـۆ خـەڵك هـەبووە، نــەك وەك دەســتەڵاتدارو حوکمڕانــانی دیکتــاتۆرو بــە زەبـرو زۆرو خۆسەپێن، زیان لە خەڵك بـدەنو، خـەڵك لێیان بترسـێو، خـەڵك لـە دەسـتو زمانیـان سـەلامەت نەبــێ، پێغــەمبەرانو شــوێن پێهەڵگرانیــان، ئەگــەر

دەستەڵاتیان هەبێ، دادگەریی دەچەسپێنن‌و، ستەم‌و نادادگەریی لادەدەن، وە هەوڵی بەرپاکردنی هێمنیی‌و ئاسایش دەدەن.

٣) ئنجا خوا ﷻ دەربارەی چوارەکەی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، ئەو چوارەشیان ئەهلی دنیا بە کەمگرتن‌و ژیانی سادەو عیبادەت‌و بۆ خوا صوڵحان‌و، خۆ بۆ خوا خۆیەکلاکردنەوە، بوون، کە دیارە هەموو پێغەمبەران هەر وابوون، بەڵام ئەوان ئەو سیفەتەیان تێدا زەقتر بووە، ئەوانیش بریتین لە: زەکەرییاو یەحیاو عیساو ئیلیاس، کە هەر چواریان زۆر دنیا بە کەمگر بوون، بەڵکو یەحیاو عیسا هەر هاوسەریشیان نەبووە، ئیلیاسیش نازانم، بەڵام زەکەرییا دیارە بابی یەحیایە، کەواتە: هاوسەری هەبووە.

ئنجا خوا دەربارەی وانیش دەفەرموێ: ﴿كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، هەر کامێك لەو چوارانە لە صالحان بوون.

٤) دەربارەی چوارەکەی دوایی دەفەرموێ: ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، ئەم چوارە، واتە: ئیسماعیل‌و ئەلیسەع‌و یونس‌و لووط، ئەوانە کتێب‌و ئۆممەت‌و شوێنەوارێکی وایان دیارنییە، بۆیە هی ئەوانیشی بەوە کۆتایی پێهێناوە: ﴿وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، هەر کام لەو چوارانەش وەك پێغەمبەرانی دیکە، لە ڕۆژگاری خۆیان‌و لەنێو خەڵکی سەردەمی خۆیان دا، هەڵبژاردبوون، یانی: پێتان وانەبێ لەبەرئەوەی ئیسماعیل‌و ئەلیسەع‌و یونس‌و لووط، وەك پێغەمبەرەکانی دیکە شوێنەوارو کتێب‌و ئۆممەتیان دیار نیە، پێگەو پایەیان کەمترە! هەر پێغەمبەرێك لە ڕۆژگاری خۆیدا باشترین کەسی سەردەمی خۆی بووە.

سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ﴾، هەندێك گوتوویانە: ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ نووح، واتە: ئەو پێغەمبەرانە لە وەچەی نووحن، هەندێکیش گوتوویانە: ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ ئیبراهیم.

مـن پێمـوایەو زۆربـەی توێـژەرەوانی قورئـانیش رایـان وایـە، راناوەكـەی دەچێتـەوە بـۆ ئیبـراهیـم، هـەر ئـەم رایـەش راسـتە، چونكە لێـرەدا بـاس باسـی ئیبـراهیمـە سەلامی خـوای لـێ بـێ، وە خـوای پـەروەرگار باسـی ئـەوە دەكات كـە پاداشـتی ئیبـراهیم دەداتـەوەو رێـزی لێنـاوە، لەسـەر ئـەوەی بـەرگریی لـە خـوای بـێ هـاوتـاو ئایینەكـەی كـردوە، پاشـان هـەموو ئـەو پێغـەمبەرانەی باسـكراون، نەسەبەكەیان دەچێتەوە سەر ئیبـراهیم، تەنیا لووط نەبـێ كە برازای بووە، بەڵام جـاری وایە دەگونجـێ مـامو برازاش وەك كوڕو باب، مامەڵە بكەن، بە بەڵگەی ئـەم ئایەتـەی خـوا، كـە دەفـەرموێ: ﴿ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ ﴾البقرة، یان ئایا ئێوە لـەوێ بوون كـاتـێ یەعقووب كاتی مردنی هات، كە بـە رۆڵەكانی خـۆی گوت: ئایا دوای من چـی دەپەرستن؟ گوتیـان: پەرستراوی تـۆو پەرستراوی بـابو باپیـرانت: ئیبـراهیم و ئیسـماعیلو ئیسحاق، یـەك پەرسـتـراوو، ئێمـەش بـۆی ملكـەچین، ئاشكرایە كـە ئیسماعیل مـامی یەعـقووب بـووە، وە یەعـقووب كـوڕی ئیسحاقـەو ئیسحـاقو ئیسماعیل بران، ئـەدی بۆچـی بـە بابـی ناونـاوە؟ چونكە جـاری وایـە مامیـش بە بـاب نـاودەبـرێ.

**مەسـەلەی شـەشـەم**: كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، واتە: وە لە بابو باپیـرانیانولە وەچەكانیـانو لە بـرایەكانیان ـ كەسانێكمـان هەڵبـژارد ــ وە پەسـندمان كـردنو بـەرەو راسـتەڕێ رێنماییـمان كردنو خستماننـە سـەری.

كـەواتە: سـەرجەم خـزمو نزیـكـانی پێغەمبـەران، لە بنـەڕەت (أصـل) یـانو، لـق (فـرع)یانو، برایـانیـان، تێكـڕایـان، هـەروەها فـەرموودەی خـوا ﴿ وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ ﴾ ئـەوە دەگەیەنـێ، كـە: تەنـیا پێغـەمبەران لەسـەر ڕێـی ڕاست

نەبوون، بەڵکو هەندێك لە خزمەكانیشیان: چ وەك ئەسڵ یانی: باب‌و باپیرانیان، چ وەك لق یانی: ڕۆڵەو كچ‌و كوڕو خوشك‌و برا، لەسەر ڕێی ڕاست بوون‌و، هیدایەتدراو بوون، ﴿ وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، وە هەڵمانبژاردن‌و بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنماییمان كردن، واتە: خستمانە سەر ڕێی ڕاست، نەك ڕێی ڕاستمان پێشاندان‌و خستمانە بەرچاویان، چونكە ڕێی ڕاست خستنە بەرچاو، كافرو مسوڵمان تێیدا یەكسانن، بەڵام خستنە سەر ڕێی ڕاست‌و ڕێی ڕاست پێگرتن، ئەوە تایبەتە بە ئەهلی ئیمانەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ ئایا كە دەفەرموێ: ئا ئەوە ڕێنمایی خوایە، هەر كەسێك لە بەندەكانی بیەوێ، پێی ڕێنمایی دەكا، وە ئەگەر هاوبەشیان بۆ خوا دانابایە، ئەوە ئەو كردەوە (باش)انەی كە دەیانكردن هەڵدەوەشانەوە، مەبەست پێی كێیەو ڕاناوەكەی بۆ كێ دەچێتەوە؟

هەندێك دەڵێن: واتە: لە باب‌و باپیران‌و لە وەچەو براو خوشكی پێغەمبەران.

هەندێكیش دەڵێن: واتە: لە پێغەمبەرانیش.

منیش پێموایە ڕای دووەم ڕاستە، چونكە خوای دادگەر بە پێغەمبەری خاتەمیش دەفەرموێ: ﴿ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ الزمر، واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، كردەوەكەت هەڵدەوەشێتەوە، كەواتە: هیچ كەس لە بەرانبەر خوادا مافی ڤیتۆی نیە، هەر كەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ‌و شتێك بێنێتە ڕیزی خوا، یان خوا بەرێتە ڕیزی شتێك، لە دروستكراوەكانی خوا، ئەوە ئیمان‌و تەوحیدەكەی‌و كردەوە چاكەكانی هەڵدەوەشێنەوە، هەتا ئەگەر پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) بن ‼

وشەی (حَبطَ) واتە: (بَطَلَ) یان (ذَهَبَ) چوو، نەما، ئەویش لەوەوە هاتوە كە ئاژەڵێك لەوەڕی زیاد لەخۆی بخوات، دوایی ورگی بئاوسێ‌و بمرێ، یان زگی بدڕێ،

یان تووشی نەخۆشیی ببێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (حَبَط)[1]، كەواتە: گوناح و تاوان و شیركیش، وەك گیاو لەوەڕی زیانبەخشن، خاوەنەكەی دەفەوتێنێ و كردەوەكانی هەڵدەوەشێنێتەوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴾، واتە: ئا ئەوانە كەسانێكن كە كتێب و حیكمەت و پێغەمبەرایەتییمان پێداون، ئەگەر ئا ئەوانە (واتە: كافرەكانی ڕۆژگاری تۆ) پێیان بێبڕوابن، ئەوە كەسانێكمان پێ ڕاسپاردوون، بڕوایان پێ بێنن، كە پێیان بێبڕوانین، یاخود لە بەرانبەریاندا سپڵە نین، لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾، ئاماژەیە بۆ ئەو هەژدە پێغەمبەرەی كە ناویان هێنراوە.

ئنجا ئەم ئایەتە دوو واتای هەن، بەپێی دوو مانایەكەی وشەی: (يَكۡفُرۡ):

١- خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم دەدوێنێ و دەفەرموێ: ئەگەر ئا ئەوانەی كە كتێب و حیكمەت و پێغەمبەرایەتییمان پێداون، ئەو خەڵكە بەرانبەر ئەو سێ شتە كافربن، ئەمە واتایەكی، چونكە: دەگونجێ لێرەدا مەبەست لە (يَكۡفُرۡ) كوفری پێچەوانەی ئیمان بێ.

٢- وە دەشگونجێ مەبەست لە وشەی (يَكۡفُرۡ) كوفری پێچەوانەی سوپاسگوزاریی (شكر) بێ، واتە: ئەگەر ئەو خەڵكەی ڕۆژگاری تۆ، بەرانبەریان (یانی: كتێب و حیكمەت و پێغەمبەرایەتیی) سپڵەو ناسوپاسگوزار بن، ﴿ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴾، ئەوە بە تەئكید لە داهاتوودا كەسانێكمان پێ ڕاسپاردوون و ڕێنماییمان كردوون، كە بەرانبەر ئەو سێ شتانە، بێبڕوا نین.

---

١) مختار الصِّحاح، ص: ١١٨.

ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴾، ئایا مەبەست لەو کۆمەڵە خەڵکە کێیە:

١- هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی پێغەمبەرانە، واتە: ئەگەر کافرەکانی رۆژگاری تۆ، بێبڕوان، یاخود ناسوپاسن، ئەوە پێغەمبەرانی خوا، بەرانبەر بەو سێ نیعمەتەی خوا، کە کتێبو حیکمەتو پێغەمبەرایەتیین، بڕواداربوونو سوپاسگوزار بوون.

٢- وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ، خوا لێیان ڕازی بێ، بە پیاوو ئافرەتەوە، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! ئەگەر کافرەکانی مەککە، بەرانبەر ئەو کتێبو حیکمەتو پێغەمبەرایەتییە بێبڕوان، یاخود ناسوپاسن، ئەوە هاوەڵانی تۆ کە ئێستا هەن، وە ئەوانەش کە دوایی پەیدادەبن لە نیوە دوورگەی عەرەبییو غەیری ئەویش، بڕوادارو سوپاسگوزار دەبن، بەرانبەر بەو سێ نیعمەتە.

٣- منیش دەڵێم: مەبەست پێی تێکڕای ئیمانداراندە، کە لەڕاستییدا ئەو مانایە لەوانی دیکە بەهێزترو فراوانترەو هیچ تێکگیران (تصادم)یشی لەگەڵ دوو مانایەکەی دیکەدا نییە، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سەرقافڵەی بڕوادارانن‌و، هاوەڵانیش لە ڕیزی پێشەوایانن.

<u>**مەسەلەی نۆیەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ﴾،

ئا ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، واتە: خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، تۆش بەدوای ڕێنماییو ڕێی ڕاستی وان بکەوە، یانی: ئەوان بکە سەرمەشق، یاخود ڕێنماییو ڕێبازو ڕێوشوێنی ئەوان بکە بە سەرمەشقی خۆت.

شایانی باسیشە ئەم ڕستە قورئانییە، پێویستی بە کورتە باسێکی تایبەت دەکات، تاکو چەمكو واتایەکەی ڕوونتر بێتەوە.

# باسێک لەبارەی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ، بۆ پێغەمبەرانی پێشووی (علیهم السلام)

## هەڵوەستەیەك لەبەردەم ئەم ڕستە قورئانییەدا :

ئەم ئایەتە زیاتر ئاوا خوێندراوەتەوە: (فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ) واتە: ئەو (ه)ەی دوای وشەی (اقْتَدِ) لە ئەسڵدا نیە، پێی دەگوترێ (هاء السَّكتة) هائی وەستان، ئەگەرنا (اقْتَدِ) یانی: بیکە سەرمەشق، شوێنی بکەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ﴾، واتە: تۆش ئەو ڕێنمایی‌و ڕێبازو چۆنیەتی دینداریەی ئەوان، بکە بە سەرمەشقی خۆت، کە ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأحقاف) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: خۆڕاگربە، وەك چۆن خاوەن ئیرادە پتەوەکان، لە پێغەمبەران خۆڕاگر بوون، وە پەلەی سزادانیان بۆ مەکە.

دیارە لە زۆر شوێنی دیکەش دا، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: کە سوود ببینێ لە ڕێبازو ڕێوشوێن‌و ئەزموونی پێغەمبەرانی پێش خۆی، زانایان لەبارەی چۆنیەتی ئەو شوێنکەوتنەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، سێ ڕایان هەن:

١/ بەشێکیان گوتوویانە: لەبەرئەوەی هەموو پێغەمبەران بەرنامەکانیان، واتە: شەریعەتەکانیان، جیاوازن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة، واتە: بۆ هەر کامێکتان بەرنامەو ڕێبازێکی تایبەتمان

داناوە، بۆیە: لێرەدا مەبەست لەوە کە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: شوێن پێی وان هەڵبگرە، لە ڕووی ڕێبازو بەرنامەوە نیە، بەڵکو لە ڕووی خوا بە یەکگرتنو ئیمانو عەقیدەوەیە.

٢/ وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی ئەوەیە، بەگشتیی بەدوای وان بکەوە، واتە: لە هەردووك بواری ئیمانو عەقیدەو شەریعەت دا.

٣/ هەندێکیش گوتوویانە: بەدوای وان بکەوەو، ئەوان بکە بە جێی تەماشای خۆتو، جێی سەرنجو پەیڕەویی لێکردن: (فيما لَمْ يَرِد بِهِ النَّص) لە هەر شتێك دا کە لە شەریعەتی خۆت دا، دەقی لەسەر نەبوو، یانی بزانە لە شەریعەتی پێغەمبەرانی پێشوودا چی هاتوە، لەوبوارەدا کاری پێبکە، مادام پێچەوانەی شەریعەتی خۆت نەبێ، ئێستاش با سەرنجی قسەی هەندێ لە توێژەرەوانی قورئانو، چەند بەڵگەیەك بدەین لەوبارەوە:

یەکەم: (جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (﴿ فَبِهُدَىٰهُمُ اقْتَدِهْ ﴾ أي بطريقهم في الإيمَانِ باللهِ وَتَوْحِيدِهِ وَالأَخْلاَقِ الحَمِيدَة وَالأَفْعَالِ المَرْضِيَّة وَالصِّفَاتِ الرَّفِيعَة، إعْمَل)[١]، واتە: بە ڕێبازی ئەوان لە: ئیمان بە خواو خوا بە یەکگرتندا، وە لە ڕەوشتی بەرزو پەسنددا، وە لە کردەوە چاكو هەڵبژاردەکانو، لە سیفەتە بەرزەکاندا، بەوە کار بکە.

هەروەها دەڵێ: (إستَدَلَّ بِهذِهِ الآيَة مَنْ قَالَ: إنَّ شَرْع مِنْ قَبلنا شَرْعٌ لَنَا مَا لَمْ يَرِدِ نَاسِخ) واتە: ئەو کەسەی گوتوویەتی: شەریعەتی (پێغەمبەران)ی پێشوو، شەریعەتی ئێمەشە، بە مەرجێك نەسخ نەکرابێتەوە، بەڵگەی بەم ئایەتە موبارەکە هێناوەتەوە، (چونکە خوا بەگشتی فەرموویەتی: تۆ بە شوێن ڕێنمایی پێغەمبەران بکەوە).

دووەم: (الطبراني) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (وفي الآية دَلِيلٌ عَلَى أنَّ شَرَائِعَ الأَنْبِيَاءِ تَلْزَمُنَا مَا لَمْ نَعْلَم نَسْخَهُ، لأَنَّ اسْم الهُدَى يَقَعُ عَلَى التَّوحِيدِ

---

١) محاسن التأويل: ج٤، ص٦١٧.

والشَّرَائِع)[١] واتە: وە لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە بەرنامەو شەریعەتەکانی پێغەمبەرانی پێشوو، پابەندکەرن بۆ ئێمە، بە مەرجێك بزانین کە نەسخ نەکراونەوە، چونکە ناوی (هدی) هەر کام لە خوا بەیەکگرتنو، بەرنامەکانیش دەگرێتەوەو گشتگیرە.

هەروەها منیش پێموایە کە ئەم رایە ڕاستە، چونکە لێرەدا خوای زاناو شارەزا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوونو خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، تۆش بەدوای ڕێی ڕاستی وان بکەوە، وە پێموایە ئەمە گشتگیرە، بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وە پاشان ئۆممەتەکەشی، بۆ پێغەمبەرانی پێش خۆی، لە وردو درشتیاندا، بە مەرجێك بزانین کە ئەو شتە تایبەت نەبووە بە ڕۆژگاری ئەو پێغەمبەرانەوەو لە شەریعەتی ئێمەدا نەسخ نەکراوەتەوە، وەك (طبراني) دەڵێ، بەڵگەش ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ﴾، (هُداهُم) واتە: ڕێی ڕاستی ئەوان، ئەمە وشەیەکی گشتگیرە، بۆ ئیمانو خوا بەیەکگرتن، بۆ کردارو گوفتارو ڕەوشتی بەرز، بۆ حەڵاڵو حەرام، بۆ ئەمرو نەهی، بۆ کۆی عەقیدەو شەریعەت.

<u>سێیەم</u>: بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە ئەم دەقەیە: ﴿عَنْ مُجَاهِد: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنِ السَّجْدَةِ الَّتِي فِي "ص"؟ فَقَالَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ ... وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ۩ ﴿٢٤﴾ ﴾، قَالَ:"أُمِرَ نَبِيُّكُمْ أَنْ يَقْتَدِيَ بِدَاوُدَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾[٢]، واتە: موجاهید دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی

---

١) التفسير الكبير: ج٣، ص٥٨.

٢) تفسير إبن أبي حاتم: ج٥، ص٣١١، فتح القدير للشوكاني: ج٢، ص١٧١، وَأَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٣٨٨) وَقَالَ الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، رجاله ثقات رجال الشيخين غير يحيى بن عبد الملك فمن رجال مسلم.

عەبباسم پرسی دەربارەی ئەو سەجدەیەی کە لە سووڕەتی (ص)دا دەبردریّ؟ ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ... وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: وە داوود بۆی دەرکەوت کە ئێمە تاقیمان کردۆتەوە، بۆیە داوای لێبووردنی لە پەروەردگاری کرد، وە لەپەو ڕوو کەوتو، گەڕایەوە بۆ لای خوا، (واتە: سەجدەی برد)، دوایی عەبدوڵلا گوتی: پێغەمبەرەکەتان فەرمانی پێکراوە، کە داوود بکاتە سەرمەشق و شوێنی بکەویّ، وە بەڵگەشی بۆ ئەو تەفسیرەی، بەم ئایەتە هێنایەوە، کە خوا دەفەرمویّ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ﴾، ئنجا ئایا بۆچی پێغەمبەری ئێمە لێرەدا سەجدەی بردوە؟ چونکە خوا لەو ئایەتەی سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرمویّ: ئا ئەوانە خوا خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، تۆش ڕێی ڕاستی ئەوان بکە سەرمەشق، بۆیە داوود ﷺ کە سەجدەی بردوە، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ چاوی لە داوود کردوەو سەجدەی بردوە، ئەگەرنا ئەو ئایەتە {واتە: ئایەتەکەی سووڕەتی (ص)} ئەوە ناگەیەنیّ کە پابەندکەریّ بۆ ئێمە، بەڵام بە حوکمی ئەم ئایەتە{واتە: ئایەتەکەی سووڕەتی (الأنعام)} هەر شتێك کە پێغەمبەرانی پێشوو پێوەی پابەندکرابن، پێغەمبەری خاتەمیش کە گەورەو سەروەریانە، پێوەی پابەندە، وە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان بۆ ئوممەتەکەشی پابەندکەرە، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەگەر قورئان بکەینە سیّ بەش، دوو بەشی مەککەییە، وە لە قورئانی مەککەییش دا، سیّ لەسەر چواری یان زیاتری، بەسەرهاتی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، ئنجا ئایا خوای کاربەجیّ بۆچی بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ پێغەمبەری خاتەمو ئوممەتەکەی دەگێڕێتەوە؟ بێگومان بۆئەوەی پێوەی پابەندبن و پەندی لێوەربگرن.

چوارەم: بەلگەیەکی دیکەش ئەوەیە، کە خوای بەرزو مەزن لە سووڕەتی (القلم)دا دەفەرمویّ: ﴿ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: خۆت بۆ حوکمی پەروەردگارت ڕاگرەو، وەك هاوەڵی نەهەنگ

(ماسی)یەکە مەبە، واتە: وەك پێغەمبەر یونس ﷺ مەبەو لەو هەڵوێستەیدا بەدوای مەکەوە، جا ئەمە هەڵاواردن (إستثناء)ە، ئەگەرنا فەرمانی پێکراوە بەدوای هەموو شتەکانی پێغەمبەران بکەوێ، بەڵام ئەو هەڵوێستەی (یونس) لێرەدا جیاکراوەتەوە.

ئنجا ئایا ئەو هەڵوێستە چۆن بووە؟ پێغەمبەر یونس خوای بالادەست بۆ لای خەڵکی نەینەوای نارد، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە، خەڵکەکە ئیمانیان پێی نەهێناو، سەرەتا زۆر کەللەڕەق بوون، تاکو گەیشتە ئەو حاڵەتەی ئەویش لێیان تووڕەبێ، ئیدی ڕۆیشت بەجێیهێشتن، وەك خوا دەربارەی ئەو هەڵوێستەی دەفەرموێ: ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧﴾ الأنبياء، واتە: (یونس) پێیوابوو: ئێمە ولاتمان لێ وەتەنگ نەهێناوەو لە سەرمان پێویست نەکردوە، کە دەبێ هەر لەوێ بێ، کە هەندێ کەس ئەم ئایەتە بە هەڵە تەفسیر دەکەنو دەڵێن: پێیوابوو توانامان بەسەری دا ناشکێ، بەڵام، نا، بەڵکو مەبەست لە: ﴿لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ﴾ یانی: (لن نُضيِّق عليه) واتە: لێی وەتەنگ ناهێنینو لەسەرمان نەکردۆتە مەرج، کە تەنیا خەڵکی نەینەوا بانگ بکات، پێیوابوو بچێتە هەر شوێنێکی دیکەش بانگەواز بکات، هەر دەبێ، بۆیە سەری خۆی هەڵگرتو ڕۆیی، ئیدی خوای دادگەریش سزای داو ئەوە بوو سەرەنجام خرایە نێو ڕووبارەوەو نەهەنگ هەڵی لووشی، وە تەنیا خوا دەزانێ چەند لەنێو زگی نەهەنگ (ماسی)دا ماوەتەوە، دوایی خوای توانا فەرمانی بە نەهەنگ کردوە، دەری هاوێشتوە، کە بەسەرهاتەکەی بە تەفصیل لە سوورەتی (الصافات)دا هەیە، (ئایەتەکانی: ١٣٩ – ١٤٨) هەروەها لە سوورەتی (الأنبياء)دا، (ئایەتەکانی: ٨٧ – ٨٨).

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: لەمەدا وەك یونس مەبە، مانای وایە ئەو شتەی جیاکردۆتەوە، کەواتە: لە هەموو شتەکانی دیکەدا، وەك یونس بکە.

پێنجــەم: هــەروەها لە ســوورەتی (الـممتحنة)دا خــوای زانــاو تــوانــا دەفەرموێ:

﴿ قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: بێگومـان لە ئیبـراهیم ﷺ وە ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون، سـەرمەشقێکی باش هەیـە بۆ ئێوە، کاتێك بـە گەلەکــەی خــۆی گــوت: ئێمــە لــە ئێـوە بەریــیو دوورین، وە حاشـاتان لێدەکــەین، وە دوژمنایــەتییو ڕق لــە نێــوان ئێمــەو ئێــوەدا بــە هەمیشــەیی پەیـدابووە، هـەتا ئیمـان بـە خــوای تـاك دێنــن، دوایـی دەفــەرموێ: ﴿ إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤﴾ ﴾، واتـە: (لـەوەدا ئیبـراهیم سـەرمەشق نیـە، تەماشای مەکەن) جگە لە قسەی ئیبـراهیم کە بە بـابی گوت: داوای لـێبوردنـت بۆ لە پـەروەردگـارم دەکـەم، (بابیشــی کـافر بـوو، کەسێکـیش کـافــر بــێ، نابــێ داوای لـێبـوردنــی بـۆ لـە خـوا بکــرێ، کەواتـە: خـوا لێرەشــدا ئـەو هەڵوێستەی ئیبـراهیمی هـەڵاوارد).

خــوا ﷻ لــەوبارەوە لــە ســوورەتی (التوبـة)دا دەفــەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴿١١٤﴾ ﴾.

قورئـان دەبــێ ئـاوا تەماشـای بکـەی، هــەموو ئایەتـەکان پێکـەوە بێـنی، ئـنجـا تـەواو تێـیدەگـەی، دەفەرموێ: داوای لێبـوردنــکردنی ئیبـراهیم بۆ بـابی، تەنیـا بەهـۆی بەڵێـنێکەوە بـوو پێیدابـوو، (کـە داوای لـێبوردنت بـۆ لـە پـەروەردگارم دەکـەم) ئنجا لە کوێ بەڵێـنی پێـداو لـە کوێ خـوای بـەرز باسـی ئـەو بەڵێنـە دەکات؟ لە سوورەتی (مریـم)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ

﴿ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئیبراهیم گوتی: سڵاوت لەسەر بێ، وە لەمەودوا داوای لێبوردنت بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، بێگومان بەرانبەرم بەخشەرو مشوورخۆرە، (دیارە ئەو کاتە وایزانیوە بابی ئیمان دێنێ) ﴿ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴿١١٤﴾ ﴾، واتە: بەڵام کاتێك بۆی دەرکەوت، کە دوژمنی خوایە (هەر ئیمان ناهێنێ) ئەوجار حاشای لێکرد، واتە: ئەو کاتەی کە بەڵێنی پێداوە، ئومێدی ئیمان هێنانی پێ هەبووە، بەڵام کاتێك ئومێدی پێی نەماوەو تەما بڕاو بووە، ئنجا حاشای لێکردووە.

کەواتە: ئێوە نەچن لەو هەڵوێستەدا، کە ئومێدتان هەبوو بە ئیمان هێنانی کەسێك، داوای لێبوردنی بۆ لە خوا بکەن، چونکە ناگونجێ داوای لێبوردن لەلایەن خواوە بۆ کەسێك بکەی کە ئیمانی نەهێناوەو کافرە، چونکە خوا لە کافر خۆشنابێ، ڕەحمەتی خوا تایبەتە بە ئیماندارانەوە.

## پوختەی مەبەست :

خوا تبارك وتعالی کە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ئا ئەوانە خوا ڕێنمایی کردوون، تۆش بەدوای ڕێنمایی ئەوان بکەوەو بیانکە سەرمەشق، ئەوە هەموو شتێك هەمووی دەگرێتەوە، جگە لەوەی کە بۆمان دەردەکەوێ، کە فلاّن شتە لە شەریعەتی فلاّنە پێغەمبەردا، تایبەت بووە، بەو خەڵك و کۆمەڵگایەوە، کە لە سەردەمی یەکێك لەو پێغەمبەرانەدا بووە، ئەگەر زانیمان تایبەتە بەوانەوە، ئەو کات بۆ ئێمە پابەندکەر (ملزِم) نابێ، ئەگەرنا هەرچی قورئان باسی دەفەرموێ، لە هەڵوێستەکانیان، لە ڕەوشتەکانیان، لە هەڵسوکەوتەکانیان، جێی تەماشاو سەرنجەو، دەبێ بیکەینە سەرمەشقی خۆمان، بۆ وێنە:

پێغەمبەر یوسف ﷺ لە میسر، دوای ئەوەی پادشاو حوکمڕانە کافرەکە ڕێزی لێدەنێ، (یوسف)یش پێی دەڵێ: ﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ ﴾یوسف، واتە: من لەسەر عەمبارەکانی زەوی دابنێ (بە زاراوی ئەمڕۆ:

بمكە وەزیری دارایی‌و ئابووریی) چونكە من پارێزەری زانام، پێغەمبەر یوسف ﷺ ئامادەیە لە ژێر سایەی پادشایەكی كافردا كارێك وەربگرێ، وەك من لە كتێبی: (چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ‌و وەحیی دا) باسم كردوە، هەركام لە (إبن تیمیة) و (الشاطبي)و چەند زانایەكی دیكەش، ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەر یوسف ﷺ یان كردۆتە بەڵگەی ئەوە كە: دروستە مرۆڤی مسوڵمان لەژێر ڕكێف‌و دەستەڵاتی پادشایەكی كافردا، كارێك بەئەستۆوە بگرێ كە بزانێ صەلاحیەتی تێیدا هەیە، كە خزمەت بە خەڵك بكات، (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ئەگەر بزانێ هەموو خراپەكانی پێ لانابردرێ‌و، هەموو چاكەكانی پێ ناچەسپێنرێ، بەڵام هەر تۆزێك گۆڕانگاریی پێ دەكرێ، با بەشداربێ لەو سیستەمە كوفرەدا، یانی: ئەگەر هەر لەسەدا دە (١٠٪)ی خراپەو ستەمەكان بگۆڕێ‌و، دادگەریی بچەسپێنێ، باشترە، كەواتە: ئێمەش پێویستە لەو كارەدا، چاو لە یوسف ﷺ بكەین.

**مەسەلەی دەیەم:** خوای پەروەردگار لێرەدا فەرمانێكی گرنگ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەكات، دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴾ تۆ پێیان بڵێ: من هیچ كرێ‌و پاداشتتان لێ داوا ناكەم، لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە خواییە، ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ئەم قورئان‌و پەیامە خواییە، تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان، ئێمە دوو هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتەدا دەكەین:

هەڵوەستەی یەكەم / كە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا ﴾، ئەم ئایەتە لە زۆر شوێنی قورئاندا دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە: لە كۆتایی سوورەتی (ص)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ٨٦ ﴾، واتە: بڵێ: من هیچ كرێ‌و پاداشتتان لێ داوا ناكەم، وە تەكلیف‌و بارگرانییتان ناخەمە سەر شان :

بەڕێزان !

ئەمە زۆر گرنگە بۆ هەر كەسێك كە بیەوێ ئایینی خوا بە خەڵك بگەیەنێ، هیچ چاوەڕوانی لێیان نەبێ، هیچ ئومێدێك‌و تەمایەكی دنیایی

پێیان نەبێ، زۆر زۆر گرنگە، چونکە خەڵك گەلێك زیاتر ڕێزی لێ دەگرن، وەك لەوەی چاوی لە دەستیان بێ.

ئنجا ڕەنگە یەکێك بڵێ: باشە مەلای فەقیر چۆن بژی؟ کەسی بانگخواز کە خزمەتی ئایین دەکاو، خەڵك ئاگادار دەکاتەوە، چۆن بژی؟ چونکە هەر کەسێك کە خزمەت بە وڵات دەکات: پزیشکە، ئەندازیارە، پارێزەرە...هتد، کە کار بۆ خەڵك دەکەن، خەڵکیش لە بەرانبەردا بژیوی ژیانیان بۆ دابین دەکەن، کەواتە: هەرکەسێك کە خزمەتی ئایینی خەڵك دەکات، ئنجا مەلایە، بانگخوازە، مامۆستایە، دەبێ خەڵکیش خزمەتی دنیای ئەو بکەن، وەك من لە کتێبی (زانایانی ئیسلام کێن‌و چۆنن؟)دا بە تەفصیلێ باسم کردوە، دەڵێین: ڕاستە دەبێ خەڵکیش خزمەتی دنیای ئەو کەسانە بکەن، کە خزمەتی ئایینی خەڵك دەکەن، بەڵام نابێ ئەوان لەسەر خەڵك بیکەنە مەرج، یانی دەبێ بڵێن: ئێمە لە پێناوی خوادا بە ڕێی پێغەمبەرتاندا دەبەین‌و، پێشتان دەکەوین، نەك بۆئەوەی ئێمە بژیەنن، بەڵکو بۆیە بەدوای شەریعەت‌و بەرنامەی خوا دەکەوین، چونکە لەسەرمان فەرزە، وە لەسەریشمان پێویستە خەڵکیش بەو ڕێیەدا ببەین، چونکە لەڕاستییدا بەندایەتیی کردن بۆ خوا لەسەر ئینسان پێویستە، بێئەوەی چاوەڕوانیی پاداشت لە خەڵك بکات، دەبێ چاوەڕێی پاداشت بەس لە خوا بکات، وەك خوا لە سوورەتی (الشعراء)دا باسی پێنج لە پێغەمبەران دەکات (نوح و هود و صالح و لوط وشُعیب) (علیهم السلام) هەر هەموویان گوتوویانە: ﴿ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾، واتە: وە هیچ کرێ‌و پاداشتێکتان لێ داوا ناکەم، پاداشتم تەنیا لەسەر پەروەردگاری جیهانەکانە.

بەڵام خەڵك دەبێ بۆخۆی هەست بکات، بەرانبەر ئەو زاناو مامۆستایە، بەرانبەر ئەو بانگخوازە، لە بەرانبەر ئەو کەسەدا، کە خزمەتی ئایین دەکات، کە دەبێ ئەوانیش خزمەتی دنیای وی بکەن، مادام ژیان‌و گوزەرانی خۆی پێ نەسووڕێ بۆئەوەی دەستی بەتاڵ بێ‌و بواری هەبێ خزمەت بکات، بەڵام مامۆستا نابێ بە بەرانبەر خەڵك فێری ئایین بکات، نابێ لەگەڵیاندا بکاتە سەوداو مامەڵەو بازرگانیی، وە دەبێ مامۆستا نەفس بەرزبێ‌و بێ تەماع بێ، وە چاوەڕوانیی ماددیی لە خەڵك نەکات.

هەڵوەستەی دووەم / لە قورئاندا وێڕای وشەی (ذِكْرَى) وشەی (ذِكْر)یش هاتوە، زانایان گوتوویانە: (ذِكْرى) ماناکەی بەهێزترە، لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە دەڵێ: (إنَّ زِيَادَةَ المَبْنَى تَدلُّ عَلَى زِيَادَةَ المَعْنَى)، واتە: وشەیەك پیتەکانی زیاتربن، بەڵگەیە لەسەر بەهێزیی ماناکەی، هەرچەندە یەك ماناشیان هەبێ، بۆ وێنە: (ذِكْر) واتە: بیرخەرەوە، (ذِكْرَى)ش هەر واتە: بیرخەرەوە، بەڵام ماناکەی بەهێزترە[1]، واتە: زۆر بیرخەرەوە، بۆچی خوا ناوی لە قورئان ناوە (ذِكْر)؟ کە یەکێکە لە ناوە زۆر دیارەکانی قورئان، چونکە مرۆڤ لە ئایینی خوای پەروەردگاردا، زیاتر پێویستی بەوە هەیە، کە ئەو شتانەی خوا دەیانفەرموێ، وەبیر خۆییان بهێنێتەوە، ئەگەرنا ئەو شتانە لە سروشتو عەقڵی ساغو سەلیمی مرۆڤدا هەن، بەڵام قورئان هاتوە: بیرت بخاتەوەو بەرچاوت ڕوونـاك بکاتەوە، بۆیەش قورئان ناوی لێنراوە (ذِكْر) واتە: بیرخەرەوە، هەڵبەتە لەو سیاقەدا ئەو مانایەی هەیە، ئەگەرنا لە شوێنی دیکەدا، بە مانای شەرەفو ناوبانگیش هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ ۝٤٤ ﴾الزخرف، کە لێرەدا (ذِكْر) دوو مانای هەن:

١/ ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ گەلەکەت.

٢/ یاخود شەرەفو ناوبانگە بۆ خۆتو گەلەکەت، کە لەڕاستییدا عەرەب دوای ئەوەی قورئانیان بۆ هات، ناویان هاتە نێو ناوانەوە، وە بوون بە گەلو نەتەوەو زمانەکەیان پارێزراو بوو، وە بوو بە زمانێك لە ئاستی زمانە گەورەو زیندووەکانی دنیادا، ئەوە هەمووی چاکەو فەزڵی قورئانە لەسەریان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص : ٣٢٩.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٩١ ـ ٩٤)، تەوەری سەرەکیی ئەم دەرسە، بریتیە لە باسی وەحیی‌و پەیامی خواو، کتێبەکانی خوا بەگشتی، بەتایبەتی دوا کتێب‌و پەیامی خوا، کە قورئانی بەرزو بەپێزە، خوای کاربەجێ نکووڵییکردنی کافرەکان لەوە کە: خوا کتێب‌و بەرنامەی بۆ بەشەر بنێرێ، بە مایەی ڕێز لێ نەگرتن‌و، قەدر نەزانین‌و، بە گەورە نەگرتنی خوا دادەنێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيْءٖ﴾، واتە: وەك پێویست ڕێزیان لە خوا نەناو بە گەورەیان نەگرت، کە گوتیان: خوا هیچ شتێکی دانەبەزاندۆتە سەر هیچ بەشەرێك، ئەوە ڕێز لێ نەگرتنی خوایە، کە پێتوابێ: خوا بەندەکانی خۆی وێڵ کردووەو بەرنامەو ڕێنمایی خۆییان نانێرێ، شتی وا چۆن لە خوا دەوەشێتەوە؟ خوا حیسابی بۆ مارو مێروو کردوە، چۆن حیساب بۆ مرۆڤ ناکات، کە مرۆڤ جێنشینی خوایەو، گەورەی هەموو بوونەوەرە؟!

وە خوا ڕایدەگەیەنێ کە: قورئان کتێبێکی بەپێزی بە ڕاستدانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی، وە پەیامی خوا بۆ تێکڕای بەشەرە.

دوایی باسی ستەمکارترین کەسمان بۆ دەکات‌و دەفەرموێ: ستەمکارترین کەس، کەسێکە کە ئەو چەند سیفەتەی هەبن:

یەکەم: بە ناوی خواوە درۆ هەڵبەستێ، کە زیاتر مەبەست پێی هاوبەش دانانە بۆ خوای بێ هاوتاو تاك‌و تەنیا.

دووەم: بڵێ: سرووشم بۆ کراوەو وەحییم بۆ هاتووەو، ڕاستیش نەکات، وەحیی بۆ نەهاتبێ، لەلایەن خوای زاناو شارەزاوە.

سێیەم: بڵێ: منیش وەك پەیامی خوا دادەبەزێنم، یانی: نەك هەر دەڵێ: وەحییم بۆ هاتوە، بەڵکو دەڵێ: دەتوانم وەحییش دابەزێنم، ئەو سێ جۆرە کەسە لە هەموو کەس ستەمکارترن، یاخود هەر کەسێك یەکێك لەو سێ قسەو لاف لێدانانەی هەبێ، کە هەرسێکیان درۆن، لە هەموو کەس ستەمکارترە، پاشان خوای پەروەردگار باسی سەرەنجامی شوومی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، لە حاڵەتی سەرەمەرگو گیانەڵادا، کە چۆن فریشتەکان دەستیان بۆ درێژ دەکەن، وە ئەو ڕووحە پیسەیان دەردەکێشن.

وە لە کۆتایی دا خوا بە سەرزەنشت کردنەوە، کافرەکان دەدوێنێ، کە بە تاقی تەنیاو بەبێ پشتو پەناو ماڵو سامانو کوڕانو خزمان، دێنەوە لای خوای دادگەر، لەبەردەم دادگای خوای پەروەردگاردا دووچاری چارەنووسی ڕەشی خۆیان دەبن.

﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ
ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ
كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ
﴿٩١﴾ وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ
وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ
مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ
مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ
أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ
غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَـٰكُمْ
أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَـٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ
زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە وەك بۆ خـوا شایستەیە بە مـەزنیان نـەگرتو نەیانناسـی، کاتێـك گوتیـان: خـوا هیـــچ شـــتێکی دانەبەزاندۆتـە ســەر هیـــچ مرۆڤێـك، بڵـێ: ئـەدی کـێ ئـەو کتێبـەی دابەزانـدوە، کە مووسـا هێنـای: ڕووناکیی‌و ڕێنمایی بـوو بـۆ خـەڵك، کە دەتانـگـێڕا بـە چـەند پەڕەیـەك (ی جیا جیا) بەشـێکـتان دەردەخستو، زۆریشتان لـێ دەشـاردەوە، وە زانیـارییەکـتان (بەهــۆی وەحییـەوە) فێرکـرا، کـە نـە ئـێوەو نـە بـابو باپیــرانتان نەتـاندەزانی؟ بڵـێ: خـوا (دایبەزانـدوە) ئنجا وازیـان لـێ بێنـە، با لـە درۆو دەلەسـەی خۆیاندا ڕۆبچـن ﴿٩١﴾ وە ئەم (قورئـان)ەشـمان ناردۆتـە خـوار، بـەپێزە، بەڕاسـتدانەری هـەرچی هـی پێش خۆیـەتی (لە کتێـبەکانی خـوا)، وە بۆئەوەی (خەڵکـی) ئوممولقـورا (مەککە) و خەڵکـی (شـارو وڵاتـانی) دەوروبـەری وریابکەیـەوە، وە ئەوانـەی بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی هەیـە، بـڕوای پـێ دێنـن، وە پارێزگـاریی لـە نوێژەکـەیان دەکـەن ﴿٩٢﴾ وە ئایا کـێ سـتەمکارترە لەو کەسـەی کە درۆی بۆ خـوا هەڵبەسـت، یان گـوتی: سـرووشم (لە خــواوە) بـۆ کـراوەو، هیـچ سـرووشـیشی بـۆ نـەکراوە، وە کەسێك کە گـوتی: منـیش (کتێـب) دادەبەزێنـم، وەك ئەوەی کە خـوا دایبەزاندوە! وە ئەگـەر ببینـی لـە کاتێکدا کە سـتەمکاران لــە ســەختیی‌و دژوارییــەکانی مــەرگ دانو، فریشــتەکانیش دەســتیان بــۆ درێژکــردوون (پێیـان دەڵـێن:) نەفسـەکانتان (گیـانەکانتان) بێنـنــە دەرێ! ئــەمڕۆ بــە ئـازاری ڕیسـوایی ســزا دەدرێـن، لـە سۆنگـەی ئــەوەوە کـە قسـەی ناهـەقتان لـەبـارەی خـواوە دەکـرد، وە لە بەرانبەر ئایەتـەکانی دا خۆتـان بـە زل دەگـرت ﴿٩٣﴾ ئێسـتاش وەك چـۆن یەکەمجـار دروســتمان کــردوون، تــاك تــاك هــاتن بــۆ لامــان، وە ئــەوەی کــە پێمانــدابوون، لـە پشــت خۆتــانەوە بەجێتــان هێشــتوە، وە ئـەو تکاکارانـەتان لەگـەڵ نابینیــن، کە پێتـانــوابوو تێتــاندا هاوبەشـــن، بێگومـان پەیوەنـدییتان پچـڕاو، ئـەوەی خـەیاڵ پـلاوتان پێـوە دەکـرد، لـێتـان ونـبـوو ﴿٩٤﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ): وەك بۆ خوا شایستەیە ڕێزیان نەگرتو بە گەورەیان نەگرت، لە زمانی عەرەبیی دا دەڵێ: (قَدرُ الشيءِ: مَبْلَغُهُ، وَقَدَرُهُ: كَذَلِكَ، وَمَا قَدَرُوا حَقَّ قَدْرِهِ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾، أَي مَا عَظَّمُوهُ حَقَّ تَعْظِيمِهِ)[1]، واتە: (قَدْر و قَدَر) بە مانای ئەندازەگیریی شتێك دێ، دەگوترێ: (قَدَرُهُ كَذَا، أو قَدْرُهُ كَذَا) یانی: ئەندازەکەی ئەوەندەیە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾، واتە: بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، ئەو ئەندازەیە کە بۆ خوا شایستەیە، ڕێزیان لە خوا نەگرتو، بە گەورەو مەزنیان نەگرت.

(قَرَاطِيسَ): کۆی (قِرْطَاس) یان (قُرْطَاس)ە، (القِرْطَاسُ: بكَسر القَافِ وَضَمِّها: الَّذِي يُكْتَبُ فِيهِ)[2]، واتە: (قِرْطَاس) یان (قُرْطَاس) بریتیە لە هەر شتێك کە لەسەری بنووسرێ، جا کاغەز بێ، چەرم بێ، بەردی تەنك بێ، یان گەڵای درەخت، کە کاتی خۆی بەکارهێنراون، بۆ لەسەر نووسین.

(مُبَارَكٌ): (البَرَكَةُ: ثُبُوتُ الخَيْرِ الإِلَهِي فِي الشَّيء، وَالـمُبَارَكُ مَا فِيهِ ذَلِكَ الخَيْر)، (بَرَكَة) بریتیە لە چەسپاویی پێزو بەرەکەتی خوا لە شتێکدا، (مُبَارَك) بریتیە لە شتێك کە هێزو پێزی تێدابێ.

(أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ): ناوێکە لە ناوەکانی مەککە، وشەی (قُرَى) کۆی (قَرْيَة)یە، وە (قَرْيَة) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای شاری گەورە، یان وڵات دێ، کە زۆر کەس وادەزانێ (قَرْيَة) بە مانای گوندو دێ هاتوە، نەخێر بە مانای وڵاتو شاری گەورە هاتوە،

---

١) مختار الصحاح، مادة: ق د ر، ص: ٤٥٥

٢) مختار الصحاح، مادة: ق ر ط س، ص: ٤٦١.

مەککەش بۆیە پێی گوتراوە: دایکی شارەکان، لەبەرئەوەی خەڵك لە هەموو شوێنەکانەوە هاتوون بۆ ئەوێو، شارێکی زۆر قەرەباڵغ بووە.

(غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ): واتە: توندوتیژیی و سەختییەکانی مەرگ، (الغَمْرَةُ: مُعْظَمُ المياه السَّاتِرَةِ لِمَقَرِّهَا، وَالغَمَرَاتُ الشَّدَائِد..)، (غمرات) کۆیەکەی (غمرة)یە، کە بە زۆریی بە ئاوی زۆر دەگوترێ، وە هەروەها بە کاتی ڕووح کێشان دەگوترێ، کە وردە وردە ڕووح لە بنی پێ ڕا دێو بە ئەژنۆو لاقدا سەردەکەوێو، دوایی دەگاتە لای ڕانو، ئنجا دەگاتە پشتێنو سینگ، وە لە سینگدا کابرا دەست دەکات بە غەرغەرە، ئنجا لەو کاتەدا، ئەندامەکانی دیکەی جەستەی، هەموویان سارد دەبنەوە، بە هەر حاڵ دوایی زار پێکدادەداو هەناسەیەك دەداو کۆتایی دێ، کەواتە: (غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ) واتە: حاڵەتی گیان کێشانو گیانەلا.

(عَذَابَ ٱلۡهُونِ ): (عَذَاب) واتە: سزاو ئازار، (الهُونُ: وَالهَوَانُ)، وشەی (هُونَ وَهَوَانَ) واتە: ڕیسوایی، دەڵێ: (أَهَانَهُ: اسْتَخَفَّ بِهِ، والإِسْم: الهَوَانُ وَالمَهَانَةُ) واتە: بە سووك تەماشای کرد، بە کەم تەماشای کرد، (هُونَ) لێرەدا چاوگە، بە مانای (هوان) دێ، واتە: سزای ڕیسوایی بچێژن.

(فُرَٰدَىٰ): (جَمْعُ فَرِيد، نَحْو أَسِير وَأُسَارَى)، (فُرَادَى) واتە: تاکەکان کۆی (فَرِيد)ە، واتە: تاك، بەتەنیا، وەك (أَسِير)ە، واتە: یەك دیل، کە کۆیەکەی (أُسَارَى)یە، واتە: دیلەکان، کە مەبەست ئەوەیە لە ڕۆژی دوایی دا، هەر کەسێك بەتەنیا دەچێتەوە بەردەم دادگای خوای دادگەر.

(خَوَّلۡنَٰكُمۡ ): (أعْطَيْنَاكُمْ، وَالتَخْوِيلُ فِي الأَصْلِ إِعْطَاء الخَوَل، خَوَّلَهُ اللهُ الشيء، مَلَّكَهُ إِيَّاهُ وَالتخوّل: التَعَهُّد)، (خَوَّلْنَاكُم) یانی ئەوەی پێماندداون، (تخويل) لە ئەسڵدا ئەوەیە شتێك بدەی بە کەسێك بۆئەوەی سەرپەرشتیی بکات، دەگوترێ: (خَوَّلَهُ اللهُ الشيء) واتە: خوا ئەو شتەی کردە موڵکی ئەو کەسە، (التخوّل: التَعَهُّد) واتە: ئاگا لێبوونو سەرپەرشتیی کردن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾﴾، لەوبارەوە ئەم دەقە گێڕدراوەتەوە: ﴿عَن إِبْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ قَولَه: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾، يَعْنِي: مِنْ بَنِي إِسرائِيل، قَالَتِ اليَهُود: يَا مُحَمَّد أَنْزَلَ اللهُ عَلَيْكَ كِتَاباً؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالُوا: وَاللهِ مَا أَنْزَلَ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ كِتَاباً! قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ، قُلْ يَا مُحَمَّد: ﴿مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ ...﴿٩١﴾﴾؟! قَالَ: اللهُ أنزله﴾[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾، واتە: لە بەنی ئیسرائیلییەکان هەوا هەیە وەك پێویست خوایان بە مەزن نەگرتو خوایان نەناسی دەڵێ: جوولەکەکان گوتیان: ئەی موحەممەد! ئایا خوا کتێبی ناردۆتە سەر تۆ؟ فەرمووی: بەڵێ، جوولەکەکان گوتیان: سوێند بە خوا، خوای هیچ کتێبێکی لە ئاسمان نەناردۆتە خوار (واتە: ئەوەندە ڕقیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا، نکووڵیی کتێبەکانی خۆشیان کرد)، ئنجا خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوار کە دەفەرموێ: بڵێ:

---

١) جامع البيان للطبري برقم: (١٣٤٥٦)، وفتح القدير للشوكاني، ج٢، ص٢٠٣، وَإِبْنُ أَبي حَاتم برقم: (٧٥٩١)، والسيوطي في الدر المنثور، ج٣، ص٣١٣، ونسبه إي إبن المنذر، وأبي الشيخ، وإبن مردويه.

ئەدی کێ ئەو کتێبەی دابەزاندوە کە مووسا هێنای، کە ڕۆشنایی‌و ڕێنمایی بوو بۆ خەڵك؟ دوایی دەفەرموێ: بڵێ: خوا دایبەزاندوە.

## ڕوونکردنەوە:

ئێمە لە سەرەتای تەفسیرکردنی ئەم سوورەتەدا گوتمان: ئەم سوورەتە هەمووی پێکەوە هاتۆتە خوار، جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن، کەواتە: نابێ هۆی هاتنە خواری ئایەتەکان هەبێ، چونکە هەمووی پێکەوە هاتوە، لە یەك کاتدا، لە یەك شەوداو، حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدا بووە !

وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوا لە یەك شەودا دایبەزاندوە، بەڵام وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی تێدایە کە لەوکاتەدا هەبوون، دیارە چەند ڕووداوێك‌و بەسەرهاتێك هەبوون خوای پەروەردگار وەڵامی هەمووانی بە یەکجارو لە یەك شەودا ناردۆتە خوار، لەم سوورەتەدا، کەواتە: دابەزێنرانی ئەم سوورەتە لە یەك شەوو لە یەك کاتدا، تێکناگیرێ لەگەڵ ئەوەدا کە هەندێك لە ئایەتەکان، هۆی هاتنە خوارەوەیان هەبێ، کە ئەمەی ئێرە یەك لە ئایەتەکانەو، چەند ئایەتێکی دیکەش هەن، کە پێشتر باسمان کردن، وە چەند ئایەتێکی دیکەش لەمەو دوا دێن، چونکە ئەوانە دیارە ئەو قسەو باس‌و پرسیارو ئیشکالانە هەبوون لەو کاتەدا، لەو سەروحەدەدا، ئنجا خوای کاربەجێ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارو ئیشکالانەی، خستۆتە نێو دووتوێی ئەم سوورەتە موبارەکەوە.

# مانای گشتی ئایەتەكان

پێشتر ئاماژەمان پێدا كە خولگەی سەرەكیی ئەم سوورەتە موبارەكە، سێ تەوەرەیە، ئەوانیش خوا بە یەكگرتن، وە پێغەمبەرایەتیی‌و وەحی پێغەمبەران، وە هاتنی رۆژی دوایی‌و لێپرسینەوەو سزاو پاداشت‌و بەهەشت‌و دۆزەخ، بەڵام ئەوەی زیاتر جەختی لەسەر كراوەتەوە، بریتیە لە خوا بەیەكگرتن‌و تەنیا خواپەرستن، وە پووچەڵكردنەوەی بتپەرستیی‌و هاوبەش بۆ خوا دانان، بە هەموو جۆرەكانیەوە.

ئنجا لێرەدا ئەم چوار ئایەتە، زیاتر دەربارەی وەحیی‌و پێغەمبەرایەتیی‌و دابەزێنرانی كتێبەكانی خوا دەدوێن، بەتایبەتی كۆتا كتێبی خوا كە قورئانە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾، وەك بۆ خوا شایستەیە خوایان بە مەزن نەگرت، خوایان نەناسی، بۆچی رێزی خوایان نەگرت؟ لەبەرئەوەی یەك قسەیان كرد! ﴿إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ﴾، كاتێك كە گوتیان: خوا هیچ شتێكی نەناردۆتە خوارێ‌و، هیچی دانەبەزاندوە بۆ سەر هیچ بەشەرێك، ئا ئەوە رێزلێنەگرتن‌و بەگەورەنەگرتنی خوایە، كە تۆ نكووڵیی بكەی لەوە كە خوا پەیام‌و وەحیی‌و بەرنامەی ناردوە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) كە ئەوانیش بە خەڵكی رابگەیەنن، تاكو خەڵك بزانن چۆن بژین؟ خوا چی لێ داواكردوون، كە ئەو ماوەی ژیانی دنیا چۆن بگوزەرێنن؟ ئەوە رێز لێنەگرتنی خواو بە مەزن نەگرتنی خواو نەناسینیەتی، كە تۆ گومانت وابێ خوا ﷻ بەرنامەو رێ‌و شوێنی خۆی بۆ بەندەكانی بە پێغەمبەراندا نانێرێ !

ئنجا وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین، خوای بەرزو مەزن لە سێ شوێنی قورئان دا ئەم رستەیەی بەكارهێناوە: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾، لە سوورەتی (الزمر)دا، كە لەوێ دەربارەی قیامەتە، وە لە سوورەتی (الحج)یش دا، كە

لەوێش دەربارەی خوا بەیەکگرتنە، کەواتە: ئەو سێ ئەسڵە هەر کەسێك نکوولیان لێ بکات، خوای نەناسیوەو ڕێزی لێ نەگرتوەو بەگەورەو مەزنی نەگرتوە.

ئنجا خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ﴾، بلێ: ئەدی (ئەگەر خوا هیچ کتێبێکی دانەبەزاندوەتە سەر هیچ بەشەرێك)، ئایا ئەو کتێبەی کە مووسا هێنای، کە ڕۆشنایی‌و ڕێنمایی بوو بۆ خەڵك، کێ دایبەزاند؟ ئێوە بۆخۆتان دەڵێن: ئێمە شوێنکەوتووی مووساین‌و، مووسا کتێبی لە خواوە بۆ هاتوە، ئنجا ئەو خوایەی ئەو کتێبەی مووسای دابەزاندوە، هەر ئەویش قورئانی بۆ موحەممەد ﷺ دابەزاندوە، وە کتێبی بۆ گشت پێغەمبەران ناردوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾، کە ئەو کتێبەتان چی لێ‌دەکرد ؟ دەتانکردە پەڕپەڕ، بەش بەش، هەندێکیانتان ئاشکرا دەکردن‌و زۆریشتانیان پەنهان دەکرد، دیارە ئەوەی کە لە بەرژەوەندییان بووە ئاشکرایان کردوەو، ئەوەی زەرەریشیان بووە، شاردوویانەتەوە، وەك زۆر لە مسوڵمانان ئێستاش وا لەگەڵ قورئاندا مامەڵە دەکەن: ئەو ئایەتانەی باسی حوکم‌و سیاسەت‌و حەڵاڵ‌و حەرام دەکەن، زۆر لەو مەلایانەی سەر بە حیزب‌و ڕژێمە سیکۆلاریست‌و خۆسەپێنەکانن، بەلایاندا ناچن‌و ئایەتی وا باس دەکەن کە بە حیسابی وان، زیانی بۆ پەزەکانی وان نەبێ !! ﴿وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ﴾، وە ئێوە ئەوەی کە نە خۆتان‌و نە باب‌و باپیرانتان نەتاندەزانی، فێری کران ، بەهۆی کتێبەکانی خواوە، چ کتێبەکەی مووسا کە تەوراتە، وە چ کتێبەکانی دیکە، کە خوا بۆ پێغەمبەرانی دیکەی ناردوون، زۆر شتیان فێرکردن‌و بەهۆیانەوە هۆشیارو بێدار بوونەوە، زۆربەی بەها بەرزەکان لە کتێبەکانی خوا وەرگیراون، ڕاستە ڕێ‌و شوێنی پێغەمبەران کوژاوەتەوە، بەڵام ڕەوشت‌و بەهاکان، کە لە کتێبەکانی خوادا هەبوون، هەر زیندوون‌و لەنێو خەڵکدا بڵاوبوونەتەوە، ﴿قُلِ اللَّهُ﴾، واتە: ئەمە وەڵامی پرسیارەکەیە، کێ ئەو کتێبەی دابەزاندوە کە مووسا هێناویەتی؟ بڵێ: خوا،

﴿ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ﴾، دوایی لێیان گەڕێ، با هەر خەریکی گەمەو یاریی بن، لەو قسەو قاڵو درۆو دەلەسەو خەیاڵانەی خۆیاندابن.

پاشان دێتە سەر باسی قورئانو دەفەرموێ: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾، وە ئەمەش کتێبێکە ناردوومانەتە خوار، کتێبێکی بەپێزە، بەرهەمدارە، پڕ خێرە، هەرچی کتێبی ئاسمانییەو خوا ناردوویەتی، هی پێش خۆی بە ڕاستیان دەزانێ، بە ڕاستدانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی، هەموویان بە ڕاست دەزانێ، وەك ئەسڵەکەیان، ﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا﴾، وە بۆئەوەی تۆ ئەی موحەممەد ﷺ! خەڵکی مەککەو دەوروبەری‌و هەموو دنیا بترسێنی‌و هۆشیار بکەیەوە، ئاگادار بکەیەوە، ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾، وە ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئیمانی پێ دێنن، ﴿وَهُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾، وە لەسەر نوێژەکانیشیان پارێزگارن، پارێز لە نوێژەکانیان دەکەن، لە کاتی خۆیدا نوێژەکانیان دەکەن، بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی کردوە.

ئنجا خوای دادگەر سێ هەڵوێست باس دەکاتو، دوایی ڕایدەگەیەنێ کە ئەوانەی ئەو هەڵوێستانەیان هەبێ چەندە ستەمکارو خراپن!

دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمۡ يُوحَ إِلَيۡهِ شَيۡءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثۡلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە درۆ بەناوی خواوە دەکات، واتە: هاوەڵ بۆ خوا دادەنێ بە درۆ؟ یان دەڵێ: وەحییم بۆ هاتوە، هیچیشی بۆ نەهاتوە، وە لە کەسێك کە دەڵێ: وێنەی ئەوە کە خوا دایبەزاندوە منیش دادەبەزێنم، کێ لەو جۆرە کەسانە ستەمکارترە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: هیچ کەس!

ئنجـــا دەفـــەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ﴾، وە ئەگەر تۆ ببینی کاتێك کە ستەمکاران لـە سـەختییەکانی مـەرگ دان، لـە کـاتی گیانـەلاٌدان، فریشـتەکانیش دەسـتیان بـۆ درێژکـردوون، دەڵێن: ئەو ڕووحانەتـان دەربێنن (تاکو بیانبـەیـن بـۆ شـوێنی سـزا)، ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ﴾، ئەمڕۆ سـزای ڕیسـوایی دەچێـژن، چونکـە خۆیـان زۆر پـێ زل بـووە، لـە بەرانبـەر وەحـی پێغەمبەرانـدا، ئێسـتا دەبـێ سـزای ڕیسـوایی‌و زەبوونـیی بچێـژن (الجَـزَاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَـل)، سـزا بەگوێـرەی شـێوی کردەوەیـە ﴿بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ﴾، لەبەرئـەوەی کە ئێوە قسـەی ناهەقتـان بە ناوی خـواوە دەگـوت، وە لـە بەرانبـەر ئایەتـەکانی خـوادا خۆتـان بـە زل دەگـرت.

لـە کۆتاییـدا دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾، ئێـوە تاك تـاك هاتنـەوە بۆ لامـان، وەك یەکەم جار دروستمان کردبوون، هـەر کـەس بـە تەنیـا دروست کراوەو بەتەنیـاش دەگەڕێتـەوە لای خـوا، خۆ خزم‌و گـەل‌و عەشیرەت‌و حیزبـی لەگەڵـدا نیـە ! ﴿وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ﴾، وە هـەرچی پێمـاندابوون، لـە پشــت خۆتـان بەجێتـانهێشــت، هــەمووی بەجێهێڵــرا لــە دنیـا، ﴿وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟﴾، وە ئــەو تکاکــارانەی کــە پێتانــوابوو هاوبەشـی خــوان‌و دەتانپەرسـتن‌و بەندایـەتییتان بـۆ دەکــردن، لەگـەڵـتاندا نایابینــین، کەسـتان لەگـەڵدا نابینـین، ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾، وە ئــەوەی کـە گومانتـان دەبـردو پێتانــوابوو شـەفاعـەتـکـارن‌و هاوبەشـن، هــەموویان ونـبوون، لەبـەرچاوتـان نەمـان.

واتـە: خۆتـان‌و کردەوەو قسـە خراپـەکانتـان ماونـەوەو، وەك گۆشــتی سـەرچەپەڕێ کەوتوونـە گـۆڕێ !

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖ﴾، واتە: وەك بۆ خوا شایستەیە ڕێزیان لە خوا نەگرتووەو خوایان بە گەورە نەگرتوە، یان وەك شایستەیە خوایان نەناسیوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە گوتیان: ﴿مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖ﴾، خوا هیچ شتێکی دانەبەزاندۆتە سەر هیچ بەشەرێك، خوا وەحیو کتێبو بەرنامەی بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەناردوە.

### کێ قەدری خوا ناگرێ ؟!

خوای کاربەجێ لە سێ شوێنان لە قورئان دا تەعبیری ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾ دووبارە کردۆتەوە:

١/ لێرەدا کە باسی دابەزاندنی پەیامو بەرنامەی خوای پەروەردگار دەکات:

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖ...﴾.

٢/ لە سوورەتی (الحج)دا، کە باسی خوا بە یەکگرتنو تەنیا خواپەرستن دەکات، وەك دەفەرمویٚ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾﴾، لەم دوو ئایەتەدا خوای بالادەست دەفەرمویٚ: ئەی خەڵکینە! وێنەیەك هێنرایەوە، گوێی بۆ بگرن، ئەو شتانەی

کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، ئەگەر هەموویان کۆببنەوە ناتوانن مێشێك دروست بکەن، وە ئەگەر مێشیش (مێشە ڕەشە) شتێکیان لێ بستێنێ، ناتوانن لێی بستێننەوە، بەدواداچوو (طالب)، وە ئەوەش کە بەدوای کەوتوون (مطلوب) هەردووکیان بێهێزن.

ئنجا ئەوە ئیعجازێکی زانستیی تێدایە، چونکە: مێشە ڕەشە بەسەر هەر شتێکەوە بنیشێ، لە ماوەی کەمتر لە چرکەیەکدا بەهۆی زاریەوە، ئەو ماددەیە دەگۆڕێ بۆ حاڵەتێکی دی، بۆیە ئەگەر هەموو دنیا کۆببنەوە، تازە ناتوانن ئەو شتەی لێ بستێننەوە.

وە لە ئایەتی دووەم دا دەفەرموێ: ﴿ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ﴾الحج، واتە: وەك بۆ خوا شایستەیە ڕێزیان نەگرتوە، خوایان بە گەورە نەگرتوە، بێگومان خوا بەهێزی زاڵە.

٣/ وە لە سوورەتی (الزمر)دا، کە باسی ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە لە بەندەکانی دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: وەك بۆ خوا شایستەیە ڕێزی خوایان نەگرتوە، لە ڕۆژی قیامەتدا خوا زەوی لە مست دەگرێ، وە ئاسمانەکانیش هەموو دەپێچێتەوە، لە دەستی ڕاستیدا، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا، لەو هاوبەشانەی بۆی بڕیار دەدەن.

زۆربەی زانایان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێن: ئەوە پێشاندانی دەستەڵات و باڵادەستیی خوایە، کە وەك چۆن یەکێك لە ئێوە تۆپێك، شتێك بە دەستەوە دەگرێ، وە تۆمارێك لە بن هەنگڵی دەگرێ و دەیپێچێتەوە، خوای پەروەردگاریش ئاوا دەتوانێ زەوی لە چەنگ بگرێ، بە دەستەڵاتی بێ وێنەی خۆی، وە دەشتوانێ ئاسمانەکان بپێچێتەوە، وەك چۆن یەکێك لە ئێوە تۆمارێك دەپێچێتەوەو لە بن هەنگڵی ڕاستی دەنێ، لێرەدا ئەو تەعبیرە تەعبیرێکی ڕەمزییە بۆ پێشاندانی دەستەڵاتی خوا.

دەشگونجێ بڵێی: خوای پەروەردگار لە چەنگ گرتن (قبضة)ی هەیەو ئاسمانەکانیش لە دەستی ڕاستی دا دەپێچێتەوە، وەك بۆ خوا شایستەیە، هەردووکیان هەر یەك سەرەنجامیان هەیە.

کەواتە: تەعبیری : ﴿ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴾، وەك بۆ خوا شایستەیە ڕێزیان نەگرتوەو بە گەورەو مەزنیان نەگرتوە، لە سێ شوێنان دا هاتوە، دەربارەی سێ بابەتی سەرەکیی:

١) لە سوورەتی (الحج)دا دەربارەی خوا بەیەکگرتن.

٢) لە سوورەتی (الأنعام) دا دەربارەی پێغەمبەرایەتیی‌و وەحیی‌و پەیامی خوا.

٣) لە سوورەتی (الزمر) دا دەربارەی قیامەت‌و زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە.

کەواتە: هەر کەسێك نکووڵیی بکات لە یەکێك لەو سێ ڕاستییە، ئەوە وەك پێویست خوای تاك‌و تەنیای نەناسیوەو ڕێزی لێ نەگرتوەو، بە گەورەی نەگرتوە، چونکە خوای بێ وێنە، خاوەنی ئەم بوونەوەرەیە، مادام وایە:

١/ دەبێ هەر ئەو بپەرسترێ‌و بەندایەتیی بۆ بکرێ، ئنجا وەك پێویست ڕێزی لێ گیراوەو، وەك بۆ ئەو شایستەیە بە گەورە گیراوەو ناسراوەو بەندایەتیی بۆ کراوە.

٢/ پاشان دەبێ بڕوامان وابێ کە: هەرگیز خوای کاربەجێ‌و دادگەر، مرۆڤەکان کە بەندەی خۆیینی، لەسەر زەوی وێڵیان ناکات، بەڵکو پەیام‌و بەرنامەیان بۆ دەنێرێ، بە پێغەمبەراندا بۆئەوەی بزانن: چۆن بژین‌و حەڵاڵ‌و حەڕام چییەو، چاکەو خراپە کامەیە.

٣/ ئنجا قەناعەتیشمان وابێ خوای خاوەن پاداشت‌و سزا: مرۆڤەکان دوای مراندنیان زیندوویان دەکاتەوەو پشتگوێیان ناخات، بەڵکو لێیان دەپێچێتەوەو لێیان دەپرسێتەوە، تاکو پاداشت‌و سزایان بداتەوە، بەپێی ئەو چاکەو خراپانەی کە کردوویانن.

وشەی (قَدْر وقَدَر)ش لە زمانی عەرەبییدا، بە مانای ئەندازە دێن، دەگوترێ: (قَدْرُ الشَّيءِ وَقَدَرُهُ ومِقْدَارُهُ) واتە: ئەندازەی ئەو شتە، بەڵام خوای پەروەردگار

ئەندازەیەکی دیارییکراوی نیە، وەك دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ ١١﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، ئەدی مەبەست چیە؟ واتە: وەك بۆ خوا شایستەیە: نەیانناسیوە، ڕێزیان نەگرتووە، بە گەورەیان نەگرتوە، شکۆو پایەبەرزیی خوایان نەزانیوە، بۆیە زانایان ئاوایان تەعبیر کردۆتەوە: (وَمَا عَرَفُوهُ حَقَّ مَعْرِفَتِهِ، وَمَا عَظَمُوا الله حَقَّ عَظَمَتِهِ، وَمَا أَجَلُّوهُ حَقَّ إِجْلالهِ).

**مەسەلەی دووەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ﴾، بە پێی هۆی هاتنە خوارەوەکەی کە باسمان کرد: جوولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتیان: ئەی موحەممەد! خوا کتێبی بۆ تۆ ناردۆتە خوارێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەوانیش گوتیان: سوێند بە خوا، خوا هیچ کتێبێکی لە ئاسمانەوە نەناردۆتە خوارێ، نە بۆ مووساو نە بۆ عیساو نە بۆ هیچ کەس، جا لە هەندێ لە بەسەرهاتەکاندا هاتوە، کە دوایی ئەوەی ئەو زانایەی جوولەکەکە ئاوای بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوە، زانایەکانی دیکەی جوولەکە گوتوویانە: تۆ ئەوە چیت گوت؟! ئێمە هەر نکوولێی دەکەین لەو کتێبەی کە بۆ موحەممەد هاتوە، ئەدی ئێمە قەناعەتمان وانیە خوا کتێبی بۆ مووسا ناردوە، گوتوویەتی: ڕاستە، بەڵام لەو کاتەدا ئەوەندە ڕقم هەڵسا بوو، مووساشم لەبیر نەمابوو، بۆیە نکووڵییم لەویش کرد.

دیارە لێرەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: لێیان بپرسەو بڵێ: ئەدی ئەگەر خوا هیچ کتێبێکی نەناردبێ بۆ بەشەر، وە ئێوە کە خۆتان بە شوێنکەوتەی مووسا دەزانن: ﴿مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ﴾، کێ ئەو کتێبەی بۆ مووسا دابەزاندوە، کە مووسا هێناویەتی، کە ڕووناکیی و ڕێنمایی بوو بۆ خەڵکی، ئەمە ئەگەر ڕووی دواندن (خطاب) لە جوولەکەکان بێ.

بەڵام (الطبري) لە تەفسیرەکەی (جامع البيان)دا[١] دەڵێ: ڕووی دواندن لە

١) ج٧، ص: ٢٨٢ .

هاوبەش بۆ خوادانەرەکانە، منیش ڕای (طبري)م پێ ڕاستترە، چونکە ئەم سوورەتە وتووێژەکانی هەموویان لەگەڵ هاوبەشدانەرەکانن‌و جارێ جوولەکە نەهاتوونە پێش تاکو خوای پەروەردگار ڕووی دواندن (خطاب) لەوان بکات، بەڵام زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: نەخێر لێرەدا ڕووی دواندن (خطاب) لە جوولەکەکانە.

پێموایە ئەوان بۆیە ئیشکالیان بۆ دروست بووە، گوتوویانە: شتێکی مەنتیقیی نیە، خوا بە هاوبەشدانەرو بتپەرستەکان بڵێ‌و ئیلزامیان بکات کە ئیمان بە قورئان بێنن، وەك چۆن ئیمانیان بەو کتێبە هەیە کە بۆ مووسا هاتوە، کە تەوراتە.

بەڵام لەڕاستییدا ئەو مەسەلەیە پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە کە دوێنراوەکان جوولەکەبن، ئەوجار بڕوایان بەو کتێبە بێ، کە بۆ مووسا نێردراوە، چونکە بتپەرستەکانی مەککەش دەیانزانی کە پێغەمبەرێك هاتوەو ناوی مووسا بووە، وە پێغەمبەرێك بە ناوی ئیبراهیم هاتوەو کتێبی هەبووە، وە پێغەمبەرانی دیکەش هاتوون، بەڵام ئینکارییان دەکرد کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەر بێ، هەر بۆیەش دەیانگوت: ئەگەر ڕاست دەکەی تۆش پێغەمبەری خوای، موعجیزەو بەڵگەیەك بێنە، وەك ئەوەی بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتوە.

کەواتە: هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، بڕوایان بەوە هەبوو کە خوا ژمارەیەك لە پێغەمبەرانی ناردوون، وە کتێبیشی بۆ ناردوونە خوار، بۆیە شتێکی ئاساییە کە خوا بفەرموێ: ئەو بتپەرست‌و هاوبەش بۆ خوادانەرانە، وەك بۆ خوا شایستەیە ڕێزی خوایان نەگرت، کە گوتیان: هیچ کتێبێکی دانەبەزاندۆتە سەر هیچ بەشەرێك، بۆیە بە نکووڵیی لێکردنەوە، پێیان بڵێ: ئەدی کێ ئەو کتێبەی دابەزاندۆتە سەر مووسا، کە مووسا هێنای‌و ڕووناکیی‌و ڕێنمایی بوو بۆ خەڵك، واتە: دیارە شتێکی باو بووەو، هاوبەش بۆ خوادانەرەکانیش قەناعەتیان بەوە هەبووە، کە کتێبێك لە خواوە هاتوە بۆ مووسا، وە با ئەوانە نەشبووبنە جوولەکە، بەڵام بەگشتی زانیویانە کە پێغەمبەرێك هەبووە، بەناوی مووساو کتێبیشی بۆ هاتوە، بەناوی تەورات، وە گەلی جوولەکەش هەن، هەروەها کە خەڵکێکی دیکە هەیە بەناوی نەصرانیی پێغەمبەرێکیان هەبووە بەناوی عیساو، کتێبێکیان هەبووە بەناوی ئینجیل، هەروەها پێغەمبەرانی دیکەش بەگشتی.

یانی: دیارە جۆرێك لە بڕوا هەبوونو قەناعەت پێبوون لەنێو هاوبەش بۆ خوادانەرەكاندا هەبووە، ئەوەش بایی ئەوەندە دەكات، كە خوای پەروەردگار پێیان بفەرموێ: وەك چۆن ئیمانتان بەو كتێبە هەیە، كە بۆ مووسا هاتووەو خوا بۆی دابەزاندوە، ئیمانیش بێنن بەو كتێبەی كە بۆ موحەممەد ﷺ هاتوە.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ تَجۡعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ ﴾، واتە: ئەو كتێبەی مووسا دەكەنە بەش بەش، كە لە ئەسڵدا (قُرطاس)و (قِرطاس) بە هەر شتێك دەگوترێ: لەسەری بنووسرێ، جا كاغەز بێ، پێستی ئاژەڵ بێ، وەك پێستی حوشترو ئاسك، یان گەڵای دارخورما بێ، یان بەردی تەنك بێ.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ تَجۡعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ ﴾، واتە: ئێوە ئەو كتێبەی مووساتان بەش بەشو پەڕ پەڕ دەكرد، لێرەدا دەگونجێ ڕووی دواندن لە جوولەكەكان بێ كە ئێوە تەوراتتان بەش بەش دەكرد، وە دەشگونجێ دیسان ڕووی دواندن لە كافرو بتپەرستەكان بێ، واتە: ئەو كتێبەی بۆ مووسا هاتوە، ئێوەش هەندێكتان لە جوولەكەكان وەردەگرتو بەش بەشتان دەكردو، ئەوەی كە لە بەرژەوەندیی خۆتان دابوو، یان لەگەڵ بەرژەوەندییتاندا دەگونجا، لەگەڵ بیرو بۆچوونتاندا دەگونجا، ئاشكراتان دەكرد، ﴿ تُبۡدُونَهَا وَتُخۡفُونَ كَثِيرٗا ﴾، هەندێكیتان دەردەخست، وە زۆریشتان پەنهان دەكرد، دیارە ئاواش خوێندراوەتەوە بە صیغەی نادیار (صیغة الغائب): (يُبْدُونَهَا وَيُخْفُونَ كَثِيرًا) واتە: ئەوان، بۆیە: دەگونجێ مەبەست پێی جوولەكەكان بێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوادانەرەكان بێ، كە تەوراتیان بەش بەش دەكردو پەڕ پەڕیان دەكرد، نەك هەمووی پێكەوە، بێنن، ئنجا كە هەندێكیان دەرخستووەو، هەندێكیان پەنهان كردوە، فەلسەفەو هۆكارەكەی ئەوە بووە كە: ئەگەر هەموویان پێكەوە دەرخستبایە، ئەو كاتە دەبوو ئەو بتپەرستییە، بەنسبەت هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانەوە، یاخود ئەو بەزمو بازاڕە ناشەرعییە بەنسبەت جوولەكەكانەوە، نەمابایەو دەستیان لێ هەڵگرتبایە، بەڵام ئەو بەشەی كە لە بەرژەوەندیی خۆیان

دابووە، دەریانخستووەو، ئەوەش لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا تێکگیراوە، پەنهانیان کردوە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿...أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ...﴿٨٥﴾﴾ ئایا بڕوا بە هەندێك لە کتێب دێنن‌و، بەرانبەر بە هەندێکیشی بێبڕوا دەبن؟!

دیارە لە نێو مسوڵمانانیش دا ئەوە هەر هەیە، بۆ وێنە لەبەر هۆیەك بێ مسوڵمانانێك کە بۆیان ناکرێ جەنگ‌و جیهاد بکەن، ڕەنگە پێیان ناخۆشبێ، ئایەتەکانی جەنگ‌و جیهاد بخوێنرێنەوە، مسوڵمانانێکی دیکە کە گیرۆدە بوونە بە جۆرێك لە شیرك‌و هاوبەش بۆ خوادانانەوە، کاتێك ئایەتەکانی خوا بەیەکگرتن (توحید)یان بە گوێ دادەدرێن، ڕەنگە پێیان قەڵس بن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْأَخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾﴾الزمر، واتە: وە ئەگەر تەنیا باسی خوا بکرێ، ئەوانەی بێبڕوان (مەبەست پێی موشریکەکانە) بە دوارۆژ، دڵیان ڕێك دێ، وە ئەگەر باسی ئەوانی دیکە بکرێ، (واتە: باسی بتپەرستەکان) دڵیان خۆش دەبێ.

جا هەر کەسێك لەسەر ڕێیەکی بەتاڵ بوو، ئەو هەقەی کە لە بەرانبەر ئەو ڕێیە بەتاڵەدا هەیە، پێی قەڵسەو پێی خۆشە نەیبیستێ‌و، نەیبینێ‌و باس نەکرێ، بۆیە پێویستە ئەو هەقەی لە خواوە دێ، هەمووی وەربگیرێ، چەندت کار بۆ پێدەکرێ‌و چەندت کار بۆ پێناکرێ؟ مەسەلەیەکی دیکەیە، بەڵام دەبێ هەمووی قبووڵ بکەی‌و بە پێی قۆناغەکانی بۆ گونجان کاریان پێبکەی، گرنگ ئەوەیە هەمووی قبووڵ بێ‌و وەریبگری، وە لەڕاستییدا ئەمەش مانای مسوڵمانەتییە، چونکە (مُسلم) کەسێکە کە بۆ خوا ملکەچە: بۆ هەموو ئەوەی کە خوا فەرموویەتی، ئنجا ئێستا هەمووی بۆ جێبەجێ دەکرێ، یاخود هەندێکی بۆ جێبەجێ دەکرێ، ئەوە شتێکی دیکەیە، چونکە هاوەڵانی بەڕێزیش خوا لێیان ڕازی بێ، لە هەموو قۆناغەکاندا نەیانتوانیوە بە هەموو ئیسلامەوە پابەند بن‌و، هەموو فەرمان‌و قەدەغەکانیان لە یەك کاتدا بۆ

جێبەجێ نەکراوە، بەڵکو هەر شتە لە قۆناغی خۆیداو لە کاتی خۆیدا، بەلام ملکەچ بوون بۆ هەمووی، وە بەرانبەر بە هیچ کام لە یاساکانی شەریعەت، هەستیارییان نەبووە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ﴾، وە فێرکران ئەوەی کە نە ئێوەو نە باب و باپیرانتان نەتانەدەزانی، واتە: بەهۆی ناردنی تەوراتەوە، کە بۆ مووسا هاتوە، ئێوە ئەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان و کافرەکان، هەم ئەوانی مەککەو هەم ئەوانی ئێستاش! وە لە ڕاستییدا تەورات زۆر شتی فێری خەڵك کردوە، ئێستاش لەگەڵ دابێ.

وە بۆ زانیارییتان: ئەوەی پێی دەگوترێ: پەیمانی کۆن (العهد القديم) تەنیا تەورات نیە، بەڵکو چەند کتێبێکەو زۆر لە تەورات زیاترە، تەورات یەکێکە لە کتێبەکان، هەروەك چۆن ئینجیلەکانیش کە لە ئەسڵدا خوا ئینجیلێکی بۆ عیسا ناردوە، بەلام نەصڕانییەکان کردوویانە بە چوار، ئەو چوارەشیان لەنێو حەفتا ئینجیلی دیکەدا هەڵبژاردوون، بەڵێ: هەر چوار ئینجیلەکانی (متى، لوقا، مرقس، يوحنا) بەشێکن لەوەی کە پێی دەگوترێ: پەیمانی نوێ (العهد الجديد)، کە ئەویش کۆمەڵێك کتێبی دیکەشی تێدان.

ئنجا ئەگەر ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێ، کە ئێمە ئەو ڕایەمان هەڵبژارد، واتە: ئێوە بەهۆی تەوراتەوە کە خوا ناردوویەتە خوارو، لەنێو جوولەکەکاندا هەبووەو ئێوەش پێتانگەیشتوە، بۆ وێنە: ئێمە وەك مسوڵمان دەگونجێ بەهۆی ئەو کتێبانەوە کە لەلای جوولەکەکانن، بەڵێ ناهەقیشیان لەگەڵ تێکەڵ کراوە، یان ئەو کتێبانەی لەلای نەصرانییەکانن، یان ئەو کتێبانەی لەلای صابیئەکانن، یان ئەو کتێبانەی لەلای مەجووسەکانن، یان ئەو کتێبانەی لەلای هیندەکانن، یان ئەو گوتانەی بووداو کۆنفۆشیۆس گوتوویانن، دەتوانین زۆر شتی باشیان لێوەربگرین، کە دیارە هەرچی شتی باشەو لەو کتێبانەدا هەیە، لە قورئان دا بە شێوەی زۆر باشتر هەیە، وە دیارە ئەو ناهەقەی کە لەگەڵ واندا تێکەڵ کراوە، لە قورئاندا نیە، کەواتە: کە

دەفەرموێ: ﴿ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانو کافرەکان بێ، کە زۆر شتیان لە خاوەن کتێبەکان وەرگرتوە، بەتایبەت لە تەورات، وە دەشگونجێ هەر مەبەست پێی جوولەکەکان بێ، لەسەر ڕای دووەم، واتە: ئێوە بەهۆی تەوراتەوە، زۆر شت فێربوون، کە خۆتانو بابو باپیرانتان نەتاندەزانی.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴾، بڵێ: خوا (ئەو کتێبەی دابەزاندوە)، دوایی وازیان لێبێنە لە بیرۆکەی پووچی خۆیاندا، لە خەیاڵەکانی خۆیاندا، با گەمەو یاریی بکەن، واتە: وەك چۆن مندالْ خانووچکە دروست دەکەن، ئەوانیش ئەو فیکرەو بۆچوونە پووچانەی کە لەسەرینی، شتێکی بەتاڵو پووچە، وەك خانووچکەو یارییو گەمەی منداڵان، لێیانگەڕێو بەجێیان بهێڵە، بەس وەڵامیان بدەوەو بڵێ: خوا ئەو کتێبەی ناردوە، خوایەك کە تەوراتی بۆ مووساو ئینجیلی بۆ عیسا ناردوە، دەشتوانێ قورئانیش بۆ موحەممەد ﷺ بنێرێ، وە ئێوە مادام بڕواتان بەوە هەیە کە خوا تەوراتی بۆ مووسا ناردوە، دەبێ ئەو بڕوایەتان واتان لێبکات کە پێتان سەیر نەبێ، خوا قورئانیش بۆ موحەممەد ﷺ بنێرێ.

**مەسەلەی سێیەم:** خوای پەروەردگار پێناسەی قورئان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَاۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴾، وە ئەمە (واتە: ئەم قورئانە) کتێبێکە ناردوومانەتە خوار، واتە: وەك چۆن پێشتر تەوراتمان بۆ مووساو، زەبوورمان بۆ داوودو، ئینجیلمان بۆ عیساو، کتێبەکانی دیکەمان بۆ پێغەمبەرانی دیکە ناردون، بە هەمان شێوە ئەمەش کتێبێکە بۆ موحەممەدمان ﷺ ناردوە.

# پێناسەی قورئان بە چوار سیفەت

سیفەتی یەکەم : دەفەرموێ: ﴿ مُبَارَكٌ ﴾، واتە: بە پیتو بە فەڕو بەپێزو بەرهەمدار، نەك بە مانای پیرۆزو موقەددەسو موتفەڕك بێ، یانی: هەر کەس شوێنی قورئان بکەوێو بڕوای پێ بێنێ، دەوڵەمەندی دەکات، بێنیازی دەکات، بەرهەمی زۆری بەدەستەوە دەدات، ژیانی پڕ دەکات لە خێرو بێرو بەرەکەت.

## لێرەدا دەمەوێ تۆزێك ئەو مەسەلەیەتان بۆ ڕوون بکەمەوە:

هەندێ لە خەڵکی سادە، هەندێ ڕەفتار دەکەن، کە لە ڕووی شەرعەوە، هیچ بنچینەیەکی نیە، بۆ وێنە: پەڕۆیەك، خواردنێك، شیرنەمەنییەك، لەسەر گۆڕو مەزارگەی پیاوچاکێك دێننەوە، دەڵێن: ئەمە موتفەڕەکە، پیرۆزە، موقەددەسە، یان دەڵێن: ئەو پەڕۆیەی کە لە قورئان دەئاڵێنرێو قورئانی تێوە دەپێچرێ، ئەوە موبارەکە، کە واش نیە، وەك جوولەکەو نەصرانییەکانیش کتێبەکانی خۆیان تەقدیس دەکەن، بەلاَم ئێمە ناڵێین: قورئان موقەددەسە، چونکە بۆ زانیارییتان موقەددەس جیایە لە موبارەك، موبارەك یانی: (کثیر الخیر)[1] خێری زۆر تێدایە، بەرهەمدارە، وە بەرەکەتەکەشی دەست کەسێك دەکەوێ، کە لێی ورد دەبێتەوەو کاری پێدەکات، نەك لەسەر ڕەفەیەکی بەرزی دابنێو، پەڕۆو شاڵی تێوەر بپێچێ، ئەو کەسە هیچ بەهرەیەك لە قورئان وەرناگرێ.

ئنجا ئەبو حامدی غەززالیی لەوبارەوە قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: کەسێك کە ئاوا مامەڵە لەگەڵ قورئان دا دەکات (واتە: لە پەڕۆیەك دا دەیپێچێو لەسەر ڕەفەیەکی بەرز دایدەنێ) وەك ئەوە وایە: حوکمڕانێك نامەیەکی پڕ لە ئاڕاستەو زانیاریی ناردبێ بۆ خەڵك، ئەوانیش بڵێن: دەبێ

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص: ١١٩، ١٢٠.

ڕێـــزی ئــەو نامەیـــەی حوكـــمڕان بگـریـــن، بێـــنن پـــەڕۆی تێـوەرپێچـــن و لــە شـوێنێكی بـەرزی دابنـێن، ئنجا مـاوە مــاوە بچـــن سـلاوێكـی لـێبكـەن و بڵـێن: ســـلاو لــە نامــەی حوكــمڕان، دەبــێ ڕێـزی لــێ بگـرین! دەڵــێ: دوایــی ئەگـەر حوكمــڕان ئــەوە ببیســتێتەوە، زۆریشیان سـزا دەداو، پێیـان دەڵـێ: مـن نامـەم بۆ نــاردوون تاكو ئیشـی پێبكەن، كە پڕ لـە ئاڕاستەو زانیارییـــە، كەچـی ئێـوە لـە پەڕۆتـان پێچاوەو لـە وێتـان داناوە؟! ئیـمام غەززالـیی دەڵـێ: مسوڵمانـانی ئێسـتاش ئـاوا مامەڵـە لەگـەڵ قورئـان دا دەكەن.

دووەم : دەفـەرموێ: ﴿ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، بە ڕاسـتدانەری هەرچییـەكـە لـە پێش خـۆی دابووە، چی لە پێش خـۆی دابووە؟ هـەموو كتێـبەكانی خـوا كـە لـە پـێش قورئــان هـاتوون، وە هــەموو پێغەمبــەران، كـە لـە پـێش موحەممـەد ﷺ نێــردراون، قورئـان هەموویان بە ڕاســت دەزانــێ.

ئێمـەی مسـوڵمان ئیمانـان بـە هـەموو پێغــەمبەران هەیــە: ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴾، جیـــاوازیی ناخەینـــە نێـــوان هیـــچ كامێكیـان، وە ئێمـە بـۆ خــوا ملكـەچین، كەواتـە: ئــەوە دینـی ئێمەیـــە ئـەی جوولـەكــەو نەصــڕانیـــی یەكـان، ئــەی خــاوەن كتێبەكـان! ئێمــە ئیمانمـان هێنـاوە بـە خــوا ﷻ وە بـە هــەر كتێـبێك كـە خــوا نــاردوویەتی، وە بـە هـەر پێغەمبەرێك كە خـوا ڕەوانـەی كـردوە.

ئـەم ئیسـلامە زۆر گەورەیـە: لـە زینـدانی ئەمریكییـەكان دا، جارجـار لەگـەڵ ئەمریكییـــەكان دا وتوویـژی فیكرییمـان دەبـوو، جـا هـەیانبوو جوولەكـە بـوو، هەیانبـوو نەصـڕانیی بوو، دەیانگـوت: ئەگـەر ئێوە ببن بە جوولـەكە، یـان بـبن بە نەصڕانیی چییـــە، خـۆ تـــەوڕاتو ئینجیلـــیش كـتێبـی خـوان، چ فەرقیـان هەیە لەگەڵ قورئـان دا؟! ئێمە بڕوامـان بە قورئـان نیـە، بەڵام خۆ ئێوە بڕواتـان بە تـەوڕاتو ئینجیلیش هەیـە، كەواتە: ئێمە ئەگەر ئیمانیش بە قورئـان بێنیـن، بۆمـان بـاش نیــە، چونكــە ئیمانمــان پێــی نیــە كە خــوا ناردوویـــەتی، بـــەڵام ئێوە ئیمانتـان بـەوە هەیـە كە تەوڕاتو ئینجیـل خوا ناردوونــی؟!

منیش پێمدەگوتن: ئەگەر ئێمە ببینە جوولەکە یان ببینە نەصرانیی، بەرەو دوا دەگەڕێینەوە !! دەیانگوت: چۆن؟! دەمگوت: چونکە تەوڕات سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا دابەزێنراوە، ئینجیلیش نزیکەی دوو هەزار ساڵ زیاتر لەمەو پێش دابەزێنراوە، هەرچەندە ئەو تەوڕاتو ئینجیلەی کە خوا دایبەزاندوون، غەیری تەوڕاتو ئینجیلی بەردەستی ئێوەن، ئەوەی ئێوە وەك حیکایەتی بەر ئاگردانێیە، سەد هەڵەو ئەفسانەیان تێدایەو، بە دڵنیایی ئەوەنین کە خوا ناردوونی، ئنجا ئەگەرنا ئێمە بڕوامان بە تەوڕاتو ئینجیلی ڕاستەقینەی مووساو عیسا (علیهما السلام) هەیە، بەڵام ئەگەر ئیمان بەو تەوڕاتو ئینجیلەی لەبەردەستی ئێوەدان بێنین‌و، ببینە شوێنکەوتووی ئەو جوولەکایەتیی‌و نەصرانییەتەی ئێوە، ئەوە ئێمە گەڕاوینەوە بۆ دواوە! بەڵام ئەگەر ئێوە ببنە مسوڵمان، بەرەو پێش دێن، دەیانگوت: چۆن؟

دەمگوت: چونکە قورئان لەدوای تەوڕاتو ئینجیلی ئێوە هاتوە، بۆیە ئێوە بەرەو پێش دەچن، پاشان کەسێك کە ئیمان بە ئیسلام دێنێ جوولەکایەتیی‌و نەصرانییەتیی خۆی لەدەست نادات، ئیمان بە تەوڕاتو ئینجیل‌و مووساو عیسا لەدەست نادات، بۆچی؟ چونکە: ئیسلام لەسەرت پێویست دەکات، کە بڕوات بە هەموو پێغەمبەران بێ‌و لەنێویان دا: مووساو عیسا (علیهما السلام) وە بڕوات بە هەموو کتێبەکانی خوا بێ، لەنێویان دا: تەوڕاتو ئینجیل، بەڵام ئێوەی جوولەکە، بڕواتان نەك بە قورئان، بەڵکو بە ئینجیل‌و عیساش نییە، وە نەصرانیی یەکانیش بڕوایان بە موحەممەد ﷺ نیە.

کەواتە: ئەگەر ئینسان مسوڵمان بێ، بڕوای بە هەموو پێغەمبەرانی خوا هەیە، وە بڕوای بە هەموو کتێبەکانی خواش هەیە، وە جیاوازییشیان ناخاتە نێوان، وە ڕێزی هەمووانیش دەگرێ، وە هەر ئەوەش دینی تەواوە، جا ئەوان وەك گوتراوە: (لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ) تەماشای یەکدییان دەکردو دەیانگوت: قسەکەت زۆر مەنتیقییە.

بەڵێ ئێمە وەك مسوڵمان، هیچ کێشەمان لەگەڵ ئەو تەوڕاتو ئەو ئینجیلە ئەسڵییەدا نیە، کە خوا بۆ مووساو عیسای ناردوون، بەڵام:

١/ ئێستا نە تەوراتە ئەسڵییەكەو، نە ئینجیلە ئەسڵییەكە، لەبەردەست دا نەماون، چونكە گۆڕراون‌و دەستكاریی كراون.

٢/ ئەوان بۆ خەڵكێك نێردروان، كە لە ڕۆژگارێكی دیكەدا بوون، ئەگەرنا هەر فەرمایشتی خوان، وە سەدا سەدیش ڕاستن، بەڵام وەك گوتم ئەو تەوراتو ئینجیلە بۆ قۆناغێكی دیكەی بەشەر هاتوون.

لە حاڵێك دا قورئان بۆ هەموو بەشەر هاتوە بە درێژایی زەمان، بە پانیی زەمین، بۆیە خوای كاربەجێ ڕێی نەداوە قورئان دەستكاریی بكرێ، بە پێچەوانەی كتێبەكانی دیكەوە، دەربارەی كتێبەكانی دیكە خوای پەروەردگار بە دەقی ئایەت دەفەرمویْ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ﴿٤١﴾﴾ المائدة، واتە: وشەكان دوای ئەوەی خوا لە شوێنی خۆی دا داینـاون، دەیانگۆڕن، وە فەرموویەتی: ﴿وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴿١٣﴾﴾ المائدة، واتە: بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاریی كرابوون، لەبیریان چوو، وەك دەبینین: خوا بە دەقی ئایەت دەفەرمویْ: هەندێكیان گۆڕی‌و هەندێكیان لەبیرچوو، بەڵام بەنسبەت قورئانەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾﴾ الحجر، واتە: ئێمە خۆمان قورئانمان ناردۆتە خوار "كە یەكێك لە ناوەكانی قورئان (ذكر)ە، واتە: بیرخەرەوە" وە خۆشمان پارێزەرینی.

بەڵام بەنسبەت كتێبەكانی دیكەوە ئایا پاراستنیان عایدی كێ كرابوو؟ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: ئێمە تەوراتمان ناردبووە خوار، ڕێنماییو ڕۆشنایی تێدابوو، وە ئەو پێغەمبەرانەی كە ملكەچ بوون بۆ خوا حوكمیان پێدەكرد، وە ڕەبانییەكان‌و ئەحبارەكان {(ڕەببانیی): زانایەكە

مشوورخـۆرو حوکمـڕان بـێو، ئیـدارەی خەڵـك بکـات، (حیبـر)[١] یـش ئـەو زانـایەیـە کە پێشەواو شارەزا بـێ، بـەڵام حوکمـڕانو مشـوورخۆرو کـاربەدەسـت نەبـێ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە پاراستنی کـتێبـی خـوایان پێ سـپێردرابوو.

کەواتــە: پاراســتنی کتێبـــی خــوا کــە تەوراتــە بــە کــێ ســپێردرابوو؟ بــە ڕەببانییـەکانو ئەحبــار، بــەڵام وەك گوتــم: خــوا پاراســتنی قورئــانی تایبـەت کردوە بە خۆیـەوە، گرنـگ ئەوەیە ئەو کـتێبانەی پێشـتـر خـوا ناردوونــی، هــەر یـەکــە بــۆ قۆناغـێـكو کۆمەڵگایەکــی دیکــە بــوون، وەك مــن لــە هەنـدێ لـە کتێبـەکانم دا، ئـەو نموونەیـەم هێنـاوەتـەوە، گوتوومـە:

دەرســی قوتابخـانە کە بۆ پۆلەکانی ســەرەتایی دادەنــرێ، ئایـا ئەگــەر دوایـی بــە کەڵـکی قۆنـاغی نێـوەندییو ئامـادەییو زانکـۆ نەهــات، مانـای وایــە ئــەو زانیارییـانەی لە قۆناغـی سەرەتایی دا دەخـوێنـرێـن، ناڕاســتن؟ نـەخێر، ناڕاســت نــین، بــەڵام بــۆ قۆنــاغی ســەرەتایین، خــوای زانــاو توانــاش ئــەو کتێــبانەی کــە نــاردوون، ڕاســتن، بــەڵام بــۆ قۆنـاغی دیکـەی ژیــانی بەشــەر بوون، بــەڵام بــۆ دوا قۆنــاغی ژیـانی بەشـەرو بــۆ قۆنـاغی کامـڵ بــوونو پێگەیشــتنی بەشــەر، خــوا قورئـانی نــاردوە.

سـیفەتی سـێیـەم : دەفـەرموێ: ﴿ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾، وە بۆئـەوەی کـە تـۆ (أُمَّ ٱلْقُرَىٰ) دایکـی شـارەکـان (شــاری مەککــە)، واتــە: خەڵـکــی دایکــی شـارەکان ئاگاداربکەیـەوەو بتـرسـێنی، وە ئـەو خەڵکەش کـە لـە دەوری مەککەن، ئەوانیش بتـرسێنیو ئاگـاداریان بکەیەوەو هۆشـیاریان بکـەیەو.

واتـە: ئـەم قورئــانە هـاتوە بـۆ هــەموو بەشــەر، چونکە ئەگەر مەککە خاڵـی (٠)یـّـك بــێ، جیّـی هــەموو جیهـان لــە دەوری دەبێتـــەوە، بۆیــە (وَمَنْ حَوْلَهَا)

١) الحِبْر: بالكَسْرِ والفتح واحد (أَحبارٍ) اليهود والكَسْرُ أفْصَحُ لأنّه يُجْمَعُ على أفعالٍ دون فعول، وقال الفرّاء: هو بالكسر، وقال أبو عُبَيْد: هو بالفتح، وقال الأصمعي: لا أدري أهو بالكسر أو بالفتح. مختار الصحاح: ح ب ر، ص ١١٧.

تێکـڕای دنیـا دەگرێتـەوە، چونکـە دنیـا هـەمووی لـە دەوری مەککـەیە: لـە مەککەوە بەرەو باشوور بڕۆی، یان بەرەو باکوور بڕۆی، بەرەو ڕۆژهەڵات بڕۆی، یان بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆی، هەتا بڕۆی هەر دەوری مەککەیە، بەڵام لە چەند بازنەیەکی گچکەدا، دوایی گەورەو، پاشان گەورەترو فراوانترو هەتا دوایی هەموو جیهان، دەوری مەککە دەداتەوە، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ئەو قورئانەمان ناردوە بە پیتو بە پێزو بە بەرەکەتە، وە بە ڕاستدانەری کتێبو پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، تاکو خەڵکی مەککەو دەوروبەری مەککەی پێ وریا بکەیەوە، خەڵکی دەوری مەککە تەنیا مەبەست پێی نیوە دوورگەی عەرەبی نیە، بەڵکو مەبەست خەڵکی هەموو دنیایە.

سیفەتی چوارەم : ئنجا پێناسەی ئەوانەمان بۆ دەکات کە ئیمان بە قورئان دێنن، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَهُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴾، وە ئەوانەی کە ئیمانیان بە دواڕۆژە، بڕوای پێدێنن (واتە: بە قورئان)، وە پارێزەری نوێژەکەشیانن. کەواتە: ئیمان بە ڕۆژی دوایی و، بەردەوامیی و پارێزگاریی کردن لە نوێژ، یارمەتی ئینسان دەدات، کە ئیمانی بە قورئان دامەزراوترو پتەوتربێ، هەروەك چۆن ئیمان بە قورئانیش، وا لە ئینسان دەکات، ئیمانی بە ڕۆژی دوایی هەبێ و، لەسەر نوێژەکەشی بەردەوام بێ، بەڵێ: قورئان و ئیمان هێنان بە پایەکانی دیکەی ئیمان، پەیوەندییەکی دوو سەرەی دیالێکتیکیان لە نێواندا هەیە، واتە: هەتا زیاتر ئیمانت بە قورئان هەبێ، ئیمانت بە دواڕۆژ زیاتر دەبێ، وە لەسەر نوێژەکانت پارێزگارتر دەبی، وە هەتا نوێژکەری باشتریش بی و، ئیمانیشت بە دواڕۆژ زیاتر بێ، ئیمانت بە قورئان پتەوتر دەبێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمۡ يُوحَ إِلَيۡهِ شَيۡءٞ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثۡلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۗ ﴾، لێرەدا خوای کاربەجێ باسی سێ جۆرە کەسمان بۆ دەکات، یان باسی کەسێکمان بۆ

دەکات کە سێ جۆرە سیفەتی زۆر خراپی تێدان، دەفەرموێ: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە:

١/ درۆ بە ناوی خواوە دەکات.

٢/ کەسێك کە دەڵێ: من سرووش (وحي)م بۆ هاتوەو، هیچ سرووشیشی بۆ نەهاتبێ.

٣/ کەسێك کە دەڵێ: منیش وەك ئەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، دەنێرمە خوار !

## سێ جۆرە کەس کە لەوان ستەمکارتر نیە :

خوای تاكو پاك لێرەدا پرسیار دەکاتو دەفەرموێ: کێ لەو سێ جۆرە کەسە ستەمکارترە، وەڵامەکەی ئەوەیە: هیچ کەس، لە زمانی عەرەبیی دا ئەو جۆرە پرسیارکردنە، پێی دەگوترێ: پرسیارێکی نکووڵیی لێکەرانە (الإِسْتِفْهَام الإِنْكَارِي) کە مەبەست ئەوە نیە، وەڵامەکەی وەربگریەوە، بەڵکو وەڵامەکەی لەنێو خۆیدایە، بۆ وێنە: کەسێك ئاوی لەبەردەم بێو، بڵێ: ئەمە ئاو نیە؟ دەبێ تۆ بڵێی: با، کەواتە: لە تەرازووی خوادا هیچ کەس لەو سێ جۆرە کەسە ستەمکارتر نیە.

<u>جۆری یەکەم</u>: کەسێك کە درۆ بە ناوی خواوە دەکات، واتە: هاوبەش بۆ خوا پەیدا دەکاتو دەڵێ: خوا هاوبەشی هەیە، لەوەدا کە بەندایەتیی بۆ بکرێ، یان لە ناوو سیفەتەکانی دا، یان لە بەدیهێنەرایەتییو لە پەروەردگارێتیی دا، بۆیە خوا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ﴿٢٧﴾ ﴾سبأ، واتە: بڵێ ئەو شتانەم پیشان بدەن، کە لکاندووتانن بە خواوە، وەك هاوبەش.

وە دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴿١١﴾ ﴾لقمان، واتە: ئەمە دروستکراوی خوایە، پیشانم بدەن ئەوانی دیکەی جیا لە خوا، چییان دروست کردوە؟ هیچ کەس هیچی دروستکردوە؟ دەنکە

گەنمێك، دەنكە لمێك، پەڕە مریشكێك، دڵۆپە بارانێك؟ بێگومان نەخێر، خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە، ئنجا مادام تەنیا خوا بەدیهێنەرە، وە تەنیا خوا پەروەردگارەو خاوەنە، دەبێ هەر ئەویش بپەرسترێ.

كەواتە: كەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، درۆی كردووەو درۆو بوختانی بۆ خوا هەڵبەستوە، كە گوتوویەتی: خوا هاوبەشی هەیە، لە حاڵێك دا كە خوا هیچ هاوبەشی نینو بێ وێنەو هاوەڵو هاوتایە.

**جۆری دووەم :** كەسێك كە دەڵێ: سرووشم بۆ كراوەو سروشیشی بۆ نەكراوە:

﴿أَوۡ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمۡ يُوحَ إِلَيۡهِ شَيۡءٞ﴾.

## چەمك و واتای وشەی (وحي):

١/ سرووش (وحي): واتە: فەرمایشتی پەنهان، بەڵێ لە ئەسڵدا وشەی (وَحِي) لە زمانی عەرەبییدا واتە: (الصَّوْتُ الخَفِي، أو الكَلَامُ الخَفِي)[1]، واتە: دەنگێكی كپ، یان قسەیەكی پەنهان.

٢/ هەروەها بە وەسوەسەی شەیتانەكانیش دەگوترێ: (وَحِي)، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ ١١٢﴾الأنعام، واتە: شەیتانەكانی ئینسو جند، قسەی ڕازاوەی فریودەر بۆ یەكدی سرووش دەكەن، وەك دەبینین: خوا قسەی ڕازاوەو فریودەری ناوناوە وەحی، چونكە قسەیەكی پەنهانە.

٣/ هەروەها بە ئاماژەكردن (إشارة)یش دەگوترێ: (وَحِي) وەك خوا باسی پێغەمبەر زەكەریا دەكات، دوای ئەوە مژدەی بوونی منداڵی پێدراوەو دەفەرموێ: ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ

---

١) مختار الصحاح، ص: ٦١٢، (الوحي: الكتاب.. وهو أيضاً الإشارة والرسالة والكتابة والإلهام والكلام الخفي وكل ما ألقيته الى غيرك).

وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾مريـــم، واتــە: لــە میحـــڕابەکەی چـــووە دەرێو بەرانبـــەر بــە گەلەکەیو ئاماژەی بۆ کـردن، واتـە: لەجیـاتی ئـەوەی قسـەیان لەگـەڵ بکات، بـە دەســت ئاماژەی بۆ کردنو گوتی: قســەم بۆ ناکـرێ.

٤/ هــەروەها (وَحِي) بــەو ئیلهــامەش دەگـوترێ، کـە خــوا دەیخاتــە دڵـی بەنـدە چاکەکــانیەوە، وەك دەربــارەی دایکـی مووســا دەفـەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾ القصـص، واتە: وەحـییمان کرد بۆ دایکی مووســا، واتـە: ئیلهامەمان خسـتە دڵـییـەوە.

٥/ بەڵکو تەنـانەت وشـەی وەحـی بـۆ ئـەو فێرکردنـە غەریزەییـەش بەکـاردێ، کـە خـوا فێـری زینـدەوەرانی دەکـات، وەك دەفـەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾النحـــل، واتـــە: خـــوا وەحـی نــارد بـۆ هـەنگ، دیـارە وەحــی بـەو مانایــە نـا کـە بـۆ پێغەمبـەران دێ، بەڵکـو یانـی: هـەنگی فێر کـرد بە شـێوەیەکی پەنهـان.

کەواتــە: ئەســـڵی وشــەی وەحـــی بـــە مانــای قسەکردنێکـــی پەنهـــان، یــان فێـرکردنێکـی پەنهـان، دێ.

ئنجـا کــە خــوا دەفـەرموێ، هیـــچ کـەس لـەو کەســە ستەمکـارتر نیـە، بڵــێ: وەحییم بۆ هاتـووە، وەحیشـی بۆ نەهاتبـێ، لـێرەدا مەبەست لە وشــەی وەحــی ئەو مانایەیە کە بۆ پێغـەمبـەران بەکارهاتوە، ئەگـەرنا ئەگـەر کەسێك بڵــێ: وەحییم بۆ هاتوە، واتە: شەیتان وەسـوەسـەی بۆ کردووم، ڕاست دەکات ! شەیتان وەسوەسەی بۆ موسـەیلـەمەی درۆزن (مسيلمة الكذاب)یش کردوە، بەڵام ئێمە بەپێی سیاقەکە دەزانین مەبەسـت لە وەحی لـێرەدا، ئەو پەیـامە تایبەتەیـە، کە خــوا بـە جبـریلـدا بـۆ پێغەمبـەرانی دەنێـرێ، خــوای بـەرز نکوولــیی لـەوە دەکـات، ئەگـەرنا بۆخــۆی دەفــەرموێ: ﴿ شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعـــام، واتـە: شـەیتانەکانی ئینسو جند وەحــی بۆ یەکـدی دەکـەن.

**جۆری سێیەم**: كەسێك كە دەڵێ: منیش وەحییو پەیامێك وەك ئەوەی خوا دایبەزاندوە، دادەبەزێنم: ﴿وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾، یانی: ئەو كەسە ناڵێ: وەحییم بۆ دێ، بەڵكو دەڵێ: من بۆخۆم لەمەودوا وەحی دادەبەزێنم، وەك ئەوەی خوا دایبەزاندوە، منیش كتێبێك دادەنێم، وەك ئەوەی خوا ناردوویەتی، كەچی درۆش دەكات، شتی وای لەدەست نایەت.

خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: هیچ كەس لەو سێ كەسانە ستەمكارتر نیە، یان هیچ كەس لەو كەسە ستەمكارتر نیە كە ئەو سێ سیفەتە خراپەی تێدان.

منیش دەڵێم: بەشەر ئەگەر دایە گێلییو نەفامیی زۆر سەیرە، بەسەرهاتێك هەیە لێرەدا پێم باشە ئاماژەی پێ بكەم.

دیارە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلاثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللهِ»[1]، واتە: ڕۆژی دوایی نایەت، هەتا نزیكەی سی دەججالی درۆزن دەنێردرێن، هەر هەموویان پێیان وایە پێغەمبەرن!

لە سەردەمی (هارون الرشید) یان (مأمون)دا كابرایەكی درۆزن داوای پێغەمبەرایەتیی كردوە، گرتوویانەو حەپسیان كردوەو پێیان گوتوە: تۆبە بكەو، پەشێمان بەوە، چونكە لەدوای پێغەمبەری خاتەم، وەحی نەماوە، گوتوویەتی: نەخێر من پێغەمبەرم، ئیدی دەیبەنە بەندیخانەو زیندانیی دەكەن، كە دەچێ دەبینێ وا كابرایەك دانیشتوەو زۆر لەخۆی باییەو، خۆی بە هەیبەت پێشان دەدات، كابرای كە لەسەر ئیددیعای پێغەمبەرایەتیی گیراوە، دەڵێ:

تۆش لێرەی ؟

دەڵێ: بەڵێ، منیش لێرەم.

ئنجا ئەوەی كە بە هەیبەتەوە دانیشتوە دەڵێ: تۆ لەسەر چی گیراوی؟

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨١٢١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٧٠٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٢٧١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢١٨)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٧٣٤).

دەڵێ: لەسەر ئەوە کە دەڵێم: پێغەمبەری خوام و بڕوام پێناکەن !

ئەویش دەڵێ: جا ئەی درۆزن ! بۆچی درۆیان دەکەی ؟

کابراش دەڵێ: جا تۆ چوزانی ؟

دەڵێ: ئەدی کەی من تۆم ناردوە ؟!

دەڵێ: بۆچی تۆ کێی؟

دەڵێ: من خوام !

ئنجا حاشاو پەرژینی قایم بێ، مرۆڤ ئەگەر شێت بووو، دایەکەرایەتیی زۆر عەجایبە ! هەڵبەتە ڕەنگە کابرا شێتیش بووبێ، بەڵام جاری واش هەیە کابرا شێتیش نیە، بڵێی عەقڵی لەدەستداوە، ئێمەش لەو جۆرە بەشەرانەمان بینیون، کابرا خۆی لێدەگۆڕێو پێی وایە شتێکی سەیرە، کەسی وامان بینیوە هەندێك قسەی بۆ ڕیز کردووین‌و گوتوویەتی: ئەو قسانەم لە خواوە بۆ هاتوون !! دیارە قسەکانی عەرەبیی بوون، منیش تەماشام کرد: ئەو قسانە لە ڕووی ڕێزمانییەوە تەواو نین، پێم گوت: کاکە مەعقوولٚ نیە خوای زاناو شارەزا، فەرمایشت بنێرێ لە ڕووی عەرەبییەوە تەواو نەبێ، ئەو قسانە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە تەواو نین، ئەوە حەتمەن شەیتانێك فێری تۆی کردوون، کە بۆخۆی عەرەبیی نازانێ !!

بەڵێ: بەشەر بەشەرە، مەرجیش نیە تەواو عەقڵی تەکلیفی لەدەست دابێ، بەڵام مرۆڤ ئاوایە، جاری وایە خۆی لێدەگۆڕێ، ئەگەر خوا ئاگاداری نەبێ‌و، خۆی بە خوا نەسپێرێ، زۆر ئەگەری هەیە خۆی لێبگۆڕێ، خوا پەنامان بداو سەرەنجاممان خێر بکات، ئنجا خوا فەرمووی: هەر کەسێك ئەو سێ سیفەتەی تێدابن، یان هەر کەسێك یەکێك لەو سێ شتانە بکات، لە هەموو کەس ستەمکارترە، ئەدی سەرەنجامیان چۆن دەبێ؟ ئەوە لە مەسەلەی پێنجەم دا باسی دەکەین.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ

ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴾، وە ئەگەر ببینی کە ستەمکاران، (واتە: ئەو سێ جۆرە کەسانەو غەیری وانیش، کە گوناهی وەك هی وان، یان شێوەی وانیان کردوە)، لە سەختییەکانی مەرگداو نوقمی نارەحەتییەکانی مەرگ بوو ون، واتە: ئەو کاتەی کە دەکەونە حاڵەتی گیانەڵاو ڕووح لە بنی پێیانەوە دەیەوێ بێتە لای سەروو بێتە دەر، چونکە پێشتر باسمان کرد، ڕووح کە لە بەدەن دەهێنرێتە دەر، لە نووکی پێوە دەست پێدەکات، هەتا دەگاتە لای گەروو لەوێ دەچێتە دەر، بە بەڵگەی ئەم ئایەتانەی سوورەتی (الواقعة)، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَـٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: کاتێك (ڕووح، یان نەفس) دەگاتە گەروو، ئێوەش لەو کاتەدا تەماشای دەکەن، وە ئێمە (واتە: فریشتەکانمان) لە ئێوە لێی نزیکترین، بەڵام ئێوە نابینن، ئەگەر ڕاست دەکەنو ئێوە ملکەچ نین، (لەبەردەستی خوادا نین)، دە جارێکی دیکە ڕووحەکەی بخەنەوە جەستە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەگەر تۆ ستەمکارەکانت ببینی، کاتێك لە سەختییەکانی مەرگ دان، ئنجا باسی فریشتەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ ﴾، وە فریشتەکان دەستەکانیان درێژ کردوە، لە شوێنی دیکەش خوای زاناو شارەزا باسی فریشتان دەکات، کە باڵیان هەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَـٰثَ وَرُبَـٰعَ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ﴾ فاطر، واتە: ستایش بۆ خوای بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی، فریشتەکانی گێڕاون بە نوێنەری خۆی، خاوەنی باڵەکانن: دوو دووو سێ سێو چوار چوار ...

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، كە جبریل شەش سەد باڵی هەیە[1]، ئنجا ئایا چۆن دەفڕن؟ ئێمە نازانین‌و نەمانبینیون، بەڵام بڕوامان پێی هەیە، خوا ﷻ دەفەرموێ: فریشتەكان بە كافرەكان دەڵێن: ﴿أَخْرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴾، ڕووحەكانتان دەربێنن، ئەمڕۆ دەبێ سزای ڕیسواكەر بچێژن، بەهۆی ئەوەوە كە شتی ناهەقتان بەرانبەر بە خوا دەگوت، وە لە بەرانبەر ئایەتەكانی خوادا خۆتان بە زل دەگرت.

لێرەدا كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ ﴾، ئەوە دیمەنێكە خوا دەیخاتە بەرچاومان، ئنجا یەكێك لە ڕووەكانی ڕەوانبێژیی لە قورئاندا، ئەوەیە كە خوای زانا جاری وایە ڕووداوەكان بە (فعل المضارع) دێنێ، بۆئەوەی لەبەرچاومان ئامادەیان بكات، وە جاری وایە لەبەر هۆكاریەكی دیكە: بە (فعل الماضي) یان بە (فعل الأمر) دەیانهێنێ.

دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ ﴾، ئەگەر ببینی، واتە: بیهێنە پێش چاوی خۆت، ئەو دیمەنە كە دیمەنێكی زۆر سەرڕاكێشە: كافرەكان وا لە سەختیی مەرگ دانو، لە كاتی گیانەڵادانو، فریشتەكانیش دەستیان بۆ درێژكردوونو پێشیان دەڵێن: بۆخۆتان ڕووحەكانی خۆتان دەربێنن، واتە: خۆتان لەو سەختییو ناخۆشییە ڕزگار بكەن، جاری وایە كەسێك دەكەوێتە حاڵەتێكی واوە، كە ئازارەكەی زۆر زۆرەو، خوا خوایەتی بمرێو كۆتایی بەو ئازارە بێنێ، وە دەشگونجێ لێرەدا مەبەست پێی سەرزەنشتكردنی كافرەكان بێ، واتە: خۆتان دەرباز بكەن لەو حاڵەتەی تێیدان.

---

١) ﴿حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُكْرَمٍ، عن الْحَسَنُ بْنُ قُتَيْبَةَ، عن شَرِيكٌ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ : رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلامُ فِي صُورَتِهِ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ قَدْ سَدَّ الأُفُقَ، يَسْقُطُ مِنْ جَنَاحِهِ مَا اللَّهُ بِهِ عَلِيمٌ مِنَ الْيَاقُوتِ وَالدُّرِّ﴾، صحيح البخاري ٤٥٠٤.

## جیـاوازی نێـوان ( روح ) و ( نفس ) :

ئنجـا ئایـا وشـەی: (روح) و (نفـس) جیـاوازییـان چـییه؟ ئـەوەی مـن بـۆم دەركەوتوە، نەفس هەر ڕووحە، بەڵام كە دەچێتە نێو جەستەوە، پێی دەگوترێ: نەفس، بۆیە خوا زەمی نەفسی كردووە، مەدحی نەفسیشی كردوە، بەڵام ڕووح نە مەدح كراوەو نە زەم كراوە، بۆچی؟ چونكە ڕووح پێش ئەوەی بچێتە جەستەوە، نە شەڕی لەدەست دێ، نە خێری لەدەست دێ، بەڵام نەفس بەهۆی جەستەوە دەستی بۆ چاكەو خراپە كراوەیە، هەر بۆیەش مەدح كراوو زەم كراویشە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ ﴾الفجر، ئەوە لێرەدا مەدح كراوە، یان دەفەرموێ: ﴿ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾ القیامة .

وە زەمیش كراوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴿٥٣﴾ ﴾ یوسف، واتە: نەفس زۆر فەرمان دەكات بە خراپە، بەڵام كە ڕووح دەچێتە جەستەوە پێی دەگوترێ: نەفس، بۆیە لە قورئاندا زۆر ناوی هاتوە، ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ ﴾الشمس، بەڵێ ڕووح كە دەچێتە نێو جەستەوە، غەریزەكان ئیش پێدەكات، وە هێزو تواناكانی جەستە، ئیش پێدەكات، ئنجا ئەگەر بە باری خێردا بیانجووڵێنێ، ئەوە مەدح دەكرێ، وە ئەگەر بە باری شەڕدا بیانجووڵێنێ، زەم دەكرێ[(١)].

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: بۆیە خوای پەروەردگار لەسەر زاری فریشتەكان فەرموویەتی: ﴿ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ﴾، نەفسەكانتان دەربێنن،

---

١) لە كتێبی (گیانی ژیان )دا باسێكی سەربەخۆمان لەبارەی شیكردنەوەی چەنك و واتای: (روح و نفس و عقل و قلب)ەوە، كردوە.

چونکە پێیان ناخۆشە، بمرن، ئینسانی کافر لە سەرەمەرگ دا، زۆر پێی ناخۆشە بمرێ؟ چونکە دەزانێ کە بەرەو سزاو ئازارو مەینەتییەکانی ژیانی بەرزەخو قیامەت دەچێ، بەڵام ئینسانی ئیماندار کە دەکەوێتە حاڵەتی سەرەمەرگەوە، پێی خۆشە بمرێ، بەپێی ئەو فەرمایشتە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ، أَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ، كَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ﴾[١]، واتە: هەر کەس حەز لە دیداری خوا بکات، خواش حەز لە دیداری دەکات، وە هەر کەسێك دیداری خوای پێناخۆش بێ، خواش دیداری ئەوی پێناخۆشە.

ئنجا ئایا کێ حەز بە دیداری خوا دەکات؟ بێگومان ئیمانداران حەز دەکەن زوو بچنە خزمەت خوای پەروەردگارو، پاداشتی کردەوەکانیان وەربگرنەوە.

ئنجا فریشتەکان لێرە دوو گوناهیان پاڵدەدەنەلا، بەڵام پێش ئەوە سزایەکیان دەخەنەڕوو دەڵێن: ﴿ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ﴾، ئەمڕۆ ئێوە سزای ڕیسوایی‌و شەرمەزاریی‌و زەبوونیی‌و بێڕێزیی دەچێژن، چونکە ئەوە بنچینەیە دەڵێ: (الجَزَاءُ مِنْ جنسِ العَمَل) سزاو پاداشت بە پێی کردەوەیە، ئنجا تاوان‌و خراپەکانیان دەخەنەڕوو:

١/ ﴿ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ﴾، چونکە بە ناوی خواوە، شتی ناهەقتان دەگوت:

أ) هاوبەشتان بۆ خوا پەیدا دەکرد.

ب) دەتانگوت: وەك چۆن خوا کتێبی ناردوە، ئێمەش کتێب دەنێرینە خوارێ.

ج) دەتانگوت: خوا وەحی بۆ ئێمە ناردوە.

٢/ ﴿ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴾، وە ئێوە بەرانبەر بە ئایەتەکانی خوا، خۆتان بە زل دەگرت، کەواتە: ئەو دوو گوناهەتان هەبوون.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٤٣٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦١٤٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٩٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٠٦٦)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٨٣٨)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٦٤)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٥٦)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٠٠٨)، وَأَبي يَعْلَى برقم: (٣٢٣٥)، وَالبَزَّار برقم: (٢٦٧٩).

یەکیان بریتی بووە، لەوەی کە شتی ناهەقتان بەرانبەر بە خوا گوتووە.

دووەمیشیان ئەوە بووە، کە خۆتان لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا بە زل دەگرت، بۆیەش ئەمڕۆ ئێوە سزایەکی ڕیساکەرو زەبوونکەر دەچێژن، کە خۆتان بە زل گرتوە، خوا بچووكو زەبوونتان دەکات، وە کە شتێکتان پاڵداوەتە لای خۆتانو هی ئێوەش نەبووە، خوای دادگەر ئەمڕۆ نیوەڕۆكو جەوهەری ئێوە پێشانی خەڵك دەدات.

**مەسەلەی شەشەمو کۆتایی:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾، وە ئێوە بە تەئکید هاتنەوە بۆ لای ئێمە، بە تەنیا تەنیا، وەك چۆن یەکەمجار دروستمان کردبوون، وە ئەوەی کە پێماندابوونو خستبوومانە ژێر چاودێرییو سەرپەرشتیی ئێوەوە، لە پشت خۆتانەوە بەجێتان هێشت، وە ئەو تکاکارانەتان کە پێتانوابوو هاوبەشن لەگەڵ ئێوەدا (لەو خوا پەرستییانەدا کە بۆ خوا دەیانکەن، کە دەبێ بەشی وانیشی تێدا هەبێ) لەگەڵتاندا نابینین.

کەواتە: خوای پەنهانزان چەند شتێکیان پێ دەفەرموێ:

١) ﴿ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ ﴾، لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (فُرادَى: جَمْعُ فَرِيد، مِثْل أُسَارَى جَمْع أَسِير)، (فَرادَى) کۆی (فريد)ە، (فريد) واتە: بە تەنیا، وەك (أُسَارَى) دیلەکان، کۆی (أَسِير)ە، واتە: دیل.

وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (مريم)یشدا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾، هەر کامێکتان لە ڕۆژی دوایی دا بە تەنیا دێتەوە بۆ خزمەتی خوا، بە تەنیایەو کەسی لەگەڵ نیە، نە عەشیرەت، نە حیزب، نە پاسەوان، نە خزمەتکار.

مەبەست لەوەدا کە خوا دەفەرموێ: ئەمڕۆ بە تەنیا دێنەوە، کەستان لەگەڵ نیە، ئەوەیە کە: خوا قیامەتیان دێنێتە بەرچاوو دەفەرموێ: ئەوە قیامەتەو ئەوە حاڵتانە، کەواتە: پێش ئەوەی بچن بۆ قیامەتێ، تەگبیری حاڵی خۆتان بکەن.

٢) وە پێیان دەفەرموێ: ﴿وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَـٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ﴾، ئەوەی کە پێمان دابوون و خستبوومانە ژێر سەرپەرشتیی و چاودێریی ئێوەوە، بەجێتان هێشت لە پشت خۆتانەوە.

یانی: ئەو سەروەت و سامانەی کە پێی لەخۆبایی بوو بوون و پێی لە کەوڵی خۆتان دەرچووبوون، هیچی دیارنیەو، هەمووتان بەجێهێشت بۆ میراتگران.

٣) دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟﴾، وە ئەو تکاکارانەتان کە پێتانوابوو، هاوبەشن تێتاندا، لەگەڵتاندا نابینین.

بەڕێزان !

تەماشا بکەن ! ئینسان بە یەکێك لە سێ شتان، یان بە هەر سێکیان لەخۆی بایی دەبێ:

أ) یان بە خزم و کەس و عەشیرەت و حیزب و دەستەو تاقم.

ب) یان بە سەروەت و سامان.

ج) یان بەوە کە پێی وابێ: فلان کەس تکای بۆ دەکات، بۆ وێنە: مرۆڤ پێی وابێ: لەبەرئەوەی سەییدەو شێخە، خۆی بەتەما خزمایەتیی و شەجەرە کردبێ، یان مەلایەو بەتەمای مەلایەتیی لێبگەڕێ ! یان ئیسلامییەو لەبەرئەوەی ناوی ئیسلامییە، پشتێندی لێ کردبێتەوە! هەروەها: سەلەفیی و صۆفیی و ...هتد. کە لەڕاستییدا ئەوە هەمووی خەیاڵ پڵاوە، ئەوەی کە دادی ئینسان دەدات: ساغیی و پاکیی و، کردەوەی ئینسانە.

٤/ ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾﴾، واتە: بێگومان پەیوەندییتان پچڕا، وە ئەوەی خەیاڵتان دەکردو خەیاڵپڵاوتان پێوە دەکرد، لێتان بزربوو.

سبحان الله !

لە مێژووی بەشەردا، مرۆڤ زۆرجار بەو شتانە خۆی هەڵخەڵەتاندوە! هەر بە جیددیی کەسی وا هەیە دەڵێ: جا من ئەو هەموو خەڵکەم لەگەڵدایە، ئەو حیزبە، ئەو عەشیرەتە، ئەو جەماوەرە، تۆ بڵێی خواش ڕێزم نەگرێ! چاوت لێیە لە دنیادا خەڵك چەند ڕێزم لێدەگرن، هەموویان دەستم بۆ بە سینگەوە دەگرن، حەتمەن لە قیامەتێش هەروام ! بەشەری وا هەیە، هەڵدەخەڵەتێ، وادەزانێ حیسابی قیامەتێش، وەك هی دنیایە، یان هەیە لەبەرئەوەی سەروەتو سامانی زۆرە، دەڵێ: من موڵكو ماڵم زۆرە، تۆ بڵێی شتێکم بۆ نەکات لە قیامەتێ ؟ خۆ من خێرو چاکە دەکەم، وادەکەمو دەچم ؟

یان لەبەرئەوەی کە بە شتێکی ئەفسانەیی، کە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَٰنًا ﴿٧١﴾﴾ الحج، خۆیان بە تەما کردوەو فریو داوە، بۆ وێنە:

١ - یەکێك دەڵێ: بە نەسەب دەچمەوە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ !.

٢ - ئەوی دیکە دەڵێ: بە نەسەب دەچمەوە سەر فلان کەس.

٣ - ئەوی دیکە دەڵێ: من سەلەفییم ! ئەوی دیکە دەڵێ: من لە فلان تەریقەت دام !

٤ - یەکی دیکە دەڵێ: من فلان کەسم خۆشدەوێ ؟

٥ - یان عەرەب خۆی بە عەرەبایەتییەوە هەڵدەکێشێ !

٦ – ئەوی دیکە خۆی بە نەتەوەیەکی دیکەوە هەڵدەکێشێ !

لەڕاستییدا ئەوە هیچی دادی ئینسان نادات، وە ئەوانە هیچیان نابنە هۆکاری ئەوە کە ئینسان دەربازی ببێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾، بێگومان پەیوەندییتان پچڕا، خوێنراویشتەوە: (لَقَدْ تَّقَطَّعَ بَيْنُكُمْ)، واتە: نێوانتان پچڕا، (بَيْنَكُمْ) یانێ: (مَا بَيْنَكُم) ئەوەی کە لە نێوانتان هەبوو، پچڕا، بەڵام (بَيْنُكُمْ) یانی: (رابطتكم) پەیوەندییەکەتان، پچڕا، ﴿وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾، وە ئەوەی کە پێتانوابوو، گومانتان دەبرد، ون بوو، هیچی دیارنیە، هەمووی خەیاڵ پلاو بوو، ئێستا خۆتانو کردەوەی خۆتان هاتوونە گۆڕێ، هیچی دیکە لە ئارادا نیە.

خوای بەخشندە لەو ڕۆژەدا پەنامان بدات، کە خۆمانو کردەوەکەمان دەچینەوە دیداری خوا، بۆ دادگایی کردنی دادگەرانەی خوای دادگەر، وە ڕووی ئەوەمان هەبێ کە بڵێین: خوایە! ئێمە بەندەی تۆ بووینو، پەیڕەوانی تۆ بووینو، شوێنکەوتووی پێغەمبەری پێشەوای تۆ بووین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەدا خوا پشتیوان بێ یازدە (١١) ئایەت دەتوێژینەوە، ئایەتەکانی (٩٥ - ١٠٥)، تەوەری سەرەکیی کە ئەم ئایەتانە لەبارەیەوە دەدوێن، بریتییە لە خستنەڕووی باڵادەستیی‌و زانایی‌و بەزەیی خوای بەرزو مەزن، ئەویش لە ئاوێنەی ژمارەیەك لە دیاردەو دیمەنە سەرنج ڕاکێشەکانی دروستکراوەکانی خوای بێ وێنەدا، وەك: قڵێشاندنی دەنکە تۆوی دانەوێڵەو، نێوکی میوەجات، وە دەرهێنانی مردوو لە زیندوو، وە بە پێچەوانەشەوە: زیندوو لە مردوو، وە قڵێشاندنی سپێدەو بەرەبەیان، وە گێڕانی شەوگار بە کاتی ئیسراحەت‌و سرەوتن، وە دانانی ئەندازەگیریی وردو بەحیساب بۆ خۆرو مانگ، وە گێڕانی ئەستێرەکان بە ڕێنمایی لە تاریکاییەکانی وشکانیی‌و دەریادا، وە هێنانەدی وەچەی مرۆڤەکان‌و خستنەوەیان لە یەك نەفس، وە لەسەرەوە ناردنە خواری ئاوو، ڕواندنی چەندان جۆر ڕووەك لە شینایی‌و درەخت‌و میوەجات.

پاشان خوای پەروەردگار باسی هەڵوێستی هاوبەش دانەرەکان دەکات، کە کوڕو کچیان بۆ خوا داناون، دیارە بە درۆ بۆیان هەڵبەستوون، وە بەرپەرچێکی ددان شکێنیان دەداتەوە، بەوە کە دەفەرموێ: مادام خوا پەیداکەری هەموو شتێك بێ، وە هاوسەری نەبێ، چۆن ڕۆڵەی پەیدادەبن؟!

دوایی دەفەرموێ: مادام خوا تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، دەبێ هەر ئەویش بپەرسترێ‌و بەندایەتیی بۆ بکرێ، وە باسی ئەو ڕاستییە دەکات کە چاوەکان خوا نابینن، بەڵام خوا ﷻ چاوەکان دەبینێ.

وە لە کۆتاییدا ئەوە خراوەتەڕوو کە: لە پەروەردگارەوە بەڵگە ڕوون‌و بەرچاو ڕوونەکان هاتوون بۆ ئێمە، وە خوا ئایەتەکانی خۆی ڕوونکردوونەوە، هەرچەندە نەزانەکان تۆمەتی ئەوە دەدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کە قورئانی لەلای کەسانی دیکە خوێندبێ‌و وەرگرتبێ، بەڵام ئەوانەی زانان، دڵنیان کە ئەو قسەو تۆمەتانە، پووچ‌و بێ بایەخن.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰۖ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّۚ
ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ
حُسۡبَانٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ
بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ
أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ
﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ
خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ
وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ
إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٩﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ
ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا
يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞۖ
وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ
خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدۡرِكُهُ
ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن
رَّبِّكُمۡۖ فَمَنۡ أَبۡصَرَ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ عَمِيَ فَعَلَيۡهَاۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿١٠٤﴾
وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِيَقُولُواْ دَرَسۡتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٥﴾﴾

# مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

((بێگومـان خــوا قلێشــێنەری دەنکــەکان (ی دانەوێڵــە)و نێوکــەکان (ی میــوەی درەختـەکان)ە، زینـدوو لـە مـردوو پەیدادەکـات،و پەیداکـەری مردوویـە لـە زینـدوو، ئـا ئــەوەتان خــوایە، چــۆن (بــەرەو کــوێ) لادەدرێــن؟ ﴿٩٥﴾ قلێشــێنەری بەرەبەیانــەو، شــەوگاری گێــڕاوە بـە مایـەو کـاتی سـرەوتن، وە خـۆرو مـانگی بـە ئەنـدازەگیریی (و بـۆ زانینی کاتەکان) هێنـاونە دی، ئەوە ئەندازەگیـریی کردنـی (خـوای) زاڵـی زانایـە ﴿٩٦﴾ وە هـەر ئـەوە کـە ئەسـتێرەکانی بـۆ گێـڕاون، بـە مایـەی ڕێ دەرکـردن لـە تاریکاییـەکانی وشـکانیــیو دەریــادا، لەڕاســتییدا ئایەتــەکــانمان بــۆ کۆمــەڵێك کــە بــزانن، بــاش ڕوونکردوونــەوە ﴿٩٧﴾ وە هـەر ئـەوە کـە لـە یـەك نـەفس پێیگەیانـدوون، جـا هەتانـە سـەقامگیــرە (لەســەر زەوی)و، هەتــانە بـە شـێوەیەکی کاتیــی (لـە نێـو منداڵــدان دا سپێرراوە)، بە دڵـنیـایی یەوە ئایەتەکـانمان بـۆ کۆمـەڵێك کە تێبگـەن، ڕوون کردوونـەوە ﴿٩٨﴾ وە هـەر ئـەوە کـە لـە ئاســمانەوە ئـاوێکی ناردۆتـە خـوار، ئنجـا هـەموو جـۆرە ڕووەکێکمـان پـێ دەرهێنـاوە، ئنجـا چـەکەرەی سـەوزمان لێـی دەرهێنـاوە (کـە پـاش فـراژووبــوونو پێگـەیشتنی)، دانەوێڵەیەکی ڕیزکـراوی لـێ دەردێنین، وە لە دارخورمــا لـە کیــف (طَلْـع)[1]ەکــانی، هێشــووە خورمــای شــۆڕبووەوە دەردێنــین، وە چەنــد باغێـك لە تـرێو، زەیتـوونو، هەنـاری وێکچـوو وێکنەچوو (دەردێنین) سـەرنجی بـەرو میوەکەی بـدەن ! کـە گـوڵ دەداتو کـە پێدەگـات (چـەنـد لـێـك دوورو جـیــاوازن) بێگومـان لـە ئــا ئەوەتــاندا، نیشـانەگـەل هــەن، بـۆ کۆمەڵــێك بــڕوا بێـنن ﴿٩٩﴾ وە (هاوبەش بۆ دانەرەکان) لە جنۆکـان هاوبەشـیان بۆ خـوا دانـان، لـە حـاڵێکـدا کـە هـەر ئەویش دروســتی کــردوون، وە بەبــێ زانیـاریی کـوڕو کچـیان بـۆی هەڵبەسـتن، (خــوا) پــاكو بــەرزە لــەوەی ئــەوان دەیڵــێن ﴿١٠٠﴾ داهێنــەری ئاســمانەکانو زەوییــە، مــادام

---

١) الطلـع: غلاف يشبه الكوز تفتـح عن حَبٍّ منضود، فيـه مـادة اخصـاب النخلـة (المعجم الوسيط، ص٥٦٢)، لە کوردیدا ئەم وشـەیەمان نیە، بەڵام ڕەنگـە، (کیفو هەگبــە) گونجاوبن.

هاوسەری نەبێ، چۆن ڕۆڵەی دەبێ ! وە هەموو شتێکی دروستکردووەو بە هەموو شتێك زانایە (١٠١) ئا ئەوەتان خوای پەروەردگارتانە، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، وەکیلو مشوور خۆرە (١٠٢) چاوەکان نایبینن، بەڵام ئەو چاوەکان دەبینێ، وە ئەو پەنهانی شارەزایە (١٠٣) (بڵێ) بەڕاستیی لە پەروەردگارتانەوە بەڵگە ڕۆشنەکانتان بۆ هاتوون، ئنجا هەر کەس (هەقی) بینی، ئەوە سوودی بۆخۆیەتیو، هەر کەسێکیش کوێربێ، ئەوە زیانی بۆخۆیەتی، وە من بەسەرتانەوە پارێزەر نیم (١٠٤) وە ئاوا ئایەتەکانمان جۆراوجۆر دەخەینەڕوو، وە با ئەوانیش (بە درۆو تۆمەت) بڵێن: خوێندووتە (و ئەم قورئانەت لە خەڵکی دیکە وەرگرتوە)، وە بۆئەوەی ئێمەش ڕوونی بکەینەوە، بۆ کەسانێك کە دەزانن، (ئەم ڕاستییانە دەخەینەڕوو) (١٠٥)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(فَالِقُ ): (الفَلْقُ: شَقُّ الشيء وَإِبَانَة بَعْضُهُ عَنْ بَعْض)، (فَلْق) بریتیە لەوە كە شتێك لەت بكەی، بیقڵیشێنی، وە هەندێكی لە هەندێكی جیا بكەیەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ﴾، واتە: خوا دەنكە تۆوەكان: دانەوێڵەكان لە نیسكو نۆكو برنجو گەنمو جۆو هەرزنو ماشو ئەو شتانەی كە دەنكیان هەیە، دەقڵیشێنی، بۆئەوەی كە سەوز ببێ، هەروەها نێوەكەكانیش: نێوكی خورما، خۆخ، قەیسی، ئەوانیش دەقڵیشێنی، دوایی هەم دەنكە تۆوەكە، هەم نێوكە میوەكە، دەبێتە دوو بەش، بەشێكی بەرەو سەرێ دەچێ، بەشێكی بەرەو خوارێ بە زەویدا شۆڕ دەبێتەوەو، دەبێتە ڕەگو ڕیشە، كە مرۆڤ ئەگەر سەرنجی بدات، هەر دەنكە تۆوێك، وە هەر نێوكە میوەیەك، بۆخۆی لەخۆیدا موعجیزەیەكە.

(ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ): (حَبّ) تاكەكەی بریتیە لە (حَبَّة)، (حبة القمح، حبة الشعير، حبة الرز)، دەنكە گەنم، دەنكە جۆ، دەنكە برنج، (حب)، ئەوەیە كە لەنێو گوڵدا دەبێ: گوڵە گەنم، گوڵە جۆ، گوڵە مەرەزە، گوڵە برنج، گوڵە هەرزن، كۆیەكشی (حُبُوب)ە.

بەڵام (النَّوى) تاكەكەی بریتیە لە (نواة)، وەك نێوكە خورما، نێوكە خۆخ، نێوكە قەیسی، ئەو نێوكە ڕەقەی كە دەشكێنرێ، جا نێوك هەیە دەخورێ، هەیە ناخورێ.

(فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ): وشەی (أَنَّى) لە زمانی عەرەبییدا بە دوو واتایان دێ: بە مانای چۆن (كيف)، وە بە مانای كوێ (أين)، كەواتە: (فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ) واتە: چۆن لادەدرێن، یاخود بەرەو كوێ لادەدرێن ؟ كە غەیری خوا بپەرستنو بەندایەتیی بۆ بكەن، (يُؤْفَكُون: أي يُصْرَفُونَ عَنِ الحَقِّ فِي الإِعْتِقَادِ إِلى البَاطِل،

وَمِنَ الصِّدقِ فِي المَقَال إِلى الكَذِبِ، وَمِنَ الجَمِيل فِي الفِعْلِ إِلى القَبِيحِ)، وشەی (يُؤْفَكُون) واتە: لادەدرێن، لە عەقیدەدا : لە هەقەوە بۆ باطڵ، وە لە ڕاستیی لە قسەوە بۆ درۆ، وە لە کردەوەدا: لە کردەوەی جوانەوە، بۆ کردەوەی ناشیرینو ناقۆڵا.

(ٱلْإِصْبَاحِ): (الصُّبْحُ وَالصَّبَاحُ والإِصْبَاحُ: أَي أَوَّلُ النَّهَارِ) لە زمانی عەرەبیدا بە هەر سێ وشەی: (الصُّبْحُ وَالصَّبَاحُ والإِصْبَاحُ) دەگوترێ: (أَوَّلُ النَّهَارِ) واتە: سەرەتای ڕۆژ، هەروەك ئێوارەش پێدەگوترێ: (عَشِيّ)، یانی: بەرەبەیان، وە پێی دەگوترێ: (غداة).

(سَكَنًا ): (السَّكَنُ السُّكُونُ: ومَا يُسْكُنُ إِلَيْهِ) واتە: (سَكَن، سُكون) بە مانای ئارامگرتن دێ، وە بە مانای شتێك، كە ئینسان بەهۆی ئەوەوە ئارام دەگرێ.

(حُسْبَانًا ): (الحِسَابُ اسْتِعْمَالُ العَدَدِ، يُقَالُ: حَسَبْتُ أَحْسَب حِسَاباً وَحُسبَاناً)، (حساب) واتە: ژماردن، بە بەكارهێنانی ژمارە، دەگوترێ: (حَسَبْتُ أَحْسَب حِسَاباً وَحُسبَاناً)، كەواتە: (حُسبَان) چاوگە، واتە: ژماردنو سەرژمێركردنو ئەندازەگیریی كردن.

هەندێك گوتوویانە: كە خوا لە سوورەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ ﴾، (حُسبَاناً) واتە: ئاگر، یان سزا، بەڵام لەڕاستییدا (حُسْبَان) شتێكە كە بەهۆیەوە، لە بەرانبەریدا ئینسان سزا دەدرێ، بە ئەندازەی ئەو خراپەیەی كە كردوویەتی.

(فَمُسْتَقَرٌّ ): (مُسْتَقَرّ: مَكَانُ القَرَارِ أَو الإِسْتِقرَار) واتە: شوێنی سەقامگیریی و لێ دامەزران، یاخود بەمانای خودی دامەزرانو سەقامگیریی دێ.

(وَمُسْتَوْدَعٌ): كەسێك سپاردەیەك لەلای كەسێك دابنێ، پێی دەگوترێ: (إِستَوْدَعَه)، وە (وديعة) واتە: سپاردە، خوا پشتیوان بێ دوایی، زیاتر مانای ئەم دوو وشەیە ڕوون دەكەینەوە.

(خَضِرًا ): (أَي الخَضِـرُ والأَخْضَـرُ) واتـە: سـەوز، سـەوزایی، کـە مەبەسـت پێـی چەکەرەیە، کە لە دەنکە تۆوێك، یان لە پنجە گیایەك، یـان لـە نێوکە میوەیـەك پەیدادەبـێ، لە کوردەواریی خۆمـان دا پێـی دەڵێـن: چەقەرە، یان چەکـەرە.

(مُّتَرَاكِبًا ): (الـمُتَرَاكِبُ: مَـا رَكِـبَ بَعْضُـهُ بَعْضًـاً)، (متراكـب) واتـە: هەنـدێك سواری هـەندێ بوون، یـان پێکـەوە ڕیزبـوون، دەنکـە گەنمە، دەنکـە جۆیـە، دەنکـە برنجە، دەنگە گەنـمە شـامییە، (گوڵەدان)، هەموویـان پێکـەوە ڕیـز دەبـن.

(مِن طَلْعِهَا ): (طلْـع: غِلاَفُ یشبه الكـوز ینفـتح عَنْ حَبٍّ منضود فِي مادته إخصاب النخلـة)، واتـە: (طلـع) شتێکە وەك گـۆزەیەکی بچووك وایـە، کـە دەنکی ڕیزبـووی تێـدان، کـە دەبێتـە هـۆی موتـوربەبـوونی دارخـورما، بـەڵام لـە کـوردیی دا لەبەرئـەوەی دارخـورمامـان نیـە، هیـچ وشـەیەك نیـە لـە بەرانبـەریدا، بۆیـە دەڵێین: بـەو کیفـە دەگـوترێ کە دوایـی هێشوە خورمـای لـێ دێتـە دەرێ، بـەڵام دەگونجـێ بڵێین: کیـف، یان هەگبـە، ئەگەرنـا یان وشـەیەکی پـڕ بـە پێستمان نیـە لە بەرانبـەری دا، یـان هەیـەو من نایـزانم.

(قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ ): (قِنْـوَان: جَمْـعُ قِـنْو، وهـو العِـذْق بِمَـا فِيـهِ مِـنَ الرُّطَـب، مثـل: صِـنو وصِـنوَان، الـدنو: القُـرْب بالـذات أو بالحكـم)، (قنـوان) کـۆی (قنـو)یــە، وە بــە (أقنـاء)یـش کۆدەکرێتـەوە، (قنـو) بریتیـە لـە هێشـوەکەو خورمایەکانیشی کـە تێیدایـە، وە (عِـذق)یشـی پـێ دەگوتـرێ، وەك (صِـنو وصِـنوَان)، (قنـوان دانيـة) واتـە: هێشـووی نـزیك، (الدنـو: القُـرْب بالـذات أو بالحكـم) واتـە: ئـەو شـتە بـە خودی خـۆی نـزیك بـێ، یان بە حوکـم نـزیك بـێ.

(وَيَنْعِهِۦٓ): (يَنَعَـتِ الثَّـمَرَةِ: تَيـنَـعُ يَنْعـاً وَيُنْعَـاً، وَأَيْنَعَـتْ إيناعَـاً، وَهِـيَ يانِعَـة وَمُونِعَـةٌ) هـەمووی یـەك مانـایە، (يَنَعَتِ الثَّمَرَةِ) واتـە: میوەکـە پێگەیشـتوە، گـەیوە، (يَنْعـاً وَيُنْعَـاً وَأَيْنَعَـتْ إيناعَـا) دیسـان بــە مانـای پێگەیشـتن دێ، وە ئەگــەر میوەکـە پێگەیشـتبێ، دەگوتـرێ: (وَهِـيَ يانِعَـة وَمُونِعَـةٌ).

(وَخَرَقُواْ ): یانی: بۆیان هەڵبەست، دەڵێ: (الخَرْقُ: قَطْعُ الشيء عَلَى سَبِيلِ الفَسَادِ مِنْ غَيْرِ تَدَبُّرٍ وَلا تَفَكُّرٍ، وَهُوَ ضِدّ الخَلْق، وهُوَ فِعْل الشيء بتَقْدِير وَرِفْق)، (خرق) پێچەوانەی (خلق)ە، (خرق) بە کوردیی یانی دڕاندنو تێکدانو بڕینی شتێك بە شێوەیەکی نارێك، بەبێ لێوردبوونەوەو بەبێ تێفکرین، وەك دڕاندنی قوماشێك هەر لەخۆڕا، بەڵام (خلق) بریتییە لە دروستکردنی شتێك بە ئەندازەگیریی‌و بە ڕێکیی.

( لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ ): چاوەکان نایبینن، ئەو چاوەکان دەبینێ، (یدرك) لە (أدرك)ەوە هاتوە، (أَدْرَكَ بَلَغَ أَقْصَى الشيء، وَأَدْرَكَ الصَّبِيُّ: بَلَغ غَايَةَ الصِّبَا وَذَلِكَ حِينَ البُلُوغ)، (أَدْرَكَ) واتە: گەیشتە ئەوپەڕی، دەگوترێ: (أَدْرَكَ الصَّبِيُّ) واتە: منداڵەکە گەیشتە کۆتایی پێگەیشتنی منداڵی، دوایی باسی بینینی خوا دەکەین، لە باسێکی سەربەخۆی تێروتەسەل دا.

(ٱللَّطِيفُ ): صیغەی موبالەغەی (لاطف)ە، (لاطف)، واتە: وردو پەنهان، یاخود پەنهانکار، یاخود زۆر میهرەبان، ئەو مانایانەی هەموویان هەن، (اللُّطْفُ: الحَرَكَةِ الخَفِيفَة، وَتَعَاطِي الأُمُورِ الدَّقِيقَة)، (لطف) بە جووڵەیەکی لەسەرەخۆو هێواش دەگوترێ، یاخود بە ئەنجامدانی کارێکی زۆر بە پەنهانکاریی‌و زۆر بە وردیی، دەگوترێ.

(بَصَآئِرُ ): (جَمْع البَصِيرَة): (بصَائِر)، کۆی (بَصِيرَة)یە، بە مانای بەڵگە (حجة) دێ، لەبەر ئەوەی کە ئینسان بەهۆی بەڵگەوە بەر پێی خۆی دەبینێ‌و لەو شتە تێدەگات، هەر شتێك کە بەڵگەی لەسەر بوو، دەزانێ کە ڕاستە.

(دَرَسۡتَ ): دەگوترێ: (دَرَسْتُ العِلْمَ: تَنَاوَلْتُ أَثَرَه بالحِفْظِ، وَلَمَّا كَانَ تَنَاوُل ذَلِكَ بمدَاوَمَةِ القِرَاءَة، عُبِّر عَن إِدَامَةِ القِرَاءَةِ بالدَّرْسِ)، (درس) ئێمە لە کوردییدا دەڵێین: خوێندن، لە ئەسڵی زمانی عەرەبیی دا لە چییەوە هاتوە؟ دەڵێ: (تَنَاوَلْتُ أَثره بالحِفْظِ) واتە: زانیارییەکەم لەبەر کرد، بەڵام لەبەرئەوەی کە لەبەرکردنی زانیاریی‌و لە مێشکی خۆدا هەڵگرتنی زانیاریی، بەوە دەبێ کە زۆر ئەو شتە بخوێنییەوە، بۆیە وشەی (قِرَاءَة) بە (درس) تەعبیر کراوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

پێشتر باسمان کردوە کە ئەم سوورەتە هەمووی باسی خوا بەیەکگرتنو (توحید الله)ە لە پەرستراوێتییو لە پەروەردگارێتیی خوای تاكو تەنیادا، لەم چەند ئایەتەش دا خوا ئەو ڕاستییە تەئكید دەكاتەوە، ئاوا دەست پێدەكات، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ﴾، بێگومان خوا قلێشێنەری دەنکەکانو نێوکەکانە، دەنکە تۆوی دانەوێڵەکان دەقلێشێنێ، بۆئەوەی سەوز بن، وە نێوکەکانی میوەجاتیش دەقلێشێنێ، بۆئەوەی سەوزبن، وە ئەو دەنکە تۆوە جاری وایە چەندان گوڵە گەنم دەردەكات، یان چەندان گوڵە جۆ، یان چەندان گوڵە هەرزن، یان چەندان گوڵە برنج، دەردەكات، هەروەك نێوکەکانیش: نێوکە خۆخە، خورمایە، قەیسییە، هەڵوژەیە، ئەو شتانەی کە نێوکدارن، ئەوانیش جاری وایە بنکێك دەردەکەن، جاری وایە چەند بنکێك دەردەکەن، پاشان هەر بنکەی چەندان خورماو خۆخو قەیسییو هەڵوژە دەگری، ﴿يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾، زیندوو لە مردوو دەردێنێو، دەرهێنەری مردوویە لە زیندوو، سبحان الله! بەردەوام خوای كاربەجێ دەستی ئێمە دەگرێ بەنێو دروستكراوەكانی خۆی دا دەمانگێڕێ، بۆئەوەی ئیمانمان پێی بەهێزتر بێ، سەرنج بدەن! چەند دەنكە تۆو دەخرێنە نێو زەوییەوە، ئنجا دەنكی: گەنمە، جۆیە، برنجە، نیسكە، نۆكە، ماشە؛ ماشی سپییە، ڕەشە، خوا هەموویان دەقلێشێنێ، پاشان دەیانكاتە دوو بەش، بەشێكی دەبێتە ڕەگو ڕیشەو بە زەویدا دەچێتە خوارو، بەشێكیشی هەڵدەستێو بەرزدەبێتەوە بۆ سەرەوە، دەبێتە چەكەرەو چرۆ دەردەكات، دوایی دەبێتە قەدو لقو پۆپ، شتێكی چەندە سەیرە!!

پاشان خوای باڵادەست، سەرنجمان ڕادەكێشێ بۆ: دیاردەی دەرهێنانی زیندوو لە مردوو، وە مردوو لە زیندوو، كە ئەوەش ئێمە بەردەوام ڕۆژانە دەیبینین، دووبارە دەبێتەوە : جووجكەی مریشكو قازو كۆترو كەو، لە هێلكە دێنەدەر، كە گیانی تێدانیە، چەندە سەیرە! وە ئەو خواردنەی كە ئێمە دەیخۆین، دوایی دەبێتە نوتفە

لە پشتی پیاوانداو، هێلکۆڵە لە سینگی ئافرەتان داو، دواییش دەبێتە منداڵ، لەوە سەیرتر! کە لەو ماددە بێ گیانە، خوای بەرز مرۆڤ پەیدا دەکات، زیندەوەرانی دیکە پەیدا دەکات، هەروەها مردووش لە زیندوو پەیدا دەکات، ئەوەش دیارە مریشكو قازو کۆترو پەلەوەر، بە گشتی ئەوانەی هێلکە دەکەن، ئەو هێلکانە، هەر لەو پەلەوەرانە پەیدا دەبن کە زیندوون.

ئنجا لە جەستەی ئینساندا، ڕۆژانە، بەڵکو زانایان دەڵێن: لە هەر چرکەیەکدا، چەندان خانەی زیندوو پەیدادەبنو، چەندان خانەی زیندوو دەمرن !!

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئا ئەوەتان خوایە، خوا ئەو زاتەیە کە ئەو کارانە دەکات، ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴾، بەرەو کوێ لادەدرێن؟ تەنیا ئەو خوایەیە کە شایستەی پەرستراونو بەندایەتیی بۆ کرانە، چۆن دارو بەردو مشكو مارو مانگو خۆرو ئەستێرەو ئینسانو هەواو ئارەزوو چیو، چی دەپەرستن؟!

ئنجا دێتە سەر باسی شتێکی فراوانترو دەفەرموێ: ﴿ فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ ﴾، خوا قڵیشێنەری بەرەبەیانە، تاریکییو ڕووناکیی لێك جیادەکاتەوە، بەهۆی سووڕانی زەوی بە دەوری خۆیدا، لە بەرانبەر خۆردا، ﴿ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنًا ﴾، وە شەوگاری گێڕاوە بە مایەی سرەوتنو ئیسڕاحەت تێدا کردن، ئینسان ڕۆژی وایە زۆر ماندوو دەبێ، خوا خوایەتی شەودابێ، تا بچێ بخەوێ، خوای پەروەردگار شەوگاری چی لێکردوە؟ ئەگەر شوێنێك ڕووناك بێ، مرۆڤ باش خەوی لێناکەوێ، چاوو گوێو جەستەی ئینسان بۆ کاتی نووستن حەزیان لە تاریکاییە، بۆیە خوای بە بەزەیی شەوگاری تاریك کردوە، ئنجا تاکو زۆر زۆر تاریك نەبێو ئەنوگستە چاو نەبێ، کە چاو چاو نەبینێ، ئەستێرەی داناون، ئینسانیش هەر بە تەقلیدو لاساییکردنەوەی خوای پەروەردگار، گڵۆپی سفر لە ژووری خەوتن دادەنێ، تاکو زۆر ڕووناك نەبێ، بەس بایی ئەوەندە ڕووناك بێ، کە پێش چاوی خۆی ببینێ.

ئنجا دێتە سەر باسی خۆرو مانگو ئەو وردەکارییانەی تێیان دا ڕەچاکراون ﴿ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗا ﴾، وە (خوا) مانگو خۆریشی گێڕاون بە مایەی

حیساب کردن، ئێمە بەهۆی خۆرو مانگەوە دەتوانین بزانین کە ساڵ (٣٦٥) ڕۆژە، ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە: ﴿ حُسۡبَانٗا ﴾، واتە: حیساب کردن، یانی: بە حیساب کردن داینـاون، کە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، ﴿ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾، ئا ئەوە ئەندازەگیریی زاڵی زانایە، خوایەك کە خاوەنی عیززەتەو خاوەنی عیلمە، عیززەتێکی بێ سنوور، زانستێکی بێ سنوور، چونکە لەڕاستییدا دانانی ئەو ئەندازەگیرییە بۆ خۆرو مانگو شەوگارو ڕۆژگار، پێویستیی بە باڵادەستیی‌و زانیاریی‌و شارەزایی‌و وردبینییەکی زۆر دەکات.

پاشان باسی لاپەڕەیەکی دیکەی فراوانتر دەکات، کە ئەستێرەکانن‌و دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ ﴾، وە خوا ئەوە کەسەیە کە ئەستێرەکانی بۆ داناون، بۆ گێڕاون، بۆئەوەی بەهۆی ئەوانەوە، ڕێ دەربکەن‌و ببنە هۆی ڕێنمایی کردنتان لە تاریکاییەکانی وشکانیی‌و دەریادا، تاریکاییەکان: دەگونجێ مەبەست هەر تاریکاییەك بێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی سەختیی‌و نارەحەتییەکان بێ.

ئنجا کاتێك ئینسان قەدری ئەوە دەزانێ، کە لە بیابانێك دابێ، زۆر کەس لە بیابان دا سەری لێشێواوە، من جاری وایە بۆخۆم لە بیابان بووم: نە شاخێك، نە تەپۆلکەیەك، هیچ شتێکی لێ نیە، تاکو ڕێ بدۆزیەوە، بەڵام کە شەو داهات، بەهۆی ئەستێرەکانەوە دەزانی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا لە کوێیەو؟ تۆش لە کوێ وەستاوی؟ هەروەها لە دەریادا، من سواری کەشتی بووم: بیست‌و پێنج سەعات کەشتی لە دەریادا دەڕوات، شەوو ڕۆژت بەسەر دادێ، کە دەکەویە نێو قووڵایی دەریاوە، زەوی شین‌و ئاسمان شین، هەست دەکەی کەوتوویە نێو تۆپێکی شینەوە، هیچ شتێك دیارنیە، هەمووی شین دەچێتەوە، ﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، بێگومان ئایەتەکانی خۆمان ڕوونکردوونەوە، بۆ کۆمەڵێك کە بزانن.

کێ لە نهێنیی ڕێگا زانیی بەهۆی ئەستێرانەوە، تێدەگات؟ کەسێك کە زانیاریی هەبێ، بۆیە خوای زاناو توانا وایفەرمووە، ئەگەرنا کەسێك کە زانیارسی نەبێ‌و

شارەزای زانستی گەردووناسیی نەبێ‌و، نەزانێ ئەم دنیایە چۆنەو، ئەم كەون‌و كائیناتە چۆنە؟ قەدری ئەمە نازانێ.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ﴾، خوا ئەو كەسەیە كە ئێوەی پێگەیاندوە لە یەك نەفس، چەند سەیرە! ئەو هەموو بەشەرەی تۆ لەسەر زەویدا دەیبینی، ئێستا ژمارەی مرۆڤ بەرەو حەوت ملیار دەچێ، یانی حەوت هەزار ملیۆن (٧,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) كەس، هەمووی لە یەك نەفسەوە هاتوون، ئەویش ئادەمە عليه السلام،

﴿ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞ ﴾، هەم هەتانە سەقامگیرە، هەم هەشتانە بۆ ماوەی كاتیی، لە شوێنێك دەبێ، كە ئەمە زانایان زۆر مانایان بۆ لێكداوەنەوە، كە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەكان دا ئاماژەیان پێدەكەین :

١/ جاری وایە مرۆڤ لە هەندێك شوێنان سەقامگیر دەبێ، وە لە هەندێ شوێنان بە كاتیی دەمێنێتەوە.

٢/ یان ڕەنگە مەبەست ئەوەبێ: مندالْ سەرەتا بە شێوەی نوتفە لە پشتی بابی دا دانراوە، بە شێوەیەكی كاتیی، بەلاّم دوایی لە مندالْدانی دایكیدا لەوێدا سەقامگیر بووە، یاخود لە پشتی بابی‌و لە سینگی دایكیدا.

٣/ یاخود لە مندالْدانی دایكیدا بە شێوەیەكی كاتییە، بەلاّم لەسەر زەوی سەقامگیرە.

٤/ یاخود لەسەر زەوی بە شێوەی كاتیی دەژی، بەلاّم دوایی لە گۆڕدا سەقامگیرە.

٥/ یاخود لە ژیانی دنیاداو لە عالەمی بەرزەخدا بە شێوەی كاتییە، بەلاّم لە بەهەشت یان دۆزەخ دا، بۆخۆی بەتەواویی سەقامگیر دەبێ.

﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴾، بەڕاستیی ئایەتەكانی خۆمانمان ڕوونكردوونەوە، بۆ كەسانێك شارەزابن.

ئایا جیاوازیی چییە لە نێوان: (يَعۡلَمُونَ) و (يَفۡقَهُونَ )دا؟ وەلاّمەكەی ئەوەیە كە: (يَعۡلَمُونَ) ئەوەیە كە ڕاستەوخۆ شتەكە بزانێ، بەلاّم (يَفۡقَهُونَ ) ئەوەیە

بەهـۆی شـتێكەوە، ئـەو شـتە بزانـێ، بۆیـە وشـەی (علـم) بـۆ خـوا بەكـاردێ، بـەڵام (فقـه) بۆ خـوا بەكارنـایـەت، چونكـە خـوای زاناو شـارەزا هـەموو شتەكان ڕاستەوخـۆ دەزانـێو، بەهۆی هیچ شتێكەوە، شـتێك نـازانـێ، هـەموو شـتەكان ڕاسـتەوخۆ دەزانـێ، بەڵام ئێمـە بەهـۆی شـتێكەوە، شـتێك دەزانیـن، بـۆ نموونـە ئـەو كـتێبـە دەخوێنیـەوە، بەهـۆی ئەو كـتێبـەوە، شـتێك دەزانـێ.

ئنجا خـوای بە بـەزەیـی دێتـە سـەر باسی چەند دیاردەیـەكی دیكە، كە ڕۆژانـە لـە ژیـانی ئێمـەدا دووبـارە دەبنـەوە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، وە ئـەو (خـوا) ئەو كەسـەیە كە لە سـەرەوە، (لە ئاسـمانەوە) ئاوی ناردۆتە خوار، بەهـۆی ئـەو ئاوەوە چی دەكات؟ ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا ﴾، چەكەرەی هـەموو شتێكمـان پـێ دەرهێنـاوە، ڕووەكـی هـەموو شـتێكمان پـێ ڕوانـدوە، لـەو چەكەرەیەشدا بنكێكی سـەوز دروست دەكەین، یاخـود لـەو دەنكـە تـۆوە، پێشـێ دەنكـە تۆوەكـە دەڕوێ، دوایـی لـەو تـۆوەش چەكـەرە سـەوز دەبـێ، ﴿ نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا ﴾، ئەگەر دانەوێڵە بێ، دانەوێڵەی ڕیزكـراوی لـێ دەردێنین، ئنجا گوڵـە جۆیـە، گوڵـە گەنمـە، گوڵـە هـەرزنـە، گوڵـە مەرەزەیـە، دەنكـەكان چەندە لـووسو جـوان ڕیـز بـوونو، كەڵەكـە بـوون لەسـەر یەكـدی، ﴿ وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ ﴾، وە لـە دارخورمـا كیـف (طلـع)ی نزیـك، دەردێنـن، وەك گوتمـان، لـە زمـانی كوردییـدا ئێمـە ئـەو وشـەیەمان نیـە، مەگـەر بڵـێی: كیـف، یـان هەگـبە، (طلـع) ئـەو شـتەیە كـە بـە عەرەبیـی (عِـذْق)ی پێدەڵـێن، كـە دوایـی هێشـوە خورمایەكـە دەیقڵیشێنـێو لـێی دێتـە دەرێ، بۆچـی دەفـەرموێ: هێشـووی نـزیك؟ چـونكە هێشـووەكان قورسـنو شـۆڕ دەبنـەوە، ﴿ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ﴾، وە چـەند باغێك لـە تـرێ، {(أعنـاب) كۆی (عِنَـبْ)ە، واتـە: تـرێ}، وە زەیتوونو هەنـار، كە وێكدەچـێو وێكیش ناچـێ.

ئنجا هەندێ لە زانایان گوتوویانە: لە ڕووی ڕواڵەتەوە ویٚکدەچێ، بۆ وێنە: هەناری شیرین، ترش، میٚخۆش هەیە، مەگەر کەسێك زۆر شارەزابێ، ئەگەرنا نازانێ کامەیان چ تامێکی هەیە؟ ئەوە ویٚکچوو (مُشْتَبِهًا) لە ڕواڵەت دا، بەلاٚم ویٚکنەچوو (وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ) لە تامەکەیدا لێك جیایە، وە هەروەها میوەکانی دیکەش، وەك تریٚ، دیمەنو ڕواڵەتەکەیان ویٚکدەچێ بەلاٚم تامیان زۆر جیایە.

ئنجا دەفەرمویٚ: ﴿ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓ ﴾، سەرنج بدەنە میوەکەیو تەماشای بکەن، کاتێ کە میوەکە دەردەچێو پێدەگات! بۆ وێنە: بەرسیلەی تریٚ، کە تامی دەکەی، تفتو تاڵەو بۆڵووی زۆر وردە، بەلاٚم کە پێدەگات، تەماشا دەکەی حاڵەتێکی دیکەی هەیە، ئنجا تریٚیە، هەنارە، خۆخە، هەرمێیە، هەنجیرە، هەرچی هەیە، کە تازە دەردەچێ: لەگەڵ ئەو حاڵەتەی پێدەگات، زۆر جیاوازە، کە ئەوەش شتێکی زۆر جێی سەرنجە، بۆیە خوای زاناو شارەزا دەفەرمویٚ: سەرنج بدەن! ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾، بێگومان لە ئا ئەوانەتاندا، نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك کە ئیمان بێنن، واتە: زۆر پێویستیی بە زانستو فیقهو شارەزایی ناکات، هەر کەسێك بیەوێ ئیمان بێنێ، نیشانەی زۆر دەبینێ، هەر ئەو میوەو دانەوێڵەیەی کە ڕۆژانە ئێمە بەکاریان دێنین، بەتایبەتی ئێمە لە کوردستانی خۆماندا، جێی وا هەیە جۆرەها میوەی ڕواڵەت جیاوازو تام جیاوازی لێیە، ئەوە هەر لە یەك شوێن دا.

ئنجا خوای پەروەردگار دێتە سەر باسی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، وە فەرمانیان پێدەکات کە ئەو خوایەی خاوەنی ئەو هەموو کردەوەو دروستکراوە سەرسوڕهێنەرانەیە، هەر دەبێ ئەو بپەرستریٚ، دەفەرمویٚ: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡ ﴾، وە هاوبەشی جندیان بۆ خوا بڕیاردان، لە حاڵێك دا کە خواش دروستی کردوون، ﴿ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ ﴾، وە کوڕانو کچانیان بۆ خوا هەڵبەستن، بەبێ زانیاریی، هەر لەخۆڕا گوتیان: خوا کوڕی هەنو کچی هەن، وەك

پێشتر باسمان کرد ـ لە تەفسیری سوورەتی مائیدەدا ـ عەرەبەکان هەندێك قەناعەتیان وابوو، شەیتانەکان کوڕی خوان‌و، فریشتەکانیش کچی خوان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، پاكو بەرزە خوا لەوەی کە ئەوان خوای بێ وێنەی پێ وەسف دەکەن.

ئنجا خوا وەڵامێکی گورچك بڕو ددان شکێنیان دەداتەوە، لەسەر ئەو خەیاڵو ئەفسانانەی کە لە مێشکیاندا هەن، کە بەداخەوە، ئێستاش هەندێ خەڵك ئەو قەناعەتەیان هەیە، کە خوا جۆرە نسبەتێکی لەگەڵ هەندێ کەس دا هەبێ!

دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، پەیداکەری ئاسمانەکانو زەوییە، خوا ئاسمانەکانو زەوی پەیداکردوون، بێئەوەی لاسایی کەسێکی دیکەی کردبێتەوە، (إبداع) ئەوەیە شتێك دابێنی، پێش تۆ کەسی دیکە کاری لەو جۆرەی نەکردبێ[١]، ئنجا خوایەك کە هەر خۆی ئاسمانەکانو زەوی وەدیهێناون، ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَـٰحِبَةٌ ﴾ چۆن دەبێ، ڕۆڵەی هەبێ، کە هاوسەری نەبووە، ئەگەر هاوسەری نەبێ ڕۆڵەو کچو کوڕی چۆن پەیدادەبن؟ وە ناشگونجێ هیچ شتێك لە دروستکراوەکان، هاوسەری خوابێ، چونکە ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾، خوا هەموو شتێکی دروستکردوە، ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە، ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ﴾، ئا ئەوەتان کە بۆتان باسکرا، خوای پەروەردگارتانە، ﴿ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، ﴿ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ فَٱعْبُدُوهُ ﴾، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، تەنیا ئەو بپەرستنو بەندایەتیی بەس بۆ وی بکەن، ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴾، وە ئەو سەرپەشتیارو مشوورخۆری هەموو شتێکە، وە بەسەر هەموو شتێك ڕادەگات.

---

١) مختار الصّحاح ، ص: ٥١، ( أبْدَعَ الشيءَ : اخترعَهُ لا على مثالٍ).

ڕەنگە یەكێك بڵێ: باشە مادام خوا ئەو هەموو سیفەتە جوانانەی هەن، بۆچی نایبینین، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ ﴾، چاوەكان ئەو نابینن، بەڵام ئەو چاوەكان دەبینێ، ﴿ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، وە خوا پەنهانكاری شارەزایە.

﴿ قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ ﴾، بێگومان لە پەروەردگارتانەوە، بەرچاو ڕوونییتان بۆ هاتوون، بەڵگەی ڕوونو ڕۆشنتان بۆ هاتوون، كە بەرپێی خۆتانیان پێ دەبینن، هەقو ناهەقیانی پێ لێك جیادەكەنەوە، ﴿ فَمَنۡ أَبۡصَرَ فَلِنَفۡسِهِۦ ﴾، ئنجا هەر كەسێك (ئەو هەقەی) بینی بەهۆی ئەو بەڵگە ڕوونو ڕۆشنانەوە، سوودەكەی بۆ خۆیەتیو خۆی لێی بەهرەمەندە، ﴿ وَمَنۡ عَمِيَ فَعَلَيۡهَا ﴾، وە هەر كەسێك كوێر بوو، لە بەرانبەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا، ئەوە بۆخۆی زەرەرمەندە، یانی: سوودو زیان بۆخۆتانە، خوا زۆر لەوە بەرزترە بەهۆی چاكەی ئێوە سوود وەربگرێو، بەهۆی گوناهی ئێوە زیان بكات، ﴿ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴾، وە من بەسەر ئێوە پارێزەر نیم.

ئەمە فەرمایشتی پێغەمبەری خوایە، ﷺو خوا لەسەر زمانی وی فەرموویەتی، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! تۆ ئاوا بڵێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾، وە ئاوا بەو شێوەیە ئایەتەكانی خۆمان جۆراو جۆر دەكەینو، بە شێوەی جۆراو جۆر دەیانخەینەڕوو، ئەم قورئانە مەزنە، ئەگەر سەد جار باسی شتێك بكات، هەر جارە بە جۆرێك باسی دەكات، كە جیاواز بێ لەوەی كە پێشتر باسی كردوە، بۆ وێنە: خوای بەرز لە چەند شوێنی دیكەدا، باسی میوەو دانەوێڵەی كردوە، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین، لە هیچ شوێنێك دا دووبارە نیە، ﴿ وَلِيَقُولُواْ دَرَسۡتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، وە با ئەوانیش بۆخۆیان هەر بڵێن: تۆ ئەم قورئانەت لەلای خەڵكی دیكە خوێندوە، وە با ئێمەش ڕوونی بكەینەوە، بۆ كەسانێك كە دەزانن، واتە:

ئـەوەی نەفـام بـێ دەڵـێ: لەلای خەڵکی دیکـه خوێندووتـه، چـونکه نازانـێ قورئـان چـی تێدایه، بـەڵام ئـەوەی زانابـێو شـارەزا بـێ، دەزانـێ کـه ناگونجـێ ئـەم قورئـانه دانـراوی بەشـەر بێ، چونکه ئەو نهێنـییانەی له قورئـان دا ئاشـکرا کـراون، جگـه لـه خـاوەنی ئاسمانەکانو زەوی، کەسی دیکه نایانزانـێ، وەك له سـوورەتی (الفرقـان)دا دەفـەرموێ: ، ﴿ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِی یَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِی ٱلسَّمَـٰوَ ٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ۝٦ ﴾، واتـــه: بڵـــێ: کەســـێك ناردوویـەتـه خـوار، کە نهێنـیی لـه ئاسـمانەکانو زەوی دا دەزانـێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰۖ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ﴾، لە کۆی ئەم ئایەتانەدا، خوای کاربەجێ باسی شازدە دیمەنی سەرنج ڕاکێشی دروستکراوەکانی خۆیمان بۆ دەکات، وە تەنیا لەم ئایەتە موبارەکەدا باسی چوار لە دیمەنەکان دەکات:

**دیمەنی ١ و ٢** : دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ﴾، بێگومان خوا قڵیشێنەری دەنکە تۆوەکانو نێوکە میوەکانە.

لەڕاستییدا زیاتر زانایانو شارەزەیانی بواری ڕووەك، لە نهێنیی ئەوە تێدەگەن، کە هەر دەنکە تووێكو، هەر نێوکە میوەیەك کە دەڕوێ، بۆخۆی موعجیزەیەکی سەرسووڕهێنەرە، بۆ وێنە: نێوکە خورمایەك کە هیچ کەس بە ددان پێی ناشکێ، چونکە زۆر ڕەقە، بە بەردیش بە زەحمەت دەشکێ، کەچی کە دەیخەیە نێو ئەو گڵە نەرمەوە، دەبینی دوایی چەکەرەیەکی نەرمی سەوزی لێ دێتە دەرێو دەبێتە دوو بەش، بەشێکی بەرەو سەرێ دەچێو، دەبێتە درەختو، بەشێکیش بەرەو خوارێ دەچێو دەبێتە ڕەگو ڕیشە، هەروەها نێوکە خۆخو قەیسیو هەڵووژەو... هتدیش بە هەمان شێوە، دەبینین دوایی لەنێو ئەو گڵە نەرمەدا، بێئەوەی هیچ فشارێکی لەسەربێ، دەڕوێ، ڕاستە ئەوە هۆکاری زانستیی هەیە، بەڵام ئایا کێ ئەو یاسایەی داناوە؟ بێگومان خوای دروستکارو قڵیشێنەری دەنکە تۆوەکانو نێوکە میوەکان.

**دیمەنی ٣ و ٤** : کە دەفەرموێ: ﴿يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾، زیندوو لە مردوو دەردێنێ، وە دەرهێنەری مردووە لە زیندوو،

پێشتریش وێنەمان هێنایەوە، لەسەر دەرهێنانی زیندوو لە مردوو، هەروەها بە پێچەوانەوەش، بۆ وێنە: دەنکە برنجێك، یان هەر دانەوێڵەیەکی دیکە، کە ڕەق و وشکەو هیچ ژیانی تێدانیە، دوایی پنجێکی لێ دەڕوێ، بنکێکی لێ دێتەدەرو دەبێتە درەختێك، یاخود بڕکە سەوزەیەك کە ژیانیان تێدایە.

هەروەها هێلکەیەك کە ژیانی تێدانیە، بەڵام بە مۆڵەتی خوا، ژیانی لێ دێتەدەر، وە هەروەها مردووش لە زیندوو دەردێنێ، ئەوە زیاتر لە جەستەی ئینساندا بەرجەستەیەو دەزانرێ.

ئەو شانەو خانانەی کە زیندوون و ژیانیان تێدایە، نەك ڕووح، دوایی دەمرن، یان ئەو خواردنەی کە دەیخۆین، بێ ژیانە، بەڵام دوایی کە دەچێتە نێو جەستەی مرۆڤ ، زیندوو دەبێ و ژیانی دێتەبەر، مرۆڤ هەر خواردنێك بخوات، هەزم دەبێ، دوایی دەچێتە نێو خانەکان و زیندوو دەبێ.

ئنجا پاش خستنەڕووی ئەو چوار دیمەنە سەرنجڕاکێشە، دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئا ئەمە خوای باڵادەستە، کە ئەو شتە سەیرانە دەکات و، جگە لەوی کەس ناتوانێ، بیانکات، بۆیەش دوایی دەفەرموێ:

﴿ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾، ئنجا ئایا بۆ کوێ لادەدرێن؟! واتە: بۆچی جگە لە خوا دەپەرستن ؟!

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾، لێرەش دا خوای زاناو توانا، چوار تابلۆو دیمەنی دیکەمان پێشان دەدات، کە لەگەڵ چوارەکانی پێشێ دەبنە هەشت:

**دیمەنی ٥** : دەفەرموێ: ﴿ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ ﴾ خوا قڵیشێنەری شەوگارو بەرەبەیانەو تاریکیی و ڕووناکیی، شەوگارو ڕۆژگار لە یەك جیادەکاتەوە.

**دیمەنی ٦** : دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا ﴾، وە شەوگاری گێڕاوە بە مایەی سرەوتن و، تێدا ئیسراحەت کردن.

**دیـــــمەنی** ٧ و ٨ : دەفـــەرموێ: ﴿ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ﴾، مـــانگو خۆریشـی داناون بـۆ حیسـاب کردنـی ئێـوە، کـە بەهـۆی جووڵــەی خـۆرەوە، بـۆ وێنە: دەزانین کـە مانگـی ڕەمەزان سـاڵـێ دە ڕۆژ دێتـە پێش، چونکـە ساڵی مانگیی (السَّنة القمرية)مان هەیە، وە ساڵی خـۆریی (السَّنة الشمسية)مان هەیە، ساڵی خـۆریی، هەر لە شوێنی خۆیەتیو ناجووڵێ، بەڵام ساڵی مانگیی دەجووڵـێ، وە ﴿ حُسْبَانًا ﴾، واتە: بۆ حیساب کـردن دانـراون.

ئنجا لـە کۆتـایی ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾، ئـا ئەوە ئەندازەگیـریی (خـوای) زاڵی زانایە، جا من دەمەوێ لێرەدا سەرنجتان بـۆ شـتێك ڕابکێشـم، کـە پێشـتـریش تیشکێکمان خستە سـەر:

﴿ حُسْبَانًا ﴾، لێـرەدا چـاووگ (مصدر)ە، بـە مانـــای (حِسـاباً) واتـە: مانــگو خـۆرمان داناون، ئـاوا جووڵـە بکـەن، بـۆ حیسـاب کردنـی ئێـوە، ئـەوە مانـایـەکی، یـان: بە حیسابو ئەندازەگیـریی دامانناون، کـەواتـە هـەروا بـە هەوەنتـە نیـە.

لێـرەش دا دەمـەوێ چـەند زانیـارییەکی سادەتـان پـێ بڵـێم، دەربـارەی کۆمەڵەی خــۆر:

## چـەنـد زانیـارییـەك لـەبارەی کۆمـەڵـەی خـۆرەوە

ئەو کۆمەڵەی خۆرەی ئێمـە، بۆچی پێی دەگوترێ: کۆمـەڵەی خۆر (المجموعة الشمسية)؟ چونکە خـۆر (شمس) نۆ خرۆکە بە دەوردا دەخولێنەوە، کە ئەمانەن: (زەوی، عەتتارد، زوهرە، مەریخ، موشتەری، زوحـەل، ئۆرانۆس، نیبتۆن، بلـۆتـۆن).

ئنجـا زانـایان دەڵێن: خـۆر ملیۆنێـكو سـێ سـەد هەزار (١,٣٠٠,٠٠٠) جـار لـەم زەوییـەی ئێمـە گـەورەترە.

وە خـۆر سـەدو پەنجـا ملـیۆن (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمـەتر لـە زەوییـەوە دوورەو بـە هەشـت دەقیقـەو دوو چـرکە تیشـکی خـۆر دەگـاتە ئێمـە، چونکـە تیشکی خـۆر لـە یـەك چـرکـەدا سـێ سـەد هەزار (٣٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر دەبـڕێ.

وە مانگ سێ سەدو هەشتاو چوار هەزارو پەنجاو پێنج کیلۆمەتر (٣٨٤,٠٥٥) لە ئێمەوە دوورە، وە تیشکی مانگ بە چرکەیەكو یەك لەسەر چواری چرکەیەك (١ و ٤/١ ) دەگاتە ئێمە.

وە یەکەم ڕۆکێتی ئەمریکیی کە هەڵدرا بۆ سەر مانگ ، کە (ئەپۆڵۆ ١١)یان پێدەگوتو یەکەمین مرۆڤی گەیاندە سەر مانگ کە ناوی (نیل ئارمسترۆنك) بوو، بە سێ ڕۆژان گەیشتە سەر مانگ[1]، لە کاتێکدا کە لە هەر یەك سەعاتدا شەش هەزار (٦٠٠٠) کیلۆمەتری دەبڕی، واتە: شەش هێندەی فڕۆکە، فڕۆکە ئەگەر زۆر بڕوات، هەزار کیلۆمەتر دەڕوات لە سەعاتێکدا، بەڵام ئەو شەش هەزار کیلۆمەتری دەبڕی، کەواتە: زۆر زۆر دوورە، بەڵام تیشکەکەی هێندە خێرایە، بە چرکەیەكو یەك لەسەر چواری چرکەیەك دەگاتە ئێمە !

ئەدی ئەگەر بویستری ڕۆکێتێك هەڵبدرێ بۆ سەر خۆر، چەند کاتی دەوێ؟ بە بیستو پێنج هەزار (٢٥٠٠٠) سەعات دەیگاتێ، ئەگەر لە هەر سەعاتێکدا شەش هەزار کیلۆمەتر ببڕێ، کە دەکاتە هەزارو چلو یەك ڕۆژو شازدە (١٠٤١,١٦) سەعات، واتە: نزیکەی سێ ساڵ بەڕێوە دەبێ.

بەڵام ئەگەر بمانەوێ ڕۆکێتێك هەر ئاوا هەڵدەین بۆ سەر نزیکترین ئەستێرە، جگە لە خۆر، کە نزیکترین ئەستێرە پێی دەگوترێ: (ئەلفا فەنتۆریس)و چوار ساڵی تیشکی لە ئێمەوە دوورە، واتە: تیشك کە لە هەر چرکەیەکدا سێ سەد هەزار کیلۆمەتر دەبڕێ، بە چوار ساڵان دەگاتە ئێمە.

ئەگەر ئەو ڕۆکێتەی هەڵیدەدەین، بە خێرایی شەش هەزار کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا ببڕێ، ئەو کاتە بە شەستو شەش هەزارو شەش سەدو شەش (٦٦,٦٠٦) ساڵ دەگاتە ئەو ئەستێرەیە !!

ئەوانە چەند زانیارییەك بوون، دەربارەی کۆمەڵەی خۆر، کە بێگومان خۆر (شمس) تەنیا ئەستێرەیەکی کەهکەشانی کاکێشانە، کە زانایان دەڵێن: سەد ملیار (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرەی تێدایە، وەك خۆرو بچوکترو گەورەتر.

---

١) (ئەپۆڵۆ ١١) ڕۆژی دووشەممە: ٢١ی تەمووزی ١٩٦٩ ز، کاتژمێر: ٣،٥٦ گەیشتە سەر مانگ، بڕوانە: (المنجد ـ قسم الأعلام)، ص٩٤، ط ٢٤، وە بڕوانە: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) لاپەڕە: ١٦٨، چاپی دووەم.

هەروەها زانایان دەڵێن: لە بوونەوەردا، هەتا ئێستا بە مەزەنندە، سەد ملیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کەهکەشانو هەندێکیش دەڵێن: پێنج سەد ملیۆن (٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کەهکەشان (مجرَّة) دۆزراونەوە، هەندێکیشان دەڵێن: بەڵکو: دە تریلیۆن (١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، (١٠)[١٢] کەهکەشان زیاتر لە بوونەوەردا هەن.

هەندێکیشیان دەڵێن: ژمارەی مەجەڕەکانە بوونەوەر هێندەی ژمارەی ئەستێرەکانی کەهکەشانەکەمانە، کە: سەد ملیار (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، (١٠)[١٠](١)،

بۆیەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾، ئا ئەوە ئەندازەگیریی (خوایەکی) زاڵی زانایە.

**مەسەلەی سێیەم:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾، واتە: وە خوا ئەو کەسەیە کە ئەستێرەکانی بۆ گێڕاون بە مایەی ڕێنمایی لە تاریکاییەکانی وشکانییو دەریادا، بێگومان ئایەتەکانمان ڕوون کردوونەوە بۆ کۆمەڵێك کە بزانن.

**دیمەنی ٩** : لەم ئایەتەشدا دیمەنی نۆیەم - بە گوێرەی ڕیزبەندیی ئێمە - دەخاتەڕوو.

ئنجا زانایان دەڵێن: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ﴾، مەبەست لە (ظُلُمَات) کە کۆی (ظُلْمة)یە، (ظُلُمَة) واتە: تاریکیی، (ظُلُمَات)واتە: تاریکییەکان، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی خودی تاریکیی بەرهەست نیە، کە بریتیە لە نەدیتنو پێچەوانەی ڕووناکییە، بەڵکو مەبەست لە (ظُلُمَات) لێرەدا: (الشدائد) سەختییەکانو نارەحەتییەکانن، کە دێنە ڕێی خەڵك، لە کاتێکدا کە بە وشکانییو بە بیابانو دەشتو سارادا دەڕۆن، وە لە کاتێکدا کە بە دەریادا دەڕۆن، دەشگونجێ هەردووکیان مەبەست بن، واتە: مەبەست پێی

---

١) بڕوانە: (مع الله في السماء) د. احمد زكي، ص١٩ و ١٩٧، وە: (الإسلام يتحدّى) وحيدالدين خان، ص ٥٨، وە: (بدائع السماء)، ص ٢٥٧، وە: (الكون الأحدب)، ص ٢٥٤.

تاریكیی بەرهەســت بــێ، كە راســتە لـە كاتێكـدا كـە ئینسـان تاریكـیی لــێ دادێ، بەتایبـەت لە دەریادا، كە هیچ نیشانەیەكی لـێ نیـە، نە شـاخێك، نـە گردۆڵكەیـەك، بەهۆی ئەســتێرەكانەوە ڕێ بە دی دەكـات.

هەروەهــا لـە بیابـانو ســاراشــدا دیسان كاتێـك كـە شـەوگار بـاڵی ڕەشی بەســەر دنیـادا دەكێشـێ، بەتایبـەت لە بیاباندا، كە دیارە لە بیـاباندا هـیچ نیشـانەیەك وەك چیـایەك، گردۆڵكـەیەك، ڕووبـارێـك، ئاوەدانییـەك نیــە، بەهـۆی ئەسـتێرەكـانەوە، ئینسـان باشـتـر دەتوانێ ڕێ دەربكات، داخۆ بەرەو ڕاسـت دەڕوا، بـەرەو چـەپ دەڕوا، بەرەو سەرێ دەڕوا، یان بەرەو خوارێ؟! بەڵـێ بوونی ئەسـتێـرەكان لەو حاڵانــەدا، زۆر گرنگەو هەر كەسێك ئەو حاڵەتـانەی لـێ نەقەومـابـن، گرنگیـی ئـەوە نـازانـێ.

## ڕاسـتكـردنـەوەی بۆچـوونێـكی هـەڵـەی هـەندێـك لە زانـایـان لەبـارەی ئەستێـرانەوە

لێــرەدا كــە خــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ ﴾، وە خـوا ئەو كەسەیە كە ئەستێرەكانی بۆ گێڕاون بـە مایەی ڕێنماییتـان لە تاریكاییەكـانی وشـكانییو دەریادا.

هەندێك لـە توێـژەرەوانی قورئـان لێیـان هەڵهـێنجـاوە كـە: ئـەركی ئەسـتێرەكان، یـاخود حیكمـەتی دروسـتكرانی ئەستێرەكـان، هـەر ئەوەیــە لەگــەڵ دوو حیـكمەتـی دیكـەش دا، كە خـوای باڵادەسـتو زاڵ لە قورئـاندا بە ڕۆشـنـی باسی كردوون:

١/ یەكیــان ئـەوەیە كە ئەسـتێـرەكان مایـەی ڕێ دەركردنـی مرۆڤەكانـن لە وشـكانیـیو دەریـادا:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ.. ﴾.

٢/ ئەوەیە كە خـوا دەفـەرموێ: ئەستێرەكانمان كردوون بە مایەی ڕازاندنەوەی ئاسمانی یەكـەم: ﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَـٰبِيحَ ...﴿٥﴾ ﴾الــملك، واتــە: وە ئاســمانی نـزیك ئێوەمان بە چرایەكان ڕازاندۆتەوە، كـە مەبەسـت پێیـان ئەسـتێرەكانـن.

٣/ سێیەم ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ئەستێرەکانمان گێڕاون بە مایەی تیربارانکردن‌و بەردباران کردنی شەیتانەکان: ﴿... وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ ﴿٥﴾﴾ الملك، بۆ وێنە (إبن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا، ـ واتە ئایەتەکانی سووڕەتی (الأنعام)دا ـ دەڵێ: (مَنِ اعْتَقَدَ فِي هَذِهِ النُّجُوم غير ثَلاَث فَقَدْ أَخْطَأَ وَكَذَب عَلَى الله: أَنَّ الله جَعَلَها زينة للسَّمَاء، وَرُجُومَاً للشَّيَاطِين، وَيُهْتَدى بها فِي ظُلُمَات البَرّ وَالبَحْر)[1]، واتە: هەر کەسێك یەکێك جگە لەو سێ شتانە پاڵ بداتە لای ئەستێرەکان، ئەوە بەهەڵەدا چووە، وە درۆشی بە ناوی خوای پاکەوە کردوە:

یەکەم: خوا ئەستێرەکانی گێڕاوە بە مایەی جوانی بۆ ئاسمانی یەکەم.

دووەم: وە کردوونی بە مایەی بەرد بارانکردنی شەیتانەکان، کە دەیانەوێ گوێ لە قسەی فریشتان بگرن.

سێیەم: وە کە بەهۆی ئەستێرەکانەوە، لە تاریکاییەکانیی وشکانیی‌و دەریادا، ڕێ دەدۆزنەوە.

بەڵام من دەڵێم: بێگومان ئەوە وا نیە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: یەکێك لە ئەرکی ئەستێرەکان، یاخود لە حیکمەتی دروستکرانیان، ئەوەیە کە ڕێیان پێ دەدۆزنەوە، وە حیکمەتێکی دیکەیان، ئەوەیە کە مایەی ڕازانەوەن بۆ ئاسمانی یەکەم، وە یەکی دیکە لە حیکمەتەکانیان، ئەوەیە کە هۆی بەرد بارانکردنی شەیتانەکانن.

بەڵام خوا نەیفەرمووە: حیکمەتی دروستکرانی ئەستێرەکان هەر ئەوانەن! بەڵکو سێ لە حیکمەتەکانیان ئەوانەن، بەڵام کورتی هەڵنەهێناون کە بفەرموێ: هیچ حیکمەتێکی دیکەیان تێدا نیە! بۆیە ئەو ئەنجامگیرییەی هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان ـ لە نێوایان دا (إبن کثیر) ـ لە جێی خۆیدا نیە، چونکە خوا ﷻ بە شێوازێکی کورت هەڵهێنان (أسلوب الحصر) نەیفەرمووە:

---

١) المصباح المنير: ص٤٣٦.

ئەستێرەکان تەنیا بۆ ئەو سێ مەبەستانەن، بەڵکو دەفەرمویٚ: ئەو سێ حیکمەتەو ئەو سێ سوودەیان لێ وەردەگیرێن، بەلاّم نەیفەرمووە: سوودی دیکەیان لێ وەرناگیرێن.

ئنجا ئێستا بۆ زانایان دەرکەوتوە کە ئەستێرەکان بەشێکن لە مەنظوومەیەکی زۆر گەورە، وە پەیوەندییان بە ژیانی ئێمەوە هەیە، وە ئەو زەوییەی ئێمە، یەکێکە لە نۆ خڕۆکە کە بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە، وە خۆری ئێمەش ئەستێرەیەکە لە سەد ملیار (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرە لە کەهکەشانی کاکێشاندا، وە وەك زانایان دەڵێن: مەزەندە دەکرێ سەد ملیار کەهکەشانی وەك ئەو کاکێشانەی ئێمە تا ئێستا دۆزراوبنەوە کەواش پێدەچێ ئەوانە هەموویان لە سنووری ئاسمانی یەکەمدا بن، چونکە خوا ﷻ بە ڕاشکاویی دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ ٥ ﴾ الملك، واتە: ئاسمانی نیزیکمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، چونکە (دنیا) (مؤنث)ی (أَدنى)یە، (أدنى)ش واتە: (أقرب)، یانی: نیزیکترین ئاسمان.

ئنجا بەو پێیە بێ: شەش ئاسمانی دیکە لە سەرووی ئەو ئاسمانەوە هەن، کە بە ئەستێران ڕازاوەتەوە، ئنجا ئەو ئاسمانی یەکەمەش کە بە ئەستێران ڕازاوەتەوە، زانایان دەڵێن: سەد ملیار گەلە ئەستێرە، واتە: کەهکەشانی تێدایە، لە هەر کەهکەشانێکدا دەوری سەد ملیار ئەستێرە هەیە، {سەد ملیار، واتە: یەکێك دابنێ یازدە سفری لە پێشەوە بێ، ملیارێك نۆ سفری هەیە، سەدەکەش دوو (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)}، وە ئەوەندە کەهکەشانەش بە ژمارەی ئەستێرەکانی هەر کەهکەشانێك، لە سنووری ئاسمانی یەکەمدا، هەن، کە بە زاراوەی زانایان دەڵێن: (کَون) بوونەوەر، بەلاّم لەڕاستییدا ئەوە هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دایە.

ئنجا لە سەرووی ئەوەشەوە، شەش ئاسمانی دیکە هەن، کەواتە: ئەوە کە زانایان وایان هەڵهێنجاوە: تەنیا ئەو سێ حیکمەتە هەن بۆ ئەستێرەکان، وەك گوتم: ئەنجامگیرییەکی ناڕاستە.

ئنجا وەك ئەنجامگیریی دەربارەی ئەوە کە ئەستێرەکان مانای ڕێنماییین، دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، بێگومان ئایەتەکانی خۆمانمان ڕۆنکردوونەوە، بۆ کۆمەڵێك کە بزانن.

واتە: ئینسان ئەگەر زانیاریی نەبێ، لە حیکمەتو نهێنییەکانی ئەستێرەکانو کەهکەشانەکان، تێ ناگات، ئەوەش ئاماژەیە بەوە کە: هەوڵبدەن زانیاریی پەیدا بکەن، زانیاریی گەردووناسییو، زانیاریی بەگشتی بۆئەوەی کە لە ئایەتەکانی خوا کە ڕوونیکردوونەوە، دەربارەی دروستکراوەکانی، بەتایبەت ئەستێرەکان، تێبگەن، چونکە بەبێ زانیاریی لە دروستکراوەکانی خوا شارەزا نابین.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴾، دیارە وەك لە دەرسەکانی پێشوودا گوتمان لەم پێنج ئایەتەدا خوا ﷻ شازدە (١٦) دیمەنی خستوونە بەرچاو، وەك بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتییو بەدیهێنەرایەتییو خاوەندارێتیی خۆی، بۆ بوونەوەر.

جا ئەوەی ئایەتی پێشوو دیمەنی نۆیەم بوو، ئەمەشیان دیمەنی دەیەمە:

**دیمەنی ١٠** : کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ﴾، وە خوا ئێوەی لە یەك نەفس پێگەیاندوەو هەمووتانی لە یەك نەفس وەدیهێناوە، ﴿ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞ ﴾، هەندێکتان نیشتەجێو، هەندێکیان بە شێوەی کاتیی دانراون، ﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴾، بێگومان ئایەتەکانی خۆمانمان ڕوونکردوونەوە بۆ کۆمەڵێك کە تێبگەن، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴾، دواییش دەفەرموێ: ﴿ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾، ئەوە هەمووی حیکمەتی خۆی هەیە، دوایی باسی دەکەین.

لێـــرەدا كـــە دەفـــەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾، وە خـــوا ئێـــوەی پێگــەیاندوە لــە یــەك نــەفس، تەماشــا بكــەن! ئێستا دەوری حــەوت ملیـار بەشــەر لەســەر زەوی هــەیە، واتــە: حــەوت هــەزارو ملیــۆن (٧,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ئینسان لەســەر زەوی هەیـــەو، وە هەموویـــان لـــە یـــەك نەفســـەوە هـــاتوون، ئـــەوەش حەقیقـەتێكـی زانستیـــیو دان پێـداهێنراوە، چونكــە، بـۆ وێنـــە: ئـەم عێـــراقەی ئێمــەی كە تێیـدا دەژیـنو هـەرێمی كوردستـان بەشێكیەتی، لـە كـاتی دروستـبوونی عێراقدا چەند ملیۆنێك بـووە، ئێســتا دەوری ســیو پێـنج ملیۆنــە، كـاتی خـۆی لـە پەنجـاكاندا حــەوت مــلیۆن بــووە، لـە پـێش پەنجایەكـاندا لەوانــەیە نیــوەی ئــەو حەوت ملیۆنە بــووبــێ.

دیـارە بـە هــەموو پێكهاتەكانیــەوە، بـەو شــێوەیە، كــورد كـە ئێسـتا دەوری چـل، پەنجـا ملیۆنــە، لـە هــەموو پارچـەكـانی كوردســـتان دا، دیـارە پێشــتــر زۆر كەمتــر بووە، هەروەها گەلـی عـەرەبو هەموو گەلەكـانی دیكـەش بە هەمان شێوە.

كەواتــە: بەشەر ڕۆژ بە ڕۆژ زیـاد دەكـات، وە زانـایان پێشــبینیی دەكــەن: ئێســـتا كە سـالّی (٢٠١٣)یە، هــەتا سـالّی (٢٠٥٠) بەشــەر ئێسـتا چــەندن، دوو قات، یـان ســێ قـات ببنـەوە، یانـی: ئێســتا دەوری حـەوت ملیـارە، ببــن بە (١٤) ملیــار، یاخــود ببــن بە دەوری (٢٠) ملـیار بەشــەر.

ئنجـا مەبەستم ئەوە بوو كـە خـوا ﷻ سـەرنجمان ڕادەكێشـێو دەفـەرموێ: هـەموو ئەوانـەی كـە ئێسـتا هـەن، لـە یـەك نـەفس بەدیهێنـــراون، ئەویــش ئــادەمە ﷺ، وە حەووای هاوســەریشی، هەر لـەو جـۆرە نەفسـە دروست بووە، بەلاّم خـوای پەروەردگار بــە تەفصــیلّ بــۆی باســی چــۆنیەتی دروســتكردنی حــەووا نەكـردوویـــن، وەك لـــە دەرسەكانی ڕابردووشـدا گوتوومـانە، ئـەوەش كە دەلّێن: حـەووا لە پەراسـووی چـەپی ئــادەم دروســت بــووە، ئەوە لە تـەوڕات وەرگیـراوەو، لە قورئاندا باسی ئەوە نەكــراوە، تەنیا باسی ئەوە كـراوە، كە خـوا هـەر لەو نەفسـە هاوسـەرەكەشی دروست كرد.

بۆیــەش خـوای بەدیهێنــەر وایفـەرمووە، چونكـە پـێش هـاتنــی ئیسلام، دەربـارەی ئــەوە كــە: ئایـا ئـافرەتیش لــە جـۆری نەفسـی پیـاوە، یــان نــا؟ مشتــومڕ هــەبووە، هەندێكیان گوتوویانە: نەخێـر، ئافـرەت نەفســێكی ئاژەڵیــی هەیـــە، بـەلاّم قورئـــان

ئەو حەقیقەتەی ڕاگەیاند، كە: نەخێر، پیاوو ئافرەت هەردووكیان خاوەنی یەك جۆرە سروشتن، كە نەفسی بەشەرە، دیارە ئێمە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (النساء) [1]دا، بە تەفصیل باسمان كردوە، حەدیسەكانیشمان هێناوە، كە ئەوە ڕاست نیە: حەووا لە ئادەم جیا بووبێتەوە، وەك لە تەوراتدا هاتوە، كە دەڵێ: حەووا لە پەراسووی چەپی ئادەم دروست بووە، وە لەوێ دەقەكەی تەوراتیشم هێناوە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە، كە لە هەمان جۆرە نەفس دروست كراوە، چونكە كە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ النساء، (مِنْهَا) ڕاناوەكەی دەچێتەوە بۆ (نفس واحدة)، كە ڕووحەكەیەو، ڕووحیش بەش (تجزئة) ناكرێ، ڕاناوەكە ناچێتەوە بۆ بەدەنەكە، ئەگەرنا دەیفەرموو: (وَخَلَقَ مِنْه) واتە: ئادەم عليه السلام وەك جەستە، بەڵام فەرموویەتی: نەفس، ئەویش (مؤنث)ە، وە نەفسیش كە هەر ڕووحە، وەك ماددە نیە بەش بەش بكرێ.

بەڵگەیەكی دیكەش ئەوەیە كە خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (الروم)دا دەفەرموێ:
﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴿٢١﴾﴾، واتە: وە لە نیشانەكانی خوایە كە لە نەفسی خۆتان، هاوسەرەكانتانی دروست كردوون، واتە: لە هەمان جۆرە نەفس، بەنسبەت ئادەمو حەوواشەوە، بە هەمان شێوە، ئنجا ئەگەر وابێ نەفسی حەووا لە ئادەم جیابووبێتەوە، دەبێ هەموو ژنێكیش لە نەفسی مێردەكەی خۆی جیابووبێتەوە، بە پێی ئەم ئایەتە!!

وە خوا سبحانه وتعالى بە دوو وشە پێناسەی بەشەرەكان دەكات، دەفەرموێ: ﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾، ﴿فَمُسْتَقَرٌّ﴾ یانی: نیشتەجێ، نیشتەجێكراو، ﴿وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ واتە:

---

١) بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرە.

هەڵگیراو، یاخود: دانراو، (إستقر) واتە: نیشتەجێ بوو، سەقامگیر بوو، وە (استودِعَ) واتە: سپێردرا، دانرا بە شێوەیەکی کاتیی، یاخود بە شێوەیەکی وەك ئەمانەتو سپاردە.

هەڵبەتە خوێنراویشەوە (فَمُسْتَقِرٌّ) واتە: نیشتەجێ، یانی: خۆی نیشتەجێیە، نەك نیشتەجێکراو بێ، (مُسْتَقَرٌّ) واتە: نیشتەجێکراو، لەسەر صیغەی (مفعول)، بەڵام (مُسْتَقِرّ) لەسەر صیغەی (فاعل)ە، واتە: خۆی نیشتەجێ بووە، (مُسْتَوْدَع)یش هەر بە یەك شێوە خوێندراوەتەوە واتە: هەڵگیراو.

زانایان هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: ﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ واتە: هەرکامێکتان حاڵەتی ئیستیقرارو نیشتەجێکراو، بە خۆوە دەبینێ، وە حاڵەتی دانراوو هەڵگیراو، بە شێوەی کاتیی.

ئنجا ئایا مەبەست لە حاڵەتی نیشتەجێکراوو هەڵگیراو چیو چین ؟

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ (مَصْدَرَانِ: أي فَلَكُم: إِستقرَار وإستيدَاع، أو إِسما مَكَانٍ: أَي مَوضع استقرارٍ واستيداع)، یانی ﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ هەردووکیان چاوگن، واتە: ئێوە هەردوو حاڵەتی نیشتەجێکرانو هەڵگیرانتان، بەخۆوە بینیوون، یاخود ناوی شوێنن، واتە: شوێنی تێدا نیشتەجێکرانو، شوێنی هەڵگیرانتان بۆ دانراوە.

ئنجا ئایا مەبەست لەوانە چییە؟

یەکەم: هەندێکیان گوتوویانە:

أ /١) ﴿فَمُسْتَقَرٌّ﴾ حاڵەتی ئینسانە لە کاتێکدا کە لە ڕەحمی دایکی دایە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ ﴿٥﴾﴾ الحج، واتە: وە لە منداڵدانەکاندا هەر چییەك کە بمانەوێ، نیشتەجێ دەکەین.

کەواتە: ئینسان لە منداڵدانی دایکیدا، حاڵەتی نیشتەجێکران بەخۆوە دەبینێ.

أ/ ٢) هەروەها نیشتەجێبوونمان لەسەر زەویی هەیە، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٣٦﴾ ﴾البقرة، وە بۆ ئێوە لەسەر زەویی هەیە، شوێنی تێدا نیشتەجێبوون، وە شوێنی تێدا گوزەراندنو ڕابواردن، تاکو کاتێکی دیارییکراو.

ب/ حاڵەتی (إستیداع) واتە: هەڵگیرانو دانران بە شێوەی کاتیی، زانایان گوتوویانە:

ب/ ١) (إستیداعٌ: في الأصلاب) هەڵگیرانە لە پشتان دا، ئینسان پێش ئەوەی ببێتە (نُطْفَة)و بچێتە منداڵدانی دایکی، لە پشتی بابی دایە، بە شێوەی تۆو (مَني)ە، هەروەك بە شێوەی (بويضة) هێلکۆڵە لە سینگی دایکیدا هەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ﴿٦﴾ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ ﴾الطارق، واتە: ئینسان با سەرنج بدا، لەچی دروست کراوە؟ لە ئاوێکی دەرقولێو {(دافق) ئەوەیە کە: شتێك دەربقوڵێ، وە ئەوە تەعبیرە لەو حاڵەتەی کە پیاوو ئافرەت پێکدەگەن}، ئنجا ئایا ئەو ئاوە لە کوێوە دێ؟ لە پشتو لە سنگەوە دێ، (الصُّلْب) واتە: ئێسقانی پشت (التَّرَائِب) ئێسقانی سنگ، کە کارگەی دروستبوونی ئاوی پیاو، لە پشتی دایە، وە کارگەی دروستبوونی ئاوی ئافرەت، لە سینگی دایە، کەواتە: بە شێوەی تۆو هەن لە پشتی بابتاندا، وە لە سینگی دایکیشتاندا.

ب/ ٢) وە واتایەکی دیکەی (مُسْتَوْدَع) واتە: ئێوە لەسەر زەوی هەن، لەسەر پشتی زەوی هەڵدەگیرێن.

<u>دووەم</u>: وە هەندێکیشیان گوتوویانە :

أ / (مُسْتَقَرٌّ) ئەوەیە کە لەسەر زەوی بێ.

ب/ (مُسْتَوْدَعٌ)یش ئەوەیە کە خرابێتە گۆڕەوە، چونکە ئەوەی کە لەسەر زەوییە، ئەوە دیارە نیشتەجێیە، بەڵام ئەوەی کە خراوەتە گۆڕەوە، بە شێوەیەکی وەدیعەو بە شێوەیەکی کاتیی خراوەتەوە گۆڕ، ئەگەرنا دوایی زیندوو دەبێتەوە.

سێیەم: (إبن عطیة) وەك (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆی (التحریر والتنویر)دا لێی وەردەگری، دەڵێ: (قَالَ ابْنُ عَطِیَّة: الَّذِي يَقْتَضِيهِ النَّظَرُ أَنَّ ابْنَ آدَمَ هُوَ مُسْتَوْدَع فِي ظَهْرِ أَبِيهِ وَلَيْسَ بِمُسْتَقرٍّ فِيهِ، لأَنَّهُ يَنْتَقل لا محَالَة، ثُمَّ يَنْتَقل إِلى الرَّحِم، ثُمَّ يَنْتَقل إِلى الدُّنيا، ثُمَّ يَنْتَقل إِلى القَبْرِ، ثُمَّ يَنْتَقل إِلى الحَشْرِ، ثُمّ يَنْتَقِل إِلى الجَنَّةِ أَوِ النَّارِ، وَهُوَ فِي كُلّ رُتْبة بَيْنَ هَذَين الظرفين مُسْتَقِرٌّ بالإِضَافَة إِلى الَّتي قَبْلها، ومُسْتَودَعٌ بالإِضَافَة إِلى الّتي بَعْدَهَا) [(١)]، واتە: ئەوەی کە تێفکرین دەیخوازێ و عەقڵ دەیخوازێ، ئەوەیە کە وەچەی ئادەم (پیاو یان ئافرەت بێ) هەڵگیراوە لە پشتی باییدا، {بەڵام لە پشتی باییدا نیشتەجێ نیە بۆچی؟ چونکە لەوێ لە پشتی بابی دێتە خوار، ئنجا ئەوە هەر باسی پشتی بابی کردوە، بەڵام لەڕاستییدا (ترائب) یانی: سینگی دایکیش، ئاوی ئافرەت لە ئێسقانی سینگی دا دروست دەبێ، لەوێ نیشتەجێ نیە، بەڵکو بۆ ماوەیەکی کاتیی دانراوەو دوایی دەگوازێتەوە} چونکە دوایی لەوێ دەگوازێتەوە بەرەو منداڵدان {ئەگەر خوای بەدیهێنەر بیەوێ ئەو (نطفة)یە دروست ببێ، کە مرۆڤی لێ دروست دەبێ، دیارە (نطفة)ش لە ئەنجامی پێکگەیشتنی (حیمن) یێکی نێو تۆو (مَنيِّ)ی پیاوو، هێلکۆڵە (بويضة) یەکی نێو تۆو (مَني)ی ئافرەتو پیتێنران (تلقيح)یان دا، دروست دەبێ}، دوایی دووبارە لەوێشەوە دەگوازرێتەوە بۆ دونیا (وەك کۆرپە لە دایك دەبێ)و دواییش دیسان لە دنیاش دەگوازرێتەوە بۆ نێو گۆڕ (ئەگەر گۆڕی بەنسیب بێ) دوایی لە حاڵەتی ژیاندا دەگوازرێتەوە بۆ حاڵەتی مردن، وە دوایی لە حاڵەتی مردنیشەوە دەگوازرێتەوە بۆ کاتی کۆکرانەوە (حشر) بۆ ڕۆژی دوایی، دوایی لە وێشەوە دەگوازرێتەوە یان بۆ بەهەشت (خوا بە نەسیبمان بکات)، یان بۆ ئاگری دۆزەخ (خوا پەنامان بدات)، وە مرۆڤ لە

---

١) ج٣، ص: ٣٧٩.

هەرکام لەو پلەو پێگانەدا، لە نێوان ئەو دووانە دایە، بەنسبەت ئەوەی کە لە پێشیەوەیە پێی دەگوترێ: نیشتەجێکراو، وە بەنسبەت حاڵەتی دواییەوە پێی دەگوترێ: سپێرردراو.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ بۆئەوەی پێشی، وەك ئەنجامگیریی فەرمووی: ﴿ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾، بەڵام بۆ ئەمەیان دەفەرموێ: ﴿ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾، چونکە بەڕاستیی زانیاریی هەبوون بە ئەستێرەکانو، خولگەی ئەستێرەکانو گەلە ئەستێرەکانو، چۆنیەتی سووڕانەوەو خولانەوەیانو قەبارەیانو، تیشکەکەیانو، تەمەنیان کە هەندێك لە ئەستێرەکان تیشکەکەیان دوای سەدان، بگرە هەزاران ساڵی تیشکیی، دەگاتە ئێمە، تیشکیش لە چرکەیەکدا (٣٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر دەبڕێ.

## پێناسەی ساڵی تیشکیی

ئنجا ئەگەر بتەوێ بزانی ساڵی تیشکی چەندە؟ دەققەیەك (٦٠) چرکەیە (٦٠ X ٣٠٠,٠٠٠) ماوە (مسافة)ی بڕاوی تیشکت لە خولەکێك دا بۆ دەردەکەوێ، دوایی ئەگەر بتەوێ بزانی لە سەعاتێکدا چەندە؟ ئەنجامی ئەوەی کە دەرچووە، جارانی (٦٠) بکە، چونکە سەعاتێك (٦٠) خولەکە، ئەو کاتە ماوە (مسافة)ی بڕاوی تیشکت لە سەعاتێك دا بۆ دەردەکەوێ، ئنجا جارانی (٢٤) بکە، ماوەی بڕاوی تیشکت لە شەوو ڕۆژێك دا بۆ دەردەکەوێ، دوایی جارانی (٣٦٥) بکە، ماوەی بڕاوی تیشکت لە ساڵێکدا بۆ دەردەکەوێ، بەم شێوەیە:

٣٠٠,٠٠٠ X ٦٠ = ١٨,٠٠٠,٠٠٠ کم لە ماوەی خولەکێك دا.

١٨,٠٠٠,٠٠٠ X ٦٠ = ١,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠ کم لە ماوەی سەعاتێك دا.

١,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠ X ٢٤ = ٢,٥٩٢,٠٠٠,٠٠٠ کم لە شەوو ڕۆژێك دا.

٢,٥٩٢,٠٠٠,٠٠٠ X ٣٦٥ = ٩٤٦,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠ کم لە ماوەی ساڵێك دا.

ئنجا ئەو ماوەیە کە تیشك لە ساڵێکدا دەیبڕێ، کە لە هەر چرکەیەکدا (٣٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، ئەستێرەی وا هەیە بە هەزار ساڵی تیشکیی، ئنجا تیشکەکەی دەگاتە ئێمە، واتە: ئەو تیشکەی ئێمە دەیبینین، هی هەزار ساڵ لەمەو پێشە، بەڵکو هی وا هەیە، هی دەیان هەزار ساڵ لەمەو پێشە، وە ڕەنگە ئەو ئەستێرەیە ئێستا هەر نەشمابێ، چونکە ئەستێرەکانیش تەمەنیان هەیە، پێدەگەنو، حاڵەتی گەنجییان هەیەو، حاڵەتی کامڵ بوونو، حاڵەتی پیربوونو، حاڵەتی لەبەینچوونیشیان هەیە، کە (تونێڵە ڕەشەکان) (الثقوبُ السَّوداء) قوتیان دەدەن، ئنجا مرۆڤ بەبێ زانیاریی سەری لە کاروباری ئەستێرەکانو کەهکەشانەکانو ئەو کەونو کائیناتە دەرناچێ.

ئەدی ئایا بۆچی دەربارەی دروستبوونی خۆمان دەفەرموێ: ﴿ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴾؟ چونکە زانیاریی بریتییە لەوەی کە یەکسەر شتێك بزانی، بەڵام (فقه)، بریتیە لەوەی شتێك بزانی بەهۆی شتێکەوە، بۆیە وشەی (علم) بۆ خوا بەکارهاتوە: ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ ﴾ الملك، بەڵام وشەی (فقه) بۆ خوا بەکارنەهاتوە، چونکە خوا ﷻ پێویستی بەوە نیە، شتێك بەهۆی شتێکەوە بزانێ، بەڵکو خوا ڕاستەوخۆ هەموو شتەکان، وەك خۆیان دەزانێ، بەڵام (فقه) بۆ ئێمە بەکارهاتوە، خوای پەروەردگار نەبوونی (فقه)ی بە سیفەتی زەم بۆ کافرەکان، بەکارهێناوە: ﴿ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الحشر، واتە: ئەوە بەهۆی ئەوەوە کە ئەوانە کۆمەڵێکن نافامن، تێناگەن، لە شتەکاندا وردنابنەوە، تاکو بەهۆی وردبوونەوە لە شتەکان، شتەکانی دیکەشیان بۆ دەربکەوێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ

مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَـٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾، خوای میهرەبان لە ئایەتەکانی پێشوو دا، دە (١٠) دیمەنو وێنەی پێشان داین، کە هەموویان بەڵگەن لەسەر بەدیهێنەرایەتیی، پەروەردگارێتی و، خاوەندارێتیی خوا، کە لە میانەی خستنەڕوویان دا، خوا ﷻ بەگشتی بە خەڵك بەتایبەتو، بە کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەفەرموێ، مادام خوا ﷻ تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، کەواتە: هەر ئەویش بپەرستن و بەندایەتییش تەنیا بۆ وی بکەن، ئنجا خوا تەنیا لەم ئایەتە موبارەکەدا، شەش وێنەو دیمەنی سەرنج ڕاکێشمان دەخاتە بەرچاو، کە هەموویان پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتیی و سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوای پەروەردگاریان تێدا دەدرەوشێنەوە:

**دیمەنی ١١** : ئنجا خوای پەنهانزان، دیمەنی یەکەم لەم ئایەتداو یازدەیەمین: لەو پێنج ئایەتەدا دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا ﴾، واتە: وە خوا ئەو کەسەیە کە لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندوە، بۆچی نافەرموێ: بارانی دابەزاندوە؟ ئەگەر فەرمووبای: (وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَطَرًا) کە لە هەموو قورئاندا، مەگەر پێویست بکات خوا باسی باران، یان باسی تەزرە بکات، ئەگەرنا هەر دەفەرموێ: (مَاءً) چونکە کە دەفەرموێ: (مَاءً) ئاو: بارانیش دەگرێتەوەو، تەرزەش دەگرێتەوەو، بەفریش دەگرێتەوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، ئەوانەی کە لە قورئان لە بیانوونو لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای دەکەن، وە شارەزای زمانی عەرەبییش نین، دەڵێن: ئێستا زانیاریی دەریخستوە کە باران، یاخود تەرزەو بەفر لە ئاسمانێ نایەنە خوار، بەڵکو لە هەور دێنە خوار، بەڵام لە قورئاندا دەڵێ: ﴿ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە خەڵك وایزانیوە، باران و بەفرو تەرزە لە ئاسمانێ دێنە خوارێ، قورئانیش بۆیە وایگوتوە !

دەڵێین: لەڕاستییدا ئەوە هەم نەشارەزاییە لە قورئانو، هەم نە شارەزاییە لە زمانی عەرەبییدا، چونکە: وشەی ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾، لە زمانی عەرەبییدا بەلای کەمەوە، چوار واتای هەن:

## چەمكو واتای وشەی ( سماء )

١/ بە مانای سەقفی سەربان دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ١٥﴾الحج، واتە: هەر کەسێك کە پێی وایە خوا سەری ناخات لە دنیاو لە دواڕۆژدا، با حەبلێك بە سەقفی خانووەکەیەوە بکات، دوایی ملی خۆی پێدا بکاتو خۆی بخنکێنێ، با بزانێ: داخۆ ئەو فێڵو تەگبیرەی کە دەیکات، مایەی ڕق هەڵسانو تووڕەییەکەی لا دەبات ؟! کەواتە (سَمَاء) بە مانای سەقفی خانوو دێ.

٢/ هەروەها (سَمَاء) بە مانای هەور (السَّحاب)یش دێ، وەك لێرەدا دەفەرموێ:

﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، یانی: (مِنَ السَّحاب) واتە: لە هەور.

٣/ هەروەها هەر شتێك لە سەرووی خۆتەوە بێ، پێی دەگوترێ (سَمَاء)، وەك خوای پەروەردگار باسی باڵندان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ٧٩﴾النحل، واتە: ئایا تەماشای باڵندانیان نەکردوە، لە هەوای ئاسمان دا ڕامکراون، بەس خوا ڕایاندەگرێ... .

٤/ هەروەها (سَمَاء) بەو ئاسمانانەش دەگوترێ کە خوای پەروەردگار دروستی کردوون، کە وەك گوتمان: نازانین سنوورەکەیان تاکو کوێیە؟

کەواتـــە لێـــرەدا کـــە دەفـــەرموێ: ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، مەبەســـت پێـــی هـــەورە، یانـــی: (مِنَ السَّحاب)، یـــان مەبەســـت پێـــی: (ســـەروو)یـــە (سَمَاء) واتـــە: ســـەروو (فـــوق) یانـــی: خـــوا لـــە ســـەرووتـــانەوە، ئـــاوی بـــۆ ناردوونـــە خـــوار، ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا﴾، ئنجا ڕووەکی هەموو شتێکمان (واتە: ڕووەکی هەموو شـتێك کە بـڕوێ لـە دانەوێڵـەو ســەوزەو میــوە) پــێ ڕوانــدوە، چەقەرەیەکــی لــێ دەردێنیــن، (خضـر) یـانی (أخضـر) واتــە: چەقـەرەیەکی سـەوز، ئەو چەقـەرەیەی کە دەیـدا.

ئنجا ئەگـەر ئینسـان بیهێنێتـە بەرچاوی خۆی: خـوا ئـاو دەنێـرێ بـۆ زەوی، بەشێوەی باران‌و بـەفرو تـەرزە، تـۆ تەماشـا بکـە ! چـەند پـنج ؟ چـەند گیا ؟ چەنـد سـەوزایی دەڕوێـن ؟ سـەوزایی، چ وەك گـیاو گـوڵ بـێ، چ وەك دانەوێڵـە بـێ، چ وەك دارو درەخت بـێ، هەرچی کە دەڕوێ‌و خـوا ﷻ وایـدانـاوە: بـڕوێ کە لەسـەر زەوی نەبـێ لـە هـیچ شـوێنێکی دیکـە: نـە مـانگ ، نـە مـەریخ، نـە هیـچ شـوێنی دیکە، تا ئێستا نەدۆزراوەتـەوە، شـت بـڕوێ، چونکـە خـۆ ئـەو ڕووانـە، هەروا گـاڵتـە نیـە ! هەم گڵەکە مەرجی خۆی هەیـەو، هـەم ئـاوی پێویسـتەو، هـــەم هـــەوای پێویســتەو، هـەم تیشـکی خـــۆری پێویســـتە، کۆمەڵێـــك هۆکـــاری پێویســتن، دیــارە ئەوە زانـایـانی ڕووەکنـاس‌و زانسـتیی ڕووەکناسـیی، ئێسـتا زۆر شـتی گرنـگ لەوبـوارەدا بـاس دەکـەن.

**دیمەنی ١٢** : ئنجا خـوای زانـاو تـوانا، دیـمەنی دووەم لەم ئایەتداو دوازدەیەمین لـەم دەرســـەدا، دەخـــاتە ڕووو دەفـــەرموێ: ﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾، لێـــرەدا خـــوا ﷻ باســـی دانەوێڵـــە دەکـــات، لـــەو چـەکـــەرە ســـەوزە کـــە پێشـــێ چەکەرەیەکـە، دوایـی ئەو چەکەرەیەش ـ وەك پێشـتـریش باسمکـرد ـ دەبێتـە دووبەش، ئەو دەنکە تۆوە، ئنجا: گەنمە، نیسکە، نۆکـە، جۆیـە، هەرزنـە، برنجـە، یاخود ئـەو نێوکە، ئنجا: نێـوکی خورمایە، قەیسـی یـە، خۆخـە، هەڵووژەیـە، چ دەنـك (حَبّ) بێ، چ نێوك (نـواة) بـێ، وەك پێشـتـر باسـمان کرد: یەکسـەر دەبێتـە دوو بەش: بەشێکی بە زەوی دا ڕۆ دەچێ‌و، بەشێکی بەرەو سەرێ هەڵدەچێ، ئـەو

بەشەی بەرەو زەوی ڕۆ دەچێ: ڕەگو ڕیشەیەو، ئەوەی بەرەو سەرێ هەڵدەچێ: چەکەرەو قەدو لقو پۆپو گەڵایە! یانی: پێچەوانەی یەکدین، ئەو دەنکە تۆوە، یاخود ئەو نێوکە دەبێتە دوو بەش کە دەفلیقێ، وەك کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿اللّهمّ ربَّ السَّماوَاتِ وَرَبَّ الأَرْضِ، وَرَبَّ العَرْشِ العَظِيم، وَرَبَّ كُلِّ شَيء، فَالِقَ الحَبِّ وَالنَّوَى...﴾[1]، واتە: ئەی خوایە! پەروەردگاری ئاسمانەکانو پەروەردگاری زەمین، وە خاوەنی بارەگای مەزن، وە پەروەردگاری هەموو شتێك، فلیقێنەری دەنکی دانەوێڵەکانو، نێوکی درەختەکان.

کە دەفەرموێ: ﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾، (حَبّ) دانەوێڵە، ناوی جینسە تاکەکەی (حبّة)یە، واتە: دەنك، تۆو، (حبّة)ش بە (حبوب) کۆدەکرێتەوەو (حبّ)یش ناوی جینسەکەیەتی، ﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾، چەند دەنکی سواری یەکدی بوو، لە پاڵ یەکدابوو، کەڵەکە بوو: گوڵە جۆو، گوڵە گەنمو، گوڵە هەرزنو، گوڵە گەنمەشامیی، ئەگەر تەماشایان بکەی دەبینی: دەنکەکانیان ڕیز دەبنو هەڵدەچنرێن (مُّتَرَاكِبًا ) ئەوەیە واتە: (يَرْكَبُ بَعْضُهُ بَعْضَاً) هەندێکی لەسەر هەندێکی ڕادەوەستێ، ئەو دیمەنە ئینسان تاکو سەرنجی لێ بدات، هەر کەمە، ئنجا سەیر ئەوەیە کە ئەو گوڵە دانەوێڵانە: گوڵە مەرەزە، گوڵە هەرزنە، گوڵە گەنم، گوڵە جۆ، داسووشیان هەیە حیکمەتی هەبوونی (داسوو)ش ئەوەیە کە تەیرو تواڵ نەیخوات، خوای کاربەجێ لەوێیدا شاردۆتەوە ! با ئینسان هەر تەماشای ئەوە بکات ! چەندە جوانو ڕێك ڕیز دەبن ! ئنجا جاری وایە یەك دەنك دەچێنی، حەوت بنکان دەردەکات، هەر بنکەش چەند گوڵێك دەردەکاتو، هەر گوڵەش چەند دەنکێکی تێدایە، وەك خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٧٠٦٤)، وَأَحْمَد بِرقم: (٨٩٤٧)، وَأَبُو دَاوُد بِرقم: (٥٠٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٤٨١)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٨٣١)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٩٦٦)، وَابْنُ أَبِي شَيْبَة بِرقم: (٢٩٣٤٣).

سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ﴾البقرة، واتە: وێنەی ئەوانەی کە سامانەکانیان لەپێناو خوادا خەرج دەکەن، وەك وێنەی دەنکێك وایە، کە حەوت گوڵان دەڕوێنێ، هەر گوڵێك سەد دەنکی تێدایە، وە خوا بۆ هەرکەسێك بیەوێ، پاداشت چەند قات دەکاتەوە، وە خوا سیفەت فراوانی زانایە.

وە هەندێك لە زانایان دەڵێن: جارێ وایە دانەوێڵە یەك بە حەوت سەد دەبڕێ، بەهەر حاڵ شتێکی زۆر سەیرە، ئەو هەموو بەرەکەتە، خوای بەخشەر دەیخاتە ئەو دەنکە تۆیەوە، کە بۆخۆی لەبەین دەچێ، بەڵام دوایی دەبێتە دنیایەك دەنکی دیکە.

**دیمەنی ١٣** : ئنجا خوا لە دیمەنی سێیەمی ئەم ئایەتەو، سێزدەیەم لە ڕیزبەندیی کۆی پێنج ئایەتەکەی ئەم دەرسەدا، دێتە سەر باسی درەختو میوەجات، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ ﴾، وە لە دارخورما لە کیفەکەیدا هێشووی شۆڕبووەوە هەیە، (طلع) ئێمە لە کوردییدا تەرجەمەی ئەو وشەیەمان نیە، چونکە لە کوردستان دا دارخورما نەبووە، مەگەر لەمەودوا بۆ وشەی (طلع) وشەیەکی کوردیی داتاشین، من هەر بە (هەگبە)و بە (کیف)م لێکداوەتەوە، چونکە (طلع) بریتییە لەو توورەگەو کیفەی کە هێشووە خورمایەکە دوایی لێی دێتەدەرێ، ئنجا پێش ئەوەی لێی بێتەدەرێ، پێی دەڵێن: (طلع)، دوایی دەیقڵێشێنێ‌و لێی دێتەدەرێ، سەرەتا هێشووە خورمایەکی بچووکە، دوایی کە لێی دێتەدەرێو گەورە دەبێ، ئەو کیفە پێی دەگوترێ: (طلع)، خوا دەفەرموێ: وە لە دارخورما لە (طلع)ەکەیدا، هێشوو (قنوان) هەن، (قنوان)یش کۆی (قنو)یە، واتە: هێشوو، هێشووی خورما، وە (دانیة) واتە: (قریبة)، نزیك، یانی: ئەو هێشووە خورمایانە، دوایی وردە وردە شۆڕدەبنەوە، لەبەرئەوەی قورسن، چەند سەیرو چەند جێی سەرنجە ! ئەو دەنکە دەڕوێو ئەو نەمامە خورمایە سەوز دەبێ‌و، بەرز

دەبێتەوە ! ئنجا ئەو خورما تەڕو تازەیە، بەتایبەتیی بە فەریکیی (رطب)یی چەند خۆشە ! پڕە لە شیلەو تاموچێژ، کە لەو زەوییە سەختو پتەووەوە دێ‌و، بەو بنکە دارخورمایە ڕەقەدا دەڕواتو، سەرەنجام خورمایەکان پێکدێنێ[1] !.

**دیمەنی ١٤** : ئنجا خوا ﷻ دیمەنی چواردەمین لەم ئایەتەداو، چواردەمین لەم دەرسەدا پێشان دەداتو، دەفەرموێ: ﴿ وَجَنَّٰتٍ مِّنۡ أَعۡنَابٍ ﴾ وە چەند باغێك لە ترییەکان: (أعناب) کۆی (عِنَب)ە، واتە: ترێ، (جنات) کۆی (جنة)یە، واتە: چەند باغێك لە ترێ، ئەوانەی کە ڕەزەوانن دەزانن، چەندان جۆرە ترێ هەن: ترێی سپی هەیە، ترێی سوور هەیە، ترێی ڕەش هەیە، هەرکام لە ترێی سپی‌و سوورو ڕەش، چەندان جۆریان هەن، هەروەها ترێی بێ دەنك‌و نێوك هەیە، ترێی کشمیشیی هەیە، هەرکامێکیان تاموچێژێکی تایبەتی هەیە.

بێگومان (ترێ)ش وەك خورما، دەیان‌و بگرە سەدان جۆری هەیە.

**دیمەنی ١٥** : ئنجا خوا دیمەنی پێنجەم لەم ئایەتەداو پازەدەیەم ـ لەم دەرسەدا ـ پێشان دەداو دەفەرموێ: ﴿ وَٱلزَّيۡتُونَ ﴾، دیارە (زیتون)یش بەهەمان شێوە ئێمە هەر دووك جۆر زەیتوون دەبینین، یاخود سێ جۆر زەیتوونی سەوز، زەیتوونی ڕەش، زەیتوونی قاوەیی، هەرچەندە زەیتوونی ڕەشیش هەر زەیتوونی سەوزو قاوەیی یەو ڕەنگەکەیان گۆڕیوە، بەلاّم بەهەر حاڵ دیارە لەویش چەندان جۆر هەن، کە هەر جۆرەی کۆمەڵێك ئیمتازو جیاکەرەوەی هەن، لەگەڵ ئەوانی دیکە، یانی: خوای پەروەردگار کە ئەو شتانەی جۆراو جۆر کردوون، ئەوە نیە بەخۆڕایی بێ، جۆرەکانی خورما هەر جۆرەی ئیمتیازێکی هەیە بەسەر ئەویدیکەدا، هەروەها جۆرەکانی ترێ‌و مێوەکانی دیکەش هەروا.

**دیمەنی ١٦** : ئنجا خوا ﷻ دیمەنی شەشەم لەم ئایەتەداو شازدەیەم‌و کۆتایی لەم دەرسەدا کە ـ پێنج ئایەت دەگرێتە خۆی ـ دەخاتەڕوو: ﴿ وَٱلرُّمَّانَ

---

١) شارەزایانی (خورما) دەڵێن: دەیان‌و بگرە سەدان جۆرە دارخورما هەن.

مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ﴾، واتە: وە هەناریش وێکچوو (لە دیمەنو ڕواڵەتدا)و وێکنەچوو (لە تامو چێژدا). کوردستان ماشاء الله هەناری زۆرە، هەنارو ترێمان زۆرە، ئەگەر خورماو زەیتوونیشمان نەبێ، هەناری شیرین، هەناری ترش، هەناری مێخۆش، هەر لە مێخۆشیشدا چەندان جۆری هەیە، هەنار ئەگەر لێی وردبیەوە زۆر جێی سەرنجە!

خوای پەروەردگاریش بەگشتی بۆ سەرنجدانی خواردن، دەفەرموێ:

﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: با ئینسان تەماشای خواردنی خۆی بکات، هی وا هەیە ڕەنگە یەك بەرچنە هەنار بخوات، بەڵام لە هەنارێکیان ورد نەبێتەوە، کە خوا چۆنی دروست کردوە؟ بەڵام خوا دەفەرموێ: لێی ورد ببنەوە، دیارە خۆراکەکە، دەچێتە نێو گەدەت، بەڵام لێوردبوونەوەکە دەچێتە عەقڵو دڵت، تۆ کە خواردن دەخۆی، تەنیا هەقی گەدەت مەدە، هەقی عەقڵو دڵیشت بدە، لێشی وردبەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ ﴾ عبس، دیارە هەنار لە دەرەوەی توێکڵێکی ڕەقی هەیە، کە ئەوە بەرگەکەیەتی، ئنجا دوایی توێکڵێکی تەنك هەیە بەسەر دەنکەکاندا هاتوە، ئنجا لە نێوان دەنکەکان دا گۆشت هەیەو خانە خانەی کردوە، ئنجا ئەو دەنکانە چەند بە جوانییو بە ڕێکیی ڕیزبوونو، خوای زاناو توانا، بەهۆی ئەو دیوارو پەردانەوە پاراستوونی، ئەگەرنا هەر تۆزێك گوشاریان بێتە سەرو بگوشرێن، دەفلیقێنەوەو دەبنە ئاو !

ئنجا خوا بۆ هەموو ئەوانە واتە: خورماو ترێو زەیتوونو هەنار... دەفەرموێ: ﴿ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ﴾، وێکچوو وێك نەچوو، هەندێکیان وێکدەچن، وە هەندێکیشیان وێك ناچن، ئنجا چ مەبەست لە تام بێ، چ

مەبەست لە دیمەن بێ، یان: لە دیمەنو ڕواڵەت دا پێك دەچن‌و، لە تامو چێژدا پێك ناچن.

خوا سەرنجمان ڕادەكێشێ‌و دەفەرموێ: ﴿ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓ﴾

واتە: سەرنجی میوەكەی بدەن، كاتێك كە بەر دەردەكات (وَيَنۡعِهِۦٓ) وە كاتێك كە پێدەگات، یانی: سەرنجی سەرەتاو كۆتایی یەكەی بدەن، ئەو دوو حاڵەتە: كاتێك كە گوڵ دەردەكات، یاخود تازە دەبێتە بەرسیلە، یان هەر دەرختێك كە میوەكەی تازە بەردەگرێ، (وَيَنۡعِهِۦٓ) واتە: كاتێك پێدەگات، بەرسیلە، چەند تاڵ‌و تفتە! دوایی كە دەبێتە ترێیەكی شیرین‌و خۆش، چەند فەرقیان هەیە، كێ بەو قۆناغانەدا تێی دەپەڕێنێ ؟

هەروەها خورما بەهەمان شێوە.

وە هەنجیر كە پێشێ پێی دەڵێن: باقوو، كە تازە پەیدا دەبێ ناسكە، بەڵام هیچ تامێكی وای نیە، دوایی دەبێتە هەنجیرێكی پڕ بە چەنگ، هەروەها هەنار...هتد هەركام لەوانە سەرنجی سەرەتاییەكەیان بدەن‌و، سەرنجی كاتی پێگەیشتنیشیان بدەن، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾، لە مانەتاندا نیشانە هەن، بۆ كۆمەڵێك كە ئیمان بێنن، یانی: چی؟ یانی:

١ - ئەگەر سەرنجی كەون‌و كائینات‌و ئەستێرەكان بدەی، دەبێ زانیارییت هەبێ.

٢ - ئەگەر سەرنجی خۆت بدەی، دەبێ شارەزایی (فیقە)ت هەبێ.

٣ - بەڵام بۆ سەرنجدان لە میوەجات‌و دانەوێڵە، هەر تۆزێك ئیمانت هەبێ، زۆرت پێویست بە زانیاریی‌و شارەزایی ناكات، هەر ئیمانت هەبێ، دەزانی كە چ كەریمێكی كارساز، چ خوایەكی بەخشندە، ئەو سفرەیەی لەم سەرزەمینەدا بۆ ڕازاندوویەوە: بە دانەوێڵەوە، بە میوەجاتەوەو بە هەموو ئەو پێداویستییانەوە كە ژیانمان پێویستیی پێیانە.

**مەسەلەی شەشەم:** ئنجا دواى ئەوانە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هاوبەشدانەرەکان: لە جندان هاوبەشیان بۆ خوا دانان، لە حاڵێك دا کە دروستیشی کردوون.

وەك لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴿١١﴾ ﴾لقمان، واتە: ئەمە دروستکراوی خوایە، پێشانم بدەن ئەوانەی لەجیاتی خوا دەیانپەرستن، (یان لەگەڵ خوادا بەندایەتییان بۆ دەکەن) چییان دروست کردوە؟ پەڕە مریشکێك، دەنکە لمێك، گوڵە گەنمێك، بەڵکو داسووی گوڵە گەنمێك، چییان دروست کردوە؟ هیچ !! بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡ ﴾، ئەوانە هاوبەشە جندەکانیان بۆ خوا بۆ پەیدا کردن، لە حاڵێك دا کە هەر خواش دروستی کردوون، یانی جندەکانیش خوا دروستی کردوونو ئادەمیزادەکانیش هەر ئەو دروستی کردوون، کەچی هەندێ لە دروستکراوەکانیان کردن بە هاوبەشی خوا، ﴿ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، وە بە بێ زانیاریی کوڕانو کچانیان بۆ خوا هەڵبەستن، پاکییو بەرزیی بۆ خوا، لەوەی کە ئەوانە خوای پێ وەسف دەکەن.

لێرەدا با تۆزێ سەرنج بدەین ! کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡ ﴾، واتە: وە جندەکانیان بۆ خوا بە هاوبەش گێڕان، مەبەست پێی ئەوەیە، یانی: (وجعلوا لله الجن شركاء) بەڵام خوا (شُرَكَاء)ی پێشخستوە، چونکە ئەوەی کە خوا دەیەوێ، سەرنجی ئێمەی زیاتر بۆ لا ڕابکێشێ، هاوبەش بۆ خوا دانانەکەیە، نەك داخۆ ئەوە جندن، یان ئینسانن.

ئنجا هەر كەسێك شارەزای ڕەوانبێژیی قورئانو شارەزای وردەكاریی زمانی عەرەبیی نەبێ، پێی سەیرەو دەڵێ: دەبوو فەرمووبای: (وجعلوا لله الجن شركاء) ئنجا ئایا مەبەست لەوە چییە؟ ئەوە لە شوێنی دیكەشدا لە قورئاندا هاتووە، قورئانیش هەندێكی هەندێكی تەفسیر دەكات، هەمیشە ئەگەر بتەوێ لە ڕستەیەكی قورئان تێبگەیو، ماناكەشی بۆت ڕۆشن نەبێ، بگەڕێ لەو بابەتەوە: چ ڕستەی دیكە، چ ئایەتی دیكە، هاتوون؟ ئەگەر هەبوون بەراوردیان بكە، ئەوە مانایەكەی زۆر ڕۆشن دەبێتەوە، بۆ نموونە: ئێستا لێرەدا، ئایا مەبەست لەوە چییە كە خوا دەفەرموێ: هاوبەشانی جندیان بۆ خوا دانان؟ با تەماشای سووڕەتی (الصافات) بكەین، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: وە لەنێوان جندو خوادا، ڕەچەڵەكیان دانا، (جندەكانیان بە ڕەچەڵەك بردنەوە سەر خوا، كە گوتیان: شەیتانەكان كوڕانی خوان) جندەكان باش دەزانن، چۆن ئامادە دەكرێن لە ڕۆژی قیامەتدا، (وەك چۆن مرۆڤەكان ئامادە دەكرێن بۆ لێپرسینەوە، ئەوانیش دەزانن ئامادە دەكرێن، ئنجا ئەگەر كوڕانی خوابن، چۆن لێیان دەپرسێتەوەو سزایان دەدا ؟) پاكیی بۆ خوا لەوەی كە ئەوان خوای پێ وەسف دەكەن، (هەموویان كۆ دەكرێنەوە) جگە لە بەندە ساغ بووەوەكان بۆ خوا. {یانی: ئەوانە ئامادە ناكرێن بۆ سزادانو، ئامادە ناكرێن بۆ سەرزەنشت كران}.

ئنجا دوایی كە دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَـٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، وە بەبێ زانیاریی كوڕانو كچانیان بۆ هەڵبەستن.

(خَرَقُوا) كە خوێندراویشەتەوە (خَرَّقُوا)، دەڵێ: (خَرْق) بریتییە لە تێكدانی شتێك بە شێوەیەكی ناڕێك، بۆ وێنە: ئەگەر پەڕۆیەك، كاغەزێك بدڕێنی بە ناڕێكو پێكیی، دەگوترێ: (خَرَقَهُ، خَرَّقه)، (خَلق)یش بە پێچەوانەوە: بریتییە لەوەی كە شتێك بە ڕێكو پێكیی دروست بكەی، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُوا۟

﴿لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ﴾ زۆربەی زانایان دەڵێن: هاوبەشدانەرەکان دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕی خوانو فریشتەکانیش کچی خوان، ئایا لە کوێ خوای پەروەردگار ئەوەمان بۆ باس دەکات؟ لە سوورەتی (الزخرف) لە ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ١٩﴾، واتە: وە ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای خاوەن بەزەییین، بە مێینەیان لەقەڵەم دان ! ئایا لە کاتی دروستکرانیاندا ئامادەبوون تاکو بزانن: فریشتە نێرن، یان مێن؟ لە کاتێکدا کە ڕەگەز (جنس)یان نیە، نێرایەتیی‌و مێیایەتییان نیە، چونکە فریشتە زاووزێ ناکەن، فریشتە چەندن هەر ئەوەندەن، بەڵام مرۆڤ و جند زاووزێ دەکەن‌و زۆر دەبن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ١٩﴾، ئەو شایەدییدانەیان کە بە درۆ دەیدەن، دەنووسرێ، وە لێشیان دەپرسرێتەوە، کەواتە: ﴿وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبٗا... ١٥٨﴾الصافات، واتە: شەیتانەکانیان کردنە کوڕی خوا، وە لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًا... ١٩﴾، ئەو فریشتانەی بەندەی خوان، کردوویانن بە مێینە(و دەڵێن: کچی خوان) ! کە هەموو ئەوانە بیرۆکەی ئەفسانەییی‌و بێ بەڵگەن.

بەڵێ جند مێینەو نێرینەیان لەنێودا هەیەو، زاووزێشیان لەنێودا هەیە، بەڵام فریشتە ڕەگەزیان نیە، هەڵبەتە جگە لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، جوولەکەو نەصرانییەکان، وە مەجووسییەکان‌و ئێزیدییەکانیش، وەبەر ئەو حوکمە دەکەون، وەك خوا لەسەر زاریان دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِ... ٣٠﴾التوبة، واتە: جوولەکەکان گوتیان: عوزەیر کوڕی خوایەو، نەصرانییەکانیش، گوتیان: مەسیح کوڕی خوایە.

خـوا ﷻ لەبارەی هـۆكارو سەرچاوەی ئەو بیرۆكـەوە، دەفەرموێ: ﴿يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ ۚ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾﴾ التوبـة، لاسـایی قسـەی ئەوانـەی پـێش خۆیـان دەكەنـەوە (هاوبەشـدانەرەكان یـان هیندۆسـەكان)، خـوا بیـانكوژێ، بـەرەو كـوێ لا دەدرێـن! دیـارە مەجووسـییەكانیش بڕوایـان بـە دوو پەروەردگـاران هـەیە: یـەزدانو ئەهریمـەن، هەروەهـا ئێـزیدییەكانیش بڕوایـان بـە دووان هـەیە، دەڵێـن: خـواو مەلـەك طـاووس، دیـارە یەزیدییـەكان بـە پێـی لێكـۆڵینـەوە مێـژووییەكـان وەك (إبـن تيمیـة)و زانایـانی دیكـەش باسـی دەكـەن، كۆمەڵێـك بـوون لـە مسـوڵمانانو شـوێنكـەوتووی (عَـدي بـن مسـافر) بـوون، كـە زانایـەكی بـاش بـووە لـە وڵاتـی جەزیـرەو شـام، بـەڵام دوایـی تێپـەڕاندنیان كـردوە لـە خۆشویسـتنـی (یەزیـدی كـوڕی موعاویـە)دا، كـە شایسـتەی ئـەوە نیـە خۆشـبویسـتـرێ، لەبەرئـەوەی كـەتنو خراپـەی زۆری كـردوە، وە یەزیـدییەكان بە پێچـەوانەوە: دژایەتیـی (حسـین بن علـي)یـان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، كـردوە، بۆیـە پێیـان گـوتراوە: یەزیـدیی، بـەڵام ئـەوان دەڵێن: ئێمـە یەزیـدیی نـین، بەڵكو ئێـمە (ئێـزەدیی)ین، خـواش پێی گوتـراوە: (ئێـزەد)، یـان یـەزدان، وە دەڵێن: دینـی ئێمـە لە پێش ئیسلامیشدا هـەبووە !!

بـەڵام ئـەوە زۆر دوورە لـە ڕاسـتییو وانیـە، بەڵگـەش لـەوبارەوە زۆرن، یەكیـان ئەوەیـە كـە ئێسـتاش زۆر ڕەفتـاریـان وەك هـی مسـوڵمانانن، ئنجـا ئـەو (مەلـەك طـاووس)ەش لەڕاسـتییدا هەر ئەو ئیبلیسـەیە، كە لـە قورئانـدا خـوا باسـی كـردوە، ئنجا ئەگەر لە یەزیدییەكان بپرسـی: چی بۆ تەقدیسی (مەلـەك طاووس) دەكەن؟ ئـەوان ناڵێـن: (مەلـەك طـاووس) هیچـی دروسـت كـردوە، هـەر دەڵێن: هـەر خـوا بەدیهێنـەرە، ئـەدی ئایا بۆچی (مەلەك طاووس) بە پیـرۆز دەگـرن؟

دەڵێن : لەبەرئەوەی كە ئەگەر بێتو بـە پیـرۆزی نەگریـن، زیـانمان لێـدەدات، بـەڵام خـوا بـە بەزەیـیو میـهرەبانەو، ئەگـەر نەشـیپەرستین، زیـانمان لـێ نـادات، بەڵام (مەلـەك طـاووس) دەبـێ شـتێكی وابكەیـن ڕازی بكەیـن، ئەگـەرنا شـەڕی لەدەسـت دێ !!

وه لـەوبارەوە ئـەم دەقـە لـە (إبـن عبـاس)ەوە گێڕدراوەتـەوە، کـە دوایـیش ئیمـام (فخرالـدین الـرازي) لـە تەفسیـرەکەی خۆیـدا شـەرحێکی لەسـەر دەکات: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالى عَنْهُمَا أَنَّهُ قَالَ: قَوْله تَعَالـى: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ ﴾، نَزَلَـتْ فِـي الزَّنَادِقَـة الَّـذِينَ قَـالُوا: إِنَّ اللّٰه وَإِبْلِيس أَخـوان، فَـاللّٰه تَعَـالى خَـالِق النَّـاسِ، وَالـدَّوَابِ، وَالأَنْعَـامِ، وَالحَيْـوَانِ، وَإِبْلِـيس خَـالِق السِّـبَاعِ، وَالحَيَـاتِ، وَالعَقَـارِب وَالشُّرُورِ﴾[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوای بەرز لێیان ڕازی بێ، لەبـارەی قسـەی خـوای بـەرزەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ ﴾، هاوبەشـی جنديان بۆ خوا بڕیار دان، دەڵێ: دەربارەی زەندیقەکان هاتۆتە خـوارێ، کـە گوتیـان: خواو ئیبلیس بران، خوای بەرز بەدیهێنەری خەڵك و ئاژەڵ و زیندەوەرو چاکەو، هەموو شتێکی باشە، ئیبلیسیش بەدیهێنەری دڕندەو مارو دووپشك و خراپەکارییەکانە !

ئنجا ئیمـام (فخرالـدین الرازي) دەڵـێ: (وَإِنَّمَا قَالَ إِبْنُ عَبَّاس هَذَا قَوْل الزَّنَادِقَـة، لأَنَّ الـمَجُوس يُلَقَّبـون بـالزَّنَادِقَـة، لأَنَّ الكِتَـاب الَّذِي زَعَـم زَرَادَشـت أَنَّـهُ نـزل عَلَيْـه مِـنْ عِنْدِ اللّٰه، مُسَمّى بـالزَّنْد والـمَنْسُوب إِلَيْهِ يُسَمَّى زَنْدِي، ثُمَّ عُرِّبَ فقيـل: زَنْـدِيق. ثُمَّ جمع فقيل زَنَـادِقَة، وَاعْلَم أَنَّ الـمجُوس قَالُوا: كُلّ مَا فِي هَذَا العَالَم مِنَ الخَيْرَاتِ فَهُوَ مِن يَـزْدَان، وَجَمِيع مَا فيهِ مِنَ الشُّرور، فَهُوَ مِنْ أَهْـرمَن، وَهُوَ الـمُسَـمَّى بِإِبْلِيس فِي شَـرْعِنا)[2]، واتە: بۆیـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس دەڵـێ: ئـەم قسەیە قسەی زەندیقەکانە، چونکە مەجووسییەکان بۆیە پێیان دەگوترێ: زندیقەکان، چـونکە ئـەو کتێبـەی کـە زەرادەشـت پێیـوابوو لەلایـەن خـواوە بـۆی دابـەزێنراوە، نـاوی (زەنـد)ە، ﴿هەڵبەتـە (ئاڤێسـتا)شی پـێ دەڵـێن، (زەنـد) یـان مەتنەکـەیەتی، یاخـود (زەنـد) شـەرحی ئاڤێستایە﴾، کە ئەوەی کـە پـاڵ بدرێتـە لای کـتێبـی زەنـد، پێـی دەگـوترێ: زەندیی، دوایی کە کراوە بە عەرەبیی، کـراوە بە زەندیق، لە کۆیەکەشـیدا گوتوویـانە: (زنادقـة) زەنـدیقـەکان، وە ئاگـاداربە ! کـە مەجووسـییەکان دەڵـێن: هەرچـی لـەم دنیایەدایە لە چاکەکـان، ئـەوە لـە یـەزدانەوەیە، وە هەرچـی خراپەشـی تێدایـە، لـە ئەهریمەنەوەیە، کە لە شەریعەتی ئێمەدا (إبلیس)ی پێ دەگوتـرێ.

---

١) (التفسير الكبير: ج٧، ص٩٣).

٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ و لاپەڕە.

هەڵبەتە تەنیا خوا ﷻ بەدیهێنەرە، بەڵام ئەوانە، لەبەرئەوەی ئیبلیس دووری خراپی بووە، وە شوێن وەحییو دینی خواش نەکەوتوون، گوتوویانە: با ئێمە ئیشێکی وابکەین لەو ئیبلیسە وەنزیك بکەوین.

وەك یەزیدییەکان دەڵێن، بۆئەوەی لە شەڕو خراپەی مەلەك طاووس بەدوور بین، دەبێ بەقسەی بکەین ! کە لەڕاستییدا بۆئەوەی لە شەڕو خراپەی ئیبلیس دوور بی، پێویست ناکات خۆتی لێوە نزیك بخەی‌و، تەمەللوقی بۆ بکەی، وە بەندایەتیی بۆ بکەی، بەڵکو لە خوا نزیك بە، ئیبلیسیش دەستەڵاتی بەسەرتدا نابێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾الحجر، واتە: بەندەکانی من تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە، مەگەر ئەوانەی لە سەرلێشێواوەکان شوێنت بکەون.

**مەسەلەی حەوتەم:** خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَـٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، لە مەسەلەی پێشوودا باسمان کرد، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، جندەکانیان کردە هاوبەش بۆ خوا ﷻ ئەویش بەو ووردەکارییەی باسمان کرد، وە کوڕو کچیان بۆ خوا بڕیاردان.

ئنجا لە بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو قسانەدا ـ کە هەموویان شتی بێ بنەماو بێ بەڵگەن ـ خوای باڵادەست بە شەش سیفەت خۆی پێناسە دەکات:

## پێناسەکردنی خوا بە شەش سیفەت :

١/ **سیفەتی یەکەم** : دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، وشەی (بَدِيعُ) لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (بَدِيعُ: هو مبدع الشيء على غير مثال سابق)[1]، (بَدِيعُ) يان (مُبْدِعُ) بە کەسێك دەگوترێ:

---

١) مختار الصّحاح ، ص: ٥١ .

شتێك پەیدا بكات، بێئەوەی كە چاولێكەریی كردبێ، بۆ وێنەیەكی دیكە، لەپێش خۆیەوە، واتە: شتێك پەیدابكات كە وێنەی نەبووبێ، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، پەیداكەرو بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوییە.

٢/ **سیفەتی دووەم** : كە خوا پێناسەی خۆی پێ دەكات دەفەرموێ: ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ﴾، چۆن ڕۆڵەی پەیدا دەبێ، وشەی: (أَنَّى) هەم بە مانای چۆن؟ دێ، وە هەم بە مانای لە كوێ؟ دێ، (من أين، كيف) واتە: چۆنو لە چ ڕوویێكەوە خوا ڕۆڵەی پەیدا دەبێ؟ ﴿ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ﴾، كە هاوسەری نەبووە، دیارە ڕۆڵە لە ئەنجامی پێكگەیشتنی دایكو باوان دا پەیدا دەبێ، وەختێ خوا ﷻ بێ وێنەو بێ هاوتا بێو بێ هاوسەربێ، وە هیچ شتێك وەك وی نەبێ، چۆن ڕۆڵەی لێ پەیدا دەبێ ؟ چۆن كوڕو كچی دەبن ؟ كەواتە: ئەمە قسەیەكی پووچو بێ بنەمایە.

٣/ **سیفەتی سێیەم**: كە خوا خۆی پێ وەسف دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ ﴾، هەموو شتێكی بەدیهێناوە، واتە: هەموو شتێك جگە خوا، بەدیهێنراوی خوایە، كەواتە: ناگونجێ هەندێ لە دروستكراوەكان، ڕۆڵەی خوا بن، بەڵكو هەموویان پەیداكراوو دروستكراوی خوان، وە لەیەك ئاستیش دان، تەنیا خوا خۆی بەدیهێنەرەو، جگە لە خۆی هەمووی بەدیهێنراو و پەیداكراو دروستكراوە.

٤/ **سیفەتی چوارەم** : كە خوا خۆی پێ وەسف دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە، واتە: خوا هەموو شتێك دەزانێ، وە لەنێو شتەكاندا: خوا ﷻ نەیزانیوە كە هاوبەشێكی هەبێ، یانی: زانیاریی خوا پەیوەست نەبووە بە شتێكەوە، بە سیفەتو ناوونیشانی: هاوبەش بۆ خوا، كەواتە: هاوبەشی خوا؛ بوونی نیە، ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا

بە هەموو شتێك زانایەو هەموو ئەو شتانەی خوا دەیانزانێ، هاوبەشی خوایان تێدا نیە، وە ڕۆڵەو کوڕو کچیان بۆ خوای پەروەردگار، تێدا نیە.

ئەوە هەمووی بەرپەرچدانەوەی قسەکانی پێشێیان بوو.

کەواتە: ئەوە کە: خوا ﷻ کوڕو کچی هەبن! هاوبەشی هەبن! وێنەی هەبێو هاوتای هەبێ، هەمووی تەنیا قسەو تۆمەتێکە، وە هیچ بنەمایەکی نیە.

**مەسەلەی هەشتەم:** دیسان خوای بێ وێنە، لەسەر پێناسەکردنی خۆی زیاتر بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾، ﴿ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ ﴾ ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە، واتە: ئەو خوایەی ﷻ کە لە ئایەتی پێشوودا وەسفکرا، کە فەرمووی: ﴿ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگاری ئێوەیە، وشەی (ربّ)ش کە ئێمە لە کوردییدا دەڵێین پەروەردگار، مانای خاوەنیش دەگەیەنێ، وە مانای سەرپەرشتیاریش دەگەیەنێ، وە مانای مشوورخۆریش دەگەیەنێو مانای پەرستراویش دەگەیەنێ[1]، ئەو خوایە: خاوەنی ئێوەیەو پەرستراوی ئێوەیە.

٥/ **سیفەتی پێنجەم** : کە خوا لێرەدا خۆییان پێ پێناسە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، جاری دیکەش باسم کردوە: زۆر جار هەندێ لە مامۆستایەکان، وە هەندێ لە بانگخوازەکان، کە قسە دەکەن (لا إِلَهَ إلاَّ اللّه) یان ﴿ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئاوا تەفسیر دەکەن، دەڵێن: بێجگە لە خوا، هیچ خوانین، ﴿ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، بێجگە لەو، هیچ خوای دیکە نین، کە بێگومان

١) المعجم الوسيط، ص: ٣٦١.

ئەوە هەڵەیە، چونکە (إِلَـه) لەگەڵ (اللّه) لێك جیان، (اللّه) ناوی ناساندن (إسم عَلَم)ی خوایە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ ١١٠ ﴾الإسراء، بەڵام (إِلَـه) بە مانای پەرستراو (مَعْبُود)ە[1]، کەواتە: (لا إِلَـهَ إِلاّ اللّه) واتە: بێجگە لە خوا، هیچ پەرستراو نین، چونکە خوا ﷻ نەیویستوە، ئیسپاتی ئەوە بکات کە تەنیا خۆی خوایە، بەڵکو ویستوویەتی ئیسپاتی ئەوە بکات، کە تەنیا خۆی پەرستراوە، بۆچی؟ چونکە کێشە لەسەر ئەوە نەبووە، کە کافرەکان غەیری خوا، بە خوا بزانن، کە وەك گوتم ئەوە زۆر لە بانگخوازو مەلایەکانیش لەو مەسەلەیەدا بەهەڵەدا چوون ! بەڵکو کێشە لەسەر ئەوە بووە، کە کافرەکانو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، جگە لە خوایان پەرستوەو، جگە لە خوایان بە پەرستراو (إِلَـه) زانیوە.

هەر بۆیەش وشەی (اللّه) لە زمانی عەرەبییدا نە دووان (تثنیة) دەکرێ، نە کۆ (جمع) دەکرێ، بەڵام (إِلَـه، إِلَـهَیْن، إِلَـهَان، آلِهَة) (تثنیة)و (جمع)یش دەکرێ، دەکرێ بە دووانو بە کۆش دەکرێ، بۆچی؟ چونکە (لا إِلَهَ إِلاّ اللّه) یانی: (لا إِلَهَ بحَقّ إِلاّ اللّه) واتە: (إِلَه)ی هەقو پەرستراوی ڕاست، تەنیا خوایە، بەڵام پەرستراوی دیکەش، کە ناهەقو ناڕاستن، هەن: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ ٢٤ ﴾الأنبياء، ﴿ أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلۡمٖ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمۡعِهِۦ وَقَلۡبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةٗ فَمَن يَهۡدِيهِ مِنۢ بَعۡدِ ٱللَّهِۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ٢٣ ﴾الجاثية ، کەواتە: یەك تاکە (إِلَه)ی هەق هەیەو، چەندان (إِلَه)ی ناهەقیش هەن، یانی: چەند کەسێكو چەند شتێك هەن، کە بە ناهەق دەپەرسترێن.

بەڵێ ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە بزانین: مانای: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، یانی: بێجگە لە خوا ﷻ هیچ کەس پەرستراوێك نییە، نەك هیچ خوایەکی دیکە

---

١) مختار الصّحاح ، ص: ٣٣ ، ٣٤.

نیە، چونکە کاتێ خۆیشیو ئێستاش کێشە لەسەر ئەوە نەبووەو نیە کە لە (خوا) بەولاوە، هیچ (خوا)و بەدیهێنەرو پەروەردگارێکی دیکە هەبێ، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الزخرف، واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی: کێ دروستی کردوون؟ دەڵێن: خوا.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾الزخرف، واتە: ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوون؟ دەڵێن (خوا)ی زاڵی زانا دروستی کردوون. بەڵێ کێشە ئەوە نەبووە کە تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، بەڵکو وەك گوتراوە: {هەر خوا خوایە، ئەوی دیکە هەمووی کاوبایە}، بەڵام کێشە لەسەر ئەوە بووە، کە لەگەڵ ئەو پەرستراوە هەقەدا، شتانی دیکەش بپەرسترێنو، بەندایەتییان بۆ بکرێ، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الزمر)دا لەسەر زاری کافرەکان دەفەرموێ: ﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ واتە: ئێمە نایانپەرستین، مەگەر بۆئەوەی لە خوامان نزیك بخەنەوە.

ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ ﴾، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، تەنیا ئەو بپەرستن. واتە: هەرچی هەیە، خوا بەدیهێنەریەتی، ئەدی بۆخۆی؟ بۆخۆی بەدیهێنەرە، ئەوانی دیکە جگە لە خوا هەموویان بەدیهێنراون، کە لە مەسەلەی نۆیەمدا تۆزێك لەوبارەوە قسە دەکەم.

٦/ **سیفەتی شەشەم** : لە کۆتایی ئایەتەکەدا سیفەتی شەشەم، بۆ پێناسەی خۆی لەم ئایەتانەدا دەخاتەڕووو دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾، وە خوا بەسەر هەموو شتێکەوە وەکیلە، وەکیل کەسێکە یەکێکی دیکە ئیشی خۆی عایدی ئەو کردبێو، ڕاسپێردرابێ لەجیاتی کەسێك ئیشێك بکات[1]، واتە: خوا ﷻ سەرپەرشتیارو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە.

١) مفردات ألفاظ القرآن ، ص: ٨٨٢.

**مەسـەلـەی نۆیـەم:**

# باسێک لە بارەی بەدیهێنەرایەتیی خواوە سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى

لێـرەدا خــوای پــەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُ﴾، هـەروەها لـە سـوورەتی (الزمـر)دا دەفـەرموێ: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢﴾، واتـە: بڵـێ: خــوا بەدیهێنــەری هــەموو شــتێکە، وە ئــەو بەسـەر هەموو شـتێکـەوە سـەرپەرشـتیارو چاودێـرە.

وە لـە سـوورەتی (الـرعـد)یشـدا دەفـەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ ١٦﴾، واتــە: بڵــێ خــوا بەدیهێنــەری هــەموو شــتێکە، وە ئــەو تاکــی ملـپێکـەچکەرە.

ئنجا لێـرەدا دەپرسـین: ئـایـا بەڵـگە چیـە لەسـەر ئـەوە، کـە خـوا بەدیهێنـەری هـەموو شـتێکـە؟

دیارە من لە کتێبەکانی خۆمدا: لە کتێبی (خواناسیی، ئایین، ئیمان)دا، وە لە بەرگی دووەمی کتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا، هەروەها لە بەرگی یەکەمی کتێبی: (الإِسْلام كَمَا يَتَجَلّى فِي كتاب الله عزّ وجل) بە تەفصیلێ باسی بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتـیی خـوام کردوە، بەڵام لێـرەدا لەقـەدەر ئـەم دەرسـە دەتـوانین بڵێین: سـێ بەڵـگەمان هـەن، لەسەر ئەوە کە: خـوا تاکە بەدیهێنـەرو پـەروەردگارو خـاوەنـی ئـەم بوونـەوەرەیـەو، ئێمـە لێـرەدا بە کورتیـی‌و گوشـراویی دەیانخـەینـە ڕوو:

## بەڵـگـەی یەکـەم: خـواڕسـك ( فطـري ) بوونی خواناسـیی:

ئینسـان لـە دەروونـەوە بـۆ خــوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى تینـوویـە، ئنجـا تەماشـا بکـەن ! ئینسـان تینـووی دەبـێ‌و، تیـنوو بـوونی مـرۆڤ، بەڵـگـەیە لەسـەر ئـەوە کـە ئـاو هەیـە، وە

ئینسان کەیفی بۆ شتی سوێر دەچێ‌و، دەبینی لە دنیای واقیعدا، شتی سوێر هەیە، وە ئینسان کەیفی بۆ شتی شیرین دەچێ‌و، لەنێو دروستکراوەکاندا، شتی شیرینیش هەیە، وە ئینسان غەریزەی جینسیی دەجوولێ، خوای پەروەردگاریش ئافرەتی دروستکردوە بۆ پیاوو، پیاویشی بۆ ئافرەت دروستکردوە، کە بە شێوەی حەلاڵ یەکدی تێر بکەن، بەکورتیی: هەرچی کە ئینسان مەیل‌و ئارەزووی بۆی دەچێ، لە شتی مادديی‌و مەعنەویی، لە دنیای واقیعدا، ئەو شتە هەیە.

ئنجا یەکێك لەو شتانەی کە هەموو مرۆڤەکان لە دەروونەوە بۆی تینوون‌و لە دڵەوە بۆی دەکوڵن، بریتییە لە: خوا ﷻ، هەموو ئینسانێك لە دەروون‌و لە ناخییەوە، هەست بەوە دەکات کە خاوەنێکی هەیە، بەدیهێنەرێکی هەیە، پەروەردگارێکی هەیە، خوایەك هەیە، بەدیهێناوەو سەرپەرشتیی دەکاو، ئاگای لێیەتی‌و لێی دەپرسێتەوە، هەموو ئینسانێك لە ناخی خۆیدا وایە، خوا هەموو ئینسانێکی وا خوڵقاندوە، کە خوای خۆی بناسێ‌و بیپەرستێ، وەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ وَيُمَجِّسَانِهِ﴾[1]، واتە: هەموو ئینسانێك لەسەر سروشتی خواناسیی لەدایك دەبێ، بەڵام دوایی باب‌و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەصرانیی، یان دەیکەنە مەجووسیی.

## بەڵگەی دووەم: یاسای هۆکاریی :

ئێمە یاسایەکی عەقڵییمان هەیە، کە هەموو عاقڵمەندانی دنیا لەسەری پێکهاتوون، پێی دەگوترێ: یاسای هۆکاریی (قانون السببية) ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئینسانێك لە عەقڵیدا، لە لای بەڵگە نەویستە، کە هیچ پەیدا بوو (مُحدَثْ)یەك بەبێ پەیداکەر (مُحدِثْ) نابێ، وە شوێنەوار بەڵگەیە لەسەر کەسێك، یان شتێك، ئەو شوێنەوارەی دانابێ، بەکورتیی: هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە، وەك یەکێك لە عەرەبێکی خێڵەکیی دەپرسێ: بەڵگەت چییە لەسەر بوونی خوا ؟ ئەویش دەڵێ: (الخُطْوَة: تَدلُّ عَلَى المَسِير، والبَعْرَة

---

١) رَوَاهُ مُسلم برقم: (٦٧٠٠)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه.

تَـدلُّ عَلَـى البَعِيـر، سَـمَاءٌ ذَاتُ أَبْـرَاج، وأَرض ذَات فجـاج، و بحَـارٌ ذَات أَمْـوَاج، أَلا تَـدلُّ عَلَى العَليم القَدِير؟) واتـە: شـوێن پـێ بەڵگـەیە لەسـەر ئەوەی کـە کەسـێك بەوێـدا ڕۆیشتوە (شـوێن پـێ بەڵگـەیە لەسـەر پێـڕۆیەك)، قشـپل بەڵگـەیە لەسـەر ئـەوەی کـە حوشتر هەیە، (دیارە کابـرا حوشـترەوان بووە) ئەدی ئاسـمانێکی خـاوەن ئەسـتێرەو، زەوییەکی خاوەن قەدپـاڵو، چیـاو، دەریـایەکی خـاوەن شـــەپۆل، بەڵگــە نیـە لەسـەر (خـوا)ی زانـای توانـا ؟

لەڕاستیدا ئەوە کە: هەموو پەیدابوویـەك پێویسـتیی بـە پەیداکـەرێك هەیـە (لِکُلِّ حَادِث مُحْدِث) زانایـانی مەنتیق دەڵێن: ئەوە یەکێکە لە قانوونە عەقڵییەکان، واتـە: هـەموو عاقڵـمەندانی دنیـا لەسـەر ئـەوە ڕێککـەوتوون، کـە هـیچ پەیدابوویـەك بـەبێ پەیداکـــەر نـابـــێ، ئنجـــا ئاشـــکرایە کـــە بوونەوەریـــش پەیدابوویـــە، کـــەواتە: پەیداکەرێکی هەیـە، کە خـوای بەرزو بـێوێنـەیە.

## بەڵـگـەی سـێـیـەم: یاسـای ڕێكو پێکیـی:

هیـچ ڕێکخـراوێك بەبێ ڕێکخەر نابـێ، (لا مُنَظَّـم بلا مُنْـظِّم)، یـان: ڕێكوپێکیـی بـــەبێ ڕێکخـــەر نابـــێ، (لا نِظَـام بـلا مُنظِّـم) بەڵـــێ هـــەموو ڕێکخـــراوێك دەبـــێ ڕێکخـەرێکـــی هـەبـــێ، ئـــەمیش یەکـــی دیکـــەیە لـــە یاســـا عەقڵییـــە ڕوونو بەڵگەنەویســـتەکان (البدیهیـات العقلیـة)، بـا وێنەیـەکی سـادە بێنینـەوە: دەنکـە شـقارتەیەك هـەر کەسـێك ببینـێ، کـە داروو چکـەیەکە تـۆزێ گۆگـردی پێوەیـــە، دەزانـــێ کەســـێك ئـەو دەنکـە شـــقارتەیەی دروسـت کـردوە، ئنجا ئـەدی شـقارتەکە بۆخـۆی کـە چەند دەنکێکی تێدایەو، لایەکی ماددەیکی زبـری لـێ دراوە، کـە بتوانـێ دەنکـــە شـــقارتەکەی پـــێ هەڵگیرســـێنی، هـــەر لـــەوەوە بگـــرە، هـــەتا ســـەعاتو کۆمپیـــۆتەرو ڕۆکێـــتو هـەموو ئـەو شـتانەی کـە ئینســـان دروســـتی کـردوون، ئایـا ئەگـەر سـەعاتێك لەو گـۆڕە بکـــەوێ، هـیچ کـەس دەچێتە عـەقڵی لـە خـۆڕا دروست بووبـێ؟ نەخێر! دەجا ئەو گـەردیلانەی کە ماددەیـان لـێ پێکـهاتوەو، ئـەو خانانـەی کـە جەسـتەیان لـێ پێکهـاتوە، کـە زۆر زۆر وردەکارییـان تێدایـەو لـە کۆمپیـــۆتەرو ســـەعاتو، لـە هەرچـی بەشـەر لـە تەکنۆلۆژیـا دروسـتی کـردوە، زیـاتر وردەکارییـان تێداکراوە، ئایا چۆن ئەوانە پێویستییان بـە وەستایەكو کارسـازێكو بـە ڕێکخـەرێك

هەیـە، کەچـی ئـەو کـەون‌و کائیناتـە، بـەو هـەموو کەهکەشـان‌و بـەو هـەموو ئەستێرەو خرۆکـانەوە، بەو هەموو ڕێك‌و پێکییەی کە هەیـەتی، چـۆن پێویسـتی بە کارسازێك‌و ڕێکخەرێك وەستایەك نیـە ! بە تەئکید پێویستی پێیەتی.

## ناگونجێ خوا بەدیهێنەری هەبێ:

ئنجا ڕەنگـە یەکێـك بپرسێ: باشە ئـەوە خـوا ﷻ بەدیهێنـەری هـەموو شـتێکە، ئەدی کێ خـوای دروست کـردوە؟

دەڵێین: ئـەو پرسـیارە لەخۆیـدا پرسـیارێکی نامەنتیقییـە، چونکـە: کـە تـۆ دەڵێی: خـوا هـەموو شـتێکی دروست کـردوە، واتـە: جگـە لـە خـوا بەدیهـێنراوە، کەواتە: شتێکی بێ جێیـە تـۆ جارێکـی دیکـە، لەنێـو بەدیهێنراوەکـاندا بگەڕێی‌و بڵێی: کامیـان خـوای بەدیهـێناوە؟ ئنجـا ئەگـەر وەك شـتێك لـە عەقڵـی ئینسانی نـزیك بخەینەوە، دەتوانین وێنەیەك بێنینـەوە.

تۆ ژمـارە یەك (١) چەند سـفرێکی لە پێشـەوە دابنـێی، ئەگەر سێ (٠٠٠) سـفر بـن، دەبێتـە هـەزار (١٠٠٠)، ئەگـەر شـەش (٠٠٠٠٠٠) سـفر بـن دەبێتـە ملیـۆن، وە ئەگەر نـۆ (٠٠٠٠٠٠٠٠٠) سـفر بـن دەبێتـە ملیـارێك، ئەگەر دوازدە (٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) سـفر بن، دەبێتـە تریلیۆنێـك، وە هەروەها هەتا کۆتایی.

ئنجا سفری ژمـارە یەك نرخەکەی خـۆی لە کوێ هێنـاوە؟ بێگومـان لـە سـفری دوای خۆی، ئنجـا سفری دوای ئـەویش لـە سـفری دوای خـۆی، ئـەویش لـە هـی دوای خـۆی ... هتـد، تا دەگاتە سـەر یەکەکە.

بەڵام ئەگـەر بە ژمارەیـەك بگوترێ: ئەو نرخـەت لە کوێ هێنـاوە؟[1] دەڵێ: هـی خۆمـەو قیـمەتەکەم قیمـەتێکی زاتییـە، بەڵـگەت چـیە؟ دەڵـێ: بەڵـگەم ئەوەیـە سـفرەکان لابـەرن، مـن هـەر یەکـم‌و بۆخـۆم هـەر هەم، وە ئەگـەر سـفرەکانم لـە پێـش دانێـی، قیمـەت بـە هـەموویان دەدەم، بـەڵام بەڵـگەمان چـییە، کـە سـفرەکان قیمەتێکی خودییـان نیـەو وەریانـگرتوە ؟!

١) واتـە: نرخـی ژمارەیی (القیمة العددیة).

بەڵگەمـــان ئەوەیـــە کـە ئەگـــەر ژمـــارەی (١) یـــەك لابـــەری، ســفرەکان هیچیان قیمەتیان نیەو هیچن! ئنجا: (وَلِلَّهِ الـمَثَلُ الأَعْلَى) دروستکراوەکان، وەك سفرەکان وان، خـواش ﷻ وەك ژمارەی (١) یەك، خـوا بوونی بـە هــەموو شـتەکان داوە، خـوایە ﷻ وایکــردوە کـە ئێمــە هـەبین، ئەگـەر خــوا بیـەوێ ئێمـە نابیــن، هـیچ کــام لـە دروســتکراوەکان نابـن.

کەواتـــە: خــــوا ﷻ ، وەك چــۆن ژمــارەی (١) پێویســـتیی بـــەوە نیـــە نرخـــە ژمارەییەکـە (قیمتـە العَدَدیـة)ی لـە غــەیری خــۆی وەربگـــرێو قیمـەتێکی زاتیـی هەیـە، خــوای بێهاوتــاش بــوون (وجـود)ەکـەی لەخۆیەوەیـەو، بوونێکــی خــوازراو (مســتعار) نیــە، وەك بــوونی ســفرەکان، کــە لــە غەیــری خۆیـــان قیمەتەکـــەیان خـواستوە، کە یەك (١)ەکـەیە، بۆیـە بەبێ وی، هیچیـان بەهـایان نیـە.

## باسێکی گرنگ : کردەوەی مرۆڤ لە نێوان بەدیهێنران (خلق) و وەدەستهێنران (کسب) دا

ئنجا دەربارەی ئەوە کە مادام خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، ئایا کردەوەکانی ئینسان (أَعْمَال الإِنْسَان) ئینسان خۆی بەدییان دێنێ، یاخود خوای پەیداکەر کردەوەکانی بەدیدێنێ ؟ لەوبارەوە زانایان بوونەتە سێ بەش :

١/ (جَبْرِيَّة) دەڵێن: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، بە کردەوەکانی مرۆڤیشەوە، واتە: کەسێك کە نوێژ دەکات، خوا نوێژەکەی بۆ دروست دەکات! وە کەسێك کە قەتڵ دەکات، خوا قەتڵەکەی بۆ دروست دەکات!

٢/ (مُعْتَزِلَة) دەڵێن: ئینسان بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی (الإِنْسَان خَالِق أَفْعَالِه).

٣/ (أَشَاعرة وماتُريدية) دەڵێن: ئینسان وەدەستهێنەری کردەوەکان خۆیەتی، بەڵام خوا بەدیهێنەریانە، واتە: خوا بۆی دروست دەکات، ئینسانیش کردەوەکانی وەدەست دێنێ !

دیارە ئەم مەسەلەیە وتووێژو مشتومڕو شەڕە قسەیەکی زۆر گەرمی لەسەر بووەو ئێستاشی لەگەڵ دابێ.

ئنجا هەرچی (جبرية)ن دەیانەوێ بەرگریی لە دەستەڵاتی ڕەهای خواو لە ویستی ڕەهای خواو لە زانیاری ڕەهای خوا، بکەن، دەڵێن: ناگونجێ شتێك هەبێ خوا دروستی نەکات، هەر شتێك هەبێ، دەبێ خوا دروستی بکات، وە هەرچی هەیە لەژێر ڕکێفی ویستی ڕەهای خوادایە، بۆیە گوتوویانە: ئینسان هیچ دەوری نیە لە کردەوەکانیداو، خوا بۆی دروست دەکات.

موعتەزیلەش بۆ بەرگریی کردن لە دادگەریی‌و حیکمەتی خوا، گوتوویانە: ئینسان بۆخۆی کردەوەکانی خۆی دروست دەکات، بۆیەش خوا لەسەر خراپەکانی سزای دەدات، لەسەر چاکەکانی پاداشتی دەداتەوە، وە ئەگەر خوا کردەوەکانی بخوڵقێنێ، سزاو پاداشت مانایەکیان نابێ.

ئەشعەرییەکان‌و ماتۆریدییەکانیش ویستوویانە چارەسەرێکی میانجیی بدۆزنەوەو گوتوویانە: خوا کردەوەکانی ئینسان دەخوڵقێنێ، بەڵام ئینسان بۆخۆی وەدەستیان دێنێ، بۆیەش هەندێ لە زانایان ئەگەر شتێك زۆر ورد بووبێ، گوتوویانە: (هذه المسألة أدقُّ من كسب الأشعري) ئەم مەسەلەیە لە (کسب)ی ئەشعەریی وردترە، یانی: مادام خوا کردەوەکانی ئینسان دەخوڵقێنێ، ئینسان چی بۆ دەمێنێتەوە ؟ ئایا وەدەست هێنان (کسب)، چییە ؟!.

منیش من لە ئەنجامی زۆر تێوەڕامانی قوڕئان دا لەم مەسەلەیە، ڕایەکم بۆ دەرکەوت(١) کە لە کتێبەکانی دیکەدا نەمبینیوە، پوختەی ئەو ڕایەشم ئەوەیە کە: هیچ کام لەو ڕایانە ڕاست نین، بەنسبەت کردەوەکانی ئینسانەوە، بەڵکو ڕای ڕاست ئەوەیە کە :

کردەوەکانی ئینسان دروستکراو نین، تاکو پێویستییان بە دروستکار بێ، نە ئینسان‌و نە خوا ﷻ ، چونکە شتی وەدیهێنراو (مخلوق) پێویستی بە بەدیهێنەر (خالق)ە، ئەوە کورتەی ڕایەکەمە، ئنجا ئێستا دێمە سەر بەڵگە هێنانەوە، لەسەر ڕاستیی ئەو ڕایەم:

**یەکەم**: خوای پەروەردگار هەرکام لە وشەی: (خلق) و (جعل)ی بەکارهێناون:

**أ-** (خلق) لە فەرهەنگەکانی زماندا یانی: پەیداکردن لە نەبوونەوە، (الخَالِق: اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ اللهِ تَعَالى وَهو مُبْدِعُ الشَّيءِ المُخْتَرَع عَلَى غَيْرِ مِثَالٍ سَبَق)(٢)،

١) یەکەمجار ئەو ڕایەم لە زیندانی ئەمریکاییەکان داو لە کتێبی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) لە بەرگی دووەمی دا تۆمار کرد، پاشان لەم تەفسیرەو لە کتێبی : (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طه حاویی)یش دا هێناومە.

٢) المعجم الوسيط، ص ١٢٥.

(خالق ومبدع) واتە: (خَالِق) یەکێکە لە ناوەکانی خوا ﷻ ، کە بریتییە لە پەیداکەری شتێك، بێئەوەی کە وێنەی پێشتری بووبێ.

ب/ دەربارەی وشەی (جعل)یش دەڵێ: (جَعَلَ اللهُ الشَّيءَ جَعلاً، خَلَقَهُ وَأَنْشَأَهُ، وَجَعَلَ الشَيءَ كَذَا، صَيَّرَهُ إِيَّاهُ)(١)، واتە: (جعل) هەم بە مانای (خلق)یش بەکارهاتوە، هەم بە مانای گۆڕینی شتێك لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکە، کە من مەبەستم مانای دووەمە.

ئنجا با تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکانە بکەین:

خوا ﷻ لە سوورەتی (النحل) لە ئایەتی (٨١ و ٨٢)دا کە لە یەك سیاقدا باسی ژمارەیەك لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی دەکات، بەو بۆنەوە وشەکانی (خلق و جعل)ی بەکارهێناون، بەلام بە دوو مانای جیاواز، دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ٨٠ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ٨١﴾، واتە:
وە خوا لە ماڵو حاڵەکانتاندا مایەی ئارامگترنی بۆ گێڕاون، وە لە پێستی ئاژەڵ ماڵی چادری بۆ ساز کردوون، کە زۆر بە ئاسانیی بۆ بارو سوارتانو بۆ کاتی نیشتەجێبوونتان بەکاری دێنن، وە لە خورییو لە تووكو مووی ئەو ئاژەڵانە (خوریی مەڕو تووکی حوشترو مووی بزنو ڕەشەوڵاخ) کەلوپەلیشی لێ دروست دەکەنو خواردنو خۆراکیش لە بەرهەمەکانیان دروست دەکەن، بۆ کاتێکی دیاریکراو، وە خوا لەوەی کە دروستی کردوە، سێبەری بۆ گێڕاون... .

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٥٢.

تەماشا بكـەن ! خـوا (جَعْـل)ی بەكارهێنــاوە بۆ سێبەر: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلًا ﴾، واتــە: (وَجَعَــلَ لَكُــمْ ظـلالاً مِما خلـق) بــەڵام (خَلْـق)ی بۆچـی بەكارهێنــاوە؟ بـۆ درەخــت؟ خـوا درەختــەكەی خوڵـقاندووە، چیایەكەی خوڵقاندوە، بەڵام سێبەرەكەی نەخوڵقاندوە، سێبەرەكەی (جعل)ی كـردوە، بۆچـی؟ چـونكە سـێبەر شـــتێك نیــە بوونێكــی زاتیــی هـــەبێ، بوونەكـــەی بـــوونێكی ئیعتیبــارییە، شـتێك لـە شـتێك دەگیــرێ، سـێبەر پەیـدا دەكـات، واتـە سـێبەرەكە بوونێكی زاتیی نیە، بوونێكـی ئیعتیبـاری هەیــە، كردەوەكانی ئینسانیش هـەموویان (جعل)یین، وەك دوایـی باسی دەكـەین.

**دووەم** : خـوا ﷻ چـەند وشـەیەكی بـۆ كردەوەكـانی ئینسـان بەكارهێنـاون: (جعـل، كسب، عمل، فعل، إقتـراف، إجتراح) ئەو شـەش وشەیە، بۆ كردەوەكـانی ئینســان بەكــارهــاتوون، بۆ وێنــە:

١) (جعـل) لە سـوورەتی (یونس)دا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتـە: بڵــێ ئایا ئـەو ڕۆزییــە دەبینیــن كـە خــوا بـۆی ناردوونەخـوار دوایـی گێڕاوتانــە بـە حـەرامو حـەڵاڵ، بڵـێ: ئایــا خــوا مۆڵـەتی داون، یـان درۆ بەنــاوی خـواوە هەڵدەبەسـتن ؟

٢) (كسـب) لە سـوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٨٦)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴿٢٨٦﴾ ﴾، واتــە: خـــوا لە هیچ نەفسێك داوا ناكا مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیـە، هـەرچـی لـە چاكـە بەدەسـتی بێنــێ، قـازانجـی خۆیــەتی، وە هـەرچـی لـە خـراپـە وەدەسـتی بێنــێ، زیـانی خۆیـەتی.

٣) (عمل) لە سـوورەتی (فصلت) لە ئایەتی (٤٦)دا دەفەرموێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا

﴿فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۝٤٦﴾، واتە: هەر کەسێك چاکەیەك ئەنجام بدات، قازانجەکەی بۆخۆیەتی، وە هەرکەس خراپە بکات، زیانەکەی بۆخۆیەتی.

٤) (فعل) لە سوورەتی (آل عمران) لە ئایەتی (١١٥)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ۝١١٥﴾، واتە: وە هەر چاکەیەك بیکەن، سپڵەییان بەرانبەر نانوێنرێ، (واتە: لێیان نادیدە ناگیرێو پاداشتیان دەدرێتەوە) وە خوا بە پارێزکاران زانایە.

٥) (إقتراف) لە سوورەتی (الشوری)دا خوای پەروەردگار وشەی (إقتراف)یشی بەکارهێناوە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ۝٢٣﴾، واتە: هەر کەسێك چاکەیەك ئەنجام بدات پاداشتەکەی بە چاکتر دەدەینەوە، بێگومان خوا لێبوردەی سوپاسگوزارە.

٦) (إجتراح) لە سوورەتی (الجاثیة)دا خوای پەروەردگار وشەی (إجتراح)ی بەکارهێناوە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ۝٢١﴾، واتە: ئایا ئەوانەی کە خراپەکان ئەنجام دەدەن، پێیانوایە: یەکسانیان دەکەین لەگەڵ ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاك دەکەن ؟ ژیانو مردنیان وەك یەکە ؟! ئەوە خراپترین بڕیارە کە دەیدەن.

کەواتە: خوا ئەو شەش وشەیەی بۆ ئینسان بەکارهێناونو، هەمووشیان ئەوە دەگەیەنن کە ئینسان کردەوەکانی خۆی لە نەبوونەوە پەیدا ناکات، هەتا ناچار بین بڵێین : خوا بەدیهێنەری کردەوەکانی ئینسانە، وەك جەبرییەکان دەیڵێن، یاخود بڵێین : ئینسان خۆی بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی، وەك (معتزلة) دەیڵێن،

چونكە كردەوەكانی ئینسان بوونێكی زاتییان نیە، تەنیا بوونێكی ئیعتیباریی‌و (جَعْلِيّ)یان هەیە، با تەماشا بكەین:

كەسێك كە نوێژ دەكات، ئایا نوێژ كردەوەیەكە كە پەیداكرابێ؟ نەخێر، چونكە هەر ئەو ئەندامانەی كە خوا پێی داوی دەیانجووڵێنێ: ئایەتەكانی خوا بە عەقڵ‌و دڵی خۆتدا دێنی‌و، كارلێك لەگەڵ ئایەتەكاندا دەكەی، بە زمان ئایەتەكان دەخوێنی، دەست دەگری‌و، دەچیە ڕكووع‌و، دەچیە سەجدەو... هتد، تەنیا ئەندامەكانی خۆت دەجووڵێنی، واتە: شتێكی تازە پەیدا نەبووە، شتێك پەیدا نەبووە، پەیداكرابێ كە پێویستی بە پەیداكەر بێ، كردەوەكانی نوێژ هەموویان شتی(جَعْلِيّ)ین‌و، جووڵەو تەصەڕڕوفاتن‌و، شتی لە نەبوو (عدم) وەدیهێنراو نین.

هەروەها كەسێك كە قەتڵێك دەكات، ئایا هیچ شتێك پەیدا كراوە؟ نەخێر، زەبرێك لە كەسێك دەدات، ئەو ئینسانە پێش ئەوەی بیكوژێ زیندووە، دوایی دەبێتە كەلەشێك ڕووحەكەی لێ جیادەبێتەوە، واتە: شتێكی تازە پەیدا نەبووە، ڕووحەكە هەر هەبووە لە جەستەیداو، بە كوشتنەكە جەستەكە ڕووحەكەی لێ دێتە دەرێ، شتێكی تازە پەیدا نەبووە.

هەروەها مرۆڤ هەر گوناهێكی دیكە دەكات، وە هەر چاكەیەك دەكات، كردەوەكانی ئینسان هیچیان كە شتێك نین، پەیدا بكرێن، تاكو پێویستییان بە پەیداكەر هەبێ، بەڵكو بەدەست دەهێنرێن‌و ئەنجام دەدرێن، بۆیە تەنیا پێویستییان بە ئەنجامدەرو وەدەستهێنەر هەیەو، مرۆڤیش ئەو توانایەی هەیە.

ڕەنگە یەكێ بڵێ: ئەو ڕایە لەگەڵ قسەی ئەشعەرییەكان‌و ماتورێدییەكان دا تێكدەكاتەوە، دەڵێین: نەخێر، تێكناكاتەوە، چونكە ئەوان دەڵێن: خوا كردەوەكانی ئینسان دەخوڵقێنێ‌و، بۆخۆشی وەدەستیان دێنێ، بەڵام من دەڵێم: كردەوەكانی مرۆڤ وەدیهێنراو (مخلوق) نین، تاكو حەوجێی بەدیهێنەر (خالق) بن، وەدەستهێنراو (مُكْتَسَب)ن‌و، مرۆڤیش خۆی وەدەستیان دێنێ، بۆیەش پێشتر گوتم: ئەو ڕایە من لە هیچ كتێبێكدا نەمبینیوە، ڕەنگە هەبێ‌و لە كتێباندا باس كرابێ، بەڵام من نەمبینیوە، وە لە ئەنجامی سەرنجدانی قوڕئان‌و زۆر

لێوردبوونەوەی دا، بۆم دەرکەوتوە کە ئەو ڕایە ڕاستەو، بەو شێوەیەش لە هەموو ئەو ئیشکالانەش دەربازمان دەبێ، کە جارێك خوا بکەین بە بەدیهێنەری کردەوەکانی ئینسان، بۆئەوەی بەرگریی لە ویستو توانای ڕەهای خوا بکەین، وە جارێك ئینسان بکەینە بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی، بۆئەوەی بەرگریی لە حیکمەتو دادگەریی خوا بکەین، بەلام لەگەلْ ئەو ڕایەدا کە هەلْمبژاردوە، پێویستیمان بەوانە بە هیچیان نابێ.

## بەکارهێنرانی وشەی ( خلق ) بۆ کردەوەی مرۆڤ :

لە سێ شوێن لە قورئاندا خوای بەدیهێنەر وشەی (خلق)ی بۆ کردەوەی ئینسان بەکارهێناوە :

یەکەم : لە سوورەتی (العنكبوت) لە ئایەتی (١٧)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ...﴿١٧﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێوە لە جیاتی خوا صەنەمان دەپەرستن، وە (درۆ هەلْدەبەستنو) درۆ بەدیدێنن.

ڕاستە لێرەدا وشەی (إِفْكاً) خوای زانا، وشەی: (خلق)ی بۆ بەکارهێناوە: ﴿ وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ﴾.

دووەم : وە لە سوورەتی (آل عمران)یش لە ئایەتی (٤٩)دا، خوای پەروەردگار دەربارەی عیسا دەفەرموێ: ﴿ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ...﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: وە ئەو (عیسا) ڕەوانە کراوە بۆ لای بەنی ئیسرائیل پێیان دەلْێ: بە نیشانەیەك لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووم، من لە قوڕێ شێوەی بالْندەتان بۆ ساز دەکەمو، فووی پێدادەکەم، یەکسەر بە مۆلْەتی خوا دەبێتە بالْندە(ی زیندوو).

سێیەم : هەروەها هەر دەربارەی هەمان بابەت لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (١١٠)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ﴿١١٠﴾ ﴾، واتە: وە (ئەی عیسا !) یاد بکەوە! کاتێك لە قوڕێ شێوەی باڵندەت دروست دەکرد بە مۆڵەتی من، وە فووت پێدا دەکردو بە مۆڵەتی من دەبوو بە باڵندە(ی زیندوو).

دیارە بەڕواڵەت ئەوە ئیشکالێکە، بەڵام لە ڕاستیی دا وانیەو، وەڵامەکەشی بەم شێوەیەیە :

١/ کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ﴾، بوختانێك هەڵدەبەستن، خوا بۆیە وشەی (خلق)ی بەکارهێناوە، چونکە باس باسی هاوبەش بۆ خوا پەیداکردنەو هاوبەشی خواش بوونی نیە، واتە: کەسێك، شتێك کە هاوبەشی خوا بێ، بوونی نیە، بۆیە خوای کاربەجێ وشەی پەیداکردن (خلق)ی بەکارهێناوە، یانی: هاوبەشدانان، وەك ئەوەیە خۆتان پەیداتان کردبێ، چونکە لە دنیای واقیعدا بوونی نیە، ئایا هاوبەشی خوا بوونی هەیە؟ نەخێر.

ئەدی چۆنە دەڵێن: ئەو ئینسانە هاوبەشی خوایە، یان ئەو صەنەمە، ئەو ئەستێرە، ئەو مانگە؟ وەڵام: ئەوە تەنیا لە مێشکی خەڵکدا هاوبەشی خوایە، بەڵام لە دنیای واقیعدا خوا هاوبەشی نین، خوا تەنیا دروستکراوی هەن، کەواتە: خوای زاناو شارەزا وشەی (خلق)ی بەو موناسەبەتەوە بەکارهێناوە، کە شتێکیان بۆ خوا پەیدا کردوە، کە لە دنیای واقیع دا بوونی، نیە، بۆیەش وشەی درۆ هەڵبەستن (إِفْك)ی بۆ بەکارهێناون .

٢و ٣/ بەنسبەت دوو شوێنەکەی دیکەوە کە: عیسا ﷺ باسی دروستکردنی باڵندە لە قوڕ دەکات، لەبەرئەوەیە کە ئەوەش شتێك بووە تایبەت بە عیساوەو، پێشتر وێنەی نەبووە، بەوبۆنەوە خوای پەروەردگار وشەی بەدیهێنان (خلق)ی بۆ بەکارهێناوە، بەڵام ئەگەر تەماشا بکەین: لە هەردوو شوێنەکاندا دروستکردنی باڵندە لە قوڕو، ژیان بە بەرداکرانی بەهۆی فووپێداکردنی

عیساوە، دەگێڕێتەوە بۆ ویستو مۆڵەتی خـوا، دەفەرموێ: ﴿أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ...﴿٤٩﴾﴾، کەواتە: شێوەی قوڕەکە بە مۆڵەتی خوا دەبێتە باڵندە، هەروەها لەوی دیکەش دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِي ﴿١١٠﴾﴾، لە هەردووکیان دا خوای پەروەردگار بوونە باڵندەی، گێڕاوەتەوە بۆ لای خۆی.

ئەمە کورتە باسێك بوو دەربارەی بەدیهێنەرایەتیی خوا ﷻ بۆ هەموو شتێك واتە: جگە لە خۆی، چونکە جگە لە خوا، تەنیا دروستکراوەکاننی، بینراو بن، یان نەبینراو.

**مەسەلەی دەیەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾الأنعام، خوا ﷻ لەسەر پێناسەکردنی خۆی بەردەوام دەبێو دەفەرموێ: چاوەکان ئەو نابینن‌و، ئەو چاوەکان دەبینێ، وە ئەو پەنهانکاری شارەزایە، بۆ وشەی ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ﴾، توێژەرەوانی قورئان، دوو واتایان هێناون:

١) هەندێکیان گوتوویانە: (لا تدركُهُ: لا تحيط به) واتە: دەوری نادات، یانی: چاوەکان دەوری خوا نادەن.

٢) هەندێکیشیان گوتوویانە: (لا تدركُهُ: لا تُبْصِرُه) نایبینن، بەدی ناکەن، چونکە دەڵێی (أَدْرَكْتُهُ) واتە: (أَدْرَكْتُهُ ببَصَرِي) یانی: (رَأَيْتُهُ وَأَبْصَرْتُهُ) واتە: بینیم‌و چاو پێیکەوت.

مانایەکی دیکە (أَدْرَكَ) بریتییە لە دیتنی تەواو، بۆیە (أَدْرَكْتُهُ) واتە: بەتەواویی بینیم، (أحطتُ به)، وە لە زمانی عەرەبییدا وشەی (إِدْرَاك) جیایە لە وشەی (عِلْم)، (علم) هەبوون بە شتێك، ئەوەیە کە تۆ ئەو شتە بزانی،

ئیدی مەرج نیە هەموو شتێکی لەبارەوە بزانی، بەلاّم کە گوتت: (أَدْرَكْتُهُ) مانای وایە هەموو شتێکت لەبارەی ئەو بابەتەوە زانی، بۆیەش خوا ﷻ نەیفەرمووە: خوا نازانن، بەلاّم فەرموویەتی زانیاریی وان دەوری خوا نادات، وەك دەفەرمویٚ: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ١١٠﴾طـه، واتە: زانیاری ئەوان دەورەی خوا نادات، یانی: هەموو شتێك لەبارەی خواوە نازانن، تەنیا دەزانین کە خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارەو، ئەو ناوو سیفەتە چاکانەی هەن، کە لە رێی وەحییەوە پێی فەرمووین، بەلاّم زانیاریی ئێمە دەوری خوای پەروەردگار نادات.

ئنجا ئێمە لێرەدا باسێك دەکەین دەربارەی بینینی خوای بەرزو بیٚ وێنەو هەوڵمداوە، باسێکی تاڕاددەیەك تێرو تەسەل بیٚ.

# باسێک لە بارەی

# پێنرانی خوای بەرزو مەزنەوە، لە دنیاو دوارۆژدا

لەبارەی بینینی خوای بەرزو بێوێنەوە لە نێوان زانایان دا مشتومڕو ڕاجیایی زۆر هەبووەو هەیە.

چ لە دنیادا لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ لە شەوی میعراج دا.

وە چ لە قیامەت دا، لە بەهەشت، لەلایەن بڕوادارانەوە.

وە چ لە خەون دا لە دنیادا .

ئنجا ئێمە خوا پشتیوان بێ، لە هەشت (٨) خاڵان دا، ئەو بابەتە دەتوێژینەوە، کە ئەمە ناوونیشانەکانیانن:

١/ بۆچی لە دنیادا خوا ﷻ نابینین ؟

٢/ پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی دیتنی خواوە، لە شەوی میعراج دا، چی فەرمووە ؟

٣/ ئایا پێغەمبەری خوا (موحەممەد) ﷺ لە شەوی میعراج دا، خوای بەرزو مەزنی دیوە، یان نا؟!

٤/ یەکدەنگیی زانایان لەسەر نەبینرانی خوا، بە چاوی سەر، لە دنیادا.

٥/ زانایان یەك دەنگن لەسەر بینینی خوای پەروەردگار، لە ڕۆژی دوایی دا.

٦/ بەڵگەکانی سەلماندنی بینینی خوا لە دوارۆژدا، لەلایەن ئەهلی بەهەشتەوە.

٧/ ئەو زانایانەی دیکە کە دەڵێن: خوا ﷻ نابینرێ، بەڵگەیان چییە؟

٨/ ئایا دەگونجێ خوا ﷻ لە خەوندا ببینرێ ؟

**یەكەم: بۆچی لە دنیادا خوا ﷻ نابینین ؟**

وەڵامەكەی ئەوەیە: كە خوا ئێمەی لەم سەر زەوییە داناوە بۆ تاقیكردنەوە، ئنجا ئەگەر خوای پەروەردگارمان هەمیشە لەبەرچاو بووایە، چۆن تاقیكردنەوە دەبوو؟ بۆیەش یەكەمین وەسفی ئیمانداران، كە لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)دا خوای بەرز ئیماندارانی پارێزكاری پێ وەسف دەكات، ئەوەیە كە ئیمانیان بە نادیار هەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ ﴾، بەڵێ، بڕواداران، خوا نادیار (غیب)ە و ئیمانیان پێیەتی، بەهەشت نادیارەو، ئیمانیان پێیەتی، دۆزەخ نادیارەو ئیمانیان پێیەتی، قیامەت نادیارەو، ئیمانیان پێیەتی، فریشتەكان نادیارن‌و، ئیمانیان پێیانە، جند پەنهانەو، ئیمانیان پێیەتی، وەحی هاتن بۆ پێغەمبەران پەنهانەو، ئیمانیان پێیەتی، هەمووی دەگرێتەوە!

كەواتە: حیكمەتی نەبینراویی خوا ﷻ لەلایەن مرۆڤەوە، وەك لە كتێبی : (خوا ناسیی، ئایین، ئیمان)دا بە تەفصیلێ باسمكردوە، ئەوەیە كە خوا ئینسانی داناوە تاقیبكاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۝٢ ﴾ الملك، واتە: ئەو كەسەی كە ژیان‌و مەرگی گێڕاون، تاكو تاقیتان بكاتەوە.

ئنجا مرۆڤ چۆن تاقی دەكرێتەوە، ئەگەر خوای پەروەردگار ببینێ، فریشتە ببینێ‌و، نێو بەهەشت‌و دۆزەخ ببینێ‌و، هەموو شتێك ببینێ، ئەو تاقیكردنەوەیە چۆن دەبێ؟

بەڵێ ئینسان لەبەرئەوەی كە خوای كاربەجێ لەسەر زەوی دایناوە، كە تاقیبكاتەوە، بۆیە خۆی لێ پەنهان كردووەو نایبینێ، وە دەبێ بە چاوی عەقڵ بیبینێ، خوا ئینسانی وا دروستكردوە، كە چاوی توانای ئەوەی نەبێ، نەك خوا

ببینێ، بەڵكو زۆر لە دروستكراوەكانیش ببینێ، وەك دوایی باسی دەكەم، بۆیە ئینسان ئەوەی لە توانادا نیە، تەحەمولی بینینی خوای بەرزو مەزن بكات، بەڵكو تەحەمولی بینینی هەندێ لە دروستكراوەكانیش ناكات، ئەو هەستەوەرانەی كە هەمانن، خوای زاناو توانا بە زۆریی باسی سێیانیان دەكات، ئەوانیش: بیستن، بینین، عەقڵ، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾﴾ الإسراء، واتە: بێگومان بیستنو بینینو عەقڵ، هەر كامێك لەوانە لێیان دەپرسرێتەوە.

با تەماشای هێزی بیستنو بینینو عەقڵی خۆمان بكەین:

١/ **بیستنو گوێ**: زانایان دەڵێن: گوێی ئینسان دەتوانێ لە (٢٠) لەرینەوە (ذبذبة) تاكو (٢٠,٠٠٠) لەرینەوە ببیستێ، واتە: لە (٢٠) كەمتر نابیستێ، وە لە (٢٠,٠٠٠) هەزاریش زیاتر نابیستێ، واتە: دەنگێك لە (٢٠) لەرینەوەی (ذبذبة) كەمتریان لە (٢٠,٠٠٠) لەرینەوەی زیاتری هەبێ، نابیسترێ، ئایا حیكمەتی ئەوە چییە؟ تەماشا بكەن! هەر كۆئەندامێك لە جەستەی ئینساندا هەیە (دڵ، سییەكان، گەدەو ڕیخۆڵەكان، مێشك، جگەر، پەنكریاس، گورچیلەكان) هەموویان دەنگیان هەیە، كە ئیش دەكەن، بەڵام ئایا ئێمە دەنگیان دەبیستین؟! نەخێر، چونكە ئەگەر ئەو دەنگانەمان هەموو بیستبایە، ئیسراحەتمان نەدەكرد، بۆچی دەنگیان نابیستین؟ چونكە لە (٢٠) لەرینەوە كەمترن، هەروەها دەنگی زۆر گەورەش، كە لە (٢٠,٠٠٠) لەرینەوە زیاتر بێ، هەر نایبیستین.

٢/ **بینینو چاو**: دیارە زۆر شتی ورد هەیە، كە ئێمە نایبینین بۆ وێنە: گەردیلە ئەوە هیچ، گەردیش نابینین، {گەردیلە واتە: (ذرة)، گەرد یانی (جزيء)[1] بەڵكو لەوەش گەورەتر نابینین، ئێمە، شانە (خلية)ش نابینین،

---

١) گەرد: (جُزَيء) لە كۆمەڵە گەردیلەیەك پێكهاتوە، وەك چۆن شانە (نسيج) لە چەند خانە (خلية) یەك پێكدێ، بە ئینگلیزی گەرد ـ جُزَيء: {(Molecul) مۆلكۆلی پێدەگوترێ.

لەسەر سینگم)، وە هەموو شتێکم زانیو بینی، دوایی فەرمووی: ئەی موحەممەد! گوتم: لە خزمەتتدام پەروەردگارم، فەرمووی: ئایا دەزانی فریشتەکانی سەرێ لە چیدا مشتومڕیانە؟ گوتم: دەربارەی کەففاراتٍ، فەرمووی: کەففاراتٍ چین؟ گوتم: ڕۆیشتن بە پێیان بەرەو نوێژی بە کۆمەڵ، وە دەستنوێژی تەواوگرتن لە کاتی بەیانیانی سارددا، گوتم: وە دەربارەی پلەکان، فەرمووی: پلەکان چین؟ گوتم: خواردن دان بە خەڵك و، قسەی نەرم لەگەڵ خەڵك کردن، وە شەونوێژکردن لە شەودا، لە کاتێکدا کە خەڵك خەوتوون، ئنجا خوا پێی فەرموم: داوام لێبکە (واتە: لێم بپاڕێوە)، منیش گوتم: خوایە! داوات لێدەکەم: چاکەکانم بە نسیب بکەی، وە خراپەکان واز لێبێنم، وە داوات لێدەکەم: خۆشەویستیی هەژاران و نەدارانم بخەیە دڵ، وە داوات لێدەکەم: لێم ببووریو، بەزەییت پێم دابێ، وە ئەگەر ویستت خەڵك تاقی بکەیەوەو تووشی بەڵایەکیان بکەی، بمبەوە بۆ لای خۆت، بێئەوەی من تاقی بکەیەوە، (واتە: بێئەوەی تووشی گوناح و تاوان ببم)، وە داوات لێدەکەم: خۆشەویستیی خۆتم بخەیە دڵ، وە خۆشەویستیی هەر کەسێك کە تۆی خۆشدەوێ، وە خۆشەویستیی هەر کردەوەیەك، کە لە خۆشەویستیی تۆم نزیك دەخاتەوە.

سێیەم: ﴿عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَائِشٍ رضي الله عنه، قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ ، فَقَالَ : فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ فَقُلْتُ: أَنْتَ أَيْ رَبِّ أَعْلَمُ، فَوَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ، ثُمَّ تَلا: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾الأنعام﴾[1]، واتە:

---

١) أَخْرَجَهُ الدَّارِمِيُّ بِرقم: (٢١٤٩)، قَالَ حُسَيْن سَلِيم أَسد: إِسنادُهُ صَحِيح إِذَا ثَبَتت صُحْبَة عبد الرحمن بن عائش، قال ابن حبان له صحبة، وقال البخاري له حديث واحد إلا أنهم مضطربون فيه، وقال بن السكن يقال له: صحبة، وذكره في الصحابة محمد بن سعد والبخاري وأبو زرعة الدمشقي، وأبو الحسن بن سميع، وأبو القاسم البغوي، وأبو زرعة الحراني وغيرهم، الإصابة في تمييز الصحابة، لابن حجر ج٤، ص٣٢٠ -٣٢٤، رقم الترجمة: (٥١٥٢).

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عائیش خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: پەروەردگاری خۆمم لە جوانترین شێوەدا بینی، فەرمووی: فریشتەکانی سەرێ لە چیدا مشتومڕیانە؟ منیش گوتم: تۆ زاناتری ئەی پەروەردگارم ! دەستی خستە نێوان هەردوو شانم، هەستم بە فێنکایی‌و ساردیی کرد لەنێوان هەردوو مەمکم دا (واتە: سەر سینگ)، هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەبوو، بۆم دەرکەوت، دوایی (پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾الأنعام، واتە: ئاوا موڵکی فراوانی ئاسمانەکان‌و زەوی پێشانی ئیبراهیم دەدەین، تاکو لە بڕوا پتەوان بێ.

ئنجا جگە لەو سێ هاوەڵە، لە دە (١٠) هاوەڵی دیکەشەوە، ئەم فەرموودەیە بە شێوازی جۆراو جۆر گێڕدراوەتەوە : کە بە پێویستی نازانم ماناکردنەوەی هەموویان دووبارە بکەینەوە:

چوارەم: ﴿عَنْ أَبِي رَافِعٍ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مشرق اللّون فعرف السرور فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، فَقَالَ لِي: يَا مُحَمَّدُ! أَتَدْرِي بِمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ ... ﴾ (أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي "الكبير" برقم: (٩٣٨)).

پێنجەم: ﴿عن أبي عبيدة الجراح عن النبيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَبِّي ﷻ فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، قال: فيم يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى ...؟﴾ (رواه الطبراني في الدعاء) ج ١، ص ٤١٩.

شەشەم: ﴿عن ثوبان، قال: خرج إلينا رسول الله ﷺ بعد صلاة الصبح، فقال: إن رَبِّي تعالى أتاني الليلة في أحسن صورة...﴾ {رواه الطبراني في "الدعاء": (٤١٩/١)}.

حەوتەم: ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الباهلي، قالَ: قَالَ رسول الله ﷺ تَراء لي رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، فقال: يا محمد...﴾ {رواه الطَّبَرَانِيُّ في "الدعاء": (٩٣٨/١)}.

هەشتەم: ﴿عن أبي هريرة، قال: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُول الله ﷺ فقال: رَأَيْتُ رَبِّي تَبارَكَ وتَعالى فِي أَحْسَنِ صُورَة...﴾ {أَخْرَجَهُ الدَّارَقُطْنِي فِي كتاب "رؤية الله" (١٧٨/١)}..

نۆیەم: ﴿عَنْ عِمْرَان بن حُصَيْن عَنِ النَّبِيّ ﷺ قَالَ: أَتَاني اللَّيلَة رَبّي عَزَّ وَجَلَّ فِي أَحْسَنِ صورة...﴾ (أَخْرَجَهُ الدَّارَقُطْنِي فِي "رؤية الله"، ص١٨٠).

دەیەم: ﴿عَنِ ابْنِ عُمَر، قَالَ: قَالَ رَسُول الله: أَتَانِي رَبّي عَزَّ وَجَلَّ فِي أَحْسَنِ صُورَة...﴾ (أَخْرَجَهُ الدَّارَقُطْنِي فِي "رؤية الله"، ص١٨٠).

یازدەیەم: ﴿عَنْ أَنَس بْنِ مَالِك قَالَ أَصْبَحْنَا يَوْمَاً فَأَتى رَسُول الله ﷺ فَأَخبرنَا، قَالَ أَتَانِي رَبي عَزَّ وَجَلَّ البَارِحَة فِي مَنَامِي فِي أَحْسَنِ صُورَة...﴾ (أَخْرَجَهُ الدَّارَقُطْنِي فِي "رؤية الله" رقم: (٢٧٦)).

دوازدەیەم: ﴿عَنْ أُمّ الطفيل امرأة أُبَيَّ بن كَعْب قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُول الله ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَبي فِي المَنَامِ ...} (أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ في "الكبير" برقم: (٣٤٦)).

سێزدەیەم: ﴿عَنْ مُعَاذ بن عَفْرَاء، قَالَ: قَالَ رَسُول الله ﷺ رَأَيْتُ رَبِّي فِي حَظِيرَة مِن الفِرْدَوس﴾(كنز العمال، رقم: (١١٥٤)).

ئنجا (إبن تيمية) لە کتێبی (مجموع الفتاوى)دا گوتوویەتی: {وَكَذَلِكَ الْحَدِيثُ الَّذِي رَوَاهُ أَهْلُ الْعِلْمِ أَنَّهُ قَالَ: ﴿ رَأَيْت رَبِّي فِي صُورَةِ كَذَا وَكَذَا﴾ يُرْوَى مِنْ طَرِيقِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَمِنْ طَرِيقِ أُمِّ الطُّفَيْلِ وَغَيْرِهِمَا وَفِيهِ ﴿أَنَّهُ وَضَعَ يَدَهُ بَيْن كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْت بَرْدَ أَنَامِلِهِ عَلَى صَدْرِي﴾ هَذَا الْحَدِيثُ لَمْ يَكُنْ لَيْلَةَ الْمِعْرَاجِ، فَإِنَّ هَذَا الْحَدِيثَ كَانَ بِالْمَدِينَةِ. وَفِي الْحَدِيثِ: ﴿أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَامَ عَنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ ثُمَّ خَرَجَ إلَيْهِمْ وَقَالَ: رَأَيْت كَذَا وَكَذَا﴾، ... فَعُلِمَ أَنَّ هَذَا الْحَدِيثَ كَانَ رُؤْيَا مَنَامٍ بِالْمَدِينَةِ، كَمَا جَاءَ مُفَسَّرًا فِي كَثِيرٍ مِنْ طُرُقِهِ ﴿إنَّهُ كَانَ رُؤْيَا مَنَامٍ﴾ مَعَ أَنَّ رُؤْيَا الأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ لَمْ يَكُنْ رُؤْيَا يَقَظَةٍ لَيْلَةَ الْمِعْرَاجِ . وَقَدْ اتَّفَقَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا يَرَ رَبَّهُ بِعَيْنَيْهِ فِي

الأَرْضِ}[١]، واتــە: هــەروەها ئــەو فەرموودەیــەی کــە زانایــان گێڕاویانەتــەوە کــە پێغــەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: پەروەردگــاری خـۆمم لـە شـێوەیەکی ئـاواو ئـاوادا بینی، ئـەو فەرموودەیـە لـە ڕێـی (ابْنِ عَبَّاس وَأُمِّ الطُّفَيْلِ)و غـەیری ئەوانیشـەوە، گێڕدراوەتـەوە، وە ئـەوەی تێدایـە کـە: (خـوا دەسـتی خستە نێوان شانەکانم تـاکو ساردایی سـەرە پەنجـەکانیم لە سـینەمدا هەسـت پێکـرد) وە ئـەم فەرموودەیـە لە شـەوی میعـراج دا نەبووە، بەڵکو ئـەو ڕووداوە لە مەدینـە بووە، نەك مەککە، کەواتـە: زانیمان ئەم فەرمـوودەیـە باسی خەونێـك دەکـات، کە لـە خــەودا بـووە، وە لـە مەدینـــەش بـووە، وەك ڕوونکراوەتـەوە لـە زۆربـەی گێڕانەوەکانـدا، کـە خـەونێك بـووە لـە کـاتی خەوتنـدا، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە خـەونی پێغەمبـەرانیش وەحییـە، بـەڵام خـەونێکی کـاتی بێـداریی نەبــووە، لـە شـــەوی میعـراج دا، وە بێگومان مسـوڵمانان لەســەر ئەوە یەکدەنگن کە، پێغەمبـەر ﷺ بـە چاوی خـۆی لەسەر زەوی پـەروەردگـاری نەبینیـوە.

## ٢/ یەکـدەنگیـی ( إجمـاع )ی زانـایانی موعتـەبـەر لەسـەر دیتـنـی خـوا، لە خـەون دا :

زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان لەســەر ئـەوە ڕێککەوتــوون، کـە خـوای مـەزن لـە خــەوندا دەبینــرێ، ئەگـەر نەڵـێم هـەموویان، چـونکە هەنـدێك لـە زانایـان دەڵێن: هـەموو زانـاو پێشـەوایان یەکدەنگن، بۆ نموونــە:

أ/ (النــووي) لــە کـتێبــی (شـرح صـحیح مسـلم)دا دەڵــێ: (قَـالَ القَاضِــي وَاتَّفَــقَ العُـلَمَاءُ عَلَـى جَـوَازِ رُؤيَـةِ اللّٰهِ تَعَالـى فِـي الـمَنَامِ وَصِحَّتِهـا وَإِنْ رَآه الإِنْسَـان عَلَـى صِفَة لا تَلِيق بحَالِهِ مِنْ صِفَاتِ الأَجْسَام لأَنَّ ذَلِكَ المرئِـي غَير ذَاتِ اللّٰهِ تَعَالَـى إِذْ لا يَجُـوز عَلَيْـهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَـى التَّجَسُّـم ولا اخْـتلاَف الأَحْوَالِ بخِلاَف رُؤْيَـةِ النَّبِـي ﷺ)[٢]، واتــە: قاضـی عیـاض گوتوویــەتی: زانایــان لەســەر ئـەوە یـەك دەنگن، کە دەگونجـێ خـوای بەرز لە خـەوندا ببینــرێ، وە ڕاسـتە کـە ببینـرێ، بـا ئینســان بە شـێوەیەكو لەسـەر سیفەتێکیش ببینـێ کـە سیفەتی جەسـتان بـێو

١) مجموع الفتـاوى، ج ٣ ، ص ٣٧٨.

٢) ج ١٥، ص ٢٥.

شایستەی خـوا نەبـێ، {بـۆ وێنـە: لـە شـێوەی بەشـەردا ببینـێ، یـان لـە شـێوەی ڕووناکییدا ببیینێ}، چونکە ئا ئـەو بینراوە، بریتـی نیە لـە خـودی خـوای بـەرز، {بـەڵام خـوای بـێوێنـە، لـە وێنـەی شـتێك دا خـۆی دەخـاتە بەرچاو}، چـونکە ناگونجـێ خـوا ﷻ بجەسـتێ، وە ناشگونجـێ لـە شـێوەی جـۆراو جـۆردا ببینـرێ، بـە پێچەوانەی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ {کـە لـە شـێوەی جـۆراو جـۆردا دەبینـرێ، کـورد لە بەرگـی کـوردیدا دەیبینـێ، عـەرەب لـە بـەرگی عـەرەبی دا، هیندییـەك لـە بەرگی هینـدیـیداو ...هتد، وە هەر کەسـەش بە زمانی خـۆی دەیدوێنـێ}[1].

ئنجا ئەو دەقـەی هێنامـان لـە (قاضـي عيـاض)ەوە، وێـڕای ئـەوە کـە (النـووي) هێناویـەتی، هـەر کـام لـە (إبـن حجـر العسـقلاني) خـاوەنی (فـتح البـاري)[2]، وە (إبن الحـاج) لە (المدخل)[3]یـش دا، هێنـاویـانە.

ب - (الدَّارِمِي) لە (السنن)ی خـۆی لـەژێر ناوونیشـانی: (بـاب رؤيـة الـرّب فـي النـوم) {باسی بینینـی پەروەردگـاری بەرز لە خـەوندا} دەڵـێ: {أَخْبَرَنَا نُعَيْمُ بْنُ حَمَّادٍ عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ قُطْبَةَ عَنْ يُوسُفَ عَنْ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: مَنْ رَأَى رَبَّـهُ فِي الْمَنَـامِ، دَخَلَ الْجَنَّـةَ} (أَخْرَجَهُ الدَّارَمِيُّ بـرقم: (٢١٥٠)[4])[5]، واتـە: نوعـەیمی کـوڕی حـەمماد لـە عەبدولحەمیـدی کـوڕی عەبـدوڕڕەحمان لـە قوتبـەوە ئەویش لە یوسـفەوە، هـەواڵی پێداین کـە ئیبنـو سیـرین (کـە یەکێکە لـە زانایـانی تابیعییـنو کتێبـی تەعبیـری خەونانیشـی هەیـە) گوتوویـەتی: هـەر کەسـێك پەروەردگاری خـۆی لە خـەوندا ببینـێ، دەچێتـە بەهەشـت.

---

١) ئـەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

٢) فتح الباري، ج ١٢، ص ٣٧٨.

٣) المدخل، ص ٢٩٠.

٤) ج ٢، ص ١٧٠.

٥) نعـيم بـن حمـاد: صـدوق كـثير، الخطـأ والـوهم، ويوسـف: هـو يوسـف بـن ميمـون القرشـي المخزومي: قال المزي: قال أبو طالب، عن أحمد بن حنبل: يوسف الصباغ مولى آل عمرو بن حريث ضعيف، ليس بشيء، وقال أبو زرعة: واهي الحديث، وقال أبو حاتم: ليس بالقوى، منكر الحديث جداً، ضعيف، وقال البخاري: منكر الحديث جداً، وقال النسائي: ليس بالقوى، وقال في موضع آخر: ليس بثقة، وقال الدار قطني: ضعيف.

ج - یەكێكی دیكە لەو زانایانە كە باسی بینینی خوا دەكات (إبن تیمیة الحراني)یە ڕەحمەتی خوا لە هەموو زانایانی ئیسلام بێ، لە كتێبی (منهاج السنّة النبویة)دا دەڵێ: {ومما یشبه المثال العلمي: رؤیة الرَبّ تَعَالى فِي المَنَام فَإِنَّهُ یُرَى فِي صُور مُخْتَلِفَة، یراه كُل عَبْدٍ عَلَى حَسَب إیمَانهِ، وَلَمَّا كَانَ النَّبِي ﷺ أَعْظَم إیْمَانَاً مِن غَیرِهِ، رَآهُ فِي أَحْسَن صُورَة، وَهِيَ رُؤْیَة مَنَام المَدِینَة كَمَا نطقت بذَلِكَ الأَحَادِیث المَأثورة}[١]، واتە: وە لەوەی كە وەك وێنەی زانستیی دەچێت، بینینی خوای بەرزە لە خەونــدا، خوای بەرز لە شێوەی جیاجیادا دەبینرێ، هەر بەندەیەك بە پێی ئیمانی خۆی خوا دەبینێ، ئنجا لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئیمانی لە هی هەموو كەس مەزنترو تەواوتر بووە، بۆیە خوای بەرزو مەزنی لە جوانترین شێوەدا بینی، كە ئەویش خەونێك بوو لە مەدینە بینی، وەك لە فەرمودە گێڕراوەكان دا هاتوە.

هەڵبەتە مەبەستی (إبن تیمیة)دا لەوەدا كە دەڵێ: خەونێك بووە لە مەدینە بینیویەتی، ئەوەیە كە وانەزانرێ، ئەو دیتنەی پێغەمبەر ﷺ بۆ خوا مەبەست پێی: شەوی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (لیلة الإسراء والمعراج) بووە.

هەروەها هەر (إبن تیمیة الحراني) لە (مجموع الفتاوى)دا گوتوویەتی: {وَقَدْ یَرَى الْمُؤْمِنُ رَبَّهُ فِي الْمَنَامِ فِي صُوَرٍ مُتَنَوِّعَةٍ عَلَى قَدْرِ إیمَانِهِ وَیَقِینِهِ}[٢]، واتە: وە ئیماندار جاری وا هەیە پەروەردگاری خۆی لە خەوندا دەبینێ، لە شێوەی جۆراو جۆردا، بەپێی ئیمانەكەیو یەقینەكەی.

### ٣/ ناوی ژمارەیەك لە زاناو پێشەوایان ـ وەك نموونە ـ كە خوای بەرزو مەزنیان لە خەون دا، دیوە:

دیارە من ناوی هەژدە (١٨) كەسم هێناوە لەو كتێبە هەر ئەوەندەیانم لێ وەرگرتوە، ئەگەرنا بۆخۆی ناوی زۆر زیاتری هێناوە[٣]:

---

١) ج ٥، ص ٣٨٣.

٢) ج ٣، ص ٣٩٠.

٣) باسی زیاتر لە حەفتا (٧٠) كەسی كردوە، بڕوانە: ص ٦١ ـ ٩٧.

١ - (حسن بن علي بن أبي طالب) وەك (الصّالحي) لە كتێبی (سبل الهدی والرشاد) بەرگی (١١)، لاپەڕە (٢٨٤)دا هێناویەتی، كە خوای بەرزو مەزنی لە خەون دا بینیوە.

٢ - (الحسن البصري) وەك لە (إبن الجَزَري) لە كتێبی (الزهر الفاتح) بەرگی (١) لاپەڕە (١١)دا هێناویەتی.

٣ - (رقبة بن مصقلة) وەك (الطبراني) لە (المعجم الأوسط) بەرگی (٣)، لاپەڕە (٣٧٩)، وە (إبن الجعد) لە (مسند) لە بەرگی (١)، لاپەڕە (١٩٨)، وە (البيهقي) لە (شعب الإيمان) بەرگی (٣)، لاپەڕە (١٦٤)، وە (إبن حبان) لە كتێبی (الثقات) بەرگی (٤) لاپەڕە (٣٠١)، وە (إبن الجوزي) لە كتێبی (المنتظم) بەرگی (٨) لاپەڕە (٤٢) دا، ئەو بەسەرهاتەیان هێناوە.

٤ - (علي بن الموفق) (البيهقي) لە (شعب الإيمان) بەرگی (٣)، لاپەڕە (٥٠١)، وە (الغزالي) لە (إحياء علوم الدين) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٤١)، وە (إبن المفلح) لە (المقصد الأرشد في ذكر أصحاب أحمد)دا باسی ئەوەیان كردوە كە (علي بن الموفق) خۆی باسی كردوەو گوتوویەتی: من لە خەوندا بە خزمەت پەروەردگارم گەیشتووم.

٥ - (إبراهيم بن أدهم) وەك (إبن الجوزي) لە كتێبی (صفة الصفوة) بەرگی (٢) لاپەڕە (٣٤٢)، وە (أبو طالب المكي) لە كتێبی (قوت القلوب) بەرگی (٢) لاپەڕە (١٠٨٢)، وە (الترمذي) لە (نوادر الأصول) بەرگی (١) لاپەڕە (٣٩١)، وە (الصفوري) (نزهة المجاس) بەرگی (١) لاپەڕە (٧١)دا هێناویانە.

٦ - (الإمام أبو حنيفة) وەك (حاشية البجيرمي على الخطيب) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٤٣١)دا، هەروەها (شرح الحَصكفي) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٥١)دا، وە (شذرات الذهب) لە بەرگی (٣) لاپەڕە (٢٥)، هەر كام لەو سێیانەش خەون دیتنی ئەبو حەنیفەیان بە خوای بەرزەوە نەقڵ كردوە، تەنانەت لە هەندێكیان دا هاتوە كە (أبو حنيفة) گوتوویەتی: سەد (١٠٠) جار لە خەونم دا بە خزمەت خوای پەروەردگار گەیشتووم.

٧ - (الإمام الشافعي)، کە (عبدالمجید العدوي) لە لاپەڕە (١٥٨)ی کتێبی (التحفة المرضیة) دا هێناویەتی، کە خوای بێهاوەڵی لە خەون دا دیوەو لە کێشەیەکی گەورەی (هارون الرشید) دەربازی بووە .

٨ - (أبو یزید البسطامي)، کە (إبن الجوزي) لە کتێبی (صفة الصفوة) بەرگی (٢) لاپەڕە (٣١١)دا، وە (إبن تیمیة) لە (مجموع الفتاوی) بەرگی (٢) لاپەڕە (٣١٥)دا، وە (إبن القیم) لە (مدارج السالکین) بەرگی (٢) لاپەڕە (٣)دا، وە (طبقات المناوي الکبری) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٤٥٢)دا، هەروەها (الشاطبي) لە (الإعتصام) بەرگی (٢) لاپەڕە (٢٦٠)دا، باسیان کردوە کە (أبو یزید البسطامي) لە خەونی دا بە خزمەت خوای پەروەردگار گەیشتوە.

٩ - (الإمام الأوزاعي) هەر یەك لە (الأصفهاني) لە (حلیة الأولیاء) بەرگی (٦) لاپەڕە (١٤٢)دا، وە (إبن الجوزي) لە (صفة الصفوة) بەرگی (٢) لاپەڕە (٤١٨)دا، وە لە (المنتظم) بەرگی (٨) لاپەڕە (١٩٨)دا، وە (تأریخ دیمشق) بەرگی (٢) لاپەڕە (٤١٨)دا، وە (إبن کثیر) لە (البدایة والنهایة) بەرگی (١٠) لاپەڕە (١١٧)دا، باسی خەونی ئەو پێشەوایەیان کردوە، بە خوای پەروەردگارەوە.

١٠- (الإمام أحمد بن حنبل) (الخلاّل) لە کتێبی (المجالس العشرة) بەرگی (١) لاپەڕە (٤٥)دا، وە (الدمیري) لە (حیاة الحیوان) بەرگی (١) لاپەڕە (٥١)دا، وە (الذهبي) لە (السِّیَر) بەرگی (١١) لاپەڕە (٣٤٧)، وە (الغزالي) لە (الإحیاء) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٤٧)دا، باسی لە خەوندا بینینی خوای پەروەردگاریان کردوە، لەلایەن ئیمام ئەحمەدەوە.

١١- (الحکیم الترمذي) کە یەکێك لە فەرموودەناسانە، جیا لە (الترمذي) خاوەنی (السنن)، کە (حاشیة البجیرمي علی الخطیب) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٤٣١)دا، وە هەروەها لە کتێبی (بریقة محمودیة) لە بەرگی (١) لاپەڕە (١٦٥)دا، وە (طبقات المناوي الکبری) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٥٨٩)دا، وە (الدمیاطي) لە کتێبی (إعانة الطالبین) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٤٧)دا، باسی ئەوەیان کردوە کە (الحکیم الترمذي) گوتوویەتی: زۆرجاران لە خەون دا بە خزمەت خوا ﷻ گەیشتووم.

١٢- (علي بن الخطاب الجزيري) كە هەر یەك لە (المناوي) لە (طبقات المناوي الكبرى) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٦٣٢)دا، وە (الشعراني) لە (لطائف المنن للشعراني) لە لاپەڕە (٧١٨)دا هێناویانە، كە خەونی بە خوای تاكەوە بینیوە.

١٣- (علي بن وهب السنجاري) وەك (المناوي) لە (طبقات المناوي الكبرى) لە بەرگی (١) لاپەڕە (٦٩١)دا باسی كردوە، كە خەونی بە خواوە بینیوە.

١٤- (أبو إسحاق الإسفرائيني) وەك (إبن العربي) لە كتێبی (عارضة الأحوذي) لە بەرگی (١٢) لاپەڕە (١١٧)دا هێناویەتی، كە خەونی بە پەروەردگاریەوە بینیوە.

١٥- (الإمام أحمد الرفاعي) وەك (الشعراني) لە كتێبی (الطبقات الكبرى للشعراني) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٨٩)دا هێناویەتی، كە لە خەونی دا بە خزمەت خوای بەرزو مەزن گەیشتوە.

١٦- (عبدالوهاب الشعراني) وەك لە كتێبی (لطائف المنن) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٨٩)دا گوتوویەتی: دوو جاران لە خەون دا شەرەفی دیتنی خوای بەرزو مەزنم پێبڕا.

١٧- (الآلوسي صاحب التفسير) وەك لە تەفسیرەكەی خۆی (روح المعاني) لە بەرگی (٩)، لاپەڕە (٥٢)دا، باسی كردوە، كە خوای پەروەردگاری لە خەون دا بینیوە.

١٨- (الملا رمضان البوطي) بابی دكتۆر (محمد سعيد رمضان البوطي)یە، كە كوردەو خەڵكی بۆتانەو بەداخەوە لە هەلومەرجێكی ناخۆش دا لە سوریا كوژرا، دیارە نووسەری ئەو كتێبە كە من ئەو شتانەم لێ خواستۆتەوە دەڵێ: لە ساڵی (١٤٢٥)ی كۆچیی دا، لەگەڵ (توفيق)ی نەوەی دا، كە كوڕی دكتۆر (محمد سعيد رمضان البوطي)یە، پێكەوە بووین لە سەفەری حەج دا، لە (مِنى) ئەو خەونەی باپیری بۆ گێڕامەوە، كە لە نەخۆشیی مەرگی دا، لە خەونی دا، قیامەت هاتوەو، خوای بێ هاوەڵی بینیوە .

١٩- كۆتا كەس خۆمم كە باسم كردوە، دیارە من نزیكەی حەفتەیەك پێش گیرانم لەلایەن ئەمریكییەكانەوە، لە ( ١٠ / ٧ / ٢٠٠٣) دا لە خەون دا بەخزمەت خوای پەروەردگار گەیشتم، كە ئەمەش دەقی ئەو خەونەیە:

لە خەونـم دا بینیـم خـوای بـەرزو مـەزن لـە ئاسـمانێ هـاتە خـوارو، منـی لەگەڵ خۆی دا بردو بە پێنـج شوێن دا ـ کە لە شێوەی ژوور دابوون ـ گێڕامـی، لە هـەر ژوورەدا ماوەیـەکی کەم دەمامەوە، پاشـان کە لـە ژووری پێنجـەم تـەواو بوویـن، هەسـتم کـرد خـوای بەخشـەرو بەخشـندە لەگـەڵ خـۆی هێنـامیـەدەر، یەکسـەریش دوای ئـەوە بێـداربوومـەوە.

بەڵام ئەوەی بۆ مـن جێـی سەرنج بوو ئەوەبوو، کە لە کـاتی گەڕانـم بـە نێـو ژوورەکان دا، هەستم بە ناڕەحەتیـیو دڵتـەنگیی دەکـرد !

شایانـی باسیشـە: ئـەم خـەونـەم دواتـر لـە سـەدا سـەد (١٠٠/١٠٠) هـاتەدی، چونکـە لـە مـاوەی گیـرانی بیسـتو دوو مانگـەو (٦٥٩) ڕۆژەدا، لـە لایـەن ئەمریـکاوە، پێـنج شـوێنیـان پێکـردمو، هـەر کاتێك دەیـانبـردم بـۆ هـەر کـام لـە ژوورەکـانو سـەرنجم دەدایـە: ئـەو ژوورانـەم دەهاتنـەوە بەرچـاو، کـە لـە خەونەکـەم دا پێیـان دا گـەڕابوومو، هـەر لـەو کاتـەش دا، لـە تەعبیـری خەونـەکەم حاڵی بوومو، زانیـم کـە ئـەو دڵتـەنگییـەم یانـی چـی ؟ وە لـەوەش حاڵی بووم کـە دەربازکرانیشـم هـەر لـە لایـەن خـوای میـهرەبانەوە بـوو، چ لـە خـەونەکەم داو چ لە حاڵـەتی واقیعی دوای خەونەکەشم دا.

چونکـە بێـگومان هۆکارەکـانیش هـەر بەشـێکن لـە قـەدەری خـواو، لـە ژێـر ڕکێفـی ویسـتی ڕەهـاو حەکیـمانەی خـوادا کـاردەکـەن !

هـەروەها ئێستاش پـاش چاپ[١] و بڵاوکرانەوەی ـ کتێبـی یـان ڕاسـتتـر بڵێـم: مـەوسووعـەی: (الإسلام كما يتجلىّ في كتاب الله عز وجل) ـ کە هیـوادارم کەلێـنێـکی بـاش بگـرێو، خـوا هێـزوپێـزێکی زۆری تێبخـات، زیاتـر لـە حیـکمەتـی ئـەو مـاوە مانەوەیـەم لـە زینـدان دا، تێگەیشـتووم، چونکـە هەفتـەیەك بەر لە ڕزگـاربوونـم، لە پاکنووس کردنی ئەو کتێبـەم بوومـەوە!

---

١) ئـەو کتێبـەم لـە چـاپی یەکـەمی دا، بـە هەشـت بـەرگو، لـە دەوری (٣٥٠٠) لاپـەڕەدا، چـاپو بڵاوکرایەوە.

دیارە لـە چاوپێکەوتنێکیش دا کـە لەگەڵـم کـرا، وە دەربـارەی بەنـدکرانم بـە ناوی: (ئەشـکەنجەو زینـدان) کـە ئێسـتا وەك کـتێب، چـاپکـراوە[1]، باسـی ئـەو خەونەم کردوە، ئنجا لەوبـارەوە هەندێ خەڵك ڕەخنـەو تێبینـی یـان هـەبوو کـە گوایـە من قسـەیەکی ناشـەرعییم کـردووەو قسـەیەکی ناهـەقم کـردوە ! بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وانیـە، ئەوەتـا ئـەو هـەموو زانایانـەی باسـم کـردوون، کـە هـی وایـان هەبووە گوتوویەتـی: دووجـارو سـێ جـارو، تەنانـەت هـی وایان هەیـە گوتوویـەتی چـل جـارو بگـرە هـی وایـان بـووە، گوتوویـەتی: سـەد (١٠٠) جـار بـە خزمـەت خـوای پەروەردگـار گەیشـتووم لە خـەون دا !

**مەسـەلەی یـازدەیـەم:** کە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾، (لطيف)، لـە (لطـف)ەوە هــاتوە، واتــە: نــەرمو نیــانیی‌و پــەنهانیی‌و ئــارامیی، (خـبیر)یـش لــە (خُبرة)ەوە هـاتوە، واتـە: شـارەزا، خــوای بـێ وێنـە بـەم دوو سـیفەتە خـۆی وەسـف دەکات، دەفـەرموێ: ئێوە بۆیە پەروەردگـار نابینـن، چونکــە خــوا (لطیـف)ە، بـەڵام کە (لطیـف)یشـە وا مەزانـن کە ئاگاداری ئێوەنیـە، بەڵکو ئاگاداری ئەوەیە کـە لەنێـو دڵ‌و دەروونیشـتان دایە، وە (لطـف) لە زمـانی عەرەبییدا بریتیــە لـە شـتی زۆر ورد لـە کـردەوە، کـە بـە چـاو نـەبینرێ، وەك دەگوتـرێ: فـلان کـەس زۆر (لطیـف)ە لـە کــردەوەدا، واتــە: زۆر نــەرمو نیــان‌و میهرەبــانە، وە وشــەی: (تَلَطُّفْ) واتــە: پەنهانکــاریی، وەك خــوا لــە ســوورەتی (الکـهف)دا بــاس دەکــات، دەفــەرموێ: ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ١٩﴾، واتە: بـا زۆر بـە ئەسـپایی‌و پەنهانیی بچـێ، وە وانەکـات کـە هیـچ کـەس هەسـتتان پـێ بکـات.

ئنجـا (لطیف) صیغەی موبالـەغەیـە، واتە: زۆر پەنهـان، یـان زۆر پەنهانکـار، کـە لە ئەسـڵدا (إسم فاعل)ەکەی (لاطِف)ە، وەك (آكِل، شآرِب) واتە: ئەو کەسەی دەخـوا، دەخـواتەوە، بەڵام (أكـيل وشَرِيب) واتە: ئەو کەسەی زۆر دەخـوا، زۆر دەخـواتــەوە.

(مُحَمَّد متَولّي الشعراوي) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا: (تفسـیر الشـعراوي) هەنـدێ

---

١) هـەروەها بە هـەردووك زمانی: عەرەبیی‌و فارسییش، چـاپ و بڵاوکراوەتـەوە.

قسەی زۆر جوان دەکات، دەربارەی (لُطف)ی خـوای بـە بـەزەیی، دەڵـێ: (فَمَظَاهِر اللّطْفِ لا حَصْـرَ لَهَـا، وَعَلَـى قـدر دقـة اللطـف تكـون دقـة مأتـاه وإحصـائه، فهـو اللطيف الـذي إذا ناديتـه لـبّاك، وإذا قصـدته آواك، وإذا أحببتـه أدنـاك، وإذا أطعتـه كافـاك، وإذا أعطيتـه وأقرضــته مـن فضـله ومالـه الـذي منحـك، عافـاك، وإذا أعرضـت عنـه، دعـاك، وإذا قربـت مـن الله، هـداك، الـّذي يجازيـك، إن وفيـت، ويعفـو عنـك، إن قصَّرت، مَنْ افتخر بـه، أَعـزَّه، ومـن افتقـر إليـه، أغنـاه، مَـنْ عطاؤه: خير، ومنْعُهُ: ذخيـرة)[1].

واتــە: دیاردەکــانی میهرەبــانیی خــوا، کورتهەڵنەهــاتوونو ناژمێردرێــن، خــوا لەگەڵتدا میهرەبانە، وە بە ئەندازەی وردیـی لوتفـی خـوا، دەبـێ بۆ پـەی پێبـردنـیو سـەرژمێـرکردنیشـی، وردەکاریـی هـەبێ، خـوا ئەو خاوەن میهرەبانییەیە، کـە ئەگـەر بانگـت کرد: وەڵامــت دەداتــەوە.

وە ئەگــەر بەرەو ڕووی چووی : پەنـات دەداتو، دەتگرێتـە خـۆی.

وە ئەگـەر خۆشـتویست : لە خۆییـت نـزیك دەخــاتەوە.

وە ئەگــەر فەرمانبـەرییت بۆ کـرد : پاداشـتت دەداتەوە.

وە ئەگەر پێت بەخشـیو لـەو ماڵــەی خۆی پێیـداوی قـەرزت پێـدا : سـەلامەتو سـەرفرازت دەکـات.

وە ئەگـەر ڕووت لـێ وەرگێڕا : بانگـت دەکـاتەوە.

وە ئەگەر لـێی نـزیك کـەوتیەوە : ڕێنمـاییت دەکـات.

.... وە ئەگــەر وەفـاداربووی بەرانبەری : پاداشــتت دەداتەوە.

وە ئەگـەر لەگـەڵیشی کەمتـەرخەم بووی، چاوپۆشـییت لێدەکـات.

... هـەر کەس شـانازیی پێـوە بکـات : عیززەتی پێ دەبەخشـێ.

هـەر کـەس هـەژاریی خۆی بۆ دەرببـڕێ : دەوڵـەمەنـدو بێنـیـازی دەکات.

---

١) تفسير الشعراوي، ج ٦، ص : ٣٨٤٩.

... خـوا ئەو کەسەیە کە ئەگەر پێت ببەخشـێ، بۆ تۆ چاکە.

وە ئەگـەر پێشـت نەبەخشـێ، بـۆت پەژمەنـدە دەکـاتو، لـە دواڕۆژدا پاداشـتت دەداتـەوە.

**مەسـەلەی دوازدەیـەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنۡ أَبۡصَرَ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ عَمِيَ فَعَلَيۡهَاۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ﴾، بێگومـان لـە پەروەردگارتانەوە بەڵگەو بەرچاوڕوونییەکان (بصائر)تان بۆ هـاتوون، {(بصائر) کـۆی (بصـیرة)یـە، جـا (بصـیرة) هـەم بـە مانـای بەڵـگە دێ، هـەم بـە مانـای بەرچاوڕوونیـی، دێ} هـەر کەسێك ببینـێ سوودەکەی بۆخۆیەتی، وە هـەر کەسێك کوێـر بێو سوود لەو بەڵگانەی خـوا نەبینـێ، زیـانی کوێـرییەکـەی بۆخۆیەتی، وە من بەسـەرتانەوە پارێـزەر نیـم.

لێـرەدا خـوا لـەسـەر زمـانـی پێغەمبەری خـوا ﷺ وا دەفەرموێ.

دیـارە خـوای پەروەردگـار ئاگـادارمان دەکـاتەوە کە ئـەم قورئانـە بەرچاوڕوونییە بـۆ ڕۆشـنکردنەوەی بەرچـاوی ئینسـان لـە بوارەکـانی : عەقیـدەو فیکـر، حـەڵاڵو حـەرام، ئـەمرو نەهـی، حـوکمو سیاسـەت دا، وە هەڵسوکەوتەکـان لـە گشـت بوارەکـاندا، ئنجا خـوا ﷻ دەفەرموێ: هەر کەسێك بەهـۆی ئەم بەرچاوڕوونییانەوە، بەهـۆی ئـەم قورئـانەوە، کـە عەقـڵو دڵو چـاوو گوێـی ڕۆشـن دەکەنـەوە، ببینـێ، قازانجی دیتـنـەکەی بۆخۆیـەتیو، بۆخۆی سـوود دەکـات، هـەر کەسێکیش کـوێر بـێو نەبینـێ، دیـارە زەرەرەکەی بۆخۆیـەتـی.

کەواتـە: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ ئەرکی ئەوە نیە کە خەڵك بپـارێزێ لـە گونـاهـو تاوانـانو ئاگـای لێیـان بـێو نەهێڵـێ خـراپـە بکەن، بەڵکو ئەرکی ئەوەیـە پـەیامو بەرنـامەی خـوایـان پـێ ڕابگـەیەنـێ، پێغـەمبەری خـوا ﷺ خـەڵکی پـێ لە گونـاهـو تاوان ناگێڕدرێتـەوە، بەڵـێ: پێی ئاگادار دەکرێنـەوە، بەڵام دیـارە خـوای پەروەردگار ئەو دەسـتەڵاتەی نـەداوە بە پێغـەمبەری خـوا ﷺ کە ڕێگـا نەدات خەڵك کـافربنو گونـاهـان بکـەن، چونکـە خەڵـك ناچـار نـاکرێو تۆبزییـان لـێ نـاکرێ، لەسـەر گـوێڕایەڵییکـردنـی خـوای باڵادەست.

**مەسەلەی سێزدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْأَيَٰتِ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾، واتە: وە بەو شێوەیە ئایەتەکانمان جۆراو جۆر ڕوون دەکەینەوە، لە چەند شوێنێك دا خوای پەروەردگار باسی ئەو مەسەلەیە دەکات، بۆ وێنە، دەفەرموێ: ﴿ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ﴿١٦٤﴾ ﴾البقرة، واتە: (خوا دەفەرموێ) بایەکانمان جۆراو جۆر کردوە، شەماڵە، ڕەشەبایە، لەولا دێ، لەملا دێ، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْأَيَٰتِ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆمان جۆراو جۆر دەخەینە ڕوو، بۆچی خوا ئایەتەکانی جۆراوجۆر کردوون؟ چونکە سروشتی ئینسان وایە، بە یەك جۆر شت ماندوو دەبێ، بۆیە خوا ئایەتەکانی جۆراو جۆری کردوون: باسی بوونەوەر، باسی ئیمانو عەقیدە، باسی عیبادەت، باسی ڕەوشت، باسی مێژوو، باسی حاڵەتە دەروونییەکان، جۆراو جۆرن.

ئنجا دەفەرموێ: ئایەتەکانی خۆمان جۆراو جۆر ڕوون دەکەینەوە، ﴿ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ ﴾، ئەو لام (ل)ە، زانایانی تەفسیر دەڵێن: لامی (عاقبة)یە، نەك لامی (علة)، چونکە خوای پەروەردگار ئایەتەکانی خۆی بۆ ئەوە نەناردوون، کە کافرەکان بڵێن: ئەی موحەممەد ! تۆ لە لای خەڵکی دیکە، خوێندووتە ﴿ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ ﴾، یانی: بۆ ئەوەی ئەوان سەرەنجام عاقیبەتیان بێتە سەر ئەوەی بڵێن: تۆ ئەم قورئانەت لەلای غەیری خۆت خوێندوە، چونکە کافرەکان وایاندەگوت.

دەڵێن : لە مەککە دو غولامیی ڕۆمیی هەبوون، نەصرانیی بوون، بە ناوی (یسار) و (جَبْر)، پێغەمبەر ﷺ جار جار لەگەڵیان ڕادەوەستا، دیارە لەگەڵیان ڕاوەستاوە: بانگیان بکاتو، بۆیان باسی ئیسلام بکات، قورەیشییەکان هیچیان بۆ نەماوە، گوتوویانە: ئەو دووانە موحەممەدیان فێری ئەو قورئانە کردوە !

وەك خوا لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: ئێمە دەزانین ئەوان دەڵێن: بەشەرێك فێری دەكات، زمانی ئەو كەسەی كە ئاماژەی بۆ دەكەن (كە ئەو غولامە ڕۆمییەیە) ئەعجەمییە (عەرەبیی باش نەزانیوەو ڕۆمیی بووە)، بەڵام ئەم قورئانە، بە زمانێكی عەرەبیی زۆر ڕوون هاتوە (كە خۆیان لە بەرانبەریدا دەستەوسانن) یانی: كابرایەكی ڕۆمیی كە خۆی باش عەرەبی نازانێ، چۆن قورئانێك فێری موحەممەد دەكات، كە ئێوە ناتوانن سوورەتێكی وەك وی بێنن ؟ بە دڵنیاییی ئەوە قسەیەكە ناچێتە هیچ عەقڵێكەوە[1].

ئنجا بۆ زانیارییتان ! ئەوانەی كە تۆزێك بە ئینصاف بوون، با كافریش بووبن، دانیان بە نابەشەریی بوونی قورئان دا هێناوە، یەكێ لەوانە (وەلیدی كوڕی موغەیرە) زۆر بە ڕوونو ڕاشكاویی، گوتوویەتی: ئەم قورئانە وەك قسەی بەشەر ناچێ، كە لەگەڵی بەراورد دەكەی، هیچ قسەیەك ناتوانێ بچێتە تای تەرازوویەوە، بەڵام كافرەكان گوتوویانە: فڵان كەس! ئەوە دیارە موحەممەد سیحری لێ كردووی، تۆشی هەڵخەڵەتاندوە[2]، ئەوان لە نەفسی خۆیاندا زانیویانە ئەم قورئانە قسەی مرۆڤ نیە.

واتایەكی دیكە: خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ﴾، ئێمە ئایەتەكانی خۆمان جۆراو جۆر ڕوون دەكەینەوە، با ئەوانیش هەموو پشكو بەشیان

---

١) بۆ هۆی هاتنەخواری ئەو ئایەتە بڕوانە (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج ٢، ص: ٤٢٢، كە ئەم دەقەی هێناوە: ﴿ عن عبيد بن مسلم الحضرمي، قال: كان لنا غلامان نصرانيّان من أهل عين التمر، يُسمّى أحدهما: يَسار، والآخر : جَبْر، وكانا يقرآن كتاباً لهما، فَربّما مَرَّ رسول الله ﷺ فقام عليهما، فقال المشركون: إنّما يتعلّم محمدٌ منهما، فأنزل الله هذه الآية.﴾ أخرجه الطبري في جامع البيان: (١٤/١٢٠)، والواحدي في أسباب النزول، ص: ١٩٠، والبيهقي في الشعب : ١٣٨، قلنا : وسنده صحيح.

٢) بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج ٣، ص ٤٧٥.

لەم قورئانە گەورەیەدا ئەوە بێ، کە تۆمەتی ئەوە بدەنە پاڵ تۆو بڵێن: خوێندووتە ﴿وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ﴾، واتە: لە لای غەیری خۆت، ئەم قورئانە فێربووی، ﴿وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾، وە با ئێمەش ڕوونی بکەینەوە بۆ کۆمەڵێك کە بزانن، واتە: تەنیا کەسانێك قەدرو پایەی قورئان دەزانن، کە زانیارییان هەبێ، بۆیە ئێستا زانای وا هەیە لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا یەك ئایەتی لە قورئان بینیوە، کە باسی حەقیقەتێکی زانستیی دەکات، کە لە سەدەی بیستو یەکدا ئاشکرا بووەو پێشتر نەزانراوە، گوتوویەتی: ناگونجێ ئەمە قسەی ئینسان بێ، چونکە ئەم نهێنییە لە سەدەی ئێمەدا ئاشکرابووە، بۆ وێنە: دەریاوانێکی زۆر گەورەی ڕۆژئاوایی کە هەموو ژیانی لە دەریاوانیی دا بردۆتە سەر، دوای ئەوەی یەکێك لە زاناکانی ئیسلام ئەو ئایەتەی سووڕەتی (النور)ی بۆ دەخوێنێتەوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾، واتە: یان وەك تاریکاییەکان لە دەریایەکی شەپۆلاویی دا، کە شەپۆلێك دایدەپۆشێ لە سەروویەوە شەپۆلێکی دیکە هەیە، لە سەروویەوە هەور هەیە... دیارە دواییی لە سەدەی بیست زانرا کە لە سەرووی شەپۆلە ڕواڵەتییاکانەوە، شەپۆلی ژێریی هەیە، هەتا (غَوّاصة) دروست نەکرا، نەدەزانرا ئەو شەپۆلانە هەن، گوتوویەتی: کێ موحەممەدی فێر کرد؟ خۆ ئەوە لە سەدەی ئێمەدا دۆزراوەتەوە؟[1].

یان ئەوە کە هەموو ڕووەکێك نێرو مێی تێدایە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾﴾الذاريات.

---

١) بڕوانە: کتێبی: (آيات أسلم قارئوها)، ص ١١، ئەو زانایەش ناوی (مستر براون)ە.

یان ئەوە کە بوونەوەر پێش ئەوەی بەم شێوەیە دروست بکرێ، لە شێوەی ماددەیەکی وەك دووکەڵ دا بوو: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ﴿١١﴾ ﴾فصلت.

یان ئەوە کە هەموو زیندەوەرێك لە ئاو دروست بووە: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنبياء، وەك من لەو کتێبەی کە لە زیندان نووسیوومە (الإِسْلام كَمَا يَتَجَلّى فِي كتاب الله عزّ وجل) ئاماژەم بە ژمارەیەکی زۆر لەو ئیعجازە زانستییانە کردوە، نزیکەی سی (٣٠) وێنەم هێناوەتەوە، کە هەموویان دوای ئەوەی زانیاریی بەرەو پێشەوە چوو، ئەو ڕاستییانە دۆزراونەوەو، قورئانیش ئاماژەی پێکردوون.

بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾، ئەم قورئانە ڕوون دەکەینەوە بۆ کۆمەڵێك کە بزانن، یانی: ئەگەر زانیارییان هەبێ، دەزانن کە ئەم قورئانە لەلایەن خواوە هاتووە، پێغەمبەری خوا تەنیا وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی قورئانی لەسەر بووە.

با جارێکی دیکەش تەماشای وشەکان بکەینەوە:

(نُصَرِّف): یانی: (نُنَوِّعُ) واتە: جۆراو جۆر دەکەین.

(الآیات): دەگونجێ مەبەست ئایەتەکانی قورئان بێ، ﴿ نُصَرِّفُ ٱلْأَيَٰتِ ﴾، نیشانەکانی خۆمان بە جۆراو جۆر ڕووندەکەینەوە، وە دەشگونجێ مەبەست غەیری ئایەتەکان قورئانیش بێ: واتە: دیاردە سروشتییەکان، یان ئەو ڕووداوانەی کە ڕوو دەدەن، نیشانەن لەسەر ئەوە کە خوا خاوەنی ئەو بوونەوەرەیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ ﴾، ئەم وشەیە بە چەند شێوەیەك خوێنراوەتەوە:

أ/ بەپێی خوێندنەوە (قراءة)ی (حَفْص) ئاوا دەخوێنرێتەوە: ﴿ وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ ﴾.

ب/ بەڵام (إبن كثير و أبي عمرو) کە دوو لە قورئان خوێنە گەورەکانن، ئاوایان

خوێندۆتەوە: (وَلِيقُولوا دَارَسْتَ)، با بڵێن: موداڕەسەت كردووە، لەگەڵ خەڵكی دیكەدا فێری بووی.

ج/ هەروەها (إبن عامر) ئاوای خوێندۆتەوە: (وَلِيقُولوا دَرَسَتْ)، یانی: (فنيت) واتە: ئەم قورئانە كۆتایی پێهات.

د/ وە بە (دُرِسَتْ)یش خوێندراوەتەوە، كە بە مانای ئەوەی پێشوویە، هەروەها بە: (دَرَّسَتْ)یش خوێندراوەتەوە، كە هەمان مانای هەیە، بەلام وەك گوتمان قیرائەتی بەناوبانگ ئەوەی (حَفْص)ە، كە ئاوای خوێندۆتەوە: ﴿وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ﴾، بەلام وەك پێشتر گوتمان: (ل)ەكەی لامی عیللەت نیە، چونكە خوا قورئانی بۆ ئەوە نەناردوە، كە ئەوان تۆمەت پاڵ بدەنە لای پێغەمبەر ﷺ، بۆیە دەڵێین: (ل)ی عاقیبەتە، وەك خوا لە سوورەتی (القصص)دا دەربارەی ئەوە كە بنەماڵەی فیرعەون مووسایان بە مەلۆتەكەیی لە سندووقەكەدا هەڵگرتەوە، دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۚ ٨﴾، واتە: وە دارودەستەی فیرعەون هەڵیان گرتەوە، كە سەرەنجام بۆیان بووە دوژمنو مایەی دڵتەنگیی و پەژارە.

كە بێگومان ئالی فیرعەون كە مووسایان هەڵگرتۆتەوە، بۆ ئەوەیان نەبووە ببێ بە دوژمنو مایەی خەمباریی، وە سەرەنجام فیرعەون لەسەر دەستی مووسا كۆتایی پێ بێ، بۆیە ئەو (ل) لامی عاقیبەتە، واتە: بۆ ئەوەی سەرەنجام وای لێ بێ، ئەگەرنا ئەوان بۆ ئەوەیان هەڵنەگرتۆتەوە ببێتە هۆكاری فەوتانی ئالی فیرعەون، چونكە هیچ كەسێك بە دەستی خۆی زەرەر لە خۆی نادات.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾، لە قورئاندا لە چەند شوێنێك ئاماژە بەوە كراوە كە ئەهلی عیلم، واتە: ئەوانەی شارەزان و زانان قەدری قورئان دەزانن، بۆ وێنە:

١) لە سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ۝٦ ﴾، واتـــــــــە: ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، دەزانن کە ئەوەی بۆ تۆ نێردراوە لە پەروەردگارتەوە، هەقە، وە ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێبازی خوای زاڵی ستایشکراو.

ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، لە هەر لقێکی زانیاریی دا ئینسان شارەزا بێ، دەزانێ قورئان ئاماژەیەکی بۆ کردوە، بۆ وێنە: بوارەکانی: پزیشکیی، یان دەروونناسیی، یان زەویناسیی، یان مێژووناسیی، یان کۆمەڵناسیی... هتد، هەر کەسێك لە هەر بوارێك شارەزابێ‌و لە قورئان وردبێتەوە، دەزانێ کە قورئان ئاماژەی بە مەسەلەیەك یان زیاتر لەو بوارەدا کردوە، کە ئەو لێی شارەزایە، بۆ نموونە: خوای پەروەردگار کە باسی چیاکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ۝٧ ﴾ النبأ، واتە: چیاکانمان کردوون بە گوڵمیخ، چونکە (أوتاد) کۆی (وتد)ەو بەو سینگە دەگوترێ، کە چادرو ڕەشماڵی پێ ڕادەگیرێ، یاخود وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە، کە هەمیشە بەشی زۆری لە زەویدایەو، بەشی کەمی لە دەرەوەیە، کە کاتی خۆی ئەوەیان نەزانیوەو، دوایی کە زانستی زەویناسیی (جیۆلۆجیی) بەرەو پێشەوە چوو، بۆیان دەرکەوت کە هەموو چیایەك، تەنانەت چیای (هیمالایا) کە بەرزترین چیایە، چەندی لە دەرەوەیە، شەش، حەوت هێندەی لە زەویدایە، بۆیە خوای پەروەردگار تەشبیهی کردوە بە گوڵمیخ‌و سنگ.

بۆیە هەر کەسێك کە پسپۆڕو شارەزایە لە بوارێك دا، ئەگەر تەماشای قورئان بکات، بۆی دەردەکەوێ کە ئەم قورئانە لەسەر دەستی موحەممەد ﷺ نەهاتوە، نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو زۆر مەسەلەی تێدا باسکراون، کە لەو سەردەمەدا، ئەو زانیارییانە نەبوون،

٢) هەروەها لەوبارەوە خوا ﷻ لە سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ

﴿ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: تۆ ڕەوانەکراونی، بڵێ: خوا بەسە، شایەد بێ لە نێوان منو ئێوەدا (یانی: خوا شایەدە)، کە ئەم قورئانەی پێداوم، (وەك بەڵگە) وە ئەوانەی کە زانیاریی کتێبیان لەلایە (جا زانیاریی کتێب، چ هی کتێبی خوایی، چ زانیاریی هەر کتێبێکی دیکە. واتە: ئەوانەی کە زانان)، ئەوانەش شایەدبن کە من ئەو قورئانەم لە خواوە هێناوەو بۆخۆم دام نەناوە.

٣) هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)دا کە دەفەرمویٚ: ﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ ﴾، واتە: تۆ بڵێ: ئیمانی پێ بێنن، یان ئیمانی پێ نەهێنن، ئەوانەی کە لە پێش (قورئان)دا زانیارییان پێدراوە، هەر کاتێك بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، لەپەڕوو سەجدە دەبەن، وە دەڵێن پاکیی بۆ پەروەردگارمان، بەڵێنی پەروەردگارمان هاتە دی.

بەڵێ خاوەن کتێبە پێشووەکان هەموویان چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەری کۆتایی بوو ون، وە زانیویانە ئەو پێغەمبەرە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی دێو پەیامەکەشی گشتییە، نەك وەك پێغەمبەرانی دیکە، کە هەر یەکەیان بۆ گەلێك یان چەند گەلێك هاتوون، بۆیە ئەوانەی کە بە ئینصاف بوون لە جوولەکەو نەصرانییەکان، وەك خوای دادگەر لێرەدا باسیان دەکات: ئیمانیان هێناوە، وەك کەعبی ئەحبارو سەلمانی فارسیی، ئنجا سەلمانی فارسیی بەسەرهاتی مسوڵمان بوونەکەی بە وردی گێڕاوەتەوە، کە پوختەکەی ئەوەیە: کە سەلمان کوڕی ئاغا دێیەك بووەو، هاتوە بۆ لای چەند خواپەرستێکی نەصرانیی، کە شارەزا بوون لە ئایین، پاشان لە ڕێی وانەوە دەچێتە شامو لەوێش دەچێتە لای زانایەکی نەصرانیی کە بابەیەکی تەماعکار بووەو، پاشان یەکێکی باشی دێتەجێو بەرلەوەی بمرێ، سەلمان دەڵێ: وەسیەتم بۆ بکە، دوای تۆ بۆ لای کێ بچم؟ دەڵێ: بڕۆ بۆ لای فلانکەس، ئەو لەسەر دینی ڕاست ماوەتەوەو نەصرانییەکی چاکە.

دوای ویش دووبارە بۆ لای یەکێکی دیکە دەچێ، وە ئەوەی کۆتایی یان دەڵێ: وەڵلاهی دوای من کەس نەماوە لەسەر ئایینی ڕاست بێو تەنیا خوابپەرستێ، هەموو خەڵك لایانداوە، بەڵام بڕۆ بۆ حیجاز بۆ مەدینە پێغەمبەری کۆتایی لەوێ دێو، هاتنەکەشی نزیك بۆتەوە، ئیدی ئەویش بەڕێ دەکەوێو، هەرچەندە پیاوێکی زۆر ئازا بووە، بەڵام ئەوانەی دەیبەن، دەیکەنە کۆیلەو دەیفرۆشن، دوایی دەست بە دەست دەڕوات تا دەگاتە مەدینە، لەوێ بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە.

پاشان کە پێغەمبەری خوا کۆچ دەکات لە مەککەوە بۆ مەدینە، دەچێ تەماشای دەکات، دەبینێ ئەو سیفەتانەی کە لە کتێبەکاندا باسکراون، ـ کە دیارە پێشتر لە زاناکانی نەصرانییەوە زانیونی ـ هەموویان لە پێغەمبەردا ﷺ، هەن، وە ئیمانی پێ دێنیو، دواییش پێغەمبەریش ﷺ زۆر ڕێزی لێناوە(١).

بە کورتیی ئەوەی ئەم ڕستە قورئانییە دەیگەیەنێ : ﴿وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾، ئەوەیە کە ئەوانەی زاناو شارەزاو چاوکراوەن، بە مەرجێك ئینصافیان هەبێ، زیاتر قەدری قورئان دەزانن، وەك گوتراوە: (قەدری زێڕ لە لای زێڕنگەرە)، ئێمەی مسوڵمانیش هەتا زەینمان فراوانتربێو، زانیاریی‌و شارەزاییمان زیاتر بێ، باشتر لە قورئان تێدەگەینو، چاکتر لێی بەهرەمەند دەبین، کەواتە: ئەگەر بمانەوێ زیاتر لە کتێبی خوا تێبگەینو بەهرەمەند بین، وە زیاتر قەدری بزانین، با هەوڵبدەین بازنەی زانیاریی شارەزایی خۆمان فراوانتر بکەین(٢).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) بڕوانە: (سِيَرُ أعلام النُّبلاء، للإمام شمس الدين الذهبي. ج١، ص ٥٠٥ ـ ٥١١، أخرجه أحمد (٥/ ٤٤١ ـ ٤٤٤)، وإبن سعد في "الطبقات" (٤/١/ ٥٣ ـ ٥٧)، و الجزري في "أسد الغابة" (٢/ ٤١٧ ـ ٤١٩)، وابن هشام في "السيرة" (١/ ٢١٤ ـ ٢٢١)، والطبراني في " الكبير" برقم: ٦٠٦٥ .... .

٢) لە کتێبی : ( با لە خزمەت قورئان دابین !) دا، چۆنیەتی باشتر لێ بەهرەمەندبوونی قورئانمان، تا ڕاددەیەکی باش، ڕوونکردۆتەوە.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان، دوازدە ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٠٦ تا ١١٧)، تەوەری سەرەکیی ئەم ئایەتە موبارەکانە کە لەبارەیەوە دەدوێن، بریتیە لە چەند ڕێنماییەکی خوای بەرزو مەزن، بۆ پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ، وە بڕوادارانی شوێنکەوتووی، لە بواری چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ نەیارەکانیان دا، واتە: لەگەڵ بێبڕوایانو هاوبەش بۆ خوا دانەراندا، وە خوای کاربەجێ لەوبارەوە چەند ڕاستییەکی گەورەو گرنگی خستوونە ڕوو، بۆ ئەوەی هەم پێغەمبەر ﷺ، وە هەم شوێنکەوتوانی پێغەمبەر ﷺ بەرچاو ڕوونو هۆشیارو بێدار بن، وە نەیارەکانیان وەك خۆیان بناسنو، چۆنیەتی بیرکردنەوەیانو هەڵسوکەوتیانو کەسایەتییانیانو هۆکاری بڕوا نەهێنانو، پشت کردنە هیدایەتی خوایانیان، بۆ ئاشکرابێ.

هەروەها لەم دوازدە ئایەتەدا، دڵدانەوەی خوای میهرەبان هەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ هەروەها دڵدانەوەی مسوڵمانانیش، وە پێناسەیەکی کورتو پوختی قورئانیش، خراوەتە ڕوو.

وە خوا ﷻ هۆشداریشی داوەتە پێغەمبەر ﷺو بڕواداران، کە بەهۆی ژمارەی زۆری گومڕابووانەوە، نەکەونە ژێر کاریگەریی و فشاریان، وە بەدوای ڕێچکەو ڕێبازەکانیان نەکەون.

﴿ ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ
شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ۗ وَمَا جَعَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ وَلَا تَسُبُّوا۟
ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ
عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ
أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ
إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ
وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ
وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ
يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَـٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ
إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾
وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم
مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِى حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ مُفَصَّلًا ۚ
وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ
ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ
إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ
أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١١٧﴾ ﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((شـوێن ئەو (بەرنامەیـ)ە بکــەوە کە لە پەروەردگارتـەوە بـۆت سـرووش کـراوە، جگە لــەو هــیچ پەرستـــراوێك نیـــە، وە ڕوو لــە هاوبەشـــدانەرەکان (و ئــازارو بانگەشـــەی خراپ)یـان وەرگـێڕە ﴿١٠٦﴾ وە ئەگـەر خــوا ویسـتبای هاوبەشـیان (بـۆ خــوا) دانـەدەنا، وە تۆشـمان بەسـەریانەوە نەکردۆتە پارێزەرو، تـۆ سەرپەرشـتیارو وەکـیل نـی بەسـەریانەوە (کە نەهـێڵی کــافر بن) ﴿١٠٧﴾ وە جنێـو بـەو (پەرستراو)انە مـەدەن کـە لـە جیاتی خـوا لێیـان دەپاڕێنـەوە، کە سەرەنجام ئـەوانیش دەستدرێژکارانەو بەبـێ زانیـاریی جنێـو بە خـوا بدەن! ئـاوا بـەو شـێوەیە (بـە گـوێرەی ویستـی ئازادانـەوەو هەڵبـژاردنیان) کـردەوەو ڕەفتـــاری هـــەر کۆمـــەڵێکمان بۆیـــان ڕازاندۆتـــەوە، پاشـــان گێڕانـــەوەیان بـــۆ لای پەروەردگـــاریانەو، هەواڵـــیان پـــێ دەدا بـــەوەی کـــە دەیانکـــرد ﴿١٠٨﴾ وە (کافرەکـان) سـوێندیان بـە خــوا خــوارد، بـە سـوێند خــواردنێکی جـەخت لەسـەر کـراو: کـە ئەگـەر نیشـانەیەکیان (لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرو قورئان بۆ بێ) بێگومان بـڕوای پـێ دێـنن، بڵێ: نیشانە (و موعجیزە)کان بەس لە لای خـوان، ئنجـا ئایــا ئێـوە (ئـەی بڕواداریـنە! کە زۆر سوورن لەسەر بڕواهێنانیان) چ شـتێك وای لێکـردوون، هەست بکەن‌و بـزانن کـە ئەگەر ئەو نیشـانانەش بـێن، هـەر ئیمان نـاهێنن! ﴿١٠٩﴾ وە (چ شـتێك وای لێکـردوون کـە هەســت بکـــەن‌و بـــزانن) کـــە دڵـــەکانیان‌و چـــاوەکانیان هـــەڵدەگێڕینەوە (تاکـــو بـــڕوا نەهێنـــن)، وەك چـــۆن یەکەمجـــار بڕوایـــان نەهێنـــاوە، وە وازیـــان لـــێ دێـــنین لـــە سـەرکێشـــیی خۆیـــاندا سـەراسیمـــە بـــبن ﴿١١٠﴾ وە ئەگـــەر فریشـــتەشمان بـــۆ لایـــان دابەزاندبایـەو، مردووانیـــش دواندبـــایانن‌و، هـــەموو شـتێکیشـــمان ڕووبـــەڕوو لەســـەر خڕکردبانەوە، مەگـەر خـوا ویسـتبای، ئەگـەرنا بڕوایان هـەر نەدەهێنـا، بـەڵام زۆربەیـان نەفـامن ﴿١١١﴾ وە بـەو شـێوەیە بـۆ هـەر پێغەمبـــەرێك دوژمنمـان ڕەخسـاندوون، لـە شـەیتانەکانی مرۆڤو جنـد، کە هەندێکیان قسـەی بریقـەدار بـۆ فریـودان بـە پەنهـانیی فێری هەندێکیان دەکـەن، وە ئەگــەر پـەروەردگارت ویسـتبای وا نەکـەن، وایانـنەدەکـرد،

دەجا واز لە خۆیانو لەوەی هەڵیدەبەستن بێنە ﴿١١٢﴾ وە با (سەرەنجام) ئەوانەی بڕوایان بە دوارۆژ نیە، دڵیان بە لایدا بچێ، (واتە: بە لای کوفرو خراپەدا)، وە پەسندی بکەنو، ئەوەی دەیکەن (لە خراپە) بیکەن ﴿١١٣﴾ (بڵێ:) ئایا جگە لە خوا بە دادوەر بخوازم، لە حاڵێکدا کە ئەو کتێبێکی ڕوونکراوەی بۆ ناردوونە خوار، وە ئەوانەی کتێبیشمان پێداون، دەزانن کە بە هەق لە پەروەردگارتەوە دابەزێنراوە؟ دەجا بە هیچ شێوەیەك لە دوو دڵان مەبە! ﴿١١٤﴾ وە وشەی پەروەردگارت لە ڕاستیی‌و دادگەریی دا، تەواوی کردوە، هیچ گۆڕەرێك بۆ وشەکانی نیە، وە ئەو بیسەری زانایە ﴿١١٥﴾ وە ئەگەر فەرمانبەریی زۆربەی زەمین نشینان بکەی، لە ڕێی خوا لات دەدەن‌و گومڕات دەکەن، (ئەوان) بەس شوێن گومان دەکەون، وە ئەوان تەنیا درۆ دەکەن ﴿١١٦﴾ بێگومان پەروەردگارت زاناترە بەوانەی کە لە ڕێبازی وی لادەدەن، وە ئەو بە ڕێیڕاستگرتووان، زاناترە ﴿١١٧﴾)).

# شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(وَلَا تَسُبُّواْ): واتە: جنێو مەدەن، وشەی (سَبّ) جنێوێکی ئازار پێگەیەنەرە، کە قسەی ناشیرن بە کەسێك بڵێی‌و ئازاری بە دڵی بگات، وە لە زمانی عەرەبییدا (سَبّ) بە مانای جنێودان‌و برین‌و تانەلێدان دێ.

(عَدۡوَۢا): واتە: دەستدرێژکارانە، تێپەڕێنەرانە، (العَدْو) واتە: سنوور بەزاندن، وشەی (عَدْو) بە سێ مانایان دێ: (العَدَاوَةُ وَالمُعَادَاة بالْقَلْب، وَالعَدْو فِي المَشِي، وَالعُدْوان والعَدو) واتە: بە مانای دژایەتیی‌و بوغزاندن لە دڵەوە دێ، وە بە مانای ئەوە دێ، کە ئینسان لە هەنگاونانی دا، تێدەپەڕێنێ، وە بە مانای دەستدرێژیکردنی ڕواڵەتییش دێ.

(زَيَّنَّا): واتە: ڕازاندوومانەتەوە، جوانمان کردوە، (الزينة ثلاث: زينة نفسية كالعلم، وزينة بدنية كطول القامة، وزينة خارجية كالمال والجاه، واللباس والحُلِيِّ) واتە: ڕازاوەیی‌و جوانیی سێ جۆرە: ڕازاوەییەکی دەروونیی، وەك زانیاریی (هەروەها عەقڵ‌و ئارامیی‌و هێمنیی) وە ڕازاوەییەکی جەستەیی، وەك بالا بەرزیی‌و شێوە جوانیی، وە ڕازاوەییەکی دەرەکییش هەیە، وەك ماڵ‌و سامان‌و پلەوپایە، وە (بۆ ئافرەت) خشڵ بە خۆداکردن.

(جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ): وشەی (جَهْد) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای وزەو توانایە، (الجَهْدُ والجُهْدُ: الطَاقَة وَالمَشَقّة) واتە: (جَهْد) واتە: وردە توانا، وە (جُهْد) یانی: قورسیی‌و زەحمەت، دەفەرموێ: سوێندیان بە خوا خوارد، بە هەموو توانای خۆیانەوە، یاخود زۆر بە سەختگیرییەوە، (حلفوا واجتهدوا في الحلف، أن يأتوا به على أبلغ ما في وسعهم..) واتە: زۆر جەختیان کرد بۆئەوەی کە هەرچی لە توانایاندایە، سوێندەکە بە قورسی بخۆن، بۆئەوەی لایەنی بەرانبەر بڕوایان پێ بکات، هی وا هەیە کە سوێند دەخوا دەڵێ: (واللهِ باللهِ تاللهِ) کۆمەڵێك سوێند ڕیز دەکات، بۆئەوەی لایەنی بەرانبەر زیاتر قەناعەتی بێ.

(وَمَا يُشۡعِرُكُمۡ ): واتە: چ شتێك واتان لێ دەكات ئێوە هەست بكەن بزانن؟ دەڵێ: (شَعَرْتُ: أَصَبْتُ الشّعر، شَعَرْتُ كَذَا: عَلِمْتُ عِلْمَاً فِي الدقة كإِصَابَةِ الشَّعْرِ) (شَعَرْتُ) واتە: كەسێك كە نیشانەدا بكاتو، لە موو بدات، كوردەواریی خۆمان ئەگەر نووسەرێك زۆر زەبر دەست بێ، دەڵێن: بابایەكی مووقەڵێشە، مووقەڵێش یانی: زۆر چاك لە نیشانە دەدات، (شَعَرْتُ كَذَا)، واتە: بە وردیی شتەكەم زانی، وەك چۆن لە موو بدەی، ئەو شتەم ئاوا بە وردیی زانی، كەواتە: (وَمَا يُشۡعِرُكُمۡ )، واتە: چ شتێك واتان لێدەكا كە بەوردیی ئەو شتە بزانن.

(وَنُقَلِّبُ ): لە كوردیی دا دەڵێن: قەڵبی كردەوە، یان: مەبەست ئەوەیە شتێك لابدرێ لە حاڵەتێكەوە بۆ حاڵەتێك، یاخود سەرەونخوون بكرێتەوە.

(أَفۡـِٔدَتَهُمۡ ): (جمع فؤاد)(أفئدة) كۆی (فؤاد)ە، دەڵێ: (الفُؤَاد كالقلب لكن يقال له فؤاد إذا اعتبر فيه معنى التفؤد، أي التوقّد، فَأَدْتُ اللَّحمَ: شَوَيْتُهُ)، (فؤاد) وەك دڵ وایە، بەڵام بەو ئیعتیبارە پێی دەگوترێ: (فؤاد)، كە مانای داگیرسانی تێدا ڕەچاو دەكرێ، (فَأَدْتُ اللَّحمَ) گۆشتەكەم برژاند.

بەڵام من پێموایە وشەی (فؤاد) تەنیا بە مانای دڵ نایەت، بەڵكو بە مانای عەقڵیش دێ، وەك لە شوێنی خۆی دا باسی دەكەم، چونكە لە هەندێك شوێن دا ناگونجێ بڵێین: وشەی (فؤاد) بە مانای دڵە، دەبێ بڵێی بە مانای عەقڵە.

(طُغۡيَٰنِهِمۡ ) (الطغيان ) (تَجَاوز الحَدِّ فِي العِصيَان) (طغيان ) بریتیە لە سنوور بەزاندن لە سەرپێچیی كردندا، واتە: هەموو سنوورەكان ببەزێنێ، (طاغوت) بۆچی پێی دەگوترێ (طاغوت)؟ چونكە تەواو هەموو سنوورەكان دەبەزێنێ: لە چەوسانەوەی خەڵكو خۆ بەزلگرییو تاوانو زوڵمو دەستدرێژیی دا.

(يَعۡمَهُونَ ): یانی: (يَتَرَدَّدُون) واتە: سەراسیمە دەبن، سەرگەردان دەبن، دەڵێ: (العَمَهُ: التَرَدُّد فِي الأَمْرِ من التَحَيُّر، عَمِهَ فَهُوَ عَمِهٌ وَعَامِهٌ، وَجَمْعُهُ عُمَّه)

(عَمَهُ) بریتیە لە دڵ لە دڵدان لە شتێکدا، لە ئەنجامی سەراسیمەیی دا نەزانی چی بکەی؟ دەگوترێ، (عَمِهَ فَهُوَ عَمِهٌ وَعَامِهٌ) واتە: ئەو کەسە سەرگەردان‌و سەراسیمەیە، کۆیەکەشی (عُمَّه)یە.

(قُبُلًا ): (قيل : هو جمع قابل، ومعناه مقابل لحواسهم، أو جمع قبيل، وقِبلاً فمعناه عياناً، وقبيل جمع قبيلة)، دەگوترێ: ڕووبەڕوو، بەرانبەر هەستەکانیان، یان کۆی (قبيل)ە، واتە: کۆمەڵە خەڵکێك، وە (قبيل) کۆی (قبيلة)یە.

(يُوحِي ): واتە: پەیامێکی پەنهان دەنێرێ، ئەسڵی وشەی وەحی بە دەنگی خشڵ دەگوترێ، خشڵی ئافرەت کە بەخۆیدا دەکات، دەنگەکەی دەنگێکی کپە، وە (وحي) بە ئاماژەیەکی خێراش دەگوترێ، وە بە ڕەمزو هێما دەگوترێ، وە بە قسەیەك بە کنارەو دەبەرڕاهاوێشتن، دەگوترێ، کە دەفەرموێ: ﴿ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ ﴾، واتە: هەندێکیان بە شێوەی پەنهان، قسەی ڕازاوە فێری یەکدی دەکەن.

(زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ ) واتە: قسەی ڕازاوە، (الزخرف: الزينة المزوَّقة، والمَنقَّشة وَمِنْهُ قِيلَ للذَّهَبِ: زوَّق الكلام: حسَّنَهُ وزيَّنَهُ) وشەی (زخرف) بە مانای زێڕیش هاتووە بەمانای نەقش‌و نیگاریش هاتوە، وە بەمانای ڕازاندنەوەی شتێك هاتوە، کەسێك کە قسەیەك دەکات‌و هەوڵ دەدا زۆر بە ڕەوانبێژیی‌و بە ڕێکیی بیکات، پێی دەگوترێ: (زوَّق الكلام: حسَّنَهُ وزيَّنَهُ) قسەکەی خۆی ڕازاندەوە، وەك هەندێ لە ئەدیب‌و شاعیرەکان، قسەکەی خۆیان دەخەنە قاڵبی تەعبیری سەرنج ڕاکێشەوە.

(غُرُورًا): (غُرُور) یانی: لەخۆباییبوون، یاخود خۆ فریودان، دەگوترێ: (غَرَّرْتُ فُلاَنَاً: أَصَبْتُ غِرَّتَهُ وَنِلْتُ مِنْهُ مَا أُرِيدُهُ، وَالغِرَّة: غَفْلَة فِي اليَقْظَةِ، وَالغِرَارُ: غَفْلَة مَعَ غَفْوَة) واتە: فلان کەسم هەڵخەڵەتاند فریوم دا، (أَصَبْتُ غِرَّتَهُ) واتە: بێئاگاییەکەیم ئیستغلال کرد، لە کاتی بێئاگاییدا زیانم پێگەیاند، (غِرَّة)

بریتیە لەوە کە ئینسان بەخەبەر بێ، بەڵام لەو کاتەدا ئاگای لەخۆی نەبێ‌و بێئاگابێ، بەڵام (غِرَار) ئەوەیە کە ئینسان وەنەوزێکی بێتێ‌و، لەو کاتەدا فێڵی لێ بکرێ، یاخود زەفەری پێ ببردرێ.

(وَلِتَصۡغَىٰٓ ): (الصَّغو: المَيْلُ، يُقَالُ: صَغَتِ النّجُوم والشَّمْس صغواً: مَالَتِ للغروب)، واتە: با مەیل بکات، بە لایەکدا بچێ، ئەستێرە، یاخود خۆر، ئەگەر خەریکی ئاوابوون بوون، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن: (صَغَتِ النّجُوم والشَّمْس) واتە: (مَالَتِ للغروب) خەریکە ئاوادەبێ.

(وَلِيَقۡتَرِفُواْ ): (أَصْل القَرفِ والإقْتِراف: قَشر اللحاء عن الشجر، واستعير الإقتراف للإكتساب، وفي الشر أكثره)، واتە: وشەی (قَرف) و (إقْتَراف) لێکردنەوەی توێکڵی درەختە، وە (إقْتَراف) بۆ وەدەستهێنان خوازراوەتە، زیاتر بۆ خراپە.

(حَكَمًا ): واتە: دادوەر، کەسێك کە کێشەی نێوان دوو لایەن، یاخود زیاتر یەکلایی دەکاتەوە، لە زمانی عەرەبیدا کە دەگوترێ: (حَكَم) یانی: مَنَع مَنْعَاً للإصلاح، وَمِنْهُ سُميت اللِّجَام: حَكَمةً، وَالحَاكِمُ مَنْ يَحْكُمْ بَيْنَ النَّاس) (حَكَم) واتە: ڕێگای گرت، بە مەبەستی بەرژەوەندیی ڕێگای لە کەسێك گرت کە خراپەیەك نەکات، بۆئەوەی بەرژەوەندیی بێتە دی، بۆیە بە لغاوی وڵاخ، (حَكَمَة)ی پێ دەڵێن: ئەو ئاسنەی کە لە دەمی ئەسپ‌و حوشتر دەکرێ، بۆئەوەی لەوەڕ نەخوا پێی دەگوترێ: (حَكَمَة) لەو کاتەدا کە خاوەنەکەی دەیەوێ بڕواو بە لەوەڕ خواردنی ڕێوە سەرقاڵ نەبێ، چونکە ڕێگا لەو وڵاخە دەگرێ لەوەڕ بخوات، وە کەسێك لە نێوان خەڵکیدا دادوەریی دەکات، (والحَكَمُ: المتخَصِّصُ بذلك) (حَكَم) کەسێکە پسپۆڕە لە دادوەریی کردن دا.

(مُفَصَّلًا): واتە: ڕوونکراوە، ئەگەر کۆمەڵە شتێك پێکەوە بلکێن، تێکدەئاڵێن، بەڵام ئەگەر جیا جیا بکرێنەوە، ڕوون دەبنەوە، ئنجا ئایا ئەوە لە چییەوە هاتوە؟ لە گەردنبەندی ئافرەت، دەگوترێ: (فصَّلَ: جعل بين كل لؤلؤتين خَرزةً، التفصيل: التبيين) واتە: لە نێوان هەردوو گەوهەردا شتێکی تێخراوە، مووروو

یان شتێکی دیکەی جگە لە گەوهەر خراوەتە نێوانیان، ئەوە پێی دەگوترێ: (عِقْدٌ مُفَصَّل) واتە: گەردنبەندێکی لەو جۆرە.

(ٱلۡمُمۡتَرِينَ ): لە (المرية)ەوە هاتوە، (مرية) بە مانای گومان دێ، بەڵام تایبەتترە لە گومان، گومان ئەوەیە کە مرۆڤ دوو دڵ بێ، کە ئەو شتە وابێ، یان وا نەبێ؟ ئەوە پێی دەگوترێ: (شك)، بە کوردیی ئێمە دەڵێین: گومان، جا بە کوردیی بە (ظن)یش دەگوترێ: گومان بە (مرية)ش هەر دەگوترێ: گومان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە زمانی کوردیی لەچاو زمانی عەرەبیی زمانێکی هەژارە، ڕەنگە هۆکارەکەشی ئەوەبێ کە زمانی کوردیی، زمانی خوێندنو نووسین نەبووەو زمانی بەڕێوەبردنی دەوڵەتو قەوارەی سیاسیی نەبووە، بۆیە وشەکانی زۆرنین، بۆ وێنە: ئێمە بە (قمر) هەر دەڵێین: مانگ، بە سی شەوەی مانگیش هەر دەڵێین: مانگ، بەڵام عەرەب بە مانگ دەڵێن: (قمر) ئەوەی بە ئاسمانەوەیە، وە بەو سی (٣٠) شەوەش دەڵێن: (شهر).

بە هەر حاڵ، دەڵێ: (المرية: التردّدُ فِي الأَمْر وهو أَخَصُّ مِنَ الشك)، (مرية) ئەوەیە لە شتێکدا دوو دڵ بی، وە تایبەتترە لە (شك)، (شك) ئەوەیە: نەزانی ئایا: بەولاوەیە؟ یان بەملاوەیە، لە نێوقەدێ بوەستی، (مرية) ئەوەیە شتەکە زیاتر بە لای نەبوونی دابێ، کە گوتت: (ظن)م وایە ئەو شتە بەم شێوەیە، کەواتە: گومانت هەیە، بەڵام زیاتر دڵت بە لای بوونی دایە، (والمماراة : المحاجَّة فيما فيه مرية) (مماراة) بریتیە لە وتوێژو شەڕە قسە لەسەر شتێك کە گومانی تێدا هەبێ.

( وَتَمَّتۡ ): واتە: تەواو بووە، کاملە، (تَمَام الشيء: إنتهاؤُهُ إِلى حَدٍّ لا يحتَاج إِلى شَيء خَارِج عَنْهُ، عَكْس النّاقص) ئەگەر بڵێی: ئەو شتە (تام)، واتە: گەیشتۆتە ڕاددەیەك کە پێویستیی بە شتێکی دیکەی بە دەرەوەی خۆی نیە، واتە لە خۆیدا (تام)ە، کاملە، تەواوە، پێچەوانەی (ناقص)، (ناقص) واتە: شتێکی ناتەواو، کە پێویستی بە دەرەوەی خۆی هەبێ، بۆیە خوای پەروەردگار دەربارەی ئیسلام دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ

نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴿٣﴾ ﴾ المائـدة، واتـه: ئـەمڕۆ بەرنامەکـەتانم بۆ تەواو کـردوونو کاملْـه، وە چاکـەی خـۆمم بـە تـەواویی لەگـەڵ کـردوونو، هـیچ نوقصانیی تێدا نیـە، وە ئیسـلامیشـم بۆ بە بەرنـامە پەسـەند کـردوون.

(كَلِمَتُ ): (كلمة) لـه زمـانی عەرەبیـدا زیاتر بـه مانـای وشـه دێ، بـەڵام (كلمة) بـه مانأای قـەزیەیـەك دێ، واته: بابەتێك کارێك کە قسـەی لـێ دەکـرێ، وە بـە مانـای (قضـاء) دێ، واته: بڕیـارێك دێ کـە کۆیەکـەی (أقضية)یـە، وە بـە مانـای وشـەش دێ، بـه مانـای بڕیـاریش دێ، وە دەشـگونجێ بـه مانـای یاسـاکانی خـوای پەروەردگاریش بـێ.

(صِدۡقٗا): (صِدق) واته: ڕاسـتیی، ڕاسـتیی بریتیـە لـە چـی؟ دەڵێ: (الصدق: مطابقة القـول الضـمير والمُخْبَـرَ عنـه مَعـاً)، (صِـدق) بریتیـە لـەوەی قسـەیەك کـە دەکـرێ، هـەم لەگەڵ دڵـدا ڕاسـت بێتـەوە، واتـە: ئـەو ئینسانەی کە ئـەو قسـەیە دەکـات ئـەو قەناعەتـەی لـە دڵـدا هەبـێ، وە هـەم لـە دنیـای واقیعیشـدا بـەو شـێوەیـە بـێ، واتـە: ئەگـەر گوتمـان: فـلان کـەس لـە سـەفەر گەڕایـەوە، هـەم قەناعەتمـان بـە قسـەکە هـەبـێ، نـەك کـابرا قەنـاعەتی وا نەبـێ ئـەو قسـەیە بکـات، ئـەوە دەبێتـە درۆ، وە هـەم لـە واقیعیـش دا ئـەو کەسـە لـە سـەفەر گەڕابێتـەوە.

(وَعَدۡلٗاۚ ): (العَدالـةُ والـمُعَادَلَةُ: لَفْظٌ يَقْتَضِـي مَعْنَـى المُسَـاوَاة، و يُسْـتعمَلُ باعْتبـار المُضَـايَفَةِ، والعَـدْلُ والعِـدْلُ يَتقـارَبَان، لَـكِن العَـدْلُ يُسْـتَعْمَلُ فِيمَـا يُـدْرَكُ بالبَصـيرَة كَالأحْكَامِ، والعِـدْلُ والعديل لـما يُدْرك بالحاسَّة)، واتـە: هـەردووك وشـەی: (عَـدالة ومُعَادَلَة) لـە یەکسانییەوە نـزیکـن، وە (عَـدْلُ وعِـدْل) لـە یـەك نـزیکـن، بـەڵام (عَـدْل) بـۆ شـتی مەعنـەویی بەکـاردێ، کـە بـە عـەقـڵ دەزانـرێ وەك: حوکمەکـان، بـەڵام (عِـدْل) بـۆ شـتی وا کـە بـە هەسـتەکان دەرك بکـرێ، بەکاردێ، وەك لا بـاری وڵاخ.

(ٱلظَّنَّ): وەك گوتم لە کوردییدا بە (شك) و (ظن) و (مرية) هەر دەڵێین: گومان، بەڵام دەگونجێ بڵێین: (ظن) بە کوردیی واتە: گومانی زاڵ، واتە: گومانێك زیاتر پێت وایە ئەو شتە وایە، بەلای بوونێ دایە، (الظن: اسم لما يحصل عن أمارة، ومتى قويت أدت إلى العلم) دەڵێ: (ظن) بریتیە: قەناعەتێك بەهۆی نیشانەیەکەوە پەیدا دەبێ، هەر کاتێك نیشانەکە بەهێز بوو، ئەوە (ظن)ەکە دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی زانیاریی دەربارەی ئەو شتەوە.

(يَخۡرُصُونَ): (الخَرْصُ: حَرْزُ الثمرة، والخَرْصُ المحروز، كالنقض للمنقوض، وقيل الخرص: الكذب) لەنێو عەرەبدا ئەوانەی کە درەختی خورمایان هەن، یەکێك تەماشای ئەو دارخورمایە دەکات، ئنجا بە مەزەندە دەڵێ: ئەوەندە خورمای پێوەیە، بە پێوان یان بە کێشان، لە کوردیی دا قرساندنی پێدەڵێن، دەگوترێ: ئەو باغە ترێیە خاوەنەکەی مەزەندەی دەکات، چەندی پێوەیە، ئەوە پێی دەگوترێ: (خرص)، وە (حَرْز)یشی پێی دەڵێن، هەڵبەتە قرساندنی خۆشمان، هەر لەو (خرص)ەوە هاتوە، دەگوترێ: دەیقرسێنێ، جا ئەوە لە ئەسڵدا بۆ میوە بەکاردێ کە میوەی درەختێك بقرسێنێ، بەڵام بۆ شتێکی دیکەش هەر دەگوترێ: دەیقرسێنم، واتە: دەینرخێنم، کە پێموایە ئەو شتە بایی ئەوەندەیە، یان ئەوەندەیە، هەندێکیش گوتوویانە: (الخرص: الكذب) بە مانای درۆ دێ، (يخرصون يعني يكذبون) درۆ دەکەن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە موبارەکە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ ﴾، ﴿عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُون يسُبُّونَ أَصْنَامَ الكُفَّارِ فَيَسُبُّ الكُفَّارُ اللهَ عَدواً بغَيرِ عِلْم، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ... ﴾﴾[1]، واتە: قەتادە دەڵێ: مسوڵمانەکان جنێویان بە بتو صەنەمی کافرەکان دەگوت، ئەوانیش بە تێپەڕاندنەوەو بە نەزانین جنێویان بە خوای پەروەردگار دەگوت، خوا ﷻ ئەو ئایەتەی ناردە خوار.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءَتْهُمْ آيَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ ﴾، ﴿عَنْ مُحَمَّد بن كَعْب القُرَظِيِّ، قَالَ: كلَّم رَسُولُ اللهِ ﷺ قُرَيشاً، فَقَالوا: يَا مُحَمَّد! تخبرنا أَنَّ موسى كَانَ مَعَهُ عَصَاً يَضْرب بهَا الحَجَر فَانْفَجَرَتِ مِنْهُ اثْنَتا عَشَرَة عَينًا، وتخبرنا أَنَّ عِيسى كَانَ يَحيي المَوْتَى، وتخبرنا أَنَّ ثَمُودَ كَانَتِ لَهُمْ نَاقة، فَأتنا بشيء مِنَ الآيَاتِ حَتَّى نُصَدِّقك! فَقَالَ النَّبي ﷺ: أَيَّ شَيء تُحِبُّونَ أَن آتيكُم بِهِ؟ قَالوا: تَجْعَلُ لَنَا الصَّفَا ذَهَبَاً، فَقَالَ لَهُمْ: فَإِنْ فَعَلْتُ تُصَدِّقُونِي؟ قَالوا: نَعَمْ وَاللهِ، لَئِنْ فَعَلْتَ لَنَتبعنَّك أَجْمَعِين! فَقَامَ رَسُول اللهِ ﷺ يَدعو، فَجَاءَهُ جبريل عليه السلام فَقَالَ لَهُ: لَك مَا شِئْتَ، إِن شِئْتَ أَصْبَحَ ذَهَبَاً،

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَري برقم: (١٣٦٥٥) مُرْسَلاً، وَعَبْد الرزاق فِي (تَفسيره) ج١، ص٢١٥، وَابْنُ أَبي حَاتم ج٤، ص١٣٤٤، وَذَكَرَهُ السيوطِي فِي "الدر المنثور" ج٣، ص٣٣، وقال صاحبا الإستيعاب في بيان الأسباب ج٢، ص١٥٢: قُلنا: وَهَذَا مُرْسَلٌ وَرجَالُهُ ثِقَات.

وَلَئِنْ أرسل آيةً فَلَم يُصَدّقوا عِنْدَ ذَلِكَ، لَنُعَذبنَّهم، وَإِنْ شِئْتَ نَدَعْهُمْ حَتَّى يَتُوبَ تَائبهِم، فَقَالَ: بَلْ يَتُوب تَائِبهم، فَأَنْزَل الله تَعَالَى: ﴿ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ﴾، إلى قوله: ﴿ يَجْهَلُونَ ﴾﴾[1]، واتە: موحەممەدی كوڕی كەعبی قوڕەزیی، دەڵێ: قوڕەیش قسەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، گوتیان: ئەی موحەممەد! تۆ هەواڵمان پێدەدەی: كە مووسا گۆچانێكی پێبووە لە بەردی دەدا، دوازدە سەرچاوەی لێ هاتنە دەرێ، وە هەواڵمان پێدەدەی: كە عیسا مردووی زیندوو كردۆتەوە، وە هەواڵمان پێدەدەی: كە گەلی سەموود حوشترێكیان هەبووە، تۆش موعجیزەیەكی لەم جۆرانەمان بۆ بێنە، تاكو بڕوات پێبكەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حەز لەچ شتێك دەكەن، وەك بەڵگەو نیشانە بۆتان بێنم؟ گوتیان: تەپۆلكەی صەفامان بۆ بكە بە زێڕ، (ئەو صەفاو مەڕوایە كە حاجییان لە حەجو عەمرەدا لە نێوانیاندا دێنو دەچن) فەرمووی: ئەگەر وامكرد، بڕوام پێدەكەنو بە ڕاستم دادەنێن؟ گوتیان: بەڵێ، سوێند بە خوا ئەگەر وا بكەی، هەمووومان بە شوێنت دەكەوین، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا پاڕایەوە بۆئەوەی خوای بەرز ئەو داواكاریەی بۆ جێبەجێ بكات، جبریل هاتە لای پێیگوت: ئەگەر دەتەوێ خوای بەرزو مەزن بۆیان دەكاتە زێڕ، بەڵام ئەگەر ئەو نیشانەیان بۆ بێ و بڕوات پێ نەكەن، لەو كاتەدا خوا سزایان دەدات، {وەك چۆن گەلانیو پێشوو دوای ئەوەی بڕوایان بە موعجیزەی پێغەمبەران نەكرد، خوا سزای داون}، یان لێیانگەڕێ، بەڵكو خوا بە قسمەتی كردبن بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، فەرمووی: بەڵكو ئارامیان لێ دەگرم، با بگەڕێنەوە باشترە، {چونكە مەترسیی هەبوو كە ئیمان نەهێنن، هەموویان لەبەین بچن} ئیدی بەو بۆنەیەوە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتانەی ناردە خوارێ.

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (١٣٦٦٢) مُرْسَلاً، لَكِن وَرَدَ فِيهِ جُزء مَرْفُوع بسند صحيح، وَهُوَ طَلَب قُريش أن يحوِّل لهم النبيّ ﷺ الصفا ذهباً إلى آخر الحديث، وهو عند أحمد في المسند بحوه ج١، ص٢٤٢، من حديث إبن عباس، صحيح إسناده الشيخ أحمد شاكر في تعليقه على المسند "هامش ج٢، ص٣٢٦"، وأيضا أخرجه الواحدي في أسباب النزول ص: ١٤٩، ١٥٠، والإستيعاب في بيان الأسباب: ج٢، ص١٥٤، وقال المؤلِّفات: قلنا وسنده ضعيف.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا، گوتمان، ڕوودەکاتە پێغەمبەر ﷺ دیارە هەر لە درێژەی مشتومڕو قسەو باسی لەگەڵ دەوروبەری دا، بەتایبەت لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دا، کۆمەڵگایەك کە پێغەمبەر ﷺی تێیدا هاتوە، ئاوا بووە، بەڵام دیارە هەر ئەمڕو نەهییەك ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ کرابێ، شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ و ئۆممەتەکەیشی دەگرێتەوە، مەگەر بە بەڵگەیەك تایبەت کرابێ بە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەویش دەبێ بەڵگەیەکی ڕوونی لەسەر بێ، کە ئەو شتە تایبەتە بەوەوە.

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ وەك پێشتر گوتمان: چەند ڕێنماییەك ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ دەکات، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەی لە نێوانیاندا ژیاوەو، بانگی کردوون، دەفەرموێ: ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت سرووش کراوە، واتە: ئەو پەیامەی کە لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە، شوێن ئەوە بکەوە، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئایا پێغەمبەر ﷺ هەر دوای ئەوە نەکەوتوە، بۆچی خوا دەفەرموێ: شوێنی بکەوە، ئایا دەبێ تاکو ئێستا شوێنی نەکەوتبێ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: بەردەوام بە لەسەر شوێنکەوتنی وەحی، بەڵام حیکمەتی چییە کە خوای پەروەردگار وا دەفەرموێ؟ ئەوە دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین.

هەڵبەتە لە چەند شوێنێکی دیکەش دا خوای پەنهان زان، ئەوەی فەرمووە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ۝١﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر! پارێز لە خوا بکە، ئەوە مانای وانیە کە پێغەمبەر تەقوای نەبووە، بەڵکو یانی: بەردەوامبە لەسەر پارێزکردن لە خوا، یاخود لێی زیاد بکە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، وە پشت لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، بكە، واتە: پشتگوێیان بخەو گوێیان پێ مەدە، بەڵام كە دەفەرموێ: پشتگوێیان بخە، مانای ئەوە نیە بانگیان مەكە، نەخێر، واتە: با قسەو پڕوپاگەندەی ئەوان، وە ئەزیەتو ئازاری ئەوان، پاشەكشە بە تۆ نەكاتو نەبێتە فشارێك لەسەر تۆ، كە ڕێگاو ڕێبازت پێ بگۆڕیو لێ تێكبدات.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای هاوبەشیان دانەدەنا، چی ویستبا؟ واتە: ئەگەر ویستبای ئەوان هاوبەش بۆ خوا دانەنێن، هاوبەشیان بۆ خوا دانەدەنا، ئەدی بۆچی ویستوویەتی؟ چونكە خوا ویستوویەتی : خەڵك تاقی بكاتەوە، ویستی خوای پەروەردگاریش بە دوای ویستو خواستی مرۆڤەكان دەكەوێ، چونكە خوای پەروەردگارو تاكو پاك، چاكەی لە چاكەكاران ویستووە، خراپەی لە خراپەكاران ویستوە، بەڵام كەی چاكەی لە چاكەكاران ویستوە ؟ دوای ئەوەی ئەو چاكەكارانە، ویستی ئازادانەی خۆیان ئاڕاستەی چاكەكردن كردوە، خوای كاربەجێش یارمەتی داون، هەروەها دوای ئەوەی خراپەكاران ویستی خۆیان ئاڕاستەی خراپەكردن كردوە، خوای دادگەریش یارمەتی داون، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾التكویر، واتە: ناتانەوێ هەتا پەروەردگاری جیهانیان نەیەوێ، واتە: پێتان وانەبێ، كە ئەگەر چاكە دەكەن، ئەوە خوا نەیویستوە، چاكە بكەنو، ئێوە هەر توانیوتانە چاكە بكەن! یان ئەگەر خراپەتان كرد، پێتان وابێ خوا نەیویستوە خراپە بكەنو، ئێوە هەر كردووتانە! نەخێر، كە چاكە دەكەن، یان خراپە دەكەن، ئیمان دێنن، یان كوفر دەكەن، ئەوە هەر لە چوارچێوەی ویستی ڕەهای خوای باڵادەست دایە، كەواتە:

﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ﴾، ئەگەر خوا ویستبای، هاوبەش بۆخوا دانەنێن، هاوبەشیان دانەدەنا، بەڵام ویستوویەتی ئازادیان بكات، ئەگەرنا خوا ویستوویەتی : فریشتەكان سەرپێچیی لە فەرمانی خوا نەكەن، هیچ فریشتەیەكتان بینیوە گوناهێك بكات؟ نەخێر، بۆچی ؟ چونكە خوا ویستوویەتی گوناهان نەكەن، بەڵام خوای

دادگەر ویستوویەتی ئینسانەکان ئازاد بن‌و، بە ویستی ئازادانەی خۆیان چاکە بکەن‌و خراپە بکەن، کێ چاکە دەکات با بیکات، کێ خراپە دەکات با بیکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ٢٩﴾الكهف، واتە: کێ دەیەوێ با ئیمان بێنێ، وە کێ دەیەوێ با کافر بێ، خوا ویستوویەتی ئازادیان بکات‌و نەیویستوە زۆریان لێ بکات، ئەگەر ویستبای تۆبزییان لێ بکات، وەك فریشتەکان، کەس نەیدەتوانی خراپە بکات.

وەك لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، تێکڕای خەڵکی سەر زەوی ئیمانیان دەهێنا، ئایا تۆ دەتەوێ زۆریان لێ بکەی، تاکو ئیمانێ بێنن ؟

واتە: خوا نەیویستوە زۆریان لێ بکات‌و، ویستوویەتی ئازادیان بکات، ئنجا کە ئازادی کردوون، هەندێکیان ئیمانیان هێناوەو زۆربەشیان ئیمانیان نەهێناوە، ئەوە مەسەلەیەکی زۆر وردە، هەڵبەتە من لە کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی) لە بەرگی (٤)دا بە تەفصیلێ باسی قەزاو قەدەرم کردوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ﴾، وە تۆمان دانەناوە پارێزەر بی بەسەریانەوە، وە تۆشمان دانەناوە سەرپەرشتیارو وەکیل بی بەسەریانەوە، واتە: تۆ پارێزەریان نی، نەهێڵی خراپە بکەن، وە وەکیلیشیان نی، بە تۆبزیی چاکەیان پێ بکەی، چونکە کەسێك دەبێتە وەکیلی کەسێك، دیارە بۆ چاکە دەبێتە وەکیلی، دەڵێ: فڵان کەس وەکیلی منە بۆ چاکە، خۆ ناڵێ وەکیلی منە بۆ خراپە !

ئنجا خوای کاربەجێ ڕێنمایی‌و ئامۆژگارییەکی دیکەی مسوڵمانان دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، بۆیە دەڵێم مسوڵمانان، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز جنێوی بە کەس نەداوە، وە زۆر بە نەزاکەت بووە، زۆر زمان چاك بووە، بۆیە لێرەدا خوا نەیفەرموە: (ولا تَسُبّ) پێشتر بە پێغەمبەر

ﷺی فـەرموو: ﴿ ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ﴾، بـەڵام لێـرەدا بـە گشـتی بـە مسـوڵمانان دەفـەرموێ، بۆچـی؟ چونكـە پێغەمبـەر ﷺ جنێـوی نـەداوە، تاكـو بفەرموێ: جنێوان مەڵـێ! ئەوە مەسەلەیەكی زۆر وردە، با ئاگامان لـێی بـێ.

ئنجا هەندێك گوتوویانـە: خـوا بەگشـتی فەرموویـەتی، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ لـە نێویاندایە، بەڵام من دەڵـێم نـا ! چونكە خـوا زانیویـەتی پێغەمبـەر ﷺ جنێوی بـە هیچ شتێكو هیچ كەسێك نەداوەو، زۆر بە نەزاكەتو زمان پاك بووە، كەواتـە: پێویستی نەكـردوە بـەو بفەرموێ: جنێـو بەو شـتانە مـەدە كە دەیانپەرسـتن لە جیاتی خـوا، بەڵام مسوڵمانان جـاری وا هـەبووە هەڵچوونو عاتیفەیان زۆری بۆ هێناونو ڕقیان هەڵساوەو، تێیان پەڕاندوەو، جنێویان بەبتو صەنەمەكان داوە، بـۆ وێنـە: لـە صولحی حودەیبیـەدا ئەبوبەكـر خـوا لێـی ڕازی بـێ بـە یـەكێك لـە قوڕەیشـییەكان دەڵـێ: {أمْصُصْ بَظْـرِ الـلاَّتِ}[1] كە من نامـەوێ تەرجەمەی بكـەم، چونكـە ئەوانە لاتیان بە پەرسـتراوێكی مێیینـەوە زانیوەو ئەبو بەكر شتێكی گوتوە، كـە دیـارە لە نێو عەرەبدا عـادەت بـووەو شـتێكی سـەیر نـەبووە، وە هەنـدێ قسـەی لـەوجۆرە لـە كـوردەواریی خۆشـماندا، هـەر هـەن، بـەڵام خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، وە جنێو بەو شـتانە مەڵێن، كە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنـەوە، ﴿ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ ﴾، كە سـەرەنجام ئەوانیش جنێـو بـە خـوا بڵێـن: بە تێپـەڕانـدنو بەبـێ زانیـاریی، كە بزانـن خوا چ زاتێكـە، چونكـە ئەگەر زانیـارییـان بە زاتـی خـوا هەبـێ، قسـە بە خـوا ناڵێـن.

دوایـی وەك دڵـدانەوەیەك بـۆ ئیمانـداران، دەفـەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمۡ ﴾، بـەو شـێوەیە بـۆ هـەر كۆمـەڵێك كردەوەكانیانمـان بـۆ جـوان كـردوونو ڕازاندۆتـەوە، كـافرەكان: هەنـدێكیان گـا دەپەرسـتن، هەنـدێكیان مشـك دەپەرسـتن، هەنـدێكیان مـار دەپەرسـتن، مـن سـاڵـی (٢٠١١)ز چـووم بـۆ هـەردووك وڵاتـی مالـیزیاو

---

١) (السیرة النبویة) لابن هشام، ج ٣، ص ١٦٦، وە (البدایة والنهایة) لابن كثیر، ج ٤، ص ١٦٧.

کەمبۆدیا، بینیم: هەندێکیان پەیکەری بووزا دەپەرستن، وە هەندێکیان ماری کوبرا دەپەرستن، هەندێك مشك دەپەرستن، وە پێیان وایە شتێکی زۆر ئاساییە، ئەو شتانە بپەرستن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئاوا بۆ هەر کۆمەڵێك کردەوەکانیانمان بۆ ڕازاندووەتەوە، کە دوایی باسی دەکەین ئەوە چۆنە ! بەڵام ئەوە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ ئیمانداران، کە کافرەکان کاتێك بتو صەنەم دەپەرستن، وە بە پیرۆزیان دەگرن، ئەوە کردەوەکانیان بۆ ڕازێنرنەوە، ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾، دوایی گێڕدرانەوەیان بۆ لای پەروەردگاریانە، ئەو هەواڵیان پێ دەدات بەوەی کە دەیانکرد، کەواتە: ئێوە لە دنیادا بۆتان نیە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەن، وە جنێو بە پەرستراوەکانیان بدەنو، هەستیان بریندار بکەن، بەڵام خاوەنو گەورەیان، کە خوای بێ هاوتایە، هەر بۆ لای ئەو دەگێڕدرێنەوە، وە دوای ئەوە هەواڵیشیان پێدەدا، بەوەی کە دەیانکرد، یانی: لێیانگەڕێن، چونکە دنیا جێگای تاقیکردنەوەیە، دەبێ خەڵك دەرفەتی پێ بدرێ، هەرچی دەپەرستێ، با بیپەرستێ.

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەی کافران دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا﴾، وە زۆر بە جەخت لەسەر کردنەوەو زۆر بە داکۆکیی لەسەرکردنەوە، سوێندیان بە خوارد، واتە: سوێندێکی جەخت لەسەرکراو، گوتیان: ﴿لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا﴾، ئەگەر نیشانەیەکمان بۆ بێ، ئەوە بە دڵنیایی ئیمانی پێ دێنن، ئنجا ئایا مەبەستیان لەو نیشانەیە چی بووە؟ وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەدا باسمان کرد، کێوی صەفایان بۆ بکات بە زێڕ! یان وەك گەلی صالح حوشترێکیان لە بەرد بۆ دەربێنێ! یان وەك گەلی عیسا مردوویان بۆ زیندوو بکاتەوە ! یان وەك مووسا سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، گۆچان لە بەرد بداتو کانیو سەرچاوەی لێ هەڵقوڵێ ؟ وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا هەشت نۆ موعجیزەی باسکردوون، کە پێشتر باسمان کرد، دوایی خوا پێی دەفەرموێ بڵێ: ﴿سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾﴾، واتە:

پاکیی بۆ پەروەردگارم (کە من ناماقووڵیی وا بکەم) ئایا من جگە لە بەشەرێکی ڕەوانەکراو، هیچی دیکە هەم، کوا ئەو شتانە بەدەست منن؟! کە کۆتا داواکارییان ئەوەیە کە گوتوویانە: ﴿وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٣﴾﴾الإسراء، واتە: وە ئیمان ناهێنین، بەوە کە بەرزبیەوە بۆ ئاسمانێ هەتا لە ئاسمانێ کتێبێکمان بۆ نەهێنی، یانی: نامەیەك نەهێنی لە خواوە کە فەرمووبێتی: ئەم نامەیە، بۆ فلانی کوڕی فلان! بزانە کە موحەممەد نێردراوی منەو ئیمانی پێ بێنە! دیارە وەك ئەوان داوایان کرد بوو، دوایی دەبووە گاڵتەجاڕ، چونکە دوایی هەر کافرێکی دیکەش دەیگوت: نامەیەکم لە لای خوا بۆ بێنە، وەختی خۆی فلانە کافر نامەی لە لای خواوە بۆ هاتوە، بۆ من لەو کەمترم ؟ منیش دەبێ نامەیەکم بۆبێ !! بۆیە دەفەرموێ: ﴿سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٣﴾﴾، واتە: بڵێ پاکیی و بێگەردیی بۆ پەروەردگارم، من جگە لە بەشەرێکی ڕەوانەکراو، هیچی دیکە نیمو هیچم لە دەستەڵات دا نیە، ئەو تەکلیفو داوایانە چین ؟ ئەگەر بەڵگەتان دەوێ، ئەوە قورئان، ئەوە موعجیزەی منە، کە موعجیزەیەکە بە کەڵکی کافرەکانی ئەو کات هاتوەو، بۆ ئێستاش و بۆ داهاتووش دەبێ، بەڵام گۆچانی مووسا عليه السلام بەس بە کەڵکی سەردەمی خۆی هات، وە مردوو زیندووکردنەوەی عیسا عليه السلام، بەس بە کەڵکی سەردەمی خۆی هات، وە حوشترەکەی صالح، بەس بە کەڵکی سەردەمی خۆی هات، وە ئێمە ئێستا بەس بەهۆی قورئانەوە دەزانین، ئەو موعجیزانە هەبوون، بەڵام قورئان بە کەڵکی ئەو کات هاتووەو ئێستاش و داهاتووش تاکو دنیا کاول دەبێ، قورئان موعجیزەی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەدە ﷺ، وە موعجیزەیەکی گشتگیریشە : خەڵکی سیاسیی، ئیعجازی سیاسیی تێدا دەبینێ، خەڵکی فەلسەفیی و فیکریی، ئیعجازی فەلسەفیی و فیکریی تێدا دەبینێ، خەڵکی گەردوونناس، ئیعجازی گەردوونیی و فیزیایی تێدا دەبینێ، خەڵکی زەوییناس لە بواری خۆیدا، پزیشك لە بواری خۆیدا، مێژووناس لە بواری خۆیدا، هەر کەسێك پسپۆڕی لە هەر بوارێکدا هەبێ، لە هەر ڕوویەکەوە تەماشای قورئان بکات، هەر

کەسـە لـە بـواری پسـپۆڕیی‌و شـارەزایی خۆیـدا، دەگـاتە ئـەو دەرەنجامـە، کـە ئـەم فەرمایشـتە فەرمایشـتی خـوایەو هی پێغـەمبـەر ﷺ نیـە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا ٱلْأَيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، بـلـێ: نیشـانەکان، موعجیزەکان بـەس لـە لای خـوان، ئـەویش ئـەو موعجیـزەیـەی نـاردوە بـۆ ئۆممـەتی پێغـەمبـەری کۆتـایی، موعجیزەیـەکی فیکریـی، عەقڵـیی، عیلمیـی، ئەدەبیـی، کـە خـوا زانیویـەتی گرنگتـرین شـتێك، کـە لـە دوا قۆنـاغی ژیانـی بەشـەردا دێتـە دی، بریتیـە لـە بەرەوپێشـچوونی زانسـت، بۆیـە موعجیزەیـەکی فیکـریی‌و عیلمیـی‌و ئەدەبیـی بـۆ نـاردوون، نـەك موعجیـزەیەکـی بەرهەسـت (محسـوس) کە ئـەگـەر وابـووایـە، تەنیـا بەکەڵکی ئـەو کـاتە دەهات، ﴿ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، خـوا ڕوو لە ئیمانداران دەکات، دەفەرموێ: چ شـتێك وای لە ئێوە کردوە هەست بکـەن‌و، بـزانن کە ئەگەر ئەو بەڵـگەو موعجیـزەیەی داوای دەکـەن، بۆشـیـان بـێ، ئیمـان نـاهێنـن، واتـە: خـوا دەزانـێ کـە ئـەوان هـەر ئیمـان نـاهێنن، بەڵام ئێوە نازانن.

دیـارە لـەوبارەوە لـە مەسـەلە گرنگـەکان دا باسـی لـێوە دەکـەین، کـە توێـژەرەوانـی قورئـان مشـتومڕی زۆریـان بووە، چونکە دەڵـێـن: بە ڕواڵـەت دەبـوو خـوا فەرموبـای : ﴿ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ واتـە: وە ئێـوە چوزانن‌و چ شـتێك وای لێکـردوون بـزانـن، کـە ئەگـەر ئـەو موعجیـزەیـە هـات، ئیمـان دێنـن، بـەڵام لێـرەدا دەفـەرموێ: ئیـمان ناهێـنن؟ ﴿ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، بـەڵام ماناکـەی بـەو شـێوەیە کـە باسـکرد، وە زەمەخشـەریی‌و زۆرێـك لـە زانایـانی ڕەوانبێـژیی هـەر ئـاوا مانـایان لێکداوەتـەوە، ئەگـەرنا هەنـدێکیان گوتوویانـە: ﴿ لَا ﴾ زیادەیـە، وە هەندێکیـان گوتوویـانە: ﴿ أَنَّهَآ ﴾، بـە مانـای (لعلَّ)یـە، بـەڵام لەڕاسـتیدا ئەوانـە هەموویـان جۆرێـك لـە (تأویل)ن، کـە پێویسـتمان پێـی نیـە. ﴿ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: چ شـتێك وای لە ئێوە کـردوە، کـە هەست بکەن‌و بـزانن: ئەگـەر ئـەو بەڵـگـەیەی داوای دەکـەن بـێـتـش، ئیمـان ناهێنـن ؟ واتـە: ئێـوە نازانـن، کـە ئیمـان

ناهێنن، بۆیە پێتان خۆشە، بێ، بەڵام خوا دەزانێ ئیمان ناهێنن، بۆیە نایەنێرێ، ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، ئەو (و)ە (عطف)ی دەکاتەوە بۆ سەر ڕستەی پێشەوە، واتە: چ شتێك وای لە ئێوە کردوە، بزانن کە عەقڵیان و چاویان، یان دڵیان و چاویان هەڵدەگێڕدرێتەوە کە ئیمانی پێ نەهێنن، وەك چۆن یەکەم جار ئیمانیان پێ نەهێنا، دەشگونجێ ئەو (و)ە (واو عطف الحالیة) بێ، واتە: لە حاڵێکدا کە ئێمە عەقڵ و چاویان هەڵدەگێڕینەوە، بۆئەوەی ئیمان نەهێنن، وەك چۆن یەکەمجار ئیمانیان پێ نەهێنا، ﴿ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾، وە لێیان دەگەڕێین لە سەرکێشیی خۆیاندا سەراسیمە بن و بخولێنەوە.

ئنجا خوای کاربەجێ حەقیقەتێکی زۆر گەورە بە پێغەمبەری خۆی و مسوڵمانان ڕادەگەیەنێ، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلًا مَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴾، وە ئەگەر گریمان ئێمە ــ وەك داوا دەکەن ــ فریشتەشمان دابەزاندبایە لایان و، مردووشمان زیندووکردبانەوەو، قسەیان لەگەڵ کردبان، وە هەموو شتێکیشمان ڕووبەڕوو هێنابایە سەریان، یاخود دەستە دەستە هەموو شتێکمان هێنابایە پێشیان، ﴿ مَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ ﴾، نەدەگونجا ئیمان بێنن، مەگەر خوا بیەوێ، ئەگەر خوا نەیویستبایە، ئەو کاتەش ئیمانیان نەدەهێنا.

یانی: لەبەرئەوەی ئەوانە ویستی خۆیانیان ئاڕاستەی ئامانجی خراپ کردوە، دیارە ویستی خوای پەروەردگاریش بە دوای ویستی ئەوان دا ڕۆیشتوە، ئنجا بۆیە ئەگەر ئەوانەشمان بۆ کردبان، چونکە لە سەرەتادا نەیانویستوە ئیمان بێنن، خوای دادگەریش دیسان ویستی لەگەڵ ئیمان هێنانیان نەدەبوو، وە سەرەنجام: ئیمانیان نەدەهێنا ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نافامن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنْسِ وَالْجِنِّ ﴾، وە ئاوا بەو شێوەیە ــ وەك چۆن ئێستا بۆ تۆ هاتۆتە پێش ــ بۆ هەر کام لە

پێغەمبەران دوژمنمان ڕەخساند بوو، لە شەیتانەکانی ئینسو جند، کە: ﴿ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ﴾، هەندێکیان قسەی فریودەرانەیان بە مەبەستی هەڵخەڵەتاندن، بە پەنهان فێری یەکدی دەکرد، کە دیارە مەبەست پێی جندەکانە، یانی: شەیتانە جندەکان، قسەیان فێری مرۆڤە هەڵخەڵەتاوەکان دەکرد، ﴿ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ﴾، وە ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، وایان نەدەکرد، واتە: ئەگەر ویستبای ڕێیان لێ بگرێ، ڕێی لێ دەگرتن، بەڵام نەیویستوە ڕێیان لێ بگرێو، ناچاریان بکات ، بەڵکو ویستوویەتی ئازادیان بکات، ﴿ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، دەجا وازیان لێبێنە خۆیانو ئەوەی هەڵیدەبەستن بە درۆو دەلەسە، یانی: با بۆخۆیان لە گێژاوی ئەو درۆو دەلەسەو قسە هەڵبەستراوانەیان دا بخولێنەوە، ﴿ وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، وە با عەقڵو دڵی ئەوانەی بڕوایان بە دواڕۆژ نییە، مەیل بە لای قسەی ئەواندا، بە لای کوفرو خراپەی ئەواندا، بکات، ﴿ وَلِيَرْضَوْهُ ﴾، وە با پەسەندی بکەن، ﴿ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴾، وە با ئەوەی کە ئەنجامی دەدەن لە خراپە، ئەنجامی بدەن، واتە: دوایی لێپرسینەوەو سزا ڕوویان تێدەکات.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا ﴾، ئایا جگە لە خوا دادوەرێکی دیکە بخوازم، لە حاڵێکدا کە خوا کتێبی بۆ ناردوونە خوار، زۆر ڕوونە، زۆر ڕوونکراوەتەوەو مەبەستەکانی تێدا زۆر ڕۆشنن، ﴿ وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ ﴾، وە ئەوانەش کە کتێبمان پێداون لەپێشدا، {واتە: لە پێش تۆدا، جوولەکەو نەصرانییەکانو ئەوانی دیکەش} دەزانن کە بە هەق لە پەروەردگارتەوە دابەزێنراوە، ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴾، کەواتە: تۆ لە دوو دڵان مەبە، ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾،

وە وشەکانی پەروەردگارت لە ڕاستیی‌و دادگەریی دا تەواویان کردوە، هیچ قسەیەك لەوە ڕاستتر نابێ‌و، هیچ قسەیەکیش لەوە دادگەرتر نابێ، چونکە فەرمایشتی خوا یان هەواڵە، یان حوکمە، ئنجا ئەگەر هەواڵە، لە ڕاستییدا تەواوی کردوە، وە ئەگەر حوکمیشە، لەوپەڕی دادگەریی دایە. ﴿لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾، گۆڕەر نیە بۆ وشەکانی خوا، وە خوا بیسەری زانایە.

ئنجا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾، وە ئەگەر بە قسەی زۆربەی خەڵکی سەر زەوی بکەی، گوێڕایەڵییان بکەی‌و فەرمانبەرییان بکەی، لە ڕێی خوا لات دەدەن، ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾، ئەوانە هەر بە دوای گومان دەکەون، وە هەر درۆ دەکەن، ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾، بێگومان پەروەردگارت زاناترە، کە کێ لە ڕێی خوا لادەدات، وە زاناتریشە بە ڕێگەی ڕاستگرتووان، کەواتە: تۆ ڕێی پەروەردگارت بگرەو، مەکەوە ژێر کاریگەریی قسەو قاڵی کافران، با زۆرینەی خەڵکی سەر زەویش پێکبێنن، چونکە هەق هەر هەقە، ئەگەر کەسیش شوێنی نەکەوێ، با کەمینەشی لەگەڵدابن، ناهەقیش هەر ناهەقە، با زۆربەی خەڵکییش بەدوای بکەون

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، وەك پێشتریش باسمان کرد، ڕاستە ماناکەی ئاوایە: شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت سرووش دەکرێ، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، وە واز لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێنەو پشتیان تێ بکە.

زانایانو توێژەرەوانی قورئان سێ واتایان بۆ ئەم ئایەتە لێکداوەنەوە:

١/ هەندێکیان گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ بێگومان هەر شوێنی ئەو پەیامو سرووشە کەوتوە کە خوا بۆی ناردوە، بۆیە کە دەفەرموێ: شوێن وەحی بکەوە، دەبێ مانایەکی زیادی تێدابێ، ئەگەرنا دەبێتە پەیداکردنی شتی هەبوو (تحصیل الحاصل)، واتە: داوای شتێکی لێ دەکات کە خۆی هەیە، ئنجا گوتوویانە، یانی: بەردەوام بە لەسەر ئەو پەیامەی کە خوای پەروەردگار بۆی ناردووی.

٢/ هەندێکی دیکەیان گوتوویانە: واتە: شوێن وەحی خوا بکەوە، نەك شوێن قسەی ئەوان.

٣/ هەندێکی دیکەشیان گوتوویانە: واتە: دڵی خۆتو فیکری خۆت سەرقاڵ مەکە، بە کافرەکانو قسەوقاڵی ئەوانەوە، بەڵکو سەرقاڵو سەرگەرمبە بە شوێنکەوتنی پەیامی خواو، بەندایەتیی کردن بۆ خوا.

بەڵام لە ڕاستییدا هەر کام لەو سێ مانایانە مەبەستن، واتە: بەردەوامبە، وە شوێن وەحیو پەیامی خوا بکەوە، نەك شوێن ڕێچکەو ڕێبازێك کە ئەوان دەیانەوێ تۆی پێ فریو بدەن، وە سەرگەرم سەرقاڵیش بە بەرنامەی خواوەو گوێ بە وان مەدە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، ئەوە چ موناسەبەتێکی هەیە لەگەڵ ئەوەدا؟! دەڵێین: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەشێك لە پەرستنی خواو، جۆرێك لە جۆرەکانی خواپەرستیی کە چەمك و واتای بەندایەتیی و پەرستنی خوا دەیگرێتەوە، بریتیە لە شوێن کەوتنی بەرنامەکەی، کەواتە: ﴿إِلَٰهَ﴾، پەرستراو، بە مانای بەرنامەدانەر (حاکم)یش دێ، وە بە مانای پەروەردگار (رب)یش دێ، ﴿إِلَٰهَ﴾، پەرستراو کەسێکە کە پەرستراوی تۆیەو فەرمانڕەوای تۆیەو، یاساو بەرنامە بۆ تۆ دادەنێ، وە پەروەردگاری تۆیە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەگەر تەنیا بە دوای بەرنامەی خوا نەکەوتی، مانای وایە تەنیا خوات نەپەرستوە، بۆیە ئەو مسوڵمانانەی کە لە هەندێك لە بوارەکانی ژیانیاندا، بە دوای ڕێچکەو بەرنامەیەکی دیکە دەکەون، بە دوای ئەمرو نەهیی و حەڵاڵ و حەرامی کەسێك و لایەنێکی دیکە دەکەون، کە شتێك بە بەرنامە دادەنێ، لەگەڵ شەریعەتی خوادا دژ و ناکۆکە، ئەوە مانای وایە: لە بەندایەتیی کردن و پەرستنیاندا بۆ خوا، هاوبەشیان بۆ خوا داناوە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، هەندێك لە توێژەروانی قورئان گوتوویانە: ئەمە نەسخ کراوەتەوە، کە دیارە ئێمە لەم زنجیرە دەرسەدا هەر لە دەرسەکانی سەرەتاوە لە سوورەتی (البقرة)دا، هەتا ئێستا هەر گوتوومانە: هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نەسخ نەکراوەتەوەو، تەنانەت هیچ ڕستەیەك نیە، بگرە هیچ وشەیەکیش نیە کە کاری پێ نەکرێ، چونکە نەسخ: بریتیە لە لابردنی حوکمێکی پێشتر بە حوکمێکی دواتر، ئێمە گوتوومانە شتی وا لە قورئاندا نیە، ئنجا یەکێك لەو ڕستانە کە هەندێك لە توێژەروان، بۆ وێنە: (القُرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (الجامع لأحكام القرآن)[1]دا دەڵێ: (وهذا منسوخ بآية السيف: أي: أُتركهم استجهالاً لَهُم)، واتە: ئەم ڕستە قورئانییە کە

---

١) ج ٧، ص ٥٠.

دەفەرموێ: ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، پشت لە هاوبەشدانەرەکان بکەو وازیان لێ بێنە: بە ئایەتی شمشێر نەسخ بۆتەوە، یانی: وازیان لێ بێنەو نادیدەیان بگرە.

ئایەتی شمشێر (آية السيف) یش، واتە: ئایەتی ژمارە (٥) لە سوورەتی (التوبة) کە پێشتر باسمان کرد[١].

هەروەها (الطبراني) لە تەفسیرەکەی خۆی (التفسير الكبير)[٢]دا دەڵێ: ئەم ڕستە قورئانییە نەسخ کراوەتەوە، ئنجا ئایا بۆچی وایانگوتوە؟ بۆیە گوتوویانە: بە ئایەتی شمشێر نەسخ بۆتەوە، چونکە گوتوویانە: دوای ئەوەی جەنگو جیهاد لەسەر مسوڵمانان فەرزکراوە، مانای وایە : ئەی پێغەمبەر ! نابێ لە موشریکەکان بگەڕێیو وازیان لێ بێنی، بەڵکو دەبێ جەنگیان لە دژ بکەی ! بە پێی بۆچوونی ئەوانەی کە گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە نەسخ بۆتەوە.

بەڵام ئێمە دەڵێین: هیچ نەسخ لە گۆڕێ دا نیە، چونکە مەبەستی: ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، هەر لەگەڵ ڕستەکەی پێشیدا، تێکدەکاتەوە، ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، بە دوای ئەو پەیامو بەرنامەیە بکەوە، کە لە خواوە لە پەروەردگارتەوە بۆ سرووش دەکرێ، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، وە پشت لە هاوبەشدانەرەکان بکەو وازیان لێ بێنە، واتە: وازیان لێ بێنە لەوڕووەوە کە بکەویە ژێر کاریگەرییان، یاخود ئیهمالیان بکەو گوێی لە ئازاردانو پڕوپاگەندەو قسەو قاڵەکانیان مەگرە !

وەك (القرطبي) بۆخۆی گوتوویەتی: وازیان لێ بێنەو نادیدەیان بگرە، کەواتە: ئایەتەکە بەو مانایە نیە کە وازیان لێ بهێنرێو، بانگ نەکرێن بۆ

---

١) لە تەفسیری سوورەتی (التوبة) دا بە درێژی باسی مشتومڕی زانایانمان لەبارەی ئەو ئایەتەوە کردووە، خستوومانەڕوو، کە هەر خودی ناولێناوی ئەو ئایەتە بە (آية السيف) هەڵەیە..

٢) ج ٣، ص ٧٢.

دینی خوا، یاخود وازیان لێ بهێنرێ، یانی: هیچ مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرێ، تاکو ناچار بین بڵێین: نەسخ کراوەتەوە، لەبەرئەوەی لەگەڵ ئایەتەکانی دیکەدا تێك دەگیرێ !

بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە : نەکەویە ژێر کاریگەرییان، وە ئازاردانی ئەوانو پڕوپاگەندەو قسەو قاڵی ئەوان، با کاریگەریی لەسەر تۆ نەبێ، کە دەستت شل بێ لە شوێنکەوتنی ئەو پەیامو بەرنامەیەی کە خوا بۆت دەنێرێ !

دیارە (نسخ)یش لە حاڵەتێکدایە، دوو ئایەت، یاخود دوو ڕستەی قورئان، تێکبگیرێنو بەیەکەوە کۆنەکرێتەوە، بەڵام لێرەدا هیچ تێکگیرانێك لە ئارادا نیە.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای، هاوبەشیان بۆ خوا دانەدەنا.

کە پێشتریش باسمان کرد : لێرەدا موعتەزیلەو ئەشعەرییەکان کە بەشێکن لە جەبرییەکان، کەوتوونە مشتومڕی زۆرەوە: جەبرییەکانو ئەشعەرییەکان گوتوویانە: خوا مرۆڤەکان لەسەر کردەوەکانیان ناچار دەکات، دەڵێن: ئەوەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای، هاوبەشیان بۆ خوا دانەدەنا، کەواتە: خوا ویستوویەتی هاوبەش بۆ خوا دابنێن، بۆیە نەیانتوانیوە هاوبەش دانەنێن ! موعتەزیلەش دەڵێن: نەخێر، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئەگەر خوا ویستبای جەبریان لێ بکات، نەیاندەتوانی هاوبەش بۆ خوا دابنێن، بەڵام خوا نەیویستوە، ناچاریان بکاتو ئازادی کردوون، بۆیە توانیویانە هاوبەش بۆ خوا دابنێن!

ئێمەش دەڵێین: مەبەستی ئایەتەکە هەر ئەوەیە، کە خوای دادگەر کاتێك هاوبەشی بۆ دادەنرێو سەرپێچیی لێدەکرێ، وە نەبێ لەبەر بێدەسەڵاتیی بێ، خوا دەیتوانی خەڵك وا دروست بکات، تەنیا بەندایەتیی بۆ وی بکەن، وە دەیتوانی وایان لێ بکات، کە هاوبەش بۆ خوا دانەنێنو کافر نەبن، بگرە سەرپێچییش نەکەن لە فەرمانی خوا، بەڵام نەیویستوە جەبریان لێ بکات،

وەك لە چەنـدان شـوێنـی قورئـان دا، ئـەو ڕاسـتییـەی فەرمـووە، بۆ نـموونـە:

١/ ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ﴿٩٩﴾﴾يونـــــس، واتـــە: ئەگەر پەروەردگارت ویسـتبای تێکڕای خەڵکی سەر زەوی ئیمانیان دەهێنا.

٢/ هـەروەها فەرموویـەتی: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾﴾هـود، واتـە: وە پەروەردگـارت ئەگـەر ویستبای، خـەڵکی دەکـردە یەك کۆمەڵ و هەمـووی لەسـەر ئیمـان کۆدەکردنـەوە.

بەڵام نەیویسـتوە وایان لـێ بکات، بەڵـکو ویسـتوویەتی ئازادیـان بکـات، ئنجـا کە ئازادیشـی کردوون، هەیـانە بـە ویستی ئازادانـەی خـۆی خـوا بەیـەکدەگـرێ و، تەنیا خـوا دەپەرسـتێ، وە هەشیانە هەر بـە ویسـتی ئازادانـەی خـۆی، هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنـێ و سـەرپێچیی لە فەرمانی خـوا دەکـات.

بەڵـێ ئەم حـەقیقەتـە لە زۆر شوێنی قورئـاندا هاتـوە، کە تـەنیا مەبەسـت پێـی دەرخسـتنی ڕەهـایی ویسـتی خـوای بـاڵادەسـت، ویسـتی خـوا وەك سـەرجەم سـیفەتەکانـی دیکـەی، ڕەهـایەو سـنووردار نیـە، وە خـوای بـەرزو مـەزن کـاتـێ کوفری پێدەکرێ، هاوبەشـی بۆ دادەنـرێ و، سـەرپێچـیی لـێ دەکـرێ، لەبـەر ئـەوە نیە کە خـوای باڵادەست نەتوانـێ ڕێگا لە کوفـر پێکـرانی و، هاوبەش بـۆ دانـرانـی و، سـەرپێچیـی لێکـرانـی، بگـرێ، دەیتـوانی وابکـات، بـەڵام بۆخـۆی ویسـتوویەتی مرۆڤەکان ئازاد بکـات، تاکـو بـە ویسـتی ئازادانـەی خۆیـان: بەندایـەتیی بـۆ خـوا بکەن، یان نەیکـەن، خـوا بەیـەك بگـرن، یـان هاوبەشـی بـۆ پەیدابکـەن، بەنـدەی چاك بن، یان بەندەی خـراپ بـن، بـۆ وێنـە:

خـوا لـە سـوورەتی (التكوير)دا دەفـەرموێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: وە ناتانەوێ، مەگەر پەروەردگاری جیهانەکان بیەوێ.

بەڵـێ: ئەگـەر خـوا ویسـتبای مرۆڤـەکان ئـازاد نەکـات و، ویسـتبای ڕێگـای کوفریان لـێ بگـرێ، وەك چۆن ڕێگای کوفـرو سـەرپێچـییکـردنی لـە فریشـتـەکان گرتـوە، نـەك هـەر ئـەوە بەڵـکو مـاددەی بـێ ژیـان، لـە گەردیلـە تـا کەهکەشـان،

هیچی لە فەرمانی خوا دەرناچێ، وەك دەفەرموێ: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا ﴿٨٣﴾﴾ آل عمـــران، واتـە: ئایـا بەرنـامەی جگـە لـە خـوا دەخـوازن، لـە کاتێکـدا کـە هەرچـی لـە ئاسمانەکانو زەوی دایـە، چارو‌ناچار بۆی ملکەچن؟

٣/ هـەروەها کـە دەفـەرموێ: ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾﴾ الأنعام، واتـە: هـەر کەسێك خـوا بیـەوێ، گـومڕای دەکـات، هـەر کەسێکیش بیـەوێ، ڕێنمایی دەکـات بۆ ڕێـی ڕاسـت.

ئەوە هـەمووی مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە ویسـتی خـوا ڕەهایـە، بـەڵام خـوا بـەو ویستە ئازادەی خۆی، وە بـە حیکـمەتی بێسـنووری خـۆی، ئینسـانەکانی وا دروسـت کردوون، کە بتـوانن ڕاسـت بـڕۆنو، چـەوت بـڕۆن، بەرەو خـوا بچـنو پشـت لە خـوا بکـەن، وە ئیمانی پـێ بێنـنو ئیمانیشـی پـێ نەهێنـن.

بـەڵام لـێرەدا دەبـێ ئـەوە بزانـرێ : کـە ویسـتی ڕەهـای خـوا، بـە گۆتـرە ئـیش ناکـات، واتە: ئەوە نیـە کە خـوا ﷻ ویستەکەی لە حیکمەتـەکەی جیابـێ، بەڵـکو لـە هەمان کـات دا کـە خـوا ویستەکەی ڕەهـایە، ویسـتی ڕەهـای خـوا، بەپێـی حیکمـەتـی ڕەهای خـوا، ڕوو لە شـتەکان دەکـات.

بـا بـزانیـن چـۆن ؟ لـە لایـەك خـوا دەفـەرموێ: هەرکـەس بیـەوێ، گـومڕای دەکاتو، هـەرکەس بیـەوێ، ڕێنمـایی دەکـات، لـەوێ بە ڕەهایی فەرموویەتی، بەڵام لـە شوێنی دیکە بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە ئەو ویستەی خوای کاربەجێ، بۆ گـومڕاکردنی خـەڵك، بەگۆتـرە نیـە، وەك فەرموویـەتی: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾﴾ إبراهيم، خـوا ستەمکارەکان گومـڕا دەکـات.

هـەروەها بـە نسـبەت هیدایەتەکەشی بـە هـەمان شـێوە، خـوا ڕێنمـایی کەسـێك دەکات، کە بـەرەو وی دەگـەڕێتـەوە، وەك فەرموویـەتی: ﴿... وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾﴾ الرعـد.

هەروەها لە سوورەتی (الزمر)دا لەوبارەوە کە خوا هیدایەتو ڕێنمایی خەڵکی خراپ ناکات، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ٣﴾، واتە: بێگومان خوا ڕێنمایی کەسێك ناکات کە زۆر درۆزنو سپڵەیە، کەواتە: بەهۆی درۆزنیو سپڵەییەوە، ئەوانە ڕێیان لێ تێکدەچێ.

ئنجا خوای زاناو تواناش لە ئەزەلەوە وای بڕیار داوە، کە هەر کەسێك چ ڕێیەك بگرێتەبەر، ئەویش ویستەکەی بۆ ئەوە دەخاتە کار، چونکە حیکمەتی خوا وا بووە، کە ئەو ئینسانە لەسەر زەوی ئازادبێ، وە هیچ کۆتو بەندێکی لەسەر نەبێ، وە بە ویستی ئازادانەی خۆی، ڕێی ڕاست بگرێ، یان ڕێی چەوت.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ﴾، خوا لێرەدا دوو وشەی بەکارهێناون بۆ پێغەمبەر ﷺ، هەردووکیانی لێ نەفی کردوون، دەفەرموێ: تۆمان نەگێڕاوە بە پارێزەر بەسەریانەوە، وە تۆشمان نەگێڕاوە بە وەکیل بەسەریانەوە.

دیارە ئەم دوو وشەیە، دەبێ چەمكو واتایەکەیان جیا بێ، (الطبراني) لە تەفسیرەکەی خۆی (التفسير الكبير)دا دەڵێ: (إِنَّمَا جَمعَ بَيْنَ حَفيظٍ وَوَكِيلٍ لاخْتِلافِ مَعْنَاهُمَا، فَإِنَّ الحَافِظَ للشيءِ هُوَ الَّذِي يَصُونهُ عَمَّا يَضُرّهُ، وَالوَكِيلُ بالشيءِ هُوَ الَّذِي يَجْلِبُ الخَيْرَ إِلَيْهِ)[1].

واتە: بۆیە خوا ﷻ وشەی (حفيظ) و (وكيل)ی کۆکردوونەوە، {کە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەر ! ﷺ تۆ نە پارێزەریو نە وەکیلی بەسەر کافرەکانەوە} (حَافِظ) ی شتێك ئەوەیە کە دەیپارێزێ لەوە کە تووشی زیان ببێو، زیانی پێ بگەیەنرێ، بەڵام (وكيل)ی شتێك ئەوەیە کە خێرو چاکەو سوودی بۆ بێنێ.

---

١) التفسير الكبير، للطبراني، ج ٣، ص ٧٣.

كەواتە: خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: تۆمان دانەناوە كە نەهێڵی كافرەكان تووشی زیان ببن، وە تۆشمان دانەناوە كە بە زۆر تووشی خێرو سوودو قازانجیان بكەی، بەڵكو تۆ ڕاگەیاندنت لەسەرە، وە بەرچاو ڕوونكردنەوەیانت لەسەرە، ئاگاداركردنەوەو ترساندنو وریاكردنەوەیانت لەسەرە، بەلاٚم تۆ ناچاریان ناكەی، خۆیان لە كوفرێك بپارێزن كە زەرەریانە، وە ناچاریان ناكەی ئیمانێك بێنن كە قازانجیانە، بەڵكو خوا ﷻ بۆخۆشی ئەوەی لەگەڵ نەكردوون، تاكو تاقی بكرێنەوە، چونكە ئەگەر خوا خەڵكی ناچار كردبایە، ئیمان بێنن، یاخود ڕێیان لیٚ بگریٚ، كافربن، ئەو كاتە نەدەگونجا تاقیبكرێنەوە لەسەر زەوی، وەك چۆن خوا فریشتەكانی تاقی نەكردۆتەوە، وە ماددەی بیٚ ژیانی تاقی نەكردۆتەوە، ئاژەڵەكانی تاقی نەكردوونەوە، ڕووەكو درەختەكانی تاقی نەكردۆتەوە، زیندەوەرەكانی تاقی نەكردۆتەوە، بەو واتایە كە ئازادیان بكات، بەڵكو هەموویانی ملكەچ كردوە، بۆ چەند یاسایەكو لە گەردیلەوە تا كەهكەشان، ماددەی بیٚ ژیان، مەحكوومی چەند یاسایەكی گەردوونییە، كە خوا بۆی داناون، هەروەها ئاژەڵو زیندەوەرو پەلەورو ڕووەك، هیچیان لەو یاسایانە كە خوا بۆی داناون، لانادەن، بۆیە بەكەڵكی تاقیكردنەوە نایەن، كەسێك بەكەڵكی تاقیكردنەوە دیٚ، كە بتوانیٚ چاكە بكاتو خراپە بكاتو، ڕاست بڕواو چەوت بڕوات.

# باسێک لە بارەی جنێودان بە پەرستراوانی جگە لە خوا

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍ ﴾، ئێمە لەبارەی جنێودان بە پەرستراوانی جگە لە خواوە، دوو ڕاستیی دەخەینە ڕوو، پاشان چوار هەڵوەستە لە بەرانبەر ئەو ئایەتەدا دەکەین:

**ڕاستیی یەکەم:** وشەی (سب)، (شتم) ئێمە لە کوردەواریی دا هەر دەڵێین: جنێو، قسەی ناشیرین، ئەویش ئەوەیە کە هەندێك وشەو تەعبیر بۆ بەرانبەرەکەت بەکاربێنی، کە پێی نارەحەت بێ‌و، پێی سووکیی‌و بێڕێزیی بێ‌و بە کەم تەماشاکردن، بگەیەنێ، ئەگەرنا جاری واش هەیە بۆ بەرانبەرەکەت وشەیەك بەکاردێنی، کە پێی ناخۆشە، بەڵام بە جنێو لە قەڵەم نادرێ، بۆ نموونە: ئەگەر تۆ بڵێی: فلان کەس تۆ هەڵەی، یان کەسێك بەڵێنێك بداو نەیگەیەنێتە سەر، تۆش پێی بڵێی: تۆ بێ بەڵێن بووی، هەروەها ئەگەر کەسێك درۆت لەگەڵ بکات، پێی بڵێی: تۆ درۆت کرد، ئەوە پێی ناگوترێ: جنێو، چونکە مەبەستت بێڕێزیی‌و کەم تەماشاکردن نیە، بەڵکو مەبەستت دەرخستنی حەقیقەت‌و واقیعی ئەوە.

لێرەدا یەکێك پرسیار دەکات: لەلایەکەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، جنێو بەو شتانە مەڵێن: کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوەو دەیانپەرستن.

ئەدی بۆچی خوای کاربەجێ لە هەندێك شوێن دا قسەی ناخۆشی بە کافرەکان‌و پەرستراوەکان فەمووە ؟! بۆ وێنە :

١/ لـە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾الأنبیاء، واتە: ئێوەو ئەوانەی لـە جیاتی خوا دەیانپەرستن، سووتەمەنی {یاخود وردە بەردی} دۆزەخن، دەچنە نێوی؟!

٢/ وە لـە شوێنی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟ وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ ﴾ الأعراف، کە وەك دەبینین: خوا بتو صەنەمەکانیان بە کەڕو کوێر ناوزەد دەکات ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوە جنێو نیە، چونکە کە دەفەرموێ: ئەوانە سووتەمەنی دۆزەخن، باسی سەرەنجامیان دەکات، وە ئەوانیش هەر بڕوایان بە دۆزەخ نەبووە، هەتا بڵێین: ئەوە سووکایەتییە.

یان کـە دەفەرموێ: نابیستن‌و نابینن، باسی واقیعەکەیان دەکات، بێگومان بت‌و صەنەمەکان توانای بیستن‌و بینینیان نەبووە، کەواتە: مەبەست لـە (سب)و (شتم) بەکارهێنانی وشەو تەعبیری دیکەیە، کە بێڕێزیی‌و سووکیی بگەیەنێ، خوای بەرزو مەزن ڕێی ئەوەی لێ گرتوون، بەڵام ڕێی ئەوەی لێ نەگرتوون بڵێن: ئەوە بتە، ئەوە صەنەمە، یان نابیستێ، یان نابینێ، یان زیانی نیە، یان قازانجی نیە، چونکە ئەو وشانە هەموویان لـە قورئاندا هاتوون‌و، دیارە بە جنێو لە قەڵەم نادرێن، ئەگەرنا خوای زاناو کاربەجێ بەکاری نەیدەهێنان.

<u>**ڕاستیی دووەم**</u>: ئەسڵی جنێودان لـە ئیسلامدا شتێکی قەدەغەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلاَ اللَّعَّانِ، وَلاَ الفَاحِشِ، وَلاَ البَذِيِّ﴾[1]، واتە: ئیماندار تانە لێدەرو، نەفرین لێکەرو، قسەی

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ فِي "الأدب المفرد" برقم: (٣١٢)، وَأَحْمَد برقم: (٣٨٣٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٧٧)، وَقَالَ: حَسَنٌ غريبٌ، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥٠٨٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٩٢)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (١٠٤٨٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٩) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين، وَالبَيْهَقِيُّ فِي "شعب الإيمان" برقم: (٥١٤٩) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

ناشیرینکەرو، زمان شڕو، جنێو فرۆش نیە، (لەگەڵ هیچ کەس‌و بەرانبەر بە هیچ کەس، نەك تەنیا لەگەڵ مسوڵمانان دا) کەواتە: کە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍ﴾، نەك هەندێ لە توێژەرەوان، بەڵكو ئەو تەفسیرانەی من تەماشام کردن هەموویان وادەڵێن، دەڵێن: لەبەرئەوەی کە ئەوانیش بە دەستدرێژیی کارانەو بە تێپەڕێنەرانەو بە نەزانیی جنێو بە خوا نەڵێن، ئێوە جنێو بە پەرستراوەکانیان مەدەن، دەڵێن: ئەگەرنا دروستە جنێویان پێ بگوترێ، ئەگەر لەبەرئەوە نەبێ، کە ئەوان قسەی ناشیرین بەرانبەر بە خوا بکەن‌و، بێئەدەبیی بەرانبەر بە خوا بکەن !

بەڵام من دەڵێم: ئەو لێکدانەوەیە ڕاست نیە، چونکە:

لە ڕاستییدا ئەو (ف)ە ی سەر: ﴿فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍ﴾، مەبەست ئەوە نیە کە خوا بفەرموێ: بۆ ئەوەی کە ئەوان جنێو بە خوا نەڵێن، ئێوەش جنێویان پێ مەڵێن ! بەڵكو ئەو (ف)یە ئەوە دەگەیەنێ کە لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئێوە جنێو دەڵێن، ئەوانیش جنێو دەڵێن، واتە: سەرەنجامەکەی ئەوانیش جنێو دەڵێن، ئەگەرنا لە ڕاستییدا جنێودان بە بت‌و صەنەم، با مەترسیی ئەوەشت نەبێ، کە بتپەرستەکەش قسە بە خوا، بڵێ‌و بێئەدەبیی بکات، جنێودان هەر خراپە، بۆچی؟ چونکە هەر حەدیسەکەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئیماندار تانەلێدەرو لەعنەتکەرو قسەی ناشیرینکەرو جنێودەر نیە.

کەواتە: لە ئەسڵدا مسوڵمانان نابێ لە خۆیانی بوەشێننەوە، جنێو بڵێن، با مەترسیی ئەوەشیان نەبێ، جنێو بە خوا بگوترێ، یاخود جنێو بە خۆیان بگوترێ، هەر نابێ مسوڵمان لە خۆی بوەشێنێتەوە جنێو بداتو، قسەی ناشیرین بکات، بۆیە من ئەو بۆچوونەی ئەو توێژەرانەم پێم ڕاست نیە، کە دەڵێ: ئەگەر مەترسیی ئەوەمان نەبوو، قسە بە خوا بگوترێ، قەیناکات کە قسە بە بت‌و سەنەمەکان بدەین ! چونکە جنێو گوتن، هەر بۆخۆی شتێکی ناشیرینەو، سیفەتێکی دزێوەو، مسوڵمان نابێ لەخۆی بوەشێنێتەوە.

ئنجا ئەگەر مەترسیی ئەوە هەبوو، کە لە بەرانبەر ئەو جنێوەدا، جنێو بە خوا بگوترێ، ئەوە زیاتر قەدەغە دەبێ، بەڵام ئەگەر مەترسییش نەبوو، هەر قەدەغەیە.

ئنجا لە لایەکی دیکەوە دەڵێین: ئەو بتو سەنەمە ماددەیەکی بێ ژیانە، دروستکراوی خوایەو، نابێ بێڕێزیی بکرێ بە دروستکراوی خوا.

ئنجا ئێمە بەرانبەر ئەم ئایەتە قورئانییە، چوار هەڵوەستە دەکەین:

**هەڵوەستەی یەکەم:** زۆرجار دەمارگیریی (تعصب) شتی سەیر بە ئینسان دەکات، ئالووسیی خاوەنی تەفسیری (روح المعاني) دەڵێ: جارێك لە مەجلیسێك بووین، کەسێکی شیعیی لەگەڵ کەسێکی سوننیی دا مشتومڕیان بوو، شیعەکە قسەی بە ئەبو بەکر، یان عومەر گوت (خوا لێیان ڕازی بێ) هەردوو وەزیری پێغەمبەر ﷺ، سوننییەکەش قسەی بە عەلی گوت، خوا لەویش ڕازی بێ، دەڵێ: منیش پێمگوت: تۆ بۆچی قسە بە عەلی دەڵێی، خۆ ئێمە فەرقیان پێ ناکەین، هەموویان پیاوی باشن‌و هاوەڵی پێغەمبەرن ﷺ ؟!، گوتی: دەزانم، دوایی داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، بەڵام هەر ویستم ڕقی وی هەڵسێنم !

کە ئەوە زۆرجار لە نێوان مسوڵمانان‌و جوولەکەو مەسیحییەکانیش دا ڕووی داوە! بەڵام دروست نیەو نابێ ئەگەر جوولەکە قسە بە پێغەمبەری ئێمە ﷺ بڵێن، تۆش بۆ ڕق هەڵسانی ئەوان، قسە بە مووسا بڵێی ! یاخود ئەگەر نەصرانیی، قسە بە پێغەمبەری ئێمە ﷺ بڵێن، تۆش بێی قسە بە عیسا بڵێی ! ئەوە هەمووی نەزانیی‌و نەفامییە، وە دەمارگیرییەکی بێجێیە، مسوڵمان نابێ ئەوە لەخۆی بوەشێنێتەوە، هەڵبەتە پێغەمبەران لە لای ئێمە هەموویان جێی ڕێزن، کەسایەتییە گەورەکانی ئیسلام، لە نێو خودی خۆماندا هەموویان جێی ڕێزن، وە کەسێك واش نەبێ، دیسان جنێو پێدانی‌و، قسەی ناشیرین پێگوتنی، شتێکی بێجێیەو، نابێ لە خۆمانی بوەشێنینەوە.

**هەڵوەستەی دووەم:** هەر شتێك سەربکێشێ بۆ گوناهێك قەدەغەیە: (محمد رشيد رضا) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، لەوبارەوە قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: (وَاستَنبط العُلَمَاءِ مِنْ هَذِهِ الآيَة أَنَّ الطاعة إِذَا أَدَّت إِلى مَعْصِية رَاجِحَةٍ، وجب

تركها، فَإِن ما يُؤَدّي إِلى الشرِّ من الشرّ، وَمِنْ فُروع هَذِهِ المسْأَلَة .. أَن مَعْنَى لفظ الكُفْر فِي اللَّغَة: السّتر والتّغْطِية، وَغَلَب لفظ الكُفْر فِي القُرْآن وعرف الفُقَهَاء والمتكلمين بمَعْنى المقَابل للإيمَان الصحيح شَرْعاً، ثُمَّ غلب في عرف كُتّاب هَذَا العَصْر عَلَى الملاحِدَة المُعَطّلين المنكِرين لِوجُودِ الله عَزَّ وَجَلَّ، فَصَارَ إِطْلاَقه عَلَى كُلّ متدين، سَبّاً وَإِهَانَةً، فَيَتَرَتّب عَلَى هَذَا أَن إطلاقه عَلَى من يحرم إيذاؤه مِنْ أَهْل الأَدْيَان مُحَرّم شَرْعَاً، إِذَا تَأذّى بِهِ، ولا سِيَّمَا فِي الخطاب، وَذَكَرْنَا شاهِداً لِهَذَا من فتاوى الحَنَفِية، وَهُوَ فِي "معين الحكم" قَالَ: إِذَا شَتَمَ الذمي يُعَزَّرُ لأَنَّهُ ارتكب مَعْصِية، وَفِيهِ نَقْلاً عَن "الغنية": وَلَوْ قَالَ للذمي: يَا كَافِر! يَأْثم لأَنَّ يَشُقُّ عَلَيْهِ)[1]، واتە: زانایان لەم ئایەتە هەڵیان هێنجاوە، کە تاعەتو چاکە ئەگەر بوو بەهۆی سەرپێچییکردنو، گوناهێك کە گەورەتر بوو لە تاعەتەکە، دەبێ ئەو تاعەتە واز لێ بهێنرێ، چونکە هەر شتێك ببێتە هۆی پەیدابوونی خراپە خراپو قەدەغەیە.

ئنجا لە لقەکانی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە وشەی کوفر لە زماندا، بە مانای داپۆشینو پەردەپۆشکردنی شتێك دێ، وە لە قورئانداو لە زاراوی شەرعزانانو موتەکەللیمین (زانایانی عەقیدە)دا وشەی کوفر لە بەرانبەر وشەی ئیمان دا قەرار دەگرێ، ئیمانی ڕاستو دروست، کە دەڵێی: ئەوە کوفرە، واتە: پێچەوانەی ئیمانە، بەڵام لە زاراوی نووسەرانی ئەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، (دیارە لە ڕۆژگاری ڕەشید ڕەزا خۆی دا، کە ئێستاش هەر وایە)، مولحیدەکانو ئەوانەی کە نکووڵیی لە بوونی خوای پەروەردگار دەکەن، تەنیا ئەوانە وشەی کوفریان بۆ بەکاردێ، (وشەی کافر زیاتر بەوان دەگوترێ) بۆیە بینا لەسەر ئەوە، کە وشەی کوفر بۆ هەر کەسێك کە ئەهلی دیانەت بێ، بە جنێوو بە بە سووك تەماشا کردن، لە قەڵەم دەدرێ : بەکارهێنانی وشەی کوفر بۆ کەسێك کە ئەزیەتی بدات، لە خاوەن دینەکانی دیکە، لە شەرع دا قەدەغەیە، مادام بەو وشەیە دڵی ئازار بدرێ، بەتایبەتی لە کاتی دواندنو قسەکردندا، وە لەوبارەوە بەڵگەیەکمان هێناوەتەوە لە فەتوای حەنەفییەکان، کە کتێبێکیان هەیە بەناوی (مُعین الحکم) دەڵێ: ئەگەر مسوڵمانێك جنێوی بە زیمیی یەك دا، (واتە: ئەوانە کە

---

١) تفسير القرآن الحكيم: ج٧، ص٦٦٧.

پەیمانیان هەیە لەگەڵ مسـوڵمانان دا) دەبێ ئـەو مسـوڵمانە سزا بـدرێو تەمبـێ بكرێ، {یانی: ئەگەر پێـی گوت: ئەی كـافر ! هـەروەهـا هەر وشـەیەك بە جنێـوی دابنـێ}[1]، هەروەها لە كـتێبی (الغُنْیـة)دا دەڵـێ: ئەگەر بە بابـای زیـمییـی (واتە: جوولەكـە، یان نەصرانیـی، یان یـەزیدیـی، یان مەجووسـیی، یان بووذایـی یـەك)[2] بڵێ: ئەی كافـر! وە پێی ناڕەحەت بێ، ئـەوە پێی گوناهبار دەبـێ.

ئنجـا بەڕاسـتیی ئـەوە تێبینییـەكی زۆر وردە كـە لـەم ئایەتـە وەریـدەگرین، كـە دەفەرمـوێ: جنێـو بەو شـتانە مەڵێن، كە لە جیـاتی خـوا دەیانپەرسـتـن.

هەڵبـەتە ئێمـە دڵنیـاین كـە هــەركەس مسـوڵمان نـەبێ، كـافرە، بـەڵام خـۆش مامەڵـەبوون لەگەڵ نامسوڵمانانـدا، خـوازیاری ئەوەیـە كـە تـۆ وشـەیەك كـە ئـەوان پێی ناڕەحـەت بن، بەتایبـەتی لە كـاتی مامەڵـەكـردنو قسە لەگــەڵ كردنـدا، ئـەو وشـەیان لەگەڵ بەكارنەهێنی، بۆ وێنــە: نەڵـێی كـافر، چونكە ئـەو پێـی وایـە كـە پێت گوت: كـافر، یانی: بڕوات بە بوونی خـوا نیــە، یـان بـڕوات بـە دواڕۆژ نیــە، یـان بـڕوات بـە پێغـەمبــەرایەتیی نیـە، ئـنجـا دیـارە ئـەوەی خـاوەن كتێبـیش بـێ، بـڕوای بەوانــە هــەموویـان هەیــەو، بـە حیسـابی خۆیـان بڕوایان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەیــە، وە بڕوایـان بـە فریشـتەو جنـدەكانو، بـە لێپرسـینەوەو، بـە پێغـەمبـەرانو وەحـی هـەیە، بەڵام دیـارە بڕوایان بە پێغـەمبــەر ﷺی ئێمـە نیـە، وە بە تەئكید هـەر كەسێك بـڕوای بـە پێغـەمبـەری خاتەمـی خـوا نەبـێ، بەڵـكو بڕوای بە یەكێك لە ئایەتەكـانی قوڕئــان نەبـێ، بـە كـافر لـە قەڵـەم دەدرێ، بـەڵام مادام ئەو ئینسانە وشـەی كـافر بە واتایــەك لێـكدەداتەوە، كە پێـی وایـە تـۆ ئـەو تۆمەتبار دەكەی بـەوەی كە ئیمـانی بە بـوونی خـوا نیـە، یـان قیامـەت نیـە، نابــێ ئەو وشـەیەی بۆ بەكـاربێنــی.

**هـەڵوەسـتەی سـێیـەم:** لێـرەدا (أبـو منصور)ی ماتۆریـدیی ئیشـكالێكی باسكردوە، دەڵێ: (كَيْفَ نَهَانَا اللهُ عَنْ سَبّ مَن يَسْتَحِق السبَّ، لئَلا يُسَبَّ مَنْ لا يستحِقّهُ، وَقَدْ أَمَرَنَا بقِتَالِهِم، وَإِذَا قَاتَلْنَاهُمْ، قَتَلُونَا، وقَتْلُ الـمُؤمن بغَير حَقّ مُنْكَر ؟!)

---

١) ئـەوەی نێـوان كەوانەكان زیادەی خۆمـە، بۆ زیاتر ڕوونبـوونەوەی مەبەست.

٢) ئـەوەی نێـوان كەوانەكان زیادەی خۆمـە، بۆ زیاتر ڕوونبـوونەوەی مەبەست.

واتـە: خـوا چۆن ڕێمان لـێ دەگـرێ جنێـو بـدەین بـە شـتێك، كـە شـایستەی جنێـو پێــدرانە (بــتو صــەنەمەكان، شـایســتەی جنێـو پێـدرانن) ئــەدی بۆچـی خــوا فەرمانمان پێدەكات لـە دژی كافرەكـان بجـەنگین، وە ئەگـەر لـە دژیـان بجەنگــین، ئەوانیش ئێمـە دەكوژن، (ئێمــەش ئـەوان دەكـوژین) دیـارە كوشتنی مسوڵمانیش بە ناهـەق، شـتێكی خراپـە؟!

واتە: بەو پێیە دەبووایە خـوای بەرز فەرمانیشـمان پـێ نـەكات بـە جیهاد، وەك چۆن دەفـەرموێ: جنێـو بـە پەرسـتـراوەكانیـان مەڵـێن، بۆئـەوەی جنێـو بـە خـوا نەڵێن، ئەدی بۆچی نەشیفەرمووە: جـەنگ مەكـەن، بۆئـەوەی نەكوژرێـن ؟!

(محمـد رشـید رضــا) لـە تەفسیــرەكەی خۆیـدا، وەڵامێكـی جـوانی دەداتــەوەو دەڵێ: (سَبُّ الآلهة مباح غير مفروض وقتـالهم فرض، وكذا التبليغ، وما كان مباحـاً يُنهـى عمـا يتولّـد منـه، ومـا كـان فرضـاً لا يُنهـى عمـا يتولّـد منـه)[1]، (دیـارە ئەو بەپێی ڕای زۆربـەی توێژەرەوان ئەم قسەیە دەكـات، ئەگـەرنا مـن خـۆم قەناعەتم وانیە جنێـودان بـە پەرسـتــراوانی ئەوانیـش، شـتێكی ڕەوابـێ، چونكـە مسوڵمان نابێ جنێـو لـە خـۆی بوەشـێنێتەوە، بەڵـێ ئـەو بـتو صـەنەمانە، لێیـان دەوەشـێتەوە قسـەیان پـێ بگوتـرێ، بەڵام تۆ نـابێ لە خۆتی بوەشـێنیتەوە)، بـەڵام ئەو دەڵێ: ئەم جنێودانە بە پەرستراوەكان ڕەوایە، بـەڵام فـەرز نیـە، بـەڵام جـەنگ لــە دژكردنـی كافرەكـان، هـەروەها بانگكردنیــان بـۆ ئیسـلام، فـەرزە، ئنجا شـتێك ئەگـەر لە ئەسڵ دا ڕەوابـێ، ڕێگـریی لـێ دەكـرێ، هـەر كـات شـتێكی لـێ پەیـدا بوو كـە خـراپ بـێ، بـەڵام شـتێك كـە فـەرز بـێ، لەبەرئـەوە ڕێگریـی لـێ نـاكرێ، كـە دەرەنجامێكـی خراپـی لـێ پەیـدادەبێ.

**هـەڵـوەستەی چـوارەم** : زۆربــەی توێــژەرەوانی قورئـان گوتوویـانە: (فِي الآيَةِ دَلِيلٌ عَلَـى وَجُـوبُ الحُكْـم بسَـدِّ الذَّرِيعَـةِ) بنچــینەیەك هەیــە زۆر لــە زانایـان كـاری پێدەكەن، بەڵام زیاتر لە مەزهـەبی ئیمـام مالیكدا ناسـراوە، پێـی دەگوتــرێ: (سَـدّ الذَّرِيعَة) ڕێگـرتن لە بیـانوو، یان: ڕێگـرتن لە هۆكاری تووشـبوونی گونـاح، بۆ وێنە

١) تفسير القرآن الحكيم: ج٧، ص٦٦٧.

دەڵێن: لە کاتێکدا کە ئاژاوەو ئاشووب پەیدادەبێ لە نێوان مسوڵمانان دا، دروست نیە چەك بفرۆشرێ، چونکە ئەو چەکە دەکەوێتە دەستیانو یەکدی پێ دەکوژن.

یان: کەسێك ئەگەر بزانی شەڕاب دروست دەکات، دروست نیە، ترێی پێ بفرۆشرێ، یان خورمای پێ بفرۆشرێ، چونکە شەڕابی لێ دروست دەکا.

ئا ئەوە پێی دەگوترێ: (سَدّ الذَّرِیعَة) واتە: ڕێگرتن لەو شتانەی کە دەبنە هۆی پەیدابوونی گوناحو خراپە، دیارە بۆچوونەکەشیان جوانە، لێرەش: مادام خوا دەفەرموێ: جنێو بەو شتانە مەڵێن کە ئەوان دەیانپەرستن، بۆئەوەی ئەوانیش جنێو بە خوا نەڵێن، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە هەر شتێك ببێتە هۆی پەیدابوونی دەرەنجامێکی خراپ، با خۆیشی قەدەغە نەبێ، لەبەر دەرەنجامە خراپەکەی، قەدەغە دەبێ، وەك نموونەی چەك فرۆشتنو، ترێو خورما فرۆشتنمان باسکرد.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾، ﴿كَذَٰلِكَ﴾ واتە: ئاوا بەو شێوەیە، بۆ هەر کۆمەڵێك، کردەوەکەیانمان بۆ جوان کردوون، دوایی گێڕانەوەیان بۆ لای پەروەردگاریانە، ئنجا هەواڵیان پێدەدا بەوەی کە دەیانکرد.

هەندێك لە زانایان پرسیارێکیان کردووە ئیشکالێکیان باسکردوە: ئایا خوای دادگەر کردەوەی خراپی کافرەکان، بۆ کافرەکان جوان دەکات ؟ کوفریان بۆ جوان دەکات؟ شیرکیان بۆ جوان دەکات؟ قەتلو زیناو شەڕاب خواردنیان بۆ جوان دەکات؟ بۆچی بۆیان جوان دەکات؟ ئایا ئەگەر بۆی جوان نەکردبان نەیاندەتوانی بیکەن؟ (محمد رشید رضا) ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ کە زۆرجار وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارو ئیشکالانە دەداتەوە، لە تەفسیرەکەی خۆی: (تفسیر القرآن الحکیم)دا، لێرەش دا وەڵامێك دەداتەوە، کە زۆرم پێ جوانە دەڵێ : (أي: سنَّتُنا في أخلاق البشر وشؤونهم، أن يستحسنوا ما يستمرون عليه وما يتعوَّدونه مما كان عليه آباؤهم، أو مما استحدثوهُ بأنفسهم...) واتە: مەبەستی خوای

پەروەردگار لەم ڕستە قورئانییە كە دەفەرمویّ: ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾، ئـاوا بـەو شـێوەیە بـۆ هـەر كۆمەڵە خەڵكێك كردەوەكانیانمان بۆ جوان كردوون، كردەوەكانیان چاك بـن، یان خراپ) یانی: سوننەتو یاسای ئێمە لە هەڵسوكەوتی بەشەرو لە كاروباری بەشەردا وایە، كە ئەو شتەی لەسەری بەردەوام دەبنو، عادەتی پێوە دەگرن، لەوەی كە بابو باپیرانیان لەسەری بوون، یان لەوەی كە بۆخۆیان دایان هێناوە، كە پێیان چاك بێ.

كەواتە: لێرەدا خوای زاناو شارەزا باسی حاڵو واقیعی بەشەر دەكات: هەر كۆمەڵێك ئەو كردەوەیەی كە دەیكەن، دیارە پێیان خۆشەو پێیان چاكە؛ ئەو بت پەرستەی، بتەكەی دەپەرستێ، پێی وایە شتێكی زۆر باشی كردوە.

شەڕاب خۆرێك كە شەڕاب دەخواتەوە، پێی وایە شتێكی باشی كردوە.

ئەوەی كە ڕێگریی دەكات، پێی وایە ڕێگریی شتێكی زۆرباشە، كەسابەتێكی زۆر باشە.

ئەوەی كە قومار دەكات، پێی وایە زۆر باشە ماڵێكی دەست بكەوێ، بێئەوەی ئارەقەی پێوە بكات ...هتد.

كەواتە: لێرەدا خوا مەبەستی ئەوە نیە بفەرموێ: من خراپەم بۆ كافرەكان جوان كردوە! دەفەرموێ: بەپێی یاسای خوا، هەر كاتێك ئینسان لەسەر شتێك ڕاهاتو لەسەری بەردەوام بوو، لە لای جوان دەبێ، ئەوەش شتێكی واقیعییە تەماشا بكەن: بابای جگەرەكێش ــ لە خوا بە زیاد بێ كە ئێمە جگەرە ناكێشین، ئێستا لێرەدا جگەرەیەك بكێشرێ، هەمووومان تەنگە نەفەس دەبین، بۆن خڵتەو دووكەڵەكەی ناخۆشە ـ كەسێك كە جگەرە دەكێشێ، ئەویش ڕەنگە یەكەمجار كە دەیكێشێ، بە دووكەڵەكەی قەڵس بێ، بەڵام وردە وردە لەسەری بەردەوام دەبێ، تاكو دەبێتە بەشێك لە خوێنیو لە جەستەیو، تەنانەت لەززەتی لێ دەكات، ئنجا جگەرە هەر تاڵو ناخۆشە، بەڵام خوا مرۆڤی وا دروستكردوە، دەتوانێ بە خێریشەوە ڕابێ، بە شەڕیشەوە ڕابێ.

یان كەسێك كە زینا دەكات، قەتڵ دەكات، شەڕاب دەخواتەوە، قومار دەكات، جنێو بە خەڵك دەدات، غەیبەت دەكات، ئەزیەتی خەڵك دەدات، بێگومان ئەوانە

هەر کردەوەی خراپن، بەڵام مرۆڤ کە لەسەر خراپەش بەردەوام بوو، جۆرێك لە لەززەتی درۆی بۆ پەیدا دەبێ، کەواتە: ئەم ئایەتە حەقیقەتێکی دەروونیی لە ژیانی مرۆڤدا بەیان دەکات، کە مرۆڤ ئەگەر لەسەر شتێك بەردەوام بوو، ئەو شتە چاك بێ، یان خراپ بێ، خۆش بێ، یان ناخۆش بێ، دەبێتە بەشێك لە وجوودی، دەبێتە بەشێك لە کەسایەتیی.

ئنجا لێرەشەوە دەزانین: بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵەکانتان لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە فێری نوێژ بکەن؟ دیارە کە دەفەرموێ: فێری نوێژیان بکەن، واتە: فێری ڕۆژووشیان بکەن، فێری چاکەیان بکەن، فێری ئیمانو عەقیدەو فێری ڕەوشتی جوانیان بکەن، بەڵام کە نوێژی فەرمووە، چونکە نوێژ گرنگترینیەتی، بۆچی لە حەوت ساڵیی دا دەبێ ڕابهێنرێ؟ چونکە هەرچەندە لەسەری فەرز نیە، بەڵام دوایی دەبێتە بەشێك لە کیانی، وە ئەو منداڵە کە دەکەوێتە تەمەنی هەرزەکارییو دوایی باڵغ دەبێ، ئەگەر نوێژ نەکات، وا دەزانێ شتێکی لێ ون بووە، وە ئەگەر ڕۆژوو نەگرێ، پێی وایە غەدرێکی کردوە، وە ئەگەر جنێوێك بدات، وا دەزانێ شتێکی زۆر خراپی کردوە، وە ئەگەر ڕێز لە دایكو بابی نەگرێو، ڕێز لە میوان نەگرێ، هەست دەکات کە شتێکی خراپی کردوە، چونکە وا ڕاهاتووە، ئەو شتانە بوونە بەشێك لە کیانو وجوودی.

ئنجا وەك چۆن ئینسان کە بە شتی چاکەوە ڕاهات، دەبێتە بەشێك لە دەروونییو کەسایەتیی، کە بە شتی خراپیشەوە ڕاهات، هەروایە.

ئنجا عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ، لەوبارەوە دەڵێ: {زَيّنا لأَهْلِ الطّاعَةِ الطّاعَةَ، وَلأَهْلِ الكُفْرِ الكُفْر، وَهُوَ كَقَوْلِهِ تَعَالَى:

﴿يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٩٣﴾ النحل،

واتە: خوای پەروەردگار مەبەستی ئەوەیە کە: بۆ چاکەکاران، چاکەمان جوان کردووە، بۆ ئەهلی کوفریش کوفرمان ڕازاندۆتەوە، ئەمە وەك ئەو فەرموودەیەی خوای بەرزە کە دەفەرموێ: ﴿يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾، (خوا) هەر کەسێ کە بیەوێ گومڕای دەکات، وە هەرکەسێکیش بیەوێ، ڕێنمایی دەکات.

ئنجا لێرەدا پرسیارێکی دیکە دێتە پێش: ئایا حیکمەت لەم ڕستەیە چییە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە کە خوا دەیەوێ دڵی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان بداتەوە، یانی: پێتان سەیر نەبێ ئەوانەی بتو صەنەم دەپەرستن، مانگو خۆر دەپەرستن، تاغوتێك دەپەرستن، هەواو ئارەزووی خۆیان دەپەرستن، پارە دەپەرستن ! ئەوە سوننەتی خوا وایە: هەر کاتێك مرۆڤێك بە شتێکەوە ڕاهات، ئەو شتەی لەلا جوان دەبێ، با لە زاتی خۆشیدا جوان نەبێ، وە لە لای شیرین دەبێ، با لە زاتی خۆشیدا، تاڵو تفتو ناخۆش بێ، وەك هەموو ئەو شتە حەرامانەی خەڵك دەیانخۆن، سوننەتی خوا وایەو، بەشەر ئەو توانایەی هەیە کە ئەگەر خۆی لەسەر شتی خراپیش ڕابێنێ، دوایی ئەو شتەی لەبەرچاو جوان دەبێ، واتە: ئێوە دڵتەنگ مەبنو، بەوە لە هەقی خۆتان مەکەونە گومانەوە : ئەگەر دەبینن خەڵکێکی زۆر ناهەقەکەی خۆی لەلا شیرینە، حەرامو خراپەی خۆیان لەلا ڕازاوەو جوانە، خوا مرۆڤی وا دروستکردوە، چونکە ئەگەر وانەبا، مرۆڤ نەیدەتوانی بە لاڕێدا بڕوات، ئەگەر وەك چۆن مرۆڤی ئیماندار، بەهۆی ئیمانو طاعەتەکەیەوە، هەر کاتێك گوناهێك، بکات هەست بە تاڵایی دەکات، کافرێکیش کە گوناهێکی کرد، هەستی بە تاڵایی کردبایە، نەیدەتوانی گوناهان بکاتو، ئەو کاتەش نەدەگونجا تاقی بکرێتەوە، بەڵام هەر کات مرۆڤ لەسەر گوناهان بەردەوام بوو، وای لێدێ، لەززەت لە گوناهەکانیو لە کوفرەکەی دەکات، وە هەر بەو شێوەیەش دەگونجێ مرۆڤ تاقی بکرێتەوە.

هەروەها پرسیارێکی دیکەش دەکرێ: خوا جوانکردنی کردەوەکانی لێرەدا، پاڵداوەتە لای خۆی: ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ﴾، ئا بەو شێوەیە بۆ هەر کۆمەڵێك کردەوەکانیانمان ڕازاندۆتەوە، بەڵام لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازاندوونە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ ﴿٤٨﴾﴾ الأنفال، وە لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ ﴿١٤﴾﴾ آل عمران، خۆشویستنی ئارەزووەکان بۆ خەڵك ڕازێنراونەوە، واتە: بە نەزانراو (مجهول) باسیکردووەو نازانرێ کێ ڕازاندوونیەوە ؟! وەڵامەکەی ئاوەیە :

١/ خوا پاڵی داوەتە لای خۆی، واتە: بە پێی یاساو سوننەتی خوا، هەر کۆمەڵێكو هەر مرۆڤێك کردەوەکانی خۆی، لەلا جوانن.

٢/ پاڵی داوەتە لای شەیتان، لەبەرئەوەی کە ڕازێنەرەوەو جوانکەری خراپەکان، شەیتانەو ئەوەی کە ڕاستەوخۆ کردەوە خراپەکان جوان دەکات، کوفرو ناشەرعیی جوان دەکات، لەبەرچاوی خەڵك، شەیتانە.

٣/ وە کە بە بکەر نەزانراو (مجهول الفاعل) باسیکردووە: ﴿... زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ ...﴿١٤﴾﴾ آل عمران، ئەگەر مەبەست لە ئارەزووەکان (الشهوات) ئەو شتانە بن، کە شتێکی خواڕسك (فطري)ن و، لە سنووری شەرعدا تێر دەکرێن، وەك غەریزەی جینسیی نێوان ژن و مێردو، ماڵ و سامان و...هتد، ئەوە ڕازێنەرەوەکەیان، خوای کاربەجێیە، بەڵام ئەگەر لە سنووری شەرع بەدەر بن، وەك زیناو مەیخۆریی و دزیی و...هتد، ئەوە ڕازێنەرەوەکەیان، شەیتانە.

**مەسەلەی حەوتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، کە پێشتریش ئەم ئایەتەمان تەفسیر کرد، دەفەرموێ: (کافرەکان) زۆر بە داکۆکیی و جەخت لەسەرکردنەوە، سوێندیان بە خوا خوارد، ئەگەر نیشانەیەکیان بۆ بێ، بێگومان ئیمانی پێ دێنن، بڵێ: بەڵگەو نیشانەکان لەلای خواوەن، وە ئێوە (ئەی مسوڵمانینە!) چ شتێك وایکردوە بزانن و هەست بکەن کە ئەگەر ئەو نیشانانەش بێن، ئەو بێبڕوایانە هەر ئیمانیان پێ ناهێنن؟ واتە: ئێوە ناتوانن ئەوە بزانن، چونکە ئەوە نهێنیی و پەنهانێکە، تەنیا خوا دەیزانێ.

جا لێرەدا دەربارەی وشەی: ﴿ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ﴾، (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (أَي: غَايَةَ أَيْمَانِهِم الَّتِي بَلَغَهَا علمهم، وَانْتَهَت إِلَيْهَا قُدْرَتُهُم)[1] واتە: سوێندەکانیان کە ئەوپەڕی زانیاریی و توانایان پێیان دەگات، واتە: سوێند دەخۆن زۆر بە جەخت لەسەرکردنەوەو داکۆکیی لەسەرکردنەوە، بۆئەوەی بەرانبەرەکانیان قەناعەت پێ بێنن، تاکو پێغەمبەری خوا، داوا لە خوا بکات،

---

١) الجامع لأحكام القرآن ج٧، ص٥١.

نیشانەیەکیان بۆ بێنێ، بۆئەوەی ئیمانی پێ بێنن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لَئِن جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ لَّيُؤۡمِنُنَّ بِهَاۚ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَا يُشۡعِرُكُمۡ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾، مەبەست لە (آية) موعجیزەیە، ئایا بەڵگەمان چییە کە مەبەست پێی ئایەتی قورئان نیە؟ چونکە ئایەتی قورئان، ئەوە دیارە بۆیان هاتووەو ئیمانیشی پێ ناهێنن، چونکە وەك پێشتر گوتمان: وشەی ئایەت لە زمانی عەرەبی داو لە بەکارهێنانی قورئاندا، بە سێ مانای سەرکیی دێ:

١) بە مانای ڕستەکانی قورئان دێ: ﴿وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾﴾الكهف.

٢) وە بە مانای موعجیزە دێ، موعجیزەش بە کوردیی دەبێتە (دەستەوسانکەر)، واتە: بەڵگەیەکی وا کە بەرانبەرەکەت دەستەوسان بکەی، نەتوانێ شتی وا بێنێ، کە لە سوورەتی (الأنبياء)دا وشەی ئایەت بۆ ئەو مەبەستە بەکارهاتوە: ﴿... فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٥﴾﴾، با ئایەتێکمان بۆ بێنێ، واتە: موعجیزەیەکمان بۆ بێنێ، وەك چۆن پێغەمبەرانی پێشوو ڕەوانەکران، بە ئایەتو موعجیزەی بەرهەستەوە، با موحەممەدیش موعجیزەیەکی ئاوامان بۆ بێنێ.

٣) بەمانای دیاردەو دیمەنەکانی دەوروبەریش دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ یوسف، واتە: زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەکانو زەوی دا، بەلایاندا ڕەت دەبن، بەڵام پشتیان تێ دەکەن، واتە: سەرنجیان نادەن، کە لێرەدا مەبەست پێی دیاردەو دیمەنەکانی بوونەوەرو دەوروبەرە.

بەڵام لێرەدا مەبەست پێی موعجیزەیە: ﴿قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَا يُشۡعِرُكُمۡ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠٩﴾﴾.

کەواتـە: کە دەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِۖ ﴾، بڵـێ: نیشـانەکان لـە لای خـوان، موعجیـزەکان لـە لای خـوان.

یانـی: هیچ پێغەمبـەرێك (علیهم الصلاة والسلام) موعجیـرەکـەی بەدەست خـۆی نـەبووە، خـوای پەروەردگار بە پێی پێداویستیی ئەو ڕۆژگـارەی کە ئەو پێغەمبـەرەی تێـدا بـووە، موعجیزەیـەکی داوەتـێ، کـە خەڵـکی ڕۆژگـاری خـۆی پـێ دەستەوسـان بکات، وە ئیسپاتی پێغـەمبـەرایەتیی خـۆی پێبکات :

١ - لـە سـەردەمی مووسادا جـادوو بـاو بـووە، خـوای کاربەجـێ ئـەو گۆچـانەی بـە مووسا داوە، کە بۆتـە مارێکـی گـەورەو بێـڕەزا، هـەروەها دەستی ڕاسـتی کـە لـەبن هەنگڵـی دەنـا، وەك خـۆر ڕۆشنایی دەدا، واتە: موعجیـزەکـەی لـە شـێوەی جـادوودا بـوو، بەڵام جـادوو نـەبـوو.

٢ - وە لـە سـەردەمی عیسـا عليه السلامدا زانسـتی پزیشـکیی بـاو بـووە، بۆیـە خـوای پەروەردگـار هەندێ موعجیـزەی بـە عیسا عليه السلامدان، کـە پـێش هـەموو پزیشکەکان کەوتـەوە: مـردووی زینـدوو دەکـردەوە، لە قوڕ باڵنـدەی دروسـت دەکـرد، کوێرو کـەڕو گـەڕی زگماکی چاك دەکـردەوە، تا کۆتـایـی.

٣ - وە لە سـەردەمی پێغـەمبـەری ئێمەشـدا ﷺ لە نێـو ئـەو گەلـەی کە ئـەو تێیانـدا بوو، زانیـاریی ڕەوانبێـژیـی زیـاتر بـاو بوو، زمانزانییو قسـەکردنو وتـارو شـیعر، بۆیە خـوای زانـا ئەم قورئانەی دا بە پێغـەمبـەر ﷺ وەك موعجیـزە، تاکو خەڵکی ڕۆژگـاری خۆی پـێ دەستەوسـان بکات، وە دەشیزانی کە لـە دواییشـدا مرۆڤایـەتیی زیاتر زانستیان لەنێـودا دەبێتـە شـتێکی ڕەواج پێـدراوو گرنـگ، وە ژیـانی مـرۆڤ زیاتر لـە ڕووی زانسـتییەوە بـەرەو پێـش دەچـێ، بۆیـە خـوا موعجیزەیـەکی بـۆ پێغـەمبـەری خاتـەم ﷺ نـارد، کە شـێوەی ئـەوەی هەیـە کـە لـە ڕۆژگاری ئەوانـدا خەڵك خـۆی پێـوە هەڵـدەکێشـێ، کە زانستییە، بەڵام ئەو زانستەی کە لـە قورئانـدا هەیە، بێگـومان لە پێـش هـەموو زانسـتێکـەوەیـە.

ئنجـا دوایـی کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا يُشۡعِرُكُمۡ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، واتە: ئەی ئیمانداریـنە! چ شـتێك وای کـردوە کە هەست بکەنو بـزانن: ئەگـەر ئـەو

نیشانەو موعجیزانەی ئەوانیش داوای دەکەن، بۆیان بێ، ئیمان ناهێنن؟ بۆیە پێتان خۆشە خوا ئایەتەکان بنێرێ، دیارە مسوڵمانان پێیان خۆش بووە خوای کاربزان هەرچی کافرەکان داوای دەکەن لە موعجیزان، بۆیان بنێرێ‌و ناچاربن ئیمان بێنن.

ئنجا خوا دەفەرمویێ: چ شتێك وای کردوە کە ئێوە بزانن، کە ئەگەر ئەو موعجیزانەش بێن، ئەوان ئیمان ناهێنن ؟ بۆیە سوورن لەسەر ئەوە، ئەگەرنا ئەگەر زانیباتان ئیمان ناهێنن، کە خوای پەروەردگار ئەوە دەزانێ، ئەو کاتە زۆر مکوڕ نەدەبوون.

پێشتر باسمان کرد کە زانایان لەبارەی ئەم ڕستە قورئانییەوە: ﴿ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، مشتومڕی زۆریان بووە، هەندێکیان گوتوویانە: وشەی (لا) زیادە، هەڵبەتە کە گوتوویانە: زیادە، مەبەست ئەوە نیە کە وشەیەك لە قورئاندا زیادە، گوتوویانە: زیادە بۆ جەختکردنەوە (زائدة للتأكيد)، چونکە دەڵێن: ئەسڵی خۆی دەبێ ئاوا بێ: ﴿ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ يُؤْمِنُونَ ﴾، ئێوە چۆن بزانن، کە ئیمان دێنن ؟ نەك چۆن بزانن، کە ئیمان ناهێنن ؟

بەڵام لە ڕاستییدا ئەگەر هەر لەسەر شێوەی خۆی بهێڵرێتەوە، باشترە، وەك زەمەخشەریی گوتوویەتی، کە زانایەکی زۆر شارەزایە لە ڕەوانبێژییدا، تەفسیرێکی هەیە بە ناوی (الكشاف) وەك (جمال الدين القاسمي) لە (محاسن التأويل)دا دەڵێ: (الَّذِي ارْتَضَاهُ الزّمخشَري، وتبعه المحققون: حَمْلُ الكَلامَ عَلَى ظَاهِره، وَأَنَّ الإِسْتفهَام فِي مَعْنَى النّفي وَالإِخْبَار عَنْهُمْ بعَدَم العِلْم، لا الإِنْكَار عَلَيهِم وَالمعْنَى: وَمَا يُدريكم أَن الآية الَّتِي يقترحونهَا، إِذَا جَاءَت لا يُؤمِنُونَ بِهَا، يَعْنِي: أَنا أَعْلَم أَنَّهَا إِذَا جَاءَت لا يُؤْمِنُون بِهَا، وَأَنْتُمْ لاَ تَدرونَ ذَلِكَ)[1] دەڵێ: ئەوەی زەمەخشەریی پەسندی کردوە، وە زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان پەسەندیان کردوە، بۆ مانای ئەم ڕستە قورئانییە، ئەوەیە کە هەروەك ڕواڵەتی خۆی تەماشای بکرێ، (واتە: تەئویل نەکرێ، نەگوترێ "لا"یەکە زیادە بۆ تەئکید، یاخود نەگوترێ: بە

١) محاسن التأويل، ج٤، ص ٦٨٣، ٦٨٤.

مانای "لعلَّ"یە) وە پرسیارکردنەکە لە مانای: لابردن (نفي)و هەواڵدان دایە، لەبارەیانەوە، کە ئەوان نازانن، نەك نکووڵییان لێ بکات، یانی: ئەگەر ئەو موعجیزەو بەڵگەیەش بێ، کە پێشنیاری دەکەن، ئەوانە هەر ئیمان ناهێنن، واتە: من دەزانم، ئەگەر ئەو موعجیزەیەش بێ، بڕای پێ ناهێنن، بەڵام ئێوە ئەوە نازانن.

ئنجا لەم ئایەتەدا: ﴿ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەگەر وشەی: ﴿ أَنَّهَآ ﴾، ئەگەر بە: ﴿ أَنَّهَآ ﴾، بخوێندرێتەوە، ماناکەیمان کرد، بەڵام بە (إِنَّهَا)ش خوێندراوەتەوە، ئنجا ئەگەر (إِنَّهَا)بێ، واتە: چ شتێك وای لە ئێوە کردوە بزانن! بێگومان ئەگەر ئەو نیشانایەی کە داوای دەکەن، بێتیش ئەوان ئیمان ناهێنن: (إِنَّهَا إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ) واتە: بێگومان ئەگەر ئایەتەکەش بێ، ئەوان هەر ئیمان ناهێنن.

دیارە ئەو کاتەش ئەو مشتومڕەی تێدا نابێ، کە لە کاتێکدا بە (أَنَّهَا) بخوێنرێتەوە، پەیدا دەبێ.

**مەسەلەی <u>هەشتەم</u>:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾، وە دڵەکانیانو چاوەکانیان هەڵدەگێڕینەوە، واتە: وا دەکەین کە عەقڵو دڵیان ئایەتەکان نەبینن‌و تێیاننەگەن، وە چاویان ئایەتەکان نەبینن، تاکو (ئیمان نەهێنن) ﴿ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، وەك چۆن یەکەمجار ئیمانیان پێ نەهێنا، ئێمەش لە سزای ئەوەدا، وایان لێ دەکەین کە عەقڵو دڵیان لە ئایەتەکان نەگەن، وە چاویان نەیانبینێ، وە سەرەنجام ئیمانیان پێ نەهێنن، ﴿ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾، وە لێیاندەگەڕێین لە سەرکێشیی‌و یاخیی بوونی خۆیاندا بخولێنەوەو سەرگەردان بن، وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەم ڕستە قورئانییە، مانایەکەی دوو ئەگەری هەن :

١) دەگونجێ مەبەست پێی سزادانی خوای دادگەربێ بۆ ئەوان لە دنیادا، کە ئەو کاتە دەبێ بڵێین: بادراوەتەوە سەر (معطوف علی) ﴿لَمْ يُؤْمِنُواْ﴾، دیارە ئەو کاتەش هەمان ئەو حوکمەی ﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ﴾ی دەبێ، کە پێشتر باسمان کرد.

لەوبارەوە (أبو السُّعود) کە یەکێکە لە توێژەرەوانی بەرجەستەی قورئان، وەك خاوەنی (محاسن التأويل) لێی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنّا نُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ عَنْ إِدْرَاكِ الحَقِّ، فَلاَ يَفْقَهُونَهُ، وَأَبْصَارَهُمْ عَنْ اجْتِلاَئِهِ فَلا يُبْصِرُونَهُ، لَكِن لا مَعَ تَوَجُهِهَا إِلَيْهِ وَاسْتَعْدَادِهَا لِقَبُولِهِ، بَلْ لِكَمَالِ نَبوِّهَا عَنْهُ وَإِعْرَاضِهَا بالكُلّيةِ، وَلِذَلِكَ أُخِّرَ ذِكْرُهُ عَنْ ذِكْرِ عَدَمِ إِيْمَانِهِم، إِشْعَارًا بِأَصَالَتِهِم فِي الكُفْرِ وَحَسْمًا لِتَوَهُّمِ أَنَّ عَدَمَ إِيْمَانِهِم نَاشِيء مِنْ تَقْلِيبهِ تَعَالى مَشَاعِرُهُم بطَرِيقِ الإِجْبَارِ)[١]، واتە: کە خوا دەفەرموێ: ئێمە دڵو چاویان هەڵدەگێڕینەوە، یانی: چ شتێك وای لە ئێوە کردوە کە بزانن‌و هەست بکەن، کە ئێمە دڵەکانیان لە ئاست ناسینی هەق دا هەڵدەگێڕینەوەو، چاوەکانیان لە دیتنی، لا دەدەین‌و نایبنن، بەڵام نەك بەو مانایە کە خۆیان بیانەوێ بە عەقڵ‌و دڵ لە هەق تێبگەن، وە بە چاو بیبینن، کەچی خوا ڕێیان لێ بگرێ! بەڵکو بەهۆی ئەوەوە کە زۆر خۆیان لە هەق بە دوور دەگرن‌و، پشتی تێ دەکەن‌و بەهۆی ئەوەشەوە خوای دادگەریش، وەك سزادانێك بۆ هەڵوێستەکەی خۆیان، وایان لێ دەکات، کە لە هەق نەگەن‌و نەیبینن، هەر بۆیەش باسی دەرکنەکردنی هەق‌و، نەبینینیان بۆی، خراوەتە دوای ئیمان نەهێنانیان، تاکو بزانرێ کە ئەوان بە کوفردا زۆر ڕۆچوون {سەرەنجام: هەستەوەرەکانیان لە کار کەوتوون، نە عەقڵیان باش تێدەگاو، نە چاویان دەبینێ‌و نە گوێیان دەبیستێ}[٢]، وە بۆ ئەوەی ڕێگریی لەو وەهمەش بکرێ، کە ئیمان نەهێنانیان، لەوەوە نەهاتوە کە خوای بەرز جەبریان لێ بکاتو، نەهێڵێ ئیمان بێنن.

---

١) محاسن التأويل، ج٤، ص ٦٨٥.

٢) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکان { } خۆم زیادم کرد، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

٢) واتایەکی دیکەی ئەوەیە، کە لێرەدا خوای کارزان باسی سزادانیان دەکات لە قیامەت دا: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾، وەك (القرطبي) لە (الجامع لأحكام القرآن)[١]دا دەڵێ: (وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى لَهب النَّار وَحرِّ الجَمْرِ، كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا فِي الدُّنيا، وَنمهلهم فِي الدُّنيا ولا نُعَاقِبهُم، فَبَعْض الآية فِي الآخرة، وبعْضُهَا فِي الدُّنيا)، واتە: (کە خوای پەروەردگار وا دەفەرموێ): یانی: ئێمە دڵەکانیانو چاوەکانیان لە ڕۆژی دوایی دا، لەسەر گڕی ئاگرو، لەسەر پشکۆکان، هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکەینو، دەیانسووڕێنین، بۆئەوەی بە هەموو باراندا، چاك بسووتێن، وەك چۆن لە دنیادا ئیمانیان پێ نەهێناوە، بەڵام ئێمە لە دنیادا مۆڵەتیان دەدەینو، پەلە ناکەین لە سزادانیان دا، کەواتە: ئایەتەکە هەندێکی باسی دنیا دەکات، وە هەندێکیشی باسی دوارۆژ دەکات.

هەڵبەتە دەشگونجێ بڵێین لە یەك کاتدا ئایەتەکە هەردوو واتاکەی هەن، بەڵام من پێموایە، واتای یەکەمیان زیاتر لەگەڵ سیاقی ئایەتەکان دا دەگونجێ.

ئنجا لەوبارەشەوە، کە جاری وایە خوا بەهۆی بەردەوام بوونی مرۆڤ لەسەر گوناحو تاوانەوە، وای لێدەکات کە ئیمان نەهێنێ، وە هەستەوەرەکانی لە کاردەکەونو یەك دەخرێنو دووری خۆیان نابینن، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! قَدْ آمَنَّا بِكَ، وَبِمَا جِئْتَ بِهِ، فَهَلْ تَخَافُ عَلَيْنَا؟ قَالَ: نَعَمْ، إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ يُقَلِّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ»﴾[٢] واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆرجار دەیفەرموو: (يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى

١) الجامع لأحكام القرآن، ج٧، ص ٥٣، ٥٤.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢١٢٨)، وَالبُخَارِيُّ فِي "الأدب المفرد" برقم: (٦٨٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٤٠)، واللَّفظ لَهُ، وَإِبْنُ مَاجَه برقم: (٣٨٣٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٩٢٧) وَالبَزَّار برقم: (٧٥٠٨)، وَإِبْنُ أَبي شَيْبَة برقم: (٣١٠٤٤).

دِینِكَ) ئەی هەڵگێڕەرەوەی دڵەکان! دڵم لەسەر دینی خۆت بچەسپێنە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئێمە ئیمانمان بە تۆ هێناوەو، ئەوەی تۆ لە خواوە هێناوتە، ئیمانمان پێ هێناوە، ئایا مەترسییت لێمان هەیە {هەڵگەڕێینەوە} ؟ فەرمووی: بەڵێ: چونکە دڵەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوادان، چۆنی بوێ دەیانسووڕێنێ.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە پێغەمبەر ﷺ باسی پەنجەی خوا بکات، هەرچەندە هەندێ لە زانایان ئەمە وا تەئویل دەکەن دەڵێن: ئەگەر خوا پەنجەشی هەبێ، ئەوە سیفەتی خوایە، وەك بۆ خوا شایستەیە، بەڵام ئەوەی کە لە فەرموودەکە وەردەگیرێ، وەك زانایانی لێکۆڵەرەوەو ڕۆچوو گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ لێرەدا وێکچواندنێك دەکات، بۆ ئەوە کە خوا چۆن دڵی مرۆڤەکان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکاتو دەیانسووڕێنێ بە ملاولادا، لە ئەنجامی کردەوەکانی خۆیان سیفەتەکانی خۆیاندا، وە بەپێی یاسای خواو سوننەتی خوا، دڵەکان بەملاولادا دەچن، وەك چۆن کەسێك بە دوو پەنجە شتێك دەسووڕێنێ، بەملاولادا، بەو شێوەیەش بۆ خوای بالادەست ئاسانە.

ئەگەرنا مەبەست لێرەدا ئەوە نیە کە پێغەمبەر ﷺ باسی دوو پەنجەی خوا بکات، بەپێی ڕای ئەوانە کە تەئویلی ناکەن، لەسەر ڕای سەلەفی صالح کە گووتوویانە: دوو پەنجەی خوا، واتە: دوو سیفەتی خوا، بەڵام هەر لە پێشینی چاکیش هەبووە کە گوتوویانە: ئەو جۆرە وشانە مانای مەجازییان هەیە، نەك مانای حەقیقیی، واتە: بە تەئویلیشیان لە قەڵەم نەداوە، بەڵکو گوتوویانە: لە زماندا ئەو تەعبیرە بەکاردێ، دەڵێن: فلان کەس بە دوو پەنجە فلان کارەی کرد، ئەوە نیە کە بە دوو پەنجە وای کردبێ، مەبەست ئەوەیە کە زۆر بە ئاسانیی کارەکەی کردووە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾، خوا ﷻ لە باسی ئەوەدا کە بێبڕوایەکان، داوای موعجیزەو بەڵگەو نیشانەیان دەکرد، بۆئەوەی ئیمان بێنن، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: وە

ئەگەر ئێمە وەك خۆیـان داوا دەكـەن: فریشـتەشمان بـۆ دابەزانـدبان، وە مردووشمـان زیندووكردبانـەوەو، قسـەیان لەگـەڵ كردبـان، وە هـەموو شـتێكیش كـە ئـەوان داوای دەكەن، ڕووبەڕوو، یاخود كۆمەڵ كۆمەڵ، بۆمان هێنابانـایە، ئەوكاتەش هەر ئیمانیـان نەدەهێنـاو بۆیان نەبوو، ئیمان بێنن، مەگەر خـوا ویستبای، بەڵام زۆربەیـان نـافامن.

واتـە: ئەگـەر نـەك ئـەو بەڵـگەو نیشـانانەی كـە ئـەوان دەیڵێن، بـەڵكو ئەگـەر فریشتەشـمان بـۆ دابەزانـدبان، هیـچ لـە مەسـەلەكە نەدەگـۆڕا {وەك لـە سـووڕەتی (الفرقـان) لە ئایـەتی (٢١)دا هەنـدێكیان داوایـان كـردو گوتیـان: ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ...﴿٢١﴾﴾ ، واتـە: دەبووایـە فریشـتەمان دابەزێتـە سـەر، یـان پەروەردگارمان ببینین}.

هەروەها ئەگەر مردووشـمان بـۆ زیندووكردبانـەوەو قسـەیان لەگەڵ كردبـان (كـە ئەو موحەممەدە ﷺ پێغـەمبـەری كۆتایی خـوایەو، ئەو قورئانە دوا كتێبـی خوایەو ئیمانی پـێ بێنـن) ! دیسـان هـەر هـەمان هەڵوێسـتیان دەبـوو، {وەك لـە سـووڕەتی (الدخـان) لـە ئایـەتی (٣٦)دا گوتوویـانە: ﴿ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، واتە: بـابو باپیـرانمان زیندووبكەنەوە، ئەگەر ڕاست دەكەن، واتە: مـردووان زینـدوو بكەنـەوە، یا بۆمـان باسی بـەرزەخ بكـەن، وە باسـی ئەوە بكـەن، كە ئێوە پێغـەمبـەری خـوان، وە ئەو كـتێبـەی كە بۆتـان هـاتوە، كـتێبـی خـوایـە !}.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴾، وە ئەگـەر هـەموو شـتێكمان ڕووبـەڕوو بـۆ هێنـابان، واتـە: هـەموو شـتێك كە ئـەوان داوای دەكەن: (قُبُلًا ) یانـی: ڕووبەڕوو، یـان دەسـتە دەسـتە، كۆمـەڵ كۆمـەڵ، دیسـان نەدەگونجـا ئیمـان بێـنن، ئەگـەر خـوا نەیویسـتبا.

كەواتـە: ئێسـتا كـە ئیمـان نـاهێنن، لەبەرئـەوەیە خـوا نەیویستوە ئیمـان بێنـن، ئنجا بۆچی خوا نەیویستوە خـەڵك بـەزۆر ئیمـان بێـنن ؟ چونكـە ویستوویەتی بە

شێوەیەکی ئـازادو بە ویستی ئـازادانەی خۆیـان ئیمـان بێنـنو نەیویسـتوە زۆریـان لـێ بکـات، ویستوویەتی ئازادیـان بکـات، ئنجـا هەندێکـیان ئیمـانیان هێنـاوە بـە ویسـتی ئازادانـەی خۆیـان، کـە ئیمانـدارانن، هەندێکیشـیان ئیمانیـان نـەهێناوە، کـە بێبـڕوایەکانن.

کەواتە: ئەوانـەی کـە ئیمانیـان نـەهێناوە، وە نەبـێ لەبـەر ئـەوە بێ کـە خـوای کاربەجـێ ویسـتبـێ، بـەڵام ئـەوان پێچەوانەی ویستی وا جووڵابنـەوە، بەڵـکو خـوا هـەر لە ئەزەلدا ویسـتوویەتی ئەو خەڵکە ئـازاد بکـات، ئـەوەی ئیمـان دێنـێ، بـا بـە ئـازادیـی ئیمـان بێنـێ، وە ئـەوەی ئیمـانیش ناهێنـێ، بـا هـەر بـە ئـازادیـی ئیمـان نەهێنـێ، نـەك زۆریـان لـێ بکات، هـەروەك چۆن زۆری لـە فریشتەکان کـردوە: بـێ فەرمـانیی خـوا نەکەنو، هەموویان ئیمانداربنو، ئەهلی طـاعـەت بـن، بـەڵام مرۆڤـی وا خولْقانـدوە، کـە ئـازادی بکــات. ئنجـا ئەگـەر ئیمـانی هێنـا، بـا ئـازادانــە ئیمـان بهێنـێ، وە ئەگـەر ئیمانیشـی نەهێنـا، هەر ئازادانە ئیمـان نەهێنـێ.

وشـــەی: (قُـبُلاً) ئـــاواش خوێنــراوەتـــەوە، وە بـــە (قُـبْلاً) خوێنــراوەتـــەوەو بـــە (قِبَلاً) خوێنــراوەتـەوە.

ئنجا ئەگـەر (قُبُـلاً) بـێ، سێ واتـای هـەن :

١/ (الأخفش) کە یەکێکە لە شارەزایانی زمانی عـەرەبیی، گوتوویـەتی: (قُبُـلاً) واتـە: (قَبِـيلاً قَبِـيلاً: جَمَـاعَةً جَمَـاعَةً) کۆمـەڵ کۆمـەڵ، یانـی: ئەگـەر هـەموو شـتێکمان کۆمـەڵ کۆمـەڵ بۆ هـێنابـانـە پێش، ئەو شتانەی کە ئـەوان داوایـان دەکـرد، هـەر ئیـمانیـان نەدەهێـنـا.

٢/ وە هــەندێك گوتوویــانە : (قُـبُل) کــۆی (قَبِيـل)ەو بــە مانــای کەفیــل دێ، وەك گوتوویـانە: (أي: كَفَلوك بِصِحَّة ما بشَّر وأَنْذر)، واتــە: (قُبُلاً) بـە مانـای ئـەوە دێ: کە کـەفالەتی ئـەوە بکەن: ئەوەی پێغـەمبـەر ﷺ، (وە پێغـەمبـەران) مـوژدەی پـێ دەداتو خـەڵکی لـێ دەترسـێنـێ، ڕاسـتە.

٣/ هـەروەها دەشـگونجـێ (قُبُل) بە مانـای: (مقابلةً ومواجهَةً) ئـەو کاتـەش (جمـع) نابـێو (مفـرد) دەبـێ، یانـی: ڕووبـەڕوو، بە ئاشکرا.

ئنجا خوای زاناو توانا لێرەدا دەفەرموێ: ئەگەر ئەو شتانەشمان هەمووو بۆ کردبان: ﴿مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾، واتە: بۆیان نەدەبوو بڕوا بێنن، مەگەر خوا بیەوێ.

خوا دەیەوێ تێمان بگەیەنێ، کە ویستی وی ڕەهایەو هیچ سنوورو بەندێکی لەسەر نیە، وە کافرەکان کە بێ فەرمانیی دەکەن، وە نەبێ خوایان دەستەوسان کردبێ‌و، پێچەوانەی ویستی خوا جووڵابنەوە، بەڵکو خوا بۆخۆی ویستوویەتی خەڵك ئازاد بێ، مرۆڤەکان ئازادبن، ئەوەی ئیمان دێنێ، بە ویستی خۆی ئیمان بێنێ، ئەوەش کە ئیمان ناهێنێ، بە ویستی خۆی ئیمان نەهێنێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ﴾، بەلاَم زۆربەیان نافامن، واتە: نازانن کە مەسەلەی ئیمان نەهێنانیان، یەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، موعجیزەو بەڵگەی دیکەیان بۆبێ، بەڵکو یەکی لەسەر ویستی ئازادانەی خۆیان کەوتوە، خۆیان نایانەوێ، بۆیە کە هاتنی ئایەت‌و نیشانەی دیکە پێشنیار دەکەن، لەبەر نەزانین‌و نەفامییانە، ئەگەرنا ئەگەر فامیدەبان، پێویستیی بەوە نەدەکرد موعجیزەو بەڵگەو نیشانەی دیکە پێشنیار بکەن، چونکە هیچ موعجیزەو بەڵگەیەك، لەم قورئانە ڕۆشنتر نیەو پڕ بە پێستتر نیە، بۆ پێغەمبەر کۆتایی، وە بۆ پەیام‌و بەرنامەکەی، کە دەبێ تاکو ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی هەیە، وەك چۆن بەرنامەکەی بەردەوام دەبێ، ئەو موعجیزەو بەڵگەیەش کە بەڵگەی ئیسپاتی ڕاستیی ئەو بەرنامەو پەیامەیەو، پشت ڕاستی دەکاتەوە، دەبێ ئەویش بەردەوام بێ، کە ئەویش دەبێ موعجیزەیەکی فیکریی زانستیی وەك قورئان بێ، وە ئەگەر موعجیزەیەکی بەرهەست بووایە، وەك ئەوەی پێغەمبەران، بە وەفاتکردنی پێغەمبەر ﷺ، موعجیزەکەشی کۆتایی پێ دەهات.

هەڵبەتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ شتی دیکەشی بووە، وەك موعجیزە، بەلاَم ئەو شتانەی بەکارنەهێناون، بۆ ئیساُپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، بۆ وێنە :

أ/ ئاو لە نێوان پەنجەکانی هەڵقوڵیوەو هاتۆتە دەرێ، وە جاری وا بووە سوپایەکی گەورە، بەو ئاوە هەرچی کوندەو مەشکەو دەفر هەبووە، لێیان پڕ کردووە،

هەمووشیان تێر ئاو بوونو دەستنوێژیان پێگرتوە، چەند جار ئەمە ڕوویداوە[١].

ب/ جاری وا بووە خواردنێکی کەم هەبووە، بەشی دوو، سێ نەفەر، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لەسەر کردووەو بەشی چەند سەد کەسی کردوە[٢].

ج/ خواردن، لەبەردەستی تەسبیحاتی کردووەو، هاوەڵان گوێیان لێ بووە[٣]، وە گەلێك شتی دیکەی کە لە کتێبەکانی سیرەدا هاتوون[٤].

بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەو موعجیزانەی نەکردوّتە بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی خۆی، بەڵکو ئەو شتانە بۆ دەرباز کردنی مسوڵمانان بوون، لە تەنگانە کە تێی کەوتوون: لەبەر بێ ئاویی، یاخود لەبەر بێ نانیی، وە بۆ دڵخۆشکردنی مسوڵمانانو زیاتر چەسپاندنی دڵیان بووە، نەك بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیان پێ پێشانبدا، تاکو بزانن کە پێغەمبەری خوایە! ئەوان بەهۆی خۆیەوە زانیویانە، کە پێغەمبەری خوایە، وە بەهۆی قورئانەوە: بەهۆی خۆیەوە؛ کە تەماشایان کردوە کردەوەو ڕەوشتو کردارو ئاکارو، ئەوەی کە دەیڵێ دەیکات، زانیویانە کە ئەوە هی بەشەرێکی ئاسایی نیەو دەبێ پێغەمبەر ﷺ بێ، هەروەها بەهۆی قورئانەوە زانیویانە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە؛ چونکە قورئان موعجیزەیەکی گشتگیرو هەتا هەتاییە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، واتە: ئەوە هەر تۆ نی ئەی موحەممەد ﷺ!

١) صحيح البخاري: ٣٥٧٢ ـ ٣٥٧٩، و صحيح مسلم: ١٨٥٩و ٢٢٧٩ و ٣٠١٣.

٢) صحيح البخاري: ١٠١٣و ٣٥٧٨، و صحيح مسلم: ٨٧٩ و ٢٠٤٠.

٣) صحيح البخاري: ٣٥٧٩

٤) بڕوانە: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) المجلد الرابع، ص: ٣٧٩ ـ ٣٨٤، کە بیستو یەك موعجیزەمان لە سەرچاوە متمانەپێکراوەکانەوە هێناون.

کە لە جندو ئادەمیزاد دوژمنت هەن‌و دوژمنایەتییت دەکەن، کە شەیتانەکانی مرۆڤو جند دژایەتیی تۆ دەکەن، ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ ﴾، هەر بەو شێوەیەش بۆ هەر کام لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، دوژمنمان گێڕاوە، کە کێ بوون؟ ﴿ شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ ﴾، ئەو دوژمنانەش بریتی بوون لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جند، ئنجا چییان کردوە؟ ﴿ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، هەندێکیان قسەی ڕازاوەی فریودەریان بۆ یەکدی ناردوە، بە شێوەی پەنهان، یانی: قسەی بریقەداری ڕازاوەیان، بە مەبەستی فریودان بۆ یەکدی ناردوە، کە دیارە مەبەست لە قسە ناردنەکە، واتە: شەیتانە جندەکان قسەیان بۆ مرۆڤەکان ناردوە، هەندێکیش دەڵێن: مرۆڤیش دەگونجێ قسە بنێرێ بۆ جند، ئەو قسانەی کە بەرپرسەکانی کوفریش دەیانکەن، مرۆڤە شەیتانەکان دەیکەن، شەیتانە جندەکان ئیستیفادەیان لێ دەکەن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ﴾، وە ئەگەر پەروەردگارت ویستبای وانەکەن، وایان نەدەکرد، کەواتە: خوای باڵادەست‌و دادگەر ویستوویەتی وا بکەن، بەڵام کە دەگوترێ: ویستوویەتی، مەبەست ئەوە نیە کە پێی خۆشە، چونکە ویستی خوا جیایە لە ڕەزامەندیی خوا: خوا هەموو شتێکی ویستوە، ئەوەی کە هەیە، وە دەبێ، هەمووی ویستوە، چونکە بەبێ ویستی خوا، هیچ شتێك دروست نابێ، بەڵام ئەو شتانەی کە ویستوونی، لە هەموویان ڕازی نیە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ۝٧ ﴾الزمر، واتە: خوا لە کوفر ڕازی نیەو پێی خۆش نیە، بۆ بەندەکانیو، بە پەسەندی نازانێ، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن بۆتان پەسەند دەکات، کەواتە: خوا لە کوفر ڕازی نیە، هەرچەندە کوفریش هەر بە ویستی خوایە.

﴿ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴾، لێیانگەڕێ، ئەوەی کە هەڵیدەبەستن، با هەڵیببەستن، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، واتە: وەك چۆن ئێستا کە دژایەتیی تۆ دەکرێ، ئەی موحەممەد ﷺ! لە لایەنی شەیتانەکانی مرۆڤو جندەوە، بە هەمان شێوە پێغەمبەرانی دیکەش دژایەتییان کراوە.

لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا ﴾؟ ئایا خوا بۆخۆی دوژمنی بۆ پێغەمبەران پەیدا کردوون ؟ دەڵێین: نەخێر، ئەو تەعبیرە کە لە زۆر جێگای دیکەی قورئاندا هاتوە، یانی: بەپێی یاساو سوننەتی خوا وایە، کاتێك پێغەمبەران دێن، ئەوانەی کە بەرژەوەندیی ناشەرعییان هەیە، دژایەتیی پێغەمبەران دەکەن، کە شەیتانەکانی مرۆڤو جندن، چونکە ئەگەر پەیامو بەرنامەی پێغەمبەران بچەسپێ، ئەوانە بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان لێ تێکدەچن، بۆیە دەکەونە دژایەتییکردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو دژایەتییکرانەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەلایەن شەیتانەکانەوە، بەپێی یاسای خوایە، وەك خوا کردبێتی ئاوایە، پاشان لەبەر ئەوەی هەر کەسێك کە چاکە دەکات، یان خراپە دەکات، بە ویستی خوایە، ـ نەك بە ڕەزامەندیی خوا ـ چونکە خوا ڕەزامەندییەکەی بەس لەگەڵ چاکە دایەو لەگەڵ خراپەدا نیە، ئنجا لەبەرئەوەی بە ویستی خوایە، بۆیە خوای پەروەردگار شتەکەی پاڵ داوەتە لای خۆی، ئەگەرنا بێگومان وە نەبێ خوا پێی خۆش بووبێ، کافرەکان دژایەتیی پێغەمبەران بکەن! بۆیەش خوا نەفرینی لە کافران کردوە، وە نەفرینی لە ستەمکاران کردوە، دواییش سزایان دەدات، مانای وایە کوفرو ستەمەکەیانی پێ ناخۆش بووە، بەڵام چونکە بە پێی یاسای خواو بە پێی ویستی ڕەهای خوا پەیدا بوون، بۆیە خوا پاڵیداوەتە لای خۆی.

# پێنج هەڵوەستەی گرنگ لە بەرانبەر ئایەتی (١١٢)دا

١/ كە دەفەرموێ: ﴿ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، لە صەحیحی بوخاریی دا هاتوە كە لە دایكمان عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە، كاتێك پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ دێ، دەگەڕێتەوە بۆ لای خەدیجە، خەدیجە خوا لێی ڕازی بێ لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ لای وەرەقەی كوڕی نەوفەل، وەرەقەش لە درێژەی چەند قسەیەكدا پێی دەڵێ: (لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ)[1]، واتە: هیچ پیاوێك وێنەی ئەوەی تۆی نەهێناوە، مەگەر دژایەتیی كراوە.

دیارە ئەوەش دوای ئەوەی پێی دەڵێ: قەومەكەت كوفرت پێ دەكەن و، دەرتدەكەن و دژایەتییت دەكەن، بریا گەنج بوومایە بۆئەوەی سەرمخستبای ! پێغەمبەر ﷺیش دەفەرموێ: (أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ ؟) ئایا ئەوان دەریشم دەكەن ؟ چونكە سەرەتای پێغەمبەرایەتیی بووە، جارێ نەیزانیوە، بۆیە فەرموویەتی: ئایا ئەوان دەریشم دەكەن ؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، هیچ پیاوێك بەرنامەو پەیامێكی ئاوای نەهێناوە، مەگەر دژایەتیی كراوە، وەرەقەی كوڕی نەوفەل شارەزایی لە كتێبە ئاسمانییەكان دا هەبووە، شارەزای مێژووو بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بووە، ئیدی بەهۆی مێژووو بەسەرهاتی پێغەمبەرانەوە، زانیویەتی كە پێغەمبەری خاتەمیش، وەك چۆن ئەوان دژایەتیی كراون، ئەویش دژایەتیی دەكرێ و دەردەكرێ، كە بێگومان واش بووە.

---

١) صحيح البخاري: ٣

کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ دەربارەی یاسایەکی خۆی دەدوێ، کە لە ژیانی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) هاتوە.

٢/ لە ڕووی ڕێزمانییەوە کە دەفەرموێ: ﴿ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ ﴾، زانایانی شارەزای زمان گوتوویانە: (شياطين: المفعول الأوّل، وعَدوّاً المفعول الثاني)، واتە: (شياطين) مەفعوولی یەکەمە (دواخراوە)، وە (عدواً) مەفعوولی دووەمە (پێش خراوە)، یانی لە ئەسڵدا ئاوایە: (وكذلك جعلنا لكل نبيّ شياطين الإنس والجن عدواً) واتە: ئاوا بەو شێوەیە بۆ هەر پێغەمبەرێك شەیتانە مرۆڤ و جندەکانمان کردوونە دوژمن. بەلام بۆیە: وشەی (عدواً) پێشخراوە، چونکە ویستراوی بنەڕەتیی (بيت القصيد)ە.

واتە: خوا دوژمنایەتیی بۆ هەموو پێغەمبەران ڕەخساندوە، بەپێی سوننەتی خۆی، دوژمنەکان کێن؟ بریتین لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جند، وەك (القرطبي) دەڵێ: (كَأَنَّهُ قِيل: جَعَلْنَا شَياطِينَ الإنْس وَالجِن عَدُوّاً)[1] شەیتانەکانی مرۆڤ و جندمان گێڕاون، بە دوژمن بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

٣/ کە دەفەرموێ: ﴿ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، یانی: هەندێکیان قسەی ڕازاوە بە مەبەستی فریودان، فێری هەندێکیان دەکەن.

وشەی: ﴿ يُوحِي ﴾ واتە: بۆی نارد بە شێوەی پەنهان، (أَوْحَى إِلَيْهِ و أَوْحَى لَهُ: أَشارَ وَأومَأ، وَكَلَّمَهُ بكَلاَم يَخْفى على غيره وَكَتَبَ إِلَيْهِ وَأَمَرَهُ)[2]، (أوحى إليه) و (أوحى له) واتە: ئاماژەی بۆ کرد، وە بە شێوەیەکی پەنهان قسەی

---

١) ج ٧، ص ٥٥

٢) المعجم الوسيط: ص ١٠١٨

لەگەڵ کرد، کە خەڵکی دیکە تێی نەگات، یاخود بۆی نووسی، یاخود خستیە دڵی‌و ئیلهامی بۆ کرد.

بۆیەش زانایان دەڵێن: (الوَحِي: الكَلامُ الخَفِيُّ السَّرِيع) وەحی بریتیە لە قسەیەکی پەنهانی خێرا، لێرەدا مەبەست لەوەحی کە دەفەرموێ: ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾، وەسوەسە کردنە، کە بریتیە لەو خوتخوتەو خەیاڵەی کە شەیتانەکانی جند فێری مرۆڤە شەیتانەکانی دەکەن، ﴿زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا﴾، واتە: قسەی ڕازاوە، ئەسڵی وشەی (زُخْرف) یان (مُزَخْرَف) شتێکە نەخش‌ونیگاری لەسەر کرابێ‌و جوان کرابێ‌و ڕازێنرابێتەوە، یاخود شتێك کە زێڕاو دەکرێ ﴿غُرُورًا﴾، واتە: بە مەبەستی فریودان یان: بە فریودان فریویان دەدەن.

لەوبارەوە کە شەیتانە جندەکان لەگەڵ ئادەمزادەکاندان‌و شتی خراپیان فێر دەکەن، پێغەمبەر ﷺ فەرموودەیەکی هەیە: «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الْجِنِّ، قَالُوا: وَإِيَّاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَإِيَّايَ إِلاَّ أَنَّ اللهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ فَلاَ يَأْمُرُنِي إِلاَّ بِخَيْرٍ»[(١)]، واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ کامێك لە ئێوە نیە، مەگەر هاودەمێکی لەگەڵ دایە، لە جند (قرین: یانی : هاودەم، هاوجووت کە هەمیشە لەگەڵ ئینسان دایەو لێی جیانابێتەوە)، گوتیان: تۆش لەگەڵت دایە، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: منیش حەتمەن لەگەڵم دایە، بەڵام خوا بەسەریدا سەریخستووم، مسوڵمان بووە، هیچ فەرمانێکم پێناکات، مەگەر بە چاکە.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٤٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٠٣٩)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥١٤٣)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٦٥٨)، وَالبَزَّار برقم: (١٨٧١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٤١٧)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (١٠٥٢٢)، وَالشَّاشِي برقم: (٨٢٤)، وَالدَّيلمِي برقم: (٦١١٥)، واللَّفظُ لِمُسلِم.

هەروەها وشەی (فَأَسْلَمَ) خوێندراویشتەوە (فَأَسْلَمُ) واتە: من سەلامەتم لە دەستی، لەبەرئەوەی بە تەنیا فەرمانم بە چاکە پێ دەکات، چونکە نابێ شەیتان دەستەلاتی بەسەر پێغەمبەر ﷺدا هەبێ، بەڵێ ئەویش وەك بەشەرێك ئەو شەیتانەی لەگەڵدایە، بەڵام لەبەرئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە لووتکەی ئیمانو نزیکیی لە خوادا بووە، ئەو شەیتانە هیچ دەستەلاتی خراپی بەسەریدا نەشکاوە، ئەگەرنا لەو ڕووەوە کە ئەویش بەشەرە، ئەویش جندێکی لەگەڵدایە، وەك چۆن مرۆڤ فریشتەی لەگەڵدایە، فریشتەکە بۆ چاکەکردن هانت دەدات، شەیتانیش بۆ خراپە هانت دەدات.

ئنجا مرۆڤ بەهۆی ئیمانو تەقوای باشەوە، زیاتر لە فریشتان نزیك دەبێ، وە لە ئیلهامو فێرکردنی فریشتەکانەوە زیاتر بەهرەمەند دەبێ، وە لە وەسوەسەو دنەدانی شەیتان بە دوور دەبێ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لە خوا دووربێ، لە فریشتەش دوور دەکەوێتەوەو، زیاتر لە خوتخوتەو وەسوەسەی شەیتانەکان زەرەرمەند دەبێ.

٤/ کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴾، دیسان جارێکی دیکە باسی ویستی ڕەهای خوا دەکات: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای وا نەکەن، وایان نەدەکرد، بەڵام خوا بۆخۆی ویستوویەتی مرۆڤەکان خۆیان بیانەوێ، بەڵام مرۆڤ ئەگەر خۆی نەیەوێ ڕوو لە شەیتان بکات، شەیتان دەستەلاتی بەسەریدا ناشکێ، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾الحجر، واتە: تۆ دەستەلاتت بەسەر بەندەکانی مندا نیە (یانی : ناکەونە ژێر ڕکێفی تۆ) مەگەر ئەوانەی سەرلێشێواونو شوێنت دەکەون.

کەواتە: مرۆڤ مەگەر خۆی شوێن شەیتان بکەوێ، ئەگەرنا شەیتان دەستەلاتی بەسەر مرۆڤدا ناشکێ.

دیارە هەموو ئەوانەی خەڵك گومڕا دەکەن، بە شەیتان ناو دەبردرێن، مرۆڤ بن، یان جند.

لەوبارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا أَبَا ذَرٍّ تَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ شَرِّ شَيَاطِينِ الإِنْسِ وَالْجِنِّ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَلِلإِنْسِ شَيَاطِينُ؟ قَالَ: نَعَمْ﴾[1]، واتە: ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! پەنا بە خوا بگرە لە خراپەی شەیتانەکانی مرۆڤو جند؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا مرۆڤیش شەیتانیش هەن؟ فەرمووی: بەڵێ.

٥/ ئنجا ئایا وشەی (شیطان) لە چییەوە هاتوە ؟ هەندێك لە زانایانی زمان دەڵێن: لە (شطن)ەوە هاتوە، (شطن) یعنی (بَعُدَ) دووركەوتەوە[2]، شەیتان هەر كەسێكە لە خوا دووربێ، جا ئینسان بێ، یان جند بێ، زیاتر وشەی (شیاطین) بۆ كەسانێك بەكاردێ كە دەوری سەركردە ببینن و دەوری كاریگەریان لەسەر غەیری خۆیان هەبێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤ ﴾البقرة، واتە: (مونافیقەكان) كە دەگەنە ئیمانداران دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، بەڵام كاتێ كە بەجیا دەچنەوە لای شەیتانەكانی خۆیان (لە تەفسیرەكان دا دەڵێن: "رؤسائهم" بەرپرسەكانیان، قسە بەدەستەكانیان) دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین، ئێمە گاڵتە بە مسوڵمانان دەكەین، كە دەڵێین: ئێمە ئیمانداریین، دەنا هەر لەگەڵ ئێوەداین، لە خزمەت ئێوەداین.

<u>مەسەلەی یازدەیەم</u>: كە دەفەرموێ : ﴿ وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ وَلِيَرۡضَوۡهُ وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ ﴾، واتە: بە پێی یاسای خوا، بە پێی سیستمێك كە خوا دایناوە لە ژیانی بەشەرو ژیانی جندا، لە

---

١) أَخْرَجَهُ الطّيالِسي برقم: (٤٧٨)، وَأَحْمَد برقم: (٢١٥٨٦) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ ضَعِيف جِداً، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٥٠٧) قال الشيخ الألباني: ضعيف الإسناد، وَالبَيْهَقِيُّ فِي "شعب الإيمان" برقم: (٢٣٩٠)

٢) المعجم الوسيط، ص: ٤٨٣، (شطنت، بَعُدت، وأَشطَنَه: أَبْعَدَهُ).

ئەنجامی خوتخوتەی خراپی شەیتانەکان دا، مرۆڤەکان گومڕا دەبن، کەواتە: مانای ﴿وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾، یانی: وە بۆئەوەی دڵی ئەوانەی بڕوایان بە دواڕۆژ نیە، بەلایدا بچێ، بەلای چی دابچێ؟ بە لای ئەو قسە زریقو بریقانەوە ئەو خوتخوتەو نەدانو هاندانە خراپانەی شەیتانەکان دا، ﴿وَلِيَرۡضَوۡهُ﴾، وە با پەسەندی بکەن، ﴿وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ﴾، وە با ئەنجامی بدەن لە کردەوەی خراپ، ئەوەی کە ئەنجامی دەدەن.

وشەی ﴿وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ﴾، یانی (وتميلَ إليه) یانی: مەیلی بەلادا بکات، ئارەزووی بەلایدا بچێ، دەڵێ: (صَغى، يصغو: مال، يميل)[1].

کە دەفەرموێ: ﴿وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾، واتە: وە با ئەوانەی بڕوایان بە دواڕۆژ نیە، دڵیان بەلایدا بچێ.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە بێبڕوایان بەهۆی بێ ئیمانییەوە، دڵیان بە لای خراپەدا دەچێ، ئینسان کە ئیمانی نەبوو، دڵی بە لای خراپەدا دەچێ، ئەدی ئەگەر ئیمانی هەبوو؟ ئەوە بە پێچەوانەوە، ئارەزووی چاکە دەکەن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٩﴾یونس، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، خوا بەهۆی ئیمانەکەیانەوە دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێو ڕێنماییان دەکات.

بەڵێ ئەگەر ئیمان لە دڵی مرۆڤدا هەبوو، خاوەنەکەی بەرەو چاکە هان دەدات، وە ئەگەر کوفر لە دڵی دا هەبوو، خاوەنەکەی بەرەو خراپە هان دەدات.

١) مختار الصحاح، ص: ٣٢٣.

ئنجـا کـە خـوای کـارزان دەفـەرموێ: ﴿ وَلِيَرْضَوْهُ ﴾، ئـەوە قۆنـاغی دووەمـە، قۆنـاغی یەکەم ئەوەیە کە ئینسـان دڵی بەرەو خراپە دەچـێ، قۆنـاغی دووەم ئەوەیـە کە هەڵیدەبژێرێو پەسـەندی دەکات، ﴿ وَلِيَرْضَوْهُ ﴾، وە بـا ئـەو خراپەیـە پەسـەند بکـەنو هەڵیبـژێرن، ئنجـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِيَقْتَرِفُواْ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴾، ئـەوەش قۆنـاغـی سـێیەمـە، واتـە : با ئەنجامی بدەن، ئـەوەی کە ئەنجـامی دەدەن، لـە کـردەوەی خـراپ.

کەواتــە: پێشــی (میـل) ئنجـا (رضـا) ئنجـا (إقـتراف)، یـانی: ئـارەزووکردن، پەسەندکردن، ئەنجامـدان، هۆکارەکەشی چییـە؟ هۆکـارەکەی بریتـیە لە بـێ ئیمـانیی، لـە ئەنجـامی ئـەوەدا کـە ئینسـان ئیمـانی نیـە دڵـی ئـارەزووی خراپـە دەکـات، کـە ئارەزووی خراپەی کـرد، دوایی هەڵیدەبژێرێو پەسـەندی دەکـات، دواییش خراپەکـە جێبـەجـێ دەکات.

هەروەها بۆ چاکەش هـەروایە: ئەگـەر مرۆڤـ ئیمـانی هـەبوو، ئـەو ئیمانـە دڵەکـەی بەرەو چاکـە پەلکێش دەکـات، ئنجا کە بەرەو چاکە چوو، شـیـرنایەتیی پێدادەچـێو پەسـەندی دەکـاو خۆشـی دەوێ، ئنجـا کـە خۆشـیویسـتو پەسـەندی کـرد، ئـەو چاکەیـە ئەنجـام دەدا.

کـەواتـە: لـەم ئایەتە موبارەکانەدا خـوای کـاربەجێ زۆر بـە وردیـی بۆمـان باسـی ئـەوە دەکـات، کـە مرۆڤـ چـۆن چـاکە دەکـات، وە چـۆن خراپـە دەکـات؟ ئنجـا ئایـا سەرچاوەی چاکـەو خراپـە چییـە؟ پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿أَلاَ إِنَّ فِي الجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ القَلْبُ﴾[1]، واتـە: ئاگـاداربـن! لـە جەسـتەدا پارچـە گۆشـتێـك هەیـە، ئەگـەر چاکبوو، جەسـتە هـەمووی چـاك دەبێ، وە ئەگەر خـراپ بوو، جەستە هەمووی خراپ دەبێ، ئەویـش دڵـە.

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٠٧٠) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

لـە ڕاسـتییدا دڵ جووڵێنـەری مرۆڤـە، دڵ کانگـای بڕیاردانـە، هەڵبەتـە لێـرەدا مەبەسـت دڵـە مەعنەوییـەکەی مرۆڤـە، کە پەیوەندیی هەیـە بـە دڵـی گۆشـتینەوە، ئەگەرنا ئەو دڵـە گۆشـتینەیە، تەماشـا دەکـەین: بـەس خـوێن دابـەش دەکات، بـەڵام ئـەو دڵـە مەعنەوییـەی، کـە سـەرچـاوەی هەسـتو ویسـتی مرۆڤـە، پەیوەندییشـی هەیـە بـەو دڵـە گۆشـتینەیەوە، کـە وەك چـۆن خـوێن دابـەش دەکـات، ویسـتو بڕیـارەکانی مرۆڤیش، دەگەیەنێتـە هەموو ئەندامەکانی جەستە.

**مەسەلەی دوازدەیەم**: کە دەفەرمویٚ: ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾، دیـارە ئـەوە خـوا ﷻ لەسـەر زمـانی پێغـەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی، یاخود خـوا بە پێغـەمبـەر ﷺ دەفەرمویٚ: بڵـێ: ئایا جگە لە خـوا بە دادوەر بخوازم؟ (حَكَمْ) بریتیـە لـە کەسـێك کە کێشـەی دوو کـەس، یاخــود دوو لایــەن، یـان زیـاتر یەکـلایی بکاتـەوەو بڕیاریـان لـە نێـوان دا بـدات، بـە یەکیـان دەڵـێ: تۆ هەقتە، بەوی دیکەشیان دەڵێ: تۆ ناهەقتە، یانـی : ئایا مـن جگـە لـە خـوا بـە دادوەرو یەکلاییـکەرەوەی کێشـەکان لەگـەڵ ئێـوەدا بخـوازم؟! ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ﴾، وە هەر ئـەو (خوایـە)ە کتێبـی بـۆ ئێـوە نـاردوە، زۆر ڕوونــە، ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴾، وە ئەوانەش کە کتێبمان پێداون، دەزانـن کـە ئـەم قورئانـە، بـە شـێوەیەکی هـەق لـە پەروەردگارتـەوە بـۆ تـۆ دابەزێنـراوە، ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾، کەواتە: تۆ لە دوو دڵانو لە گومانـداران مەبـە.

کـە دەفـەرمویٚ: ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا ﴾، ئـەو پرسـیارە، پرسـیارێکی نکووڵیی لێکـەرانە (الإِسْتِفْهَامِ الإِنْكَارِي)یـە کـە مەبەسـت ئـەوە نیـە وەڵامەکەی

وەربگریەوە، بەڵکو وەڵامەکەی لەنێو خۆیدایە، وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست لە (حكم) (مَعْبُود)ە: پەرستراو، یانی: (أَفَغَير اللّهِ أَبْتَغِي مَعْبُوداً) واتە: ئایا جگە لە خوا بپەرستم؟ بەڵام مانای ڕاستتر ئەوەیە کە (حَكَمْ) هەر لەسەر مانا ڕواڵەتییەکەی خۆیەتی، واتە: دادوەر.

ئنجا ئایا بۆچی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئایا من جگە لە خوا بە دادوەر بخوازم، کە لە کاتێکدا ئەو کتێبێکی ڕوونی بۆ ناردوون؟ واتە: ئەو ڕاجیاییانەی لە نێوان ئینسانەکاندا هەن، تەنیا مافی خوای دادگەرە لە ڕێی کتێبو وەحیو بەرنامەی خۆیەوە، بۆیان یەکلایی بکاتەوەو، هەقو ناهەقیان بۆ بخاتە ڕوو.

دەربارەی وشەی حەکەم گوتراوە: (الحَكَمُ: أَبْلَغُ مِنَ الحَاكِمِ إذْ لا يَسْتَحق التسمية بالحكم، إلاَّ مَنْ يَحْكُم بالحَقّ لَكِن الحاكم صِفَة جارية عَلى الفعل) واتە: حەکەم مانای بەهێزترە لە حاکم، {(حکم) واتە: دادوەر، (حاکم) واتە: حوکمڕان}، چونکە تەنیا کەسێك شایستەیە پێی بگوترێ: (حَكَمْ) کە حوکم بە هەق بکات، دادوەرییەکی بە هەق بکات، بەڵام (حاکم) حوکمڕان، ڕووی لە کردەوەکەیەو هەرکەسێ حوکم بکا، پێی دەگوترێ (حاکم).

کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مُفَصَّلٗا﴾، وە خوا ئەو کەسەیە کە کتێبی بۆ ئێوە ناردۆتە خوار، ڕوون کراوەیە، واتە: هەقو ناهەقو، حەڵاڵو حەڕامو، چاكو خراپو، ڕاستو چەوتو، تا کۆتایی، تێدا ڕوون کراونەوەو، لە یەك جیاکراونەوە.

خەواریج کە کۆمەڵێك بوون کاتی خۆی لە خەلیفەی چوارەم (علي بن أبي طالب) خوا لێی ڕازی بێ جیابوونەتەوە، ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، لەسەر ئەوە کە دروست نیە مرۆڤ بکرێتە دادوەر، وە کاتی خۆی لایەنی موعاویە لەگەڵ لایەنی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە دوو کەس بکەنە حەکەم، لە لایەنی موعاویەوە: عەمری کوڕی عاصو، لە لایەنی عەلی یەوە ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لە هەمووان ڕازی بێ، خەواریج گوتیان: ئەی عەلی! تۆ خەلیفەی مسوڵمانانی، چۆن ڕازی دەبی بۆ دینی خوا مرۆڤ ببێتە دادوەر؟!

چۆنیـەتی پەیـدابوونو سـەرهەڵـدانی گرووپـی (خـەواریـج)یش بـە کورتـی بـەم شێوەیە بوو:

هـەر کـام لـە موعـاویـەی کـوڕی ئەبوسوفیـانو عـەمـری کـوڕی عـاص، لـە عەلـی کـوڕی ئەبـو طـاڵیـب یـاخی بـوونو هەڵـگەڕانەوەو، ئـەوەبوو سـەرەنجـام جەنگـی (صفین) لە نێـوانیـان دا ڕووی دا.

ئیـدی دوای ئـەوەی دەرکـەوت، کـە خەریکـە بشکێن سـوپای عەلـی خـەریك بـوو سوپای موعـاویە بشکێنـێ، بۆئـەوەی خۆیـان دەربـاز بکـەن لـەو شکسـتە، فێڵێکـیان دۆزیـەوە، گوتیـان: کـێ موصـحەفی پێیـە؟ بـا لەسـەری ڕمەکـەی ببەستێو بـەرزی بکـاتەوە، دەڵێین: قورئان حەکەم بێ، گوتیان: ئەگـەر عەلـی شـەڕەکە ڕاگـرێ، هـەر زەرەریەتـی، ڕایـنەگـرێ، هـەر زەرەریـەتی، ئەگـەر ڕایگـرێ، ئـەوە ئێمـە دەربازمـان دەبـێ لەو شکستە، وە ئەگـەر ڕایـنەگرێ، ئەوە ئێمـە دوایـی دەڵێین: تەماشا بکـەن ! عەلی حوکم بە قورئـان ناکـات !

بێگومـان فێڵەکەشـیان سـەری گـرت، چـونکە کاتێـك کـە موصـحەفەکانیان بـەرز کردەوە، ئەوانەی کـە دوایی ناویـان لێنـرا: خەواریج، گوتیان: ئـەی خەلیفـە ! (عەلـی کوڕی ئەبی طاڵیب) شـەڕەکە ڕاگـرە، ئەوانە داوا دەکـەن قورئان حەکـەم بێ.

عەلی گـوتی: ئاخر مـن لەسـەر قورئـانـێ شـەڕیان لەگەڵدا دەکـەم، مـن خەلیفـەی مسـوڵمانانمو ئەوانە سـەرپێچییـان کـردوە !

گوتیـان: نەخێـر، دەبـێ ڕایگـری.

گـوتی: ئەوانەکـە دەڵێن: قورئـان حەکـەم بـێ، (كَلِمَـةُ حَـقٍّ يُـرَادُ بِهـا بَـاطِـلٌ) قسـەیەکی هـەق دەکـەن، بەڵام مەبەستێکی ناهـەقی لـە پشتەوەیە، تەنیـا دەیانـەوێ خۆیـان لەو شکستە ڕزگـار بکـەن.

گوتیـان: نەخێر، ئەگـەر ڕایـنەگری لە تۆ دەدەیـن.

ئیـدی بە ناچاریی شـەڕەکەیان پـێ ڕاگـرت، کـە دوایـیش کە دوو حەکـەمەکانیـان دانان، گوتیـان: چۆن لە بـارەی ئـەو بارودۆخـەوە بە حەکـەمان ڕازی ؟

گوتـی: بۆخۆتـان واتانـنەگوت ؟

گوتیـــان: ئنجـا بـا ئێمــەش وامـانـگوتبــێ، ئێمـە بەهەڵـەدا چـووین، ئنجـا ئـەم ئایەتـــەیان بـــە بەڵـــگە هێنایـــەوە ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ﴾، ئایا جگە لە خوا بە دادوەر بخوازم.

گوتیـــان: خـوا دەفــەرموێ: نابــێ جگـە لـە خـوا، بـە دادوەر بخـوازرێ، کەواتــە: چۆن ڕازی، دوو نەفەر حەکەم بن ؟!

ئنجا عەلـی خوا لێی ڕازی بـێ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی نـارد بۆ لایـان گوتـی: بچۆ هەنـدێ شـتیان بـۆ ڕوون بکـەوە، ئـەویش چـوو بـۆ لایـان گـوتی: لەسـەر چی لـە خـەلیفەی مسـولمانان جیا بوونەتـەوە؟ {کە نەك هـەر لێـی جیابووبوونــەوە، بگــرە (عەلـی)یان بە کافریش دادەنـا}.

گوتیــان : کــافر بووە !

گـوتی: لەســەر چی ؟

گوتیـان: لەسـەر ئـەوەی کـە ڕازی بـووە دوو نەفـەر دادوەربـن، داخـۆ ئـەو لەسـەر هەقـە، یان لەسەر ناهەقـە ؟

ئەویش گـوتـی: من پرسـیارتان لـێ دەکـەم: ئایـا چارەسـەری کێشـەی دوو کۆمـەڵ لـە مسـولمانان {کـە کۆمـەڵی عەلـیو کۆمەڵـی موعاویـە بـوون} گـەورەترە، یـاخود کێشـەی ژنو مێـردێك ؟

گوتیــان: کێشـەی ئەو دوو کۆمەڵـەی مسـولمانان.

گـوتی: دەجا خـوای پـەروەردگار بـۆ کێشــەی ژنو مێــردێك دەفـەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾النسـاء، واتـە: ئەگـەر مەترسـییتان هـەبوو ناکۆکییەکـەیان بتەقێتـەوەو چارەسـەر نەبـێ، دادوەرێـك لـە تەرەفـی پیـــاوەکەو، دادوەرێـــك لـە تەرەفـی ژنەکـە بنێـرن، ئەگـەر مەبەسـتیان چاکسـازیی بـێ، خـوا پێکیان دێنـێ، بێگومـان خـوا زانـای شـارەزایە.

دوایی گوتی: باشە چارەسەری کێشەی دوو کۆمەڵی گەورەی مسوڵمانان، گەورەترە، یاخود بڕیاردان لەسەر کەسێك کە لە ئیحرام دایەو نێچیرێك دەکوژێو دەبێ خوێنەکەی بدا ؟ گوتیان: بێگومان ئەوەی یەکەم، گوتی: دەجا خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾ ﴾المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! لە کاتێکدا کە لە ئیحرام دان، نێچیر مەکوژن، وە هەرکامێك لە ئێوە نێچیرێکی کوشت، پاداشتێك بە ئەندازەی ئەوەی کە کوشتوویەتی لە ئاژەڵان، (دەکەوێتە سەری) کە دوو مرۆڤی دادگەر لە خۆتان بڕیاری لەسەر دەدەن، ﴿ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ ﴾، دوو مرۆڤ لەبارەیەوە دەبنە دادوەر، کە دادگەربن، ئیدی ئەوەبوو بێ قسەی کردنو، زۆربەیان ئیقناع بوون، وە سەرەنجام دوو لەسەر سێ، یان زیاتریان گەڕانەوە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ، ئەوانی دیکەش مانەوە، دوایی ئەوە بوو لە شەڕی (نهروان)دا، زۆربەیان لەبەین چوون.

کەواتە قسەکەیان لەجێی خۆیدا نەبووە، جا ئەمە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زۆر کەس ئایەتێك لە قورئان، وشەیەك لە قورئان، لە شوێنێکدا بەکاردێنێ، کە شوێنی خۆی نیە، بۆیە بەڕاستیی هەموو کەس هی ئەوە نیە کە ئایەت بخوێنێتەوەو، بە بەڵگەی بێنێتەوە، یان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگە بێنێتەوە، بەڵکو هەرکەس بیەوێ ئایەتەکانی قورئانو دەقەکانی سوننەت بە بەڵگە بێنێتەوە، دەبێ فیقهی هەبێو شارەزابێ، ئنجا تێدەگات ئەو ئایەتە شوێنەکەی کوێیەو، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ شوێنەکەی کوێیە ؟ بۆیەش پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ من أبي هريرة رضي الله عنه، قال: قال رسول الله ﷺ : مَنْ

يُرِدِ اللّٰهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ﴾[١]، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خوا بیەوێ چاکەی لەگەڵ بکات، لە ئایین دا شارەزای دەکاتو تێی دەگەیەنێ.

نەیفەرمووە: (يُحفِّظُه نصُوص الدِّينِ) دەقەکانی دینی پێ لەبەر دەکات! هەیە هەموو قورئانی لەبەرە، بەڵام سوودێکی وای لێ نابینێ، کەسی وا هەیە زۆر فەرمایشتی پێغەمبەری ﷺ لەبەرن، بەڵام ڕەنگە سوودێکی وایان لێ نەبینێ.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ﴾[٢]، زۆر کەس شارەزاییەکی هەڵگرتووە، بەڵام دەیبا بۆ لای کەسێ، کە ئەو لێی شارەزاترە، ئەو دەتوانێ یاساکانی لێ هەڵبهێنجێو لە شوێنی خۆیان دا، ئەو دەقە شەرعییانە بەکاربێنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ﴾، ئەوانەی کە کتێبمان پێداون، دەزانن کە ئەم قورئانە لە پەروەردگارتەوە بە هەق دابەزێنراوە، ئایا بە: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ﴾ مەبەست پێی کێیە؟ بێگومان مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانییەکانو هەموو ئەوانی دیکەن، کە خۆیان بە خاوەنی کتێبی ئاسمانی دەزانن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ﴾، دەجا لە گوماندارانو دوودڵان مەبە، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە زۆربەیان بێبڕوا دەبنو، دان بەو هەقە دانانێن کە لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە، {خاوەن کتێبەکانیش دەیزانن} مەکەوە گومانو دوو دڵیی، مرۆڤ زۆرجار ئەگەر ئاگای لە

---

١) حَديثٌ صَحيحٌ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٨٩) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٧٨٤)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٢٨)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٧٤١٣)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (١٥٤١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٩٤) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخين عَنِ إبنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعَمٍ عَنْ أَبِيهِ.

خۆی نەبێ، بەهۆی زۆربوونەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی بیرۆکەیەکی هەڵەو قەناعەتێکی بێجێوە.

من جارێك یەكێك پرسیاری لێ کردم، گوتی: مامۆستا، ژمارەی مسوڵمانان چەندە لە دنیادا ؟

گوتم: ملیارێك زیاترە.

گوتی: ئەدی ژمارەی کافران؟

گوتم: چوار، پێنج ملیار دەبێ، یانی: هەر لە چوار بەشەران یان لە پێنج بەشەران یەکێکیان مسوڵمانە.

گوتی: باشە دەبێ چوار نەفەر لەسەر هەق بن، یان یەك ؟

گوتم: مەبەستت چییە ؟

گوتی: مەبەستم ئەوەیە ئایا ئەو هەموو خەڵکە بە هەڵەدا چوون ؟!! هەر ئێمە لەسەر هەقین؟

گوتم: بەڵێ، با وێنەیەکت بۆ بێنمەوە: ئەگەر هەموو دنیا کۆ ببێتەوەو بڵێ: (الفَاعِلُ مَنصُوبٌ)، قسەی هەموویان هەڵەیە، قسەی عەرەبی زانێك کە دەڵێ: (الفاعل مرفوع)، ڕاستە، یانی: قسەی ئەو کەسە ڕاستە کە هەق دەپێکێ، گوتم: مەسەلەی زۆریی‌و کەمیی هەقی پێ ناناسرێ، بۆیە گوتراوە: (يُعْرَفُ الرِّجَالُ بالحَقّ، ولا يُعْرَفُ الحَقّ بالرِّجَال) پیاوان بەهۆی هەقەوە دەناسرێن، نەك هەق بەهۆی پیاوانەوە، بناسرێ.

کەواتە: لێرەدا خوا دەفەرموێ: لە گومانداران‌و لە دوو دڵان مەبە، بەهۆی ئەوەوە کە زۆربەی خەڵکی ڕێی ناهەقیان گرتوە، هەڵبەتە: زۆربەی خەڵکەکەش مەرج نیە، هەمووی هەقی کەوتبێتە بەرچاو، مەرج نیە وەك ئێمەی مسوڵمان ـ ئەوانەمان کە شارەزاین ـ ئاوا لە ئیسلام‌و قورئان‌و سوننەت شارەزا بێ‌و، ئنجا ڕەفزیشی کردبێ، زۆربەیان وەك گوتراوە: (النَّاسُ أَعْدَاءُ مَا جَهِلُوا) خەڵك دوژمنی شتێکن کە نایناسن‌و پێی ئاشنا نین‌و، پێیان شتێکی نامۆیە.

ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەیە لە سوورەتی (یونس)دا ئایەتی (٩٤) کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ فَسۡـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقۡرَءُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكَۚ لَقَدۡ جَآءَكَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: ئەگەر لە گومان دای لەو کتێبەدا کە بۆمان ناردووی، لەوانە بپرسە کە لە پێش تۆدا کتێبیان خوێندۆتەوە، (واتە: لەو زانایانەی ئەهلی کیتاب بپرسە، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو ناوو سیفەتەکانی تۆیان لە لان)، لە سوننەت دا هاتوە کە پێغەمبەری ﷺ فەرموویەتی: ﴿لا أَشُكُّ ولا أَسْأَلُ﴾[1]، واتە: نە گومانم هەیەو نە پرسیاریش دەکەم.

ئنجا لێرەدا دەبێ بزانین کە مەبەست لەم دواندنەی خوای پەروەردگاردا، کێیە ؟ مەبەست ئەوانەن کە لە پشت پێغەمبەرەوەن ﷺ وەك پێشینان گوتوویانە: ((دیوار لەگەڵ تۆمە، گوێسوانە گوێت لێبێ)) هەندێ دواندن (خطاب) هەیە کە خوا ﷻ لەگەڵ پێغەمبەردا دەیکات‌و، مەبەستی پێ ئۆممەتەکەی‌و شوێنکەوتووانیەتی، واتە: ئەی مسوڵمانینە ! ئەگەر لە گومان دان، فەرموون : دیراسەی کتێبە پێشووەکان بکەن، کە لەوانیش دا باسی پێغەمبەری کۆتایی کراوە، مەبەستم ئەوەیە کە بە هەڵە لەو تەعبیرانە تێنەگەین‌و، پێمانوابێ یان خەتەرەیەکمان بەدڵ دابێ: تۆ بڵێی پێغەمبەر ﷺ جۆرێك لە گومانی هەبووبێ‌و دوودڵیی بووبێ؟! نەء، بەڵکو مەبەست پێی ئۆممەتەکەیەتی، بەڵام دواندن (خطاب)ە کە لەگەڵ ئەو دایە.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، واتە: وشەی پەروەردگارت تەواوی کردوە لە ڕاستیی‌و دادگەرییدا، گۆڕەر نیە بۆ وشەکانی، وە خوا بیسەری زانایە ﴿ وَتَمَّتۡ ﴾، (تمام الشيء: انتهاؤُهُ إِلى حَدٍّ لا يحتاج إِلى شَيء خَارِجٍ عَنْهُ،

---

[1] أَخْرَجَهُ عَبْدُالرَّزَاق في "المصنف" برقم: (١٠٢١١)، عَنْ قتادة، وَالطَّبَرِي في تفسيرهِ مُرسَلاً.

عَكْس النّـاقص) ئەگـەر بلّـێـی: ئەو شـتە تـــەواو (تـامّ)ە، واتـە: گەیشـتۆتە رِاددەیـەك کە پێویسـتـی بە دەرەوەی خــۆی نیــەو بـە شـتێکی دیکـــەی لــە دەرەوەی خـۆی نیـە، واتە لە خــودی خۆیدا تـەواو (تـام)ەو کاملّـە، پێچـەوانـــەی (نـاقص)، (نـاقص) واتـە: ناتـەواو کە پێویسـتـی بە دەرەوەی خــۆی هەبـێ.

خـوا دەفـەرموێ: وشـەی پەروەردگارت تەواوی کردوە، لە چی دا ؟ لە رِاستییداو لە دادگەرییـدا، بۆچـی دەفــەرموێ: لــە رِاسـتیی‌و لــە دادگــەریی دا ؟ چـونکە وشــەی پەروەردگار کە قورِئانە، یـان هەواڵـە، یـان حـوکم‌و برِیـارە، ئەگــەر هــەواڵ بــێ، لە رِاستییدا تەواوی کردوە، وە ئەگەر برِیارو حوکم‌و بێ لە دادگەریی دا تەواوی کردوە.

وە مەبەسـت لـە: ﴿ كَلِمَتُ رَبِّكَ ﴾ وشــەی پەروەردگــارت، بـە پێـی رِای زۆربـەی زانایان‌و بە پێی سیاقەکەش، دیـارە: قورِئانە، هەروەك خوێندراویشتەوە : ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَـاتُ رَبِّكَ ﴾، واتـە: وشـــەکانی پەروەردگــارت تەواویــان کــردوە...، هەنــدێکیش گوتوویانە: مەبەست لە: ﴿ كَلِمَتُ رَبِّكَ ﴾، واتە موژدەو هەرِەشــەکانی خــوا (الوعـد و الوعیـد)، وە هەنــدێك گوتوویانـــە: مەبەســـت پێــی ســـوننەت‌و یاســاکانی خـــوای پەروەردگــارە، منیــش دەڵێــم هەموویــان دەگرێتـــەوە، بــەڵام بەپێــی ســیاقەکـــە، زیــاتر دەردەکـەوێ کە مەبەسـت پێـی قورِئــانــە.

ئنجـا کــە دەفــەرموێ: ﴿ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾، (الصّــدقُ: مُطَابَقَـةُ الكَـلامِ للوَاقِـعِ بحَسَب اعتِقَـاد الـمُتَكَلّم)[1] (صـدق): بریتیــە لـەوە کـە قسـەیەك پـرِ بـە پێســتـی واقیـع بــێ، بە پێـی بــرِواپێبوونــی ئەو کەســە کە قسـە دەکـات.

وشـــەی (عــدل)یــش: (العَــدْلُ: الإِنْصَــافُ وَهُـوَ إِعْطَــاءُ الـمَرْءِ مَـا لَـهُ وَأَخـذ مَـا عَلَيْهِ)[2] (عـدل) بریتیــە لە ئینصــاف، ئـەویش ئـەوەیـە کە هەر کەسـە هەقی خـۆی پێبدرێ، وە ئـەوەش کە لەســەریەتی لـێی وەربگــیــرێ.

---

١) المعجم الوسیط، ص ٥١١.

٢) المعجم الوسیط، ص ٥٨٨.

کە دەفەرموێ: ﴿لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾، ئەمە ئەگەر مەبەست پێی قورئان بێ، یانی: هیچ کەسێك ناتوانێ هیچ وشەیەکی قورئان بگۆڕێ، بە وشەیەك کە لە قورئان ڕاستتر بێ، وە دادگەرتربێ، یاخود وەك قورئان ڕاستو دادگەربێ، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە کە هیچ کەسێك ناتوانێ ئایەتەکانی قورئان بگۆڕێ، بۆچی؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩ ﴾ الحجر، واتە: ئێمە خۆمان زیکرمان دابەزاندوە، وە خۆشمان پارێزەرییینی، هەڵبەتە لە واقیعیش دا قورئان هیچ کەس نەیتوانیوە وە ناشتوانێ بە هەردوو واتایەکە: دەستکاریی بکات. بەڵێ کەسێك دەگونجێ هەندێك ئایەتان دەستکاریی بکات، بەڵام لە مسوڵمانان پەنهان نابێو، هەموو کەس دەزانێ، کە ئەوە گۆڕدراوە.

ئەگەر مەبەستیش لە: ﴿كَلِمَتُ﴾، سوننەتو یاساکانو حوکمە قەدەرییەکانی خوا بێ، واتە: هیچ کەس سوننەتو یاساکانی خوای بۆ ناگۆڕدرێنو لانادرێن، ئەوەش واقیعێکی بەرچاوە.

کە دەشفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾، خوا بیسەری زانایە، کەسێك کە هەموو شتێك ببیستێو، هەموو شتێك بزانێ، دیارە وشەکانیشی تەواو دەبن، وە ناشگۆڕدرێن، وە پڕ بە پێستی پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤ دەبن.

**مەسەلەی چواردەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴾، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر تۆ بە قسەی زۆربەی خەڵکی سەر زەوی بکەی، لە ڕێی خوا لات دەدەن، ئەوانە تەنیا شوێن گومان دەکەون، وە تەنیا درۆش دەکەن، واتە: زۆربەی ئەو خەڵکە کە دانوویان لەگەڵ ئەو هەقەدا ناکوڵن، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناویەتی: خاوەنی گومانو درۆن، بۆیە زۆرینە مەرج نیە لەسەر هەق بێ.

یەکێ لە پیاوچاکان دەڵێ: (عَلَيْكَ بطَرِيق الحَقِّ وَلا تَسْتَوْحِش مِن قِلَّةِ السَّالِكِين، وَإِيّاك وَطريق الباطِل ولا تَغْتَرَّ بكثرة الهالكين)، یانی: ڕێی هەق

بگرەو، ترسو بێزارییت نەبێ، کە کەم کەس بەڕێی هەقدا دەڕۆن، وە خۆت لە ڕێی ناهەق بپارێزەو، بەوە هەڵمەخەڵەتێ، کە زۆر کەس تێیدا فەوتاون.

بەڵێ، ناهەق هەر ناهەقە، ئەگەر هەموو خەڵکیش شوێنی بکەوێ، هەقیش هەر هەقە، ئەگەر هیچ کەسیش شوێنی نەکەوێ، لە زۆر شوێندا خوای پەروەردگار باسی کردوە، کە زۆرینەی خەڵك ڕێی ناهەق دەگرن، بۆ وێنە :-

١/ دەفەرموێ ﴿... وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢١﴾﴾ یوسف، واتە: بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

٢/ هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾﴾ المؤمنون، واتە: زۆربەیان نکوولی لە هەق دەکەن.

٣/ هەروەها لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ كَثۡرَةُ ٱلۡخَبِيثِۚ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠٠﴾﴾، واتە: بڵێ پاكو پیس وەك یەك نین، با زۆریی پیسیش سەرسامت بکات.

بەڵام لێرەدا دەبێ بزانین کە زۆرینە لەنێو بەشەردا، کە ڕێی ناهەق دەگرن، بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە زۆرینە لەنێو ئۆممەتدا لەسەر ناهەقن! چونکە ڕای زۆرینە (جمهور) یەکێکە لە زاڵکەرەکان (مُرجِّحات)ی ڕاستیی ڕایەك، هەڵبەتە جاری واش دەبێ کە کەمینەش دەیپێکنو زۆرینە نایپێکن، بەڵام بە زۆریی وایە کە ڕای زۆرینە لە هەقو ڕاستییەوە نیزیکترە، وە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ ئاماژە بەوە دەکەن، وەك دەفەرموێ: ﴿يَدُ اللهِ مَعَ الْجَمَاعَةِ﴾[1]، واتە: دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵ دایە.

١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٦٦) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، صَحَّحَهُ الشيخ الألباني.

وە ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء)یش کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥ ﴾، هەر ئاماژەیە بەو ڕاستییە.

ئنجا لێرەدا هەندێ لە زانایان پرسیارێکیان بۆ دروست بووە، دەڵێن: باشە، خوای پەروەردگار باسی بێبڕوایەکان دەکاتو دەفەرموێ: ئەوانە تەنیا شوێن گومان دەکەون، دیارە (قیاس)یش کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی هەڵهێنجانی حوکمی شەرعیی، لەسەر بناغەی گومان (ظن) بنیات نراوە، کەواتە: ناگونجێ شوێن قیاس بکەوین بۆ هەڵهێنجانی حوکمی شەرعیی! جا هەڵبەتە وشەی (ظن) چەند پێناسەیەکی هەن، بۆ وێنە: هەندێك ئاوا پێناسەیان کردوە:

(الظن: إِدْرَاكُ الشيءِ مَعَ تَرجيحه، وَقَدْ يَكُونُ مَعَ اليَقِين)[(١)]، واتە: (ظَن) بریتیە لەوە کە عەقڵ شتێك بزانێ، لەگەڵ زاڵکردنی ئەگەری بوونی بەسەر نەبوونیدا.

وە هەندێك گوتوویانە: (الظن: هُوَ الإعتِقَاد الرّاجح غَير المستند إِلى أَمَارَة: أَمَّا المستند الى أَمارَة، فَلاَ يعتبَر ظَناً مَذْمُوماً)[(٢)] واتە: (ظن) بریتیە لە بڕواهێنانێکی زاڵ، کە پاڵ نەداتە لای نیشانەیەك، (واتە: پشت ئەستوور نەبێ بە نیشانەیەك)، بەڵام ئەوەی پشت ئەستوور بێ بە نیشانەیەك، ڕەخنەی لێناگیرێ، ئنجا (قیاس)یش بریتیە لە گومانێکی پشت ئەستوور بە نیشانەیەك، بۆیە ئەو جۆرە حوکمەی بەهۆی قیاسەوە هەڵدەهێنجرێ، ناچێتە خانەی ئەو گومانەوە کە خوای بەرز زەمی دەکاو، دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ﴾.

---

١) المعجم الوسيط : ص ٥٧٨.

٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٥٣٩.

**مەسەلەی پازدەیەمو کۆتایی**: ئەوە کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦۗ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾، بێگومان پەروەردگارت زاناترە بەوەی کێ لە ڕێی ئەو ون دەبێ، وە زاناتریشە بەوانەی کە ڕێگای ڕاستیان گرتوە، وشەی ﴿ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ ﴾، ئەگەر بە ڕواڵەتەکەی لێکی بدەینەوە لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، ماناکەی هەڵە دەردەچێ، واتە: خوا زاناترینە کێ گومڕا دەبێ، بۆیە زانایان دەڵێن: ماناکەی ئاوایە: ﴿ هُوَ أعْلَمُ بِمَن يَضِلُّ ﴾، خوا زاناترە بەو کەسەی کە گومڕا دەبێ، ﴿ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾، وە خوا زاناترە بە هیدایەتدراوانو ڕێگای ڕاست گرتووان.

ئەوەی من لێی تێدەگەم مەبەستی خوا ئەوەیە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وە شوێنکەوتووانی، دڵنیا بکاتەوە کە ئەو خوایەی ئەو قورئانەی بۆ ناردوون، زاناترە بە هەردووك لایان: بەوانەی کە گومڕا دەبنو، بەوانەش کە ڕێی ڕاست دەگرن.

کەواتە: ئێوە مەکەونە دڵ لە دڵ دانو، مەکەونە گومانەوە، ـ وەك پێشتر گوتم ـ بەهۆی ئەوەوە کە زۆرینەی خەڵك لە ڕێی هەق لایانداوە، چونکە لە ڕاستییدا زۆرینەو کەمینە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە مرۆڤ ڕێگای ڕاستی گرتوە، یان ڕێگای چەوتی گرتوە، ناسینی ڕێگای ڕاستو چەوت گرتووان بە زۆریی و کەمیی نیە، بەڵکو بە کۆمەڵێك شوێنەوارو کۆمەڵێك بەڵگەی دیکەیە، ئەگەرنا جاری وایە خەڵکێکی زۆر زۆر لەسەر ناهەق کۆدەبنەوە، هەر وەك جاری واش هەیە خەڵکێکی زۆر لەسەر هەق کۆدەبنەوە، گرنگ ئەوەیە پێوەری مرۆڤ بۆ ڕاستیی و چەوتیی، یان هەقو ناهەقو بوونی شتێك، نابێ ئەوەبێ کە ئایا خەڵکێکی زۆر لەگەڵ ئەو شتە دایە، یاخود خەڵکێکی کەم؟

وەك لە ئایەتەکانیشدا خوای زاناو توانا زۆر باسی ئەوە دەکات، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾یوسف، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾المؤمنون، هەروەها

دەفـــــەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ كَثۡرَةُ ٱلۡخَبِيثِ ﴾ (١٠٠) المائدة، لە چەند شوێنان دا خوا باسی ئەوە دەكات، كە: زۆربەی خەڵكی نازانن، نافامن، بڕوا ناهێنن، هەق قبووڵ ناكەن، بەڵام لێرەدا مەبەست لە زۆرینەی مرۆڤانە، نەك زۆرینەی نێو ئۆممەتی ئیسلام، چونكە هەندێك لە ئەهلی بیدعەت وەك شیعەو خەواریجو مورجیئەو موعتەزیلە، ئەم ئایەتانە بە بەڵگە دێننەوەو دەڵێن: ئەهلی سوننەتو جەماعەت زۆرینەن، خواش دەفەرموێ: زۆربەی خەڵكی هەق قبووڵ ناكەن، زۆربەیان نازانن، زۆربەیان ئیمان ناهێنن، زۆربەیان ناحاڵین ! ئێمەش لە وەڵامیان دا دەڵێین: خوا ﷻ فەرموویەتی: زۆرینە لەسەر ئاستی مرۆڤایەتیی، هەق ناپێكن، دیارە هۆكاری ئەوەش ئاشكرایە: مرۆڤەكان ئەگەر ئیمانیان نەبێ، زیاتر نەفسو ئارەزوو و شەیتان بەسەریاندا زاڵە، تاكو عەقڵو مەنتیق، بەڵام بە نسبەت زۆرینەی ئۆممەتەوە، زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە ڕای زۆرینەی زانایان، یەكێكە لە زاڵكەرەكان (مرجِّحات) ئەگەر دوو ڕا هەبن یەكێكیان زۆرینەی زانایان تەبەنیيان كردبێ، ئەوە لە هەقەوە نیزیكترە، وەك پێشینان گوتوویانە: (عەقڵی دووان لە هی یەكێك زیاترە) كەواتە: ئایەتەكان كە باسی زۆرینەی گومڕاو سەرگەردان دەكەن، مەبەست زۆرینەیە لەسەر ئاستی بەشەر. بەڵام زۆرینە لەسەر ئاستی كۆمەڵێكی ئیمانداری هیدایەتدراو، وا دەچێتە عەقڵەوە، كە شتێك زۆرینە پشتگیریی بكەن، دەبێ لە هەقەوە نیزیكتر بێ، هەرچەندە جاری واش هەیە، دیارە لە هەندێ مەسەلەدا ڕای زۆرینە ناپێكێ، وەك شەریعەتزانان گوتوویانە: هەندێك (قیل) هەن وەك (فیل)ن !، واتە: جاری وایە قسەیەك قیلێكی لەسەرە، بەڵام بەڵگەكەی بەهێزترە، یاخود جاری وایە ڕایەك كەمینەیەك پشتگیرییان كردوە، بەڵام دوایی دەردەكەوێ، كەمینە پێكاویەتی، بەڵام ئەمە دەگمەنەو، بە زۆریی وایە كە ڕای زۆرینە لە هەقو ڕاستییەوە نزیكترە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسـەمان لە دە (١٠) ئایـەت پێکـدێ، لە ئایـەتەکـانی: (١١٨ تا ١٢٧)، لـەم دە (١٠) ئایـەتە موبارەکـەدا، خـوای کاربەجـێ کۆمەڵێـك بابـەت بـاس دەکـاتو تەوەرەێکـی سـەرەکیی نیـە، هەمووی کۆبکاتەوە، بەڵکو لە چەند تەوەرێك پێکهاتوە.

سـەرەتا خـوا فەرمان بە بـڕواداران دەکات کـە لـە گۆشـتی ئـەو ئاژەڵـە سـەربڕاوەی، کە نـاوی خـوای لەسەرهێنراوە، بخـۆن : ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴾، وە پێیـان دەفـەرموێ: ئـەوەی کـە لێیـان قەدەغـە کـراوە بـۆی ڕوونـکردوونـەوە، کەواتـە: ئـەوەی نـەچێتە خانـەی قەدەغـە کراوەوە، مانای وایـە بە حەڵاڵیی ماوەتـەوە.

پاشـان فەرمانیـان پێـدەکات کـە خۆیـان لـە گونـاهی ئاشـکراو پـەنهان بپارێزن، وە دوایـی پێیـان دەفـەرموێ: لـە گۆشـتی سـەربڕاوێك نـەخۆن کـە نـاوی خـوای لەسـەر نەهێنراوە، ئنجا سـەربڕاوێك کە ناوی خـوای لەسـەر نایەت، یـانـی: ناوی جگـە لـە خـوای لەسـەر هاتوە، یاخود شـتێك کە ناوی خـوای لەسـەر نـەهاتبـێ، کـە دەگونجـێ مەبەسـت پێی مرداربـێ، ئاژەڵێك کە دەمرێ، ناوی خـوای لەسەر نایەت، فریای (بسم الله) ناکـەون، وە پێیان ڕادەگەیـەنێ: کە ئەگەر بێتو فەرمانبەریی هاوبەش بۆ خـوا دانـەرەکان بکـەن، کە شەیتانـەکان وەسوەسـەیان بـۆ دەکـەن: بـۆ خـواردنی گۆشـتی سـەربڕاوی نـاوی خـوا لەسـەر نـەهێنـراو، یاخود خـواردنی گۆشـتێك کە ناوی خـوای لەسـەر نـەهاتوە، ئەوە لەو حاڵەتەدا، ئەگەر ئەو خـواردنـە کە گۆشـتی مردارە، یاخود نـاوی جگـە لـە خـوای لەسـەر هـاتوە، بە حەڵاڵ بزانن، پێی دەبن بە هاوبەش بۆ خـوا دانـەرو دەچنـە ڕیـزی هاوبـەش بۆ خـوا دانـەرانـەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾.

پاشان خوا دوو وێنان دێنێتەوە، بۆ خستنەڕووی حاڵەتی بابای ئیماندارو بابای بێ ئیمان، کە حاڵیان چۆنە، وە دوایی خوای دادگەر باسی یاسایەکی خۆی دەکات، کە بریتیە لە زاڵکردنی تاوانبارانی قسە ڕۆیشتوو بەسەر ئاوەدانییەکان دا، بۆ تێکدانی ئاوەدانییەکان، واتە: هەر کاتێك ئەوانەی کە دەسەڵاتدارن، تاوانبارەکان بوون، ئەوە ئەو ئاوەدانیی‌و وڵاتە تێکدەچێ.

ئنجا دوایی خوا باسی هەڵوێستی خۆبەزلگرانەی کافرەکان دەکات، کە لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا، وە لە بەرانبەر پێغەمبەرانی خوادا (علیهم الصلاة والسلام) خۆ بەزل دەگرن، وە دەڵێن: ئیمان ناهێنین، تاکو چی بۆ پێغەمبەران هاتوە، بۆ ئێمەش نەیەت.

وە باسی سەرەنجامی شوومیان دەکات، کە بریتیە لە زەبوونیی‌و سزای بە ئێش لە دوارۆژدا.

ئنجا خوای دادگەر باسی حاڵەتی هەر کام لە بابای هیدایەت دراوی سینە گوشاد، وە مرۆڤی گومڕای سینە تەنگ‌و دڵ گوشراو دەکات‌و وێنەیان لەسەر دێنێتەوە.

وە لە کۆتایی دا خوا ڕایدەگەیەنێ: کە ئەو جۆرە مامەڵەکردنەی خوا لەگەڵ بەندەکانیدا، کە هەر کەسێك بەرەو خوا بڕوات، سینەی گوشاد دەکات، وە هەر کەسێك پشت لە خوا بکات، خوا دڵی تەنگ دەکات، لە بەرانبەر دینی خۆی دا، یاسایەکی چەسپاوی خوایە، وە ڕایدەگەیەنێ کە پەند وەرگران‌و بەهرەمەندان لە ئایەتەکانی خوا، سەرەنجامیان مەنزڵگای ئاشتییە، کە یەکێ لە ناوەکانی بەهەشت (دار السلام)، وە خواش سەرپەرشتیارو مشوورخۆری ئەو کەسانەیە، کە پەند لە ئایەتەکانی خوا وەردەگرن.

﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤۡمِنِينَ (١١٨) وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تَأۡكُلُواْ
مِمَّا ذُكِرَ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَقَدۡ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيۡكُمۡ إِلَّا مَا ٱضۡطُرِرۡتُمۡ إِلَيۡهِۗ وَإِنَّ
كَثِيرٗا لَّيُضِلُّونَ بِأَهۡوَآئِهِم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُعۡتَدِينَ (١١٩) وَذَرُواْ ظَٰهِرَ
ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ (١٢٠) وَلَا
تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ
أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ (١٢١) أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ
وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ
كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (١٢٢) وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا فِي كُلِّ قَرۡيَةٍ
أَكَٰبِرَ مُجۡرِمِيهَا لِيَمۡكُرُواْ فِيهَاۖ وَمَا يَمۡكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ
(١٢٣) وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ
حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ
بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ (١٢٤) فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ
أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ
يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ (١٢٥) وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗاۗ قَدۡ
فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ (١٢٦) لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ (١٢٧)﴾.

# مانای وشــە بە وشــەی ئایەتەکـان

((" ئەی بڕوادارینـە ! " دەجا ئەگـەر بە ئایـەتەکانی (خـوا) بـڕوادارن، لـەو (گۆشـتی سـەربڕاو)ە بخـۆن، کـە نـاوی خـوای لەســەر هێنـراوە (لـە کـاتی سـەربڕانی دا) ﴿١١٨﴾ وە بۆچی لـەو (گۆشـت)ە سـەربڕاوە ناخـۆن، کە ناوی خـوای لەسـەر هێنراوە، لە حاڵێکدا کـە (خـوا) ئـەوەی لێـی قەدەغـەکردوون، بۆی ڕوون کردوونــەوە، مەگـەر ئـەوەی بـۆی ناچـار بکرێـن ؟ وە زۆرێك بەهـۆی ئارەزووەکانیانــەوە، بـەبێ زانیـاریی (خـەڵك) گومڕا دەکـەن، بێگومـان پـەروەردگارت بـە سـنوور شـکێنان زانـاترە ﴿١١٩﴾ وە واز لـە گونـاهـ بێـنن، بـە ئاشـکراو بە پەنهانییـەوە، بە دڵنیـاییـەوە ئەوانـەی گونـاهـ بەدەسـت دێنــن، لەمـەودوا ســزا دەدرێـن بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەیـانکرد ﴿١٢٠﴾ وە لـەو (گۆشــت)ە مـەخۆن کـە نـاوی خــوای لەســەر نــەهێنراوە (لــە کـاتی سـەربڕینــی دا) وە بێگومـان ئـەوە (نـاوی خــوا نـەهێنــان لـە کـاتی سـەربڕینــدا) لـە ڕێ دەرچوونــە، وە بــە دڵنیاییـــەوە شەیتانـــەکان ســرووش (وەسوەســە) بــۆ دۆســتەکانیان (لــە هاوبــەش دانــەران) دەکــەن، تــاکو شــەڕە قســەتان لەگـەڵ بکــەن، وە ئەگــەر فەرمانبەریــیان بکــەن (لــە بــە حــەڵاڵ دانـانی سـەربڕاوی ناوی جگە لە خـوا لەســەرهێنراودا) ئـەوە بێگـومان ئێـوە هاوبـەش دانــەرن ﴿١٢١﴾ ئایا کەسێك کە مردوو بووەو زیندوومان کردۆتـەوەو، ڕۆشـناییی یـەکمـان پێـداوە، کە لە نێوخەڵکیدا پێی دەڕوات، وەك کەسێك وایـە کە لە تاریکاییان دایـە، لێیـان دەربـاز نابـێ؟! بەو شێوەیـە ئەوەی کافرەکـان دەیکـەن، بۆیـان ڕازێنراوەتەوە ﴿١٢٢﴾ وە بەو جۆرە لە هەر ئاوەدانییـەکدا، تاوانبارەکانمان کردوونـە گەورەو باڵادەست، تاکو پیلانگێڕیی تێدا بکەن، هەرچەندە پیلانەکەشیان هەر لە دژی خۆیانە، بەڵام هەست ناکەن ﴿١٢٣﴾ وە ئەگەر بەڵگەو موعجیزەیـەکیان بـۆ هـات دەڵێن: هـەرگیز بـڕوا نـاهێنین، هـەتا وەك ئـەوەی بـە پێغـەمبەرانی خــوا دراوە، پێمـان نــەدرێ، خـوا زانـاترە بـەوە کـە پـەیامی خـوا بـە کـێ دەسپێرێ‌و کـێ شایستـەیـە، لەمەودوا ئەوانـەی تاوانیـان کـردوە لـە لای خـوا "لـە ڕۆژی دوایـی دا" زەبوونیی‌و سـزای تونـدیان تـووش دەبـێ، بەهـۆی ئـەوەوە کـە پیلانـگـێڕییان

دەکرد ﴿١٢٤﴾ خوا هەر کەسی بیەوێ ڕێنمایی بکات، سینەی بۆ گەردنکەچیی (ئیسلام) گوشاد دەکات، وە هەرکەسێکی بوێ، گومڕای بکات، سینەی تەنگو سەغڵەت دەکات، وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان سەربکەوێ، بەو شێوەیە خوا سزا (ونەفرەت) بۆ ئەوانە تەرخان دەکات، کە بڕواناهێنن ﴿١٢٥﴾ وە ئەمە (بەم جۆرە مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤەکاندا) ڕێبازی ڕاستی پەروەردگارتە، بە ڕاستیی ئایەتەکانمان بۆ کۆمەڵێك بیربکەنەوە، ڕوونکردوونەوە ﴿١٢٦﴾ مەنزڵگای ئاشتییان لە لای پەروەردگار هەیە، وە (خوا) بەهۆی ئەو کردەوە (باشو پەسەند)انەوە کە دەیانکرد، مشوورخۆرو پشتیوانیانە ﴿١٢٧﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(فَصَّلَ لَكُم ) واتە: بۆی ڕوون کردوونەوە، (بَيَّنَ لَكُمْ، وَفَصَّلَ العِقْدَ: جَعَلَ بَيْنَ حَبّاته حَبّاتٍ أُخْرَى مغَايرَة فَهُوَ مُفصَّل) گەردەنبەند، یان ملوانکەی ئافرەتان، بۆ وێنە: ئەگەر لە گەوهەر بێ، لە مرواریی بێ، لە بەردی بە نرخ بێ، لە نێوان هەردوو دەنکدا، دەنکێکی دی جیای تێ دەکرێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (عِقْد مُفَصَّل) دیارە قسەش کاتێك کە بەش بەش بێ، ئەو قسەیە بۆ بەرانبەرەکە باشترەو ڕوونترەو چاك لێی تێدەگات، وە خوای پەروەردگاریش ئایەتەکانی قورئانی، چەند جارێك بە شێوازو تەعبیری جیا جیا دووبارە کردوونەوە، بۆئەوەی خەڵك زیاتر لێیان تێبگات، بەتایبەت ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە ئیمانو عەقیدەوە هەیە.

(إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ): واتە: مەگەر ئەوەی بۆی ناچار بکرێن، (اضْطرهُ إِلَيْهِ: أَحْوَجَهُ إِلَيْهِ وَأَلْجَأَهُ) واتە: ناچاری کرد بۆی، خوا دەفەرموێ: هەموو ئەو شتانەی کە قەدەغەن بۆمان ڕوونکردوونەوە، جگە لەوەی کە بۆی ناچار دەکرێن، واتە: قەدەغەکەش کە ناچار بووی، بۆت ڕەوایە، بایی ئەوەندەی کە لە مەرگ دەرباز بی، لێی بخۆی.

(يَقۡتَرِفُونَ ): (اقْتَـرَف: اكْتَسَبَ، وَاقْتَـرَف الذَّنْـبَ: أتَـاه) واتـە: بەدەسـتی هێنـا، بـەڵام زیاتـر بۆ گونـاحو شـتی خـراپ بەکاردێ.

(لَفِسۡقٌ ): (فِسق) لـە زمـانی عەرەبییدا، واتـە: دەرچوون، دەگوتـرێ: (فَسَقَت الرطبةُ عَنْ قِشْرِهَا: خَرَجَت) خورما کە لە کیفەکەی دەردەچێ، دەگوترێ: (فَسَقَت)، وە کە دەگوتـرێ: (فَسَقَ فُـلاَنٌ)، فلاَن کەس فاسـق بـوو، واتـە: (عَصَى وَجَـاوَزَ حُـدود الشَّرْعِ وَخَـرَجَ عَـنْ طَاعَتِـهِ) سـەرپێچیی کـردو لـە سـنوورەکانی خـوا دەرچـوە، لـە گوێڕایـەڵیی بەرنامـەی (خـوا) دەرچـوو.

(يَمۡكُرُونَ ): پیـلان دەگێـڕن، وشـەی (مَكْر) یانـی: فێـڵ، (ومَكَرَ بـهِ: خَدَعَـهُ) واتـە: فێـڵی لێکـردو هەڵیخـەڵەتانـد.

(صَغَارٌ ): واتـە: زەبـوونیی‌و بچـووکیی‌و سـووکـیی، دەگوتـرێ: (صَغُرَ يَصْغُر صِغَرَاً: قَلَّ حَجْمُهُ أَو سِـنُّه فَهُوَ صَغِير) واتـە: قەبـارەی بچووك بـوو، یاخـود تەمـەنی کـەم بـوو، کـە (صِغار) کۆیـەکەیـەتی، وە هـەروەها کـە دەگـوترێ: (صَغِرَ يَصْغُر صَغَاراً: رَضِيَ بالـذُلِّ وَالضَّـعَة) واتـە: بـە زەبوونیـی‌و ملکەچیـی‌و داماویی ڕازی بـوو، خـوای پـەروەردگار باسـی بێبـڕواکان دەکـات، کـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا تووشـی زەبوونیی‌و سـووکیی‌و بـێ دەرەتـانیی دەبـن.

(يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ ): واتـە: سینـەی گوشـاد دەکـات، دەگوتـرێ، (شَـرَح الشَّـيءِ: بَسَـطَهُ وَوَسَّعَهُ وَحَبَّبَهُ إِلَـيْهِ) فراوانـی کـردو لێکـی کێشـایەوە، لـە لای خۆشـەویسـت کـرد.

(ضَيِّقًا ): (ضَـاقَ يَضِيق ضَيْقَاً وَضِيْقَاً) واتـە: تـەنگ بـوون، (انْضَمَّ بَعْضُـهُ إِلـى بَعْض فَلَـمْ يتسـعْ لِمَا فِيـهِ وَقَصُـرَ عَنْـهُ) شـتێك کـە جێـی شـتێکی تێـدا نـەبێتـەوە، لـە زمـانی عەرەبیـدا پێـی دەگـوترێ: (ضَـيق) واتـە: تـەنگو تەسـك، کـە خـوای پەروەردگـار لێـرەدا باسـی سینـەی ئەوانـە دەکـات کـە بێـبڕوان، دەفـەرموێ: لـە

بەرانبەر دینی خوادا، دڵیان دێتەوە یەكو سینەیان دێتەوە یەكو جێگای هیدایەتی خوای تێدا نابێتەوە.

(حَرَجًا): (الحرجُ: غَيْضَةِ الشَّجَرِ الـمُلتفَّة لا يقدر أحد أَن يرعى فيها) بە مانای درەختێك، یاخود باغو بیستانێك دێ، كە جەنگەڵ بێو هیچ ڕێی تێنەچێ، شوان نەتوانێ مەڕەكەی تێدا بلەوەڕێنێ، (حرج) واتە: سەغڵەتیی‌و تەنگیی، دەگوترێ: (حَرِجَ الصَّدْر يَحْرَجُ: ضَاقَ) واتە: سینەی تەنگ بوو.

(ٱلرِّجْسَ): (الرِّجْسُ: الشيء القَذِرُ، والفِعْلُ القَبِيح، وَالحَرَامُ، والكُفْرُ، واللَّعْنَة، والعَذَابُ، وَرِجْسُ الشَّيْطَانِ: وَسْوَسَتُهُ) وشەی (رِجْس) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای شتی پیس دێ، وە بە مانای كردەوەی خراپ دێ، وە بە مانای شتی قەدەغە دێ، وە بە مانای كوفر دێ، وە بە مانای نەفرین دێ، وە بە مانای سزاش دێ، وە (رِجْسُ الشَّيْطَانِ) واتە: خوتخوتەو دنەدانی شەیتان.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەكان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَتَى أُنَاسٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَنَأْكُلُ مَا نَقْتُلُ، وَلا نَأْكُلُ مَا يَقْتُلُ اللهُ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ...الى...وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾[1]، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: كۆمەڵێك هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ (دیارە مسوڵمان بوون، چونكە گوتوویانە: یا رسول الله! كافرەكان هەرگیز نەیانگوتوە: یا رسول الله! هەر گوتوویانە: یا محمد!

---

١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٦٩)، وَقَالَ الشيخ الألباني: صحيح.

یا أبا القاسم) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە لەوە دەخۆین كە بە دەستی خۆمان دەیكوژینو سەریدەبڕین، یاخود ڕاوی دەكەین، بەلام لەوە ناخۆین كە خوا كوشتوویەتی (واتە: مردار) ؟ لەوبارەوە ئەو ئایەتە هاتە خوارێ، دوایی ڕوونی دەكەینەوە: حیكمەتی ئەوە چییە كە مردار ناخورێ، وە بۆچی ئەوەی كە بۆ غەیری خوا سەردەبڕدرێ، ناخورێ ؟

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ ﴾، قَالَ خَاصَمَهُمْ الْمُشْرِكُونَ فَقَالُوا: مَا ذَبَحَ اللهُ فَلا تَأْكُلُوهُ، وَمَا ذَبَحْتُمْ أَنْتُمْ أَكَلْتُمُوهُ﴾[١]، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان موناقەشەو شەڕە قسەیان لەگەڵ ئیماندارانـدا كـرد، گوتیان: ئەوەی كە خوا سەری بڕیوە نایخۆن (مەبەست مردارە)، وە ئەوەی بۆخۆتان سەری دەبڕن، دەیخۆن ! خوای پاك پێی فەرموون : لەوە مەخۆن كە ناوی خوای لەسەر نەهاتوە، واتە: مرداربۆتەوە، یان ناوی خوای لەسەر نەهاتوە، واتە: بۆ جگە لە خوا سەر بڕاوە، هەردووكیان دەگرێتەوە، وەك دوایی باسی دەكەین.

١) أَخْرَجَهُ النَّسَائيُّ برقم: (٤٤٣٧)، قَالَ الشيخ الألباني: صحيح الإسناد.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ لەم (١٠) ئایـەتە موبارەکەدا، کۆمەڵێك بابـەت باس دەکـات، دیـارە ئـەوەی کـە تەوەری سـەرەکییە لە ئایـەتەکاندا، مەسـەلەی خـواردنـە لـە گۆشـتێك کـە سـەربڕاوەو، ناوی خـوای لەسـەر هاتـوە، یاخـود بۆ خـوا سـەربڕاوە، وە نـەخـواردن لـە گۆشـتێك، یـان سـەربڕاوێك کە ناوی خـوای لەسـەر نـەهاتـوە، ئنجا چ مـردار بووبێتـەوە، چ بـۆ غـەیری خـوا سـەربڕابـێ.

وە دوایـی کۆمەڵێك بابەتـی دیکەش باس دەکـرێن، خـوای بـەرز وێنـە دێنـێتـەوە بـۆ مرۆڤی ئیمانداری مرۆڤـی بـێ ئیمـان.

ســەرەتا خـــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴾، ئـەم (ف)ە ﴿ فَكُلُوا۟ ﴾، لـێی وەردەگیـرێ کـە مشـتومڕێـك لەوبـارەوە هـەبووە، وەك لە هـۆی هاتنـە خـوارەوەکەش دا بۆمـان دەرکـەوت، مشـتومڕێك هـەبووە لەنێـوان ئیمـانداران و کافرەکانـدا، لەسـەر ئـەوە کـە گوتوویانـە: چۆن ئـەوەی کـە خـوا کوشتوویـەتی ـ کە مردارە ـ نایخۆن، بەڵام ئـەوەی کە بۆخۆتـان کوشـتووتانـە دەیخـۆن؟ بۆیـە خـوا بە (ف) دەست پێدەکـات: ﴿ فَكُلُوا۟ ﴾، واتە: خـوا فـەرمانی کـردوە کە ئـەوەی حەڵاڵەو ناوی خـوای لەسـەر هاتوە، خۆتـان کوشتووتانـەو سـەرتانـبـڕیوە، ﴿ فَكُلُوا۟ ﴾، دەجـا لێـی بخـۆن، ئەگـەر بـە ئایـەتەکـانی خــوا بـڕوادارن، واتـە: بـە قسـەی کـافرو موشــریکەکان مەکــەن و، مەکەونــە ژێــر کــاریگەریی پڕوپاگــەندەو قســەو قــاڵ و ئەفسانـەکانی ئەوان.

ئنجا خـوای پـەروەردگار بـە شـێوەی پرسـیارکردن و بـە جۆرێـك لەســەر زەنشـت و سـەرکۆنـــەوە، دەفــەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ ﴾، ئنجــا بۆچی و چ شتێك ڕێگـرتانـە کـە لەوەی کە ناوی خـوای لەسـەر هـاتوە، نەخـۆن ؟ ﴿ وَقَدْ

﴿فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾، له حاڵێك دا خوا ﷻ ئـەوە لێـی قەدەغـە کـردوون، بـە تـەواویی بـۆی ڕوونکردوونــەوە، ﴿إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ﴾، جگــە لـەوەی کـە بـۆی ناچار دەکـرێن، واتـە: قەدەغـەکراوەکانی بـۆ ڕوون کردوونـەوە، جگـە لـەوەی کـە بـۆی تێدەگیـرێنو ناچار دەبن لێی بخـۆن، کە ئەو کاتەش هەر قەدەغـەیـە، بـەڵام کەسێك کـە تێگیـراوەو ناچارکراوە، بۆی ڕەوایـە لێـی بخـوات، تـاکو پێـی لـە مـەرگ دەربـاز بـێ، مـادام بزانـێ، ئەگەر بێتو لەو مـردار بـووە، یـان لـەو گۆشتـی بـەرازە، یـان لـەو خوێنـە، یـان لـەوە کە بۆ جگـە لـە خـوا سـەربڕاوە، نەخـوات، ناژیـەت، ئـەوە بـۆی هـەیـە بیخـوات، بەڵکو لەسـەریشی فـەرزە، بایـی ئەوەندە لە یـەکێ لەو شتانـە بخـوات، تاکـو لـە مـەرگ دەربــازی بـێ.

هەڵبـەتە ئەم سـوورەتە مەککەییـەو وا دەردەکـەوێ مسوڵمانان لە کۆمەڵگای مەککەدا زۆر لـە ژێـر فشـاری کـافراندا بـوون، لـە ڕووی فیکریــیەوە، لـە ڕووی فەرهەنگــیی‌و کلتووریی‌و عـادەت‌و نـەریتەوە، کـە سـەفسـەتەیان لەگـەڵ کـردوون‌و گوتوویانـە: مـردار خـوا کوشتوویـەتیو، سـەربڕاو بۆخۆتان سـەریـدەبڕن، چۆن ئەوەی خـوا کوشتوویـەتی لە گۆشـتـەکەی ناخـۆن، بەڵام ئەوەی بۆخۆتان دەیکوژن لە گۆشـتەکەی دەخـۆن؟

کـە ئـەوە بـە ڕواڵـەت جۆرێـك لـە بەڵـگەی تێدایـە، بـەڵام لـە ڕاستییدا بەڵـگە نیـە، چونکە هەردووکیان خـوا دەیانکوژێ، مرداریـش‌و، ئـەوەی کـە مـرۆڤیش سـەریدەبـڕێ، هەر خـوا دەیانکوژێ، بەڵام مردار بۆیە نابـێ لـێی بخـورێ، چونکە پیسە، ئەو خوێنـەی لە جەستەی ئاژەڵ دایـە، لە ڕێی سـەربڕینـەوە، خوێنـەکە دەچێتـە دەرەوە، کە ئێستا لەم ڕۆژگــارەداو، پـاش گەشـەکردنی زانسـت، حیکمەتەکـەی دەرکـەوتوە، بـەڵام ئـاژەڵ کـە مردار دەبێتـەوە، خوێنـەکەی هەر لە بەدەنی دا دەمێنێتـەوە، وە ئەو میکرۆبانـەی کە لـە خوێن دان، جەستەکە دەردەدار دەکەن، وە هـەر کـەس لـەو گۆشـتە بخـوا، دیـارە ئەگـەری نـەخۆشیی‌و دەردەداریی لـێ نـزیکـترە، ئەوە لە ڕووی تەندروستیی‌و، جەستەییـەوە.

لـە ڕووی مەعنـەوییشــەوە: هـەر شــتێك نــاوی خــوای لەســەر نـەهێنرابـێ، دیـارە ناخـورێ، وەك دواییش بە تەفصیلێ باسی دەکـەین، چونکە نـاوی خـوا لەسـەر خـواردن هێنان، بەرەکـەتی تێـدەخات، بـا ئێمـە نـەشزانین چۆنــە؟ کـە ئـەوەش وەك دوایـی باسـی دەکەین، ئێستا لە ڕووی زانستیشەوە دەرکـەوتوە، کـە گۆشـت، یـان خـواردن بەگشـتی بـە

بەسەردا خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان، یاخود ناوی خوا لەسەر هێنان، گۆڕانێکی کیمیاویی بەسەردا دێو، زانستی تازە ئەوەی دۆزیوەتەوەو ئاشکرای کردوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾، وە زۆرێکیان واتە: لە بێبڕوایان، بە ئارەزووی خۆیانو بەبێ زانیاریی خەڵك لە ڕێ لادەدەن.

ئنجا بەهۆی ئەوەوە کە خواردنی پیسیان پێ دەخۆن، یان شتی حەرامیان بۆ حەلاڵ دەکەن، یاخود چاکەیان لە پێش چاو ناشیرین دەکەن، یان خراپەیان لە پێش چاو جوان دەکەن، گرنگ ئەوەیە بە ئارەزووی خۆیانو بەبێ ئەوەی کە زانیارییان هەبێ، خەڵك لە ڕێ لادەدەن، ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ﴾، بێگومان پەروەردگارت زاناترە بە لە ڕێ دەرچووانو بە سنوورشکێنان.

ئنجا خوا بەو بۆنەوە کە نابێ لە شتێك بخورێ، کە خوا قەدەغەی کردوە، وە بە پێچەوانەشەوە: شتێك کە خوا حەلاڵی کردوە، نابێ پارێزی لێ بکرێ، هەر لەبەرئەوەی پێچەوانەی باوو نەریتێکی نەفامانەیە، دەفەرموێ: ﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ﴾، وە دەست هەڵبگرن لە گوناهی ئاشکراو پەنهان، مانایەکەی ڕۆشنە، واتە: ئەو گوناهانەی کە بە ئاشکرا دەکرێن، بە ئەندامە ڕواڵەتییەکان، وە ئەو گوناهانەی کە بە پەنهانیی دەکرێن، لە دەروونی خۆتاندا، وەك: گومانی خراپ، حەسوودیی، ڕقو کین، خۆ بەگەورە زانین، ڕووپامایی، ئەو شتانەی کە بە دەروون دەکرێنو کەس هەستیان پێ ناکات.

یاخود: ئەو گوناهانەی کە لەبەرچاوی خەڵك دەکرێن بە ئاشکرا، وە ئەو گوناهانەی کە بە پەنامەکیی دەکرێن، خەڵك ئاگای لێیان نیە، دەست لەوانە لە هەموویان هەڵبگرن، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُواْ يَقْتَرِفُونَ﴾، بێگومان ئەوانەی گوناح بەدەست دێنن، سزا دەدرێن بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، واتە: لەمەودوا لە قیامەت سزاکەیان وەردەگرنەوە، بگرە لە دنیاشدا، بەڵام کەسێك کە گوناحو تاوان دەکات، مەرج نیە هەمیشە سزا دنیاییەکەی شتێکی بەرهەست (محسوس) بێ، ئەگەرنا مرۆڤ ئازادیی یەکەی دەکەوێتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە دەکەوێتە حاڵەتی جەبرەوە!

ئنجا دووبارە دێتەوە سەر هەمان بابەتو دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ﴾، وە لەوە مەخۆن كە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە، وە ئەوە لە ڕێ دەرچوونە، واتە لە ڕێ دەرچوونە لە گۆشتێك بخۆن، كە ناوی خوای لەسەر نەهێنرابێ، كە مەبەست پێی مردارە، وە هەندێكیش دەڵێن: بەڵكو هەر ئاژەڵێك كە سەر دەبڕدرێ، ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنرابێ، هەر نابێ لێی بخۆی، با مسوڵمانیش سەری بڕیبێ، وە هەندێكیش دەڵێن: مەبەست لەم ڕستە موبارەكە ئەوەیە كە لەوە مەخۆن كە ناوی جگە لە خوای لەسەر هاتوە، واتە: بۆ جگە لە خوا، سەر بڕاوە، كە دیارە ئەوە لە هەموو حاڵاندا هەر قەدەغەو حەرامە، بەڵام ئەوەی دیكە ڕاجیایی زانایانی تێدایە، وەك دوایی باسی دەكەین، كە ئەگەر ئاژەڵێك مسوڵمان سەریببڕێو، ناوی خوای لەسەر نەهێنێ، ئایا حەرام دەبێ ؟ هەندێك دەڵێن: بەڵێ، هەندێكیش دەڵێن: نەخێر، دوای باسی وردەكارییەكەی دەكەین، وە باسی بەڵگەكانی هەردووك لاشیان دەكەین.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ﴾، وە بێگومان شەیتانەكان وەسوەسە دەكەن بۆ دۆستەكانی خۆیان، تاكو شەڕە قسەتان لەگەڵ بكەن، ﴿ لَيُوحُونَ ﴾، واتە: بە پەنامەكیی خوتخوتەیان دەخەنە دڵەوە، ﴿ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ﴾، واتە: كافرەكان كە دۆستی شەیتانەكانن، وەك چۆن ئیمانداران دۆستی مەلائیكەتانن، شەیتانەكانیش خوتخوتە دەخەنە دڵی دۆستەكانی خۆیان، كە كافرەكانو هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانن، تاكو موناقەشەتان لەگەڵ دا بكەن، لەبارەی خواردنی گۆشتی مردار، یان بۆ جگە لە خوا سەربڕاوەوە.

ئەم ئایەتە موبارەكە ئەوەی لێوەردەگیرێ، كە زۆر بیرۆكەو فیكرەی خراپ، كە لە دڵو عەقڵی مرۆڤی كافرو بێبڕوادا پەیدا دەبن، بەهۆی خوتخوتەو دنەدانو فێركردنی شەیتانەكانەوەیە، هەروەك زۆر بیرۆكەو نیازی باشو پەسند، كە لە دڵی مرۆڤی بڕواداری پارێزكاردا پەیدا دەبن، بەهۆی فریشتانەوەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ

ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ فصلت، ﴿ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ﴾، تاکو بەو شتانە کە شەیتانەکان فێریان کردوون، موناقەشەو شەڕەقسە لەگەڵ ئێوەدا بکەن، ئەیش ئەوەیە، کە گوتیان: چۆن ئاژەڵێك کە بۆخۆتان دەیکوژن، گۆشتەکەی دەخۆن، بەڵام ئاژەڵێك کە خوا کوشتوویەتی، (واتە: مردارە) لێی ناخۆن؟! خواش مسوڵمانان ئاگادار دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾، وە ئەگەر فەرمانبەرییان بکەنو بە قسەیان بکەن، بێگومان ئێوە هاوبەش بۆ خوا دانەرن، کە دوایی باسی دەکەین، ئەمە چۆنە؟ ئایا لە هەر شتێکدا مسوڵمان بە قسەی کافر بکات، یەکسەر دەبێتە هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافر دەبێو لە دین دەردەچێ ؟ کە بێگومان لە هەموو حاڵەندا وانیە.

ئنجا خوای کاربەجێ دوو وێنە دێنێتەوە، بۆ حاڵەتی مرۆڤی ئیماندارو حاڵەتی مرۆڤی بێ ئیمانو، دەفەرموێ: ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ﴾، ئایا کەسێك کە مردوو بووەو زیندوومان کردۆتەوەو ڕووناکییەکمان پێداوە، کە لە نێو خەڵکیدا پێی دەڕوات، وەبەر پێی خۆی پێ دەبینێو ڕێی پێ دەر دەکات، وەك وێنەی ئەو کەسە وایە کە لە تاریکییاندا نقوم بووەو، لێشیان دەرباز نابێو، ڕێی دەربازبوونیشی نیە ؟! بە تەئکید نەخێر، کە ئەوەی یەکەمیان مرۆڤی ئیماندارە، ئەوەی دووەمیشیان مرۆڤی بێ ئیمانە، ﴿ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ئەو کردەوە خراپانەی کە دەیانکەن، بۆ کافران ڕازێنراونەوە، واتە: ڕازاوەو جوان نین، بەڵام بۆیان جوانکراون، وەك پێشتریش گوتم : مرۆڤ وەختێك لەسەر شتێك بەردەوام دەبێ، خێربێ، یان شەڕبێ، شیرنایەتیی ئەو شتەی دەچێتە دڵو دەبێتە بەشێك لە دەروونییو، بەشێك لە کەسایەتی، وە دوایی بە زەحمەت نەبێ ناتوانێ دەستبەرداری بێ، چاك بێ، یان خراپ بێ.

ئنجا خوا باسی یاسایەکی خۆیمان بۆ دەکات بەو بۆنەوە کە دیارە کافرەکان ئەوەیان ڕەواج پێدەدا، کە تەماشا بکەن ! مسوڵمانان لە شتێك کە خوا ژیانی

لێستاندۆتەوە (کە مردارە) ناخۆن، بەلام شتێك کە خۆیان ژیانی لێ دەستێننەوەو خۆیان سەری دەبڕن، یان ڕاوی دەکەن، لێی دەخۆن؟! دیارە لەوبارەوە بانگەشەو پڕوپاگەندەی زۆریان کردوە دژی مسوڵمانان، ئەوەش جۆرێك لە پیلانگێڕیی بووە بۆئەوەی مسوڵمانان لە دینەکەیان، لە شەریعەتی خوا بکەونە گومانەوە، بۆیە خوا باسی یاسایەکی خۆیمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾، واتە: هەر بەو شێوەیە کە کافرەکانی ڕۆژگاری تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ پیلانگێڕیی دەکەن، وە جەنگی دەروونییو فیکریی لەگەڵ ئیمانداراندا دەکەن، دەیانەوێ شتە خراپەکانی خۆیان جوان بکەن، لەپێشچاوی مسوڵمانان، وە شتە باشەکانی کە خوا ﷻ بە حەڵاڵی داناونو باشن، ناشیرین بکەنو نیشانەی پرسیاریان بخەنە سەر، وەك چۆن لە سەردەمی تۆدا زلە زلەکانی قوڕەیش کە کافرەکانن، ئەو پیلانگێڕییە دەکەن، ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، واتە: پێشتریش هەر وابووە، ﴿ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ ﴾، لە هەر شارو ئاوەدانییەکدا {پێشتریش باسمان کردوە، کە وشەی: ﴿ قَرْيَةٍ ﴾، لە زمانی عەرەبییدا بە مانای شاری گەورە، یان وڵات، یان ئاوەدانییەکی گەورە دێ، نەك بەو واتا باوەی ئێستا، کە بە گوندو لادێو شوێنێك کە دانیشتوانی کەم بن، دەگوترێ، لە زمانی قورئانو بەکارهێنانی قورئاندا ﴿ قَرْيَةٍ ﴾، واتە: (المَدِينة الكَبيرَة) شارێکی گەورە، مەککە چونکە زۆر قەڵەباڵغ بووەو لە هەر چوار لای دنیاوە خەڵك بۆی هاتوە، پێی گوتراوە: (أُمّ القُرَى) دایکی شارەکان، دایکی ئاوەدانییەکان}، ئێمە تاوانبارەکانمان کردۆتە سەرۆكو قسەڕۆیشتوو باڵادەست، ﴿ لِيَمْكُرُوا فِيهَا ﴾، تاکو پیلانگێڕیی تێدا بکەن، ﴿ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ ﴾، وە ئەو پیلانگێڕییەش هەر لە دژی خۆیانەو، بە زەرەری خۆیان تەواو دەبێ، ﴿ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾، بەڵام هەست ناکەن.

یەکێك بۆی هەیە لێرەدا بپرسێ:

ئایا خـوا تاوانبارەکانی کردۆتـە قسـەڕۆیشتوو باڵادەسـت لـە شـارو ئاوەدانیـیەکاندا، بۆئەوەی پیلانـگێڕیی بکەن؟ جاری دیکەش وەڵامی ئەو پرسیارەمان داوەتەوە، کە لێرەدا خوا ﷻ باسی یاسـاو سوننـەتێکی خۆی دەکات، واتە: بە پێی ویستی ڕەهای خـوا، وە بـە پێی ئەو یاسایانەی خوا دایناون لە ژیانی مرۆڤدا، لە هەر ئاوەدانییەکدا، خراپـەکارەکان هەوڵدەدەن باڵادەست بن، حوکمڕان بن، ئەمرو نـەهییـان بەدەست بـێ‌و، قسـە ڕۆیشـتوو بن، وە خەڵك بخەنـە ژێر ڕکێفی خۆیانـەوە، وە سـەرەنجام پیلانـگێڕیی تێدا بکـەن.

بۆیـەش لێرەدا خـوای زانـاو تـوانـا ئـەوە پاڵدەداتە لای خۆی، چونکە بـە پێی یاسـای خـوا، وا بووە، وە بە پێی ویستی ڕەهای خـوای بـەرزو مـەزن وابـووەو، ئەگـەر ویستبای وانـەبێ، وانـەدەبوو، وە بەپێی ئەو یاسایانـەی کـە خـوای باڵادەسـت دایناون، لـە شـارو ئاوەدانییـەکاندا، وەختێـك خەڵـك بـێ هەڵوێسـت دەبـێ‌و، بـە دوای خراپـەکارەکان دەکـەوێ‌و، خراپـەکارەکانیش دەوریـان قەڵـەباڵغ دەبـێ‌و، دەسـت ڕۆیشـتوو دەبـن، سـەرەنجام ئـەو شـارو ئاوەدانییـە دەخەنـە ژێـر ڕکێـفو هەیمەنـەی خۆیانـەوەو، پیلانگێـڕیی‌و خراپـەکاریی تێدا دەکـەن.

ئنجـا خـوا باسـی هەڵوێسـتی کۆمەڵێـك لـە کـافرە خـۆ بەزلگـرەکـان دەکـات، لـە بەرانبـەر پێغـەمبەرانی خـوادا (علـیهم الصـلاة والسـلام) وە لـە بەرانبـەر ئاییـن‌و بەرنامـەی کۆتـایی خـوادا کـە بـە پێغـەمبـەری خاتەمـدا ﷺ نێـرداوە، دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِ ﴾، وە هـەر کات بەڵگەو موعجیزەیـەکیان بۆبـێ دەڵێن: هەرگیز ئیمانی پـێ نـاهێنین، تـاکو ئـەوەی بە پێغـەمبەرانی خـوا دراوە، بە ئێمەش نـەدرێ.

واتـە: دەبـێ ئێمـەش خـوا وەحـی‌و پـەیاممان بـۆ بنێـرێ ! خـوا دەفـەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾، خـوا زاناترە پەیامی خـۆی بـە کـێ دەسپێرێ‌و کـێ شـایستەیــە، ﴿ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ ﴾، لەمەودوا ئەوانـەی تاوان دەکـەن زەبوونییان لە لایـەن خـواوە تـووش دەبـێ، وە سزایـەکی توندیان تـووش دەبـێ، بەهـۆی ئـەو پیلانـگێڕییـەوە کـە دەیکـەن،

واتە: کە وایانگوتوە وەنەبێ قەناعەتیان وا بووبێ، بەڵکو ئەوە پیلانێك بووە، بۆئەوەی خەڵك هەڵخەڵەتێننو، بە خەڵکە سادەکە بڵێن: ئەدی فلان کەس کە گەورەی ئێمەیە، بۆچی خوا پەیامی بۆ نەناردوە، ئەگەر ڕاست بووایە خوا پێغەمبەری ناردبایە، دەبوو فلان کەسی کردبایە پێغەمبەر کە گەورەی ئێمەیە، (وەلیدی کوڕی موغیرە، ئەبو جەهل، ئەبو سوفیان) خەڵکە سادەکەیان بەو قسانە هەڵدەخەڵەتاند، واتە: ئەوە جۆرێك بووە لە پیلانگێڕیی کە خەڵکە سادەکە، خەڵکە ڕەشو ڕووتەکە، هەڵخەڵەتێنن، ئەگەرنا مەبەستیان ئەوە نەبووە، خوا وەحییان بۆ بنێرێو، زانیویانە شایستەی ئەوە نین، یان هەر بڕوایان بە هاتنی وەحی نەبووە !

ئنجا خوای کاربەجێ جارێکی دیکە دوو وێنە دێنێتەوە، یاخود حاڵەتی ئینسانی ئیماندارو ئینسانی بێ ئیمان، هەردووکیان لە دوو وێنەی بەرجەستەکراودا، وێنا دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ﴾، هەر کەسێك خوا بیەوێ ڕێنمایی بکات، سینەو دڵی بۆ ئیسلام، (واتە: ئەو ئیسلامەی کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە، یاخود ئیسلام بە مانای گەردنکەچیی بۆ خوا، کە لێرە ئەم مانایەیان بەهێزترە)، گوشاد دەکات، گەردنکەچیی بۆ خوا ئەوەیە کە ئیمان بەو ئیسلامە بێنن، بەو قورئانو سوننەتە بێنن، کە بۆ پێغەمبەری خاتەم هاتوون، ﴿ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ ﴾، وە هەر کەسێك خوا بیەوێ گومڕای بکات، ﴿ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾، سینەی تەنگو سەغڵەت دەکات، وەك بەرەو ئاسمان سەرکەوێ، کەسێك کە بەرەو ئاسمان سەرکەوێ تووشی تەنگە نەفەسییو تووشی دڵ سەغڵەتیی دێ، خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ئاوا ئەو کەسەی کە بمانەوێ گومڕای بکەین، دڵی سەغڵەت دەکەین، لە بەرانبەر دینی خۆماندا، سینەی تەنگ دەکەین، کە ڕێی نەبێ، ئەو دینە، ئەو هیدایەتە بچێتە نێو دڵی، ﴿ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەمە وەڵامی پرسیارێکە، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا خوا بۆچی وا لەو کافرانە دەکات، دەبا سینەیان نەهێنێتەوە یەكو دڵیان سەغڵەتو تەنگ نەکات، تاکو هیدایەتی تێبچێ ؟!

خوا وەڵام دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە: ﴿ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، خوا سزاو نەفرینو کوفرو پیسیی، بۆ ئەوانە تەرخان دەکات، کە ئیمان ناهێنن، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە نایانەوێ ئیمان بێنن، ئەو حاڵەتە دەروونیەیان بۆ دروست دەبێ.

ئەوانی دیکەش لەبەرئەوەی دڵو سینەی خۆیان بۆ ئیسلام دەکەنەوەو، ڕووی خۆیان بەرەو خوا وەردەچەرخێنن، بۆیە لە بەرەکەتی ئەوەدا، خوای پەروەردگاریش ڕێنماییان دەکاتو سینەیان گوشاد دەکات، ئەگەرنا خوا زوڵم لە کەس ناکات، وە خوای کاربەجێ بە گۆترە مامەڵە لەگەڵ بەندەکانی دا ناکات، کاری خوا گۆترەکاریی تێدا نیەو، خوا کاربەجێیە.

لە کۆتایی دا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗا ﴾، ئا ئەمە ڕێبازی پەروەردگارتە ڕاستە، ئەمە (هذا): مەبەست پێی ئیسلامە، یان مەبەست پێی ئەم قورئانەیە، یان: ئەم شێوە مامەڵەکردنەی خوا لەگەڵ بەندەکانی دا، کە هەر کەسێك بەرەو خوا جووڵە بکات، خوا هیدایەتی دەدات، وە هەر کەسێك پشت لە خوا بکات، خوا سینەی وێك دێنێتەوە، لە بەرانبەر دینی خۆیدا، ئا ئەوە ڕاستە شەقامی خوایە، ﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴾، بێگومان ئایەتەکانی خۆمان ڕۆشن کردوونەوە بۆ کەسانێك کە بیانەوێ پەند وەربگرنو بیر بکەنەوە، ﴿ لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡ ﴾، ئەوانە مەنزڵگای ئاشتییان هەیە لەلایەن پەروەردگاریانەوە، کە مەبەست بەهەشتە، ﴿ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، وە خوا سەرپەرشتیاریانە بەهۆی کردەوەکانیانەوە، واتە: خوا بە گۆترە سەرپەرشتییان ناکاتو مشووریان لێ ناخوات، بەڵکو کردەوەی باشیان هەنو، بەرەو خوا حەرەکاتیان کردوە، ئیدی لە ئێمە حەرەکەتو لە خوای بە بەزەیی بەرەکەت، بۆیە خوای بەخشەر بۆخۆی سەرپەرشتیی کردوونو مشووری لێ خواردوون.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾، دەجا بخۆن لەوەی ناوی خوای لەسەر هاتوە، ئەگەر بڕواداران بە ئایەتەکانی خوا.

لەم ئایەتە دەردەکەوێ، هەروەها لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشی کە باسمان کرد، کە مسوڵمانان فشارێکی زۆریان لەسەر بووە، فشارێکی فیکریی، دەروونیی، بەهۆی ئەو کلتوورو فەرهەنگو عادەتو نەریتەوە، کە باو بووە لە نێو کۆمەڵگای خۆیاندا، بەتایبەت لە ڕووی خواردنی سەربڕاوو نەخواردنی مردارەوەبووەوە، یاخود ئەوەی کە بۆ بتو صەنەمەکان سەریان بڕیوە، کە مسوڵمانان لێیان نەخواردوە، کافرەکان لەوبارەوە مناقەشەیان لەگەڵدا کردوون، بۆیە خوای قسەلەجێ بەم شێوەیە دەفەرموێ: ﴿فَكُلُواْ﴾، بخۆن لەوەی کە ناوی خوای لەسەر هاتوە، ئەگەر بە ئایەتەکانی خوا ئیمانداری.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾، ئەگەر بە ئایەتەکانی خوا بڕوادارن، واتە: ئەگەر ئیمانداربن، دەبێ پابەند بن بە حەڵاڵو حەرامی خواوە، کەواتە: بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان ئیمانی هەیە، پابەندی شەریعەتی خوا دەبێ، پابەندی حەڵاڵو حەرامی خوا دەبێ، وە هەر کەسێك لە حەڵاڵو حەرامی خوا، لە ئەمرو نەهی خوا، لە شەریعەتی خوا لابدات، نیشانەی پرسیار دەکەوێتە سەر ئیمانەکەی، تۆ چ ئیمانداریێکی ! ئەگەر بە قسەی پەروەردگاری خۆتو، بە قسەی پەرستراوی خۆتو، بە قسەی خاوەنو گەورەی خۆت نەکەی، کە خوای بەدیهێنەرە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ

﴿ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، لێرەدا خوا بە جۆرێك لە سەرکۆنەکردنو سەرسوڕمانو سەرزەنشتەوە بە ئیمانداران دەفەرموێ:

﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴾، چیتانەو چ شتێك ڕێی لێگرتوون، چ شتێك واتان لێ دەکات، کە لەوە نەخۆن، کە ناوی خوای لەسەر هاتوە، لە کاتی سەربڕیندا، با بۆخۆشتان سەرتان نەبڕیبێ ؟

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ ﴾، بە دڵنیایی یەوە خوا ئەوەی بۆ ڕوونکردوونەوە، کە لێی قەدەغە کردوون،و، خاڵی بۆ خستوونەتە سەر پیت، ﴿ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ﴾، مەگەر ئەوەی بۆی ناچار دەکرێن، ئەوەی کە بۆی ناچار دەکرێن، با حەرامیش کرابێ لە ئەسڵدا، بەڵام بۆ بابای ناچارو تێگیراو، ڕەوایە، کە بایی ئەوەندەی پێی لە مەرگ ڕزگاربێ، لێی بخوات.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، وە زۆرێك لەوان بە ئارەزووەکانیان و بە نەزانیی، خەڵك گومڕا دەکەن، واتە: زۆرێك لە کافرەکان، بۆچی نافەرموێ: هەموویان؟ چونکە هەیان بووە دوایی ئیمانی هێناوە، وە هەیانبووە زانیویەتی، بەڵێ هەیانبووە زانیاریی هەبووە، بەڵام زانیویەتی : بەرژەوەندیی لەگەڵ ئەو هەقەدا نییە کە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دا، نێردراوە، ئەگەر بێ و بەدوای موحەممەدی ڕاستو دادگەر ﷺ بکەوێ، بەرژەوەندییەکەی لێ تێکدەچێ، چونکە ناتوانێ چەوت بڕواتو ستەم بکات، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، بێگومان پەروەردگارت زاناترە بە سنوور شکێنان، ئنجا هەمیشە خوای کاربەجێ عادەتی وایە لە قورئاندا، کە ئەو شتانەی کەمن دیارییان دەکاتو، ئەو شتانەی زۆرن، دەمێننەوەو سەرژمێریان ناکات، هەمیشە خوا شتە کەمەکان سەرژمێر دەکات، لەبەرئەوەی هەمیشە قەدەغەکراوەکان کەمترن، خوای بە بەزەیی ئەو شتانەی کە قەدەغەی کردوون سەرژمێرو دیاریی کردوون، واتە: جگە لەوان هەمووی حەڵاڵە، بۆ وێنە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ ...﴿٢٣﴾ ﴾ النساء، خوا ﷻ چواردە جۆر لە ئافرەتان سەرژمێر دەكات، دەفەرموێ: ئا ئەو ئافرەتانەتان لێ قەدەغەن: (دایكانتان، خوشكانتان، كچانتان ... ) كەواتە: جگە لەو چواردە جۆرە، هەرچی دەمێنێتەوە لە ئافرەتان، حەڵاڵە كە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بكەن، لەبەرئەوەی كە قەدەغەكراوەكان كەمن، چواردەن، ژمێردراون، بەڵام ئەوانی دیكە سەرژمێر ناكرێن، چونكە زۆر زۆرن.

هەروەها دەربارەی ئەو شتانەش كە قەدەغەن لە خواردنەكان، خوای كاربەجێ، دەفەرموێ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ۚ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ...﴿٣﴾ ﴾ المائدة، كە یازدە جۆرە گۆشتن، ئەو یازدە جۆرەش دەچنە نێو چوار جۆرەوە: مردارو، خوێن، گۆشتی بەرازو سەربڕوا بۆ جگە لە خوا، وەك لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ ﴾ واتە: بێگومان تەنیا مردارو خوێن و گۆشتی بەرازو سەربڕاو بۆ جگە لە خواتان لێ قەدەغە كراوە، هەمیشە خوای كاربەجێ ئەو شتانەی كەمن سەرژمێرو دیارییان دەكات، ئنجا بۆیەش حەرامەكان كەمترن، چونكە خوا كەون و كائیناتی بۆ ئینسانان دروست كردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة، یان ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٦٥﴾ ﴾ الحج، بۆیە خوای پەروەردگار هەمیشە ئەو شتانەی كە قەدەغەن، سەرژمێریان دەكات، بۆئەوەی دوایی جگە لەوانە، هەرچی مایەوە، حەڵاڵ بێ، چونكە ئەسڵ لە شتەكاندا ڕەواییەو، ئەسڵ لە شتەكاندا پاكێتییە: (الأَصْلُ فِي الأَشْيَاءِ الإِبَاحَةُ)و

(الأَصْلُ فِي الأَشْيَاءِ الطَّهَارَةِ)، کەواتە: دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر پیسیی‌و قەدەغە بوون‌و ڕێ لێگیران، ئەوەم بۆیە ڕوون کردەوە، چونکە زۆر کەس هەمیشە دەیەوێ بازنەی قەدەغەکراوەکان فراوان بکات، لەسەر حیسابی حەڵاڵەکان‌و ڕێ پێدراوەکان، کە ئەوە پێچەوانەی ڕووحی شەریعەتە، کە شەریعەت هەمیشە قەدەغەکراوەکان سەرژمێر دەکات، تاکو دوایی هەرچی دەمێنێتەوە، بزانین کە ڕەوا حەڵاڵە.

**مەسەلەی سێیەم**: خوا ﷻ ڕوو لە ئیمانداران دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ ﴾،
خوا دەفەرموێ: وە واز لە گوناهی ئاشکراو پەنهان بێنن، بێگومان ئەوانەی کە گوناح وەدەست دێنن، لەمەودوا سزای ئەوەی کە ئەنجامیان دەدا، دەیاندرێتەوە.

وشەی (ذر) یانی: (دَع) واتە: وازی لێ بێنە، لێی گەڕێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓۚ﴾، مانای وانیە کە ئیمانداران دەستیان لە گوناهی پەنهان‌و ئاشکرادا بووە، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە: وەك چۆن نەتانکردوە، گوناح هەر مەکەن، چونکە واز لێهێنان دوو حاڵەتی هەیە: یان ئەوەیە ئینسان دەستی لە ئیشەکەدایەو وازی لێ دێنێ، یان هەر لە سەرەتاوە نەیکردووەو لێیگەڕاوە، یانی: مادام لێیگەڕاوی، هەر ئاوا لێیگەڕێ.

توێژەرەوانی قورئان دەربارەی گوناهی ئاشکراو پەنهان، ـ وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا ـ زۆر شتیان گوتوە، بەڵام من پێموایە لەو دوو خاڵەدا کورت‌و پوخت دەبێتەوە:

١) ئەو گوناهانەی کە ئاشکران، ئەوانەن کە ئینسان بە ئەندامە ڕواڵەتییەکانی دەیانکات: بە دەست‌و زمان‌و پێ‌و چاوو... هتد، وە گوناهی پەنهان، ئەوانەن کە ئینسان بە ئەندامە دەروونییەکانی دەیانکات: بە دڵ‌و بە عەقڵ‌و بە فیکرو خەیاڵ‌و ئەندێشە.

٢) گوناهی ئاشکرا ئەوانەن، کە ئینسان لە نێو خەڵکیدا ئەنجامیان دەدات، واتە: کە خەڵك ئاگای لێیە، گوناهی پەنهانیش ئەوەیە کە لە کاتێکدا ئینسان ئەو

گوناهە دەكات، كەسی لێ نیەو بە پەنهانیی دەیكات، واتە: كاتێك كە خەڵك ئاگای لێ نیە.

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموودەیەكی هەیە دەفەرموێ: ﴿البِرُّ: حُسْنُ الخُلُقِ، وَالإِثْمُ: مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ، وَكَرِهْتَ أنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ﴾[1]، واتە: چاكەكاریی (دینداریی) بریتیە لە ڕەوشتی جوان، گوناهیش شتێكە لە دڵتدا دێتو دەچێ، {واتە: پێی ئاسوودە نیو پێی مورتاح نی}، وە پێشت ناخۆشە خەڵك پێی بزانێ.

ئنجا ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە كە گوناهە پەنهانەكان، بنكو ڕەگو ڕیشەی گوناهە ئاشكراكانن، هەروەك چاكە پەنهانەكان، بنكو ڕەگو ڕیشەی چاكە ئاشكراكانن، ئیمان پەنهانەو لە دڵو عەقڵی ئینساندایە، وە ئەگەر ئینسان ئیمانی نەبێ، كردەوەی باشی نابێ، بۆیە هەمیشە خوا ئیمان پێش كردەوە دەخاتو دەفەرموێ: ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، هەروەها بە پێچەوانەشەوە، كوفر پەنهانە، بەلام تاوانو لادانو گوناح ئاشكرایە، چونكە ئەهلی كوفر، فەرق بە حەلاڵو حەرامو، چاكەو خراپە ناكەن، وە شوێن ئارەزووەكانیان دەكەون، كەواتە: كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ﴾، هەرچەندە گوناهی ئاشكرا ﴿ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ﴾، پێش پەنهان (باطن)ەكەی خراوە، بەلام لەبەر ئەوە نیە، كە گرنگترە، لە ڕاستییدا (بَاطِنُ الإِثْم) گوناهی پەنهان لە (ظاهر الإِثْم) گوناهی ئاشكرا گرنگترەو، ئەگەر ئینسان واز لە گوناهە پەنهانەكان بێنێ، ئاشكراكانی پێشتر لەكۆڵ دەكەون، هەروەك چۆن ئەگەر چاكەی پەنهانو بكات ئیمانی هەبێ، كردەوەی باشیشی دەبێ، ئەگەر ترسی لە دڵدا هەبێ بەرانبەر بە خوا، شەرمی هەبێ، خۆشەویستیی هەبێ، ڕێزی هەبێ، بە گەورەگرتنی هەبێ، لە دڵدا بەرانبەر بە خوا، بێگومان ئەو كاتە ملكەچییشی بۆ خوا دەبێ، تاعەتو

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٦٦٨)، وَالبُخَارِيُّ في "الأدب المفرد" برقم: (٢٩٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٥٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٨٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٢١٧٢) عَنْ النَّوَاسِ بنِ سَمْعَان رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

فەرمانبەرییشی دەبێ، وە بە پێچەوانەشەوە: ئینسان هەتا گیرۆدە نەبێ بە نەخۆشییە دەروونییەکانەوە، گیرۆدە نابێ بە گوناهە ئاشکراکانەوە، بۆ وێنە: کەسێك کە لادانی هەیە لە بواری مامەڵە لەگەڵ خەڵکداو، غەیبەتیان دەکاو، هەوڵدەدا بیانشکێنێو، نارەحەتیان دەکاو، هەقی خەڵکی بەلادا دێ، لەبەر ئەوەیە کە حەسەدو بوغزو غەرەزوو کینە، لە دڵو دەروونیدا هەیە بەرانبەریانو ئەوە پاڵی پێوە دەنێ، کە زیانیان پێ بگەیەنێ، بە دەست بێ، بە زمان بێ، بە هەر شێوەیەك بۆی بگونجێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾، وە لەوە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە، وە ئەمە لە رێ دەرچوونە، وە شەیتانەکان خوتخوتە دەکەنو پەیامی پەنامەکیی دەنێرن بۆ دۆستەکانی خۆیان، تاکو شەرە قسەتان لەگەڵدا بکەن، وە ئەگەر فەرمانبەرییان بکەن، ئێوە دەبن بە هاوبەش (بۆ خوا) دانەر.

واتە: ئەگەر فەرمانبەرییان بکەن، لە بە حەڵاڵ دانانی حەرامو بە حەرام دانانی حەڵاڵ داو، لەو بوارەدا شوێنیان بکەون، ئەوە هەمان حوکمی ئەوانتان دەبێو بە هاوبەشدانەر دادەنرێن .

# باسێك لە بارەی (بسم الله) كردنەوە لە كاتی خواردن و سەربڕین دا

ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە موبارەكەدا، باسێك دەكەین دەربارەی (بسم الله) كردن لە كاتی خواردندا، وە لە كاتی سەربڕیندا، كە دیارە ئەدەبێكی ئیسلامییە، ئینسان لە كاتی خواردن و خواردنەوەدا، بەڵكو لە سەرەتای هەر كارێكی گرنگ دا، كە پێی هەڵدەستێ (بسم الله) بكات، ناوی خوا بێنێ، دیارە ئێمە لە پێنج خاڵان دا ئەو بابەتە دەتوێژینەوەو سەرەتاش دەچینە سەر خاڵی یەكەم:

## خاڵی یەكەم: چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (بسم الله) كردن لەسەر خواردن:

١) ﴿عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا غُلاَمُ سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ﴾[١]، واتە: عومەری كوڕی ئەبی سەلەمە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوتم: ئەی ڕۆڵە! ناوی خوا بێنە، وە بە دەستی ڕاستت بخۆ، وە لەپێش خۆشتەوە بخۆ.

٢) هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرْ اسْمَ اللهِ تَعَالَى، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يذكر اسم الله تعالى فِي أَوَّلِهِ، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ}[٢]، واتە: ئەگەر یەكێكتان خواردنی خوارد، با ناوی خوای بەرزی لەسەر بێنێ لە سەرەتاوە، ئەگەر لەبیری چوو لە

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٣٧٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٠٦١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٢٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٦٧)، وَالنَّسَائِيُّ في "الكبرى" برقم: (٦٧٥٩).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٣٣٥)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٣٧٦٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٥٨)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٠٨٧) وَقَالَ: صَحِيح وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٢١٤) قَالَ شُعَيْب الأَرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

سەرەتاوە (بسم الله) بکات، با دوایی هەر کاتێك بیری کەوتەوە، (واتە: ئەگەر لە میانی نان خواردنەکەیدا، بیری کەوتەوە) با بڵێ: بە ناوی خوا لە سەرەتاوەو لە کۆتاییەوە.

٣) هەروەها لەوبارەوە کە لە ئەنجامی (بسم الله) کردن دا بەرەکەت دەکەوێتە خواردنەکەوەو دەستی شەیتانەکان لێ دەبردرێ، ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ الله عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَأْكُلُ فِي سِتَّةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ جَائِعٌ فَأَكَلَهُ بِلُقْمَتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَمَا إِنَّهُ لَوْ ذَكَرَ اسْمَ اللَّهِ لَكَفَاكُمْ﴾[1]، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ شەش لە هاوەڵانی دا خواردنیان خوارد، پیاوێکی خێڵەکیی هات، بە دوو پاروان هەمووی خەلاس کرد "دیارە دەبێ دوو پارووی گەورەی لێدابێ"، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ناوی خوای لەسەر هێنابایە بەشی هەمووتانی دەکرد.

بەڵام دیارە (بسم الله)ی لێ نەکراوە، کە ئەو دەستی گەیاندۆتێ، شەیتانیش دەستی لەگەڵ بردووە بەرەکەتی تێدا نەماوە.

## خاڵی دووەم: مانای: ناوی خوا لەسەر خواردنو سەربڕاو، نەهێنان:

کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ﴿١٢١﴾﴾، وە لەوە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە، {واتە: (بسم الله)ی لێ نەکراوە} وە ئەوە لە ڕێ دەرچوونە.

زانایان بە چەند جۆرێك لێکیان داوەتەوە:

یەکەم: ئەو ژیاندارە کە بە ناوی جگە لە خواوە سەربڕاوە، واتە: ناوی جگە لە خوای لەسەر هاتوە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ:

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦١٣١)، وَاللَّفْظُ لَهُ، قَالَ شعيب الأرنؤوط: حَسَنٌ بشَوَاهِدِه، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٥٨)، تعليق الألباني: صحيح.

﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمًا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ ﴾،

واتە: تۆ بڵێ: "ئەی موحەممەد ﷺ" لەوەدا کە بە وەحی بۆم نێردراوە، نابینم شتێك لەسەر هیچ بخۆرێك قەدەغە کرا بێ، مەگەر مردار بێ، یا خوێنێکی ڕژێنراو بێ، یان گۆشتی بەراز بێ، یا فیسقێك بێ، (واتە: ژیانداریکی سەربڕاو بێ) کە ناوی جگە لە خوای لەسەر هاتبێ.

کەواتە: (أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ)و (مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ )

لەگەڵ (أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ) یەکن: (ناوی خوای لەسەر نەهاتوە)، ئایەتی (١٢١)، {دەنگی جگە لە خوای پێ بەرز کراوەتەوە}، ئایەتی (١٤٥).

دووەم: یانی: لەوە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهاتوەو مردار بۆتەوە، چونکە مردار (میتة) دیارە ناوی خوای لەسەر نایەت، لەبەر ئەوەی خەڵك فریای ناکەوێ و چەقۆی ناگاتێ، تاکو ناوی خوای لەسەر بێنێ.

سێیەم: ئەوەی کە ناوی خوای لەسەر نەهاتوە، مەبەست ئەوەیە کە ناوی خوای لەسەر نەهێنرابێ لە کاتی سەربڕینیدا، جا چ بە ئانقەست بێ، یان بە لەبیرچوونەوە بێ، بە بەڵگەی ئایەتی ژمارە (٤)ی سووڕەتی (المائدة) دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٤﴾ ﴾، وشەی (جوارح) هەم سەگی ڕاوێ دەگرێتەوە، هەم باز دەگرێتەوە، وە هەر شتێك کە ڕاوی پێبکرێ، دەیگرێتەوە، دەفەرموێ: ئەوەی کە بۆ ئێوەیان گرتوە لێی بخۆن، بەڵام ناوی خوای لەسەر بێنن، یانی: لە کاتێکدا ئەو نێچیرگرەی ڕاوی پێدەکەی، بەرەو گرتنی نێچیرەکەی

دەنێری، ناوی خوای لەسەر بێنە، یاخود کاتێ کە سەری دەبڕی، ناوی خوای لەسەر بێنە.

هەڵبەتە من دوایی لەوبارەوە ڕای خۆم دەڵێم، بەلام جارێ دەربارەی ڕواڵەتی ڕستە قورئانییە کە دەڵێم: ئەو سێ واتایانە هەرسێکیان دەگرێتەوە، بەلام بەڵگە لەسەر ئەوە کە زیاتر مەبەست پێی ئەوەیە کە بۆ جگە لە خوا سەربڕا بێ، ئەوەیە کە خوا ناوی لێدەنێ (وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٌ)، وە لە ئایەتی (١٤٥) سووڕەتی (الأنعام)یشدا دەفەرموێ: ﴿أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ ١٤٥﴾.

شایانی باسیشە لایەنگرانی ڕای سێیەم کە دەڵێن: مەبەست لە (مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ) هەر گۆشتێکە کە (بسم الله)ی لێ نەکرابێ‌و، ڕایان وایە ئەم ئایەتە قورئانییە، ئەو جۆرەی سێیەمەش دەگرێتەوە، ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگە دێننەوە:

**فەرموودەی یەکەم:** ﴿عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: سَألْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَتَصَيَّدُ بِهذِهِ الْكِلابِ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كِلابَكَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللّهِ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَهَا كَلْبٌ مِنْ غَيْرِهَا فَلاَ تَأْكُلْ﴾[1]، واتە: عەدیی کوڕی حاتەم خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتم: ئێمە خەڵکێکین بەم سەگانە ڕاوێ دەکەین، (واتە: ئەوە چۆنەو کەنگێ نێچیرەکە بخۆین؟ کەنگێ نەیخۆین؟) فەرمووی: ئەگەر سەگەکانی خۆت کە فێری ڕاوت کردوون، ناردتن‌و ناوی خوات لەسەر هێنان {(بسم الله)ت لێکردن} لە نێچیرەکەیان بخۆ، لەوەی کە بۆتۆیان گرتوە، مەگەر سەگەکە لێی بخوات، ئەگەر سەگەکە لە نێچیرەکەی خوارد،

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَدَ برقم: (١٨٢٩٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٤٨٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٩٥٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٤٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٧٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٢٦٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٠٨).

دەترسـم بۆخـۆی گـرتبێتـی، لەبەرئـەوە لێـی مـەخۆ، هـەروەها ئەگـەر سـەگی غـەیری خۆشت بەشداریی تێدا کـرد، دیسـان لـێی مەخـۆ.

شـاهێد لێـرەدا ئەوەیـە کـە پێغـەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: ئەگـەر نـاوی خـوات لەسـەر هێنـابێ، کاتێـك کە سـەگەکـەت نـاردوە.

**فەرمـــوودەی دووەم** : دیـارە پێغـەمبەر ﷺ پرسـیاری لێکـراوە کـە بـەچ شـتێك: نێچیـر (ئـاژەڵ، یـان پەلـەوەر) سـەربـبڕدرێ؟ پێغـەمبەری خـوا ﷺ لـەوبارەوە فەرمووییـەتی: ﴿مَـا أَنْهَـرَ الـدَّمَ، وَذُكِـرَ اسْـمُ اللهِ، فَكُـلْ لَـيْسَ السِّـنَّ وَالظُّفُـرَ، وَسـاحَدِّثُكَ أَمَّـا السِّـنُّ فَعَظْـمٌ، وَأَمَّـا الظُّفُـرُ فَمُدَى الْحَبَشَـةِ﴾ (١)، واتـە: هـەر شـتێك خوێن بێنـێ (لە سـەربڕاوەکە)، وە ناوی خـواشی لەسـەر بهێنرێ، بیخۆن، جگە لـە ددانو نینـۆك، ئێستا حیکـمەتی ئـەوەتان بـۆ ڕووندەکەمـەوە: هەرچـی ددانـــە، بـە ئێسـقان لـە قەڵـەم دەدرێ، وە هەرچـی نینۆکیشـە، ئـەوە چـەقۆی حەبەشـەییـەکانـە. {(الْمُدَى: جَمْع مِدية وَهِيَ الشَّفْرَةُ الكَبِيـرَة) (مُدى) کۆی (مِدية)یـە، کـە بریتیـە لە چەقـۆی گـەورە}.

**فەرموودەی سێـیـەم:** ﴿عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ الْبَجَلِيِّ رضي الله عنه قَالَ ضَحَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ ﷺ أُضْحِيـةً ذَاتَ يَوْمٍ فَإِذَا أُنَاسٌ قَدْ ذَبَحُوا ضَحَايَاهُمْ قَبْلَ الصَّلاةِ فَلَمَّا انْصَرَفَ رَآهُـمْ النَّبِـيُّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدْ ذَبَحُوا قَبْـلَ الصَّلاةِ، فَقَـالَ: مَـنْ ذَبَـحَ قَبْـلَ الصَّـلاةِ فَلْيَذْبَحْ مَكَـانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ كَانَ لَمْ يَذْبَحْ حَتَّـى صَلَّيْنَا فَلْيَذْبَحْ عَلَـى اسْمِ اللهِ} (٢)، واتە: جونـدوبی کوڕی سـوفیانی بەجەلیـی خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: لەگـەڵ پێغـەمبەری خـوا ﷺ ڕۆژێـك قوربانییمـان سـەربڕی، ئنجـا کۆمەڵە خەڵکێك قوربانییـەکانی خۆیـان پێش نوێژ (واتە: پێش نوێژی جـەژن) سـەربڕی بـوو، کـە پێغـەمبەر ﷺ نوێژەکـەی تـەواو بـوو، تەماشـای کـرد، بینـی هەندێ کـەس قوربانیـیەکەیان سـەربڕیوە، پێش ئەوەی نوێژێ بکەن، فـەرمووی:

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٨٤٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٤٨٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٦٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٩١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٤٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣١٧٨)، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ رضي الله عنه.

٢) مُتَّفَقٌ عَلَيْه: أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٦٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٦٠).

هەر کەسێك لە پێش نوێژدا قوربانیی سەربڕیوە، با لەجێی ئەو قوربانییەکی دیکە سەربڕێ، {ئەوی دیکە بە قوربانیی لە قەڵەم نادرێ، چونکە دەبێ قوربانیی دوای نوێژ بکرێ سەربڕدرێ}، وە کەسێك کە قوربانییەکەی سەرنەبڕیوە تاکو نوێژمان نەکردوە (قوربانییەکەی خستۆتە دوای نوێژ)، با بە ناوی خوا سەری ببڕێ (واتە: ناوی خوای لێبێنێ).

**فەرمودەی چوارەم:** ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ قَوْمَاً قَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ قَوْمَاً يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ، لا نَدْرِي أَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ أَمْ لا؟ فَقَالَ: سَمُّوا عَلَيْهِ أَنْتُمْ وَكُلُوهُ، قَالَتْ وَكَانُوا حَدِيثِي عَهْدٍ بِالْكُفْرِ﴾[1]، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کۆمەڵێك خەڵك هاتن بە پێغەمبەر ﷺیان گوت: کەسانێك هەن گۆشتمان بۆ دێنن، ئێمەش نازانین ئەو گۆشتە کە کاتی خۆی سەربڕاوە، ناوی خوای لەسەر هاتوە، یان نا؟ ئەویش فەرمووی: ئێوە (بسم الله) بکەنو بیخۆن، (بۆخۆتان ناوی خوای لەسەر بێنن، لە کاتی خواردنیداو تەواو).

ئنجا عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەوانە (تازە مسوڵمان بوو بوون) واتە: لە کوفرەوە نزیك بوون، یانی: شارەزای دەستووری ئیسلامیی نەبوون).

## <u>خاڵی سێیەم</u>: ڕاجیایی زانایان لەبارەی حوکمی (بسم الله)کردنەوە، لەکاتی سەربڕین دا:

(المهلَّب) یەکێکە لە زانایان وەك خاوەنی (محاسن التأویل) لێی دەخوازێتەوە دەڵێ: (قَالَ المهلَّب: هَذَا الْحَدِيثُ أَصْلٌ فِي أَنَّ التَّسْمِيَةَ لَيْسَتْ فَرْضًا، فَلَمَّا نَابت تَسْمِيتهُم عَن التَّسْمِيَةِ عَلَى الذَّبح، دَلَّ عَلَى أَنَّهَا سُنَةٌ لأَنَّ السُّنَّة لا تَنوب عَن فَرْض)[2]، واتە: موهەللەب دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بنچینەیە لەوبارەوە کە (بسم الله) کردن لە کاتی سەربڕین(ی ئاژەڵ، یاخود نێچیر)دا فەرز نییەو سوننەتە،

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٦٢).

٢) محاسن التأويل، ج ٤، ص ٧٠٥.

چونکە (بسم الله) کردن لە کاتی خواردندا سوننەتەو، سوننەتیش جێگای فەرز ناگرێتەوە، {کەواتە: دیارە (بسم الله)کردنەکەش بۆ کاتی سەربڕینەکەش هەر سوننەتە، چونکە سوننەت شوێنی فەرز ناگرێتەوە}.

دیارە هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: هەر ئاژەڵێك کە سەر دەبڕدرێ، ئەگەر بە لەبیرچوونەوە (بسم الله)ی لێ نەکرابێ، گۆشتەکەی حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر بە ئانقەست (بسم الله)ی لێنەکرابێ، ئەوە گۆشتەکەی حەرامە.

ئنجا خاوەنانی بۆچوونی یەکەم، ئەم فەرموودەیە بە بەڵگە دێننەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ اَللَّهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي اَلْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ﴾ (أَخْرَجَهُ اِبْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢٠٤٥)، صَحَّحَهُ الألباني، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً إِبْنُ حِبَّان برقم: (٧٢١٩) قال شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي)، واتە: بێگومان خوا (سزادانی) لەسەر ئۆممەتی من لابردوە، لەسەر شتێك کە شتێك بە هەڵە دەیکەن، یان بە لەبیرچوونەوە دەیکەن، یان بە زۆر پێیان دەکرێ.

کەواتە: کەسێك لەبیری چوو (بسم الله) بکات، ئەوە سەربڕاوەکەی دەخورێ و، هیچ ئیشکالی تێدانییە.

هەروەها (القُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] زۆر بە جوانیی هەموو ڕایەکانی هێناون، کە پێنج ڕان، گوتوویەتی: {فَقَوله: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴾، ظَاهِر فِي تَنَاول المَيْتَة، وَتدخلُ فِيهِ مَا ذكر عَلَيْهِ غَيْر اسْمِ اللهِ بعمُوم أَنَّهُ لَمْ يَذْكر عَلَيْهِ اسْم الله، وَبزِيَادَة ذكر غَيْر اسم الله سُبْحَانَهُ عَلَيْهِ الَّذِي يَقْتَضِي تَحْرِيمه نَصّاً بقَوله: ﴿ ... وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ... ﴿١٧٣﴾ ﴾ البقرة، وَهَلْ يَدخلُ فِيهِ مَا ترك المُسْلِم التسمية عَمْداً عَلَيْهِ مِنَ الذَّبْح، وَعِنْدَ إِرْسَال كلب الصَّيْدِ؟ اختَلَفَ العُلَمَاء فِي ذَلِكَ عَلَى أَقْوَال خَمْسَة:

---

١) الجامع لأحكام القران: ج٧، ص٦١، ٦٢.

الأَوَّل: إنْ تَرَكَهَا سَهْواً أُكلا جَمِيعاً، وَهُوَ قَوْل إسْحَاق وَرِوَايَة عَنْ أَحْمَد بْنُ حَنْبَل، فَإِنْ تَرَكَهَا عَمْدَاً لَمْ يؤكلا، وَقَالَه فِي الكِتَاب مَالِك وَابْنُ القَاسِم، وَهُوَ قَوْل أَبي حَنيفَة وَأَصْحَابه وَالثَّوْرِيُّ وَالحَسَنُ بْنُ حَي وَعِيسى وَأصبغ ، وَقَالَهُ سَعِيد بْنُ جُبَيرٍ وَعَطَاء، وَاخْتَارَهُ النّحَاس وَقَالَ: هَذَا أَحْسَن ، لأَنَّهُ لا يسمى فَاسِقاً إذَا كَانَ نَاسِياً.

الثَّانِي: إنْ تَرَكَهَا عَامِدَاً أو نَاسِياً يَأْكُلهما، وَهُوَ قَوْل الشَافِعِي وَالحَسَن، وَرُوِيَ ذَلِكَ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ وَأَبِي هُرَيْرَة وَعَطَاءَ وَسَعِيد بْنِ المُسَيِّب وَجَابِر بْنِ زَيدٍ وَعِكْرِمَة وَأَبي عِيَاض وَأَبِي رَافِع وَطَاوس وَإبْرَاهِيم النَّخَعِي ...

الثَّالِث: إنْ تَرَكَهَا عَامِدَاً أو ساهِياً حُرُم أكلُهَما، قَالَ مُحَمَّد بْن سِيرِين وَعَبْدُاللّه بْن عَياش بْن أَبِي رَبِيعَة وَعَبْدُاللّه بن عُمَر وَنَافِع وَعَبْدالله بْن زَيد الخطمي وَالشَّعْبي، وَبِهِ قَالَ أَبو ثَور وَدَاوُد بْن عَلِي وَأَحْمَد فِي رِوَايَة.

الرَّابِع: إنْ تَرَكَهَا عَامِدَاً كُره أكلُهَما، قَالَهُ القَاضِي أَبُو الحَسَن وَالشَّيخ أَبُو بَكْر مِنْ عُلَمَائِنَا.

الخَامِس: قَالَ أشهَب: تؤكل ذَبيحَة تَارِك التَّسْمِية عَمْدَاً إلاَّ أَنْ يَكُونَ مُسْتَخِفَّاً، وَقَالَ نَحْوه الطَّبَرِي).

واتە: کە خوا دەفەرموێ: وە لەوە مەخۆن، کە ناوی خوای لەسەر نەهاتوە، بە ئاشکرا مرداربووەوە دەگرێتەوە، چونکە مرداربوو، ناوی خوای لەسەر نەهاتوە، وە ئەوەش دەگرێتەوە کە ناوی جگە لە خوای لەسەر بێ، چونکە: یەکەم: ناوی خوای لەسەر نەهاتووە، سەرەڕای ئەوەش ناوی جگە لە خوای پاکیشی لەسەر هاتوە، کە دیارە ئەگەر ناوی جگە لە خواشی لەسەر هات، ئەوە بە دەقی قورئان قەدەغەیە،

{چونکە لە ئایەتی (١٧٣)ی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ...﴿١٧٣﴾ ﴾، واتە: ... هەر شتێك کە ناوی جگە لە خوای لەسەر هاتبێ، قەدەغەیەو لە ڕیزی گۆشتی بەرازو مردارو خوێن دایە}[1]، بەلاَم ئایا ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەش دەگرێتەوە کە

١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

مسولْمانێك ناوی خوا بە ئانقەست لەسەر سەربڕاوێك نەهێنێ، یاخود لە كاتێكدا كە سەگەكەی (یاخود بازەكەی) دەنێرێ بۆ ڕاو {(بسم الله)ی لێ ناكات}، ئایا ئەوەش دەگرێتەوە یان نا؟ زانایان لەوبارەوە ڕای جیایان هەن‌و، ڕایەكانیان هەموویان دەبن بە پێنج ڕاو بۆچوون:

**ڕای یەكەم:** {كە لە ڕاستییدا لە هەموویان بەهێزترە}[1]، دەڵێن: ئەگەر بە لەبیرچوونەوە (بسم الله) نەكات، چ بۆ نێچیرەكە كە دەگیرێ‌و سەگی تێبەرداوە، (یان تاژیی، یان بازی تێبەرداوە)، وە چ ئەوە كە خۆی سەری دەبڕێ، (پەلەوەر یان ئاژەڵ) دەخورێن، (واتە: حەڵاڵن)، ئەمەش قسەی ئیسحاقە، وە ڕیوایەتێكە لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەلەوە، بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست (بسم الله)ی نەكرد، هیچیان ناخورێن، مادام لەبیری بێ، ئەمە وەك لە كتێبەكەیدا گووتویەتی، قسەی مالیك‌و ئیبنو قاسمە، وە قسەی ئەبو حەنیفەو هاوەڵەكانیەتی، وە قسەی ثەوریی‌و حەسەنی كوڕی حەیی‌و عیساو ئەصبەغە، هەروەها هی سەعیدی كوڕی جوبەیرو عەتائەو، نەححاسیش ئەوەی هەڵبژاردوە، وە گوتوویەتی: ئەم ڕایە باشترە، چونكە هەر كەسێك بە لەبیرچوونەوە (بسم الله)ی نەكردبێ، بە فاسق لە قەڵەم نادرێ، (كردەوەكەی بە لەرێ دەرچوون لە قەڵەم نادرێ)[2].

**ڕای دووەم:** دەڵێن: ئەگەر بە ئانقەست (بسم الله)ی لێ نەكردبن، یاخود بە لەبیرچوونەوە هەرچۆنێكی بێ، گۆشتەكەیان هەر دەخورێ‌و حەڵاڵن، ئەمەش قسەی شافیعیی‌و حەسەنی بەسرایییە، وە ئەوە لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس‌و ئەبو هورەیرەوە خوایان لێ ڕازی بێ، وە لە عەتاءو سەعیدی كوڕی موسەییب‌و ئەوانیش ڕەحمەتی خوایان لێبێ، گێڕدراوەتەوە.

**ڕای سێیەم:** دەڵێن: ئەگەر بە ئانقەست یان بە لەبیرچوونەوەوە (بسم الله)ی لێ نەكردبن، حەرامە بیانخوات، ئەمەش قسەی موحەممەدی كوڕی سیرین‌و

---

١) ئەمە زیادكردنی خۆمە.

٢) ئەمە زیادكردنی خۆمە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، وە قسەی شەعبیيو ئەبو ثەورو ئەبو داوودی کوڕی عەلی یە،، وە ئەحمەدیش لە ڕیوایەتێکدا ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ئەوە ڕایەتی.

**ڕای چوارەم:** دەڵێن: ئەگەر بە ئانقەست (بسم اللّه)ی لێ نەکردبن، شتێکی ناپەسندە گۆشتەکەیان بخوات، بەڵام حەرام نیە، ئەوەش قازیی ئەبو حەسەنو شێخ ئەبو بەکر، لە زانایانی مالیکی مەزهەب گوتوویانە.

**ڕای پێنجەم:** دەڵێن: ئەگەر بە ئانقەست (بسم اللّه)ی لێ نەکردبێ، دەخورێ، بەڵام بە مەرجێك لە ڕووی بە کەمگرتنەوە نەبووبێ (بۆ وێنە: گوتبێتی جا (بسم اللّه) چییە ! بیکەمو نەیکەم)[1] ؟!.

ئنجا لە ڕاستیدا ڕای بەهێزتر لە تەفسیری فەرمایشتی خوادا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ﴾، وە لەوە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهاتوە، وە ئەوە لە ڕێ دەرچوونە.

ئەوەیە کە مەبەست پێی ئەو ژیاندارانەن کە بۆ جگە لە خوا سەر دەبڕدرێن، بۆیە ئەو ڕایەش ڕاستترە کە مسوڵمان ئەگەر (بسم اللّه)ی لەسەر سەربڕاوێك نەکرد، هەرچەندە بە دڵنیاییەوە وا باشترە کە (بسم اللّه)ی لێ بکات، بەڵام ئەگەر (بسم اللّه)یشی نەکرد، بە مەرجێك لێی نەخوێنرێتەوە کە بە کەمگرتنی تێدایە، ــ کە ئەگەر وایکرد، ئەوە هەر کوفریشە ــ ئەوە ئەگەر بەهۆی لەبیرچوونەوەوە بێ، یاخود بە ئانقەستیش بێ، ئەو سەربڕاوە، گۆشتەکەی هەر حەڵاڵە.

## خاڵی چوارەم: مشتومڕی زانایان لەبارەی نەسخ کرانەوەی ئەو ئایەتەوە:

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە هەندێکی نەسخ کراوەتەوە، لەوبارەوە با تەماشای قسەی (إبن جرير الطبري) بکەین، دەڵێ: (اخْتَلَفَ أَهْلُ

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

العِلْـم فِـي هَـذِهِ الآيَـة، هَـلْ نسـخ مِـنْ حُكْـمِهَا شَـيء أَمْ لا؟ فَقَـالَ بَعْضُـهُم: لَـمْ ينسَـخ مِنْهَـا شَيء، وَهِيَ مُحْكَـمَة فِيمَا عُنِيت بِـهِ، وَعَلَـى هَـذَا قَـوْل عَامَّة أَهْـل العِـلْم، وَرُوِي عَـنِ الحَسَـنِ البَصْـرِي وَعِكْـرَمَة: أَنَّـهُ تَعَالَـى نسـخ مِـن هَـذِهِ الآيَـة وَاسْـتَثْنَى قوله: ﴿ ...وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ ... ﴾، وَرَوى إِبْـنُ أَبـي حَـاتِم عَـنْ مَكْحُول أَيْضَاً أَنَّـهُ تَعَالـى نَسـخهَا بِقولـِهِ: ﴿ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ ۝٥ ﴾، وَالصَّوَاب أَنَّهُ لا تعَـارض بَيْنَ حِـلِّ طَعَـام أَهْـل الكِـتاب، وَبَيْـنَ تَحْـرِيم مَـا لَـمْ يَـذْكر اسْـم اللّهِ عَلَيْـهِ)[1]، واتـە: زانایـان، لـەبارەی ئـەم ئایـەتەوە ڕاجیاییـان هەیـە، ئایا حوکمەکەی هیچی لـێ نـەسخ کراوەتـەوە یان نا؟ هەنـدێك گوتوویانـە: هیچـی لـێ نـەسخ نەبۆتـەوەو موحکـەمـەو، ئـەوەی کـە مەبەسـتیـەتی هـەر لـە شـوێنی خـۆی دایـە، وە زۆربـەی زانایـان لەسـەر ئـەو ڕایـەن، {لـە نێوایشـیان دا موجاهید، کە قوتابی ئیبنو عەبباس بووە، وە زانایان گوتوویانـە: ئەگەر تەفسـیری قورئـان لـە موجاهیـدەوە هـات، ئـەوە ئیشـت تـەواوە، واتـە: زۆر شـارەزا بـووە لـە قورئـان}[2]، بـەڵام لە حەسـەنی بەسرِاییو لـە عیکریمـەوە {ئـەویش هـەر قوتـابی ئیبنو عەببـاس بووە}[3] گێڕدراوەتەوە کـە خـوای پەروەردگـار هەندێکی لەم ئایـەتە نـەسخ کردۆتەوەو لێـی هـەڵاواردوە، پـاش ئـەوەی ئـەو ڕسـتەیەی نـاردە خـوارێ، کە دەفـەرموێ: ﴿ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ ۝٥ ﴾المائدة، واتـە: خـواردنی ئەوانـەی کە کتێبیان پێدراوە، بۆ ئێوە حـەڵاڵـە.

---

١) محاسـن تـأويل: ج٤، ص٧٠٦. ئـەو مەسـەلەیە گرنگـە، وە مـن بـە ڕاسـتیی، زۆر قەڵـس دەبم، کـە هەندێك لە توێـژەرەوانـی قورئان، هەر لەخـۆوە دەڵێن: ئـەم ڕسـتە قورئانییـە نەسخ بۆتـەوە، ئـەم ئایەتـە ئەوەندەی لـێ نەسخ بۆتەوە، بێئـەوەی کـە بەڵگەیەکـیان پـێ بـێ! هەرچـەندە وەك دوایـی ڕوونـی دەکەینـەوە، مەبەسـتی زانایـانی پێشـین لـە (نسـخ) شـتێکی دیکـە بـووە، نـەك لابـردنی حوکمی ئایـەتەکە.

٢) ئـەوەی نێوان کەوانـەکان زیادکردنـی خۆمـە.

٣) ئـەوەی نێوان کەوانـەکان زیادکردنـی خۆمـە.

وە (ابن أبي حاتم) لە (مکحول) وە گێڕاویەتەوە کە: ﴿... وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ...﴿١٢١﴾﴾ الأنعـام، بـە: ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ ﴿٥﴾﴾ المائدة، نەسخ نەبۆتەوە[1].

{مەبەستیان ئەوەیە کە: مادام خوا فەرموویەتی: خواردنی خاوەن کتێبەکانتان بۆ حەڵاڵە، لە حاڵێك دا کە خاوەن کتێبەکان ناوی خوا لەسەر سەربڕاو ناهێنن، کەواتە: ڕستەکەی (الأنعام) کە دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ...﴿١٢١﴾﴾ نەسخ بۆتەوە}.

دوایی (الطبري) دەڵێ: قسەی ڕاست ئەوەیە کە تێکگیران نیە لە نێوان ئەوەدا کە خاوەن کتێبەکان، (واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان) سەربڕاویان بۆ ئێمە حەڵاڵە، وە ئەوەش کە ناوی خوای لەسەر نەهاتبێ، (بەو واتایەی کە بۆ جگە لە خوا سەربڕابێ)، حەرامە، تێکناگیرێن.

{کەواتە: پێویست ناکات باسی نەسخ بکەین، دیاری هۆی تێکنەگیرانەکەشی ئەوەیە کە ئایەتەکەی (الأنعام) خواردنی گۆشتی سەربڕاو بۆ جگە لە خوا قەدەغە دەکات، بەڵام تایەتەکەی (المائدة) باسێ ڕەوایی خواردنی سەربڕاوی خاوەن کتێبەکان دەکات، کە بێگومان: سەربڕاو بۆ جگە لە خوا، جیاوازە لە سەربڕاوی خاوەن کتێبەکان}[2].

(إِبْنُ كَثِير)یش گوتوویەتی: (وَهَذَا الَّذِي قَالَهُ صَحِيح، وَمَن أطلق مِنَ السَّلَفِ النَّسْخ هَاهُنَا، فَإِنَّمَا أَرَادَ التَّخْصِيص)[3].

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادکردنی خۆمە.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادکردنی خۆمە.

٣) تفسير القرآن العظيم لإبن كثير، ج٣، ص٣٢٧، دار طيبة للنشر والتوزيع، الطبعة الثانية ١٤٢٠هـ - ١٩٩٩ م عدد الأجزاء: ٨.

واتە: وە ئەوەی (طبري) گوتوویەتی، ڕاستە، وە هەندێك لە زانایانی پێشین کە وشەی نەسخیان بەکارهێناوە، مەبەستیان پێی تایبەت کردن بووە، نەك لابردنی حوکمەکە.

**خاڵی پێنجەم: لێخواردنی حەرامو بە حەڵاڵ دانانی: کوفرو شیرکە:**

ڕستەیەکی دیکە کە هەر لەو ئایەتە موبارەکەدا هەیە کە دەفەرموێ:
﴿...وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ١٢١﴾، وە شەیتانەکان وەحی دەکەن بۆ دۆستەکانی خۆیان، تاکو شەڕە قسەتان لەگەڵ بکەن، وە ئەگەر ئێوە بە قسەیان بکەن، بێگومان دەبن بە هاوبەش بۆ خوا دانەر.

خاوەنی کتێبی (محاسن التأويل)[1]، دەڵێ: (قَالَ الزجَاج: في قوله تعالى: ﴿وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ﴾ دَلِيل عَلَى أَنَّ كُلَّ مَنْ أَحَلّ شَيْئَاً مِمَّا حَرّم اللهُ تَعَالى، أَو حَرَّمَ شَيْئَاً مِمَّا أَحَلَّ الله تَعَالى، فَهُوَ مُشْرِكٌ، وَإِنَّمَا سُمِّيَ مُشْرِكَاً لأَنَّهُ أَثبت حَاكِمَاً سِوَى الله تَعَالى، وَهَذَا هُوَ الشِّرْك)، واتە: زەججاج "کە یەکێکە لە شارەزایانی زمانو شارەزایانی تەفسیر" دەڵێ: لە قسەی خوای بەرزدا کە دەفەرموێ: ئەگەر بە قسەی هاوبەش دانەرەکان بکەن، دەبن بە هاوبەش بۆ خوا دانەر، بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە هەر کەسێك، شتێك کە خوا قەدەغەی کردوە، حەڵاڵی بکات، وە شتێك کە خوای بەرز بە حەڵاڵی داناوە، قەدەغەی بکات، ئەوە دەبێتە هاوبەش بۆ خوا دانەر، بۆیەش پێی دەگوترێ: هاوبەش بۆخوا دانەر، چونکە جگە لە خوای بەرز حکومڕانێکی دیکەو حەڵاڵو حەڕام دانەرێکی دیکەی داناوەو، ئەوەش شیرکە.

هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: يَا عَدِيُّ! اطرحْ

---

[1] ج ٤، ص ٧٠٧.

عَنْكَ هَـذَا الْـوَثَنَ، وَسَـمِعْتُهُ يَقْـرَأُ فِـي سُـورَةِ بَـرَاءَةٌ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾ ﴾التوبة، قَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئاً اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئاً حَرَّمُوهُ}[1]، واتە: عەدى كوڕى حاتیم خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ خاچێكی زێڕم لە ملدا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عەدی! ئەو بتە فڕێ بدە، وە گوێم لێبوو لە سوورەتی بەرائە ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: "جولەكەكانو نەصرانییەكان، زاناكانی خۆیانو ڕاهیبەكانی خۆیان {واتە عابیدەكانی خۆیان كە گۆشەگیرن}[2] بە پەروەردگارو بە پەرستراوی خۆیان دەگرن، ئنجا پێغەمبەر ﷺ كە ئایەتەكەی خوێندەوە فەرمووی: ئاگاداربن ئەوان {واتە: جوولەكەو نەصرانییەكان}[3] زاناكانو گۆشەگیرەكانی خۆیانیان نەدەپەرست {نوێژو ڕۆژوویان بۆ بكەنو سەجدەو ڕكووعیان بۆ ببەن}[4]، بەڵكو مەبەست لە پەرستنەكەیان ئەوە بوو، كە ئەگەر شتێكیان بۆ حەلاڵ دەكردن، ئەوانیش بە حەلاڵیان دەزانی {با حەرامیش بووایە} وە ئەگەر شتێكیان لێ قەدەغە كردبان، بە قەدەغەیان دەزانی{و بە دوایان دەكەوتن لە حەلاڵو حەرامدا}.

هەر لەوبارەوە (إبن العربي) كە (القرطبي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا (الجامع لأحكام القرآن) لێیەوە دێنێ، دەڵێ: {قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾، إِنَّمَا يَكُونُ الْمُؤْمِنُ بِطَاعَةِ الْمُشْرِكِ مُشْرِكَاً، إِذَا أَطَاعَهُ فِي اعْتِقَادِهِ،

---

١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٩٥) قَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ.

٢) زیادكردنی خۆمن، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

٣) زیادكردنی خۆمن، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

٤) زیادكردنی خۆمن، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

فَأمّا إِذَا أَطَاعَهُ فِي الْفِعْلِ وَعَقْدُهُ سَلِيمٌ مُسْتَمِرٌّ عَلَى التَّوْحِيدِ وَالتَّصْدِيقِ، فَهُوَ عَاصٍ فَافْهَمُوا ذَلِكَ فِي كُلِّ مَوْضِعٍ)[١]، کە بە بۆچوونی مـن قسەکەی زۆر جوانە، واتە: ئیماندار کاتێك بە فەرمانبەریی کردنی ئینسانێکی هاوبەش بۆ خوا دانەر، دەبێتە هاوبەش بۆ خوا دانەر{و لە بازنەی ئیسلامدا دەردەچێ} ئەگەر لە ڕووی عەقیدەوە شوێنی بکەوێ، بەڵام ئەگەر بەس لە کردەوەدا شوێنی بکەوێ، {واتە: بە ناچاریی شوێنی بکەوێ، یان وەك لاسایی کردنەوە شوێنی بکەوێ، یان لە ترسان شوێنی بکەوێ}[٢]، بەڵام دڵی هەر لە جێی خۆی بێ لەسەر خوا بەیەکگرتنو بەڕاست دانانی خواو ئیسلام، ئەوە تەنیا گوناهبارە، لەوە تێبگەن لە هەموو شوێنەکان دا.

لێرەدا دێینە کۆتایی باسی حوکمی (بسم الله) کردن، لەسەر خواردنو لەسەر سەربڕاوان.

**مەسەلەی پێنجەم:** خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، لێرەدا خوا بەراورد دەکات لە نێوان مرۆڤی ئیماندارو مرۆڤی بێ ئیماندا، دەفەرموێ: ئایا کەسێك کە مردوو بووەو زیندوومان کردۆتەوەو ڕووناکییەکمان پێداوە، لە نێو خەڵکیدا پێی دەڕوات، وەك وێنەی کەسێك وایە، کە لە تاریکییان دایەو لێیان دەرباز نابێ؟ ئاوا کافرەکان ئەو کردەوانەی کە دەیانکەن بۆیان ڕازێندراوەنەوە.

تەماشا بکەن ! خوای پەروەردگار بە سێ وەسفان پێناسەی مرۆڤی ئیماندار دەکات:

---

١) ج ٧، ص ٦٤.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

# پێناسەی مرۆڤی بڕوادار بە سێ سیفەتی گرنگ

یەکەم: دەفەرموێ: ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ ﴾، ئایا کەسێك کە مردوو بوو زیندوومان کردەوە، واتە: مردنی مەعنەوییی، کەسێك ئیمانی نەبێ بە مردوو لە قەڵەم دەدرێ، وە کەسێك ئیمانی هەبوو، بە زیندوو لە قەڵەم دەدرێ، وەك خوای پەروەردگار لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ...﴿٢٢﴾ ﴾فاطر، واتە: زیندووان‌و مردووان وەك یەك نین، کە مەبەست پێی مردنی مەعنەوییە.

دووەم: دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا ﴾، وە ڕووناکییەکمان پێدا، کەواتە: ئیمان ڕۆشنایی‌و ڕووناکییەکە، عەقڵ‌و دڵ‌و دەروو دەروونی ئینسان، ڕۆشن دەکاتەوە، وە دەوروبەری ئینسان ڕۆشن دەکاتەوە، وە ڕابردووو ئێستاو داهاتووی، ڕۆشن دەکاتەوە.

سێیەم: دەفەرموێ: ﴿ يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ ﴾، بەو ڕووناکییە لە نێو خەڵکیدا دەڕوات، واتە: لەبەر ڕۆشنایی دامامەڵە لەگەڵ خەڵکدا دەکات.

بەڵام کەسی کافر بە چی پێناسە دەکات؟ دەفەرموێ: ﴿ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئایا وەك کەسێك وایە کە لە تاریکییاندایە، لێشیان دەرباز نابێ، ئینسانی کافر بۆچی لە تاریکییدایە؟ تەماشا بکەن!

کافر نازانێ لە کوێ ڕا هاتوە ؟ وە نازانێ بۆچی هاتوە؟ وە نازانێ بۆ کوێ دەچێ؟ وە نازانێ کێ هێناویەتی؟ وە نازانێ چی لێ داوا کراوە؟ حەڵاڵو حەرامی بۆ لێك جیا نابنەوە، وە پاكو پیسی بۆ لێك جیا نابنەوە، وە ڕاستو چەوتی بۆ لێك جیا نابنەوە، بەڵێ، دەڵێ: ئەمە ڕاستەو ئەمە چەوتە، بەڵام جاری وایە ئەوەی کە ئەو بە ڕاستی دەزانێ، چەوتە، وە ئەوەی ئەو بە چەوتی زانیوە ڕاستە، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: موونافیقە نێرو مێیەکان هەندێکیان لە هەندێکیانن، فەرمان بە خراپە دەکەنو، ڕێ لە چاکە دەگرن، دەستی خۆیان دەگرنەوە لە بەخشین، خوایان لەبیر چووە، خواش ئەوانی لەبیر کردوە (پشت گوێ خستوە)، بێگومان دووڕووان لە ڕێ دەرچووانن.

کەواتە: ئینسانی بێبڕوا لە تاریکاییدایە، بە نسبەت خۆیەوە، نازانێ لە کوێوە هاتوە؟ نازانێ بۆ کوێ دەچێ؟ نازانێ بۆچی هاتوە؟ وا مەزانن خەڵك وەك ئێمەیە: ئێمە مسوڵمانینو دەزانین بۆ کوێ دەچین ؟ حەڵاڵ چیە ؟ حەرام چیە؟ چ حەڵاڵو حەرام لە بواری جینسیی دا بێ، چ لە بواری خواردنو خواردنەوەدا بێ، چ لە بواری بەرگو پۆشاك دا بێ، چ لە بواری کارو کەسابەت دا بێ، چ لە بواری سیاسەت دا بێ، لە هەر بوارێك دا بێ، ئێمە بەرچاومان ڕۆشنە، ئەوە هەمووی چاکەو نیعمەتی خوایە.

ئنجا ئەگەر تۆ بە وڵاتاندا بڕۆیو بگەڕێی دەبینی: شتێك کە لێرەدا بە پیسی دەزانین، شوێنی وا هەیە، دەیخۆن، یان بۆ وێنە: ئێمە شانازیی بەوەوە دەکەین کە غەیرەمان هەیەو بە تەنگ نامووسی خۆمانەوەین، بەڵام لەو وڵاتانەی ڕۆژئاوا، شتێکی ئاساییە کابرا، کچەکەی زرتە زەلامێك بێنێتەوە بۆ ماڵێ! بەڵکو ئەگەر هاتوو کچەکەی گەیشتە تەمەنی هەژدە (١٨) ساڵییو، هێشتا دۆستی نەبوو،

دەیبەنە لای پزیشکی دەروونیی و دەڵێ: تا ئێستا کچەکەم دۆستێکی نیە، ڕەنگە نەخۆشی دەروونیی هەبێ!

یان هاوسەرگیریی ژن لەگەڵ ژن، وە پیاو لەگەڵ پیاوو، پێکهێنانی خێزانی یەك ڕەگەزیی (الزواج المِثْليّ)، یان کەسێك دایکی دیارە بەڵام نازانێ بابی کێیەو، زۆریشی پێ ئاساییە، بەڵێ، پێی نارەحەتە، بەڵام عەیب نیە کە لە نێو خەڵکی دا نەزانێ بابی کێیە؟!

مەبەستم ئەوەیە، ئەوەی کە لێرەدا خوا دەفەرموێ: کافر لە تاریکییدایە، ئەوە ڕاستە لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی فیکریی و عەقیدیی و، لە ڕووی عیبادەت و، لە ڕووی خێزانیی و کۆمەڵایەتییەوە، بەڵێ، لە ڕووی ڕێکخستنی ژیانی دنیایی یەوە ڕواڵەتێك دەزانن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَـٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ۝٧ ﴾الروم، بەڵام لە زۆر ڕووی دیکەوە، لە تاریکییدان.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە بۆ کافرەکان ڕازێنراوەتەوە ئەوەی کە دەیکەن، واتە: شەیتان بۆی ڕازاندوونەوە، ئەگەرنا زۆر لە کردەوەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانیان زۆر ناقۆڵاو دزێوو ناشرینن، بەڵام شەیتان بۆی جوان کردوون، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ۝٢٤ ﴾النمل، واتە: شەیتان کردەوەکانی بۆ جوان کردوون، ئنجا لەبارەی ژیان و مردنی مەعنەوییەوە، یەکێك لە شاعیرەکان دەڵێ:

وَإِنْ امرؤٌ لَـمْ يحـيي بالـعِلْم مَيِّـتٌ

فَلَيْـسَ لَـهُ حَـتَّـى الـنـشـورِ نـشـورُ

واتە: وە ئەگەر مرۆڤ بەهۆی زانیارییەوە زیندوو نەبێ، مردوویە، وە هەتا کاتی زیندووکرانەوە(ی قیامەت) زیندووبوونەوەی نیە.

بەڵێ بەهۆی نەزانینەوە خەڵك پێش مردنێش مردوون، هەر بە زیندوویی مردوون، بە مردوو حیسابن، وەك دەڵێن: مردووی بەشی زیندوو خۆرن، وە جەستەکانیان پێش ئەوەی بچنە گۆڕیشەوە، هەر جەستەکان بۆخۆیان گۆڕن بۆ ڕووحەکانیان، بەڵێ کەسێك کە بەهۆی عیلمی شەریعەتەوە، عیلمێك کە خوات پێ دەناسێنێو خۆت پێ دەناسێنێ، کەسێك بەهۆی عیلمەوە نەژیابێو زیندوو نەبووبێ، ئەوە بە مردوو لە قەڵەم دەدرێ، وە هەتا کاتی لێپرسینەوەو هەڵسانەوە، هەڵناستێتەوەو هەر بە مردوویی دەمێنێتەوە.

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾،

پێشتریش باسمان کرد، ئەو ( وَكَذَٰلِكَ )ە، ئەو (ك) بۆ پێچواندن(تشبيه)ە، واتە: وەك چۆن کافرەکانی ڕۆژگاری تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ!) لە کۆمەڵگاکەی تۆدا حوکمڕانو قسە ڕۆیشتوون، ئەمرو نەهیان بە دەستە، وە پیلان دەگێڕنو خەڵك لە ڕێی خوادا لادەدەن، بە هەمان شێوە لە ڕابردووشدا، ئەوە یاسای خوایە، کە لە هەموو شارو ئاوەدانییەکی گەورەدا، تاوانبارەکانمان، کردە حوکمڕانو بالادەست تاکو خراپەو پیلانگێڕیی تێدا بکەن، وە ئەو پیلانگێڕییەش کە دەیکەن، هەر بە زیانی خۆیانە، بەلام هەست ناکەن.

جا لێرەدا کە دەفەرموێ: ( وَكَذَٰلِكَ ) واتە: وەك چۆن بۆ کافرەکانی پێشێ کردەوەکانمان ڕازاندبۆوە، بە هەمان شێوەش لە هەر شارو ئاوەدانییەکی گەورەدا، خراپەکارەکانمان کردوون بە حوکمڕان، یان مەبەست ئەوەیە، وەك چۆن لە شارو کۆمەڵگاکەی تۆدا، تاوانبارەکان بوونە قسە ڕۆیشتووو حوکمڕان، بە هەمان شێوە: یاسای خوا لە هەموو کۆمەڵگاکانی دیکەی بەشەردا وا بووە.

پێشتر وەڵامی ئەوەشمان دایەوە کە ئیشکالێك لێرەدا دێتە پێشێ: خوا بۆچی وایکردووە حیکمەتی چییە؟ وەك گوتمان: لێرەدا خوای دادگەر باسی یاساو سیستەمێك دەکات کە دایناوە لە ژیانی بەشەردا، کە کۆمەڵگایەکان کاتێك لە خوا

دووردەکەونەوە، لە وەحی دوور دەکەونەوەو دەکەونە شوێنی تاوانبارەکانو، ئەوان دەکەنە حوکمڕانو گەورەو سەرۆکی خۆیانو بە دوایاندا دەچن، ئەوانیش دیارە ئیشیان بریتییە لە پیلانو فێڵو تەڵەکە بازیی بۆ دوورخستنەوەی خەڵك لە خوا، وە دەوری خۆ قەرەباڵغ کردن، بەو خەڵکە ڕەشو ڕووتەو چەوساندنەوەیانو بەکارهێنانیان بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان، لێرەدا خوای پەروەردگار باسی واقیعی ئەو کۆمەڵگایە دەکات، نەك ئەوە کە خوای دادگەر وای لێکردوون، چونکە خوا هەموو پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) بۆیە ناردوون، کە خەڵك ئازادبنو، سەرفرازو سەربەست بن، وە کەس نەیانکات بە کۆیلەی خۆیو نەیانکات بە خزمەتکاری خۆی.

کەواتە: ئامانجێك کە خوا پێغەمبەرانی بۆ ناردوە، کە بریتییە لە ئازادکردنی خەڵك، ناگونجێ بڵێین: خوای کاربەجێ بە جەبر لەسەر کۆمەڵگایەکانی داناوەو، پێی خۆش بووەو پێی چاك بووە؟ نەخێر، بەڵام خوای پەنهانزان باسی واقیعی ئەو کۆمەڵگایانە دەکات، وە باسی ئەوە دەکات کە ئەوە هەموو ئەو بەزمو بازاڕە، بە ویستی ڕەهای خوای باڵادەستو بەپێی یاسای وی هاتۆتە دی.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُواْ فِيهَا ﴾، یانی: لە هەر شارو ئاوەدانییەکی گەورەدا تاوانبارەکانیانمان کردوە بە گەورە، (أَكَابر) کۆی (أكبر)ە، واتە: سەرۆكو گەورەو قسە ڕۆیشتوو، وەك گوتم: کە خوا دەفەرموێ: وامان کردوە، واتە: بە پێی یاساو سوننەتی ئێمە وای لێ هاتوە، ئەگەرنا خوای دادگەر لەو حاڵە ڕازی نییە، بگرە تەنانەت پێغەمبەرانیشی بۆ ئەوە ناردوە، تاکو ئەو وەزعو بەزمو بازاڕە بگۆڕن، بەوە کە تاوانبارەکان، حوکمڕانو دەست ڕۆیشتوو نەبن، بەڵکو لەسەر بناغەیەکی ڕاست ئەو کۆمەڵگایە خۆی ئیدارە بکات، وە پابەندبن بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا وشەی (مکر)ی بەکارهێناوە؟ ﴿ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾؟ هەندێك لە زانایان وایان پێناسە کردوە (المكر: حيلةٌ في مخالفة الإستقامة)، (مكر) بریتییە لە فێڵێك بە پێچەوانەی ڕێك ڕاوەستان.

بۆیەش خوای پەروەردگار ئەو تەعبیرە بەکاردێنێ، چونکە ئەو زلە زلانە، زانیویانە کە: ئەو موحەممەدە ﷺ ئەو مووسایە، ئەو عیسایە،...هتد، ئەوانە پێغەمبەری خوان، زۆربەیان زانیویانە، بەڵام بۆچی شوێنیان نەکەوتوون؟ چونکە بازاڕەکەیان لێ تێکدەچوو، کەواتە: ئەوە فێڵێك بووە، لە خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەیان کردوە، بە پێغەمبەری خۆیانیان گوتوە: تۆ پێغەمبەر نی، ئەگەر ڕاست دەکەی پێغەمبەری، بەڵگە بێنە! هەڵبەتە زانیویانە ئەو قورئانەی کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی، بەڵگەیە، زانیویانە موعجیزەیەکە لە بەرانبەریدا دەستەوسانن، ئنجا گوتوویانە: ئەدی بۆچی ئێمەش وەك گەلانی دیکە موعجیزەی بەرهەست (محسوس) مان بۆ نایەت؟ تاکو خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەیان گومانانیان بۆ دروست بێ! چونکە ئەگەر ئیمانیان پێ هێنابایە، ئەوکاتە ئەبو جەهل و ئەبو سوفیان و وەلیدی کوڕی موغەڕەو نەضری کوڕی حاریث و کێ و کێ... ئەو بەزم و بازاڕەی پەیدایان کردبوو، بەو بت پەرستیی و نەزانیی و نەفامییە، کە بەهۆیەوە ئەو خەڵکەیان دادۆشیوە : لە دەستیان دەدا.

دیارە ئێستاش هەروایە: ئێستاش ئەو ڕژێمە تاغوتییانەو، ئەو ڕژێمە بنەماڵەیی و دکتاتۆرییانە، چۆن ئەو خەڵکەیان بۆ ڕام و دەستەمۆ بووە؟ بەوە کە خۆیان لێکردوون بە پەرستراوو، هەڵیانخەڵەتاندوون بەرنامەو ڕێچکەکانیانیان بۆ ڕازندوونەوەو، ناوی سەرنج ڕاکێشیان لێناون، بۆیە خوا وشەی (مکر)ی بەکارهێناوە بۆ ڕەفتاری زلەزلەکان.

<u>**مەسەلەی حەوتەم**</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ ﴾.

﴿ وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ ﴾، یانی: (وَإِذَا جَاءَتْهُمْ مُعْجِزَةٌ) (آية) لێرەدا بە مانای بەڵگەیەکی دەستەوسانکەر دێ، نەك مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان بێ، ئەوەش بە سیاقەکە دەزانین، واتە: وە ئەگەر کاتێك بەڵگەیەکی دەستەوسانکەر،

موعجیزەیەك، نیشانەیەكی ئاشكرایان بۆ بێ، لەسەر ڕاستیی پێغەمبەر ﷺ: ﴿قَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِ﴾، گوتیان هەرگیز ئیمان ناهێنین، تاكو ئەووەمان پێ نەدرێ، كە بە پێغەمبەرانی خوا دراوە، واتە: ئێمەش دەبێ موعجیزەی وامان بۆ بێ، یاخود دەبێ ئێمەش وەحییمان بۆ بێ، هەردوو ماناكەی دەگرێتەوە، خوای دادگەرو قسە لەجێ، وەڵام دەداتەوەو، دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ﴾، خوا زاناترە بەو شوێنەو بەو كەسە كە پەیامی خۆی تێدا دادەنێ، یانی: خوا دەزانێ، كێ شایستەترە؟ ئەوانەی كە تاوانبارن لە لای خوا زەبوونییو بچووكییان تووش دێ، چونكە ئەوان خۆیان بە زل دەگرنو دەڵێن: ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ ناهێنین، تاكو ئێمەش موعجیزەیەكمان پێ نەدرێ، یان ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ ناهێنین تاكو ئێمەش وەحییمان بۆ دێ، خۆیان بە زل دەگرن، بۆیە خوا بە پێچەوانەی نیەتەكەیانەوە، بچووكیان دەكاتەوەو زەبوون دەبن.

لە فەرموودەیەك دا هاتوە دەربارەی حاڵی خۆ بە گەورەزانان، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿يُحْشَرُ الْمُتَكَبِّرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَمْثَالَ الذَّرِّ فِي صُوَرِ النَّاسِ، يَعْلُوهُمْ كُلُّ شَيْءٍ مِنْ الصَّغَارِ حَتَّى يَدْخُلُوا سِجْنًا فِي جَهَنَّمَ، يُقَالُ لَهُ: بُولَسُ فَتَعْلُوَهُمْ نَارُ الأَنْيَارِ، يُسْقَوْنَ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ : عُصَارَةِ أَهْلِ النَّارِ}[1]، واتە: لە ڕۆژی قیامەت دا خۆبەزلگران لە شێوەی مرۆڤو قەبارەی مێروولەدا كۆدەكرێنەوە، تەنانەت لەبەر بچووكییو زەبوونیی هەموو شتێك وەسەریان دەكەوێ هەتا لە دۆزەخ دا دەچنە سجنێكەوە كە پێی دەگوترێ: (بۆلەس) ئاگری ئاگران دایاندەپۆشێ، لە كێمو زووخاوی خەڵكی ئاگر بە گەروویان دا دەكرێ.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٦٦٧٧)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٤٩٢) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَأَخْرَجَهُ أَيْضَاً: الحُمَيْدِي بِرقم: (٥٩٨)، وَالبُخَارِيُّ فِي "الأدب المفرد" بِرقم: (٥٥٧) قَالَ شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

(القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (قَالَ الوَلِيد بن المغيْرَة: لَوْ كَانَت النّبوّة حَقّاً لَكُنْتُ أَوْلى بِهَا مِنْكَ، لأَنِي أَكْبَرُ مِنْكَ سِناً، وَأَكْثَرُ مِنْكَ مالاً)[1] واتە: وەلیدی کوڕی موغەرە "بە پێغەمبەر ﷺی گوت" ئەگەر پێغەمبەرایەتیی هەق بووایە، من پێی شایستەتر بووم لە تۆ، چونکە لە تۆ بە تەمەنترمو، لە تۆش دەوڵەمەندترم.

هەروەها (القرطبي) ئەوەشی هێناوە، دەڵێ: (وَقَالَ أَبُو جَهْل: وَاللّهِ لا نَرْضَى بِهِ وَلا نَتَّبِعه أَبداً، إلاّ أَنْ يَأتِينا وَحِي كَمَا يَأتيه؛ فَنَزَلَتِ الآية)[2] واتە: ئەبو جەهلیش گوتی: سوێند بە خوا پێی ڕازی نابین، وە هەرگیز شوێنیشی ناکەوین، مەگەر وەك چۆن وەحی بۆ ئەو دێ، وەحی بۆ ئێمەش بێ، ئیدی لەوبارەوە، ئەم ئایەتانە هاتنە خوار.

**مەسەلەی هەشتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾﴾، ئەم ئایەتە موبارەکە باسی هیدایەت درانی ئینسانو چۆنیەتی گومڕابوونی دەکات، خوای کاربەجێ بۆمان وێنە دەکاتو دەفەرموێ: ئەگەر خوا بیەوێ هەر کەسێك ڕێنمایی بکاتو بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، سینەی بۆ ئیسلام گوشاد دەکاتو دڵی دەکاتەوە، وە بیەوێ هەرکەسێکیش گومڕا بکات، سینەی تەنگو سەغڵەت دەکات، وەك ئەوەی بیەوێ بەرەو ئاسمان سەر بکەوێ، ئاوا بەم شێوەیە خوا پیسیی و کوفرو نەفرین لەسەر ئەوانە دادەنێ، کە بڕوا ناهێنن.

(يَشْرَحْ) واتە: (يُوسِّعْ) فراوانی دەکات، وە شەی (ضَيِّقًا) خوێنراویشەتەوە: (ضَيْقاً) واتە: تەنگ، وە وشەی (حَرَجًا) خوێنراویشەتەوە: (حَرِجاً) ئەویش بە

---

[1] الجامع لأحكام القرآن، ج ٧، ص ٦٥.

[2] هەمان سەرچاوە.

مانای زۆر تەنگو تەسك دێ، وە (القُرطُبي) دەڵێ: هەندێك گوتوویانە: (حَرَجْ) (جَمْعُ حَرَجَةٍ، وَهُوَ شِدَّةُ الضَّيْقِ، وَالحَرَجَةُ الغَيْضَةُ، وَالجَمْعُ حَرَجْ وَحرجَات)[1]، واتە: (حَرَجًا) كۆی (حَرَجَة)یە، كە بریتییە لە زۆر تەنگیی، وە (حَرَج) بە باغو جەنگەڵێك دەگوترێ، كە هیچ شتێك ڕێی تێ نەباتو بە (حَرَجْ وَحرجَات) كۆدەكرێتەوە.

هەروەها دەڵێ: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ گوتوویەتی: (الحَرَجُ : مَوضِعُ الشَّجَرِ المُلْتَفِّ)، (حَرَج) لە نێو باغو جەنگەڵێكدا، بەو شوێنە دەگوترێ كە دارەكان پێكدا دەدەن، درەختەكان لێك بئاڵێنو هیچ شتێك ڕێی نەبێ تێی بچێ، واتە: وەك چۆن شوانێك بیەوێ مەڕەكانی بباتە نێو باغێك، كە دارەكانی چڕوپڕو جەنگەڵ بێو نەتوانێ، بە هەمان شێوەش ئیمانو هیدایەت ناچێتە نێو سینەو دڵی كەسێك، كە خوای كاربەجێ نەیویستوە هیدایەت وەربگرێ، لەبەرئەوەی كە شایستە نیە، وە لەبەرئەوەش كە بۆخۆی ئارەزووو ویستی نیە، بۆ وەرگرتنی هیدایەت.

كە دەفەرموێ: ﴿ كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، واتە: وەك ئەوە كە بەرەو ئاسمان بەرزبێتەوە، خوێنراویشتەوە (يَصْعَد) و (يصّاعَد) هەر سێ قیرائەتەكەی هەن، ئنجا ئەگەر وردبینەوە: هەر جەڕەسی وشەكە ماناكەشی دەگەیەنێ، وە ئەم ئایەتە ئیعجازێكی زانستیی تێدایە، كە دەفەرموێ: ﴿ يَصَّعَّدُ ﴾، واتە: زۆر بە زەحمەت سەردەكەوێ، ئیعجازەكەش ئەوەیە كە مرۆڤ تا بەرەو سەرەوەی هەوا بڕوات، دیارە ڕێژەی ئۆكسجین كەم دەبێتەوە، كە ڕێژەی ئۆكسجین لە هەوادا (٢١٪)ە، وە ڕێژەی نایترۆجین (٧٨٪)، وە ڕێژەی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لە (٠،٣٪)یە، ئینسانیش ئۆكسجین هەڵدەمژێو تاكو ڕێژەكەی كەمتر بێ تووشی تەنگە نەفەسیی زیاتر دەبێ، وە ئینسان دوای ئەوەی كە باڵۆنی دروست كرد، فڕۆكەی دروست كرد، زانی كە لە سەرەوەی خۆی چ باسە، زانی كە ئەگەر بەرزبێتەوە بۆ ئاسمان، ڕێژەی ئۆكسجین كەم دەبێتەوە، وە تووشی تەنگە

---

١) الجامع لأحكام القرآن ج٧، ص٨١.

نەفەسیی دەبێ، یانی: پێش ئەوەی باڵۆنو فڕۆکە دروست بکرێ، ئەوە نەزانرابوو، بەڵام ئەمە پێشتر لە قورئان دا باسکراوە، مانای وایە ئەم قورئانە کەسێك ناردوویەتی، کە پێش ئەوەی باڵۆنو فڕۆکە دروست بکرێن، زانیویەتی، بە بەرەو سەرێ چوون، ڕێژەی ئۆکسجین لە هەوادا، کەم دەبێتەوە، ئەگەرنا دوایی بەشەریش ئەوەیان بۆ دەرکەوتوە، بەڵام ئەو کاتە، تەنیا خوا زانیویەتی.

کەواتە: ئەم قورئانە دەبێ لەلایەن خوایەکەوە هاتبێ، کە هەزارو چوار سەدو سیو شەش ساڵ، پێش ئێستاو دوای ئێستاشی زانیوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئاوا خوا (رجس) دەخاتە سەر ئەوانەی ئیمان ناهێنن، وشەی (رجس) لە زمانی عەرەبیدا بە (نتن) یانی: شتی بۆگەنو پیس، وە بە (اللعن)، یانی: نەفرین، وە بە (كفر) بەوانە هەموویان لێکدراوەتەوە، موجاهید گوتوویەتی: (الرِّجْسُ: مَا لا خَيْرَ فِيهِ)، (رجس) بریتیە لە هەر شتێك خێری تێدانەبێ.

## ڕوونکردنەوەی چەمکی سینە گوشادبوون :

ئنجا دەربارەی ئەوە کە ئایا ئینسان چۆن سینەی گوشاد دەبێ بۆ ئیمانو هیدایەتی خوا ؟ دوو فەرموودە دێنینەوە :

یەکەم: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مِسْوَرٍ، قَالَ: تَلاَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ﴾، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا هَذَا الشَّرْحُ؟ قَالَ: نُورٌ يُقْذَفُ بِهِ فِي الْقَلْبِ فَيَنْفَسِحُ لَهُ الْقَلْبُ، قَالَ: فَقِيلَ: فَهَلْ لِذَلِكَ مِنْ أَمَارَةٍ يُعْرَفُ بِهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قِيلَ: وَمَا هِيَ، قَالَ: الإِنَابَةُ إِلَى دَارِ الْخُلُودِ، وَالتَّجَافِي عَنْ دَارِ الْغُرُورِ، وَالاِسْتِعْدَادُ لِلْمَوْتِ قَبْلَ لِقَاءِ الْمَوْتِ}[1]، واتە:

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٥٤٥٦)، وَإِبْنُ جَرِير برقم: (١٢٨٥٣)، وَإِبْنُ أَبِي حَاتم، وَقَالَ إِبْنُ كَثير فِي الحديث طُرقٌ مرسلةٌ ومتصلةٌ يشدُّ بعضها بعضاً.

عەبدوڵڵای كوڕی میسوەر، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ﴾، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو سینە گوشاد بوونە چۆنە؟ فەرمووی: ڕووناكییەكە دەخرێتە نێو دڵو، دڵو دەروونی فراوان دەبێ، گوتیان: ئایا ئەوە نیشانەیەكی هەیە كە پێی بزانرێ؟ (ئینسان لە خۆی حاڵی بێ) فەرمووی: بەڵێ: گوتیان چییە؟ (سێ نیشانەی لێ هەڵدانو) فەرمووی: گەڕانەوە بۆ مەنزڵگای هەمیشەیی (بەهەشت)، وە خۆ دوورگرتن لە مەنزڵگای فریودەر (كە دنیایە، بەو مانایە نا كە وازی لێبێنێ، یانی : باوەشی بۆ نەكاتەوەو گوریسی لە بن ڕانەخات)(١)، وە خۆ ئامادەكردن بۆ مردن پێش گەیشتن بە مردن.

{واتە: هەمیشە مردنت لەبیر بێ، وە مردن داینەمۆیەك بێ، وا بكات ئازاتر بی لە ئەنجامدانی چاكەو خێرخوازیو چاكسازیی، وە بۆ هەر شتێك كە جێگای ڕەزامەندیی خوایە}.

دووەم: ﴿روي أن عَبدالله بْنِ مَسْعُود قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ ! وَهَل ينشرح الصَّدْر ؟ فَقَالَ: نَعَمْ يَدخُلُ القَلْبَ نُور، فقَالَ: وَهَلْ لِذَلِكَ مِنْ عَلامَةٍ؟ فقَالَ ﷺ: التَّجَافِي عَنْ دَارِ الْغُرُورِ، وَالإِنَابَةُ إِلَى دَارِ الْخُلُودِ، وَالإِسْتِعْدَادُ لِلْمَوْتِ قَبْلَ لِقَاءِ الْمَوْتِ﴾(٢)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئایا سینەی ئینسان گوشادو فراوان دەبێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ڕووناكییەك دەچێتە نێو دڵ، (واتە: ئیمانو هیدایەت)، گوتی: ئایا ئەوە نیشانەی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ: نیشانەكەی ئەوەیە، خۆ دوورگرتن لە مەنزڵگای فریودەر (واتە: دنیا كە زۆربەی خەڵك فریوی پێ دەخوات)، وە گەڕانەوە لە ناخەوە بۆ مەنزڵگای هەمیشەیی (واتە: لە دڵەوە بەهەشتت خۆشبوێ)، وە خۆ ئامادەكردن بۆ مردن، پێش دابەزینی مردن.

---

١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

٢) أَخْرَجَهُ إِبْنُ جَرِير برقم: (١٢٨٥٣).

ئنجا لێرەدا پرسیارێك دەكرێ، وەك زۆرجاری دیكەش ئەم پرسیارەمان هاتۆتە پێش، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: خوا كە دەفەرموێ: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ﴾ بۆ ئەوەی دیكەش دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ﴾ هەر كەسێك خوا بیەوێ بیخاتە سەر رێی ڕاست، وە هەر كەسێك خوا بیەوێ گومڕای بكات، ئایا ئەمە چۆنە ؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: خوای دادگەر لێرەدا باسی یاسایەكی خۆیمان بۆ دەكات، كە خوا نەك هەر لەگۆترە خەڵك هیدایەت بدات‌و خەڵك گومڕا بكات !

یانی: خوا دەفەرموێ: ئەی مرۆڤەكان سەرنج بدەن ! هەر كەسێكتان بینی ئەو نیشانانەی لێ دەركەوتن، ئەوە خوا ویستوویەتی هیدایەتی بدات، ئەوەی دیكەش كە پێچەوانەی ئەوەتان لێ بینی، بزانن كە خوا ویستوویەتی گومڕای بكات، یانی ئێمە بەهۆی حاڵەتی بەشەرەكە دەزانین، كە خوا چ ئیرادەیەكی بەو كەسە هەیە، چونكە لە شوێنی دیكەدا، باسی ئەوەمان بۆ دەكات، كە ڕوونكردنەوەی یاساكەیەتی‌و دەفەرموێ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾﴾ إبراهيم، واتە: خوا ستەمكاران گومڕا دەكات، كەواتە: خوا لەخۆڕا خەڵك گومڕا ناكات، ئەوانە گومڕا دەكات كە ستەم دەكەن، وە هەمیشە ویستی خراپەو شەڕیان هەیەو، نایانەوێ بەرەو خوا بڕۆن، ئنجا وەك خۆیان دەیانەوێ، خوای دادگەر ئاوا مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات، ئەگەرنا، ئەگەر بیانەوێ بەرەو خوا بچن، خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾﴾ الرعد، ئەوەی بەرەو خوا بگەڕێتەوە، ڕێنمایی دەكات، ئەوەی بەرەو خوا بجووڵێ، خوا دەستی دەگرێ، ئەوەی پشتیش لە خوا بكات، خوای دادگەر ئیهمالی دەكات.

كەواتە: ئینسان بە دڵ‌و سینەی خۆی دەزانێ، كە وەزعی چۆنە؟ ئایا خوا ویستوویەتی هیدایەتی بدات، یان نەیویستوە؟ ئەوە مەسەلەیەكی زۆر وردە: ویستی خوا وەك ئاسمان وایە، ئینسان هەرچی بكات لە بن سێبەری ئاسماندا دەیكات، تۆش هەرچی بیكەی بە ویستی خوا دەیكەی، كە بەرەو كوفرو گومڕایی

بچی، یان بەرەو دینداریی‌و تاعەت بچێ، هەر بە ویستی خوا دەچی، هیچ شتێك لە ویستی خوا بەدەر نیە، بەلام هەموویشی بە پێی حیکمەت‌و زانیاریی خوای دادگەرە، حیکمەتی خوا وا دەخوازێ: کەسێك دڵی بەرەو خوا وەرچەرخێ، خوای پەروەردگار یارمەتی دەدات، وە کەسێك بەرەو کوفر بچێ، خوا بە تۆبزیی نایگێڕێتەوە بۆ سەر ئیمان‌و هیدایەت، بۆچی؟ چونکە خوای کاربەجێ ویستوویەتی: ئەو ئینسانانە ئازادو سەر پشك بن، بە ویستی ئازادانەی خۆیان ڕێی ڕاست بگرن، یان ڕێی چەوت بگرن، خوای دادگەر نە بە تۆبزیی ڕێی ڕاست بە کەس دەگرێتەبەر، نە بە تۆبزییش ڕێی چەوت بە کەس دەگرێ، بەڵکو ئازادی کردوون، وەك فەرموویەتی: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾﴾ الكهف، واتە: ئنجا کێ دەیەوێ با بڕوا بێنێ‌و، کێش دەیەوێ با کافر بێ.

وە هەر ئەوەشە وایکردوە مرۆڤ بەکەڵکی تاقیکردنەوە بێ.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾، مانای وایە وەڵامی پرسیارەکەمان دەست کەوت، دەفەرموێ: ئاوا خوا سزا، (یان پیسیی، یاخود کوفر، یاخود نەفرین) دەخاتە سەر ئەوانەی ئیمان ناهێنن، کەواتە: بەهۆی ئیمان نەهێنانیانەوە، تووشی ئەو حاڵەتە بوون، کە لە بەرانبەر ئاییتی خوادا دڵیان داخراوە، سینەیان دەگوشرێ‌و دڵیان ڕێك دێ، وە ڕێگای هیدایەتی خوا نیە، بچێتە نێو دڵ‌و سینەیانەوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾﴾، ئا ئەمە ڕێبازی پەروەردگارتە، ڕێك و ڕاستە، وشەی (الصِّرَاطُ المُسْتَقِيم) بە مانای ڕێی ڕاستە‌و، ڕاستە شەقامێکی بێ گرێ‌و گۆڵ، ﴿قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾، بە ڕاستیی ئایەتەکانی خۆمانمان جوان ڕوونکردوونەوە، بۆ کەسانێك بۆ کۆمەڵێك، کە پەند وەربگرن‌و، بیر بکەنەوە.

توێــژەرەوانی قورئــان دەڵــێن: کــە دەفــەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا ﴾، ئــەو (و)اوە، واوی بادانـەوە (عـطـف)یە بۆ سـەر پێشـێ، بەڵام (هـذا) ئەمـە، ئاماژەیـە بـۆ سـێ واتایـان، دوو مانایان زانایـان باسیان کردوونو، یـەکیان ڕای خۆمـە:

١- دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ: ئـەم ڕێبازە، ئـەم ئـایینو بەرنامەیـە کـە تـۆی لەسـەری، ئـەی موحەممەد ! ﷺ ئا ئەوە ڕێبـازو ڕاسـتە شـەقامی پەروەردگـارتە.

٢- دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ: (البیـان الـذي جـاء بـه القـرآن) واتــە: ئــەو ڕوونکردنـەوانـەی قورئـان هێنـاونـی، ئـا ئەوە ڕاستە شەقامی خـوایـە.

٣- منـیش وای تێدەگـەم مەبەسـت لـەم ئایـەتە: ﴿ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗا ﴾، واتە: ئەم جۆرە مامەڵەیـەی خـوای پەروەردگار لەگەڵ بەنـدەکانی دا، مامەڵەیـەکی ڕێـكو ڕاسـتو دادگەرانـەیــە، چـۆن؟ بـۆ وێنــە: خــوا لــە ســوورەتی (البلـد)دا فەرموویـەتی: ﴿ وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ١٠ ﴾، واتـە: ئێمـە دوو ڕێیـەکانمان پێشـان داون، یــان لــە ســوورەتی (الإنســان)دا دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ٣ ﴾، واتــە: ئێمــە ڕێمــان خســتۆتە بــەردەمی: یــان سوپاسگوزار دەبێ، یان سپڵەو ناسوپاس دەبێ.

ئنجـا ئـەو جـۆرە مامەڵەیـەی خـوا، لەگـەڵ بەنـدەکانی دا، کـە: هــەر کەسێك سوپاسگوزار بوو، یارمـەتی دەدا، وە هـەر کەسێك سپڵەو نـاسـوپاس گـوزار بـوو، لێـی دەگـەڕێ، یاخود ئـەوە کـە: هەر کەسێك بـەرەو خـوا ڕۆیشــت، خـوا سینـەی گوشـاد دەکات، وە هەر کەسێك پشتی لە خوا کردو ئارەزووی نـەبوو لە خـوا نـزیك بێتـەوە، خـوا لە بەرانبەر دینی خۆیدا، سینـەی دادەخـاو دڵـی وێـك دێنێتـەوە، ئـەو جۆرە مامەڵەیـە ڕێبـازی ڕاستی خـوایە.

ئنجـا بۆچـی ئـەم مانـایـەم هەڵبـژارد؟ چونکـە بـە لای کەمـەوە لـە دوو شـوێنی دیکەی قورئـانـدا، خـوای دادگـەر بـەو شـێوەیە مامەڵەکـردن لەگەڵ بەندەکانیـدا، بـە ڕێی ڕاسـتی خۆی دانـاوە، بۆ وێنـە:

١/ لە سوورەتی (هود)دا، لەسەر زمانی هوود کە بۆ لای گەلی عاد نێردراوە، فەرموویەتی: ﴿ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمْ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: من پشتم بە خوا بەستوە، پەروەردگاری منو ئێوەشە، هیچ زیندەوەرێك نیە، مەگەر خوا پێشە سەرەكەی گرتوە (جڵەوی وی بە دەستە)، بێگومان پەروەردگارم لەسەر ڕێیەكی ڕاستە.

واتە: پەروەردگارم لەسەر ڕێیەكی ڕاستەو بە شێوەیەكی دادگەرانەو، بە ڕاستو ڕێكیی، مامەڵە لەگەڵ بەندەكانیدا دەكاتو، ستەم لە كەس ناكات.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (الحجر)دا لە ئایەتەكانی (٤١ و ٤٢) دا خوای پەروەردگار لە وەڵامی ئیبلیس دا، كە دەڵێ: هەموو بەندەكان گومڕا دەكەم، جگە لەوانەی بەندەی هەڵبژاردەی تۆن فەرموویەتی: ﴿ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: (خوا دەفەرموێ: ئەی ئیبلیس ئەوەی كە تۆ دەیڵێی هەموو بەندەكانم گومڕا دەكەی، جگە لە بەندە هەڵبژێردراوەكان) ئەوە ڕێی ڕاستی منە، بێگومان ئەوانەی بەندەی منن، تۆ دەستەڵاتت بەسەردا نین، جگە لە وانەی شوێنت دەكەون، لە سەرگەردانان.

كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ﴾، واتە: ئەم شێوە مامەڵەیەی خوای كاربەجێ لەگەڵ بەندەكانیدا كە: هەر كەسێك بەرەو خوا بچێ، دەستی دەگرێ، وە هەر كەسێك پشت لە خوا بكات، وازی لێ دێنێ، ئا ئەوە مامەڵەیەكی ڕاستو دروستو دادگەرانەی خوایە، لەگەڵ بەندەكانیدا، چونكە ئەگەر وا نەبووایە، ئەوەی بەرەو ڕووشی هاتبایە، یارمەتی نەدایاو، ئەوەی پشتیشی تێكردبایە، بەتۆبزیی هێنابایەوە، مانای وایە ئەو كاتە ئینسان بەكەڵكی تاقیكرانەوە نەدەهات، چونكە ئینسان كاتێك بەكەڵكی تاقیكرانەوە دێ، بتوانێ چەوت بڕواو ڕاست بڕوا، بەڵام دیارە خوای میهرەبان پێی خۆشە، بەندەكانی

ڕاست بڕۆن، بۆیە هەر کەسێك ڕێی ڕاست بگرێتەبەرو بەرەو خوا بڕوا، یارمەتی دەدات، بەڵام ئەگەر پشتیشی تێبکات، بەتۆبزیی نایهێنێتەوە، چونکە ئازادی کردووە لێی گەڕاوە.

**مەسەلەی دەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢٧﴾، ئەمە دەچێتەوە بۆ پێشێ، کە دەفەرموێ: ﴿قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ...﴾، یانی: ئەو کۆمەڵەی کە پەند وەردەگرنو بیردەکەنەوە، مەنزڵگای ئاشتییان بۆ هەیە، لە لای پەروەردگار یان {کە مەبەست پێی بەهەشتە، چونکە لە بەهەشت دا ناکۆکییو دەمەقاڵێو دمبەدمبەو دەنگ بەرزکردنەوەی لێ نیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ٦٢﴾مريم، واتە: قسەی ناڕێكو بێخێرو بێ نەزاکەتی تێدا نابیستن، جگە لە سەلام کردن. بەڵام لە دۆزەخ دا، هەموو نەفرین لە یەکدی دەکەن}.

وە کە دەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ﴾، ئەوانە مەنزڵگای ئاشتییان هەیە، لە لای پەروەردگاریان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەهەشت لە عەرشی خوا نزیکە، وەك لە حەدیس دا هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا سَأَلْتُمْ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ وَسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ}[1]، واتە: ئەگەر داواتان لە خوای زاڵی پایەدار کرد، داوای فیردەوسی لێبکەن، چونکە نێوەڕاستو بەرزترین پلەی بەهەشتە، وە لە سەروویەوە، عەرشی خوای بە بەزەییەوە.

---

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبي شَيْبَة برقم: (٣٤٠٧٦)، وَأَحْمَد، برقم: (٢٢٧٤٧)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٢٨٠٩)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٨٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣١٧٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٦٩)، وَقَالَ: إِسنَادُهُ صَحِيح، وأخرجه أيضاً إبنُ حِبَّانَ برقم: (٩٥٨).

هەڵبەتە هەر خوا بۆخۆی دەزانێ کە بەهەشت نزیك بوون لە خوا، چۆنە ؟ چۆنیەتییەکەی خوا دەیزانێ، بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە دێتە زەینەوەو فەرموودەکەی پێغەمبەریش ﷺ دەیگەیەنێ، کە: مادام فیردەوس بەرزترین پلەی بەهەشت بێ‌و لە سەرووییەوە عەرشی خوابێ، مانای وایە بەگشتی بەهەشت لەگەڵ عەرشی خوا لێك نزیکن.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، وە خوا سەرپەرشتیارو دۆستیانە، {هی ئیمانداران}، بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد.

ئنجا ئایا بۆچی خوای بەرز لێرەدا بەو جۆرە باسی بەهەشت دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾، موناسەبەتی وشەی (سلام) لێرەدا چییە؟ هەڵبەتە لە شوێنی دیکەش دا باسی کردوە، بەڵام لێرەدا موناسەبەتی ئەوەیە کە: لە قیامەتدا سەلامەتیی بۆ مرۆڤ زۆر گرنگە.

وە موناسەبەتێکی دیکە ئەوەیە کە: ئەو ئیماندارانە لە دنیادا لەگەڵ خوا لە حاڵەتی ئاشتەوایی دا بوون‌و لە حاڵەتی شەڕو ناکۆکییدا نەبوون، وە لە حاڵەتی سەرپێچیی‌و لاملیی دا نەبوون، بە پێچەوانەی کافرەکانەوە، بۆیە هەر کەس لە دنیادا لەگەڵ خوا لە حاڵەتی ئاشتیی‌و (سلم) دابێ، خوای پەروەردگاریش لە قیامەت دا، دەیباتە ئەو شوێنەی کە پڕە لە ئاشتیی‌و خێرو خۆشیی‌و سەلامەتیی.

هەروەها ئینسانی ئیماندار، نەك هەر لەگەڵ خوادا، بگرە لەگەڵ بەندەکانی خواشدا، لە حاڵەتی ئاشتیی‌و (سلم) دایە، مەگەر ئەوانەی شەڕی پێبفرۆشن‌و بەری دەرگای بگرن، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»[1]، واتە: مسوڵمان کەسێکە مسوڵمانان لە دەست‌و زمانی سەلامەت بن، هەروەها دەفەرموێ: «الْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمَائِهِمْ

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٨١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٩٩٦)، وَالحُمَيدِيُّ برقم: (٥٩٥)، وَأَحْمَد برقم: (٦٥١٥)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧١٦)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٣٠)، وَالطَّبَرَانِيُّ في "الأوسط" برقم: (٣٥٩٨).

وَأَمْوَالِـهِمْ﴾[1]، واتـە: ئیمانـدار کەسـێکە خـەڵك بـە ئەمینـداری دابنـێ، لەسـەر خوێنیـانو مـاڵو سامانیان.

کەواتە: کەسێك ئەهلی ئـەمانو سـەلام بـێ، لەگـەڵ بەنـدەکانی خـوادا، شـایستەی ئەوەیـە کە خـوای پەروەردگاریش بیخاتە مەنزڵـگای ئاشتییو سـەلامەتیی خۆیەوە.

ئنجـا کـە دەشـفەرموێ: ﴿وَهُوَ وَلِيُّهُم﴾، وە خـوا سـەرپەرشتیارو دۆسـتی ئیمانـدارانـە، بـەڵام بەهـۆی چییـەوە دۆسـتو پشـتیوانیانـە؟ خـۆ هـەر لەگـۆتـرە نیـە، بەڵکـو: ﴿بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾، بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەیـانکرد، کەواتـە: لـە ڕاسـتییدا چارەنووسـی ئینسـان، بـۆ ڕەفتـارو هەڵسـوکەوتو هەڵوێسـتەکانی خـۆی دەگـەڕێتـەوە چ چاك ، چ خـراپ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.



١) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٨٩١٨)، وَالتِّرْمِـذِيُّ بـرقم: (٢٦٢٧) وَقَـالَ: حَسَـنٌ صَـحِيحٌ، وَالنَّسَـائِيُّ فـي "الكبرى" برقم: (١١٧٢٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٨٠)

# دەرسی چواردەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەدا ئایەتەکانی: (١٢٨ تا ١٣٥) واتە: هەشت ئایەت دەتوێژینەوە، تەوەری سەرەکیی ئەم هەشت ئایەتە موبارەکە بریتییە لە خستنەڕووی سەرەنجامی شوومی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەران، لە ڕۆژی دوایی دا، وە پاشان سەرزەنشت کردنیان، لەلایەن خوای زاڵی دادگەرەوە، لەسەر ئەوە کە لامل بوونو سەرپێچیی کار بوون لە پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام)، وە لە پەیامو بەرنامەکانیان.

وە هەروەها خوا ﷻ باسی دادگەریی و کاربەجێی و بێنیازیی و میهرەبانیی و دەستەڵاتداریێتی ڕەهای خۆی، دەکات.

وە لە کۆتایی دا بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: کە لە بێبڕوایەکان بێمنەت بە، لێیان بێباك بە، چییان لە دەست دێ، با بیکەن، وە کە دڵنیاشیان بکاتەوە، کە سەرەنجامی مەنزڵگای دوارۆژ، هی ئیماندارانە، ستەمکارانیش هەرگیز سەرفراز نابنو بە مراد ناگەن.

﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ وَقَالَ
أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ
لَنَاۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ١٢٨
وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعۡضَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٢٩ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ
أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ
قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ
كَانُواْ كَٰفِرِينَ ١٣٠ ذَٰلِكَ أَن لَّمۡ يَكُن رَّبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا
غَٰفِلُونَ ١٣١ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ
١٣٢ وَرَبُّكَ ٱلۡغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۚ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ
بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ١٣٣
إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأٓتٖۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ١٣٤ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ
عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ
ٱلدَّارِۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١٣٥ ﴾.

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە ئـەو ڕۆژە کـە (خـوا) هـەموویان کۆدەکاتـەوە (لـە گۆڕەپـانی خڕکرانـەوەدا) (دەڵێین:) ئەی کۆمـەڵی جند ! زۆرتـان لە مرۆڤەکان (گومـڕا) کـردن! وە دۆستەکانیـان لـە مرۆڤان گوتیان: پەروەردگارمان ! هەنـدێکمان لـە هەنـدێکمان بەهرەمەنـد بـووین، وە (ئێستاش) گەیشتووینە ئـەو کـاتەی کـە بـۆت دانـابووین، (خـوا) فـەرمووی: (ئاگـری دۆزەخ) جێگای حەوانەوەتانـەو، مەگــەر ئـەوەی خـــوا بیـــەوێ، دەنا تێیـدا هەمیشـەیی دەبـن، بەڕاستیی پـەروەردگارت کـاربەجێی زانایـە ﴿١٢٨﴾ وە بـەو شـێوەیە (کـە شـەیتانە جندەکـانمان بەسەر مرۆڤـە بێبـڕوایەکاندا زاڵ کـردوون) بەشـێك لـە سـتەمکاران (کـە زلـە زلەکانیـانن) بەســەر بەشـــێکیاندا (کــە شــوێنەکەوتووەکانیانن) زاڵ دەکـــەین‌و، دەیانکەینە هەمەکارەیان، بە هۆی ئەوەوە کە (لە کـردەوەی خـراپ) دەیانکـرد ﴿١٢٩﴾ ئـەی کۆمەڵی جنـدو مرۆڤ ! ئـەدی لـە خۆتـان ڕەوانـەکراوانتان بـۆ نەهـاتن، ئایەتـەکانمانیان بەسـەردا دەخوێندنـەوەو، لـە دیـداری ئـەمڕۆ دەیانتـرسـاندن؟ گوتیـان: (بـا) شـایەدیی لەسـەر خۆمان دەدەیـن، وە ژیـانی دنیا فریـوی دایـن، وە شـایەدییان لەسـەر خۆیانـدا کە ئەوان بێبـڕوا بـوون ﴿١٣٠﴾ (ڕوونکردنـەوەی) ئـەو (ڕاستیی)ەش بـۆ ئەوەیـە کـە (بزانـرێ) پـەروەردگارت بــە هـــۆی ســـتەمەوە ئاوەدانییـــەکان لەبـــەین نابـات، لــە کاتێکـدا کــە خەڵکەکەیـان بـێ ئاگـان ﴿١٣١﴾ وە بـۆ هـەر کەسـێك چـەندان پلـە هـەن، بەهـۆی ئـەو (کـردەوە باشـان)ەوە کـە دەیـانکرد، وە پـەروەردگارت لـەوەی "بێبـــڕوایەکان" دەیکـەن بێئـاگا نیە ﴿١٣٢﴾ وە پەروەردگارت دەوڵەمـەندی خاوەن بەزەیی یە، ئەگەر بیــەوێ لاتــان دەبات (لەسـەر زەوی) و هەر کەسێکی بوێ لە شوێنتان دایدەنـێ، وەك چۆن ئێـوەی لـە وەچەی کۆمەڵێکی دیکە پێگـەیاندوە ﴿١٣٣﴾ بێگومان ئەوەی بەڵێنتان پێـدەدرێ هـەر دێ، وە ئێـوە دەستەوسـانکەر نـین ﴿١٣٤﴾ بڵـێ: ئـەی خەڵکـینە! چیتان لەدەسـت دێ بیکـەن، مـنیش ئەنجـامدەر (ی ئـەرکی سەرشاسـنم)م، بێگومـان لەمـەودوا دەزانـن سـەرەنجامی مەنزڵگا (ی دوارۆژ) بۆ کـێ دەبـێ ! بە دڵنیـایی یەوە ستەمکاران سـەرفراز نـابن ﴿١٣٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(يَـٰمَعۡشَرَ ): (معشر) كۆیەكەی (معاشر)ە، واتە: كۆمەڵ، دەستە تاقم.

(ٱسۡتَمۡتَعَ ): (استمتع: طلب التمتع، والمتاع انتفاع ممتد الوقت)، (استمتع) واتە: داوای كرد كە لە شتێك بەهرەمەندبێ‌و سوود وەربگرێ، (متاع) بریتیە لە بەهرە وەرگرتنێك كە ماوەیەكی پێ بچێ.

(مَثۡوَىٰكُمۡ ): واتە: جێگای حەوانەوەتان، (الثواء: الإِقَامَة مَعَ الإِستقْرَار) (مَثْوَى) بریتیە لە شوێنی نیشتەجێبوون لەگەڵ ئارامیی‌و سەقامگیریی دا، (ثوى، یثوي، ثواءً) واتە: (استقَر، یَستقِر، استقْرَارًا) واتە: لەو شوێنەدا نیشتەجێبوو، وە سەقامگیر بوو.

(نُوَلِّي بَعۡضَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بَعۡضَۢا): (نُسَلّطُ بَعْضَ الظّالِمِينَ على بَعْضٍ) هەندێك لە ستەمكاران بەسەر هەندێكیاندا زاڵ دەكەین، دەیانكەینە كاربەدەست‌و حوكمڕانیان، یاخود دەیانكەینە دۆست‌و پشتیوانیان، (الوَلاية: النُّصْرَة، وَالوِلايةُ: تَولّي الأَمْر)، (وَلاية) واتە: پشتگرتن‌و یارمەتیدان، بەڵام (وِلاية) واتە: سەرپەرشتییكردن‌و مشوورخواردن.

(يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَـٰتِي ): واتە: ئایەتەكانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوە، (قَصّ عَلَيْهِ الخَبَر: رَوَاهُ عَلَى وَجْهه) بەو شێوەیە كە ڕووداوەكە ڕووی دابوو، گێڕایەوە.

(عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ ): واتە: بەو شێوەیەی كە ئێوە هەن، یاخود بەو حاڵەتەی كە هەن، (مَكنَ مَكانَة: ضَخُمَ ضَخَامَةً عَظُم عِنْدَهُ وَارتَفَع فَهُو مكين)، (مكانة) واتە: ڕێزو پێگە، جاری واش هەیە، بە مانای دەست ڕۆیشتوویەتی دێ.

(عَـٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ): (الدار: المنْزل) مەنزڵگا، كە لێرەدا وشەی (دار)، لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر (ال)ی تەعریفی لەسەر بوو، مەبەست پێی قیامەتە، بەپێی سیاق دەزانرێ، جاری وایە مەبەست پێی بەهەشتە، جاری وایە مەبەست پێی دۆزەخە.

# مانـای گشـتـی ئایەتەكـــان

لـەم ئایـەتـانـەدا خـوای بـەرزو مـەزن، باسـی سـەرەنجامی شـوومی كافرەكـانو شوێنكەوتووانی كافران دەكات، وە باسی ئەوە دەكات كە خوای كاربەجێ لە قیامەتێ سەرزەنشتو سەركۆنەیان دەكات، ئەوانیش وەڵامێكیان پێ نابێ، جا ئەو بێبڕوایانە جند بووبن، یان مرۆڤ بووبن.

دەفـەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ﴾، وە ئەو ڕۆژەی كە تێكڕایان كۆدەكاتەوەو خڕیان دەكاتەوە، لە كوێ كۆیان دەكاتەوە؟ خوا لە قیامەت كۆیان دەكاتەوە، ئنجا ئایا شوێنەكە كوێیە؟ لە فەرمایشتی پێغەمبەردا وەسفی ئەم شوێنە كراوە، فەرموویەتی: زەوییەكە گۆڕەپانێكی سپی وەك نان وایە، بێ گرێو گۆڵەو، هیچ نیشانەیەكی هیچكەسی لەسەر نیە: ﴿عن سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦١٥٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٩٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣٢٠).

كەواتە: ئەم سەر زەوییەی ئێمە نیە ! چونكە خوا دەربارەی ئەو زەوییەی كە لە دواڕۆژ خەڵكی لەسەر كۆدەكاتەوە، فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾إبراهيم، ئەو ڕۆژە كە نە زەوی وەك خۆی دەمێنێ، نە ئاسمانەكان، وە خەڵكی دێنە دەرێ بۆ خوای تاكی مل پێكەچكەر.

ئنجا كە خوا بە سەركۆنەوە سەرزەنشتەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی كە خوا هەموویان كۆدەكاتەوە (دەفەرموێ:) ئەی كۆمەڵی جند! زۆرتان لە مرۆڤەكان گومڕا كردنو پەلكێشتان كردنو بە لای خراپەتان دا بردن، لێرەدا مەبەست لە (كۆمەڵی جند) جندە شەیتانەكانە، چونكە جند ئیمانداریشیان هەیە، واتە: خوا دەفەرموێ: (یا

مَعْشَرَ الجَنِّ الكَفَرە) یان (یا مَعْشَرَ الجِنِّ الشَّیاطِین)، وە بە پێی سیاقەکە دەزانرێ کە مەبەست جندە کافرەکانە.

ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە ئینسانەکان بە زۆریی بەهۆی شەیتانەکانی جندەوە سەرگەردانو گومڕا دەبن.

﴿وَقَالَ أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ﴾، دۆستەکانیان لە مرۆڤەکان، (واتە: دۆستی شەیتانە جندەکان) گوتیان: پەروەردگارمان! هەندێکمان لە هەندێکمان بەهرەمەند بووین، هەندێکمان سوودمان لە هەندێکمان بینی، دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی سوود بینینی جند لە ئینسان، وە سوود بینینی ئینسانەکان لە جند دەکەین، چییەو چۆنە؟ واتە: ئێمە پێکەوە بەرژەوەندییمان گۆڕیوەتەوە، ﴿وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَا﴾، وە گەیشتینە ئەو کاتەی تۆ بۆت داناوین، وشەی (أجل) بریتیە لە کاتی دیاریکراوی کۆتایی هاتنی شتێك، بۆ نموونە: دەگوترێ: فلان کەس ئەجەلی هاتوە، یانی: کاتی دیاریکراوی مەرگی گەیشتوە، کە دەبێ دنیا بەجێبێڵێ، واتە: لێرەدا مرۆڤەکان دان بەوەدا دەنێن، کە ئەوە هەر خەتای شەیتانە جندەکان بوو، کە ئەو مرۆڤانەیان گومڕا کردوە، بەڵام دیارە خۆشیان ئارەزوومەندی ئەوە بوون.

ئنجا با بزانین خوا چی دەفەرموێ؟ ﴿قَالَ ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ﴾، (خوا) فەرمووی: ئاگری دۆزەخ جێگای حەوانەوەتانە، جێگای تێدا نیشتەجێ بوونتانە، وە ئەی مرۆڤو جندەکان! ئێوە هەردووکتان بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، مەگەر ئەو ئەندازەیەی خوا بیەوێ.

ڕەنگە یەکێك بڵێ: ئایا جندو مرۆڤە کافرەکان لە دۆزەخ دا هەتا هەتایی و هەمیشەیی نابن، بۆچی لێرەدا ئەگەری تێخستوە؟ ئەوە دوایی باسی دەکەین، کە مەبەست پێی چییە؟ ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ﴾، بێگومان پەروەردگارت کاربەجێی زانایە، واتە: کە دنیای داناوە، بۆ جێی تێدا تاقیکردنەوەی جندو

مرۆڤان، وە دۆزەخێکی داناوە بۆ شوێنی سزا، وە بەهەشتیشی داناوە بۆ پاداشت دانەوەیان، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، ئاوا هەندێك لە ستەمكاران دەكەینە سەرپەرشتیاری هەندێكیان، یان هەندێكیان دەسەڵاتدار دەكەین، بەسەر هەندێكیاندا، یان هەندێكیان دەكەینە دۆستو نزیكی هەندێكیان.

ئنجا ئایا ئەوە بەهۆی چییەوەیە؟ بەهۆی ئەو كردەوانەوەیە كە دەیانكەن، واتە: كردەوەكانی ئینسانن كە دۆستەكانی دیاریی دەكەن.

كەواتە: خوای دادگەر لەگۆترە هەندێك لە مرۆڤەكان ناكاتە شوێنكەوتووی شەیتانەكانی جند، بەڵكو بەهۆی ئەو كردەوە خراپانەوە كە دەیانكەن، شایستەیی ئەوەیان پەیدادەبێ كە لە شەیتانەكان نزیك بن، وەك خوا لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾الأعراف، واتە: ئێمە شەیتانەكانمان كردوە بە دۆستو پشتیوانو نیزیك، بۆ ئەو كەسانەی كە ئیمان ناهێنن.

ئنجا خوا جارێكی دیكە بانگی مرۆڤایەتیی دەكات، وە بانگی جندانیش دەكات، جندو مرۆڤ پێكەوە، دەفەرموێ: ﴿ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ﴾، ئەی كۆمەڵی مرۆڤو جند! ئایا لە خۆتان ڕەوانەكراوتان بۆ نەهاتن ؟ ئنجا ئایا ئەو ڕەوانەكراوانە هەر مرۆڤ بوون، یان لە نێو جندیش پێغەمبەر هەبوون ؟ زۆربەی زۆری زانایان ڕایان وایە، كە تەنیا لە نێو مرۆڤەكاندا پێغەمبەر هەبوون، ئەدی بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿ مِّنكُمْ ﴾، لە هەردووكتان ؟ وەڵامی ئەمەش لە مەسەلە گرنگەكان دا ڕوون دەكەینەوە، ﴿ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ﴾، ئایەتەكانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوە، وە ئایا نەیانترساندنو وریایان نەكردنەوە، لەم دیدارەی ئەمڕۆتان، كە دێنەوە بۆ لای من ؟ ﴿ قَالُوا شَهِدْنَا عَلَىٰ

أَنفُسِنَا ﴾، گوتیان: شایەدیی دەدەین لەسەر خۆمان، کە پێغەمبەرانمان بۆ هاتن‌و ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا خوێندینەوە، وە ئاگاداریشیان کردووینەوەو گوتوویانە: ئەم ژیانە دنیاییە، قۆناغێکی دیکەی بە دوادا دێ، کە بەرزەخەو، پاشان قیامەت‌و لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەیە.

خــوا دەفــەرموێ: ﴿ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴾، بەڵام ژیانی دنیا فریوی دان‌و هەڵیخەڵەتاندن، وە شایەدییان لەسەر خۆیاندا کە ئەوانە بێبڕوا بوون.

ئنجا لێرەدا خوای دادگەر باسی دادگەریی خۆی دەکات دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَن لَّمۡ يَكُن رَّبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا غَٰفِلُونَ ﴾، ئا ئەوەمان بۆیە ڕوونکردەوە ـ کە بەو شێوەیە ڕەفتارمان لەگەڵ جندو مرۆڤەکان دا کردوە، ـ چونکە پەروەردگارت فەوتێنەری ئاوەدانییەکان نیە بە ستەم، لە کاتێکدا کە دانیشتووانی ئەو ئاوەدانییانە، بێئاگان، واتە: ئەگەر بێئاگابن‌و پێغەمبەرانیان بۆ نەنێررابن، خواش بیانفەوتێنێ، ئەوە ستەمە، وە ستەمیش لە خوا ناوەشێتەوە.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: پەروەردگارت بەهۆی ستەمەوە خەڵکی ئاوەدانییەکان نافەوتێنێ، ئەگەر بێئاگابن، واتە: دەبێ ئاگادار بکرێنەوە، تاکو دەست لەو ستەمە هەڵبگرن، ئنجا ئەگەر دەستیان هەڵنەگرت، ئەوجار دەیانفەوتێنێ، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْ ﴾، وە بۆ هەر کامێك لە بەندەکانی خوا، لە جندو مرۆڤ، چەندان پلە هەن، بۆ ئەو کردەوانەی کە دەیانکەن، هەر کەسە بەپێی کردەوەی خۆی‌و بەپێی چاکەو خواپەرستیی خۆی، پلەیەکی هەیە، هەروەك چۆن بەهۆی خراپییشەوە، هەر کەسە پێگەیەکی هەیە لە ئاگردا، بەهۆی چاکەکانیشەوە، هەر کەسە پلەیەکی هەیە لە بەهەشتدا، وەك چۆن خوا لە بەهەشت پلەکان (درجات)ی داناون، لە ئاگریش قادرمەکان (درکات)ی داناوە، (درجات) بۆ سەریێیە، (درکات) بۆ خوارێ، ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴾، وە

پەروەردگارت لەوە بێئاگا نیە کە دەیکەن، ﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ﴾، وە پەروەردگارت بێنیازی خاوەن بەزەییە، بێنیازەو پێویستی بە کەس نیە، وە زۆر خاوەنی بەزەییشە، ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ ﴾، ئەگەر بیەوێ، ئێوە لادەبات، گەسکێکتان لێدەداتو هەمووتان ڕِدەماڵێ، یەکی لەسەر نەکەوتوون، ﴿ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴾، وە هەرکەسێکی بوێ دەیهێنێتە شوێنی ئێوە، وەك چۆن ئێوەشی پێگەیاندوە لە وەچەی خەڵکێکی دیکە، واتە: خوا دەتوانێ ئێوە لابەرێو، خەڵکێکی دیکە لە شوێنی ئێوە دابنێ، لەم سەر زەوییە، ژیانی بەشەرو جند بەردەوام دەبێ، ئەگەر ئێوە خراپ بنو، خوا ئێوەش لابەرێ، یەکی ناکەوێ، وەك چۆن ئەوانەی پێشێ لەبەین بردوونو، ئێوەی لە شوێنی وان دانا، ئێوەش لادەباو، خەڵکێکی دیکەتان دێنێتە شوێن، کە ئەوە هەڕەشەیە، خوا لێیان دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوا ڕەحمەتو بەزەیی خۆشی پێیان پێشاندەدات: ﴿ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأَتٍ ﴾، بێگومان ئەوەی کە بەڵێنتان پێ دەدرێ دێ، یاخود ئەوەی هەڕەشەتان پێی لێدەکرێ، دێ وشەی (توعَدُون) (مجهول الفاعل) هاتوە، دەگونجێ لە: (وَعَد، يَعِدُ، وَعداً)ەوە بێ، وە دەگونجێ لە (أَوْعَد، يُوعِد، وَعِيداً)ەوە بێ، چونکە (وَعيد) واتە: هەڕەشە، بەڵام (وعد) واتە: موژدە، ئەم وشەیەش هەردووك مانایان دەگەیەنێ، واتە: ئەوەی کە خوا موژدەی پێداون، وە ئەوەش کە هەڕەشەی پێ لە کافرەکان کردوە، هەر دێ، ڕوویەکی ئیعجازو دەستەوسانکەریی قورئان لەوەدایە، ئەم وشەی: (تُوعَدون)ە، ئەگەر بەم شێوەیە نەهاتبایە، بە هەر شێوەیەکی دیکە هاتبایە، هەر یەك مانای دەگەیاند، بۆ وێنە: ئەگەر بە (معلوم الفاعل) هێنابایو فەرمووبای: (إِنَّمَا يعِدُكُم) ئەو کاتە تەنیا موژدەی دەگرتەوەو هەڕەشەی نەدەگرتەوە، وە ئەگەر فەرمووبای (إِنَّمَا يوعِدُكُم بە ...) تەنیا هەڕەشە (وعید)ی دەگرتەوە، بەڵام ﴿ تُوعَدُونَ ﴾، هەردووکیان دەگرێتەوە، ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴾، وە ئێوە دەستەوسانکەر نین، (عجز) واتە: بێ دەستەڵاتیی، دەستە پاچەیی، (معجز) واتە:

دەستەپاچەکەرو بێ دەستەڵاتکەر، کەواتە: ئەوەی خوا بەڵێنی داوە، بێ، چ بە باری موژدەدا، چ بە باری هەڕەشەدا، هەر دێ، وە کەسیش ناتوانێ ڕێگای لێ بگرێ.

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ:﴿ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٞ ﴾، بڵێ: ئەی گەلەکەم! لەسەر ئەو حاڵەتەی کە خۆتان لەسەریینی، یاخود بە پێی توانای خۆتان هەرچی لە تواناتاندا هەیە، بیکەن، وە منیش ئەوەی لەسەر شانمە بە پێی توانای خۆم دەیکەمو جێبەجێی دەکەم، ﴿ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾، لەمەودوا بە تەئکید دەزانن، چی دەزانن؟ ﴿ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ ﴾، کێ سەرەنجامی مەنزڵگای هەیە، واتە: ئایا ڕۆژی دوایی لە گرەوی کێ دایەو، کێ سەرەنجامی چاکی هەیە لە دوارۆژدا، من یان ئێوە، منێك کە بە ڕێی خوادا ڕۆیشتووم، یاخود ئێوە کە بە ڕێی شەیتاندا ڕۆیشتوون؟ ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، بێگومان ستەمکاران سەرفراز نابن، واتە: ئەگەر ئێوەش لەسەر ئەو ستەمکارییەتان بمێننەوە، بە تەئکید سەرفراز نابن، پێچەوانەی سەرفرازییش، دیارە ماڵوێرانیی و ناکامیی و بێ مرادییە.

# چەند مەســەلەیەکی گرنـگ

**مەسەلـەی یەکـەم:** کـە خــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَا ﴾ وشـەی: ﴿ يَحۡشُرُهُمۡ ﴾ بـە (نحشـرهم)یـش خوێنـراوەتـەوە، هـەردوو قیـرائەتەکـــە هـــەن، جـــا زانایـــانی زمـــانی عەرەبـــیی دەڵـــێن: (یـوم) بـــەچی (منصوب)ە؟ دەڵێـن بـە (أذكـر) یـانی: (أُذكـر یومَ...) یـاد بکـەوە ئـەو ڕۆژەی کە هـەموویان کـۆدەکرێنـەوە، کە مەبـەست پێـی ڕۆژی قیـامـەتـە.

وشـەی (معشر) و (قوم) و (جماعة) هـەموویان بـە مانـای کۆمەڵە خەڵکێك دێـن.

کــە دەفـەرمـــوێ: ﴿ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ ﴾، واتـــە: خـــوا بـــە جنـــدە شـەیتـانەکـان دەفـەرموێ: زۆر لـە مرۆڤەکـانتـان گـومڕا کـرد، یـاخود زۆرتـان لـێ کردوونـە شـوێنکەوتـەی خۆتـانو، بـە ڕێـی بـەتـاڵو پووچـدا بردووتـانن، ئنجـا مرۆڤـەکان کـە دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَا ﴾، پـەروەردگارمان! هـەندێکمان لە هـەندێکمان بـەهرەمەند بووین، خـوای زانـاو شـارەزا لە ســووڕەتی (الجـن)دا باسـی ئـەوەمان بـۆ دەکـات، کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٞ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٖ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقٗا ٦ ﴾، وە هــەندێك لــە پیـاوانی مـرۆڤ ، پـەنـایـان دەبردە بـەر هـەندێك لە پیـاوانـی جنـد، ئەوانیـش زیـاتر گومـڕایـان دەکـردن.

کـە ئێستـاش هـەر وایـە، کـاتی خـۆی وابـووە، کەسێك بـەلای دۆڵـێكو شـیوێك دا لایداوە، گوتوویـەتی: (أَعُوذُ بِرَبِّ هَذَا الوَادِي) پـەنـا دەگـرم بـە گـەورەی ئـەم دۆڵە،

پەنایان دەبردە بەر شەیتانە جندەکان، ئەوانیش زیاتر پێی لەخۆبایی دەبوون، ئێستا ئەوانەی جادوو لە خەڵك دەکەن، بە زۆریی بەهۆی شەیتانەکانەوە جادوو دەکەن، یانی: ئەو جادووگەرانە سوود دەبینن لەو شەیتانانە کە جادوویان بۆ دەکەن، وە شەیتانەکانیش سوود لەوان وەردەگرن، کە بەهۆی ئەو جادووکردنەوە، خەڵك تووشی کێشەو گرفتی خێزانییو کۆمەڵایەتیی دەکەن، ئەوەش شتێکی دیارەو خوای پەروەردگار بە دەقی ئایەت دەفەرموێ: ﴿ يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ﴿١٠٢﴾ ﴾البقرة، واتە: بەهۆی ئەو جادووەوە، ژنو مێرد لێك دەکەن، ئەوە سوود لە یەکدی بینینی مرۆڤە گومڕاکانو شەیتانە جندەکانە، کە بۆ شتی خراپ هاوکاریی یەکدی دەکەنو یارمەتیی یەکدی دەدەن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ﴾، واتە: ئێمە گەیشتینە ئەو کاتەی کە بۆت دانابووین، بۆت ناوزەند کردووین، یاخود بۆت دوا خستبووین (أخَّرت لنا) هەردوو ماناکەی هاتوون: (أجَّلَ: وقَّت) کاتی دیارییکرد، وە (أجَّلَ: أخَّر) دوایخست.

<u>**مەسەلەی دووەم**</u>: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾، ئاگر جێگاو ڕێگاتانەو شوێنی حەوانەوەتانە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، بێگومان پەروەردگارت کاربەجێی زانایە.

پێشتر باسمان کرد (ثَوَى، يَثْوَي) واتە: (أَقَامَ ، يُقيم وَاستقَرّ، يَسْتَقِرُّ) مایەوە لەو شوێنەی تێیدا نیشتەجێ بووە دەمێنێتەوە.

## مشتومڕێکی زانایان لەبارەی هەمیشە مانەوە لە دۆزەخ دا

توێژەرەوانی قورئان دەربارەی ئەم ڕستە موبارەکە کە دەفەرمویّ: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، مشتومڕێکی زۆریان لەنێودا دروست بووە، خوا دەفەرمویّ: لە دۆزەخدا دەمێننەوە، مەگەر ئەوەی خوا بیەویّ.

گوتوویانە: ئایا کافرەکانی جندو مرۆڤ ، لە دۆزەخ دێنە دەریّ؟ ئەدی بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، مەگەر ئەوەی خوا بیەویّ؟ کەچی لە شوێنی دیکە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾﴾ الجن، واتە: ئەوەی سەرپێچیی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بە تەئکید ئاگری دۆزەخی هەیەو تێیدا دەمێنێتەوە بە هەمیشەیی، ئەوە بۆ ئەهلی دۆزەخ وایفەرمووە، وە بۆ ئەهلی بەهەشتیش فەرموویەتی: ﴿جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٨﴾﴾ البينة، واتە: (ئیمانداران) پاداشتیان لە لای پەروەردگاریانە، کە بەهەشتی عەدنەو ڕووباری بە ژێردا دەڕۆن، تێیدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی، کەچی لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾؟

سەرەتا دەڵێین: ئەم ئایەتە، وەك ئەم سیّ ئایەتەی سوورەتی (هود)ە، کە خوا دەفەرمویّ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ﴿١٠٨﴾﴾، واتە: ئەوانەی بەدبەخت بوونو تووشی ڕۆژی ڕەش

بوون، لە ئاگری دۆزەخ دان، لەوێدا هەناسە هەڵمژینو هەناسە دانەوەیان هەیە (یاخود ئاگری دۆزەخ هەناسە هەڵمژینو هەناسە دانەوەی هەیە) تێیدا دەمێننەوە، هەتا ئاسمانەكانو زەوی بەردەوام بن، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، بێگومان پەروەردگارت هەرچییەكی بوێ، دەیكات.

وە ئەوانەی كە بەختەوەر بوون لە بەهەشتدا، بە هەمیشەیی دەمێننەوە، هەتا ئاسمانەكانو زەوی بەردەوام بن، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، ئا ئەوە بەخششێكی نەبڕاوەیە.

زانایان لێرەدا چەند وەڵامێكیان داونەوە:

١/ هەندێك دەڵێن: خوا تەنیا ویستوویەتی لێرەدا ڕەهایی ویستی خۆی پێشانی ئێمە بدات، واتە: ویستی خوای باڵادەست بەنددارو بەستراونیە، بە هیچ شتێكەوە، چونكە خوا دەتوانێ كۆتایی بە بەهەشتو دۆزەخیش بێنێ، بەڵام مادام بۆخۆی هەواڵی پێداوین كە بەهەشتییەكان، تا ئەبەدو بەبێ بڕانەوە لە بەهەشت دەمێننەوە، وە دۆزەخییەكانیش كە كافرن، بەبێ بڕانەوە لە دۆزەخ دەمێننەوە، دیارە هەر وایە.

كەواتە: ئەم ئایەتەش كە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، تەنیا بۆ ئەوەیە كە پێشانمان بدات: ویستو خواستی خوای پەروەردگار ئازادەو ڕەهایەو بەستراونیە، ئەگەرنا مەبەست ئەوەنیە، ئەم ڕستە قورئانییانە لەگەڵ شوێنەكانی دیكەی قورئان دا تێكبگیرێن.

٢/ هەندێكیش گوتوویانە: ئەو (ما)ی كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، بە مانای (مَنْ) دێ، چونكە ئیماندارانیش بە ئەندازەی گوناهەكانیان لە دۆزەخ دا دەمێننەوەو دەسووتێن، كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، واتە: (إِلاَّ مَنْ شَاءَ الله) یانی: مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بیەوێ، بە ماوەیەكی كاتیی تێیدا بمێنێتەوە، تاكو پاك دەبێتەوەو بە ئەندازەی گوناهەكانی دەسووتێ، دوایی دەربازی دەبێ، چونكە ئیماندارە.

٣/ هەندێکیش گوتوویانە: ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾، واتە: ئەو ئاگرە بەردەوام دەبێ، وە تێیدا دەمێننەوە، مەگەر ئەو کاتەی پەروەردگارت بیەوێ لە نێو ئاگر بچنە دەرو، بچن بۆ (زمهریر) کە شوێنێکی زۆر زۆر ساردە[1]، لەبەر سارديان مرۆڤ دەسووتێنێ.

بەڵام لە ڕاستییدا ڕای یەکەمیان بەهێزترە.

ئنجا لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾، بێگومان پەروەردگارت کاربەجێی زانایە، ئەمە وەڵامی ئیشکالێك دەداتەوە، کە ڕەنگە یەکێك بڵێ: چۆن ئەگەر کەسێك پەنجا ساڵ کوفرو شیرك و نیفاق و بێدینیی کردبێ و مردبێ، خوا بەبێ بڕانەوە سزای دەدات؟ وە هەروەها کەسێك شەست ساڵ خواپەرستیی کردبێ، خوا بەبێ بڕانەوە دەیخاتە بەهەشتەوە ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: بۆیە خوا ئەوە دەکات، چونکە ئەوەی کە کافرەو هاوبەش بۆ خوا دانەرەو مونافیقە، ئەگەر ژیانێکی هەمیشەییشی هەبێ، هەر لەسەر کوفرەکەی خۆی دەمێنێتەوە، وەك لە شوێنی دیکەدا هاتوە، فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾﴾الأنعام، ئەگەر بشگێڕدرابانەوە، دەگەڕانەوە سەر ئەوەی لەسەری بوون، وە بە نسبەت ئەهلی ئیمانیشەوە، دیارە کەسێکی ئیماندار، ئەگەر خوا هەتا هەتا ژیانی پێبدات، هەر بە ئیمانەوە دەمێنێتەوە.

شایانی باسە زانایان هەموو یەکدەنگن لەسەر مانەوەی بەهەشت بە هەمیشەیی، بەڵام بۆ هەمیشە مانەوە لە دۆزەخدا، جۆرە ڕاجیاییەکی تێدایەو هەندێك دەڵێن: کاتێك دێ، خوای باڵادەست کۆتایی بە دۆزەخ بێنێ و کەسی تێدا نەمێنێ، بەڵام بێگومان ئەوە ڕایەکی زۆر بێهێزە، بەس هەر ویستم ئاماژەی پێ بکەم.

---

١) مختار الصحاح، ص: ٢٤٩.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، واتە: وەك چۆن جندو مرۆڤ لە یەكدی بەهرەمەند دەبن، بە باری شەڕو خراپەدا، شەیتانەكانی جند، لەگەڵ مرۆڤە سەرلێشێواوو سەرگەردانەكان لە یەكدی بەهرەمەند دەبنو، یەكدی تووشی زیانو زەرەر دەكەن، كە ئەوان پێیان وایە، ئەوە بەهرە وەرگرتنە، بەڵام بێگومان بەهرەی خراپ وەرگرتنە لە یەكدی، بە هەمان شێوەش هەندێك لە ستەمكاران دەكەینە دۆستو نزیكی هەندێكیان ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًا ﴾، كە دیارە مەبەست لە (الظالمین) واتە: خراپەكاران، ستەمكاران، (ظلم) لە بەكارهێنانی قورئاندا، وە لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لە: (وَضْعُ شيءٍ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ)[1] واتە: دانانی شتێك لە غەیری شوێنی خۆیدا، واتە شتی بێ جێ، كە خوای كاربەجێ، هەم شیركی بە زوڵم ناوبردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ۝١٣ ﴾ لقمان، وە هەم كوفریشی بە زوڵم ناوبردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٢٥٤ ﴾ البقرة، وە دەستدرێژیی كردنە سەر مافی خەڵكی دیكە، وە شكاندنی سنوورەكانیشی، بە زوڵم ناو بردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ۝٢٧٩ ﴾ البقرة، واتە: نە ستەم لە خەڵك بكەن، نە با خەڵكیش ستەمتان لێ بكات.

ئنجا خوای بەرز كە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًا ﴾، ئاوا بەو شێوەیە واتە: وەك چۆن شەیتانەكانی جندو مرۆڤە سەرگەردانەكان،

١) مختار الصحاح، ص: ٣٥٨ .

بەهەرەی خراپ لە یەکدی وەردەگرن، بە هەمان شێوەش ستەمکارەکانمان هەندێکیان کردوە بە دۆستو نزیکی هەندێکیان، یاخود هەندێکیانمان کردوە بە سەرپەرشتیارو مشوورخۆرو حوکمڕانی هەندێکیان، واتە: هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا حوکمڕانو دەست ڕۆیشتوون، بەڵام بۆچی؟ ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە وەدەستیان دەهێنا، کەواتە: ﴿نُوَلِّي بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعۡضَۢا﴾، واتە: ١) (نَجْعَل بَعْضهُم أَوْلِياء بَعْض) یان هەندێکیان دەکەینە دۆستی هەندێکیان، ٢) (نَجْعَل بَعْضُهُم يَتَوَلَّى أَمْرَ بَعْضٍ) واتە: هەندێکیان کاروباری هەندێکیان بەدەستەوە دەگرن، بەڵام خوا ﷻ هۆکاری ئەوە کە ستەمکاران: ستەمکارانی مرۆڤو جند، یان ستەمکاران لەنێو ئینسانەکاندا، یان ستەمکاران لەنێو جندەکاندا، واتە خراپەکارانو سنوورشکێنان، دەبن بە دۆستو پشتیوانی یەکدی، هۆکارەکەی بەوە بەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە وەدەستیان دەهێنا، کەواتە: کردەوەکانی ئینسانو جندن کە جۆری پەیوەندییەکانیان دیاریی دەکەن، ئەگەر ئینسان کردەوەی باشی هەبێ، بە تەئکید کردەوە باشەکانی وای لێ دەکەن، کە دڵی بەرەو خەڵکی باش وەربچەرخێ، وە ئەگەر کردەوەکانیشی خراپ بن، کردەوە خراپەکانی وای لێ دەکەن، کە دڵی بەرەو خەڵکی خراپ وەربچەرخێ، ئەوەش شتێکی ئاشکرایەو زانراوە، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ﴾[1]، واتە: ڕووحەکان وەك سەربازی مەشق پێکراو وان، ئەوانەی کە پێك ئاشنان، لێك نزیك دەکەونەوەو، ئەوانەش کە پێك نامۆن لێك دوور دەکەونەوە، جا ئەوانەی کە کردەوەکانیان وەك یەکن، پێك ئاشنا دەبن، ئینسان بە سروشت وایە ئەگەر نوێژکەر بێ، ڕۆژووگر بێ، خۆپارێز بێ لە قەدەغەکراوەکان، کەیفی بەو جۆرە کەسانە دێ، وە ئەگەر بە پێچەوانەشەوە

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣١٥٨)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٤٣٨١) عَنْ عَائِشَةَ، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً أَحْمَد برقم: (٧٩٢٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٦٥٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٣٤)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٦٨) عَنْ أَبي هُرَيرَةَ.

بێ، بۆ نموونە ئەهلی شەڕاب‌و قومارو دزیی‌و فەسادو خراپە بێ، دیارە کەیفی بەو جۆرە کەسانە دێ، کە کردەوەی وەك هی وی ئەنجام دەدەن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە ﷻ دەفەرموێ ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ بانگی جندو مرۆڤ دەکات، هەردووکیان: ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ ! ئایا لە خۆتان ڕەوانەکراوانێکتان بۆ نەهاتن، ئایەتەکانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوەو لە دیداریی ئەمڕۆتان دەیانترساندن‌و ئاگاداریان دەکردنەوە، واتە: پێیان ڕادەگەیاندن کە ڕۆژێك دێ، خوا لێتان دەپرسێتەوەو بە دیداری خوا دەگەن؟ ﴿ قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ﴾، گوتیان با، شایەدیی دەدەین لەسەر خۆمان، کە ئێمە پێمان ڕاگەیەنراو، ئایەتەکانی تۆیان بۆ خوێندینەوە، وە ئاگاداریشیان کردینەوە لەم دیدارەی ئەمڕۆمان ﴿ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا ﴾، (خوا دەفەرموێ:) ژیانی دنیا هەڵی خەڵەتاندن، فریوی دان، ﴿ وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴾، وە شایەدییشیان لەسەر خۆیاندا، کە ئەوان بێبڕوا بوون.

لێرەدا زانایان پرسیارێکیان بۆ دروست بووە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ ! ئایا لە خۆتان پێغەمبەرانێکتان بۆ نەهاتن؟ پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) تەنیا لە ئینسانان بوون، یاخود لە جندیش بوون، دیارە زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: تەنیا لە نێو مرۆڤەکان دا، خوا پێغەمبەرانی ڕەوانەکردوون، وە جند هیچ پێغەمبەریان لە نێودا ڕەوانە نەکراون، ئەدی چۆن لێرەدا خوای شارەزا دەفەرموێ: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ ﴾، ئەی کۆمەڵی جند و مرۆڤ ! ئایا لە خۆتان ڕەوانەکراوانتان بۆ نەهاتن؟ پاڵی داوەتە لای هەردووکیان ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوا ﷻ لە قورئاندا، لە شوێنی دیکەش دا بابەتی وای باسکردوە، کە پاڵی دەداتە لای دوو لایەن، بەڵام تەنیا پەیوەندیی بە لایەنێکیانەوە هەیە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الرحمن)دا خوا ﷻ باسی گەوهەرو مرواریی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: (خوا) دوو دەریاکانی تێکەڵ کردوون، پێکدەگەن، بەڵام پەردەیەکیان لە نێواندا هەیە، کە دەستدرێژیی ناکەنە سەر یەکدی، یانی: پێك دەگەن، بەڵام تێکەڵ بە یەکدی نابن !

کە ئەوەش ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە، چونکە مۆلکۆلەکانی ئاوی شیرین لەگەڵ ئاوی سوێر لێك جیان، وە تێکەڵ نابن، ڕووبارەکان کە تێکەڵ بە زەریاو ئۆقیانووسەکان دەبنەوە، تا ماوەیەکی زۆریش ئاوەکان بە یەکجاریی پێکەوە ئاوێتە نابن.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴾ لەو دوو ئاوانە گەوهەرو مرواریی دێنەدەرێ، (اللُّؤلؤة) کە کۆیەکەی لە (لؤلؤ)ە و بە مانای گەوهەرە[1]، کە لە نێو سەدەفێك دایە، مەرجانیش جۆرە بەردێکی زۆر بەنرخە[2]، هەموو شارەزایان دەزانن کە گەوهەرو مرواریی تەنیا لە ئاوی سوێردا، (واتە: لە زەریاکاندا، لە ئۆقیانووسەکاندا) دروست دەبن‌و، لە ئاوی شیریندا دروست نابن، بەڵام خوا ﷻ پاڵی داوەتە لای هەردووکیان، ئەوە لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (تغلیب) واتە: زاڵکردن، ئەگەر دوو شت پێکەوە باس بکرێن، یەکێکیان بەسەر ئەویدیکەدا زاڵ دەکرێ، واتە: شتێك کە پەیوەندیی بە یەکێکیانەوە هەیە، پاڵدەدرێتە لای هەردووکیان، ئەوە شێوازێکی باوە لە زمانی عەرەبییدا، لێرەش کە خوا دەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ ! ئایا لە خۆتان پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتوون

---

١) اللؤلؤة: الدُرَّة، مختار الصحاح، ص: ٥٠٨ .

٢) المرجان: صغر اللؤلؤء، مختار الصحاح، ص: ٥٣٥ .

پێغەمبەران تەنیا لە ئینسانەكان ڕەوانەكراون، بەڵام خوای پەروەردگار بە شێوازی زاڵكردن، پێغەمبەرەكان (علیهم الصلاة والسلام)ی پاڵ دەداتە لای هەردووكیان.

هەڵبەتە ڕایەكی واش هەیە، كە دەڵێ: نەخێر بەڵكو جندیش پێغەمبەریان لەنێودا هاتوون، با ئێمەش ناوەكانیان نەزانین، بەڵام ئەو ڕایە بێهێزە، بە بەڵگەی ئەوەی كە لە سوورەتی (الأحقاف)دا خوای زانا دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ يَـٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَـٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأحقاف، لێرەدا جندەكان باسی ئەوە دەكەن دەڵێن: ئێمە گوێمان لێبووە: لە دوای مووسا كتێبێكی دیكە هاتۆتە خوارێ، (كە قورئانە)، كەواتە: باسی هیچ پێغەمبەری خۆیان ناكەن، كەواتە: جندیش هەر شوێنكەوتووی پێغەمبەرانێكن، كە لەنێو بەشەردا دێن، جا ئەوانەی كە لە سەردەمی مووسا دابوون (علیه السلام) شوێن مووسا كەوتوون، ئەوانەی دوایی، دوای پێغەمبەرانی دیكە كەوتوون، وە ئەوانەی دوایی دوای پێغەمبەری خاتەم ﷺ كەوتوون، وە ئیمانیان پێی هێناوە، هەر بۆیە لە نێو جندان دا، نەصرانیی هەن، جوولەكە هەن، مسوڵمان هەن، كافر هەن، مونافیق هەن، هەموو ئەوانەی كە لەنێو بەشەردا هەن، لەنێو ئەوانیشدا هەن، وە من وام دێتە بەرچاو كە جند لەو ڕووانەوە زیاتر شوێنكەوتەی مرۆڤەكانن، زیاتر كارتێكراوی مرۆڤەكانن، چونكە مرۆڤ پایەی بەرزترە لە جند.

وە من جاری وا هەبووە كە بە شێوەیەك لە شێوەكان قسەم لەگەڵدا كردوون[١]، دەڵێن: بۆ ئێمە شانازییە كە بە شێوەیەك لە شێوەكان لە خزمەت ئینسانێكدا بین، دیارە ئیماندارانیان لە خزمەت ئیماندارانیانن‌و، كافرەكانیشیان لە خزمەت كافرەكانیان دان.

ئنجا وەك خوای زاناو توانا باسیكردوە ئەوانە دوو جار شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن :

---

١) لەسەر زمانی مرۆڤ و لەكاتی چوونە نێو جەستەیان دا.

١/ جارێكیان دەڵێن: ﴿ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ﴾، یانی: شایەدیی دەدەین كە پێغەمبەران هاتوونە لامان، وە پێشیان ڕاگەیاندووین كە ڕۆژێك دێ ئێمە بە دیداری تۆ دەگەین‌و سزاو پاداشت‌و لێپرسینەوە، دێتە گۆڕێ.

٢/ دەفەرموێ: ﴿ وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴾، وە شایەدییان لەسەر خۆیاندا، كە بێبڕوا بوون، وشەی (كفر)یش لە ئەسڵدا لە (ستر)ەوە هاتوە، واتە: داپۆشین (كافر) بە مانای داپۆشەر (ساتر) دێ، كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿ وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴾، شایەدییان لەسەر خۆیاندا، كە ئەوانە داپۆشەری هەق بوون، واتە: هەقەكەیان ناسیوە، بەڵام هەقەكەیان داپۆشیوەو بڕوایان پێ نەهێناوەو پشتیان تێكردوە، ئەگەرنا كەسێك كە پەیامی خوای پێ نەگات، پەیامی پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) پێنەگات، بە كافر لە قەڵەم نادرێ، چونكە هیچی دانەپۆشیوە، هەقێكی پێ نەگەیشتوە، كە زانیبێتی ئەوە هەقەو لە خواوە هاتووەو داپیپۆشی !

بۆیە ئەوانەی كە پەیامی خوایان پێ ناگات پێیان دەگوترێ: (أهل الفترة) واتە: خەڵكی ماوەیەك كە پێغەمبەرایەتیی تێدا دابڕاوە، بە نسبەت ئەوانەوە پێغەمبەرایەتیی پچڕاوە، ئەوان پەیامی خوایان پێ نەگەیشتوە، خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ١٥ ﴾، واتە: ئێمە سزادەر نین (بۆ ئینسانەكان‌و بۆ جندەكانیش) تاكو پێغەمبەر ڕەوانە نەكەین، كەواتە: كەسانێك پەیامی خوای پەروەردگاریان لە ڕێی پێغەمبەرانەوە پێ نەگەیشتبێ، با لە سەدەی بیست‌و یەكەمیشدا بن، ئەوە حوكمی كافربوونیان بەسەردا نادرێ، مادام لە بنەڕەتەوە پەیامی خوای بە بەزەییان پێ نەگەیەنرابێ، چونكە هەقێكیان پێ نەگەیوە، دایانپۆشیبێ، بەڵام بە مەرجێك كەمتەرخەم نەبووبن لە ناسینی ئەو هەقەدا.

کەواتە: ئەگەر قەومێك هەبن لە شوێنێکی زۆر دووری دنیا، وە بە هیچ شێوەیەك ناوو ناوبانگی ئیسلامیان پێ نەگەیشتبێ، یاخود ناوو ناوبانگی ئیسلامیان پێ گەیشتبێ، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئیسلامی لەسەرە، ئەوانە وا پێدەچێ کە ئەهلی سزا نەبن، بە پێی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾، ئەوەم لە چی هەڵهێنجا ؟ لەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ﴾، واتە: وە شایەدییان لەسەر خۆیاندا کە کافر بوون، واتە: ئەو هەقەی کە پێیان گەیشتوە، دایانپۆشیوەو بڕوایان پێ نەهێناوەو تەبەننییان نەکردوە، بەڵام کەسێك هەقی پێ نەگەیشتبێ، هیچی دانەپۆشیوە.

وە دوایی کە دەفەرموێ: ﴿وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا﴾، وە ژیانی دنیا فریوی دان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هۆکاری سەرەکی کافربوونی خەڵك، ژیانی دنیایە، زریق‌و بریقی دنیایە، خۆشیی‌و لەزەتەکانی دنیایە، واتە: خۆشیی‌و لەزەتە ناشەرعییەکان، هەواو ئارەزووەکان، ئەوانە وا لە خەڵك دەکەن کە بێبڕوا بن، چونکە لە ڕاستیدا ئیمان جۆرێکە لە بەستنەوەی ئینسان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: «الدُّنْيا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكافِرِ»[1]، واتە: دنیا حەپسخانەی ئینسانی ئیماندارە، وە بەهەشتی ئینسانی کافرە.

یانی: ئینسانی ئیماندار بەهۆی پابەندیی بە شەریعەتەوە، بەهۆی دەرنەچوونی لە شیرازەی شەریعەتەوە، وەك لە گرتووخانەیەکدا بێ وایە، لەو ڕووەوە کە بە دوای ئارەزووەکانی ناکەوێ، وە دوای ئارەزووی خەڵك ناکەوێ، وە مافی خەڵك پێشێل ناکات، وە نەفسی چی پێ خۆش بوو، وا ناکات، بەڵام ئینسانی کافر وەك لە بەهەشت دابێ، وایە لە بەهەشت دا هیچ شتێ لە ئینسان قەدەغە نیە، وەك دنیا نیە، کەواتە: ئینسانی کافر لەو ڕووەوە، کە هیچ شتێك لە

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٢٧٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٣٤٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٢٤)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١١٣)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٨٧) عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ.

خۆی بە قەدەغە نازانێ، وەك ئەو كەسە وایە كە لە بەهەشت دابێ، بەڵام بە تەئكید بەهەشتێكی وەهمییە، چونكە شوێن ئارەزووەكانی دەكەوێ، وە هەر كەسێك شوێن ئارەزووەكانی بكەوێ، لە دنیاو دوارۆژدا زەرەر دەكات، وە زەرەر بە جەستەو ڕووحو عەقڵی وە بە خۆیو بە خێزانیو بە كۆمەڵگا دەگەیەنێ.

بۆیە خوای زاناو شارەزا لە سووڕەتی (فاطر)دا پێمان دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ۝٥ ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! بێگومان ژیانی دنیا بەس ڕابواردنێكی كەمە، {(متاع) بریتیە لە بەهرەمەندبوونی ئینسان لە شتێك، بۆ ماوەیەكی دیاریكراو، ژیانی دنیاش بەهرەمەندبوونێكی كەمە، ڕابواردنێكی كەمە} با ژیانی دنیا فریوتان نەدا، وە با فریودەر (كە مەبەست شەیتانە) هەڵتاننەخەڵەتێنێو لە خشتەتان نەبات.

**مەسەلەی پێنجەم**: كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَن لَّمۡ يَكُن رَّبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا غَٰفِلُونَ ﴾، ئەوە (ذَلِكَ)، ئایا ئەوە ئاماژەیە بەچی؟ دیارە (هَذَا) ناوی ئاماژە، (اسم إشارة)یە، بۆ شتێك كە نزیك بێ، (هَذَا) یانی: ئەمە، (ذَلِكَ) یانی: ئەوە، بۆ شتێكە كە دوور بێ، (ذَاكَ) تۆزێك دوور بێ، (ذَلِكَ) دوورتربێ، واتە: ئەو ڕەوانەكردنی پێغەمبەرانە لە لایەن خواوە : ﴿أَن لَّمۡ يَكُن رَّبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا غَٰفِلُونَ ﴾، لەبەرئەوەیە كە ناگونجێ پەروەردگارت فەوتێنەری ئاوەدانییەكان بێ، لەبەرئەوەی كە ستەمو خراپە دەكەن، لە حاڵێك دا كە خەڵكەكە بێئاگایە، یانی: هەتا خەڵكەكە وریاو، هۆشیار نەكرێتەوە لە لایەن پێغەمبەرانەوە، با ئەهلی زوڵمو خراپەو كوفریش بن، خوا لە بەینیان نابات، دەشگونجێ، (ذَلِكَ) ئاماژە بێو ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییە: كە ئەوە یاسای خوایە: خەڵكی شارو وڵاتەكان نافەوتێنێ بەهۆی زوڵمو خراپەیانەوە، مادام خەڵكەكە بێئاگا بن، ئنجا وشەی (بِظُلۡمٖ ) دەگونجێ پەیوەست بێ بە: (القُرى) وە، هەرچەندە خراپەو ستەم بكەن، بەڵام خوا

نـایـانفـەوتێنـێ، ئەگـەر بێـئاگـا بن، دەبـێ وریـاو ئاگـادار بکرێن، وە دەگونجـێ (بِظُلْمٍ ) پـەیوەسـت بێ بـە: (رَبّـِك)ەوە، واتە (بظلم منه) یـانی خـوا سـتەم نـاکات لە خەڵـکی شـارو ئاوەدانییـەکان، کە بیـانفـەوتێنـێو ئەوانیـش بێـئاگـابن، بێئـەوەی کـە وریـاو ئاگاداریـان بکـاتەوە.

ئەمە وەك ئەو ئایـەتەی سوورەتی (الإسراء)ە، کە دەفـەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾، واتە: وە ئێمـە سزادەر نین (بۆ ئاوەدانـیی‌و بۆ شـارەکان) تـاکو پێغـەمبـەر ڕەوان نەکـەین‌و ئەو پێغـەمبـەرە (علیـه الصلاة والسـلام) وریـایـان نەکـاتەوەو ئاگاداریـان نەکـاتەوە، دیـارە حیکمـەت‌و دادگـەریی‌و میهرەبـانیی خـواش هـەر وای لـێ چـاوەڕێ دەکـرێ.

پێشـتـریش باسـمان کردوە کە وشەی (قریـة) کە بـە (قُرَى) کـۆ دەکرێتـەوە، واتـە: شاری گـەورە، یـاخود وڵات، یـان دەوڵـەت، وە بـە مـانـای (گونـد)و (دێ) نیـە، وەك لـە زاراوی ئێسـتـادا بـاوە.

**مـەسـەلـەی شـەشـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾، واتـە: بـۆ هـەر کـامێـك لـەو مرۆڤـانە، یـان لەو جنـدانەی کە لەسـەر زەویـین، چـەندان پلـە هـەن، بەهـۆی ئـەو کـردەوەوە کە دەیـانکـرد، یانـی: کردەوەکانیـان پلەکانیـان بـۆ دیـاریی دەکـەن، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾، وە پـەروەردگـارت بێـئاگـا نیـە لـەوەی کـە کردوویانە، دەزانـێ چییـان کـردوە، هـەر کەسـە بـە پێـی کـردەوەی خـۆی، پێگـەو پلـەی بۆ دیـاریی دەکرێ.

کـە دەفـەرموێ: (وَلِكُلٍّ) ئـەم تەنوینـەی سـەر: (ولكلٍّ) یـانـی: (وَلِكُلٍّ مِنْ أَهْلِ الإِيمان وَالكُفْرِ) بۆ هـەر کام لە ئیمـانداران‌و کـافـران، ئنجا ئـایـا: ئەهلـی کـوفر کـوا پلەیـان هـەیە؟ چونکە پلە بـۆ بـەرزییـەو، ئەهلـی کـوفریش نـزم دەبنـەوە ؟! ئەمـە

وەك (الآلوسي) لە تەفسیری (روح المعاني) دا، دەڵێ: (الدرجات: أَي المَرَاتِب فَيَتَنَاوَل الدَّرَكَاتِ حَقِيقَةً أَو تَغْلِيبًا)[1] واتە: بۆ هەر كامێكیان پێگەیەك هەیە، بە پێی كردەوەكانیان پێگەیەكی هەیە، {جا ئەو پێگەیە لە بەرزە، یان لە نزمە}، بۆیە مەبەست لە (درجات) لێرەدا (مراتب)ە، كە (دركات)یش دەگرێتەوە، چونكە درجات بەرەو سەرە، بۆیە قاڵدرمە، پەیژە، پێی دەگوترێ: (دَرَجْ)، چونكە پێی دەچیتە سەرێ، بەڵام بەرەو خوار پێی دەگوترێ: (دَرَك)[2]، وەك لە كوردەواریی خۆماندا ئەگەر یەكێك لە یەكێك تووڕە بێ، پێی دەڵێ: (دە بڕۆ بە دەرەك بی) یانی: زۆر بچیە خوار، (الآلوسي) دەڵێ: وشەی (درجات) لێرەدا یان بە مانا حەقیقییەكەی، یاخود بە مانا زاڵكردنەكەی مانای (دركات)یش، دەگرێتە خۆی، كە بەرەو نزمیی و خوارێیە، وەك خوای گەورە دەربارەی مونافیقەكان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٤٥﴾ ﴾النساء، واتە: بێگومان مونافیقەكان لە پلەی خوارەوەی ئاگردان، كەواتە: دەزانین (دَرَكة) كە بە (دَرَكات) كۆ دەكرێتەوە، بۆ خواریّ و نزمییە.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴾، پەروەردگارت بێئاگا نیە لەوەی كە دەیانكرد، ئەمە وەك ئایەتی ژمارە (١٧)ی سوورەتی (المؤمنون) كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان لە سەرووتانەوە حەوت چینمان دروستكردوون، (كە مەبەست پێیان حەوت ئاسمانەكانە)، وە ئێمە لە دروستكراوەكانی خۆمان بێئاگا نین، ئاگاداری وردو درشتین، بە پێچەوانەی ئەوەوە كە فەیلەسووفەكان تەصەوریان دەكرد، دەیانگوت: خوا ﷻ ئەو بوونەوەرەی وەك سەعاتێك وەگەڕخستوەو قورمیشی كردووە لێی گەڕاوە، ئیدی هەقی نیە، بەسەر ئەو وردەكارییانەوە كە تێیدا دەبن! خوا زۆر لەوە گەورەترە ئەو وردە شتانە بزانێ! ئەوان پێیانوابوو كە لە پایەو مەقامی خوای پەروەردگار دادەبەزێ، ئەگەر شتی وردو بچووك

---

١) ج ٤، ص ٣٧٠.

٢) الدَّرْك والدَّرُك: أسفل كلّ شيء ذي عُمْقٍ كالبئر ونحوها. المعجم الوسيط: ص ٢٨١.

بزانێ، بەڵام لە ڕاستییدا وانیە، بۆیەش (أبو حامد الغزالي) یەکێك لەو شتانەی کە فەیلەسووفەکانی پێ کافر کردوون، ئەوەیە کە گوتوویانە خوا وردەکارییەکان نازانێ، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾﴾المجادلة، واتە: خوا بە هەموو شتێك زانایە، وە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾﴾آل عمران، بێگومان هیچ شتێك لە خوا ون نابێ، نە لە زەوی و نە لە ئاسمان دا، هیچ شتێ لە خوا پەنهان نابێ، ورد بێ یان درشت، ئاشکرا بێ یان پەنهان.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴾، وە پەروەردگارت دەوڵەمەندی خاوەن بەزەییە، ئەگەر بیەوێ لاتان دەبات، وە هەر کەسێك کە بیەوێ لە شوێنی ئێوەی دادەنێ و، دەیکاتە جێنشینی ئێوە، وەك چۆن ئێوەی لە وەچەی خەڵکێکی دیکە، کۆمەڵێکی دیکە پێگەیاندوە.

ئەمە لێرەدا هەڕەشەیە، خوا ﷻ لێیان دەکات، خوا لێرەدا خۆی بە دوو سیفەت وەسف دەکات، ﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ﴾، پەروەردگارت دەوڵەمەندە، وە خاوەنی بەزەییە، دەوڵەمەند کێیە؟ (مَنْ لا يَحْتَاج إِلى غَيْرِه)[1] دەوڵەمەند کەسێکە پێویستیی بە جگە لە خۆی نیە، کەواتە: خوا دەوڵەمەندە، ئەگەر ئێوەش لەبەین بەرێ، پەکی لەسەر ئێوە نەکەوتوە، خەڵکێکی دیکە لە شوێنی ئێوە دێنێتە سەر ئەم زەوییە.

وە خوا خاوەنی بەزەییە، وە بەزەیی خوا وای کردوە کە چاوپۆشییتان لێ بکات و، مۆڵەتتان بدا، گەسکێکتان لێ نەدات، ڕاتان نەماڵێ! مۆڵەتدان دەدات،

---

١) مختار الصحاح، ص: ٤٢٢ .

بەڵكو بگەڕێنەوە، كەواتە: ئەم ئایەتە هەم هەڕەشەیە، هەم جۆرێكە لە تەماع وەبەرنانو، ئومێدەواركردن، كە ئەگەر بێتو بگەڕێنەوە، خوا بەزەیی زۆرەو، هەر ئەو ڕەحمەتەشی وایكردوە كە زوو لەبەینتان نابات.

كە دەفەرموێ: ﴿إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم ﴾، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (محمد) وایە كە دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە پشت هەڵكەن، خوا ئێوە لادەبات، كۆمەڵێكی دیكە دێنێ، پاشان ئەوان وەك ئێوە نابن، یانی: خوای بێنیاز پەكی لەسەر كەس نەكەوتوە.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ﴾، لە وەچەی كۆمەڵێكی دیكە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە ئەو خەڵكەی دێن لە ئێوە جیاواز دەبن، گەلێكی دیكە دەبنو، كۆمەڵێكی دیكە دەبن، ئنجا ئەگەر تەماشای یاسای خواش بكەین هەر وایە: عەرەب دەستیان بە دینی خواوە گرت، هەتا بە كەڵك هاتنو ڕاست بوون لەگەڵ دینی خوادا، سەرقافڵەی مسوڵمانان بوون، كە ئەوان دەستیان لێ هەڵگرت، خوای باڵادەست خەڵكێكی دیكەی هێنا، سەلجووقییەكانی هێنا، غەزنەوییەكانی هێنا، ئەییووبییەكانی هێنا، دوایی عوسمانییەكانی هێنا، خوای كاربەجێ هەر جارە، چ كۆمەڵگایەك، چ نەتەوەیەك لەگەڵ دینی خوادا ڕاستیان كردبێ، ئەوانی هێناوەتە سەر شانۆو، ئەوانی دیكەی لابردوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأٓتٖۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴾، بێگومان ئەوەی كە بەڵێنتان پێ دەدرێ، دێ، وە ئێوە دەستەوسانكەر نین، لێرەدا خوا ﷻ ئەم وشەیەی: ﴿ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ ﴾ بە: (البناء للمجهول) هێناوە، نەك بە: (البناء للمعلوم)و نەیفەرمووە: (إِنَّ مَا يَعِدُكُم اللهُ بِهِ) یان (إِنَّ مَا يُوعِدكُم اللهُ بِهِ) ئنجا ئەوە یەكێك لە ڕووەكانی

ئیعجازی قورئانە، چونکە دەفەرموێ: (تُوعَدُونَ) ئەوەی کە بەڵێنتان پێ دەدرێ، ئەوە هەم بەڵێن (وعد) دەگرێتەوە، هەم هەڕەشە (وعيد)یش دەگرێتەوە، (وعد) واتە: گفتو بەڵێندان بۆ شتی باش، (وعيد) واتە: بەڵێندان بە هەڕەشە لێکردن، بەڵام ئەگەر بەشێوەی (معلوم الفاعل) بووایە، ئەو کاتە بەس بەڵێنی دەگەیاند.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾، (عَجْز) یانی: چی؟ یانی: دەستەپاچەیی، دەستەوەستانیی، ئەوە کە ئینسان هیچی لەدەست نەیەت.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾، وە ئێوە دەستەوستانکەر نین، خوا ئەوەی کە ڕایگەیاند بە تەئکید، دێ، وە ئەگەر بێت ئێوە دەستەوستانکەری نین.

ئەمەش دوو مانا دەگەیەنێ:

١/ ئێوە دەرباز نابن لە ژێر ڕکێفو دەستەڵاتی خواو قوتار نابن.

٢/ ئێوە لە دەستەڵاتی خوا بەدەر نینو، لە هەر شوێنێك بن، دەستەڵاتی خوا دەتانگاتێ.

**مەسەلەی نۆیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، لێرەدا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: ئەی گەلەکەم! ئێوە لە شوێنی خۆتانەوە، یان بە پێی توانای خۆتان، یان چەندتان لە دەست دێ، ئیشی خۆتان بکەن، منیش کاری خۆم دەکەم، لەمەودوا بۆتان دەردەکەوێ، سەرەنجامی مەنزڵگای دواڕۆژ بۆ کێ دەبێ؟ بێگومان ستەمکاران سەرفراز نابن، ئەمە وەك ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ إِنَّهُۥ بِمَا

﴿تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ٤٠﴾، فصلت چیتان دەوێ، بیكەن، بێگومان خوا بینەری ئەوەیە كە دەیكەن.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰقَوۡمِ﴾، ئەوە جۆرێكە لە سەرنج ڕاكێشانو دڵ نەرمكردن، واتە: ئێوە خەڵكو كۆمەڵی خۆمنو نەتەوەی خۆمن، ئینسانیش بۆ خەڵكو نەتەوەی خۆی، چاكە نەبێ نایەوێ، دوایی كە دەفەرموێ: ﴿ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ﴾، ئەمە سێ واتای هەن :

١/ وشەی (مكانتكم) بە مانای شوێن (مكان)ە، وەك (المقامة والمقام)[1]و (الدارة والدار)[2]و (الماءة والماء)[3]، هەموویان بە یەك مانان، یانی: چ بڵێی: (مقامة)، چ بڵێی: (مقام)، وە چ بڵێی: (دارة)، چ بڵێی: (دار)، وە چ بڵێی (ماءة)، چ بڵێی (ماء) هەر یەكن، لێرەشدا (مكانة) یانی: (مكان)، واتە لە شوێنی خۆتانەوە چیتان لە دەست دێ، بیكەنو مەجووڵێن.

٢/ مانایەكی دیكەی (مكانة) بریتیە لە حاڵەت، یانی: (حالتكم)، واتە: لەو حاڵەی كە لە سەرینی.

٣/ وە مانایەكی دیكەی (مكانة): (تمكنكم) واتە: بەو شێوەی كە دەستتان دەڕوات، چیتان لە دەست دێ، درێغیی مەكەن .

مەبەست لەم ڕستە قورئانییە ئەوەیە، كە ئێوە چیتان لە دەست دێ بیكەن، لە دژایەتییكردنی من، من بێ باكمو، بێ منەتم لەبەرئەوەی پشتم بە خوا قایمە، ئێوەش درێغیی مەكەن، وە منیش چیم لە دەست دێ، یان ئەوەی كە بە چاكی دەزانم دەیكەم، وە پیلانگێڕییو هەڕەشەو گوڕەشەی ئێوە، وە پەرچ خستنە بەر پێی من، لەلایەن ئێوەوە من بەرەو دوا ناگێڕێتەوە.

---

١) واتە: پێگەو پایە، یان بەردەوامبوون، مختار الصحاح، ص: ٤٨٣ .

٢) واتە: مەنزڵگا، خانوو، مختار الصحاح، ص: ١٩٩ .

٣) واتە: ئاو.

دوایـــی دەفـــەرموێ: ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، بـە تەئكـيد لەمـەودوا دەزانـن کـێ سـەرەنجامی مەنزڵگای دوارِۆژی دەبێ، واتە: دەزانـن کە سـەرەنجام لـە دوارِۆژدا، سـەرفـرازیـی لـە گـرەوی منو شـوێنکەوتوانمدا دەبێ، لەبـەرئەوەی پشتمان بـە خـواوەیـە، وە بـە ڕێی خـوادا دەڕۆیـن، وشـەی (عاقبـة) یـانـی: (أَخيـر الأمـر و أثـر عمل العامـل)[١] بـە مانـای کۆتـایی کارێـكو، بـە مانـای شـوێنەواری کردەوەی کەسێکە کە ئـەنجامی دەدات، خـوای پـەروەردگار لە زۆر شـوێنـان لە قورئاندا تەئکیدی لەسەر ئـەوە کردۆتـەوە، کە سـەرەنجامی دنیـاو دوارِۆژ، لـە گـرەوی پاریزکـاران‌و ئیمـانداراندایـە، بـۆ وێنـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ١٢٨﴾الأعـراف، وە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ٤٩﴾هـود، واتە سەرەنجام بـۆ پارێزکـارانە، وە بـە پێچـەوانەوە ئەهلـی کوفـرو زوڵـم‌و خـراپـە، سـەرەنجامی شـووم‌و خراپیـان هـەیـە، وەك لـە سـوورەتی (الـروم)دا دەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ... ١٠﴾، پاشـان سـەرەنجامی ئەوانەی کە خراپـەیـان دەکـرد، بریتـی بـوو لـە خراپـە، واتـە: لـە سـزاو پـەشیمانیی.

لە کۆتـاییـدا خـوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١٣٥﴾الأنعام، واتـە: بێگومان سـتەمکاران سەرفراز نـابن، ئنجا ئایـا سـتەمکـاران کێـن؟ خـوا دەفـەرموێ: ﴿...وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٥٤﴾ البقـرة، وە کـافرەکان سـتەمکارن، سـتەمکاری ڕاسـتەقینە هـەر ئەوانـن.

کەواتـە: وەك پێشـتـریش گوتمـان لێـرەدا خــوای کـاربـەجێ باسـی سـوننەت‌و یـاسایـەکی خـۆی دەکـات، کـە سـتەمکـاران سـەرفراز نـابن، ئنجـا ئـایـا سـەرفـرازیی، (فلاح) یـانی چی؟ (الفلاحُ: الفوز والبقاء والنجاة، وهو إسم، والمصدر هو الإفلاحُ،

---

١) مختار الصحاح، ص: ٣٨٩ .

والفَلْحُ: الشـقُّ، فَلَّح الأرض: شَـقَّها)[١]، (فـلاح) بریتیـه لـه بردنـەوە، مانـەوە، دەربازبـوون، وە وشەی فـەلاح نـاوە، چاوگـەکەی بریتییـە لـە (إفلاح) دەڵـێ، (أَفْلَحَ، يُفلِحُ، إِفْلاَحـا وَفَلاَحـاً)، (فَلْح)یش بە مانـای (شَقّ)ە، دەگـوترێ (فَلَّح الأَرضَ) واتـە: (شَقَّ الأَرض)، زەوییـەکەی شـەق کـرد، بۆیـە بـە جوتیـار دەگوتـرێ: (فّلاح)، واتـە: شـەقکـەری زەوی، نـاخـی زەوی دەدڕێ.

بەڵێ لێرەدا خـوای دادگـەر ئەو حەقیقەتە لەسەر زمانی پێغـەمبـەری خاتەم ﷺ ڕادەگـەیـەنێ، کـە ئـەی بێبـڕوایەکـان ! ئێـوە چیتـان لـە دەسـت دێ، بیکـەن، منـیش ئەوەی کـە بـە پێویسـتی دەزانـم دەیکـەم، ئـەوەی خـوا منـی پێوە پابـەند کـردوە، ئەنجامی دەدەم، وە دڵنیاشـم کە سەرەنجـام ئێوە بـەدبـەختیـیو پـەشـیمانییتـان بـۆ دەمێنێتەوە، وە ئێمـەش سـەرفرازیـیو ڕووسـووریمـان بەقسـمەت دەبـێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) مختار الصحاح، لفظ: ف ل ح.

# دەرسی پازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە ئایەتـەکانی (١٣٦ تـا ١٤٤)، واتـە: نـۆ (٩) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، تەوەری سـەرەکیی ئەم نۆ (٩) ئایەتـە بریتیـە لـە خستنە ڕووی پووچیی بیـرۆکـەی بـە قەدەغە دانانـی هەندێك لەو نیعمەتـانەی کـە خـوا بـۆ مرۆڤەکانی حـەڵاڵ کـردوون، لـە بەروبوومی کشتوکاڵو ئاژەڵ، هەروەها کوشـتنی منداڵـی خۆ، جگەرگۆشـە، بـە بیانووی پڕوپووچو ئەفسانەیی، کـە ئـەوە عـادەتێك بـووە لـەنێو هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکـانی نیوە دوورگەی عەڕەبیـیو غەیـری نیوە دوورگـەی عەڕەبییش دا باو بووە، کـە ئێستاش ئەوە هـەر هەیـە، بەڵام لە قاڵبی دیکەداو بە شـێوازی دیکـە.

پاشـان خـوا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو، کـە: نیعمەتـەکانی وەك میوەجاتو دانەوێڵەو ئاژەڵـی بارهەڵگری، بۆ بەهرەمەندبوونی مرۆڤەکان دروستکردوون، بۆیـە نابـێ بەهـۆی کـەوتنە ژێـر کاریگـەریی شـەیتانو شـوێن پـێ هەڵـگرتنیو خوتخوتـەیەوە، ئـەو نیعمـەتانە لە خۆیـان قەدەغـە بکـەن.

پاشـان خـوای بە بـەزەیی داوایـان لـێ دەکـات کـە بەڵگـەیەك بێـنن، لەسـەر قەدەغـە بوونی هەر یەك لەو ئـاژەڵانەی کـە بە بیـانووی جـۆراو جـۆرەوە، قەدەغـەیان کـردوون، لەو هەشـت جۆرە ئاژەڵـە، واتە: لە مـەڕو بزن، هـەروەها لە ڕەشـە وڵاخو لە حوشـتر، کـە بـە تەئکیـد هـیچ بەڵگـەیەکیان دەسـت ناکـەوێ بـۆ سـەلمـاندنی ڕاسـتیی ئـەوە کـە کافرەکان هەندێك جـۆر لـەو ئاژەڵانـەیان لـە خۆیـان قەدەغـە دەکـرد، خـوا دەفـەرموێ: هیچ بەڵگـەیەکتان بە دەستەوە نیە، بەڵکو ئێـوە لەسـەر بناغـەی نـەفامییو ئەفسـانەیی ئەو شـتانە لە خۆتـان قەدەغـە دەکـەن.

﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُوا۟ هَٰذَا
لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا ۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ
إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ ۗ سَآءَ مَا
يَحْكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ۖ وَلَوْ
شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾ وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ
حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا
يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ
﴿١٣٨﴾ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ
أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ
حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟
مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ وَهُوَ
ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا
أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ
إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ
﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ

وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾.

## مانای وشـه به وشـەی ئایەتەکـان

((وە لەوەی کە خوا دروستی کردوە لە کشتوکاڵو ئاژەڵ، بەشێکیان بۆ خوا دانا، بە بۆچوونی هەڵەی خۆیان گوتیان: ئەمە بۆ خواو ئەمەش بۆ هاوبەشەکانمان (لە پەرستندا)، ئنجا ئەوەی هی هاوبەشەکانیانە، ئەوە بۆ خوا ناچێ، بەڵام ئەوەی هی خوایە، بۆ هاوبەشەکانیان دەچێ ! ئەوە خراپترین بڕیارە کە دەیدەن ﴿١٣٦﴾ وە هەر بەو شێوەیە بۆ زۆرێك لە هاوبەشدانەران، هاوبەشە (پەرستراوە)کان کوشتنی ڕۆڵەکانیان بۆ ڕازاندنەوە، تاکو بە هیلاکیان بدەنو، ئایینەکەیانیان لێ تێکەڵو پێکەڵ بکەن، وە ئەگەر خوا ویستبای وا نەکەن، وایان نەدەکرد، ئنجا واز لە خۆیانو درۆ هەڵبەستنەکانیان بێنە ﴿١٣٧﴾ وە گوتیان: ئەوە ئاژەڵو کشتوکاڵێکە بە بۆچوونی هەڵەی خۆیان، قەدەغەیەو نابێ هیچ کەسێك بیخوات، مەگەر کەسێك بمانەوێ، وە ئاژەڵێك کە پشتی قەدەغەکراوە (بۆ بارو سوار بەکاری ناهێنن) وە ئاژەڵێك کە بە درۆ هەڵبەستنەوە، بە ناوی خواوە، ناوی خوای لەسەر ناهێنن، بە دڵنیاییەوە لەمەودوا بەهۆی درۆ هەڵبەستنیانەوە، خوا سزایان دەدات ﴿١٣٨﴾ وە گوتیان: ئەوەی لە سکی ئەم ئاژەڵانەدا بێ، تایبەتە بە نێرینەکانمانەوە، وە لە هاوسەرەکانمان قەدەغەیە، بەڵام ئەگەر ئەو (بەچکەیـ)ـە مردار بێ، ئەوە نێرو مێ تێیدا هاوبەشن، بێگومان (خوا) سزای ئەو وەسفکردنە (بێ بنەمایانە)یان دەدات، بە

ڕاستیی خوا کاربەجێی زانایە ﴿١٣٩﴾ مسۆگەر ئەوانەی نەفامانەو بەبێ زانیاریی، ڕۆڵەکانی خۆیانیان کوشتو، ئەو ڕۆزییەی خوا پێی دابوون، قەدەغەیان کرد: زیانبار بوون، وە بێگومان گومڕابوونو لە ڕێی ڕاستگرتووان نەبوون ﴿١٤٠﴾ خوا ئەو کەسەیە کە باغی کەپردارو بێ کەپری هێناونە دی، هەروەها دارخورماو کشتوکاڵ کە بەرەکەی جۆراوجۆرە، وە زەیتوونو هەناری وێکچوو لە (ڕەنگدا)و وێکنەچوو (لە تامو چێژدا)، جا هەر کات بەریدا، لە بەرو میوەکەی بخۆن، وە لە ڕۆژی هەڵگرتنەوەی حاسڵاتیشدا، مافەکەی کە بۆ هەژارانو نەداران دانراوە، بیدەن بە خاوەنەکانیان، وە زێدەڕۆیی مەکەن، چونکە خوا زێدەڕۆییکارانی خۆشناوێ ﴿١٤١﴾ وە لە ئاژەڵی بارهەڵگرو، هی (گچکەو وردی وەك) لە زەمیندا ڕاخراوی بۆ هێناونە دی، دەجا لەوەی کە خوا پێیداون، بخۆنو بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، کە بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە ﴿١٤٢﴾ خوا هەشت جووتی هێناونەدی لە ئاژەڵان: لە مەڕ دووان، (بەرانو مەڕ)، وە لە بزن دووان (بزنو نێریی)، بڵێ: ئایا خوا دوو نێرەکانی قەدەغە کردوون (واتە نێرییو بەران)؟ یان دوو مێیەکان (واتە: بزنو مەڕ)، یان ئەوەی کە لە بەچکەدانی دوو مێینەکان دایە، قەدەغەی کردوە؟ ئەگەر لە ڕاستانن لەوبارەوە، زانیارییو هەواڵم پێ بدەن ﴿١٤٣﴾ وە خوا لە حوشتریش دووان (جَمَل و ناقة) وە لە ڕەشە وڵاخیش دووان (گاو مانگا)ی دروست کردوون، بڵێ: ئایا خوا دوو نێرەکانی قەدەغە کردوون، یا دوو مێینەکان، یان ئەوەی بەچکەدانی دوو مێینەکان گرتوویانەتە خۆیان، یان ئایا ئێوە ئامادەبوون، کە خوا ئەمەی پێ ڕاگەیاندن؟ دەجا کێ لەو کەسە ستەمکارترە، کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، تاکو بەبێ زانیاریی خەڵك گومڕا بکات! بێگومان خوا کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕێی ڕاست ﴿١٤٤﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ذَرَأَ ): (الـذَرَءُ: إِظْهَـارُ اللهِ تَعَالـى مَـا أَبْـدَاهُ، يُقَـالُ ذَرَأَ اللهُ الخَـلْق، أَي: أَوْجَـدَ أَشْخَاصُهُم)، (ذَرء) لـە زمـانی عەرەبییـدا واتـە: بـڵاوی کـردەوە، دروسـتی کـردو بـڵاوی کـردەوە، پەخشی کـرد، کـە لـێرە دەفەرموێ: (ذَرَء) واتـە: خـودی شـتەکانی هێنـاوەتـە دی‌و، ئاشـکرای کـردوون‌و بـڵاوی کردوونـەوە.

(ٱلْحَرْثِ ): (الحَرْثُ: إِلقَـاء البَـذْرِ فِـي الأَرْضِ وَتَهيؤُهَـا لِلـزَّرْعِ وَيُسَـمَّى الـمَحْرُوثِ)، (حَـرْث) لە ئەسـڵدا بە مانـای کـێڵان دێ، یاخود بە مانای چاندنی تـۆو لـە زەوییـدا دێ، یـان زەوییـەك خـۆش بکـەی‌و بیکـێڵـی، بۆئـەوەی ئامـادەی بکـەی شـتی تێـدا بچێنـی، وە وشـەی (حَرْث) بە مانـای کشـتوکاڵیش دێ.

(وَٱلْأَنْعَـٰمِ): (النَّعَـمُ مُخْتَص بالإِبْلِ، جَمْعُهُ أَنْعَام، لَكِن الأَنْعَام تُقَالُ لِلإِبلِ وَالبَقَرِ وَالغَنَـمِ، وَالأَنْعَـام: الـمَالُ الرَّاعِيَـة)، وەك لـە (مختـار الصـحاح)دا هـاتوە[1]، کـە دەگوتـرێ: (نَعَمْ) تـایبـەتە بە حوشـترەوەو کۆیەکـەی (أَنْعَام)ە، بەڵام وشـەی (أَنْعَـام) وێـڕای حوشـتـر، ڕەشـە وڵاخیش‌و مەڕو بزنیش دەگرێتەوە، هەروەها (أَنْعَـام) هەر ئاژەڵێکـە بلـەوەڕێ، دیـارە بـە پێـی قسـەی ئەوبـێ، گوێدرێـژو وڵاخـە بـەرزەو هێسـتـریش، دەگرێتـەوەو هەرچی بلـەوەڕێ دەیگـرێتـەوە.

(لِيُرْدُوهُمْ ): (الـرَّدى الـهَلاَك، وَالتَـرَدِّي: التعـرُّض لِلـهَلاَك) ، (لیُـردُوهُم) واتـە: بـۆ ئـەوەی بیـانفەوتێنـن، چونکـە (رَدى) بـە مانـای فەوتانـە (التَـرديِّ) ئەوەیـە کـە کەسـێ خـۆی بخاتە حاڵـەتی فەوتـانـەوە.

(وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ): بـۆ ئـەوەی دینەکـەیان لـێ تێکـەڵ‌و پێکـەڵ بکـەن، (لَبَسَ يَلْبِسُ) واته: (خَلَطَ يَخْلِطُ)، تێکەڵـی کـرد، تێکـەڵ دەکـات، (أَصْلُ اللَّبْسِ:

---

[1] ص: ٥٧٥.

سِتْرُ الشَّيء، وَيُقَالُ لَبَسْتُ عَلَيْهِ أَمْرَهُ) واتە: شتەکەم لێ تێکەڵ کرد، بەس لە ئەسڵدا بە مانای پۆشین دێ.

(حِجْرٌ): (الحِجْرُ: الـمَمْنُوع مِنْهُ بتَحْرِيمِهِ) شتێك کە قەدەغە کرابێ، وەك بڵێی پەردەیەکی بۆ کراوە، کە ڕێ نیە کەسێك دەستی بگەیەنێتێ.

(ٱفۡتِرَآءً عَلَيۡهِۚ): واتە: بە درۆ هەڵبەستن لە کوردییشدا بەکاردێ، دەڵێ: ئیفتیرای پێ کرد، واتە: شتێکی بە دەمەوە هەڵبەست کە نەیگوتوە، (الفَرِيُ: قَطْعُ الجلْدِ للْخَرْزِ وَالإِصْلاَح وَالإِفْرَاءُ: للإِفْسادِ، والإِفْتِراء فيهما وفي الإفساد أكثر)، وشەی (فري)، لە زمانی عەرەبییدا بریتیە لە بڕینی چەرم و پێست، بۆ ئەوەی کە پینەی پێ بکا، (پینەی پێلاو، پینەی شتێکی پێ بکاو شتێکی پێ چاك بکاتەوە)، ئنجا (إفراء) تەنیا بۆ خراپە بەکاردێ، بەلام (إفتراء) بۆ چاکەو بۆ خراپە، بەلام زیاتر بۆ خراپە بەکاردێ.

(وَصۡفَهُمۡ): (الوَصْفُ: ذِكْرُ الشَّيء بحِلَيتِهِ وَنَعْتِه، وَالصِّفَةُ: الحَالَةُ الَّتِي عَلَيْهَا الشيء، والوصف قد يكون حقاً أَو باطلاً)، (وَصْف) بریتیە لە باسکردنی شتێك بە ئاوەڵناوەکانیەوە، ئەو حاڵەتانەی کە لە سەریانە، بەلام سیفەت بریتیە لەو حاڵەتەی کە شتێك لەسەریەتی، وەسفیش جاری وا هەیە بە هەقەو، جاری واش هەیە بە ناهەقە.

(سَفَهَۢا): (السَّفَهُ: خِفَّةٌ في البَدَنِ، وَثَوْبٌ سَفيهٌ: رَدِيءُ النَّسْجِ واسْتُعمِلَ في خِفَّةِ النَّفْسِ لِنقُصَانِ العَقْلِ) واتە: وشەی (السَّفَهُ) بەمانای قالب سووکیی دێت، وە قوماشێك کە باش نەچنرابێ (سفيه)ی پێ دەگوترێ، (واتە: باش نەچنراوەو سووکە)، پاشان بەکارهێنراوەو خوازراوەتەوە بۆ سووکیی نەفس، لەبەر عەقڵی سووك، چونکە عەقڵ بریتیە لە حەقیقەتی ئینسانو کاکڵی ئینسان.

(مَّعۡرُوشَٰتٖ): واتە: کەپر بۆ کراوەکان، (العَرْشُ: فِي الأَصْل شَيء مُسَقَّف، وَجَمْعُهُ عُرُوش، عَرَشْتُ الكَرْمَ وَعَرَّشتهُ: إِذَا جعلت لَهُ كَهَيْئَةِ سَقف)، دار مێو کە ئەگەر

کەپری بۆ بکرێ، دەچێتە سەر کەپرەکە، پێی دەگوترێ: (مَعْرُوش) واتە: کەپر بۆ کراو، بەڵام ئەگەر ئەوە نەبێ، پێی دەگوترێ: (غَيْر مَعْرُوش) واتە: ئەوەی کە هەر لەسەر زەوی ڕادەکشێو بڵاودەبێتەوە.

(مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ): واتە: میوەکەی جۆراو جۆرە، جیاوازە، (الإخْتِلافُ وَالـمُخَالَفَةُ أَنْ يَأْخُذ كُلّ وَاحِدٍ طَرِيقَاً غَيْر طَرِيق الآخَر)، (إخْتِلاف ومُخَالَفَة) ئەوەیە کە هەر کامێك ڕێی ئەوی دیکە بگرێ، وشەی (أُكُلْ)یش (الأُكل: ما يُؤكَل) هەر شتێکە کە بخورێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی میوەیە.

(حَصَادِهِۦ): (أَصْلُ الحَصد قَطْعُ الـزَّرْعِ)، وشەی (حصد) بە مانای بڕینی کشتوکاڵ دێ، حاصڵاتێك: گەنمە، جۆیە، دانەوێڵەیە، هەر شتێکە، کە دەدروێتەوە. (الحَصَادِ والحِصادِ قطع الشيء فِي إبّانه، لَكِنَ الحَصِيد فِي غَيْرِ إبّانه)، وشەی (حَصاد وحِصاد)، هەردووکیان بە مانای دروێنەو بڕینی ئەو دانەوێڵەو شتە دێ لە کاتی خۆیدا، بەڵام (حصيد) بەوە دەڵێن کە لە غەیری کاتی خۆیدا بێ.

(حَمُولَةً): واتە: بارهەڵگر، هەندێ دەڵێن: تەنیا بە حوشتر دەگوترێ، بەڵام خاوەنی (مختار الصحاح) دەڵێ: (الحَمُولَةُ: الإبل الَّتِي تحمل، وَكَذَا كُل مَا احْتُمِلَ عَلَيْهِ الحِمْلُ، مِنْ حِمَار وَغَيْرِه، سَوَاء كَانَت عَلَيْهِ الأَحْمال أَو لَمْ تَكُن)[1] هەر شتێ: باری لێ بار بکرێ، چ بارەکەی لەسەر بێ، یان لەسەری نەبێ، لە کەران و ئەوانی دیکەش هەر پێیان دەگوترێ: (حمُولَة)، یانی: بارهەڵگرەکان.

(وَفَرْشًا): (فَرْش) واتە: ڕاخراو، (الفَرْشُ: مَا يفرش مِنَ الأَنْعَامِ، أَي: يُرْكَب)، بریتیە لەو ئاژەڵانەی کە بۆ سواریی بەکاردێن، نەك بۆ بار، وەك: ئەسپ، کە بۆ سواریی بەکاردێ، هەندێکیش گوتوویانە: (فرش) واتە: حەیوانی ورد، کە لە دوورەوە تەماشایان دەکەی، وەك فەرشێك بە زەویەوە نووسابێو ڕاخرابێ، چونکە لە زەوییەوە نزیکەو وردە.

١) مختار الصّحاح، ص: ١٤٩.

(أَزْوَٰجٍ ): (يُقَالُ لِكُلِ وَاحِدٍ مِنَ القَرِينَينِ مِنَ الذَّكَرِ وَالأُنْثَى فِي الحَيْوَانَاتِ المُتَزَاوِجَةِ: زَوْج، وَلِكُلّ قَرِينين فِيهَا وَفِي غَيرِهَا: زَوْج، كَالْخُفّ وَالنَّعْلِ)، وشەی (زَوْج) کە بە (أَزْوَاج) کۆ دەکرێتەوە، واتە: جووت، ئنجا جووت مەرج نیە دووان بن، بۆ وێنە: بزن پێی دەگوترێ: جووتی نێریی، نێریی پێی دەگوترێ: جووتی بزن، یان پیاو پێی دەگوترێ: جووتی ئافرەت، ئافرەت پێی دەگوترێ: جووتی پیاو، بۆیە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بە ئادەم دەفەرمووێ: ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ﴿٣٥﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەی ئادەم خۆت و جووتەکەت، (واتە: ئەوەی کە تۆ لەگەڵ وی دا، هەردووکتان دەبن بە جووت) لە بە هەشت دا نیشتەجێ بن، زۆر کەس وا دەزانێ کە گوترا: (زَوْج) تەنیا دەبێ دووان بن، نەخێر، بە هەر کامێك لەو شتانەی کە هاوتایەکیان هەبێ، دەگوترێ: (زَوْج)و مەرج نیە تەنیا نێرو مێ بن، دەڵێ: جووتە نەعل، جووتە گۆرەوی، هەر شتێ کە دووان بێ، بەرانبەرێکی هەبێ، بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (زَوْج).

(ٱلضَّأْنِ ): کۆی (ضَائِن)ە، واتە مەڕ، پێچەوانەی (مَاعِزْ)ە کە بە (مَعْز) کۆدەکرێتەوە، (مَعْز) تاکەکەی (ماعز)ە واتە: بزن، یان حەیوانی ڕەش، (ضأن) تاکەکەی (ضائن) واتە: حەیوانی سپی، مەڕ.

(ٱلْإِبِلِ ): (الإِبْلُ لا وَاحِدَةَ لَهَا مِنْ لفظ، وَهِيَ مُؤَنَّثَة لأَنَّهَا اسْمُ جَمْع)، وشەی (إبل) حوشتر، تاکی نیە، ناوی کۆیە، بۆیەش بە (مؤنث) دێ، چونکە ناوی کۆیە، (بقر)یش دیسان ناوی جنسە، تاکەکەی (بقرة)یە هەندێ کەس وا دەزانێ (البقرة) بە مانای مێینەیە، (واتە: مانگا) دێ، بەڵام وانیە، هەڵبەتە من بۆ خۆشم وامدەزانی هەر وایە، بەڵام کە تەحقیقم کرد، دەڵێ: (البَقَرَةُ: تَقَعُ عَلَى الذّكَرِ وَالأُنْثَى والهاء للإفراد، والجمع: بقرات، والثور والثورة: للذَّكَرِ وَالأُنْثَى)، وشەی (بقرة) لە زمانی عەرەبییدا واتە: ڕەشە وڵاخ، ئنجا (البقرة) بۆ تاکێکە چ نێر بێ، چ مێ، (ها)یەکەی (البقرة) بۆ تاکە، کۆی (بقرة) (بقرات)ە، واتە: دیسان بۆ نێرو بۆ مێ بەکاردێ، بەڵام ئەگەر بتەوێ بۆ مێ بەکاربێ، دەڵێی: (ثورة)، وە بۆ نێریش دەگوترێ: (ثور)، ئەگەرنا وشەی (بقرة و بقر) نێرو مێ دەگرنەوە.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خــوای بــەرزو مــەزن لــەم نــۆ ئایەتــەدا، باسـی هەڵوێستی کـافرو هاوبــەش بـۆ خــوا دانــەرەکان دەکـات، کــە لەســەر بناغەیـەکی ئەفسـانەیی، لەســەر بناغەیـەك کــە هـیچ بەڵگــەیەك لــە عــەقڵ‌و زانسـت، وە لــە فیطــرەت پشـتگیــریی ناکـات، هەڵدەسـتان بــە قەدەغـەکردنی هەنـدێك لـە بەرهـەمی میوەجـات‌و دانوێڵـەو کشتوکـاڵ، وە هەنـدێ لـە جـۆرەکانی ئـاژەڵ، هەروەهـا هەڵدەسـتان بـە کوشـتنی منـداڵەکانی خۆشیان، چ کـچ، چ کـوڕ، دیـارە بەشـێکیان ئەو کـارەیان ئەنجـامداوە.

جا خـوا ﷻ لێـرەدا لەم ئایەتانەدا، ئـەو جـۆرە هەڵسوکـەوتانەی هاوبـەش بـۆ خــوا دانەرەکــان، کــە دیـارە مـەرج نیــە هـەر لــە نیـوە دوورگــەی عەرەبییـدا، ئـەو نەریتانــە هـــەبووبن، بەڵــکو لــە نێــو زۆربـــەی میللـــەتانی دنیـادا بـاوبوون، خـــوای زانـــا ئـــەو مەسـەلانـە دەخاتە ڕوو، وە لە مەحـەکی وەحییان دەداتو، سـەرەنجام دەریدەخـات: کــە ئەو هەڵسوکـەوتانە، هەڵسوکـەوتی پووچو بـێ بنەمـان، وە لـەوبارەوە ئەم دەقە هـاتوە: ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِذَا سَرَّكَ أَنْ تَعْلَمَ جَهْلَ الْعَرَبِ، فَاقْرَأْ مَا فَوْقَ الثَّلاثِينَ وَمِائَةٍ فِي سُورَةِ الأَنْعَامِ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهَۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ ﴿ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴾﴾[١]، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس خـوا لـێیان ڕازی بـێ، دەڵـێ: ئەگـەر پێت خۆشـە، نەزانیی عەرەبەکان بزانـی، ئایەتی (١٣٠) بە پشتەوە لـە سووڕەتی (الأنعام) بخـوێنەوە: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهَۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ هەتـا فـەرموودەی خــوا: ﴿ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴾، کە دیـارە مەبەستی ئـەو ئایەتانەیـە کـە ئێستا ئێمە مانـای گشتییان دەکـەین.

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٣٣٤).

خوا ﷻ هەر لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا کە باسی نەفامییو نەزانیی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانو کافرەکان دەکەن، دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَـٰمِ نَصِيبًا ﴾، وە بەشێکیان بۆ خوا دانا، لەوەی کە بەدیهێناوە لە کشتوکاڵو ئاژەڵان، واتە: لە دانەوێڵەو میوەجاتو سەوزەو هەر ڕووەکێکی دیکە، وە لە ئاژەڵان، کە مەبەست پێی: حوشترو ڕەشە وڵاخە لەگەڵ مەڕو بزن، بە ڕای زۆربەی زانایان، ﴿ فَقَالُواْ هَـٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَـٰذَا لِشُرَكَآئِنَا ﴾، وە بە بۆچوونی هەڵەی خۆیان، گوتیان: ئەم بەشە بۆ خوایەو، ئەم بەشەش بۆ هاوبەشەکانمانە، واتە: ئەوانەی کە لە خەیاڵو زەینی ئەواندا بە هاوبەشی خوا دانراون، لە پەرستراندا، ئەگەرنا بە تەئکید خوای پەروەردگار هیچ هاوبەشی نین، ﴿ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ ﴾، ئنجا ئەوەی کە بۆ هاوبەشەکانیان دایانناوە، ناگاتە خوا، بەڵام ئەوەی کە بۆ خوا دایانناوە، دەگاتە هاوبەشەکانیان.

دیارە ئەم مەسەلەیە وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، تەفسیلێکی هەیە، بەڵام کورتەکەی ئەوەیە کە کافرەکان دوای ئەوەی حاصەڵاتیان هەڵدەگرتەوە، جا دانەوێڵە بووایە، یان میوەجات، دەیانکردە دوو بەش، دەیانگوت: ئەو بەشە بۆ خوا، کە ئەو بەشەی بۆ خوا دایاننابوو، بۆ خۆیانو میوانو بۆ هەژارو نەدار بەکاریان دەهێناو، دەیانبەخشی، وە دەیانگوت: ئەوەش بۆ بتەکانمان، بۆ هاوبەشەکانمان، بۆیەش خوا لێرەدا ناوی ناون: هاوبەشەکانیان، چونکە ئەوان وایاندەگوتو نەیاندەگوت بتو صەنەم، دەیانگوت: ئەوانە هاوبەشی خوان، لە پەرستنو بەندایەتییداو بەشێکی پەرستنیان بۆ ئەوان ئەنجام دەدا.

ئنجا یەکێك لە شێوەکانی پەرستن ئەوەبوو کە بەشێك لە ماڵو سامانەکانیان بۆ خوا دادەناو، بەشێکیش بۆ بتو صەنەمەکانیان کە ناویان نابوون: هاوبەشەکان (شرکاء)، وە ئەو بەشەی کە بۆ بتو صەنەمەکان دایان دەنا، خزمەتی بتەکانیان پێ دەکرد، بۆ مەسرەفو خەرجیی بتەکان: بەرگیان بۆ بتەکانیان دەکرد، بەڵکو جاری

وا هەبوو زێڕو خشڵیان پێوە دەخستن، وە بۆنخۆشیان دەکردن، وە پاشان (سادن)یان بۆ دەگرتن، (سادن)[1] واتە: بتەوان، ئنجا ئەو بتەوانانەش کە خزمەتی صەنەمەکانیان دەکرد، دیارە ئەوانیش پێویستییان بە پارەو مەسرەفو خەرجیی هەبوو، بۆیەش هاوبەش بۆ خوا دانەرو بتپەرستەکان بەشێك لە بەرهەمی ئاژەڵو کشتوکاڵیان بۆ بتەکان دادەنا، بۆ ئەو مەبەستانە، جا ئەوەی کە بۆ بتەکانیان دادەنا، ئەگەر بەشێکی لێ هەڵوەریباو چووبایە گەڵ بەشی خوا، دەیانهێنایەوە، دەیانگوت: خوا پێویستیی بەوە نیە، بەڵام ئەوەی کە بۆ بتەکانیان (هاوبەشەکانیان) دایاننابوو، ئەگەر بەشێکی لێ چووبایە لای بەشی خوا، دەیانگوت: ئەوانە پێویستییان پێیەتی، بەڵام خوا بێنیازە ! واتە: ئەگەر بەشی بتەکان لەگەڵ هی خوا تێکەڵ بووبایە، دەیانگێڕایەوە بۆ بتەکان، بەڵام ئەگەر بەشی خوا تێکەڵ بووبایە، لەگەڵ هی ئەوان، نەیاندەگێڕایەوەو دەیانگوت: خوا پێویستیی پێی نیە ! بۆیە خوا دەفەرموێ:

﴿سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾، ئەوە خراپترین جۆرە بڕیارە، کە ئەوان دەیدەن، واتە: ئەو هەڵسوکەوتە بەو شێوەیە لەگەڵ خوای بەرزدا کە: بەشێکی بۆ دابنێی، لەو شتانەی کە دروستی کردوون، ئنجا هەر کات لە بەشەکەی وی تێکەڵ بە بەشی بتەکان بوو، لێی گەڕێی، بەڵام ئەگەر هی ئەوان تێکەڵ بە بەشی خوا بوو، بیهێنیەوە ! مانای وایە کە تۆ بە کەمتر لە بتەکانیش، تەماشای خوای پەروەردگارت کردوە، جا دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، کە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان ئەو بیرۆکە ئەفسانەییە چی لێ وەردەگیرێ ؟

پاشان دێتە سەر باسی هەڵسوکەوتێکی دیکەی ئەفسانەییان کە ئەویش بریتی بووە، لەوە کە منداڵەکانی خۆیانیان دەکوشت، ئنجا ئەگەر کچ بوونایە دەیانگوت: بۆ ئەوەی تووشی عەیبەمان نەکەن: (دَفْعًا للعَار)، وە ئەگەر کوڕیش بوونایە، جاری وا بوو هەندێك لە تیرەکانی عەرەب (هەموویان نا)، لە ترسی ئەوەی کە دوایی مەسرەفیان پێ ناکێشرێن: (دَفْعًا للفَقْر أو مَخَافَةَ مِنَ الفَقْر)، خوا دەفەرموێ:

---

١) کۆی: سادن، (سَدَنَة)یە، کە بە خزمەتکاری کابەو بتو صەنەمەکان دەگوترا، بڕوانە: مختار الصِّحاح، ص: ٢٦٤.

﴿ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، وە هەروەها بەو شێوەیە {واتە: وەك چۆن لەسەر بناغەیەکی ئەفسانەیی دەستکاریی بەرهەمی کشتوکاڵیان دەکرد، بەشێکیان بۆ خواو، بەشێکیان بۆ هاوبەشەکانیان دادەنا، بە هەمان شێوە} زۆرێك لە هاوبەشەکان، کوشتنی منداڵەکانیان بۆ ڕازاندبوونەوە، کێ؟ (شُرَكَآؤُهُمْ )، ئەوانەی کە دەیانکردن بە هاوبەش بۆ خوا، کە دیارە مەبەست بتو صەنەمەکانن.

ئنجا یەکێ بۆی هەیە بڵێ: باشە خۆ بتو صەنەمەکان قسەیان نەدەکرد؟ دەڵێین: ڕاستە، بەڵام ئەوان دەچوون بۆ لای ئەو بتو صەنەمانە، دوایی شتێکیان دەخستە قورعەوە، سێ پارچە داریان دەهێنا، یەکێکیان لەسەری نووسرابوو: بیکە، یەکێکیان لەسەری نووسرابوو: مەیکە، وە یەکێکیان هیچی لەسەر نەنوسرابوو، ئنجا لە توورەگەیەکیان دەهاویشتن‌و، دەستیان تێدەخست، ئنجا ئەگەر ئەو پارچە دارە بووایە، کە لەسەری نووسراوبوو: بیکە، یەکسەر ئەو شتەیان ئەنجام دەدا، کوشتنی منداڵ بووایە، هەرچی بووایە، بەڵام ئەگەر ئەوە بووایە، کە نووسرابوو : مەیکە، ئەنجامیان نەدەدا، وە ئەگەر ئەوە بووایە کە هیچی لەسەر نیە، دووبارەیان دەکردەوە، تاکو یەکێك لە بیکەو مەیکە دەردەچوو! بۆیەش خوای کاربەجێ پاڵی داوەتە لای بتو صەنەمەکان، چونکە بتەوانەکان لەلای ئەوان دەیانکرد، هەروەها بتەوانەکانیش زۆرجار قسەیان دەکرد لە پشت بتەکانەوە، کە بە حیساب ئەوە بتەکەیە قسە دەکات، یاخود بە ناوی بتەکەوە قسەیان دەکرد، بۆیە خوا پاڵی داوەتە لای ئەوان.

ئنجا ئایا بۆچی وایاندەکرد؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ ﴾، هاوبەشەکانیان بۆیان جوان دەکردن، کە ڕۆڵەکانی خۆیان بکوژن، بۆ ئەوەی بە هیلاکیان بدەن‌و بیانفەوتێنن، ﴿ وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ﴾، وە بۆ ئەوەی دینەکەیان لێ تێکەڵ بکەن.

هەڵبەتە دەشگونجێ لێرەدا كە دەفەرموێ: هاوبەشەكانیان كوشتنی ڕۆڵەكانیان بۆ دەڕازاندنەوە، مەبەست پێی شەیتانەكان بێ، چونكە بتپەرستەكان شەیتانەكانیان دەپەرستو، ئەوانیش بە خوتخوتە دەیانخستە دڵو مێشكیان، كە: كچەكەت بكوژە! نەوەك دوایی شوو بكات، یاخود تیرەیەكی دیكە بەسەر تیرەكەتاندا بداتو، بە دیل بگیرێو عەیبەت بێتە سەرێ! وە: بێنە كوڕەكەت بكوژە ! نەوەك دوایی گەورە ببێو مەسرەفی ئەو هەموو كوڕانەت پێ نەكێشرێ، كەواتە: بە دوو مەبەست ئەو هاوبەشانەیان كوشتنی منداڵەكانیان بۆ جوان دەكردن: یەكەم: بۆ ئەوەی بیانفەوتێنن، دووەم: بۆ ئەوەی دینەكەیان لێ تێكەڵ بكەن.

یەكێك بۆی هەیە بڵێ: كام دینە؟ دەڵێین: ئەو دینەی كە هی ئیبراهیمو ئیسماعیل بوو سەلامی خوایان لەسەر بێ، لەنێویاندا مابۆوە، هەندێ شتی باش لە شوێنەواری دینی ئیبراهیمو ئیسماعیلیان لەنێودا مابۆوە، بەڵام شەیتانەكان دەیانویست ئەوەندە شتەی كە باشیش بوو، لە پاشماوەی ئەو دینە ڕاستەی ئیبراهیمو ئیسماعیل، تێكی بدەن، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، لێرەدا ئەمە وەڵامی پرسیارێكە، كە ڕەنگە لە هەندێ مێشكدا پەیدا بێ، بڵێ: ئایا خوا نەیدەتوانی ڕێیان لێ بگرێ؟ با، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای وا نەكەن، وایاننەدەكرد، بەڵام ئەدی خوا بۆچی نەیویستوە، وانەكەن؟ لەبەر ئەوەی ویستوویەتی ئازادیان بكاتو، ئازاد بن، سەرپشك بن، چونكە وا نەبێ تاقی ناكرێنەوەو، وانەبێ دەرناكەوێ: ئایا كێ بە ئازایەتیی خۆی بەندایەتیی بۆ خوا دەكات؟ وە كێ بەندایەتیی بۆ خوا ناكات؟ ئەگەر خوا ناچاری كردبان لەسەر تاعەت، ئازایەتیی ئەوانە كە بەندایەتیی بۆ خوا دەكەن، بە ئیرادەی ئازادانەی خۆیان، دەرنەدەكەوت، هەروەك تاوانی تاوانبارانیش دەرنەدەكەوت.

ئنجا لە كۆتایی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾، دەجا وازیان لێ بێنەو ئەوەی كە هەڵیدەبەستن، واتە: ئەو درۆو دەلەسەیەی كە بە ناوی

دینەوەو بە ناوی خواوە هەڵیدەبەستن، لێیانگەڕێ، وە کە دەفەرموێ: لێیانگەڕێ، مەبەست ئەوە نیە ئاگاداریان نەکاتەوە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ، ئەرکی سەرەکیی ئاگادارکردنەوەیە ﴿... وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾﴾ النور، وە خوای پەروەردگار قورئانی ناردوە، بۆئەوەی ئاگاداریان بکاتەوەو بانگەوازیان بکات، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە زۆر خەفەتی پێ مەخۆو، لێیانگەڕێو لە گومڕایی خۆیاندا وێڵیان بکە، بەو واتایە کە ئیهمالیان بکە خۆیانو بیروکە ئەفسانەییەکانیان، لەو ڕووەوە کە هیچ نین، واتە: هیچ ئیعتیبارێکیان بۆ دامەنێو بە هەندیان مەگرە.

ئنجا خوای زاناو شارەزا دێتە سەر باسی هەندێ شتی دیکەی ئەفسانەییان، دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾، وە گوتیان: (واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کافرەکان) ئەوانە چەند جۆرێك ئاژەڵن، وە چەند جۆرێك بەروبوومی کشتوکاڵن، قەدەغەیە نابێ هیچ کەس بیانخوات، مەگەر کەسێك کە خۆمان بمانەوێ.

(هەروا بە بۆچوونی خۆیانو لەخۆوە دەیانگوت: ئەو جۆرە ئاژەڵە، یان ئەو جۆرە دانەوێڵەیە، یان ئەو جۆرە میوەجاتە، یان ئەو جۆرە بەرهەمە، دەبێ حەتمەن فلان جۆرە کەسە بیخواو، نابێ فلان جۆرە کەسە بیخوات، بۆیە خوا دەفەرموێ: (بِزَعْمِهِمْ ) وشەی (زَعْم) واتە: بۆچوونێکی هەڵە، بە بۆچوونی هەڵەی خۆیان، ﴿وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا﴾، واتە: وە هەندێ ئاژەڵ پشتیان قەدەغە کردبوون، واتە: نە بۆ بارهەڵگرتن، نە بۆ سواریی، بەکاریان نەدەهێنان، ئنجا ئەو ئاژەڵانە حوشتر بوونایە، گا بوونایە، کە زیاتر حوشترو گا بەکارهێنراون بۆ بارو سوار (بارلێنانو بۆ سواریی)، ﴿وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ﴾،

وە هەندێ ئاژەڵیش ناوی خوایان لەسەر نەدەهێنان، بە درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوە، هەر لەخۆوە دەیانگوت: ئەوانە کە سەریان دەبڕین، نابێ ناوی خوایان لەسەر بهێنرێ، ئنجا یان ناوی بتو صەنەمیان لەسەر دەهێنان، یاخود هیچ ناوێکیان لەسەر نەدەهێنان، هەر ئاوا سەریان دەبڕین، دیارە گەر تۆ بتەوێ بە شێوەی عەقڵو مەنتیق ئەوە هەڵسەنگێنی، ناچێتە عەقڵەوەو هیچ پێوەرو تەرازوویەك نایگرێتەوە، ﴿سَيَجۡزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴾، بە تەئكید لەمەودوا خوا سزایان دەدات، بەهۆی ئەو درۆ هەڵبەستنانەیانەوە، کە لەخۆوە شتیان قەدەغە دەکرد.

ئنجا خوای زاناو شارەزا دێتە سەر باسی هەندێ قسەو بیروڕای دیکەی ئەفسانەییان، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ سَيَجۡزِيهِمۡ وَصۡفَهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴾، وە گوتیان: ئەوەی لە سکی ئەو ئاژەڵانە دایە، (ئاژەڵە مێیینەکان) تایبەتە بە نێرینەکانمانەوە، هەندێك جۆرە ئاژەڵیان دانابوو، دەیانگوت: بەچکەکانی، یاخود شیرەکەی کە لە سکیدایە، دەبێ تایبەت بێ بە پیاوەکانیانەوە ﴿ وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَا ﴾، وە گوتیان : قەدەغەیە لەسەر ژنەکانمان، لەسەر هاوسەرانمانو، نابێ ئافرەتان بیخۆن، چ شیرەکەیان کە لە سکیان دابوو، چ بەچکەکانیان کە دەیانبوون، ﴿ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ سَيَجۡزِيهِمۡ وَصۡفَهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴾، بەڵام ئەگەر بەچکەکە مردوو بووایە، واتە: کاتێ کە بە مردوویی لە دایك بووایە، یاخود کاتێك ئەو ئاژەڵەیان سەردەبڕی، ئەو بەچکەیەی کە لە سکی دایە، ئەگەر مردوو بووایە، ئەوە پیاوو ئافرەت تێیدا هاوبەش دەبوون! ئەوەش هەر لەخۆوە، بەبێ بەڵگەیەكو، بێئەوەی کە عەقڵ بیخوازێو زانست بیخوازێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ سَيَجۡزِيهِمۡ وَصۡفَهُمۡۚ إِنَّهُۥ

﴿حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾، خودا سزای ئەو جۆرە وەسفکردنو باسکردنە ئەفسانەییەیان، دەداتەوە، ﴿إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾، بێگومان خوا کاربەجێی زانایە.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەوەی کە ئەو جۆرە ڕەفتارانەیان سەرەنجامی چۆنە؟ دەفەرموێ: ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهَۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾، بێگومان زیانباربوون ئەوانەی کە منداڵەکانی خۆیان بە نەفامیی کوشت، بە بێ زانیاریی، {کچو کوڕەکانیان لەبەر هەژارییو نەداریی، یاخود کچەکانیان لەبەر ئەوە کە عەیبەیان نەیەتە سەر ، وە کوڕەکانیان لە ترسی هەژاریی}، هەروەها زیانباربوون بەهۆی ئەوەوە کە ئەوەی خوا پێی داون، ئەو ڕزقو ڕۆزییانەی خوا پێی داون {لە دانەوێڵەو لە ئاژەڵو لە میوەجات، هەر لەخۆوە هەندێ جۆریان لێ قەدەغە کردن}، ﴿ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ﴾، بە درۆ هەڵبەستن بە ناوی خوا چونکە ئەوانەیان هەموو بەناوی دینەوە دەکردو دەیانگوت: لە ڕووی دینەوە دەبێ وابێو ئەگەر وابکەین لە خوا نزیك دەبینەوەو بتو سەنەمەکان شەفاعەتمان بۆ دەکەن، بۆیە خوا دەفەرموێ ﴿قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾، گومڕابوون، ڕێی ڕاستیان ون کرد، وە لە ڕێی ڕاستگرتووان نەبوون.

ئنجا خوای بێ هاوتا، باسی هەندێ لە نیعمەتەکانی خۆی دەکات، وە پاشان باس دەکات کە دەبێ چۆن لەگەڵ نیعمەتەکانی خوا، لەگەڵ چاکەکانی خوادا مامەڵە بکرێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّـٰتٍ مَّعْرُوشَـٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَـٰتٍ﴾، وە خوا ئەو کەسەیە کە باغو بێستانی کەپردارو بێ کەپری هێناونە دی، واتە: ئەو جۆرە میوەجاتەی کە پێویستییان بە کەپر دەکات، کە دیارە مەبەست پێی درەختی مێوە، (ترێ) دەبێ کەپری بۆ بکرێ، بۆ ئەوەی بەرزبێتەوەو هێشووەکانی پێدا شۆڕ بێتەوە، ﴿وَغَيْرَ مَعْرُوشَـٰتٍ﴾، وە ئەوەشی کە پێویستیشی بە کەپر ناکات

ڕادەخرێ، ئەوەی کە لە شوێنی ئاودێر بیکەن، کەپری بۆ دەکەن، بەڵام ئەوەی کە لە دێمەکار بڕوێ، ئەو درەختی ترێیە، ڕادەخرێو بەبێ کەپرە، ﴿وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی ئەو جۆرە میوانە بێ، وەك خۆخو سێوو هەنارو هەنجیرو هەرمێو ئەوانە، کە درەختیان هەیەو پێویستییان بە کەپر ناکات، بۆخۆیان بە درەختەکەیانەوە هەڵواسراون، وە دەشگونجێ ﴿مَعۡرُوشَٰتٖ ﴾، مەبەست پێی ئەو جۆرە تەڕەکارو سەوزەو شتانەبێ، کە لە زەوی ڕادەخرێن، وەك کاڵەكو شووتیو ترۆزییو خەیارو تەماتەو هەموو ئەو شتانەی دیکە، ﴿وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ ﴾، مەبەست ئەو جۆرە میوانە بن کە بە درەختەوەن، ﴿وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ﴾، وە خوا دارخورمای دروستکردوە، وە کشتوکاڵ، (زرع) هەموو جۆرەکانی سەوزەو دانەوێڵە دەگرێتەوە، وە هەموو جۆرەکانی ئەو ڕووەکانەش دەگرێتەوە کە لە نێوانی سەوزەو دانەوێڵەدان، وەك گەنمەشامیی﴿مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ ﴾، (مختلف) واتە: جۆراوجۆر، (أكل) واتە: خواردنەکەی، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە دەخورێ، کە میوەکەیەتی، یاخود بەرەکەی کە جۆراوجۆرە، جا ئەوە چ مەبەست پێی (زرع) بێ، واتە: تەڕەکارو دانەوێڵە، چ مەبەست پێی میوەجات بێ، هەموویان جۆراوجۆرو ڕەنگاو ڕەنگن، ﴿وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ ﴾، وە خوا زەیتوونی دروستکردوەو، هەناری دروستکردوە، وێکچوویەو وێکنەچووشە، وێکچوویە لە ڕەنگدا وێکدەچێ، هەنار بە هەنار دەچێ، وە زەیتوون بە زەیتوون دەچێ، بەڵام لە تامو چێژو بۆنو نێوەڕۆکیان دا، وێکناچنو جۆراو جۆرن، ﴿كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ ﴾، ئنجا ئایا دەبێ چۆن لەگەڵ ئەو نیعمەتانەی خوادا مامەڵە بکرێ ؟ ئایا وەك هاوبەش بۆ خوادانەرە ئەفسانەییەکان، بکەن ؟ نەخێر بەڵکو دەبێ لە بەرهەمەکەی بخۆن، هەر کاتێ بەری دەرکرد، واتە: هەر کاتێ پێگەیشت، وە هەقەکەشی لێ دەربکەن لە ڕۆژی

هەڵگرتنەوەیدا، (حصاد) واتە: حاصەڵات هەڵگرتنەوە، ئەو کاتەی کە درەو دەکرێ‌و دەچنرێتەوەو هەڵدەگیرێ، ﴿ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ ﴾، واتە: زێدەڕۆیی مەکەن، لە خواردندا زێدەڕۆیی مەکەن‌و لە لێ بەخشینیدا زێدەڕۆیی مەکەن، هەردووکیان دەگرێتەوە، بۆچی ؟ چونکە: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾، بێگومان ئەو (خوا) زێدەڕۆییکارانی خۆش ناوێ.

دوای ئەوە دێتەوە سەر باسی ئاژەڵ، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗا ﴾، وە لە ئاژەڵەکان هی باربەرو ڕاخراوی بۆ دروستکردوون، باربەر ئەو حوشترانەن کە بار دەبەن، یان ئەو (گا)یانەی کە بار دەبەن، بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە: (حمولة) ناوە بۆ هەر بارهەڵگرێك، جا چ حوشتر بێ، چ گوێدرێژ بێ، چ ماین‌و ئێستر بێ، چ گا بێ، چ هەر شتێکی دیکە بێ، وە (فَرْشاً) بە مانای ڕاخراو دێ، جا دەگونجێ مەبەست پێی ئاژەڵی ورد بێ، وەك مەڕو بزن، کە لەچاو حوشترو گادا، بە زەوییەوە نووساون، وەك فەرشێك ڕاخراون لەسەر زەوی، هەندێکیش دەڵێن: ﴿ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗا ﴾، واتە: لەنێو ئاژەڵەکاندا، هەم هەیانە بارتان بۆ هەڵدەگرن‌و، هەم فەرش‌و ڕایەخیش لە تووك‌و مووو خورییەکەیان، دروست دەکەن، ﴿ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾، لەوەی کە خوا پێی داون، بخۆن‌و بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان دا مەڕۆن‌و، بە دوای شوێن پێیەکانی شەیتان مەکەون، کە بێن لەخۆوە هەندێ لەو شتانە قەدەغە بکەن، یان بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، کە لە ئایەتەکاندا باسکرا، ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾، بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، کەواتە: شوێنی مەکەون، هەر لەخۆوە، ئەو ڕزق‌و ڕۆزییە پاك‌و چاکانەی پەروەردگار: چ لە ئاژەڵ، چ میوەجات، چ دانەوێڵە، چ بەرهەمی دیکە، لەخۆوە لە خۆتانیان قەدەغە مەکەن.

دوایی خوای بالآدەست وەك دەمکوتکردنێکی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، کە لەخۆوە هەندێ لەو شتانەیان لەخۆیان قەدەغە دەکرد، بەتایبەت ئاژەڵەکان، دەفەرموێ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖ﴾، واتە: (خَلَقَ لَكُمْ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ)، هەشت جووتی بۆ دروستکردوون، لە چوار جۆرە ئاژەڵ، وشەی (أزواج) کۆی (زوج)ە، (زوج)یش بریتیە لە تاکی هەر شتێك کە بەرانبەرێکی هەبێ، مەرجیش نیە تەنیا لە نێرو مێدا بێ، خوا دەفەرموێ: هەشت جووتی بۆ دروستکردوون، لە چوار جۆرە ئاژەڵ، ﴿مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِ﴾، لە حەیوانی سپی دووانو، لە حەیوانی ڕەش دووان، بۆیە وادەڵێم، چونکە: لە کوردییدا (ضأن) واتە: مەڕ، کە زیاتر مێینەکە دەگرێتەوە، بەلآم لە زمانی عەرەبیدا (ضأن) کە کۆی (ضائن)، (ضائن) واتە: ئاژەڵی وردی سپی، کە ئێمە دەڵێین : مەڕ، بەلآم مەرج نیە تەنیا مێ بێ، بەڵکو بە نێرو مێی دەگوترێ: (ضائن)، ئەگەر تاك بێ، ئنجا بە مێیەکەی دەگوترێ: (نعجة) مەڕ، وە بە نێرەکەی دەگوترێ: (کبش)، بەران، ئێمە دەڵێین: بەرانو مەڕ، ﴿وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِ﴾، وە لە وردە ئاژەڵی ڕەش یاخود سوور، یان مەرەز، دووان، (معز) کۆی (ماعز)ە لە زمانی عەرەبییدا، (ماعز) بە تاکی ئەوە دەگوترێ کە ئێمە پێی دەڵێین: بزن، بەلآم لە عەرەبیی دا، نەك تەنیا بە مێینەکەی نا، بە هەردووکیان دەگوترێ: (ماعز)، چ نێر بێ، کە ئێمە بە نێرەکەی دەڵێین : نێرییو، بە مێیەکەی دەڵێین: بزن، بەلآم لە زمانی عەرەبییدا، بە هەردووکیان دەگوترێ: (ماعز) وە بە کۆیان دەگوترێ: (مَعْز)، وە بە تاکی نێریان دەگوترێ: (تَیْس)و بە تاکی مێیان دەگوترێ: (عَنْزَة). کەواتە بە کوردیی: (معز) واتە: ئاژەڵی وردی ڕەش، کە زیاتر لە چیا دەبێ، وە (ضأن) واتە: ئاژەڵی وردی سپی، کە زیاتر لە دەشت دەبێ.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ﴾، (ئەی پێغەمبەر !) تۆ پێیان بڵێ، (یان هەر کەسی کە قورئان دەخوێنێ)، ئایا خوا دوو نێرەکانی قەدەغە کردوون، لە ئاژەڵی ڕەشو سپی، مەڕو بزن، واتە: بەرانو نێریی

قەدەغە کردوون، یان دوو مێینەکانی قەدەغە کردوون، واتە: بزنو مەڕ ؟ ﴿أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، یاخود هەرچی بەچکەدانی دوو مێینەکان گرتوویانەتە خۆیان، واتە: ئەوەی لەنێو سکیاندایە ؟ چونکە خوا وشەی (أرحام)ی بەکارهێناوەو (أرحام)یش کۆی (رحم)ە، ئەگەر بۆ بەشەر بێ، دەبێ بڵێی: منداڵدان، بەڵام بۆ ئاژەڵ دەبێ بڵێین: بەچکەدان، چونکە بەچکەکەی تێدایە.

یانی: ئایا خوا هەردوو نێرەکانی قەدەغەکردوون، یان هەردوو مێیەکان، یاخود ئەوەی کە لە بەچکەدانی مێینەکانیدایە، کامەی قەدەغە کردوە ؟! ﴿نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، ئەگەر ڕاست دەکەن، خوا ئەوانەی قەدەغە کردووە، بەناوی دینی خواوە ئەوە دەڵێن، بە زانیاریی هەواڵم پێ بدەن، نەك هەروا بە شێوەیەکی ئەفسانەیی.

ئنجا لە کۆتایی دا دێتە سەر باسی چوار جۆرەکەی دیکە لە ئاژەڵانو، دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ﴾، وە لە حوشتر دووانو لە ڕەشە وڵاخیش دووان، دیارە لە زمانی عەرەبییدا (إبل) ناوی (جنس)ە، بۆ حوشتر، یانی: بێئەوەی کە بزانی : داخۆ نێرە یان مێیە ؟ وە (بقر)یش ناوە بۆ ڕەشە وڵاخ، دیسان بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە: نێرە یان مێ ؟ بۆ هەردووکیان بەکاردێ، جا عەرەب بە نێرەی حوشتر، دەڵێن: (جَمَل) وە بە مێیەکەشی دەڵێن (ناقة)، کە لە کوردییدا ئێمە ئەوەمان نیە، چونکە حوشتر لە کوردەواریی دا نەبووە، تاکو مێیەکەی ناوێکی بۆ دابنێینو، نێرەکەی ناوێکی دیکەی بۆ دابنێین، هەر دەڵێن: وشتر، یان حوشتر، وە (بقر)یش ناوی (جنس)ە، بۆ ڕەشە وڵاخ، جا بە نێرەی ڕەشە وڵاخ دەگوترێ: (ثور)، وە بە مێیەکەشی دەگوترێ: (ثورة)، کە (ثور) بە (ثیران) کۆ دەکرێتەوەو (ثورة)ش بە (ثورات)، بەڵام ئێمە بە نێرەکەی دەڵێین: گا، وە بە مێیەکەی دەڵێین: مانگا، کەواتە: وشەی (بقرة) واتە: تاکی ڕەشە وڵاخ، چ نێر بێ،

چ مێ، كە زۆربەی خەڵك وا دەزانن: (بقرة) واتە: مانگا، واتە: مێینەی ڕەشە وڵاخ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا وانیەو (بقرة) تاكی ڕەشەوڵاخە، نێر بێ یان مێو، بە (بقرات) كۆدەكرێتەوە، واتە: ڕەشەوڵاخەكان، نێربن یان مێ.

دووبارە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾، بڵێ: ئایا خوا دوو نێرینەكانی قەدەغە كردوون، یان دوو مێینەكان، یاخود ئەوەی كە بەچكەدانی ئاژەڵەكان گرتوویاننە خۆیان، یانی كامەیان، بەڵگەتان چییە؟ ﴿ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا ﴾، یان ئایا ئێوە شایەد بوونو ئاگادار بوون كە خوا ئەو وەسیەتەی بۆ كردن، واتە: ئەگەر بەڵگەی زانیارییو عەقڵییتان نیە، ئایا بەڵگەی نەقڵییتان هەیە ؟ بەڵگەیەكتان لە وەحی هەیە ؟ كە خوا ڕاسپاردەیەكی وای بۆ كردبن؟ ئەوە لێرەدا جۆرێكە لە پلارو توانج تێگرتنو گاڵتەپێكردن، یانی: نەخێر، نە خوا وەسیەتی وای بۆ كردوون، نە عەقڵو عیلمیش داخوازی ئەوە دەكەن كە هەندێ لەو جۆرە ئاژەڵانە قەدەغە بكەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، ئنجا ئایا كێ ستەمكارترە لە كەسێك كە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، بۆ ئەوەی بەبێ زانیاریی خەڵك گومڕا بكاتو سەرگەردانیان بكات ؟ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بێگومان خوا كەسانی ستەمكار ڕاستە ڕێ ناكاتو، نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست.

# چەند مەسـەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡۗ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴾، پێشتر ئەم ئایەتەمان مانا کرد، لێرەدا هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، سێ جۆرە بێئەدەبیی و بێڕێزیی بەرانبەر بە خوا دەکەن :

١/ بەشێکیان بۆ خوای بێ هاوتا دانا، لەوەی کە دروستی کردوە لە کشتوکاڵ و لە ئاژەڵ، واتە: خوا ئەو کشتوکاڵ و دانەوێڵەو میوەجات و ئاژەڵانەی دروستکردوون، کەچی لە دروستکراوەکانی خۆی، بەشێکی بۆ دادەنێن !

٢/ ئەوەیە کە بەشێکی بۆ دادەنێن، نەك هەمووی.

٣/ ئەوەیە کە بەشی هاوبەشەکانیان، بۆ خوا نەدەچوو، بەڵام بەشی خوا، بۆ بت و صەنەمەکان و بۆ هاوبەشەکانیان دەچوو، ئنجا ئایا ئەوە چۆن بووە؟! عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: وَكَانُوا إِذَا هَلَكَ الَّذِي لآلِهَتِهِم وَكَثُرَ الَّذِي لله، أَخَذُوا الَّذِي لله، وَأَنْفَقُوهُ عَلَى الأَصْنَامِ، وَإِذَا هَلَكَ الَّذِي لله وَكَثُرَ الَّذِي للأَصْنَامِ، قَالُوا: لَوْ شَاءَ اللهُ لأَزْكَى الَّذِي لَهُ}[1] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: (عەرەبە بت پەرستەکان عادەتیان وابوو: ئەو بەشەی کە بۆ بتەکانیان دانابوو، ئەگەر فەوتابایە، وە ئەو بەشەی کە بۆ خوایان دانابوو، زیادی کردبایە، (جا ئاژەڵ بووایە، یان

---

١) جامع البيان، برقم: (١٠٨٢٠) و (١٠٨٢١) والتفسير الكبير للطبراني، ج٣، ص٨٩.

دانەوێڵە، یان هەرچی بووایە)، لە بەشەکەی خوایان هەڵدەگرتو دەیانخستە سەر هی بتەکانیانو، بۆیان سەرف دەکردن، بەڵام ئەگەر لە بەشی خوا فەوتابایەو بەشی بۆ بتەکانیان زیادی کردبایە دەیانگوت: ئەگەر خوا ویستبای، بەشەکەی خۆشی زیاد دەکرد، (دیارە پێویستیی پێ نیە).

هەر لەوبارەوە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی چەمکی ئەو هەڵسوکەوتەی بتپەرستەکان، ئەمەشی لێ گێڕدراوەتەوە: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: جَعَلُوا للهِ مِنْ ثَمَرَاتِهِم وَمَا لَهُمْ، نَصِيبَاً، وَللشَّيطَانِ وَالأَوْثَانِ، نَصِيبَاً، فَإِنْ سَقَطَ مِنْ ثَمَرَةِ مَا جَعَلُوا للهِ، فِي نَصِيبِ الشَّيْطَانِ، تَرَكُوهُ، وَإِنْ سَقَطَ مِمَّا جَعَلُوهُ للشَّيْطَانِ، فِي نَصِيبِ اللهِ، التَقَطُوهُ وَحفظُوهُ وَرَدُّوهُ إلى نَصِيبِ الشَّيْطَانِ، وَإِن انْفَجَرَ مِنْ سِقْيِ مَا جَعَلُوهُ للهِ فِي نَصِيبِ الشَّيْطَانِ، تَرَكُوهُ، وَإِن انْفَجَرَ مِن سِقْيِ مَا جَعَلُوهُ للشَّيْطَانِ فِي نَصِيبِ اللهِ، سَدُّوهُ، فَهَذَا مَا جَعَلُوا مِنَ الحروث وَسِقْيِ الماءِ، وَأَمَّا مَا جَعَلُوا للشَّيْطَانِ مِنَ الأَنْعَامِ فَهُوَ قَوْلُ اللهِ: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ﴿١٠٣﴾﴾ المائدة}[1]، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەوانە عادەتیان وابوو، لە کشتوکاڵو لە ماڵو سامان بەشێکیان بۆ خوا دادەنا، بەشێکیشیان بۆ شەیتانو بۆ بتەکانیان دادەنا، جا ئەگەر لەو بەشەی کە بۆ خوا دایانناوە، لە میوەکە کەوتبایە خوارێو چووبایە گەڵ بەشی شەیتانو بتەکانیان، لێی دەگەڕان، بەڵام ئەگەر لەو بەشەی کە بۆ شەیتانو بۆ بتەکان دایاننابوو، لێی کەوتبایە خوارێو چووبایە گەڵ بەشی خوا، هەڵیاندەگرتەوەو دەیانپاراستو دەیانخستەوە گەڵ بەشی شەیتانو بتەکان، هەروەها ئەو کشتوکاڵە کە دەیانکرد، ئەگەر لەوەی کە بۆ خوا دایانناوە، ئاوەکەی چووبایە نێو بەشی شەیتانو بتەکان، لێی دەگەڕان، بەڵام ئەگەر لەوەی کە بۆ بتو شەیتان دایانناوە، ئاوەکەی چووبایە گەڵ بەشی خوا، دەیانگێڕایەوە، ئەوە سەبارەت بە کشتوکاڵو ئەوەی کە بە ئاودێریی، ئاو دەدرێو بەرهەم دێ، بەڵام

---

١) جامع البيان للطبري برقم: (١٣٨١٥).

بەنسبەت ئەو بەشەوە، کە لە ئاژەڵان بۆ شەیتانیان دانابوو، خوا دەفەرموێ:

﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ ﴿١٠٣﴾﴾ المائدة، چوار جۆرە ئاژەڵیان دیاریی کردبوون، بە تایبەتی لە حوشتر: بەحیرە، سائیبە، وەصیلە، حام، کە کاتی خۆی باسمانکردوە، بۆچی ئەو ناوانەیان لێناون، کە هەر لەخۆوە ئەو ناوانەیان لێنابوونو، لە خۆیانیان قەدەغە کردبوون، یاخود بۆ بتەکانیان تەرخانیان کردبوون.

دەشگونجێ مەبەست لەو ئایەتە موبارەکە، ئەوەبێ کە لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (قَالَ اللهُ تَعَالَى: أنَا أغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ)﴾[1]، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: خوای پایە بەرزو مەزن دەفەرموێ: من بێنیازترینو دەوڵەمەنترینی هاوبەشەکانم لە هاوبەشدارێتیی، هەر کەسێك کردەوەیەك بکات، بەشی جگە لە منی تێکەڵ بکات، ئەوە من خۆیو هاوبەشەکەی (کە ئەو کەسە، یان ئەو شتەی کە کردوویەتی بە هاوبەش) وازی لێ دێنم، (واتە: بەشەکەی خۆشم دەدەم بەو).

کەواتە: دەگونجێ مەبەست لەو ئایەتە کە دەفەرموێ: (ئەوەی کە هی هاوبەشەکانیان بوو، بۆ خوا نەدەچوو، بەڵام ئەوەی هی خوا بوو، بۆ هاوبەشەکانیان دەچوو) مەبەست ئەوەبێ چونکە خوا بەشەکەی خۆی ناوێ، واتە: بەشەکەی خۆیشی دەدات بەو هاوبەشانەو، خوا قبووڵی ناکات، ئەو کردەوەیەی کە بۆ خوا دەکرێ، جگە لە خۆی تێدا بەشدار بکرێ، جا نوێژ بێ، ڕۆژوو بێ، ماڵ بەخشین بێ، جەنگو جیهاد بێ، بڵاوکردنەوەی زانست بێ، هەر شتێك ڕیاو شیرکی تێکەوتو جگە لە خوای تێدا بەشدار کرا، خوای بێنیاز بەشەکەی خۆشی ناوێ.

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٩٨٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٠٢).

## ئەوەی پێویستە لەم ڕۆژگارەمان دا، لە ئایەتی (١٣٦)ی وەربگرین

ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ، بۆ ئێستامان؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئێستاش زۆر کەس ئەگەر خوا بە یەکگرو ئیمانداری باش نەبێ، هەر وا دەکات، چۆن؟ ئەوان ـ واتە: هاوبەشدانەرە پێشووەکان ـ بە شێوەیەکی ڕواڵەتیی‌و ئەفسانەیی‌و سادە، بەشی خواو بەشی جگە لە خوایان جیاکردۆتەوە، بەڵام ئێستا خەڵك دێنێ، دەڵێ: دینی خوا لە مزگەوتێیە، بەڵام لە بازاڕو لە فەرمانگەو کێڵگەو لە هەموو کایەکانی دیکەی ژیان دا، بە دوای جگە لە خوا دەکەوێ، وەك لە یەکەمین هەڵبژاردندا[1]، گوتیان: حاجییەك دەنگی دابوو، گوتبوویان: حاجی دەنگت بە کێ داوە؟ ئەویش ئاماژەی کردبوو بۆ ڕەنگی یەکێ لەو حیزبە عەلمانییانەو گوتبووی: هەر فلان ڕەنگە جوانە نیە؟ گوتبوویان: حاجی ئەدی ئیسلام؟ گوتبووی ئیسلام بان سەر، بان سەر!!

یانی: لەسەر زەوی لەسەر لەگەڵ فلان بەرنامەو فیکرەیەم، بەنسبەت ئایین‌و بەرنامەکەی خواش ئەوە لە ئاسمانە! کە لە حەقیقەتدا ئەمە وەك ئەوەیە کە تۆ بێنی بەشی کەمتر بۆ خوا دابنێی، یان حیسابی کەمتر بۆ خوا بکەی، کە بێگومان ئەوە بێئەدەبییەکی زۆر گەورەیە، کە دیارە ئەوەش لە زۆر شتدا بەرجەستە دەبێ: بۆ نموونە :

١/ کەسێك خەریکی ئیشوکار دەبێ، دوایی، خۆر خەریکە ئاوابێ، ئەوجار نوێژەکەی دەکەوێتەوە بیرو، بە پەلە دەیکات.

٢/ یان کەسێك کە هەر خەریکی ئیشوکار دەبێ، ئنجا ئەگەر بواری هەبوو بەڕۆژوو دەبێ لە ڕەمەزان دا ! ئەگەرنا دەڵێ: ئیشم زۆرە، وەك بڵێی: بەشەکەی خوای پەروەردگار لە زیادەیە!

٣/ هەروەها جاری وابووە کەسێك ماڵێکی خراپ کە بۆخۆی نەیویستوە، ئەوەی کردوە بە خێرو داویەتی بە خوا، بەڵام ئەوەی کە بەکەڵك هاتوە، بۆخۆی بەکاریهێناوە !

---

١) مەبەست یەکەمین هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستانە، لە ساڵی: ١٩٩٢ ز دا.

لەڕاستییدا ئەوە هەمووی دەچێتەوە سەر ئەو ڕیشە ئەفسانەییەی، کە تۆ بەشی کەمتر بۆ خوا دابنێی ! ڕاست ئەوەیە نەك هەر بەشی کەمترو بەشی زۆرتر، بەڵکو تۆ دەبێ هەموو شتەکان بە هی خوای پەروەردگار بزانیو، لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاریان بێنی، چونکە خوای تاكو پاك، ڕازی نابێ بەوە کە کەسی لەگەڵدا بکرێتە هاوبەش، بۆیە خوای بێ هاوتا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾، واتە: خراپترین بڕیار ئەو بڕیارەیە کە ئەوان دەیدەن، کە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خوای گەورەدا دەکەن، کە جگە لە خوا پێش خوا دەخەن !

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ قَتۡلَ أَوۡلَٰدِهِمۡ شُرَكَآؤُهُمۡ لِيُرۡدُوهُمۡ وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡۖ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ﴾، ئەوەی پێشێیان دەستکارییکردنی نیعمەتەکانی خوا بوو، لە ئاژەڵو کشتوکاڵو بەروبوومو میوەجات، لەسەر بناغەیەکی ئەفسانەییو بتپەرستانە، بەڵام ئەمەیان بریتیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ڕۆڵەو جگەر گۆشەی خۆت دا، لەسەر بناغەیەکی ئەفسانەیی، دەفەرموێ: هەروەها بەو شێوەیە، زۆر لە هاوبەشەکان (یاخود زۆر لە بتو صەنەمەکان، یاخود زۆر لە شەیتانەکان، کە لەگەڵ خوا دەپەرستڕێن) کوشتنی ڕۆڵەکانی خۆیانیان بۆ هاوبەش دانەرەکان جوانکردوە، بۆ ئەوەی بیانفەوتێنن، وە بۆئەوەی دینەکەیان لێ تێکەڵ بکەن، واتە: ئەو دینە هەقەی کە لە ئیبراهیمو ئیسماعیلەوە سەلامی خوایان لەسەربێ هاتووە، هەندێ لە پاشماوە ڕاستەکانی لەنێو ئەواندا ماوەنەوە، ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ﴾ ، وە ئەگەر خوا ویستبای، وایاننەدەکرد، بۆیە: لێیانگەڕێو ئەوەی کە هەڵیدەبەستن، یا هەڵیبەستن.

لەوبارەشەوە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: (كَانَ أَهْلُ الجَاهِلِيَّةِ يَدْفِنُونَ بَنَاتَهُم أَحْيَاءً، كَرَاهِيَّةَ للبَنَاتِ، وَكَانَ الرَّجُلُ مِنْهُمْ يَحْلِفُ، لأَنَّ وُلِدَ مِنْهُمْ كَذَا وَكَذَا غُلامَاً، لِيَنْحرِوا أَحَدَهُمْ، كَمَا حَلَفَ

عَبْدُالـمُطَلّب عَلَى ابْنِـه عَبْدُالله، وَكَانَ لآلِـهَتِهِم خُدَّام يَقُومُونَ عَلَيهِم الَّـذِينَ كَانُوا يزيِّنُونَ للـمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلاَدِهِم)[1]، واتە: خەڵكی سەردەمی نەفامیی، (كافرو هاوبەش بۆخوا دانەرەكان) كچەكانی خۆیان بە زیندوویی لە گڵی دەخستن، لەبەرئەوەی ڕقیان لە كچان بوو، (دەیانگوت: چۆن دەبێ كچ بە شوو بدرێ‌و، ئەو عەیبە گەورەیەمان بێتە سەرێ، یان لە ترسی ئەوەی كە نەوەك تیرەو هۆزێك بەسەر تیرەو هۆزەكەیاندا بداو، دوایی كچەكەیان بە دیل بگیرێ‌و سووكایەتیی پێ بكرێ، دەیانگوت: با هەر بە گچكەیی بیكوژین باشترە، وەك لەوەی دوایی عەیبەمان بێنێتە سەر)[2].

هەروەها هەندێ لە پیاوەكانیان سوێندیان دەخوارد: ئەگەر ئەوەندە كوڕەی ببن، یەكێكیان سەردەبڕێ‌و دەیكاتە قوربانیی، وەك (عَبْدُالـمُطَلّب)، (باپیری پێغەمبەر ﷺ) بەڵێنی داو سوێندی خواردو قوڕعەكەی كەوتە سەر عەبدوڵڵا.

{هۆكاری ئەوەش ئەوەبوو كە قوڕەیشییەكان ویستیان زوڵمی لێ بكەن، ئەویش لە خوا پاڕایەوە: خوایە ! ئەگەر دە كوڕانم بدەیە، كە بەرگرییم لێبكەن، یەكێكیان بۆ تۆ دەكەمە قوربانیی، خواش دە كوڕی دانێ، یەكێكیان عەبدوڵڵا بوو، بابی پێغەمبەری خۆمان ﷺ، ئنجا قورعەی كێشا، عەبدوڵڵا دەرچوو، عەبدوڵڵاش لە هەمووان گچكەتر بوو، زۆری خۆش دەویست، گوتی: تەگبیر چیە؟ پرسیان بە كاهینێك كرد، گوتی: بێنە دە حوشتران لەوێ دانێ‌و، عەبدوڵڵاش لەوێ دانێ، قورعە بكێشە، ئەگەر دە حوشترەكە دەرچوون، ئەوان سەربڕەو، عەبدوڵڵا سەلامەت دەبێ، ئەگەر عەبدوڵڵا دەرچوو، دە حوشتری دیكەیان بخە گەڵ، دەڵێ: دە جاران قوڕعەیان دەكێشا، هەر دە جارەكە هەر عەبدوڵڵا دەردەچوو، دە حوشتر، دە حوشتر زیادی دەكردن، تاكو بوونە سەد (١٠٠) حوشتر، ئنجا دوایی سەد حوشترەكە سەربڕان وەك فیدیەو قەرەبوو بۆ عەبدوڵڵا}[3]، ئنجا عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس دەڵێ: پەرستراوەكانیان خوددامیان هەبوون، كە كوشتنی ڕۆڵەكانیان

---

١) جامع البيان للطبري، برقم: (١٠٨٢٦)، والتفسير الكبير للطبراني، ج٣، ص٨٩، ٩٠.

٢) ئەوەی لە نێوان كەوانەكان زیادكردنی خۆمە.

٣) السيرة النبويَّة، لابن هشام، ج ١، ص : ٨٠ ـ ٨٢، ط دار ابن الهيثم.

بۆ هاوبەشدارەکان دەڕازاندەوە، ئەو لێرەدا گوتوویەتی: (خُدّام) کە کۆی (خادم)ە، پێشیان دەگوترێ: (سدنة)، کە کۆی (سادن)ە، واتە: بتەوان، خزمەتی بتەکەیان دەکرد، سبحان اللە ئێستاش لەسەر هەندێ مەزارگەی هەندێك تاقمو کۆمەڵی مسوڵمانان، ئەو جۆرە کەسانە هەنو هەر پێیاندەگوترێ: (سادن) واتە: کەسێك کە خزمەتی ئەو قەبرە دەکاو، پارەیەك کە لەسەر قەبرەکە دادەندرێ، کۆی دەکاتەوە پێی دەگوترێ: (سادن)، کە لە سەردەمی نەفامییشدا پێیانگوتراوە: (سادن)، واتە: خزمەتکاری قەبر، یان خزمەتکاری بت، (خادم)یشی پێ گوتراوە، کە کۆیەکەی (خُدّام)ە، جا دەڵێ: ئەو بتانە (خدام)یان هەبوون، خزمەتی بتەکانیان دەکرد، وەك پێشتر گوتم: بەرگیان لەبەردەکردنو دەیانشۆردنو بۆنخۆششیان دەکردنو زێڕو خشڵیان پێوە دەخستنو ... هتد، ئنجا ئەوانەی کە بۆ هاوبەشدانەرەکان، کوشتنی منداڵەکانیان جوان دەکرد، ئەو بتەوانانە بوون، ئەوان بۆیان جوان دەکردن.

ئنجا خوا کە دەفەرموێ: ﴿لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ بۆ زۆرێك لە هاوبەشدانەرەکان لەبەرئەوەی هەموویان وانەبوون، خۆ ئەگەر هەموو وابوونایە، هەموویان کوڕو کچی خۆیانیان کوشتبان، بنەبڕ دەبوون، بەڵام نە هەموویان کچی خۆیانیان کوشتوەو، نە هەمووشیان کوڕی خۆیانیان کوشتوە، بەس هەندێکیان وابوون، بەڵکو هەیانبووە کە زۆر عاقڵو بلیمەت بووەو، ئەگەر کەسێکی بینیبایە، ویستبای کچی خۆی بکوژێ، یان کوڕی خۆی بکوژێ، گوتوویەتی: بیدە من بەخێوی دەکەمو گەورەی دەکەم، کە پێگەیشت یان بە ڕێی دەکەم، یان دەتدەمەوە، هەیانبووە چەندان کەسی ئاوای زیندوو کردۆتەوە، ئەو کەسانە ناویشیان هەبووەو کەسانی خێرخواز بوون، کەواتە: خەڵکی حەکیمو زاناشیان تێدا بووە.

کە دەفەرموێ: ﴿قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾، وشەی (أولاد) کۆی (وَلَد)ە واتە: منداڵ، دەگونجێ کوڕ (إبن) بێو، دەگونجێ کچ (بنت) بێ، جا ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (الإسراء)ە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ

كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ ﴾الإسراء، واتە: وە منداڵەکانتان لە ترسی تەنگدەستیی مەکوژن، چونکە ئێمە ڕزقی ئەوانیش‌و ئێوەش دەدەین، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: کچەکانیان لەبەرئەوە دەکوشت کە سووکایەتیی‌و عەیبەیان نەیەتە سەر، وە کوڕەکانیشیان لەبەر هەژاریی‌و نەداریی کوشتوە، وەك گوتم: دیارە هەندێ لە تیرەو هۆزەکان وابوون، یان هەندێك لە بنەماڵەکان وابوون، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾ وە ئەگەر خوا ویستبای وایانەدەکرد، لێیانگەڕێ‌و ئەوەی کە هەڵیدەبەستن (با هەڵیبەستن).

ئاشکرایە کە دەفەرموێ : لێیانگەڕێ ئەوەی کە هەڵیدەبەستن، مەبەست ئەوە نیە کە بانگیان مەکەو هەقیان بۆ ڕوون مەکەوە، واتە: مەکەوە ژێر کاریگەرییان، دیارە ئەو کلتوورە سەقەتە فشارو کاریگەریی زۆر بووە لەسەر عەقڵ‌و دڵی خەڵك‌و کۆمەڵگا بەگشتیی، ئنجا هەرچەندە ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام مەبەست پێی مسوڵمانانە، واتە: مەکەونە ژێر کاریگەرییان‌و، لە دڵی خۆتان دا بڵێن: ئەوانە مادام ئەو کارە دەکەن، تۆ بڵێی ئەسڵێکی نەبێ‌و شتێکی باش نەبێ ؟ دڵنیا بن ! ئەو بیرۆکە ئەفسانەییانە هیچ نین‌و، مەکەونە ژێر کاریگەرییان، واتە: وازیان لێ بێنن‌و بەهەندیان مەگرن، نەك مەبەست ئەوەبێ: وازیان لێ بێنە ! بەو واتایە کە بۆیان ڕوون مەکەوەو، بانگیان مەکەن بۆ هەق ! چونکە قورئان هەمووی بانگکردنی مرۆڤە بۆ هەق، کەواتە: دەبێ وشەکانی قورئان وەك خۆیان لێیان تێبگەین.

<u>**مەسەلەی سێیەم:**</u> دوایی خوای پەروەردگار باسی کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی ئەفسانەیی دیکەی بتپەرستەکان دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ هَـٰذِهِۦٓ أَنْعَـٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَـٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَـٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا

وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾، لێرەدا دەبێ چەند وشەو ڕستەیەك مانا بکەین:

١) (حِجْرٌ) یانی: (ممنوع): قەدەغە، ئەمیش لەوەوە هاتوە کە ئەگەر کەسێك ویستبێتی پاوانێك، شتێك دیاریی بکات، پاردەی بۆ کردووەو بەردی لە دەورە داناون، ئەوەش پێی دەگوترێ (حِجْر).

٢) (حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا)، پشتیان قەدەغەکراوە، یانی: پشتیان قەدەغەکردوون لەوەی کە سواریان بن، یان باریان لێ بنێن، چەند جۆرە حوشترێك هەبوون، گوتوویانە: نابێ باریان لێ بنێین، نابێ کەس سواریان بێ، قەدەغەیەو خوا پێی ناخۆشە، بە ناوی خواوە وایان گوتوە.

٣) (لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا) چۆن ناوی خوایان لەسەر نەهێناون؟ گوتوویانە: ئەو جۆرە ئاژەڵە بەس دەبێ ناوی فلان بتەی لەسەر بێ و نابێ ناوی خوای لەسەر بێ، چونکە تایبەتمان کردوە بەو پەرستراوانەی خۆمانەوە.

٤) ﴿مَا فِى بُطُونِ هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا﴾ ئەوەی کە لە سکی ئەو جۆرە ئاژەڵانەدایە، (ئنجا ئەگەر شیر بووبێ، ئەگەر بەچکە بووبێ، بەڵام زیاتر واپێدەچێ کە بەچکە بووبێ)، ئەوە نابێ ئافرەتانمان لێی بخۆن و، دەبێ بەس نێرینەکانمان لێی بخۆن.

دیارە مەبەست لە ﴿هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ﴾ لە ڕستەی: ﴿مَا فِى بُطُونِ هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ﴾دا، چەند جۆرە ئاژەڵێکی دیارییکراوو زانراو بوون لە باو (عرف)ی ئەو ساکەی هاوبەشدانەرەکان داو، وشەی (هذه) کە ناوی ئاماژە (إسم الإشارة)یە بۆ شتی نزیك و زانراو، بەڵگەی ئەوەیە کە گوتمان.

٥) ﴿وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ﴾، وە ئەگەر مردار بووبێ لە سکی ئەو ئاژەڵەدا کە سەریان بڕیوە، یان بە مرداریی لەدایك بووبێ، گرنگ ئەوەیە

کە لێیان جیاکردۆتەوە، مردار بووبێ، ئەوە تێیدا هاوبەش بوون، کە ئەوانە هەموویان بیرۆکەی ئەفسانەیی بوون، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ إِنَّهُ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾، بە تەئکید خوا سزایان دەداتو، لەسەر ئەوەی کە هەڵیدەبەستن، بێئەوەی کە پشت ئەستووربێ بە وەحیو، بەڵگەیەکی لە وەحی، یاخود بەڵگەیەکی عەقڵیی لەسەر بێ.

ئەمە وەك ئایەتی ژمارە (١١٦)ی سوورەتی (النحل) وایە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَذَا حَلَالٌ وَهَذَا حَرَامٌ لِتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾﴾، واتە: وە هەر بەوەی کە زمانتان بە درۆ وەسفی دەکات، مەڵێن ئەوە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە، تاکو سەرەنجام بە ناوی خواوە درۆ هەڵبەستن، بێگومان ئەوانەی بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن.

هەروەها وەك ئەوە وایە کە لە ئایەتی ژمارە (١٠٣)ی سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِنْ بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾﴾، عەرەبەکان چوار جۆرە ئاژەڵیان هەبوون:

١/ (بحيرة): حوشترێك بووە گوێیان شەق کردوە.

٢/ (سائبة): جۆرە حوشترێك بووە گوتوویانە: دەبێ بە کەیفی خۆی بگەڕێو نابێ کەس بیگێڕێتەوە.

٣/ (وصيلة): ئەویش جۆرە ئاژەڵێکی مێینە بووە، حوشتر یان مەڕ یان بزن یان مانگا بووە، ئەگەر چەند سکی کردبان لە دوای یەك، دەیانگوت نابێ نە سەرببڕدرێ، وە نە تووك یان خوریی یان مووی لێبکرێتەوە، وە نابێ بدۆشرێ.

٤/ (حام): بە جۆرە حوشترێکیان گوتوە، کە چەند جارێك لە مێیەی حوشتر پەڕی بێو بەچکەی بووبێ، دەیانگوت (حَمى ظَهْرَهُ) پشتی خۆی پاراستوە.

یانی: هەر لەخۆوە، ئەو چوار ناوەیان لەو چوار جۆرە ئاژەڵانە نابوون، نە سەریان دەبڕین، نە باریان لێ دەنان، نە سواریان دەبوون، نە هیچ سوودێکیان لێ دەبینین.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾﴾، بەڵام ئەوانەی کە بێبڕوان، درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، وە زۆربەشیان نافامن.

## ئەم ئایەتانە سێ مەسەلەیان لێ وەردەگیرێن :

١ - (القرطبي) دەڵێ: (وَفِي الآيَةِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ العَالِمَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَتَعَلَّم قَوْلَ مَنْ خَالَفَهُ وَإِنْ لَمْ يَأْخُذ بِهِ، حَتَّى يَعْرِفَ فَسادَ قَوْلِهِ، وَيَعْلَم كَيْفَ يَردّ عَلَيْهِ؛ لأَنَّ اللهَ تَعَالَى أَعْلَمَ النَّبِيّ ﷺ وَأَصْحَابَهُ قَوْلَ مَنْ خَالَفَهُم مِنْ أَهْلِ زَمَانِهِم، لِيَعْرِفُوا فَسادَ قَوْلِهِم)[1]، واتە: ئەم ئایەتە ئەو بەڵگەیەی تێدایە، کە زانا دەبێ قسەو بیروڕای کەسێك کە پێچەوانەشیەتی، با بیروڕاکەشی پێ هەڵە بێ و لێشی وەرنەگرێ، دەبێ هەوڵبدات چاکی بزانێ، {ئەگەر لیبرالیی یە، ئەگەر عەلمانییە، ئەگەر مارکسییە، ئەگەر بتپەرستە، ئەگەر هەرچی پەرستە، دەبێ تۆ باش باش لێی تێبگەیو، بیرۆکەکەیو قسەکەی بزانی، بۆچی؟}[2] بۆئەوەی بزانی کە کوێی هەڵەیە، وە پاشان بزانی چۆنی بەرپەرچ دەدەیەوە، {چۆن دەزانین کە ئەم ئایەتە ئەوەی تێدایە}؟ ئەوەتا خوای بەرز، پێغەمبەری ﷺ خۆیو هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کردۆتەوە لە قسەی خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان (لە کافرەکان)، تاکو پووچەڵیی قسەو بیروڕایەکەیان بزانن.

یانی : بیروڕایەکانیان چۆن بوون، بەبێ دەستکاریی، خوای پەروەردگار ئاوا باسی کردوون، وە قسەکانیانی وەك خۆیان گێڕاونەوە، چونکە تۆ ئەگەر ناهەق نەزانی، ناتوانی بەرپەرچی بدەیەوە.

---

١) الجامع لأحكام القرآن: ج٧، ص٧٨.

٢) ئەوەی لە نێوان کەوانەکان دایە زیادکردنی خۆمە، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.

٢ - پێشـــەوا (مالـــك)یـــش گـوتوویەتـــی: (إسْـتَدَلّ مَالِـك بقَـوْله ﴿ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ﴾، عَلَـى أَنَّـهُ لا يَجُـوزُ الوَقْـفُ عَلَـى أَوْلادِه الذكور دون البنات، وأن ذلك الوقف يفسخ، ولو بعد موت الواقف، لأن: ذلك من فعل الجاهلية)[١]، پێشـەوا ماليك ئـەم ئايەتـەی ﴿ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ﴾، كردۆتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوە كـە دروسـت نيـە، كەسێك شتێك وەقف بكات، تـەنيا بـۆ منداڵـە نێرينەكـانی، جيـا لـە كچەكـانی، {واتە تەنيـا بۆ كوڕەكـانیو كچەكانی لـێ بێـبەش بكات، هەروەهـا لـە مـيراتدا، ئـەوە چاكتـر دروسـت نيـە، چونكـە مـيـرات خـوا ديـاريـی كـردوە}[٢]، وە ئـەو وەقفـە، ئەگـەر دوای مردنـی وەقفكەرەكـەش بـێ، دەبـێ هەڵبوەشـێنرێتـەوە، چونكە ئەوە كردەوەی سـەردەمی نەفامييە، كە بەشيان بۆ پياوانيـان دادەناو بـۆ ئافرەتانيان دانـەدەنا.

٣ – عەبدوڵڵای كوڕی عـەبباس خـوا لـێيان ڕازی بـێ، كـە پێشـتريش قسەكـەيمان هێنـا لەبـارەی ئەم ئايەتانـەوە، ئەم دەقـەی لێوە نەقڵ كـراوە: {عَـنْ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمَـا، قَـالَ: إِذَا سَـرَّكَ أَنْ تَعْلَـمَ جَهْـلَ الْعَـرَبِ فَاقْـرَأْ مَـا فَـوْقَ الـثَّلاثِينَ وَمِائَــةٍ فِــي سُــورَةِ الأَنْعَــامِ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ إِلَــى قَوْلِــهِ: ﴿ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴾}[٣] واتـــە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عـەبباس خـوا لـێيان ڕازی بـێ، دەڵـێ: ئەگـەر پێـت خۆشـە نەزانيـی عەرەبـەكان بزانـی، ئايـەتی (١٣٠) بـە پشـتەوە لـە سووڕەتی (الأنعـام) دا بخوێنــــەوە: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ تـــاكو

---

١) محاسن التـأويل، ج٤، ص ٧٣٨.

٢) ئـەوەی لە نێوان كەوانـەكان دايە زيـادكردنـی خۆمـە، بۆ ڕوونكـردنەوەی مەبەست.

٣) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٣٣٤).

﴿قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ﴾، بەڵێ بەم ئایەتانە بۆمان دەردەکەوێ کە عەرەبی بەر لە هاتنی ئیسلام لە چ نەفامییەکی قووڵ دابوون؟ چۆن لە نەزانیی و نەفامیی‌و لە بێئاگاییدا نغرۆ بوون، بەڵام بەهۆی ئیمان‌و ئیسلام‌و قورئانەوە، چۆن دوایی گەیشتنە لووتکەی زانست‌و عەقڵ‌و حیکمەت‌و دانایی‌و هەموو ڕەوشتێکی بەرزو جوان.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِۚ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٤٠﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە زیانبار بوون، ئەوانەی کە منداڵەکانی خۆیان، ڕۆڵەکانی خۆیانیان بە نەفامیی‌و بەبێ زانیاریی کوشتن، وە ئەو ڕۆزییەی کە خوا پێی دابوون، قەدەغەیان کرد، بە درۆ هەڵبەستنەوە بە ناوی خواوە، بێگومان گومڕا بوون، وە لە ڕێی ڕاستگرتووان نەبوون.

وشەی: (ضلال)، بریتییە لە ون بوون، یاخود ڕێ لێ ونبوون، ئێمە لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێین: سەرگەردانیی، یاخود گومڕایی[1].

کە دەفەرموێ: ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ﴾، (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆی دا دەڵێ: (تَحقِيق الفِعْل بـ (قَدْ) لِلتَّنْبيه عَلَى أَنَّ خُسْرَانهم أَمْرٌ ثَابِتٌ، فَيُفِيد التَّحْقِيق التَّعجيب مِنْهُمْ كَيْفَ عَموُا عَمَّا هُمْ فِيهِ مِنْ خُسْرَانهم ؟)[2]، واتە: کە وشەی (قد) چۆتە سەر کردەوەکە، کە لە زمانی عەرەبییدا مانای دڵنیاکردنەوە دەگەیەنێ، بۆ ئاگادار کردنەوەیە لەسەر ئەوە کە زیانباریی کافرو هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، بەهۆی ئەو ڕەفتارانەیانەوە شتێکی چەسپاوە، وە ئەو دڵنیاکردنەوەیە سەرسوڕمان لە کردەوەیان دەگەیەنێ، کە چۆن ئەو زیانبارییەی خۆیان نەبینیوە، کە تێیدان ؟

١) مختار الصحاح، ص ٣٣٩.

٢) التحرير والتنوير: ج٤، ص ١١٣.

وەك دەبینیــن خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهَۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، (سَفَهًا) بـە نەفامیــی، (بِغَيْرِ عِلْمٍ) بـەبێ زانیـاریی، واتـە: ئەوانـە هەم عـەقڵ سووکـیی‌و، هەم نەبوونـی زانیـارییـان لـە خۆیانـدا کۆکردۆتـەوە، جاری وایـە ئینسان زانیـاریی دەربـارەی شـتێك نیــە، بـەڵام عەقـڵ‌و تێگـەیشـتنێکی باشـی هەیە، وە جاری وایە کـەسێك عـەقڵ‌و تێگـەیشـتنەکـەی بـاش نیـە، بـەڵام لـە شـتێکدا زانیاریی هەیە، بەڵام ئەو هاوبەش بۆ خـوادانـەرانـە، هـەم کێشـەی عەقڵیان هـەبووە، عـەقڵیان سـووك‌و کـرچ‌و کـاڵ بـووە لـەوبــارەوە، وە هـەم زانیارییـان نەبـووە، دیارە زانیاریی لەبارەی حـەڕام‌و حـەڵاڵـەوە، تەنیـا لـە وەحـی وەردەگیـرێ، بۆیـە لێـرەدا مەبەست لـە زانیـاریی، وەحییـە، واتە: نە خـۆیـان عەقـڵێکی باشیان هـەبووە، وە نـە زانیارییشــیان بــە وەحــی خــوای پەروەردگــار هــەبووە، تـاکو تووشــی ئــەو جــۆرە بەهەڵەداچوونــە نەبــن، ﴿ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴾، دیـارە هـەر کــەسێك کــە گومڕابــێ، ڕێـی ڕاسـتی نەگرتــوە، بـەڵام ئـەوە شـێوازێکـە لـە زمـانی عەرەبییدا، بۆ جەختکـردنەوە لەسـەر شـتێك.

بۆ وێنە: خـوا لـە شـوێنی دیکـەدا دەفـەرموێ: ﴿ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ ﴾طـە، واتە: فیرعەون گەلەکەی خۆی گومڕا کردو، ڕێـی ڕاسـتی پێشـان نـەدان، یان لـە شـوێنی دیکـەدا دەفـەرموێ: ﴿ ...قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتـە: ئەگەر وا بکەم کـەواتـە من گومـڕا بووم‌و، لە ڕێ ڕاستگرتووان نیـم.

(الأعشی) شاعیرێکە لە شیعرێکدا دەڵێ: (إِمَّا تَرَيْنَا حُفَاةً لا نِعَالَ لَنَا) ئەگەر ئێمە ببینـی پێخواسـین، پێڵاومان نین، دیارە ئەگـەر کـەسـێك پێخـواس بـێ، بـە تەئکید پێڵاوی نیە، ئەمە شـێوازێکە لە زمانی عەرەبییدا، بۆ تەئکیدکردنەوە بەکـاردێ.

<u>مەسـەلــەی پێنـجــەم</u>: کــە دەفــەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّـٰتٍ مَّعْرُوشَـٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَـٰتٍ ﴾، ﴿ جَنَّـٰتٍ ﴾، کۆی (جنة)یـە، (جنـة) واتـە: بێسـتان‌و بـاغ،

ئێمە لە کوردەواریی دا دەڵێین: باغو بێستان، مەبەستمان پێی ئەوەیە کە درەختی میوەی تێدابێ، پاشان دەگونجێ کشتوکاڵیشی تێدا کرابێ، سەوزەی تێدا کرابێ، دانەوێڵەی لێ بێ، هەمووی دەگرێتەوە.

﴿مَّعۡرُوشَٰتٖ﴾، واتە: درەختی مێوی کەپربۆکراو، یاخود یانی: وەك چۆن عەرِشو کورسی لەسەر زەوی دادەنرێ، ئەویش ئاوا ڕاخراوە، کە لێرەدا مەبەست پێی میوەیە کە ڕادەخرێ لەسەر زەوی، یاخود: سەوزەو کاڵەكو شووتی ... هتد.

﴿وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ﴾، واتە: ئەو درەختانەی، یاخود ئەو میوەجاتەی کە درەختەکانیان بەرز هەڵدەچنو پێویستییان بە کەپر نیە، وەك دارخورماو خۆخو هەنجیرو هەنارو هەرمێو... هتد.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ﴾، پێشتریش باسمان کرد، واتە: دارخورما، وە کشتوکاڵ کە بەروبوومەکەی جۆراو جۆرو جیاوازە لە ڕەنگو تامو بۆنو قەبارەیان دا، ﴿وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖ﴾، وە زەیتوونو هەنار، وێکیش دەچنو وێکیش ناچن، دەگونجێ وێکچوونیان لەڕووی ڕواڵەتو ڕەنگو قەبارەوە بێ، بەڵام لە تامو چێژدا، وێکناچن.

کە دەفەرموێ: ﴿كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ﴾، هەر کاتێك میوەجاتەکە بەری گرتو پێگەیشت، لێی بخۆن، وە دەگونجێ مەبەست لە (ثمر) بەروبوومی کشتوکاڵیش بێ، وەك دانەوێڵەو سەوزەو کاڵەكو شووتیو خەیارو... هتد، هەر کاتێك پێگەیشت، بۆتان هەیە لێی بخۆن، ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦ﴾، بەڵام ڕۆژی هەڵگرتنەوەی، یاخود ڕۆژی ڕنینەوەی، یان دروێنەکردنی، مافی خۆی لێبدەن، واتە: لەو ڕۆژەوە کە پێدەگات بۆت هەیە لێی بخۆی، بەڵام کەی دەبێ مافی هەژارو نەدارانی لێبدەی؟ ئەو ڕۆژە کە هەڵیدەگریەوەو دەیچنیەوە.

ئەم ڕستە قورئانییە لە ئایەتێکی دیکەش دا، هەر لەم سوورەتەدا هاتوە، لە وێ خوا فەرمووی: ﴿ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓ...﴾ (٩٩)، واتە: سەرنجی میوەو بەرەکەی بدەن، کاتێ کە میوە دەردەکات، وە کاتێ کە پێدەگات.

بەلام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦ﴾، لەوێدا دەفەرموێ: سەرنجی بدەنێ، چونکە لەوێدا مەقام مەقامی ئەوەبوو کە خوا باسی نیشانەکانی پەروەردگارێتیی خۆی دەکرد، بەلام لێرەدا باسی نیعمەتەکانی خۆی دەکات، بۆیە لەوێ فەرمووی: سەرنجی درەختەکان بدەن کە میوە دەردەکاتو پێدەگات، لێرەش دەفەرموێ: لە میوەکەی بخۆن، چونکە لێرەدا باسی نیعمەتەکانە، پاشان وەك بەشێك لە سوپاسگوزاریی لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خوادا، فەرمان دەکات کە مافی خەڵکی لێ بدرێ.

وشەی (حَصَاد) هەم بە (حَصَاد) خوێنراوەتەوە، هەم بە (حِصَاد)، بە مانای چنینەوەو هەڵگرتنەوە، دێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾، پێشتریش گوتمان، ئەمە سێ واتایان دەگەیەنێ:

١/ زێدەڕۆیی مەکەن لە لێخواردنیدا، کە هێندەی لێ بخۆن، هیچ بەشی هەژارو نەدار نەمێنێتەوە.

٢/ لە پێدانی هەژاراندا هێندەی لێ مەدەن بە هەژارانو نەداران، کە هیچ بۆ ماڵو منداڵی خۆتان نەمێنێتەوە.

دەڵێن: یەکێك لە هاوەڵان کە خورمایەکەی پێگەیشتوە، گوتوویەتی: ئەمڕۆ لە بەیانیەوە تاکو ئێوارێ، هەر کەسێ بێ، با لەو خورمایەی من بخوات، ئنجا کە ئێوارە داهات، هیچی بۆ نەمابۆوە بیباتەوە بۆ ماڵو منداڵی، خوای پەروەردگاریش فەرمووی: زێدەڕۆی مەکەن، تەنانەت لە خێرو چاکەشدا، ئینسان دەبێ خەتی نێوەڕاستو میانگیریی ڕەچاو بکات، نەوەك بۆخۆی هیچی نەمێنێو، خۆیشی دواتر پێویستیی بە خەڵکی بێ، یان ماڵو منداڵی چاویان لە دەستی خەڵکی بێ.

بۆیە خوا لە سوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾ ﴾، ئەوانەی کە ماڵیان دەبەخشنو خەرج دەکەن، نە زێدەڕۆیی دەکەن، وە نە چرووکییش دەکەن، نە دەست بڵاون، نە چنگ قوچاون، بەڵکو خەتی نێوەڕاست دەگرن.

٣/ دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە بەگشتی لە هەموو کردەوەو ڕفتارەکانتاندا، زێدەڕۆیی مەکەنو، سنوورشکێنیی مەکەن.

## مشتومڕی زانایان لەبارەی نەسخ بوونەوە،
## یان نەسخ نەبوونەوەی ئەم ئایەتەوە :

لێرەدا توێژەرەوانی قورئان دەربارەی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦ ﴾، دوو بۆچوونیان هەن:

١) هەندێك دەڵێن: ئەم ئایەتە بەفەرزبوونی زەکات نەسخ بۆتەوە، واتە: لە بەروبوومی کشتوکاڵو دارو درەختو میوەجات، پێویست ناکات هەقی لێبدەی، مادام زەکات فەرز بووە، تەنیا زەکات واجبە.

یەکێ لەو زانایانە پێشەوا (طبري)یە کە بە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان دادەنرێ، گوتوویەتی: {وَأَوْلَى الأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ عِنْدِي بالصَّوَابِ، قَوْلُ مَنْ قَالَ: كَانَ ذَلِكَ فَرْضاً فَرَضَهُ اللّٰهُ عَلَى الـمُؤْمِنِينَ فِي طَعَامِهِم وَثِمَارِهِم الَّتِي تُخْرِجُهَا زُروعُهم وَغُرُوسهم، ثُمَّ نَسَخَهُ اللّٰهُ بالصَّدَقَةِ المَفْرُوضَةِ، وَالوَظِيفَةِ المَعْلُومَةِ مِنَ العُشْرِ وَنِصْفِ العُشْر}[1]، واتە: ڕاستترین قسە لەلای من، قسەی کەسێکە کە دەڵێ: ئەوە فەرزێك بووە خوا لەسەر ئیماندارانی داناوە، لە خواردنیانو لە میوەجاتیانو لە بەرهەمی کشتوکاڵو دارو درەختیان دا، دوایی

١) جامع البیان، ج٥، ص٦٢.

خوا بە زەکاتێك كە فەرزی كردووەو، ئەندازەی بۆ داناوە، كە بریتیە لە یەك لەسەر دەو، یەك لەسەر بیست، ئەوەی نەسخ كردۆتەوە، {یەك لەسەر دە، واتە: ئەگەر بەرهەمی كشتوكاڵ بە ئاوی باران، یان بە ئاوی ڕووبار ئاو بدرێ، ئەوە بەرهەمەكەی، یەك لەسەر دە (١/١٠)ی زەكات لێ دەكەوێ، بەڵام ئەگەر بە دەست ئاو بدرێ، ئنجا جۆگای بۆ هەڵبەستی، یان بە بیرو ناعوورو... هتد، ئەوە نیوەی دە یەك، كە دەكاتە بیست یەك (١/٢٠)}.

هەڵبەتە توێژەروان بوونەتە دوو ڕا، بەشێكیان دەڵێن: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە زەكات، هەندێكیشیان دەڵێن: نەسخ نەبۆتەوە:

(طبري) یەكێكە لەوانەی دەڵێن: نەسخ بۆتەوە، بەڵام (محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ: نەخێر نەسخ نەبۆتەوە.

منیش پێموایە لە قورئاندا نەسخ هەر نیە، وە هیچ ئایەتێك نەسخ نەبۆتەوە.

(محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەكەی خۆی دا لەوبارەوە دەڵێ: (وَعَلَى القَوْلِ المُخْتَار: فَهَذِهِ الآيَة غَيْر مَنْسُوخَة، وَلَكِنَّهَا مُخَصَّصَة وَمُبَيَّنَة بآيَاتٍ أُخْرَى وَبِمَا يبَيّنه النَّبِيُّ ﷺ فَلاَ يُتَعَلَّق بإِطْلاَقِهَا، وَعَنِ السُّدِّي: أَنَّهَا نُسِخَتْ بَآيَةِ الزَّكَاةِ يَعْنِي: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ ١٠٣﴾ التوبة، وَقَدْ كَانَ المُتَقَدِّمُونَ يُسَمُّونَ التّخْصِيص نَسْخًا)[1]، واتە: لەسەر قسەی هەڵبژێردراوو ڕای هەڵبژاردە: ئەم ئایەتە نەسخ نەبۆتەوە، بەڵكو تایبەت كراوە، وە ڕوونكراوەتەوە بە ئایەتەكانی دیكە، وە بەوەی كە پێغەمبەری خوا ڕوونی كردۆتەوە، كە باسی زەكاتی كردوە، بۆیە كە دەفەرموێ: ﴿وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦ﴾، ئەوە پەیوەست نیە بە مانای ڕەهای ئەم ئایەتەوە {واتە: تەنیا مەبەست پێی زەكاتە} وە (سُدِّي) گوتوویەتی: ئەم ئایەتە بە ئایەتی زەكات نەسخ بۆتەوە، واتە: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ...١٠٣﴾ التوبة، وە زانایانی پێشوو، هەندێك ئایەت كە مانای هەندێ

١) التحرير والتنوير ج ٨، ص١٢٢.

ئایەتیان تایبەت دەکرد، ناویان لێناوە نەسخ، {ئەوان وەك زاراوەیەك بەكاریان هێناوە، بەڵام زانایانی دوایی وایانزانیوە: هەر كە وشەی نەسخ بەكارهات مانای ئەوە دەگەیەنێ كە ئەو ئایەتە حوكمەكەی لاچووە، لە كاتێدا كە زانایانی پێشوو مەبەستیان ئەوە نەبووە، بەڵكو مەبەستیان ئەوەبووە كە ئایەتێك مانایەكی گشتی هەبووەو، ئایەتێكی دیكە هاتوە مانایەكەی تایبەت كردوە، یان مانایەكی ڕەهای هەبووە، ئایەتێكی دیكە ماناكەی بەنددار (مُقَیَّد) كردوە}[1].

ئنجا من دەڵێم: لە ڕاستییدا نەسخ كاتێك دەبێ، كە ئەو دوو ئایەتە تێكبگیرێن، ئنجا ئایا فەرزبوونی زەكات كە خوا دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ...﴿١٠٣﴾﴾ التوبة، واتە: صەدەقەیەك لە ماڵەكانیان وەربگرە، كە بەهۆی ئەو صەدەقەیەوە، پاكیان بكەیەوەو گەشەیان پێبدەی.

ئایا ئەو زەكاتە، لەگەڵ ئایەتەكەی سوورەتی (الأنعام) دا كە سوورەتێكی مەككەییە، كە دەفەرموێ: ﴿وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ لە بەروبوومی كشتوكاڵ‌و میوەجاتەكەتان هەقەكەی لێ بدەن، ئایا تێكدەگیرێن؟ دەڵێین: نەخێر، چونكە خوای پەروەردگار لە سەرەتادا بەگشتی فەرموویەتی‌و دیاریی نەكردوە لە چەندی چەند؟ هەر بەگشتی فەرموویەتی: لەو بەروبووم‌و كشتوكاڵەی كە دەیكەن، هەقی هەژارو نەداری لێبدەن، بەڵام دیاریی نەكردوە، پاشان ئایەتەكانی دیكە، كە لە مەدینە هاتوونە خوارێ، وە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ كە ڕوونكەرەوەی قورئانە، ئەندازەكەیان دیاریی كردوە، كە دەیەك (١/١٠)ی لێبدەن، ئەگەر بە ئاوی باران یان ڕووبار ئاو بدرێ، وە بیست یەك (١/٢٠)، ئەگەر بە ئاو بۆ هەڵبەستن‌و بە بیرو ناعوور ئاو بدرێ.

وە دەشگونجێ بڵێین: پێشێ خوا فەرموویەتی: هەقی لێبدەن! مەبەستی پێ سوننەت (ندب)و خۆبەخشیی (تطوع) بووە، یانی: ئەگەر نەشیانداباپە، گوناهبار نەدەبوون، بەڵام دوایی خوا فەرزی كردوە، كەواتە: كە دوایی خوا

---

١) ئەوەی لە نێوان كەوانەكان دایە زیادكردنی خۆمە.

فەڕزی کـردوە، مانـای ئـەوە نیـە کـە سـوننەت بوونـەکـە نەسخ بۆتـەوە، چونکـە فەڕز بریتیـە لـە بەخشـینێك کـە پێویستە ببیبەخشـی، بـەڵام سوننەت ئەوەیـە کـە فەڕز نـەبووە ببیبەخشی، بەڵام پەسـەند بووە ببیبەخشی، کـەواتە: کـە شـتێك فـەڕز دەکـرێ، حاڵـەتە پەسـەندییەکـەشـی هەر دەمێنـێ.

ئنجـا زانایـان ئـەم ئـایەتەیان کردۆتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوە کـە فـەرزە لـە دانەوێڵـەو میوەجـات، زەکـات بدرێ، بەبـێ ئـەوەی کـە سـاڵی بەسـەردا وەرسـووڕێ، کـە پێـی دەڵـێن: (حولان الحول) سـاڵ بەسـەردا وەرسـووڕان، وە سـاڵ بەسـەردا وەرسـووڕان، بۆ ماڵـی بـازرگانیـیو ئـاژەڵو ماڵی نەغدینـەیە، کە کاتی خـۆی زێـڕو زیـو بـووە، دینـارو درەمیـان پـێ گوتـوە، وەك ئێسـتا پـارەی نەقدینـە: دینـارو دۆلارو تمـەنو ڕیـاڵو ... هتـد، ئـەوە دەبـێ سـاڵی بەسـەردا وەرسـووڕێ، بـەڵام بەرهـەمی کشـتوکاڵو میوەجاتو سـەوزە، سـاڵ بەسـەردا وەرسـووڕانی نـاوێ، بـەڵکو دانەوێڵـەو کشـتوکاڵو میـوەجـات، لـە کـاتی هەڵگرتنـەوەی ئـەو حاسـەڵاتەکـەدا، هەقەکـەی دەدرێ، کـە مەگـەر چۆن دەنـا، ئەویـش سـاڵی هـەر یـەك جـار دەبـێ.

## زەکـات لـە چـیو چـی دەدرێو، چـەنـد دەدرێ ؟

ئنجـا ئایـا زەکـات لـە چـیو چـی دەدرێو، چـەند دەدرێ ؟ لێـرەدا زانایـان مشـتوومڕیـان هەیـە :

١/ ئـەبو حەنیفـە ڕای وایـە: هەرچـی زەوی سـەوزی دەکـات، وە دوایـی بەشـەر لێـی بەهرەمەنـد دەبـێ، پێویسـتە زەکـاتی لێبـدرێ، منـیش بۆخـۆم ئـەو ڕایـەم پـێ پەسـەندە.

٢/ هەندێکیش گوتوویـانە: نەخێـر، بەڵکـو تەنیـا زەکـات لـەو شـتانە دەدرێ، کـە وەك قـووتو بژیـو، ئینسـان پێیـان دەژیـەت.

(إبن العربي) لە (أحكام القرآن)دا زۆر بـە ڕێکیـی ڕای زانایـان لـەوبارەوە دێنـێ، دیارە لە شـەرحی ئەم ئایـەتەدا ﴿ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦ ... ﴾ گوتـوویەتی: (وَقَدْ أَفَادَتْ هَـذِهِ الآيَةُ وُجُوبَ الزَّكَاةِ فِيمَا سَمَّى اللَّهُ سُبْحَانَهُ، وَأَفَادَتْ بَيَانَ مَا

يَجِبُ فِيهِ مِنْ مُخْرَجَاتِ الأَرْضِ الَّتِي أَجْمَلَهَا فِي قَوْلِهِ: ﴿وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴿٢٦٧﴾﴾البقرة، وَفَسَّرَهَا هَاهُنَا، فَكَانَتْ آيَةُ الْبَقَرَةِ عَامَّةً فِي الْمُخْرَجِ كُلِّهِ مُجْمَلَةً فِي الْقَدْرِ، وَهَذِهِ الآيَةُ خَاصَّةٌ فِي مُخْرَجَاتِ الأَرْضِ مُجْمَلَةٌ فِي الْقَدْرِ، فَبَيَّنَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ الَّذِي أُمِرَ بِأَنْ يُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: "فِيمَا سَقَتْ السَّمَاءُ الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِنَضْحٍ أَوْ دَالِيَةٍ نِصْفُ الْعُشْرِ"، فَكَانَ هَذَا بَيَانًا لِمِقْدَارِ الْحَقِّ الْمُجْمَلِ فِي هَذِهِ الآيَةِ.

وَقَالَ أَيْضًا ﷺ: ﴿لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنْ حَبٍّ أَوْ تَمْرٍ صَدَقَةٌ﴾[1]، فَكَانَ هَذَا بَيَانًا لِلْمِقْدَارِ الَّذِي يُؤْخَذُ مِنْهُ الْحَقُّ، وَالَّذِي يُسَمَّى فِي أَلْسِنَةِ الْعُلَمَاءِ نِصَابًا.

وَقَدْ اخْتَلَفَ الْعُلَمَاءُ فِي ذَلِكَ اخْتِلافًا مُتَبَايِنًا قَدِيمًا وَحَدِيثًا، فَرُوِيَ عَنْ مَالِكٍ وَأَصْحَابِهِ: أَنَّ الزَّكَاةَ فِي كُلِّ مُقْتَاتٍ لا قَوْلَ لَهُ سِوَاهُ، وَقَدْ أَوْرَدْنَاهُ فِي كُتُبِ الْفِقْهِ وَشَرَحْنَاهُ، وَبِهِ قَالَ الشافِعِيُّ.

وَقَالَ أَبُو حَنِيفَةَ: تَجِبُ فِي كُلِّ مَا تُنْبِتُهُ الأَرْضُ مِنْ الْمَأْكُولاتِ مِنْ الْقُوتِ وَالْفَاكِهَةِ وَالْخُضَرِ، وَبِهِ قَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ الْمَاجِشُونِ فِي أُصُولِ الثِّمَارِ دُونَ الْبُقُولِ.

وَقَالَ أَحْمَدُ أَقْوَالاً: أَظْهَرُهَا أَنَّ الزَّكَاةَ تَجِبُ فِي كُلِّ مَا قَالَ أَبُو حَنِيفَةَ إِذَا كَانَ يُوسَقُ، فَأَوْجَبَهَا فِي اللَّوْزِ، لأَنَّهُ مَكِيلٌ دُونَ الْجَوْزِ لِأَنَّهُ مَعْدُودٌ، مُعَوِّلا عَلَى قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ﴿لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنْ تَمْرٍ أَوْ حَبٍّ صَدَقَةٌ﴾، فَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ مَحَلَّ الْوَاجِبِ هُوَ الْمُوسَقُ، وَبَيَّنَ الْقَدْرَ الَّذِي يَجِبُ إِخْرَاجُ الْحَقِّ مِنْهُ. وَأَمَّا أَبُو حَنِيفَةَ فَجَعَلَ الآيَةَ مِرْآتَهُ فَأَبْصَرَ الْحَقَّ)[2].

گومان لەوە نیە کە ئەمە ئینصافی زانایانی پێشینمان بۆ دەردەخات، دیارە

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٦٥٣٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩٧٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٤٨٣).

٢) أحكام القرآن ج٢، ص٢٨٢ و ٢٨٣.

ئیبنولعەرەبی یەکێکە لە زانایانی مالیکی مەزهەب، بەڵام لێرەدا قسەی (أبو حنیفة) هەڵدەبژێرێ، دیارە قسەی هەمووان دێنێو دەڵێ: (ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە زەکات فەرزە لە هەموو ئەو شتانەدا کە خوا ناوی هێناون، دیارە خوا باسی میوەجاتو باسی دانەوێڵەو کشتوکاڵی کردوە بەگشتی، وە ئەم ئایەتە ئەوەی گەیاندوە، کە ئەوەی زەکاتی تێدا پێویست دەبێ، ئەوەیە کە زەوی دەریدێنێ، خوا فەرموویەتی: ﴿وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴿٢٦٧﴾﴾ البقـرة، واتە: هەرچی لە زەوی بۆتان دەردێنین، زەکاتی لێبدەن، بەڵام لێرەدا ڕوونی کردۆتەوە ئەوەی کە زەوی دەریدێنێ چییە؟ دانەوێڵەیە میوەیە، وە کشتوکاڵە، لێرەدا ڕوونی کردۆتەوە، چونکە ئایەتەکەی (البقرة) بەگشتی باسی ئەوەی کردوە، کە هەرچی لە زەوی دێتە دەرێ، بەڵام ئەندازەکەی دەبێ چەند بێ ؟ بە کورتیی فەرموویەتی، بەڵام ئەم ئایەتە بەتایبەت باسی ئەوانەی کردوە، کە لە زەوی دێنە دەرێ، وە بە کورتیی باسی ئەندازەکەی کردوە.

پێغەمبەری خواش ﷺ کە فەرمانی پێکراوە: ئەوەی بۆ خەڵکی نێردراوەتە خوار بۆیان ڕوونبکاتەوە، ئەو ڕوونی کردۆتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿فِيمَا سَقَتْ السَّمَاءُ: الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِنَضْحٍ أَوْ دَالِيَةٍ: نِصْفُ الْعُشْرِ﴾، واتە: ئەوەی کە بە بارانێ ئاودەدرێ، یەك لەسەر دە (١/١٠)ی دەکرێتە زەکات، ئەوەشی کە بە هەڵهێنجانی ئاو یان بە ناعوور ئاودەدرێ، ئەوە نیوەی دەیەك، واتە: بیست یەك (١/٢٠)ی دەکرێتە زەکات، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە کە زەحمەتو ماندووبونی پێوە دەکێشرێ.

ئەوە ڕوونکردنەوەی ئەو ئەندازەیە بووە، کە لەوێ بە کورتیی باس کراوە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەوە کە لە چەندی زەکات دەدرێ؟ ئەوەشی ڕوونکردۆتەوەو فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنْ حَبٍّ أَوْ تَمْرٍ صَدَقَةٌ﴾[1] واتە: لە کەمتر لە پێنج ویسق لە دانەوێڵەو لە خورما، زەکات نادرێ، {ویسقێك شەست صاعە، کە لە کوردەواریی خۆماندا، ڕبەی پێدەگوترێ، چونکە صاعێك چوار مستە کە نزیکەی دەکاتە چوار کیلۆ شتێك زیاتر یان

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٦٥٣٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩٧٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٤٨٣).

كەمتر، بەو پێیە چوار جاران شەست، دەكاتە دوو سەدو چل مست، كە ڕەنگە هەر مستێك كیلۆیەك یان زیاتر بێ، كەواتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لەوەندە كەمتر بێ زەكاتی لێناكەوێ، چونكە ئەگەر لەوەندە كەمتر بێ، هەر بەشی خۆی دەكات ئەو ماڵە، یان ئەو كەسە}[1] ئەمەش ڕوونكردنەوەی ئەندازەكەی بووە كە ئەو هەقەی تێدا دەدرێ، كە لە زمانی زانایان دا پێی دەگوترێ: (نصاب)، واتە: ئەندازەی زەكات لێكەوتوو.

ئنجا لەوبارەوە زانایان زۆر كەوتوونە ڕاجیایی: هی پێشیو هی دوایش، لە مالیكو هاوەڵەكانییەوە گێڕدراوەتەوە: زەكات لە هەر شتێك دەدرێ، كە مرۆڤ هەڵیبگرێو پێی بژیەت، مالیك هەر ئەو ڕایەی هەیە، هەروەها شافیعییش هەمان ڕای هەیە.

بەڵام ئەبو حەنیفە گوتوویەتی: هەرچی زەوی سەوزی دەكات، لەو شتانەی كە دەخورێن، لە بژیوو لەوە كە هەڵبگیرێ لە میوەو سەوزە، هەمووی زەكاتی لێدەكەوێ.

ئەحمەدیش چەند قسەیەكی هەن لەوبارەوە : ئاشكراترین قسەی ئەوەیە كە زەكات لە هەموو ئەو شتانە دەكەوێ كە ئەبو حەنیفە گوتوویەتی، بە مەرجێك بپێورێ، بۆیە ئەحمەد زەكاتی لە بادەم (اللَّوْز)دا واجب كردوە، چونكە دەپێورێ، بەڵام لە گوێزدا، چونكە دەژمێردرێ، زەكاتی تێدا واجب نەكردوە.

دوایی (إبن العربي) دەڵێ: (وَأَمَّا أَبُو حَنِيفَةَ فَجَعَلَ الآيَةَ مِرْآتَهُ فَأَبْصَرَ الْحَقَّ) واتە: بەڵام ئەبو حەنیفە ئایەتەكەی كردۆتە ئاوێنەی خۆی، بۆیە هەقی بینیوە.

منیش دەڵێم: قسەكەی زۆر جوانەو ڕایەكەی ئەبو حەنیفە ڕاستە، چونكە ئێستا هەندێ جۆرە میوەو خواردن هەن، لە وڵاتانی دیكەدا، ڕەنگە نەژمێردرێو نەشپێورێ، بەڵام مرۆڤیش پێی دەژی، یان زۆر بەنرخە، بۆیە ناگونجێ زەكاتی لێ نەدرێ ! هۆكاری ئەوەش ئاشكرایە: زۆرینەی زانایان سەیری دەوروبەری خۆیان كردوەو، بەس باوو عادەتی خۆیان، یان ئەوەی لە دەوروبەریان بووە، هەر ئەوەیان بینیوە، بەڵام ئەبو حەنیفە چونكە دنیای زیاتر بینیوە، بۆخۆی

---

١) نێوان كەوانەكان زیادكردنی خۆمە.

فارس بووە بە ئەصڵ، واشپێدەچێ ئەزموونی زیاتر بووبێ، چونکە لە کووفە بووە، کووفەش ئەو کاتە شوێنێك بووە، خەڵکی جۆراو جۆری لێبووە، بۆیە لە زۆر شتدا ئەبو حەنیفە دیدی فراوانتر بووەو، ئاسۆی فیکری فراوانتر بووە، وە چەمك واتای ئایەتەکانی فراوانتر لێکداوەتەوە.

**مەسەلەی شەشەم**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗاۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿١٤٢﴾﴾ پێشتریش باسمان کرد کە لێرەدا خوا دەفەرموێ: وە لە ئاژەڵان (خوا) هی باربەرو هی ڕاخراوی بۆ دروستکردوون، دەجا لەوەی کە خوا پێیداون بخۆن، وە بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆتان.

## مانا و چەمکی (حمولة) و (فرش)

أ - (حَمُولَةٗ): (الحمولة: الإِبْلُ الَّتِي تَحْمِلُ، وَكَذَا كُلُّ مَا احْتُمِلَ عَلَيْهِ (حَمُولَة): ئەو حوشترەیە کە بارهەڵدەگرێ، بەڵام خاوەنی (مختار الصحاح) دەڵێ: (الحَمُولَةُ: الإِبْلُ الَّتِي تُحْمِلُ، وكذا كل ما احتمل عَلَيْهِ الحَيُّ مِنْ حِمَارٍ وَغَيْرِه، سَوَاءً كَانَت عَلَيْهِ الأحمَال أَوْ لَمْ تَكُن)[1]، واتە: (حمولة) هەم حوشتریش دەگرێتەوە، هەم هەر شتێك کە هەر ژیاندارێك باری بخاتە سەر، لە کەران و ئاژەڵانیی دیکەش، ئنجا باریان بەسەرەوە بێ، یان نا.

بە کورتیی واتە: بارهەڵگر، ئنجا لە هەندێ شوێنان بار لە (گا) دەنێن، لە هەندێ جێگا بار لە (مانگا) دەنێن، لە گوێدرێژ، لە ئێستر، لە مایەن، لە فیل، بۆیە هەموو ئەوانە، وشەی (حمولة) دەیانگرێتەوە.

ب - (وَفَرۡشٗا) وشەی (فرش): واتە: ڕاخراو، بۆیە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی ئاژەڵی وردە، لەبەرئەوەی کە لە دوورەوە تەماشای دەکەی، وەك

١) مختار الصحاح، ص ١٤٩.

فەرشێك ڕاخراوە، ئاژەڵی وردیش وەك: مەڕو بزن.

وە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە (فرش) دەگونجێ حوشتر بێ، ڕەشە وڵاخ بێ، مەڕو بزن بێ، هەرچییەك بێ، کە سەردەبڕدرێ، چونکە کە سەردەبڕدرێو دەکەوێتە سەرجێ، وەك ڕاخرابێ وایە.

هەندێکیان گوتوویانە: (فرش) مەبەست پێی ئەوەیە کە دروست دەکرێ، وەك ڕایەخ کە لە تووكو مووو خوریی، ئەو ئاژەڵانە دروست دەکرێ.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست لە (فرش) حوشتری بچووکەو (حمولة)ش حوشتری گەورەیە، لە هەندێ لە وڵاتان حوشتر هەیە بەقەدەر گوێدرێژێك دەبێ، جاری وایە لە مەڕو بزن گەورەترەو، لە گوێدرێژیش بچووکترە.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾، لەوەی کە خوا پێیداون، بخۆن، واتە: لە جیاتی ئەوەی لەخۆتانی قەدەغە بکەن، سوپاسگوزاریی خوا بکەنو لەو نیعمەتانە بخۆن، کە وەك ڕۆزیی پێیداون، ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾، وە بە دوای هەنگاوەکانی[1] شەیتان مەکەون، کە لەخۆتانەوە هەندێکیان لەخۆتان قەدەغە بکەنو، لەو نیعمەتانەی خوا، خۆتان بێبەش بکەن.

دیارە مەبەست لە بەدوای هەنگاوەکانی شەیتان نەکەوتن، نەکەوتنە ژێر کاریگەریی یەتیو هەڵنەخەڵەتانە بە خوتخوتەو دنەدانەکانی.

ئنجا ئایا لە چیدا بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان نەکەوین؟ خوا بە شێوەیەکی گشتی فەرموویەتی، بەڵام بە پێی سیاق دەڵێین: یانی: لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئاژەڵو دانەوێڵەو میوەو میوەجاتدا، بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، لەخۆوە خۆتان لەو نیعمەتانەی خوا بێبەش مەکەن، ئەگەرنا لە هیچ شتێکدا نابێ شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان بکەوین.

---

١) الخُطْوَةُ بالضمِّ: مابين القدمين، و جمع القلّة: خُطُوات و خُطْوات و خُطَوات، والكثير: خُطى، والخَطْوَةُ: المرة الواحدة والجمع: خُطوات و خِطاء. مختار الصحاح، ص ١٧١.

**مەسەلەی حەوتەم:** خوا دەفەرموێ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ دواتر دەفەرموێ: وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ..(١٤٤)﴾، لێرەدا خوا دەیەوێ پرسیارێکی بێ وەڵام ئاراستەی ئەو کافرو هاوبەش بۆ خوادانەرانە بکات، کە لەخۆوە شتیان قەدەغە دەکرد، لەسەر بناغەیەکی ئەفسانەیی، دەفەرموێ: خوا هەشت جووتی بۆ ئێوە خوڵقاندوون، لە مەڕ دووانو لە بزن دووان، وە لە حوشتر دووانو لە ڕەشەوڵاخ دووان، ئایا خوا کامەی قەدەغە کردوە، دوو نێرەکانی قەدەغە کردوون لە ئاژەڵی ورد، یانی: بەرانو نێریی، یان دوو مێیەکانی قەدەغە کردوون، یانی: مەڕو بزن، یاخود ئەوەی کە بەچکەدانی مێینەکان هەڵیگرتوە، واتە: ئایا خوا گەورەکانی قەدەغە کردوون، یاخود بێچووەکان؟ بەڵگەتان چییە؟ بۆیە دەفەرموێ: ﴿نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، بە زانیاریی هەواڵم پێبدەن، ئەگەر ڕاست دەکەن، واتە: هیچ زانیارییەکتان نیە، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ﴾، هەروەها لە وشتر دووانو لە ڕەشەوڵاخ دووان، دیسان خوا دەفەرموێ: ئایە خوا دوو نێرەکانی قەدەغە کردوون، یانی: (گا) و (جَمَل)، یاخود دوو مێیەکان، یانی: (ناقة) و (مانگا)، یان ئەو بەچکانەی کە لە بەچکەدانی مێینەکاندان ؟ بە تەئکید هیچیانی قەدەغە نەکردوە بەگشتی واتە: ئێوە لەخۆتانەوە ئەو قسانە دەکەن، بۆیە خوا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا﴾، یانی: ئەگەر زانیارییتان نیە، ئایا ئێوە شایەدن، کە خوا وەسیەتی لەم شێوەیەی بۆ کردوون، وەك یەکێك بە یەکێکی دیکە دەڵێ: تۆ وەکیلی خوای ؟ لەلای خوا هاتوویەوە، کە خوا ئەو شتانەی قەدەغە کردوون ؟ بۆیە لێرەدا خوا پرسیارێکی بێ وەڵامیان لێدەکاتو،

چاوەڕێـی وەڵامیـان لـێ ناكـات، چونكـە ئـەوە پێـی دەگـوترێ: پرسـیاری نكووڵـیی لێكەرانە، (الإستفهام الإنكاري) كـە پرسـیارێك نیـە چاوەڕێی وەڵام بی، وەك ئەوەی كە كەسێك ئاوێكی لە پێش بێو، تۆش بڵێی : ئایا ئەوە ئاو نیە ؟ خۆ تۆ مەبەستت ئەوە نیـە، كە بڵـێ: بـا، یـانی: تـۆ دەیـبینـی، بۆچی نكووڵـیی لـێدەكـەی؟ بۆیـە لـە كۆتـایی دا دەفــەرموێ: ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيۡرِ عِلۡمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، ئنجـا ئایـا كـێ ستەمكارترە لە كەسێك كە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، تاكو خەڵك بەبێ زانیـاریی گومـڕا بكات ؟ بێگومان خوا كەسانی ستەمكار ناخـەتـە سـەر ڕێـی ڕاسـت.

جـا (محمـد الطـاهر بـن عاشـور) دەڵـێ: (وَيُسْتَفَادُ مِنَ الآيـةِ أَنَّ مَنْ الظّلـم أَنّ يُقدِمَ أَحَـد عَلَـى الإِفْتَـاءِ فِـي الـدِّين، مَـا لَـم يَكُـن قَـد غَلَـب عَلَـى ظَنِّـه أَنَّـه يُفْتِـي بالصَّوَاب الّذِي يُرضي الله)[1]، واتـە: لـەم ئایەتـە وەردەگیـرێ، كـە ستەمە ئینسـان فـەتوا بـدات لـە دینـدا، بـێ ئـەوەی كـە دڵـی بـە لای ئـەوەدا شكابێتـەوە، كـە ئـەو فەتوایـەی دەیـدا، ڕاسـتەو، خـوای پەروەردیگاریش لـێی ڕازییـە.

واتە: ئینسان سـەری لە شـتێك دەرنەچێ، نابێ قسەی تێدا بكات، وە ئـەو ڕەفـتارە ستەمێـكی گـەورەیـە، چونكـە لێـرەدا خـوا ڕەخنـە لـە كافرەكـان دەگـرێ، كـە هـەر لەخۆیانەوە، هەندێ لە ئاژەڵەكانیان لەخۆیانیان قەدەغە دەكردنو ناوێكیـان لێـدەنان، خوای دادگەریش ئەوەی بە ستەم ناوبردوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ مسۆگەر خـوا كۆمـەڵی ستەمكاران ناخاتـە سـەر ڕێـی ڕاست، كەواتـە: هـیچ كـەسێك بەبێ زانیاریـیو، بەبێ دڵنیـایی، یـان بـەلای كـەمـەوە: بەبـێ گومانێـكی زاڵ، نابـێ قسـان لەسـەر شـتێك بكـات، دەبـێ دڵـت بـەلای شـتەكەدا چووبـێ، بەڵگەیەكـت بەدەستەوە هەبێ، ئەوجار بڵێی: ئەو شتە ئاوایە، ئەگەرنا لەسەری گونـاهبـار دەبـی.

هەڵبەتە ئەو گوتوویـەتی فەتـوا، بەڵام من دەڵێم: فەتـواو غەیری فەتـواش، چونكە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ

---

١) التحرير والتنوير ج٤، ص١٣٥.

﴿كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦﴾، واتە: بە دوای شتێك مەكەوە كە زانیارییت دەربارەی نیە، واتە: نەك هەر لە بواری فەتوادا، بەڵكو لە هەر بوارێكی دیكەش دا، ئینسان كە زانیاریی لەبارەی مەسەلەكەیەوە پێ نیە، پێویستە بڵێ: نایزانم.

هەڵبەتە زانایانی پێشینمان زۆر بە ئەدەبو گەڵێك خاكیی بوون: پرسیارێكیان لێ كرابێ نەیانزانی بێ، گوتوویانە: (اللّهُ أَعْلَم) خوا زاناترە، بۆیەش زانایانی پێشوو گوتوویانە: هەر كەسێ: (لا أَدْرِي) نازانم، نەزانی ئەوە كاری كراوە، واتە: هەر كەسێ هەر پرسیارێكیان لێ كردو، هەر شتێكی هاتە پێشێو هەر قسەی تێدا كرد، ئەوە بە تەئكید زۆرجار بە نەزانیی قسەی تێدا دەكاتو مانای وایە، بە پێچەوانەی فەرمایشتی خوای پەروەردگارەوە، دەجووڵێتەوە، كە خوا دەفەرموێ: هەر شتێك زانیارییتان لەبارەیەوە نیە، قسەی لێ مەكەنو بەدوای مەكەون.

دەگێڕنەوە ئیمام مالیك یەكێك چل (٤٠) پرسیاری لێدەكات، دەڵێ: ئەوە چل پرسیارە هی خەڵكی ئەندەلووس (ئیسپانیا)ن، هێناومن، تۆش ئیمامی خەڵكی مەدینەی، ئنجا دوای ئەوەی چل پرسیارەكەی ئاراستە دەكات، لە وەڵامی سیو شەشیاندا دەڵێ: (لا أَدْرِي)، نازانم، ئەویش دەڵێ: چۆن نازانی؟ من لە ئەندەلووسەوە هاتووم چەند مانگە ڕێ، بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە؟ (دیارە خەڵكی ئەندەلووسو ئەفریقیا، هەموویان لەسەر مەزهەبی ئیمام مالیك بوون، ئێستاشی لەگەڵ دابێ)، ئەویش دەڵێ: ئاخر نازانم، بەرانبەرەكەشی دەڵێ: چۆن نازانی، من ئەو خەڵكە ناردوومی ؟ دەڵێ: {لا أَدْرِي، وأَبلِغْ مَنْ وَرَاءَكَ بِأَنَّ مَالِكاً، قَالَ: لا أَدري}، واتە: نازانم، وە بەوانەی كە ناردووشیانی بڵێ: مالیك گوتوویەتی: نازانم !

ئا ئەوە ئینصافە، چونكە ئەوانە زانیویانە كە لە ڕاستییدا ئەو فەتوایە دینە، وە هەر قسەیەك كە ئینسان دەیكات، دەبێ پێشێ وەڵامەكەی بۆ قیامەتێ ئامەدە كردبێ، ئایا قەناعەتی پێیەتی، وە ئایا بە ڕاستی دەزانێو، بەڵگەی چییە ؟!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی : (١٤٥ تا ١٥٠)، دیارە تەوەری سەرەکیی ئەم شەش ئایەتە، ئەوەیە، کە خوا بە پێغەمبەری خۆی دەفەرموێ: کە بەگشتی بە هەموو خەڵك، بە کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیشەوە ــ کە لەسەر بناغەی ئەفسانەیی چەندان جۆرە ئاژەڵیان لەخۆیان قەدەغە دەکردن ـ ڕابگەیەنێ، لەو بەرنامەیەدا کە خوا بۆی ناردوە ـ کە قورئانە ــ بێجگە لە چوار جۆرە شت، لەو شتانەی کە ئەوان بە قەدەغەیان دادەنان، هیچ شتێکی دیکە قەدەغە نیە، ئەو چوارەش بریتین لە: (مردار، خوێنی ڕژاو، گۆشتی بەراز، سەربڕاو بۆ جگە لە خوا).

پاشان باسی ئەو شتانەش کراوە کە کاتی خۆی، خوا وەك سزادانێك لەسەر جوولەکانی قەدەغە کردبوون، کە ئەوانیش: ئاژەڵو پەلەوەری نینۆکدار کە نینۆکیان هەبێ، وە پاشان بەزو چەوریی ڕەشەوڵاخو مەڕو بزن، جگە لەوەی کە بە ئیسقانەوە دەنووسێ، یان بە ڕیخۆڵەکانەوە دەنووسێ، کە ناگونجێ لێی بکرێتەوە.

ئنجا خوای پەروەردگار باسی ئەوەی کردوە کە: هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بیانووی ئەوە دەگرن کە ئەو هاوبەش بۆ خوادانانو شت لە خۆ قەدەغە کردنەیان، بەهۆی ویستی خواوە بووە، کەواتە: دیارە خوا ئەو شتانەی پێ چاکن، بۆیە ویستوونی، وە ئەگەر خوا ویستبای نەیانکەین، نەمان دەکردن، خواش بەرپەرچیان دەداتەوەو ڕایدەگەیەنێ، کە ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان پێ نیەو خوای بێوێنە بەڵگەی تەواوی هەیە لەسەرتان، کە ناچاریی نەکردوون بۆ شیرك و شت لەخۆ قەدەغەکردنەکانتان.

﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ
مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ
ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى
ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا
عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ
بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل
رَّبُّكُمۡ ذُو رَحۡمَةٖ وَٰسِعَةٖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُهُۥ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٤٧﴾
سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن
شَيۡءٖۚ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ
عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلۡ
فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلۡ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ
يَشۡهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَاۖ فَإِن شَهِدُواْ فَلَا تَشۡهَدۡ مَعَهُمۡۚ وَلَا تَتَّبِعۡ
أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمۡ
يَعۡدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ﴾ .

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەكـان

((''ئەی پێغـەمبەر'' بڵـێ: لەو (بەرنامەیـ)ەدا كە بۆم نێـرراوە، هـیچ قەدەغـەكراوێك لەسەر هیچ بخۆرێـك كـە بیخـوا، شـك نابـەم، مەگـەر مـردار بـێ، یـان خـوێنی ڕژاو، یـان گۆشـتی بـەراز، كـە بێگومـان پیسـن، یـان فیسـقێك، نـاوی جگـە لـە خـوای لەسـەرهێنـرابێ، ئنجا هەر كەسێكیش ناچاركـرا، بۆ خـواردن لە یەكێك لەو چوارانە، بـە مەرجێـك بـە ئـارەزوو لێبـوونو بـە تێپەڕاندنـەوە نەبـێ، ئـەوە بێگومـان پەروەردگـارت لێبوردەی بە بەزەییـە ﴿١٤٥﴾ وە لەسەر ئەوانەی جوولەكەن: هـەموو خـاوەن نینۆكێكـمان قەدەغـە كردبوو، وە بەزی ڕەشـەوڵاخو مەڕو بزنیشمان لـێ قەدەغـە كردبـوون، مەگـەر ئەوەی كە بە پشـتیانەوە نووسـابێ، یـان بـە ڕیخۆڵەكـان، یـان لەگـەڵ ئێسـكدا ئاوێتـە بووبـێ، ئـەو جـۆرە سـزایەشـمان دان، بەهـۆی سنوورشـكێنییـانەوە، وە بێگومـان ئێمـە ڕاستین لەوەدا كە دەیڵێین ﴿١٤٦﴾ ئنجا ئەگـەر تۆیـان بـە ناڕاسـت دانـا، ئـەوە پێیـان بڵـێ: پەروەردگـارتان خـاوەن بەزەییـەكی فراوانـە، وە سـزای لـە كۆمەڵـی تاوانبـاران ناگێڕدرێتـەوە ﴿١٤٧﴾ ئەوانەی هاوبەشیان بـۆ خـوا دانـاوە، لەمـەودوا دەڵێن: ئەگـەر خـوا ویسـتبای : نـە خۆمـان نـە بـابو باپیـرانمان هاوبەشـمان بـۆ خـوا دانەدەنـاو، هـیچ شـتێكیشمان قەدەغـە نەدەكـرد، هـەر ئـاواش ئەوانـەی پـێش ئـەوانیش بـە درۆدانانیـان كـردبووە پیشـە، تاكو سـزای ئێمـەیان چێشـت، بڵـێ: ئایا بـۆ سەلـماندنی قسـەكەتان، هیچ زانیارییـەكتان لەلایـە، تاكو بۆمـانی بێننـە دەرێو پێشـانمانی بـدەن؟ بەڵـكو بـەس بەدوای گومان دەكـەونو، ئێوە هـەر درۆ دەكـەن ﴿١٤٨﴾ بڵـێ: هـەر خـوا بەڵگـەی تـەواوی هەیە، وە ئەگـەر ویستبای (ئازادو سەرپشـك نەبن، لە نێوان ئیمانو كوفردا)، هەمووتانی دەخسـتە سەر ڕاستە ڕێ ﴿١٤٩﴾ بڵـێ: ئەو شایەدانەتان بێنن كە شـایەدن، لەسـەر ئـەوە كـە خـوا ئەو شـتانەی قەدەغـەكـردوون، ئنجا ئەگـەر شـایەدییـاندا، تـۆ شـایەدییـان لەگـەڵ

مەدە، وە بەدوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، کە ئایەتەکانمان بە درۆ دادەنێن، وە بڕوایان بە دوارۆژ نیەو، دروستکراوەکان لەگەڵ پەروەردگاریاندا یەکسان دەکەن (١٥٠)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(لَّآ أَجِدُ): واتە: شك نابەم، نابینم، نادۆزمەوە، (وَجَدَ يَجِدُ مطلوبَه وَجْدَاً وَوَجَدَاً وَجِدَةً وَوُجُوداً وَوِجْدَاناً: أَدْرَكَهُ، وَوَجَدَ الشَّيءَ كَذَا... عَلِمَهُ)، (وَجَدَ) واتە: وایزانی، زانی کە وایە، یاخود ئەو شتەی کە بەدوایدا دەگەڕا، پەیدای کرد.

(مُحَرَّمًا ): (حَرَّمَ الشَّيءَ عَلَيْهِ: جَعَلَهُ حَرَاماً) (حَرَّمَ الشَّيءَ عَلَيْهِ) واتە: ئەو شتەی لێ قەدەغە کرد، حەرام لە زمانی عەرەبییدا یانی : (ممنوع) واتە: شتێك کە ڕێی لێ گیرابێ، (الممنُوع مِنْ فِعْله، أَوْ مِنْ أَكْلِه، أَوْ مِنْ قَولِهِ) شتێك کە ڕێی لێ گیرابێ بکرێ، یان بخورێ، یان بگوترێ، (المحرَّم: ذُو الحُرْمَة) شتێك کە قەدەغەبێ.

(طَاعِمٍ ): (اسْم فَاعِل من طَعِمَ)، (طاعِم) بە کوردیی یانی: بخۆر.

(مَيْتَةً ): وە بە (مَيِّتة)ش خوێنراوەتەوە، (المَيْتَة: الحَيْوَان الَّذِي مَاتَ حتف أنفه، أَو عَلَى هَيْئَة غَيْر مَشْرُوعة) ئاژەڵێك کە بۆخۆی مردار دەبێ، لە کوردەوارییدا دەڵێن: مردار بوو، بێ ئەوەی دەستی کەسی تێدا بێ، یاخود بە شێوەیەکی ناشەرعیی دەمرێ، وەك ئەوەی کە بە دار لێی بدرێ، یان هەڵبدێرێ ... هتد.

(دَمًا مَّسْفُوحًا ): واتە: خوێنی ڕژاو، جا دوایی باسی دەکەین بۆچی خوا لێرەدا وشەی ﴿دَمًا مَّسْفُوحًا﴾ خوێنی ڕژاوی بەکارهێناوە، لە چوار ئایەتدا هەر تەنیا (دم) هاتوە، تەنیا لێرەدا نەبێ کە دەفەرموێ: ﴿دَمًا مَّسْفُوحًا﴾،

خوێنــی ڕژاو، (سَـفَحَ الـدَّمُ)، واتــه: خوێنەکـه ڕژا، وە دەگـوترێ: (يَسـفَحُ سـفوحـاً وسَفَحَانـاً: انصبَّ فهـو مَسْفُوح) یـانی: ڕژاوە.

(رِجۡسٌ ): (القَذَر والشـيء القَذِر) یانـی: پیسیی، یـان شـتێك كـه پـیس بـێ، (الحـَرَامُ، اللَّعْـنَة، الفِعْـلُ القَبـيح، العَـذَاب، الكُـفْر) وشــەی (رجـس) ئەمانــه هــەموویان دەگرێتــەوە: قەدەغـه، نەفرین، كـردەوەی خــراپ، سـزا، كوفر.

(أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ): واتـه: نــاوی جگــه لــه خــوای لەســەر بەرزكرابێتــەوە، چـونكه عـەرەب عادەتیـان وابوو، كه مانگیــان دەبینــی، دەیانگوت: (هَـذَا هِـلاَل، هَـذَا هِـلاَل) ئەمه هیـلالـه، ئەمه هیـلالـه ! ئنجـا لـەوەوە هـەموو دەنـگ بەرزكردنەوەیـەكیان بـه (أَهَـلَّ بـهِ) یـانی: (رَفَـعَ صَـوْته بـهِ) دەنگــی پـێ بەرزكــردەوە، تەعبیــر كــردوە، وە لەكـاتی ســەربڕیینی قوربانیــش دا، ئـاژەڵـەكه دەنگی لەسـەر بەرزكراوەتـەوە، بـه ناوی جیـا لـه خـواو، نـاوی جگه لـه خـوای لەسەر هێنـراوە.

(بَاغٖ ): (بَغِيَ) واته: سنووری شكاند، یان تێپپـەڕانـد، یان ستەمی كرد، دەڵێ: (الـبَغِي: تَجَـاوُز الحـَدّ، بغـى يَبْغـي بَغِـياً، اعْـتَدَى) واتــه: ســـنووری شــكاندوە، كـه لێــرەدا مەبەست ئەوەیـه بە ئـارەزووەوە نەبــێ، لەو شــتانەی لێیـان دەخوات.

(شُحُومَهُمَآ ): واتـه: بـەز، چــەوریی، (شحِم).

(ٱلۡحَوَايَآ ): (جَمْـع حَوِيَّة، وَهِـي الأَمْعَـاء، والأَمْعَـاء جَمْـعُ الـمِعَى: الـمصير : والجمـع مُصران ومَصـارين)، (الحـَوَايا) كـۆی (حَوِيَّـة) واته: ڕیخـۆڵـه.

(بَأۡسُهُۥ ): (البــأس): (العَذَابُ والشِّدَّة) واتــه: ســزاو ســەغڵەتیــی.

(ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُ): (البُرهـان الكَـافِي، البَـلاَغ: الكِـفَايَة، بَلَـغَ الأمـر: وَصَـل إِلـى غَايَتـه) واته: بەڵگـەیەكی یەكلاییكـەرەوە، (بَلاغ) واته: شتێك كه بەس بـێ، كـه دەگوتـرێ: (بَلَـغَ الأمـر) واته: كـارەكه گـەیشـته مەبەسـتی خـۆی.

(هَلُمَّ ): (أحِضـرْ، هَـاتِ، أحْضِـروا، هـاتوا، (هَلَـمَّ) : دعـوةٌ لإحضـار أَمـرٍ)، (هَلُمَّ) واتـه: بێنـه، ئامـاده بكـه.

(يَعْدِلُونَ ): واتـه: يەكسـان دەكـەن، دەڵـێ: (عَدَلَ الشـيء بالشـيء: سَوَّاه بـهِ) واتـه: شـتێكى وەك شـتێك لێكـرد، يەكسـانى كـردن.

## مانـاى گـشـتـى ئـايـەتەكـــان

ئـەم ئايــەتانەش هـەر تـەواوكـەرى بابەتــى سـەرەكيــى ئايەتــەكانى ڕابـردوون، كـە بريــتى بــوو لــە: قەدەغـەكردنــى چـەند جۆرێــك لـە دانەوێڵــەو ميـوەجـاتو ئــاژەڵ، لەلايەن كافـرەكانەوە بە بـێ بەڵگەى وەحيـى.

ديـارە لەم شـەش ئايەتـەدا، خـواى كـاربەجـێ كۆتـا ئەنجـام لـەو بـوارەدا ڕادەگەيـەنێو ڕوونـى دەكاتەوە، كە خـواى زانـاو شـارەزا لەو شـتانەى كە هاوبەشـدانەركان لە خۆيانيـان قەدەغـەكردوون، تەنيـا چواريـان لە كتێبـى كۆتايـىو دوا پەيامى خـوادا، قەدەغـەن.

شـايانى باسيشـه كـه زانايان لەبارەى ئەم شــەش ئايەتـەوە، زۆر مشـتومڕيـان كـردوە، ئێمەش لە مەسەلە گرنگـەكاندا، بـە درێـژيى باسـى ئــەو مشــتومڕو ڕاجياييــەى زانايـان دەكەين، خـوا بە پێغـەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطۡعَمُهُۥٓ ﴾، يانـى: هەموو ئەو شـتانەى كـە ئێـوە لـە خۆتانتـان قەدەغـە كـردوونو ناوونـاتــۆرەى جيـا جيــاتان لێنــاون، ئەوانـە بەپێـى وەحييـەك كـە لەلايـەن خـواوە بۆم هاتـوە هيـچيـان قەدەغـە نيـن، بەڵكو ئێـوە لەســەر بناغـەيەكـى ئەفسـانەيى ئەو شتانە لەخۆتـان قەدەغـە دەكـەن، ﴿ قُل ﴾ بڵــێ: ﴿لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ ﴾، پێم شـك نايەو نابينـم لـەوەدا كـە بـۆم سـرووش كــراوە، لـەو پەيــامەدا كـە لـە خــواوە بـۆم هــاتوە، ﴿ مُحَرَّمًا ﴾، هـيـچ قەدەغـەكراوێـك نابيــنم، ﴿عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطۡعَمُهُۥٓ ﴾،

لەسەر هەر بخۆرێك كە بیخوا (طاعم) واتە: كەسێك كە شتێك دەخوات، جا پیاوبێ، یان ئافرەت بێ، گچكە بێ، یان گەورە بێ، بە پێچەوانەی ئەوانەوە كە دەیانگوت: ئەو شتە بۆ پیاوان دروستە، بەلاَم بۆ ئافرەتان دروست نیەو، نابێ بیخۆن، ﴿إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾، مەگەر ئەو شتە كە قەدەغە كراوە، یەكێك لەو چوارانە بێ: مردار بێ، یان خوێنێكی ڕژاو بێ، یان گۆشتی بەراز بێ، ﴿فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ﴾، كە بێگومان ئەوە پیسەو قێزەونە، زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەو (رجس)ە، بۆ هەرسێكیان دەچێتەوە، یانی: هەركام لە مردارو خوێنو گۆشتی بەراز (رجس)ن، كە بە مانای پیسو زیانبەخشو قێزەون، دێ، ﴿أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾، یاخود ئاژەڵێكی (فسق) بێ، واتە: (فسق)ی تێدا بەرجەستە بووبێ، ئەویش ئەوەیە كە بۆ جگە لە خوا سەربڕابێو، لە كاتی سەربڕیندا، ناوی جگە لە خوای لەسەر هێنرابێ، لەو وەحییەدا كە بۆم هاتوە : تەنیا ئەو چوارە قەدەغە كراون.

جا ئەوە دوایی باسی دەكەین، وە لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)شدا ئەو ڕایەم هەڵبژاردوە، كە جگە لەو چوارە دەگونجێ شتی دیكەش قەدەغەبن، چونكە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوون، وەك: هەموو خاوەن كەڵبەیەك لە دڕندان، وە هەموو خاوەن نینۆكێك لە پەلەوەران، وە كەری ماڵیی، بەلاَم وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین، دوای لێوردبوونەوەی زیاتر، گەیشتوومە ئەو قەناعەتە كە: جگە لەو چوارە، هیچی شتی دیكە قەدەغە نیە، مەگەر وشەی (خبائث) بیگرێتەوەو پیسو قێزەون بێ، یان چەمكو واتای وشەی (رجس) بیگرێتەوە پیسو زیانبەخش بێ[1]، ئەگەرنا خوای پەروەردگار هیچ شتێكی دیكەی قەدەغە نەكردوە، هەر لە كەرگەدەن، تاكو مارو مێروو، كە دوایی بە درێژیی باسی دەكەین.

---

١) هەڵبەتە هەركام لە : كەڵبدار لە دڕندانو، چڕنووكدار لە پەلەوەرانو كەری ماڵیی، پیسو زیانبەخشن.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ ﴾، هەر کەسێك تێگیراو ناچار کرا، بە مەرجێك بە ئارەزووەوە نەخوات، وە لەو ئەندازەیەی کە پێویستیشی پێیەو، پەکی لە سەری کەوتوە، تێنەپەڕێنێ، ﴿ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بێگومان پەروەردگارت لێبوردەی بە بەزەیی یەو، لەو چوارانەش بۆی هەیە بخوات، لەکاتی تێگیراویی‌و ناچارییدا، تێگیراوییەك بە شێوەیەك بێ، کە وا بزانێ ئەگەر نەخوات، دەمرێ، ئەوە بەنسبەت شەریعەتی ئیسلامەوە.

ئەدی بەنسبەت جوولەکەکانەوە؟ خوا دەفەرموێ ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ١٤٦ ﴾، وە لەسەر ئەوانەی گەڕاونەوە، ئایا جوولەکە بۆچی ناویان لێنراوە: (یهود)؟ لەبەرئەوەی وەك لە قورئاندا هاتوە، گوتوویانە: ﴿ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ ١٥٦ ﴾ الأعراف، (هُدْنَا) یانی: (رَجَعْنَا)، گەڕاینەوە، کاتی خۆی ئەوانە بۆ لای خوا گەڕاونەوە، ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ ﴾، وە لەسەر ئەوانەی کە گەڕابوونەوە بۆ لای خوا (لەسەر دەستی مووسا) هەموو خاوەن نینۆکێکمان قەدەغە کردبوو، (لە پەلەوەرو لە ئاژەڵ)، ﴿ ... وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ ... ﴾ وە لە ڕەشەوڵاخ و لە ئاژەڵی ورد، {چونکە وشەی (غَنَمْ) لە زمانی عەرەبییدا، هەم مەڕ دەگرێتەوەو هەم بزنیش، واتە: لە ئاژەڵی ورد، یان مەڕو بزن، یاخود حەیوانی سپی‌و ڕەش} بەزەکەیانمان قەدەغەکردبوو، واتە: چەوریی‌و بەزی ڕەشەوڵاخو، بەزی ئاژەڵی وردمان قەدەغە کردبوو، ﴿ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ ﴾، مەگەر ئەوەی کە بە پشتیانەوە نووسابوو، ئەو بەزو چەورییە کە لێ نابێتەوە، ﴿ أَوِ

﴿ ٱلْحَوَايَآ ﴾، یان ئەوەی لەگەڵ ڕیخۆڵەکان دا تێکەڵ بووە، ﴿ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ﴾ یان ئەو بەزەی لەگەڵ ئێسقانەکان دا تێکەڵ بووە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ئەوەی لە جوولەکەکان قەدەغە کرد بوو ؟ لەبەر پیسیی‌و، زیانبەخش بوونی ؟ نەخێر، ﴿ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾، ئەویش بەهۆی ستەمکاریی‌و لادانیانەوە، ئاوا سزامان دان‌و ئەوانەمان لێ قەدەغەکردن، وە بە دڵنیایی یەوە، ئێمە ڕاستگۆیین.

بۆیەش خوا وا دەفەرموێ: چونکە جوولەکەکان بە پێغەمبەریان دەگوت: ئێمە خوا سزای نەداوین، وە هیچ شتێکی لەبەر سزادان لێ قەدەغە نەکردووین، بەڵکو ئەوە کاتی خۆی یەعقووب لەسەر خۆی قەدەغەی کرد بوو، ئێمەش بە دوای بابو باپیرانمان کەوتووین! بەڵام خوا ڕوونی دەکاتەوە کە نەخێر، بەڵکو یەعقووب شتێکی دیکەی لەسەر خۆی قەدەغە کردوە، نەك ئەو شتانە، بەڵکو ئەو شتانە بەهۆی سەرکێشیی‌و ستەم‌و خراپەیانەوە، خوا سزای دران‌و، لێی قەدەغە کردوون.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، ئنجا ئەگەر بێبڕوابوون بەرانبەرت‌و تۆیان بە درۆ دانا، تۆیان بە ناڕاست داناو گوتیان: ڕاست ناکەی، {کە مەبەست پێی تەنیا هاوبەش بۆ خوادانەرەکانە، یان مەبەست جوولەکەکان‌و هاوبەش بۆ خوادانەرەکانیشە، ئەگەر وایانکرد} ﴿ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ ﴾، تۆ بڵێ: پەروەردگارتان خاوەن بەزەییەکی فراوانە، ﴿ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، وە تۆڵەو سزای خواش لە کۆمەڵی تاوانباران ناگێڕدرێتەوە، واتە: ئەگەر بگەڕێنەوە خوا ڕەحمەتێکی فراوان‌و فەڕاحی هەیە، بەشی هەمووتان دەکات، ئەگەر نەشگەڕێنەوە، دڵنیابن خوا سزاتان دەداو، کەسیش ناتوانێ سزای خوا بەرپەرچ بداتەوە.

ئنجا خوا دێتە سەر باسی قسەیەکی هاوبەش بۆ خوادانەرو کافرەکان، کە دەیانگوت: ئێمە کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێین‌و، ئەو شتانە قەدەغە دەکەین، مادام بە ویستو خواستی خوایە، دیارە خوا پێی چاکە ! ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ﴾، لەمەو دوا ئەوانەی هاوبەش بۆ خوادانەرن دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای، نە ئێمەو نە باب‌و باپیرانمان، هیچ هاوبەشێکمان بۆ خوا دانەدەنا، وە هیچ شتێکیشمان قەدەغە نەدەکرد، {ئەگەر خوا ویستبای، نە بتمان دەپەرست، نە هیچ شتێکیشمان قەدەغە دەکرد}، خواش بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأْسَنَا﴾، ئاوا هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەوانیش پێغەمبەرانی ئێمەیان بە درۆ دانا، تاکو سزای ئێمەیان چێشت، یانی: پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، لەوەدا کە پێغەمبەران دەیانگوت: نابێ بت پەرست بن، نابێ لەخۆتانەوە شت قەدەغە بکەن، ئەوانیش هەر ئاوا پێغەمبەرانیان بەڕاست دانەدەنا، دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ﴾، تۆش بڵێ: ئایا هیچ زانیارییەکتان لەوبارەوە هەیە، تاکو بۆمانی دەربێنن‌و پێشانمان بدەن؟ ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾، بێگومان ئێوە بەس بە دوای گومان دەکەون، وە تەنیا درۆ دەکەن، واتە: ڕاست ناکەن، کە خوا ئەو بت پەرستییەی ئێوەی پێ چاکە، هەر لەبەرئەوەی ویستوویەتی، وە ڕاست ناکەن، کە ئەو شت قەدەغەکردنەی ئێوەی پێ چاکە، هەر لەبەرئەوەی ویستوویەتی‌و بەپێی ویستی خوایە، چونکە ویستی خوا لەگەڵ ڕەزامەندیی خوا، لە یەك جیان، خوا هەموو شتێکی دەوێ، بەڵام هەموو شتێکی خۆشناوێ، وەك دوایی باسی دەکەین، بۆیە دەفەرموێ: ﴿قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ﴾، بڵێ: خوا بەڵگەی تەواوی هەیە لەسەر ئێوە، ئەگەر

ویستبای هەمووتانی ڕێنمایی دەکردو، هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام نەیویستوە زۆرییتان لێبکاتو ئازادی کردوون، بۆیە هەندێکتان بە ویستی ئازادانەی خۆتان، ڕێی ڕاستتان گرتۆتەبەر، هەندێکیشتان ڕێی چەوتتان گرتوە.

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ﴾، بڵێ: ئەو شایەدانەتان بێنن کە شایەدیی دەدەن لەسەر ئەوەی خوا ئەو شتانەی قەدەغەکردوون، کوان؟ کێن شایەدەکانتان ؟ ﴿ فَإِن شَهِدُواْ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ﴾، ئنجا ئەگەر شایەدییشیاندا، شایەدییان لەگەڵ مەدە.

واتە: تۆ ئەی پێغەمبەر ! شایەدییان لەگەڵ مەدە، چونکە ئەوان شایەدیی بە درۆ دەدەن، تۆش شایەدیی بە ڕاست نەبێ نادەی، کەواتە: لەگەڵ ئەواندا شایەدیی مەدە، ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، وە بە دوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، کە ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دادەنێن، ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْأَخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾، وە ئەوانەی بڕوایان بە دواڕۆژنییە، وە ئەوان دروستکراوەکان لەگەڵ پەروەردیگاریاندا یەکسان دەکەن.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:**

## باسێک دەربارەی خواردنە قەدەغەکراوەکان

بابەتی خواردنەکان: کامیان قەدەغەنو، کامیان ڕەوانو ڕێ پێدراون؟ بابەتێکی گرنگەو پەیوەندیی بە مرۆڤەکانەوە هەیە بەگشتی، بە مسوڵمانو نا مسوڵمانو بە وردو درشتیانەوەو، بە نێرو مێوە، جا ئێمە هەوڵدەدەین ئەم باسە زۆر بەگوشراویی بخەینە ڕوو، سەرەتا لەبەر تیشکی ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾﴾ بابەتەکە ڕوون دەکەینەوە، واتە: بڵێ: لەوەدا کە بۆم سرووش کراوە، هیچ قەدەغەکراوێك نابینم، لەسەر هیچ بخۆرێك کە بیخوا، مەگەر: (ئەو قەدەغەکراوە) مرداربێ، یان خوێنی ڕژاو بێ، یان گۆشتی بەراز بێ، کە ئەوە پیسە، (یاخود ئەوانە هەموویان پیسن)، یان (فیسق)ێك بێ، کە دەنگی لەسەر بەرزکرابێتەوە بۆ جگە لە خوا، {واتە: سەربڕاوێك ناوی جگە لە خوای لەسەر هێنرابێ}، وە هەر کەسێك تێگیرا، بە مەرجێ بە ئارەزووەوە نەبێو لە سنووریش تێنەپەڕێنێ، ئەوە بێگومان پەروەردگارت لێبوردەی بە بەزەییە.

ئەم ئایەتە مشتومرو ڕاجیاییەکی زۆری زانایانی لەسەرە، ئنجا ئێمە دیارە سەرەتا چەند برگەیەك لەبارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە، دەخەینە ڕوو، وەك ڕوونکردنەوە، دوایی دێینە سەر هەردوو ڕایەکان، کە زانایان بەگشتی تێیدا کەوتوونە دوو ڕاو بۆچوونەوە:

١/ هەندێکیان دەڵێن: خوا زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی لەم ئایەتانەدا دەفەرمویٚ: (ئەی موحەممەد!) تۆ بەو خەڵکە بڵێ: لەوەدا کە خوا بۆی سرووش کردووم بێجگە لەم چوارە: مردارو، خوێنی ڕژاوو، گۆشتی بەرازو، بۆ جگە لە خوا سەربڕاو، قەدەغە نین، بۆ هەر کەسێك کە بیانخوات.

دەڵێن: کەواتە: جگە لەم چوارە، نابێ هیچ شتێکی دیکە قەدەغەبێ.

٢/ هەندێکی دیکەش دەڵێن: لەبەرئەوەی کە لە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ دا، باسی درندەی کەڵبەدار (كُلَّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ) وە پەلەوەری چڕنووکدار (ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطُّيُورِ) کراوە، وە باسی کەری ماڵیی کراوە (الحمار الأهلي)، هەروەها باسی ژووشك (قنفذ) کراوە، وە باسی پشیلە (هِرّ) کراوە، لە چەند دەقێکدا، کە ئەوانە نەهییان لێکراوە، یان حەرامن، کەواتە: دەبێ جگە لەم چوارە، حەرامکراوی دیکەش هەبن.

ئنجا ئێمە پێش ئەوەی بێینە سەر ڕوونکردنەوەی ئەو دوو ڕایانەو بەڵگەکانیان، چەند شتێك دەخەینە ڕوو:

## پێنج ڕاستیی گەورە و گرنگ لەبارەی قەدەغەکراوەکانەوە

یەکەم: بە پێی سیاق دیارە، کە ئەم ئایەتە وەڵامی حەرامکردنە ئەفسانەییەکانی کافرەکان دەداتەوە، کە لە ئایەتەکانی ڕابردوودا خراونە ڕوو، بە کورتیی خوا دەفەرمویٚ: ئەو شتانەی ئێوە قەدەغەتان کردوون، قەدەغە نین، بڵێ: تەنها ئەو چوارە قەدەغەن، نەك ئەو شتانەی ئێوە، هەر ئاژەڵەی ناوێکتان لێناوە: (بەحیرە، سائیبە، وەصیلە، حام) یان دەڵێن: نابێ ئافرەتان لەم جۆرە ئاژەڵە بخۆن، یان ئەو جۆرە ئاژەڵە دەبێ وابێ! یانی: ئەوانەی ئێوە بە قەدەغەیان دادەنێن، هیچیان قەدەغە نین.

دووەم: وشەی: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ ﴾، بڵێ لەوەدا کە بۆم سرووش کراوە، بە وەحی بۆم هاتوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە حەرام دەبێ، تەنیا لە

ڕێگەی وەحییەوە دیاریی بکرێ، واتە: بۆ دیارییکردنی قەدەغەکراوەکان، جگە لە وەحی، هیچ سەرچاوەیەکی دیکەمان نیە، ئەگەر یەکێك بڵێ: ئەدی بۆ حەڵاڵ؟ دەڵێین: بۆ حەڵاڵ پێویست ناکات دەقی لەسەر هەبێ، چونکە خوا بە گشتی فەرموویەتی: هەموو شتێکم بۆ مرۆڤەکان خوڵقاندوە، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام بۆ دیارییکردنی قەدەغەکان، حەتمەن دەبێ دەقێکی شەرعیی هەبێ، وەك خوا لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾يونس، واتە: تۆ بڵێ: ئایا دەبینن ئەوەی کە خوا لە رۆزیی بۆی ناردوونە خوار! پاشان ئێوە حەڵاڵو حەرامتان تێدا داناوە، بڵێ ئایا خوا مۆڵەتی داون؟ یان بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن؟.

کەواتە: هەر شتێك حەرام بکرێ، لە دوو حاڵ بەدەر نیە:

أ) یان لە جێی خۆیەتیو بە مۆڵەتی خوایە، ﴿قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ﴾.

ب) یان بێ جێیەو درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خواوە،﴿أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴾، یانی جگە لەو دوو حاڵەتە نیە، یان لە جێی خۆیەتیو بە پێی مۆڵەتی خوایە، واتە: دەقی وەحی لەسەرە، یاخود درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خواوەو، حەرامکردنێکی بێ بنەمایەو بێ بەڵگەو بێ پاساوە.

هەروەها هەر لەوبارەوە خوا ﷻ لە سوورەتی (النحل) دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: وە بەوەی کە زمانتان بە دۆر دەیڵێ، (واتە: تەنیا بە دەربڕینی زمانو بە وەسفی درۆ) هەندێ شت قەدەغە مەکەن، بە درۆ بە زمانتان مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە، کە سەرەنجام بە ناوی خواوە درۆ هەڵبەستن،

بێگومان ئەوانەی بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن.

بۆیەش دەفەرمویێ: بە ناوی خواوە، چونکە کە تۆ گوتت : ئەو شتە حەرامە، دەبێ لە لایەن خواوە بەڵگەیەکت هەبێ، ئنجا کە بەڵگەت نەبوو، لە لایەن خواوە، کەواتە: درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خواوەو، بوختان کردنە بە خوای پاكو بێگەرد، کە فلان شتەی قەدەغە کردوە.

سێیەم: کە دەفەرمویێ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾، بلێ: پێم شك نایەت لەوەدا کە بۆم وەحی کراوە، هیچ قەدەغەکراوێك هەبێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە بناغە لە شتەکاندا ڕەواییو حەڵاڵییە، واتە: لە ئەسڵدا خوا هەرچی دروستی کردوە، لەم وجوودەدا کە ئێمە پەیوەندییمان پێوەی هەیە، چ لەسەر زەوی، چ لە بوونەوەردا بە گشتی، هەمووی بۆ مرۆڤ دروستکراوە، وە بۆ مرۆڤ ڕەوایە کە لێی بەهرەمەند بێ ، بۆچی ؟

چونکە :

١ - خوا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرمویێ :﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ...﴿٢٩﴾ ﴾ واتە: ئەو کەسێکە ئەوەی کە لە زەوییدایە، بۆ هەمووتانی خوڵقاندوە، یانی: هەرچی لە زەوییدابێ، بۆ ئێوەی دروستکردوە.

٢ - هەروەها لە سوورەتی (لقمان)دا دەفەرمویێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ...﴿٢٠﴾ ﴾،
واتە: ئایا سەرنج نادەن! کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دایە، بۆی دەستەمۆ کردوون (بۆی ڕامکردوون کە سوودی لێ ببینن)، وە نیعمەتو چاکەکانی خۆی بە ئاشکراو بە پەنهانیی بەسەردا ڕشتوون.

کەواتە: لە بوون (وجود)دا هەرچی مرۆڤ بتوانێ لێی بەهرەمەندبێ، وە سوودی لێ ببینێ، بۆی ڕەوایە، چونکە ئەسڵ لە شتەکاندا ڕەوایيە، زانایان لەسەر ئەم بنچینەیە ڕێککەوتوونو دەڵێن: بناغە لە شتەکاندا بریتیە لە ڕەوایی (الأَصْلُ

فِي الأَشْيَاءِ الإِبَاحَةُ) هەروەها دەشڵێن: (الأَصْلُ فِي الأَشْيَاءِ الحِلِّيَّةُ) بناغە لە شتەکاندا بریتیە لە حەڵاڵ بوون، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر قەدەغەکران و ڕێ لێگیران، کەواتە : ئەو تەعبیرە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾، بڵێ: پێم شك نایەت، لەوەدا کە بۆم سرووش کراوە، هیچ قەدەغەکراوێك هەبێ... یانی: دەبێ ئێمە بۆ دۆزینەوەی حەرامەکان لە بەڵگە بگەڕێین، واتە: بۆ ئیسپاتی ئەوە کە فڵانە شتە قەدەغەیە، پێویستییمان بەوە هەیە کە بەڵگە بدۆزینەوە، ئەدی بۆ ئیسپاتی ئەوە کە فڵانە شتە حەڵاڵە؟ دەڵێین: لە ئەسڵدا هەموو شتێك حەڵاڵەو پێویستیی بە بەڵگە نیە.

چـوارەم: کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطۡعَمُهُۥٓ ﴾، لەسەر هەر بخۆرێك کە بیخوا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نێرو مێ لە خواردنەکاندا یەکسانن، وە ئەوە بەرپەرچدانەوەی هاوبەش بۆ خوادانەرو کافرەکانە، وەك خوا لێیان دەگێڕێتەوە: ﴿ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُ... ﴿١٣٩﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە گوتیان: ئەوەی کە لە سکی ئەو ئاژەڵانەدایە، تایبەتە بە پیاوەکانمانەوە، وە حەرامو قەدەغەیە لە ژنەکان (لە هاوسەرەکان)، بەڵام ئەگەر مرداربێ، هەردووکیان تێیدا بەشدارن.

بەڵێ ئەمە ئەوە دەردەخات، کە لە بواری خواردنو خواردنەوەدا، پیاوانو ئافرەتان، وەك یەك وانو، شتەکان، ئەگەر ڕەوا بن، بۆ هەردووك ڕەگەزەکە ڕەوان.

پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾، مەگەر ئەو شتەی کە قەدەغەکراوە، یەکێك لەو چوارانە بێ: مردار بێ، یان خوێن بێ، یان گۆشتی بەراز، یاخود بۆ جگە لە خوا سەربڕا بێ .

## پێناسەی: میتة و دم و لحم الخنزیر و ما أهلّ لغیر الله بە:

١/ (الـمَیْتَـة): (المعجم الوسیط) ئاوا پێناسـەی (مَیْتَة) دەكات: (الـمَیْتَة: الحَیْوَان الَّذِي مَاتَ حتف أنفه أَو عَلَى هَيْئَة غَيْر مَشْرُوعة) واتـە: (مَیْتَـة) ـ مردار ـ ئـەو ژیـاندارەیە كـە بۆخـۆی مـردوە، یـان بـە شـێوەیەكی نـاڕەوا مـردوە، بـۆ وێنـە: ئـاژەڵێك كە ئەوەنـدەی لێبـدرێ، بمرێ، یان خنكێنـدرا بـێ، ئـەوە مـرداره.

٢/ (الـدَّم): ـ خوێـن ـ (سَـائِلٌ أَحْمَـر يَسْـرِي فِـي عُـرُوق الحَيْوَان) ماددەیـەكی شـلی سـووره كـە بـە دەمـارەكانـی ژیانـداردا هاموشـۆ دەكـات، ئنجـا ئـەو ژیانـداره: ئینسـانه، ئاژەڵە، درندەیـە، پەلـەوەره، هەرچی هەیـە.

٣/ (لَحْم خنزِير) ـ گۆشتی بەراز ـ بـەرازیش ئـاژەڵێكی زانـراوە.

٤/ (﴿فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾) واتـە: ئاژەڵێـك كـە نـاوی جگـە لـە خـوای لـەسەر هێنـراوە (فسـق)، واتـە: لـە ڕێ دەرچـوون، لـە شـێرازەی شـەرع دەرچـوون، كـە بریتییـە لەوەی ناوی جگە لە خـوای لەسـەر هێنـرابـێ، واتـە: بـۆ جگـە لـە خـوا سـەربـڕابـێ.

پێویستە ئەوە بزانین كە خـوای زانـا، بۆ وشـەی (دم) ـ خوێن ـ لێـرەدا دەفەرموێ: ﴿دَمًا مَّسۡفُوحًا﴾، خوێنـی ڕژاو، ئنجا وەك دوایـی باسـی دەكـەین، لـە سـێ شـوێنی دیكـە لـە قورئـاندا، ئەو چواره هـاتوون، واتـە: مـردارو، خـوێنو، گۆشـتی بـەرازو، بـۆ جگـە لـە خـوا سـەربـڕدراو، بـەڵام تەنیـا لێـرەدا ئـەو قەیـدەی خستۆتە سەرێ، كـە دەفەرمـوێ: ﴿دَمًا مَّسۡفُوحًا﴾، خوێنـی ڕژاو، ئنجا بنچینەیـەكی زانسـتی (أصـول الفقـه) لـە نێـو زانـایـاندا بـاوه، دەڵـێت: (يُحْمَلُ الْمُطْلَقُ عَلَى الْمُقَيَّدِ) هەمیشـە دەبـێ ئـەوەی بـە ڕەهـایی باسـكـراوە، لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەوەدا كـە بـە بەنـددار (مقیَّد)ی باسكراوە، تەفسـیـر بكرێ، كەواتە: لە شوێنەكانی دیكەش دا، مەبەسـت لـە خوێـن: خوێنـی ڕژاوه، بۆچـی خـوا وایفـەرمووە؟ چـونكە پێغـەمبەری خـوا ﷺ

دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ: الْحُوتُ وَالْجَرَاد، وَدَمَانِ: الكَبِدُ وَالطِّحَالِ﴾[1]، واتە: دوو مردارمان بۆ حەڵاڵن: ماسیو کوللە (کە سەرنابڕدرێن، با بشمرن حەڵاڵن، مەگەر بۆگەن بووبن، یان لەڕووی تەندروستییو پزیشکییەوە زیانیان هەبێ)، وە دوو خوێنیش: جەرگو سپڵ (کە ئەوانیش هەر جۆرێکن لە خوێن، بەڵام دیارە پێکهاتەکەیان جیایە، لە خوێنی ئاسایی).

هەڵبەتە لە ڕووی زانستییشەوە دەرکەوتوە کە جەرگو سپڵ زیانیان نیە، وەك خوێنی ڕژاو، ئنجا ڕەنگە یەکێ پێی سەیر بێو بڵێ: جا خوێنی ڕژاو، کێ دەیخوات؟ کاتی خۆی عەرەبەکان عادەتیان وابوو کە میوانیان دەهات، حوشتری زیندوویان دەهێنا خوێنیان لێ دەگرت، خوێنەکەیان لە شتێك دەکرد، دوایی دەیانبرژاندو دەیانخوارد، یان جاری وابوو لە سەفەرێ خوێنیان لە حوشترەکەیان دەگرت، یان شتێکیان سەردەبڕی، دەیانگوت: با خوێنەکەی خەسار نەبێ، لە قاپێکیان دەکردو، لە ڕیخۆڵەیان دەکردو دەیانبرژاندو دەیانخوارد، ئێستاش ڕەنگە لە نێو هەندێ میللەتاندا شتی وا هەر هەبێ، خوای زاناو شارەزا هیچی لەخۆڕا باس نەکردوە.

وە خوا ﷻ لە باسی گۆشتی بەرازدا فەرمویەتی: ﴿ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ﴾، (رجس) کە لە زمانی عەرەبییدا بە مانای : پیسیو، قێزەونو، حەرامو سزاو ئازارو، نەفرین، دێ، دیارە لێرەدا بە مانای : قێزەونو شتی پیسو زیانبەخشە، بەڵام ئایا لێرەدا تەنیا مەبەستی گۆشتی بەرازە، یاخود مەبەست هەرسێکیانە؟

زۆربەی زانایان دەڵێن: کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ﴾، هەرچەندە لە دوای گۆشتی بەراز باسکراوە، بەڵام بۆ هەرسێکیان دەگەڕێتەوە، واتە: مردارو خوێنو گۆشتی بەراز، هەرسێکیان پیسن، بە مانای پیسیی ماددیی، ئەدی ئەوەی دیکە کە بۆ جگە لە خوا سەردەبڕدرێ؟ ئەوە پیسی مەعنەوییە، ئەگەرنا لەڕووی ڕواڵەتییەوە، پیس نیە.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٧٢٣)، وَالدَّارَقُطِنيُّ برقم: (٤٦٨٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣١٤)، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في "السلسلة الصحيحة" برقم: (١١١٨).

## ئایا تەنیا ئەو چوار شتە قەدەغەن بۆ خواردن ؟!

ئنجا با بێینە سەر ئەوە کە ئایا تەنیا ئەو چوار شتە قەدەغەن، یان شتی دیکەش هەیە، قەدەغەبیٚ؟

بەلاّم بەر لەوەی بێینە سەر ڕاو بۆچوونی زانایان دەڵێین: کاتی خۆی ئێمە لە سوورەتی (البقرة) لە کاتی تەفسیری ئایەتی (١٧٣)دا، قسەمان لەوبارەوە کردوە، بەلاّم بە حەقیقەت ئەو بابەتە زۆر گرنگە، بۆیە لێرەش دووبارە قسەی لێدەکەین، وە من دوای لێکۆڵینەوەی زۆرو دوای ئەزموونی زیاتر، ئەو ڕایەی کە لەو کاتەداو، لە تەفسیری ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة)دا خستوومەتە ڕوو، کە گوتوومە: جگە لەو چوارانەش قەدەغەکراوی دیکە هەن، ئێستا ئەو ڕایەم نەماوە، بەڵکو ڕایەکی دیکەم بۆ پەیدا بووە، ئەویش ئەوەیە کە جگە لەو چوارانە، هیچ شتی دیکە قەدەغە نیە، مەگەر پیس‌و زیانبەخش بیٚ.

زانایانیش بۆیە کەوتوونە مشتومڕەوە، چونکە ئەم بابەتە کە خوا دەفەرمویٚ: (تەنیا چوار خواردنتان لیٚ قەدەغەن) لە چوار شوێنان، لە قورئاندا هاتوە:

١- لە سوورەتی (الأنعام)دا، ئایەتی (١٤٥).

٢- لە سوورەتی (النحل)دا، ئایەتی (١١٥).

٣- لە سوورەتی (البقرة)دا، ئایەتی (١٧٣).

٤- لە سوورەتی (المائدة)دا، ئایەتی (١).

هەڵبەتە خوای دادگەر ڕاستییەك لە چوار شوێندا بخاتە ڕوو، دیارە بابەتێکی گەورەو گرنگە، وە بێگومان بابەتی خواردنی گۆشتی پەلەوەرو ئاژەڵ، شتێکی گرنگەو ژیانی زۆربەی خەڵکی لەسەرە.

ئنجا ڕاجیاییەکەیان بەو هۆیەوە سەریهەڵداوە، کە خوا لە چوار شوێناندا ئەوەی باس کردوە، لە سوورەتەکانی (البقرة) و (النحل) لە هەردووکیاندا، وشەی

(إِنَّمَا)ی بەکارهێناوە، کە بە: ئامرازی کورتهەڵێنانو چەسپاندن، ناسراوە:

١/ لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾﴾.

٢/ وە لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾.

وەك گوتمان : (إِنَّمَا) لە زمانی عەرەبییدا، پێی دەگوترێ (أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَاتِ) یانی: ئامرازی کورتهەڵێنانو ئیسپات کردن، واتە: (إِنَّمَا) کە دەچێتە سەر شتێك، بۆ وێنە : کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ﴾، واتە: تەنیا ئەوەی لێ قەدەغە کردوونو هیچی دیکەی لێ قەدەغە نەکردوون.

٣/ لە سوورەتی (الأنعام)یش دا وشەی (إِنَّمَا) نیە، لەوێ دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ﴿١٤٥﴾﴾، واتە: بلێ: لەوەدا کە خوا بە وەحی بۆی ناردووم، هیچ قەدەغەکراوێك نابینم جگە لەم چوارانە.. "کە باسمان کردن".

٤/ لە سوورەتی (المائدة)ش دا دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الْأَنْعَامِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١﴾﴾، واتە: چوارپێی ئاژەڵانتان بۆ حەڵاڵ کراون، جگە لەوەی

بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە، دوایی لە ئایەتی ژمارە (٣)دا ئەوەی خوێندۆتەوەو فەرموویەتی: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ ... ﴿٣﴾﴾ المائدة، لەم ئایەتەدا یازدە (١١) شتان باس دەکات، بەلاّم هەموویان دەچنەوە نێو ئەو چوارە، چونکە :

١)﴿الْمُنْخَنِقَةُ﴾ خنکێندراو. ٢) ﴿الْمَوْقُوذَةُ﴾ لێدراو، ٣) ﴿الْمُتَرَدِّيَةُ﴾ هەڵدێراو، ٤) ﴿النَّطِيحَةُ﴾ قۆچ لێدراو، ٥) ﴿مَا أَكَلَ السَّبُعُ﴾ ئەوەی دڕندە لێی خواردبێ، ئەم پێنجانە هەموویان بە مردار حیسابن.

٦) ﴿مَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ﴾ئەوەی لەسەر بت سەربڕابێ، ئەمیش هەر لە جۆری ﴿مَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ یە، ٧) ﴿أَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ﴾ ئەوە بە زەلەمان دابەشتان کردبێ، کە جۆرێکە لە قومار، ئەمیش هەر لە جۆری ﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ یە.

## خستنە ڕووی دوو ڕایەکانی زانایان

### ڕای یەکەم :

دەڵێن: جگە لەو چوار شتانە، هیچ شتێکی دیکە لە ئاژەڵو پەلەوەرو زیندەوەرو دڕندەو مارو مێروو...هتد قەدەغە نیە، بەلاّم دەشڵێن: بەو مەرجە حەڕام نین، کە بە بەڵگەی زانستییو پزیشکییو تەندروستیی نەسەلمێندرابێ، کە فلاّنە شتە پیسەو زیانبەخشە، چونکە هەر شتێك سەلمێنرا، پیسەو

زیانبەخشە، ئەوە قەدەغە دەبێ، بەلاَم بەم ئایەتە نا، بەڵكو بە ئایەتی ژمارە (١٥٧) سوورەتی (الأعراف) كە دەفەرموێ: ﴿ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾، واتە: وە (پێغەمبەری خاتەم) هەموو شتە پیسو زیانبەخشەكانیان لێ قەدەغە دەكات.

كەواتە: هەر شتێك پیسو زیانبەخش بێ، قەدەغەیە، بە بەڵگەی ئایەتەكەی (الأعراف - ١٥٧)، وە بەپێی ئەو وشەیەش كە لە ئایەتی ژمارە (١٤٥) سوورەتی (الأنعام)دا هاتوە، كە دوای ئەوەی باسی مردارو خوێنو گۆشتی بەراز دەكات، دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ﴾، واتە: لەبەرئەوەی پیسو زیانبەخشن.

كەواتە : هەر شتێك پیسو زیانبەخش بێ، هەم وشەی (رجس)، وە هەم وشەی (خبائث) لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەیگرنەوە، بەلاَم بێجگە لەوە، ئەوەی نەكەوێتە ژێر ناوونیشانی: (رجس)و (خبائث)ەوە، مانای وایە، دەبێ حەلاَڵ بێ.

**بەڵگەكانی ڕای یەكەم، جگە لە ئایەتەكان:**

١) ﴿ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَأْكُلُونَ أَشْيَاءَ، وَيَتْرُكُونَ أَشْيَاءَ تَقَذُّرًا، فَبَعَثَ اللهُ تَعَالَى نَبِيَّهُ ﷺ، وَأَنْزَلَ كِتَابَهُ، وَأَحَلَّ حَلالَهُ، وَحَرَّمَ حَرَامَهُ، فَمَا أَحَلَّ فَهُوَ حَلالٌ، وَمَا حَرَّمَ فَهُوَ حَرَامٌ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَفْوٌ، وَتَلا: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾، إِلَى آخِرِ الآيَةِ}[1] واتە: خەڵكی سەردەمی نەفامیی چەند شتێكیان دەخوارد "لە ئاژەڵ" چەند شتێكیشیان واز لێ دەهێنا، لەبەرئەوە كە بێزیان لێ دەكردنەوە، خوای بەرزیش پێغەمبەری ﷺ خۆی ڕەوانە كرد، وە كتێبی خۆی ناردە خوار، ئەوەی كە حەلاَڵی كرد، حەلاَڵی كرد، وە ئەوەی كە قەدەغەی كرد، قەدەغەی كرد، وە ئەوەی كە خوا حەلاَڵی كردوە، حەلاَڵە، وە ئەوەی كە خوا قەدەغەی كردوە، قەدەغەیە، وە ئەوەشی كە خوا لێی بێدەنگ بووە، ئەوە عەفوویە (واتە:

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّحَاوِي فِي "مشكل الآثار" برقم: (٦٣٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٨٠٠)، قَالَ الأَلْبَانِي: صَحِيح الإِسْنَاد.

لێیگەڕاوەو کە لێیگەڕاوە یانی: قەدەغـە نیـە)، دوایـی (عبـدالله) کـوڕی (عـبـاس) ئەو ئایـەتـەی خوێنـدەوە: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ... ﴾.

وە لـە گێڕانەوەیـەکی دیکـەدا دەڵـێ: عەبدوڵـڵای کـوڕی عـەبباس خـوا لێـیان ڕازی بـێ، ئەم ئایەتـەی خوێنــدەوە، دوایـی گـوتی: {مَا خَلاَ هَذَا، فَهُوَ حَلاَلٌ}[١] واتە: جگە لەم چوارانـە، ئـەوەی دیکـە هـەمووی حـەڵاڵـە.

٢) ﴿عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قُلْتُ لِجَابِرِ بْنِ زَيْدٍ : يَزْعُمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ حُمُرِ الأَهْلِيَّةِ زَمنَ خَيْبَرَ! فَقَالَ: قَدْ كَانَ يَقُولُ ذَاكَ الْحَكَمُ بْنُ عَمْرٍو الْغِفَارِيُّ عِنْدَنَا بِالْبَصْرَةِ، وَلَكِنْ أَبَى ذَاكَ الْبَحْرُ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَقَرَأَ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾﴾[٢] واتە: عەمری کوڕی دینـار، دەڵـێ: بـە جابیـری کـوڕی زەیـدم گـوت: ئەوانە دەڵێن: کە پێغەمبەری خـوا ﷺ لـە ڕۆژی خەیبـەردا نەهـی کـردووە لـە خـواردنی گۆشـتی کـەری ماڵـیی ! ئـەویش گـوتی: حەکـەمی کـوڕی عەمری غیفاریی لە بەسرە لـەلای ئێمـە، وایـدەگـوت، (دەیگوت: لـە پێغـەمبەرم ﷺ بیسـتوە وایفـەرمووە)[٣]، بـەڵام دەریـا (مەبەسـت پێـی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـە) ڕازی نـەبوو بـەو قسـەیە، وە ئـەو ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾ بۆیـەش (جابـر) گوتوویـەتی: (بحـر) واتـە: وەك بەحـری زانسـت وایـە.

٣) ﴿أَخْرَجَ ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَيْسَ شَيْءٍ مِنَ الدَّوَابِ حَرَامٌ، إِلاَّ مَا حَرَّمَ اللهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾}[٤]، واتـە:

---

١) أَخْرَجَهُ عَبْدُ الرَّزَّاق برقم: (٨٧٠٩

٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٢٠٩

٣) ئـەوەی نێـوان کـەوانەکان زیـادەی خۆمـە، بۆ ڕوونکردنـەوەی مەبەست

٤) فتح القدير: ج٢، ص٢١٣

ئیبنو ئەبی حاتیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: هیچ شتێك لە زیندەوەران قەدەغە نیە، مەگەر ئەوەی خوا لە کتێبەکەی خۆی دا قەدەغەی کردبێ.

٤) ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَكْلِ الْقُنْفُذِ؟ فَتَلا : ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾، الآيَةَ، فَقَالَ شَيْخٌ عِنْدَهُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِي ﷺ فَقَالَ: (خَبِيثَةٌ مِنَ الْخَبَائِثِ)، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِنْ كَانَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذَا، فَهُوَ كَمَا قَالَ، مَا لَمْ نَدْرِ﴾[1]، واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە، کە پرسیاری لێکرا دەربارەی ژیشك، (لە بارەی خواردنی گۆشتەکەی) ئەویش ئەو ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾، {واتە: مادام لەویدا نیە کەواتە: حەڵاڵە}[2]، پیاوێکی بە تەمەن لەوێ بوو، گوتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو دەیگوت: باسی ژیشك کراوە لەلای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرموویەتی: پیسێکە لە پیسییەکان، (یان زیانبەخشێکە لە زیانبەخشەکان)، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش گوتی: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وایفەرمووبێ، ئەوە وەك ئەو فەرموویەتی وایە، دیارە ئێمە پێمان نەزانیوە !

وادیارە گومانی هەبووە، تۆ بڵێی پێغەمبەر وایفەرمووبێ، جا یان گومانی لەو کابرایە بە تەمەنە هەبووە، یان گومانی لە ئەبو هورەیرە هەبووە، کە ڕەنگە بەهەڵەدا چووبێ، چونکە جگە لە پێغەمبەر کەس پارێزراو (معصوم) نیە لە هەڵەدا کردن.

٥) ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: مَاتَتْ شَاةٌ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَاتَتَ فُلاَنَةُ تَعْنِي: الشَّاةَ، قَالَ: (فَلَوْلاَ أَخَذْتُمْ مَسْكَهَا)، قَالَتْ: نَأْخُذُ مَسْكَ

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد ج٢، ص٣٨١، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧٩٩)، قَالَ أَيْمَن صالح شَعْبَان: إِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ جِداً، وَضَعَّفَهُ الأَلْبَاني.

٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

شَاةٍ قَدْ مَاتَتْ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (إِنَّمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ ... ﴿١٤٥﴾ ﴾، وَإِنَّكُمْ لاَ تَطْعَمُونَهُ إِنَّمَا تَدْبُغُونَهُ فَتَنْتَفِعُونَ بِهِ)، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهَا فَسَلَخَتْ مَسْكَهَا، فَدَبَغَتْهُ فَاتَّخَذَتْ مِنْهُ قِرْبَةً حَتَّى تَخَرَّقَتْ عِنْدَهَا﴾[1]، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: سەودەی کچی زەمعە (کە یەکێکە لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ و دایکانی ئیمانداران خوا لێی ڕازی بێ، ئافرەتێکی بە تەمەن بووە)، مەڕێکی هەبوو مەڕەکەی مرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فلان کەسە مردوە، {دیارە ئەوان عادەتیان وابووە کە ئاژەڵو شت، ناویان بۆ داناوەو ناوێکی هەبووە، بۆ وێنە : گوێ بە گوارە، مەرەز، لە کوردەوارییشدا هەیە ناو لە مەڕو بزنو مانگا دەنێن}[2] پێغەمبەریش فەرمووی: بۆ پێستەکەتان وەرنەدەگرتو کەوڵتان نەدەکرد ؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئایا پێستی مەڕی مردوو، کە مردوە وەریبگرین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ ... ﴿١٤٥﴾ ﴾، واتە: بڵێ: لەوەدا کە بۆم وەحی کراوە، هیچ قەدەغەکراوێك نابینم، لەسەر هیچ بخۆرێك کە بیخوا...، دوایی فەرمووی: خۆ ئێوە گۆشتەکەی ناخۆن، بەڵکو لە دەباغی دەدەنو خۆشی دەکەن، بۆئەوەی سوودی لێ ببینن، ئیدی سەودە ناردی (دیارە نەفەرێکی ناردوە) مەڕەکەیان کەوڵ کرد، پاشان خۆشیان کردو لە دەباغیانداو، مەشکەیەکیان لێ دروستکرد، تاکو لەلای سەودە دڕا، هەر مابوو .

---

١) أخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٠٢٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٢٨١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح.

٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

تەماشا دەکەین : پێغەمبەریش ﷺ بەڵگەی بەم ئایەتە هێناوەتەوە، لەسەر ئەوە کە پێستەکەی حەڵاڵە، بەڵام گۆشتەکەی حەرامە، چونکە مردارەو مردارییەکەشی بۆ گۆشتەکەی دەچێتەوە.

٦) ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا سُئِلَتْ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَكُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ، تَلَتْ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾﴾[1]، واتە: لە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە، کە کاتێك پرسیاری لێدەکرا، دەربارەی هەر کەڵبەدارێك لە دڕندان، وە هەر چڕنووکدارێك لە باڵندان، ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾، بۆ وێنە: دەربارەی کەمتیار، گورگ، چەقەڵ، شێر، باشوو، خەرتەل، داڵاش، پرسیاری لێکرابایە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە، واتە: مادام لەو چوار شتانە نیە، حەرام نیە.

کەواتە: وێڕای ئایەتەکان، ئەو شوێنەوانەش هەن، وەك بەڵگەکانی ڕای یەکەم، کە دەڵێ: جگە لەو چوارانە، هیچ شتێك قەدەغە نیە.

**ڕای دووەم :**

دەڵێن: نەخێر، بێجگە لەو چوارانە، شتی دیکەش هەیە قەدەغە بێ، چونکە چەند ئایەتو فەرموودەیەك لەوبارەوە هەن:

بەڵگەکانیان:

١) دەڵێن: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴿١٥٧﴾ ﴾، واتە: هەرچی پاكو چاكە بۆیان حەڵاڵ دەکات، وە هەرچی پیسو زیانبەخشە، لێیان قەدەغە دەکات،

---

١) أَخْرَجَهُ اِبْنُ أبي شيبة برقم: (٢٠٢٣٥)، واِبْنُ أَبي حَاتِمِ في (تفسيره)، برقم: (٨٠١١).

ئنجا دەڵێن: سەرجەم ئەو پەلەوەرە بە چڕنووكو دەندووك بە قولابو، ئەو دڕندە كەڵبەدارانە كە مشتومڕیان لەسەرە، هەموویان زیانبەخشو پیسن، لەبەرئەوە وشەی (خبائث)، دەیانگرێتەوە.

هەروەها بەڵگە بە ئایەتی ژمارە (١٤٥) سوورەتی (الأنعام)یش دێننەوە، كە خوای پەروەردگار دوای ئەوەی باسی مردارو خوێنی ڕژاوو گۆشتی بەراز، دەكات، دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ﴾، چونكە پیسە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ﴾، دەڵێن: كەواتە: هەر شتێكی دیكەش زیانبەخش بێ، دەیگرێتەوە، وە هەر شتێ قێزەون بێ، دەیگرێتەوەو هەمان حوكمی هەیە.

دەڵێن: ئەگەر مردارو خوێنو گۆشتی بەراز، لەبەر (رجس) بوون واتە: پیسو زیانبەخش بوون، حەڕام بن، دیارە هەر شتێكی دیكەش وابێ، هەمان حوكمی هەیە.

٢) ئنجا لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە: ﴿عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنْ السِّبَاعِ﴾[١]، واتە: ئەبی ثەعلەبە (كە یەكێكە لە هاوەڵان) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی كرد لە: خواردنی هەموو كەڵبەدارێك لە دڕندان، یانی: ئەو دڕندانەی گۆشتخۆرن[٢].

٣) هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ﴾[٣]، واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی كرد لە خواردنی گۆشتی كەریماڵیی لە ڕۆژی خەیبەردا.

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٥٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٣٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٧٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٣٢٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٣٢).

٢) دواتر ئەو فەرموودەیەش دێنین كە وێڕای دڕندەی كەڵبەدار باسی باڵندە چڕنووكدار (ذي مخلب من الطَّير)یش دەكات، كە أحمد: ١٦٨٦٢ و أبو داود : ٣٨٠٥ هێناویانەو (الألباني)یش بە (صحيح)ی داناوە.

٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٥٥٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٩٣٢).

ئنجا شوێنکەوتووانی ئەم ڕایە دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر قسەیەکی فەرمووبێ، وەك ئەوە وایە خوا ﷻ فەرموویێتی، بە بەڵگەی:

أ/ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَلا هَلْ عَسَى رَجُلٌ يَبْلُغُهُ الْحَدِيثُ عَنِّي وَهُوَ مُتَّكِيءٌ عَلَى أَرِيكَتِهِ، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللهِ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَلالاً اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَرَاماً حَرَّمْنَاهُ، وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ كَمَا حَرَّمَ اللهُ﴾[1]، واتە: نزیکە پیاوێك کە پاڵی داوەتەوە لەسەر تەختێك، فەرموودەیەکی منی پێبگاتو بڵێ: لە نێوان منو ئێوەدا کتێبی خوا هەیە: هەر شتێ لە کتێبی خوادا بینیمان حەڵاڵە، بە حەڵاڵی دادەنێینو، هەر شتێ لە کتێبی خودا بینیمان حەرامە، بە حەرامی دادەنێین، بەڵام وانیەو ئەوەی کە پێغەمبەری خواش ﷺ حەرامی کردوە، وەك ئەوەیە کە خوای بەرز حەرامی کردوە.

ب/ هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ، أَلاَ يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ، يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلاَلٍ فَأَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ، أَلاَ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ لَحْمُ الْحِمَارِ الأَهْلِيِّ، وَلاَ كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ ...﴾[2]، واتە: ئاگاداربن ! من کتێبم پێدراوە، وە لەگەڵ کتێبیشدا شتێکی دیکەی وەك ئەوم پێدراوە، (واتە: قورئانم پێدراوەو سوننەتیشم پێدراوە)، با ئەوە نەیەتە دی : پیاوێکی تێر لەسەر قەنەفەو لەسەر شوێنی ئیسراحەتی خۆی پاڵی دابێتەوە بڵێ: هەر خەریکی قورئان بن ! هەر شتێکتان لە قورئاندا حەڵاڵ بینی، بە حەڵاڵی دابنێن، وە هەر شتێکتان لە قورئاندا بینی حەرامە، بە حەرامی دابنێن ! ئاگاداربن ! کە گۆشتی کەری ماڵییتان بۆ حەڵاڵ نیە، هەروەها گۆشتی هیچ خاوەن کەڵبەیەك لە دڕندان.

---

١) أَخْرَجَهُ الترمذي، برقم: (٢٦٦٤)، قال الألباني: صحيح.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٢١٣)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح رِجَالُهُ ثِقَات رِجَال الصَّحِيح غير عبد الرحمن بن أبي عروف الجرشي فمِنْ رجال أَبي دَاوُدَ وَالنَّسَائِي وَهُوَ ثِقَة، وَأَيْضاً أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٠٤) قَالَ الأَلباني: صَحِيح.

## دوو جۆرە تەئویل و ماناکردنی ئایەتەکان، بۆ خۆ دەربازکردنی لە تێکگیران:

بەڵام ئایا ئەوان چۆن لەم ئایەتانە حاڵی بوون ؟ بە دوو شێوە مانای ئایەتەکان دەکەن:

**یەك** : دەڵێن: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ ﴾، واتە: هەتا هاتنە خواری ئەم ئایەتە هیچ شتێك قەدەغە نەبووە، جگە لەم چوارە، ئەم ئایەتەش لە سوورەتی (الأنعام)دا لە مەککە هاتۆتە خوار، کەواتە: شتی دیکە کە دوایی هاتۆتە خوارو خوا قەدەغەی کردبێ، مانای وایە لەگەڵ ئەمەدا تێکناگیرێ، چونکە هەتا ئەو کاتەی ئەم ئایەتە هاتۆتە خوار، تەنیا ئەو چوارە قەدەغەبوون، بەڵام خوا ﷻ دوایی شتی دیکەشی قەدەغە کردووە.

بەڵام لەڕاستییدا ئەمە هەڵوەشاندنەوەی زۆر ئاسانە، ئەویش ئەوەیە کە: بەڵێ، ئەم ئایەتەی سوورەتی (الأنعام) مەککەییە، وە ئەوەی سوورەتی (النحل)یش هەروا، بەڵام ئایەتی ژمارە (١٧٣)ی سوورەتی (البقرة) لە مەدینە هاتۆتە خوار، وە ئایەتی ژمارە (٣) سوورەتی (المائدة)ش، نەك هەر لە مەدینە هاتۆتە خوار، بەڵکو سوورەتی (المائدة) کۆتا سوورەتە لە قورئان هاتبێتە خوار، یانی: لەو دوو سوورەتە مەدەنییانەش دا خوای زاناو شارەزا هەر باسی ئەو چوارانە دەکات، کەواتە: ئەوە بە بەڵگە دانانرێ.

**دوو** : مانایەکی دیکە بۆ خۆ دەربازکردن لە تێکگیران لە نێوان ئەم فەرموودانەو ئەو ئایەتانەدا، ئەوەیە کە دەڵێن : ئەو کورتهەڵێنانە کە خوا دەفەرموێ : تەنیا ئەو چوارە حەرامن، کورتهەڵێنانێکی گوێرەیی (حصر نسبي)یە، کە ئەوان پێی دەڵێن : (الحصْر الإِضَافِي أَو الحَصْر النّسبي) یانی : چی ؟ دەڵێن:

چونکە کافرەکان زۆر شتیان لە گۆشتی ئاژەڵان قەدەغە دەکرد، وەك باسمان کردو ئاماژەمان پێدان، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾المائدة، بۆیە خوا ﷻ فەرمووی: ئەو ئاژەڵانەی ئێوە قەدەغەیان دەکەن، هیچیان قەدەغە نین، تەنیا ئەو چوار شتە قەدەغەن، کە بریتین لە: مردارو خوێنی ڕژاوو گۆشتی بەرازو بۆ جگە لەخوا سەربڕاو، واتە: بەنسبەت ئەو شتانەوە، کە ئەوان قەدەغەیان کردوون، تەنیا ئەو چوارە قەدەغەن.

لەوبارەوە (إبن كثير) دەڵێ : (والمقصود من سياق هذه الآية الكريمة، الردُّ عَلَى المُشرِكِين الَّذِينَ ابتدعوا ما ابتدعوه، من تحريم المحرَّمَات عَلَى أَنْفُسِهِم بآرائِهِم الفاسِدَة مِن البَحِيرة والسائبة والوصيلة والحام ونحو ذَلِكَ، فَأَمَر (الله) رَسُولَهُ أن يُخْبِرهم أنه لا يجد فِيما أَوحاه الله إِلَيْهِ أَن ذَلِكَ مُحَرَّم، وَإِنَّمَا حُرِّم ما ذكر فِي هَذِهِ الآية، مِن الميتة، والدَّم المسفوح، وَلَحْم الخنزِير، وَمَا أُهِلّ لِغَيْر الله بِهِ. وَمَا عَدَا ذَلِكَ فَلَم يُحَرَّمْ، وَإِنَّمَا هُوَ عَفو مَسْكُوت عَنْهُ، فَكَيْفَ تَزعُمُون أَنْتُم أَنَّهُ حَرَام، وَمِن أين حرَّمتموه ولم يحرِّمه الله؟)[1]، واتە: مەبەست لەم ئایەتانە بەرپەرچدانەوەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانە، ئەوانەی کە لەخۆوە شتیان دادەهێناو لەخۆیانەوە شتیان قەدەغە دەکرد لەسەر خۆیان، بە بیروبۆچوونە هەڵەکانیان، وەك: (بَحِيرة، سائبة، وصيلة، حام)و وێنەی ئەوانە، ئنجا خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەر کرد: هەواڵیان پێبدا : لەو ئاییینەدا کە خوا بە وەحی بۆی ناردوە، نابینێ ئەو شتانە قەدەغە بن، بەڵکو هەر ئەوانە قەدەغەن، کە لەم ئایەتانەدا هاتوون، کە بریتین لە: مردارو خوێنی ڕژاوو گۆشتی بەرازو بۆ جگە لە خوا سەربڕاو، وە جگە لەم چوارە خوا ﷻ هیچی دیکەی قەدەغە نەکردوە، بەڵکو لێی بێدەنگ بووە، کەواتە: ئێوە چۆن گومان دەبەن کە ئەو شتانە قەدەغەن، وە چۆن قەدەغەتان کردن، لە حاڵێکدا کە خوا قەدەغەی نەکردوون ؟!

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص٤٥٥.

## ڕای خـۆم لــەوبـــارەوە

وەك پێشــتریش گوتــم ڕای یەکـەم هەڵدەبـژێرم کـە: جگــە لـەو چـوار شــتە، هـیچ شــتێك قەدەغـە نیـە، بەڵام دوای ئـەوەی کە ئـەو سێ ڕوونکردنەوانە، دەخـەمە ڕوو:

یەکــەم: بەنســبەت شـــەڕابو میـــزو پیســـایی‌و شــتی پیســـەوە، لەبـەر پیســـیی‌و زیانبەخشییان، هەر حەڕامن، چونکە هەندێ کەس دەڵێن: ئەگەر وابێ، دەبێ ئەو شتانەش حەڵاڵ بن، چونکە لە قورئاندا نەهاتوون‌و دەقیـان لەسـەر نیە !! ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێـین: نەخێر وانیە، چونکە وشـەی : ﴿ٱلْخَبَٰٓئِثَ﴾ لە ئایەتی ژمارە (١٥٧) سـووڕەتی (الأعراف)، وە وشـەی : ﴿فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ﴾ لە ئایــەتی (١٤٥)ی سـووڕەتی (الأنعام)دا، ئەوە دەگەیەنن کـە هـەر شـتێك (خبائث) بێ، حـەڕامـە.

دووەم: مەرج نیە مرۆڤ بێزی لـە هـەرشـتـێ ببێتـەوە، حـەڕام بـێ، چونکە زۆر لـە توێـژەرەوان لـە شـوێنێـك دا ژیـاون، بـۆ وێنـە: بۆقیـان نەخـواردوە، مارمێلکـەیان نەخـواردوە، ماریـان نەخـواردوە ... هتـد، بـەڵام ئێمـە لـە سوننەتی پێغـەمبەردا بەڵگەمان هـەیە کە پێغـەمبەری خـوا، شتێکی نەخـواردوەو، بێـزی لـێ کردۆتـەوە، بەڵام نەیفـەرمووە، حـەڕامــە، بـۆ وێنــە: ﴿عَـنْ خَـالِـدِ بْنِ الْوَلِـيدِ ﵁، أَنَّهُ دَخَلَ مَـعَ رَسُـولِ اللّٰهِ ﷺ بَيْـتَ مَيْمُونَـةَ فَأُتِـيَ بِضَـبٍّ مَحْنُوذٍ فَأَهْـوَى إِلَيْـهِ رَسُـولُ اللّٰهِ ﷺ بِيَـدِهِ، فَقَالَ بَعْضُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ : أَخْبِرُوا النَّـبِيّ ﷺ بِمَا يُرِيدُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْـهُ، فَقَالُوا: هُوَ ضَـبٌّ، فَرَفَعَ رَسُـولُ اللّٰهِ ﷺ يَـدَهُ، قَـالَ: فَقُلْـتُ: أَحَرَامٌ هُوَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: (لاَ وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ)، قَـالَ خَالِـدٌ: فَاجْـتَرَرْتُهُ فَأَكَلْـتُهُ وَرَسُـولُ اللّٰـهِ ﷺ يَنْظُـرُ﴾[1]، واتـە: خالیـدی کوڕی وەلـید خــوا لـێی ڕازی بـێ، دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: چوومە مـاڵی مەیموونـەی

١) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد، بـرقم: (١٦٨٥٩)، وَالبُخَـارِيُّ، بـرقم: (٥٢١٧)، وَمُسْلِمٌ، بـرقم: (٥١٤٦) بـرقم: (٥٢٦٣) قـال شـعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(خێزانی پێغەمبەر ﷺ کە پووری خالید بووە)، (ضب)یان هێنایە پێش پێغەمبەر ﷺ (ئێمە پێی دەڵێین: بزنمژە)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشێ نەیزانی، دەستی بۆ برد، یەکێ لە ئافرەتەکان کە لە ماڵی مەیموونە دابوون، گوتی : هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ بەوەی کە دەیەوێ لێی بخوان، ئیدی هەواڵیان پێدا : کە ئەوە بزنمژەیە ! ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گێڕایەوە، خالید دەڵێ گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە حەرامە ؟ گوتی : نەخێر حەرام نیە، بەڵام لەسەر زەمینی ئەو خەڵکەی کە من لە نێویان دا گەورە بووم، نەبووە، بۆیە دڵم بۆی ناچێ، یاخود بێزم لێ دەبێتەوە، خالید دەڵێ: ئیدی منیش ڕامکێشاو خواردم، پێغەمبەری خواش ﷺ تەماشای دەکرد.

لەلایەکی دیکەشەوە فەرموودەی دیکەشمان هەیە بە جۆرێکی دیکە: ﴿أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ لَحْمِ الضَّبِّ﴾[1]، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردوە لە خواردنی گۆشتی بزنمژە (ضب)، وەك دەبینین : لێرەدا نەهی لێکردوە، لەوێش فەرموویەتی : حەرام نیە.

کەواتە: مەرج نیە هەرچی پێغەمبەر ﷺ ڕێگریی لێکرد، حەرام بێ، جاری وایە ڕێگریی لێکرانەکە، لەبەرئەوە بووە کە پێی خۆش نەبووە، لەسەر سفرەکەی هەبێو بێزی لێ بۆتەوە.

سێیەم: ئەم ڕایە کە دەڵێ: جگە لەو چوارانە هیچ شتی دیکە قەدەغە نیە، ڕای پێشەوا مالیكو کۆمەڵێك زانای دیکەیە، دیارە مالیك یەکێکە لە پێشەواو زانا گەورەکان، کە ئیمامی خەڵکی مەدینە بووە، ئنجا ئەگەر ئەو بڵێ: جگە لەو چوارانە، هیچی دیکە قەدەغەنیە، مانای وایە ڕایەکەی ئیعتیبارێکی تایبەتی هەیە.

پێشەوا فەخرەددینی ڕازیی لەوبارەوە لە تەفسیرەکەی خۆی دا[2] دەڵێ: (فَثَبَتَ بِالتَّقرِيرِ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ : قُوّة هَذَا الكَلاَم وَصحّة هَذَا المَذْهَب، وَهُوَ الَّذِي كَانَ يَقُولُ بِهِ مَالِك بْن أَنَس) دیارە فەخرەددینی ڕازیی، دوای باسو خواسێکی

---

١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧٩٦)، وَحَسَّنَهُ الأَلبانِي.

٢) التفسير الكبير، ج٧، ص١٨٢.

زۆر دەڵێ: بەم شێوەیە چەسپا کە ئەم قسەیە زۆر بەهێزەو، ئەم ڕایە زۆر ڕاستەو، ئەم ڕایەش ڕای مالیکی کوڕی ئەنەسە.

لەبەر ئەوە من ئەو قسەیەی شەوکانیی کە لە (فتح القدير)ەکەیدا هێناویەتی، پێم باش نیە، کە لەوبارەوە دەڵێ: (وَقَدْ رُوِيَ عَن ابنِ عَبَّاسٍ وَابْن عُمَر وَعَائِشَة أَنَّهُ لا حرام إلاَّ مَا ذَكَرَه الله فِي هَذِهِ الآيَة، وروي ذَلِكَ عَنْ مَالِك، وَهُوَ قَول سَاقِط وَمَذْهبٌ في غَاية الضعف، لاستلزَامه لإِهْمَال غيرها مِمَّا نزل بعدها، مِنَ القُرْآن، وَإِهْمَال ما صَحّ عَن النَّبِي ﷺ أَنَّهُ قَالَهُ بَعْدَ نزول هَذِهِ الآية، بلا سَبَب يَقْتَضِي ذَلِكَ ولا موجِبٍ يوجبه)[١] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو عائیشەوە خوا لێیان ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە کە: جگە لەوەی خوا لەم ئایەتەدا باسی کردوە، هیچ شتێك قەدەغە نیە، وە ئەوە لە مالیکیشەوە گێڕدراوەتەوە (واتە: ڕای ئەویشە) وە ئەمە قسەیەکی زۆر بێهێزە، چونکە ئەم قسەیە، ئەوە دەخوازێ، کە هەرچی قورئانێك، کە لە دوای ئەوە دابەزیوەو باسی قەدەغەکراوەکان دەکات، پشتگوێ بخرێ، وە هەرچی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای دابەزینی ئەو ئایەتە، فەرموویەتی‌و بە سەنەدی ڕاست پێمانگەیشتوە، دەبێ پشتگوێ بخرێ، بەبێ هۆکارێك کە ئەوە بخوازێ‌و بەبێ پاساوێك کە شایستە بێ!

بەڵام ئێمە دەڵێین: لەڕاستیدا هیچ ئایەتێك لە دوای ئەوە نەهاتۆتە خوار، کە لەگەڵ ئەم ئایەتەدا تێکبگیرێ، واتە: لەگەڵ ئەو ئایەتەی ژمارە (١٤٥) سوورەتی (الأنعام)، وە ئەوەیش کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ئەویش وەڵامی خۆی هەیەو، بێگومان قسەو کردەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ قورئان دا تێکناگیرێ‌و دژ ناوەستێ.

ئنجا وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا: من کاتی خۆی لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١٧٣)ی سوورەتی (البقرة)دا، ئەو ڕایەم پەسند کرد، کە جگە لەو چوارانە، شتی دیکەش هەن، خواردنیان قەدەغەیە، ئەویش لەبەر هەبوونی ئەو فەرموودانەی

١) فتح القدير، ج٢، ص٢١٢.

پێغەمبەر ﷺ، کە پێشتر باسمان کردنو، دواییش جارێکی دیکە باسیان دەکەینەوە، بەڵام ئێستا دوای زیاتر وردبوونەوە لە بابەتەکە، گەیشتوومەتە ئەو رایەی کە جگە لەو چوارە، هیچ شتێك قەدەغە نیە وەك حەرامو قەدەغە بوون، بەڵام دەگونجێ بڵێین: ناپەسندە، قێزەونە، هەڵبەتە بە مەرجێك ئەو شتە زیانبەخش نەبێ، چونکە ئەگەر زیانبەخشو پیس بێ، دەکەوێتە ژێر ناوونیشانی: (خبائث)ەوەو، هەموو (خبائث)ێکیش قەدەغەیە.

هەروەها شتی پیسو زیانبەخش دەکەوێتە ژێر ناوونیشانی (رجس)یشەوە، کە ئایەتی (١٤٥)، سوورەتی (الأنعام)دا هاتوەو، هەرچی (رجس)یش بێ، واتە: پیسو زیانبەخش بێ، قەدەغەی دەکات، بەڵام هەر ژیاندارێك بە مەرجێ پیسو زیانبەخش نەبێ، با ئینسان بێزیشی نەیەت بیخوات: مارە، بۆقە، پەرەسێلکەیە حاجی لەقلەقە، فیلە، پڵینگە، شێرە، مشکە، هەرچی هەیە، مادام دەرکەوێ زیانی نیە، هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نیە، کە بڵێین: ئەوە قەدەغەیە، بەڵگەم چییە لەسەر ئەوە ؟ ئەم دە (١٠) بەڵگانەی خوارەوەن :

## دە (١٠) بەڵگە لەسەر قەدەغەنەبوونی جگە لە چوار قەدەغەکراوەکە

**بەڵگەی یەکەم**: مادام ئەو بابەتە لە چوار ئایەتدا هاتوە : دووانی مەککەییو دووانی مەدینەیی، لە چوار شوێنان لە قورئاندا خوا بفەرموێ: تەنیا ئەو چوار شتانە قەدەغەن، ناگونجێ حوکمێکی لەم شێوەیە نە نەسخ بکرێتەوە، نە تایبەتکردن، بیگرێتەوە، بەتایبەتییش کە لە سێیان دا، شێوازی کورتهەڵێنان (حصر) بەکارهاتوە، کە خوا دەفەرموێ: بەس ئەو چوار شتە قەدەغەن، وە لە چوارەمیشیاندا کە ئایەتی کۆتایەمینە، پێویستیی نەکردوە خوا لەوێشدا شێوازی کورتهەڵێنان (حصر) بەکاربێنێ، کەواتە: ئایەتی چوارەمیش هەمان حوکمی هەیە، هەروەك چۆن کە لە ئایەتی یەکەم دا ـ کە واپێدەچێ یەکەم ئایەت، ئایەتەکەی سوورەتی (الأنعام) بێ ـ کە فەرموویەتی: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا

مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾﴾، بەڵێ کە لێرەدا باسی خوێنی ڕژاو (دَمًا مَّسْفُوحًا)ی کردوە، لە سێ ئایەتەکەی دیکەدا، پێویستی نەکردوە، هەموو جارێك باسی خوێنی ڕژاو بکاتو، وشەی ڕژاو (مَّسْفُوحًا)ی بۆ زیاد بکات، چونکە مانای وایە هەر کات باسی خوێن دەکات، مەبەست پێی خوێنی ڕژاوە، نەك ئەو خوێنەی کە لە جگەرو لە سپڵ دا کۆدەبێتەوە.

ئنجا هەر کام لەو چوار ئایەتەش، لە سیاقێکدا هاتوون، کە خوا باسی چاکەو نیعمەتەکانی خۆی دەکات، با تەماشا بکەین:

١ - خوای زاناو توانا لە ئایەتەکانی پێشتری سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرمویٚ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ﴿١٤٣﴾﴾، مانای وایە خوا باسی ئاژەڵەکان دەکات، کە خوا دروستی کردوون، ئنجا خوا گلەیی و سەرزەنشت ئاراستەی کافرەکان دەکات، کە بۆچی لە خۆتانیان قەدەغە دەکەن؟ ئنجا لەوێدا دەفەرمویٚ: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً ...﴿١٤٥﴾﴾، کەواتە: جگە لەو چوارانە، ئەو نیعمەتانەی کە خوا خوڵقاندوونی لە ئاژەڵ و پەلەوەرو ... هتد، هیچیان قەدەغە نین.

٢ - لە سوورەتی (النحل)یشداو لە سیاقی باسی نیعمەتەکانداو، لە پێش ئایەتی (١١٥)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ

بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾، واتە: لەوەی کە خوا پێیداون حەڵاڵو پاكو چاكە بخۆن، وە سوپاسی چاکەی خوا بکەن، ئەگەر تەنیا بەندایەتیی بۆ ئەو دەکەن، بێگومان (خوا) تەنیا مردارو خوێنو گۆشتی بەرازو بۆ جگە لە خوا سەربڕاوی لێ قەدەغەکردوون.

٣ - لە سوورەتی (البقرة)شدا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانە ئیمانتان هێناوە ! لەو ڕزقە پاكو چاكو بە لەزەتانەی كە پێمانداون، بخۆن، وە سوپاسی (چاکەی) خوا بکەن، ئەگەر تەنیا ئەو دەپەرستن، بێگومان (خوا) تەنیا مردارو خوێنو گۆشتی بەرازو بۆ جگە لە خوا سەربڕاوی لێ قەدەغەکردوون...

٤ - وە لە سوورەتی (المائدة)شدا دەفەرموێ: ﴿... أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ...﴿١﴾﴾، واتە: هەرچی چوارپێی ئاژەڵە بۆتان حەڵاڵ كراوە، جگە لەوەی بەسەرتان دا دەخوێنرێتەوە..، دوایی دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ ...﴿٣﴾﴾، کەواتە: هەموویان لە سیاقی باسی نیعمەتەکانو چاكەكانی خوا دان، ئنجا مادام خوا وا بە ڕوونو ڕاشكاویی بفەرموێ: ئەو شتانەی کە بۆم دروستکردوون، هەموویان چاکەو نیعمەتی منن، وە جگە لەو چوارانە هیچ شتێکتان لێ قەدەغە نیە، ئەوە بەڵگەیەكی بەهێزە، کە جگە لەو چوار شتە، هیچی دیکە قەدەغە نیە.

**بەڵگەی دووەم:** خوا ڕایگەیاندوە کە بەگشتی دروستكراوەكانی بۆ سوودی مرۆڤایەتیی دروستکردوون:

أ - خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَ لَكُم مَّا فِی ٱلۡأَرۡضِ جَمِیعࣰا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰۤ إِلَى ٱلسَّمَاۤءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَـٰوَ ٰتࣲۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَیۡءٍ عَلِیمࣱ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتــە: خـــوا ئــەو كەســەیە كــە هەرچــی لەســەر زەویــی دایــە، بــۆ ئێــوەی دروســتكردوە، مانــای وایــە هــەرچی بەشــەر بتوانــێ لێــی بەهرەمەنــدو سوودمەندبـێ، هـەر جرِو جانەوەرێك بـێ، هەر زیندەوەرێك بـێ، مـادام بەشـەر بتوانـێ سوودی لـێ ببینـێ، خـوا بۆ ئێمـەی دروسـتكردوە، گرنـگ ئەوەیـە زیانـی نەبـێو میـزاجو دڵـی قبـووڵـی بكات.

ئنجـا لــەو ئایەتــانەی پێشێشــدا خــوا دەفـەرموێ: هیچـم لــێ قەدەغــە نەكـردوون جگـە لـەو چوارە، مەگـەر شـتێك زیانبـەخشو پـیس بــێ، كـە ئـەوە حوكمێكـی دیكەی هـەیە.

ب - وە لـــە ســــوورەتی (الحـــج)دا دەفـــەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِی ٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِی فِی ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ... ﴿٦٥﴾ ﴾، واتــە: ئایـا نابینــی كــە خـوا هەرچی لە ئاسـمانو زەوی دایــە، بـۆ ئێـوەی دەسـتەمۆكردوە، وە كەشـتیش لە دەریادا دەڕوا بــە فەرمـانی خـوا.

ج - وە لە سـوورەتی (الجاثیة)شـدا دەفـەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِی ٱلسَّمَـٰوَ ٰتِ وَمَا فِی ٱلۡأَرۡضِ جَمِیعࣰا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِی ذَ ٰلِكَ لَـَٔایَـٰتࣲ لِّقَوۡمࣲ یَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتـــــە: هـەرچی لە ئاسـمانەكانو زەویدا هەیــە، هــەمووی لەلایـەن خۆیــەوە بـۆ ئێـوەی دەسـتەمۆو ڕام كـردوەو، وایـلـێكـردوە كە لـێـی بەهـرەمەنـد بــن.

**بەڵـگـەی سـێـیـەم:** خـوا ﷻ، هـەروەها پێغـەمبەری خـوا ﷺ قەدەغــەیان كـردوە كە بەبــێ بەڵگــەی ڕوونو بــێ چەنـدو چـوون، شـتێك قەدەغــە بكـرێ، یـانی: خـــواو پێغـەمبەری خـوا، زۆر بەوە قەڵسـن كە لەخـۆوە شـتێك قەدەغـە بكــرێ.

با تەماشـا بكـەین :

أ) لە سوورەتی (النحل)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: وە هەر بەوەی کە زمانتان وەسفی دەکات بە درۆ مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە، تاکو بە ناوی خواوە درۆ هەڵبەستن، ئەوانەی بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن سەرفراز نابن.

ب - وە لە سوورەتی (یونس)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ: پێشانم بدەن ! ئەو ڕۆزییەی کە خوا بۆی ناردوونە خوار، کەچی هەندێکیتان بە حەڕام داناو هەندێکیشتان بە حەڵاڵ دانا، بڵێ : ئایا خوا مۆڵەتی داون، یاخود درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن ؟

کەواتە: خوا زۆری پێ ناخۆشە، هەر لەخۆوە ئەو شتانەی کە بۆ ئێمەی دروستکردوون، حەرامیان بکەین.

ج - پێغەمبەر ﷺیش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ فَهُوَ حَلاَلٌ وَمَا حَرَّمَ فَهُو حَرَامٌ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَافِيَةٌ، فَاقْبَلُوا مِنَ اللهِ عَافِيَتَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُنْ نَسِيًّا، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾ مريم﴾[1]، واتە: ئەوەی خوا لە کتێبی خۆی دا بۆی حەڵاڵ کردوون، حەڵاڵە، وە ئەوەش کە بۆی حەرام کردوون، حەرامە، وە ئەوەی لێی

١) أَخْرَجَهُ البَزَّار، برقم: (٤٠٨٧)، وَالطَّبَرَانِي، كَمَا فِي "مجمع الزوائد" (ج١، ص١٧١)، وَقَالَ الهَيْثَمِيُّ: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ ورجاله موثقون، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٤١٩) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، وَالبَيْهَقِيّ في "الكبرى"، برقم: (١٩٥٠٨)، وَالدَّارَقُطْنِي، برقم: (١٢).

بێدەنگ بووە، عەفوە (چاوپۆشیی لێکراوە)، دەجا چاوپۆشیی خوا وەربگرن، چونکە خوا هیچ شتێکی لەبیر نەچووە، {یانی: کە هەندێ شتی باس نەکردووەو نەیفەرمووە حەرامە، مانای وایە حەلاڵو موباحە، ئەگەر زانیتان سوودی لێ دەبینن، بەکاریبێنن، وە ئەگەر زانیتان زیانی هەیە لێیگەڕێن}[1]، ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾ مریم، وە پەروەردگارت هیچی لەبیر نەچووەو هیچی لەبیرناچێ.

**بەڵگەی چوارەم:** بەڵگەکی دیکە لەسەر ئەوە کە جگە لەو چوار شتانەی، کە خوا لە چوار ئایەتی قورئاندا، لە سوورەتەکانی: (البقرة، المائدة، الأنعام، النحل)دا ڕایگەیاندوە کە حەرامن، کە بریتین لە: مردارو خوێنو گۆشتی بەرازو بۆ جگە لە خوا سەربڕاو، جگە لەو چوارە، قەدەغە نین، ئەوەیە کە خوا بە ڕەهایی خواردنی خاوەن کتێبەکانی بۆ مسوڵمانان حەلاڵ کردوە، وەك لە ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ﴿٥﴾﴾،ئەمڕۆ شتە بەتامو خۆشەکانتان بۆ حەلاڵ کراون، وە خواردنی ئەوانەی کە کتێبیان پێدراوە بۆ ئێوە حەلاڵە، وە خواردنی ئێوەش بۆ ئەوان حەلاڵە.

ئنجا مادام لێرەدا خوا بە ڕەهایی خواردنی خاوەن کتێبەکانی بۆ ئێمە حەلاڵ کردوە، بەتایبەت خواردنی جوولەکەو نەصرانییەکان، کە دیارە ئەوانیش مەگەر چۆن، دەنا کەم شت هەیە نەیخۆن، دیارە بەراز ئەوە جیایە، چونکە بەراز دەقی قورئانی لەسەرە، بەلاّم شتەکانی دیکە هەرچی خاوەن کتێبەکان بیخۆن، لە گۆشتی ئاژەڵو پەلەوەرو دڕندەو زیندەوەران، بەپێی ئەم ئایەتە، کە دەفەرموێ: خواردنی خاوەن کتێبەکان بۆ ئێوە حەلاڵ کراوە، کەواتە هەرچی بیخۆن، جگە لەوەی کە دەقی قورئانی لەسەرە، کە بەرازەو ئەوان گۆشتەکەی بە حەلاڵ دەزانن، وە جگە لە مردارو، خوێنو، بۆ جگە لە

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە.

خوا سەربڕاو، ئەوەی دیکە هەمووی ڕەوایە.

**بەڵگەی پێنجەم:** ئەوەیە کە ناگونجێ دەقەکانی سوننەت لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا تێکبگیرێن، بۆچی ؟ چونکە خوا بە ئەرکی پێغەمبەری خاتەمی ﷺ داناوە کە ئایەتەکانی خوا بۆ خەڵك ڕوون بکاتەوە، وەك لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: وە زیکرمان (بیرخەرەوەمان) بۆ تۆ ناردۆتەخوار، تاکو ئەوەی بۆیان نێرراوەتەخوار، بۆ خەڵکی ڕوون بکەیەوە، کەواتە: ئەرکی پێغەمبەر ﷺ بریتی بووە لە ڕوونکردنەوەی قورئان، بۆیە هەموو فەرمایشتەکانی، وە هەموو کردەوەکانی، وە هەموو دانپێداهێنانەکانی، یانی: سوننەت بە هەرسێ بەشەکەیەوە (أقوال وأفعال وتقريرات) دەبێ بریتی بێ، لە ڕوونکردنەوەی واتاو چەمکی ئایەتەکانی قورئان، نەك لەگەڵیاندا تێکبگیرێ !

ئنجا بابزانین: چۆن چارەسەری تێکگیرانی ئەو فەرموودانە دەکەین، کە پێشتر باسمان کردن، کە تێیاندا پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە، لە خواردنی گۆشتی دڕندەی کەڵبەدار، وە پەلەوەری نینۆکدار، وە کەریماڵیی...، ئایا چۆن ئەو فەرموودانە، لەگەڵ ئەم ئایەتانەدا بگونجێنین ؟

ئێمە لەوبوارەدا دوو ڕێگەمان لەپێشە :

ڕێی یەکەمیان: ئەوەیە کە بڵێین: ئەو دەقانە مادام لەگەڵ قورئاندا تێکدەگیرێن، دیارە هی پێغەمبەری خوا ﷺ نین، وەك ئیمام فەخرەددینی ڕازیی کە بۆخۆی یەکێکە لەو زانایانەی جگە لەو چوارانە، هیچ شتێکی دیکەی پێ قەدەغە نیە، هەرچەندە بۆخۆی شافیعیی مەزهەبە، بەڵام لەوەدا ڕای مالیکی بەلاوە پەسەندە، وە زانایانی ڕۆچوو هەر وابوون، ئەگەر بەگشتیش شوێنکەوتووی پێشەوایەك بووبن، بەڵام کە زانیبێتیان، لە شتێکدا ئیمامەکەیان نەیپێکاوە، پشتگیریی ڕای ئیمامێکی دیکەیان کردوە، کە پێکاویەتی، یان خۆیان ڕایەکی دیکەیان خستۆتە ڕوو، لەوبارەوە ئیمام فەخرەددین لە (تفسير الكبير)ەکەی خۆی دا کە بە (مفاتيح الغيب) ناسراوە

دەڵێ : (وَعِنْدَ هَذَا نَقُولُ: مَا رُوِيَ أَنَّهُ ﷺ حَرَّمَ كُلَّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وذِي مِخْلَبٍ مِنْ الطُّيُورِ ضَعِيفٌ، لأَنَّهُ خَبَرُ وَاحِدٍ عَلَى خِلَافِ كِتَابِ اللهِ تَعَالَى، فَوَجَبَ أَنْ لا يَكُونُ مَقْبُولاً)[1]، واتە: لێرەدا دەڵێین: ئەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە هەموو خاوەن دڕندەیەکی کەڵبەدار، وە هەموو خاوەن چڕنووکێك لە باڵندانی قەدەغەکردوە، ئەوە بێهێزە، چونکە هەواڵی یەکێکە، {خەبەری ئاحاد ئەوەیە کە یەك لە هاوەڵان لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستوە، دوایی بە ئێمە گەیشتوە، کە لە بەرانبەریدا هەواڵی موتەواتیر هەیە، کە ئەوەیە کە کۆمەڵێك، کە نەگونجێ لەسەر درۆ کۆببنەوە، شتێکیان لە پێغەمبەر بیستبێ‌و، دواییش بە ئێمە گەیشتبێ، دیارە ئەو فەرموودانەی باسی قەدەغەبوونی گۆشتی دڕندەو گۆشتی باڵندەی چڕنووکدار دەکەن، هەروەها هی کەری ماڵییش، هەموویان فەرموودەی ئاحادن، ئنجا دەڵێ}[2] هەواڵی ئاحادیش کە لەگەڵ کتێبی خوای بەرزدا، تێکبگیرێ، نابێ وەربگیرێ.

ئەوە ڕێگای یەکەم، بۆ چارەسەری تێکگیرانی ئەو دەقانەی سوننەت کە لەوبارەوە هاتوون، لەگەڵ ئەو ئایاتانەدا، بەلاّم خۆم ئەو ڕایەم پێ باش نیە، مادام فەرموودەکان، وە دەقەکان لە کتێبو سەرچاوە متمانە پێکراوەکان دا هاتوون، وە بە سەنەدی زۆر بەهێز هاتوون، ناچار نین بڵێین : ڕاست نین‌و وەریانناگرین.

بۆیەش: <u>ڕێگای دووەم</u> هەڵدەبژێرین، ئەویش ئەوەیە کە بڵێین: مەبەست لەم دەقانە، قەدەغەبوونی خواردنی جگە لەو چوار شتانە نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ناپەسەندەو باش نیە، یاخود لە ڕووی تەبیعەت نەبردن‌و لە ڕووی قێزەونیی‌و لە ڕووی بێز لێبوونەوەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردوون‌و ڕێی لێگرتوون، بەلاّم قەدەغەی نەکردوون، هەڵبەتە جگە لەو شتانەی کە دەکەونە ژێر ناوونیشان‌و نێو بازنەی چەمك‌و واتای (خبائث)ەوە، کە لە ئایەتی (١٥٧)ی سوورەتی (الأعراف)دا

---

١) ج ٧ ، ص: ١٨٤.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

هاتوە، وە وشەی (رجس) کە لە ئایەتی ژمارە (١٤٥)ی سوورەتی (الأنعام)دا هاتوە، کە پێشتریش باسمان کرد، واتە: هەر شتێك پیسو زیانبەخش بێ، ئەوە بە پێی دەقی قورئان، وە بە پێی عەقڵی سەلیمیش قەدەغەیە، بەڵام شتێك پیسو زیانبەخش نەبێ، ئێمە دەڵێین: ئەو فەرمودانەی پێغەمبەر ﷺ مەبەست پێیان ئەوە کە ئەو شتانە: ناپەسەندن، یاخود قێزەونن، تەبیعەتی ئینسان نایانبات، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە چییە ؟

١/ ﴿عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ رضي الله عنه، أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ بَيْتَ مَيْمُونَةَ فَأُتِيَ بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ، فَقَالَ بَعْضُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ أَخْبِرُوا النَّبِيَّ ﷺ بِمَا يُرِيدُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ، فَقَالُوا: هُوَ ضَبٌّ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ، قَالَ فَقُلْتُ: أَحَرَامٌ هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (لاَ وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ)، قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ﴾[1]، واتە: خالیدی کوڕی وەلید خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: چوومەماڵی مەیموونە (خێزانی پێغەمبەر ﷺ، کە پووری خالید بووە)، (ضب)یان هێنایە پێش پێغەمبەر ﷺ (ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین: بزنمژە)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی نەیزانیو دەستی بۆ برد، هەندێ لە ئافرەتەکان لە ماڵی مەیموونە دابوون، گوتیان: هەواڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن بەوەی کە بەتەمایە لێی بخوات، ئیدی هەواڵیان پێدا کە ئەوە بزنمژەیە، ئەویش دەستی گێڕایەوە، خالید گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا حەرامە ؟ گوتی: نەخێر حەرام نیە، بەڵام لەسەر زەمینی ئەو خەڵکەی کە من لە نێویان دا گەورە بووم، نەبووە، بۆیە دڵم بۆی ناچێ، یاخود بێزم نایەت.

٢/ ئنجا لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، کە یەکێك لە هاوەڵان بە ناوی (عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ﴿أَنَّ رَسُولَ اللهِ

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (١٦٨٥٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٢١٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥١٤٦) برقم: (٥٢٦٣) قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ لَحْمِ الضَّبِّ﴾(١)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردوە لە خواردنی گۆشتی بزنمژە (ضب).

وەك دەبینن لێرەدا ڕێگریی لێ کردوە، لەوێش فەرموویەتی : حەرام نیە، کەواتە: مەرج نیە هەرچی پێغەمبەر ﷺ ڕێگریی لێکرد، حەرام بێ.

٣/ وە دەربارەی هەر کام لە گۆشتی دڕندەی کەڵبەدار، وە پەلەوەری چڕنووکدار، ئەم دەقە دێنینەوە: (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ﴾(٢). واتە: پێغەمبەری خوا ڕێگریی کردوە لە خواردنی هەر دڕندەیەکی کەڵبەدارو، هەر باڵندەیەکی چڕنووکدار.

٤/ هەروەها لەبارەی کەری ماڵییشەوە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردوە، کەواتە: دەگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی لە شتێك بکات، بەڵام حەرامیش نەبێ، بەڵکو ناپەسەند بێ، چونکە عورفو باو نیە بخورێ، یان لەبەرئەوەی خەڵك بە قێزەونی دەزانن، یان لەبەر هەر هۆیەکی دیکە.

وەك لەم دەقەدا هاتوە: عَنْ علي رضي الله عنه: ﴿أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ زَمَنَ خَيْبَرَ﴾(٣)، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی (جەنگی) خەیبەردا، ڕێگریی کرد لە (نیکاحی) موتعەو (خواردنی گۆشتی) کەری ماڵیی.

وەك دەبینین : نەهی کردوە لە خواردنی گۆشتی کەر، هەروەها لە خواردنی گۆشتی بزنمژە (ضب)، بەڵام کە خالیدی کوڕی وەلید پرسیاری کردوە، ئایا حەرامە ؟ فەرموویەتی : نەخێر.

کەواتە: دەگونجێ کە ئەوانەش حەرام نەبن، چونکە بەنسبەت بزنمژە

---

١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، برقم: (٣٧٩٦)، وَحَسَّنَهُ الأَلبَاني.

٢) أَخْرَجَهُ أحمد، برقم: (١٦٨٦٢)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٣٨٠٥)، وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني.

٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٤٢٢٧)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٤٩٩٢).

(ضب)ەوە، پێغەمبەر پاساوی نەخواردنی بەوە هێنایەوە، فەرمووی: دڵم بۆی ناچێ، بێزم لێی دەبێتەوە، دیارە دەگونجێ بەنسبەت گۆشتی دڕندەو گۆشتی پەلەوەری نینۆكداریشەوە، بە هەمان شێوە بێ، یان دەگونجێ لەبەر هۆیەكی دیكە بێ، بۆ وێنە: بەنسبەت گوێدرێژەكانەوە، بۆ بارهەڵگرتن پێویستییان بوون، وەك دوایی باسی دەكەین.

**بەڵگەی شەشەم:** یەكێكی دیكە لەو بەڵگانە، ئەوەیە كە هەر كام لە (إِبْنُ عَبَّاس وَإِبْنُ عُمَر وعَائِشَة) خوا لە هەموویان ڕازی بێ، لێیان گێڕدراوەتەوە كە كاتێ لەبارەی خواردنی ئەو چوار شتەوە، پرسیاریان لێكراوە، ئەم ئایەتانەیان خوێندۆتەوە: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ ﴾(١٤٥)، واتە: بە پێی ئەم ئایەتە ئەو شتانەی ئێوە پرسیاریان لەبارەیەوە دەكەن، جگە لەو چوار شتانە، هیچیان قەدەغە نینن وەك پێشتر دەقی فەرموودەكانمان هێنا.

هەڵبەتە: ناگونجێ ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزەش نەیانزانبێ كە پێغەمبەر ﷺ ئەو فەرموودانەی فەرمووە، ئاگایان لەو فەرموودانە نەبووبێ، بەلام دیارە زانیویانە ئەم فەرموودانە، مانای قەدەغەبوون ناگەیەنن.

**بەڵگەی حەوتەم:** بەڵگەیەكی دیكە لەوبارەوە، ئەوەیە كە لە (إِبْنُ شِهَاب الزُّهْرِي) كە زانایەكی بەرجەستەی تابیعینە، گێڕاویانەتەوە كە: (لَمْ يَسْمَعْ هَـ ـا النّهي فِي الحجَاز حَتَّى إِذَا جَاءَ الشّام ، سُمِعَهُ مَن أَبي إِدْرِيس الخَوْلانِي) واتە: نەیبیستوە لە حیجاز نەهی كرابێ {لە خواردنی گۆشتی كەری ماڵیو دڕندەو چڕنووكدار} تاكو لە شام لە ئەبو ئیدریسی خەوەلانی بیستوە.

كەواتە: لە مەككەو مەدینەو تائیفو هەموو ئەو شوێنانەی دیكەی حیجاز، دەبێ ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر زانرابن، بەلام دیارە خەڵك وا لەو فەرموودانە حاڵی نەبووە، كە خواردنی ئەو گۆشتانە حەرام بێ، بەڵكو گوتوویانە: پێغەمبەر ڕێگریی لێكردوون، لەبەرئەوەی ناپەسەندن، یاخود لەبەر هەر هۆكارێكی دیكە.

**بەڵگەی هەشتەم:** بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە، ئەوەیە کە مالیك کە ئیمامی خەڵکی مەدینە بووە، خواردنی گۆشتی درِندانو پەلەوەری چرِنووکداری تەنیا بە ناپەسەند زانیوە، ئەمەش دیسان بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە نابێ ئەو شتانە قەدەغەبووبن، ئەگەرنا مەعقووڵ نیە ئیمام مالیك کە ئیمامی خەڵکی مەدینە بووە، لە خەڵکی مەدینەی نەبیستبێ، کە پێغەمبەر لە حاڵێك دا لەنێویاندا بووەو لە خزمەتی دابوون، ئەو شتانەی قەدەغەکردوون !

**بەڵگەی نۆیەم:** بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لاَ أَدْرِي أَنهى عَنْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ كَانَ حُمُولَةَ النَّاسِ، فَكَرِهَ أَنْ تَذْهَبَ حُمُولَتُهُمْ، أَوْ حَرَّمَ فِي يَوْمِ خَيْبَرَ، لَحْمَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ﴾[1]، عەبدوڵڵای کورِی عەبباس خوا لە خۆیو بابی رِازی بێ، گوتوویەتی: نازانم ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرئەوەی بارهەڵگری خەڵك بووە، رِێگریی کرد لە سەربرِینی کەرو خواردنی گۆشتەکەی، بۆئەوەی کە بارهەڵگرەکانیان نەفەوتێن، یاخود لە رِۆژی خەیبەردا بە یەکجاریی قەدەغەی کردوە، نەك لەبەرئەوەی کە بارهەڵگریانە بارە بەریانە، بەڵکو لەبەرئەوە کە پیسو زیانبەخشە ؟

بەڵام فەرموودەیەکی دیکە، ئەوە دەگەیەنێ کە زیاتر لەبەر بارهەڵگریی بووبێ: ﴿عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ ا ﷺ جَاءَهُ جَاءٍ فَقَالَ: أُكِلَتْ الْحُمُرُ؟ ثُمَّ جَاءَهُ جَاءٍ فَقَالَ: أُكِلَتْ الْحُمُرُ؟ ثُمَّ جَاءَهُ جَاءٍ فَقَالَ: أُفْنِيَتْ الْحُمُرُ؟ فَأَمَرَ مُنَادِياً فَنَادَى فِي النَّاسِ: إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عن لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، فَإِنَّهَا رِجْسٌ، فَأُكْفِئَتْ الْقُدُورُ، وَإِنَّهَا لَتَفُورُ بِاللَّحْمِ﴾[2]، واتە: ئەنەسی کورِی مالیك خوا لێی رِازی بێ دەگێرِێتەوە، دەڵێ: کەسێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: گۆشتی کەرەکان خورا، (واتە: کەرەکان سەربرِاون گۆشتیان دەخورێ، دیارە پێغەمبەر هیچی نەفەرمووە)، ئنجا یەکێکی دیکە

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٤٢٢٧)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٤٩٩٢)

٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٤١٩٩)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٤٩٩٦)

هـاتو گوتـی: گۆشـتی کـەرەکـان خـورا، دوایـی یـەکێکی دیکـە هـاتو، گوتـی: کەرەکان تەواو بوون (واتە: هـەموویان سـەربڕان) ئنجا پێغـەمبەر ﷺ فـەرمانی کرد بانگکەرێك بانگی کرد، لـە نێو خەڵکیدا کە: خـواو پێغـەمبەری خـوا ﷺ ڕێتان لێدەگرن، لـە خـواردنی گۆشتی کـەری ماڵیـی، چونکە پیسە، ئنجـا ئـەو مەنجەڵانـەی گۆشتەکانیـان تێدا کوڵـێنرابوون، لـە حاڵێـکدا کـە گۆشـتەکانیان دەکوڵـی، قەڵـب کـرانـەوەو گۆشـتەکـەش ڕژێـنـرا.

ڕەنگـە هەنـدێ کـەس بڵـێن :

هـۆی قەدەغـەکرانـی گۆشـتی کـەر، ئەوەیـە کـە پێغـەمبەر ﷺ بـە (رِجْس) ناوی بـردوەو فەرموویـەتی: (فَإِنَّهَا رِجْسٌ) !

کـە دیـارە وشـەی (رِجْس) هـەر کـام لـە ماناکـانی: پیـس، ئـازار، سـزا... دەگەیـەنـێ.

ئێمـەش دەڵێـین: مـەرج نیـە هـەر شـتێك سیفەتی: ئـازاردەرو بێـزارکەری تێدا بێ، حـەڕام بێ، بە بەڵگەی ئەوە کە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ هـەر کـام لـە پیـوازو سیـرو کـەوەر (کـوڕادە)ی بە ئـازاردەرو بێـزارکـەر ناوبـردووەو، نەهیـشی لە خـواردنیـان کردوە، بـۆ کەسـانێك بێـنە مزگـەوتو نوێـژی بـە کـۆمەڵ، بـەڵام نەیفـەرمووە، حـەڕامـن:

١) ﴿مَن أكَلَ ثُوْمـاً أو بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنـا، أو ليعتـزِلْ مَسْجِدنـا﴾ رواه البخـاري: ٨٥٥ و مسـلم: ٥٦٤، واتـە: هەرکـەس سیـرو پیـوازی خـوارد، بـا کەنـارمان لێبگرێ، یـان: بـا لە مـزگەوتمـان کەنـار بگـرێ.

٢) ﴿مَن أكَلَ البَصَلَ والثُوْم و الكراث، فَلا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدِنَا، فإن الملائكة تتأذّى مِمّا يتأذى منـه بنـي آدم﴾ رواه مسـلم: ٥٦٤، واتـە: هەرکـەس پیـوازو سـیرو کـەوەر (کـوڕادە ــ سیـرمۆکە)ی خـوارد، بـا نـزیـکی مزگەوتەکـەمان نەکـەوێ، چونکـە هـەر شـتێك ئـادەمیـزادان بێـزارو نـاڕەحـەت بکـات، فریـشتانیش نـاڕەحەتو بێـزار دەکات.

٣) (عمر بن الخطاب)یش خوا لێی ڕازی بێ: پیازو سیری بە دوو ڕووەکە پیسەکە (الشجرتین الخبیثتین) ناو بردوون: ﴿... ثم إنكم أيها الناس تأكلون شجرتين، ما أراهما الاّ خبيثتين: البصلُ والثُّوم...﴾ رواه مسلم: ٥٦٧، واتە: پاشان ئەی خەڵکینە! ئێوە دوو ڕووەکان دەخۆن، من هەر بە پیس (بۆنناخۆش)یان دەزانم: پیوازو سیر... .

ئنجا لێرەشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە:

هەموو قەدەغەکراوێك پیس (رجس)ە، بەڵام مەرج نیە هەموو پیسێك قەدەغەکراو بێ، چونکە (رجس) یان (خبیث) جاری وا هەیە بە شتی بۆن ناخۆشیان گوتوە، بۆ وێنە: سیرو پیاز، لەبەر بۆنە ناخۆشەکەی پێیانگوتراوە: (خبیث) کەواتە: دەگونجێ گۆشتی کەرێ، لەبەرئەوەی تەبیعەتی ئەوان نەیبردوە، بۆیە بە (رجس) ناوبراوە، بەڵام ئەگەر قەومێکی وا هەبێ کە تەبیعەتیان بیبا، ئەوە بۆ ئەوان بە (رجس) پیس لە قەڵەم نادرێ.

**<u>بەڵگەی دەیەم</u>:** ئەوەیە کە بە ڕاستیی دەبێ ئێمەی مسوڵمان عەقڵو زەینمان زۆر فراوان بکەین: ئیسلام تەنیا بۆ گەلی عەرەب نەهاتوە، تەنیا بۆ کورد نەهاتوە، تەنیا بۆ خەڵکێك نەهاتوە کە لە ئاسیا دەژین، یان لە ئەفریقیا دەژین، یان لە ئەورووپا دەژین، بەڵکو بۆ هەموو خەڵکی هاتوە لە سەرتاپای زەمین دا، من خۆم ساڵی (٢٠١١) کە چوومە (کەمبۆدیا) و چووم بۆ (مالیزیا) [1] تەماشام دەکرد (جرج) لەوێ دانراوە، مشکی قەڵەو ! منیش گوتم: ئەوە چییە؟ گوتیان: دەیفرۆشن بۆ خواردنێو لێرەدا زۆر بە ڕمێنە، بڕواتان هەبێ لەوێ مریشكو قەلو ئەوانە کڕیاریان هەر نەبوو، لەبەر مارو قرژاڵو بۆقو سیسرکەو، چەندان جۆرە قالۆنچەو جۆرە کرم، گوتم : ئەوە چیە؟ گوتیان: ئەوانە هەموویان دەخۆنو ڕمێنیشیان زۆر لەسەرە.

---

١) بۆ بەشداریی کردن لە کۆنگرەی پەرلەمنتارانی وڵاتانی ئاسیادا

جا لە ڕاستییدا ئەگەر بە فراوانی تەماشای دنیا بکەین، باشە خەڵکێکی زۆر لەوێ ڕەنگە ژیانی هەر لەسەر خواردنی بۆق و قرژاڵو مارو مشكو جرج بێ، هەڵبەتە کە دەڵێم: جرجو مشك، نەك ئەوەی لە وڵاتی خۆمان هەیە، چونکە لە هەندێ فەرموودانددا هاتوە کە: مریشکیش ئەگەر پیسایی بخوات، وە مانگاش ئەگەر پیسایی بخوا، کە پێیدەڵێن: (جلاّلة)، لەبەرئەوەی گۆشتەکەی بۆنی لێدێ، هەندێ لە زانایان دەڵێن: ناپەسەندە، هەندێکیش دەڵێن: حەرامە بخورێ، مادام زۆربەی خواردنەکەی شتی پیس بێ، بەلاّم مشکێك، یان جرجێك کە لە بیابان گیا دەخوات، مادام سوودبەخش بێو زیانی نەبێ، حوکمەکەی جیایە.

هەڵبەتە هەر شتێكو هەر ژیاندارو زیندەوەرێك، ئەگەر لە ڕووی ندروستییەوە سەلمێنرا کە وشەی (خبائث) دەیگرێتەوەو، زیانبەخشە بۆ تەندروستیی ئینسان، ئنجا مارە، دووپشکە، مشکە، بۆقە، قالۆنچەیە، هەرچی هەیە، ئەگەر دەرکەوت زیانی هەیە، ئەوە بەهۆی زیانەکەیەوە حەرامە، بەلاّم نەك لەبەر ئایەتەکە، یان لەبەر فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەلاّم ئەگەر دەرکەوت زیانیان نیە، ئەو کاتە ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان نیە کە حەرام بن، فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ وەك گوتم: ئەوپەڕی ئەوە دەگەیەنن کە ناپەسەندن، ئەوە بەنسبەت دڕندەی کەڵبەدارو، پەلەوەری چڕنووکدارو کەری ماڵیی.

بەلاّم بەنسبەت ئەو زیندەوەرو ژیاندرانەی دیکەوە نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەکاندا باسی کردبن، بۆ وێنە: فیلو کەرگەدەنو مارو.... هتد، کە وەك گوتم: ڕەنگە زۆر لە وڵاتان خواردنی سەرەکییان ئەو شتانە بن، بە هەر حاڵ، وەك گوتم: ئەگەر دەرکەوت لە ڕووی زانستییەوە زیانبەخشو پیسن، ئەوە ئەوکاتە بە پێی ئایەتەکەی سوورەتی (الأعراف) کە فەرمووی:

﴿ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾، مانای وایە مادام پیسو زیانبەخش بن، دەبێ قەدەغە دەبن، بەلاّم ئەگەر پیسو زیانبەخش نەبوون، هەر لەبەرئەوەی من تەبیعەتم نایانبا، یان تەبیعەتی کەسێك حەزی پێناکات، ئەوە حەرام نابن، چونکە پێغەمبەر ﷺ تەبیعەتی بزنمژەی نەبردوە، بەلاّم لە تەنیشتی

خالیدی کوڕی وەلید خوا لێی ڕازی بێ خواردوویەتیو پرسیاریشی کردوە: ئایا حەرامە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەخێر، بەڵام تەبیعەتم نایبا.

هەڵبەتە منیش (عەلی باپیر) من تەبیعەتم کوللەو قالۆنچەو سیسرکەو مارو مشك، نابات، ئەگەر تەواو دڵنیاش بم، ڕەواو حەڵاڵیشن، تەبیعەتم نایبات، بگرە ڕەنگە تەبیعەتم شتی دیکەش نەبات، کە جاری وایە خەڵکی دیکەش پێی حەڵاڵە، بەڵام تەبیعەت نەبردن شتێکە، وە شت حەرامکردنیش شتێکی دیکەیە، ئێمە نابێ تەبیعەتی خۆمان لە خەڵکی بکەینە شەریعەتو، تەبعی خۆمان لە خەڵك نەکەینە شەرع، شەریعەتی خواش ئەوەیە کە لە وەحی خوادا هاتوە، لە قورئانو سوننەتی صەحیح دا هاتوە، بەڵام تەبیعەتو عادەتو سروشتو نەریتی ئێمە، جیایە .

ئنجا کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ ﴿٧٨﴾﴾ الحج، واتە: خوا لە دینی خۆیدا سەغڵەتیی بۆ ئێوە دانەناوە، بەو جۆرە تێگەیشتنە باشتر دێتە دی، زۆر لە وڵاتان ژیانیان لەسەر چەند جۆرێك لەو زیندەورەو ئاژەڵ و دڕندانەیە، زۆرێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو لە ئەورووپا سەگ دەخۆن، پشیلەو بۆقو قرژاڵو مارو مشك دەخۆن، زۆر جۆرە زیندەوەر دەخۆن، ناشبینین زیانێکی لێدابن، لە ڕووی زانستییشەوە پێموانیە ئەوان لە دوای ئێمەوەبن، تاکو بڵێین: ئێمە بۆمان دەرکەوتوە کە ئەوانە زیانیان هەیە، بەڵام ئەوان بۆیان دەرنەکەوتوە !

کورتەی قسان ئەوەیە: کە مادام خوا دینی خۆی بۆ هەموو بەشەر ناردوە، ئەو بەشەرە لە هەر شوێنێکی دنیا بێ، وە خواش فەرموویەتی : هەرچی لەسەر زەوییە بۆ ئێوەم دروستکردوە، کەواتە: هەرچی لەسەر زەوییە لەئەسڵدا ڕەوایەو حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر دەرکەوت کە شتێك زیانبەخشە، ئەوە ئەو کاتە دەڵێین: ئەو شتە زیانبەخشەو لەبەرئەوەی کە زیانبەخشە، حەرامە، نەك لەبەرئەوە کە فلانە فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دەیگرێتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەقێکی ڕوونو بێ چەندو چوونی لێ نەگێڕدراوەتەوە، لەوبارەوە.

بە کورتیی: من ئەو رایەم پێ پەسندە، کە: مەرج نیە هەموو نەهی لێکراوێك حەرام بێ، ئنجا خوا لە کۆتایی ئەو ئایەتەدا دەفەرموێ:

﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٤٥﴾، ئنجا هەر کەسێ ناچاربوو، یان ناچارکرا، بە مەرجێك بە ئارەزووە نەخوات، وە زیاد لە ئەندازەی کە پەکی لەسەری کەوتوە، نەخوات و تێنەپەڕێنێ، ئەوە بێگومان پەروەردگارت لێبوردەی بە بەزەییە !

جێی سەرنجە کە ئەم ڕستەیە: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ﴾، لە چوار شوێناندا هاتوە، کە ئەوەش لوتف و میهرەبانیی و بەزەیی خوا دەگەیەنێ، بەرانبەر بە بەندەکانی، واتە: بەنسبەت ئەو چوارانەشەوە کە خوا لە چوار ئایەتدا، لە چوار سووڕەتدا قەدەغەی کردوون، هەر کەسێك تێگیراو ناچاربوو لێیان بخوات، واتە: لە مردارو، لە خوێن و، لە گۆشتی بەرازو، لە بۆ جگە لە خوا سەربڕاویش، ئەوە گوناهی ناگاتێ.

## حیکمەتی جیاوازی تەعبیری چوار ئایەتەکە

شایانی باسە کە حەرامکردنی ئەو چوا خواردنە پیس و زیانبەخشانە، کە لە چوار شوێنی قورئان دا هاتوە، لە هەر شوێنەی بە شێوەیەك هاتوە، ئەویش زۆر حیکمەتی تێدان، بەلام ئێمە بوارمان نیە زۆر لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە بە دوای ئایەتەکان بکەوین و، خوێنەرانی کوردیش ڕەنگە زۆر سوودی لێ نەبینن:

١ - لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٧٣﴾.

٢ - وە لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣﴾.

٣ - وە لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٤٥﴾.

٤ - وە لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١١٥﴾.

وەك دەبینین: لە هەر جێیەی بە تەعبیرێك هاتوە :

١) لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: هەر كەسێ ناچاربوو بە مەرجێك نە ئەهلی (بغي) بێ، نە ئەهلی (عدوان) بێ، (غَيۡرَ بَاغٖ ) واتە: بە ئارەزووەوە نەبێ، (بغي) لێرەدا بە مانای دەستدرێژیی‌و سنوورشكێنیی نیە، بەڵكو بە مانای ئەوەیە بە ئارەزووەوە نەخوات، (وَلَا عَادٖ ) وە تێشنەپەڕێنێ، یانی: لە ئەندازەی پێویستیی‌و پەك لەسەركەوتنی ﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ﴾، گوناهی لەسەر نیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾، خوا لێبوردەی بە بەزەییە، واتە: ئەگەر ئینسان تیبگیرێ لە نێوان مردن لەبرسان، یاخود خواردنی گۆشتی بەرازو مردارو خوێن دا، ئەوە دەتوانێ لەوانە بخوات.

٢) وە لە سوورەتی (المائدة)دا فەرموویەتی: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ﴾، یانی: وە هەركەس ناچار كرا، لە برسیەتییەكی زۆردا، لێرەوەش بۆمان دەردەكەوێ، كە ئەو حاڵەتی ناچاریی (إضطرار)ە، برسیەتیی زۆرە، چونكە (مخمصة) ئەوەیە كە ئینسان زگی بە پشتیەوە نوسابێتەوەو ماوەیەكی زۆر هیچی نەخواردبێ‌و، زۆر تینی بۆ هاتبێ‌و سەغڵەت بووبێ ﴿غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ﴾، یانی: مەیلی بەلای گوناهدا نەكردبێ، ئەمەش ئەوە ڕووندەكاتەوە

کە دەفەرموێ: ﴿غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ﴾، یانی: ڕستەی : نە بە ئارەزووەوە بخوات، نە لە سنوور تێپەڕێنێ، یانی: بەلا گوناهدا نەشکابێتەوە، کەواتە: ﴿غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ﴾، مەبەستی ئەوەیە کە بە ئانقەست نەخوات، بۆئەوەی گوناهبار بێ، بەڵکو دەبێ زۆری بۆبێ‌و ناچاربێ.

٣) هەروەها لە سوورەتی (الأنعام) دا فەرمووی: ﴿فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، بێگومان پەروەردگارت لێبوردەی بە بەزەییە.

٤) وە لە سوورەتی (النحل)یش دا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

کەواتە: لە کاتی تێگیران‌و ناچارییدا، خوا ﷻ هەم وەك (خوا) و هەم وەك پەروەردگار میهرەبان‌و لێبوردەو بە بەزەییە، بەرانبەر بە کەسانێکی بێچارەو بێ دەرەتان، کە لەو شتە قەدەغانە بخۆن.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ١٤٦﴾، وە لەسەر ئەوانەی جوولەکەن، بەزو چەوریی هەموو خاوەن نینۆکێك لە ڕەشەوڵاخ‌و حەیوانی ورد، (مەڕو بزن)مان لێ قەدەغەکردبوون، مەگەر ئەوەی بە پشتیانەوە نووساوە، یان بە ڕیخۆڵەکانیانەوە، یاخود بە ئێسقانی دیکەوە نووساوەو لێی جیا نابێتەوە، ئەوەش بەهۆی سنوورشکێنییان سزامان دان، وە ئێمە ڕاستگۆین.

لەم ئایەتە موبارەکەدا خوا ڕایدەگەیەنێ کە بەهۆی لادان‌و خراپەکارییەوە، نەك بەهۆی ئەوەوە کە زیانبەخشن، دوو جۆرە شتی لە جوولەکەکان قەدەغە کردوون:

**یەکەم** : هەموو ژیانداریّکی نینۆکدار، چ ئـاژەڵ بێ، چ پەلـەوەر، جا دیارە (ظفر) بە (أظفار وأظافير) کۆدەکرێتــەوە، وە (محمد الطاهر بن عاشور) لە (التحرير والتنوير)[1]دا دەربــارەی وشــەی (ظفـر) دەڵــێ: (الظـُّفْرُ: العَظْمُ الَّـذِي تَحْتَ الجِلْـدِ فِـي منتهـى أَصَابع الإِنْسَـان والحَيـوَان والـمَخالب، وَهُـوَ يقابـل الحَـافِر والظـِّلْفَ وَيَكُـونُ للإِبـلِ والسَّبُع والكَلْـبِ والـهِرِّ والأَرْنَـبِ وَالـوَبْر وَنَحْوِهَـا)، واتـە: (ظفـر) بريتيـە لـەو ئێسقانەی کـە لـە ژێــر پێســت دايـە لـە کۆتـايی پەنجـەکانی ئينسـان، (پەنجـەی پێ، يان پەنجەی دەست) وە ئاژەڵ.

وە چڕنووکی ئـاژەڵو پەلـەوەر، لە بەرانبـەر نینـۆكو سـم دايـە، وە حوشـترو دڕنـدەو سـەگو پشيلەو کەروێشكو وەبـرو[2] هـاووێنـەيان، هەيـانە.

حەيـوانی يەك سـم، وەك ئەسـپو مايـنو هێسـتـرو کـەر کـە سميـان شــەق نيـە، بەڵام سـمی ئەوانـی ديکە وەك: مانگـاو مـەڕو بـزن، بـە عەرەبــيی (ظِلْف)ی پێ دەڵێن، کە دوو لەتـەو، بە کـورديی دوو سـمی پـێ دەڵـێن، ئنجـا ئــەو (ظفـر)ە چۆنـەو چييـە؟ هی حوشـتـرە، هی دڕندەيە، هـی ســەگو پشـيلەو کەروێشــکە... هتد؟ (محمد متولي الشعراوي) ڕەحمەتی خـوا لە هـەموو توێـژەرەوانی قورئــان بــێ، لە تەفسـيـرەکـەی خۆی دا بەنـاوی (الخـواطر) دەڵێ: (الظُفُر: هُوَ مَا يَظْـهَرُ عِنْـدَمَا نَنْـظُر إِلــى أَقْـدَام بَعْـضِ الحَيوَانَـاتِ أَو الطّيـوُر، فَهُنَـاكَ حَيوَانَـات نَجِـدُ تَشـقّق أُصْبُعِهَا ظَاهِرَاً والأَصَابِعُ مُنْفَصِلَةٌ ومُنْفَرِجَـةٌ بَعْضُهَا عَنْ بَعْض، فَـهَذِهِ لَيْسَت حَـرَامَاً عَلَيهِم، وَنَوْعٌ آخَـر نَجِدُ أَصَـابعُهَا غَيْـر مفصولَةِ وَغَيْـر مُنفرجَـة، مِثْـل: الإِبْـل، وَالنعـام، والبـط، والأَوَّز، وهـي ذو الظفـر)[3]، واتـە: (ظُفُـر) بريتيـە لـەوەی کـە بۆمـان دەردەکـەوێو دەيبيـنين لـە کاتێکـدا تەماشـای پێی هـەندێ لە

١) ج ٤ ، ص: ١٤٢.

٢) الوَبْـرُ: حيـوان مـن ذوات الحوافـر فـي حجـم الأرنـب، أَطْحَـلُ اللَّـون، أي بيـن الغَبْـرُة والسَّواد قصيـرُ الـذَّنَـبِ.... المعجـم الوسـيط، ص : (١٠٠٨)، ئەمــە: نـازانم بـە کـورديی چـی پێدەڵێــنو ڕەنگە لە کوردستان دا هـەر نەشبێ.

٣) ج ٧ ، ص: ٣٩٧٧.

ئـاژەڵو باڵنــدەكان دەكـەین، هەنـدێك ژیانـدار هـەن تەماشـا دەكـەین (ژیانـدار مەبەستم پـێ ئاژەڵو پەڕندەیە) پەنجەكانیـان دیارنو لـە یـەك جیـان، وەك هـی مریشـكو كـەوو قەلو كۆتـر، دیارە پەنجـەكانیـان لە یەك جیانو لە یـەك بـڵاون، ئەمانەیان لـێ قەدەغە نەبووە، بـەڵام جۆرێكی دیكـە هەیـە كە پەنجەكـانیان لـە یـەك جیانیــن، بەڵـكو پێكـەوە لكـاون، وەك هــی حوشــتـر، (حوشـتــر خوففـی هەیــەو هـــەمووی پێكـــەوەیە)، وە حوشــتــرمـــەلو، مراوییـــو قــاز، ئەوانــە پێیانـدەگـوترێ: خاوەن نینۆك (ذو الظفر).

واتە: ئەوەی كە پەنجەكانی پێی پێكەوە لكاون. كەواتە: جولەكـەكان ئەوانـەیان لـێ قەدەغە بووە، ئەویش نەك لەبەرئەوەی زیانبەخشن، بەڵكو وەك سـزادانیـان.

**دووەم** : جـۆری دووەمـی ئـەو شــتانەی كە لێیان قەدەغـە بوونی، بریتـی بـووە لـە (بـەز)، كـە دوای ئـەوەی قاڵ دەكرێتـەوە، پێـی دەگـوترێ: پیـو، بـە عەرەبیــی پێـی دەگوتــرێ: (شـحم) كــە جۆرێــكە لــە چــەوری، دیـارە جوولەكـە هـەموو بـەزو چەوریــی ڕەشــەوڵاخو مـەڕو بزنیـان لــێ قەدەغــە بـووە، جگـە لـەوەی كـە بـە پشــتیانەوە لكــاوە، یاخــود لەگــەڵ ڕیخۆڵەكـانیـان تێكــەڵ بـووە، یـان لەگـەڵ ئێسقانی دیكەدا تێكەڵ بووەو، لەیـەك جیا ناكـرێتـەوە.

﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ ﴾، ئنجـا بــە تەفسیــركردنی ئــەم ئایەتــە لــە دوو ئایـەتی دیكـەی ســوورەتی (النسـاء) حـاڵــی دەبـین، كـە خـوا لەوێـدا دەفەرمـوێ:

﴿ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ١٦٠ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ وَأَكۡلِهِمۡ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ١٦١ ﴾، واتــە: بەهــۆی ســتەم كردنــی ئەوانـەی كە جوولەكـە بوون هەندێ لە خـواردنی خۆشو بـەتام كـە پێشــتـر بۆیـان حـەڵاڵ بـوون، بەهـۆی ستەمو زوڵـم دەستدرێژییانــەوە، لێمـان قەدەغـەكردن، وەك

لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡ ﴾، لێرەدا (بغـي)، لەوێش (ظُلْم) دیارە (ظُلْم)[1] و بغي[2])یش واتایان لە یەك نزیكە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴾، وە بەهۆی ئەوەوە كە خەڵكیان زۆر لەسەر ڕێگای خوا لادەدا، ﴿ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ ﴾، وە بەهۆی ئەوەوە كە ڕیبایان وەردەگرت، كە لێشیان قەدەغەكرابوو، ﴿ وَأَكۡلِهِمۡ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾، وە بەهۆی ئەوەوە كە ماڵی خەڵكیان بە ناهەق دەخوارد، لەبەر ئەو ستەمانەو، لەبەر ئەو سنوور شكێنییانە، هەندێ شتی خۆش و بەتامیان لێ قەدەغە كردبوون.

ئنجا ئایا ئەو شتە خۆش و بەتامانە چین؟ لە سوورەتی (النساء)دا نەیفەرموە، بەڵام لە سوورەتی (الأنعام)دا فەرموویەتی و ڕوونی كردۆتەوە، بۆیە لە قورئاندا یەك وشەی زیادیش نیە، خوا بە پێویستی نەزانیوە لە سوورەتی (النساء)دا دووبارەی بكاتەوە، چونكە لە سوورەتی (الأنعام)دا، كە ئایەتەكە دابەزیوە، ڕوونی كردۆتەوە، كە چی لێ قەدەغە كردوون ؟

كە دوو جۆرە شت بوون :

١/ پەلەوەرو ئاژەڵی نینۆكدار.

٢/ بەزو چەوریی ڕەشەوڵاخو مەڕو بزن.

---

١) الظلم : وضع الشيء في غير موضعه ، مختار الصِّحاح، ص: ٤٠٥.

٢) البغي : مجاوزة الحدَّ ، مختار الصِّحاح، ص: ٥٩.

لێرەدا توێژەرەوانی قورئان پرسیارێك دەكەن، دەڵێن : بۆچی خوا ئەو دوو شتە خۆش‌و بەتامانەی لێ قەدەغە كردوون، بەتایبەت چەورییەكە ؟

وەڵام: ئەوانە ملهوڕ بوون‌و، سنوورشكێنییان كردوە، بۆیە خوای كاربەجێ خواردنی خۆش‌و بەتامی لێ قەدەغەكردوون، بەتایبەتی چەوریی، تاكو لەو ملهوڕیی‌و یاخیی بوونەیان كەم بكاتەوە.

ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا كە جوولەكەكان دەیانگوت: ئێمە هیچ شتێكمان لێ قەدەغە نەكراوە: (إِنَّ اللّٰهَ لَمْ يُحَرِّمْ عَلَيْنَا شَيْئًا، وَإِنَّمَا حَرَّمْنَا عَلَى أَنْفُسِنَا اقْتِدَاءً بيعقُوب فِيمَا حَرَّمَهُ عَلَى نَفْسِهِ)، واتە: خوا هیچ شتێكی لە ئێمە قەدەغە نەكردوە، (وەك سزادان)، بەڵكو بۆخۆمان هەندێ شتمان لەخۆمان قەدەغەكردوە، وەك چاولێكردنمان لە یەعقووب (بابی یوسف) چونكە یەعقووب ئەو شتانەی لەخۆی قەدەغەكردبوون، ئێمەش ئەو شتانەمان لەخۆمان قەدەغەكردوون، وەك ڕێزلێگرتنی‌و شوێن پێ هەڵگرتنی !

بەڵام ئەوە ڕاست نیە، بۆیە خوا بۆ بەرپەرچدانەوەیان دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾، ئاوا سزامان دان، بەهۆی دەستدرێژیی‌و سنوورشكێنییانەوە، وە ئێمە ڕاستگۆین. واتە: جوولەكەكان ڕاست ناكەن كە دەڵێن: یەعقووب ئەو شتانەی لەخۆی قەدەغە كردوون، ئێمەش بەدوای یەعقووب كەوتووین ، بۆیە ئەو شتانە ناخۆین‌و لەخۆمانیان قەدەغە دەكەین، نەك خوا سزای دابین، خواش ﷻ دەفەرموێ: نەخێر وانیە، بەڵكو بەهۆی ستەم‌و لادانیانەوە، سزامان دان، وە ئێمە ڕاستگۆین.

ئنجا با تەماشا بكەین، بزانین یەعقووب چی لەخۆی قەدەغەكردوە؟ ئایا جوولەكەكان ڕاستدەكەن، كە یەعقووب گۆشتی ئاژەڵ‌و پەلەوەری نینۆكدار، وە بەزو چەوری ڕەشەوڵاخ‌و مەڕو بزنی لەخۆی قەدەغەكردوە؟ نەخێر، چونكە خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ

﴿فَأْتُلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾﴾، هەموو خـواردنەكان بـۆ وەچـەی ئیسرِائیل حەڵاڵ بوون، جگە لەوەی ئیسرِائیل، (واتە: یەعقووب) لەخۆی قەدەغە كردبوو، پێش ئەوەی تەورِات بێتە خوارێ، بڵێ: تـەورِات بێـنن و بیخوێننـەوە، ئەگەر راسـت دەكەن.

لـەوبـارەوە بەسـەرهاتێـك هەیـە كـە تۆزێـك درێـژە، بـەڵام كۆمەڵـە شـتێكی دیكەشـی تێـدان، سوودبەخشـە بیگـێرینـەوە: ﴿عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاس رضي الله عنه حَضَـرَتْ عِصَابَةٌ مِـنَ الـيَهُودِ نَبِـيَّ اللهِ ﷺ يَوْمـاً فَقَـالُوا: يَـا أَبَـا الْقَاسِـمِ! حَـدِّثْنَا عَـنْ خِـلالٍ نَسْـأَلُـكَ عَنْهُنَّ لا يَعْلَمُهُنَّ إلاَّ نَبِـيٌّ، قَـالَ: سَـلُونِي عَـمَّا شِئْتُمْ، وَلَكِـنْ اجْعَلُـوا لِـي ذِمَّةَ اللهِ وَمَـا أَخَذَ يَعْقُـوبُ عَلَيْـهِ السَّلام عَلَـى بَنِيـهِ لَئِـنْ حَدَّثْتُكُمْ شَيْئَاً فَعَرَفْتُمُـوهُ لَتُتَـابِعُنِّي عَلَـى الإِسْـلامِ، قَـالُوا: فَـذَلِكَ لَـكَ، قَـالَ: فَسَلُونِي عَمَّا شِـئْتُمْ، قَـالُوا: أَخْبِرْنَا عَنْ أَرْبَعِ خِلالٍ نَسْـأَلُـكَ عَنْهُنَّ: أَخْبِرْنَا أَيُّ الطَّعَامِ حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَـى نَفْسِـهِ مِـنْ قَبْـلِ أَنْ تُنَـزَّلَ التَّـوْرَاةُ؟ وَأَخْبِرْنَـا كَيْـفَ مَـاءُ الْمَـرْأَةِ وَمَـاءُ الرَّجُـلِ؟ كَيْـفَ يَكُـونُ الذَّكَـرُ مِنْهُ؟ وَأَخْبِرْنَا كَيْفَ هَذَا النَّبِيُّ الأُمِّـيُّ فِـي النَّوْمِ، وَمَـنْ وَلِيُّـهُ مِـنْ الْمَلائِكَةِ؟ قَالَ فَعَلَيْكُمْ عَـهْدُ اللهِ وَمِيثَاقُهُ لَئِنْ أَنَـا أَخْبَرْتُكُـمْ لَتُتَـابِعُنِّي، قَـالَ: فَأَعْطَوْهُ مَـا شَـاءَ مِـنْ عَهْـدٍ وَمِيثَـاقٍ، قَـالَ: فَأَنْشُـدُكُمْ بِالَّـذِي أَنْـزَلَ التَّـوْرَاةَ عَلَـى مُوسَـى عليه السلام هَـلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ إِسْرَائِيلَ يَعْقُوبَ عليه السلام مَرِضَ مَرَضَاً شَدِيداً، وَطَـالَ سَقَمُهُ، فَنَذَرَ لِلَّـهِ نَذْرَاً لَئِنْ شَفَاهُ اللَّهُ تَعَـالَى مِـنْ سَقَمِهِ لَيُحَـرِّمَنَّ أَحَـبَّ الشَّـرَابِ إِلَيْـهِ وَأَحَـبَّ الطَّعَـامِ إِلَيْـهِ، وَكَـانَ أَحَبَّ الطَّعَـامِ إِلَيْـهِ لُحْمَـانُ الإِبِلِ، وَأَحَـبَّ الشَّرَابِ إِلَيْـهِ أَلْبَانُهَـا؟ قَـالُوا: اللَّهُـمَّ نَعَـمْ، قَـالَ: اللَّهُـمَّ اشْـهَدْ عَلَيْهِمْ، فَأَنْشُـدُكُمْ بِـاللهِ الَّـذِي لا إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ الَّـذِي أَنْـزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ مَـاءَ الرَّجُـلِ أَبْيَضُ غَلِيظٌ، وَأَنَّ مَـاءَ الْمَـرْأَةِ أَصْفَرُ رَقِيـقٌ، فَأَيُّهُمَـا عَـلا كَـانَ لَـهُ الْوَلَـدُ، وَالشَّبَهُ بِـإِذْنِ اللهِ، إِنْ عَـلا مَـاءُ الرَّجُـلِ عَلَـى مَـاءِ الْمَرْأَةِ كَـانَ ذَكَـرَاً بِـإِذْنِ اللهِ، وَإِنْ عَـلا مَـاءُ الْمَـرْأَةِ عَلَـى مَـاءِ الرَّجُـلِ كَـانَ أُنْثَـى بِـإِذْنِ اللهِ، قَالُوا: اللَّهُـمَّ نَعَـمْ، قَـالَ: اللَّهُـمَّ اشْـهَدْ عَلَيْهِمْ، فَأَنْشُـدُكُمْ بِالَّـذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَـى مُوسَـى، هَـلْ تَعْلَمُـونَ أَنَّ هَـذَا النَّبِـيَّ الأُمِّـيَّ تَنَـامُ عَيْنَـاهُ وَلا يَنَـامُ قَلْبُـهُ، قَـالُوا: اللَّهُمَّ نَعَـمْ، قَـالَ: اللَّهُمَّ اشْـهَدْ، قَالُوا: وَأَنْـتَ الآنَ فَحَـدِّثْنَا مَـنْ وَلِيُّـكَ مِـنَ الـمَلائِكَةِ فَعِنْدَهَـا نُجَامِعُـكَ أَوْ نُفَارِقُـكَ؟ قَـالَ: فَإِنَّ وَلِـيِّي جِبْرِيـلُ عَلَيْـهِ السَّلام وَلَـمْ يَبْعَثْ اللهُ نَبِـيَّاً قَـطُّ إِلاَّ وَهُـوَ وَلِيُّـهُ، قَـالُوا: فَعِنْـدَهَا نُفَارِقُـكَ، لَـوْ كَـانَ وَلِيُّـكَ سِوَاهُ مِـنَ

الـمَلائِكَةِ لَتَابَعْنَـاكَ، وَصَـدَّقْنَاكَ، قَـالَ: فَمَـا يَمْـنَعُكُمْ مِـنْ أَنْ تُصَـدِّقُوهُ، قَـالُوا: إِنَّـهُ عَدُوُّنَـا، قَـالَ فَعِنْـدَ ذَلِـكَ ، قَـالَ اللهُ عَـزَّ وَجَـلَّ: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ البقـــرة[1]، واتـە: عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بـێ، بۆمـان دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: کۆمـەڵێك لـە جوولەکـەکان هاتنـە لای پێغـەمبەر ﷺ گوتیـان: هـەواڵمان پێبدە بـە چـەند شـتێك لێت دەپرسین: مەگـەر کەسێك کـە پێغـەمبەری خـوا بـێ، ئەگـەرنا هیـچ کەس وەڵامیان نازانـێ، {چوار شـت بوون}.

فەرمووی: ئەوەی کـە دەتـانەوێ، لێـم بپرسـن، بـەڵام بەڵـێنی خـوام پێبـدەن، وە ئەو بەڵێنەی کە یەعقووب لە کوڕەکانی وەرگرت، کـە لـەدوای ئـەو بێجگـە لـە خـوا هیچی دیکە نەپەرستن، ئەگـەر شـتەکەم پێگوتنو زانیتـان قسـەکەم ڕاسـتە، شـوێنـم بکـەون لــە ئیســلامەتییدا، گوتیــان: ئــەوەش مافــی تۆیــەو بەڵێنــت پێــدەدەین، فەرمـووی: دە ئێسـتا چیتـان دەوێ لـێـم بپرسـن.

گوتیـان: هـەواڵـمـان پێبـدە دەربـارەی چـوار شـتـان :

١/ هەواڵـمـان پێبـدە دەربـارەی ئـەو خــواردنەی کـە ئیسـڕائیل (واتـە: یەعقـووب) لەسـەر خـۆی قەدەغـەی کردبـوو.

٢/ وە هەواڵمان پێبدە دەربـارەی ئـاوی ئـافرەتو ئـاوی پیـاو، (واتـە: تـۆوی ئـافرەتو تۆوی پیـاو)، وە چۆن نێرو مێیان لـێ پەیدا دەبــێ ؟

٣/ وە هەواڵمان پێبدە ئـەو پێغـەمبەرە نەخوێنـدەوارە، ئایـا لـە کـاتی خـەودا حاڵـی چۆنــە ؟

٤/ وە هەواڵـمـان پێبـدە ئەو پێغـەمبەرە لەنێـو فریشـتەکاندا کـێ دۆسـتیـەتیو، دێ بۆ لای ؟

١) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد، برقم: (٢٥١٤)، قَالَ شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَـنٌ.

پێغەمبەریش ﷺ پەیمانی لێوەرگرتن، کە ئەگەر هەواڵی پێدانو ڕاست بوو بە پێی کتێبەکەی خۆیان شوێنی دەکەون.

ئنجا فەرمووی: بەو خوایە لێتان دەپرسم، کە تەوراتی ناردۆتە خوار بۆ سەر مووسا، ئایا دەزانن کە ئیسرائیل نەخۆش بوو و نەخۆشییەکەی درێژی خایاند، دوایی لەسەر خۆی نەزر کرد (لە کوردەواریی دا بە نەزر دەڵێن : لەخۆگرتن) کە ئەگەر خوا شیفای داو چاکی کردەوە لەو نەخۆشییەی، ئەوە خۆشەویسترین خواردنەوەو خواردن، لەخۆی قەدەغە دەکات، (دیارە لە دینی ئەواندا دروست بووە، کە ئینسان شت لەخۆی قەدەغە بکات، وەك نەزر) وە خۆشەویسترین خواردن لەلای، گۆشتی حوشتر بوو، وە خۆشەویسترین خواردنەوەش لەلای شیری حوشتر بوو ؟

گوتیان: بەڵێ ئەوە ڕاستە، فەرمووی: خوایە ! شایەدبە لەسەریان ( کە ئەوە هی یەکەمم زانی)، دوایی فەرمووی: بەو خوایە کە جگە لەو هیچ پەرستراو نین، کە تەوراتی ناردۆتە سەر مووسا، لێتان دەپرسم : ئایا دەزانن کە تۆوی پیاو سپیو خەستە، وە تۆوی ئافرەت مەیلەو زەردو ڕوونە، وە هی هەرکامێکیان بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ بوو، ئەوە منداڵەکە بەویان دەچێ، (شێوەی ئەوی دەبێ)، بە ئیزنی خوا، ئەگەر ئاوی پیاو زاڵ بوو بەسەر هی ئافرەتدا، منداڵەکە کوڕ دەردەچێ، وە ئەگەر ئاوی ئافرەتەکە زاڵ بوو مێینە دەردەچێ بە ئیزنی خوا؟، {دیارە ئەو زاڵ بوونە وەك ئیعجازی عیلمیی دەرکەوتوە، کە ئاوی پیاو ڕەمزی کیمیایی کرۆمۆسۆمەکانی بریتییە لە : (X Y) بەڵام هی ئافرەت : ( X X)}[1]، گوتیان: بەڵێ، ئەوەش وایە، فەرمووی: خوایە ! شایەدبە بەسەریانەوە.

ئنجا فەرمووی: بەو خوایە داواتان لێدەکەم کە تەوراتی ناردۆتە سەر مووسا، (واتە: ئەو خوایەتان بە گژدا دەکەم) دەزانن کە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە کە دەبێ پێغەمبەری کۆتایی بێ، لە خەودا چاوی دەخەون، بەڵام دڵی هەر بێدارەو ناخەوێ؟ گوتیان: بەڵێ ئەوەش وایە، فەرمووی: خوایە ! شایەدبە بەسەریانەوە.

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادکردنی خۆمە.

گوتیان: ئێستا تۆ هەواڵمان پێبدە دۆستی تایبەتیی تۆ، لەنێو فریشتەکاندا، ئەوەی کە دێ بۆ لاتو وەحییت بۆ دێنێ، کێیە ؟ ئەگەر پێت گوتین، یان لەگەڵت دەبین‌و شوێنت دەکەوین، یاخود لێت جیا دەبینەوە.

ئەویش فەرمووی: دۆستم لەنێو فریشتەکاندا جبریلە، وە خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، هەرگیز مەگەر بە جبریلدا پەیامی بۆ ناردوە.

گوتیان: ئێستا ئێمە لێت جیادەبینەوە، ئەگەر جگە لە جبریل فریشتەیەکی دیکە دۆستی تۆ بووایە، (لە ڕیواتێکی دیکەدا گوتوویانە : ئەگەر میکائیل بووایە) شوێنت دەکەوتین، بەڵام جبریل دوژمنی ئێمەیە، ئنجا لەو کاتەدا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴿٩٧﴾ ﴾، واتە: بڵێ : هەر کەسێك دوژمنی جبریل بێ، ئەوە بێگومان جبریل ئەو کتێبەی ناردۆتە خوار بۆ سەر دڵی تۆ، بە ئیزنی خوا، کەواتە: هەر کەسێك دوژمنی جبریل بێ، دوژمنی خواشە.

بۆیە بە پێی ئەم فەرموودەیەش دەردەکەوێ کە ئەو شتانەی دیکەش، بەهۆی خراپەو ستەمیانەوە، لێیان قەدەغەکراون، دیارە یەعقووب تەنیا گۆشتی حوشترو شیری حوشتری لەسەر خۆی قەدەغەکردبوو، وەك نەزر، بەڵام ئەو شتانەی دیکە کە لە قورئانێدا هاتوون، وەك سزادانێك بووە، خوای دادگەر لێی قەدەغە کردوون.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ ﴾، ئنجا ئەگەر تۆیان بە درۆ دانا (بڕوایان بە تۆ نەکرد) پێیان بڵێ: پەروەردگارتان خاوەنی بەزەییەکی فراوانە، وە سزاشی لە کۆمەڵی تاوانباران، بەرپەرچ نادرێتەوە.

سبحان اللە لێرەدا خوای بە بەزەیی تەماعی وەبەرناون بۆ ڕەحمەتەکەی، پێش ئەوەی بە سزایەکەی بیانترسێنێ، دەفەرموێ: ﴿ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، پێیان بڵێ: پەروەردگارتان

بەزەیی زۆر فراوانە، یانی: بگەڕێنەوە بۆ لای، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾، (بأس) یانی سزا، جەزرەبە: سزای خوا بەرپەرچ نادرێتەوە، ئەگەر بۆ کۆمەڵی تاوانباران هات، ناڵێ ئێوە تاوانبارن، خۆ تاوانباریش بوون، بەڵام خوای کاربەجێ ئەوە نافەرموێ، بۆ ئەوەی دڵیان نەرم بێ و سەرنجیان ڕابکێشێ، وە تەماع و ئومێدیان بە ڕەحمەتی خوا بێ و بگەڕێنەوە، واتە: ڕەحمەت و میهرەبانیی خوا ئەوەندە فراوانە، ئێوە بەو هەموو گوناح و تاوانانەتانەوە، جوولەکەکان، یان هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکان، دەگونجێ مەبەست پێی هەردووکیان بێ، یاخود مەبەست یەکێکیان بێ، لەگەڵ ئەو هەموو گوناح و تاوان و خراپانەشتان، ڕەحمەتی خوا هێندە فراوانە، جێگای ئێوەشی تێدا دەبێتەوە، هەرچەندە خاوەن خراپەو تاوان بن، تا ئێستاش لەسەر تاوان و گوناهەکانتان بەردەوام بن، بەڵام وەختێك سزای خوا بێ، کەس ناتوانێ پێشی بگرێ و بەرپەرچی بداتەوە.

<u>**مەسەلەی چوارەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾، لەمەودوا ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای نە ئێمەو نە باب و باپیرانمان هاوبەشمان بۆ خوا دانەدەنا، وە هیچ شتێکیشمان قەدەغە نەدەکرد، هەر بەو شێوە ئەوانی پێش وانیش پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، تاکو سزای ئێمەیان چێشت، بڵێ: ئایا لەوبارەوە زانیارییتان لەلایە بۆمان بێننە دەرێ و پێشانمان بدەن !

ئەمە بە تەوسەوە خوا فەرموویەتی، دوایی دەفەرموێ: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾ ئێوە بەس بەدوای گومان دەکەون، وە بەس

درۆ دەكـەن، ڕاسـت ناكـەن.

لێـرەدا با تەماشـا بكـەین !

ئـەوان دەڵێـن: ئەگـەر خـوا ویستبای، ئێمـە نـە خۆمـانو نـە بـابو باپیرانمـان، هاوبەشـمان بۆ خـوا دانەدەنـا، وە ئەگـەر خوا ویستبای، ئەو شتانە قەدەغـە نەكەین، قەدەغـەمان نەدەكردن، كەچی خـوا دەفـەرمـوێ: هـەر ئـاوا ئەوانـەی پـێش وانیـش خـواو پێغـەمبەرانی خـوایـان بە درۆ دانـا.

لێرەدا پرسـیارێك دێتـە پێش:

بێگومان ئەوان شـتێكیان گوتـوە كە ڕاسـتـە، دەڵێن: ئەگـەر خـوا ویسـتبای ئێمـە كـافر نەدەبووین، ئنجـا ئەوەتـا خـواش بۆخـۆی فەرموویەتـی: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ۗ وَمَا جَعَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾ وە ئەگـەر خـوا ویستبای هاوبەشـیان بۆ خوا دانەدەنا... هەروەها فەرموویـەتی: ﴿ ...وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ... ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعام ، ئەگـەر پەروەردگارت ویستبای، وایانـنەدەكرد، ئەدی یانی چی، لێرەدا خـوای پەروەردگار لەسـەر ئەو قسـەیان ڕەخنـەیان لـێ دەگـرێ ؟

ئـەوە دەبـێ بـە وردیـی سەرنجـی بدەینـێ ! لـێرەدا توێـژەرەوانی قورئـان زۆر شـتیان گوتـوە، مـن تەماشـای دەوری سـی (٣٠) تەفسـیـرم كـردوەو، لەوبـارەوە زۆر شـتیان گوتـوە، منیش ئەوەی پێـم ڕاسـتو بەجێیـە، كورتو پوختـەی دەكەمـەوە :

سـەرەتـا دەڵێـین: ئـەوەی هاوبەشدانەرەكـان لێـرەدا گوتوویانـە: لـە سـوورەتی (النحـل)یشدا هـەمان شـتیان گوتـوە، لێـرەدا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ﴾، لەمـەودوا ئەوانـەی هاوبـەش بـۆ خـوادانەرن دەڵێن، هەواڵـی داوە كـە وا دەڵـێن، ئنجـا لـە سـوورەتی (النحـل)دا، ئـەوەی خـوا هـەواڵی پێـداوە هاتۆتـە دی:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ

وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٣٥﴾، دیارە سوورەتی (الأنعام) پێش سوورەتی (النحل) هاتۆتە خوارێ، لە (الأنعام)دا فەرموویەتی: لەمەودوا هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای، خۆمانو بابو باپیرمان هاوبەشمان بۆ خوا دانەدەناو، هیچ شتێكیشمان قەدەغە نەدەكرد، لە سورەتی (النحل)یشدا دەفەرموێ: وە ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، گوتیان: ئەگەر خوا ویستبای ئێمەو بابو باپیرانمان، جگە لە خوامان نەدەپەرست، وە هیچ شتێكیشمان بە بێ ئیزنی خوا قەدەغە نەدەكرد، خواش دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، ئەوانەی پێش وانیش هەر وایانكرد، ﴿ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، ئایا پێغەمبەران هیچیان لەسەرە، جگە لە گەیاندنێكی ئاشكرا؟ ئەوە لایەكی بابەتەكە، كە ئەوەی خوا هەواڵی پێداوە، لە سووڕەتی (الأنعام)دا، لە سووڕەتی (النحل)دا هاتۆتە دی.

لێرەدا خوڵاصەی ئەو مەسەلەیە ئەوەیە: كە ئەوانە مەبەستیان ئەوە بووە بڵێن: ئایا كە ئێمە هاوبەش بۆ خوا دادەنێینو كافر دەبینو شت قەدەغە دەكەین لەخۆمان، بە ویستی خوایە یان نا ؟ وەڵامەكەشی هەر ئەوەیە كە: بەڵێ بە ویستی خوایە.

ئنجا گوتوویانە: مادام بە ویستی خوابێ، كەواتە: خوا ئەو كارانەی پێ چاكن ! بۆیە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ ... كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ...﴿١٤٨﴾ ﴾ الأنعام، ئاوا ئەوانی پێش وانیش، پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، چونكە ئەوان ویستوویانە بڵێن: ئەی پێغەمبەرەكان ! ئێوە ڕاست ناكەن، كە خوا شیركو ئەو شتانەی قەدەغە كردوە، بە بەڵگەی ئەوە كە خوا ویستوویەتی ئێمە وا بكەین، ئنجا مادام خوا ویستوویەتی، كەواتە: خوا ئەو شتانەی پێ چاكن، كەواتە: نابێ لە شەریعەتو دینەكەشیدا، نە شیركی قەدەغە كردبێ، وە نە لە خۆ قەدەغەكردنی ئەو ئاژەڵو خواردنانەشی قەدەغەكردبێ !

کەواتە: ئەوەی خوا لێرەدا ڕەخنەی لێدەگرێ، لە قسەو بۆچوونی کافرەکان ئەوەیە کە هەڵساون ویستی خواو ڕەزامەندیی خوایان تێکەڵ کردوە، (الإرادة التكوينية)ی خواو (الإرادة التشريعية) [١] خوایان، تێکەڵ کردوە.

گوتوویانە: مادام خوا ویستوویەتی ئێمە کافر بین، دیارە خوا کوفری پێ چاکە، وە مادام خوا ویستوویەتی ئێمە هاوبەش بۆ خوا دابنێین، دیارە خوا هاوبەش بۆ خوا دانانی پێ چاکە، وە مادام خوا ویستوویەتی ئەو شتانە قەدەغە بکەین، کە بەبێ ویستی خوا ناکرێ، ئنجا مادام بە ویستی خوا کردوومانە، کەواتە: دیارە خوا ئەو شتانەی پێ چاکن، وە مادام خوا ئەو شتانەی پێ چاك بن، ناگونجێ لە شەریعەتی خوادا ڕەخنەمان لێ بگیرێ لەسەر ئەو شتانە !!

بەڵام ئەوە لەڕاستییدا هەڵەیەکی زۆر گەورەیە کە ئەوانە تێیکەوتوون، کە ئێستاش هەندێ لە خەڵکی مسوڵمانو خۆ بەمسوڵمان زانیش تووشی ئەو هەڵەیە دەبێ.

دەڵێین : هەموو شتێ بە ویستی خوا نییە ؟ با، دەی باشە، مادام خوا ئەو شتانەی ویستبێ، دیارە خوا لێیان ڕازییە ؟ بەڵام نا، ویستی خوا لەگەڵ ڕەزامەندیی خوا لێك جیان، ئنجا ئایا ئینسان بەهۆی چییەوە، تووشی ئەو هەڵەیە دەبێ ؟ بەهۆی قیاسکردنی خوا لەسەر خۆی، ئێمە وەك مرۆڤ ناتوانین ئیرادەی شتێك بکەین، مەگەر ڕەغبەتمان لەو شتە نەبێ، ئەگەر بەدەگمەن، دەنا بە زۆریی وایە کە ئێمە ویستو ڕەزامەندییمان یەکن، واتە: کە شتێکمان ویست، دیارە ئەو شتانەمان پێ خۆشە، ئەو شتەمان پێ چاکە، بەڵام خوا ﷻ جیایە، هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نابێ: کوفری کافران، شیرکی موشریکان، نیفاقی مونافیقان، گوناحی تاوانباران، چاکەی چاکەکاران، هەمووی بە ویستی خوایە، بەڵام بە تەئکید خوای پەروەردگار چاکەی پێخۆشەو، خراپەی پێناخۆشە، ئیمانی پێ خۆشەو، کوفری پێ ناخۆشە، بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە؟

---

١) ویستی هێنانەدیو، ویستی یاسادانا، کە ویستی هێنانەدی، ویستراوەکانی هەر دێنەدی، بەڵام ویستی یاسادانان، مەرج نیە ویستراوەکانی بێنە دی.

بەڵگەمان ئەوەیە كە خوا دەفەرمویٚ: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴿٧﴾﴾ الزمر، خوا ڕازی نیە بەندەكانی كافر بن، بەڵام ئەگەر شوكرانەی بكەن ڕازییە، واتە: خوا شوكرو ئیمانی حەز لێیە، وە كوفرو سپڵەیی، ڕق لێیە.

ئنجا خوا ئەو هەموو پێغەمبەرانەو ئەو هەموو كتێبانەی بۆچی ناردوون؟ بۆئەوەی كە تێمان بگەیەنیٚ: كە چی پیٚ خۆشەو، چی پیٚ ناخۆشە ؟ بەڵیٚ كوفرو ئیمانو خراپەو چاكە، هەمووی بە ویستی خوایە، بەڵام ئێمە ویستی خوامان لیٚ دیار نیە، بەس بە كردەوەی خۆمان، بۆمان دەردەكەویٚ، كە خوا چی لە ئێمە ویستوەو، چی لە ئێمە نەویستوە ؟ وە بەهۆی شەریعەتەكەیەوە، ڕەزامەندیی خوامان بۆ دەردەكەویٚ، تۆ بەدوای شەریعەتی خوا بكەوە، بە پێی شەریعەتی خوا دەزانی كە خوا ڕازییە لە ئیمانو چاكەو، وە نارازییە لە نیفاق شیرك خراپە.

كەواتە: ئەی كافرەكان ! ئێوە لەسەر ئەوە سزا دەدرێن، كە بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ پێغەمبەران بەدرۆ دادەنێن، كە پێتان وایە ڕاست ناكەن، لەوەدا كە پێتان ڕادەگەیەنن لە خراپیی كوفرو شیرك، وە بە حەرام دانانی شتان بەبیٚ مۆڵەتی خوا.

<u>**مەسەلەی پێنجەم**</u>: خوای پەروەردگار دوای ئەوەی بەرپەرچی هاوبەش بۆ خوا دانەرانو كافرەكانی دایەوە كە دەیانگوت: ﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ﴿١٤٩﴾﴾، ئەگەر خوا ویستبای نە خۆمانو نە بابو باپیرانمان، هاوبەشمان بۆ خوا دانەدەنا، وە هیچ شتێكیشمان قەدەغە نەدەكرد.

كە مەبەستیان ئەوەیە: هیچ شتێك لەو شتانە كە شەریعەتی پێغەمبەری خاتەم قەدەغەی كردوونو ڕەخنەیان لیٚ دەگریٚ، نەدەبوو قەدەغە بكرێن، خوای زاناو شارەزاش لە وەڵامیاندا فەرمووی: ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا﴾، هەروا بەو شێوەیە، (واتە: وەك ئەوان)، ئەوانی پێش وانیش پێغەمبەرانی خوا، یاخود پەیامی خوایان بە درۆ داناوە، تاكو سزای

ئێمەیان چێشت، ﴿قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ﴾، پێیان بڵێ: ئایا زانیارییتان لەلایە، پێشانمان بدەن، بۆمان دەربێنن.

پاشان چییەت (ماهیة)ی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، دەخاتەڕووو دەفەرموێ: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ﴾، ئێوە بەس شوێن گومان دەکەون، وە تەنیا درۆ دەکەن، لەچی دا درۆ دەکەن ؟ ئایا لەوەدا درۆ دەکەن کە دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای، هاوبەشیان بۆخوا دانەدەنا؟ وە ئەگەر خوا ویستبای شتیان لەخۆیان قەدەغە نەدەکرد؟ بێگومان نەخێر، چونکە بێگومان بەبێ ویستی خوا، هیچ کەس نە ئیمان دێنێ، نە کافر دەبێ، وە نە شت قەدەغە دەکات، نە چاکە، دەکات، نە خراپە، دەکات.

ئەدی لە چیدا خوای کارزان بە درۆزنیان دادەنێ ؟ لەوەدا کە ئەوان مەبەستیان ئەوە بووە : هەر شتێك خوا لە ئێوەی ویستوە دیارە لە لاشی پەسەندە، هەر شتێك خوا ویستوویەتی ئێمە بیکەین، لە شیرکو، لە بە حەرام دانانی ئەو شتانەی کە نابێ حەرام بکرێن، دیارە خوا ئەو شتانەی پێ پەسەندن ! خواش دەفەرموێ: نەخێر، ئێوە درۆ دەکەن، ئەوە ڕاست نیە، کە خوا هەر شتێکی ویستبێ، لە لاشی پەسند بێ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ﴾، بلێ: بێگومان خوا بەڵگەی تەواوی هەیە، واتە: بەڵگەی تەواوی هەیە لەسەر بەندەکانی کە ستەمیان لێ ناکات، وە بەڵگەی تەواوی هەیە لەسەر بەندەکانی، کە ئازادی کردوون، بە ویستی ئازادانەی خۆیان ئیمان دێنن، یان ناهێنن، چاکە دەکەن، یان خراپە دەکەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾، بلێ: خوا بەڵگەی تەواوی هەیە، واتە بەڵگەکە گەیشتۆتە ئەوپەڕیو، گەیشتۆتە کۆتایی مەنزڵ، ئەگەر ویستبای بە زۆر واتان لێ بکات بڕوا بێنن، هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست .

لێرەدا ڕستەی ﴿لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾، مەبەست پێی ڕێنمایی کردن نیە، چونکە خوا هەموومانی ڕێنمایی کردوە، وەك ڕێگا بۆ ڕوونکردنەوەو ڕێ پێشاندان، بەڵکو پێی : مەبەست خستنە سەر ڕێیە، چونکە هیدایەت دوو جۆرە:

یەکەم: ئەوەیە کە خوا ڕێ پێشانی هەندێ خەڵك بدات، ئەوە دیارە پێشانی کافرو مسوڵمانی داوە.

دووەم: ئەوەیە کە بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست، کە ئەوە تایبەتە بە ئەهلی ئیمانەوە، خوا دەفەرموێ: ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، یانی چی؟ یانی: ئەگەر ویستبای زۆرتان لێ بکات، بە زۆر هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام نەیویستوە زۆرتان لێ بکاتو ویستوویەتی ئازادتان بکات، ئنجا کە ئازادی کردوون، هەندێکتان ڕێی ڕاستتان گرتوەو هەندێکیشتان ڕێی چەوت.

کەواتە: لێرەدا خوا کە دەفەرموێ: ئێوە درۆ دەکەن، یانی : کە ئەو شیرکو گوناهو خراپەیەی ئێوە لەسەرینی، لەلای خوا پەسەند بێو شتێکی باشو خۆشویستراو بێ، ئەوە وانیە لەوەدا ڕاست ناکەن.

بەڵام کە دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەگەر خوا ویستبای، واتە: ئەگەر خوا ویستبای زۆرتان لێ بکات، دەیتوانی زۆرتان لێ بکات، بەڵام ویستوویەتی ئازادتان بکات، کە ئازادیشی کردوون، هەندێکتان ڕێی ڕاستتان گرتوە: ڕێی تەنیا خواپەرستییو چاکە، هەندێکیشیتان ڕێی چەوتتان گرتوە: ڕێی شیركو گوناهو تاوان.

ئنجا ئێرە یەکێکە لەو شوێنانەی کە توێژەرەوانی قورئان زۆر تێیدا کەوتوونەتە مشتومڕەوە، چونکە: لەلایەکەوە: ئەو هاوبەش بۆخوا دانەرانە دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای ئێمە هاوبەشمان بۆ خوا دانەدەناو، هیچ شتێکمان قەدەغە نەدەکرد، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: درۆ دەکەن، ئنجا ئایا لەوەدا درۆ دەکەن، کە هەموو شتێك بە ویستی خوایە؟ نەخێر، لەوەدا درۆ ناکەن، بەڵام ئەوان مەبەستیان ئەوەبوو کە: خوا ویستوویەتی ئێمە هاوبەشی بۆ دابنێینو، ویستوویەتی ئێمە گوناه بکەین، کەواتە: مادام ئەوەی لە ئێمە ویستوە، دیارە

پێی خۆشبووەو پەسەندیشی کردوە، خوای بەرزو مەزن لەوەدا دەفەرموێ: درۆ دەکەن، واتە: مەرج نیە هەرچی خوا ویستی، پەسندی بێو خۆشیبوێ !

ئەدی ئایا ئێمە بە چی دەزانین شتەکان کامیان لەلای خوا خۆشویستراوەو پەسندە؟ وە کامیان ناخۆشویستراوەو ناپەسندە؟ بەهۆی شەریعەتەکەیەوە دەزانین، نەك لەبەرئەوەی خوا ویستوویەتی، خوا هەموو شتێکی ویستوەو، هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نایەتەدی، بەڵام بۆ دیارییکردنی ئەوە کە کام لەو شتانەی ویستوونی، لەلای خۆشەویستن، ئاوێنەی ئەوەو سەنگی مەحەكو تەرازووی ئەوە، بریتیە لە شەریعەت، ئێمە تەماشای شەریعەتەکەی دەکەین، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ﴿٧﴾﴾الزمـر، واتە: خوا کوفر بۆ بەندەکانی پەسند ناکاتو پێی چاك نیە، بەڵام ئەگەر سوپاسی خوا بکەن، سوپاسگوزاربن، شوکرانە بژێر بن، خوا پێی خۆشەو پێی ڕازییە.

کەواتە: بەهۆی شەریعەتەوە ئێمە دەزانین ڕەزامەندیی خواو خۆشویستنی خوا، لە کوێیەو، وە تووڕەیی خواو ڕازی نەبوونی خوا، لە کوێیە، نەك بیانوو بە ویستی خوا بگرین.

ئنجا ئەوە بۆیە زۆر تیشکی دەخەمە سەر، چونکە هەندێك خەڵك ئێستاش زۆرجار بیانوو بە ویستنی خوا دێنێتەوە: خوا ویستی لەسەر نەبووە، ئەو شتە ببێ، یان ئەو شتە نەبێ، کەواتە: خوا پێی چاکە؟ نەخێر، وەك گوتم: ئەوە هەمووی بریتیە لە قیاسکردنی خوا لەسەر خۆمان، ئێمە هەر شتێکمان ویست بە زۆریی وایە پەسەندیش دەکەین، وە هەر شتێکمان نەویستو ئیرادەمان ڕووی تێنەکرد، بەزۆریی وایە خۆشمان ناوێ، بەڵام بەنسبەت خوای پەروەردگارەوە، وانیە، چونکە ناگونجێ هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا پەیدا بێ، هەموو شتێك بە پێی ویستی خوا پەیدابێ، هەموو شتێك بەویستی خوایە، بەڵام لە شتە ویستراوەکانی خوادا، کامیان خۆشویستراوە بۆ خوا، کامیان بوغزێنراوە؟ دەبێ تەماشای شەریعەت بکەینو بەهۆی شەریعەتەوە، خۆشویستراوو ناخۆشویستراوەکانی خوامان بۆ دەردەکەون.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَاءَكُمُ الَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ اللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ۚ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ

كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ﴾،

خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، بڵێ: بێنن ئەو شایەدانەتان کە شایەدیی دەدەن: خوا ئەو شتانەی قەدەغە کردوون، ئنجا ئەگەر ئەوان شایەدییاندا، تۆ شایەدییان لەگەڵ مەدە، وە شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دادەنێن، وە ئەوانەی کە بڕوایان بە دوارۆژ نیە، وە لەگەڵ خوادا دروستکراوەکانی خوا یەکسان دەکەنو، دەیانهێننە ڕیزی خوا.

چونکە شیرك یانی چی؟ ئەوەیە کە هەندێ لە دروستکراوەکان بهێنیە ڕیزی خوا، یانی: وەك چۆن خوا دەپەرستی، ئەوانیش بپەرستی.

کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ﴾، وشەی (هَلُمَّ ) لە زمانی عەرەبییدا، یانی: (هاتِ)، بیهێنە، یان (هاتُوا)، بیهێنن (احْضِروا) ئامادەی بکەن، ﴿ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَـٰذَا ﴾ ئەو شایەدانەتان بێنن کە شایەدیی دەدەن، خوا ئەو شتانەی قەدەغە کردوون، ﴿فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ﴾، ئەگەر ئەوان شایەدییان دا، تۆ شایەدییان لەگەڵ مەدە، چونکە شایەدیی بە درۆ دەدەن، تۆش (ئەی موحەممەد ! ﷺ) شایەدیی بە هەقو دادگەریی نەبێ نادەی، کەواتە: تۆ لەگەڵ ئەوان دا شایەدیی مەدە.

لێرەدا خوا لەجیاتی ئەو تەفصیلەی بداتێو بفەرموێ: ئەگەر ئەوان شایەدییان دا، ئەوان تەنیا شایەدیی بە درۆ دەدەن، تۆش شایەدیی بە درۆ نادەی، کەواتە: لەگەڵیان ئامادە مەبە، یەکسەر فەرموویەتی: ئەگەر شایەدییاندا، تۆ شایەدییان لەگەڵ مەدە.

وە دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾، وە شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، کە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نیەو بڕوایان بە دوارۆژنیە، وە

دروستکراوەکان لەگەڵ خوادا یەکسان دەکەن، کەواتە: ئەوانە چوار عەیبیان هەن:

١ - ئەوەیە کە دوای ئارەزووویان دەکەون.

٢ - ئایەتەکانی خوا بە درۆ دادەنێن.

٣ - بڕوایان بە دواڕۆژ نیە.

٤ - دروستکراوەکان لەگەڵ خوادا یەکسان دەکەن.

کەواتە: کەسانی وا، تۆ شایستە نی شوێنیان بکەوی.

لە کۆتایی ئەم دەرسەدا دەمەوێ ئاماژە بە دوو بابەتی گرنگ بکەم هەرچەندە پێشتریش، قسەمان لەبارەوە کردن :

**بابەتی یەکەم: حەڵاڵو حەڕام سنووردارە :**

ئەو ئایەتانەی ڕابردن بە زۆریی باسی حەڵاڵو حەڕامو بوون، ئێمە پێویستە وەك مسوڵمان بزانین: خوا ﷻ هیچ شتێکی قەدەغە نەکردوە، زیانبەخش نەبێ، وە هیچ شتێکیشی حەڵاڵ نەکردوە، کە سوودبەخش نەبێ، بەڵام سوننەتی خوا وایە هەمیشە ئەو شتانەی کە کەمن ـ کە بێگومان هەمیشەش حەڕامو قەدەغەکان کەمینەن ـ سەرژمێریان دەکات، بۆئەوەی هەرچی مایەوە، دیاربێ کە هەموویان حەڵاڵن.

بۆ وێنە : لە بواری خواردنەکان دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: تەنیا ئەو چوار شتە قەدەغەن: مردارو، خوێنی ڕژاوو، گۆشتی بەرازو، بۆ جگە لە خوا سەربڕاو، کەواتە: هەرچی دەمێنێتەوە لە ئەسڵدا ڕەوایەو موباحە، بەڵام بەمەرجێك کە زیانبەخش نەبێو، ئینسان بەهۆیەوە تووشی زەرەر نەبێ.

هەروەها لە مەسەلەی ئافرەتانی شیاو بۆ هاوسەرگیریی دا، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النساء)دا، ئەو ئافرەتانەی کە حەرامن، سەرژمێریان دەکات:

﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ

وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ ... ﴿٢٤﴾﴾.

خوا ﷻ چواردە جۆر ئافرەت دەژمێرێ، کە ئەوانە قەدەغەن‌و پێتان ناشێن، مانای وایە ئەوانەی کە دەمێننەوە، پێتان دەشێن، هەمیشەی خوا ئەو شتانەی کە قەدەغەن سەرژمێریان دەکات، بۆئەوەی هەرچی مایەوە موباح بێ، وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾﴾، واتە: خوا ئەوەی لێی قەدەغەکردوون بە تەفصیلێ بۆی باسکردوون، مەگەر ئەوەی بۆی ناچاربن، کەواتە: هەرچی کە خوا بە تەفصیلێ باسی نەکردوە، ئەوە لەسەر ئەسڵی خۆی ماوەتەوە، کە بریتیە لە حەڵاڵ بوون‌و ڕەوایی.

**بابەتی دووەم: تەنیا شتی زیانبەخش قەدەغەکراوە :**

پێشتریش باسمان کرد کە خوا: خوێن‌و، مردارو، گۆشتی بەرازو، بۆ جگە لە خوا سەربڕاوی، قەدەغە کردوون، هەر کامێك لەوانە زانستی پزیشکیی (طب) بۆی دەرکەوتوە، کە زیانبەخش‌و بەزەڕە، دیارە تاکو زانست بەرەو پێشەوە بچێ،

حیکمەتو نهێنییەکانی خوا زیاتر ئاشکرا دەبن، کە هەر کام لە مردارو خوێن کانگای نەخۆشیو میکرۆبن، هەروەها گۆشتی بەراز ــ وەك لە سووڕەتی (البقرة)شدا باسمان کردوە، ــ کە بۆچی خوا قەدەغەی کردوە؟ چونکە هەم لەڕووی جەستەییەوە مایەی نەخۆشی یە، هەم لەڕووی نەفسییەوە.

لە ڕووی جەستەییەوە جۆرە میکرۆبێك لە گۆشتی بەرازدا هەیە، کە زۆر بەزەحمەت دەفەوتێ، وە پاشان بەراز بۆخۆی پیس خۆرەو، پاشەڕۆکی خۆی دەخواتەوە، وە لە ڕووی دەروونییشەوە، بەراز عادەتێکی هەیە، نەمزانیوە هیچ ئاژەڵو دڕندەیەك ئەو عادەتەی هەبێ، ئەویش ئەوەیە کە نێرەی بەراز لە پەنا خۆی، سواری مێیەکەی دەبن، هیچ کاردانەوەیەکی نابێ، بە پێچەوانەی پەلەوەرو دڕندەو ئاژەڵەکانی دیکەوە، واتە: بەراز غیرەتی نیە بەرانبەر بە مێیەکەی خۆی، بۆیە زانایانی دەروونناسو کۆمەڵناس دەڵێن: هەر کەسێك گۆشتی بەراز بخوات، نەك هەر گۆشتی بەراز، هەر گۆشتێکی دیکە بخوات، عادەتی خاوەنی ئەو گۆشتە، ئنجا ئاژەڵە، پەلەوەرە، ئەو دڕندەیە، کەمو زۆر لە ڕووی دەروونییەوە، کاریگەریی لەسەری دەبێ، ئەوانەی کە دەڵێن: گۆشتی ئاژەڵی دڕندە، کە گۆشت خۆرن، نابێ بخورێ، لەبەرئەوەیە کە سیفەتی دڕندەیی کاریگەریی لەسەر نەفسی ئینسان دادەنێ.

هەروەها گۆشتی گوێدرێژیش بە هەمان شێوە، هەروەها گۆشتی بەرازیش کارگەرییەکەی ئێستا لە ژیانی ئەوروپاییەکاندا، لە ژیانی ئەو کەسانەدا کە گۆشتی بەراز دەخۆن، بە ئاشکرا دیارە کە سیفەتی غیرەت، واتە: (بە تەنگ ناموسەوە بوون)یان لەدەست داوە، کابرا زۆر پێی ئاساییە کچەکەی کوڕێك لەگەڵ خۆی بێنێتەوە، ماڵێ، یان جاری وایە هاوسەرەکەی لەگەڵ دۆستێکی دێتەوە ماڵ، وە بەپێی قانوونی ئەو وڵاتە مەگەر ئافرەتەکە ئەو پیاوە لەگەڵ خۆی بێنێتەوە بۆ شوێنی پیاوەکەی خۆی، ئەگەرنا ئەگەر لە دەرێ لەگەڵی جووت بێ، مادام بە ڕەزامەندیی خۆی بێ، پیاوەکە بۆی نیە هیچ سزایەکی بدات، وە لەلایان بۆتە شتێکی ئاسایی، وە بەتەئکید خواردنی گۆشتی بەرازەکە ئەو کاریگەرییە خراپەی لەسەر داناون.

وە دیارە بە پێی ئایەتی ژمارە (١٥٧) سووڕەتی (الأعراف) کە خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ١٥٧ ﴾،

ئەوانەی کە سوودبەخشو باشن، بۆیان حەڵاڵ دەکات، وە ئەوانەی کە پیسو زیانبەخشن لێیان قەدەغە دەکات.

مانای وایە: هەر شتێك کە خوا قەدەغەی کردبێ پیسو زیانبەخشە، جا جاری وایە زیانەکەی ئێستا زانراوەو، جاری وایە ئێستا نازانرێو دوایی دەزانرێ، ئێستا کە زیانەکانی: مردارو خوێنو گۆشتی بەراز دەرکەوتوون، کاتی خۆی نەزانراون، بەڵام تاکو زیاتر زانست بەرەو پێشەوە دەچێ، حیکمەتو نهێنییەکانی خوا لە دروستکراوەکانی داو، لە شەریعەتەکەی دا زیاتر دەردەکەون، بە پێی بەڵێنی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت، واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان پێ پێشان دەدەین لە ئاسۆکانو لە دەروونیان دا، تاکو بۆیان دەربکەوێ، کە (قورئان) هەقە، بەڵێ، هەتا زانست بەرەو پێشەوە بچێ، زیاتر پەردە لەسەر ڕاستییەکانی قورئان هەڵدەدرێتەوە.

هەروەها بۆ جگە لە خوا سەربڕاویش، ئێستا دەرکەوتوە ـ ئەویش لە ئەنجامی بەرەوپێشچوونی زانستدا ـ کە ئەو ژیاندارەی سەردەبڕدرێ، ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنرێ، یاخود ناوی جگە لە خوای لەسەر بهێنرێ، کاریگەرییەکی خراپ لەسەر ئەو گۆشتە پەیدا، دەبێ تەنانەت لە ڕووی ڕواڵەتو جەستەییشەوە، بەڵام حیکمەتە گەورەکەی ئەوەیە، کە لە ڕووی مەعنەوییەوە خراپە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەڤدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان سێ (٣) ئایەت لە خۆ دەگرێ، ئایەتەکانی: (١٥١ تا ١٥٣)، ئەم سێ ئایەتە دە وەصیەتە گرنگەکانیان گرتوونە خۆیان، خوای کاربەجێ دە (١٠) لە شتە قەدەغەکراوە گەورەکان، بە ناوونیشانی وەصیەتی خۆی دەخاتەڕوو، کە ئەمانەن:

١ - هاوبەش بۆ خوا دانان.

٢ - پێچەوانەی چاك ڕەفتارکردن لەگەڵ بابو دایك.

٣ - کوشتنی منداڵ لەبەر برسیەتیی.

٤ - نزیك کەوتنەوە لە گوناهە دزێوەکان، بە ئاشکراو پەنهانەوە.

٥ - کوشتنی بە ناهەق.

٦ - نزیك کەوتنەوە لە ماڵی هەتیوو زیان پێگەیاندنی.

٧ - ناپاکیی لە پێوانو کێشاندا.

٨ - قسەی نادادگەرانە کردن، یان قسەی ناڕاست کردن.

٩ - پەیمانی خوا جێبەجێ نەکردن.

١٠ - لادان لە ڕاستە شەقامی خوا بەرەو ڕێچکان.

شایانی باسیشە ئەم سێ ئایەتەو ئەو دە وەصیەتە گەورەی گرتوویاننە خۆیان، پێگەو پلەیەکی تایبەتییان هەیە لە ئیسلامدا، وەك دوایی دەیخەینەڕوو.

﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْۖ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔاۖ
وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًاۖ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ
وَإِيَّاهُمْۖ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقْتُلُواْ
ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾
وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥۖ وَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ
وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُواْ وَلَوْ
كَانَ ذَا قُرْبَىٰۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُواْۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ
﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ
عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾.

## مانای وشـە بە وشەی ئایەتەکـان

((بڵـێ: وەرن بـا ئـەوەی پـەروەردگارتان لێـی قەدەغـە کـردوون، بەسـەرتاندا بخوێنمـەوە، "ئەوەیـە" کـە هـیچ شـتێك نەکەنـە هـاوبەشی، وە کـە لەگـەڵ بـابو دایکـتاندا "هـیچ خراپەیـەك هـەرچەندە گچکـەو کـەمیش بـێ نەیکـەن‌و" چاکەکـارو خۆش ڕەفتـاربن، وە توخنـی گونـاهـە دزێوەکـان مەکـەون، بـە ئاشـکراو پەناهـانەوە، وە نەفسێك کە خـوا قەدەغـەی کـردوە "بکوژرێ" بـە هـەق نەبـێ مـەیکوژن، ئـا ئـەوەتان "خـوا" پێی ڕاسپاردوون، بەڵکو بفـامن ﴿١٥١﴾ وە نـزیکی مـاڵ‌و سـامانی هـەتیو مەکـەون، مەگـەر بـە باشتـرین شـێوەی مامەڵە کـردن، هـەتا پێدەگـات "باڵـغ دەبـێ"، وە پێـوان‌و کێشـان بە تـەواویی‌و دادگەرانـە ئەنجـام بـدەن، جگـە لـە توانـای، لەسـەر هیـچ کـەس "هـیچ ئەرکـێك" پێویسـت ناکـەین، وە هـەر کـات قسـەتان کـرد، دادگـەربن، ئەگـەر "بابای قسە لەبـارەوەکـراو" خاوەن نـزیکایـەتیی "خـزم"یش بـێ، وە بـە پـەیمانی خـوا وەفاداریی بکـەن، ئا ئەوەتـان "خـوا" پێی ڕاسپاردوون، بەڵـکو بیهـێننەوە بیـر خۆتـان ﴿١٥٢﴾ وە ئەم "بەرنـامەی"ە ڕێبـازی منە، ڕاسـت‌و بێ گرێیـە، دەجا شـوێنی بکەون‌و بـە دوای ڕێچکـان مەکـەون، ئەگـەرنا لـە بەرنامـەی خـوا هەڵـەو پەڕاگەنـدەتان دەکـات، ئـا ئەوەتـان "خـوا" پێـی ڕاسـپاردوون، بەڵـکـو پارێـز بکـەن ﴿١٥٣﴾)).

## شیكردنـەوەی هـەندێك لە وشـەكان

(تَعَالَوۡاْ ): واتە: وەرن، (وَقِيلَ : أَصْلُهُ أَنْ يُدْعَى الإِنْسَان إِلى مَكان مُرْتَفع ثُمَّ جعل للدعاء إِلى كُل مَكان، قَالَ بَعضُهُم أَصْله من العلو وهو ارتفاع المنزلة فكانه دعا إلى ما فيه رفعة) وە گوتراوە: لە ئەسڵدا ئەوەیە كە كەسێك لە سەری بێ، بانگی كەسێكی دی بكات بۆ شوێنی بەرزو بڵێ: وەرە، واتە: وەرە سەرێ، دوایی بەكارهێنراوە بۆ هەر جۆرە بانگ كردنێكو، مەرج نیە بۆ سەرو خوار بێ، یاخود ئەوەیە كە كەسێك بانگ بكەی بۆ شتێك كە پێی بەرز بێتەوە، بۆیە خوا لێرەدا وشەی (تعالوا)ی بەكارهێناوە.

(أَتۡلُ ): یانی: (أَقْرَأُ) واتە: بەسەرتاندا دەخوێنمەوە، (تَلاَهُ: تَبِعَهُ مُتَابَعَةً لَيْسَ بَيْنَهُمَا مَا لَيْسَ مِنْهُمَا)، ئەسڵی وشەی (تَلَی) واتە: بە دوای كەوت، بە دواكەوتنێك كە ئەوو شتەكەی دیكە، هیچ شتێك لە نێوانیاندا نەبێ.

(مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ ): وشەی (إِمْلاَق) واتە: (فَقْر) نەداریی، (أَمْلَقَتْهُ الخواطِب: أَفْقَرتهُ، وَأَمْلَق الدَّهْرُ مَالَهُ: أذهبتَهُ)، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (أَمْلَقَتْهُ الخواطِب) واتە: كارەساتەكان هەژاریان كرد، هەروەها گوتراوە: (وَأَمْلَق الدَّهْرُ مَالَهُ) واتە: ڕۆژگار ماڵەكەی بردو نەیهێشت.

(ٱلۡفَوَٰحِشَ): (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشة: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ) واتە: هەر سێ وشەی: (فُحْشُ، فَحْشَاءُ، فَاحِشة) هەر قسەو كردەوەیەكە كە زۆر دزێوو ناقۆڵاو ناشیرین بێ، كە دیارە وشەی: (فَاحِشة) لە قورئاندا هەم بە مانای زینا هاتووە، هەم بە مانای نێربازیی هاتوە، وە هەم بە مانای چرووكیی و ڕژدییش هاتوەو، هەم بە مانای بڵاوكردنەوەی قسەی خراپیش هاتوە.

(وَصَّىٰكُم بِهِۦ ): (الوَصِيَة: التقَدُّمُ إِلى الغَيْرِ بِمَا يَعْمَلُ بِهِ مُقْتَرِنًا بوَعْظٍ مِنْ قَوْلِهِم: أَرْضٌ وَاصِية، مُتَّصِلَةُ النَّبَاتِ، وَيُقَالُ أَوْصَاهُ وَوَصَّاهُ)، (وَصِية) ئەوەیە كە

بەرانبەرەکەت بەهۆی ئامۆژگاریی کردنەوە، داوای کردەوەی باشی لێ بکەی، وە دەگوترێ: (أَرْضٌ وَاصِيَة) یانی: زەوییەك کە ڕووەکەکەی پێکەوە پەیوەستە، وە دەگوترێ: (أَوْصَاهُ وَوَصَّاهُ)

(أَشُدَّهُۥ): (مُفْرَد بمَعْنَى القُوَّة وَالبُلُوغ، أَوْ جَمْع "شِدَّة" كَنِعْمَة وَأَنْعُم)، وشەی (أشدّ) یان تاکە بە مانای: هێزو پێگەیشتن، یان کۆی (شدة)یە، وەك: (نِعْمَة) کە کۆیەکەی (أَنْعُم).

(وَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ): (كَالَ يَكِيلُ كَيْلاً، وَكِلْتُ لَهُ الطَّعَام، إِذَا أَعطيتهُ وَاكْتَلْتُ عَلَيْهِ، أَخَذْتُ مِنْهُ كَيْلاً، الوَافِي: الَّذِي بَلَغَ التَّمَام)، (كَيْل) واتە: پێوانە، دەگوترێ: (كِلْتُ لَهُ) واتە: بۆم پێوا، بەڵام (اكْتَلْتُ عَلَيْهِ) یانی: بۆی پێوام، (وَافِي) واتە: تێرو تەواو.

(بِٱلْقِسْطِ): (القِسْطُ: هُوَ النَّصِيبُ بالعَدْلِ كَالنِّصْفِ وَالنَّصَفَةِ، وَالقِسْطُ: أَخْذ قِسْط الغَيْرِ، وَالإِقْسَاط: إِعْطَاء الغَيْر، قَسَطَ وَأَقْسَطَ)، (قِسْط) بەشکردنی دادگەرانەیە، وە (قِسْط) ئەوەیە کە هەقی بەرانبەرەکەت بخۆی، بەڵام (إِقْسَاط) ئەوەیە کە مافی بەرانبەرەکەت بدەی، کە یەکەمیان: (قَسَطَ يَقْسِطُ)و دووەمیان (أَقْسَطَ يُقْسِطُ)یە.

(وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ): (العَهْدُ: حِفْظ الشيء وَمُرَاعَاتُهُ حَالاً بَعْدَ حَالٍ، وَسُمِّيَ المَوْثِقُ الَّذِي يَلْزَمُ مُرَاعَاتُهُ عَهْدًا)، (عَهْد) پاراستنی شتێكو چاودێری کردنیەتی، حاڵ دوای حاڵ، وە ئەو پەیمانەی کە پێویستە ئاگاداریی لێبکرێ، ناوی لێنراوە: (عَهْد).

(صِرَٰطِي): (الصِّرَاط: الطَّرِيقُ المُسْتَقِيم)، (صِرَاط) یانی: ڕێی ڕاستو ڕێك.

(ٱلسُّبُلَ): (السبيل: الطَّرِيق الَّذِي فِيهِ سهُولَة، وَجَمْعُهُ: سُبُل)، (سبيل) ڕێیەکی ئاسانیی تێدابێو بە (سُبُل) کورتدەکرێتەوە.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خـوای پەروەردگـار لە کۆتـایی باسی ئەو خـواردنە قـەدەغـە کراوانـەدا، کـە هـاوبەش بـۆ خـوا دانـەرو کـافرەکـان لەسـەر بناغـەیـەکی ئەفسانەیی، بـێ ئـەوەی کـە عـەقـڵ پشـتگیـریی بکـاتو لـە وەحییـەوە پشـتگیـریی بـۆ هاتبـێو، زانسـت پشـت ڕاسـتی بکـاتەوە، وە بێئـەوەی لەگـەڵ سـروشتی ئینسـانـدا بگونجـێ، هـەر لەخـۆوە شـتیان قـەدەغـە دەکـرد، وە کۆمەڵـێك هـەڵسوکەوتیان دەکـرد: منداڵـی خۆیـان دەکوشـت، هاوبەشیان بۆ خـوا دادەنا! کەچی دوای هـەموو ئەوانەش، کردەوە خراپەکـانی خۆیـانو، پاشان کوفرو شـیـرکەکەی خۆشیان، دەخستەوە سـەر خـوای پەروەردگـار! وەك چۆن شـەیتان بە ویستی خۆی سـەجدەی بۆ ئـادەم نەبـرد، واتە: سـەجدەی ڕێزگـرتن، کەچی دوایـی گوتـی: ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ﴾الأعـراف، واتە: (ئیبلیس) گـوتی: لەبەرئـەوەی تـۆ منـت گومـڕا کـرد، لەسـەر ڕێ ڕاستەکەی تـۆ بۆیان دادەنیشـمو ناهێڵـم بە ڕێـی ڕاسـتدا بـڕۆن، بۆخـۆی خـۆی گومڕا کـرد، کەچی دەیخستە سـەر خـوای دادگـەر، یانی: خـۆی لـە گوناهـەکـانی خـۆی تەبریـە دەکـرد، ئـەوە عادەتـی ئیبلیسە.

ئنجا لە دوای هـەموو ئەوانـە، خـوا بـە پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، بڵـێ: وەرن بـا ئـەوەتان بەسـەردا بخـوێنمەوە، کـە پەروەردگـارتان لێـی قـەدەغـە کـردوون، یـانی: قـەدەغـەکراوەکـان ئـەو شـتانە نین کە ئێوە لە خۆتانیـان قـەدەغـە دەکـەن، لەسـەر بناغـەی ئەفسانەیی ! ئـەو

شتانەی کە خوا قەدەغەی کردوون، دە (١٠) شتی سەرەکییو گرنگن، کە بەڕای زۆربەی توێژەرەوانی قورئان ئەو دە (١٠) شتە لە شەریعەتی هەموو پێغەمبەراندا قەدەغە بوون، وە ئەو دە شتە، زۆربەیان لە تەوراتی ئێستادا هەن، ئەو دە (١٠) شتانەش:

**یەکەم:** ﴿أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾، هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی خوا، واتە: یەکەمین قەدەغەکراو، بریتییە لە هاوبەش بۆ خوا دانان، خوا فەرموویەتی: هیچ شتێك مەکەنە هاوبەش، نەیفەرمووە هیچ کەس، لە هەندێك شوێنان دەفەرموێ: هیچ کەس، وەك: ﴿وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ١١٠﴾الكهف، وە لە هەندێ شوێنان دەفەرموێ: هیچ شتێك، چونکە بەشەر کە تووشی شیركو هاوبەش بۆ خوا دانان بووە، جاری وایە یەکێك لە ئینسانەکانی، یان شەیتانەکانی کردۆتە هاوبەشی خوا، وە جاری وایە شتێك لە شتەکانی کردۆتە هاوبەشی خوا، دارێك، بەردێك، هەواو ئارەزوویێك، ڕووەکێك، دڕندەیەك، مارێك، دوو پشكێك، مشکێکی کردۆتە هاوبەش بۆ خوا، کە ئێستاش لە دنیادا ئەو شتانە هەر دەپەرسترێن.

**دووەم:** لە قەدەغەکراوەکان بریتییە لە خراپ نەبوون لەگەڵ دایكو باب دا، بەڵام لێرەدا خوا تەعبیرەکەی گۆڕیوەو نەیفەرمووە: لەگەڵ دایكو باب دا خراپ مەبن، بەڵکو فەرموویەتی: چاکە لەگەڵ دایكو بابتاندا بکەن: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا﴾، کەواتە: دووەمین گوناهو قەدەغەکراو بریتییە لە پێچەوانەی: چاکەکردن لەگەڵ بابو دایکدا، یانی: هێشاندنی دڵی دایكو باب، وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ٢٣﴾ واتە: هیچ وشەیەك نەڵێی کە ئەوان پێیان ناخۆش بێ، وە خۆیان لێ تووڕە مەکە، لێرەش فەرموویەتی: چاکە لەگەڵ بابو دایکتاندا بکەن، کە پێچەوانەی لەگەڵ خراپ بوونە، کە بریتییە لە دڵ هێشاندنیانو ماف فەوتاندنیانو بێڕێزیی کردن بەرانبەریان، دوایی حیکمەتەکەی ڕوون دەکەینەوە، بۆچی وایفەرمووە ؟

**سێیەم:** ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾، وە منداڵەکانتان لەبەر هەژاریی و تەنگدەستیی مەکوژن.

جا تەماشا بکەن ! لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: منداڵەکانتان لە ترسی هەژاریی مەکوژن، ئێمە ڕۆزیی ئەوانیش دەدەین، هی ئێوەش دەدەین، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾، وە منداڵەکانتان لەبەر هەژاریی و تەنگدەستیی مەکوژن، ئێمە ڕۆزیی ئێوەش و هی ئەوانیش دەدەین.

مەبەستم ئەوەیە ئەوە هەمووی وردەکاریی فەرموودەی خوا (كلام الله)یە، کە مرۆڤ دەبێ زۆر بیری لێ بکاتەوە، ئنجا دەزانێ کە بۆچی ئەو وشەیە لە پێش ئەم وشەیەدا هاتوە ؟ دیارە لەبەر ئەوەشە خوای پەروەردگار پێمان دەفەرموێ: زۆر بیر لە قورئان بکەنەوەو تێیبفکرن.

**چوارەم:** لەو قەدەغەکراوانە: ﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾، وە توخنی گوناهە ناقۆڵایەکان مەکەون، واتە: ئەوانەی کە بە قسەو زمان، یان بە کردەوەو ئەندامەکانی دیکە، دەکرێن، چ ئەوانەی ئاشکران و، چ ئەوانەی پەنهانن، ئەوانەی کە ئاشکران، واتە: ئەوانەی بە ئەندامە ئاشکراکانتان دەکرێن، ئەوانەی کە پەنهانیشن، واتە: ئەوانەی بە ئەندامە پەنهانەکانتان دەکرێن، وەك دڵ و هۆش و خەیاڵ، یاخود لەبەرچاوی خەڵکی دەیانکەن، یان بە پەنهانیی دەیانکەن.

**پێنجەم:** لە قەدەغەکراوەکان، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ

وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾، وە ئەو نەفسە کە خوا قەدەغەی کردوە، بە هەقی خۆی نەبێ مەیکوژن، ئا ئەمەتان خوا پێی ڕاسپاردوونو پێی وەصیەت کردوون، بەڵکو بفامنو تێبگەن.

ئنجا لە ئایەتی دووەمدا دێتە سەر چوار قەدەغەکراوی دیکە :

**شەشەم:** ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، وە توخنیماڵی هەتیو مەکەون، مەگەر بە باشترین شێوە، هەتاکو دەگاتە قۆناغی تینو تاقەتو ماڵەکەی خۆی دەپارێزێ، بە باشترین شێوە یانی چی؟ یانی مەگەر بازرگانییو کەسابەتی بۆ بە ماڵەکەی بکەنو بۆی زۆر بکەن، ئەگەرنا نەچن تەصەڕووف لە ماڵی هەتیوەکەدا بکەن، بە شێوەیەك کە زەرەر بکات.

**حەوتەم:** ﴿ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِ ﴾، وە پێوانەو کێشان بەتەواویو دادگەرانە ئەنجام بدەن، یانی چی؟ ئەوەی پێشێ، دەفەرموێ: توخنی ماڵی هەتیو مەکەون، مەگەر بە باشترین شێوە، واتە: مەیخۆن، زیانی پێ مەگەیەنن، لە حەوتەمیاندا نەیفەرمووە : فێڵو تەرازوو بازیی لە کێشانو پێواندا مەکەن، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِ ﴾، کە دوایی حیکمەتەکەی ڕوون دەکەینەوە، چونکە هەر ئەوەندە بەس نیە کە تۆ فێڵ نەکەی لە پێوانو کێشاندا، بەڵکو دەبێ بەتەواویو دادگەرانە کێشانو پێوانەکە تەواو بکەی، ﴿ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴾، لەسەر هیچ کەسێك پێویست ناکەین، مەگەر ئەوەی لە توانای دا هەیە، چونکە مەسەلەی کێشانو پێوان زۆر هەستیارە، ئەگەر زۆر تووشی وەسوەسەش نەبن تێیدا، قەیناکات، چونکە خوای دادگەر جگە لەوەی لە توانتاندا هەیە، لەسەری پێویست نەکردوون.

**هەشتەم:** ﴿ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ ﴾، ئەگەر قسەتان کرد، دادگەرانە قسە بکەن، ئەگەر خاوەن خزمایەتییو نزیکیش بێ.

لێرەش نەیفەرمووە: درۆ مەکەن، یان قسەی ناڕاست مەکەن، چونکە هەر ئەوە بەس نیە کە قسەی ناڕاست نەکەیو درۆ نەکەی، بەڵکو دەبێ قسەی دادگەرانە بکەی، ئەگەر ئەو کەسە کە قسەی لەبارەوە دەکرێ، خزمیش بێو نزیکیش بێو برادەریش بێ .

**نۆیەم:** ﴿ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُواْ ﴾، وە پەیمانی خوا جێبەجێ بکەن .

لێرەش نەیفەرمووە: پەیمانی خوا مەشکێنن، چونکە هەر ئەوەندەش بەس نیە کە پەیمان نەشکێنی، بەڵکو دەبێ بەجێشی بێنی، ﴿ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، ئەوەشتان خوا پێی ڕاسپاردوون، بۆ ئەوەی بیری لێ بکەنەوە، بەڵکو بیری لێ بکەنەوە.

**دەیەمو کۆتایی :** کە ئایەتی سێیەمی بۆ تەرخان کراوە، ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ﴾، وە ئەمە ڕاستە شەقامی منە بێ گرێو گۆڵە، شوێنی بکەون، ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾، وە بە دوای ڕێچکان مەکەون، ئەگەرنا لە ڕاستە شەقامی خوا دەترازێنو پەرتەوازە دەبن، ﴿ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، خوا ئەمەی کردۆتە وەصیەت بۆتان، بۆ ئەوەی پارێزتان پەیدابێ، تەقواتان پەیدابێ، لێرەش خوا نەیفەرمووە: لە ڕێی من لامەدەن، چونکە لانەدان لە ڕێی خوا بەس نیە، بەڵکو دەبێ شوێنی بکەوی.

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:**

## گرنگیی و تایبەتمەندیی ئەم سێ ئایەتەو ئەو دە وەصیەتەی گرتوویانەتە خۆیان:

كە هەركامێك لەو دە وەصیەتە ئامۆژگارییەكی تێدایە، چ شێوازی ڕاستەوخۆ بیگەیەنێ، چ شێوازی ناڕاستەوخۆ، لەوبارەوە فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەندێ قسەی هاوەڵان دێنین :

**یەكەم:** ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيُّكُمْ يُبَايِعُنِي عَلَى ثَلاثٍ؟ ثُم تَلا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ﴾، حَتَّى فرغ من الآيات، فَمَنْ وَفَّى فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنِ انْتَقَصَ شَيْئًا، أَدْرَكَهُ اللهُ بِهَا فِي الدُّنِيَا، كَانَتْ عُقُوبَتُهُ، وَمَنْ أَخَّرَ إِلَى الآخِرَةِ كَانَ أَمْرُهُ إِلَى اللهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٣٢٤٠) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَادِ، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي}، واتە: عوبادەی كوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كێ لە ئێوە پەیمانم لەگەڵ دەبەستێ لەسەر ئەم سێ ئایەتە ؟

پاشان ئایەتەكانی خوێندەوە : ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ...﴾، هەتا هەر سێ ئایەتی تەواوكردن، فەرمووی: هەر كەسێك ئەم ئایەتانە جێبەجێ بكات، پاداشتی لەسەر خوایە، وە هەر كەسێك شتێكیان لێ كەم بكاتەوە، ئەگەر خوا لە دنیادا سزای دا، ئەوە سزای دا، وە ئەگەر دواشی خست بۆ دواڕۆژ، ئەوە عایدی خوایە، ئەگەر ویستی سزای دەدات، وە ئەگەر ویستی لێی دەبووری.

**دووەم**: ﴿عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يَنْظُرَ إِلى وَصِيةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّتِي عَلَيْهَا خَاتَمُهُ، فَلْيَقْرَأْ هَؤلاء الآيَاتِ: ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾، إِلى قَوْلِهِ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾﴾ {أَخْرَجَهُ التِرمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ، والطبراني في "الكبير" برقم: (١٠٠٦٠)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: هەر کەسێك دەیەوێ تەماشای وەصیەتی پێغەمبەر ﷺ بکات، کە مۆرەکەی پێوەیە، با ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە، ئنجا خوێندنیەوە، لە: ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾، تاکو: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾.

**سێیەم**: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِنَّ فِي الأَنْعَامِ آيَات مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الكِتَابِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٣٢٤٠)، وَقَالَ: هَذا حَدِيثٌ صَحيح الإِسناد، وَلَم يخرجاه، وَصَحَّحَهُ الذَّهَبِي}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: لە سووڕەتی ئەنعامدا چەند ئایەتێك هەن، موحکەمن، "واتە: مانایان ڕۆشنە" وە ئەوانە بە بنچینەی کتێبی خوا دادەنرێن، دوایی خوێندنیەوە، تا سێ ئایەتەکەی تەواو کردن.

**ئنجا ئەوەی جێی سەرنجە: ئەم دە گوناهە، کە بریتین لە :**

١- هاوبەش بۆ خوا دانان.

٢- خراپ ڕەفتار کردن لەگەڵ بابو دایك.

٣- کوشتنی منداڵ لەبەر هەژاریی.

٤- ئەنجامدانی گوناهە دزێوەکان، بە ئاشکراو پەنهانەوە.

٥- کوشتنی کەسێك بە ناهەق.

٦- خواردنی ماڵی هەتیو.

٧- ناپاكیی لە پێوان‌و كێشاندا.

٨- قسەی ناڕاست‌و نادادگەرانە.

٩- پەیمانی خوا جێبەجێ نەكردن.

١٠- لادان لە ڕاستە شەقامی خوا بەرەو ڕێچكان.

ئەم دە تاوانە، كە خستماننەڕوو، تاوان‌و خراپەی زۆر زلن، بەلام جێی سەرنجە كە پێنج لەو دە شتە قەدەغەكراوانە، وەك قەدەغەكراو خراونەتە ڕوو، پێنجیشیان پێچەوانەكەیان خراوەتە ڕوو، چۆن؟

أ/ ئەو پێنجەی وەك قەدەغەكراو خراونەتە ڕوو، ئەمانەن، خوا دەفەرموێ:

یەك: ﴿ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴾، هیچ شتێك مەكەنە هاوبەشی خوا.

دوو: ﴿ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ ﴾، منداڵەكانتان لە ترسی هەژاریی مەكوژن.

سێ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ ﴾، توخنی گوناهە ناقولایەكان مەكەون، ئەوانەی كە ئاشكران‌و ئەوانەی كە پەنهانن.

چوار: ﴿ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ ﴾، ئەو نەفسەی خوا قەدەغەی كردوە، مەگەر بە هەقی خۆی، ئەگەرنا مەیكوژن.

پێنج: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، توخنی ماڵی هەتیو مەكەون، مەگەر بە باشترین شێوە مامەڵەی بۆ پێبكەن.

ب/ بەلام پێنجیان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ خراونەتە ڕوو، واتە: بە بارە خراپەكەدا نا، بۆ وێنە: كە خوا دەفەرموێ: هاوبەش بۆ خوا دامەنێن، ئەوانیش بریتین لە:

یەك: ﴿ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا ﴾، لەگەڵ دایك‌و باوكتاندا چاك بن.

**دووەم:** ﴿ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ﴾، پێوان و کێشان بەتەواویی ئەنجام بدەن، بە دادگەرانە.

**سێ:** ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ﴾، ئەگەر قسەتان کرد، دادگەرانە قسان بکەن، هەرچەندە قسە دەربارە کراوەکە پەیوەندیی و نزیکایەتییشی لەگەڵ ئێوەدا هەبێ.

**چوار:** ﴿ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ﴾، پەیمانی خوا جێبەجێ بکەن.

**پێنج:** ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ﴾، وە ئەمە ڕاستە شەقامی منەو شوێنی بکەون.

ئنجا حیکمەتی ئەم جیاوازییە چییە؟ بۆچی خوای کاربەجێ، ئەو پێنجەی پێشێ، وەك قەدەغەکراو خستوونە ڕوو، بەلاَم ئەو پێنجەی دوایی، وەك پێچەوانەکەیان خستوونە ڕوو؟

**حیکمەتەکەی ئەوەیە کە بە نسبەت ئەو پێنجە پێشەوە :**

١/ هاوبەش بۆ خوا دانان، ئەوە هەر نابێ مرۆڤ هاوبەش بۆ خوا دابنێ، لەبەرئەوەی گوناهێکی یەکجار گەورەیە.

٢/ هەروەها کوشتنی منداڵی خۆت.

٣/ وە دوورکەوتنەوە لە گوناهی پەنهان و ئاشکرا.

٤/ کوشتنی خەڵك بە ناهەق.

٥/ خواردنی ماڵی هەتیو، خوا وەك خۆیان فەرموونی.

**بەلاَم بە نسبەت پێنجەکەی دیکەوە :**

١) دایك و باب کە چاکەیان لەگەڵدا بکەی، خوا نەیفەرمووە: (ولا تُسيئوا إلى الوالدين) بۆچی؟ چونکە ئەوەندە بەس نیە کە تۆ لەگەڵ باب و دایکتدا

خراپ نەبی، بەڵکو، نەك دەبێ خراپ نەبی، دەبێ زۆر چاکیش بی لەگەڵیاندا، ئنجا ئەگەر خوا فەرموویای (ألاَّ تُشرکوا بە شیئاً، ولا تُسیئوا إلی الوالدین) هاوبەش بۆ خوا دامەنێنن‌و، لەگەڵ باب‌و دایکیشتان خراپ مەبن ! مانای وایە ئەگەر لەگەڵ باب‌و دایکت دا باشیش نەبی، قەیناکات، واتە: هەر خراپ مەبە، بەسە ! بەڵام خوا واینەفەرمووە.

هەڵبەتە کەلامی خوا زۆر وردەو لەو مەقام‌و سیاقەدا ئەوەندە بەس نیە خوای پەروەردگار بفەرموێ: لەگەڵ دایك‌و بابتدا خراپ مەبە ! چونکە کەسی وا هەیە، بێڕێزیی بەرانبەر دایك‌و بابی ناکات، بەڵام چاکەشیان لەگەڵدا ناکات، بەڵام نەخێر، خوا دەفەرموێ: لەگەڵ باب‌و دایکتان دا بە چاکە مامەڵە بکەن، چونکە هەر ئەوەندە کە خراپەیان لەگەڵدا نەکەی، بەس نیە.

٢) پاشان بۆ هی دووەم فەرموویەتی: ﴿وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾، وە پێوان‌و کێشان بە تەواویی ئەنجام بدەن، بە دادگەرانە، نەیفەرمووە: (ولا تخونوا في الکیل والمیزان) لە کێشان‌و پێوان دا خیانەت مەکەن.

چونکە ئەوەندە بەس نیە کە خیانەت‌و ناپاکیی نەکەی، بەڵکو دەبێ وریابی‌و بە دادگەرانە هەقی خۆیان پێبدەی، کە بۆیان دەکێشی‌و پێیان دەدەی، نەك هەر بە ئانقەست خیانەت نەکەی، بەڵکو بە کەمتەرخەمییش نەیکەی.

٣) وە بۆ هی سێیەم دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ﴾، ئەگەر قسەتان کرد، دادگەرانە قسان بکەن، دیارە خوا مەبەستی ئەوەیە کە: ئەگەر قسەتان کرد، درۆ مەکەن، یان ناهەق مەڵێن، بەڵام هەر ئەوەندە بەس نیە کە تۆ درۆ نەکەی‌و ناهەقی نەڵێی، بەڵکو دەبێ زۆر بە دادگەرانەوە قسەی هەق بکەی، بە ئینصافەوە قسە بکەی، کاتێ قسەت لەسەر هەر شتێك کرد.

٤) بۆ هی چوارەم دەفەرموێ: ﴿ وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْ ﴾، وە بە پەیمانی خوا وەفاداربن، خوا نەیفەرمووە: (ولا تَنْكثوا العهد) پەیمان مەشکێنن، چونکە هەرئەوەندە بەس نیە کە پەیمان نەشکێنی، بەڵکو دەبێ ئاگاشت لێی بێ و کەمتەرخەمیی تێدا نەکەی.

٥) وە بۆ پێنجەمو کۆتایی دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُ ﴾، وە ئەوە ڕاستە شەقامی منەو شوێنی بکەون، خوا نەیفەرمووە: (ولا تَنْحرفوا عَنِ الصِّرَاط) لە ڕاستە ڕێ لامەدەن، کە ئەو کاتە وەك ئەوەیە بفەرموێ: هەر لەڕێ لامەدەن، بەڵام نا، فەرموویەتی: شوێنی بکەون، تۆ لێرەدا تەرکیزت لەسەر شوێنکەوتنی ڕاستە شەقامی خوایە، نەك تەرکیزت لەسەر ئەوەبێ لەسەر ڕاستە شەقامی خوا لانەدەی، بەڵکو دەبێ تۆ ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بەو ڕێیە ڕاستەوە پابەند بی، وە بۆ فەرمانی خوا ملکەچ بی.

**مەسەلەی دووەم :**

## پۆلێن کردنی ئەو دە (١٠) گوناهە بۆ سێ جۆر :

جۆری یەکەم / پێنجیان کە لە ئایەتی یەکەمدا هاتوون، هەر پێنجیان عەقڵی سەلیم ڕەفزیان دەکات، یانی هەرکەسێك عەقڵی هەبێ، دەزانێ ئەوانە خراپن، بۆیە خوا لە کۆتایی ئەو پێنج گوناهەدا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾، بەڵکو عەقڵتان هەبێ، هەر عەقڵتان هەبێ دەزانن کە ئەو کارانە خراپن، ئەو پێنجانە چی وچین؟

یەکەمیان: ﴿ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا ﴾، هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی خوا، مامەڵە لەگەڵ خوادا، دەبێ بە شێوەیەك بێ کە هیچ شتێك نەهێنیە ڕیزی خوا، بە هیچ جۆرێك، هاوبەش یانی چی؟ یانی تۆ یەکێك لە دروستکراوەکانی خوا، وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا بکەی.

ئنجا بۆ زانیارییتان : بەو پێیە بێ، زۆر لە مسولمانانیش تووشی شیرك دەبن، ئنجا شیرکی گەورە، یان شیرکی گچکە، بەلام ئێمە نالێین: هەرچی وایکرد لە بازنەی ئیسلام چۆتە دەرێ، چونکە زۆر کەس بە نەزانیی تووشی شیرك دەبێ، چۆن؟ ئەو کەسەی کە پێی وایە شێخەکەی، یان مامۆستایەکەی، یان حیزبەکەی، یان سەرۆك عەشیرەتەکەی، یان پارەو سامانەکەی، دەیپارێزێ، ئەوە شیرکە، بۆچی؟ چونکە پارێزەر بەس خوایە، شیفا هێن بەس خوایە، سەرخەر بەس خوایە، هەر خوا دەتوانێ دەوڵەمەندت بکات، هەژارت بکات، شیفات بدات، وە ئەگەر یەکێك لەو شتانەت لە جگە لە خوا زانی، ئەوە شیرکە، بۆیە لە سوورەتی (الشعراء)دا هاوبەش بۆ خوادانەرەکان لە قیامەت دەڵێن:

﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: سوێند بە خوا ئێمە لە گومراییەکی ئاشکرا دا بووین، کە ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییەکاندا یەکسان دەکرد.

کەواتە: هەر کەسێك شتێك بێنێتە ڕیزی خوا، ئەوە کردوویەتی بە هاوبەش بۆ خوا.

عەبدوڵلای کوری عەبباس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کەسی وا هەیە شەوێ دز دێتە سەرماڵیان، کەڵەبابەکەیان دەقووقێنێ، یان سەگەکەیان دەوەڕێ، یان کەرەکەیان دەزەڕێ، دەڵێ: وەڵلاهی ئەگەر کەڵەشێرەکە، یان سەگەکە، یان کەرەکە نەبووایە، شەوێ دزییمان لێ دەکرا، دەڵێ: ئەوە شیرکە، بۆچی؟ چونکە دزیی لێنەکرانەکەی، گێڕاوەتەوە بۆ یەکێك لەو هۆکارانە (أسباب) کە دەیانبینێ، بەلام دەبێ هۆکار بەدیهێنەر (مسبب)یش ببینێ، کە خوایە، واتە: نابێ تۆ چاوت تەنیا هۆکارەکە ببینێ، بەڵکو دەبێ بڵێی: خوا نەیهێشت، بەلام کەڵەشێرەکەی کردە هۆکار، بەلام ئەگەر تەنیا باسی هۆکارەکە بکەی، ئەوە ئەو کاتە شیرکە.

ئنجا لێرەدا ئەم فەرموودەیە دێنینەوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَحَدَّثَهُ بِبَعْضِ الْكَلَامِ، فَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، فَقَالَ: جَعَلْتَنِي لِلَّهِ عِدْلاً بَلْ مَا شَاءَ اللَّهُ﴾ {أخرجه الطبراني

بـرقم: (١٣٠٠٥)، والبخـاري فـي "الأدب الـمفرد" بـرقم: (٧٨٣) وصـححه الألبـاني﴾، واته: واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خـوا لێیان ڕازی بـێ، دەڵـێ: پیاوێـك هـاتە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ هـەندێ قسـەی بـۆ کـرد، پاشان گـوتی: مەگەر خـوا بیـەوێو تـۆ بتـەوێ، فەرمووی: ئایا منـت کـردە هاوتـای خـوا؟! بڵـێ: مەگـەر خوا بیـەوێ بەتەنیـا، (یان بڵێ: ئەگەر خوا بیـەوێ ئنجـا پاشان تـۆ)[١] کە دیـارە ئەوانە شـیرکی بچووکن، شـیرکی گـەورەش بریتیـە لـەوەی، ئـەو شـتانەی هـی خـوان، بیاندەیـە پـاڵ کەسـێکی دی، وەك: شـیفا هێنـان، سـەرخستن، ژێـرخسـتن، هـەژارکـردنو دەوڵەمەنـدکردن، ئـەو شـتانە کە تەنیـا بە خـوا دەکرێن، یاخود یـەکێك لەو شـتانەی کە دەبـێ تـەنیا بـۆ خـوا ئەنجـام بـدرێن، بـۆ غـەیری خـوایان ئەنجـام بـدەی، وەك: پاڕانـەوە، لێتـرسـان، خـۆش ویستن، پشـت پێبەسـتن، یاخـود بۆ سـەربڕین، سـوێند پـێ خـواردن.

دووەمیـان: ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾، لەگـەڵ دایـكو بابـدا چاکەکـاریی بکـرێ، زانایـانی زمـانی عەرەبیـی دەڵێن: خـوا نەیفـەرمووە: (وإلـى الوالـدين إحسـاناً) دەفەرموێ: ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾، کە لە هەموو قورئانیشدا هەر وایە، ئنجا ئایا ئەم دووانە جیاوازییان چییە؟! ئەگەر بڵێ (أَحْسَنَ إِلَيْهِ) چاکەی لەگەڵ کـرد، یانی: دەگونجێ من کەسێك بنێرم بڵێم: بچۆ ئەو شتە بۆ بابم بەرە، یان ئەو کـارەی بـۆ بکـە، بـەڵام : ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾، مانـای ئەوەیـە بۆخـۆت ڕاستەوخۆ شتەکە بکەی، خزمەتکـەیان بکـەی، وە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: بۆخـۆت ڕاستەوخۆ خزمەتەکەیان بکە، نەك لە ڕێی کەسێکی دیکەوە، کە ڕایسپێری.

سـێیەمیـان: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ﴾، منداڵەکانتان لە ترسی هـەژاریی مەکوژن، دیـارە هـەم چاکەکردن لەگـەڵ بـابو دایـك، هـەم نەکوشـتنی منداڵـی خۆ لەبەر هـەژاریی، هەموو عەقڵێکی سـەلیم پەسـندیان دەکـات.

١) لە گێڕانـەوەی دیکـە هـاتوە: ﴿قُلْ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ شِئْتَ﴾ (أَخْرَجَـهُ ابْنُ مَاجَه بـرقم: (٢١١٧)، قـال الشيخ الألباني : حسن صحيح).

چوارەمیــــــان: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ ﴾، وە تـوخنی گوناهــە ناقۆلآیـەکـان مەکـەون، ئەوانـەی کـە ئاشـکران‌و، ئەوانـەی کـە پەنهانـن.

ئـەوەش دیسـان ئـەوەی لـە خراپــە بـە دڵ دەکـرێ، یـان بـە ئەندامەکـانی جەسـتە، یـان ئـەوەی کـە لـە نێـو خەڵکـدا دەکرێ، یاخـود ئـەوەی لـە حاڵـەتی پەنامەکیی دا دەکرێ، قسە، یان کردەوە، دیارە هـەموو عەقڵێـکی سـەلیم ئـەو جۆرە شـتانە ڕەفز دەکات.

پێنجەمیان: ﴿ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ ﴾، ئەو نەفسە کە خـوا قـەدەغـەی کردوە، مەگەر بە هـەقی خۆی، ئەگەرنا مەیکوژن.

ئیدی نەفسـەکە مسولْمانە، یـان کـافرە، خـوا بەگشـتی فەرموویـەتی، دوایـی خـوا دەفـەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾، ئـا ئەمـە خـوا ئێـوەی پـێ ڕاسـپاردوە، بەڵـکو عەقڵتـان هەبـێ، یـانی هـەر عەقڵتـان هەبـێ دەزانـن، کـە ئەم پێنـجە، هەر پێنجیـان خراپـن.

**مەسـەلـەی سـێیـەم:**

جـۆری دووەم : چوار جۆرە گونـاح کـە پێویسـتییان بـە بیـرکردنەوەو وەبیـر خـۆ هێنـانـەوە هـەیـە، کە بزانـرێ خراپـن، ئەوانیش چـی‌و چین ؟

١) ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، وە تـوخنی ماڵی هـەتیو مەکـەون، هـەتا باڵـغ دەبـێ، مەگـەر بە باشتـرین شـێوە.

چونکـە دوای ئـەوەی منـداڵ باڵـغ بـوو، هـەتیو نامێنـێ، وەك عەلـی کوڕی ئـەبو طـاڵـیب خـوا لـێی ڕازی بـێ، لـە پێغـەمبـەرەوە ﷺ هێناویـەتی، کـە فەرموویـەتی: ﴿لاَ يُتْمَ بَعْدَ حُلُمٍ﴾ {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي في "السنن الصغرى" برقم: (٢٠٤٩)} واتـە: دوای باڵـغ بـوون هەتیویـی نامێنـێ، هـەر منداڵـێ، کوڕ یـان کچ، دوای ئەوەی باڵـغ بوو، بە هەتیو لە قەڵەم نادرێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ: حَتَّى يَسْتَيْقِظَ ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٤٠٣)، وَالترمِذِيُّ برقم: (١٤٢٣) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَالنَّسَائِي فِي الكُبْرَى برقم: (٧٣٤٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٠٤٢)، وَالحَاكِمُ برقم: (٨١٧٠)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (٤٨٦٨)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضَاً: أَحْمَد برقم: (٩٥٦)}، واتە: قەڵەم لەسەر سێ كەسان لابراوە: نوستوو تا بەئاگا دێ، منداڵ تا باڵغ دەبێ، شێت تا چاك دەبێتەوە.

ئنجا خوای كاربەجێ لێرەدا نەیفەرمووە: ماڵی هەتیو مەخۆن، بەڵكو فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾، وە توخنی ماڵی هەتیو مەكەون، لێی نزیك مەكەونەوە، نەك هەر نەیخۆن، ئنجا نەیفەرمووە (إِلاَّ بالَّتِي هِيَ حَسَنَة) مەگەر بەو شێوەی كە باشە، بەڵكو فەرموویەتی: مەگەر بە باشترین شێوە.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، واتە: تا ئەو كاتەی باڵغ دەبێ، وەك لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ ٦ ﴾، واتە: وە هەتیوەكان تاقی بكەنەوە، تاكو كە گەیشتنە ئەندازەی هاوسەرگیریی، ئەگەر هۆشتان پێوە بینین، ماڵەكەیان تەسلیم بكەنەوە.

بەڵام لێرەدا تێبینییەك هەیە دەبێ ئاگادار بین، هەندێ كەس پێیوایە دەبێ بە هەموو شێوەیەكو بە هەموو جۆرێك لە هەتیوان خۆی بە دوور بگری، هەتا خەڵكی عەوام دەڵێن: قەدەغەیە ئاویشیان لە ماڵی بخۆیەوەو، لە ژێر سێبەریشیان دابنیشی حەرامە ! كە دیارە ئەوە ڕاست نیە، چونكە ئەگەر بەو شێوەیە بێ، ئەو هەتیوانە زایە دەبنو هیچ كەسێك نابێ دەستیان بەسەردا بێنێو، سەرپەرشتییان بكاتو، ئاگای لێیان بێ، بەڵكو پێویستە تێكەڵییان لەگەڵ بكرێو، هاموشۆیان بكرێ، بەڵام دەبێ كەسێك كە

چایەکیان لە ماڵ دەخواتەوە، بایی دوو چایی سوودیان پێ بگەیەنێ، پارووە نانێکیان لە ماڵ دەخوا، با بایی دوو پاروە نان سوودیان پێ بگەیەنێ، وە ئەوە قسەی هەندێ مەلایە کە زۆر قووڵ نابنەوە لە شتەکاندا، یان هەر ئەوەیان ڕەچاو کردوە، کە ئەگەر هەر توخنی هەتیو بکەوی، زیانی پێدەگەیەنی، بەڵام کە تۆ چایەکی لە ماڵ دەخۆیەوە لە ڕووی ماددییەوە، بەڵام لە ڕووی مەعنەوییەوە هێندەی سەد چا، سوودی پێ دەگەیەنی، ئامۆژگاریی دەکەی، دڵی دەدەیەوە، دەستی بەسەردا دێنی، دڵی خۆشدەکەی، وە دەشتوانی لە ڕووی ماددییەوەش هاوکاریی بکەی، بایی ئەوەی کە سوودت لێ بینیوەو زیاتریش.

٢) ﴿وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾، وە پێوان و کێشانە بە تەواویی ئەنجام بدەن، لەسەر هیچ کەسێك پێویست ناکەین، مەگەر ئەوەی لە توانایدا بێ.

(أوفوا: الوفاء: التمام) شتی تەواو، بە تەواویی جێبەجێی بکەن، ئنجا بۆچی دەفەرموێ: (بِٱلۡقِسۡطِ) تاکو مرۆڤ ستەم نەکات، بەڵکو بە دادگەرانە، نە ستەم لە خۆت بکە، نە لە بەرانبەرەکەشتی بکە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾، لەبەرئەوەیە کە مرۆڤ زێدەڕۆیی نەکات لە زۆر دوو دڵ بووندا و وەسوەسەی بۆ دروست بێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: زیاد لە پێویست لەسەر کەس پێویست ناکەین.

٣) لەو شتانەی کە خوا لە کۆتاییەکەیاندا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ﴾، وە هەر کاتێ قسەتان کرد، دادگەر بن، ئەگەر خزمیش بێ، ئەگەر خاوەنی نزیکییش بێ، واتە: ئەو کەسەی قسەکەی لەبارەوە دەکرێ، با پەیوەندییەکی خزمایەتیی، یاخود نزیکایەتیی لەگەڵ ئێوەشدا هەبێ، ئێوە دادگەرانە قسە بکەن .

لێرەدا وەك لە سەرەتاوەش گوتمان : خوا نەیفەرمووە: قسەی ناڕاست مەکەن، یان درۆ مەکەن، یاخود قسەی نادادگەرانە مەکەن، چونکە لێرەدا ئەوەندە بەس نیە، کە ئینسان ناڕاست نەبێ‌و نادادگەر نەبێ، بەڵکو دەبێ دادگەر بێ، وە دەبێ ڕاست بێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُواْ ﴾، هەر کاتێ قسەتان کرد، واتە: هەموو جۆرە قسەیەك، وە لە هەموو بوارەکانی ژیان‌و گوزەراندا، تەنانەت ئەگەر ئینسان باسی بیروبڕوای کۆمەڵێکی نەیارو ناحەزیش بکات، دەبێ دادگەرانە قسە بکات، ئەگەر ڕەخنە لە بیرۆکەیەك دەگرێ، با پێچەوانەی ئیسلامیش بێ، با بیرۆکەیەکی کوفریش بێ، ئەگەر لایەنێکی باشی هەیە، دەبێ لایەنە باشەکەشی ئاماژە پێ بدەی، نەك لەبەرئەوەی ئەو خەڵکەی ناحەزی ئیسلامەو، ئەوان تەنیا ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن‌و، ئاماژە ناکەن بەو شتانەی کە ناتوانن نکووڵییان لێبکەن، یان مشتومڕ هەڵناگرن، کە لایەنی چاك‌و باشن، نابێ مسوڵمانانیش لە کاردانەوەی ئەواندا وابن، بەڵکو پێویستە بە دادگەرانە قسە بکەن، وە بەڕاستیی قسە بکەن.

ئنجا وەك گوتم: با هەڵسەنگاندنی بیروبڕوای کەسێك بێ، کە بڕواشی بە ئیسلام نیە، یاخود با لە کاتی ناکۆکیی‌و مشتومڕیشدا بی، یاخود لە کاتی شایەدییدان دابێ، یان لە کاتی قسەی ئاساییش دابێ، ئینسان دەبێ هەوڵبدات، شتی ناڕاست‌و نادادگەر نەڵێ.

چونکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُواْ ﴾، ئەوە هەمووی دەگرێتەوە، هەر کاتێ قسەتان کرد، دادگەر بن لە قسەکەتاندا، ﴿ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ﴾، با ئەو کەسە کە قسەکەی لەبارەوە دەکرێ‌و قسەکە بە زیانی تەواو دەبێ، خزمیش بێ‌و خاوەنی خزمایەتیی‌و نزیکییش بێ.

ئەم ئایەتە وەك ئایەتی ژمارە (١٣٥)ی سووڕەتی (النساء)ە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ

وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿١٣٥﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! زۆر بە دادگەریی هەڵسن، (واتە: زۆر دادگەریی بچەسپێنن، وە بۆ خوا شایەدیی بدەن، با لەسەر خۆشتان بێ، (واتە: با بە زیانی خۆشتان تەواو بێ)، یاخود ئەو شایەدییدانە بە زیانی بابو دایك، یاخود خزمانیش تەواو بێ، ئەو کەسە کە شایەدییەکەی بۆ دەدرێ، ئەگەر دەوڵەمەند بێ، یان هەژار بێ، خوا لێیان لە پێشترە، {واتە: نە لەبەر سەروەتو سامانی دەوڵەمەندان، نە لەبەر هەژاریی هەژاران، شایەدیی مەگۆڕنو قسەی ناڕاست مەکەن، چونکە خوا لێیان لە پێشترە، وە خواش بۆ خۆی دەفەرموێ قسەی ڕاست بکەن}[1]، بە دوای ئارەزووەکان مەکەون، کە سەرەنجام تووشی نادادگەریی ببن، ئەگەر ئێوەش شایەدییدانەکە لار بکەنو قسەی ناڕاست بکەن، یان شایەدییەکە هەر نەدەن، بێگومان خوا بەوەی کە دەیکەن شارەزایە.

٤) ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْ﴾، وە بە پەیمانی خوا وەفادار بن، واتە: پەیمانی خوا جێبەجێ بکەن، ئەمەش وەك ئایەتەکەی سوورەتی (الإسراء) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿...وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٤﴾﴾، واتە: وەفادار بن بە پەیمان، چونکە پەیمان لێی دەپرسرێتەوە، ئنجا ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە، کە لێرەدا خوا بە شێوەیەك ئەوەی فەرمووە، کە مانای پەیمان (عَهْد) زۆر فراوان دەبێ، چۆن ؟ خوا لێرەدا نەیفەرموە: (بما عاهدتم الله علیه) یان (بما عَهِدَ اللهُ به إلیکم) یان (بما عاهدتم بینکم) بەڵکو چی فەرمووە؟ فەرموویەتی: ﴿وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْ﴾، وە بە پەیمانی خوا وەفادار بن، ئنجا ئەمە دەگونجێ بڵێین :

---

١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

أ / (إضافة المصدر إلى الفاعل) واتە: (ما عهد الله به إليكم من الشرائع، فأوفوا) ئەوەی کە خوا بۆ لای ئێوەی ڕاسپاردوە، پەیمانی لێ وەرگرتوون لە بەرنامەکانیدا، پێی وەفاداربن و جێبەجێیان بکەن.

ب / وە دەشگونجێ وەك عەرەبیی زانەکان دەڵێن: (أن تكون إضافة المصدرِ إلى مفعوله) یانی (ما عاهدتم الله أن تفعلوه، فأوفوا به) ئەوەی کە پەیمانتان لەگەڵ خوا داوە جێبەجێی بکەن، پێی وەفادار بن.

ج / وە دەشگونجێ ئەوە بێ کە پێی دەگوترێ: (الإضافة لأدنى ملابسة) یانی: (العهد الذي أَمَر الله بحفظه وحذَّر من خَتْره ، وهو المعهود التي تنعقد بين الناس بعضهم مع بعض، فأوفوا بها) ئەو پەیمانەی کە خوا فەرمانی پێکردوە، بپارێزرێ، وە ئێوەی ئاگادارکردۆتەوە لەوەی کە بشکێنرێ، کە بریتیە لەو بەڵێن و پەیمانانەی خەڵك لەنێو خۆیاندا دەیاندەن، هەندێکیان بە هەندێکیان بەڵێن و پەیمان دەدەن، جێبەجێی بکەن.

کەواتە: بەهۆی ئەوەوە، کە خوا وەك (محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ : (وَلِهَذَا أُسند اسم العهد إلى اسم الجلالة بطريق الإضافة دون طريق الفعل، بأن يُقالُ: وبما عاهدتم الله عليه ، أو نحو ذلك ، كي يَتَّسِعَ لفظُهُ إلى جميع هذه المعاني)[1] وشەی پەیمان (عَهْد) پاڵدراوەتە لای ناوی خوا، بە شێوەی پاڵدران، نەك بەشێوەی کردار، تاکو ئەو سێ مانایانە هەر سێکیان بگرێتەوە.

واتە: ئەو بەڵێنەی کە خوا لێی وەرگرتوون، پێی وەفادار بن، ئەو بەڵێنەی بە خوای دەدەن، پێی وەفادار بن، وە ئەو بەڵێنانە لە نێو خۆتاندا دەیاندەن ، پێیان وەفادار بن.

بەڵام ئەگەر هاتباو بە شێوەی (فعل) خوا فەرموویای، ئەو کاتە یەك مانای دەبوو، بۆ وێنە: ئەگەر فەرموویای : (وبما عاهدتم الله عليه) ئەو کاتە تەنیا یەك مانای دەگرتەوە، واتە: ئەو پەیمانەی کە داوتانە بە خوا.

---

١) التحرير والتنوير، ج٨، ص١٦٩.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾، ئا ئەوەتان خوا وەصیەتی ئێوەی پێكردووەو ئێوەی پێ ڕاسپاردوە بۆ ئەوەی بیربكەنەوە.

ئەمە لەبەر ئەوەیە كە وەك لە پێشەوە باسمان كرد : هەر كام لەو چوارانە، ئینسان هەر تۆزێ بیر بكاتەوەو وەبیر خۆی بێنێتەوە، شتی ڕیشەدارن لە فیترەتو سروشتی ئینساندا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾﴾، بەڵكو بیر بكەنەوە، یان لەبەرئەوە بووە كە عەرەبەكان ئەو كاتە كە قورئانیان لە نێودا دابەزیوە ، ئەو كردەوانەیان ، هەر چواریان كردوون، بۆیە تەنیا پێویستییان بەوە بووە كە بیریان بخرێتەوە، واتە: زانیویانن، بەلام جاری وایە لێیان بێ ئاگابوون، یان كاڵ بوونەتەوە لەنێویانداو، پێویستییان بە تۆخ كردنەوەو بیرخستنەوە بووە.

## مەسەلەی چوارەمو كۆتایی:

جۆری سێیەم: خوا ﷻ یەك گوناحی گەورە، كە گوناحی دەیەمینە، یان یەك قەدەغەی گەورە كە قەدەغەی دەیەمینە، وە سەرجەم قەدەغەكانی دیكە دەخاتەوە نێو خۆی، دەخاتەڕوو، وە دەشفەرموێ: بە بێ خۆپاراستن لەو قەدەغەی دەیەمە، پارێزكاریی بۆ ئێوە پەیدا نابێ، ئەو گوناهەی دەیەم خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی تەقواو پارێزارییتان پەیدا بێ، دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾، وە ئا ئەمە ڕاستە شەقامی منە، ڕاستە ڕێبازی منە، شوێنی بكەون، وە بە دوای ڕێچكەكان مەكەون، ئەگەرنا شوێنكەوتنی ڕێچكەكان، ئێوە لە ڕاستە شەقامی خوا دەترازێنێو پەرتەوازەتان دەكات، ئا ئەمەشتان خوا وەصیەتی ئێوەی پێدەكات، بەڵكو پارێزتان پەیدابێ، تەقواتان پەیدا بێ.

بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە موبارەكە چەند فەرموودەیەك هەن :

**فەرموودەی یەكەم:** ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ خَطًّا، ثُمَّ قَالَ: (هَذَا سَبِيلُ اللهِ) ثُمَّ خَطَّ خُطُوطَاً عَنْ يَمِينِهِ وعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: (هَذِهِ سُبُلٌ مُتَفَرِّقَةٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيهِ، وَقَرَأَ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُ ...﴿١٥٣﴾﴾الأنعام﴾{أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٤٤٣٧)، وَالطَّيَالِسِي بـرقم: (٢٤٤)، وَالنَّسَائِيُّ فـي "الكـبرى" بـرقم: (١١١٧٤)، والـدَّارَمِي بـرقم: (٢٠٦)، وَالطَّبَـرِي فـي "التفسـير" بـرقم: (١٤١٦٨)، وَصَحَّحَهُ الحَاكِمُ في "المستدرك" برقم: (٣٢٤١)، ووافقهُ الذهبي، وَصَحَّحَهُ أَحْمَد شَاكِر} (كە ئەمە جۆرێكە لە تەفسیركردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ قورئان) واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، هێڵێكی بۆ كێشاین {بە داروو چكەیەك یان بە پەنجەی موبارەكی لەسەر گڵ} وە فەرمووی : ئەمە ڕێبازی خوایە، وە دوایی هەندێ هێڵی خوارو خێچی لە لای ڕاستو چەپی هێڵە ڕاستەكە كێشاو، ئاماژەی بۆ وردە هێڵەكان كردو، فەرمووی: ئەمانەش ڕێچكەكانن و، لەسەر هەر ڕێچكەیەك شەیتانێك هەیە، خەڵكی بۆ بانگ دەكات {ماركسیزم، كۆمۆنیزم، ماویزم كە زیاتر كاتی خۆی هەبوون، وە كاپیتالیزم، لیبرالیزم، سیكۆلاریزم، ناسیۆنالیزم، ئەوانە گشتیان ڕێچكەن}[1]، وە لەسەر هەر كام لەو ڕێچكانە شەیتانێك هەیە، {بەڵكو شەیتانەكان هەن}[2]، كە خەڵكی بۆ بانگ دەكات {بۆ ئەوەی خەڵك ببێتە شوێنكەوتەیان}[3]، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُ ...﴿١٥٣﴾﴾.

**فەرموودەی دووەم :** ﴿عَنْ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً صِرَاطَاً مُسْتَقِيماً، وَعَلَى جَنْبَتَيِ الصِّرَاطِ سُورَانِ، فِيهِمَا

١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

٢) بە هەمان شێوە.

٣) بە هەمان شێوە.

أَبْوَابٌ مُفَتَّحَةٌ، وَعَلَى الأَبْوَابِ سُتُورٌ مُرْخَاةٌ وَعَلَى بَابِ الصِّرَاطِ دَاعٍ يَقُولُ: أَيُّهَا النَّاسُ ! ادْخُلُوا الصِّرَاطَ جَمِيعًا وَلاَ تَتَفَرَّقُوا، وَدَاعٍ يَدْعُو مِنْ جَوْفِ الصِّرَاطِ، فَإِذَا أَرَادَ يَفْتَحُ شَيْئًا مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ ، قَالَ : وَيْحَكَ لا تَفْتَحْهُ فَإِنَّكَ إِنْ تَفْتَحْهُ تَلِجْهُ! وَالصِّرَاطُ : الإِسْلامُ ، وَالسُّورَانِ : حُدُودُ اللهِ تَعَالَى، وَالأَبْوَابُ الْمُفَتَّحَةُ: مَحَارِمُ اللهِ تَعَالَى، وَذَلِكَ الدَّاعِي عَلَى رَأْسِ الصِّرَاطِ: كِتَابُ اللهِ، وَالدَّاعِي فَوْقَ الصِّرَاطِ: وَاعِظُ اللهِ فِي قَلْبِ كُلِّ مُسْلِمٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٦٧١) تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَأَخْرَجَهُ أَيْضَاً الحَاكِمُ برقم: (٢٤٥)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم ولا أعرف له علة، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٧٢١٦)، وَالترمِذِيُّ برقم: (٢٨٥٩ ) وَقَالَ: غَرِيبٌ، وَالنَّسَائِيُّ في الكبرى برقم: (١١٢٣٣)، وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع، رقم: (٣٨٨٧)}، واتە: نەوواسی کوڕی سەمعان خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خوا ﷺوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: خوا وێنەی هێناوەتەوە بۆ ڕاستە شەقامو ئایینو بەرنامەی خۆی بە ڕێیەکی ڕاست، وە لە هەردوو تەنیشتی ئەو ڕێگا ڕاستەدا دوو دیوار هەن، (دوو شوورە هەن) ئەو دوو شوورەیە کە بە دەوری ئەو ڕێگایەوە کراون، دەرگایان تێدانو کراونەتەوە، وە دەرگەکان کە کراونەوە پەردەیان بەسەردا دراوەتەوە، پەردەکە دەرگاکەی پەنهان کردوە، وە لەسەری کۆتایی ئەو ڕێگایە دەرگایەك هەیە بانگکەرێکی لێیە، بانگ دەکات دەڵێ: ئەی خەڵکینە! وەرن بەم ڕاستە شەقامەدا {بڕۆن کە ئەو دوو شوورەیەی لە دەورەن}، بچنە نێو ئەو ڕاستە شەقامەوە، وە پەرتەوازە مەبن، وە لەسەری ڕێگاکەش بانگخوازێکی دیکە بانگ دەکات، هەر کاتێ ئینسان ویستی یەکێك لەو دەرگایانە بکاتەوە کە لەملاولای ڕێگەکەن، {واتە: پەردەکە لابداتو بچێتە نێو ئەو دەرگایە} ئەو کەسەکە کە لە سەری ڕێیەکە ڕاوەستاوە دەڵێ: وریابە ! بێقەزابی دەرگاکە مەکەوە، چونکە ئەو پەردەیە بکەیەوە، دەچیە نێوی.

ئنجا {پێغەمبەر ﷺ شەرحی کرد، مەبەست لەو پێنج شتانە چییە؟ ئەو ڕێیەو ئەو دوو شوورەیەو، ئەو دەرگایانە کە پەردەیان بەسەردا دراوەو ، ئەو بانگکەرە کە لە کۆتایی دەرگاکە بانگ دەکاتو، ئەو بانگکەرەش کە لەسەر

ڕێیەکەوە بانگ دەکات؟)[١] فەرمووی : ڕێیەکە بریتیە لە ئیسلام، دوو شوورەکەش (دوو دیوارەکە) سنوورەکانی خوان، (ئەو شتانەن کە خوا قەدەغەی کردوون)، وە دەرگا کراوەکان، بریتین لە قەدەغەکراوەکانی خوا، وە ئەو بانگخوازەی کە لە سەری ڕێیەکەیە لە لای کۆتایی دەرگاکە، کتێبی خوایە (قورئان)، وە ئەو بانگخوازەش کە لەسەر ڕێیەکەیە لەلای سەرەوە، ئەوە ئامۆژگەرییکەری خوایە لە دڵی هەموو ئینسانێکی مسوڵماندا.

تەماشا دەکەین پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە جوانیی ئەم ئایەتەی بۆ ئێمە وێناکردوە، بۆئەوەی کە بە شێوەیەکی تەصویریی لێی تێبگەین، جا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە مەسەلەی نواندن (تمثیل) شتێکی ڕەوایە، پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی لێرەدا نواندنێکی کردوە، واتە: (تمثیل)ی کردوە، ئەو چەمكو واتا مەعنەوییانەی لە شێوەیەکی بەرهەستدا خستۆتە بەرچاوی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، وە بەرچاوی ئێمەش، بۆ ئەوەی باش لێی تێبگەین.

ئنجا لە کۆتایی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتە موبارەکانەدا دەڵێین: ئەم ئایاتانە کە دە (١٠) قەدەغەی سەرەکییان تێدا بوون، بە گوناهو قەدەغەی شیرك دەستیان پێکرد، کە پێچەوانەی خوا بەیەکگرتنە، وە بناغەو نێوەڕۆکی مسوڵمانەتیی، بریتیە لە خوا بەیەکگرتنو، شتەکانی دیکە هەموویان بە دەوری ئەو ئەسڵەدا دەخولێنەوە : ئەگەر عیبادەتەکانن، ئەگەر ڕەوشتو خووەکانن، ئەگەر خۆپارستن لە قەدەغەکانن، ئەگەر جێبەجکردنی ئەرکە شەرعییەکانن، ئەگەر هەڵسوکەوتەکانی بواری کۆمەڵایەتییو سیاسییو ئابوورییو جەنگو ئاشتیین، هەموویان پەیوەستن بە خوا بەیەکگرتنەوە، چونکە تۆ هەر شتێك لەوانە: ئەگەر فەرمانە ئەنجامی دەدەی، وە ئەگەر قەدەغەیە خۆی لێ دەپارێزی، لەبەر ئەوەیە کە خوا وایفەرمووەو، بۆئەوەی خوا لێت ڕازی بێ لە دنیاو لە دواڕۆژدا، وە لە دنیادا لە عەیبداریی دووربیو، لە قیامەتیش سەرفرازو سەربەرز بی، ئنجا قەدەغەی یەکەمیان بریتیە لە چی؟ بریتیە لە شیرك، وە کۆتا قەدەغەشیان بریتیە لە چی؟ بریتیە لە لادان لە ڕێبازی خواو پەرتەوازە نەبوون، واتە: قەدەغەی یەکەمیان

---

١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

خۆپارستنە لە شیرك بەهۆی خوا بەیەكگرتنەوە، كۆتا قەدەغەش بریتیە لە: خۆپارستن لە پەرتەوازەیی، بۆئەوەی یەكڕیزیی (وحدة) لە خۆماندا بپارێزین، بۆیە دەتوانین بڵێین: ئیسلام دینی تەوحیدو وەحدەتە، ئیسلام دینێكە بناغەكەی بریتیە لە خوا بەیەكگرتن‌و، یەكڕیزیی‌و پێكەوە بوون‌و، لەیەك نەترازانی مسوڵمانان.

وە دەربارەی ئایەتی كۆتایی كە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، پێمان دەفەرموێ: كە بەبێ گرتنە بەری ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو ڕووەكان‌و لە هەموو بوارەكانی ژیاندا: لە بواری عیبادەتدا ، دەبێ عیبادەتت وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بێ، وە دەبێ هەڵسوكەوت‌و خوو ڕەوشتت، وەك هی ئەو بێ، وە دەبێ سیاسەتت ، وەك هی ئەو بێ، وە دەبێ بازرگانیی‌و مامەڵەت، وەك هی ئەو بێ، هەموو ئەوانەت پێویستە وەك هی پێغەمبەر ﷺ بن، وە بە پێی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بێ، ئنجا دەبی بە ئەهلی تەقوا، كەواتە: پارێزكار كێیە ؟ ئەو كەسەیە كە لە وردو درشتی ژیانیدا، بە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەوێ.

ئنجا خوا لە دوای پێنج قەدەغەی یەكەم دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، وە لە دوای چوار قەدەغەی دووەم، دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، وە لە دوای قەدەغەی كۆتایی، دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە: ئینسان دەبێ عەقڵی بەكاربێنێ، ئنجا ئەگەر عەقڵت بەكارهێناو بیرت كردەوە، ئەو كاتە پەند وەردەگری، وە كە پەندت وەرگرت، پارێزكار دەبی، كەواتە: (تَعَقُّل وَتَذَكُّر وَتَقْوَى) سێ شتی پێكەوە پەیوەستن، كێ دەتوانێ ئەهلی تەقوا بێ؟ كەسێ كە بتوانێ ئەو ڕاستییانەی كە خوای پەروەردگار خستوونیە ڕوو لە قورئان‌و سوننەتدا، وە لەگەڵ فیطرەتیشدا تێكهەڵكێشراون، بیرخۆیان بێنێتەوە.

ئنجا ئایا کێ دەتوانێ ئەو ڕاستییانە وەبیرخۆی بێنێتەوە ؟ کەسێ کە عەقڵی بەکاربێنێ، کە عەقڵت بەکارهێنا، ڕاستییەکانت دەکەونەوە بیر.

وە ئەگەر ڕاستییەکانت کەوتنەوە بیرو پەندت لێوەرگرتن، دەبی بە ئەهلی تەقوا .

ئنجا جێی سەرنجیشە کە لە تەوراتدا لە (سِفْرُ الْخُرُوجِ) لە ئیصحاحی بیستەمدا، ئەو دە وەصیەتانە هەن، بەلأم دیارە بە صیغەو تەعبیرێکی دیکە کە ئاوا دەست پێدەکەن: {أَنَا الرَّبُّ إِلَهُكَ الَّذِي أَخْرَجَكَ مِنْ أَرْضِ مِصْرَ مِنْ بَيْتِ الْعُبُودِيةِ. لاَ يَكُنْ لَكَ آلِهَةٌ أُخْرَى أَمَامِي. لاَ تَصْنَعْ لَكَ تِمْثَالاً مَنْحُوتاً وَلاَ صُورَةً مَا مِمَّا فِي السَّمَاءِ مِنْ فَوْقُ وَمَا فِي الأَرْضِ مِنْ تَحْتُ وَمَا فِي الْمَاءِ مِنْ تَحْتِ الأَرْضِ. لاَ تَسْجُدْ لَهُنَّ وَلاَ تَعْبُدْهُنَّ لأَنِّي أَنَا الرَّبَّ إِلَهَكَ إِلَهٌ غَيُورٌ أَفْتَقِدُ ذُنُوبَ الآبَاءِ فِي الأَبْنَاءِ فِي الْجِيلِ الثَّالِثِ وَالرَّابِعِ مِنْ مُبْغِضِيَّ. وَأَصْنَعُ إِحْسَاناً إِلَى أُلُوفٍ مِنْ مُحِبِّيَّ وَحَافِظِي وَصَايَايَ. لاَ تَنْطِقْ بِاسْمِ الرَّبِّ إِلَهِكَ بَاطِلاً لأَنَّ الرَّبَّ لاَ يُبْرِئُ مَنْ نَطَقَ بِاسْمِهِ بَاطِلاً. اُذْكُرْ يَوْمَ السَّبْتِ لِتُقَدِّسَهُ. سِتَّةَ أَيَّامٍ تَعْمَلُ وَتَصْنَعُ جَمِيعَ عَمَلِكَ. وَأَمَّا الْيَوْمُ السَّابِعُ فَفِيهِ سَبْتٌ لِلرَّبِّ إِلَهِكَ. لاَ تَصْنَعْ عَمَلاً مَا أَنْتَ وَابْنُكَ وَابْنَتُكَ وَعَبْدُكَ وَأَمَتُكَ وَبَهِيمَتُكَ وَنَزِيلُكَ الَّذِي دَاخِلَ أَبْوَابِكَ. لأَنْ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ صَنَعَ الرَّبُّ السَّمَاءَ وَالأَرْضَ وَالْبَحْرَ وَكُلَّ مَا فِيهَا وَاسْتَرَاحَ فِي الْيَوْمِ السَّابِعِ[١]. لِذَلِكَ بَارَكَ الرَّبُّ يَوْمَ السَّبْتِ وَقَدَّسَهُ. أَكْرِمْ أَبَاكَ وَأُمَّكَ لِتَطُولَ أَيَّامُكَ عَلَى الأَرْضِ الَّتِي يُعْطِيكَ الرَّبُّ إِلَهُكَ. لاَتَقْتُلْ. لاَ تَزْنِ. لاَ تَسْرِقْ. لاَ تَشْهَدْ عَلَى قَرِيبِكَ شَهَادَةَ زُورٍ. لاَتَشْتَهِ بَيْتَ قَرِيبِكَ، لاَ تَشْتَهِ امْرَأَةَ قَرِيبِكَ وَلاَ عَبْدَهُ وَلاَ أَمَتَهُ وَلاَ ثَوْرَهُ وَلاَ حِمَارَهُ وَلاَ شَيْئاً مِمَّا لِقَرِيبِكَ...}[٢]، واتە: من پەروەردگارتم ئەو پەرستراوەی کە تۆم لە میسرٍ دەرباز کرد، دوایی دەڵێ: لەگەڵ باب‌و دایکت دا چاك بە، وە

١) پێشتر بەرپەرچی ئەو بیرۆکە ئەفسانەییانەمان داوەتەوەو، دەشتوانی سەرنجی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) بدەی بەرگی سێیەم باسی : (الإيمان بكتب الله تعالى).

٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٢٠.

ئەزیەتیان مەدە ... دەڵێ: قەتڵ مەکە، زینا مەکە، دزیی مەکە، شایەدیی بە دۆر بۆ نزیکو خزمانت مەدە... هتد.

دیارە ئەوەی کە خوای پەروەردگار هێناونی لەم کتێبی کۆتایی خۆیدا، بە شێوەیەکی تەواوتر لە کتێبەکان هێناونی، ئەگەرنا وەك پێشتر باسمان کرد : ئەو دە وەصیەتە کە بریتین لە خۆپاراستن لەو دە قەدەغەکراوە، بە ڕای زۆربەی زانایان، لە هەموو بەرنامەی پێغەمبەرەکانی دیکەشدا هاتوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەژدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی ژمارە : (١٥٤ تا ١٦٠) تەفسیر دەکەن، لەو حەوت ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی پێدانی کتێب بە مووسا ﷺ دەکات، کە مەبەست پێی تەوراتە، وە خوا ﷻ تەورات بە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێكو، ڕێنماییو بەزەیی خۆی وەسف دەکات.

پاشان باسی قورئان دەکات، وە بە پیرۆزو بەرهەمدار وەسفی دەکات، وە فەرمان بە ئیمانداران دەکات کە شوێنی بکەونو پارێز بکەن، تاکو شایستەی بەزەیی خوا بن.

ئنجا خوا ﷻ ئاماژە دەکات بە حیکمەتو ئامانجی دابەزێنرانی قورئان لە نێو گەلی عەرەبدا، دەکات، کە بریتیە لە بیانوو برکرانیان، تاکو بیانوویان نەمێنێ، وە پاشان هەڕەشەیان لێدەکات لە حاڵێکدا کە لاملو لادەر بن لە قورئان، دەبێ چاوەڕێی سزای توندی خوابن، وە دوایی خوا هەڕەشە لە کەسانێك دەکات کە لە قورئان لادەدەن، بە هاتنی قیامەت، وە دەرکەوتنی نیشانەکانی قیامەت، وە ڕایدەگەیەنێ کە لەو کاتەدا : ئیمان هێنان، دادی کەس نادات، وە چاکەکردنیش دادی کەس نادات.

وە لە کۆتایی دا خوای بەرزو مەزن هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە ئایینەکەیانیان بەش بەش کردووەو، بوونە تاقم تاقمو پەرتەوازە بوون، وە ڕایدەگەیەنێ کە ئەگەر چاك بنو، بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێبازی خوا، ئەوە هەر چاکەیەك کە بیکەن بە دە (١٠) بەرامبەر پاداشت دەدرێتەوە، دیارە لە سوورەتی (البقرة)دا تاکو یەك بە حەوت سەدیش ڕۆیشتوە، کە دوایی باسی دەکەین، بەڵام خراپە تەنیا وەك خۆی سزای لەسەر هەیە، وە هیچ کەسیش ستەمی لێناکرێ .

﴿ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ
شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ
فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ
مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا
ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ
فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ
ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ
نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟
إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ
أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ
وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

((دوایـی کتێبمـان دا بە مووسا، تێرو تەواوو تەواکەر بوو، بۆ چاکەی ئـەو کەسـەی چاکـەی کــرد، وە ڕوونکــەرەوە بــوو بــۆ هــەموو شــتێك (کــە کۆمەڵگـای ئـەو کاتـە پێویســتیان بــوو)، وە ڕێنمـایی‌و بـەزەیی بـوو (لـە خــواوە) بەڵـکو بــڕوا بـە دیـداری پەروەردگاریــان بێنــن. ﴿١٥٣﴾ وە ئــەم (قورئــان)ەش کتێبێکــە دامانبەزانــدوە، بەپێــزو بەرهــەمدارە، دەجــا شــوێنی بکــەون، وە پــارێز بکــەن، بەڵکــو بـەزەییتــان لەگــەڵ بنوێنـرێ. (وە ئەم قورئـانەمان دابەزاندە سەرتان، ئەی گەلـی عـەرەب !) نـەوەك بڵێن: کتێب تەنیا بۆ دوو کۆمەڵ لەپێش ئێمـەدا (واتـە جوولەکـەو دیانـەکان) دابـەزێنراوە، وە ئێمـە لـە خوێنــدنەوەو فێرکردنیـان (بەهــۆی نەزانینــی زمانیانــەوە) بێ‌ئاگــابووین. ﴿١٥٤﴾ یــان نــەوەك بڵــێن: ئەگــەر هاتبــاو ئێمــە کــتێبمان دابەزێندرابــایە ســەر، بــە دڵنیــاییەوە ئێمــە لــەوان ڕێیــڕاســت گرتووتــر دەبوویــن، دەجــا ئــەوە لــە پەروەردگارتانـەوە بەڵگـەیەکـی ڕوون‌و، ڕێنمـایی‌و بەزەییتـان بـۆ هـات، ئنجا ئایا کـێ ستەمکارترە لە کەسێك کە بە ئایەتەکانی خوا بێبڕوایەو، لێیان لامل دەبـێ! بێگومـان لەمـەودوا بـە سـزایەکی زۆر خـراپ، سـزای ئـەو کەسـانە دەدەیـن، کـە لـە ئایەتـەکانمان لادەدەن (یـان خەڵکیـان لــێ لادەدەن) بەهــۆی ئــەوەوە کــە لـێیــان لامـل دەبــن (یــان خەڵکــیان لــێ لادەدەن) ﴿١٥٧﴾ ئایــا ئــەوان چاوەڕێــی چــی دەکــەن؟ مەگــەر ئــەوە کــە فریشتەیان بێنـەلا، یان پـەروەردگـارت بــێ، یـان هەنـدێ لـە نیشـانەکانی پـەروەردگارت بێن، ڕۆژێك کە هەندێ لە نیشانەکانی پەروەردگـارت دێـن، هیـچ کەسـێك ئیمانەکـەی سـوودی پێناگـەیەنــێ، کــە پێشتر ئیمـانی نەهێنـابــێ، یـان بەپێــی ئیمانەکـەی چاکـەی وەدەست نەهێنـابـێ، بڵـێ: چاوەڕێ بن، ئێمەش لە چاوەڕوانانیـن ﴿١٥٨﴾ بێگومان ئەوانـەی ئایینەکـانیان پەرتەوازەو بـەش بەش کردوەو بوونە دەستە دەستە، تۆ هیچ پەیوەندییـت پێیانــەوە نیــە، بەڵکو کاروباریان دەگەڕێتەوە بۆ لای خـوا، پاشـان هـەواڵیــان پێدەدات، بـەوەی کـە دەیانکــرد ﴿١٥٩﴾ هـەر کـەس چاکـە بێنــێ (بـۆ لای خــوا) بـە ئەنـدازەی دە بەرانبــەری پاداشــتی هەیـە، وە هەرکـەسێکــیش خراپـە بێنــێ (بـۆ لای خـوا) تەنیــا بەئەندازەی خراپەکـەی سـزا دەدرێ، وە ئـەوان هیچ ستەمیان لـێنـاکـرێ ﴿١٦٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(تَمَامًا ): دوو واتای هەن، واتە: ئەو کتێبەی دامان بە مووسا کە تەوراتە، کتێبێکی کاملّو تێرو تەواو بوو، یاخود تەواوکەربوو، (تَمَام الشَّيء : انْتَهَاؤُهُ إِلى حَدٍّ لا يَحْتَاج إِلى شَيء خَارِج عَنْهُ وَالنَّاقِص عكسُهُ)، واتە: شتێك کە بگوترێ ئەو شتە تەواوە، یانی: گەیشتۆتە رادەیەك پێویستیی بە دەرەوەی خۆی نیە، تێرو تەواوە، پێچەوانەی (ناقص) کە پێویستیی بە دەرەوەی خۆی هەیە، بۆئەوەی تەواو بکرێ.

(مُبَارَكٌ ): (أَصْلُ البَرْك : صَدْرُ البَعير، وَبرَك البَعِيرُ: أَلْقَى بَرْكَهُ، وَسُمِّيَ مَحْبَسُ المَاءِ بِرْكة، وَالبَرَكَةُ: ثبُوتُ الخَيْرِ الإِلَهي فِي الشيء) وشەی (بَرْك) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا، بە سینگی حوشتر دەگوترێ، بۆیە کە دەگوترێ: (بَرَكَ البَعِيرُ: أَلْقَى بَرْكَهُ) واتە: سینگی خۆی لە زەوی دانا، ئنجا ئەو شوێنەی ئاوی تێدا حەپس دەکرێ، پێی دەگوترێ: (بِرْكة)، واتە: گۆماو ، شوێنێك کە ئاوی تێدا وەستابێ، (وَالبَرَكة: ثبُوتُ الخَيْرِ الإِلَهي فِي الشيء)، واتە: (بَرَكة) بریتیە لە چەسپانی بەرەکەتو پێزی خوا لە شتێکدا.

(دِرَاسَتِهِمْ ): واتە: لە خوێندنیانو لێکۆڵینەوەیان، (دَرَسَ الكِتَابَ وَنَحْوه دَرْسا وَدِرَاسة: قرأهُ قِرَاءَةً وَأَقْبَلَ عَلَيْهِ لِيَحْفَظَهُ) ئەگەر بگوترێ: کتێبەکەی دەرس کرد، یاخود هەر شتێکی دیکەی دیراسە کرد، واتە: خوێندیەوەو گرنگیی پێدا، بۆ ئەوەی لەبەری بکاو تێیبگات. کەواتە: (دِرَاسة) جیایە لە (قِرَاءَة)، (دِرَاسة) ئەوەیە بیخوێنیەوەو لەبەری بکەیو لێی تێبگەی، بەڵام (قِرَاءَة) ئەوەیە بەس بخوێنرێتەوە.

(وَصَدَفَ ): (صَدَفَ يَصْدِف عَنْهُ صُدُوفاً: أَعْرَضَ وَ مَالَ، وَصَدَفَ فُلاناً عَنِ الشَّيءِ: صَرَفَهُ) وشەی (صَدَف) دوو واتای هەن: واتایەکیان یانی: لەو شتەی لاداو رووی لێوەرگێڕا، واتایەکەی دیکەی ئەوەیە کە کەسێك، کەسێك لە شتێك بگێڕێتەوە، دەڵێن: فلان کەسی لێ گێڕایەوە، کەواتە: (صَدَف) ئەوەیە کە ئینسان بۆخۆی لابدات لە ڕێیە، یاخود خەڵکی لابدات، هەردوو واتاکەی هەن.

(سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ ): واتـە: (السُّوءُ: كُـلُّ مَـا يَغُـمّ الإِنْسـانُ، وكُـلّ مَـا يَقبُـحُ، اسْم جَـامِع للآفَاتِ) وشەی (سُوء) هەر شتێکە کە ئینسان پێی نارەحەت بێ، پێی ناخۆش بـێ: نەخۆشیی بێ، ناخۆشـیی بێ، قسەی ناخۆش بێ، هەژاریی بێ، هەرچی بێ، هەر شتێك کە ئینسان دڵی پێی تەنگ بێو پێی نارەحەت بێ، هەروەهـا (سُـوء) هەر شتێکە کـە ناشیرینو ناقۆڵابێ، هەروەها وشەی (سُوء) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو دەردو بەڵاو نەهامەتییەکان، کە خوا دەفەرموێ: (سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ ) یانی: سزایەکی زۆر خراپ.

(فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ ): واتـە: دینەکەی خۆیان بـەش بـەشو پەرتـەوازە کـردوە، دەڵـێ: (فَـرَّقْتُ بَـيْنَ الشَّـيْئَينِ: فَصَّلْتُ بَيْنَهُمَـا، سَـوَاءٌ أُدْرِكَ بالبَصَـرِ أَو البَصِـيرَة، وَالتَّفرِيـق أَصْـله للتَّكْثِير، وَيُقَالُ ذَلِكَ فِي تشتيت الشمل والكَلِمَة)، (فَرَّقْتُ بَيْنَ الشَّيْئَينِ) واتە: دوو شتم لێك جیاکردنەوە، (فَصَّلْتُ بَيْنَهُمَا) ئەو دوو شتەم لە یەك جیاکردنـەوە، ئنجـا چ ئەو شتە بەچاو ببـینرێ، بۆ نموونە: دوو شت دانـراون لە پەنای یەکن، لە یـەکیان دووردەخەیەوە، یاخود بەعەقڵ بزانرێ، بۆ وێنە: یەکێ دەڵـێ: من ئەو بابەتەم وا بۆ باسکردن، کە هەقو ناهەقم بۆ لێك جیاکردنەوە، ئەوە بە عەقڵ دەبینرێ، یان کوفرو ئیمانم بۆ لە یەك جیاکردنەوە، ئەوە دیارە لە یەك جیاکردنەوەی کوفرو ئیمان، یـان هەقو ناهەق، یان حـەڵاڵو حـەرام، بە عـەقڵو بـە دڵ دەبیـنـرێ ، نەك بە چاو.

(شِيَعٗا ): (شیع) یان (أشیاع) کـۆی (شیعة)یـە، (وَالشيعَةُ: من يتقوَّى بِهِم الإِنْسـان وَيَنْتَشِـرُونَ عَنْـهُ)، هـەر کۆمـەڵێك کـە ئینسـان پشـتی پێیـان قـایم بـێ، وە لـەوەوە بـڵاوببنـەوە، پێیان دەگوتـرێ : (شیعة).

وە کـە بـە شیعەی بەرانبـەر ئەهلـی سوننەتو جەماعـەت دەگوتـرێ: (شیعة) لەبەرئەوە بووە ، کـە وەك کۆمەڵێك بوون، کـاتی خۆی بە حیسـابی خۆیـان (ئێمـە ناڵێین: وایـە) بە حیسـابی خۆیان بەرگرییـان لە عەلی کوڕی ئەبـی طـالیـب خـوا لێی ڕازی بێ، کردوە، وە لە بنەماڵەی پێغـەمبەر ﷺ ، کـە بە زۆریـی عەلـی کوڕی ئەبو طالیـب و بنەماڵەی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ لەسـەریان قـەرزدار بـوونـەوە !.

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی دە (١٠) شتە قەدەغەکراوە سەرەکییەکانی کرد، کە وەك پێشتر گوتمان : بەڕای زۆربەی زانایان لە بەرنامەی هەموو پێغەمبەرانی دیکەدا ئەو شتانە هەر قەدەغەبوون، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، دوایی کتێبمان بە مووسادا، دیارە ئەو کتێبە لە شوێنی دیکە باسکراوە، کە مەبەست پێی تەوراتە، چونکە مووسا ﷺ یەك کتێبی پێدراوە، ئەویش بریتیە لە تەورات، وە تەوراتیش بە زمانی عیبریی بە مانای شەریعەت دێ، یانی بەرنامە، هەروەك چۆن ئینجیل واتە: مزگێنی، موژدە، ئنجا زانایان ـ وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین ـ دەڵێن: وشەی (ثم) لە زمانی عەرەبییدا (الترتيب والتراخي) بۆ ڕیزبەندییە کە پێی بچێ، بۆ وێنە: ئەگەر سێ نەفەر بێن ئەحمەد لە پێشەوە بێ، مەحموود لەدوای وی بێ و، دڵشاد لەدوای وی بێ، دەگوترێ: (جَاءَ أَحْمَد، ثُمَّ جَاءَ مَحْمُود، ثُمَّ جَاءَ دلشاد)، (ثُمَّ) لە زمانی عەرەبییدا بۆ ڕیزبەندییەو بۆ ئەوەشە کە پێی چووبێ، زانایان لێرەدا دەڵێن: تەورات کە بە مووسا ﷺ دراوە لە پێش قورئاندایە، واتە: پێش ئەوەی قورئان بە موحەممەد بدرێ، تەورات بە مووسا ﷺ دراوە، ئەدی بۆچی لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، دوایی کتێبمان بە مووسادا ؟ زانایان دەڵێن : ئەو (ثُمَّ)ەیە ، بۆ ڕیزبەندیی هەواڵدانە، نەك بۆ ڕیزبەندیی زەمانیی، ئەگەرنا دیارە تەورات لە پێش قورئانەوە بووە، لە ڕووی ڕیزبەندیی کاتییەوە.

(محمد متولي الشعراوي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا ئەو وێنەیە دەهێنێتەوەو وێنەیەکی جوانیشە، دەڵێ: ئەگەر بابێك بە کوڕەکەی خۆی کە لە زانکۆیە بڵێ: ڕۆڵە گیان! من لە زانکۆ مشوورم لێخواردووی‌و مشوورت لێدەخۆم، ئنجا لە ئامادەییش مشوورم لێخواردووی، ئنجا لە قۆناغی سەرەتاییش مشوورم لێخواردووی، ئەگەر بە (ثُمَّ)ش بیڵێ، لێرەدا مانای وانیە کە قۆناغی زانکۆ، لەپێش قۆناغی

ئامادەیی‌و قۆناغی سەرەتاییە، بەڵام ئەو (ثُمَّ)ەیە بۆ ڕیزکردنی هەواڵدانەکەیە، نەك بۆ ڕیزکردنی زەمەنیی.

دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە خوا دوای ئەوەی باسی ئەو دە (١٠) شتە قەدەغەکراوە بنەڕەتییانەی کرد لە پێشەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، یانی: جگە لەو دە (١٠) قەدەغەکراوەش کە بۆ هەموو پێغەمبەران هاتوون، هەموو پێغەمبەران خەڵکانی خۆیان لێ ئاگادار کردوونەوە، ئنجا دوای ئەوەش تەوراتمان بە مووسادا، کەواتە: لەو حاڵەتەدا ئەو (ثُمَّ)ەیە لە شوێنی خۆی دا بەکارهاتوە بۆ ڕیزبەندیی‌و بەدوای یەکدا هاتنە، چونکە تەورات دوای ئەوە هاتوە کە خوا بۆ هەموو پێغەمبەرانی دیکە، ئەو دە (١٠) قەدەغەکراوەی کردوون بە بەرنامە، کە بە ئوممەتەکانی خۆیانیان ڕابگەیەنن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ تَمَامًا ﴾، لێرەدا ﴿ تَمَامًا ﴾، یان بە مانای تێرو تەواو دێ، یان بە مانای تەواوکەر دێ، ﴿ عَلَى ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ ﴾، وەك تەواوکەر بۆ کەسێ کە چاکەی کرد، کە مەبەست پێی مووسایە، یان مووساو ئوممەتەکەینی، یانی : وەك تەواوکەر بۆ ئەو نیعمەتانەی کە خوا پێیدابوون، تەوراتیشمان پێدان، ﴿ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ ﴾، وە ڕوونکەرەوە بۆ هەموو شتێك، ئنجا ئایا هەموو شتێك لە تەوراتدا باسکراوە؟ نەخێر، بەڵکو لێرەدا مەبەست هەموو شتێکە، کە ئەوان پێویستیان بووەو، کۆمەڵگەی ئەوکاتە پێویستی بووە، ﴿ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴾، وە ڕێنمایی بوو، وە بەزەیی خوا بوو، بەڵکو بڕوا بە دیداریی پەروەردگاریان، بێنن.

ئنجا خوای بالادەست دێتە سەر باسی قورئان، دەفەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ ﴾، وە ئەمەش کتێبێکە دامانبەزاندوە، بەرهەمدارە، بە پیتو پێزە،

بەرەکەتی تێدایە، ﴿ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ ﴾، دەجا شوێنی بکەونو پارێز بکەن، لە چەند شوێنێك لە قورئاندا، تەوراتو قورئان بەیەکەوە هاتوون، چونکە هەم تەورات شەریعەتی تێدابووە، هەم قورئانیش کامڵترین شەریعەتی خوای پەروەردگاری تێدایە، بەزۆریی پێکەوە هاتوون.

لێرەش کە خوا ﷻ باسی تەورات دەکات، ئنجا دەفەرموێ: ئەمەش کتێبێکە دامانبەزاندوە بە پیتو پێزە، دەجا شوێنی بکەونو پارێز بکەن، واتە: خۆتان بپارێزن لەوەی لێی لادەن، ﴿ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴾، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ، زانایان دەڵێن: (لَعَلّ مِنَ اللّٰهِ وَاجِبَة)، (لَعَلّ) لە زمانی کوردییدا دەبێتە: ڕەنگە، لەوانەیە، بەڵام ئەگەر خوای پەروەردگار بۆ شتێك بەکاریهێنا، ئەوە ئەو شتەی لەسەر خۆی پێویست کردوە، واتە: ئەگەر دوای قورئان بکەون، وە پارێز بکەن لە خۆلێلادانی، بە تەئکید خوای پەروەردگار بەزەییتان لەگەڵدا دەنوێنێ.

ئەوجار باسی حیکمەتی ناردنی قورئان دەکات، لەنێو گەلی عەرەبدا، ئەم قورئانە دیارە کە بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بەڵام پێشێ لە نێو گەلی عەرەبداو بە زمانی عەرەبیی هاتوە : ﴿ أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلۡكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيۡنِ مِن قَبۡلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمۡ لَغَٰفِلِينَ ﴾، ئەم قورئانەمان بۆیە لەنێو ئێوەدا دابەزاند (ئەی گەلی عەرەب !) بۆئەوەی نەڵێن: بێگومان کتێب تەنیا لەنێو دوو کۆمەڵ لە پێش ئێمەدا دابەزێنراوە، کە مەبەست جوولەکەو نەصرانییەکانە، ﴿ وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمۡ لَغَٰفِلِينَ ﴾، وە ئێمە لە لێکۆڵینەوەی ئەوانو، لە خوێندنەوەی ئەوانو ، لە توێژینەوەی ئەوان، بۆ کتێبەکەیان بێئاگابووین، بۆچی ؟ چونکە زمانی ئەوانیان نەزانیوە، ئەگەر تەورات بووە، ئەگەر ئینجیل بووە، دیارە عەرەب زمانی ئەوانیان نەزانیوە، واتە: بۆئەوەی ئەو بیانووەتان نەبێ، بۆیە قورئانمان لەنێو ئێوەدا دابەزاند، ﴿ أَوۡ تَقُولُواْ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی کە نەڵێن: ﴿ لَوۡ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡكِتَٰبُ

﴿ لَكُنَّآ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمۡ ﴾، ئەگەر ئێمە کتێبمان بۆ سەر دابەزیبایە، ئێمە لەوان ، واتە: لە جوولەکەو نەصرانییەکان، ڕێی ڕاستگرتووتر دەبووین، ئەوان باش بەدوای کتێبی خوا ناکەون، ئێمە باشی بەدوا دەکەوتین، ئەگەر خوا لەنێو ئێمەدا کتێبی دابەزاندبایە، ﴿ فَقَدۡ جَآءَكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞۚ ﴾، دەجا ئێستا ئەوە خوا ئەو بیانووەی بڕیون، ئەوە لە پەروەردگارتانەوە، بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکراتان بۆ هات، وە ڕێنماییتان بۆ هات، وە بەزەییتان بۆ هات، کە هەر سێکیان وەسفن بۆ قورئان، واتە: ئەو قورئانەی کە خوا بۆی ناردوون بەڵگەیە، بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرایە، وە ڕێنماییو ڕێپیشاندەرە، وە مایەی بەزەییو ڕەحمەتی خواشە.

مانای وایە: ئەوە بیانووتان نەما.

هەڵبەتە دەشگونجێ لێرەدا تەنیا مەبەست پێی گەلی عەرەب نەبێ، چونکە خەڵکی دیکەش جگە لە جوولەکەو نەصرانییەکان، جا کورد بووە، فارس بووە، هەر گەلێك بووە، گوتوویانە: خوا هەر تەوراتی بۆ جوولەکەکان ناردووە، ئینجیلیشی بۆ نەصرانییەکان ناردوە، بەڵام ئێمە خۆ هیچ کتێبمان بۆ نەهاتوە؟ میللەتانی دیکەش بۆیان هەبووە وابڵێن، بەڵام خوای کاربەجێ کە قورئانی دابەزاندوە، بۆ هەموو بەشەر، مانای وایە هەموویانی بیانووبڕ کردوون، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانێو بڕوای پێیان نیە ! ﴿ وَصَدَفَ عَنۡهَاۗ ﴾، وە لێیان لادەدات، یاخود خەڵکیان لێ لادەدات ! ﴿ سَنَجۡزِي ٱلَّذِينَ يَصۡدِفُونَ عَنۡ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يَصۡدِفُونَ ﴾، بێگومان لەمەودوا، بە سزایەکی زۆر خراپو بەئێش، سزای ئەو کەسانە دەدەین کە لە ئایەتەکانمان لادەدەن، یان خەڵکیان لێ لادەدەن، بەهۆی ئەوەوە کە لێیان لامل دەبن، یان خەڵکیان لێ لادەدەن.

﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَـٰتِ رَبِّكَ﴾، ئایا چاوەڕێی چی دەکەن ؟ مەگەر ئەوە کە فریشتەیان بێنەلا، یان پەروەردگارت بێ، یان هەندێ لە نیشانەکانی پەروەردگارت بێن، ﴿يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَـٰتِ رَبِّكَ﴾، ئەو ڕۆژەی کە هەندێك لە نیشانەکانی پەروەردگارت دێن، واتە: نیشانە گەورەکان، یان نیشانە دوورەکان، ئەو نیشانانەی کە کەوتوونە پێش قیامەت، ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَـٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَـٰنِهَا خَيْرًا﴾، هیچ نەفسێك، هیچ کەسێك ئیمانەکەی سوودی پێناگەیەنێ، دوای هاتنی نیشانەکانی خوا، مادام پێشتر ئیمانی نەهێنابێ، یاخود پێشتر ئیمانی هێنابێ، بەلاّم چاکەی نەکردبێ، بەپێی ئیمانەکەی، واتە: ئیمانێکی ڕووکەشییو ڕواڵەتیی هەبووبێ، دوای ئەوەی کە نیشانەکانی قیامەت دێن، ئەو جۆرە کەسانە ئیمانەکەیان سوودیان پێناگەیەنێ، چونکە ئیمانهێنان، واتە: بڕواهێنان بە شتێك کە نادیارە، ئنجا دوای ئەوەی کە قیامەت دێو دیار دەبێو، دوای ئەوەی کە فریشتە دێو دیار دەبێ، مانای وایە ئەوە پێی ناگوترێ: ئیمان.

بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾، بڵێ ئێوە چاوەڕێ بن، ئێمەش چاوەڕێین، چاوەڕێی یەکێك لەو سێ شتانە بکەن، ئێمەش چاوەڕێین، دیارە کەسێك قسەی وادەکات، کە زۆر لەخۆی دڵنیابێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ﴾، بێگومان ئەوانەی ئایینەکەی خۆیانیان پارچە پارچە کردووە، خۆشیان تاقم تاقم بوون، تۆ هیچ پەیوەندییت بەوانە نیەو، ئەوانیش هیچ پەیوەندییان بەتۆوە نیە، چونکە تۆ خوا بەیەکگرتنت بۆ هێناون، وە یەکڕیزیت بۆ هێناون، ئایینی خوا بەیەکگرتنو یەکڕیزیی (دین التوحيد والوحدة)، بەلاّم ئەوان مادام خۆیان بەش

بەش بکەن‌و، دینەکەش پەرتـەوازە بکـەن، مانـای وایـە لەسـەر ڕێبـازی تـۆ نـین، ﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾، بەڵکو کاری ئەوان بۆ لای خوایە، دوایی هەواڵیان پێدەدات ، بەوەی کە دەیانکرد، ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا ﴾، هەر کەسێك چاکە بێـنێ (چاکە بەگـشتیی) ئـەوە دە بەرانبـەری ئـەو چاکەیە پاداشـتی هەیـــە، ﴿ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾، وە هـــەر کەسـێك خراپـە بێـنـێ (خراپە بەگشـتیی) ئەوە تەنیـا بە ئەندازەی خـۆی سـزا دەدرێ، وە سـتـەمیـان لـێنـاکـرێ.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾، هەرچەند پێشتریش ئاماژەمان پێدا، بەڵام بۆ زیاتر چەسپاندن لە زەینی هەمووانیەکدا، توێژەرەوانی قورئان زۆر مشتومڕیان کردوە، لەسەر ئەم وشەیەی (ثُمَّ) کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، یانی: دوای ئەوەی کە قورئان دابەزیوە، تەوڕات بە مووسا دراوە؟ کەچی دوای تەوڕات، قورئان دابەزیوە، ئەدی چۆن خوا وا دەفەرموێ : کە ڕواڵەتەکەی وایە : دوای ئەوەی قورئان دابەزی، کتێبیشمان بە مووسادا ؟

وەڵامەکەی بە دوو جۆرە :

١/ (ثُمَّ) بۆ ڕیزبەندیی و بەکاوەخۆ بەدوای یەکداهاتن (الترتيب والتراخي)ە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە دوای ئەوەی خوای زانا ئەو دە (١٠) وەصیەتەی کردن بۆ هەموو پێغەمبەران (عَلَيهم الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، ئنجا دوایی خوا تەوڕاتیشی دا بە مووسا.

٢/ مەبەست لە (ثُمَّ) لێرەدا ڕیزبەندیی کاتیی نیە، بەڵکو مەبەست پێی ڕیزبەندییە لە ڕووی هەواڵ پێدانەوە، وەك شاعیرێك دەڵێ:

قُل لِمَنْ سادَ ثُمَّ سادَ أَبُوهُ ثُمَّ قَدْ سادَ قَبْلَ ذَلِكَ جَدُّهُ

واتە: بە کەسێك بڵێ: کە بۆخۆی بووە بە سەرۆك، وە پاشان بابیشی بۆتە سەرۆك، وە دوای ئەوە لە پێش ئەودا باپیریشی سەرۆك بووە.

هەموویانــی بــە (ثُمَّ) هێنــاوە، بــەڵام بــە تەئكــید باپیــری لــە پێــش بابــیو، بابیشی لە پێش کورەکەدا، سەرۆك بووە.

یان وەك لە سوورەتی (الأعراف)لە ئایەتی (١١)دا دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ١١ ﴾، واتــە: وە بێگومان ئێوەمان دروستکردووەو، دوایی وێنەی ئێوەمان کێشا، دوایی بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن.

ئاشکراشــە کــە خــوای بەدیهــێنەر پێــش ئــەوەی ئــادەم دروســت بکاتو وێنەی بکێشێ، بە فریشتەکانی فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، بە بەڵگەی ئایەتی ژمارە (٧٢)ی سوورەتی (ص) کە دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ٧١ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٧٢ ﴾ واتــە: وە یــاد بکــەوە ! کاتــێ پــەروەردگــارت بــە فریشــتەکانی فــەرموو: مــن بــە دیهێنەری بەشــەرێکم لە قوڕێ، ئنجا هــەر کــاتێك ڕێکمخســتو لە ڕووحی خــۆم فووم بەبەردا کرد، کڕنووشی بۆ بەرن .

کــەواتە: خــوا بــە فریشــتەکانی فەرمــووە: کڕنووشــی ڕێزگــرتن بــۆ ئــادەم ببەن، پێش دروستکرانی، ئەدی بۆچی لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ ١١ ﴾، لێرەدا دەڵێین: ئەو (ثُمَّ)یە بۆ ڕیزبەندیی هەواڵدان (ترتیب الإخبار)ە .

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ تَمَامًا ﴾، ئەوەش دوو واتای هەن:

١/ یان بە مانای: (كَامِلاً) دێ، واتــە: ئەو کتێبەی بە مووسامان دابوو، تەواوو کامڵ بوو بۆ خەڵکی ڕۆژگاری خۆی، وەڵامگۆی پرسیارەکانی خەڵکی ڕۆژگاری خۆی بوو.

٢/ یان بە مانای: (تَتْميماً وإتمَاماً) دێ، واتە: تەواوکەر بوو، واتە: خوا پێش دانی تەوڕات بە مووسا، کۆمەڵێك چاکەی دیکەی لەگەڵ گەلی مووسادا کردبوون ، دوایی وەك تەواوکردنی چاکەکانی، تەوڕاتیشی بە مووسادا، کە دەفەرموێ:

﴿تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ﴾، واتە: تەواو بوو، یاخود تەواوکەر، بوو وێڕای ئەو چاکەیەی کە پێماندابوو ، لەبەرئەوەی چاکەکاربوون.

ئنجا (عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ )ش لێرەدا سێ واتای هەن:

١) دەگونجێ بڵێ: ﴿تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ﴾ لێرەدا بۆ (جنس)ە، وەك لە خوێندنەوەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعووددا خوای لێی ڕازی بێ، هاتووە: (تمَاماً عَلَى الَّذِي أَحْسَنوا)، واتە: تەواوکردنی چاکە بۆ هەر کەسێك چاکەیەك بکات ، کە مووساو گەلەکەی دەگرێتەوە.

٢) ﴿تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ﴾، واتە: وەك نیعمەتێکی تێرو تەواو، یان کتێبێکی تێرو تەواو، یاخود چاکەیەکی تەواوکەر بوو، دامانبەزاندە سەر ئەو بەندەیە کە چاکەی کرد، لە فەرمانبەریی دا بۆ خوای پەروەردگار.

واتە: مووسا لەسەر ئەو چاکەیەی کە کردی، تەوڕاتمان پێدا، چونکە خوای کاربەجێ پەیامی خۆی بە کەسێك نادات، کە شایستە نەبێ.

٣) ﴿تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ﴾، واتە: لەسەر ئەوە کە مووسا بە چاکیی کردی، ئێمە تەوڕاتو کتێبمان پێدا.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَتَفۡصِيلًا لِّكُلِّ شَىۡءٍ﴾، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ڕوونکەرەوە بۆ هەموو شتێك، واتە: هەموو شتێك کە خەڵکی ڕۆژگاری پێغەمبەر مووسا پێویستییان پێ بووبێ، ئەگەرنا تەوڕات هەموو شتێکی تێدا نەبووە، هەڵبەتە ئەم تەعبیرە بۆ قورئانیش هاتوە، خوای بەرز دەربارەی قورئان دەفەرموێ: ﴿تِبۡيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىۡءٍ ۝٨٩﴾النحل، واتە: (قورئان) ڕوونکەرەوەیە بۆ

هەموو شتێك، كە ئێوە پێویستییتان پێیەتیو پەكتان لەسەری كەوتوە، بەڵام بۆ نموونە: لە تەوراتو لە قورئان دا باس نەكراوە، كە چۆن فڕۆكە دروست بكرێ، بۆچی؟ چونكە مرۆڤ بۆخۆی عەقڵی بەو شتانە دەشكێو، پێویست ناكات خوا فێری بكات، خۆی دەتوانێ بیر بكاتەوەو ئەو شتانە دابهێنێ، وەك دەبینین ئەو هەموو شتانەی هێناونە دی، بە پشت بەستن بەو عەقڵو توانایەی كە خوای بەخشەر پێی داوە.

پاشان كە دەفەرموێ: ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾، وە ڕێنماییو بەزەیی خوا بوو، بەڵكو بڕوا بە دیداری پەروەردگاریان بێنن.

دیارە لە پەیمانی كۆندا كە تەورات بەشێكیە لێو ، نزیكەی دوو هەزار لاپەڕەیە، لەوێ دا مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا باسی قیامەتی تێدانیە، یانی: كەسێك كە پەیمانی كۆن دەخوێنێتەوە، وا هەست دەكات كە جوولەكەو نەصرانیی بڕوایان بە قیامەت نیە، زۆر بەدەگمەن، لە پەیمانی كۆن دا باسی ڕۆژی دوایی كراوە، دەبێ بە چراو شەداوان[1] تێیدا بگەڕێی، تاكو ئەو بابەتە دەدۆزیەوە.

بەڵام لێرەدا كە خوا دەفەرموێ: ﴿لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾، بەڵكو بڕوابێنن بە دیداری پەروەردگاریان.

ئەوە دەگەیەنێ، كە لە تەوراتیش دا باسی قیامەتو سزاو پاداشتی خوا كراوە، بەڵام لەمیانی ئەوەدا كە دەستكارییان كردوە، لایانبردووەو گۆڕیویانە، چونكە جوولەكە گرنگیی زۆریان بەوە داوە، كە تەنیا جەخت لەسەر دنیا بكەنو، قیامەت پشتگوێ بخەن.

**مەسەلەی دووەم**: كە دەفەرموێ: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾، وە ئەمەش كتێبێكە بەرهەمدارە، زۆر خێردارو بەپێزە، بەڵام

---

١) چراو شەداو: لە زستانان دا بۆ ڕاوی كۆترو ڕیشۆڵەو پۆڕو ... هتد، بەكاردێن.

ئایا بەرەكەتی قورئان لە چی دایە؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّبِعُوهُ ﴾، شوێنی بكەون، واتە: ئەگەر شوێنی بكەون، ئنجا لێی بەهرەمەند دەبن، بەهۆی خوێندنو تێگەیشتنو كارپێكردنیەوە، ئەو بەرهەمە وەدەست دێنن، وەك لە سووڕەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ئەمە كتێبێكە ناردوومانەتە لای تۆ، بەرهەمدارو، بەرەكەتدارە، بۆئەوەی لە ئایەتەكان وردبنەوەو خاوەن عەقڵان سوودی لێ وەربگرن، یانی: ئەگەر لێی ورد نەبنەوە، پەندی لێوەرناگرن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، شوێنی بكەونو پارێز بكەن، پارێز بكەن، یانی چی؟ یان لەخۆتان وریابنو هۆشیاربن ! لێی لانەدەن، بەڵكو بەزەییتان لەگەڵ دا بنوێنرێ، كەواتە: لە ئەنجامی شوێنكەوتنی قورئاندا، وە خۆپاراستن لە لێ لادانی دا، ئینسان شایانی ئەوە دەبێ، خوا بەزەیی پێدا بێتەوەو، لەگەڵی بەڕەحم بێ.

<u>**مەسەلەی سێیەم**</u>: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾، لێرەدا خوای بەرز وەك لە مانا گشتییەكەیدا باسمان كرد: حیكمەتی ناردنە خواری قورئان لەنێو گەلی عەرەبدا بەتایبەت، دەخاتەڕوو، وە دەشگونجێ ڕووی دواندن لە هەموو مرۆڤایەتیی بێ، كە ئەو كاتە ماناكەی ئاوای لێ دێ: هەموو ئەوانەی كە شارەزای كتێبی ئاسمانی نەبوون، بۆ ئەوەی خوا بیانوویان بڕێ، كە بیانووان

بەوە بگرن، بڵێن: تەنیا لەنێو دوو کۆمەڵدا لە پێش ئێمەدا کە بریتین لە جوولەکەکانو نەصرانییەکان، کتێب دابەزێنراوە، {ئەو کتێبانەی کە زانراون: (تەوراتو ئینجیل)، ئەگەرنا بەتەئکید خوای پەروەردگار کتێبی دیکەشی دابەزاندوون} بۆیە قورئانمان دابەزاند بۆ سەر پێغەمبەری خاتەم، بۆئەوەی ئەو خەڵکە ئەو جۆرە بیانووەیان نەمێنێ، بەڵام بە پێی سیاقی ئایەتەکان، واپێدەچێ زیاتر مەبەست پێی گەلی عەرەب بێ، چونکە ئاشنایی بە جوولەکەو نەصرانییەکان، یاخود تەنیا ئەو دوو کۆمەڵە بە خاوەن کتێبی ئاسمانیی زانین، زیاتر لەنێو گەلی عەرەب دا باوبووە.

ئنجا با سەرنجی ئەو دوو ئایەتە موبارەکە بدەین، کە خوای کاربەجێ دەیەوێ بیانووبڕی کەسانێك بکات، کە بەهۆی دابەزاندنی قورئانەوە دوایی دەرفەتیان نەبێ، بڵێن: کاتی خۆی تەنیا جوولەکەو نەصرانییەکان کتێبیان بۆ دابەزێنراوە، وە ئێمە هیچ کتێبی خوامان لەبەردەستدا نەبووە.

شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: کە دەفەرموێ: ﴿ أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلۡكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيۡنِ مِن قَبۡلِنَا ﴾، ئەو (أَن)ە، وشەیەك یان ڕستەیە لەدواوەی هەیەو وەك کورتکردنەوە ئەو شتە مەزەندە دەکرێ، وەك بگوترێ: (كَرَاهَةً أَنْ تَقُولُوا) واتە: لەبەر پێناخۆشبوونی ئەوەی کە بڵێن، یاخود (خَشِيَةَ أَنْ تَقُولُوا) لە ترسی ئەوەی کە بڵێن: تەنیا کتێب بۆ دوو کۆمەڵ لە پێش ئێمەدا دابەزێنراوە، بۆیە ئێمە کتێبمان بۆ سەر پێغەمبەری خاتەم دابەزاند.

هەندکێشیان گوتوویانە: (أَن تَقُولُوٓاْ) یانی: (لِئَلاّ تَقُولوا) بۆئەوەی نەڵێن، یان: نەوەك بڵێن: کە کتێب تەنیا بۆ سەر دوو کۆمەڵ لە پێش ئێمەدا دابەزێنراوە، کە جوولەکەکانو نەصرانییەکان بوون، هەڵبەتە ناویان نەهاتوە، بەڵام بە پێی سیاق دەزانرێ ، کە مەبەست پێی ئەو دووانەن، چونکە تەنیا ئەو دوو کۆمەڵە خەڵکە بوون کە زانراو بووەو باوبووە، کە کتێبیان بۆ دابەزێنراوە: جوولەکە بوون، کە تەورات بۆ سەر مووسا دابەزیوە، وە نەصرانییەکان بوون، کە ئینجیل بۆ سەر عیسا دابەزیوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَـٰفِلِينَ ﴾، یانی: تاکو دەرفەتی ئەوەتان نەبێ، یان ڕێی ئەوەتان نەبێ کە بڵێن: ئێمە لە لێکۆڵینەوەو شارەزابوونی ئەوان لە کتێبی خۆیان، بێئاگا بووین، لەبەرئەوە کە زمانی ئەوانیان نەزانیوە.

وشەی (دِرَاسة) هەندێ بە مانای خوێندنەوەیان لێکداوەتەوە، بەڵام لەڕاستییدا وانیە، دەڵێ: (الدرَاسة : القَراءَةُ ، مُحَاوَلَةَ للحِفْظ والتأمل)، واتە: (درَاسة) خوێندنەوە بە مەبەستی لەبەرکردنو تێوەڕامان.

ئنجا (دِرَاسة) لە ئەسڵدا لە وشەی (دَرْس)ەوە هاتوە، (درس) واتە: شتێك کە لەبەین برابێ، یان زۆر پێخوستی لەسەر بێ، شتیك کە کۆن کرابێ، شڕ کرابێ خانوویەك ، ئاوەدانییەك شوێنەوارێکی کەمی لێ بەجێمابێ، پێی دەڵێن: (الدوارس)، یان (دارِسة)، کەواتە: (دراسة) خوێندنەوەیەکە چەند جار بیخوێنیەوە ، بۆئەوەی لەبەری بکەیو لێی وردبیەوە، کەواتە: (دراسة) تەنیا خوێندنەوە نیە، بەڵکو خوێندنەوەیە ، لەگەڵ لەبەرکردنو لێ تێگەیشتنو لێوردبوونەوە.

پێشتر باسمانکرد کە (طائفتین) مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانییەکانە، ئنجا ئایا تەنیا جوولەکەو نەصرانیی کتێبیان بۆ دابەزێندراوە؟

دەڵێین: نەخێر، هەڵبەتە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: دیارە تەنیا کتێب بۆ جوولەکەکانو نەصرانییەکان دابەزیوە، کتێبێك کە باوبووبیو زانراوبووبێ، بەڵام لەڕاستییدا ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەو مەسەلەیە، بەڵام عەرەبەکان وایانزانیوە کە تەنیا جوولەکەو نەصرانیی خاوەنی کتێبن، ئەگەرنا (صائبة) کتێبی (کَنزا ربّا)و (مجوس) کتێبی (ئاڤێستا) یان هەنو، (زبور)ی (داود)و، (حِکَم)ی (سلێمان)یش لە پەیمانی کۆندا هەن، وە خەڵکانی دیکەش هەن لافی خاوەنی کتێبی ئاسمانیی بوون لێدەدەن.

دوایی خوا دەفەرموێ: بۆئەوەی کە وانەڵێن: هەروەها بۆئەوەی نەشڵێن: ﴿ أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلۡكِتَـٰبُ لَكُنَّآ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمۡ ﴾، ئەگەر کتێب بۆ سەر

ئێمە دابەزیبایە، ئێمە لەوان زیاتر ڕێی ڕاستمان دەگرت، ڕێ ڕاستگرتووتر دەبووینو، سەر ڕاستتر دەبووین، یانی: باشتر دینداریمان دەکرد، واتە: بۆئەوەی بواری ئەو دوو بیانووەتان نەبێ : ﴿فَقَدۡ جَآءَكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ﴾، بە دڵنیایی لێرەدا خوای پەروەردگار مەبەستی ئەوەیە ، کە ئەوە قورئانتان بۆ هات، بەڵام نافەرموێ: قورئانتان بۆ هات، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿فَقَدۡ جَآءَكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ﴾، سێ سیفەتان لە قورئان هەڵدەدا:

١) بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکراتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هات.

٢) وە ڕێنماییتان بۆ هات.

٣) وە بەزەییتان بۆ هات.

واتە: قورئان بە سێ وەسفان پێناسە دەکات :

١/ (بَيِّنَةٞ ) لەبەرئەوەی هەر کەسێ عەقڵێکی سەلیمی هەبێ، دەزانێ کە قورئان بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرایەو ، ئەو کەلامە تەنیا فەرمایشتی خوایەو، تەنیا خوا دەتوانێ بەو شێوەیە فەرمایشت بکاتو، ئەو فەرموودانە بڵێ.

٢/ وە ڕێنماییە، ڕێنماییە بۆ ئینسان لە ژیانی تاکیو خێزانییو کۆمەڵایەتییو سیاسیی.... هتددا.

٣/ وە مایەی ڕەحمەتی خوایە بۆ دوارۆژ، بەڵکو هەر لە دنیاشدا قورئان بەرجەستەکەری ڕەحمەتو بەزەییو لوتفو کەرەمو بەخشندەیی خوای پەروەردگارە، کەواتە: ئەوە ئەم قورئانەتان بۆ هات، تاکو هیچ برو بیانووتان نەمێنن.

ئنجا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێ، کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دادەنێ، بڕوای بە ئایەتەکانی خوا نیە، دوای ئەوەی کە بۆی هاتوون ؟

کە پێشتر دەیانگوت: ئەگەر بێتو ئایەتی خوامان بۆ بێو، کتێبی خوامان بۆ بێ، لە خەڵکی پێش خۆمان (لە جوولەکەو نەصرانییەکان) بەدینترو چاکتر دەبینو، باشتر پابەند دەبین بە بەرنامەو ڕێنمایی خواوە، کەچی ئێستا کە بۆیان هات، بە درۆی دابنێن ! هیچ کەس لەو کەسە ستەمکارتر نیە، هەروەها دەیانگوت: ئێمە شارەزای ئەو دوو کتێبە نەبووین کە لە پێش ئێمەدا هاتوون، بۆ جوولەکەو نەصرانییەکان، بۆیە ڕێی ڕاستمان نەگرتوە ! باشە ئێستا فەرموون کتێبێکتان بۆ هات، بە زمانێکی ڕوونو پاراوی خۆتان، بۆتان هاتوە، کە لە لووتکەی ڕەوانبێژییو پاراوییو ڕوونیی دایە، ئنجا ئایا کێ لە ئێوە ستەمکارترە، ئەگەر بڕوای پێ نەهێنن، بەڵکو لەجیاتی بڕوا پێهێنان ئایەتەکانی خوا بە درۆ دابنێن ؟! ﴿ وَصَدَفَ عَنْهَا ﴾، وە لە ئایەتەکانی خواشی لادا، واتە: لەڕووی فیکرییەوە پێیان بێبڕوا بوو، وە لە ڕووی کردەییشەوە، لێی لادان.

یان ﴿ وَصَدَفَ عَنْهَا ﴾، واتە: (صَرَفَ عَنْهَا) خەڵکی لێ لادان، یانی: بەوەندە وازیان نەهێنا، کە بۆخۆیان بڕوا بە ئایەتەکانی خوا نەهێنن، بڕوا بە کتێبەکانی خوا نەهێنن، بەڵکو خەڵکیشیان لێ لادان.

چونکە وشەی (صَدَفَ يَصْدِفُ صُدُوفاً) دوو مانای هەن:

١) مانای یەکەمیان (انحَرَفَ) لایدا.

٢) مانای دووەم: (صَرَفَ الناس عنها) خەڵکی لێ لاداو خەڵکی لێ دوورخستەوە.

لێرەدا بۆیە خوا وشەی (صَدَفَ)ی بەکارهێناوە، چونکە وشەی (صَدَفَ) لە یەك کاتدا هەردوو مانایەکان دەگەیەنێ، یانی: هەم خۆشیان لەو ئایەتانەو کتێبەی خوا، لایان دا، هەم خەڵکیشیان لێ دوورخستەوەو لێ لادا.

دیاره ئەگەر وشەیەكی دیكە بووایە، بۆ وێنە : وشەی (مال) یان (انحرف) یاخود، وشەی (صَدَّ)ی بەكارهێنابایە، ئەم وشانە تەنیا یەك مانای دەگەیاند، بەڵام وشەی (صَدَف) هەركام لەو دوو واتایانە دەگرێتەوە.

هەڵبەتە هاوبەشدانەرەكانیش هەم خۆشیان بڕوایان پێ نەهێناوەو لێی لامل بوون، وە هەم خەڵكیشیان لێی دوورخستۆتەوەو لاداوە.

ئنجا دەفەرمویٚ: هەركەسێ وابێ ! ﴿ سَنَجْزِي ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَـٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴾، ئێمە لەمەودوا بە خراپترین سزا، سزای ئەو كەسانە دەدەین كە لە ئایەتەكانی ئێمە لادەدەن، یان خەڵك لە ئایەتەكانی ئێمە لادەدەنو دووردەخەنەوە، ئەو سزایەش بەهۆی ئەو كردارو ڕەفتارەوەیە كە ئەنجامی دەدەن.

مەسەلەی چوارەم: كە دەفەرمویٚ: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَـٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَـٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَـٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَـٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴾، ئەم ئایەتە موبارەكە كە پێشتریش مانامان كرد، بە كورتیی ماناكەی ئاوایە: ئایا بێبڕوایەكان چاوەڕێی چی دەكەن؟ جگە لەوەی كە فریشتەكان بێنە لایان، یاخود پەروەردگارت بێ بۆ لایان، یاخود هەندێ لە نیشانەكانی پەروەردگارت بێن، ئەو ڕۆژە كە هەندێ لە نیشانەكانی پەروەردگارت دێن، ئیمان هێنانی هیچ كەس، سوودی پێ ناگەیەنێ، كە پێشتر ئیمانی نەهێناوە، (پێش هاتنی نیشانەكان) یاخود كە كردەوەی باشی بە پێی ئیمانەكەی ئەنجام نەداوە، بڵێ : چاوەڕێ بن ئێمەش چاوەڕێین !

لێرەدا خوای پەروەردگار باسی سێ شتانی كردەوە: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ ﴾، یانی: (هَلْ يَنْتَظِرُونَ) ئایا چاوەڕێی چی دەكەن ؟ جگە لەوەی فریشتە بێن، یان

پەروەردگارت بێ، یان نیشانەکانی پەروەردگارت بێن ؟

## ئەم ڕستە قورئانییە ، دەگونجێ چەند مەبەستێکی هەبن :

١/ دەگونجێ مەبەست پێی قیامەت بێ، هاتنی نیشانەکانی پەروەردگار، ئەوە دیارە مەبەست پێی ئەوەیە، بەڵام مەبەست لە هاتنی فریشتەکانو، هاتنی خوای پەروەردگار، دەگونجێ مەبەستی دیکەی هەبێ، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ ﴾، واتە: ئایا چاوەڕێی چی دەکەن، جگە لەوەی کە خوا لە سێبەرێك لە هەوراندا بێ، وە فریشتەکانیش لە خزمەتیدا، وە کاروباریان کۆتایی بێ، (واتە: دادگایی بکرێنو لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێ)، ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴾، وە کاروبارەکان بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە.

دەگونجێ لێرەش دا مەبەست پێی ، هەمان مەبەستی ئەو ئایەتەی سوورەتی (البقرة) بێ.

٢/ دەشگونجێ مەبەست لە هاتنی فریشتانو هاتنی خوای پەروەردگار، ئەوە بێ کە کافرەکان داوایان دەکرد، وەك لە سوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، دەڵێن: ئەدی بۆچی فریشتە دانابەزنە سەرمان، یان بۆچی پەروەردگارمان نابینین ؟ (خوا دەفەرموێ:) لە نەفسی خۆیاندا خۆیان بەزلگرتو سەرکێشییو لاملییان بەرانبەر بە خوا نواند.

٣/ وە دەشگونجێ مانایەکی دیکەشی هەبێ، ئەویش ئەوەیە کە مەبەست لە هاتنی فریشتەکان، هاتنی فریشتان بێ، بۆ گیان کێشانیان، وەك خوا لە

ســــوورەتی (الأعــراف)دا دەفــەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ ... ﴿٣٧﴾ ﴾، واتـە: هـەتا کاتــێ کـە ڕەوانەکراوەکـانی ئێمـە، (واتـە: فریشتەکانمـان) چوون بۆ لایان گیـانیـان کێشـان، ڕووحیـان وەرگـرتـن.

هـەروەها لە سـوورەتی (الأنعام)دا خـوای زاڵـی مـەزن دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتـە: وە ئـەو (خــوا) فریشــتە پارێزەرەکانتــان دەنێرێتە سـەر، هەتا کاتـێ یەکێکتان مردنی گەیشتە سـەر، فریشـتەکانمـان گیـانی دەکێشـن، ﴿ وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾، وە هیـچ کـەمتـەرخـەمیی‌و خـاوە خــاوو سـاردیی تێـداناکـەن.

کـەواتە: دەگونجــێ مەبەسـت لـە: ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، هەرِەشــە بـێ، واتـە: ئایا چاوەڕێـی چی دەکـەن؟ جگـە لـەوەی کـە فریشـتەکـان بـێن بـۆ لایــان گیـانیــان بکـێشــن، ﴿ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ﴾، یـان پەروەردگـارت بێ، یاخـود هەنـدێ لە نیشانەکانی پەروەردگـارت بێـن ؟

## هـاتـنـی خـوا :

بەنســـبەت هـاتنی خــوای پەروەردگــارەوە، وە، دەڵـێـین: سـیفەتەکانی خــوا وەك خـۆیـنــی، وەك زاتینــی، وەك دەفەرموێ: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾الشـوری، واتـە: هیـچ شـتێك وەك خوا نیـە.

دیــارە سیفەتەکــانی خــواش وێنـەیان نیـە، کەواتــە: بـۆ (هـاتنــی خــوا) دەبــێ بڵـێین: ئـەوە سیفەتی خـوایە، وەك بۆ خـوا شـایستـەیە، نـەك بەو چەمـك‌و واتایـەی کە دێتـە زەینی ئێمـەوە: ئێـمە کاتــێ شـتێك لە شـوێنێکەوە بچێتـە شـوێـنێـك، ئەو

شوێنەی کە پێشتر لێی بووە، چۆڵی دەکات، ئەوجار شوێنێکی دیکە داگیر دەکات، بەڵام هاتنی خوای بۆ وێنە بەو شێوەیە نیە، بەڵکو سیفەتێکە وەك بۆ خوا شایستەیە، وایە، ئەگەرنا ئەو واتایەی کە ئێمە بۆ شتە ماددییەکان بەکاریدێنین، ئەو واتایە، لەگەڵ خوادا ناگونجێ، بۆیە دەبێ بڵێین: واتایەکەی بەو شێوەیە، کە بۆ خوا شایستەیە.

دیارە هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوای پەروەردگاریش هەروان : زانیاریی خوا، فەرمایشتکردنی خوا، دەستەڵاتی خوا، ڕەحمەتی خوا، چوونە سەر عەرشی خوا، واتە: هەموو سیفەتەکان بەو شێوەیەن کە شایستەی خوایە.

## هاتنی نیشانەکانی پەروەردگار:

مەبەست لە هاتنی هەندێ لە نیشانەکانی پەروەردگار، زۆربەی زانایان بەوە لێکیانداوەتەوە، کە نیشانەکان بریتین لەو نیشانانەی کە پێش هاتنی قیامەت، یان تێکچوونی دنیا، دێن، وەك لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا هاتوە: ﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: لاَ تَقُومُ الساعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا﴾[1]، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: دنیا کۆتایی نایەت، تاکو خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت.

(ساعة) واتە: ئەو کاتەی کە ژیانی دنیای تێیدا کۆتایی دێو تێکدەچێ، (قیامة) واتە: هەڵسانەوە، هەڵسانەوەی دوای تێکچوونی دنیا، لە قۆناغی دووەمدا، خەڵك هەڵدەستنەوەو زیندوو دەکرێنەوە، چونکە ڕۆژی دوایی[2] دوو قۆناغی سەرەکییە: ١) (ساعة). ٢) (قیامة)، وەك خوا لە سوورەتی (الزمر)دا لەبارەی قۆناغی یەکەمەوە دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧١٦١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٦٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣١٢)، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٦٨)، وَالنَّسَائِيُّ في "الكُبرى" برقم: (١١١٧٧)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٨٣٨).

٢) لە کتێبی : (الإسلام كما يتجلَّى في كتاب الله تعالى)دا، بەدرێژیی باسی ڕۆژی دواییمان کردوە، بە هەردووك قۆناغەکەیەوە.

مَن شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، واتە: فوو بە صووڕدا کرا، یەکسەرو دەستبەجێ هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوییدا هەیە، مردن.

پاشان لەبارەی قۆناغی دووەمیشیەوە، دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾، دوایی بۆ جاری دووەم فووی پێداکرا، یەکسەر هەموویان هەڵسانەوە.

جا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿ لاَ تَقُومُ الساعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فإذا طَلَعَتْ ورآها الناس آمَنَ مَنْ عليها، فذلك حين لا ينفَعُ نَفْساً إيمانُها لم تكن آمنت من قبلُ أو كسبت في إيمانِها خَيراً﴾ رواه أحمد في المسند : (٧١٦١) ، وَالبُخَارِيُّ : (٨١ / ٢٢٣)، وَمُسْلِمٌ : (٢ / ١٩٤) و غيرهم، واتە: دنیا تێکناچێ، تاکو خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت ، ئنجا کاتێ (خۆر لە ڕۆژئاواوە) هەڵهات (پێچەوانەی عادەتی خۆی ، کە هەموو ڕۆژێ لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێ) ، وە خەڵك بینییان ، هەموو ئەوانەی لەسەر زەویین ئیمان دێنن ، بەڵام ئەوە ئەو کاتەیە، کە هیچ نەفسێك ئیمان هێنانەکەی سوودی پێناگەیەنێ ، کە پێشتر (واتە: پێش هاتنی ئەو نیشانەیە) ئیمانیان نەهێناوە ، وە کردەوەی باشیان ئەنجام نەداوە.

# باسێک لە بارەی پەیوەندیی کردەوە، بە ئیمانەوە

خـــوا کـــە دەفـــەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرًا﴾، ئەمـــە زانایـــان دوو واتایان بۆ لـێکداوەتـەوە:

## واتای یـەکـەم :

(الطبري) دەڵـێ: (معنى الآية: لا ينفع كافراً لم يكن آمن بالله قبل الطلوع، إيمانٌ كذلك بعد الطلوع، ولا يَنْفَعُ مؤمناً لم يكن عمل صالحاً قبل الطلوع، عملٌ صالِحٌ بعد الطلوع)[1]، واتە: کافرێك کە پێش خۆرهەڵهاتن لە خۆرئاواوە ئیمانی نەهێنابێ، ئیمان هێنانەکەی دوای ئەوەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێتەوە، سـوودی پێناگەیەنـێ، وە بڕوادارێـك کـە پێـش ئـەوەی خـۆر لـە ڕۆژئـاواوە هەڵبێتـەوە، کـردەوەی باشـی ئەنجـام نەدابـێ، دوای خۆرهەڵـهاتن لـە خۆرئـاواوە، کـردەوە باشـەکانی لێوەرنـاگـیـرێـن، (یـان تەوبەکـردنی لـێ وەرناگیـرێ).

## واتای دووەم :

(الشـوكاني) دەڵـێ: (لا يَنْفَعُ نَفْسا إِيمَانُها عِنْدَ حضُور الآيَاتِ متَّصفة بأَنَّها لَمْ تَكُن آمنت من قبل، أو آمنت مِن قبل، ولكن لم تكسب في إيمانها خَيراً. فحصل من هَذَا أَنَّهُ لا يَنْفَعُ إلاَّ الجمع بين الإيمَان من قبل مجيء بعض الآيات، مع كَسب الخَير في الإيمان ، فَمَنْ آمن من قبل فَقَط، وَلم يكسب خيراً في إِيمانه، أو كسب خَيراً، ولم يُؤمن، فإن ذَلِكَ غير نافعه، وهذا التركيب هو

---

١) جامع البيان ، ج: ٨، ص: ١٠٨ ، بە تۆزێك دەستكارییەوە.

كَقَولِك: لا أعطِي رَجُلاً اليوم أَتَانِي ، لم يأتني بالأَمْسِ، أَو لم يمدحني في إتيانهِ إليَّ بالأمس، فإن المستفاد من هذا: أَنَّهُ لا يَستحق العَطاء إلاَّ رَجُلٌ أَتَاهُ بالأَمْس، ومَدَحَهُ في إتيانهِ إليه بالأَمْس)[1]، واتە: هیچ کەسێك ئیمانەکەی لە کاتی هاتنی نیشانەکاندا سوودی پێناگەیەنێ، کە پێشتر ئیمانی نەهێنابێ، یان ئیمانی هێنابێ، پێش هاتنی نیشانەکان، بەڵام کردەوەی باشی ئەنجام نەدابێ، {واتە: بە پێی ئیمانەکەی کردەوە باشەکانی ئەنجام نەدابن، چونکە ئیمان هەموو کردەوە باشەکان دەخوازێ}[2]، (دەڵێ: کەواتە:) لەمەوە ئەوەمان دەستگیر دەبێ کە دەبێ هەردووکیان هەبن ، ئیمانیش هەبێ ، پێش ئەوەی نیشانەکان بێن ، وە دەبێ کردەوەی باشیش هەبێ ، بەپێی ئیمانەکە، کەواتە: کەسێك تەنیا ئیمانی هێنابێ، بەڵام کردەوەی باشی ئەنجام نەدابێ، یان بەس کردەوەی باشی ئەنجام دابێ، بەڵام ئیمانی نەهێنابێ، پێش هاتنی ئایەتەکان، سوودی پێناگەیەنێ.

وە پێکهاتنی ئەم ڕستەیەش وەك ئەوەیە کە تۆ بڵێی: بە پیاوێك نابەخشم کە ئەمڕۆ هاتبێ بۆ لام، بەڵام دوێنێ نەهاتبێ‌و مەدحیشی نەکردبم ، لە هاتنەکەیدا، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە تەنیا کەسێك شایستەی ئەوەیە کە تۆ پێی ببەخشی کە دوێنێ هاتبێ بۆ لاتو، مەدحیشی کردبی {بەڵام ئەگەر دوێنێ هاتبێ‌و مەدحی نەکردبی، یان هەر نەهاتبێ، ئەوە مانای وایە کە تۆ پێی نابەخشی}[3].

شایانی باسیشە ئەم جۆرە لێکدانەوەیە سەردەکێشێ بۆ ئەو مەسەلەیە کە:

ئایا ئیمان یەکێ لە پێکهێنەرەکانی کردەوەیە، یاخود کردەوە تەنیا تەواوکەری ئیمانە ؟

ئنجا لە ڕاستییدا دوای ئەوە کە زۆر سەرنجی ئایەتەکەم داوە، پێموایە

---

١) فتح القدير: ج٢، ص٢٢٣.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

٣) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

ئایەتەكـە لەگـەڵ هـەردوو واتاكانـدا دەگونجـێ، بـەڵام ئـەوە كـە ئایـا كـردەوە پێكـهێنەری ئیمانـە، یـاخود بـەس تەواوكـەریەتی؟ دوایـی قسـەی لێدەكـەین‌و ڕای خۆشـم دەڵێـم، بـەڵام بـا تۆزێكـی دیكـە تەماشـای قسـەی زانایـان بكـەین، لـە بـارەی لێكدانـەوەی مانـای ئایەتـەكەوە :

(جمال الدین القاسمي) له (محاسن التأویل)دا دەربـارەی ئـەم ئایەتـە دەڵـێ: (لا ينفع نفساً مؤمنةً إيمانُها إذا لم تكن قد كسبت خيراً، هذا قول المعتزلة والخوارج)[1]، واتـە: ئەمـە ڕای موعتەزیلـەو خەواریجـە كـە: ئیمانـدارێك كـە ئیمان دێنـێ: ئەگـەر كـردەوەی باشـی نـەكردبێ، بەپێـی ئیمانەكـەی، ئـەوە ئیمانەكـەی سـوودی پێناگـەیەنێ، بـەڵام ئەشعەرییەكان‌و مالیكـییەكان‌و ماتوریدییـەكان ، ئـاوای لێكدەدەنـەوە، دەڵێـن: (لا ينفع نفساً غير مؤمنة إيمانُها، بعد الآيات ، أو نفساً مؤمنة لم تكن كسبت خيراً في إيمانها من قبل كسبها) ، واتە: كەسێك ئیمانی نەهێنابـێ، دوای هـاتنی نیشـانەكان ئیمـان بێنـێ، ئیمـان هێنانەكـەی سـوودی پێناگەیەنـێ، وە كەسێكـیش ئیمـانی بووبـێ، بـەڵام كـردەوەی باشـی نەكردبـێ، دوایـی دیتنـی نیشـانەكان، كردەوە باشـەكانی لـێ وەرناگیـرێن.

دەڵێـن: مەبەسـت پێـی ئـەوە نیـە كـە دەبـێ ئیمانیشـی هێنابـێ‌و ، كـردەوەی باشیشـی كردبـن، چونكـە كردەوە پێكهێنەری ئیمـان نیـە، بەڵكو تەواوكـەریەتی .

ئنجـا هـەر خـاوەنی (محاسن التأویل) دەڵـێ: (لا يَنْفَعُ مَنْ كَانَ مُشْرِكاً ، إيمَانُه، ولا تُقْبَلُ تَوْبَة فَاسِقٍ ، عِنْدَ ظُهُور هَذِهِ الآيَة العَظِيمَة الَّتِي تَضطرُهُم إلى الإِيْمَان وَالتَّوْبَة، وَذَلِكَ لِذَهاب زَمَنِ التَّكْلِيف) واتـە: كـەسێك كـە موشریك بووبـێ (كافر بووبێ) كاتـێ كـە ئـەو نیشـانە گـەورەیە دەبینـێ، ئیمان هێنانەكـەی سـوودی پێناگـەیەنـێ، وە هـەروەها كەسـێك فاسق‌و لاڕێ بووبـێ‌و كـردەوەی باشـی نـەبووبن، دوای ئـەوەی كـە ئـەو نیشـانە گـەورەیە دەبینـێ ، تۆبەكـردن‌و طاعەتكردن‌و چاكەكانی لێوەرناگیـرێن، چونكـە كـاتی تەكلیف بەسـەرچووە.

---

١) ج ٤، ص ٧٩٤.

وە ئەم فەرموودەیەش دەهێنێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ﴾[1] واتە: بێگومان خوا تۆبەی بەندە قبووڵ دەکات، بە مەرجێك ڕووحی نەگەیبێتە گەرووی.

(محمد رشيد رضا)ش دەڵێ: (والتحقيق: أَنَّ الإِيمَانَ الصَّحِيح بمَا جَاءَ بِهِ الرّسُولَ ، وَهُوَ إِيْمَانٌ الإِذْعَانِ وَالقَبُول، يَسْتَلْزِمُ العمَل بمَا جَاءَ فِي الجُمْلَةِ دُونَ التَّفْصِيل الشُّمولِي ، فَيَجُوزُ عَقْلاً أَنْ يَتْرُك المُؤمِن بَعْض الوَاجِبَاتِ أَو يَرْتَكِب بَعض المُحَرّمَات...)[2]، واتە: وە ئەنجامی لێکۆڵینەوە ئەوەیە کە ئیمانی ڕاستو دروست بەوەی پێغەمبەر ﷺ لە خواوە هێناویەتی ، کە بریتیە لە ئیمانی مل بۆ کەچکردنو قبووڵکردن، ئەوە دەخوازێ کە کردەوەی باش ئەنجام بدرێ بەگشتی، بەبێ ئەوە کە بڵێین: دەبێ هەموو کردەوە باشەکان ئەنجام بدرێن، چونکە بە پێی عەقڵ دروستەو دەگونجێ ئینسانی ئیماندار هەندێ شت کە لەسەری فەرزە، بیچوێنێ، یاخود هەندێ لەو شتانەی کە قەدەغەن، بیانشکێنێ.

## ڕای خۆم لەبارەی پەیوەندیی نێوان ئیمانو کردەوەوە

ڕای خۆم لەوبارەوە: ئایا کردەوەی باش، جا کردەوەی باش کردنی فەرزەکان بێ، یاخود خۆدوورگرتن لە قەدەغەکان بێ، کردەوەی باش هەردووکیەتی، ئایا کردەوەی باش پێکهێنەری ئیمانە، یان تەواوکەریەتی، یان ئەسڵەن پەیوەندیی بە ئیمانەوە نیە؟ لەوبارەوە بەگشتی پێنج ڕا هەن :

١) <u>**موڕجیئەکان**</u> گوتوویانە: کردەوەی باش بۆ ئیمان، نە بەشێکی پێکهێنەریەتی، نە بەشێکی تەواوکەریەتی، بەڵکو دەگونجێ ئینسان ئیمانێکی زۆر زۆر باشی

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٠٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٣٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٥٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦٥٩) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٧٠٦٣)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (٨٤٧)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥٧١٧)، وَحَسَّنَهُ الألباني في "صحيح الجامع" رقم: (١٩٠٣).

٢) تفسير القرآن الحكيم ج٨، ص١٩٥.

هەبێ‌و، یەك كردەوەی باشیشی نەبێ !

كە بە تەئكید ئەم ڕایە لە سەدا سەد هەڵەیە، چونكە خوا هەر جارێ باسی ئیمانی كردبێ ، باسی كردەوەی باشیشی كردوە، كەواتە: كردەوەی باش بەشێكە لە ئیمان‌و لێی جیانابێتەوە، وە ئەم بیرۆكەیەی مورجیئە ، زیانی زۆری لە مسوڵمانان داوە ، كە پێیانوابووە دەگونجێ مرۆڤ لافی ئیمانێكی زۆر باش لێبدات، بێئەوەی هیچ كردەوەیەكی باشی هەبێ، هەتا هەندێ لە مورجیئە گوتوویانە: ئینسان دەگونجێ ئیمانی وەك ئیمانی جبریل‌و میكائیل بێ، بەڵام كردەوەی باشیشی نەبێ ! كە ئەوە ڕێی زۆر خۆش كردوە بۆ مسوڵمانان، مسوڵمانانێكی ئیمان لاواز، كە كردەوەی باش ئەنجام نەدەن، وە خۆشیان بە ئیمانداری باش بزانن، وە ئێستاشی لەگەڵدابێ ئەوە هەر هەیە، بۆ نموونە بابایەكی عەلمانیی، بابایەك كە نە نوێژ دەكات، نە ڕۆژوو دەگرێ، نە هیچ پابەندییەكی بە شەریعەتەوە هەیە، دەڵێ: من ئیمانداری زۆر باشم، دیارە بەپێی بیرۆكەی هەڵەی مورجیئە !

٢) **خەواریج** گوتوویانە: دەبێ هەموو كردەوە باشەكانت هەبن، واتە: هەرچی گوناهە نەیكەی‌و ، هەرچی واجبیشە هەمووی بكەی، ئنجا بە ئیماندار لە قەڵەم دەدرێی، واتە: ئەوان گوتوویانە: هەموو كردەوەكان پێكهێنەری ئیمانن، یانی: هەموو كردەوە باشەكان، كە وەك گوتم كردەوەی باش ئەوەیە: ئینسان خۆی لە قەدەغەكراوەكان بپارێزێ، وە فەرزكراوەكانیش ئەنجام بدات، گوتوویانە: هەموو كردەوە باشەكان پێكهێنەری ئیمانن.

بۆیەش خەواریج پێیانوابووە هەر كەسێك درۆ بكات، غەیبەت بكات، نەك هەر قەتڵ‌و زینا، گوتوویانە: ئەوە یەكسەر ئیمانەكەی هەڵدەوەشێتەوە، هەروەها هەر كەسێك واجبێك بچوێنێ، نوێژێك بچوێنێ، یان فەرمان بە چاكەیەك بچوێنێ، هەر واجبێك بچوێنێ، ئیمانەكەی هەڵوەشاوەتەوە.

كە بە تەئكید وەك چۆن مورجیئە كورتیان هێناوە، خەواریجیش تێیانپەڕاندوە، مورجیئە ئەهلی بەزایەدان (تفریط) بوون‌و ، خەواریجیش ئەهلی تێپەڕاندن (إفراط)ن.

٣) **موعتەزیلە** گوتوویانە: بەبێ کردەوە ئیمان دروست نابێ، بەڵام ناشڵێین: هەر کەسێك گوتی: ئیماندارمو کردەوەی باشی نەبوون، ئەوە کافرە، وە ناشڵێین: ئیماندارە، ئەدی دەڵێن چییە ؟ گوتوویانە: دەڵێین (لَهُ منزلَةٌ بين المنزلتين) پێگەیەکی هەیە لە نێوان دوو پێگەکان دا، واتە نە ئیماندارە نە کافرە، لەو نێوانەدا هەڵواسراوە !

کە ئەوەش ڕایەکی زۆر سەیرە !!

٤) **ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان**: ئەوەی کە باوە وەك بیرۆکەی ئەشعەرییو ماتوریدییەکان، ئەگەرنا (أبو الحسن الأشعري) وەك لە کتێبی (الإبانة عن أصول الديانة)دا دیارە، ڕایەکەی بەو شێوەیە نیە، بەهەرحاڵ ئەوەی وەك قوتابخانەی ئەشعەرییو ماتۆریدیی باوە لە نێویاندا دەڵێ: کردەوە پێکهێنەری ئیمان نیە، بەڵام تەواوکەری ئیمانە، واتە: هەر کەسێك کردەوەی نەبێ، ئیمانەکەی ناتەواوە.

٥) **ڕای پێنجەم**: وەك لە کتێبی {ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی}[1] لە بەرگی یەکەم دا بە درێژیی باسم کردوە، وە بەڵگەکانیشم هێناون، وە من پێموایە ئەوە ڕای زۆربەی هەر زۆری زانایانە، وە ڕای پێشینی چاکمانە، وە ڕای ئەوانەیە کە بە ئەهلی سوننەتو جەماعەت ناسراون، ئەوەیە کە دەڵێ :

ئەسڵی کردەوە پێکهێنەری ئیمانە، واتە: لە ئەسڵدا کردەوە پێکهێنەری ئیمانە، بەڵام نەك هەموو کردەوەیەك پێکهێنەری ئیمان بێ، واتە: مەرج نیە ئینسانی ئیماندار هەموو کردەوە باشەکان ئەنجام بدات، وە خۆی لە هەموو قەدەغەکان بپارێزێ، بەڵکو گوناهێك دەکات: واجبێك دەچوێنێ، یان قەدەغەیەك دەشکێنێ، بەڵام هەر بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێ، مادام ئەو قەدەغە شکاندانو ئەو واجب چواندنە ، ئینسانی پێ کافر نەبێ.

(الترمذي) لەوبارەوە ئەم دەقەی هێناوە: ﴿عَنْ عَبد الله بن شَقِيق التَّابِعيِّ المتَّفَق عَلَى جَلالَتِهِ رَحِمهُ اللهُ، قَالَ: كَانَ أصحَابُ محمَّدٍ ﷺ لا يَرَوْنَ

---

١) هەروەها لە بەرگی دووەمی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)ش دا بە درێژی باسم کردوە.

شَـيْئاً مِـنَ الأعْمَـالِ تَرْكُـهُ كُفْـرٌ غَيْـرَ الصَّـلاَةِ﴾[1]، واتـه: عەبدوڵـلای كـوڕی شـەقیقی تابیعیـی (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێ)، كـه زانـایان لەسـەر گـەورەیی‌و ڕێزداریـی یەكدەنگـن، گوتوویـەتی: هـاوەڵانـی بەڕێـزی پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ پێیان وانـەبوو ، وازلـێهێنانی هیچ كردەوەیـەك ، كوفره، جگه له نوێـژ.

وه مـن قـەنـاعەتم وایـه هـەر كەسـێ ئەسڵی نوێـژی نەبـێ، نـەك هەیبـێ‌و بیچوێنـێ، هـەر نەیبـێ وەك دەڵـێن: (تـارك الصلاة) بـێ، ئـەوه ئەسڵی كـردەوەی نیـە، وه هـەر كەسـێك هـیچ كردەوەیـەكی مسوڵمانـانـەی تێدا نـەبوو، بەتایبـەتی نوێـژ ، كـه بناغـەی كـردەوه باشـەكانه، ئـەوه بەتەئكـید بەڵگـەیەكی بەدەسـتەوە نیـه بڵـێ : مـن ئیماندارم ، چونكـه ئەصڵی كـردەوه ، پێكهێنـەری ئیمانـه، بـەڵام نـەك وەك خـەواریج و موعـتەزیلـه دەڵـێن: هـەموو كردەوەیـەك پێكهێنـەری ئیمانـه، بەڵكـو ئەصـڵی كـردەوه پێكهێنـەری ئیمـانه، نـەك تەواوكـەری بێـت، وەك ئەشعەریـی‌و ماتوریـدییـەكان گوتـوویـانە.

**<u>مەسـەلەی پێنجـەم</u>:** كـه خـوا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ١٥٩﴾، بێگومان ئەوانـەی دینەكـەی خۆیانیان پارچه پارچه كرد، وه بوونـه دەسـته دەسـتەو تـاقم تاقـم، تـۆ هـیچ پەیوەندییـت پێیانـەوه نیـه، دیـاره لێـرەدا ڕووی دوانـدن لـه پێغـەمبـەره واته: ئەی موحەممـەد ! تۆ هیچ پەیوەنـدییت بەوانـەوه نیـەو، ئـەوانیش هیـچ پەیوەندییەكـیان بـەتۆوه نیـه، واتـه: ئەوانـه لەسـەر ڕێبـازی تـۆ نـین، كـه دینەكـەیان بـەش بـەش كـردوەو ، خۆشـیان بوونـه تاقـم تـاقم و دەسـته دەسـته، ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾، بەڵـكو چارەنووسی ئـەوان ، وه لـێپرسـینەوەی ئەوان‌و سزادانی ئەوان ، عایدی خوایه، وه دوایـی هـەواڵیان پێـدەدا بـەوەی دەیانـكـرد، كـه بە تەئكید ئەوه هەڕەشـەیه.

---

١) رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ (٢٦٢٢)، وَقَالَ الشيخ الألباني: صحيح.

<u>ئەم ئـایەتـە مسـولْمانانیـش دەگـرێتـەوە :</u>

زانایـان لـێرەدا کـەوتوونە مشتومڕەوە کـە ئایـا ئـەم ئایەتـە موبارەکـە: تەنیـا مەبەست پێی نا مسولْمانەکانە، بەتایبەت خـاوەن کـتێبەکان، کە دینـی خۆیـان بـەش بـەش کـردووە، بوونەتـە تاقـم تـاقمو دەسـتە دەسـتەی دژ بەیـەك، هـەم جوولەکـە چەند دەستەن، هەم نەصرانیـی چـەند دەسـتەن، هـەم جوولەکـەو نەصـرانیـی دژی یەکـدین، وە ئـەوان لەگـەڵ (صـابِئَة)و ، (صـابِئَة) لەگـەڵ مەجــووسو ، ئەویـدیکـە لەگـــەڵ ئەویـدیکـــە، ئایـــا مەبەســـت تـــەنیا پێـــی ئەوانـــە ؟ یاخـــود مسولْمانـــانیش دەگرێتـەوە ؟ هەندێکیان گوتوویـانە : تەنیـا خـاوەن کـتێبەکـان دەگرێتـــەوە، ئـەوان دینی خۆیـان بـەش بـەشو پارچە پارچە کردووە، هەر یەکەیان لایـەکی گـرتوە.

بەڵام زۆربـەی زانـــایان ، یـان زۆربـــەی توێـژەرەوانی قورئـان، وە خۆشـم هـەر ڕام وایـــە ، کـــە ئـــەو ڕایـــە پەســـەندترە، کـــە دەڵـــێ : ئـــەم ئایـــەتە هـــەم نامسولْمانـــان دەگرێتـــــەوە (خـــاوەن کتێبـــەکان)، وە هـــەم مســـولْمانـــانیش دەگرێتـــــەوە، چونکـــە مسولْمانـان حەقـی ڤیتـۆیان نیـە ! مسولْمانـانیش ئەگەر دینـی خۆیـان بـەش بـەش کـرد، یەکـیان تەنهـا لایـەنی تەزکیـەی نەفسی گـرت، ئـەوی دیکـە تەنهـا لایەنـی فیقهـی گـرتو، ئـەوی دیکـە تەنیـا لایـەنی جـەنگو جیهـادی گـرتو، ئـەوی دیکـە تەنیـا لایەنـی سیاسـەتی گـرتو ، ئـەوی دیکـە تەنیـا لایـەنی پـەروەردەی گـرتو ، ئەوی دیکە تەنیا لایەنێکی دیکەی گـرت...، لەڕاسـتییدا ئـەوەش هـەر بـەش بـەش کـردنو پارچە پارچـە کردنـی دینـە، وە لە ئەنجـامی ئەوەشـدایە ، کـە پەرتـەوازەیی لـەنێو مسولْمانـــاندا پەیـــدا دەبـــێ، وەك خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الــــــروم ، هــــەر حیـزبو کۆمەڵـە بـەوەی کەلەسـەریەتی پێـی دڵخۆشـە، چونکـە ئـەوەی کـە هـەر لایـەنی پـەروەردەی گرتـوە، دەڵـێ : دیـن هـەر ئەوەیـە، وە ئـەوەی تەنیـا لایـەنی عەقیـدەی گرتـوە، دەڵێ: دین هـەر ئەوەیـە، وە ئـەوەی کـە تـەنیا لایـەنی سیاسـەتی گرتـوە، دەڵـێ: دیـن هـەر ئەوەیـەو ، بەبـێ ئـەوە هـیچ شـتێکمان بـۆ ناکـرێ، ئنجـا تەماشـایـان دەکەی: لـێك دەخوێنـنو دەبنـە دژی یەکـدی !

بـەڵام ئەگــەر هـەموو لایەنــەكانی ئیسـلامو هـەموو بوارەكــانی ڕەچاوبكــەی، وە هـەوڵبدەی بەپێـی توانــا بە هــەموو لایەنەكانیەوە پابـەند بـی ، ئەو كاتە هەركـەسێ خزمەت بە هەر لایەكی ئیسـلام بكا، تۆ بە هـی خۆتی دەزانـی، وە دڵت پـێ خۆشە.

بەڵگـەمان چییـە لەسـەر ئـەوە ؟ بەڵگــەمان ئەوەیــە كـە خـوا لـە سـوورەتی (آل عمران)دا دەفـەرمویێ: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ ﴾، (بــــە مسوڵمانــــانو ئیمــــانداران دەفـەرموێ:) وەك ئەوانـە مـەبن كـە پەرتـەوازە بـوونو نـاكۆك بـوون، دوای ئـەوەی بەڵگـە ڕوونو ئاشـكراكانیـان بۆ هـاتن، وە ئەوانە سـزایەكی مەزنیـان بـۆ هەیــە، كـە دەفـەرمـوێ: وەك ئـەوان مـەبن، مانـای وایــە: ئەگــەر ئێـوەش وەك ئــەوان بـن، ئـەوا هـەمان سـزای ئـەوان بـۆ ئێـوەش دانـدراوە، وە هـەمـان هەڕەشــە كـە لـەوان كـــراوە، ئێـوەش دەگرێتــەوە.

ئنجـا ئێمــە فەرموودەیەكـی پێغـەمبەرمان ﷺ هەیــە، هەرچـەندە هەنـدێ لـە زانایــان مشـــتومڕیان لـەبارەی سـەنەدەكـەیەوە هەیـە، بـەڵام زۆربەیــان بـە ڕاسـتی دادەنـێن، بـە چــەند شـێوەیەكیش هـاتوە، پێغـەمبەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿افْـتَرَقَتِ الْيَهُـودُ عَلَـى إِحْـدَى أَوْ ثِنْتَـيْنِ وَسَـبْعِينَ فِرْقَــةً، وَتَفَرَّقَـتِ النَّصَـارَى عَلَـى إِحْـدَى أَوْ ثِنْتَــيْنِ وَ سَـبْعِينَ فِرْقَــةً، وَتَفْتَـرِقُ أُمَّتِــي عَلَــى ثَـلاثٍ وَسَــبْعِينَ فِرْقَــةً﴾(١)، واتــە: جوولەكـەكــان بوونــە حەفتــاو یــەك، یــان حەفتــاو دوو دەســتەو تــاقم، وە نەصرانییەكـانیش بوونە حەفتـاو یەك، یان حەفتـاو دوو دەستەو تـاقم، وە ئۆممەتی منیـش دەبێتــە حەفتـاو سـێ دەسـتەو تاقـم.

كــەواتە: كــە خـــوای پــەروەردگار دەفــەرموێ: ئەوانــەی دینەكــەیان بــەش بــەش كــردووە ، بوونەتــە تــاقم تــاقم: هــیچ پەیوەندییەكــەیان بــە تــۆوە نیــە، وێــڕای نامسوڵمانـان، مسوڵمانـانیش دەگرێتـەوە، مسوڵمانـانیش ئەگەر وابكـەن، مانـای وایـە

١) أَخْرَجَـهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٥٩٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٤٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَإِبْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٩١)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٠)، وَالبَيْهَقِي برقم: (٢٠٦٩٠)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً أَحْمَد برقم: (٨٣٧٧)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥٩١٠)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٤٧) قال الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

هیچ پەیوەندییان بە پێغەمبەرەوە نابێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دینێکی هێناوە، دینی خواپەرستییو خوا بەیەکگرتنە، وە دینی یەکڕیزییو یەکخستنە، وەختێك مسولْمانان هەر کۆمەڵەیان لایەکی لێبگرن، وە لەنێو خۆیاندا پەرتەوازە بن، مانای وایە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر نین لەو بوارەدا، وە لەو کردەوەدا، با بە یەکجارییش لە بازنەی ئیمانو ئیسلام نەچووبنە دەرێ.

ئنجا لەوبارەوە زانایان چەند قسەیەکیان هەن، کە زیاتر تیشك دەخەنە سەر چەمكو واتای ئەو ئایەتە موبارەکە، بۆ نموونە :

## چەند قسەیەکی زانایان لەبارەی چەمكو واتای ئایەتی ( ١٥٩ )ەوە

١) (قال ابن عطية: هَذِهِ الآيـة تَعُمُّ أَهْلَ الأَهْوَاءِ وَالبدَع والشُّذوذ فِي الفُرُوع، وَغَير ذَلِكَ مِنْ أَهْل التَّعَمّق فِي الجدَال وَالخَوْض فِي الكَلام)[١]، واتە: (ابن عطية) دەڵێ: ئەم ئایەتە هەموو ئەوانەی شوێن ئارەزووەکان دەکەون، وە داهێنان دەکەن لە دیندا، وە شتی ڕیزپەڕ دەهێننە پێش، لە لقو پۆپەکانی دیندا، وە جگە لەوەش ئەوانەی کە زۆر بە شەڕە قسەدا قووڵ دەبنەوە، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە.

٢) (إِبْنُ البَطّال) لە شەرحی (صحيح البخاري)دا، ئەم قسەیە لە (أبو حنيفة)وە دەگێڕێتەوە: (عَنْ أبي حنيفة، يَقُولُ: لَقِيتُ عَطَاءِ بن أَبي رباح بمَكة، فَسأَلْتهُ عَن شيء، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِنْ أَهْل الكُوفَة، قَالَ: أَنْتَ مِنْ أَهل القَرية الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُم وَكَانُوا شِيعَاً؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَمِن أَي الأَصْنَاف أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِمّن لا يَسُبّ السَّلَف، وَيُؤْمِنُ بالقَدَر، وَلا يُكَفّرُ أَحَدَاً بذنب، قَالَ لي عطاء: عَرفت، فَالزم)، واتە: (أبو حنيفة) دەڵێ: لە مەککە گەیشتمە عەطائی کوڕی ئەبی ڕەباح (کە یەکێك بووە لە زانایانی پێشین)، دەربارەی شتێك پرسیارم لێی کرد، ئەویش گوتی: تۆ لە کوێوە هاتووی، خەڵکی کوێی ؟

منیش گوتم : خەڵکی کووفەم.

گوتی: خەڵکی ئەو شارەی کە دینەکەیان بەش بەش کردوەو بوونە دەستە دەستە؟

---

١) الإعتصام للشاطبي، ج١، ص٣٩.

گوتم : بەڵێ.

گوتی : تۆ لە کامە کۆمەڵەی ؟

گوتم : من لەوانەم کە جنێو بە پێشینەی چاکمان نادەن، (واتە: لە شیعەکان نیم)، وە ئیمان بە قەدەر دێنن، (واتە: لە موعتەزیلە نیم)، وە لەوانەم هیچ کەسێك بە گوناهێك کافر ناکەن، (واتە: خەواریجیش نیم)، {کەواتە: نە شیعە بێو ، نە موعتەزیلە بێو، نە خەواریج بێ، مانای وایە ئەهلی سوننەتو جەماعەته، کە زۆرینەی مسوڵمانانن}.

دەڵێ: (عَطَاء) پێی گوتم: ڕێی خۆت دۆزیوەتەوەو پێیەوە پابەند بە .

٣) (عَنِ الحَسَنِ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّان ﷺ يَوْمَاً يَخْطُبُنَا، فَقَطَعُوا عَلَيْهِ كَلامَهُ، فَتَرَامَوا بالبَطْحَاءِ، حَتَّى جَعَلْتُ مَا أُبْصِر أديمَ السَّمَاءِ، قَالَ: وَسَمِعْنَا صَوْتاً مِنْ بَعْضِ حُجر أَزْوَاجِ النَّبيّ ﷺ، فَقِيلَ: هَذَا صَوْت أُمّ المُؤْمِنِينَ، قَالَ: فَسَمِعْتُهَا وَهِيَ تَقُولُ: أَلا إنَّ نَبِيّكُمْ قَدْ بَرِيءَ مِمَّنْ فَرَّقَ دِينَهُ وَاحْتَزَبَ، وَتَلَت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعًا ﴾ قال القاضي إسماعيل: أحسبه يعني بقوله: أم المؤمنين أم سلمة ، وأن ذلك قد ذكر في بعض الحديث، وقد كانت عائشة في ذلك الوقت حاجَّةً)، واتە: لە حەسەنی بەصرایییەوە گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: ڕۆژێك عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی ڕازی بێ، هاتەدەر وتاری بۆ داین، کەچی وتارەکەیان پێ بڕی، وە چەوو بەردیان لە یەکدی گرت، {ئەوانەی کە پشتگیریی عوسمانیان کردوە، وەك خەلیفەو ئەوانەی کە دژایەتییان کردوە، دیارە ئەوە ئەو کاتە بووە کە ئەو فیتنە گەورەیە ڕوویداوە، کە عوسمانی تێدا شەهید کراوە}[1] هەتا هێندەیان بەرد بە یەکدی دادان، ئاسمان دیارنەبوو لەبەر شەڕە بەرد، وە گوێمان لە دەنگێك بوو، لە یەکێك لە ژوورەکانی هاوسەرانی پێغەمبەرەوە دەهات، گوتیان: ئەوە دەنگی دایکی ئیمانداران‌ە، دەڵێ: گوێم لێ بوو دەیگوت: ئاگاداربن ! پێغەمبەرەکەتان حاشای لەو

---

١) نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

کەسانە کردوە، کە دینەکەی بەش بەش دەکەن، وە دەبنە تاقم تاقم، وە دوایی ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍ ﴾، (قاضي إسماعيل) دەڵێ: پێمەوایە کە دەڵێ: دایکی ئیمانداران ، مەبەستی (أم سلمة)یە، چونکە لەو کاتەدا عائیشە لە حەجێ بوو.

٤) (قَالَ القاضي: ظَاهِر القُرآن يَدلُّ عَلى أَنْ كل مَن ابْتَدَعَ فِي الدِّين بدعَة مِنَ الخوارج وغيرهم ، فهو داخل في هذه الآية، لأَنَّهُم إِذَا ابتَدَعُوا تَجَادَلُوا وَتَخَاصَمُوا وَتَفَرَّقُوا وَكَانُوا شِيَعَاً)، واتە: قازی {کە مەبەست پێی (قاضي عياض)ە} دەڵێ: ڕواڵەتی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ ، کە هەر کەسێك لە دیندا داهێنان بکات، {شتێك پەیدا بکات، کە لەگەڵ ئەو دینەدا نامۆ بێ غەریب بێ}[1]، ئنجا خەواریج بێ، یاخود جگە لە خەواریج، ئەوە ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە، چونکە هەر کاتێ داهێنانیان کرد لە دیندا، شەڕە قسە دەکەن، وە کە شەڕە قسەیان کرد، ناکۆك دەبنو ، کە ناکۆك بوون پەرتەواز دەبنو دەبنە تاقم تاقم .

٥) (رَوَى عَبْدُ بنُ حُمَيد عَنِ الحَسَنِ قَالَ: رَأَيْتُ يَوْمَ قَتْل عُثمان ﵁ ذِرَاعَ امْرَأَة مِنْ أَزْوَاج رَسُول الله قَدْ أُخْرِجَتْ مِنْ بَين الحَائِطِ وَالسِّتْر وَهِيَ تُنَادي: أَلا إِنَّ اللهَ ورسوله بَريئَانِ مِنَ الَّذِينَ فَارَقُوا دِينَهُم فَكَانُوا شِيَعَاً)، واتە: عەبدی کوڕی حومەید لە حەسەنی بەصرایییەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: ئەو ڕۆژەی کە عوسمانی تێدا کوژرا، خوا لێی ڕازی بێ، قۆڵی ئافرەتێکم بینی لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ، کە لەنێوان دیوارو پەردەیەك کە دادرابۆوە، قۆڵەکە هاتەدەرێ، بانگی دەکرد: ئاگاداربن ! کە خواو پێغەمبەرەکەی بەریینو دوورن ، لەوانەی کە وازیان لە دینەکەیان هێناوەو، بوونەتە تاقم تاقمو دەستەدەستەی دژ بەیەكو ناکۆك.

ئنجا (محمد رشید رضا) لە تەفسیرەکەی خۆی (التفسير القرآن الحكيم)دا کە من قسەکانی دیکەشم هەر لەووە هێناون، دەڵێ: {وَجُمْلَةُ القَوْلِ: أَنَّ المُرَادَ

---

١) نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

مِـنَ : ﴿ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ﴾، أَهْـلُ الكِتَــابِ ، وَالـمُرَادُ مـن جَعْـل الرَّسُول بَرِيئاً مِنْهُـمْ: تَحْذِيرُ أُمَّتِهِ مِنْ مِثْل فِعْلِهِـم ، لِيُعْلم أنَّ مَـنْ فَعَـلَ فِعْلَـهُم مِـنْ هَـذِهِ الأُمَّـة فَرَسُـولُ الله بَـرِيء مِـنْهُمْ بـالأَوْلَى، لا كَمَـا يَـزْعُمُ بَعْـضُ الجَـاهِلِين المُضِلِّينَ منْ أَن مَا وَرَدَ فِي الكِتَاب وَالسُّنَّةِ مِنْ صِفَات الكُفَّار وَأَفْعَالـهم خَاصّ بهـم، فَإِذَا تَلَبَّسَ بِهِ المُسْلِمُونَ لا يَكُون حُكْمُهُم فيهِ كَحُكْم مَنْ قَبْلَهُمْ، كَأَنَّ الله تَعَالـى أَبـاح لِلْمُسْلِمِينَ الشِّـرْكَ وَالكُفْـرَ وَالنِّفَـاقَ وَالبِّـدَعَ والضَّـلالاَت ، وضَـمِن لَهُـم جَنَّتَـهُ وَرِضْوُانَهُ بمجَرّد انتسابهم إلـى الإِسْلام}[1] ئـەمە قسەيەكى زۆر جوانـە، ئەگـەر بە زێڕ بنووسـرێتەوە دەيهێنـێ.

دەڵـێ: كورتـەی قسان: مەبەست لەوانەی كـە خـوا دەفەرمویێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ ﴾، خاوەن كتێبەكانە، بەڵام مەبەسـت لـەوە كـە پێغـەمبەر ﷺ بەرییـە لـە هـەر كـەسـێ وابكـات ، ترسـاندنو ورياكردنـەوەی ئۆممەتەكـەيەتی ، لــەوە كــە وەك ئــەوان نەكــەن، تاكـو بزانـرێ كــە هـەر كـەسـێك وەك ئــەوان بكــات، لـە ئۆممەتــی پێغـەمبـەر ﷺ، ئەوە پێغـەمبەری خــوا ﷺ لـە پێشــتــرە كـە لـەوان بەريـی بـێو لـەوان دوور بـێ، تاكـو لە جوولەكـەو نەصـڕانييەكـان، نـەك وەك ئـەوەی هـەندێ لە نەزانـە گومڕاكـەرەكان دەڵێن: كە ئەوەی لـە قورئـانو سـوننەتدا هـاتوە ، دەربـارەی سيفەتی كافرەكـانو كردەوەكانيان، تايبەتە بەوانـەوە، بۆيـە ئەگـەر مسوڵمانــان ئـەو سيفەتو كـردەوە خراپـانەيـان، كـە خـوا وەسـفی كـافرەكانی پێكـردوون، ئەنجـامی بدەن، حوكميان وەك حوكمی ئەوان نابـێ ! ئەمەش ئەوە دەگـەيەنـێ كە خـوای بـەرز ڕێی داوە بـە مسوڵمانـان كـە شـيـرك بكـەن، كوفـر بكـەن، نيفـاق بكـەن، داهێنـان بكـەن لە ديندا، وە گومڕايی بكـەن، وە خـوا تەنيـا بەوەندەی كە خۆيـان بـە مسوڵمان زانيـوە، گرەنتی ئـەوەی داونـێ كە بيانخاتە بەهەشتەكەی، وە لێشيـان ڕازييـە !!

كە ئەوەش ديـارە بۆچوونێكـی زۆر زۆر هەڵەيە.

بەڵام پێويستە بزانرێ كە مەسەلە ئيجتيهادييەكانو ڕاجيايی تێياندا ئاسـاييە، وە جيـايە لـەمە، چونكـە پێشـەوايانـی وەك: (أبـو حنيفـة، أحمـد، سفيان الثـوري،

---

١) ج ٨، ص: (١٩٨–٢٠٠).

الشافعي، مالك، جعفر الصادق، زيد بن علي، أبو جعفر الطبري، ليث)، ئەو زانایانەو ، دوای وانیش کەسانی وەك : (إبن تيمية، إبن القيم، الشوكاني) ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموو لایەکیان بێ، ڕاجیاییان بووە لەسەر ئەو شتانەی کە بواری ئیجتیهادو کۆششیان تێدایە، وە دەقێکی قورئانو سوننەتی بێ چەندو چوونیان لەسەر نیە، بابەتەکەی یەکلایی کردبێتەوەو دەریخات کە ئەوە ماناکەیانە، یاخود دەقی قورئانو سوننەتی هەر لەسەر نیە، بەڵکو بۆ عەقڵو ئیجتیهادو ئەزموونی بەشەر بەجێهێڵراوە.

وەك زۆربەی مەسەلەکانی بواری حوکمو سیاسەتو ئیدارەو ئابووریی، ئەوە ڕاجیایی لەو مەسەلانەدا، جیایە لەوەی کە خوای پەروەردگار سەرزەنشتی خاوەن کتێبەکانی پێکردوە، وە سەرکۆنەی هەر کەسێکی دیکەشی پێ دەکات، کە وەك خاوەن کتێبەکان دەکات، وە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەریش ﷺ لەو جۆرە شتانەدا کەوتوونە ڕاجیایەوە، بەڵام ڕاجیاییان نەکردۆتە پاساوی ناکۆکیی و دووبەرەکیی، ئەگەرنا ئەگەر لەسەر بابەتە فەرعییەکانو مەسەلە ئیجتیهادییەکانیش ناکۆکییو دووبەرەکیی پەیدا بکرێ، بە هەمان شێوە لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی خاوەن کتێبەکان دەگەیەنێ.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾، هەر کەسێك چاکە بێنێ، ئەوە دە بەرانبەر چاکەی هەیە یانی: دە بەرامبەر پاداشتی هەیە، وە هەرکەسێ خراپە بێنێ تەنیا بەقەدەر خۆی سزا دەدرێ وە ستەمیان لێناکرێ.

لەوبارەوەش چەندان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هەن، زیاتر تیشکمان بۆ دەخەنە سەر چەمكو واتای ئەم ئایەتە :

١/ یەکێك لەو فەرموودانە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿عَن عَبد الله بْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فِيما يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ ، قَالَ: إنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ، ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا، كَتَبَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَهُ عَشْرَ

حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَإِنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا، كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا، كَتَبَهَا اللَّهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٢٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٤٩١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٣١)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوای بەرزی پایەدار چاکەکان‌و خراپەکانی نووسیون، دوایی ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، کە دەفەرموێ: هەر کەسێك ویستی چاکەیەك بکات، بەڵام نەیکرد، خوا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ، {واتە: عەزمی لەسەر چاکەیەك جەزم کردوە، بەڵام بۆی نەکراوەو پەرچێك هاتۆتە ڕێی، بۆیە نەیتوانیوە بیکا، دەنا لێی پەشێمان نەبۆتەوە}[1]، ئنجا ئەگەر ویستی بیکات‌و کردیشی، خوا بە دە چاکە بۆی دەنووسێ، تاکو حەوت سەد بەرانبەر تاکو چەندان بەرانبەر زیاتر، وە هەرکەسێك ویستی خراپەیەك بکات‌و، نەیکرد، خوا چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ،{واتە: نەیکردو لێی پەشێمان بۆوە، ئەگەرنا ئەگەر عەزمی لەسەر جەزم بێ، حوکمەکەی جیایە، دوایی باسی دەکەین}[2]، بەڵام ئەگەر ئەو خراپەیەی ویستوویەتی بیکات‌و کردی، خوا یەك خراپەی بۆ دەنووسێ.

٢/ لە فەرموودەیەکی دیکەی قودسیی دا واتە: کە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ﴿يَقُولُ اللَّهُ: إِذَا أَرَادَ عَبْدِي أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَلا تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ حَتَّى يَعْمَلَهَا، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا بِمِثْلِهَا، وَإِنْ تَرَكَهَا مِنْ أَجْلِي فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً، فَلَمْ يَعْمَلْهَا ، فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ﴾ (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧٥٠١))، واتە: خوای بەرز دەفەرموێ: هەر کاتێك بەندەی من ویستی خراپەیەك بکات (بە فریشتەکان دەفەرموێ) لەسەر مەنووسن، تاکو دەیکات، ئەگەر کردی ، یەك خراپەی بۆ بنووسن، بەڵام ئەگەر لەبەر من وازی لەو خراپەیە هێنا، {ویستوویەتی خراپە بکات، بەڵام نەیکرد لەبەر خوا}[3] لە

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

٣) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

جێی ئەو خراپەیە، چاکەیەکی بۆ بنووسن، بەڵام ئەگەر ویستی چاکەیەك بکاتو نەشیکرد، {واتە: نەیتوانی بیکاتو پەرچێکی هاتە ڕێ}[١] چاکەیەکی بۆ بنووسن، {هەر بە نیەتەکەی}[٢]، بەڵام ئەگەر ویستی بیکاتو کردیشی، ئەوە دە بەرانبەر بۆی بنووسن، تاکو حەوت سەد بەرانبەر.

(إبن کثیر)یش لەوبارەوە قسەیەکی جوان دەکات، لە تەفسیرەکەی خۆی دا کە دیارە کورتکراوەتەوە بە ناوونیشانی : (المصباح المنیر في تهذیب تفسیر إبن کثیر)، دەڵێ: (إِعْلَم أَنَّ تَارِكَ السّيئَة الَّذِي لا يعملها عَلَى ثَلاَثَة أَقْسام: تَارَةً يتركها لله عَزَّ وجل، فَهَذَا تُكْتُبُ لَهُ حَسَنَةً عَلَى كَفِّه عَنْهَا لله تعالى، وَهَذَا عَمل وَنِيَّة؛ وَلِهَذَا جَاءَ أَنَّهُ يُكْتَبُ لَهُ حَسَنَةً، كَمَا جَاءَ فِي بَعض أَلْفَاظ الصَّحِيح: "فَإِنَّمَا تَرَكَهَا مِنْ جرائي" أي: مِنْ أَجْلِي. وَتَارَةً يتركها نسْيَانَاً وذُهولاً عَنْهَا، فَهَذَا لا لَهُ وَلا عَلَيْهِ؛ لأَنَّهُ لَمْ يَنْوِ خَيْرَاً ولا فعل شَرّا، وَتَارَةً يَتْرُكُهَا عَجْزاً وَكَسَلاً بعد السعي فِي أَسْبَابهَا والتَلَبُّس بما يقربُ مِنْهَا، فَهَذَا يَتَنَزَّلُ مَنْزِلَة فَاعِلِهَا)[٣]، واتە: بزانە ئەو کردەوە خراپەیەی کە ئینسان وازی لێ دێنێ سێ جۆرە:

١ – یان لەبەر خوا وازی لێ دێنێ، دەیەوێ خراپەیەك بکاتو نیەتی بە دڵدا دێ، بەڵام دوایی لەبەر خوا وازی لێ دێنێو پەشێمان دەبێتەوە، ئەوە وەك فەرموودەکە دەفەرموێ: ئەگەر لەبەر من وازی لێ هێنا، لە بەرانبەر ئەو خراپەیەدا ، کە ویستی بیکاتو لێی پەشێمان دەبێتەوە لەبەر خوا، چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ.

٢ - وە جاری وایە کە وازی لێ دێنێ ، لەبیری دەچێتەوە، ئەوە نە خراپەکەی بۆ دەنووسرێو، نە چاکەکەشی بۆ دەنووسرێ، چونکە لێی پەشێمان نەبۆتەوە هەر لەبیری چووە، ویستوویەتی خراپەیەك بکات، بەڵام دوایی

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

٣) ص : ٣٦٤.

لەبیـــری چۆتـــەوە بیکـــات، خراپەکـــەی بـــۆ نـــانووسرێ، چونکـــە نەیکـــردوە، چاکەکەشی بۆ نـانووسـرێ، چونکە لێـی پەشـیمان نەبۆتـەوە.

٣ - ئەوەیە کـە دەیـەوێ خراپەیەك بکاتو، خراپەکەی بۆ نـاکرێ، بـەڵام عـەزمی لەسـەر جەزم کـردوە بیکـات، بەڵام یان لەبـەر نـەتوانین، یـان لەبـەر تەنبەڵـیی بـۆی ناکـرێ، ئەگـەرنا هـەر دەیـەوێ بیکـات، وە هەوڵیشـی داوە هۆکارەکـانی بێنێتـە دی، {بـۆ وێنـە: دەیـەوێ قـەتڵـێك بکـات، یـان زینـا بکـات، یـان دزیـی بکـات، بەڵام دوایـی دەسـتی نایگـاتـێ، ئەگـەرنا هـەر لـە دڵیدایـە}[١]، ئـەوە بـە تەئکید وەك ئەو خراپـەیـەی کردبـێ وایـە.

دوایی خـوای دادگـەر دەفـەرموێ: ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، وە ئـەوان سـتەمیان لـێ نـاکرێ، واتـە: چاکـەکاران سـتەمیان لـێ نـاکرێ، بەڵـکو پاداشـتیان دەدرێتـەوە بـە ئەنـــدازەی چاکەکـــانی خۆیـــان، بەڵـــکو بـــە چـــەند بەرانبـــەرو زیـــاتر پاداشـــتیان دەدرێتـەوە، وە خراپەکارانیش ستەمیان لـێ ناکرێ، خـوای دادگـەر تەنیا بە ئەنـدازەی خراپەکـەیـان سـزایان دەدات.

یەکێك بۆ هەیە، بڵێ: ئایـا بۆچی خـوا یەك بە دە، چاکـەی چاکـەکاران دەداتـەوە، بەگشتی، هـی واش هەیە یەك بە حەوت سـەدو بەڵکو زیاتریش پاداشـتی دەداتەوە ؟!

وەڵامەکەی ئەوەیـە کـە ئـەوە دەکـەوێتە سـەر ئەنـدازەی نیـەتو عـەزمو جـەزمی ئـەو ئینسـانە، وە کـەلێـن پێگرتنـی بـە چاکەکـەی، هـەتا کـەلێنـی باشـتری پێبگـرێ، واتە: هەتا بە دڵێـکی سـاغو سـافتـرەوە بیکـاتو، زیـاتر ڕەزامەنـدیی خـوا هانـدەرو پاڵنـەری بـێ، دیـارە بەرانبـەری پاداشـتەکەی زیـاترەو بەرزتـرەو چاکـترە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنـی خۆمـە.

# دەرسی نۆزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێنج (٥) ئایەتی كۆتایی دەگرێتە خۆی، لە : (١٦١ تا ١٦٥)، لەم پێنج ئایەتەدا خوای پەروەردگار سێ جاران بە وشەی: بڵێ (قل) پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ، وەك لە سەرەتای تەفسیری ئەم سوورەتەدا گوتمان، لەم سوورەتەدا (٤٣) جار خوای پەروەردگار وشەی: (قل)ی بەكارهێناوە، جا ئەم پێنج ئایەتە سێ جاری كۆتایی واتە: جاری (٤١ و ٤٢ و ٤٣) یان گرتۆتە خۆیان، بۆیە جاری یەكەم خوای باڵادەست فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەكات، كە بفەرموێ: من پەروەردگارم، بەرەو ڕێیەكی ڕاست ڕێنمایی كردووم، كە بەرنامەیەكی ڕاستو تەواوو دامەزراوەو هەمان ڕێبازی ئیبراهیمە، كە ئیبراهیم خوا بە یەكگربوو، نەك هاوبەش بۆ خوا دانەر.

وە بۆ جاری دووەم خوا فەرمانی پێ دەكات كە ڕایبگەیەنێ: نوێژو بەندایەتییو ژیانو مردنی تەنیا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەكانە، كە هیچ هاوبەشی نین، وە بۆ خۆشی (واتە: موحەممەد ﷺ) یەكەمینی مسوڵمانانە.

پاشان بۆ جاری سێیەمو كۆتایی، ـ كە جاری چلو سێیەمینە لەم سوورەتەدا ـ خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەكات كە بڵێ: ئایا جگە لە خوا كە پەروەردگاری هەموو شتێكە، كەسێكی دیكە بە پەروەردگار بگرم، لە حاڵێكدا كە هەر كەسێك، هەر چییەك بكات ، تەنیا لە ملی خۆیەتی، وە كەس لە گوناهی كەس هەڵناگرێ ؟!

وە لە كۆتاییدا خوای پەروەردگار ڕایدەگەیەنێ : كە ئێمەی مرۆڤی كردووە بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، وە جیاوازیی خستۆتە نێوانمان، لەو نیعمەتانەدا كە پێی داوین، بە مەبەستی تاقیكردنەوە، وە ڕایدەگەیەنێ : كە خوای پەروەردگار سزای خێرایە، بۆ كەسانێك كە لاڕێ دەبن، وە لێبوردەو بە بەزەییشە، بۆ كەسانێك كە بەرەو خوا هەنگاو دەنێن.

﴿قُلۡ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ دِينٗا قِيَمٗا مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۚ
وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ
أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ
وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ
ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ
فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿١٦٥﴾﴾.

# مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

(("خــوا دەفــەرموێ: ئــەی موحەممـــەد" بڵــێ: بــە دڵنیاییـــەوە پەروەردگـــارم خستوومیــە ســەر ڕێیــەکی ڕاســتو بــێ گــرێو گـۆڵ، بەرنامەیـەکی ڕاسـتو دامـەزراوو ڕاست ڕاگـرە، ڕێبـازی ئیـبـڕاهیمە، کـە پـاكو بـێ خـەوش بـوو، وە ئـەو (ئیـبـڕاهیم) لـە هـاوبـەش بۆ خـوا دانـەران نەبـووە ﴿١٦١﴾ بڵـێ: بێگـومان نوێـژو پەرسـتشو ژیـانو مـردنم بۆ خـوای پەروەردگاری جیهـانەکانە ﴿١٦٢﴾ هیـچ هـاوبەشی نین، وە هـەر بـەوەش فــەرمانم پێکراوە، وە من یەکـەمینی مسوڵـمانانم ﴿١٦٣﴾ بڵـێ: ئایـا جگـە لـە خـوا بـە پەروەردگـار بزانــم ! لـە حاڵێـکـدا کـە ئـەو پەروەردگـارو خـاوەنی هــەموو شـتێکە، وە هــەر کەسێك کـردەوەی خـراپ بەدەســت بێنـێ بـەس ســەری خـۆی دەگــرێتەوە، وە هـیـچ گوناهبارێـك گوناهی یەکێکی دیکە هـەڵناگـرێ؟ پاشـان گـەڕانەوەتـان بـۆ لای پەروەردگـارتانە، ئنجـا هـەواڵــتان پێــدەدات، بـەوە کـە تێیـدا دەکەوتنـە مشــتومرو ڕاجیاییـــەوە ﴿١٦٤﴾ وە ئـەو (خـوا) ئەو کەسـەیە کە کردوونـی بە جێنشینان(ی خـۆی) لەسـەر زەوی، وە بە چەنـدان پلە هـەنـدێکـتانی بەسـەر هـەنـدێکتان دا بەرزکـردۆتـەوە، تاکو لـەوەدا کـە پێـی دابـوون، تاقیتـان بکاتەوە، بە ڕاسـتیی پەروەردگـار، سـزادانی خێرایـە بـۆ تاوانبـاران، وە بێگـومان ئەو لـێبوردەی بە بـەزەییـە "بۆ فـەرمانبـەرانو گوێـڕایــەڵان" ﴿١٦٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(دِينًا قِيَمًا ): (دین) واتە، بەرنامەی ژیان، ئایین، (قِيَمًا ) (أَي ثابتاً مقوِّمَاً لأمور مَعَاشِهِم وَمَعَادهم، و قُرِيءَ: قيِّماً: القيِّم : السيّد وسائس الأمر، وأمرٌ قيِّم: مستقيم، وكتاب قَيِّم: ذو قيمة، والقيمة المستقيمة المعتدلة) وشەی (قيماً) بە مانای چەسپاو دێ، وە بە مانای ڕاگری كاروباری دنیاو دوارۆژ دێ، وە هەروەها وشەی (قَيِّم) بە مانای (سيِّد) سەرپەرشتیارو مشوورخۆر دێ، وە (أمر قيِّم) واتە: كارێكی ڕێك ڕاست، وە (كتاب قيِّم) واتە: خاوەن بەهاو قیمەت، وە (قيِّمة) بە مانای ڕێكو ڕاستو هاوسەنگ دێ.

(مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ ): (المِلَّةُ: كالدِّين، وَهُوَ اسْمٌ لَمَا شَرَعَ اللهُ تعالى لِعبادِهِ عَلَى لِسَانِ الأنبِيَاءِ لِيتَوَصَّلُوا بِهِ إلى جِوارِ اللهِ، والفَرْقُ بَينَهَا وبَيْنَ الدِّين ، أنَّ المِلَّةَ لا تُضافُ إلاَّ إلى النَّبيِّ ﷺ)، واتە: وشەی (مِلَّةُ) هەر بەمانای (دین) دێت، وە ناوە بۆئەوە كە خوای بێ هاوتا لەسەر زمانی پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) وەك بەرنامەیەك بۆ بەندەكانی داناوە، تاكو پێی بگەن بە ڕەزامەندیی خواو، پێیبگەنە دراوسێیەتی خوا، بەلاّم ئایا وشەی (المِلَّة) لەگەلّ (دین)دا جیاوازیی چییە؟ هەلّبەتە لە زمانی عەرەبیی دا، ئەگەرنا وشەی میللەت لە زمانی كوردیی دا ، بە مانای (گەل)ە، دەگوترێ: میللەتی كورد، بەلاّم ئەوە بەكارهێنانێكی عورفییە، ئەگەرنا لە بەكارهێنانی قورئان دا، وشەی (مِلَّةُ) یانی دین، بەلاّم جیاوازییان چییە ؟ جیاوازییان ئەوەیە ، كە دین پالّ دەدرێتە لای خوا (دین الله)، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ ﴾ النصر، ناگوترێ : دینی موحەممەد ﷺ، بەلّكو دەگوترێ: میللەتی موحەممەد ﷺ ومیللەتی ئیبراهیم عليه السلام، واتە: ئەو

بەرنامەو ڕێبازەی لەسەری بوونە... کەواتە: دینی ئیسلام، ئەگەر پاڵبدرێتە لای خوا ، دەگوترێ: دین، بەلام ئەگەر پاڵ بدرێتە لای موحەممەد ﷺ دەگوترێ: میللەت، واتە: ئەو ڕێبازو ئەو شێوە دینداریيەی ، کە ئەو گرتوويەتە بەرو پەیڕەويی لێکردوە.

(حَنِيفًا ): (الحَنَفُ: هُوَ مَيْلٌ عَنِ الضَّلَالِ إِلى الإِستقَامَةِ، عَكْسُ الجَنَف: هُوَ مَيْل عَنِ الإِستقَامَةِ إِلى الضَّلَال، والحَنَفُ: هُوَ الـمَائِلُ إِلى ذَلِكَ)، واتە: (حَنَفْ) بریتیە لە مەیلکردنو بەلادا چوون، لە گومڕاییەوە بەرەو ڕاستە ڕێگا، بە پێچەوانەوەی (جَنَف)ەوە، وشەی (جَنَف) بریتیە لە مەیلکردنی کەسێك، بۆ وازهێنان لە گومڕاییو ڕێی لارو خوار ، بەرەو ڕاستە شەقامی خوا.

(وَنُسُكِى ): (النّسك: العبادة والناسك: العَابِد، واختص بأعمال الحج، والمناسك: مواقف النسك وأعمالها، والنسيكة مختصة بالذبيحة) وشەی (نُسُك) بە مانای عیبادەتو خواپەرستیی دێ، وە (ناسك) واتە: (عابد)، کەسێك خوا پەرست بێ، وە وشەی (نسك) تایبەتە بە کردەوەکانی حەجو عومرەوە، (مناسك)یش ئەو شوێنانەن ، کە خوا پەرستییەکانێ حەجو کردەوەکانی حەجیان تێدا ئەنجام دەدرێن، وە وشەی: (نسيكة) یانی: (ذبيحة) واتە: سەربڕاو، ئەوەی کە دەکرێتە قوربانیی.

(خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ ): وشەی (خَلَائِف) کۆی (خَلِيفة)یە، و (خُلَفاء) کۆی (خَلیف)ە، (خَليف وخَلِيفة) هەردووکیان بە مانای (جێنشین) دێن، خیلافەت بریتیە لە چی؟ (خِلافَة) کە زۆر کەس بە هەڵە دەریدەبڕێ، (الخِلاَفة: النِّيَابَةُ عَنِ الغَيْرِ، إمَّا لِغَيْبَةِ الـمَنُوبِ عَنهُ، وإمَّا لِعَجْزِه، وإمَّا لِمَوْتِهِ، وَإمَّا لِشَرَفِ المُستَخْلَفِ، وَعَلَى هَذَا الوَجْه ، استَخْلَفَ الله أَوْلِيَاءهُ فِي الأَرْض) وشەی (خِلَافة) بریتیە لە جێنشینایەتییکردنی جگە لە خۆت، جێنشینایەتیی کردنیش، یان لەبەرئەوە دەبێ ئەو کەسەی کە بە جێنشینی داناوە، لەوێ نیە، یان لەبەرئەوەیە کە ناتوانێ ، یان لەبەرئەوەیە کە دەمرێ، یان لەبەر ڕێزلێگرتن، یەکێك لە شوێنی

خۆی دادەنێ‌و دەیەوێ ڕێزی لێبگرێ، وە لەم ڕووەیانەوەیە، کە خوا دۆستانی خۆی لە زەوییدا کردۆتە جێنشینی خۆی.

(لِّيَبْلُوَكُمْ): واتە: تاکو تاقیتان بکاتەوە، (بَلَوتُهُ: اختبَرتُهُ) تاقیم کردەوە، یانی: (كَأَنّي أَخْلَقْتُهُ مِنْ كَثْرَةِ اخْتِبَارِي) وەك بڵێی: کە شتێك زۆر ئەزموونت کردبێ‌و شڕت کردبێ، چونکە دەڵێ: (بَلِـيَ الثّوبُ بِلاً وَبَلائاً: خَلِقَ) واتە: بەرگەکە، جلەکە، شڕ بوو، کۆن بوو، وە (إبتلاء) لەوەوە هاتوە ، کە شتێك تاقی دەکەیەوە، کۆنی بکەی‌و شڕی بکەی.

(ٱلْعِقَابِ ): (العُقُوبَة، وَالـمُعَاقَبَة، وَالعِقَاب يَخْتَصّ بالعَذَاب) هەموویان بە مانای سزادان دێن.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

دیـاره خــوای تاکــی پەروەردگــار ﷻ لــەم ســوورەتی (الأنعـام)دا ، وەك زۆرجــار گوتوومـانە: بەتایبـەت باسی یەکتـایی خۆی کردوە، وە تێکهـەڵکێش لەگـەڵ ئـەوە باسی پێغـەمبـەرایەتیی‌و وەحیی‌و ڕۆژی دوایی‌و بەهـەشت‌و دۆزەخ‌و، ئەوانەشـی کـردوە، بـەڵام بەڕاسـتیی ئـەم سوورەتە دەتـوانین نـاوی لـێ بنـێین (سـورة التوحیـد)، سـوورەتی خــوا بەیەکگـرتن، وە (٤٣) جـار خــوا لــەم ســوورەتەدا ، بـە پێغـەمبــەری دەفـەرمویّ: (قُلْ) بڵـێ، بڵـێ، بڵـێ... لەم پێنـج ئایەتـەدا ، سـێ جـار وشـەی بڵـێ (قُلْ) هـاتـوە، وە ئـەم پێنـج ئایەتـە ، وەك پوختـەو گوشـراوی مەبەسـتەکانی ئەو (١٦٠) ئایەتـەی ڕابـردوو، وان، چـونکە ئـەم سـوورەتە هــەمووی (١٦٥) ئایەتـە، ئــەو (١٦٠) ئایەتــەی ڕابــردوو، خـــوای پەروەردگـار ئامانجـە سـەرەکییـەکـەی هـەموویانـی لەم پێنـج ئایەتـەدا پوخـت کردۆتـەوە، وە خـوای کـاربەجـێ عـادەتی وایـە هـەم لە سـەرەتـایی سوورەتەکـان‌و ، هـەم لـە کۆتـایی سوورەتەکـان دا پوختـەو ئامـانج‌و مەبەسـتەکانی ئەو سـوورەتـانە، دەخـاتـە ڕوو.

سـەرەتا خــوا ﷻ دەفــەرمویّ: ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، بە پێغـەمبـەری خـاتـەم ﷺ دەفـەرموێ: ـــ لـە کۆتـایی هـەموو ئـەو قسـەو باس‌و وتـووێـژکردنــە لەگـەڵ خـەڵك دا بەگشتـی‌و ، لەگەڵ هـاوبـەش بۆ خـوا دانـەرەکـانـدا، بەتـایبـەتی - تۆ بڵـێ: بێگـومان مـن پـەروەردگـارم ڕێنمایی کردووم بـۆ ڕێیــەکی ڕاســت‌و بــێ گــرێ‌و گــۆڵ، ئنجـا ئـایـا ئـەو ڕێیە ڕاسـت‌و بێ گـرێ‌و گـۆڵە، ئەو ڕاسـتە شەقامە چییە؟ ﴿ دِينًا قِيَمًا ﴾ بەرنامەیـەکی چەسـپاوو ڕێـك‌و ڕاسـت‌و ڕاسـت ڕاگـرە، ﴿ قِيَمًا ﴾، هـەر سـێ ماناکەی هـەن:

١) هـەم بە مانای دامەزراو دێ.

٢) هەم بە مانای ڕاستو ڕێك دێ.

٣) وە هەم بە مانای ڕێبازێك دێ، کە کەسێك شوێنی بکەوێ، ڕێکی ڕادەگرێو ناهێڵێ بەملاولادا لابداو لە قاڵبێکی ڕاستی دەدا.

ئنجا ئایا ئەو دینە ڕێكو ڕاستو دامەزراو ڕاست ڕاگرە، ڕێبازو ڕێوشوێنی کێیە؟ ﴿ مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ﴾، هەمان ڕێبازی ئیبراهیمە ﷺ کە ئیبراهیمیش (حنیف) بووە، واتە: وازی لە هەرچی لاریی خوارییو نارێکیی هەیە، هێناوە، وە بەدوای ڕاستە شەقامی خوا کەوتوە، کەواتە: من پەروەردگارم بەرەو ڕاستە شەقامێکی ئاوا ڕێنمایی کردووم، کە سەرقافڵەی ئەو ڕێبازە ، ئیبراهیمە، ئیبراهیمیش پاكو ڕاست بووە، نە جوولەکە بووە، وە نە نەصرانیی بووە، نە هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە، بەڵکو مسوڵمان بووە، بۆ خوا گەردن کەچێکی ساغو پاكو بێ خەوش بووە، بۆیەش خوای پەروەردگار تەئکید لەوە دەکاتەوە، چونکە هەم جوولەکەکان دەیانگوت: ئیبراهیم لە ئێمەیە، هەم نەصرانییەکان وایاندەگوت، هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش دەیانگوت: ئێمە لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمین، بەڵام خوای زاناو شارەزا ، لێرەدا هەموویان بە درۆ دەخاتەو ، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، وە ئیبراهیم لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبووە.

کەواتە : سەرەتاو یەکەمجار خوا فەرمایشتەکەی خۆی ئاڕاستەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، کە بە شێوەی فیکریی‌و تیۆریی، خوا بە یەکگرتنو ئەو هیدایەتو ڕێبازەی کە خوا ئەوی لەسەر داناوە، ڕایبگەیەنێ، ئنجا بۆ جاری دووەم پێی دەفەرموێ: کە بە شێوەی کردەیی بەندایەتیی بۆ خوا کردنو، یەکتاپەرستیی خۆی ڕابگەیەنێ، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي ﴾ بڵێ: بێگومان نوێژم ﴿ وَنُسُكِي ﴾، (نُسك)بە مانای خوا پەرستیی دێ، بەگشتی، وە بە مانای سەربڕینیش دێ، وە بە مانای خوا پەرستییەکانی حەجیش دێ، ﴿ وَمَحْيَايَ ﴾، وە ژیانم ﴿ وَمَمَاتِي ﴾، وە مردنم

﴿ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَالَمِينَ ﴾، هەمووی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، ﴿ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ﴾، (ئەو) هیچ هاوبەشی نیین، ﴿ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، وە بەوە فەرمانم پێکراوە، واتە: هەر لە خۆمەوە وا ناکەم، فەرمانم وا پێکراوە، ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، وە من یەکەمینی مسولمانانم، دیارە پێغەمبەری خاتەم یەکەمینی ئۆممەتەکەی بووە .

وە ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ ، کە: من یەکەمین مسولمانو بۆ خوا ملکەچو گەردن کەچم، کەواتە: هیچ ئومێدێکتان بەوە نەبێ، من لەو ڕاستە شەقامە لابدەم.

پاشان بۆ جاری سێیەم دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ ﴾، بلێ: ئایا جگە لە خوا، پەروەردگارێکی دیکە بخوازم، لە حاڵێکدا ئەو پەروەردگاری هەموو شتێکە؟! شتێکی زۆر بێجێیە، خوا پەروەردگاری هەموو شتێك بێ، کەچی تۆ بچی یەکێکی دیکە بکەی بە پەروەردگاری خۆت !! ﴿ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ﴾، هەر کەسێکیش هەر خراپەیەك دەکات، سەری خۆی دەگرێتەوە، کەواتە: ئەگەر من لابدەم، زەرەر لە خۆم دەدەم، ئێوەش کە لاتان داوە، زەرەر لەخۆتان دەدەن، ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، وە هیچ گوناهبارێکیش گوناهی کەسێکی دی هەڵناگرێ، هیچ کەسێك کۆڵی گوناهانی کەسێکی دیکە، ناخاتە سەر شانی خۆی، ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ ﴾، دوایی گەڕانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە، ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾، هەواڵتان پێدەدات بەوەی کە تێیدا دەکەوتنە ڕاجیاییەوە لەگەڵ بڕواداران دا .

دیارە لێرە ڕووی دواندنو قسەکردن، لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ ﴾، (خوا) ئەو کەسەیە کە ئێوەی کردۆتە جێنشینان لەسەر زەوی، ئێمە جێنشینانی کێین ؟! جێنشینی خواین ﷻ خوا تەصەڕووف کردنو دەخالەت کردنی لە کاروباری زەویی دا ، بە ئینسانان سپاردوە، ﴿ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾، وە خوا هەندێکتانی بەسەر هەندێکتان دا ، بە چەندان پلە بەرزکردۆتەوە، هەیە عەقڵی زیاتری پێداوە، هەیە هێزی بەدەنیی زیاتری پێداوە، هەیە ماڵو سامانی زیاتری پێداوە، هەیە هێزی دەروونیی زیاتری پێداوە، ئەمە واتایەکی .

واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە: خوای پەروەردگار ئیمتیازەکانی بە نێوتاندا دابەش کردوون، هەر کامێکتانی بەسەر ئەوەی دیکەدا بەرز کردۆتەوە، ئەگەر یەکێك لە ڕووی عەقڵییەوە بەهێزبێ، ئەوی دیکە لە ڕووی جەستەییەوە، ئەوەی دیکە لە ڕووی ماڵ سامانەوە بەهێزە، ئەوی دیکە لەڕووی دەروونیی و مەعنەوییەوە ، دڵی گەورەترە، هیچ کەسێك نیە ئیمتیازێکی نەبێ، شتێکی تایبەت بەخۆی نەبێ، خوای پەروەردگار شتەکانی دابەش کردوون.

ئنجا ئایا بۆچی خوا وایکردوە؟ ﴿ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾، تاکو تاقیتان بکاتەوە لەوەدا کە پێی داون، ئایا چی لەو نیعمەتانەی خوا دەکەن ؟ پێیان لەخۆبایی دەبن ؟ پێیان لە کەوڵی خۆتان دەردەچن ؟ وە شانازیی و فەخریان پێوە دەکەن بەسەر یەکدیدا ؟ یاخود نیعمەتەکان دەگێڕنەوە بۆ لای خواو ، ئەو نیعمەتانە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاردێنن ؟

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴾، بێگومان پەروەردگارت سزای زۆر خێرایە، وە بێگومان زۆریش لێبوردەی بە بەزەییە، سزای خێرایە بۆ کەسێك کە شایستەی سزابێ، وە لێبوردەو بە بەزەییشە، بۆ کەسێك کە شایستەی بەخششو بەزەیی و لێبوردنی خوای پەروەردگارە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا لەو پێنج ئایەتەی کۆتایی سوورەتی (الأنعام) دا ، سێ جاران بە پێغەمبەری فەرمووە :﴿ قُلْ ﴾ بڵێ، بۆ جاری یەکەم، دەفەرمووێ:

﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾، ئەمە چەند شتێکی لێ وەردەگیرێن:

**یەکەم/** تۆ پێیان بڵێ، بێگومان، {چونکە ﴿ إِنَّ ﴾، بۆ تەئکیدو جەخت کردنەوەیە} ، بێگومان پەروەردگاری من، خاوەنی من، منی ڕێنمایی کردوە، یاخود منی خستۆتە سەر ڕاستە ڕێیەك .

لێرەدا ئەمە وێچواندن (تشبیه)ی تێدایە ، یانی: ئەو ئایین‌و بەرنامەیەی کە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ لەسەرە، وەك ڕێیەکی ڕاست وایە، کە خوای پەروەردگار بۆی ناردوە، وەك چۆن یەکێك دەستی کەسێك بگرێ‌و بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، واتە: خوای خاوەنم ، ئەو ڕێیە ڕاستەی پێشانداوم ، خستوومیەتە سەر ئەو ڕێیە ڕاستە.

**دووەم/** ئنجا پێناسەی ئەو ڕێیە ڕاستە دەکات‌و دەفەرمووێ: ﴿ دِينًا قِيَمًا ﴾، بەرنامەیەکی ڕاست‌و چەسپاوە، وە شوێنکەوتووانی خۆشی ڕێك دەکات‌و ڕاستیان ڕادەگرێ، ناهێڵێ بەملاولادا بچن‌و، سەرپەرشتییان دەکات.

**سێیەم/** ئنجا ئەو ئایین‌و بەرنامە ڕاست‌و چەسپاوە، هی کێیە ؟! ﴿ مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ ﴾، ڕێبازی ئیبراهیمە ، هەمان ئایین‌و ڕێباز کە ئیبراهیم ﷺ لەسەری ڕۆیشتوە، هەمان ڕێبازە.

**چوارەم**/ ئنجا ئایا ئیبیڕاهیمی سەرقافڵەی ئەو بەرنامەو ڕێبازە ، هەڵوێستی بەرانبەر ڕێچكەو كوێرە ڕێیەكان چۆن بووە ؟ ﴿ حَنِيفًا ﴾، ئیبڕاهیمیش پاكو بێ خەوش بووە، وازی لە هەرچی گومڕایی سەرگەردانیی‌و، هەرچی ڕێچكەو كوێرە ڕێ هەبووە ، هێناوەو، هاتۆتە سەر ڕاستە شەقامی خوا.

**پێنجەم**/ ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، وە ئیبڕاهیم لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبووە.

لێرەدا ڕەنگە پرسیارێك لە زەینی هەندێك كەس دا دروستبێ: ئایا كە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بەپێی ڕێبازی ئیبڕاهیم بەڕێوەدەچێ، مانای وانیە ئیبڕاهیم لە پێغەمبەری خاتەم گەورەتر بووە ؟

دەڵێین: نەخێر .

لێرەدا مەبەست ئەوەیە كە ئەو ڕێبازی ئیسلامە ، كە پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد)ی ﷺ لەسەر دەڕوات، شتێكی داهێنراو نیە، شتێكی تازە نیە، بەڵكو ڕەگ‌و ڕیشەی بە قووڵایی مێژووداچۆتە خوار، پیاوێكی گەورەی وەك ئیبڕاهیم كاتی خۆی لەسەر ئەو ڕێبازە بووە، لە ڕۆژگاری خۆیدا ئیبڕاهیم سەرقافڵەی ئەو كاروان‌و ئەو ڕێیە بووە.

كەواتە: ئێوە ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، وە ئەی جوولەكەكان‌و نەصرانییەكان ! وە ئەی هەموو ئەوانەی كە خۆتان بە خاوەنی بەرنامەیەكی ئاسمانی دەزانن ! ئەو ڕێبازەی موحەممەد ﷺ لەسەریەتی، ئەو دینەی كە ئەو بۆی هاتوە: هەمان بەرنامەو ڕێبازی ئیبڕاهیمە سەلامی خوای لێ بێ.

ئنجا بۆ زانیاریتان ! هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەكان، هەموو خاوەن كتێبە ئاسمانییەكان ، شانازیی بە ئیبڕاهیمەوە دەكەن، جوولەكە عیسایان قبوول نیەو، نەصرانیی موحەممەد ﷺیان قبوول نیەو، لەنێو خۆیاندا ، پەیڕەوانی هەر بەرنامەیەك ئەوی دیكەیان قبوول نیە، بەڵام هەموویان ئیبڕاهیمیان قبووڵە، بە صابیئەكانیشەوەو، هەمووشیان شانازیی بە ئیبڕاهیمەوە دەكەن، بۆیە خوای پەروەردگار ئەوەندە مەدحی ئیبڕاهیم دەكات.

وە بێگومان ئیبراهیمیش ﷺ لە زۆر ڕووەوە دەشوبهێتە پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ، مووسا ﷺ پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل بووە، عیسا ﷺ تایبەت بووە بە بەنی ئیسرائیلەوە، داوود ﷺو سولەیمان ﷺ بە هەمان شێوە، پێغەمبەرێکی دیکە لە شوێنی دیکە بووە، یەکی دیکە تایبەت بووە بە شوێنێکی دیکەوە، بەڵام ئیبراهیم لە عێراق بووە، لە شام بووە، لە حیجاز بووە، لە میسر بووە، پێغەمبەرێکی جیهانییو نێو نەتەوەیی بووە ، پێغەمبەرێك بووە ، هەرچی دەستی گەیوەتێ ، بگرە هەرچی دەنگی گەیوەتێ ، بانگی کردوە بۆلای خوای پەروەردگار، وە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە جگە لە خوایان پەرستوە، هەر لە بتو صەنەمەوە، بۆ خڕۆکەو مانگو خۆر، هەتا حوکمڕانێکی ملهوڕو پادشایەکی ستەمکاری وەك نەمروود، لەگەڵ هەموویان دا تێکگیراوەو شەڕەقسەی کردوە.

## سێ جۆرە سەرەکییەکەی هیدایەتی خوا

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ هَدَىٰنِى رَبِّىٓ ﴾، پەروەردگارم منی ڕێنمایی کردوە، بۆ زانیارییتان هیدایەت سێ جۆرە:

١ / (الهداية التكوينية): واتە: ڕێنماییکردنی خوا بۆ دروستکراوەکانی بەگشتیی، هەر لە گەردیلەوە تا کەهکەشان، هەر لە ئەمبیاوە تا ئینسان، هەر لە جندو فریشتەوە، هەتا تێکڕای ژیانداران و ڕووەك .

وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأعلى)دا ، باسی ئەو جۆرە هیدایەتەی خۆی دەکات، واتە: کە خوا هەموو دروستکراوەکانی خۆی خستۆتە سەر ڕێی ڕاست، دەفەرموێ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣ ﴾، واتە: ناوی ئەو پەروەردگارە بەرزەت بە پاك بگرە ، کە هەموو شتێکی بە ڕێكو پێکیی دروستکردوە، وە هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردووەو ڕێنماییشی کردوە.

هەروەها لە سوورەتی (طه)دا ، کە فیرعەون بە مووسا دەڵێ: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾، (فیرعەون) گوتی: پەروەردگاری ئێوە کێیە ئەی مووسا ؟ مووسا لە وەڵام دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه، گوتی: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە، کە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوە، دوایی ڕێنماییشی کردوە، ئەو هیدایەتە بریتیە لە هیدایەتی (تکویني) یانی هیدایەتی گشتی (الهداية العامة) ، کە خوای پەروەردگار هەموو دروستکراوەکانی خۆی، کە وەك گوتم : هەر لە گەردیلەوە تا کەهکەشانەکان، کە گەردیلە بچووکترین شتە کە ئێمە بزانین[1]، وە کەهکەشان (مجرة) یان هێشووە کەهکەشان (السَّديم) ، گەورەترین شتە، هەموویان لەلایەن خواوە یاساو سیستەمیان بۆ دانراوەو، لێی لانادەن.

٢ / (الهداية التشريعية): ڕێنمایی یاسا دانان، کە ئەوەش تایبەتە بە ئینسانو جندەوە، وەك خوا پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ ﴿١٨٥﴾ ﴾، واتە: ئەو مانگی ڕەمەزانەی کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوار، ڕێنماییە بۆ خەڵك بەگشتی، بۆ کافرو مسوڵمان، ئەوەش هیدایەتی بەرنامە دانان.

٣ / (الهداية التوفيقية): ڕێنمایی هاوکارییکردن، ئەویش ئەوەیە کە دوای ئەوەی ئینسان هیدایەتی تەشریعیی خوا قبووڵ دەکات، خوا هیدایەتێکی زیادەی دەداتێ، وەك لە سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾، وە ئەوانەی هیدایەتی گشتیی خوایان قبووڵ

---

١) دیارە گەردیلە (ذرة: Atom)ش لە سێ بەشی سەرەکیی پێکهاتوە، کە بریتین لە: ئەلکترۆنو پرۆتۆنو نیترۆنو، تەنۆلکەی بچووکتریش لەنێو گەردیلەدا هەن.

کردوه، (زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ) هیدایەتیان بۆ زیدە دەکات، یانی: هیدایەتی تایبەتیشیان پێ دەبەخشێ ، کە بریتیە لە تەوفیقو دڵ وەچەرخان بەرەو چاکەو، دڵ نەرم بوون بۆ تاعەتو ، دڵ ڕۆشنیی و بەرچاو ڕۆشنیی، وە پارێزکاریی تایبەتییشیان پێ دەدات.

ئنجا دیارە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ﴾، مەبەست پێی جۆری دووەمو سێیەمیەتی، هەم جۆری دووەم کە خوا بەرنامەیەکی بۆ ناردوە، هەم جۆری سێیەم کە خوا یارمەتی داوەو ، دڵی خستۆتە سەر ئەو ڕاستە شەقامە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، وە ئیبراهیم لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبووە، لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٦٧﴾، واتە: ئیبراهیم نە جوولەکە بووەو نە نەصرانیی بووە، بەڵکو وازهێنەر بووە لە هەرچی بیری چەوتە، وە بۆ خوا ملکەچ بووە، وە لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبووە.

**مەسەلەی دووەم**: خوا بۆ جاری دووەم بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾، ئەمە چەند شتێکی لێ وەردەگیرێن: لە ئایەتی پێشێدا، خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە : کە بەو خەڵکە ڕابگەیەنێ : خوا ئەوی هیدایەت داوە، وە خستوویەتە سەر ڕاستە شەقامێك، مشووری لێ خواردوە ، لە ڕووی فیکریی و عەقیدەیی و تیۆرییەوە، بەڵام ئەمجارە لە ڕووی کردەییەوە، خوا پێی دەفەرموێ : بەندایەتیی کردەیی خۆت بەوان ڕابگەیەنە بۆ خوا، کە تۆ بەندەی خوای، هەموو شتێکت بۆ خوایە بە کردەوە، ئەویش لە چوار بڕگەدا دەخاتەڕوو:

أ ) ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي ﴾، تۆ بڵێ: من نوێژم.

ب) ﴿ وَنُسُكِي ﴾، وە خوا پەرستییم، یاخود قوربانیی سەربڕینم، یاخود خوا پەرستییەکانی حەجم، هەر سێ واتاکەی هەن.

ج) ﴿ وَمَحْيَايَ ﴾، وە ژیانم.

د) ﴿ وَمَمَاتِي ﴾، وە مردنم.

﴿ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَالَمِينَ ﴾، بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، ﴿ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ﴾، ئەو هیچ هاوبەشی نین، ﴿ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، وە بەوە فەرمانم پێکراوە، وە من یەکەمینی مسوڵمانانم .

(صلاة) و (نُسُك) کە لێرەدا پێکەوە هاتوون، لە سوورەتی (الکوثر)یش دا پێکەوە هاتوون، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَعْطَيْنَاكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ ﴾، واتە: ئێمە (کوثر)مان بە تۆ داوە، واتە: چاکەو نیعمەتێکی زۆر (الخیر الکثیر) یاخود: ڕووبارێکە لە بەهەشت دا (نَهْرٌ فِي الجَنَّةِ)[1].

ئنجا نوێژ بۆ پەروەردگارت بکەو ، قوربانیی بۆ سەرببڕە .

دەگونجێ لێرەدا مەبەست ئەوەبێ: ﴿ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي لِلَّهِ ﴾، نوێژ کردنمو قوربانیی سەر بڕینم، بۆ خوایە.

یاخود (نُسُک) دەگونجێ مەبەست پێی خواپەرستیی پێ ، بەگشتی، نوێژیش تایبەتترین جۆری خوا پەرستییە، واتە: من خواپەرستیی گشتییو خواپەرستیی

١) ﴿عن أنس بن مالك عن النبيّ ﷺ ، أنه قال : بَيْنا أنا أَسيرُ في الجنّة ، إذا بِنَهرٍ حافَتاهُ قُبابُ الدرِّ المجوَّف، قلت : ما هذا يا جبريلُ ؟ قال : هذا الكوثر الّذي أعطاك ربُّك ...﴾ ، رواه البخاري: (١١ / ٤١٢)، و رواه مُسْلِمٌ وأحمد بلفظ آخر قريب ..

تایبەتییم، بەس بۆ خوایە .

﴿وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي﴾، لە زمانی عەرەبییدا ئەسڵی خۆی (حیاة و موت)ن، (مَحْیا ومَماة)یان لێ دروست کراون، یاخود: (إسما زمانٍ من: حَيَّ وماتَ) ناوی کاتن لە: (ژیا) وە (مرد)، واتە: ئەگەر (مصدر میمیّ) بن، واتە: من ژیانو مردنم بۆ خوایە، بەڵام ئەگەر ناوی زەمانیش بن، واتە: هەرچی لە ژیانمدا دەیکەمو ، هەرچی لە کاتی مەرگ دا دەیکەم، بۆ خوایە.

کەواتە: کردەوەکانی ژیانو مردن، یاخود ئەوەی کە لە حاڵەتی ژیانو مردنمدا بەسەرم دا دێ ، بۆ خوایە، خۆم بۆ خوا یەکلا کردۆتەوە.

ئنجا یەکێك ڕەنگە بڵێ : باشە ئینسان دەتوانێ ژیانەکەی بۆ خوا بێ، ئەدی مردنەکەی چۆن بۆ خوا دەبێ ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: ئاگات لە ژیانەکەت بێ ، مردنەکەشت یەکسەر بە دوای ژیانەکەتدا دێ، ئینسان لەسەر چی ژیا، لەسەر ئەوەش دەمرێ، وە لەسەر چیش بمرێ، لەسەر ئەوەش زیندوو دەبێتەوە .

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ﴾[1]، واتە: هەموو بەندەیەك لەسەر ئەوە زیندوو دەکرێتەوە ، کە لەسەری مردوە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ژیانو مردنم بۆ خوایە، یانی: من ژیانەکەم بەو شێوەیە بە ڕێ دەکەم، کە دینی خوا دەیخوازێ، کە ژیانەکەت بەو شێوەیە بە ڕێ کرد، کۆتایی ژیانەکەشت کە مەرگەکەیە ، بەو شێوەیە دەبێ، وە هەر لەسەر ئەوەش زیندوو دەکرێیەوە .

﴿لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئنجا باشە خۆ ئەو شتانە هەر هی خوان؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: کە من بۆ خوا ئەنجامیان دەدەم، دەنا هەموو شتێك هەر هی خوایە، بەڵام تۆ بە نیەتی خۆت نوێژەکەت بۆ خوا دەکەی، دەنا هەموو شتێك هەر خوا خاوەنیەتی، بەڵام

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٨٧٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣١٩)، وابنُ مَاجه برقم: (٤٢٣٠).

تۆ دەتوانی کە نوێژەکەت بۆ خوا نەبێ، بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکت بێ، خوا پەرستییەکانی دیکەت ، دەگونجێ بۆ ڕیابازیی‌و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکت بن، ژیانەکەت بەو شێوەیە نەبێ کە خوا پێی خۆشە.

لێرەدا دەمەوێ قسەیەکی جوانی (محمد الطاهر بن عاشور) بێنم کە لە تەفسیرەکەیدا[1] دەربارەی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی، دەڵێ: (وَيَجُوزُ أَنْ يَكُون الـمُرَاد مِنَ الـمَمَاتِ مَا يحصل للرَّسُول عَلَيهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم بَعْدَ وَفَاتِهِ مِنْ تَوجُّهاته الرّوحيَّة نَحْو أمّته ، بالدُّعَاء لَهُمْ ، وَالتَّسْلِيم عَلَى مَن سَلَّمَ عَلَيْهِ مِنْهُم، وَالظّهُور لِخَاصَّة أمَّته فِي الـمَنَام، فَإِنَّ للرَّسُول بَعْدَ مَمَاتهِ أَحْكَام الحيَاةِ الرّوحيَّة الكَامِلَة كَمَا وَرَدَ فِي الحَديث : "إِذَا سَلّمَ عَلَيَّ أَحَد مِنْ أُمَّتِي رَدّ الله عَلَيَّ رُوحِي فَرَددْتُ عَلَيْهِ السَّلام" وَكَذَلِكَ أَعْمَاله في الحَشْر مِنَ الشَّفَاعَةِ العَامَّة وَالسُّجود لله في عرصات القِيَامَة، فتلك أعمال خاصة به ﷺ وَهِيَ كُلّها لله تَعَالى لأَنَّها لنفع عَبيده، أَو لنَفع أتباع دينه الَّذِي ارْتضَاهُ لَهُمْ، فَيكُون قَوْله: "وَمَمَاتِي" هُنَا ناظراً إلى قوله في الحديث : ﴿حَياتِي خَيْرٌ لَكُمْ ومَمَاتِي خَيْرٌ لَكُمْ﴾[2] واتە: دەشگونجێ مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: ژیان‌و مردنم بۆ خوایە، مەبەست ئەوەبێ کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دوای مردنی، دوای پێغەمبەر دێتە دی، کە بریتیە لە گرنگیدانی ڕووحیی پێغەمبەر ﷺ بە ئۆممەتەکەی، کە دوعایان بۆ دەکات، وە سەلام دەکات ، لە هەر کەسێك کە سەلامی لێ بکات، وە لە خەوندا دەردەکەوێ بۆ کەسانی تایبەت لە ئۆممەتی {جاری وایە لە خەوندا ئاراستەیان دەکات : وابکرێ وانەکرێ}[3]، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە دوای مردنیشی هەموو یاساکانی ژیانی ڕووحی بەتەواویی هەیە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتووە: ئەگەر یەکێك لە ئۆممەتم سلاوی لێم کرد، خوا ڕووحەکەم بۆ دەگێڕێتەوە، تاکو منیش وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە قیامەت شەفاعەتی گشتیی دەکات، وە سەجدە دەبات لە قیامەت داو ، لە خوای

---

١) التحرير والتنوير، ج٤، ص٢٠٢.

٢) التحرير والتنوير، ج٤، ص٢٠٢.

٣) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

پەروەردگار دەپارێتەوەو مەدحو سەنای خوا دەکات، ئەوانەش کردەوەی تایبەتن بە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمووشیان بۆ خوان، بەڵام سوودی بەندەکانی خوای تێدایە، سوودی شوێنکەوتووانی ئەو ئایینەی کە بۆی پەسەند کردوون، تێدایە، بۆیە کە دەفەرموێ: مردنیشم بۆ خوایە، مەبەستی پێی ئەوەیە کە لە فەرمایشتدا هاتوە: ﴿حَيَاتِي خَيْرٌ لَكُمْ ، وَمَمَاتِي خَيْرٌ لَكُمْ﴾ واتە: ژیانم بۆ ئێوە خێرە، مردنیشم بۆ ئێوە خێرە، واتە: لە دوای مردنیشم خێری من هەر دێ، {ئاراستەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئۆممەتی دوای مردنیشی هەر بەردەوامە !}[١].

بەڵام بە تەئکید ئەوەی کە یاساکانی شەریعەتی لێوەردەگیرێن، تەنیا ئەو قورئانو سوننەتەن، کە پێغەمبەر ﷺ رایگەیاندوون، ئەدی خەون؟! پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی فەرموویەتی: ﴿لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبوَّةِ إلاَّ المُبَشِّرَاتِ ، قَالُوا: وَمَا المُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ﴾[٢]، واتە: جگە لە دڵخۆشکەرەکان هیچ شتێك لە پێغەمبەرایەتیی (دوای من) نەماوەتەوە، گوتیان: دڵخۆشکەرەکان چییە ؟ فەرمووی: خەونی چاکە .

وەك دەبنیین: پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لێناوە (مبشرات) مـوژدەدەرو دڵخۆشکەر.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ ﴾، یانی: ئەوە فەرمانی خوایەو ڕێنمایی خوایەو ، لەخۆمەوە ئەوانە ئەنجام نادەم ، ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، وە من یەکەمینی مسوڵمانانم، ئاشکرایە کە هەموو پێغەمبەرێك یەکەمین مسوڵمانی ئۆممەتەکەی بووە، ئەدی بۆچی لێرەدا خوا وادەفەرموێ؟ لێرەدا مەبەست پێی نائومێدکردنی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، لەوەدا کە هیچ تەماعێکیان لە پێغەمبەر ﷺدا نەبێ ، کە دەستبەرداری ئایینەکەی ببێ، وە بە دوای وان بکەوێ، واتە: من یەکەمین مسوڵمانم، یەکەمین ملکەچکەرم بۆ خوا، کەواتە: هیچ

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.
٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٩٩٠).

ئومێدێکـتان بەمـن نەبـێ ! دەشـتوانین بڵێیـن: کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾، یانـی: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ لە ڕووی کاتـەوە، بەڵـێ پـێش هـەموو ئۆممـەتی کەوتۆتـەوە، بـەڵام پـێش پێغـەمبـەرانی دیکەو ئۆممـەتانی دیکە نەکەوتۆتـەوە، بەڵام لە ڕووی پایـەو پلەوە، بێگومان پێش هەموویان کەوتۆتـەوە، بـۆ وێنـە : ئەگـەر لە شوێنێك زانکۆیەك هـەبێ، هـەموو سـاڵێك قوتابییەکانـی: (٩٨، ٩٩) پلـە (درجة) بێنـن، بەڵام دوایی قوتابییـەك لە یەکێك لە دەورەکانـدا (١٠٠) بێنێ، یان لە سەد زیاتر بێنـێ، دەگونجێ بڵێین: فـلان کەس یەکـەمی ئەو زانکۆیەیە، هـەر لـەو ڕۆژەوە کە زانکۆ دامەزراوە، با سەد ساڵیش بێ دامەزرابـێ، بۆچی؟! چونکە لـە مـاوەی سـەد سـاڵ لەمەو پێش ، هیچ کەس ئەو پلـەیەی نەهێنـاوە، ئنجا ئەوە پێی دەگوترێ: ڕیـزبەندنیی پلـەو پایـە (الـترتیبُ الرُتْبـيّ)، ئنجا ئەوە بـە هـەمان شـێوەش لـە ڕووی پێگـەو پلـەوە: پێغـەمبـەری ئێمـە ﷺ یەکەمیـن مسوڵـمانە، چونکـە: هـەموو پێغـەمبەرانی دیکە بۆ خوا ملکەچتـر بووەو، لە پێش هەموویانەوەیە لە ڕووی پێگەو پلەوە، بەڵام لە ڕووی زەمەنەوە، دیارە کە تەنیا لە پێش ئۆممـەتی خۆیەتـی.

### هـەموو پـێغـەمبـەران ( علـیهم السـلام ) بە ( مسلم ) وەسـف کراون :

جێـی سـەرنجە کـە خـوای پەروەردگـار هـەموو پێغەمبـەرانی (علـیهم الصلاة والسلام) بە (مسلم) ناوزەنـد کردوون، واتە: هەموو پێغـەمبـەران مسوڵـمان بوونـە، بـۆ خـوا ملکـەچ بوونـە، وە دینـی هـەموویان تەنیـا ئیسلام بـووە، یانـی: کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ﴾ المائـدة، واتـە: ئیسـلامم بـە بەرنـامە بۆ هەڵبـژاردوون، بـۆ پەسـەنـد کـردوون، کەواتـە: ئیسـلام ئاییـنی هـەموو پێغـەمبـەران بووە، با تەماشا بکـەین:

١/ پێغـەمبـەر نووح ﵇ لە سـوورەتی (یـونس)دا دەفـەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ

(٧٢) ﴾، واتە: ئەگەر پشتتان هەڵکرد، هیچ کرێیەکم لێ داوا نەکردوونە، پاداشتم تەنیا لەسەر خوایە، وە من فەرمانم پێکراوە کە لە مسوڵمانان بم.

٢/ بە نسبەت ئیبراهیمیشەوە ﷺ، لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَـٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ (١٣٢) ﴾، وە ئیبراهیم وەسیەتی کرد بۆ نەوەکانی، هەروەها یەعقووبیش (گوتی): ئەی ڕۆڵەکانم ! خوا ئایینی بۆ هەڵبژاردوون، بە مسوڵمانەتیی نەبێ مەمرن.

واتە: ئیبراهیمیش و یەعقووبیش و کوڕەکانیشیان، هەموویان مسوڵمان و ملکەچ بوون بۆ خوا.

٣/ پێغەمبەر یوسف ﷺ لە ئایەتی (١٠١)ی سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّـٰلِحِينَ (١٠١) ﴾ یوسف، واتە: پەروەردگارم ، تۆ موڵك و دەسەڵاتت پێدام، وە لە تەعبیری خەون شارەزات کردم، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ! تۆ سەرپەرشتیارو مشوورخۆرمی لە دنیاو دوارۆژدا، بە مسوڵمانەتیی بممرێنە، وە بە صاڵحانم بگەیەنە.

٤/ هەروەها مووسا ﷺ لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ (٨٤) ﴾یونس، واتە: مووسا گوتی: ئەی گەلەکەم ! ئەگەر ئێوە ئیمانتان بە خوا هێناوە، تەنیا پشت بە خوا ببەستن، ئەگەر مسوڵمانن.

٥/ هەروەها سەرجەم پێغەمبەرانی جوولەکەکان، لە سوورەتی (المائدة) خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا

ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ ... ﴿٤٤﴾ ﴾،
واتـە: ئێمـە تەوراتمـان ناردبووە خـوار، ڕێنمـایی ڕۆشـنایی تێـدا بـوو، پێغەمبەرانێك كە بۆ خوا مسوڵمان و ملكەچ بوون، حوكمیان پێ دەكرد، بۆ ئەوانەی كە جوولەكەن، هەروەها مشوورخۆران و زانایانی نێو جوولەكەكانیش .

(رّبانیون) واتـە: ئەو زانایانەی كە حوكمڕان بوون، (أحبار)یش ئەو زانایانەی كە دەسەڵاتیان نەبوو.

٦/ هەروەها خـوا دەربارەی حەوارییەكانی پێغەمبەر عیسا ﷺ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾، واتە: وە یادبكەوە ! كاتێك وەحییم كرد بۆ حەوارییەكان، {واتە: برادەرو هاوەڵە دانستەكانی عیسا ﷺ كە دوازدە كەس بوون بە ڕای زۆربەی زانایان}[1]، پێمگوتن: كە ئیمان بەمن و بە پێغەمبەرەكەم بێنن، گوتیان: ئیمانمان هێناوە، تۆ شایەدبە، كە ئێمە مسوڵمانین.

بۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿الأَنْبِيَاءُ إِخوةٌ لِعَلاَّتٍ، أُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى، وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٩٧٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٥٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٦٥)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٤٦٧٥)}، واتـە: پێغەمبەران بـران و كوڕی چەند دایكێكین و یەك بابیان هەیە، وە ئایینەكەیان و بەرنامەكەیان یەكە. {بەڵام دیارە لەگەڵ وردەكاریی جۆراو جۆردا}[2].

**مەسەلەی <u>سێیەم</u>:** كە دەفەرمووێ: ﴿ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ

١) ئەوەی نێوان كەوانەكان، زیادكردنی خۆمە.

٢) ئەوەی نێوان كەوانەكان، زیادكردنی خۆمە.

﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾، بە پێغەمبەر دەفەرموێ ، بە شێوەی پرسیاری نکوولّیی لێکەرانە: پێیان بڵێ: ئایا جگە لە خوا بە پەروەردگار بخوازم کە ئەو پەروەردگاری هەموو شتێکە ؟

## چەمكو واتای وشەی ( ربّ )

وشەی (ربّ) لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (الربّ فِي الأَصْل: التربية وهو إنْشاء الشيء حالاً فحالاً إِلى حَدّ التَّمَامِ، يُقَالُ رَبَّه وَرَبّاه وَرَبَّبه) وشەی (رب) لە بناغەدا بەمانای پەروەردەکردنە، ئەویش بریتیە: لەوەی کە شتێك قۆناغ بە قۆناغ پێ بگەیەنرێ، هەتاکو تەواو دەبێ و کامڵ دەبێ، دەگوترێ: (رَبّه وَرَبّاه وَرَبَّبه) هەرسێکیان بە یەك مانا دێن، واتە: پەروەردەی کردو پێی گەیاند، صەفوانی کوڕی ئوممەیە کاتی خۆی لە جەنگی (حنين)دا بە ئەبو سفیانی گوت: (لَئِن يَرُبَّني رجلٌ من قريش، أحَبُّ اليَّ من أنْ يَرُبَّني رجل من هوازن) واتە: ئەگەر پیاوێك لە قورەیش سەرپەرشتییم بکات (مەبەستی پێغەمبەر بووە)، لەلام خۆشەویستترە لەوە کە پیاوێك لە (هوازن) (تیرەیەکی دیکەی عەرەبەکانە) سەرپەرشتییم بکات، هەڵبەتە وشەی (ربّ) چاوگ (مصدر)ە، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ بکەر (فاعل)، وە جگە لە خوا بە ڕەهایی بە کەس ناگوترێ پەروەردگار، چونکە هەر خوای بەرز سەرپەرشتیی هەموو دروستکراوەکان دەکاتو، بەرژەوەندییەکانیان دێنێتە دی.

خاوەنی (المعجم الوسيط) هەشت مانای بۆ وشەی (ربّ) هێناون: (الربّ: إسم الله تعالى ولا يقال (الربّ) في غير الله إلا بالإضافة، والمالك، والسيد، والمربِّي، والقَيِّم، والمُنْعِمُ، والمُدَبِّر، والمُصْلِحُ وجمعه أرباب وربوب)[1]:

(ربّ) : (١) ناوی خوای بەرزەو، بۆ غەیری خوای پەروەردگار بەکارنایەت، مەگەر پاڵ بدرێتە لای شتێك، {وەك: (رب الإبل، رب البيت) یان کە بە ئافرەت دەگوترێ (ربة البيت) یانی کابان، ئەگەر پاڵبدرێتە لای شتێك قەیناکات، بەڵام

١) ص : ٣٢١.

بە موتڵەقیی نابێ بە کەس بگوترێ (ربّ)}[١]، وە: (٢) خاوەن، وە: (٣) سەرۆك، وە: (٤) پێگەیەنەر ، وە: (٥) سەرپەرشتیار ، وە: (٦) چاکە لەگەڵداکار، وە: (٧) مشوورخۆر ، وە: (٨) چاککەر، (کاروباری کەسێكو شتێك چاك بکات) ، وە کۆی (ربّ)یش (أرباب)ە ، وە (ربوب)ە.

کەواتە شتێکی نەگونجاوە لە کاتێکدا خوای پەروەردگار سەرپەرشتیارو خاوەنی هەموو شتێکە، ئێمە شتێکی دیکەی جگە خوا، یان کەسێکی دیکەی جیا لە خوا، بکەینە پەروەردگار.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا﴾، هیچ کەسێك ئەو خراپەیەی کە دەیکات ، بێجگە لە خۆی زیانی بۆ کەسی دیکە نیە.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە: کە ئێوە ئەو گوناهانەی کە دەیانکەن، وامەزانن زیانیان بۆ من هەیە، ئەگەرنا بێگومان جاری وایە کەسێك گوناح دەکات، زیانی بۆ خەڵکی دیکەش هەیە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە خۆتان بە تەنیا، تەحەمولی سەرەنجامی غەڵەتو پەڵەتو گوناحو کوفرو شیرکی خۆتان دەکەن، کە بەقسەم ناکەن.

وشەی (كسب)یش لە قورئاندا بۆ چاکە بەکارهاتوە، وەك خوا لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴿٢٨٦﴾ ﴾، واتە: .. هەر نەفسێك ئەو چاکەیەی کە دەیکات، قازانجی بۆخۆیەتی، وە ئەو خراپەیەی کە دەیکات زیانی بۆخۆیەتی، وشەی: ﴿ كَسَبَتْ ﴾، بۆ چاکە، بەڵام وشەی: ﴿ ٱكْتَسَبَتْ ﴾، بۆ خراپە بەکارهێنراون، چونکە چاکە لەگەڵ فیترەتدا دەگونجێو، هیچ زەحمەتی ناوێ، بەڵام خراپە زەحمەتی دەوێ، تەکەللوفە .

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

ئنجا ئایا لێرەدا چۆن دەزانین وشەی: ﴿ كَسَبَتْ ﴾، بۆ خراپەیە ؟ بە هۆی وشەی ﴿ عَلَى ﴾ وە: ﴿ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ﴾، چونکە ﴿ عَلَى ﴾، بۆ زیانە، کەواتە: هەر کەسێك گوناهێك بكات ، سەری خۆی دەگرێتەوە.

ئنجا ئایا بۆچی لێرەدا وشەی : ﴿ كَسَبَتْ ﴾ی، بەکارهێناوە ؟ چونکە ئەوانە هێندە لەسەر خراپە بەردەوام بوون، لێیان بۆتە تەبیعەتو زۆر بە ئاسانیی خراپە دەکەن !.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ، واتە: وەك چۆن گوناهی کەس بۆ کەس ناچێ، کەسیش گوناهی کەس هەڵناگرێ.

ئنجا ئەوە ئەوپەڕی دادگەریی خوای پەروەردگارە، کە کەس گوناهی کەس هەڵناگرێ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەنیە کە کەسێك کەسێك گومڕا بكات، لە گوناهەکەی دا بەشدار نەبێ ! چونکە گومڕاکردنەکەی گوناهێکەو دێتە ئەستۆی ! بەڵام مەبەست ئەوەیە: ئایا ئەگەر کەسێك لەوپەڕی دنیا قەتڵێك دەکاتو ئاگات لێ نیە، دەبێ بێتە ئەستۆی تۆ ؟ یان: کوڕێك، کچێك هەڵەیەك دەکات، بابو دایکەکە بەبێ ئەوەی کە کەمتەرخەم بووبن لە پەروەردەکردنیدا، ئایا گوناهەکەی دێتە ئەستۆیان؟ نەخێر، لێرەدا مەبەست ئەو حاڵەتانەیە.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾، (وِزْرَ) واتە: (حِمْل) کۆڵ، ئەوەی کە ئینسان بە پشت هەڵیدەگرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ ﴾الأنعام، واتە: وە ئەوان کۆڵەکانی خۆیان لەسەر پشتی خۆیان هەڵدەگرن، وە ئەوە خراپترین شتە کە ئەوان هەڵیانگرتوە.

لێرەدا خوای پەروەردگار گوناح تەشبیە دەکات بە کۆڵێکەوە کە بابای گوناهبار بە کۆڵیدا داوەو، دەچێ بۆ قیامەتێ، ئنجا وەرە مرۆڤ بە کۆڵێ گوناهەوە ، بچێ بۆ خزمەت خوای پەروەردگار، کە خوا لەسەر زەوی داینابوو بەندایەتیی بۆ بکات، کەچی بە کۆڵێ گوناهەوە دەچێتەوە بۆ لای !

دوایی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴾، دوایی گێڕانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە، وە هەواڵتان پێدەدات بەوەی کە تێیدا دەکەوتنە ڕاجیاییەوە، چ لەگەڵ کافران دا، چ لەگەڵ ئیمانداراندا، ئەو مشتومڕو ڕاجیاییەی کە لە دنیادا یەکلایی نابێتەوەو هەڵنابڕدرێ، لە قیامەتێ خوا بۆتان هەڵدەبڕێ.

<u>**مەسەلەی چوارەمو کۆتایی**</u>: خوا لە کۆتاییی دا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ﴾، وە خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی کردوە بە جێنشینانی (خۆی) لەسەر زەوی، وە هەندێکتانی بەسەر هەندێکتاندا بە چەند پلە بەرز کردۆتەوە، تاکو لەوەدا کە پێیداون، تاقیتان بکاتەوە، بێگومان پەروەردگارت سزای خێرایە، وە بێگومان ئەو لێبوردەی بەبەزەییە.

# باسێک دەربارەی جێنشینی خوابوونی مرۆڤ لەسەر زەوی

لێرەدا زانایان پرسیاریان کردوە: ئایا ڕووی دواندن لە کێیە؟ کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ﴾؟

١/ هەندێکیان گوتوویانە: ڕووی دواندن لە مسوڵمانانە، واتە: ئەی مسوڵمانان! خوا ئێوەی لەسەر زەوی داناوەو، ئێوە جێنشینی ئەون، بۆ ئەوەی شەریعەتی ئەو پیادە بکەن لەسەر زەوی.

٢/ وە هەندێکیان گوتوویانە: ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، چونکە ئەو سووڕەتی (الأنعام)ە، بە زۆریی وتوویژە لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەران دا.

٣/ هەندێکیشیان گوتوویانە: ڕووی دواندن لە خەڵکە بەگشتی.

کە لە ڕاستییدا سێیەمیان ڕاستە، چونکە خوای باڵادەست ، هەموو بەشەری لەسەر زەوی داناوە، وەك جێنشینی خۆی لەسەر زەوی دایناون، وە نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون، وە جیاوازیی جۆراو جۆریشی خستۆتە نێوانیان.

لەو ئیمتیازانەدا کە پێیداون، تاکو تاقیيان بکاتەوە، لەو بوارەدا هەموويان وان، نەك مسوڵمانان بە تەنیا، یاخود کافرو هاوبەشدانەران بە تەنیا، بەڵکو هەموو بەشەر لەوەدا یەکسانن.

ئنجا لەم ئایەتەدا کە خوا باسی ئەوە دەکات: ئینسانەکانی لەسەر زەوی کردوون بە جێنشینی خۆی، ئەو مەسەلەیە لە پێنج، شەش شوێنی دیکەی قورئاندا هاتووە، بۆ نموونە:

١/ لە سووڕەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٣٩﴾﴾، واتە: ئەو کەسێکە کردوونی بە جێشینان لە زەوی دا.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (الحدید)دا دەفەرموێ: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنن‌و، لەوەدا کە کردوونی بە جێنشین ببەخشن.

٣/ وە لە سوورەتی (البقرة)دا، لە ئایەتی (٣٠)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: وە یاد بکەوە کاتێ پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم.

٤/ هەروەها لە سوورەتی (یونس) لە ئایەتەکانی (١٣)و (١٤)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ خَلَـٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان کۆمەڵگاکانمان لە پێش ئێوەدا فەوتاندن، دوای ئەوەی کە ستەمیان کرد، وە پێغەمبەرانیان بۆ لا هاتن، بە بەڵگە ڕوونەکانەوە، بەڵام ئیمانیان نەهێنا بەوەی کە پێشتر پێی بێبڕوا بوون، ئاوا سزای تاوانباران دەدەین، دوایی ئێوەمان کردە جێنشین لەسەر زەوی لە دوای وان، تەماشا دەکەین چۆن ڕەفتار دەکەن !

٥/ هەروەها لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتەکانی (١٢٨ و ١٢٩)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾، واتە:

کاتێ مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: پەنا بە خوا بگرن‌و یارمەتیی لە خوا وەربگرن، وە خۆڕاگربن، زەوی هی خوایە دەیکاتە میرات بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ لە بەندەکانی، وە سەرەنجامیش بۆ پارێزکارانە، گەلەکەی پێیان گوت: پێش ئەوەی بێیە لامان (بکرێی بە پێغەمبەر لە نێوانماندا) هەر ئەزیەت دەدراین (لەلایەن فیرعەونەوە)، وە دوای ئەوەی کە هاتووشی، هەر ئەزیەت دەدرێین، فەرمووی: زۆر نزیکە پەروەردگارتان دوژمنەکانتان بفەوتێنێ، وە ئێوە بکاتە جێنشین لە دوای وان، وە تەماشا دەکات داخو ئێوە چۆن دەکەن؟!

کەواتە: لەو هەموو ئایەتانەدا، خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەکات کە ئینسانەکانی کردوونە جێنشین لەسەر زەوی، ئنجا دەپرسین : ئایا دەگونجێ ئینسان خەلیفەی خوا بێ ؟ هەندێك دەڵێن: نەخێر، من لە کتێبی (خواپەرستیی ئیسلامیی) بەرگی یەکەم دا، بە تەفصیلێ باسم کردوە، وە لەو کتێبەدا کە لە زیندان دا نوسیومە بە ناوی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا باسم کردوە[1]، کە لە ڕاستییدا ئەوە کە ئینسان جێنشینی خوایە، واقیعە، یانی : هەر بە واقیعیی وایە، بۆچی؟ چونکە ئەوە دیارە خوا ئێمەی لەسەر ئەم زەوییە داناوە، وە فەرمووشیەتی : هەرچی لەو سەر زەوییەیە، بۆ ئێوەم دروست کردوە، وە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ... ﴿١٥﴾ ﴾الملك، واتە: ئەو (خوا) کەسێکە زەوی بۆ دەستەمۆ کردوون، دەجا بە قەد پاڵەکانیدا بڕۆن، وە لە ڕزقی خوا بخۆن !

وە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لە زەویی دایە بۆ هەمووتانی خولقاندوە، یان هەمووی بۆ ئێوە خولقاندوە .

---

١) لە بەرگی یەکەم دا.

کەواتە: ئێمە بە کردەیی جێنشینی خواین لەسەر زەوی، جێنشینی خوا یانی چی؟ یانی خوای پەروەردگار لە جیاتی ئەوەی ڕاستەوخۆ، یاخود لە ڕێی فریشتەکانەوە، کاروباری سەر زەوی هەڵسووڕێنێ، عایدی ئێمەی کردوە، ئەوە مانای جێنشین بوونی ئێمەیە بۆ خوای پەروەردگار، چونکە لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺیش فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ وَإِنَّ اللهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (٢٧٤٢)، وَأَحْمَد بـرقم: (١١١٨٥)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (٨٦٧)}، واتە: بێگومان دنیا شیرینەو سەوزە {خۆشترین تام لە تامەکاندا شیرینییەو جوانترین ڕەنگیش دیارە سەوزییە، واتە: دنیا جوانەو بەتامە}[1]، وە خوا ئێوەی تێدا کردۆتە جێنشینو ، تەماشا دەکات داخۆ چی دەکەن، دەجا خۆتان بپارێزن لە دنیاو، خۆشتان بپارێزن لە ئافرەت (واتە: بە باری حەرامییدا)، چونکە یەکەمین کێشەو فیتنە کە لەنێو بەنی ئیسرائیلدا پەیدا بوو، بەهۆی ئافرەتانەوە بوو.

ئنجا ئایەتەکانیش هەر ئەوە دەگەیەنن، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

ئنجا ئەو ئایەتانەی کە من خوێندنمەوە: ئایەتەکەی (فاطر)و ئایەتەکەی (الحديد)و ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة)، مانای خەلیفەی خوا بوونی ئینسان، دەگەیەنن، بەڵام ئایەتەکانی دیکە: ئایەتەکەی سوورەتی (يونس)و ئایەتەکەی سوورەتی (الأعراف) ئەوە دەگەیەنن، کە قەومێک لە شوێن قەومێک زەوی بە میرات بگرن.

پاشان (راغب الأصفهاني) زۆر بە جوانیی باسی خەلیفە دەکاتو دەڵێ: (خَلِيفَة) بە (خَلاَئِف) کۆ دەکرێتەوە، هەروەك چۆن (خليف) بە (خُلَفاء) کۆدەکرێتەوە، (خَلِيفة) و (خَليف) هەردووکیان بە مانای جێنشین دێن (الخِلاَفة: النِّيَابَةُ عَنِ الغَيْرِ، إِمَّا لِغَيْبَةِ المَنُوبِ عَنهُ، وإِمَّا لِعَجْزِهُ، وإِمَّا لِمَوْتِهِ، وَإِمَّا لِشَرَفِ المُسْتَخْلَفِ)

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان، زیادکردنی خۆمە.

یـــانی: وشـــەی (خِلاَفــة) بریتیـــە لـــە جێنشـــینایەتییکردنی غـــەیری خـــۆت، جێنشینایەتییکردنیش، یان لەبەرئەوەیە کە ئەو کەسـەی جێنشـینی داناوە لـەوێ نیـە، یـان لەبەرئەوەیـە کـە ناتوانـێ، یـان لـەبەرئەوەیـە کـە دەمـرێ، یـان لەبـەر ڕێـزلێگـرتن ، یەکـێك لـە شـوێنـی خـۆی دادەنـێو، دەیـەوێ ڕێـزی لـێبگـرێ، ئنجـا بەنسبەت ئینسانەوە ، کە خـوا کردوویەتی بەجێنشینی خۆی، بە مانای چوارەمیانە.

بەڵگـەمان چییە لەسـەر ئەوە کە خـوا ڕێـزی لـە ئینسان نـاوە؟ ئەوەیـە کـە فریشـــتەکان گوتیـــان: ﴿ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠ ﴾البقـرة، واتـە: ئایا کەسـێك لـە زەویـدا دادەنێـیو دەیکـەی بـە جێنشـین، کـە خـوێنی تێـدا دەڕێژێو خراپـەی تێـدا دەکات، ئێمـەش هەمیشـە تـۆ بـە پـاك دەگـرینو سـتایشـت دەکەین؟ (خـوا) فـەرمووی: ئـەوەی من دەیزانـم، ئێوە نایزانـن، کـە دیـارە ئـەوە ڕێـز لێگـرتنـێك بووە، بۆیە فریشـتەکان پێیـان خـۆش بـووە بۆ وان بـێ.

ئنجا بێگومـان ئێمـە یـان دەبـێ بڵێین: ئینسـان جێنشـینی خـوایە لەسـەر زەوی، یان دەبێ بڵێین: ئینسانەکان هـەنـدێکیان جێنشـینی هـەنـدێکیانن، یـان دەبـێ بڵێین: ئینسـان جێنشـینی (جـن)ە، هــەڵبەتە هەنـــدێك لــە زانایـان وایانـــگوتوە، بـــەڵام لەڕاســـتییدا لەبەرئـەوەی ئینسـانو جنـــد پێکـەوە هـاتوونە ســـەر زەوی، ناگونجـــێ ئینسان جێنشـینی جند بـێ .

ئنجا بەڵگـەمان چییـە لەسـەر ئەوەی کە پێکەوە هاتوونەتە سـەر زەوی ؟!

بەڵگەمان ئەوەیـە کـە خـوا لـە سـوورەتی (طه)دا دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣ ﴾، واتـە: (خـوا) فـەرمووی: هـەردووك لاتـان دابەزنە سـەر زەوی (ئیبلیسو ئـادەمو حەووا) هـەندێکتان دوژمنن بۆ هـەندێکتـان.

هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرمویٚ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: (خوا فەرمووی: دابەزن هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن... .

کەواتە: جند لە پێش مرۆڤدا لەسەر زەوی نەبوون، بەڵکو پێکەوە دابەزیونە سەر زەوی، وە پێکەوە ئەو سەر زەوییەیان ئاوەدان کردۆتەوە .

وە ناشگونجیٚ بڵێین : مرۆڤەکان هەندێکیان خەلیفەی هەندێکیانن، ئەدی ئادەم خەلیفەی کیٚ بووە ؟ خۆ پێش ئادەم کەسی دیکە نەبووە ؟ ئنجا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان، بۆئەوەی خۆیان لەوە دەرباز بکەن، گوتوویانە : لە پێش ئادەمدا، چەندان ئادەمی دیکە هەبوون! بێگومان ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو، ئەسڵ ئەوەیە کە ئینسان جێنشینی خوایە لەسەر زەوی .

ئنجا دیارە هەمووی سیفەتەکانی خوای پەروەردگار دەبیٚ وەك ئەوەبن، کە بۆ خوا شایستەیە، کەواتە: مرۆڤ کە دەبێتە خەلیفەی خوا، وەك ئەوە نیە کە مرۆڤەکان دەبنە خەلیفەو جێنشینی یەکدی، خەلیفەی خوا بوون ، بەو شێوەیەیە کە بۆ خوای پەروەردگار شایستەیە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ ﴾، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (الزخرف) وایە، کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: ئێمە لە ژیانی دنیادا، ژیانو گوزەرانیانمان لەنێودا دابەش کردوون، هەندێکیان بە چەندان پلە بەسەر هەندێکیاندا بەرزکراونەوە، تاکو هەندێکیان هەندێکیان بەکاربێنن.

یانی: ئەگەر وەزیر جوتیار بەکاربێنێ، جوتیاریش وەزیر بەکاردێنێو خزمەتی ئەو دەکات، ئەگەر بەرگدروویەك، یاساناسێك بەکاردێنێ، ئەویش ئەو بەکاردێنێ، ئەگەر سەرۆك خەڵك بەکاربێنێ، خەڵکیش سەرۆك بەکاردێنن، یانی: هەموویان خزمەتی یەکدی دەکەن، هەر کەسە بەپێی ئەو نیعمەتانەی کە خوا پێی داون، لە بواری خۆیدا، هەرکامێکیان خزمەتی ئەوانی دیکە دەکات.

وە ئەگەر ماناش ئەوەبێ: خوا هەندێك لە نیعمەتەکانی زیاتر داون بە هەندێکیان، بەڵێ، هەیە عەقڵی بەقوەتترە، عیلمی زیاترە، ماڵو سامانی زیاترە، قەدو قیافەی ڕێکترە، ڕەنگو ڕووی جوانترە، بێگومان ئەوەش واقیعێکە، بەڵام بێگومان لە ڕۆژی دواییشدا لێپرسینەوە، بەپێی نیعمەتەکانە، وەك فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾التكاثر، واتە: پاشان لەو ڕۆژەدا لەبارەی نیعمەتەکانەوە لێتان دەپرسرێتەوە، یانی: کێ خوا نیعمەتی زیاتری پێدا بێ، بە دڵنیایی دیارە لێپرسینەوەی زیاتریشی لەگەڵدا دەکرێ.

لە کۆتایی دا خوا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴾، بێگومان پەروەردگارت سزای خێرایە، وە بێگومان لێبوردەی بە بەزەییە، ئاشکرایە سزایەکەی بۆ کەسانێکە کە شایستەی بن، کە بێبڕواو ستەمکارە خراپەکانن ، وە لێبوردنو بەزەییەکەشی بۆ کەسانێکە کە شایستەی بن، کە ئەهلی ئیمانی چاکەکارو پارێزکارن.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی بمانخاتە ژێر سایەی لێبوردەییو میهرەبانیو بەزەیی خۆیەوە، وە پەنا بە خوا دەگرین لەو گوناحو تاوانو غەڵەتو پەڵەتانەی کە وامان لێدەکەن شایستەی سزای خوای دادگەر بین، خوا ئاکامو سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات، ئامین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# سەرچاوەکان

١) تفسير الطَّبَرِي الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَرِي، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإِمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداءِ إِسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقى، إِعداد جماعَة مِنَ العُلَماء، بإِشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإِمام فَخْرَالدِّين محمد بن عُمَرَ بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي، حَقَّقَهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحَاديثهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية.

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرْآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف: الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني، تحقيق: عبدالرزاق الْمَهدي، دار الكتاب العربي، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) زاد المسير في علم التفسير: لابن الجوزي .

٨) روح المعاني: للآلوسي .

٩) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل، تأليف: علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

١٠) تفسير المراغي ، تأليف أحمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت.

١١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام الْمَنان ، تأليف: العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، تحقيق: عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٢) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن، تأليف: الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١٣) صفوة التفاسير، تأليف: العلامة محمد بن علي الصابوني، مكتبة الهداية، أربيل/ العراق، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٤) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف: محمد رشيد رضا، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٥) الأساس في التفسير، تأليف: سعيد حوى، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٦) في ظِلال القُرْآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٧) التفسير الْمُنير في العَقِيدة والشَّرِيعَة والْمَنْهَج، تأليف: الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٨) التحرير والتنوير، محمد الطاهر بن عاشور .

١٩) الميزان ، محمد حسين الطباطبائي .

٢٠) تفسير الشعراوي ، محمد متولِّي الشعراوي .

٢١) تفسير نمونه ، ناصر مكارم شيرازي .

٢٢) الكاشف ، محمد جواد مغنية .

٢٣) التفسير التوحيدي ، د. حسن الترابي .

٢٤) مُفرَدات ألفاظ القُرآن، تأليف: العلامة الراغب الأصفهاني، تحقيق: صفوان عدنان داوودي، دار القلم، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

٢٥) الإستيعاب في بيان الأسباب .

٢٦) أسباب النزول ، للنيسابوري .

٢٧) لُبـاب النقـول فـي أسباب النزول، للإمـام الحـافظ جلال الـدين عبدالرحمن بـن أبـي بكـر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق الْمَهْدِي، دار الكتـاب العربـي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م) ، (أسبـاب النـزول) للنيسـابوري .

٢٨) مختـار الصِّحاح ، للـرازي .

٢٩) المعجـم الوسـيط، دار الدعـوة، الطبعـة الثانيـة.

٣٠) الْموطـأ للإمـام مالـك بـن أنـس بروايـة يحـيى بـن يحـيى الليثـي، تحقيـق: الـدكتور الشـيخ خليـل مـأمون شـيحا، دار الـمعرفة، الطبعـة الثانيـة (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسـباب النـزول) للـواحدي.

٣١) الْمُسنَد للإمام أحمد بن محمد بـن حنبـل، الناشـر مؤسسـة قرطبـة، القـاهرة، الأحـاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها.

٣٢) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمـد بـن إسـماعيل البُخَارِي، تحقيـق: الـدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولـى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٣) صَحِيح مسـلم للإمـام الحـافظ مسـلم بـن الحجـاج النَّيسـابوري، حقـوق أصـولُهُ و خَـرَّجَ أَحـاديثهُ على الكتب السـتة: الـدكتور الشيخ خليـل مأمون شـيحا، دار الـمعرفة، الطبعـة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٤) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجسـتاني، تحقيـق: محمـد ناصـر الدين الألبـاني، مكتبـة الْمعـارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٥) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيـق: محمــد ناصر الدين الألبـاني، مكتبة الْمعـارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٦) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بـن شـعيب بـن علـي الشهيـر بـ(النَّسَـائي)، تحقيـق: محمـد ناصـر الـدين الألبـاني، مكتبـة الْمعـارف، الطبعـة الثــانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٣٧) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبـي عبـدالله محمـد بـن يزيـد القزوينـي الشـهيـر بـ (ابْنُ مَاجَـهْ)، تحقيــق: محمـد ناصـر الـدين الألبـاني، مكتبــة الْمعـارف، الطبعــة الثــانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٣٨) سُنَن الدار قُطني، للإِمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني، تحقيق: مجدي بن مَنصور بن سي الشورى، دار الكتب العلمية، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٣٩) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإِمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري، تحقيق: صالح اللحَّام، دار ابن حزم، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٠) صَحِيح ابْنُ حِبَّان للإِمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني، تحقيق: حقوق أصولُهُ وخَرَّجَ أَحاديثه: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٤١) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَرَاني، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي، مكتبة الأصالة والتُّراث، الطبعة الأولى ( ١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٤٢) سُنَن الدَّارمي للإِمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ أَلفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلَّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارسَهُ: الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا، دار المصطفى، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٣) مشكاة المصابيح، تأليف: محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٤) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، تأليف: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٥) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ: عصام موسى هادي، دار الصديق، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٤٦) السنن الكبرى تصنيف: الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق: دكتور عبدالغفار سليمان البنداري، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت — لبنان، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٤٧) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة الأولى.

# نێوەڕۆک